# فقه السنة

## بەکوردی

سید سابق

وەرگێرانی

حەمەئەمین ئەحمەد بەرزنجی

پێشەکی و تعلیق

محمد ناصر الدین الالباني

تمام المنة في تعليق علي فقه السنة

شەهید حەسەن بەننا پێشەکی بۆ نوسیوە

تاوانەکان

ئاشتی لە ئیسلامدا

کڕین و فرۆشتن

دادوەری

بەشە دابڕاوەکان

فقه السنة

چاپی سێیەم

٢٠١٣

# فقه السنة

## بەکـوردی

## سید سابق

## وەرگێڕانی

حەمەئەمین ئەحمەد بەرزنجی

## پێشەکی و تعلیق

محمد ناصرالدین الالباني

تمام المنة في تعليق علي فقه السنة

شەهید حەسەن بەننا پێشەکی بۆ نوسیوە

## بەرگی یەکەم

چاپی سێهەم

٢٠١٣

بسم الله الرحمن الرحيم

## ناسنامەی کتێب


- ناوی کتێب : فقه السنة بە کوردی
- نـوسـیـنی : سید سابق
- وەرگـێڕنی : حەمەئەمین ئەحمەد بەرزنجی
- نۆرەی چاپ: سێیەم ٢٠١٣
- تیراژ : ٢٠٠٠ دەورە

لەبەڕێوەبەرایەتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی (٧٧٤)ی ساڵی ٢٠٠٧ ی پێدراوە

ناوەندی ڕۆشنبیر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

## پێشەکی:

**لە نوسینی ئیمامی شەهید حەسەن بەننا**

سوپاس و ستایشی بێپایان بۆ خوای گەورە ,صەلات و سەلام لەسەر گیانی پاکی پێغەمبەرمان (موحەممەد)ـ دروودی خوای لەسەر بێت ـ, وە لەسەر ئالوبەیتوو هاوەڵانی..

خوای مەزن دەفەرموێت:( وما كان المؤمنون لينفروا كافة , ولولا نفر من كل فرقة منهم طائفة ليتفقهوا فى الدين ولينذروا قومهم اذا رجعوا اليهم لعلهم يحذرون) التوبة ـ ١٢٢

واتە: پێویست ناکات هەموو موسوڵمانان وە دەرکەون, با لەناو هەر کۆمەڵگایەکدا دەستەیەکیان بچێتە دەرێ, هەتا لە ئاینەکەیان شارەزا بن, کە گەڕانەوە ناو هۆزەکەیان, بیان ترسێنن بەڵکو خۆیان بپارێزن..

لەپاشان: لەمەزنترین ئەو کارانەی کە لەخودا نێزیکمان دەکاتەوە, بریتیە لە بلاوکردنەوەی بانگەوازی ئیسلام و, زانستە شەرعیەکان, هەتا خەڵکی لەسەر زانست و زانیاری و بەرچاو ڕوونی پەرستشەکان و کردەوەکانیان جێبەجێ بکەن, پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر بێت ـ دەفەرموێت:(من يريد الله بة خيرا يفقه فى الدين)

واتە: هەرکەس خوا بیەوێت توشی خەیری بکات شارەزای دەکات لە زانستە شەرعیەکاندا, زانستیش بە فێربون دەبێت, پێغەمبەرانی خودا دینارو درهەمیان جێنەهێشتوە, بەڵکو زانست و زانیارییان جێهێشتوە, جا هەر کەس بەو زانستانە بەهرەمەند ببێت, ئەوە بەختەوەرە..

ناسکترین شێوازو بەسوود ترینیان و نێزیکترینیان لە دڵ و ئاوەزەوە, شارەزابونە لە زانستە شەرعیەکان بە تایبەت لە حوکمی پەرستشەکان و, پێشکەشکردنیەتی بەگەل و نەتەوەی ئیسلام, وە دوور کەوتنەوەیە لە زاراوە هونەریە وشکەکان, کە لق و پۆپەکی زۆریان لێدەبێتەوە, گەیاندنی ئەوانە بە گوێرەی توانا بەو بەڵگانەی حوکم و سودەکانی, بەوەندەی کە بۆیان دەلوێ جێبەجێی بکەن, هەتا خوێنەران و تێگەیشتوان هەست بکەن کە لەخواو پێغەمبەر نێزیك بونەتەوەو, سوودمەند بن لە دنیاو قیامەتتدا, چونکە لەوەدا گەورەترین پاڵنەر هەیە بۆ زیادکردنی زانیاریو ڕۆیشتن بەرەو زانست..

خوای گەورەمان یارمەتیو پاڵپشتی برای بەڕێزمان مامۆستا شێخ (سەید سابق)ی کرد بۆ گرتنەبەری ئەم شێوازە ڕێیە, بەوەی کە ئەم کتێبە ئاسانەی داناوە, کە دەتوانرێ بەسانایی زانستی لێوەربگیرێو کەڵك وسوودیشی زۆرە, وە هەموو زانستە شەرعیەکانی تیا ڕوون کردوەتەوە بەو شێوازە جوانە, بەوە پاداشتی خوای گەورەی بۆ خۆی دەستەبەر کردوە بەئومێدی خوا, هەروەها خۆشەویستی ئەوانەی بەلایخۆیدا ڕاکێشاوە کەخاوەنی غیرەتن بەرامبەر ئایینەکەیان, خوای گەورە لە بری ئایینەکەی و نەتەوەی ئیسلام و بانگەوازەکەی . پاداشتی بە چاکترین شێوە بداتەوە, وە سوود بگەیەنێ و لەسەر دەستی ئەودا خێر بۆ خۆی و خەڵکانی تر بەردەوام بکات.

**ئیمزا: حەسەن بەننا**

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إنَّ الحَمدَ لله، نَحمَدُهُ، وَنَستَعِينُهُ، وَنَستَغفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللهِ مِن شُرُورِ أنفسِنَا وَمِن سَيِّئَاتِ أعمَالِنَا، مَن يَهدِهِ اللهُ فَلَا مُضِلَّ لَهُ وَمَن يُضلِل فَلا هَادِيَ لَهُ، وَأشهَدُ أن لا إلَهَ إلا اللهُ وَحدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ وَأشهَدُ أنَّ مُحَمَّداً عَبدُهُ وَرَسُولُه.

أمَّا بَعدُ:

حەزم ئەکرد وەك موسڵمانێك خزمەتێك بەم ئایینە پیرۆزەی ئیسلام بکەم، بە شێوەیەك کوردی موسڵمان سودی لێ وەربگرێت، وە ببێتە خێرێکی بەردەوام کە لە دوای مردن سوودی لێ وەربگرم، بۆیە دەستم دایە ئەم کتێبە پڕ سوود و ئاسانو لەبارەو وەرم گێڕایە سەر زمانی کوردی بۆ ئەوەی برا کوردە موسڵمانەکانم بە زمانی کوردی شیرین لە یاسا پیرۆزەکەی ئایینەکەیان بگەن.

جا ئەم کتێبە: (فقه السنة) ی (سید سابق) ە (خوا پاداشی بەخێری باتەوە) هەتا خوێنەری موسڵمان نەی خوێنێتەوە و لێی تێ نەگات نازانێت چەندە بە نرخە.

داواکارم لە خوای گەورە ئەم کارەم بۆ بکات بە کارێك تەنها لە ڕێگای ئەودا بێت.

حەمە ئەمین ئەحمەد بەرزنجی

سلێمانی / چوار شەممە / ٤ / ٥ / ١٩٩٥ ز

٤ / ذی الحجة / ١٤١٥ ك

## پێشەكی زانای پایەبەرز مامۆستا (محمد ناصر الدين الألباني) لە كتێبی (تمام المنة) دا

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

### پێشەكی چاپی دووەم:

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانیان، وە صەلات و سەلام لەسەر گەورەی پێغەمبەران بێت كە فەرمویەتی -هەروەك لە «صحیحین» دا هاتوە- (مَن يُرِدِ اللّٰهُ بِهِ خَيراً يُفَقِّهْهُ فِي الدِّين). واتە: ئەگەر خوای گەورە بیەوێت خێر بە كەسێك بگەیەنێت لە دیندا شارەزرای ئەكات.

وە هەروەها صەلات و سەلام لەسەر خاندان و یارە پیرۆزەكانی بێت، وە هەروەها لەسەر ئەوكەسانەی كە شوێن ئەوان كەوتون لەسەر شارەزاییەكەیان و ڕێ و ڕەوشتەكەیان هەتا ڕۆژی دوایی.

پاشان: ئەمە چاپی دوەمی كتێبەكەمە (تمام المنة في التعليق على فقه السنة) ئەوە نزیكەی چارەكە سەدەیەك بەسەر چاپی یەكەمدا تێپەڕیوە كە بۆم ڕێ نەكەوتوە چاوی پێدا بخشێنمەوە و ئامادەی بكەمەوە بۆ چاپ كردنی جارێكی تر، هەتا ئەم دواییە كە لە (عەممان - پایتەختی ئەردەن) نیشتەجێ بوم، وە سوپاس بۆ خوا لەوێ بۆم ڕێ كەوتوە كە هەندێك لە دانراوەكانم چاپ بكەم و لەژێر چاوەدێری خۆمدا بێت و هەڵەكانی ڕاست بكەمەوە لەگەڵ یارمەتی دانی هەندێك لە كارمەندانی (المكتبة الإسلامية).

بەم كارەشم هەوڵ ئەدەم كە كەم یان زۆرێك هەڵەی گەورەی تێدا نەبێت، یان لەكاتی هەڵە ڕاست كردنەوەكەیدا بەبێ چاودێری ورد هەندێك دێڕی لێ بكەوێت، جا تا ئێستا توانیومانە -لەژێر چاودێری خۆمدا- هەندێك دانراو چاپ بكەین، بۆ نمونە: بەرگی سێیەمی (سلسلة الأحاديث الضعيفة) و هەروەها چوارەمیش لەژێر چاپدایە، هەروەها بەرگی چوارەمی (سلسلة الأحاديث الصحيحة)ش لەژێر چاپدایە، جا سوپاس بۆ ئەو خوایەی كە بەهۆی نعیمەتەكانی ئەوەوە كارە چاكەكان بەجێ دێن.

وە بۆ ئەم چاپی دوەمی (تمام المنة) چەند تەواوكردنێك هەیە كە زۆر گرینگن، لە هەموشیان گرینگتر ئەوەیە كە هەندێك لەو «تعليق» انەی لام مابو پێم زیاد كردوە، كە ئەویش «تعليق»

کردنە لەسەر بەرگی سێهەم لەو بەرگە بچوکانەی کە یەکەم جار (فقه السنة) لەسەری چاپ کرابو کە ئەویش بە یەکەم بەشی زەکات دەست پێ ئەکات و بە ئاخری بەشی ڕۆژو کۆتایی پێ دێت، بەم زیاد کردنەش ئێمە «تعلیق» مان لەسەر چواریەکی (فقه السنة) داوە بە فەزڵی خوای گەورە.

ئومێدەوارم لە خوای بەرز و بەرێز کە هەمو «تعلیق» ەکە تەواو بکەم، ئەگەر خوا تەمەن دوا بخات و بەرەکەت بخاتە ناو کاتەوە، یان بەلایەنی کەمەوە ئەوەی کە ماوەتەوە لە حەدیسە زەعیف و «منکر» ەکانی لێ‌ی دەربهێنم، بۆ ئەوەی خوێنەرەکان ئاگادار بن بەسەریدا، هەروەها ئاگاداربن بەسەر بە نرخی ئەو مەسەلانەی کە لەسەری نوسراون، هەروەکو ئەو حەدیسەی کە لە بەشی یەکەمی «جنائز» دا هەیە لە دوای بەشی ڕۆژوەوە کە ئەمەیە: (اللَّهُمَّ إلَيكَ أشكُو ضَعفَ قُوَّتِي...) هتد.

چونکە ئەم حەدیسە هەرچەندە بەناوبانگە لەناو کتێبەکانی بەسەرهات و سیرەدا، بەڵام زەعیفە، جا هەر لەبەر ئەو بەناوبانگی‌یەی دانەر بە هەڵەدا چوە، جا من ئەم حەدیسەم تەخریج کردوەو لاوازی‌یەکەیشیم ڕون کردۆتەوە لە کتێبی تەخریجی (فقه السيرة)دا (ل١٣١) پاشان لە (الضعيفة) دا بە ژمارە (٢٩٣٣).

وە هەروەها حەدیسی :(العِلمُ ثلاثَةٌ، وَمَا سوى ذَلِكَ فَضلٌ: آيةٌ مُحكمةٌ، أو سُنَّةٌ قَائِمَةٌ، أو فَرِيضَةٌ عَادِلَةٌ)، دیسان ئەویش زەعیفە، لە (تخريج المشكاة ٢٣٩) دا ڕونم کردۆتەوە، هەروەها لە (الإرواء) دا بە ژمارە (١٦٦٤)، هەروەها لە (ضعيف أبي داود)دا بە ژمارە (٤٩٦)، کە لە دواترین بەشی (فقه السنة) دا هاتوە کە (فرائض)ە.

وە لەنێوان ئەم بەشەو بەشی «جنائز» دا چەند بەشێکی تر هەیە کە دەیان -ئەگەر نەڵێم سەدان- حەدیسی لاوازی تێدایە.

ڕەنگە نهێنی بڵاو کردنەوەش نەبێت ئەگەر ئەم بەسەرهاتە بگێڕمەوە:

یەکێك لە برا زانکۆیی‌یەکانمان ئەوەی پێشنیار کرد کە لە پێش چاپدا پێشەکی ئەم کتێبە لەگەڵ بەشی یەکەمیدا بنێرم بۆ (شيخ سيد سابق)، بۆ ئەوەی بێتە هاوکاری کردنێك لەگەڵی لەسەر چاکەو زانست و گەڕان بە شوێن ڕاستی‌یەکاندا.

منیش وەڵامی پێشنیارەكەیم دایەوەو پێشەكی‌یەكەی و بەشی یەكەمی كتێبەكەم نارد بۆ لای شیخ (سید سابق)وە زیاتر لە یەك ساڵ لەلای مایەوە ، پاشان لە ڕێگای یەكێك لە براكانمانەوە كە دانیشتوی قاهیرە بو بەشی یەكەمی بۆ ناردمەوە، بەڵام پێشەكی‌یەكەی بۆ نەناردمەوە! وە سوپاس بۆ خوا لەبەر ئیحتیات نوسخەیەكەم لەبەر گرتبۆوە پێش ئەوەی بۆی بنێرم.

بەشی یەكەمم بۆ هاتەوە بێ ئەوەی هیچ وەڵامێكم بۆ بێتەوە لە مامۆستای بەڕێزەوە كە ڕای خۆیم پێ بڵێت لەبارەی ئەو بەشەی بۆم ناردوەو لەبارەی پێشەكی‌یەكەیەوە.

هەر بۆیە دەستم كرد بە چاپ كردنی ئەو پێشەكی‌یە و بەشی یەكەم و دوەمی كتێبەكە لە ئەوەڵ فرسەتا كە بۆم ڕێ كەوت لەو ڕۆژەدا بە دەستگای كاتیبە نوسیمەوە لەپاشاندا بە ستانسل ڕام كێشا.

وە لە بەراورد كردنی هەندێك مەسەلە لە چاپە كۆنەكەی (فقه السنة) كە (تمام المنة)ی لەسەر نوسراوە لەگەڵ هەندێك لە چاپە تازەكانی بە تایبەت چاپی (دار الكتاب العربي) كە سێ بەرگە بۆم دەركەوت كە شێخ هیچ سودێكی وای لەم كتێبەم وەرنەگرتوە كە شایەنی باس كردن بێت، چ ئەو بەشەی كە خۆم بوم و چ ئەو بەشانەی كە دوایی لەگەڵ كتێبەكەدا چاپ كرا.

چونكە من سەرنجم داوە ئەو هەڵە حەدیسی و فیقهی‌یانە هەروەك خۆی ماونەتەوە بێ ئەوەی هیچ دەستكاری بكرێن یان چاك بكرێن، مەگەر لە هەندێك مەسەلەی زۆر كەمدا، جا نازانم لەبەر ئەوە بوە كە سەرنەپەرژاوە بیان خوێنێتەوە، یان لەبەر ئەوە بوە كە قەناعەتی بەو سەرنج و ڕەخنە زانستی‌یانە نەبو؟ لەوانەشە خاڵی یەكەم ڕێچوتر بێت، چونكە ئەم كتێبەی من قاعیدەی وای تێدایە كە پێویستە لەسەر هەمو زانایەك پابەند بێت پێوەی، وە هەروەها چەند مەسەلەو حەدیسی وەهای تێدایە كە پیاوی زانا ئەگەر توشیان ببێت هەر نەبێت هەڵوێستی خۆی بەرامبەریان ڕون بكاتەوە، جا چ ڕەخنە بێت یان پشتگیری، وە چ بە لاواز گێڕان بێت یان بە «صحیح» دانان بێت، لەو جێگایانەدا كە هەڵوێستی‌یان لەسەر ئەكرێ، هەروەك خوێنەران زۆر لەو مەسەلانە دەبینن

بەڵام ئەوەی كە ناهێڵێ ئەو وەگەرە تەئكید بكەم ئەوەیە كە بینیومە شێخ لە هەندێك شوێندا سودی لەم ڕەخنەیەی من وەرگرتوە، كە لە هەندێكیدا ئاگاداریم لەسەر داناوە، لە (لاپەڕەكانی٤٤و٦٢و١٠٤و١٣٧و١٤٥)دا، لەوانە هەڵوێستی شێخە بەرامبەر مەسەلەی دەست نوێژ گرتنەوە لە گۆشتی وشتر، چونكە لەو چاپەدا كە من «تعلیق» م لەسەر داوە، لەسەر پارسەنگ

کردنی ئیمام نەوەوی بۆ واجبێتی دەست نوێژ گرتنەوە لە خواردنی گۆشتی ووشتر، ئاڵۆزی‌یەکی وەهای هێناوە کە ئەوانەی لاوازن لە زانستدا و ئەوانەی تەقلیدی مەزهەبەکان ئەکەن پێی ئەگەڕێنەوە لە کارکردن بەو حەدیسە، جا بە شوێن قسەکەی نەوەویدا ووتویەتی:

بەڵام ئەوەندە هەیە کە ئەوترێت: حەدیسەکەی «جابر» و «براء» چۆن شاراوە بوە لەسەر خولەفای ڕاشیدین ... هتد.

جا من وەڵامێکی وەهام داوەتەوە کە ئەم ئاڵۆزی‌یە ناهێڵێ لە بنەڕەتا، هەروەك لە شوێنی خۆیدا ئەیبینی، وە ئەمە کاریگەری ئەوەی هەبو کە دانەر ملکەچ بو بۆ حەق —خوا پاداشتی خێری بداتەوە- وە ئەو ئاڵۆزی‌یەش کە ئیددعای کردبو لای برد، بەڵام ئاماژەی بۆ ئەوە نەکردوە کە کێ بۆتە هۆ بۆ ئەم کارە!

نمونەیەکی تریش هەیە، ئەویش ئەوەیە کە من ڕەخنەم لێ گرتوە کاتێك حەدیسی (أَحَبُّ الدِّينِ إلى اللهِ الحَنِيفِيَّةُ السَّمحة) ی بەزاراوەی (تمریض) هێناوە کە لاوازی حەدیسەکە ئەگەیەنێت، وە ڕونم کردۆتەوە کە ئەو حەدیسە (حسن لغیره)یە، و مولزەمیشم کردبو کە دان بەو قسەیەدا بنێت هەروەك لە (ل٣٨) دا ئەیبینیت، کەچی کاتێ ئەزانین ئەکەوێتە ناو هەڵەیەکی ترەوە کە لەم هەڵەی پێشو گەورەترە، ئەویش ئەوەیە حەدیسەکەی بە هی موسلیم داناوە، لە کاتێکدا ئەم حەدیسە ئەصلی نی‌یە لای موسلیم! بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە بەڵگەی ئەوەیە کە دانەر لەسەر ئەو ڕەخنەیەم وەستاوە لەو حەدیسەدا، و ویستویەتی ئەو هەڵوێستەی خۆی ڕاست بکاتەوە، ئیتر ئاوای لێ هات کە بینیت.

کورتیەکەی: من هیوام وابوو لە دانەر (خوا بیپارێزێ) وەڵامی ئەو خواستەم بداتەوە، و ئەو هیوایەم بەدی بهێنێت کە لە پێشەکی چاپی یەکەمدا نوسیبوم و پێشتر نیشانم دابو —وەك باس کرا- ئەویش ئەوەیە کە (چاو بەسەر ئەو نوسراوانەدا بخشێنێتەوە کە تا ئێستا نوسیویەتی، وە ئەو هەڵانەش ڕاست بکاتەوە کە بۆی دەرکەوتوەو پەلە نەکات لە دەرکردنی بەشەکانی تری کتێبەکە).

ئومێدی ئەوەم هەبو لێی بەڵام نائومێد بوم، وە کابراش بەردەوام بو لە دەرکردنی پاشماوەی کتێبەکە هەر بەو شێوە ڕەخنە لێ گیراوەی کە لە بەشەکانی یەکەمدا لەسەری ڕۆیشتبو، بەبێ ئەوەی پابەند بێ بەو قاعیدە زانستی‌یانە کە ناردبوم بۆی، وە بەبێ هیچ ڕاست کردنەوە یان گۆڕانکاری‌یەك لە مەنهەجەکەیدا.

زانستیش -هەروەك ناسراوە- لە پێشکەوتنێکی بەردەوامدایە کە مانای وەستان نازانێت، وە هەمو رۆژێك چاپخانەکان چەندین سەرچاوەی زانستی تازە دێننە دەرەوە کە لەمەوبەر نەزاندراوە، و ئەم کارە یارمەتی توێژەرەو لێکۆڵەرەکانی داوە کە دانراوەکانیان باشتر بکەن و پوختەتری بکەن *لەمەڵە*، و چەندین سودی تری پێ زیاد بکەن، وە چەندین لێکۆڵینەوە بکەن کە بۆ زۆر لە کەسانی تری پێش ئەوان نەرەخساوە!

جا لەبەر ئەوە کاتێك بینیم (فقه السنة) بەو شێوەیە وشکەو بە درێژایی چەندەها ساڵ هەر وا ماوەتەوە کە دانەر دایناوە پێش نزیکەی نیو سەدە، لەگەڵ ئەوەشدا کە چەندین جار چاپ کراوەتەوە، وام بە باش زانی چاو بخشێنمەوە بەسەر (تمام المنة في التعليق على فقه السنة) دا کە لەلام بوو، جا پوختەم کردەوەو وچەند مەسەلەیەك و چەند سودێکی زۆریشم لێ زیاد کرد، کە باسی گرینگترینیانم کردوە لە سەرەتای ئەم قسەیەدا، ئیتر ئەوانە هەمو بون بە هۆی ئەوەی لەبەرگە تازەکەیدا دوبارە چاپ ببێتەوەو لەناو خەڵکدا بڵاو ببێتەوە.

لە خوای گەورەو پاك و بێگەرد داواکارم ئەم دانراوەم و هەمو دانراوەکانی ترم بکات بە کردەوەیەکی چاك، و تەنها لەبەر ڕەزامەندی ئەو بێت و بەشی کەسی تری تێدا نەبێت جگە لەو.

وَسُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ أشهَدُ أن لا إلَهَ إلا أنتَ أستَغفِرُكَ وَأتُوبُ إلَيكَ.

عەمان / یەکی ڕەجەبی ساڵی (١٤٠٨) کۆچی.

محمد ناصر الدين الألباني

باوکی عبدالرحمن

## پێشەکی زانای پایەبەرز مامۆستا (محمد ناصر الدین الألباني) لە چاپی یەکەمدا

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

**پێشەکی چاپی یەکەم:**

**إنَّ الحَمدَ لله، نَحمَدُهُ، وَنَستَعِينُهُ، وَنَستَغفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللهِ مِن شُرُورِ أنفُسِنَا وَمِن سَيِّئَاتِ أعمَالِنَا، مَن يَهدِهِ اللهُ فَلَا مُضِلَّ لَهُ وَمَن يُضلِل فَلا هَادِيَ لَهُ، وَأشهَدُ أن لا إلَهَ إلا اللهُ وَحدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ وَأشهَدُ أنَّ مُحَمَّداً عَبدُهُ وَرَسُولُه.**

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾[١].

---

**(١) ئەمە (خطبة الحاجه) کە پێغەمبەر ﷺ فێری یارەکانی ئەکرد، و سەلەفیش ووتار و دەرس و کتێبەکانیان بەوە دەست پێ ئەکرد، وە لەو بارەیەوە نامیلکەیەکی زۆر جوانم هەیە کە ڕێگاکانی حەدیسەکەی و زاراوەکانیم تێدا کۆ کردۆتەوە، و چەند سودێکم تێدا باس کردوە کە لەگەڵ باسەکەدا یەك دێتەوە، جا لەم ماوەیەی پێشودا لەسەر ئەرکی (جمعية التمدن الإسلامي) لە دیمەشق چاپ کراوە، پاشان (المكتب الإسلامي) بۆ جاری دوەم چاپێکی جوانی کردۆتەوە، کە زیاد کراوو پوختەکراویشە.**

بەڕاستی کتێبی (فقه السنة)ی مامۆستا سید سابق باشترین کتێبە کە من بینیبێتم لەو بابەتەدا دانرابێت.

لە جوانی بەش بەش کردنی و ڕەوانی و شیرینی (أسلوب) دارشتنی، لەگەڵ دوری کردنی لە ووشەو ڕستەی ئاڵۆزو گران کە کەم کتێبی فیقهی هەیە تێیدا نەبێت.

جا ئەمە هانی گەنجە موسڵمانەکانی داوە ڕوی تێ بکەن و خۆیانی پێ شارەزا بکەن لە دینی خوادا، وە تاسۆی توێژینەوەی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ ی لەبەردەمیاندا کردەوەو هەڵی نان بۆ دەرهێنانی ئەوەی کە تیایەتی لەو گەنجینەو زانستانەی کە هەر موسڵمانێك خوای گەورە ویستبێتی چاکەی پێ بگەیەنێت لێی بێ‌نیاز نابێت.

هەروەك پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن يُرِدِ اللهُ بِهِ خَيراً يُفَقِّهْهُ فِي الدِّين) واتە: ئەگەر خوای گەورە بیەوێت سود بە کەسێك بگەیەنێت، لە دیندا شارەزای ئەکات، ئەم حەدیسە (متفق علیه)یە و لە (سلسلة الأحاديث الصحيحة) دا تەخریج کراوە بە ژمارە (١١٩٤).

وە دەرچونی ئەم کتێبە بەڕای من پێویستی‌یەکە لە پێویستی‌یەکانی ئەم سەردەمە، چونکە لەو کتێبەدا بۆ زۆرێك لە موسڵمانان دەرکەوتوە کە ڕزگاربونیان نی‌یە لە لادان و دوبەرەکی و هەرسهێنان و زاڵ بونی بێ‌باوەڕان و گومڕایان بەسەریانا، ئیللا بە گەڕانەوە نەبێت بۆ کتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ. بۆ ئەوەی تەنها لەو دوانە کاروباری دینەکەیان و پێویستی‌یەکانی فیقهەکەیان وەربگرن.

جا هەر بۆیە پێویست بو بۆ عامەی خەڵك سەرچاوەیەکیان هەبێت کە بە ئاسانی دەستیان پێی بگات و بتوانن پشتی پێ ببەستن و موراجەعەی بکەن لە کاتی پێویستدا.

وە ئەو سەرچاوەیە بە شێوەیەك بێت کە بێ‌نیازیان بکات لە موراجەعەی زۆر بۆ سەرچاوە بەرفراوانەکان تەنها لەبەر چەند مەسەلەیەك زۆر بن یان کەم.

ئیتر ئەوەبو خوای گەورە مامۆستا (سید سابق)ی ڕێنمونی کرد کە ئەم کتێبە بۆ خەڵك دەربکات، جا بەوە ڕێگای بۆ ڕوناك و نزیك کردنەوە، خوای گەورە پاداشتی بەخێری بداتەوە.

لەبەر ئەوە من لە زوەوە لەکاتی دەرچونی بەرگی یەکەمی لە قەوارە بچوکە کۆنەکەیدا و ئێستاش هانی هەمو ئەو کەسانەم داوە کە ئارەزومەندی سوننەتن و یارمەتیدەری حەقن کە ئەو کتێبەیان هەبێت و سود وەربگرن لەو سوننەت و حەقە کە تیایەتی.

تا وای لێ هات نوسخەکانی لەناو ڕیزی برا سەلەفی‌یەکانمان و جگە لەوانیش لە دیمەشق و شارەکانی تری وولاتی سوریاو جگە لەوێش بلاّو بۆوە. وە لە ئەنجامی ئەوەوە پرسیارێکی زۆر لەو برایانەمانەوە بەرەو ڕوی من کرایەوە لەبارەی چەندەها مەسەلە و حەدیس کە لەو کتێبەدا هاتون.

منیش بە گوێرەی ئەوەی کە ئەمزانی وەلاّمم ئەدانەوەو زۆر جاریش وەلاّمەکەی من پێچەوانەی ئەوە ئەبو کە لە کتێبەکەدا هاتوە، چونکە زۆر لە حەدیسەکانیم بە لاواز دائەنا و زۆر لە مەسەلەکانیم بە هەڵە دائەنا، جا کاتێك هەندێك لەو کەسانەی کە بە پەرۆشن بۆ شارەزا بون لە سوننەت و سورن لەسەر بلاّوبونەوەی لەنێوان ئوممەتی ئیسلامیدا بە شێوەیەکی ڕاست ئەمەیان بینی، پێشنیاری ئەوەیان کردم کە ئەو ڕەخنانەی هەمە لەسەر کتێبەکە بیان نوسم و لەنێوان خەڵکیدا بلاّویان بکەمەوە، جا لەسەرەتاوە بەهانەم هێنایەوە لەسەر ئەنجام دانی ئەو کارە، بەلاّم کاتێك ئەم داواکاری‌یە چەند جارە بۆوە لە لایەن چەندین کەسی ترەوە جەخت کرا لەسەری، پێم وابو کە هەر ئەبێت داواکاری‌یەکەیان بەجێ بهێنم و ئاواتەکەیان بهێنمە دی، لەبەر ئەوەی ئەم کارە خزمەتێکە بۆ کتێبەکە ، بەڵکو هەر خودی ئەو بۆ چونەیە کە دانەر بانگەوازی خەڵکی بۆ کردوە ئەویش: (کۆکردنەوەیانە لەسەر کیتاب و سوننەت و لەناوبردنی ناکۆکی و بیدعەی دەمارگیری مەزهەبی‌یە...) ، وەکو خۆی لە پێشەکی کتێبەکەیدا دانی پەمەدا ناوە.

زیاد لەسەر ئەوەش ئەوکارە پوختە کردنی کتێبەکەیە لەو هەڵە فیقهی‌یانەی کە تیایەتی، هەروەها لەو حەدیسە زەعیفانەی کە بونیان لەو کتێبەدا دژایەتی‌یە لەگەڵ (فقه السنة)دا.

بەم کارەشم هەندێك لەو ئارەزوە بەدی دێت کە یەکێك لە براکانمان بۆ هەردو لامانی دەرخستبو کاتێك چوبو بۆ میسر، کە ئەویش هاوکاری کردنە لە نزیکەوە لە پێناوی ئەو بیرو بۆچونەی باس کرا، بەلاّم چەند هۆیەك بو بە ڕێگری ئەوەی ئەو هاوکاری‌یە بکرێت، گرینگترینیان: دوری شوێن، و گرانی بە یەك گەیشتن بو، جا کاتێك ئەوەم لەدەست چو، لەوەدا کەمتەرخەمی ناکەم کە لە دورەوە هاوکاری بکەم، چونکە هەروەك ووتراوە: (ما لا يدرك كله لا يترك جُلُّه) واتە: ئەوەی کە دەست بە هەموی ناگات بە یەکجاری وازی لێ ناهێنرێت.

ئیتر کاتێك خوای گەورە سینەمی بۆ ئەو کارە فراوان کرد و دڵنیا بوم پێی، دەستم کرد بە خوێندنەوەی ئەوە بەشانەی کە دەرچوبون لە کتێبەکە، بە شێوەیەکی ورد و بیرکردنەوەوە.

وە هەرکاتێك شتێکم بۆ دەربکەوتایە کە شایەنی باس و ئاگادار کردنەوە بێت لەسەری لای خۆم لە چەند کاغەزێکدا ئەم نوسی و تەعلیقم لەسەر ئەدا.

وە هەر ئەوەندە کە تەواو بوم لە تەعلیق دانەکەم لەسەری، پێویستی ئەو کارەم بۆ دەرکەوت، چونکە لە دوای ئەو لێکۆڵینەوەیە چەند هەڵەیەکی زۆرم بۆ دەرکەوت کە هەندێکیان زۆر گرینگن و

بە بیرمدا نەدەهات کە لەو کتێبەدا هەبن، جا لەبەر ئەوە پێم وابو کە پێویستە ڕون بکرێنەوە، وە خوای گەورەش یارمەتی دام بۆ ئەو کارە، و سوپاس و ستایش هەر بۆ ئەو.

لەوانەیە کە بەسود بێت ئەگەر باسی جۆری ئەو هەڵانە بکەم بەشێوەیەکی کورت، بۆئەوەی خوێنەر بە شێوەیەکی گشتی لێی تێ بگات و گرینگی ئەو ڕەخنانەی بۆ دەربکەوێت، جا دەڵێم:

تەقریبەن ئەکرێت ئەو هەڵانە کۆ بکرێنەوە بەم جۆرەی خوارەوە:

١- چەند حەدیسێکی زۆر هەیە کە دانەر بێ دەنگەی لەسەر کردون کەچی لاوازیشن.

٢- چەند حەدیسێکی تر هەیە کە بە (قوي) داناون، بەڵام ئەگەر لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکرێت (قوي) نین بەڵکو (واهي)ن.

٣- چەند حەدیسێکی بە لاواز داناون، کەچی «صحیح»ن، یان چەند سەنەدێکی تریانْ هەیە کە «صحیح»ە.

٤- چەند حەدیسێکی تر هەیە کە دانەر ئەیانگێڕێتەوە بۆ جگە لە «صحیحین» (واتە: بوخاری و موسلیم) بەڵام ئەو حەدیسانە یان لە هەردوکیاندا هەیە یان لە یەکێکیاندا.

٥- چەند حەدیسێك هەیە کە ئەیانگێڕێتەوە بۆ یەکێك لە «صحیحین» و جگە لە «صحیحین» یش کەچی ئەسڵێکیان نی‌یە لەو دوانەدا.

٦- چەند حەدیسێك دێنێت کە هەر نین لە کتێبەکانی «سنة» دا.

٧- حەدیسێك دێنێت لەرێگای «صحابی»یەکەوە کە ناوی ئەبات بە ریوایەتی کۆمەڵێك لە زانایانی حەدیس، بەڵام ئەو حەدیسە لای هەندێکیان لە ڕێگای «صحابی» یەکی ترەوەیە، یان زیاتر.

٨- حەدیس ئەداتە پاڵ ئەوکەسەی کە تەخریجی کردوەو بێ دەنگ نەبێ لەسەری، لەگەڵ ئەوەشدا تەخریج کەری حەدیسەکە دوای تەخریج شتێکی هێناوە کە «صحة» ی حەدیسەکەی عەیبدار کردوە.

٩- لە مەسەلەکانیدا شوێن بەڵگە نەکەوتوە، چونکە زۆر جار مەسەلەیەك باس ئەکات و بەڵگەیەکیشی نی‌یە کە پاڵپشتی بکات، وە هەندێك جاریش «قیاس» ی بۆ ئەکات بە بەڵگە، لەگەڵ ئەوەشدا حەدیسێکی «صحیح» ی لەبارەوە هاتوە، وە هەندێك جاریش بە «عموم» بەڵگە ئەهێنێتەوە لەگەڵ ئەوەشدا کە بەڵگەیەکی «خاص» هەیە لەبارەیەوە.

١٠- نەگەیشتن بەوپەڕی مەسەلەکانی (فصل) هەروەکو (الأغسال المستحبة) و وێنەی ئەو.

١١- لە یەك مەسەلەدا چەندین ڕاو بۆچونی هێناوە کە بەرهەڵستی یەکتر ئەکەن بەبێ ئەوەی یەکێکیان پەسەند بکات.

١٢- دودڵی کردنی لە هەندێك مەسەلە لە یەك جێگادا، جا ڕایەك هەڵدەبژێرێت لە ئەوەڵی باسەکەدا، بەڵام لە کۆتایی باسەکەدا هەڵی ئەوەشێنێتەوە.

١٣- لەو ڕاو بۆچونانەدا کە بەرهەڵستی یەکتر ئەکەن ڕایەك پارسەنگ ئەداتەوە کە شایەنی پارسەنگ دانەوە نی‌یە، لەبەر لاوازی بەڵگەکەی، و بەهێزی بەڵگەی بەرامبەرەکەی.

١٤- موخالەفە کردنی بۆ حەدیسی (صحیح) لە چەندین شوێندا، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو حەدیسە هیچ حەدیسێکی تر (معارض) ی نی‌یە.

ئەم جۆرەشیان ناشیرینترینیانە کە دانەر تێی کەوتوە، چونکە لە هیچ شتێکدا نایەتەوە لەگەڵ ڕێنمایی‌یەکەی دانەر بۆ خەڵکی کە دەست بە سوننەتەوە بگرن. بە تایبەتی کە زانیت لەو موخالەفە کردنەیا بەهانەی دانەر لەو جیاوازی کردنەدا تەنها ئەوەیە کە جومهور لە هەندێك مەسەلەدا کاریان بەو حەدیسە نەکردوە، یان دانەر نەیزانیوە کە کەسانێکی تر لە مەسەلەیەکی تردا کاریان پێ کردووە، جا ئەمەیە (شبهة) گومان و سەرلێ‌تێکچونی ئەوکەسانەی کە تەقلید ئەکەن و ڕەددی سوننەتەکان ئەدەنەوەو بەرامبەریان ئەوەستن، وە لەمەودوا قسەی ئیمام شافیعی دێت کە ئەم شوبهەیە پوچەڵ ئەکاتەوەو ڕەگ و بێخی دەرئەهێنێت، خوای گەورە پاداشتی خێری بداتەوە.

لەوانەیە باش بێت باسی ئەوە بکەم کە من نامەوێ بە ڕەخنە گرتنەکەم لەسەر ئەم کتێبەو دەرخستنی هەڵەکانی شتێك لە نرخی کتێبەکە دابەزێنم، یان لە حەقی کەم بکەمەوە، بەڵکو تەنها ئەمەوێ حەق بە حەق سەربخەم، وە (فقه السنة) بپارێزم لە هەڵە ئەوەندەی کە بکرێ، چونکە ئەوە زیاتر هۆیە بۆ ئەوەی خەڵك ڕوی تێ بکەن و سودی لێ وەربگرن، وە هەروەها شیاوترە بۆ بڕینی زمانی دوژمنانی ئەم بیرو بۆچونە، لەوەی کە قسەی لەبارەوە بکەن، بە حەق یان بە باتڵ، بەڵکو دانەر –خوا زیاتر شارەزای بکات- چارێك بخشێنێتەوە بەوەدا کە تا ئێستا نوسیویەتی‌یەوەو ئەو هەڵانە ڕاست بکاتەوە کە بۆی ڕون بۆتەوەو پەلە نەکات لە دەرکردنی بەشەکانی تری ئەم کتێبە، تاوەکو بۆی ڕون ئەبێتەوە کە ڕاست و بێ هەڵەیە، وە هەروەها حەدیسە زەعیفەکانیشی تێدا نەهێڵێت، چونکە ئەوەندە حەدیسی صەحیح هەیە کە بێ‌نیاز بین لە حەدیسی زەعیف.

ئەمە ئەو، وە من کاتێك دەستم کرد بە تەعلیق دان لەسەر کتێبەکە لە چۆنیەتی هێنانی قسەی دانەردا دو دڵ بوم، ئایا هەمو قسەکەی باس بکەم، یا زۆربەی باس بکەم کە قسەکە ئەگەیەنێ، یان تەنها سەرەتاکەی باس بکەم کە ئاماژە بۆ کۆتایی‌یەکەی ئەکات هەروەك باوە لە تەعلیق دان لەسەر کتێب؟

تا لە دواییدا شێوازی یەکەمم وەرگرت. ئەو شێوازەش هەرچەندە هەندێك دوپات کردنەوەی تێدایە بە نیسبەت ئەوکەسەی کە ئەسڵی کتێبەکەی لا هەیە (فقه السنة)، بەڵام سودمەندتر و ئاشکراترە بۆ ئەوکەسەی ئەسڵەکەی لا نییە، چونکە ئەتوانێت هەم لەو قسەیە تێ بگات کە نەقدی لەسەر کراوە, و هەم لە حەدیسە لاوازکراوەکەو وێنەی ئەوانەش، بەبێ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ ئەسڵەکە، وە ناویشم نا: (تَمَامُ المِنَّةِ فِي التَّعْلِيْقِ على فِقْهِ السُّنَّة) لە خوای گەورە داواکارم کە ئەم کارەم تەنها لەبەر ڕەزامەندی ئەو بێت، و سودێکی گشتی بگەیەنێت، چونکە بەڕاستی خوای گەورە بیسەری دوعایەو وەڵام دەرەوەیە.

## پێشەکی‌یەکی زانستی گرینگ:

پێش ئەوەی دەست بکەم بە مەبەستەکە پێویستە لەمیانەی ئەوەدا هەندێك لەو قاعیدە بنەڕەتی‌یانە باس بکەم کە هەرکەسێك شارەزا بون لە سوننەتی بەلاوە گرینگ بێت لێیان بێ‌نیاز نابێت، بەتایبەت کە شێوازی (تألیف) وا پێویست ئەکات. وە بۆ ئەوەی بتوانین بۆیان بگەڕێینەوە کاتێك کە بۆنەیان هات.

بەمەش بۆ خۆم و بۆ خوێنەرەکان وەختێك ئەگێڕمەوە کە کەم نی‌یە، وە خۆمان لە زۆرێك دوپات کردنەوە لائەدەین کە پێویست نی‌یە هەروەکو خوێنەری بەڕێز دەیبینێ.

## قاعیدەی یەکەم

### ڕەد کردنەوەی حەدیسی (شاذ)

بزانە کە یەکێك لە مەرجەکانی حەدیسی (صحیح) ئەوەیە کە (شاذ) نەبێت، چونکە پێناسە کردنی حەدیسی (صحیح) لای زانایانی حەدیس بەم شێوەیە:

ئەو حەدیسە خاوەن سەنەدەیە کە سەنەدەکەی (متصل) نەپچڕاوە و بە گێڕانەوەی کەسێکی عادلی (ضابط) بەهۆش لە کەسێکی عادلی بەهۆشەوە تا ئەگات بە کۆتایی‌یەکەی.

وە مەرجە کە ئەو حەدیسە نە (شاذ) بێت و نە (معلل) عیللەتدار بێت، جا لەم سیفەتانەدا کە باس کرا خۆ پاراستنی تێدایە لە حەدیسی (مرسل) (واتە: ئاخری ئیسنادەکەی کەوتبێت)، وە لە حەدیسی (منقطع) (واتە: سەنەدەکەی پچڕانی تێدا بێت) و لە (شاذ) (واتە: نامۆ)، هەروەها لەو حەدیسەی کە عیللەتێکی وەهای تێدا بێت لە بنەڕەتەکەی بدات، لەو حەدیسانەی کە لە ڕیوایەتەکەیاندا جۆرێك عەیبی تێدایە.

حەدیسی (شاذ)یش ئەوەیە کەسێکی سیقەی قەبوڵ کراو ڕیوایەتی بکات و پێچەوانەی ئەوکەسە بێت کە لەو باشترە، بەپێی ئەوەی زانایانی حەدیس پشتی پێ ئەبەستن.

(ابن الصلاح) لە (المقدمة)دا (ل٨٦) ئەوەی ڕون کردۆتەوەو فەرمویەتی: ئەگەر (راوي) (واتە: گێڕەرەوەی حەدیس) بە تەنها شتێکی ڕیوایەت کرد سەیری ئەکرێت، جا ئەگەر ئەوەی کە بە تەنیا هێناویەتی پێچەوانەی ئەوە بو کە کەسێکی باشتر لەو لە لایەن (حفظ و ضبط)ەوە هێناویەتی، ئەوە ئەوەی کە ئەوکەسە بە تەنیا هێناویەتی بە (شاذ) و ڕەد کراوە دائەنرێت.

وە ئەگەر پێچەوانەی ئەوە نەبو کە کەسێکی تر جگە لەو هێناویەتی بەڵکو هەر ئەو بەتەنیا هێنابوی و کەسی تریش نەیهێنابو، ئەوە سەیری ئەو (راوي) یە تەنیایە ئەکرێت، جا ئەگەر دادوەرو (حافظ) بو وە سیقە بە لەبەرکردن و هۆشیاری‌یەکەی کرا لەو شتانەدا کە هێناویەتی، ئەوە ئەو بەتەنیا هێنانەی لێ قبول ئەکرێت، و تەنهایی‌یەکەی عەیبداری ناکات، وە ئەگەر ئەو (راوي)یە لەو کسانە نەبو کە سیقە بە لەبەرکردن و هۆشیاری‌یەکەی بکرێت لەو حەدیسەدا کە هێناویەتی، ئەوە بەتەنیا هێنانەکەی لای ئەدا و دوری ئەخاتەوە لە جێگەی (صحیح).

پاشان ئەو (راوي) یە بەتەنهایە ئەگەڕێت لەنێوان چەند پلەیەکی جیاوازدا بەپێی حاڵەتی، جا ئەگەر دور نەبو لە پلەی (حافظ)ی (ضابط) کە تەنهایی‌یەکەی قەبوڵ کراوە، ئەوە حەدیسەکەی بە حەسەن دا ئەنێین و نایخەینە ڕیزی حەدیسی زەعیفەوە.

بەڵام ئەگەر لە پلەی ئەو (حافظ)ە دور بو، ئەوە ئەوەی کە بە تەنیا هێناویەتی ڕەدی ئەکەینەوە و لە ڕیزی حەدیسی (شاذ) ی (منكر) دا ئەبێت...

(شاذ) یەتیش لە سەنەددا ئەبێت و لە مەتنیشدا وە بۆ هەریەك لەمانە نمونەی زۆر هەیە کە لەمەودوا لەسەر هەندێکیان ئاگادار کردنەوە دێت لە جێی خۆیاندا (إن شاء الله تعالى).

## قاعیدەی دوەم

## ڕەد کردنەوەی حەدیسی (مضطرب) –واتە: تێکەڵ و پێکەڵ–

لەوەی کە کەمێ لەمەوبەر ڕابورد زاندرا کە مەرجی حەدیسی صەحیح ئەوەیە کە عیللەتی تێدا نەبێت، جا بزانە یەکێك لە عیللەتی حەدیس (إضطراب)ە.

وە لە پێناسەی حەدیسی (مضطرب) دا وتویانە:

ئەو حەدیسەیە کە گێڕانەوەکەی جیاوازی تێدایە، چونکە هەندێکیان بە شێوەیەك ڕیوایەتی ئەکەن و هەندەکەی تریان بە شێوەیەکی تر کە جیاوازە لەگەڵ ئەودا، کاتێکیش ناوی ئەنێین (مضطرب) کە پلەی دو ڕیوایەتەکە یەکسان بن، بەڵام ئەگەر یەکێکیان بەهێزتر بوو، بە شێوەیەك

کە ریوایەتەکەی تر بەرامبەری نەبو، بەوەی کە ئەو (راوی) یە (حافظ) تر بو یان زۆرتر هاوڕێیەتی ئەو کەسەی کردبو کە ریوایەتەکەی لێوە وەرگرتوە، یان بە هەر شێوەیەکی تر بو لە شێوەکانی (ترجیح) (بەهێز بون) کە پشتی پێ ئەبەسترێ، ئەوە حوکم کردن بۆ ئەو ڕیوایەتەیانە کە (راجح) بەهێزترە، وە ناوی (مضطرب)ی بەسەردا نادرێ و حوکمی ئەویشی نییە.

پاشان ڕێ ئەکەوێت (إضطراب) لە مەتنی حەدیسدا ئەبێت، وە ڕێ ئەکەوێت لە ئیسنادەکەیدا ئەبێت، وە جاری وا هەیە لە یەك (راوی) دا ئەبێت، و جاری واش هەیە لە کۆمەڵێك (راوی) ئەو حەدیسەدا ئەبێت، وە (إضطراب) یش هۆیە بۆ لاواز کردنی حەدیس، چونکە هەستی ئەوەی لێ ئەکرێ کە چاك لەبەر نەکراوە.

پاشان (ابن الصلاح) نمونەیەکی بۆ ئەوە باس کردوە، ئەویش حەدیسی خەتەکەیە کە دانەر بە بەهێزی داناوە، جا ڕەدی ئەو قسەیەش لە بەشی سوترەدا دێت (إن شاء الله).

## قاعیدەی سێیەم
## ڕەد کردنەوەی حەدیسی (مُدَلِّس)

(تدلیس) (واتە شاردنەوەو فێڵ کردن) سێ جۆرە:

١- (تدلیس الإسناد): ئەویش ئەوەیە کەسێك حەدیسێك بگێڕێتەوە لە کەسێکەوە کە بینیویەتی بەڵام ئەو حەدیسەی لێوە نەبیستوە کە چی وا دەربخات لەوەوە بیستویەتی، وە ڕێ ئەکەوێ لەنێوانیانا نەفەرێك یان دو نەفەر هەیە، جا عادەتەن ئەو ڕاوییەی ئەوکارە ئەکات ناڵێت: (أخبرنا فلان) هەروەها ناڵێت: (حدثنا) -واتە: بۆی باس کردین- و وێنەی ئەوە، بەڵکو ئەڵێت: فلان کەس وتی، یان لە فڵان کەسەوە..، و ئەو جۆرە قسانە کەوا نیشان ئەدات لێوەی بیستبێت.

٢- (تدلیس الشیوخ): ئەویش ئەوەیە کەسێك لە شێخێکەوە حەدیسێك ببیستێت و ریوایەتی بکات جا ناوی ئەبات بە ناوێك یان بە (کنیة) یێك یان باسی بنەماڵەکەی ئەکات، یان بە شتێك وەسفی ئەکات کە بەوە ناناسرێت، ئەمەش بۆیە ئەکات تا نەناسرێتەوە.

٣- (تدلیس التسویة) : ئەوەیە کە ئەو (مدلس)ە حەدیسێك لە شێخێکی سیقەوە ئەبیستێت، کە ئەو شێخە سیقەیەش لە شێخێکی زەعیفەوە بیستویەتی، ئەو شێخە زەعیفەش لە شێخێکی سیقەوە، جا ئەو (مدلس)ەی کە حەدیسەکەی لە سیقەی ئەووەڵەوە بیستوە بە قەست ئەو شێخە زەعیفە لەنێوان ئەو دو شێخە سیقەیەدا لائەبات و ریوایەتەکە ڕاستەوخۆ ئەکات لە شێخە سیقەکەی یەکەمەوە بۆ شێخە سیقەکەی تریان، بەڵام بە ووشەیەك ئەیهێنێت کە ئیحتیمالی تێدا بێت، وەك ئەوەی بە (عنعنة) و شتی وا باسی بکات. ئیتر ئیسنادەکە هەمووی سیقە دەرئەچێت، وە ئەو

(مدلس)ەش بە صەراحەت باسی پەیوەندی نێوان خۆی و شێخەکەی باس ئەکات، چونکە بۆ خۆی لەو شێخە سیقەیەوە بیستویەتی، ئیتر ئەوکاتە هیچی وا لە ئیسنادەکەیدا دەرناکەوێت کە قەبوڵ نەکرێت و ڕەد بکرێتەوە، مەگەر بۆ ئەوکەسانەی کە ئەهلی نەقدن و شارەزان لە عیللەتەکانی حەدیس، جا لەبەر ئەوە خراپترین جۆرەکانی (تدلیس) ئەم جۆرەیە، پاشان یەکەم پاشان دوەم.

حوکمی ئەو کەسەش کە (تدلیس)ی لێوە سابت بوە، ئەگەر عادل بو، ئەوە ریوایەتی لێوە وەرناگیرێ مەگەر ئەو ریوایەتانەی کە بە صەراحەت بڵێت (حدثنا)، وە هەندێك لە زانایان بە هیچ شێوەیەك حەدیسی لێ وەرناگرن، وە ڕای ڕاستر یەکەمە هەروەك (حافظ) ئیبنوحەجەر ووتویەتی، وە زانایان ڕون کردنەوەیان هەیە لەوبارەوە جا هەرکەس پێی خۆش بوو با بگەرێتەوە بۆ کتێبەکانی (مصطلح الحدیث).

## قاعیدەی چوارەم

## ڕەد کردنەوەی حەدیسی (مجهول)

(خطیب) لە (الکفایة) دا (ل٨٨) فەرمویەتی:

(مجهول) لای زانایانی حەدیس بە هەموو ئەو کەسانە ئەوترێت کە بۆخۆیان نەناسراون بە فێربونی زانست و زانایانیش بەوە نەیان ناسیون، وە هەروەها بەو کەسەش ئەوترێت کە حەدیسەکەی ناسراو نی‌یە تەنها لە لایەنی یەك (راوی) یەوە نەبێت.

کەمترین شتیش کە (جهالة) ی پێ لابچێت ئەوەیە کە دوو نەفەرو بەرەوژورتر لەو پیاوەوە ریوایەتیان کردبێت و لەو کەسانە بن کە بە زانست ناوبانگیان دەرکردوە.

منیش ئەڵێم: بەڵام ئەو پیاوە حوکمی عەدالەتی بۆ سابت نابێت بەوەی کە ئەو دو نەفەرە ناسراوە ریوایەتیان لێوە کردوە، کۆمەڵێکیش ئیددعای ئەوەیان کردوە کە عەدالەتەکەی بەوە سابت نەبێت.

پاشان (خطیب) باسی خراپی ئەو قسەیەیان ئەکات لە باسێکی تایبەتیدا، جا هەرکەس پێی خۆش بو با بگەرێتەوە بۆی.

منیش دەڵێم: ئەو مەجهولەی کە تەنها یەك کەس ریوایەتی لێوە ئەکات ئەوە ناسراوە بە (مجهول العین) و ئەو (جهالة)ش لائەچێت بە ریوایەت کردنی دوان و زیاتر لێیەوە.

وە هەروەها (مجهول الحال) و (مستور)ە. وە جەماعەتێك ریوایەتی ئەو مەجهولەیان قەبوڵ کردوە بەبێ مەرج.

بەڵام جومهوری زانایان ڕەدیان کردۆتەوە وەك لە (شرح النخبة) (ل٢٤) دا ئەڵێت:

ئەوەی کە لێکۆڵینەوەی لەسەر کرابێت ئەوەیە کە ریوایەت کردنی (مستور) ئەو کەسەی حاڵی شاراوەیەو ئەوەی وەك ئەو وایە لەو ریوایەتانەی کە ئیحتیمالی تێدایە، ئەوە بە موتڵەقی حوکم بە ڕەد کردنەوەی یان بە قبوڵ کردنی نادرێت، بەڵکو ئەوترێت: ئەوەستێندرێ ڕائەگیەدرێ هەتا حاڵی ڕون ئەبێتەوە، هەروەك ئیمامی تەنکیدی کردوە.

منیش دەڵێم: کاتێك حاڵی بۆ ئێمە ڕون ئەبێتەوە کە ئیمامێکی (مُعْتَمَد) پشت پێ بەستراو بە سیقەی دابنێت.

وەك بلێی (حافظ)یش ئاماژەی بۆ ئەوە کردوە کە فەرمویەتی: (مجهول الحال) ئەو کەسەیە کە دوان و بەرەژورتر ریوایەتیان لێوە کردبێت وە بە سیقەش دانەنرابێت.

بۆیە دەڵێم : (ئیمامێکی (معتمد) لە بە سیقە دانانەکەیدا) لەبەر ئەوەی هەندێك (محدث) هەن کە پشت بە (توثیق) کردنەکەیان نابەسترێت، چونکە خۆیان لە جومهور جیا کردۆتەوەو مەجهولیان بە سیقە داناوە، لەوانە ئیبنوحیببانە کە لە قاعیدەی دواییدا باسم کردوە.

بەڵێ ئەکرێت ڕیوایەتی ئەو مەجهولە وەربگیرێت بە مەرجێك کۆمەڵێك سیقە لێوەی ڕیوایەت بکەن و لە حەدیسەکەشدا شتێکی وا دەرنەکەوێت کە ئینکاری لێ بکرێت، وە زانایانی دوایینە لە (حفاظ) کاریان بەوە کردوە، وەکو (ابن کثیر) و (عراقی) و (عسقلانی) و جگە لەوان، وە سەیری هەندێك نمونەش بکە لەم لاپەڕانەدا: (٢٠٤-٢٠٧).

## قاعیدەی پێنجەم

## پشت نەبەستن بە (توثیق) ی ئیبنوحیببان

لەوەوە کە کەمێك لەمەوپێش ڕابورد زانیت کە مەجهول بە هەردو جۆرەکەیەوە لای جومهوری زانایان حەدیسی لێ قبوڵ ناکرێت، بەڵام ئیبنوحیببان لەو زانایانە خۆی جیا کردۆتەوە و حەدیسی مەجهولی قبوڵ کردوە، وە بە بەڵگەی داناوەو لە (صحیح)ەکەیدا هێناویەتی.

(حافظ) ئیبنوحەجەر لە (لسان المیزان) دا ووتویەتی:

ئیبنوحیببان ئەڵێت: هەرکەس حەدیسەکەی (منکر) بوو لەبەر کەمی (راوی)یەکەی ئەوە دروست نی‌یە بە عادل دابنرێت مەگەر دوای ئەوەی هەڵبسەنگێندرێت، وە ئەگەر لەو کەسانە بو کە حەدیسی مونکەر ڕیوایەت ئەکات بەڵام لەگەڵ ڕاوی‌یە سیقەکاندا یەك هاتەوە لە (أخبار) دا، ئەوە بە عادل دائەنرێت و ریوایەتەکەی وەرئەگیرێت. چونکە خەڵکی قسەکانیان بە باش و دادوەرانە دائەنرێت تاوەکو شتێکی وایان لێوە دەرئەکەوێت کە ئەبێتە هۆی عەیبدارکردنی (ئەو کاتە عیللەت دار ئەبێت بەهۆی ئەو عیللەتەوە کە لێی دەرکەوتوە) ئەمە حوکمی ئەو (راوی)انەیە کە

بەناوبانگن، بەڵام ئەو کەسانەی نەناسراون و تەنها ئەو کەسانە ریوایەتیان لێوە کردون کە پلەیان لاوازە، ئەوانە لە هەمو حاڵەتەکانا تەرك ئەکرێن. (الضعفاء ٢/١٩٢-١٩٣) وە زیادەکەش لە تەرجەمەی (عائذ الله المُجاشِعي)یەوە هاتوە.

پاشان (حافظ) دەفەرموێت:

ئەوەی کە ئیبنوحیببان بۆی چوە لەوەدا کە (ئەگەر کەسێك (جهالة العين) ی تێدا نەما، بە (عادل) دائەنرێت هەتاوەکو عەیبێکی لێوە دەرئەکەوێت)، بۆچونێکی سەیرە، و جومهوری زانایان پێچەوانەی ئەوەن، وە ئەمە بۆچونی ئیبنوحیببانە لە (كتاب الثقات) دا کە دایناوە، چونکە باسی کۆمەڵێك ئەکات کە ئەبو حاتەم و جگە لەو دانیان بەوەدا ناوە کە مەجهولن، وە دەڵێ‌ی لای ئیبنو حیببان (جهالة العين) بە ریوایەت کردنی یەك کەسی مەشهور لائەچێت، ئەمەش مەزهەبی مامۆستاکەیەتی کە ئیبنوخوزەیمەیە، بەڵام جەهالەتی حاڵی ئەو (مجهول العين)ە لای کەسانی تر هەروا دەمێنێتەوە. (قسەکەی حافظ تەواو بوو).

وە ئەوەی سەرسوڕهێنەرە لە ئیبنو حیبباندا ئەوەیە کە لەو کتێبەدا کە باس کرا بەپێ‌ی ئەو قاعیدە بێ‌هێزە کۆمەڵێك باس ئەکات و لە ژیاننامەکەشیاندا دان بەوەدا ئەنێت (کە نە خۆیان ئەناسێت و نە باوکیان)!

ئەوتا لە (طبقة)ی سێ‌یەمدا ئەڵێت: (سهل)، ریوایەت ئەکات لە شەددادی کوڕی هادەوە، وە ئەبو یەعفور لە سەهلەوە ریوایەتی کردوە، جا من (نە سەهل ئەناسم و نە ئەزانم باوکی کێ‌یە).

وە هەرکەسیش حەزی لە نمونەی زیاترە با بگەڕێتەوە بۆ (الصارم المُنكِي) (ل٩٢-٩٣).

جا لەدوای ئەوەی ئەو نمونانەی باس کردوە ووتویەتی:

ئیبنو حیببان لەو کتێبەیدا چەند کەسێکی زۆری لەو جۆرە باس کردوە، شێوازەکەشی لەوەدا ئەوەیە کە هەرکەسێك (جرح) ی لێ نەزانیبێت باسی ئەکات، با ئەو کەسە مەجهولیش بێت و حاڵی نەزاندرێ.

جا پێویستە ئاگاداری لەسەر ئەوە بکرێت و بزاندرێت کە بە سیقەدانانی ئیبنوحیببان بۆ کەسێك تەنها لەبەر ئەوەی لەم کتێبەدا باسی کردوە لە نزمترین پلەکانی بە سیقە دائەنا.

هەر لەبەر ئەوە ئەبینین زانایانی لێکۆڵەرەوەی (حديث) هەروەك (ذهبـي) و (عسقلاني) و جگە لەوان کەسانێك بە سیقە نازانن کە تەنها ئیبنوحیببان بە سیقەی داناون و مەجهولن، وە لەمەودوا نمونەی زۆر دێت لەسەر ئەوە لەکاتی قسەکردن لەو حەدیسە زەعیفانەی کە دانەر —یان ئەوکەسەی

لێوەی نەقڵ کردوە- پیاوەکانی بە سیقە داناوە لەگەڵ ئەوەشدا کە لەو حەدیسانەدا مەجهولی وایان تیایە کە تەنها ئیبنوحیببان بە سیقەی داناوە.

وە ئەوەی کە پێویستە ئاگاداری لەسەر بکرێتەوە ئەوەیە کە:

قسەی (ابن عبدالهادي) دانەری (الصارم المنكي) کە ووتویەتی: (با ئەوکەسەی کە ئیبنوحیببان بە سیقەی داناوە مەجهولیش بێت و حاڵی نەناسراو بێت) قسەیەکی ورد نیە، چونکە ئەو قسەیە ئەوەی کە لە پێچەوانەکەیەوە بزاندرێت ئەوەیە کە شێوازی ئیبنوحیببان لە باوەڕ پێکراوەکانیدا ئەوەیە ئەوکەسەی (مجهول العين) بێت باسی ناکات، ئەم قسەیەش وا نیە، بەپێی ئەوەی کە لەبارەی سەهلەوە ووتویەتی: (نە ئەیناسم و نە ئەزانم باوکی کێیە) وێنەی ئەوەش بەم نزیکانە دێت.

وە هەروەها قسەکەی (حافظ) کە ئەڵێت: (جهالة العين) بە ریوایەتی یەکێکی مەشهور لائەچێت، وا نیشان ئەدات کە ئیبنوحیببان تەنها کەسێك بە سیقە دائەنێت کە کەسێکی بەناوبانگ ریوایەتی لێوە بکا، چونکە ئەگەر مەبەستی بە سیقە ئەوەبێت کە بەناوبانگ بێت. وەکو لێوەی دەرئەکەوێت، ئەوە پێچەوانەی ئەوەیە کە لە سیقە پێکراوەکانیدا بەدی ئەکرێت، وە ئەگەر مەبەستی جگە لەوەش بێت ئەوە نرخێکی نیە، چونکە ئەوکەسە کە ریوایەتەکەی لێوە ئەکرێت یان زەعیفە یان مەجهولە، وە هەریەك لەو دوانەش راوییان هەیە لە کتێبی (الثقات)دا، ئەمەش هەندێك نمونە لە چینی تابیعیەکان کە لای ئیبنوحیببان هەیە:

١- ئیبراهیمی کوڕی عبدالرحمن ی (عُذري) : کە ئیبنوحیببان لە (٤/١٠) دا ووتویەتی:

حەدیسی مورسەل ریوایەت ئەکات، کەچی موعانی کوڕی روفاعە لێوەی ئەگێڕێتەوە.

پاشان ئیبنوحیببان مورسەلێك ئەهێنێ لە ئیبراهیمەوە بە ئیسنادی خۆی: (يَرِثُ هَذَا العِلمَ مِن كُلِّ خَلَفٍ عُدُوْلُه...) حەدیسەکە.

جا منیش دەڵێم: ئەم موعانە خودی (حافظ) لەبارەیەوە دەڵێت: (لين الحديث)ە، وە (ذهبي) دەڵێت: (ليس بعمدة) بەتایبەت کە کەسێکی باس کردوە کە نازاندرێ کێیە؟.

مەبەستی ئیبراهیمە چونکە ئەو (مجهول العين)ە ئیبنو حیببانیش ئاماژەی بۆ ئەوە کردوەو لە ژیاننامەی ئەم موعانەدا لە (الضعفاء ٣/٣٦)دا ووتویەتی: (منكر الحديث)ە، مەراسیلی زۆر ریوایەت ئەکات، هەروەها لە کۆمەڵێك مەجهولەوە ریوایەت ئەهێنێت کە لە حەدیسی ئەو کەسانە ناچێت کە (ثبت)ن.

٢- ئیبراهیمی کوڕی ئیسماعیل، ئیبنوحیببان لە (٤/١٤-١٥)دا ئەڵێ:

خۆی لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەت ئەکات، کەچی حەججاجی کوڕی یەسار لێوەی ڕیوایەت ئەکات.

منیش دەڵێم: ئەم حەججاجە کە پێی دەوترێ ئیبنوعوبەید، (حافظ) لەبارەیەوە ئەڵێت: مەجهولە.

هەروەها لە پێش (حافظ)یشەوە ئەبو حاتەم و جگە لەویش ئاوهایان ووتوە، وەکو لە (میزان) ی (ذهبـي) دا هاتوە و ڕونیشی کردۆتەوە لە چ ڕویەکەوە مەجهولەو ووتویەتی: تەنها (لیث)ی کوڕی ئەبو سولەیم لە (حجاج)ەوە ریوایەت ئەکات.

ئەم (لیث)ەش لاوازەو (إختلاط)ی تێدا هەیە هەروەك زاندراوە تەنانەت لای ئیبنوحیببانیش (٢/٢٣١).

٣- ئیبراهیمی ئەنصاری. ئیبنوحیببان (٤/١٥) ئەڵێت: لە مەسلەمەی کوڕی مەخلەدەوە ریوایەت ئەکات کەچی کوڕەکەی کە ئیسماعیلی کوڕی ئیبڕاهیمە لێوەی ڕیوایەت ئەکات.

منیش دەڵێم: ئەم ئیسماعیلە مەجهولە هەروەك (حافظ) ووتویەتی و پێش ئەویش ئەبو حاتەم.

جا لەم لێکۆڵینەوەوە دەرئەکەوێت کە لای ئیبنو حیببان (جهالة العين) بە ریوایەتی یەك نەفەریش لائەچێت، با ئەو یەك نەفەرە زەعیفیش بێت یان مەجهول، ئەمەش پێچەوانەی ڕواڵەتی قسەی (حافظ)ە کە لەمەپێش باس کرا، هەرچەندە تەئکیدی لەسەر ئەو قسەیەی نەکردوە، چونکە (حافظ) وتویەتی: دەڵێی (ئیبنوحیببان) ئەم قسەیەشی لە خودی قسەی ئیبنوحیببانەوە وەرگرتوە کە تۆزێ لەمەوبەر هێنای: (ئەمە حوکمی ئەو ڕاوییانەیە کە مەشهورن، ئەمما مەجهولەکان...)هتد، جا ئەم قسەیە وەك ئاشکرایە بە نمونەی دوەم هەڵوەشاوەتەوە.

وە بە گشتی (جهالة العينية) بە تەنیا بەلای ئیبنوحیببانەوە بە جەرح دانانرێت، وەمن زیاتر یەقینم پەیدا کرد کاتێك ژیاننامەی ئەو ڕاویانەم خوێندەوە لە کتێبەکەیدا (الضعفاء) کە ژمارەیان گەیشتۆتە نزیکەی (١٤٠٠) ڕاوی، جا من کەسێکیانم لێ نەبینی کە ئیبنوحیببان بە جەهالەت تانەی لێ دابێت، تەنها چوار کەس نەبێت، ئیتر ئەوانی تر هەمویان بەوە تانەی لێ داون کە حەدیسی مونکەر ریوایەت ئەکەن، نەك بە جەهالەت، ئەمەش ناوی ئەو ڕاویانەو قسەی ئیبنو حیببان لەبارەیانەوە:

١- حومەیدی کوڕی عەلی کوڕی هارونی قەیسی (١/٢٦٣-٢٦٤) کە هەندێك ڕیوایەتی مونکەری لێوە باس کردوە پاشان ووتویەتی:

(دروست نی‌یە بەڵگەی پێ بێتەوە لە دوای ئەوەی ئەم جۆرە شتانەی لەو سیقانەوە ریوایەت کردوە.. ئەمەش شێخێکە کە کەم کەس ناینناسن.

٢- عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو لەیلای ئەنصاری. ئیبنوحیببان ئەڵێت (٢/٥) :

ئەمە پیاوێکی مەجهولە، هیچ شتێکم لێوە نەبیستوە کە ریوایەتی کردبێت جگە لەم قسە مونکەرە کە ئیجماعی موسڵمانان بە گشتی شایەتی پوچەڵ بونی قسەکەی ئەدەن.

٣- عەبدوڵڵای کوڕی زیادی کوڕی سولەیم، لە (٢/٧) دا ئەڵێت:

شێخێکی مەجهولە، بەقییەی کوڕی وەلید لێیەوە ریوایەتی کردوە، وە هیچ ڕاوی‌یەکی تر ناناسم جگە لە بەقییە کە ریوایەتی لێوە کردبێ، ئەم بەقییەش باسی لاوازی‌یەکەیمان کردوە لەسەرەتای کتێبەکەدا، ئێستاش بۆم نالوێت تانەی لێ بدەم، بەڵام بە هەرحاڵ ئەوەی ئەو ریوایەتی کردوە پێویستە وازی لێ بهێندرێ.

٤- ئەبوزەید، لە (٣/١٥٨)دا ئەڵێت:

ئەبو زەید لە ئیبنو مەسعودەوە شتێك ریوایەت ئەکات کە لێوەی نەزاندراوە، وە ئەم ئەبوزەیدە نە خۆی ناسراوە، نە باوکی ناسراوەو نە وڵاتەکەی، جا ئەگەر کەسێك لەسەر ئەم سیفەتە بێت و تەنها یەك خەبەر ریوایەت بکات و ئەو خەبەرەش موخالەفەی کیتاب و سوننەت و ئیجماع و قیاس و ڕاو بۆچون بکات، ئەوە شایستەی ئەوەیە خۆی لێ لابدرێت و نەکرێت بە بەڵگە.

جا هەر لەم بارەیە بوو کە (ابن عبدالهادی) لە پێشەوە ووتی:

(شێوازی ئیبنوحیببان وەهایە کە هەرکەسێك نەزانێت (جرح)ی تێدایە باسی ئەکات با مەجهولیش بێت و حاڵی نەزاندرێت).

بەڵام ڕاست ئەوەیە کە بوترێ: (خوددی خۆشی نەزاندرابێ نەك هەر حاڵی) بەپێی ئەو نمونانەی پێشەوە، وە خواش زاناترە.

بە کورتی پێویستە بە سیقە دانانی ئیبنوحیببان زۆر بە ووتووریایی‌یەوە وەربگیرێت، چونکە پێچەوانەی زانایانی کردوە لەوەدا کە مەجهولەکانی بە سیقە داناوە، بەڵام ئەم قسەیە بە موتڵەقی ناوترێت، هەروەك (العلّامة مُعَلِّمي) ڕونی کردۆتەوە لە (التنكيل) (١/٤٣٧-٤٣٨)دا لەگەڵ تەعلیق دانەکەم بەسەریەوە. وە بۆ ئەم باسەش بگەڕێرەوە بۆ ڕەددانەوەم لەسەر شێخ حەبەشی، چونکە شێخ حەبەشی زۆر پشت بەوکەسانە ئەبەستێت کە ئیبنوحیببان بە سیقەی داناون و مەجهولیشن (ل١٨-٢١).

وە هەروەها لەو شتانەی کە پێویستە ئاگاداری لەسەر بکرێت، ئەوەیە کە پێویستە ئەوەی (معلمي) باسی کردوە شتێکی کەی گرینگیشی پێ زیاد بکرێت، کە بەهۆی خەریك بونم بەم زانستەوە پێم زانیوە، و کەم کەسیش هەیە ئاگاداری لەسەر کردبێت، وە جەماوەری قوتابییانیش لێی بێئاگا بون، ئەویش ئەوەیە هەرکەسێك ئیبنوحیببان بە سیقە دای بنێ و کۆمەڵێکیش لە سیقە پێکراوەکان ریوایەتی لێوە بکەن، وە شتێکی واشی نەهێنابێت کە ئینکاری بکرێ لەسەری ئەوە ئەوکەسە ڕاستگۆیەو ئەکرێت بە بەڵگە.

جا بەپێی ئەوە هەندێك حەدیس کە لەو شێوەیەن بە قەویم داناون، هەروەك حەدیسی (عجن) لە باسی نوێژدا، کەچی هەندێك لە تازە پێ گەیشتوەکان لەم زانستەدا وایان زانیوە کە من لەخۆمدا توشی (تناقض) بوم و لەگەڵ ئیبنوحیبباندا یەك کەوتوم لەو (شذوذ)ەیدا، وە ئیبنوحیببانیش حەدیسی (عجن)ی بە لاواز داناوە، ڕەددی ئەوەش بە شی کراوەیی دێت (إن شاء الله). لەگەڵ باس کردنی دە نمونە لەو ڕاویانەی کە تەنها ئیبنوحیببان بە سیقەی داناون، وە هەردوك (حافظ) (ذهبي) و عسقلانیش شوێنی کەوتون، جا شوێن ئەو مەسەلەیە بکەوە لە باسی (چۆنیەتی هەستانەوە لە سجود) (ل١٩٧-٢٠٧).

## قاعیدەی شەشەم

### ئەوەی کە زانایان ئەڵێن: (رجاله رجال الصحيح) واتە: پیاوەکانی ئەم حەدیسە پیاوانی صەحیحن،

### ئەوە بە (صحیح) دانان نیەیە بۆ ئەو حەدیسە

لە قاعیدەی یەکەمەوە پێناسەی حەدیسی صەحیحت زانی، وە زانیت کە لە مەرجەکانی (صحة) ئەوەیە سەلامەت بێت لە عیللەتەکان کە هەندێك لەوانە (شذوذ) و (إضطراب) و (تدليس)ە وەك باس کرا، جا هەر لەسەر ئەوەوە قسەی هەندێك لە (محدثين) زانایانی حەدیس کە لەبارەی حەدیسێکەوە ئەڵێن: پیاوەکانی پیاوانی صەحیحن، یان پیاوەکانی سیقەن، یان وێنەی ئەمانە، وەك ئەوە نیەیە کە بڵێن: ئیسنادەکەی صەحیحە، چونکە ئەم قسەیان هەمو مەرجەکانی (صحة) سابت ئەکات، کە یەکێك لەو مەرجانە سەلامەت بونە لە عیللەتەکان، بە پێچەوانەی قسەی یەکەمەوە، کە هەمو مەرجەکان سابت ناکات، بەڵکو تەنها یەك مەرج سابت ئەکات ئەویش عەدالەتی پیاوەکان و سیقە بونیانە، بەمەش (صحة) سابت نابێت وەك ئاشکرایە.

لێرەدا تێبینییەکی تریش هەیە ئەویش ئەوەیە: جاری وا هەیە ئەو حەدیسەی ئەو قسەیەی لەبارەوە ئەوترێت سەلامەت ئەبێت لەو عیللەتانە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا صەحیح نابێت، چونکە جاری وا هەیە لە سەنەدەکەیدا پیاوێك هەیە کە لە پیاوانی صەحیحە بەڵام نەکراوە بە (حجة)

بەڵگە، وە هەر بۆیە تەخریجی بۆ کراوە لەبەر شایەتی پێهێنانەوە، یان لەگەڵ کەسێکی تردا هێندرابێت لەبەر لاواز بونی (حفظ)ی، یان ئەو کەسە لەو کەسانەیە کە ئیبنو حیببان بە تەنیا (توثیق)ی کردوە. وە زۆر جاریش هەندێك لە لێکۆڵەرەوەکان ئاماژە بۆ ئەوە ئەکەن بەوە کە ئەڵێن: (ورجاله موثقون) واتە: پیاوەکانی کراون بە ثقه. تا ئاماژە بۆ ئەوە بکەن کە لە بە سیقە کردنی هەندێکیاندا نەرمی ئەبیندرێت، جا ئەمانە هەموی ڕێگرن لەوەی کە (صحة) بزاندرێت لەو قسەیەی ئەوانەوە کە باسمان کرد.

وەکو ئەوەی دانەر ئاگای لە هیچ کام لەمانە نەبوبێ، بۆیە لە زۆر حەدیسدا تەنها بەوەی هەندێك ئەو قسەیان لەبارەوە کردوە بە صەحیحی داناوە، وە لە دوبارە بونەوەی تەعلیقەکەدا ئاگادار کردنەوە لەسەر ئەوە ئەبینیت.

پاشان ئەم قاعیدەیەم زیاتر ڕون کردۆتەوە لە پێشەکی کتێبەکەمدا (صحيح الترغيب والترهيب) (ل٣٩-٤٦) جا بۆی بگەڕێرەوە چونکە گرینگە.

## قاعیدەی حەوتەم

## پشت نەبەستن بە بێ دەنگ بونی ئەبوداود

وا بەناوبانگە کە ئەبوداود دەرحەق بە کتێبەکەی (السنن) ووتویەتی:

لەم کتێبەمدا هەرچی حەدیسێك کە لاوازی‌یەکی بەهێزی تێدا بێت ڕونم کردۆتەوە، وە هەر حەدیسێك هیچم لەبارەیەوە نەوتبێت ئەوە (صالح)ە.

زانایان جیاوازیان هەیە لە تێگەیشتنی مەبەست لەو قسەیە کە ووتویەتی: (صالح)ە، هەندێکیان بۆ ئەوە چون کە مەبەستی ئەوە بوە (حسن)ەو ئەکرێتە (حجة).

هەندێکیشیان بۆ ئەوە چون کە مەبەستەکەی لەوە گشتی تر بوە، کەواتە ئەو حەدیسانە ئەگرێتەوە کە ئەکرێن بە (حجة)، وە ئەوانەی کە ئەکرێن بە شاهید کە ئەویش ئەو حەدیسەیە لاوازی‌یەکەی زۆر بە هێز نەبێت.

وە ئەم قسەیان ڕاستە بەپێی ئەوەی کە ئەڵێت: ئەوەی حەدیسەی کە لاوازی‌یەکی بەهێزی تێدا بێت ڕونم کردۆتەوە. چونکە ئەم قسەیە ئەوە ئەگەیەنێت ئەوەی کە لاوازی‌یەکی بەهێزی تێدا نەبێت ڕونی ناکاتەوە. کەواتە ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هەر حەدیسێك ئەو لێی بێدەنگ بوە، (حسن) نی‌یە بەلایەوە، وە ئەوەی کە شایەتە بۆ ئەمە بونی چەند حەدیسێکی زۆرە لەلای (أبوداود) کە هیچ زانایەك گومانی لەوەدا نی‌یە کە لاوازن، کەچی لەو حەدیسانەن کە بێدەنگەی لەسەر

کردون، تەنانەت نەوەوی لەبارەی هەندێکیانەوە ئەڵێت: بۆیە ئەبوداود دانی نەناوە بە لاوازی‌یەکەیاندا چونکە لاوازی‌یەکەیان ئاشکرایە.

کەچی لەگەڵ ئەوەشدا نەوەوی ڕەحمەتی خوای لێ بێت زۆر لەو حەدیسانەی کردوە بە (حجة) و لای نەکردۆتەوە بۆ سەر پیاچونەوەی سەنەدەکانیان، ئیتر بە هۆی ئەوەوە کەوتۆتە ناو هەڵەیەکی زۆرەوە.

وە ئەوەی کە ئێمە لێی تێگەیشتوین لەبارەی ئەبوداودەوە، زانایانی لێکۆڵەرەوەش دوپاتیان کردۆتەوە، وەکو (ابن منده) و (ذهبي) و (ابن عبد الهادي) و (ابن كثير)، جا قسەکانیانم هێناوە لە پێشەکی کتێبەکەمدا (صحيح أبي داود).

پاشان لەسەر قسەی (حافظ) ابن حجر لەم مەسەلەیەدا هەڵوێستەم کرد، بینیم ئەویش هەر بۆ ئەوە چوە کە ئێمە باسمان کردو، وە بەجۆرێك شی کردۆتەوەو بەڵگەی بۆ هێناوەتەوە کە لەلای کەسێکی تر ئەوە نابینیت. ئەگەر مەترسی درێژە پێدان نەبوایە لێرەدا باسم ئەکرد، بۆیە تەنها ئاماژە بۆ سەرچاوەکەی ئەکەم ئەویش (توضيح الأفكار لمعاني تنقيح الأنظار)ە (١/١٩٦-١٩٩للإمام الصنعاني).

## قاعیدەی هەشتەم

### ئەو ڕەمز و نیشانانەی (سيوطي) لە (الجامع الصغير) دا دایناوە پشتی پێ نابەسترێ.

هەروەها لای زۆرێك لە زانایان وا بەناوبانگە کە پشت بە ڕەمز دانانی (سيوطي) ئەبەستن بە (صحة) یا بە (حُسن) یا بە (ضَعف)، (شيخ سيد سابق)یش بە شوێن ئەواندا ڕۆیشتوە، جا ئێمە ڕامان وایە کە ئەوە دروست نی‌یە لەبەر دو هۆ:

١- ڕودانی دەستکاری کردنی ڕەمزەکانی کتێبەکەی لەلایەن نوسخە نوسەکانەوە، چونکە زۆر جار حەدیسم بینیوە لەو کتێبەدا جۆرێك ڕەمزی بۆ دانراوە کە پێچەوانەی ئەوەیە کە شەرحکەرەکەی (المناوي) لە خودی (سيوطي)یەوە هێناویەتی، چونکە (مُناوي) لە (جامع)ەوە ئەیهێنێت کە دەستنوسی (سيوطي)یە، هەروەك دانی بەوەدا ناوە لە سەرەتای شەرحەکەیدا وە دەفەرموێت:

ئەمما ئەو ڕەمزانەی لە هەندێك نوسخەدا هەیە کە نیشانەن بۆ (صحيح) و (حسن) و (ضعيف) بە شێوەی سەری پیتی (صاد و حاء و ضاد) ئەوە نابێت پشتی پێ ببەسترێ لەبەر زۆری دەستکاری کردنی نوسخە نوسەکان. لەگەڵ ئەوەشدا (مناوي) خۆشی ئەوکارەی کردوە لە هەندێکیدا، هەروەك لە دەستنوسەکەی خۆیدا بینیومە.

٢- (سیوطي) بەناوبانگە لەوەدا کە کەمتەرخەمی ئەکات لە بە صەحیح دانان و بە لاواز دانان (تصحیح و تضعیف)، وە ئەو حەدیسانەی کە ئەو بە صەحیح یان بە حەسەنی داناون لەو کتێبەدا بەشێکی زۆریان لەلایەن شاریحەکەیەوە کە (مناوي)یە ڕەد دراوەتەوە، وە ژمارەشیان بە سەدان ئەگات ئەگەر نەڵێین زۆرترە.

هەروەها زۆر حەدیسی (موضوع)ی تێ کەوتوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە لە پێشەکی‌یەکەیدا ووتویەتی: (من ئەم کتێبەم پاراستوە لەو حەدیسانەی کە تەنها ئەوانەی حەدیس هەڵئەبەستن هێناویانە، یان ئەوانەی کە درۆزنن).

جا من بە شێوەیەکی خێرایی موتابەعەیانم کردوە، کە ژمارەیان نزیکەی هەزارە، وە ئومێدەوارم کە بتوانم دوبارە سەیرێکیان بکەمەوە و قەڵەمی لێکۆڵینەوە بەسەریانا بێنمەوە و تەخریجیان بکەم بۆ خەڵك، وە ئەوەی سەرسوڕهێنەرە ئەوەیە کە بەشێکی تێدایەو کەمیش نی‌یە کە خودی (سیوطي) شایەتی ئەوە ئەدات لە غەیری ئەم کتێبەدا کە (موضوع)ن، ئیتر ئەمانە هەموی سیقە کردن بەو کتێبە لاواز ئەکات. داوا لە خوا ئەکەین لە هەڵە بمان پارێزێ.

لەپاشاندا خوای گەورە بۆی ئاسان کردم، (الجامع الصغیر) و زیادەکەی کە ناوی (الفتح الكبير في ضم الزيادة إلى الجامع الصغير)ە کردم بە دو بەشەوە: (صحيح الجامع) و (ضعيف الجامع..). و ژمارەی صەحیحەکان (٦٤٦٩) حەدیسە، و ژمارەی (موضوع)ەکان نزیکەی (٩٨٠) حەدیسە، کە ئەمیش هەروەك صەحیحەکە چاپ بوە سوپاس بۆ خوا.

## قاعیدەی نۆیەم

### بێ دەنگ بونی (منذري) لەسەر حەدیس لە (الترغیب) دا نابێتە بە هێز کردن بۆ ئەو حەدیسە

ئەسڵ ئەوەیە کە دروست نی‌یە حەدیسی زەعیف باس بکرێت مەگەر بۆ ڕون کردنەوەی حاڵی حەدیسەکە، وەك لەمەودوا دەرئەکەوێت، جا لەبەر ئەوە هەندێك وا ئەزانن ئەوەی کە (منذري) لە (الترغيب والترهيب) دا لەسەری بێ دەنگ بوە ئەوە ئەگەیەنێت کە ئەو حەدیسە لای ئەو لاواز نی‌یە، وە (سید سابق)یش هەر لەسەر ئەو شێوازە ڕۆیشتوە لە زیاتر لە حەدیسێکدا، ئەمەش لادانە لە زاراوەی (منذري) کە لە پێشەکی کتێبەکەیدا دانی پێدا ناوە، چونکە (منذري) ڕەحمەتی خوای لێ بێت لە (ل٤) دا دەفەرموێت:

جا ئەگەر ئیسنادی حەدیسەکە صەحیح بێت یان حەسەن یان نزیك بێت لەو دوانەوە، ئەوە بە زاراوەی (عن) هێناومە، وە هەروەها ئەگەر (مرسل) بێت یان (منقطع) یان (معضل) یان لەسەنەدەکەیدا ڕاوی‌یەکی نەناسراو هەبێت، یان (ضعیف) هەبێت و کرابێت بە (ثقة) یان (ثقة)

هەبێت و بە (ضعیف) دانرابێت و باقی راوی‌یەکانی ئیسنادەکە سیقە بن، یان قسەیەکیان لەبارەوە کرابێت کە زیانی نی‌یە، یان بە (مرفوع)ی ریوایەت کرابێت و ڕاستیش ئەوە بێت کە (موقوف) بێت، یان بە (متصل)ی ریوایەت کرابێت و ڕاستیش ئەوە بێت کە (مرسل) بێت، یان ئیسنادەکەی (ضعیف) بێت بەڵام هەندێك لەوانەی تەخریجیان کردوە یان هێناویانە بە صەحیح یان بە حەسەن دایان نابێت، لە هەموو ئەمانەدا دیسان بە زاراوەی (عن) ئەیهێنم، پاشان ئاماژە ئەکەم بۆ ئەوەی کە (مرسل)ە، یان (منقطع)ە، یان (معضل)ە، یان ئەو راوی‌یە جیاوازی لەبارەیەوە هەیە، جا ئەڵێم: (رَوَاهُ فُلان مِن رِوَايَةِ فُلان، أو مِن طَرِيقِ فُلان، أو فِي إسنَادِهِ فُلان) یان وێنەی ئەو ڕستانە.

وە ئەگەر لە ئیسنادەکەدا کەسانێك هەبوون کە پێیان ووترابو: (كذَّاب) یان (وضَّاع) یان (مُتَّهَم) یان (مُجمَعٌ على تركه) یان (ضَعفِه) یان (ذَاهِبُ الحَدِيثِ) یان (هَالِكٌ) یان (سَاقِطٌ) یان (لَيسَ بِشَئ) یان (ضَعِيفٌ جِداً) یان (ضَعِيفٌ فَقَط) یان ئەم بینی کە (توثيق) کرابێت، وە بە جۆرێك بێت کە ڕێی تێ نەچێ ئیحتیمالی بە (حسن) دانانی هەبێت، ئەوە بە زاراوەی (رُوِيَ) هێناومە، وە هەرگیز باسی ئەو راوی‌یە و باسی ئەو قسەیە ناکەم کە لە بارەیەوە کراوە.

کەواتە بۆ ئیسنادی (ضعیف) دو نیشانە هەیە: لە پێشەوە بە زاراوەی (رُوِيَ) دەست پێ ئەکات و لە دواییشەوە هیچ قسەی لەسەر ناکرێت.

وە من لە پێشەکی (صحیح الترغیب)دا ئەم قسەیەی ئەوم شی کردۆتەوە هەروەها ئەم کورتی و شاراوەیی‌یەو ئەو ڕەخنانەش کە تیایەتی جا بۆی بگەڕێرەوە چونکە زۆر گرینگە.

## قاعیدەی دەیەم

### بەهێز کردنی حەدیس بەهۆی زۆری (طرق) ڕێگاکانی‌یەوە، بەشێوەیەکی گشتی نی‌یە

ئەوەی کە بەناوبانگە لای ئەهلی زانستی حەدیس ئەوەیە ئەگەر حەدیسێك لە چەند ڕێگایەکی جیا جیاوە هات ئەوە بەهۆی ئەو چەند ڕێگایەوە بەهێز ئەبێت و ئەبێتە (حجة)، با هەریەکە لەو ڕێگایانەش ئەگەر بە تەنیایی بێت لاواز بێت، بەڵام ئەم قسەیە بە شێوەیەکی گشتی ناوترێت، بەڵکو لەلای لێکۆڵەرەوەکانی حەدیس بەوە ئەبەسترێتەوە کە ئەگەر ئەو لاوازی‌یەی راوی‌یەکان کە لە چەند ڕێگایەکەوە هەیە لەلایەن (سوء حفظ)ی ئەوانەوە بێت، نەك لەبەر تۆمەتێك بێت لە ڕاستگۆیی‌یاندا یان لە دینیاندا، ئەگینا ئەگەر لەبەر ئەو هۆیە بو ئەوە بەهێز نابێت هەرچەندە ڕێگاکانیشی زۆر بێت، جا ئەمە هەر ئەوەیە کە (مناوي) لێکۆڵەرەوە هێناویەتی لە (فیض القدیر) دا لە زانایانەوە، فەرمویانە:

ئەگەر لاوازی‌یەکە بەهێز بوو، ئەوە هاتنی ئەو حەدیسە لە چەند ڕێگایەکی ترەوە ئەو لاوازی‌یە پڕ ناکاتەوە با ئەو ڕێگایانە زۆریش بن، جا هەر لەبەر ئەوە لەسەر لاوازی ئەم حەدیسە ڕێکەوتون کە ئەمە دەقەکەیەتی: (من حفظ على أمتي أربعين حديثاً)[1] واتە: هەرکەسێ لە نەتەوەکەم چل حەدیسی لەبەر کردبێ. لەگەڵ ئەوەشدا کە ڕێگاکانی زۆرن، چونکە لاوازی‌یەکەی بەهێزەو زۆری ڕێگاکانی ئەو لاوازی‌یە پڕناکاتەوە، بە پێچەوانەی ئەو حەدیسەی کە لاوازی‌یەکەی کەمە، چونکە لاوازی‌یەکەی پڕ ئەبێتەوەو بەهێز ئەبێت. بۆ ئەمەش بگەڕێرەوە بۆ (قواعد التحديث) (ل٩٠) و (شرح النخبة) (ل٢٥).

جا لەسەر ئەم ئەساسە پێویستە لەسەر هەرکەسێك بیەوێ حەدیسێك بەهێز بکات بەهۆی زۆری ڕێگاکانی‌یەوە، کە لەسەر پیاوانی هەریەك لەو ڕێگایانە هەڵوێستە بکات تاوەکو بۆی دەرکەوێت تا چ ڕادەیەك لاوازن، وە جێی داخە کە زۆر کەم لە زانایان ئەم کارە ئەکەن، بەتایبەت زانا دوایینەکان، چونکە ئەوان حەدیس بەهێز ئەکەن تەنها لەبەر ئەوەی لە کەسانی ترەوە ئەیهێنن و چەند ڕێگایەکی هەیە، بەبێ ئەوەی لەسەر ئەو ڕێگایانە بوەستن و ڕادەی ئەو لاوازی‌یە بزانن! نمونەش لەسەر ئەوە زۆرە، و هەرکەسێ بیەوێت لە کتێبەکانی تەخریجدا ئەیانبینێتەوە، بە تایبەت لە کتێبەکەم (سلسلة الأحاديث الضعيفة).

## قاعیدەی یانزەهەم

### دروست نی‌یە حەدیسی لاواز باس بکرێت مەگەر لەگەڵ ڕون کردنەوەی لاوازی‌یەکەی

ژمارەیەکی زۆر لە دانەرەکان بە تایبەت لەم چاخەی ئێستادا هەرچەندە کە بۆچونیان جیاوازە و تایبەتمەندیان جیاوازە، ئەو حەدیسانەی کە نیسبەت دراون بۆلای پێغەمبەر ﷺ باس ئەکەن، بێ ئەوەی خەڵکی ئاگادار بکەن لە لاوازەکانیان، جا لەبەر نەزانیان بێت بەرامبەر بە سوننەت، یان لەبەر ویستو ئارەزویان، یان لەبەر تەمبەڵیان لە گەڕانەوە بۆ کتێبی ئەو کەسانەی کە لە حەدیسدا شارەزان، وە هەندێك لەو شارەزایانە خۆشیان کەمتەرخەمی ئەکەن لەمەدا، بەتایبەت لە حەدیسەکانی (فضائل الأعمال) دا.

ئەبو شامە ئەڵێت:

ئەو کارە لەلای لێکۆڵەرەوەکان لە ئەهلی حەدیس و لای زانایانی (أصول) و (فقه) هەڵەیە، بەڵکو پێویستە حاڵی ئەو حەدیسە ڕون بکرێتەوە ئەگەر زاندرا، وەگەر نا ئەچێتە ژێر ئەو هەڕەشەوە

(١) ئەم حەدیسە تەخریج کراوە لە (الضعيفة)دا (٤٥٨٩).

کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن حَدَّثَ عَنِّي بِحَديثٍ يُرَى أنَّه كَذِبٌ فَهُوَ أحَدُ الكَاذِبَين) رواه مسلم.

واتە: هەرکەس حەدیسێك لەمنەوە باس بکات و پێشی ڕابگەیندرێ کە درۆیە، ئەوە یەکێکە لە دوو درۆزنەکان.

جا ئەمە حوکمی ئەو کەسەیە کە لەسەر حەدیسە زەعیفەکان بێ دەنگی ئەکات لە (فضائل الأعمال)دا، جا ئەی لە ئەحکام و ئەواندا ئەبێت چۆن بێت؟!

وە بشزانە کە ئەوکەسەی کاری وا ئەکات لە دوو پیاو بەدەر نییە:

١- یان لاوازی ئەو حەدیسانە ئەزانێت و ئاگاداری لەسەر ناکاتەوە، کە ئەوەش موسڵمانان فریو ئەدات و حەتمەن ئەچێتە ناو ئەو هەڕەشەیەوە کە باس کرا، ئیبنوحیببان لە کتێبەکەیدا (الضعفاء) ووتویەتی (١/٧-٨) :

لەم حەدیسەدا بەڵگەی ئەوە هەیە کە ئەگەر (مُحَدِّث) حەدیسێکی ڕیوایەت کرد لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە صەحیح نەبوو لەوانەی کە هەڵبەستراون بەدەم پێغەمبەرەوە ﷺ، وە ئەو (محدث)ەش ئەیزانی، ئەوە هەروەك یەکێك لە دو درۆزنەکەی لێ دێت، لەگەڵ ئەوەشدا ڕواڵەتی مانای حەدیسەکە لەوەش توندترە، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن رَوَى عَنِّي حَديثاً وَهُوَ يُرى أنَّه كَذِبٌ..) واتە: هەرکەس حەدیسێك لەمنەوە ڕیوایەت بکات و پێشی ڕابگەیندرێ کە درۆیە، وە نەیفەرموە: ئەگەر یەقینی هەبێت کە درۆیە، کەواتە هەرکەس حەدیسێك ڕیوایەت بکات و دو دڵ بێت لەوەدا کە صەحیحە یان نا، ئەوە ئەچێتە ناو ڕواڵەتی ئەم حەدیسەوە.

(ابن عبدالهادي) ئەمەی هێناوە لە (الصارم المنكي) (ل١٦٥-١٦٦) دا و سابتیشی کردوە.

٢- یان نازانێت کە لاوازە، ئەوە دیسانەوە هەر گوناهکارە لەبەر ئەوەی بەبێ زانین نیسبەتی داوە بۆ پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمویەتی: (كفى بالمرء كذباً أن يحدث بكل ما سمع)[1]

واتە: بەسە بۆ پیاو کە بە درۆزن دەرچێت، ئەوە کە هەرچی بیست باسی بکات.

جا ئەوکەسە بەشی هەیە لە گوناهی درۆ هەڵبەستن بەدەم پێغەمبەرەوە ﷺ، چونکە پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بۆ ئەوە کردوە کە هەرکەسێك هەرچییەکی بیست باسی بکات -وە هەر بەو شێوەیە ئەگەر بینوسێ- ئەوە بێگومان ئەکەوێتە ناو درۆ هەڵبەستنەوە بە دەم پێغەمبەرەوە ﷺ جا بە هۆی ئەوەوە ئەبێت بە یەکێك لە دو درۆزنەکان، یەکەم: ئەوەی کە درۆکەی هەڵبەستوە، دوەم: ئەوەی کە بڵاوی کردۆتەوە.

(١) موسلیم ڕیوایەتی کردوە لە پێشەکی صەحیحەکەیدا، هەروەها لە (الصحيحة)یشدا تەخریج کراوە.

هەروەها ئیبنو حیببان ووتویەتی (١/٩) :

لەم حەدیسەدا سەرزەنشتی تێدایە بۆ ئادەمیزاد کە نابێت هەرچی بیبیستێ باسی بکات تاوەکو بە یەقین نەزانێت کە ڕاستە.

وە ئەوەی دانی بەوەدا ناوە کە هەرکەسێك لاوازی حەدیسێك نەزانێت دروست نی‌یە بۆی بیکاتە بەڵگە بەبێ گەڕان و پشکنین لیێ ئەگەر شارەزا بوو، یان بەبێ پرسیار کردن لە ئەهلی عیلم ئەگەر بۆ خۆی شارەزایی نەبو، بگەڕێرەوە بۆ پێشەکی (الضعیفة) (ل١٠-١٢).

## قاعیدەی دوازدەهەم

## وازهێنان لە کار کردن بە حەدیسی زەعیف لە (فضائل الأعمال) دا

لەنێوان زۆر لە ئەهلی عیلم و قوتابیاندا وا بەناوبانگە کە دروستە کار بە حەدیسی لاواز بکرێت لە (فضائل الأعمال)دا، و پێشیان وایە کە هیچ جیاوازی‌یەك نی‌یە لەوەدا، جا چۆن پێ‌یان وانابێت لەکاتێکدا ئەوەی ڕەحمەتی خوای لیێ بێت لە چەندین کتێبیدا ئیجماعی زانایانی لەسەر ئەوە هێناوە؟ وە لە هێنانی ئەوەدا تێڕوانینێکی ئاشکرا هەیە، چونکە جیاوازی تێیدا ناسراوە، وە بەڕاستی هەندێك لە زانا لێکۆڵەرەوەکان لەسەر ئەو بۆچونەن کە حەدیسی زەعیف دروست نی‌یە کاری پێ بکرێ بە هیچ شێوەیەك، نە لە (أحکام) و نە لە (فضائل)دا. (شیخ قاسمي) ڕەحمەتی خوای لیێبێت لە (قواعد التحدیث) دا (ل٩٤) فەرمویەتی:

(ابن سید الناس) ئەم قسەیەی لە (عیون الأثر) دا باس کردوە لە یەحیای کوڕی مەعینەوە، وە لە (فتح المغیث) دا نیسبەتی داوە بۆ (ابن العربي) و لە ڕواڵەتیشدا بۆچونی بوخاری و موسلیمیش هەر وایە.. وە هەروەها مەزهەبی ئیبنوحەزمیشە...

منیش دەڵێم: حەق هەر ئەمەیە کە بەلای منەوە هیچ گومانێکی تێدا نی‌یە، لەبەر چەند هۆیەك:

یەکەم: حەدیسی زەعیف بیروباوەڕی لاواز ئەگەیەنێ، وە دروست نی‌یە کاری پێ بکرێت بە ڕێکەوتنی زانایان، جا هەر کەسێك کارکردن بە حەدیسی زەعیف لە (فضائل الأعمال)دا لەوە دەربکات، ئەوە پێویستە بەڵگە بهێنێتەوە، کە ئەمەش دورە!

دوەم: من وا لە قسەکەیان تێ ئەگەم کە ئەڵێن: لە (...فضائل الأعمال)دا واتە: ئەو کردەوانەی کە بە بەڵگەیەکی شەرعی سابت بوە کە مەشروعن، وە حەدیسێکی زەعیفیشیان لەگەڵدا ئەبێت، و پاداشتێکی تایبەت ناوبراوە بۆ هەرکەسێك کاریان پێ بکات، جا لە وێنەی ئەوەدا کار بە حەدیسی زەعیف ئەکرێت لە (فضائل)دا، چونکە دانانی ئەو کارەوە بەهۆی حەدیسەکەوە نی‌یە لەوێدا، بەڵکو

ڕون کردنەوەی (فضل) ێکی تایبەتی تێدایە کە ئومێد ئەکرێت ئەو کەسەی ئەنجامی ئەدات بەو پاداشتە بگات، وە هەندێك لە زانایانیش ئەو قسە ناوبراوەیان هەر بەم جۆرە لێك داوەتەوە، وەك: (شیخ علي القاري) ڕەحمەتی خوای لێ بێ کە لە (المرقاة) (٢/٣٨١) دا دەفەرموێت:

ئەوە کە ئەڵێت: حەدیسی زەعیف کاری پێ ئەکرێت لە (فضائل الأعمال)دا بە ئیجماع، با بە هۆی حەدیسی تریشەوە بەهێز نەکرابێت، وەك ئەوەی وای فەرموە، ئەوە شوێنی کار پێ کردنەکەی (فضائل)ە کانە کە سابت بون لە قورئاندا یان لە سوننەتدا.

جا بەپێی ئەمە کارکردن بەو حەدیسە لاوازە دروستە، ئەگەر ئەوکارەی کە لەو حەدیسە زەعیفەدایە سابت بوبێ بە حەدیسێکی تر کە بۆ بەڵگە هێنانەوە دەست بدات.

بەڵام من پێم وایە جومهوری ئەوانەی کە ئەو قسەیە ئەڵێن، مەبەستیان ئەم لێکدانەوەیە نیەیە هەرچەندە ئاشکراشە، چونکە ئێمە ئەیان بینین کار بە چەند حەدیسێکی لاواز ئەکەن کە ئەوەی لەماندایە سابت نەبوە لە حەدیسی تری سابتا، بۆ نمونە: ئەوەی بە موستەحەببی داناوە (و دانەریش شوێنی کەوتوە) کە نیشتەجێ لە وەڵامی (قَد قَامَتِ الصَّلاةُ)دا بڵێت: (أقَامَهَا اللهُ وَأدامَهَا) لەگەڵ ئەوەشدا ئەو حەدیسەی لەوبارەیەوە هاتوە زەعیفە هەروەك باسی دێت، جا ئەمە قسەیەکە کە مەشروعیەتەکەی بە حەدیسی تر جگە لەم حەدیسە زەعیفە سابت نەبوە، لەگەڵ ئەوەشدا بە موستەحەبیان داناوە، هەرچەندە (إستحباب) حوکمێکە لە پێنج حوکمەکان کە پێویستە لە سابت کردنیدا بەڵگەیەك هەبێت بۆ (حجة) دەست بدات. جا چەندین مەسەلە هەیە کە بۆ خەڵکیان داناون و بە پەسەندیان زانیوە کەچی هەر بە چەند حەدیسێکی لاواز دایان ناون کە هیچ بنەمایەك نیەیە بۆ ئەو کارەی کە تیایاندایە لە سوننەتی صەحیحدا، وە لێرەش مەجال نیەیە بۆ ئەوەی نمونەی زۆری لەسەر بهێنینەوە، وە ئەم نمونەیەی باسم کرد بەسمانە، لە کتێبەکەشدا چەندین نمونە هەیە کە لە شوێنی خۆیدا ئاگادار کردنەوە لەسەریان دێت (إن شاء الله).

تەنها ئەوەی کە گرینگە لێرەدا ئەوەیە ئەوکەسانەی مخالفە ئەکەن بزانن کار کردن بە حەدیسی زەعیف لای ئەوانەی وا ئەڵێن لە (فضائل الأعمال)دا هەروا بە شێوەیەکی گشتی و ڕەها نیەیە، چونکە (حافظ ابن حجر) لە (تبيين العَجَب) دا (ل٣-٤) دەفەرموێت:

وا بڵاوە کە ئەهلی عیلم کەمتەرخەمی ئەکەن لە هێنانی حەدیس لە (فضائل الأعمال) دا با ئەو حەدیسە لاوازیشی تێدا بێت، مادام (موضوع) نەبێت، وە پێویستە مەرجی ئەوە دابنێن ئەو کەسەی کار بەو حەدیسە ئەکات باوەڕی وابێت کە لاوازە، وە نابێت بڵاوی بکاتەوە نەوەك کەسێك بە حەدیسی زەعیف کار بکات و شتێك بکات بە شەرع کە شەرع نەبێت. یان هەندێك نەزان چاویان پێی بکەوێت و وا بزانن کە سوننەتێکی صەحیحە.

مامۆستا (أبو محمد) ی کوڕی (عبد السلام) و جگە لەویش دانیان بەم مانایەدا ناوە، وە بۆ ئەوەی ئادەمیزاد هوشیار بێت لەوەی کە بچێتە ژێر مانای فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرمویەتی: هەرکەس حەدیسێك لەمنەوە باس بکات و پێشی ڕابگەیەندرێ کە لاوازە، ئەوە یەکێکە لە دو درۆزنەکان.

ئەی ئەوەی کە کاری پێ بکات ئەبێ چۆن بێت؟! وە هیچ جیاوازیش نی‌یە لە کارکردن بە حەدیس لە ئەحکامدا بێت یان لە (فضائل) دا، چونکە هەموی هەر شەرعە.

جا ئەمە سێ مەرجی گرینگن بۆ دروستی کار کردن بە حەدیسی لاواز لە (فضائل) دا.

١- (موضوع) نەبێت.

٢- ئەو کەسەی کاری پێ ئەکات بزانێت کە زەعیفە.

٣- کار پێ کردنەکەی بڵاو نەکاتەوە.

وە جێی داخە کە ئەبینین زۆر لە زانایان چ جای خەڵکی عەوام کەمتەرخەمی ئەکەن لەم مەرجانەدا، چونکە ئەوان کار بە حەدیس ئەکەن بێ‌ئەوەی صیحەت و لاوازی ئەو حەدیسە بزانن، خۆ ئەگەر لاوازی‌یەکەشی بزانن ئەوە ئەندازەکەی نازانن، وە ئایا ئەو لاوازی‌یە کەمە یان زۆرە و ڕێگرە لەوەی کە کاری پێ بکرێ. پاشان ئەوان کار پێ کردنەکەی ئاشکرا ئەکەن هەروەك چۆن حەدیسەکە صەحیح بێت! هەر بۆیە ئەو عیبادەتانەی کە دروست نین لەنێوان موسڵماناندا زۆر بون، و موسڵمانانی وەرگێڕاوە لەو عیبادەتە صەحیحانەی کە بە سەنەدی سابتەوە هاتون.

پاشان ئەم مەرجانە ئەوە بەهێز ئەکات کە ئێمە بۆی چوین لەوەی کە جومهور مەبەستی ئەو مانایە نی‌یە کە کەمێك لەمەوبەر باسمان کرد. چونکە ئەو مانایە هیچ کام لەو مەرجانەی تێدا نەگیراوە هەروەك شاراوە نی‌یە.

پێم وابێت (حافظ) ڕەحمەتی خوای لێ بێت مەیلی هەیە بەلای ئەوەدا کە کارکردن بە حەدیسی لاواز دروست نەبێت بەو مانایەی پێشو، بەپێی قسەکەی کە لەمەوپێش باس کرا: (هیچ جیاوازی‌یەك نی‌یە لە کارکردن بە حەدیسی زەعیف چ لە ئەحکام دا بێت یان لە (فضائل) دا چونکە هەموی هەر شەرعە).

ئەم قسەیەش هەقە چونکە ئەو حەدیسە لاوازەی کە حەدیسێکی تر نەبێت پشتگیری بکات، وێ دەچێت کە درۆ بێت، بەڵکو بە زۆری درۆیەو (موضوع)ە، وە هەندێك لە زانایان ئەوەیان تەئکید کردوە، چونکە ئەوکەسەی کار بەو حەدیسە ئەکات فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ دەیگرێتەوە (يُرى أنَّه كَذِب) واتە ئاشکرا بکرێت کە وایە, جا هەر لەبەر ئەوە (حافظ) بە شوێنێدا ووتویەتی: جا ئەی

حاڵی ئەوکەسە چۆنە کە کاری پێ ئەکات؟، وە ئەوەی پشتگیری ئەم قسەیە ئەکات ئەوەیە کە لەمەوبەر لە ئیبنوحیببانەوە باسمان کرد لە قاعیدەی یانزەهەمدا کە ووتویەتی: هەرکەسێك گومانی هەبێت لەوەدا کە ریوایەتی ئەکات ئاخۆ صەحیحە یان نا، ئەوە ئەچێتە ناو ئەو هەڕەشەیەوە.

ئێمەش هەروەك (حافظ) ئەڵێین: جا ئەبێ حاڵی ئەوکەسە چۆن بێت کە کاری پێوە ئەکات..؟!
ئەمەش ڕون کردنەوەی مەبەستی (حافظ)ە لە قسەکەی پێشەوەی، ئەما لێکدانەوەی قسەی (حافظ) بەوەی کە مەبەستی حەدیسی (موضوع) بوە، وە حەدیسە (موضوع) ەکە لە کار پێکردنیا جیاوازی نیـیە لەنێوان ئەحکام و (فضائل) دا، وەکو هەندێ لە مامۆستایانی هاوچەرخی (حَلَب) پێیان وایە، ئەوە زۆر دورە لە شێوەی قسەی (حافظ)ەوە، چونکە قسەی (حافظ) دەرحەق بە حەدیسی لاوازە نەك (موضوع) هەروەك شاراوە نیـیە.

جا ئەم قسەیەش کە باسمان کرد دژایەتی ناکات لەگەڵ ئەوەدا کە (حافظ) باسی چەند مەرجێکی کردوە بۆ کار کردن بە حەدیسی زەعیف، هەروەك (شیخ سید سابق) پێی وابوە، چونکە ئێمە ئەڵێین: (حافظ) ئەو مەرجانەی تەنها لەبەر ئەوکەسانە داناوە کە لێیانەوە باس ئەکات کە ئەوان کەمتەرخەمی ئەکەن لە هێنانی حەدیسی لاواز لە (فضائل)دا هەرئەوەندە کە (موضوع) نەبێت، جا وەك ئەوەی پێیان بڵێت: ئەگەر پێتان وایە کە وابێت، ئەوە پێویستە بەم مەرجانەوە بیبەستنەوە، ئەمەش هەروەك ئەو کارە وایە کە من کردومە لەم قاعیدەیەدا، وە (حافظ) یش دانی بەوەدا نەناوە کە لەگەڵیاندا بێت لەوەدا کە بەو مەرجانەوە دروست بێت، بەتایبەت لە کۆتایی قسەکەیدا وای نواندوە کە پێچەوانەی ئەوەیە هەروەك ڕونمان کردەوە.

کورتەی قسەش ئەوەیە : کار کردن بە حەدیسی زەعیف لە (فضائل الأعمال) دا دروست نیـیە گفتی پێ بدرێت بەو شێوەیەی کە باسمان کرد، چونکە پێچەوانەی ئەصڵەو هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیـیە، وە پێویستە لەسەر هەرکەسێك کە گفتی پێ ئەدات بە چاوی گرنگی و ئیعتیبارەوە ئاگاداری ئەو مەرجە باس کراوانە بکات و پابەند بێت پێیانەوە لە کارەکەیدا، ئیتر خواش یارمەتیدەرە.

پاشان زەرەری ئەو قسەیە کە پێچەوانەی ئەو ڕایەیە کە ئێمە هەڵمان بژاردوەو پارسەنگمان داوەتەوە ئەوەیە، کە کارکردن بە حەدیسی زەعیف لە (فضائل)دا موخالیفەکان بۆ ئەوە ڕائەکێشێ کە گفت بە کار پێ کردنی بدەن لە ئەحکامی شەرعیشدا، بەڵکو لە عەقائیدیشدا، وە نمونەی زۆرم لەلایە لەسەر ئەوە بەڵام من تەنها بە یەك نمونە بەسەی لێ ئەکەم:

حەدیسێك هەیە فەرمان بە نوێژکەر ئەدات خەتێك بکێشێت لەبەر دەمیدا ئەگەر سوترەی دەست نەکەوت، وە لەگەڵ ئەوەشدا کە بەیهەقی و ئەوەوی هەردوکیان لەو کەسانەن کە دانیان بە

لاوازی‌یەکەیدا ناوە، کەچی بە دروستیان داناوە کارەان پێ بکرێت، بە پێچەوانەی ئیمامەکەیان کە شافیعی‌یە. وە لەمەودوا موناقەشەی قسەکەیان دێت لە کاتی قسە کردن لەسەر ئەو حەدیسە باس کراوە.

وە هەرکەس پێی خۆش بێت زیاتر ئەم باسە گرینگەی بۆ ڕون بێتەوە با بگەڕێتەوە بۆ پێشەکی (صحيح الترغيب (١/١٦-٣٦).

## قاعیدەی سیانزەهەم

### کاتێك باسی حەدیسی لاواز ئەکرێت ناوترێت: (قال ﷺ)، یان: (وَرَدَ عَنه)، و وێنەی ئەمانە

نەوەوی لە (المجموع شرح المهذب) (١/٦٣) دا دەفەرموێت:

زانا لێکۆڵەرەوەکان لە ئەهلی حەدیس و جگە لەوان دەڵێن: ئەگەر حەدیس زەعیف بو لە گێڕانەوەکەیدا ناوترێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی، یان: کردویەتی، یان: فەرمانی داوە، یان: نەهی کردوە، یان: حوکمی داوەو وێنەی ئەمانە لە زاراوەکانی (جزم) بڕاندنەوە، هەروەها ناوترێت: ئەبو هورەیرە ریوایەتی کردوە، یان: ووتویەتی، یان: باسی کردوە... و وەك ئەو جۆرە قسانە، هەروەها ئەو قسەیە دەرحەق بە تابعین و ئەوانەی دوای ئەوانیش ناوترێت ئەگەر حەدیسەکە لاواز بو، ئیتر لە هیچ کام لە جۆرانەدا بە زاراوەی (جزم) ناوترێت، بەڵکو لە هەموو ئەمانەدا ئەوترێت: (رُوِيَ عَنهُ) لەوەوە ریوایەت کراوە، یان: (نُقِلَ عَنهُ) لەوەوە نەقل کراوە، یان: (حُكِيَ عَنهُ) لەوەوە گێڕدراوەتەوە، یان: باس ئەکرێت، یان: ئەگێڕدرێتەوە، یان: ریوایەت ئەکرێت، و وێنەی ئەمانە لە زاراوەکانی (تمريض) بە لاواز دانان، نەك زاراوەکانی (جزم).

ووتویانە: چونکە زاراوەکانی جەزم بۆ صەحیح یان بۆ حەسەن دانراوە، وە زاراوەکانی (تمريض)یش بۆ جگە لەو دوانەیە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە زاراوەی جەزم وا داوا ئەکات ئەوەی دوای ئەو زاراوەیە دێت صەحیح بێت، کەواتە نابێت بەکاربێت مەگەر لەو حەدیسانەدا کە صەحیحە، وەگەرنا نادەمیزاد دەچێتە ناو مانای درۆ هەڵبەست بەدەم پێغەمبەرەوە ﷺ. جا ئەم ئەدەبە دانەر[1] و جومهوری زانایان لە هاوەڵەکانمان و جگە لەوانیش کەمتەرخەمیان تێدا کردوە، بەڵکو جومهوری خاوەن زانستەکان بە گشتی جگە لە (مُحَدِّث)ە کارامەکان نەبێت، ئەمەش کەمتەرخەمی‌یەکی ناشیرینە لەوانەوە، چونکە زۆر جار دەرحەق بە حەدیسی صەحیح ئەڵێن: (رُوِيَ عنه) واتە: لێوەی ریوایەت کراوە، وە دەرحەق بە زەعیفیش ئەڵێن: (قال) یان: (روى فلان) واتە: ووتویەتی، یان: فڵان کەس ریوایەتی کردوە، وە ئەمەش لادانە لە ڕاستی.

(١) واتە شیرازی کە خاوەنی (المهذب)ە.

منیش دەڵێم: دانەرەکەی ئیمەش -خوا پاداشتی بەخێری بداتەوە- هەرچەندە لە ڕاستی لای داوە لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە لایان داوە -وەك لە شوێنی خۆیدا ڕون کردنەوەکەی دێت کاتێك تەعلیقی لەسەر ئەدرێت-، بەڵام من ڕایەکی تایبەتیم هەیە لەوەدا کە ئەوەی باسی کردوە لە زانایانەوە، کە پێویستە بەم بۆنەیەوە باسی بکەم، جا دەڵێم:

ئەگەر ئەوەی سەلمێندراوە لەلایەن شەرعەوە ئەوە بێت کە پێویستە لەگەڵ خەڵکدا بەپێی توانا بە گوێرەی تێ گەیشتنیان قسەیان لەگەڵدا بکرێت، وە ئەو زاراوەیەی کە لای لێکۆڵەرەوەکان هەیە زۆربەی خەڵك نایزانن، چونکە ئەوان جیاوازی ناخەنە نێوان ئەو کەسەی کە ئەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی و لەنێوان ئەوەی کە ئەڵێت: لە پێغەمبەرەوە ﷺ ریوایەت کراوە، بەهۆی کەمی ئەو کەسانەی کە بە زانستی سوننەتەوە خەریکن، ئەوە من پێم کە وایە پێویستە دان بە صەحیحی حەدیس یان بە زەعیفیدا بهێندرێت لەبەر لادانی گومان، هەروەك پێغەمبەر ﷺ ئاماژە بۆ ئەوە ئەکات بەوە کە دەفەرموێت: (دَعْ مَا يَرِيبُكَ إلى مَا لا يَرِيبُك) رواه النسائي والترمذي، وهو مخرج في إرواء الغليل (٢٠٧٤) وغيره.

واتە: واز لەو شتە بهێنە کە ئەتخاتە گومانەوە بۆ ئەو شتەی کە لە گومان لات ئەبات.

## قاعیدەی چواردەهەم

## واجبێتی کارکردن بە حەدیسی صەحیح با کەسیش کاری پێ نەکات

ئیمام شافیعی ڕەحمەتی خوای لێ بێت لە ریسالە بەناوبانگەکەیدا دەفەرموێت:

عومەری کوڕی (خطاب) ﷺ لە سزای قرتاندنی پەنجە کەڵەدا بە پانزە ووشتر حوکمی دا، بەڵام کاتێك نامەکەی خاندانی عەمری کوڕی حەزمی بینی و تێیدا هاتبو کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (وَفِي كُلِّ أصبُعٍ مِمَّا هُنَالِكَ عَشرٌ مِنَ الإبِلِ) واتە: لە هەر پەنجەیەکی دەستدا دە ووشتر هەیە، عومەر و صەحابە چونە سەر ئەو حوکمە.

شافیعی دەفەرموێت: نامەکەی خاندانی عەمری کوڕی حەزمیان قەبوڵ نەکرد ـ والله أعلم ـ تا بۆیان دەرنەکەوت کە هی پێغەمبەری خوایە ﷺ.

لەم حەدیسەدا دوو بەڵگە هەیە:

یەکەمیان قەبول کردنی ئەو خەبەرە، دوەمیان قەبول کردنی خەبەر کاتێك کە سابت ئەبێت، با کاری هیچ کام لە ئیمامەکانیش وەك ئەو خەبەرە نەبوبێت کە عومەر ﷺ وەری گرتوە، هەروەها بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەگەر کارێك جێبەجێ بوو لەلایەن یەکێك لە ئیمامەکانەوە لەپاشان خەبەرێك لە پێغەمبەرەوە ﷺ پەیدا بوو کە پێچەوانەی کاری ئەو ئیمامە بێت ئەوە واز لە کاری

ئەو ئیمامە ئەهێنندرێ لەبەر خەبەرەکەی پێغەمبەر ﷺ. وە هەروەها بەڵگەی ئەوەیە کە حەدیسی پێغەمبەر ﷺ بە خودی خۆی سابت ئەبێت نەك بە کردەوەی کەسانی تر لە دوای ئەو[1].

## قاعیدەی پانزەهەم

### فەرمان کردنی یاسادانەر بە یەك تاکەکەس فەرمان کردنە بە هەمو تاکەکانی ئوممەت

ئەگەر یاسادانەری حەکیم گفتوگۆی لەگەڵ یەك کەسدا کرد لە نەتەوەدا یان حوکمێکی بەسەردا کرد، ئایا ئەم حوکمە گشتی ئەبێت لەناو نەتەوەکەدا مەگەر بەڵگەیەك هەبێت کە تایبەتی بکات؟ یان تایبەت ئەبێت بەو کەسەوە؟

زانایانی ئوصول لەوەدا جیاوازیان هەیە، وە قسەی حەقیش ئەوەی یەکەمیانە، وە هەر ئەوەشە کە شەوکانی و جگە لەو لە لێکۆڵەرەکان[2] پارسەنگیان داوەتەوە.

ئیبنو حەزم لە (أصول الأحكام) (٣/٨٨-٨٩) دا دەفەرموێت:

جا ئێمە یەقینمان هەیە کە پێغەمبەر ﷺ نێردراوە بۆلای هەرکەسێك کە زیندو بوە لە سەردەمی خۆیدا لە ئاوەدانی سەرزەوی چ ئینسان چ جنۆکە، هەروەها بۆ ئەو کەسەی کە لە دوای ئەو لە دایك ئەبێت هەتا ڕۆژی دوایی، تاوەکو حوکم بکات لە هەمو دیار و نادیارێکدا کە خوای گەورە دروستی ئەکات هەتا ڕۆژی دوایی، جا کاتێك ئەو قسەیە ڕاست بو بە ئیجماعی هەمو ئوممەت کە بێ‌گومان و بڕاوەیە و ڕاگەیەنراوە بەهۆی پێغەمبەرەوە ﷺ، هەروەها بەو دەقانەی سابتن لەسەر ئەوەی باسمان کرد کە دین هەتا ڕۆژی دوایی ئەمێنێتەوەو پێویستە لەسەر ئینسان و جنۆکە، وە زانیشمان بە زەرورەتی هەست کردن کە ڕێگا نیە بۆ بینینی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەو کەسانەی کە لە دوای ئەو دێن؛ ئەو کاتە فەرمان کردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ یەکێك لە جۆرێك و بۆ یەکێکی تر لە جۆرێکی تر فەرمانە بۆ هەمو جۆرەکان، وە ئەوەش ڕون کراوەتەوە کە هەرچی لە شەریعەتدا تایبەت بو بە کەسێکەوەو بە کۆمەڵێکەوە ئەوە پێغەمبەر ﷺ بە دەق ڕونی کردۆتەوەو ڕایگەیاندوە کە تایبەتە، هەروەك لە گیسکەکەدا حوکمی کرد بۆ ئەبو بوردەی کوڕی نیار، وە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێدا کە بۆ هیچ کەسێك لە دوای ئەو بری ناکەوێ.

وە فەرمان کردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەو ئافرەتەی کە هەمیشە لەحەیزدا بو، فەرمان بو بۆ هەمو ئافرەتێك کە هەمیشە لە حەیزدایە.

---

(١) (الرسالة ٤٣٣) تحقيق أحمد شاكر.

(٢) بگەڕێرەوە بۆ (أصول الفقه للشيخ محمد الخضيري)، (ل٢٠٨-٢٠٩).

وە دانانی جابیر و ئیبنوعەبباس لەلای ڕاستی‌یەوە حوکم کردنە بۆ هەمو موسڵمانێکی نێرو مێ کە بە تەنیا لەگەڵ ئیمامەکەیدا نوێژ ئەکات، وە لەلای هیچ کەسێك جیاوازی لەوەدا نی‌یە کە فەرمان کردنی پێغەمبەر بە یارەکانی ڕەزای خوایان لێ بێت لە کاتێکدا کە حازر بون، فەرمانە بۆ هەمو ئەوانەی کە لەمەودوا دێن هەتا ڕۆژی دوایی.

پاشان ئیبنوحەزم دەستی کردوە بە ڕەد دانەوەی هەرکەسێك کە جیاوازی ئەکات لە نێوان ئەصل و فەرعدا، جا بۆی بگەڕێرەوە.

ئەمە دوایی ئەوە بو کە بەرژەوەندی پێویستی کرد لێرەدا بیهێنم لە قاعیدەکانی حەدیسی و فیقهی، وە زۆر جێی داخە کە دانەری (فقه السنة) پابەند نەبوە پێیانەوە، یان -بە لایەنی کەمەوە- بەو شێوەیەی کە شایستەیە چاودێری نەکردون، لەگەڵ ئەوەشدا کە پەیوەندی‌یەکی بەتینیان هەیە لەگەڵ مەوضوعی کتێبەکەدا هەروەك بینیت، وە ڕون کردنەوەی هەمو ئەمانە لە جێگای خۆیاندا دێت لەم تەعلیقە بەسودەدا (إن شاء الله).

داوا لە خوای گەورە ئەکەم کە ڕاستی بکاتە پەیوەستی ئەو تەعلیقەو بەهۆی ئەوەوە سود بە برا موسڵمانەکانم بگەیەنێت لە هەمو وڵاتەکاندا، بەڕاستی ئەو بیسەرو وەڵام دەرەوەی پاڕانەوەیە.

**محمد ناصر الدين الألباني**

**دیمەشق ٣/ شەووالی / ١٣٧٣ کۆچی.**

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحَمدُ للهِ رَبِّ العَالَمِين، والصَّلاةُ والسَّلامُ عَلَى سَيِّدِ الأوَّلِينَ والآخِرِينَ وَعَلَى آلِهِ وَصَحبِهِ وَمَنِ اهتَدَى بِهَديِهِ إلَى يَومِ الدِّين.

لەپاشاندا:

ئەم کتێبە چەندەها باس و بابەتی لە فیقهی ئیسلامی گرتۆتە خۆ لەگەڵ بەڵگەکانیان بە ڕوونی و ئاشکرایی لە قورئان و سوننەتی صەحیح و ئەوەی ئەم ئوممەتە لەسەری کۆ بوون[1]. وە بە شێوەیەکی سووك و ئاسان خراوەتە بەردەم موسڵمانان، وە زۆر لەو شتانەی گرتۆتەوە کە موسڵمانان پێویستیان پێی هەیە، لەگەڵ خۆلادان لە باسی جیاوازی بیر و بۆچونی زانایان مەگەر جیاوازییەك نەبێ کە شایستەی باس کردنە ئەوە ئاماژەی بۆ ئەکەین.

بەم شێوەیەش وێنەیەکی ڕاست و دروستی فیقهی ئیسلامی ئەبەخشێت کە خوای گەورە بە (محمد) ی ﷺ ڕەوانەی کردووە، وە دەرگای تێگەیشتن لەسەر فەرموودەکانی خوا و پێغەمبەرەکەی واڵا دەکات، وە کۆشیان دەکاتەوە لەسەر کیتاب و سوننەت، وە خیلاف و بیدعە و دەمارگیری مەزهەبی لەبەین دەبات، هەروەها ئەو ووتە پوچە لە نێو دەبات کە دەڵێت: دەرگای هەوڵدان (الإجتهاد) داخراوە.

ئەم کارەش چەند هەوڵدانێکە مەبەستمان پێی خزمەت کردنی ئایینەکەمانە، و سوود گەیاندنە بە برا موسڵمانەکانمان، داواکارین لە خوا کە سوود بەخش بێت بۆیان، وە ئەم کردەوەیەمان بکاتە کردەوەیەکی خاوێن بۆ ڕەزای خوا، کە هەر ئەوە پشت و پەنامان.

دانەر: السيد سابق.

---

(١) ئەم ووتەیە بەشی زۆری ئەو بابەتانە ئەگرێتەوە نەك هەموویان، چونکە لە کتێبەکەدا زۆر فەرموودەی لاواز هەیە هەندێکیان بێ دەنگە لەسەرێ و هەندێکیشیان یا بە صەحیح یا بە حەسەنی زانیوە، لەمەشدا لاسایی کەسانی تری کردۆتەوە، وە هەروەها چەند مەسەلەیەك هەن کە کەم نین بەڵگەی لەسەر نەهێناوەتەوە، بەڵکو هەندێکیان بە پێچەوانەی بەڵگەکانەوەیە ئەمەش لە شوێنی خۆیدا ڕوون ئەکرێتەوە (تمام المنة، محمد ناصر الدين الألباني).

# سەرەتا

**(رسالة) پەیامی ئیسلام و گشتیەتی ئەو پەیامەو مەبەست لێی.**

خوای گەورە موحەممەدی ﷺ ناردووە بۆ سەر ئادەمیزاد بە ئایینێکی ڕاست و بەرفراوانەوە، وە بە شەریعەت و یاسایەکی تێکڕایی و کۆگرەوە، کە ژیانێکی پاك و پڕ ڕێز بۆ نەوەکانی ئادەم علیه السلام دابین دەکات و ئەیانگەیێنێتە بەرزترین پلەکانی پێش کەوتن و کەماڵ.

لە ماوەی نزیکەی بیست و سێ ساڵ دا کە پێغەمبەر ﷺ بەسەری بردووە بۆ بانگەواز کردنی خەڵك بۆلای خوا و ئاینەکەی، ئەوەی کە ویستی لە ڕاگەباندنی ئەو ئایینەو کۆ کردنەوەی خەڵك لەسەری بۆی جێ‌بەجێ بوو.

**گشتگیری پەیامەکە:**

پەیامی ئیسلام پەیامێکی کاتی و سنووردار نەبوو کە تایبەت بێت بە نەوەیەکەوە بێجگە لە نەوەیەکی تر و بە هۆزێکەوە بێجگە لە هۆزێکی تر، وەك پەیامەکانی پێش خۆی، بەڵکو پەیامێکی گشتی بوو بۆ هەموو ئادەمیزاد هەتا ژیان لەسەر زەوی دا هەبێت، وە تایبەت نیە بە وڵاتێکەوە بێجگە لە وڵاتێکی تر و بە سەردەمێکەوە بێجگە لەسەردەمێکی تر، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿تَبَارَكَ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ لِيَكُونَ لِلْعَٰلَمِينَ نَذِيرًا﴾ (الفرقان /١).

واتە: گەورە و پیرۆزە ئەو زاتەی کە قورئانی ناردۆتە خوارەوە بۆسەر بەندەکەی خۆی کە موحەممەدە ﷺ بۆ ئەوەی بۆ هەموو جیهانیان ترسێنەر بێت.

وە هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا﴾ (سبأ / ٢٨).

واتە: ئێمە تۆمان نەناردوە ـ ئەی محمد ـ تەنها بۆ ئەوە نەبێ کە بۆ هەموو خەڵك مزگێنی دەر و ترسێنەر بی.

وە هەروەها فەرموویەتی: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ

فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ ٱلنَّبِيِّ ٱلۡأُمِّيِّ ٱلَّذِي يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَكَلِمَٰتِهِۦ وَٱتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ﴾ (أعراف / ١٥٨).

واتە: ـ ئەی محمد ـ بڵێ ئەی خەڵکینە من نێرراوی خوام بۆ سەر ئێوە بە گشتی، ئەو خوایەی کە خاوەنی ئاسمانەکان و زەویە ، هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە جگە لەو، هەر ئەو توانای ژیاندن و مراندن و زیندو کردنەوەی هەیە، کەواتە ئێوەش باوەڕ بە خوا و نێرراوە نەخوێندەوارەکەی بهێنن، ئەو نێرراوەی باوەڕی بە خوا و ووشەکانی هەیە، وە شوێنی بکەون و پابەند بن بەوەی فەرمانتان پێ ئەدات، بە ئومێدی ئەوەی ڕێی ڕاست بگرن.

وە لە فەرموودەی صحیح دا هاتووە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (كَانَ كُلُّ نَبِـيٍ يُبْعثُ في قَومِهِ خَاصَّةً، وَبُعِثتُ إلى كُلِّ أحمَرٍ وَأسوَد) واتە: هەموو پێغەمبەران تەنها بۆ سەر نەتەوەی خۆیان ئەنێرران، بەڵام من بۆسەر هەموو ڕەش و سپیەك نێرراووم.

وە ئەوەی تەئکیدی گشتیەتی ئەم پەیامە ئەکات ئەمانەی خوارەوەیە:

١- شتێکی تێدا نیە کە باوەڕ پێ کردنی،خەڵك گران بێت یا کار پێ کردنی گران بێت لەسەریان، خوای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَا﴾ (البقرة / ٢٨٦).

واتە: خوا لە هیچ کەس داوای بەجێ هێنانی کارێك ناکات کە لە توانای زیاتر بێت.

هەروەها ئەفەرمووێت: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلۡيُسۡرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلۡعُسۡرَ﴾ (البقرة / ١٨٥)

واتە: خوا ئاسانی دەوێت بۆ ئێوە وە گرانی ناوێ بۆتان.

هەروەها ئەفەرمووێت: ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلدِّينِ مِنۡ حَرَجٖ﴾ (الحج / ٧٨).

واتە: خوا لە ئایینی ئیسلامدا شتێکی دانەناوە گران بێت لەسەرتان.

وە لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە لە ئەبی سەعدی مەقبورىيەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إنَّ هذا الدِّينَ يُسْرٌ وَلَنْ يُشَادَّ الدِّينَ أحدٌ إلا غَلَبَهُ)[1] واتە: ئەم ئاینە سووك و ئاسانە، هەرکەس لەسەر خۆی گران کرد بەسەریا زاڵ ئەبێت.

وە لە صەحیحی موسلیم دا بە مەرفوعی هاتووە: (أحبُّ الدِّينِ إلى الله الحنيفيةُ السمحةُ)[2] واتە: خۆشەویست ترینی ئاین لای خوا ئایینی ڕاست و ئاسانە.

٢- ئەو شتانەی کە بە پێی سەردەم و شوێن ناگۆڕێت، وەك: بیروباوەڕو عیبادات، ئەوە بە تەواوەتی ڕوون کراونەتەوە بە دەقەکان، کەوابوو بۆ کەس نیە لێی زیاد یا کەم بکات، وە ئەو شتانەی کە بە پێی کات و شوێن ئەگۆڕێن، وەك بەرژەوەندیيە شارستانیەکان و کاروباری ڕامیاری و جەنگی، ئەوە بە شێوەیەکی گشتی هاتون، و بۆ ئەوەی لەگەڵ بەرژەوەندیيەکانی خەڵك بگونجێت، لە هەموو کات و سەردەمێکدا، وە بۆ ئەوەی کاربەدەستەکان بیکەنە چرای ڕووناکی ڕێگایان بۆ بەرپا کردنی ڕاستی و دادپەروەری.

٣- هەموو ئەو (تعاليم) ئامۆژگاری و ڕێنومایيانەی کە تیایەتی مەبەست لێیان تەنها پاراستنی ئایین و پاراستنی گیان و پاراستنی عەقڵ و پاراستنی وەچە و پاراستنی سامانە، وە ئاشکراشە کە ئەوان ئەگونجێن لەگەڵ سروشت و عەقڵی ئادەمیزاددا و سازگارن لەگەڵ گۆڕانکاری و پێشکەوتنی شارستانیەتیدا، وە بۆ هەموو کات و شوێنێك دەست ئەدەن.

---

(١) هێنانی ئەم فەرمودەیە دوو شتی تێدایە:

یەکەم: (حديث) ی ئەبی سەعیدی مەقبوری، نە لای بوخارىيە و نە لای کەسانی تر بەڵکو لە (حديث) ی سەعیدی کوڕی ئەبی میقبەرىيەوەیە لە ئەبی هورەیرەوە. ـ تێبینی! وا دیارە لە نوسخەکانی تردا ئەم هەڵەیە چاك کراوە، چونکە لەو نوسخەیەدا کە بە دەستی شێخ ئەلبانیيەوە بوە ئەبو سەعیدی خودری نوسراوە. وەرگێڕ ـ

دووەم: ووشەی (هذا) لە بوخاریيەوە نیە بەڵکو ئەڵێت: (إن الدين يسرٌ...).

(٢) دانەر بۆ ئەوە چووە کە فەرموودەکە لاواز بێت لەبەر هێنانی بە شێوەی ئەگێڕنەوە (رُوِيَ) بەڵام فەرموودەکە ڕاستە، ئەبوایە دانەر سەنەدی فەرموودەکەی بە ڕاست و ڕێکی بهێنایە وەك (حافظ) لە (الفتح) دا هێناویەتی، وە هەروەها ریوایەت دانە پاڵ موسلیم هەڵەیەکی ترە چونکە ئەصلی نیە لە موسلیم دا بەڵکو بوخاری بە موعەللەقی هێناویەتی و لە (الصحيحة) دا تەخریجم کردوە. (تمام المنة / الألباني).

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِىٓ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزْقِ ۚ قُلْ هِىَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٣٢﴾ قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّىَ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَٱلْإِثْمَ وَٱلْبَغْىَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَأَن تُشْرِكُوا۟ بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا وَأَن تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾ (الأعراف/ ٣٢، ٣٣).

واتە: ـ ئەی محمد! ـ بڵێ: کێ حەرامی کردوە لەسەرتان جل و بەرگی جوان کە خوا کردویەتی بە جوانی و ڕازاندنەوە بۆ بەندەکانی، هەروا چێژ وەرگرتن لە ڕزق و ڕۆزی پاك؟ بڵێ: ئەو خواردن و جل و بەرگە حەڵاڵ کراوانە مافی بڕواداران و کەسانی تریشە لە ژیانی دنیادا، بەڵام لە ڕۆژی دوایی دا تەنها بۆ بڕوادارانە. ئا بەم جۆرە ئێمە نیشانەکان بۆ کەسانێ کە ئەزانن و تێ ئەگەن ڕون دەکەینەوە. بڵێ: خوا کار و کردەوەی ناشیرینی حەرام کردوە، هەروەها گوناح و ستەم کردنی بە ناهەق و ئەوەی کە شتێك بکەنە هاوبەشی خوا لە عیبادەت کردندا کە هیچ بەڵگەیەك لەسەری نەهاتوە، وە حەرامی کردوە ئەوەی کە نایزانن بۆ خوا هەڵیبەستن. ـ وەك ئەوە کە خوا کوڕی هەیە ، و وەك حەرام کردنی هەندێك خواردن ـ .

هەروەها فەرمویەتی: ﴿وَرَحْمَتِى وَسِعَتْ كُلَّ شَىْءٍ ۚ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِنَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٥٦﴾ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِىَّ ٱلْأُمِّىَّ ٱلَّذِى يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَىٰهُمْ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَٱلْأَغْلَٰلَ ٱلَّتِى كَانَتْ عَلَيْهِمْ ۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُوا۟ ٱلنُّورَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾ (الأعراف/ ١٥٦، ١٥٧).

واتە: ڕەحمەتو میهرەبانیم فراوانەو هەموو شتێك تەگرێتەوە، جا لە دواییدا ئەم ڕەحمەتەم بۆ کەسانێ دەنوسم کە خۆ لە کوفرو گوناح دەپارێزن و زەکات ئەدەن، وە بە تایبەت بۆ کەسانێ کە بە نیشانەکانی ئێمە بڕوا دێنن. وە ئەوانەی کە لە ناردراوی (خوا) پێغەمبەری نەخوێندەوار ﷺ پەیڕەوی دەکەن، ئەو پێغەمبەرەی کە نیشانەکانی لای خۆیان لە تەورات و ئینجیل دا نوسراوە پەیای دەکەن، بە چاکە و یەکتاپەرستی فەرمانیان پێ ئەدا و لە خراپەو هاوبەش دانان بەرگری‌یان دەکا، شتە پاکەکانیان بۆ حەلاڵ دەکا و شتە پیسەکانیان لێ حەرام دەکا، وە ئەو بارە گران و قورسانەی کە پێوەی گرفتار بوبوون لەسەریان لادەبا، جا ئەو کەسانەی کە بەو بڕوایان هێناو پشتیوانی و کۆمەکیان کرد، وە لە نوورێك کە لەگەڵی دا نازڵ کرابو، پەیڕەویان کرد، هەر ئەمانە ڕزگارن.

**مەبەست لە (رسالة) ی ئیسلام**

ئەو مەبەستەی کە پەیامی ئیسلام پەلی بۆ دەهاوێژێ، پاقژ کردنەوەی دەروونەکانە لە ڕێگەی ناسینی خوداو پەرستشی، وە بەتین کردنی پەیوەندی‌یە مرۆڤایەتی‌یەکان و دامەزراندنیانە لەسەر بناغەی خۆشەویستی و بەزەیی و برایەتی و یەکسانی و دادپەروەری، جا بەمەش ئادەمیزاد بەختەوەر ئەبێت هەم لە دنیا و هەم لە ڕۆژی دوایی، خوای گەورە ئەفەرموورێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِى بَعَثَ فِى ٱلْأُمِّيِّـۧنَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ﴾ (الجمعة / ٢).

واتە: خوای پاك و بێ‌گەردە کە لەناو نەخوێندەواراندا کەسێکی هەڵبژاردووە بە نێردراوی خۆی و ناردوویەتی بۆ ئەوەی ئایەتەکانی ئەو بەسەریاندا بخوێنێ و لە تاوان پاکیان بکاتەوە و فێری کتێب و حیکمەتیان بکات، هەرچەندە لەوە پێش ئەوان لە گومڕایی‌یەکی ڕوون و ئاشکرادا بوون.

وە هەروەها ئەفەرموورێت: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَـٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَـٰلَمِينَ﴾ (الأنبياء / ١٠٧).

واتە: ئێمە تۆمان نەناردووە مەگەر بە ڕەحمەت بۆ هەموو خەڵکی.

وە لە فەرموودەدا هاتووە دەفەرموورێت: (أَنَا رَحْمَةٌ مُهْدَاةٌ). واتە: من ڕەحمەتێکی بەخشراوم بە نەتەوەی ئیسلام.

## (تشريع) ی ئیسلامی یان فیقهی ئیسلام

یاسای ئیسلام لایەنێکە لە لایەنە هەرە گرینگەکان کە پەیامی ئیسلام دایڕشتووە و ڕێك و پێکی کردووە، ئەم لایەنەش لایەنە عەمەلی‌یەکەیە لەم پەیامەدا.

یاسای ئایینی ڕووت -وەك حوکمەکانی عیبادات- لە وەحی خواوە نەبێت بۆ پێغەمبەر ﷺ کە کیتاب و سوننەتە لە هیچ لایەکی ترەوە دەر نەئەچو، یا بە هۆی ئیجتهادێکی پێغەمبەرەوە ﷺ کە خواش پێی ڕازی ئەبوو، وە ئەرکی پێغەمبەریش ﷺ لە چوارچێوەی ڕاگەیاندن و ڕوون کردنەوە بەدەر نەبو، خوای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ ۝ إِنۡ هُوَ إِلَّا وَحۡيٞ يُوحَىٰ﴾ (النجم / ٣،٤).

واتە: ئەو بە ئارەزووی خۆی قسە ناکات. وە ئەو قورئانەش بێجگە لەوە کە وەحی بۆ دەکرێ شتێکی تر نیە.

بەڵام ئەو یاسایانەی کە پەیوەندی بە کاروباری دنیاوە هەیە، وەك کێشە ڕامیاری‌یەکان و جەنگی‌یەکان و غەزائیەکان، ئەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ درابوو بە ڕاوێژکاری ئەو کارانە بەجێ بگەیەنێت، وە جاری وا بووە ڕایەکی دەربڕیوە لەسەر کێشەیەك پاشان لێی پەشیمان بووەتەوە لەبەر ڕای هاوەڵەکانی، وەك لە جەنگی بەدر و ئوحوددا ئەمە ڕووی دا، وە هاوەڵەکانیشی (خوا لێیان ڕازی بێت) لە هەموو کارو بارێکدا ئەگەڕانەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ و پرسیاریان ئەکرد دەربارەی ئەو شتانەی لایان شاراوە بوو، وە هەروەها دەربارەی دەقە قورئانیە شاراوەکان پرسیاریان لێ ئەکرد، وە ئەو دەقانەی خۆیان لێی تێ ئەگەیشتن بۆ پێغەمبەریان ﷺ باس ئەکرد جاری وا ئەبوو بڕیار (إقرار) ی لەسەر ئەو تێگەیشتنەیان ئەدا، وە جاری وابوو لایەنی بۆچوونە هەڵەکانیانی ڕوون ئەکردەوە .

وە ئەو بنەما گشتیانەی کە ئیسلام دای ناوون بۆ ئەوەی موسڵمانان لەبەر ڕۆشنایی‌یەکەیدا بڕۆن ئەمانەن:-

١- قەدەغە کردنی گەڕان بە شوێن ئەو شتانەی کە ڕووی نەداوە هەتا ڕوو ئەدات، خوای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَسۡـَٔلُواْ عَنۡ أَشۡيَآءَ إِن تُبۡدَ لَكُمۡ

تَسُؤْكُمْ وَإِن تَسْأَلُواْ عَنْهَا حِينَ يُنَزَّلُ ٱلْقُرْءَانُ تُبْدَ لَكُمْ عَفَا ٱللَّهُ عَنْهَا وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ﴾ (المائدة / ١٠١).

**واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە لە شت گەلێ مەپرسن کە ئەگەر بۆتان دەرکەوێ نارەحەتتان بکا، وە ئەگەر لەکاتی ژیانی پێغەمبەردا و کاتی هاتنە خوارەوەی قورئاندا لەوانە پرسیار بکەن بۆ ئێوە ئاشکرا ئەبێ، خوا وازی لەو شتانە هێناوە و ئەوانی بەخشیوە لەوانە، وە خوا غەفور و ڕەحیمە.**

**وە لە (حدیث) دا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردبوو پرسیار لەو شتانە بکرێت کە هێشتا ڕووی نەداوە.**

**٢- دوور کەوتنەوە لە پرسیاری زۆر و کێشە ئاڵۆزو گرانەکان: لە (حدیث)دا هاتووە (إنَّ اللهَ كَرِهَ لَكُم قِيلَ وَقَال وَكَثرَةَ السُّؤالِ وَإضاعَةَ المَال).**

**واتە خوای گەورە ووتی و ووتی و پرسیاری زۆر و ماڵ بەفیڕۆ دانی پێ ناخۆشە.**

**هەروەها فەرموویەتی: (إنَّ اللهَ فَرَضَ فَرَائِضَ فَلا تُضَيِّعُوهَا وَحَدَّ حُدوداً فَلا تَعتَدُوهَا وَحَرَّمَ أشيَاءَ فَلا تَنتَهِكُوهَا، وَسَكَتَ عَن أشيَاءَ رَحمَةً بِكُم مِن غَيرِ نِسيَانٍ فَلا تَبحَثُوا عَنهَا).**

**واتە: خوا کۆمەڵێك شتی داناوە بە فەرز لەسەرتان مەیان فەوتێنن، وە چەند سنوورێکی داناوە مەیان بەزێنن، وە چەند شتێکی حەرام کردووە مەچن بەلایاندا، وە بەبێ لە بیر چوونەوە بێ دەنگی لە چەند شتێك کردووە، جا بۆیان مەگەڕێن چونکە خوا میهرەبانی لەگەڵدا کردوون.**

**وە هەر لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتووە فەرموویەتی: (أعظَمُ النَّاسِ جُرماً مَن سَألَ عَن شَيءٍ لَم يُحَرَّمْ فَحُرِّمَ مِن أجلِ مَسألَتِه).**

**واتە: تاوانبارترین کەس ئەو کەسەیە کە دەربارەی شتێك پرسیار ئەکات حەرام نەکراوە بەڵام بەهۆی پرسیارەکەی ئەوەوە حەرام ئەکرێت.**

**٣- دوور کەوتنەوە لە ناکۆکی و پەرتەوازە بوون لە ئایین دا، خوای گەورە ئەفەرموێت:** ﴿وَإِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً﴾ **(المؤمنون / ٥٢).**

**واتە: بەڕاستی ئایینی ئێوە ـ ئەی کۆمەڵی پێغەمبەران ـ یەك ئایینە کە ئیسلامە.**

وە هەروەها ئەفەرمووێت: ﴿وَٱعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُواْ﴾ (آل عمران / ١٠٣).

واتە: هەموو بە جارێك دەست بگرن بە کتێب و ئایینی خواوە و پەرت و بڵاو مەبن.

وە ئەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَنَٰزَعُواْ فَتَفْشَلُواْ وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ﴾ (الأنفال / ٤٦).

واتە: لەناو یەکدا ناکۆك مەبن بە جۆرێك دڵەکانتان پەرت و بڵاو ببێ، و لاواز بن و هێزو دەسەڵاتتان لەدەس بچێت.

وە ئەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمْ وَكَانُواْ شِيَعًا لَّسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍ﴾ (الأنعام / ١٥٩).

واتە: ئەو کەسانەی کە ئایینەکەیان پەرت و بڵاو کردووە و کۆمەڵ کۆمەڵ بوون، دوای ئەوەی کە کۆ بون لەسەر تەوحیدی خواو کارکردن بە شەرعی خوا، ئەوە تۆ ـ ئەی محمد! ـ لەوان بەریت.

هەروەها ئەفەرمووێت: ﴿وَكَانُواْ شِيَعًا﴾ (الروم / ٣٢).

واتە: پارچە پارچە و دەستە دەستە بوون.

هەروەها ئەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ تَفَرَّقُواْ وَٱخْتَلَفُواْ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ (آل عمران / ١٠٥).

واتە: ئێوەش ـ ئەی ئیمان داران ـ وەك ئەو خاوەن کتێبانە مەبن کە پارچە پارچە بوون و جیاوازی کەوتە نێوانیان دوای ئەوەی کە ئایین و ڕێنمایی‌یان بۆ هات، وە ئەوانە سزای سەخت و توندیان بۆ هەیە.

٤- گێڕانەوەی ئەو مەسەلانەی کە ناکۆکیان لەسەرە بۆلای کیتاب و سوننەت لەبەر ئەوەی خوای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿فَإِن تَنَٰزَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ﴾ (النساء / ٥٩).

واتە: ئەگەر لە شتێكدا جیاوازی و ناكۆكی كەوتە نێوانتان، ئەوە حوكمەكەی بگێڕنەوە بۆلای كتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەرەكەی ﷺ.

وە ئەفەرمووێ: ﴿وَمَا ٱخۡتَلَفۡتُمۡ فِيهِ مِن شَيۡءٖ فَحُكۡمُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِۚ﴾ (الشورى / ١٠).

واتە: لە هەر شتێكدا جیاوازیتان تێیدا هەبێ لە كاروباری ئایینەكەتان، ئەوە حوكمەكەی بگێڕنەوە بۆلای خوای گەورە.

چونكە ئەم ئایینە كتێبی خوا كە قورئانە ڕوونی كردۆتەوە، وەك خوای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿وَنَزَّلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ تِبۡيَٰنٗا لِّكُلِّ شَيۡءٖ﴾ (النحل / ٨٩).

واتە: ئێمە ئەم قورئانەمان ناردۆتە خوارەوە بۆسەر تۆ بۆ ڕون كردنەوەی هەموو ئەو شتانەی كە پێویستیان بە ڕوون كردنەوە هەیە، وەك ئەحكامی حەڵاڵ و حەرام و پاداشت و سزاو جگە لەمانە.

وە ئەفەرمووێت: ﴿مَّا فَرَّطۡنَا فِي ٱلۡكِتَٰبِ مِن شَيۡءٖۚ﴾ (الأنعام / ٣٨).

واتە هیچمان لەبیر نەكردووەو هەموو شتێكی گەورەو بچوكمان سابت كردوە لە (لوح المحفوظ) دا.

هەروەها ئەم ئایینە سوننەتی عەمەلی پێغەمبەر ﷺ ڕوونی كردۆتەوە، خوای گەورە فەرموویەتی ﴿وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ﴾ (النحل / ٤٤).

واتە: ئێمە ئەم قورئانەمان ناردۆتە خوارەوە بۆ تۆ ـ ئەی محمد ـ بۆ ئەوەی ئەو ماناو ئەحكامانە كە تیایەتی ڕوونی بكەیتەوە بۆ خەڵك.

هەروەها ئەفەرمووێت: ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ لِتَحۡكُمَ بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُۚ﴾ (النساء / ١٠٥).

واتە: ئێمە بە هەق ئەو قورئانەمان ناردووە بۆ تۆ تا لەنێوان خەڵكدا بەو شێوەیە حوكم بكەیت كە خوا نیشانی داوی.

بەمەش فەرمانی خوای گەورە جێ بەجێ بوو، وە نیشانەو دروشمەکانی ڕون بوەوە، وەك خوای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِى وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَـٰمَ دِينًا﴾ (المائدة / ٣).

واتە: ئەمڕۆ کار و فەرمانی ئایینەکەتان کە ئیسلامە بۆم تەواو کردن و نیعمەتەکانی خۆمم بە تەواوی بەسەردا ڕژاندن و ڕازی بووم بەوەی کە ئیسلام بێتە ئایینتان.

جا مادام مسئەلە ئایینیەکان بەو شێوەیە ڕوون کراونەتەوە، وە مادام ئەو بنەمایەی کە ئەبێ لەکاتی کێشەدا بۆی بگەڕێینەوە دیاریەیە، ئیتر ئیختلاف و چەند بەرەکێ تێیدا مانای نیە و ڕێی پێ نەدراوە، خوای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِى ٱلْكِتَـٰبِ لَفِى شِقَاقٍۭ بَعِيدٍ﴾ (البقرة / ١٧٦).

واتە: بەڕاستی ئەو کەسانەی لە فەرمانەکانی ئەم قوڕئانەدا ئیختلاف و جیاوازیان کرد لە لادان و دژایەتی‌یەکی دوور لە هەق و ڕاستین.

وە هەروەها فەرموویەتی: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا﴾ (النساء / ٦٦).

واتە: نا سوێند بە پەروەردگارت ئەوانە باوەڕدار نابن بە ڕاستی هەتا تۆ نەکەنە حەکەم لە کێشەی نێوانیاندا، پاشان لەو حوکمەی کە تۆ کردوتە هیچ گرێ و ناڕەحەتی‌یەك لە دڵیاندا هەست پێ نەکەن، وە بە تەواوی تەسلیمی دادوەری تۆ نەبن.

لەژێر ڕۆشنایی ئەم بنەمایانەدا هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ و ئەهلی ئەو سەدانەی کە دووای ئەوان هاتوون و پێغەمبەر ﷺ شایەتی داوە لەسەر چاکی‌یان بەڕێدا ڕۆیشتون، وە هیچ ناکۆکی و جیاوازی نەکەوتۆتە نێوانیان لە چەند کێشەیەکی دیاری دا نەبێت، ئەویش بە هۆی جیاوازی‌یان لە تێگەیشتنی دەقەکانی قوڕئان و ئەوەی کە هەندێکیان شتێکی ئەزانی و ئەوی تریان نەی ئەزانی.

پاشان کاتێ پێشەوای هەر چوار (مذهب)ەکان هاتن، شوێن بەرنامەی ئەوانەی پێش خۆیان کەوتن، بەڵام هەندێکیان نزیکتر بوون لە سوننەتەوە لە هەندێکی تریان، وەك حیجازی‌یەکان کە

بەشی زۆریان هەڵگری سوننەت و گێڕەوەی گوفتاری هاوەڵان و شوێنکەوتووانیان بوون، وە هەندێکی تریان نزیکتر بوون بەلای ڕەئی‌یەوە وەك: عیراقی‌یەکان کە کەمیان تیا بوو (حدیث) یان لەبەر بێت، لەبەر دووری وولاتەکەیان لە شوێنی هاتنە خوارەوەی (وحي).

ئەو پێشەوایانە ڕەحمەتی خوایان لەسەر بێت هەر چی لە توانایانا بوو کردیان و کۆشان بۆ ناساندنی ئەم ئایینە بە خەڵك و ڕێ نمایی کردنیان، وە قەدەغەشیان ئەکرد کە کەس (تقلید) لاسایی‌یان بکاتەوە، وە ئەیان ووت: (دروست نیە کەس ئەو قسانەی ئێمە بکات هەتا بەڵگەی ڕاستێتیان نەزانێ)، وە بە ڕاشکاوی ووتوویانە: (مذهب)ی ئێمە (حدیث)ی صەحیحە لەبەر ئەوەی ئەوان مەبەستیان نەبوو کەس (تقلید) یان بکاو شوێنیان بکەوێ وەك شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ. بەڵکو هەموو مەبەستیان ئەوە بووە یارمەتی خەڵك بدەن بۆ ئەوەی لە ئەحکامەکانی ئەم ئایینە تێ بگەن.

بەڵام دووای ئەوان خەڵك سارد بونەوەو وورەیان لاواز بوو، وە غەریزەی لاسایی کردنەوە و (تقلید) یان جوولا، هەر بۆیە هەر کۆمەڵێ (مذهب)ێکی دیاری کراوی بۆ خۆی هەڵبژارد، کە تێی بڕوانێ و ئیعتماد بکاتە سەری، وە دەمارگیری بکا بۆی، و بە هەموو توانای سەری بخات، و قسەی پێشەواکەی وەك فەرموودەی خوا و پێغەمبەر ﷺ لێ بکات، وە بۆ خۆی بە ڕەوای دانانێ کە فەتوایەك بدات پێچەوانەی ئەوە بێت کە پێشەواکەی دەری هێناوە و (إستنباط)ی کردووە، وە ئەوەندە زیادەڕەویان ئەکرد لە متمانە کردن بە پێشەواکانیان تا گەیشتنە ئەو ڕادەیەی (کەرخی) بڵێ: هەر ئایەت و (حدیث)ێ پێچەوانەی ئەو بیر و ڕایە بێ کە هاوەڵەکانمان هەیانە، ئەوە ئەو ئایەت و (حدیث)ە یا تەئویل کراوە یا مەنسوخە.

وە بەهۆی تەقلید و دەمارگیری بۆ مەزهەبەکان ئوممەتی ئیسلام ڕێنمایی وەرگرتنی لە قورئان و سوننەت لەدەست دا، وە ئەو قسەیە سەری هەڵدا کە گوایە دەرگای تێ کۆشان (الإجتهاد) داخراوە، بەو شێوەیە شەریعەت بوو بە خودی قسەکانی پێشەوا (مذهب) ی‌یەکان و پێشەوا (مذهبی) یەکانیش قسەکانیان بوو بە خودی شەریعەت، وە هەرکەس لەو قسانە دەربچێت بە (مبتدع) دائەنرێت و کەس باوەڕی پێ ناکات و نرخ بۆ فەتواکانی دانانێن.

وە ئەوەی یارمەتی بڵاو بوونەوەی ئەو بیر و بۆچوونە خراپەی دا ئەوە بوو کە کاربەدەستان و دەوڵەمەندەکان قوتابخانەیان دائەمەزراند، وە ئەبوایە تەنها (مذهب) ێکی دیاری کراو تێیدا بخوێنرایە، ئەمەش بووە هۆیەك لە هۆیەکانی بە پیرەوە چوونی خەڵك بۆ ئەو (مذهب) انە و دوور کەوتنەوەیان لە تێکۆشان (الإجتهاد)، لەبەر پاراستنی ئەو مووچانەی بۆیان دانرابوو!

ئەبو زورعە لە بەلقینی مامۆستای پرسی: هۆی چیە (تقي الدين السبكی) ئیجتهاد ناكات خۆ هەموو پێویستی‌یەكانی ئیجتیهاد كردنی تەواوە؟ بەلقینی بێ دەنگ بوو، ئەبو زورعەش خۆی وەڵامی خۆی دایەوە و ووتی: من وا تێ ئەگەم ئەو مووچانەی دانراوون بۆ زانایانی چوار (مذهب)ەكە رێی لێ گرتووە، چونكە هەركەس لەوە دەرچوو مووچەی نادرێتێ و بێ بەش ئەكرێت لە دادوەری (القضاء)، وە خەڵك لێی دوور ئەكەونەوە و پرسی پێ ناكەن و بە بیدعەچی ئەناسن، بەلقینی مامۆستای دەستی كردە پێكەنین و لەسەر ئەوە یەكڕا بوون.

وە بەهۆی خۆبەستن بە تەقلیدەوەو لەدەست دانی رێنمایی بە كیتاب و سوننەت و قەول كردن بەوەی كە دەرگای ئیجتهاد بەسراوە، ئوممەت كەوتە گێژاوی شەڕ و بەڵاوە ـ لە لاسایی كردنەوی گاورو جولەكەدا ـ چووە ناو كونی سوس مارەوە كە پێغەمبەر ﷺ ئوممەتەكەی لێ ئاگادار كردبۆوە.

لە ئەنجامی ئەوەدا نەتەوەی ئیسلام پارچە پارچە بوو وە بوو بە كۆمەڵ كۆمەڵ، هەتا ئیختیلاف و جیاوازی گەیشتە ئەو رادەیە كە ئایا حەنەفی (مذهب) مارە ئەكرێت لە شافیعی (مذهب)، جا هەندێكیان فەتوایان داوە كە دروست نیە، چونكە ئافرەتی شافیعی (مذهب) گومانی هەیە لە ئیمانەكەی خۆی - لەبەر ئەوەی كە شافیعی‌یەكان بە رەوای ئەزانن موسڵمان بڵێ: من ئیماندارم (إن شاء الله) واتە: (إن شاء الله) بەكار بهێنن لەو قسەیەدا- وە هەندێكیان فەتوای دروستی‌یان داوە بە پێی قیاس لەسەر ئافرەتی (ذمي) واتە: هەروەك چۆن دروستە ئافرەتی (ذمي) بهێنرێ هەروەها ئافرەتی شافیعی (مذهب)یش دروستە، هەروەها لە ئەنجامی ئەوانەدا بیدعە بڵاو بووەوە، و شوێنەوار و مەشخەڵی سوننەت شاررایەوە و بیر و هۆش لە جوڵە كەوتن و چالاكی فكری راوەستا، و سەربەخۆیی زانستی فەوتا، ئەمەش بووە هۆی لاواز بوونی كەسایەتی نەتەوەو لەدەس دانی رۆحی بەرهەم هێنەری، وە رێی بەرەو پێش چونی لە ئوممەت گرت، ئیتر بەهۆی ئەمەوە دوژمنانی ئیسلام كەلێنیان دی‌یەوە بۆ هاتنە ناو كرۆكی ئیسلامەوە.

ساڵان تێ پەڕین و سەدەكان كۆتایی‌یان هات، بەڵام خوای گەورە لە هەر سەردەمێك دا تازە كەرەوەیەكی ناردووە تاوەكو ئایینەكەیان بۆ تازە بكاتەوە و لە خەوی بێ ئاگایی بێداریان بكاتەوە، و بەرەو رێی راستیان رەوانە بكات، بەڵام ئوممەت نەئەگەیشتنە ئەوەی بە ئاگا بێنەوە جارێكی تر دەگەڕانەوە بۆ سەر دۆخی جاران، بەڵكو خراپتر لەوەش.

لە كۆتایی دا كار سەری كێشا بۆ ئەوەی كە یاسادانان و تەشریعی ئیسلامی كە خوا ژیانی هەموو خەڵكی پێ دامەزراندبوو، وە كردبویە چەكێك بۆ ژیانی رۆژانەو دووا رۆژیان، شۆڕ بێتەوە بەرەو كەندەڵانێك كە بێ وێنە بێ لە سامناكی‌دا، وە سەر بەرەو خوار بێتەوە بەرەو شیوێكی

تێکشکێنەر، هەتا وای لێ هاتووە خۆ خەریك کردن پێوەی تێك دەری عەقڵ و دڵەو بەفیڕۆ دەری کاتە، کە نە سوود بەخشە بۆ دینی خواو نە ڕێکخەر، بۆ ژیانی خەڵکی.

وە ئەمەش نمونەیەکە لەوەی زانایانی دوایی نووسیویانە: (ابن عَرَفَة) پێناسەی ئیجارەی کردووە وتویەتی: فرۆشتنی سودی ئەو شتانەیە کە بتوانرێت بگوێزرێتەوە، جگە لە کەشتی و ئاژەڵ کە بەشێکی تر بریتی نادرێتەوە لە خۆی نەبێت، هەندێکی وەك هەندێکی دیکەیەتی ئەگەر لێك جیا کرانەوە، یەکێ لە قوتابی‌یەکانی ڕەخنەی لێ گرت و پێی ووت: پێویست بە ووتنی هەندێك ناکات، چونکە ئەو ووشەیە لێرەدا لەگەڵ کورتی و پوختی دا نایاتەوە، مامۆستاش دوو ڕۆژ وەستا لە پاشاندا بە ووشەیەکی بێ سوود وەڵامی دایەوە.

بەو شێوەیە یاسادانان (تشریع) لەو ئاستەدا وەستا و زانایان تەنها (متون) ناوەڕۆکیان دەرنەبڕی، جگە لە پەراوێز و ئەو ڕەخنە و مەتەڵۆکانە نەبێ کە تێ‌یدایەو ئەو تەقریراتە نەبێ کە لەسەری نوسراوەتەوە هیچی تریان نەدەزانی.

هەتا ئەوروپا هەڵی کوتایە سەر ڕۆژهەڵات، بە دەستی شەپلاغەی لێ ئەدا و بە قاچیشی پێ‌لەقەی پێدا ئەدا. ئیتر ئەوە بوو بەو لێدانانە ڕاست بۆوە، وە کە ئاوڕی دایەوە بەلای ڕاستی و بەلای چەپیدا خۆی بینی ئەوا دووا کەوتووە لەکاروانی ژیانی کە بەرەو پێش دەڕوا، وە خۆی بینی‌یەوە کەوا دانیشتووە و کاروانەکەش بەرەوپێش دەڕوات، لەناکاو خۆی بینی لەبەردەم جیهانێکی نوێدا کە هەرهەمووی پڕە لە ژیان و توانایی و بەرهەم هێنان، جا بۆیە ئەم دیمەنە ڕای چڵەکاند و سەری سوڕماند، پاشان ئەو کەسانەی کە سپلە بوون لەئاست مێژووی خۆیان و بەدکار بوون لەگەڵ باو و باپیرانیان و دین و ڕەوشتی خۆیان وڕێ کردبوو هاواریان کرد! ئائەوە وڵاتانی ئەوروپایە ئەی خەڵکی ڕۆژهەڵات، دە ئێوەش ڕێگەی ئەوان بگرن و لاسایی ئەوان بکەنەوە لە خێرو شەڕ و باوەڕو بێ باوەڕیدا و لە تاڵی و شیرینی دا.

وە مێشك ووشکەکانیشیان هەڵوێستێکی سەلبی ڕاوەستان، هەر (لاحول ولا قوة إلا بالله و إنا لله..) یان بوو، وە سەری خۆیان کز کردبوو و ماڵەکانی خۆیان بەجێ نەئەهێشت، جا ئەمەش لای هەڵخەڵەتاوەکان بەڵگەیەکی تربوو لەسەر ئەوەی کە شەریعەتی ئیسلام لەگەڵ پێشکەوتنی شارستانیەتیدا ناڕوا بەرێوە، و لەگەڵ ڕۆژگارا نایەتەوە، پاشان ئەنجامی حەتمی ئەمەش ئەوەبوو کە یاسای نامۆی بێگانە زاڵ بوو بەسەر ژیانی خەڵکی ڕۆژهەڵاتدا، هەرچەندیش پێچەوانەی ئایین و نەریت و خوڕەوشتی‌یانە، ئیتر بەو شێوەیە خووڕەوشتی ڕۆژئاوایی‌یەکان ماڵەکان و کۆڵان و شەقامەکان و یانەکان و قوتابخانە و خوێندنگاکانی گرتەوە، بەجۆرێك ئەوڕم و شەپۆلی بەتینتر دەبێ و زاڵ دەبێ بەسەر هەموو گۆشە و کەنارێکدا، هەتا خەریك بوو خەڵکی ڕۆژهەڵات دین و نەریتی

خۆیان لەبیر بچێتەوە و پەیوەندی بپچڕێنن لەنێوان ئێستا و ڕابوردوویان، بەڵام ئەم زەوی‌یە چۆڵ نابێت لەوکەسانەی کە بەڵگەکانی ئایینی خوا ڕوون ئەکەنەوە، هەربۆیە بانگەوازچیانی (إصلاح) چاکە کاری ڕاست بوونەوە و بانگەوازی ئەو کەسانەیان کرد کە بە ڕۆژئاوایی‌یەکان هەڵخەڵەتاون: ووشیار بن، دەست بەردار بن لە پڕو پاگەندە کردنتان، چونکە بەڕاستی ئەو فسادە ڕەووشتی‌یەی کە ڕۆژئاوایی‌یەکان هەیانە هەر ئەبێ سەریان پێ بکێشێ بۆ سەرەنجامێکی پیس و خراپ، وە مادام ئەوان خوو ڕەووشتی خۆیان چاك نەکەن بە بیر و باوەڕی ڕاستەقینە و ڕەوشتی بەرز و پەسەند، زانستەکانیان هەڵ ئەگەڕێتەوە و ئەبێتە ئامێری وێران کاری، و شارستانیەتەکەیان ئەبێتە ئاگر و بە ئێجگاری هەڵیان ئەلوشێ: ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ ۝ إِرَمَ ذَاتِ ٱلْعِمَادِ ۝ ٱلَّتِي لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِي ٱلْبِلَٰدِ ۝ وَثَمُودَ ٱلَّذِينَ جَابُوا۟ ٱلصَّخْرَ بِٱلْوَادِ ۝ وَفِرْعَوْنَ ذِى ٱلْأَوْتَادِ ۝ ٱلَّذِينَ طَغَوْا۟ فِى ٱلْبِلَٰدِ ۝ فَأَكْثَرُوا۟ فِيهَا ٱلْفَسَادَ ۝ فَصَبَّ عَلَيْهِمْ رَبُّكَ سَوْطَ عَذَابٍ ۝ إِنَّ رَبَّكَ لَبِٱلْمِرْصَادِ﴾ (الفجر / ٦-١٤).

واتە: ئایا نەتبینی و نەتزانی پەروەردگارت چی لە گەلی عاد ـ هۆزی إرم ـ کرد؟ (تیرەیەکی ناسراون لە یەمەن) کە بەهێزو لە خۆ بایی بوون و خاوەنی کۆشکی ستوندار بوون، کەوا وێنەی ئەوان لە هیچ شارێکدا ساز نەدرابوو. وە چی کرد لە سەموود کە لەو دۆڵەدا کە تیا ئەژیان بەردیان هەڵئەکۆڵی و خانوویان لێ ئەتاشی، هەروەها فیرعەونی خاوەن سوپا کە وەك سنگ مڵك و دەسەڵاتیان ڕاگرتبو. ئا ئەوانە ـ عادو سەمودو فیرعەون ـ کە ستەمکاریان کرد لەشارەکانی خوادا، و فسادی زۆریان تێدا کرد، جا پەروەردگارت سزایەکی سەختی بەسەرا باراندن، بەڕاستی پەروەردگارت لە کەمین دایە و چاودێری ئەوانە ئەکا کە نافەرمانی ئەکەن.

هەروەها ئەو بانگەواز چیانە هاوار ئەکەن لەو مێشك ووشکانە، وەرن سەرچاوەی ڕوون و زوڵاڵ و ڕێنمایی جوان لەبەر دەمتانایە، وەرن بەرەو سەرچاوەی قورئان و ڕێنمایی سوننەت، ئایینی خۆتان لەو دوانە وەربگرن، وە مژدەی ئەو دووانە بدەن بەکەسانی تریش، ئەوکاتە ئەم دنیا سەر لێشێواوە بەهۆی ئێوەوە ئەگەڕێنەوە سەر ڕێی ڕاست، و ئەم مرۆڤایەتی‌یە چەوساوەیە بەختیار ئەکەن، ﴿لَّقَدْ

كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُواْ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْأَخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا﴾ (الأحزاب / ٢١).

**واتە: بەڕاستی بۆ ئێوە ـ ئەی ئیمانداران! ـ لە ـ ووتارو کرداری ـ ڕەسولی خوادا ﷺ نمونەی چاك هەیە، بۆ ئەوانەی کە هیوایان بە ڕەحمەتی خوا و ڕۆژی دوایی هەیەو یادی خوا زۆر دەکەن.**

وە لە فەزڵی خواوە کۆمەڵێك پیاوانی چاك بەرەو پێی ئەم بانگەوازە هاتن و دڵانێکی پاك و دڵسۆز وەریان گرت، وە لاوانێك پەیڕەویان لێ کرد کە نازیز ترین شتێك کە هەیانە لە ماڵ و لە گیان لە پێناویدا بەختیان کرد.

جا ئایا خوا ڕێی داوە کە نوورەکەی سەرلەنوێ لەسەر زەوی هەڵبێتەوە؟ وە ئایا مەبەستیەتی کە ئادەمیزاد بە ژیانێکی ئاسودەیی بژی، ژیانێك کە ئیمان و خۆشەویستی و چاکەو دادپەروەری باڵی بەسەردا بکێشێ؟ ئەم چەند ئایەتە شایەتن لەسەر ئەوە: ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا﴾ (فتح / ٢٨).

**واتە: خوای پاك و بێ‌گەردە کە پێغەمبەری خۆی بە ڕێنمایی و دینی هەقەوە ناردووە تا ئەو دینە بەسەر هەموو دینێکدا سەر بخا، وە بەسە کە خوا شایەدی ئەمە بێ.**

هەروەها: ﴿سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ﴾ (فصلت / ٥٣).

**واتە: بە زوویی نیشانەکانی خۆمان لە ئاسۆکانی ئاسمانەکان و زەویداو ئەو ڕوداوە گەورانەی تیایانا ڕو ئەدات نیشان ئەدەین، هەروەها لە دەرون و گیانی خۆشیانا، تا بۆیان دەربکەوێ بە شێوەیەك کە گومانی تێدا نەبێ کە بەڕاستی ئەو قورئانە هەقەو ئەوەی هێناویەتی ڕاستگۆیە. ئایا شایتی پەروەردگارت بۆ ئەمە بەسیان نیە، لە کاتێکدا کە خوا ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکداو هیچ شتێك لە شایەتی ئەو گەورەتر نیە.**

# (الطهارة) پاك و خاوێنی

**ئاوه‌كان و به‌شه‌كانی**

**به‌شی یه‌كه‌م له‌ ئاوه‌كان: ئاوی (مطلق).**

حوكمی ئه‌م ئاوه‌ ئه‌وه‌یه‌ كه‌ خاوێن كه‌ره‌وه‌یه‌، واته‌: خۆی له‌ خۆیدا خاوێنه‌ و شته‌ پیسه‌كانیش پاك ده‌كاته‌وه‌، كه‌ ئه‌م جۆره‌ ئاوانه‌ ئه‌گرێته‌وه‌:

١- ئاوی باران، و به‌فر، و ته‌رزه‌:-

به‌ پێی فه‌رمووده‌ی خوای گه‌وره‌ كه‌ ئه‌فه‌رموورێت: ﴿وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً لِّيُطَهِّرَكُم بِهِۦ﴾ (الأنفال / ١١).

واته‌: خوای گه‌وره‌ له‌ هه‌وره‌كانه‌وه‌ ئاو (باران) ێكی بۆ ئێوه‌ نارد (باراند) تا به‌وه‌ پاكتان بكاته‌وه‌.

هه‌روه‌ها ئه‌فه‌رموورێت: ﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً طَهُورًا﴾ (الفرقان / ٤٨).

واته‌: له‌ ئاسمانه‌وه‌ ئاوێكی خاوێن و خاوێن كه‌ره‌وه‌مان بۆ ناردوون.

وه‌ به‌ پێی ئه‌وه‌ی كه‌ (أبو هريرة) ئه‌ی گێرێته‌وه‌ كه‌ پێغه‌مبه‌ر ﷺ دووای دابه‌ستنی نوێژ پێش خوێندنی سووره‌تی فاتیحه‌ ماوه‌یه‌ك بێ ده‌نگ ئه‌بوو منیش پێم ووت: (ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا! ﷺ دایك و باوكم به‌ قوربانت بێ ئه‌و ماوه‌یه‌ی ده‌وه‌ستیت له‌نێوان نوێژ دابه‌ستن و خوێندندا چی‌یه‌ و چی تێدا ئه‌فه‌رموویت ؟ ئه‌ویش فه‌رمووی: ئه‌ڵێم (اللَّهُمَّ بَاعِد بَيني وَبَينَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدتَ بَينَ المَشرقِ وَالمَغرِبِ، اللَّهُمَّ نَقِّنِي مِن خَطَايَايَ كَمَا يُنَقَّى الثَّوبُ الأبيَضُ مِنَ الدَّنَسِ، اللَّهُمَّ اغسِلنِي مِن خَطَايَايِ بِالثَّلج وَالمَاءِ وَالبَرَدِ) رواه الجماعة إلا الترمذي.

واته‌: ئه‌ڵێم: خوایه‌ نێوان من و تاوانه‌كانم ئه‌وه‌نده‌ی نێوان خۆرهه‌ڵات و خۆرئاوا دوور بخه‌ره‌وه‌، خوایه‌ چۆن جل و به‌رگی سپی له‌ چڵك و پیسی پاك ئه‌كرێته‌وه‌ به‌و شێوه‌یه‌ش من له‌ تاوانه‌كانم پاك بكه‌ره‌وه‌، خوایه‌ به‌ به‌فر و ئاو و ته‌رزه‌ بمشۆره‌ له‌ تاوانه‌كانم.

٢- ئاوی ده‌ریا.

بەپێی ئەوەی کە (أبو هريرة) ئەگێڕێتەوە: پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەر کرد ﷺ ووتی: ئەی نێرراوی خوا ! ئێمە بەسەر دەریادا هاتوچۆ دەکەین لەگەڵ خۆمان ئاو کەم هەڵ ئەگرین ئەگەر دەستنوێژی پێ بشۆین تینوومان ئەبێت و بێ ئاو دەکەوین، ئایا بە ئاوی دەریا دەس نوێژ بگرین؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (هُوَ الطَّهُورُ مَاؤُهُ الحِلُّ مَيتَتُهُ) رواه الخمسة.

واتە: ئاوی دەریا پاکە و پاك کەرەوەیە، وە خواردنی مردارەوەبووەکانی حەڵاڵە (ترمذي) دەفەرموێت: ئەم (حديث) ە (حسن صحيح) ە وە پرسیاریشم لە موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی بوخاری کردووە دەربارەی ئەم (حديث)ە ؟ فەرمووی: (حديث) ێکی صەحیحە.

٣- ئاوی زەمزەم.

بە پێی ئەوەی کە لە عەلی یەوە رضي الله عنه گێڕدراوەتەوە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ داوای دۆڵچەیەکی کرد لەئاوی زەمزەم و لێی خواردەوە و دەس نوێژیشی پێ گرت. (ئەحمەد گێڕاویەتی-یەوە)[1].

٤- ئەو ئاوەی بە زۆر مانەوە دەگۆڕێت، یا بەپێی ڕەنگی ئەو شوێنەی تێیدایە ڕەنگی ئەگۆڕێت یا شتێکی تێکەڵ ئەبێت بەزۆریش لێی جیا نابێتەوە و ڕەنگەکەی ئەگۆڕێت وەك قەوزە و گەڵای درەخت، ئەم جۆرە ئاوانەش ناوی ئاوی ڕەها نەیان گرێتەوە، بە ڕێکەوتنی زانایان.

وە ئەصل لەم باسەدا ئەوەیە کە هەرچی ئاوی پێ بووترێت (مطلقاً) بەگشتی بێ بەستنەوە (تقييد)، ئەوە دروستە خۆی پێ پاك بکرێتەوە، وەك خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَلَمْ تَجِدُواْ مَآءً فَتَيَمَّمُواْ﴾ (المائدة / ٦).

(١) لە دوو لاوە ڕەخنەی لێ ئەگیرێت، یەکەمیان: لە گێڕانەوەی ئەحمەد نیە بەڵکو لە زیادەکانی عبد الله ی کوڕی ئەحمەدە (١/٧٦/الزوائد).

دووەمیان: هێنانی بەو سیغەیە هەست بەوە دەکرێت لاواز بێت، پێچەوانەی (بنەمای سیانزەهەمە) لەبەر ئەوەی فەرموودەکە ئیسنادەکەی (جيد)ە وەك لە (إرواء الغليل)دا هاتووە ژمارە (١٣)، وە ئەحمەد شاکر ڕەحمەتی خوای لێ بێت بە صەحیحی داناوە لە تەعلیقەکەیدا لەسەر (المسند) (٢/١٩/٥٦٤) وە دانی بەوەدا ناوە کە ئەو فەرموودەیە لە (الزوائد)ە (تمام المنة).

**دووەم لە ئاو ـ ئاوی بەكارهاتووە:**

ئاوی بەكارهاتوو ئەو ئاوەیە لە ئەندامەكانی لەشی دەس نوێژ گر یا خۆشۆر جیا ئەبێتەوە لەكاتی دەس نوێژ گرتن و خۆشۆردندا.

حوكمی ئەم ئاوەش ئەوەیە كە پاكەو پاك كەرەوەیە وەك ئاوی ڕەها (مطلق)، یەكسانن بە پێی (اصل)، چونكە ئەمیش پاك و پاك كەرەوە بووە، وە هیچ بەڵگەیەك نیە ئەم جۆرە ئاوە لە خاوێنی و خاوێن كەرەوەیی دەربكات.

وە لەم بارەیەوە حەدیسەكەی (ربیع) ی كچی (معوذ) هەیە كە باسی چۆنیەتی دەس نوێژ گرتنی پێغەمبەر ﷺ ئەكات دەفەرمووێت: (پێغەمبەر ﷺ مەسحی سەری كرد بەو ئاوەی بە هەردوو دەستیەوە مابۆوە) ئەحمەد و ئەبوداود گێڕاویانەتەوە. وە (لفظ) ی ئەبو داود بەم شێوەیە: پێغەمبەر ﷺ مەسحی سەری كرد بە ئاوێ كە بە دەستیەوە بوو.

وە لە (أبی هريرة) ەوە هاتووە كە جارێكیان لە یەكێ لە ڕێگاكانی مەدینە بە لەش گرانیەوە ئەگات بە پێغەمبەر ﷺ، خۆی ئەشارێتەوە، پاشان ئەچێت خۆی ئەشوات و دێتەوە، پێغەمبەر ﷺ پێی ئەفەرمووێت: (أبو هريرة) ئەوە لە كوێ بووی، ئەمیش ئەڵێت: لەشم گران بوو حەزم نەكرد بە پیسی لەگەڵتا دابنیشم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (سُبحَانَ الله إنَّ المُؤمِنَ لا يَنجِس) رواه الجماعة.

واتە: پاك و بێ گەردی بۆ خوا، بەڕاستی ئادەمیزادی باوەڕدار پیس نابێت.

جا ئەوەی لەم فەرموودەیە وەرئەگیرێت ئەوەیە ئەگەر باوەڕدار ئەگەر پیس نەبێت، كەواتە لە چ ڕوویەكەوە ئەو ئاوە وا لێ ئەكات لە خاوێنی و خاوێن كەرەوەیی بكەوێت، هەر لەبەر ئەوەی بەر لاشەی كەوتووە، چونكە ئەو پەڕی ئەوەیە پاكێك بە پاكێك گەیشتووە، و ئەمەش زیانی نیە.

(إبن منذر) دەفەرموێت: لە عەلی و ئیبنو عومەر و ئەبی ئومامە و (عطاء) و حەسەن و مەكحول و (نخعي) یەوە گێڕدراوەتەوە فەرمویانە: ئەگەر كەسێك مەسحی سەری لەبیر چوو تەڕی بە ڕیشیەوە مابوو، ئەو تەڕیەی بەسە بۆ مەسحی سەری، ئەمەش ئەبێتە بەڵگەی ئەوەی ئەوان ڕایان لەسەر ئەوە بووە كە ئاوی بەكارهاتوو پاكە و پاك كەرەوەشە، وە منیش ئەو ڕایەم هەیە، ئەم بۆچوونەش یەكێكە لەو ریوایەتانەی لە مالیك و شافعیەوە هاتوون، وە ئیبنو حەزم داوێتیە پاڵ سوفیانی (ثوري) و ئەبی (ثور) و هەموو ئەوانەی لەسەر مەزهەبی (ظاهر) ین.

بەشی سێهەم: ئەو ئاوەی شتی پاكی تێكەڵ بووە

ئەو شتە پاکانەش وەك: سابون و زەعفەران و ئارد و ئەو شتانەی بەزۆری لە ئاوەکە جیا نەکرێنەوە.

حوکمی ئەم جۆرە ئاوەش ئەوەیە کە خاوێنە و خاوێن کەرەوەیە، بە مەرجێك ناوی ئاوی (مطلق)ی بەسەرەوە بمێنێ، بەڵام کاتێ لەو گشتی‌یەتەی دەرچوو وای لێ هات ناوی ئاوی ڕەها (مطلق) ی پێوە نەما ئەوە خۆی لە خۆیدا پاك ئەبێت، بەڵام شتانی تری پێ پاك نابێتەوە، لە (أم عطية)وە هاتوە کە فەرموویەتی: پێغەمبەر ﷺ کاتێ زەینەبی کچی کۆچی دوایی کرد هات بۆلامان و فەرمووی: سێ جار یا پێنج جار یا زیاتر، هەرچەندە خۆتان بە باشی ئەزانن بیشۆرن بە ئاو و سیدر، لە دوواناودا کافوری تێ بکەن یا شتێك لەکافوری تێ بکەن، وە کاتێ لێ بوونەوە پێم ڕابگەیەنن، ئەفەرموێت: کاتێ لێ بووینەوە پێمان ڕاگەیاند، هات ئیزارەکەی خۆی داینێ و فەرمووی: (أشعِرْنَهَا إيَّاهُ) واتە بیکەنە کراس و یەکەم جار ئەوەی بۆ لەبەر بکەن (رواه الجماعة).

مردوویش بە شتێك نەبێت کە دروستە زیندووی پێ بشۆرێت ناشۆررێت.

وە لای ئەحمەد و نەسائی و ئیبنو خوزەیمە هاتووە لە (حديث)ی ئومموهانیئەوە کە: پێغەمبەر ﷺ و مەیمونەی خێزانی بە ئاوی تەشتێکی هەویراوی خۆیان شۆردووە.

لەو دوو باسەدا ئاو بە تێکەڵی ناوی هاتووە، بەڵام ئەو تێکەڵی‌یە نەی گەیاندۆتە پلەیەك ناوی ئاوێتی لەسەر لابردبێت.

بەشی چوارەم: ئەو ئاوەی پیسی بەرکەوتبێت

ئەویش دوو حاڵەتی هەیە:

یەکەم: ئەو پیسی‌یە تام یان ڕەنگ یان بۆنی ئەو ئاوەی گۆڕی بێت لەم حاڵەتەدا دروست نیە شتی پێ پاك بکرێتەوە بە ڕای هەموو زانایان، (ابن منذر) و (ابن ملقن) ئەمەیان نەقڵ کردووە.

دووەم: ئاوەکە بە ئاوی ڕەها (مطلق) بمێنێتەوە بەوەی کە تام یا ڕەنگ یا بۆنی نەگۆڕێ. حوکمی ئەم جۆرە ئاوەش ئەوەیە خاوێن و خاوێن کەرەوەیە زۆر بێت یا کەم، بەڵگەی ئەمەش حەدیسەکەی ئەبی هورەیرەیە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموێت: پیاوێکی دەشتەکی هەڵسا لەناو مزگەوتدا میزی کرد. خەڵکەکە بۆی هەڵسان لێی بدەن پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (دعوه وأرِيقُوا على بولِهِ سَجْلاً من ماءٍ، فإنما بُعِثْتُم مُيَسِّرِيْن ولم تُبْعَثُواْ مُعَسِّرِيْن) رواه الجماعة إلا مسلماً.

واتە: وازی لێ بهێنن و دۆڵچەیەك ئاو بکەن بەسەر میزەکەیدا، ئێوە بۆ ئەوە نەنێرراون کە شت گران بکەن، بەڵکو بۆ ئەوە نێرراون شت ئاسان بکەن لەسەر خەڵك.

وە (حدیث) ی ئەبی سەعیدی خودری ڕەزای خوای لێ بێت کە ئەفەرمووێت: ووترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! لە ئاوی بیری (بضاعة) دەست نوێژ بگرین ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (المَاءُ طَهُورٌ لاَيُنَجِّسُهُ شَيءٌ) رواه أحمد والشافعي وأبو داود والنسائي و الترمذي وحسنه.

واتە: ئاو خاوێن و خاوێن کەرەوەیە هیچ شتێك پیسی ناکات.

ئیمامی ئەحمد دەفەرمووێت (حدیث)ەکەی بیری (بضاعة) صەحیحە، وە یەحیای کوڕی مەعین و ئەبی موحەممەدی کوڕی حەزم بە صەحیحیان داناوە، ئیبنو عەبباس و ئەبو هورەیرە و حەسەنی بەصری و ئیبنو موسەییب و عیکریمەو ئیبنو ئەبی لەیلا و (ثوری) و داودی (ظاهر)ی و نەخەعی و مالیك و چەند زانایەکی تر ئەم ڕەئیەیان هەیە، وە غەزالی ووتوویەتی: زۆرم حەز ئەکرد (مذهب)ی شافیعی لە ئاوەکاندا وەك (مذهب)ی مالیك بوایە. بەڵام حەدیسەکەی عەبدوڵلای کوڕی عومەر خوا لێیان ڕازی بێت کە ئەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذَا كَانَ المَاءُ قُلَّتَينِ لَم يَحمِلِ الخَبَثَ) رواه الخمسة.

واتە: ئەگەر ئاو گەیشتە ڕادەی قولەتەین پیسی هەڵناگرێ.

ئەم (حدیث)ە سەنەد و مەتنەکەی (مضطرب)ە[1].

ابن عبدالبر لە تەمهیددا ئەفەرمووێت: ئەوەی شافیعی بۆی چووە لە فەرموودەی قوللەتەیندا (مذهب) ێکی (ضعیف) ە لە ڕووی تێڕووانین و لێکۆڵینەوە، وە لە ڕووی (أثر) یشەوە (ثابت) نیە.

## بەرماوە – السؤر

بەرماوە: ئەو ئاوەیە لە دەفرەکاندا ئەمێنێتەوە دووای خواردنەوە ئەمیش چەند جۆرێکە:-

١- بەرماوەی ئادەمیزاد:

---

(١) منیش ئەڵێم: وا نیە بەڵکو (حدیث)ێکی صەحیحە، کۆمەڵێك بە صەحیحیان داناوە لەوانە ئەبو جەعفەری (طحاوی) حەنەفیە، وە ئەو (إضطراب) تێکەڵ و پێکەڵیەی ئیشارەتی پێ کردووە لە هەندێك ڕێگای لاوازی-یەوەیەتی، وەك لە صەحیحی ئەبو داود دا (٥٦-٥٨) ڕوونم کردۆتەوە، وە لە (إرواء الغليل) دا (٢٣-١٧٢) ئیشارەتم بۆ کردووە، بەڵێ واتای فەرموودەکە پێچەوانەی گشتی یەتی فەرموودەکەی ئەبی سەعیدە کە ئەفەرمووێت: (المَاءُ طَهُورٌ لاَيُنَجِّسُهُ شَيءٌ)، وە لەم بەشەدا پشتی پێ ئەبەسترێت وەك ئیبنو قەییم شەرحی کردووە لە (تهذيب سنن أبي داود) دا، با ئەو کەسەی ڕاستی ئەوێت بگەڕێتەوە بۆی چونکە باسێکی کەم وێنە و گرنگە، وە هەروەها با بگەڕێتەوە بۆ (السيل الجرار) ی شەوکانی (١/٥٥). (تمام المنة).

ئەم جۆرە بەرماوەیەش پاکە، چ هی موسڵمان بێت یا کافر یا لەش گران یا ئافرەتی بێ نوێژ، بەڵام ئەوەی کە خوای گەورە فەرموویەتی دەربارەی بێ باوەڕان: ﴿إِنَّمَا الْمُشْرِكُوْنَ نَجَسٌ﴾ واتە: بەڕاستی بێ باوەڕەکان پۆخڵن، مەبەست لەو پۆخڵیە پۆخڵی دەروونیە لە ڕووی ئەوەوە کە باوەڕێکی پوچیان هەیە و لە ڕووی ئەوەوە کە خۆ لە پیس و پەڵۆخی ناپارێزن، نەك لەبەر ئەوە خۆیان و لاشەیان پیسە، چونکە بێ باوەڕەکان لەسەرەتای ئیسلامەوە تێکەڵ بە موسڵمانان ئەبوون و نێراویان ئەهاتنە لای پێغەمبەر ﷺ، وە ئەچوونە ناو مزگەوتەکەشی‌یەوە، هەرگیزیش پێغەمبەر ﷺ فەرمانی نەئەکرد بە شۆردنی ئەو شتانەی لاشەی بێ باوەڕەکان بەری کەوتوون، وە لە عائشەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرموێت: (کات بووە بێ نوێژ بووم ئاوم خواردۆتەوە لە قاپێکدا دوایی داومەتە دەس پێغەمبەر ﷺ لێی ئەخواردەوە و دەمی ئەنا بە شوێن دەمی منەوە) (موسلیم گێڕاویەتی‌یەوە).

٢- بەرماوەی ئەو شتانەی گۆشتیان ئەخورێت:

بەرماوی ئەمانەش پاکە چونکە لیکەکانیان لە گۆشتی خاوێنەوە پەیدا ئەبێ و حوکمی ئەو وەرئەگرێت، ئەبوبەکری کوڕی (منذر) دەفەرموێت: زانایان هەموو لەسەر ئەوە کۆن کە بەرماوەی ئەو شتانەی گۆشتیان ئەخورێت دروستە بخورێتەوە و دەست نوێژی پێ بگیرێت.

٣- بەرماوەی هێستر و گوێ درێژ و دڕندە و باڵندە گۆشت خۆرەکان:

بەرماوەی ئەمانەش پاکە بە پێی ئەو حەدیسەی کە جابیر ڕەزای خوای لێ بێت ئەگێڕێتەوە: پرسیار کرا لە پێغەمبەر ﷺ ئایا دەس نوێژ بگرین بەو ئاوەی کە لەبەر گوێ درێژ ئەمێنێتەوە؟ فەرمووی: (نَعَم، وَبِمَا أَفْضَلَتِ السِّبَاعُ كُلُّها) أخرجه الشافعي والدارقطني والبيهقي[1].

---

(١) ئەم (حدیث) ە لاوازە وەك ئەوەی لە مەجموع (١/١٧٣) دا فەرموویەتی: من ئەم (حدیث)ەم بۆیە هێناوە هەرچەندە لاوازە چونکە مەشهورە لە کتێبی هاوەڵەکاندا، لەوانەیە هەندێکیان پشتیان پێ بەستبێت، جا منیش ئاگادارم کردنەوە لەسەری. بەڵام قسەکەی بەیهەقی کە باس کراوە دیارە لە (السنن الكبرى) دایە (١/ ٢٤٩/ - ٢٥٠)، کە حەدیسەکەی تەخریج کردوە، مەبەستی لەو سەنەدانەدایە کە ئەچێتەوە سەر داوودی کوڕی حوصەین لە بلوکی‌یەوە ، هەرچەندە هەموشیان لاوازن وەك قسەکەی بەیهەقی خۆشی ئەیگەیەنێت، چونکە لەو داوودە ناو براوەیە. پاشان ئەو حەدیسە مەتنەکەشی مونکەرە چونکە پێچەوانەی (حدیث)ی قولتەینە کە ئەفەرموێ: «ئەگەر ئاو گەیشتە قولتەین پیسی هەڵناگرێ». (ابن التركماني) لە (الجوهر النقي) دا (١/٢٥٠) ووتویەتی: ڕووالەتی ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بەرماوەی دڕندە پیسە، چونکە ئەگەر وانەبێ ئەو مەرجە سودی نابێت. (تمام المنة).

واته: بەڵێ وە بەو ئاوەی لەبەر هەموو دڕندەکان ئەمێنێتەوە، بەیهەقی ئەفەرمووێت: ئەم فەرموودەیە چەند سەنەدێکی هەیە ئەگەر هەموویان بخرێنە پاڵ یەك بەهێز ئەبێت.

وە لە ئیبنو عومەرەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ شەوێك دەرچوو لە یەکێك لە سەفەرەکانیدا و بەلای کابرایەکدا تێپەڕی کە دانیشتبوو لەلای دۆلاوێکی خۆیەوە، عومەر ڕەزای خوای لەسەر بێت فەرمووی: ئەمشەو دڕندە دەمی نەخستۆتە دۆلاوەکەتەوە ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی خاوەن دۆلاو پێی مەڵێ ئەمە خۆ ماندووکەرە! ئەوەی دڕندە کردوویەتی‌یە زگی‌یەوە بۆ خۆیەتی و ئەوەشی لەبەری ماوەتەوە بۆ ئێمە خواردنەوەیەکی خاوێنە. (دارقطني) گێڕاویەتی‌یەوە[1]. وە لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە هاتووە کە (عومەر لەگەڵ کۆمەڵە سوارێك کە عەمری کوڕی عاصیشی تێدا بوو ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە سەر دۆلاوێك، عەمر ووتی، ئەی خاوەن دۆلاو ئایا دڕندە دێتە سەر دۆلاوەکەت؟ عومەر بە کابرای فەرموو: پێمان مەڵێ، چونکە ئێمە دەچین بەسەر دڕندەدا و ئەوانیش دێن بەسەر ئێمەدا) مالیك لە (الموطأ) دا گێڕاویەتی‌یەوە[2].

٤- بەرماوەی پشیلە:-

بەرماوەی پشیلە پاکە، بەپێی ئەو فەرموودەی کەبشەی کچی کەعبی ژنی ئەبی قەتادە، دەفەرمووێت: ئەبو قەتادە هاتە ماڵمان ئاوم بۆ کردە قاپێکەوە، لەولاوە پشیلەیەك هات دەمی تێ

---

(١) هەروەها ئەمەش لاوازە، لە ریوایەتەکەدا کە لەلای (دارقطني) یە (١/٢٦) ئەییوبی کوڕی خالیدی حەڕڕانی تێدایە، (حافظ ابن حجر) دەفەرمووێت (ضعیف)ە وە ئەو ئەییوبە لەگەڵ لاوازی‌یەکەی (اضطراب) یشی لە سەنەدەکەی کردووە... ، وە (حافظ ابن حجر) لە (التلخیص) دا ئاماژەی بۆ لاوازی ئەم (حدیث) ە کردووە، شەوکانیش بە دوایدا لە (السیل الجرار) (١/٦٠) دا. (تمام المنة).

(٢) ئەم (اثر) ە لە (الموطأ) دا (١/٤٦) بەم جۆرەیە: لە یەحیای کوڕی سەعید لە موحەممەدی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حاریسی تەیمی‌یەوە لە یەحیای کوڕی (عبدالرحمن) ی کوڕی (حاطب) ەوە کە عومەر... هتد.

کەواتە ئەسەرەکە لە یەحیای کوڕی (عبدالرحمن)ەوەیە نەك یەحیای کوڕی سەعید هەروەك لە کتێبەکەدا هاتووە، ڕەنگە ئەمە هەڵەی پێنووس بێت لە دانەرەوە، یان هەڵەی چاپ بێت. هەروەها بەیهەقی (١/٢٥٠) لە ڕێگای مالیکەوە دەیگێڕێتەوە، وە (دارقطني) (١/٢٢) لە ڕێگای حەممادی کوڕی زەید لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە.

پاشان ئەم ئەسەرە لاوازە (ثابت) نی‌یە لە عومەرەوە، لەبەر ئەوەی ئەم کوڕەی (حاطب) نەگەیشتووە بە بینینی عومەر ڕەزای خوای لێ بێ، چونکە لەسەردەمی خیلافەتی (عثمان) دا خوا لێی ڕازی بێت، لە دایك بووە.

هەر بۆیە نەوەوی لە (المجموع) دا (١/١٧٤) تەئکیدی کردوە کە ئەو ئەسەرە موڕسەلێکی (منقطع)ە، بڕوانە (تمام المنة).

خست، ئەبو قەتادەش قاپەکەی بۆ لار کردەوە هەتا تێری خواردەوە، دەفەرمووێت: ئەبو قەتادە منی بینی تەماشای ئەکەم، ووتی: ئەوە لات سەیرە برازا ؟ ووتم: بەڵێ، ووتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (پشیلە پیس نیە، پشیلە لەوانەن کە زۆر هاتوچۆتان ئەکەن) رواه الخمسة، وە (ترمذي) ووتوویەتی: (حديث حسن صحيح) وە بوخاری و جگە لەویش بە صەحیحیان داناوە.

٥- بەرماوی سەگ و بەراز:-

ئەم جۆرانە بەرماوەیان پیسن، پێویستە دوورە پەرێزی‌یان لێ بکرێ. ئەما بەرماوەی سەگ، ئەوە بەپێی ئەو (حديث)ەی کە بوخاری و موسلیم ئەیگێڕنەوە لە ئەبی هورەیرەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (إذا شَرِبَ الكلبُ في إناءِ أحَدِكُم فَلْيَغْسِلهُ سَبْعاً).

واتە: ئەگەر سەگ دەمی خستە قاپی کەسێکتانەوە با حەوت جار بیشوات،

وە لای ئەحمەد و موسلیم ئاوا هاتووە: (طَهُورُ إناءِ أحَدِكُم إذا وَلَغَ فِيهِ الكَلْبُ أن يَغْسِلَه سبعَ مَرَّاتٍ أولاهُنَّ بِالتُّرَابِ).

واتە: (ئەگەر سەگێك دەمی خستە قاپی کەسێکتانەوە، پاك کردنەوەکەی ئەوەیە حەوت جار بیشوات یەکەم جاریان بە قوڕاو).

ئەما بەرماوەی بەراز، ئەوە لەبەر پیس‌و پەڵۆخی خۆیەتی.

## النجاسة (پیسی)

(النجاسة) ئەو شتە پیسی‌یەیە کە پێویستە لەسەر موسڵمان خۆی لێ بپارێزێ، و ئەگەر بەر شوێنێکی کەوت ئەبێ بیشوات و شوێنەکەی پاك بکاتەوە، خوای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ﴾ (المدثر/٤) واتە: جل و بەرگەکەشت خاوێن رابگرە.

هەروەها ئەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ﴾ (البقرە/٢٢٢) واتە: بەڕاستی خوا تۆبەکاران و خۆ خاوێن کەرەوەکانی خۆش ئەوێت، وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الطُّهُوْرُ شَطرُ الإيمَان). واتە: خۆ بە خاوێن ڕاگرتن نیوەی باوەڕە. وە (نجاسة) چەند باسێکی لەسەرە وا لە خوارەوە ئاماژەیان بۆ ئەکەین:

جۆرەکانی پیسی (أنواع النجاسات) :

١- مردارەوەبوو:

مردارەوەبوو ئەوەیە خۆی گیانی لەدەس دابێت بێ ئەوەی سەر برابێت بە سەربڕینی شەرعی، ئەمە ئەو پارچانەش ئەگرێتەوە کە لە ئاژەڵی زیندوو لێ ئەکرێتەوە، واتە ئەو پارچانەش هەر بە مردارەوەبوو دائەنرێت، بەپێی ئەوەی ئەبی واقیدی (لیثي) ئەگێرێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ما قُطِعَ مِن البَهِيمةِ وَهِيَ حَيَّةٌ فَهُوَ مَيْتَةٌ) رواه أبوداود والترمذي وحسنه.

واتە: هەرچی لە ئاژەڵی زیندوو ببڕدرێت ئەو بڕراوە مردارەوە بووە.

(ترمذي) ئەڵێ: زانایانیش هەر لەسەر ئەوە ئەڕۆن.

بەڵام ئەمانەی خوارەوە لە مردارەوەبوو جیا ئەکرێنەوەو حوکمی مردارەوەبوویان نیە، وەك:-

أ- ماسی و کوللەی مردارەوەبوو، ئەم دووانە پاکن و گۆشتەکەیان ئەخورێ بەپێی فەرموودەکەی ئیبنو عومەر خوایان لێ رازی بێت کە ئەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أُحِلَّ لَنَا مَيْتَتَانِ ودَمَانِ ؛ أمَّا المَيْتَتَانِ فالحوتُ والجرادُ، وأما الدمان فالكَبِدُ والطِّحَالُ) رواه أحمد والشافعي وابن ماجة والبيهقي والدارقطني، والحديث ضعيف.

واتە: دوو جۆر مردارەوەبوومان بۆ حەلاڵ کراوە لەگەڵ دوو جۆر خوێن، دوو مردارەوەبووەکە ماسی و کوللەن، دوو خوێنەکەش جگەر و سپڵن، ئەم (حدیث)ە (ضعیف)ە بەڵام ئیمام ئەحمەد وەقفەکەی بە صەحیح داناوە وەك: ئەبو زورعە و ئەبو حاتیم ووتوویانە، وە ئەم شێوە وەقفەش حوکمی رەفعی هەیە لەبەر ئەوەی کاتێ صەحابە بڵێت: ئەوەمان بۆ حەلاڵ کرا یا ئەوەمان لێ حەرام کرا، وەك ئەوە وایە بڵێ: فەرمانمان بەوە پێ کراوە یا ئەوەمان لێ قەدەغە کراوە، وە لە پێشەوە لەسەر ئاوی دەریا باسی ئەو (حدیث)ەمان کرد کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (هُوَ الطَّهُورُ مَاؤُهُ الحِلُّ مَيْتَتُهُ) واتە: دەریا ئاوەکەی پاکە و خواردنی گۆشتی مردارەوەبووی حەلاڵە.

ب- مردارەوەبووی ئەو شتانەی خوێنیان نیە وەك: مێروولە و هەنگ و وێنەی ئەوانە، ئەوانە پاکن و ئەگەر کەوتنە ناو شتێکەوە و تێیدا مردار بوونەوە ئەو شتە پیس ناکەن، (ابن منذر) فەرموویەتی: نەم بیستووە خیلاف هەبێت لەنێوان زانایاندا لەسەر پاکی ئەو شتانەی باسمان کرد، جگە لەوەی لە شافیعی‌یەوە گێڕراوەتەوە، وە ئەوی بە ناوبانگ بێت لە (مذهب)ەکەیدا ئەوەیە کە ئەوانە کاتێ کەوتنە ناو شلەمەنی‌یەوە پیسن و (عفو) یان لەسەرە، بە مەرجێ رەنگی ئەو شلەمەنیە نەگۆڕێ.

ج- ئێسك و شاخ و سم و نینۆك و توك و پەڕ و پێستەی مردارەوەبوو وە هەرچی‌یەكیش لە جینسی ئەوانە بوو ئەوا هەر هەموویان پاكن، چونكە ئەصل لە هەموو ئەوانەدا پاكی‌یە، وە بەڵگەش لەسەر پیسی‌یان نی‌یە[1].

زوهری دەربارەی ئێسكی مردارەوەبوو وەك: ئێسكی فیل و شتی تر دەفەرمووێت: (كەسانێكم لە زانایانی سەلەف بینیوە بەو ئێسكانە سەر و ڕیشیان داهێناوە و چەوری‌یان پێ لە خۆ داوە بە بێ ئەوەی شتێكی تیا ببینن) بوخاری گێڕاویەتی‌یەوە.

وە لە ئیبنو عەبباسەوە خوا لێ‌یان ڕازی بێت هاتووە فەرمویەتی: (مەڕێك بە خێر درابوو بە كارەكەرێكی مەیمونەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ، پاش ماوەیەك مردار بووەوە، پێغەمبەر ﷺ بەلای لاكەكەیدا تێ‌پەڕ بوو فەرمووی: (هَلَّا أَخَذتُم إِهَابَهَا فَدَبَغتُمُوهُ فَانتَفَعتُم بِهِ؟) رواه الجماعة.

واتە: نەئەبوو كەوڵی بكەن و كەوڵەكەی خۆش بكەن و كەڵكی لێ وەربگرن؟ ووتیان: مردار بۆتەوە، فەرمووی: (هەر خواردنی گۆشتەكەی حەرام كراوە).

ئیبنوماجە ئەفەرمووێت: مەڕەكە مەڕی مەیمونە بووە، وە لە بوخاری و نەسائی دا باسی خۆش كردنی تێدا نی‌یە.

وە لە ئیبنو عەبباسەوە هاتوە كە ئەم ئایەتەی خوێندۆتەوە: ﴿قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٖ يَطۡعَمُهُۥٓ إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيۡتَةً أَوۡ دَمٗا مَّسۡفُوحًا أَوۡ لَحۡمَ خِنزِيرٖ فَإِنَّهُۥ رِجۡسٌ﴾ (الأنعام / ١٤٥). تا كۆتایی ئایەتەكە.

واتە: ـ ئەی محمد! ـ بڵێ: لەوەدا كە بۆ من هاتووە بە وەحی هیچ شتێكی حەرام كراو شك نابەم بۆ كەسێك كە بیخوا لەو ئاژەڵانەی كە ئێوە ئەڵێن حەرام كراوە، مەگەر ئەوەی كە مردارەوە بوبێ، یان خوێنی ڕژاو بێ، یان گۆشتی بەراز بێ ئەوە ـ ئەو سێ شتە ـ پیسن.

---

(١) نەخێر بەڵگە هاتووە لەسەر پیسی پێستی مردارەوەبوو لە چەند فەرموودەیەكی ناسراوی زۆر، وەك فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: (إِذَا دُبِغَ الإِهَابُ فَقَد طَهُرَ) واتە: «پێستی مردارەوەبوو ئەگەر خۆش كرا ئەوە پاك دەبێتەوە» (مسلم) و جگە لەویش دەیگێڕنەوە... جا نازانم بۆچی دانەر خۆی لەمە لاداوە؟! وە بە ڕاستی سەیر لەوەدایە كە هەر لەم بابەدا حەدیسەكەی ئیبنوعەبباسی باس كردووە، كە بە ڕاشكاوی باس لەوە دەكات كە سوودی لێ‌وەر ناگیرێت لە دوای خۆش كردن نەبێت... بەڵام دانەر لە كۆتایی ئەم بابە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕاستی‌یە لە ژێر ناونیشانی «پاك كردنەوەی پێستی مردارەوە بوو» دا. بڕوانە (تمام المنة).

وه فرمویه‌تی: «ئەوەی كه خوا حەرامی كردووه له مردارەوەبوودا تەنها ئەوەیه كه ئەخورێ ئەویش گۆشته، ئەما پێست و قەیتان له چەرم و ددان و ئێسقان و مو و خوری ئەوه حەلاڵن» رواه ابن المنذر وابن أبي حاتم.

وه هەروەها پەنیر و شیلاوگ (بۆ پەنیر دروست كردن) و شیری مردارەوەبوو خاوێنه، چونكه صەحابه كاتێ شارەكانی عێراقیان فەتح كرد، له پەنیری مەجوسەكانیان خوارد، هەرچەنده به شیلاوگ دروست ئەكرێت، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو شتانەی ئەوان سەری ئەبڕن هەروەك مردارەوەبوو ئەژمێردرێ.

وه سابت بوه له سەلمانی فارسی‌یەوه خوا لێی ڕازی بێت، كاتێ دەربارەی شتێ له پەنیر و ڕۆن و فەروه پرسیاری لێ كرا، فەرمووی: حەلاڵ ئەوەیه خوا له كیتابەكەیدا حەلاڵی كردووه، وه حەرام ئەوەیه خوا له كیتابەكەیدا حەرامی كردوه، وه ئەوەی باسی نەكردووه ئەوه لەو شتانەیه كه لێ بووردنی لەسەره واته: (عفو)ه، وه ئاشكرایه كه پرسیارەكه دەربارەی پەنیری مەجوسەكان بوو، پرسیارەكەیان كاتێ سەلمان جێگری عومەری كوڕی (خطاب) بوو لەسەر مەداین.

٢- خوێن (الدم).

جا یەكسانه خوێنەكه خوێنی ڕژاو بێت وەك ئەو خوێنەی له شتی سەربڕاو ئەڕوات، یا خوێنی بێ نوێژی ئافرەتان بێ، بەڵام ئەوه هەیه كەمێ خوێن عەفوی لەسەره، وه له ئیبنو جوره‌یجەوه هاتووه دەربارەی ئەم فەرموودەی خوا: ﴿أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا﴾ (الأنعام/١٤٥) ئەڵێت: (المسفوح)، واته: ڕژاو. بەڵام ئەو خوێنەی لەناو دەمارەكانی سەربڕاودا ئەمێنێتەوه قەیناكه، ئیبنو مونذیر ریوایەتی كردووه.

وه پرسیار له ئەبی میجلەز كراوه دەربارەی ئەو خوێنەی به شوێنی بڕاوەكەوه ماوەتەوه، یا ئەو خوێنەی كاتی كوڵاندنی ئەكەوێتە سەر مەنجەڵ، فەرمووی: قەی ناكات، تەنها خوێنی ڕژاو حەرام كراوه (عەبدی كوڕی حومەید و ئەبی شەیخ ریوایەتیان كردووه).

وه له عائیشەوه هاتوه ڕەزای خوای لێ بێ دەفەرموورێت: ئێمه گۆشتمان ئەخوارد و خوێنیش خەت خەت بەسەر مەنجەڵەكەوه بوو.

حەسەن دەفەرموورێت: بەردەوام موسڵمانان به برینەكانیانەوه نوێژیان دەكرد. (بوخاری گێراویەتی‌یەوه) وه به صەحیحی هاتووه كه عومەر خوا لێی ڕازی بێت نوێژی كردووه و خوێن له برینەكانی ئەڕژێشت. (حافظ) له (الفتح) دا باسی كردووه وه ئەبی هورەیره دڵۆپ و دو دڵۆپی به

خراپ نەئەزانی لە نوێژدا[1]. بەڵام خوێنی کێچ و ئەو خوێن و ئاوەی کە لە دومبەڵەکانەوە دێنە دەرەوە عەفویان لەسەرە بە پێی ئەو (آثار)انە. وە پرسیار لە ئەبی میجلەز کرا دەربارەی ئەو کێم و

(۱) لەم فەصلەدا چەند شتێك هەیە دانەر لێی نەکۆڵاوەتەوە نە لە ڕووی (حدیث) ی‌یەوە وە نە لە ڕووی فیقهی‌یەوە:
لە ڕووی (حدیث) ی‌یەوە ئەم شتانەی تێدایە:

یەکەم: قسەی دانەر لە بارەی ئەسەرەکەی حەسەنەوە کە ئەڵێت: (ذکره البخاري) بە هەڵەدا چووەو وا ئەزانێت (موصول)ە لەلای بوخاری، لە کاتێکدا ئەو بە (معلق)ی ریوایەتی کردوە بێ سەنەد، بەڵام ئیبنو ئەبی شەیبە بە سەنەدێکی (صحیح) وەصلی کردوە، هەروەك لە (الفتح) دا (۱/۲۸۱) هاتووە.

دووەم: دانەر کە ئەڵێت: «ئەبی هورەیرە دڵۆپ و دو دڵۆپی بە خراپ نەئەزانی لە نوێژدا» بێ‌دەنگ بووە لەسەری و وای زانیوە کە (ثابت)ە لە ئەبو هورەیرەوە، بەڵام وا نی‌یە، لەبەر ئەوەی سەنەدەکەی (ضعیف)ە شورەیکی کوڕی عەبدوڵڵای (قاضي) تێدایە (ضعیف) ە لەبەر (سوء حفظه)، وە هەروەها شێخەکەی لەم سەنەدەدا عیمرانی کوڕی موسلیمە. پاشان جگە لەوەی ئەم (حدیث)ە (ضعیف)ە پێچەوانەی ئەو حەدیسەیە کە بە صەحیحی هاتووە لە ئەبو هورەیرەوە: (لا وُضُوءَ إلَّا مِن حَدَثٍ) واتە: دەستنوێژ تەنها بە شت هاتنە دەرەوە لە پێش و پاش دەشکێت. (رواه البخاري معلقاً ووصله إسماعیل القاضي بإسناد صحیح). هەروەك (حافظ) دەفەرموێت وە بە مەرفوعیش هاتووە بە (لفظ)ی (إلَّا مِن صَوتٍ أو رِیحٍ) واتە ناشکێت مەگەر بە دەنگ یان بۆن، (وهو مخرج في المشكاة ۳۱۰/التحقیق الثاني) و (الإرواء ۱/۱٤٥و۱٥۳). هەروەها پێچەوانەی (حدیث)ی ئەنصاری‌یەکەیە کە هەستا بۆ شەونوێژ، موشرکێك تیرێکی تێ گرت، ئەمیش تیرەکەی دەرهێنا، بەردەوام بوو تا سێ تیری لێ‌دا، پاشان رکوعی بردو سەجدەی بردو بەردەوام بوو لەسەر نوێژەکەی و خوێنەکەشی بە شەپۆل ئەهات. بڕوانە (صحیح أبي داود ۱۹۳) وە ئەم ڕووداوە حوکمی مەرفوعی هەیە، چونکە عادەتەن دوورە کە پێغەمبەر ﷺ ئاگای لە شتی وا نەبووبێ، جا ئەگەر خوێنی زۆر هۆ بێت بۆ بەتاڵبوونەوەی دەست نوێژ ئەوە پێغەمبەر ﷺ ڕوونی دەکردەوە چونکە دوا خستنی ڕون کردنەوە دروست نی‌یە وەك مەعلومە لە (علم الأصول) دا. وە لە فەرزێکدا شاراوەش بووایە لە پێغەمبەر ﷺ، خۆ شاراوە نەئەبوو لەو خوایەی کە هیچ شتێ لێی وون نابێت لە ئەرزو ئاسمان، جا ئەگەر بەتاڵ کەرەوە بووایە یان پیس بووایە ئەوە وەحی دەکرد بۆ پێغەمبەر ﷺ هەروەك ڕوون و ئاشکرایە. ئەمە ڕاو بۆچوونی بوخاری و ئیبنو حەزمە (۱/۲٥٥).

ئەما لە لایەنی فیقهی‌یەوە، ئەمەی تێدایە:

یەکەم: یەکسانی کردنی لە نێوان خوێنی (حیض) و خوێنەکانی تر، وەك خوێنی ئینسان و خوێنی ئاژەڵ کە گۆشتی بخورێت، ئەمەش هەڵەیەکی ئاشکرایە لەبەر دوو شت:

۱- بەڵگە نی‌یە لەسەر ئەوە لە سوننەتدا، لە قورئاندا ئەوە هیچ کە نی‌یە، ئەصلیش (براءة الذمة) یە مەگەر دەق بێت.

پیسی‌یەی لە برینەوە بەر لەش و جل و بەرگ ئەكەوێت ؟ فەرمووی: ئەوانە هیچ نین، خوا باسی خوێنی كردووە نەك كێم، ئیبنو تەیمی‌یە دەفەرمووێت: پێویستە جل‌وبەرگ لە زەرداوو كێماوی برین بشۆرێن، دەشفەرمووێت: بەڵگە نیە لەسەر پیسێتیان، تەواو.

وە باشتر وایە ئادەمیزاد بە پێی توانا خۆیان لێ بپارێزێ.

٣- گۆشتی بەراز.

خوای گەورە ئەفەرمووێت ﴿لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٍ يَطْعَمُهُۥٓ إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُۥ رِجْسٌ﴾ (الأنعام / ١٤٥).

واتە: ئەی موحەممەد ﷺ بڵێ بە باوەڕداران: لەوەی بە وەحی بۆ من هاتووە نابینم شتێكی تێدا بێت خواردنی حەرام بێت لەسەرتان، جگە لە گۆشتی مردارەوەبوو، یا خوێنی ڕژاو یا گۆشتی بەراز كە بەڕاستی ئەوانە پیسن.

واتە: ئەوانە هەمموو پیسن‌و ئادەمی دەروون خاوێن لێیان دوور ئەكەوێتەوە، وە (ضمیر) ی (إنه) بۆ هەرسێ جۆرەكە ئەگەڕێتەوە، وە دروستە هەودا و دەزوو بە توكی بەراز بكرێت بە پێی ڕاست ترین ڕای زانایان.

---

٢- پێچەوانەی ئەوەیە كە لە سوننەتدا سابت بوە، ئەمما لەبارەی خوێنی ئینسانی موسڵمانەوە حەدیسی ئەنصاری-یەكە هەیە كە تۆزێ لەمەوپێش ڕابورد.

وە لە بارەی خوێنی حەیوانەوە بە صەحیحی لە ئیبنومەسعودەوە هاتوە ﷺ كە حەیوانی قوربانی سەربڕیوەو گیانی تێوە چوە لە خوێن‌و ڕیخەكەی، پاشان نوێژی كردوە بەبێ ئەوەی دەستنوێژ بگرێتەوە.

دووەم: جیاوازی كردنی لەنێوان خوێنی زۆرو خوێنی كەمدا، ئەمە هیچ بەڵگەیەكی لەسەر نی‌یە لە سوننەتدا! بەڵكو حەدیسی ئەنصاری‌یەكە پوچەڵی دەكاتەوە وەك ئاشكرایە. وە دانەر تەنها بەڵگەی بە ئەسەرەكەی ئەبوهورەیرە هێناوەتەوە كە لە پێشەوە باس كراو لاوازی‌یەكەیت زانی.

سەیر لەوەدایە كە دانەر لێرەدا خوێنەكانی یەكسان كردوە لە پیسی‌یەتی داو خوێنی ئەو ئاژەڵانەی جیا نەكردۆتەوە كە گۆشتیان ئەخورێ، كەچی لەمەودوا جیاوازی كردوە لە نێوان میزی ئادەمیزاد كە پیسەو لە نێوان میزی ئەو ئاژەڵانەی كە گۆشتیان ئەخورێ، جا حوكمی كردوە بە پاكی‌یەتی میزی ئەو ئاژەڵانە لەبەر پەیوەندی بە ئەصلەكەیانەوە، دەی بۆ لێرەشدا وای نەئەكرد خۆ بەڵگەكە لێرەو لەوێش هەر یەكە؟! (تمام المنة).

**٤، ٥، ٦ – ڕشانەوە و میز و پاشەڕۆکی ئادەمی:**

**زانایان هەموو پێك هاتوون لەسەر پیسیێتی ئەم شتانە، جگە لەوە نەبێت کە ڕشانەوەی کەم لێ بوردنی لەسەرە[1]، هەروەها میزی منداڵی بچوك ئەوەی کە هێشتا شیرەخۆرەیە و خواردنی نەخواردووە، ئاسانی تیا کراوەو جێگاکەی بە پڕژاندنی ئاو بەسەریدا پاك دەبێتەوە بەپێی ئەو (حدیث)ەی ئوموقەیس خوا لێی ڕازی بێت کە دەفەرمووێت: (ئوموقەیس هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ کوڕێکی شیرە خۆرەی خۆی پێ بوو هێشتا نەگەیشتبووە ئەوەی خواردن بخوات، ئەم کوڕەی میزی کرد بە کۆشی پێغەمبەردا ﷺ جا پێغەمبەر ﷺ داوای ئاوی کردو پڕژاندی بەسەر جلوبەرگەکەی و نەیشت بە مانای شتن (بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە).**

**وە لە عەلی‌یەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە فەرموویەتی، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: (بَولُ الغُلامِ يُنْضَحُ عَلَيهِ، وَبَولُ الجَارِيَةِ يُغْسَلُ) واتە: جێگە میزی کوڕی کۆرپە ئاوی پێ ئەپڕژێنرێت، و میزی کچی کۆرپە ئەشۆرێت.**

**قەتادە دەفەرمووێت: کاتێك بەو شێوەیە ئەکرێت کە هەردووکیان هەر شیرە خۆرە بن و خواردنیان نەخواردبێت، بەڵام ئەگەر خواردنیان خوارد میزی هەردووکیان ئەشۆرێت (ئەحمەد و خاوەن سونەنەکان ریوایەتیان کردووە، جگە لە نەسائی (ئەوەی سەرەوە زاراوەی ئەحمەدە). (حافظ) لە (الفتح)دا ئەفەرمووێت: ئیسنادەکەی صەحیحە، لە پاشاندا ئاو لێپڕژاندن کاتێك ئەبێت کە منداڵە کوڕەکە تەنها شیر بخوات. بەڵام ئەگەر خواردنی تریشی خوارد ئەوە ئەبێ جێگەکەی بشۆررێت، زانایان لەسەر ئەمە (خلاف) یان نیە.**

---

(١) دانەر بەڵگەی نەهێناوەتەوە لەسەر ئەوە، تەنها ئەوە نەبێت ووتوویەتی: (زانایان پێك هاتوون لەسەر پیسیێتی) ئەم دەعوایەش هەڵوەشاوەیە، چونکە ئیبنوحەزم پێچەوانەی ئەوەیە، وە بەڕاست و ڕێکی دانی ناوە بە پاکیێتیێ ڕشانەوەی موسڵماندا، بڕوانە (المحلى / ١/ ١٨٣)، وە هەروەها شەوکانی لە (الدرر البهية) دا، وە (صديق خان) لە شەرحەکەیدا (١/١٨-٢٠) ئەمانە بە هیچ شێوەیەك لەناو شتە پیسەکاندا باسی ڕشانەوەی ئادەمیزادیان نەکردووە، ئەوەش هەقەو ڕاستە. پاشان ئەو دوانە باسی ئەوەیان کردوە کە لە پیسیێتی ڕشانەوەی ئادەمیزاددا خیلاف هەیە، وە ئەمان پاکیێتی‌یان پێش خستوەو ووتویانە: ئەصل پاکی‌یەتی‌یە، وە بە شتێکی صەحیح نەبێت لەو ئەصلە لانادرێت. دانەریش لە زۆر مەسەلەی تردا پشتی بەم ئەصلە بەستوە، وەك پاکی‌یەتی میزی ئەو ئاژەڵانەی کە گۆشتیان ئەخورێ، وە پاکی‌یەتی (خمر) ئارەق کە لەمەودوا باسیان دێت، وە ئەو ئەصلە بنەمایەکی گەورەیە لە بنەماکانی (فقه)، جا نازانم چی وای لێ کردوە لێرە وازی لێ هێناوە، لەگەڵ ئەوەشدا لە بابەکەدا دەقێکی تایبەت نی‌یە (معارض) ی بێت. (تمام المنة).

وە لەوانەیە هۆی ئیکتفا کردن بە ئاو لێ پرژاندن بە میزی کوڕا ئەوەبێت کە خەڵك بە زۆری هۆگرن پێوەیو ئەیگرنە باوەشیان، ئەویش بەزۆری میزیان پێدا ئەکات و شتنی کارێکی گران ئەبێت بۆیە سووك کراوە لەسەریان.

٧- وەدی (الودي) :

وەدی ئاوێکی سپی خەستە دووای میز کردن دێتە دەر، ئەم ئاوەش پیسە بەرای هەموو زانایان بێ جیاوازی و خیلاف، عائیشە خوای لێ ڕازی بێت دفەرمووێت: وەدی ئەوەیە دووای میز کردن دێتە دەرەوە، ئەبێ ئەوکەسە ئامێری خۆی و هەردوو گونی بشوات و پاشان دەست نوێژ بگرێت، خۆی بۆ نەشوات، (ابن منذر) ریوایەتی کردووە.

وە لە ئیبنو عەبباسەوە هاتوە کە دەفەرمووێت: (سێ جۆر ئاو هەیە: مەنی و وەدی و (مذي). هاتنە دەری مەنی خۆشۆردنی لەسەرە، بەلاّم وەدی و (مذي) باش خۆپاك کردنەوەی ئەوێت، (أثرم) و بەیهەقی ریوایەتی‌یان کردووە، زاراوەکەی بەیهەقی بەم شێوەیە هاتووە: (بەلاّم وەدی و (مذي) ئەوە گەلێ و گونت بشۆرەو دەس نوێژێك بگرە چۆن دەس نوێژ ئەگری بۆ نوێژ).

٨- (مذي):

(مذي) ئاوێکی سپی لینجە کاتی بیر کردنەوە لە جیماع یا دەس بازی کردن لەگەڵ خێزاندا دێتە دەر، وە جاری وا هەیە ئادەمیزاد هەست بە هاتنە دەرەوەی ناکات، لە پیاوو ژندا هەیە بەلاّم لە ژندا زۆرترە، (مذی) یش پیسە بەرای هەموو زانایان، بەلاّم ئەوەی تێدایە کاتێك بەر لەش بکەوێت ئەبێ جێگەکەی بشۆررێت بەلاّم ئەگەر بەر جلوبەرگ بکەوێت ئاوی لێ ئەپرژێنرێت چونکە پیسی-یەکە خۆ لێ پاراستنی گرانە لەبەر ئەوەی بە زۆری جلوبەرگی ئەوانە تێوە ئەچێت کە ژنیان نەهێناوە، وە ئەم لە میزی منداڵ شایستەترە ئاسان کاری بۆ بکرێت – لە عەلی‌یەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: (من پیاوێکی (مذي) زۆر بووم بە پیاوێکم ووت: پرسیار بکە لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی (مذي) من خۆم لەبەر جێی کچەکەی لام نەمتوانی پرسیاری لێ بکەم ) کابراش پرسیاری لێ کرد ئەویش فەرمووی: (دەس نوێژێك بگرە و ئامێرت بشۆ) بوخاری جگە لەو گێڕاویانەتەوە.

لە سەهلی کوڕی حونەیفەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: (من بەهۆی (مذي) یەوە ماندو بوبوم، چونکە خۆم زۆر بۆ ئەشۆری، پاشان ئەوەم بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: (بۆ ئەوە تەنها دەس نوێژ گرتن بەسە، ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەی ئەگەر بەر جلەکانم کەوت؟ فەرمووی: مشتێك ئاوت بەسە بی پرژێنە بەو شوێنەی بەری کەوتووە) ئەبو داود و ئیبنوماجە و (ترمذي) گێڕاویانەتەوەو (ترمذي) دەفەرمووێت: ئەم (حدیث)ە (حدیث)ێکی (حسن

و صحيح)ە، وە لە (حديث)ەكەدا موحەممەدی كوڕی ئیسحاقی تێدایە، ئەویش (ضعيف) ە ئەگەر (عنعنە)ی كردبێت چونكە مودەللیسە. بەڵام لێرەدا بە (تحديث) هێناویەتی.

(أثرم) بەم (لفظ)ە ڕیوایەتی كردووە: (زۆر بێزار بووم بەدەس زۆری (مذي)یەوە بۆ پێغەمبەرم ﷺ باس كرد فەرمووی: (مستێك ئاوت بەسە بیڕژێنیتە جێگاكەی).

٩- مەنی ، (المني).

هەندێ لە زانایان بۆ ئەوە چوون كە مەنی پیسە، وە وا دیارە پاكە، بەڵام (مستحب) وایە بشۆرێت ئەگەر تەڕ بێت، وە بیروێت ئەگەر وشك بوو. عائیشە خوای لێ ڕازی بێت دەفەرمووێت: (من مەنیم بە جلەكانی پێغەمبەرەوە ﷺ ئەپرواند ئەگەر وشك بووایە، وە ئەمشۆری ئەگەر تەڕ بووایە) (دارقطني)و ئەبو عوانەو بەززار گێڕاویانەتەوە. وە لە ئیبنو عەبباسەوە هاتوە دەفەرمووێت: دەربارەی مەنی كە بەر جل و بەرگ ئەكەوێ پرسیارم كرد لە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (مەنی هەروەك چڵم و تفە بە پارچەیەك پەڕۆ یا بە (إذخر)ێك بیسرە) - (إذخر) گیایەكی بۆن خۆشە - (دارقطني)و بەیهەقی و (طحاوی) گێڕاویانەتەوە وە لەم (حديث)ەدا ئیختلاف هەیە لەبارەی ڕەفع و وەقفی‌یەوە،

١٠- میز و تەرسی ئەوشتانەی گۆشتیان ناخۆرێت.

ئەم دووانەش پیسن، بەپێی ئەو (حديث)ەی ئیبنومەسعود گێڕاویەتی‌یەوە كە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ چوو دەست بە ئاو بگەیەنێت، جا داوای لێ كردم سێ بەردی بۆ بەرم، خۆی پێ پاك بكاتەوە منیش دوو بەردم دۆزی‌یەوە گەڕام بۆ سێ‌یەم دەستم نەكەوت، تەرسێكم دۆزی‌یەوە بۆم برد، ئەویش ﷺ دوو بەردەكەی لێ وەرگرتم و تەرسەكەی فڕێ دا و فەرمووی: (هذا رجسٌ) واتە: (ئەمە پیسە) بوخاری و ئیبنو ماجە و ئیبنو خوزەیمە گێڕاویانەتەوە،

وە ئیبنو خوزەیمە لە ڕیوایەتێكدا ئەمەی هێناوە (إنها رِكسٌ إنها رَوثَةُ حِمَارٍ) واتە: (ئەمە پیسە ئەمە تەرسی كەرە).

بەڵام لەبەر ئەوەی گرانە خۆ لێ پاراستنی، عەفو ئەكرێ لە كەمێكی.

وەلیدی كوڕی موسلیم دەفەرمووێت: بە ئەوزاعیم ووت: میزی ئەوووڵاغانەی گۆشتیان ناخورێت وەك ئێستر و كەر و ئەسپ، چۆنە ؟ ئەویش ووتی: صەحابە لە جەنگەكاندا گرفتاری ئەم شتە ئەبوون و بەریان ئەكەوت نە لەشیان بۆ ئەشۆری و نە جلەكانیان.

بەڵام میزو شیاكەی ئەو ئاژەڵانەی گۆشتیان ئەخورێت، مالیكو ئەحمەدو كۆمەڵێك لە شافیعی-یەكان بۆ ئەوە چوون كە پاكە، ئیبنوتەیمی‌یە دەفەرمووێت: كەسێك لە یارەكانی پێغەمبەر ﷺ

نەیفەرموە: ئەوانە پیسن، بەڵكو گفت بە پیسی ئەوانە ووتەیەكی داهێنراوە، لە صەحابە و پێشینەكانەوە نەهاتووە -تەواو-.

ئەنەس خوای لێ ڕازی بێت دەفەرمووێت: (كۆمەڵێك لە تیرەی عوكل یان عورەینە هاتنە مەدینە و مەدینەیان پێ نەكەوت، تووشی ژانە سك بوون، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ دان بچنە لای ووشترەكان و لە میز و شیرەكەیان بخۆنەوە) ئەحمد و (شیخین) بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە.

ئەم (حدیث)ەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە میزی ووشتر پاكە، وە میزی هەر گیاندارێك گۆشتەكەی بخورێ (قیاس) ئەكرێتە سەر میزی ووشتر، (إبن منذر) دەفەرمووێت: هەركەس بڵێت: ئەوە تایبەت بووە بەوانەوە ئەوە نەیپێكاوە، چونكە تایبەتمەندی بە بەڵگە نەبێت ناچەسپێت، وە ئەوە كە زانایان ڕەخنەیان نەگرتووە لەوە پشقلی مەڕ بفرۆشرێت لە بازاڕەكانیاندا و میزی ووشتر بەكار بێت لە داوو دەرماندا لە كۆنو نوێدا، بەڵگەیە لەسەر پاكی ئەم شتانە.

شەوكانی دەفەرمووێت: ئەوەی ئاشكرایە میز و پەیینی هەموو ئەو ئاژەڵانەی گۆشتیان ئەخورێت پاكن لەبەر پەیوەندی بە ئەصلەكەوەو جیا نەبونەوە لە (البراءة الأصلية)، وە پیسیەتی حوكمێكی شەرعیەو گوێزەرەوەیە لەو حوكمەی كە ئەصل و بەرائەت ئەگەیەنێ، كەواتە قسەی ئەو كەسەی كە ئەڵێت پیسە وەرناگیرێ، مەگەر بە بەڵگەیەكی واوە كە بگونجێت بۆ گواستنەوە لەو دوانە (الأصل والبراءة). وە بۆ ئەوانەی ئەڵێن: پیسە بەڵگەی لەو شێوەیەمان دەس نەكەوتووە.

١١- پیسایی خۆر – (الجلاّلة) :

لە سوار بوونی پیسایی خۆر و خورادنی گۆشتەكەی و خواردنەوەی شیرەكەی نەهی هاتووە ؛

لە ئیبنو عەبباسەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتوە كە دەفەرمووێت: (پێغەمبەر ﷺ نەهی كردووە لە خواردنەوەی شیری ئاژەڵی پیس خۆر) رواه الخمسة إلا ابن ماجة. وە (ترمذي) بە صەحیحی داناوە.

لە ریوایەتێكی تردا هاتووە: (سوار بوونی ئاژەڵی پیسایی خۆر نەهی لێ كراوە). ئەبو داود ریوایەتی كردووە.

لە عەمری كوڕی شوعەیبەوە لە باوكیەوە لە باپیریەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: (پێغەمبەر ﷺ نەهی كردووە لە خواردنی گۆشتی كەری ماڵی و سوواربوونی ئاژەڵی پیسایی خۆر و خواردنی گۆشتەكەی) ئەحمد و نسائی و ئەبوداود گێڕاویانەتەوە.

ئاژەڵی (جلالة) ش ئەو ئاژەڵانەن كە پیسایی ئەخۆن لە ووشتر و مانگا و مەڕ و مریشك و سۆنە و قازو جگە لەمانە، بە جۆرێك كە بۆنەكەیان گۆڕابێت، جا ئەگەر ئەو ئاژەڵە بەند بكرێت و ماوەیەك ئالفی خاوێنی بدرێتێ، و دوور بخرێتەوە لە پیسایی و گۆشتەكەی خۆش بێتەوەو ناوی ئاژەڵی پیسایی خۆری لەسەر نەمێنێ، ئەوە حەڵاڵ ئەبێتەوە، چونكە هۆی نەهی كردن لە كەڵك لێ وەرگرتنی ئەو گۆڕانكاری‌یەیە كە تووشی بووە بەهۆی خواردنی پیسایی‌یەوە، وە ئەو هۆیەش لاچووە.

١٢- ئارەق – (الخمر) :

ئارەق لای جەماوەری زانایان پیسە بە پێی فەرموودەی خوای گەورە كە ئەفەرمووێت: ﴿إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ﴾ (المائده/٩٠) واتە: بەڕاستی شەڕاب و قومار و بت و ئەزلام –كە جۆرێكە لە بەخت تاقی كردنەوە- پیسن و لە كردەوەی شەیتانن .

بەڵام كۆمەڵێك بۆ پاكێتی چوون و ئەڵێن: ئارەق پاكە[1] وە ئەو پیسی‌یەی كە لە ئایەتەكەدا باس كراوە بە پیسی مەعنەوی دایان ناوە چونكە ووشەی (رجس) لە ئایەتەكەدا ئەوەمان پێ ڕائەگەیەنێت ئارەق و ئەوانەی دووای ئارەق هاتوون لە ئایەتەكەدا پیسن، وە ئارەق بێ گومان وەصف ناكرێ بە پیسی‌یەكی هەستی، خوای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿فَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلرِّجْسَ مِنَ

---

(١) وا باشە ناوی هەندێ لەو پێشەوایانەو شتێكی كەم لە ژیان نامەیان باس بكەم كە ئەو قسەیان كردووە، چونكە زانای ناودارو بەرز بوون:

١- رەبیعەی كوڕی عبد الرحمن ناسراو بە: (ربیعة الرأی)، خاوەنی (التهذیب) ووتویەتی: گەییوە بە هەندێك لە صەحابە و گەورەپیاوان لە تابیعین، وە خاوەنی فەتوا بوە لە مەدینەدا، مالیكیش زانستی لێ وەرگرتوە.

٢- (لیث)ی كوڕی سەعیدی میسری، كە ئیمامێكی بەناوبانگە، پێشەوا گەورەكان دانیان ناوە بە فەزڵی ئەودا، لەوانە ئیمامی مالیك و ئیمامی شافیعی.

٣- ئیسماعیلی كوڕی یەحیای موزەنی هاوەڵی ئیمامی شافیعی، جگە لەمانەش زانایانی دواییش لە بەغدادی-یەكان زۆرن كە هەموویان ڕایان وایە عارەق پاكەو ئەوەی حەرامە خواردنەوەیەتی، وەك لە تەفسیری (قرطبـي) دا هاتووە (٦/٨ ٨)، وە ئەوەش بەهێزترە. (تمام المنة).

﴿ٱلْأَوْثَـٰنِ﴾ (الحج/٣٠) واتە: دوور بكەونەوە لە پیسی كە بتەكانن. وە بت پیسێكی مەعنەوی‌یە ئەوەی دەستی لێ دا دەستی پیس نابێت.

هەروەها بۆیە ئەو كۆمەڵە بە پیسی مەعنەویان داناوە، چونكە ئەو پیسی‌یە بەوە تەفسیر كراوەتەوە لەناو ئایەتەكەدا كە كردەوەی شەیتانە و دوژمنایەتی و ناكۆكی ئەخاتە نێوانتانەوە و لە یادی خوا و نوێژ كردن دوورتان ئەخاتەوە.

وە لە كتێبی (سبل السلام)دا هاتووە: (لە ڕاستی دا ئەصلّ لە شتەكان پاكی‌یەتی‌یە، وە حەرامێتی هاوشان نیە لەگەڵ پیسی‌یەتیدا، چونكی حەشیش حەرامیش كراوە كەچی پاكیشە، بەڵام پیسیەتی هاوشانە لەگەڵ حەرامی‌یەتیدا، كەواتە هەموو پیسێك حەرامە نەك بە پێچەوانەوە، ئەوەش بۆیە وایە چونكە حوكم دان بە پیسی شتێك دەست لێدانیشی بە هەموو شێوەیەك حەرام دەكات، كەواتە حوكم دان بە پیسیەتی شت حوكم دانە بە حەرامی‌یەتیشی، بە پێچەوانەی حوكم دان بە حەرامیەتی چونكە ئەبینی لەبەر كردنی حەریر و زێڕ حەرامە لەگەڵ ئەوەشدا خاوێنن بە (ضرورة)ی شەرعی و بە ئیجماع، جا ئەگەر ئەوەت زانی، ئەزانی كە حەرام بوونی هەموو جۆرە ئارەقێك و ئەو ئارەقەی دەقەكان ئاماژەیان بۆ كردووە ئەوە ناگەیەنێ كە ئەو ئارەقە پیس بێت، بەڵكو ئەبێت بەڵگەی تر هەبێت لەسەری، ئەگینا لەسەر ئەصڵی خۆیان ئەمێننەوە كە زانایان كۆن لەسەر ئەو ئەصڵە كە پاكی‌یەتی‌یە، هەركەسیش پێچەوانەی ئەوە دەڵێت: ئەبێت بەڵگەی هەبێت).

١٣- سەگ – (الكلب) :

سەگیش پیسە، وە كە دەم بخاتە هەر شتێكەوە پێویستە ئەو شتە حەوت جار بشۆرێت، یەكەم جاریان بە قوڕاو بێت، بەپێی (حدیث)ەكەی ئەبی هورەیرە خوا لێی ڕازی بێت كە ئەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (طَهورُ إناءِ أحَدِكُم إذا وَلَغَ فيهِ الكَلبُ أن يَغسِلَهُ سبعَ مرات أولاهُنَّ بالتراب) رواه مسلم وأحمد وأبو داود والبيهقي واتە: (ئەگەر سەگ دەمی نایە قاپی كەسێكتان، بەوە پاك ئەبێتەوە كە حەوت جار بیشۆرن و یەكەم جاریشیان بە قوڕاو بێت).

وە ئەگەر سەگێك دەمی خستە ناو قاپێكەوە شتی مەییوی تێدا بوو، ئەوە جێ دەمەكە و دەورو پشتی فڕێ ئەدرێت و سوود لەوەی ماوەتەوە وەرئەگیرێت، چونكە پاكی‌یە پێشووەكەی پێوە ماوە.

بەڵام تووكی سەگ ڕای دیارتر وایە كە پاكە و لەسەر پیسێتی بەڵگەیەك نیە.

**پاك كردنەوەی لەش و جل و بەرگ:**

جلوبەرگ و لەش ئەگەر پیسی‌یەکیان بەر کەوت پێویستە بە ئاو بشۆرێن هەتا ئەو پیسی‌یەیان لێ ئەبێتەوە ئەگەر پیسی‌یەکە بە چاو ئەبینرا وەك: خوێن، جا ئەگەر دووای شۆردنیشی جێگەکەی هەر دیار بوو وە گران بوو لێ کردنەوەی ئەوە لێ بووردنی لەسەرە (عفو) ە.

بەڵام ئەگەر بەچاو نەئەبینرا وەك میز ئەوە تەنها شۆردنی بەسە تەنانەت جارێکیش بێ.

لە ئەسمائی کچی ئەبو بەکری صدديقەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: (ئافرەتێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ ووتی: ئەگەر ئافرەتێك لە ئێمە کراسەکەی خوێنی بێ نوێژی تێوە چوو چی بکات ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بیپروێنێت، پاشان ئاوی پێدا بکات، ئینجا بیشۆرێت لەپاشان نوێژی پێوە بکات) متفق عليه.

وە ئەگەر داوێنی کراسی ئافرەت لە زەوی خشاو پیسی تێوە چوو زەوی‌یەکە پاکی ئەکاتەوە ، بەپێی ئەوەی گێڕراوەتەوە و ئەڵێن: ژنێك بە ئوموسەلەمەی ووت: (من داوێنی کراسەکەم درێژەو بە زەویدا ئەخشێ و بە شوێنی پیسیشدا تێ ئەپەڕم چی بکەم؟ ئەویش پێی فەرموو: پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: (يُطَهِّرُهُ مابعدَهُ) رواه أحمد وأبوداود.

واتە: زەوی‌یە پاکەکەی دووای زەوی‌یە پیسەکە پاکی ئەکاتەوە.

**پاك کردنەوەی زەوی:**

ئەگەر پیسی کەوتە سەر شوێنێکی زەوی بە ئاو کردن بەسەر ئەو شوێنەدا پاك ئەبێتەوە بەپێی (حديث)ەکەی ئەبی هورەیرە خوا لێی ڕازی بێت کە ئەفەرمووێت: عەرەبێکی دەشتەکی هەڵسا لەناو مزگەوتدا میزی کرد، خەڵکەکە بۆی هەڵسان لێی بدەن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (دَعُوهُ وَأرِيقُوا على بَولِهِ سَجلاً مِن مَاءٍ أو ذَنُوباً مِن مَاءٍ، فَإنَّما بُعِثتُم مُيَسِّرِيْنَ ولم تُبْعَثُوا معسِّرِين) رواه الجماعة إلا مسلماً واتە: وازی لێ بهێنن، دۆڵچەیەك ئاو بکەن بەسەر شوێنی میزەکەیدا، چونکە بەڕاستی ئێوە بۆ ئاسان کاری نێرراوون نەك گران کاری.

هەروەها زەوی و ئەوەی بە هەمیشەیی پێوەی لکاوە وەك درەخت و خانوو، ئەگەر پیس بوون بە ووشك بوونەوە پاك ئەبنەوە، ئەبو قولابە دەفەرمووێت: ووشك بوونەوەی زەوی پاك کەرەوەیەتی، وە عائیشە خوای لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: (خاوێن بوونەوەی زەوی بە ووشك بوونەوەیەتی) ئیبنوئەبی شەیبە گێڕاویەتی‌یەوە.

ئەمە ئەگەر پیسی‌یەکە شلەمەنی بوو، بەڵام ئەگەر جستەی هەبوو ئەوە خاوێن نابێتەوە هەتا خودی ئەو شتە پیسە لانەبرێت یان گۆڕانکاری بەسەرا نەیات.

**پاك کردنەوەی ڕۆن و وێنەی ڕۆن:**

لە ئیبنو عەبباس و (میمون)ەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: لە پێغەمبەریان پرسی ﷺ ئەگەر مشكێك كەوتبێتە ناو ڕۆنێكەوە چی بكەین ؟ ئەویش ﷺ فەرمووی: (أَلْقُوهَا وَمَا حَولَها فَاطرَحُوهُ وكُلُوا سَمْنَكُم) بوخاری گێڕاویەتیەوە

واتە: مشكەكە و ئەو بەشەی بە چوار دەوری مشكەكەدایە فڕێ بدەن و ڕۆنی خۆتان بخۆن.

(حافظ) دەفەرمووێت: (ابن عبد البر) ئیتتیفاقی زانایان نەقل ئەكات لەسەر ئەوەی كە شتی مەییوو ئەگەر شتێكی مردارەوەبووی تێ كەوت، شوێنی مردارەوەبووەكە و چوار دەورەكەی فڕێ ئەدرێ، بە مەرجێك (ثابت) ببێ كە هیچ پارچەیەك لە پارچەكانی ئەو مردارەوەبووە نەپەڕیوەتە شوێنەكانی تری ئەو مەییوەوە، بەڵام لەبارەی شتی شلەوە ئیختلافیان هەیە جەماوەری زانایان ئەڵێن هەموو ئەو شلەمەنیە پیس ئەبێ لەبەر ئەوەی پیسیەتی پێگەیشتووە، بەڵام دەستەیەك لەوان كە زوهری و ئەوزاعی لەو دەستەیە، موخالەفەی جمهوریان كردووە و ئەڵێن: حوكمی شلەمەنی وەك حوكمی ئاو وایە، ئەگەر بەهۆی پیسیەوە گۆڕا پیس ئەبێ، وە ئەگەر نەگۆڕا ئەوە پاكە، ئەمەش (مذهب) ی ئیبنو عەبباس و ئیبنو مەسعود و وبوخاریە، وە ئەمەش صەحیحە.

**پاك كردنەوەی پێستەی مردارەوەبوو:**

پێستەی مردارەوەبوو ڕووی ناوەوەو دەرەوەی بە خۆش كردن پاك ئەبێتەوە، بەپێی ئەوەی ئیبنوعەبباس خوا لێیان ڕازی بێت ئەی گێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذا دُبِغَ الإهَابُ فَقَد طَهُرَ) بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە واتە: ئەگەر پێستە خۆش كرا ئەوە پاك بۆتەوە.

**خاوێن كردنەوەی ئاوێنە و شتی بریسكەدار:**

ئاوێنە و تیغ و شمشێر و نینۆك و ئێسقان و شوشە و قاپ و قاچاغی ڕۆناوی و هەموو ئەو شتانەی سافن و كونی ووردیان تێدا نیە بە سڕین پاك ئەبنەوە بە مەرجێ شوێنەواری پیسی-یەكەیان پێوە نەمێنێ، یارەكانی پێغەمبەر ﷺ نوێژیان ئەكرد و شمشێرەكانیان پێوە بوو لەكاتێكدا كە خوێنی بەر ئەكەوت وە لە پاك كردنەوەیدا تەنها بە سڕین وازیان لێ ئەهێنا.

**پاك كردنەوەی سۆڵ:**

نەعل و خوفی پیس بوو بە خشاندنیان بەسەر زەویدا پاك ئەبێتەوە بە مەرجێ شوێنەواری پیسیەكەیان پێوە نەمێنێ، بەپێی (حدیث)ی ئەبوهورەیرە كە ئەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذَا وَطِئَ أحَدُكُم بِنَعلِهِ الأذَى فَإنَّ التُّرَابَ لَهُ طُهُور) رواه أبو داود. واتە: ئەگەر یەكێكتان بە نەعلەوە پێتان نا بەسەر پیسی دا، ئەوە زەوی پاك كەرەوەیەتی. وە لە ڕیوایەتێكی تردا

هاتووه فەرموویەتی: (إذَا وَطِئَ الأذَى بِخُفَيه فَطُهُورُهُمَا التُّرَابُ) واتە: ئەگەر بە سۆڵەوە پێی نا بە پیسی دا ئەوە خاك پاك کەرەوەیەتی.

وە لە ئەبی سەعیدەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذَا جَاءَ أحَدُكُمُ المَسجِدَ فَليَقلِب نَعلَيهِ فَلِيَنظُر فِيهِمَا فَإن رَأى خَبَثاً فَليَمسَحهُ بالأرضِ ثُمَّ لِيُصَلِّ فِيهِمَا) رواه أحمد وأبو داود.

واتە: ئەگەر کەسێکتان هات بۆ مزگەوت با نەعلەکانی هەڵ بگێڕێتەوە و سەیریان بکات ئەگەر پیسی پێ‌یانەوە بینی، بیان سڕێ بە زەوی‌دا و نوێژیان پێوە بکات.

وە لەبەر ئەوەی نەعل شتێکە بە زۆری بەر پیسی ئەکەوێ هەربۆیە سڕینی بە شتی رەق‌و ووشك (جامد) بەسە بۆ پاك بوونەوەی. هەروەك شوێنی خۆ پاك کردنەوە، پێش و پاش کە پیسایی پێدا دێ، کە بە شتی رەق‌و ووشك بیسرێ بەسیەتی، بەڵکو نەعل لەپێش ترە لە شوێنی خۆپاك کردنەوە، چونکی شوێنی خۆپاك کردنەوە رۆژی دووجار یا سێ‌جار پیسی لێ دێتە دەر و پێویستی بە پاك کردنەوەیە، بەلام نەعل زیاتر بەر پیسی ئەکەوێ.

**چەند شتێکی بەسوود کە ئادەمیزاد زۆر پێوستی پێ‌یان هەیە:**

١- پەتی تەناف کاتێ جل و بەرگی پیسی پێوە هەڵخرا و باو تیشکی خۆر ووشکی کردەوە، قەیناکە دووای ئەوە پۆشاکی خاوێنی بەسەردا هەڵبخرێ.

٢- کەسێك بە شوێنێکدا تێ پەڕی شتێك بکەوێت بەسەریا نەزانێ ئاوە یا میزە، پێویست نیە لەسەری پرسیار بکات ئەگەر پرسیاریشی کرد پێویست نیە لەسەر پرسیار لێ کراوەکە وەڵامی بداتەوە با بش زانێ ئەو شتە پیسە، وە پێویست نیە لەسەر ئەو کەسە شوێنەکەی بشوا.

٣- ئەگەر قاچ یا داوێن بەشەو بەر شتێکی تەڕ کەوت نەزانرا چیە پێویست نیە بۆنی بکات هەتا بزانێت ئەو شتە چی بووە، بەپێ‌ی ئەوەی گێڕراوەتەوە کە عومەر خوا لێی رازی بێت رۆژێك ئەڕۆیشت بەرێوە لە پلوسکی ماڵانەوە شتێکی بەرکەوت، ئەوەی لەگەڵیا بوو هاواری کرد: خاوەن ماڵ ئاوەکەت پاك بوو یا پیس، عومەر فەرمووی: خاوەن ماڵ! پێمان مەڵێ؛ پاشان عومەر رۆیشت.

٤- کەسێك قوڕی جادەو کۆڵانی بەرکەوت لەسەری پێویست نیە بیشواتەوە، کۆمەیلی کوڕی زیاد دەفەرمووێت، چاوم بە عەلی کەوت رەزای خوای لێ بێ بەناو قوڕی بارانا ئەڕۆیشت پاشان چووە ناو مزگەوت و نوێژی کرد و قاچی نەشۆری.

٥- ئەگەر کەسێك لە نوێژ بۆوە و لەپاشاندا پیسی‌یەکی بینی بە جلەکانیەوە یان بە لەشی‌یەوە کە پێ‌ی نەزانی بوو، یان پێ‌ی زانی بوو بەلاّم بیری نەبوو لێی بکاتەوە، یان بیری بوو بەلاّم توانای

لێ کردنەوەی نەبوو، ئەوە نوێژەکەی دروستەو دووبارەکردنەوەی لەسەر نیە[1]، بەپێی فەرموودەی خوای گەورە کە فەرموویەتی: ﴿ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَآ أَخْطَأْتُم بِهِۦ﴾ (الأحزاب/٥) واتە: تاوانتان لەسەر نیڕیە لەوەدا کە بە هەڵە کردووتانە.

ئەمەش زۆر لە صەحابە و تابعین فتوایان لەسەر داوە.

٦- هەرکەس شوێنی پیسی‌یەکەی بە جلەکانیەوە لێ تێك چوو ئەبێ هەموو جلەکانی بشوات، چونکە ڕێگا نیە بۆ دڵنیا بوون لە پاکی بە شتنی هەمووی نەبێت. ئەمەش لەو بەشەیە کە ئەڵێن: (مَا لايَتِمُّ الوَاجِبُ إلا بِهِ فَهُوَ وَاجِبٌ) واتە: هەرشتێ واجب بەو نەبێ نەیەتە دی، ئەوە ئەو شتە واجبە.

٧- ئەگەر جلە خاوێنەکانت لێ تێك چوو لەناو جلە پیسەکاندا ئەت زانی پاکەکە کامەیە ئەبێ هەوڵی دۆزینەوەی بدەیت، ئەگەر هەر بۆت دەرنەکەوت یەکێ لە جلەکان لەبەر بکەو نوێژێکی پێوە بکە جا جلە پاکەکان کەم بن یا زۆر فەرقی نیە، وەك مەسەلەی (قبلة) ڕووگە.

**چونە سەر ئاو:**

بۆ چونە سەرئاو چەند ڕەوشتێ هەیە کورت ئەبنەوە لەم خاڵانەی خوارەوەدا:

١- هەرچی شتێك ناوی خوای پێوە بوو نابێت لەگەڵ خۆیدا بیبات بۆ سەر پێشاو مەگەر ترسی لەناو چوونی ئەو شتەی هەبێت، یا لەناو شتێکدا پارێزراو بێت، بە پێی ئەو حەدیثەی ئەنەس خوا لێی ڕازی بێت کە ئەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ ئەنگوستیلەیەکی لە پەنجەدا بوو لەسەری نووسرابوو (محمدٌ رسول الله) کاتێ بچوایە سەر ئاودەست دای ئەنا) رواه الأربعة. (حافظ) لەبارەی ئەم (حدیث)ەوە دەفەرموێت: (معلول)ە، ئەبو داود دەفەرموێت: ئەو حەدیسە (منکر) ە، بەڵام بەشی یەکەمی حەدیسەکە صەحیحە.

---

(١) بەڵگەی لەسەر ئەمە حەدیسەکەی ئەبی سەعیدی خودرییە کە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ لە نوێژدا سۆڵەکانی داکەندو لای چەپی‌یەوە دای نا، صەحابە کە ئەویان بینی سۆڵەکانیان داکەند، پێغەمبەر ﷺ کە لە نوێژ بۆوە، پرسی: چی پاڵی پێوە نان سۆڵەکانتان فڕێ بدەن؟ ووتیان: بینیمان تۆ سۆڵەکانت فڕێ دا بۆیە ئێمەش فڕێمان دا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی جوبرائیل علیه السلام پێی ڕاگەیاندم پیسی‌یان پێوەیە، وە فەرمووی: ئەگەر کەسێکتان هات بۆ مزگەوت با سەیری پێڵاوەکانی بکات ئەگەر پیسی پێوە بینێ با بیان سڕێت و نوێژیان پێوە بکات. ئەبو داود و ئەحمەدو جگە لەوان بە سەنەدێکی صحیح گێڕاویانەتەوە، وە لە (الإرواء / ٢٨٤) دا تەخریج کراوە، دانەریش کەمێ پێش ئەم بەشە باسی کردووە بەڵام بێ دەنگەی لێ کردووە! (تمام المنة).

٢- خۆ وون کردن و دوور کەوتنەوە لە چاو بە تایبەتی ئەگەر پیسی بکات، بۆ ئەوەی دەنگی لێوە نەبیسرێ و بۆنی نەچێت بەسەر کەسدا، بەپێی حەدیسەکەی جابیر خوا لێی ڕازی بێت کە دەفەرموێت: (لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دەرچووم لە سەفەرێکدا، کاتێك بچوایە بۆ دەست بە ئاو گەیاندن دوور ئەکەوتەوە بە شێوەیەك کە نەئەبینرا) ئیبنو ماجە گێڕاویەتیەوە.

وە لای ئەبو داود هاتووە: کاتێ بچوایە بۆ سەر پێشاو دوور ئەکەوتەوە تاوەکو هیچ کەسێ بەچاو نەیبینێ، هەروەها هاتووە: کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ بچوایە بۆ پێشاو دوور ئەکەوتەوە.

٣- ووتنی (بسم الله) و (أعوذ بالله) بە دەنگی بەرز[1] کاتی چوونە سەر پێشاو یان کاتی خۆ هەڵماڵین لە شوێنی چۆڵدا بۆکاری پێشاو، بەپێی ئەوەی کە ئەنەس ئەگێڕێتەوە دەفەرموێت: کاتێ پێغەمبەر ﷺ بیویستایە بچێتە سەر پێشاو ئەی فەرموو: (بِسمِ الله اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الخُبثِ وَالخَبَائِثِ) رواه الجماعة، واتە: بەناوی خوا، خوایە من پەنا ئەگرم بە تۆ لە شەیتانی نێر و مێ[2].

٤- بە تەواوی واز لە قسە کردن بهێنێت، زیکر کردن بێت یا شتی تر، وە نابێت وەڵامی سڵاو و بانگ بێژ بداتەوە، مەگەر ئەو شتە زۆر پێویست بێت، وەك ئەوەی کوێرێك خەریك بێت بکەوێتە خوارەوە ئەمیش هاواری لێ بکات و ڕێی پیشان بدات، جا ئەگەر لەو کاتەدا کە لەسەر پێشاوە بپژمێت ئەبێت لە دڵی خۆیدا (الحمد لله) بڵێ‌و زمانی نەجوڵێنێت بۆی، بەپێی حەدیسی ئیبنوعومەر ڕەزای خوایان لێ بێ کە دەفەرموێت: (لەو کاتەدا کە پێغەمبەر ﷺ میزی ئەکرد پیاوێك بەلایدا تێپەڕی سڵاوی لێ کرد، ئەویش وەڵامی نەدایەوە) (جماعة) گێڕاویانەتەوە جگە لە بوخاری.

وە هەروەها بە پێی ئەو حەدیسەی ئەبو سەعید خوای لێ ڕازی بێت کە دەفەرموێت: (گوێم لێ بووە پێغەمبەر ﷺ ئەیفەرموو: (لا يَخرُجِ الرَّجُلانِ يَضرِبَانِ الغَائِطَ كَاشِفَينِ عَن عَورَتِهِمَا يَتَحَدَّثَانِ فَإِنَّ اللهَ يَمقُتُ عَلَى ذَلِكَ) رواه أحمد وأبو داود وابن ماجة. واتە: نابێت دوو کەس بچن بۆ

(١) بزانە کە هیچ فەرموودەیەك لەم فەرموودانە و جگە لەمانەش بەڵگە نیە لەسەر ووتنی (بسم الله) بە دەنگی بەرز وەك دانەر لێرەدا ئاماژەی بۆ دەکات (تمام المنة).

(٢) ئەو فەرموودانەی لەو بارەیەوە هاتون کە بە ئاشکرا ووتنی (بسم الله) ی تێدا بێت (ضعيف)ن جگە لە (حديث)ەکەی عەلی خوا لێی ڕازی بێت کە بە مەرفوعی هێناویەتی، ئەفەرموێت (بەربەستی نێوان چاوی جننی و نادەمیزاد ئەوەیە ئەگەر کەسێکتان چووە سەر ئاودەست بڵێت: (بسم الله) بەڵام بزانە لە هیچ کامێك لەم (حديث)انەدا ئەو ئاشکرا کردنە بە (بسم الله) نیە.. لەبەر ئەوە پێویستە ئاگادار بن. (تمام المنة).

سەر پێشاو لە نزیك یەكەوە خۆیان هەڵماڵن و قسە بەیەكەوە بكەن، چونكە خوا قینی لەو جۆرە كارەیە.

وە (ظاهر)ی ئەم حەدیسە قسە كردن حەرام ئەكات لەكاتی كاری سەر پێشاو، بەڵام (إجماع) كۆی زانایان ئەو نەهی‌یە لە حەرامیەتییەوە وەرئەچەرخێنێت بەرەو كەراهەت[1].

٥- ئەبێ (قبلة) بە گەورە دابنێ لەو كاتەدا، نە پێشی تێ بكا و نە پاشی، بە پێی ئەو (حدیث)ەی ئەبی هورەیرە خوا لێی ڕازی بێت كە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إِذَا جَلَسَ أَحَدُكُم لِحَاجَتِهِ فَلا يَستَقبِل القِبلَةَ وَلا يَستَدبِرهَا) رواه أحمد ومسلم. واتە: ئەگەر كەسێك ویستی دەست بە ئاو بگەیەنێت با نە پێش و نە پاشی نە كاتە قیبلە.

ئەو نەهی‌یەش لەسەر كەراهەت دائەنرێت بە پێی حەدیسی ئیبنو عومەر خوا لێیان ڕازی بێت ئەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (ڕۆژێك چوومە سەر بانی ماڵەكەی حەفصە پێغەمبەرم ﷺ بینی لەسەر پێشاو ڕووی كردبووە شام و پشتی كردبووە كەعبە) (جماعة) گێڕاویانەتەوە.

یان بۆ كۆكردنەوە لەنێوان هەردوو حەدیسەكە دەوترێت: حەرام بوونەكە بۆ بیابانەو دروستی‌یەكە بۆ ناوخانووە[2].

---

(١) (حدیث)ەكە (ضعیف)ە، ئیسنادەكەی صەحیح نیە و دوو عیللەتی تێدایە: یەكەم (إضطراب) دووەم: لە سەنەدەكەی دا هیلالی كوڕی (عیاض)ی تێدایە. (ذهبي) دەفەرموێت ناناسرێت، وە (حافظ) لە (التقریب) دا دەفەرموێت: (مجهول)ە. وە من وا لە (حدیث)ەكە تێ ئەگەم كە قسە كردن هەر كاتی خۆ هەڵماڵین قەدەغە بێت، بەڵام بێ خۆ هەڵماڵین پێم وایە حەرام نەبێت، جا با باش سەرنج بدرێ. (تمام المنة).

(٢) وە ئەم ڕووە ڕاسترە لەوەی پێشوو. (سید سابق)

شیخ ئەلبانی دەفەرموێت: بەڵكو قسەی ڕاستتر ئەوەیە كە بە ڕو كردنە قیبلەو پشت تێ كردنی لەكاتی كاری سەرپێشاودا حەرامە بە گشتی چ لە بیابان و چ لە ناو خانوودا، وە دووا ووتەی شەوكانیش لەسەر ئەم بۆچوونەیە لە (نیل الأوطار) و (سیل الجرار) (٦٩/١) تیایدا دەفەرموێت:

(حەقیقەتی نەهی‌یەكە قەدەغە كردنە، وە ئەمە لانادرێت بەوەی كە ریوایەت كراوە پێغەمبەر ﷺ وای كردووە، چونكە ئێمە شارەزامان كردیت بەوەی كە فیعل و كردەوەی پێغەمبەر ﷺ پێچەوانەی ووتەی تایبەت بە ئومەتەكەی نی‌یە، ئیللا مەگەر بەڵگەیەك بێت دەلالەت بكاتە سەر ئەوەی ئەو مەبەستی پێ ئەوە بوو كە چاوی لێ بكرێت، ئەگینا فیعلەكەی تایبەت دەبێت بە خۆی، وە ئەم مەسئەلەیە لە (الأصول) دا بڕیاری لەسەر دراوە و بە جوانترین شێوە توێژینەوەی لەسەر كراوە، وە ئەمە حەقە هەروەك شاراوە نی‌یە لەلای خاوەن وئینصاف، وە ئەگەر دامان نا كە وێنەی ئەم كارە بەڵگە هاتووە لەسەر ئەوەی كە ئیقتدای پێوە بكرێ، ئەوە تایبەت دەبوو بە ناو خانوو، چونكە ئەو بینیویەتی لە ماڵی حەفصە لە نێوان دوو خشت.

چونكه له مهروانی ئهصغهرهوه هاتووه ووتوویهتی: ئیبنو عومهرم بینیوه ووشترهكهی پاڵ داوهو خۆی بهرهو قیبله میزی كردووه، منیش ووتم: ئهی ئهبا عبد الرحمن ئایا بهو شێوهیه میز كردن نههی لێ نهكراوه؟ فهرمووی: بهڵێ نههی لێ كراوه.. بهڵام ئهو نههیهیه بۆ دهشت و چۆڵه، وه ئهگهر شتێك ههبێت له نێوانتا و له نێوان قیبلهدا بهربهست بێت ئهوه قهیناكه. ئهبو داود و ئیبنو خوزهیمه و حاكم گێڕاویانهتهوه و ئیسنادهكهی حهسهنه وهك له (الفتح) دا هاتووه.

٦- له شوێنێكی نهرم و نهویدا كارهكهی ئهنجام بدا، بۆ ئهوهی خۆی بپارێزێ له پرژهی پیسایی بهپێی ئهو (حدیث)هی (أبو موسى) خوا لێی ڕازی بێت ئهگێڕێتهوه ئهفهرمووێت: (پێغهمبهر ﷺ چووه شوێنێكی نهرمهڵان له بن دیوارێكدا میزی كرد) له پاشاندا فهرمووی: (إذَا بَالَ أحَدُكُم فَلْيَرتَدْ لِبَولِهِ) رواه أحمد وأبوداود. واته: ئهگهر كهسێكتان ویستی میز بكات با شوێنێكی باش ههڵبژێرێ بۆ میزهكهی، وه ئهم (حدیث)ه ههرچهنده ئیسنادهكهی كهسێكی نادیاری تێدایه، بهڵام واتاكهی ڕاسته.

٧- میز نهكاته ناو كونی زهویهوه نهك دهعبایهكی تێدا بێ ئازاری بدا، به پێی (حدیث)ی قهتاده كه ئهگێڕێتهوه له عبدالله ی كوڕی (سرجس)هوه كه دهفهرمووێت: (پێغهمبهر ﷺ نههی كردووه لهوهی كه میز بكرێته ناو كونی زهویهوه)، به قهتادهیان ووت: لهبهر چی خراپه میز

---

منیش دهڵێم (واته شیخ ئهلبانی): شهوكانی مهبهستی ئهوهیه كه ئهو بهڵگه ئاماژه بۆ كراوه نههاتووه، كهواته حوكمهكه لهسهر گشتیهتی دهمێنێتهوه، وه فیعلهكه تایبهته به پێغهمبهر ﷺ خۆیهوه.

ئهمما ووتهكهی ئیبنو عومهر له (حدیث)ی (مروان الأصفر) كه دانهر پاش (حدیث)هكهی پێشوو باسی لێوه كردوه كه ئهفهرمووێ: (قهدهغه كردنهكه بۆ دهشت و چۆڵه...) ئهوه صریح و ئاشكرا نیه كه (رفع)ه (واته له پێغهمبهرهوه بێت ﷺ)، بهڵكو لهوانهیه ئهمه تێگهیشتنی خۆی بێت بۆ فیعلی پێغهمبهر ﷺ له ماڵی حهفصه، كهواته ناشێت بۆ بهڵگهی تایبهت كردنی به بیابانهوه، ههروهك شهوكانی ڕوونی كردۆتهوه جا ههركهسێك دهیهوێت با بگهڕێتهوه بۆی (١/٧٣).

وه ئهوهی پشتیوانی ئهو گشتیهتیه دهكات فهرموودانهیه كه هاتووه له بارهی تف كردن به ڕووی قیبلهوه لهناوهوهو دهرهوهی مزگهوت. لهوانه: «مَن تَفَل تِجَاهَ القِبلَةِ جَاءَ يَومَ القِيَامَةِ وَتَفْلَتُهُ بَينَ عَينَيه» كه تهخریج كراوه له (الصحیحة ٢٢٢و٢٢٣)دا. واته ههركهس ڕوهو قیبله تف بكات له ڕۆژی قیامهتدا كاتێ دێت تفهكه بهناو چاویهوهیهتی. وه ئهوهوی ڕهحمهتی خوای لێ بێت تهئكیدی كردووه كه دروست نیه له ههموو حاڵێكدا، لهناو نوێژ و دهرهوهی نوێژ، له مزگهوت یا جگه له مزگهوت، وهك لهوێدا لێوهیم نهقڵ كردووه، وه صهنعانیش ههروا دهفهرمووێت، جا ئهگهر تف كردن به ڕووی قیبله له خانوودا قهدهغهو حهرام كرابێت، دهی نابێت میز كردن و پیسی كردن به ڕوویدا لهپێش تریش بێت له حهرامی دا؟ (فَاعتَبِرُوا يَا أُولِي الأبصَار) (تمام المنة).

بکرێته ناو کونەوە ؟ فەرمووی: (لەبەر ئەوەی جێگای جنۆکەیە) ئەحمەد و نەسائی و ئەبوداود و حاکم و بەیهەقی گێڕاویانەتەوە و ئیبنو خوزەیمە و ئیبنو سەکەن بە صەحیحیان داناوە[1].

٨- خۆ بپارێزرێ لە سێبەرێ کە خەڵك لێی دائەنیشن وە لە ڕێگاو بان و شوێنی گفت و گۆی خەڵك، بە پێی ئەوەی ئەبی هورەیرە خوا لێی ڕازی بێت ئەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إِتَّقُوا اللَّاعِنَين، قَالُوا وَمَا اللَّاعِنَانِ يَا رَسُولَ الله: قَالَ الَّذِي يَتَخَلَّى فِي طَرِيقِ النَّاسِ أو ظُلِّتِهِم) رواه أحمد ومسلم (١/٢٢٦/٢٦٩) وأبوداود (١/٤١/٢٥).

واتە خۆتان لەو دووشتە بپارێزن کە ئەبنە هۆی نەفرین لێ کردنتان، ووتیان: ئەو دووشتە چی‌یە ئەی نێرراوی خوا ؟ فەرمووی: ئەوەی لەسەر ڕێگا و سێبەری خەڵکدا پیسی ئەکات.

٩- میز نەکاتە ئەو شوێنەی خۆی لێ ئەشۆرێت، وە هەروەها ئاوی وەستاو یا ڕۆیشتوو، بە پێی ئەوەی ئیبنو موغەففەل خوا لێی ڕازی بێت ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا يَبُولَنَّ أَحَدُكُم فِي مُسْتَحَمِّهِ، ثُمَّ يَتَوَضَّأَ فِيهِ فَإِنَّ عَامَّةَ الوَسوَاسِ مِنهُ)، رواه الخمسة. واتە: با کەستان میز لەو شوێنەدا نەکات کە خۆی لێ ئەشۆرێت، ئینجا دەس نوێژی تێدا بگیرێت، چونکە گشت وەسوەسەی شەیتان لەوەوە دروست ئەبێت[2].

بەڵام ئەوەی کە ئەفەرموێت: (ئینجا دەست نوێژی تێدا بگرێ) لای ئەحمەد و ئەبوداود هەیە.

لە جابیرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ (نەهی کردووە لەوەی کە لە ئاوی ڕۆیشتوودا میز بکرێ) ئەحمەد و موسلیم و نەسائی و ئیبنوماجە گێڕاویانەتەوە. وە هەر لە جابیرەوە هاتووە کە ئەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ میز کردنە ناو ئاوی ڕۆیشتووی قەدەغە کردبوو) وە لە

---

(١) حەدیسەکە (ضعیف)ە ئەوانەی کە بە صەحیحیان داناوە یان ئاسانکارییان کردوە یان هەڵە. بۆ زیاتر بڕوانە (ضعیف أبي داود ٧) وە (إرواء الغليل (١/٩٣/٥٥) (تمام المنة).

(٢) حەدیسەکە بەو شێوەیە (ضعیف)ە وەك ئیمامی (ترمذي) ئیشارەتی بۆ کردووە و ئەڵێت: (حديث غريب)، بەڵام بە (لفظ)ێکی تر هاتووە صەحیحە کە ئەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردبوو کەسێکمان هەموو ڕۆژێك سەر شانە بکات، یا میز بکاتە شوێنی خۆشۆردنی) (عسقلاني) و جگە لەو بە صەحیحیان داناوە، وە لە صەحیحی (أبي داود) دا تەخریج کراوە (٢١)، جا ئەگەر دانەر بەڵگەی بەم حەدیسە بهێنایەتەوە ئەپێکا!

(مجمع الزوائد) دا هاتووه: كه ئەمە (طبراني) ئەم حەدیسەی ریوایەت كردووەو پیاوەكانی جێی باوەڕن، بەڵام ئەگەر لە شوێنی خۆشتنەكەیدا گونجێك هەبێ ئەوە دروستە میزی لێ بكا[1].

١٠- نابێ بە پێوە میز بكرێت، لەبەر ئەوەی لە ڕێزو ڕەوشت جووانیەوە دوورە، وە پرژەی میزەكە ئەپەڕێتە میزكەر خۆی، بەڵام ئەگەر بتوانێت خۆی بپارێزێ لە پرژەی میزەكەی دروستە بە پێوە میز بكات، عائیشە خوا لێی ڕازی بێت ئەفەرموێت: (هەركەس پێی ووتن: پێغەمبەر ﷺ بە پێوە میزی كردووە باوەڕی پێ مەكەن، چونكە بە دانیشتنەوە نەبێت میزی نەئەكرد) خاوەنی پێنج سونەنەكان گێڕاویانەتەوە جگە لە ئەبوداود.

(ترمذي) دەفەرموێت: (ئەمە چاك ترین و ڕاسترینە لەم بابەدا.

وە ئەم قسەیەی عائیشەش بەپێی زانیاری خۆی بووە دەربارەی پێغەمبەر ﷺ [2] وە پێچەوانەی ئەوە نیەیە كە ریوایەت كراوە لە (حذیفة) وە خوا لێی ڕازی بێت كە پێغەمبەر ﷺ چووە سەر سەرانگوێلكێك و بە پێوە میزی كرد، منیش لێی دوور كەوتمەوە، فەرمووی: نزیك بەرەوە، منیش لێی نزیك بوومەوە هەتا شوێنی پاژنەكانی، لە پاشاندا هاتە ئەملاوەو دەس نوێژی گرت و مەسحی كاڵەكانی كرد) (جماعة) گێڕاویانەتەوە. ئەوەی دەفەرموێت: بە دانیشتنەوە میز كردن لای من چاكترە وە بە پێوەش ڕەوایەو هەردووكیان لە پێغەمبەرەوە ﷺ (ثابت)ە[3].

١١- واجبە هەرچی پیسی‌یەك بە پاش و پێشی‌یەوە هەبێت لێی بكاتەوە، بە بەرد یان شتێك كە وەك بەرد وابێ لە هەر شتێكی ڕەق و ووشك كە پاك بێت و پیسی لێ بكاتەوەو حورمەتی نەبێ، یان هەر بە ئاو لێی بكاتەوە، یان بە هەردوكیان بە یەكەوە، بەپێی ئەوەی عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ ئەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إذا ذَهَبَ أَحَدُكُمْ إلى الغائِطِ فَلْيَسْتَطِب بِثَلاثَةِ

---

(١) بۆ ئاوی وەستاو ڕاستە چونكە حەدیسەكەی صەحیحە موسلیم و جگە لەو ریوایەتیان كردوە، بەڵام بۆ ئاوی ڕۆیشتوو، نەخێر، چونكە (لفظ) ی (الجاري) كە تیایەتی (منكر)ە ، هەركەس لەو بارەیەوە زیادەی دەوێت با سەیری (الضعیفة) ژمارە (٥٢٢٧) بكات، (تمام المنة).

(٢) ئەو قسەیە ئیسنادەكەی لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێت) (ضعیف)ە، چونكە شورەیكی كوڕی عبد الله ی (قاضي) تێدایە كە (ضعیف)ە و حەدیسێك كە ئەو بە تەنیا ریوایەتی كردبێ ناكرێ بە بەڵگە، (حافظ) لە (التقریب) دا فەرمویەتی: ڕاستگۆیەو هەڵە زۆر ئەكات، چونكە (مثبت) زانستی زیادەی لەگەڵدایە، وە ئەگەر نەتەوێ سەیری (الإرواء / ١/٩٥) بكە وە (الصحیحة) ژمارە (٢٠١). جا بەپێی ئەوە بە هەردوو شێوەكە میز كردن دروستە ئەگەر خۆ بپارێزرێ لە پرژەی میز (تمام المنة).

(٣) حەدیسەكە صەحیحە بێ گومان، بەڵام بە شێوەی (رُوِي) (واتە ریوایەت كراوە) هێناویەتی وا دەرئەخات (ضعیف) بێت، ئەبووایە بە شێوەی (وَرَدَ) یان وێنەی ئەوە بیهێنایە (تمام المنة).

أحجار فإنَّها تُجزئُ عَنْهُ) رواه أحمد والنسائي وأبوداود والدارقطني. واته: ئەگەر كەسێكتان چووە سەر پێشاو با خۆی بە سێ بەرد پاك بكاتەوە، چونكە بەو شێوەیە بری پاك كردنەوە ئەكەوێت).

وە لە ئەنەسەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە فەرمویەتی: (پێغەمبەر ﷺ كە ئەچووە سەر پێشاو من و غولامێكی وەك خۆم مەسینەیەكی پڕ لە ئاومان هەڵ ئەگرت لەگەڵ حەربەیەكی بچكۆلەدا، پێغەمبەر ﷺ خۆی بە ئاوەكە پاك ئەكردەوە) متفق علیه[1].

وە لە ئیبنو عەبباسەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتوە كە پێغەمبەر ﷺ بەلای دوو گۆڕدا تێ پەڕی فەرمووی: (إنَّهُمَا يُعَذَّبَانِ، وما يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ، أمَّا أحَدُهُمَا فَكَانَ لا يَسْتَنزِهُ مِنَ البَولِ، وَأمَّا الآخَرُ فَكَانَ يَمشِي بِالنَّمِيمَةِ) رواه الجماعة.

واتە: ئەم دووانە ئێستا سزا ئەدرێن سزادانەكەشیان لەبەر تاوانی گەورە نیە، یەكێكیان خۆی لە میز پاك نەئەكردەوە، ئەوی تریان دوو زمانی ئەكرد لەناو خەڵكدا.

لە ئەنەسەوە خوا لێی ڕازی بێت بە (مرفوع) ی هاتووە: (خۆتان لە میز پاك بكەنەوە، چونكە بەشی زۆری سزای گۆڕ بەهۆی ئەوەوەیە).

١٢- نابێت بە دەستی ڕاست خۆ پاك بكاتەوە تاوەكو دەستی ڕاستی خاوێن ڕاگرێ لەوەی كە بەر شتی پیس بكەوێ، بە پێی ئەوەی كە (عبدالرحمن)ی كوڕی زەید ئەگێڕێتەوەو ئەفەرموێت: (بە سەلمانیان ووت: پێغەمبەرەكەتان هەموو شتێكی فێر كردن، هەتا شێوەی دەست بە ئاو گەیاندنیش، ئەویش فەرمووی: بەڵێ، نەهی لێ كردبووین لەوەی بەرەو قیبلە میز و پیسایی بكەین، وە هەروەها نەهی لێ كردبووین لەوەی كە بە دەستی ڕاست خۆمان پاك بكەینەوە، وەنابێ

---

(١) خۆ پاك كردنەوە بە ئاو و بەرد بە یەكەوە صحیح نیە لە پێغەمبەرەوە ﷺ ، جا ئەترسم ووتن بە هەردووكیان زیادەڕەوی بێت لە ئاین دا، چونكە ڕێنمایی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە تەنها بە یەكێكیان خۆ پاك ئەكرێتەوە، وە چاكترین ڕێنمایی ڕێنمایی پێغەمبەرە ﷺ، وە خراپترین شتیش تازە داهێنراوەكانە... وە ئەو (حدیث)ەی كە ئەفەرموێت: خەڵكی قوبا بە ئاوو بەرد خۆیان پاك ئەكردەوەو خوای گەورە ئەو ئایەتەی كە ئەفەرمووێ: ﴿فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْ﴾ لەسەر ئەوانی ناردۆتە خوارەوە ئیسنادەكەی (ضعیف)ە، و كاری پێ ناكرێت، ئەوەی و (حافظ) و كەسانی تریە (ضعیف)یان داناوە، وە ئەصلی فەرموودەكە لای ئەبو داود و كەسانی ترە لە ئەبی هورەیرەوە بێ ئەوەی باسی بەردی تێدا بێت، لەبەر ئەوەی ئەبو داود لە بەشی (الإستنجاء بالماء) دا هێناویەتی، وە شایەتی تری زۆرەو لە هیچ كامیاندا باسی بەرد نەكراوە، وە لە (صحیح سنن أبي داود) دا بە ژمارە (٣٤) ڕوونم كردۆتەوە. (تمام المنة).

کەسێکمان بە سێ بەرد کەمتر خۆی پاك بکاتەوە، یا بە پیسی یا بە ئێسقان خۆی پاك بکاتەوە) موسلیم و ئەبو داودو (ترمذي) گێڕاویانەتەوە.

وە لە حەفصەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرموویێت: (پێغەمبەر ﷺ دەستی ڕاستی دانابوو بۆ خواردن و خواردنەوە و جل و بەرگ لەبەر کردن و بەخشین و وەرگرتن، وە دەستی چەپیشی بۆ شتی تر) ئەحمەد و ئەبو داود و ئیبنو ماجە و ئیبنو حیببان و حاکم و بەیهەقی گێڕاویانەتەوە.

١٣- ئەبێ دووای خۆ پاك کردنەوە دەست لە زەوی بخشێنێت، یا بە صابون و وێنەی صابون بیشوات بۆ ئەوەی هەرچی بۆنێکی ناخۆشی تێوە چووبێت لێی بیێتەوە، بە پێی ئەوەی ئەبی هورەیرە خوا لێی ڕازی بێت ئەگێڕێتەوە و دەفەرموویێت: (پێغەمبەر ﷺ کاتێ ئەچووە سەر پێشاو، لە جامێکدا یا لە جەوەنەیەکدا ئاوم بۆ ئەبرد خۆی پێ پاك ئەکردەوە لەپاشاندا دەستی لە زەوی ئەخشاند) ئەبو داود و نەسائی و بەیهەقی و ئیبنو ماجە گێڕاویانەتەوە.

١٤- ئەگەر میزی کرد دووای تەواو بوون ئاو لە زەکەری و نافەکەی بپرژێنێت بۆ ئەوەی وەسوەسە لە خۆی دوور بخاتەوە، وە هەرکاتێك هەستی بە تەڕییەك کرد بڵێ: ئەوە شوێنەواری ئاو لێ پرژاندنەکەیە، بەپێی ئەو (حدیث)ەی حەکەمی کوڕی سوفیان یان سوفیانی کوڕی حەکەم کە دەفەرموویێت: (پێغەمبەر ﷺ کاتێ میزی بکردایە دەس نوێژی ئەگرت و ئاوی ئەپرژاندە شەرمگەی)[1].

وە لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموویێت: (پێغەمبەرم ﷺ بینیوە میزی کردووە لە پاشاندا ئاوی پرژاندۆتە شەرمگەی).

١٥- کاتی چونە ناو پێشاو ئەبێ قاچی چەپی پێش بخات، وە قاچی ڕاستی کاتی هاتنە دەرەوە، لەپاشاندا بڵێت: (غفرانك). واتە: خوایە لێم ببورە. لە عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرموویێت: (پێغەمبەر ﷺ کاتێ لە ئاودەست ئەهاتە دەر ئەی فەرموو: (غُفرَانَكَ) خاوەنی پێنج سونەنەکان گێڕاویانەتەوە جگە لە نەسائی، وە حەدیسی عائشە صەحیحترین شتە کە لەم

---

(١) ئەو حەدیسە مەتنەکەی صەحیح نیە، چونکە (اضطراب) تێکەڵ و پێکەڵی زۆر تێدایە (حافظ) لە (التهذیب) دا لە دە ڕووەوە بە کورتی ڕوونی کردۆتەوە، وە لەوەی کە حەکەمی کوڕی سوفیان صەحابە بووبێت خیلاف هەیە، بەڵام حەدیسەکە چەند شایەتی هەیە، لەوانە حەدیسەکەی ئیبنوعەبباسە خوا لێی ڕازی بێت کە دەفەرموویێت: (جارێکیان پێغەمبەر ﷺ دەس نوێژی گرت و ئاوی پرژاندە شەرمگەی)، دارەمی و بەیهەقی تەخریجیان کردوەو سەنەدەکەی صەحیحە لەسەر مەرجی هەردوو شەیخەین، جا ئەگەر دانەر ئەو (حدیث)ەی بهێنایە باشتر بوو. (تمام المنة).

بابەدا هاتووە، وەك ئەبو حاتم دەفەرمووێت: وە لە چەند ڕێگایەكی لاوازەوە ریوایەت كراوە كە ئەگێڕنەوە پێغەمبەر ﷺ ئەی فەرموو: (الحَمدُ للهِ الَّذِي أذاقَنِي لذَّتَهُ، وأبْقَى فِيَّ قُوَّتَهُ وأذهَبَ عنِّي أذَاهُ). واتە: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی چەژی خۆشی ئەو شتەی كە كردوومە پێی بەخشیم و توواناكەی لە جەستەمدا هێشتەوە و ئازارەكەی لەكۆڵ خستم[1].

## ڕەفتارە سروشتی‌یەكان ـ (سنن الفطرة)

خوای گەورە چەند ڕەفتارێكی بۆ نێرراوەكانی (درودی خوایان لەسەر بێت) هەڵبژاردووە و فەرمانی بە ئێمەش كردووە لەو ڕەفتارانەدا شوێنیان بكەوین، وە ئەو ڕەفتارانەی وەك چەند دروشمێك لێ كردوە كە بە زۆری ڕوو ئەدەن تا شوێن كەوتووانیانی پێ بناسرێتەوەو لە كەسانی تر جیا بكرێنەوە، وە ئەو ڕەفتارانەش پێیان ئەوترێ: ڕەفتارە سروشتی‌یەكانی ئادەمیزاد (سنن الفطرة).

وا لە خوارەوە باسیان ئەكەین:

١- خەتەنە كردن، ئەویش بڕینی ئەو پارچە گۆشتەیە كە سەری ذەكەری ئادەمیزاد دادەپۆشێ، بۆ ئەوەی چڵك و پیسی كۆ نەبێتەوەو بە تەواوەتی لە میز پاك ببێتەوە، وە بۆ ئەوەی خۆشی جیماعی كەم نەبێ. ئەمەش سەبارەت بە پیاوە. بەڵام سەبارەت بە ئافرەت بەشی سەرەوەی شەرمگە ئەبڕێت. ئەم ڕەفتارەش ڕەفتارێكی كۆنە. بەڵام ئەو حەدیسانەی كە دەربارەی خەتەنەی ئافرەتەوە هاتون هیچیان (صحیح) نین[2].

---

(١) ئەو قسەیەی دانەر كە ئەڵێت (لە چەند ڕێگایەكی (ضعیف)ەوە) وورد نی‌یە لە دەربڕینی حاڵی ئەو حەدیسە، چونكە یەكەمیان لە حەدیسی (أبي ذر) و ئەنەسە هەردووكیان لە (الإرواء) دا تەخریج كراون بە ژمارەی (٥٣) بە دوو سەنەدی (ضعیف). ئەوی تریان لە حەدیسی ئیبنو عومەرە ئەویش لە (الضعیفة) دا تەخریج كراوە بە ژمارەی (٤١٨٧). پاشان ئەوەی ئەڵێت: (لە چەند ڕێگای لاوازەوە) وا هەست ئەكرێت هەریەك لەو دوو حەدیسە لە ڕێگایەك زیاتری هەبێت، چونكە ئەو قسەیە دێت بە بیری خوێنەردا كە ووتراوە: حەدیسی (ضعیف) بەهۆی ڕێگاكانی‌یەوە بەهێز ئەبێت، جا وا ئەزانێ دانەر مەبەستی ئەمەیە كە ئەڵێت: (لە چەند ڕێگایەكی (ضعیف)ەوە) هیوام وایە مەبەستی ئەوە نەبێ؛ لەبەر ئەوەی كە ڕوون كرایەوە. (تمام المنة).

(٢) ئەوە بە گشتی وا نی‌یە، چونكە فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ بە صەحیحی هاتووە كە بە خەتەنەكەرە ئافرەتەكانی مەدینەی فەرموو: (لێی ببڕە بەڵام زۆر نا چونكە جوانترەو ڕوخسار گەشاوەتر ئەكات و بۆ مێردەكەشی باشترە). ئەبو داودو (طبراني و بزار) و جگە لەمانیش گێڕاویانەتەوە، وە چەند ڕێگاو چەند شاهیدی هەیە لە كۆمەڵێك صەحابەوە كە لە (الصحیحة) دا تەخریجم كردووە (٢/٣٥٣/٣٥٨) بە دوورو درێژی كە لە شوێنی تر نای بینی، و تێیدا ڕوونم كردۆتەوە كە خەتەنە كردنی ئافرەت شتێكی زانراو بووە لەلای سەلەف، بە پێچەوانەی ئەوانەی كە زانیاریان نی‌یە بە

له ئه‌بی هوره‌یره‌وه هاتووه که پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رموویه‌تی: (ئیبراهیمی خه‌لیل (علیه الصلاة والسلام) کاتێ ته‌مه‌نی گه‌یشته هه‌شتا ساڵ له قه‌دووم شوێنێکه له شام. یان به قه‌دووم که ئامرازێکی دارتاشی‌یه خۆی خه‌ته‌نه کرد) بوخاری گێڕاویه‌تی‌یه‌وه.

وه (مذهب)ی (جمهور)ی زانایان ئه‌وه‌یه خه‌ته‌نه کردن واجبه. وه شافیعی‌یه‌کان به (مستحب)ی ئه‌زانن منداڵ له حه‌وته‌م ڕۆژی له‌دایك بوونی دا خه‌ته‌نه بکرێت، شه‌وکانی ده‌فه‌رمووێت ده‌رباره‌ی دیاری کردنی کاته‌که‌ی هیچ نه‌هاتووه و شتێکی واش نه‌هاتووه واجب بونی بگه‌یه‌نێت[1].

۲، ۳- تاشینی به‌ر و هه‌ڵکێشانی تووکی بن باڵ: ئه‌مه‌ش دوو سوونه‌تن. به تاشین بێ یا به هه‌ڵکه‌ندن بێ یا به قرتاندن بێ به مقه‌ست یا به لێ کردنه‌وه به ده‌رمان بێ بری ئه‌که‌وێ.

٤، ٥ – نینۆك کردن و قرتاندنی سمێڵ یان زیاده‌ڕه‌وی له کورت کردنه‌وه‌ی.

ده‌رباره‌ی هه‌ردووکیان ڕیوایه‌تی صه‌حیح هاتووه، له حه‌دیسی ئیبنوعومه‌ردا هاتووه که پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌فه‌رمووێت: (خالِفوا المُشرِكين ؛ وَفِّرُوا اللِّحَى، وأحْفُوا الشوارب) رواه الشيخان.

واته: پێچه‌وانه‌ی بێباوه‌ڕه‌کان بکه‌ن، ڕیشتان بهێڵنه‌وه و سمێڵتان ئێجگار کورت بکه‌نه‌وه.

---

(آثار)ه‌کان، وه ئه‌وه‌ی پشتگیری هه‌موو ئه‌وه ئه‌کات حه‌دیسه به‌ناوبانگه‌که‌یه که ئه‌فه‌رمووێت: (ئه‌گه‌ر هه‌ردوو شوێنه خه‌ته‌نه کراوه‌کان گه‌یشتن به یه‌ك خۆشۆردن پێویست ئه‌بێت ) که له (الإرواء) دا به ژماره (۸۰) ته‌خریج کراوه. ئیمامی ئه‌حمه‌د ڕه‌حمه‌تی خوای له‌سه‌ر بێت ده‌فه‌رمووێت: (ئه‌و حه‌دیسه به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی که ئافره‌تانیش له‌و کاتانه‌دا خه‌ته‌نه ئه‌کران)، بڕوانه (تحفة المودود في أحكام المولود ص/٦٤)، دانراوی ئیبنو قه‌یم. (تمام المنة).

(۱) وه هه‌روه‌ها ئه‌ڵێت: (له‌و باره‌یه‌وه کات دیاری نه‌کراوه و هیچیش نه‌هاتووه به‌ڵگه‌ی پێویست بوون بێت).

منیش ئه‌ڵێم: ئه‌مما ده‌رباره‌ی کات دیاری کردن دوو حه‌دیس هاتووه:

یه‌که‌م له جابیره‌وه هاتووه: (پێغه‌مبه‌ر ﷺ عه‌قیقه‌ی بۆ حه‌سه‌ن و حوسه‌ین کردووه و له ڕۆژی حه‌وته‌مدا خه‌ته‌نه‌ی کردوون) (طبراني) له (المعجم الصغير) دا هێناویه‌تی به سه‌نه‌دێك که پیاوه‌کانی سیقه‌ن.

دووه‌م: له ئیبنو عه‌بباسه‌وه هاتووه ده‌فه‌رمووێت: (حه‌وت شت سوننه‌ته له منداڵدا ؛ ڕۆژی حه‌وته‌می ناو ئه‌نرێت، وه خه‌ته‌نه ئه‌کرێت... حه‌دیسه‌که) (طبراني) له (الأوسط / ١/٣٣٤/٥٦٢) گێڕاویه‌تی‌یه‌وه، وه (هيثمي) له (المجمع) (٤/٩٥) دا ووتوویه‌تی: پیاوه‌کانی جێی باوه‌ڕن، ئیمامی شافیعی کاری پێ کردووه‌و به موسته‌حه‌ببی داناوه‌و که خه‌ته‌نه کردن له ڕۆژی حه‌وته‌مدا بێت، وه‌ك له (المجموع)دا (١/٣٠٧) هاتووه.

به‌ڵام حوکمی خه‌ته‌نه کردن ئه‌وه‌ی لای ئێمه له‌پێشه واجب بوونی‌یه‌تی، وه ئه‌وه‌ش (مذهب) ی (جمهور)ه وه‌ك: (مالك و شافعي و أحمد) وه (ابن قيم)یش هه‌ڵی بژاردووه‌و بۆ به‌ڵگه هێنانه‌وه له‌سه‌ری پانزه ڕووی هێناوه (تمام المنة).

وە لە حەدیسی ئەبوهورەیرەدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (خمسٌ مِنَ الفِطرَة؛ الاستحدادُ، والختَانُ، وقصُّ الشَّارِبِ، وَنَتفُ الإبِطِ، وَتَقليمُ الأظَافِرِ) رواه الجماعة. واتە: پێنج شت لە سروشتی ئادەمیزادن، بەر تاشین و خەتەنە کردن و سمێڵ کورت کردنەوە و مووی بن باڵ هەڵکەندن و نینۆك کردن. لێرەدا سمێڵ کورت کردنەوە یا زیادەڕەوی لە کورت کردنەوەیدا دیاری نەکراوە بە کامیان سوننەت بەجێ ئەگات، چونکە مەبەست ئەوەیە سمێڵ ئەوەندە درێژ نەکرێت خواردن و خواردنەوەی پێوە بگیرسێتەوەو چڵك و پیسی تێدا کۆ ببێتەوە.

وە لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن لَم يَأخُذ مِن شَارِبِهِ فَلَيسَ مِنَّا) رواه أحمد والنسائي والترمذي وصححه. واتە: هەرکەس لە سمێڵی نەگرێت لە ئێمە نیە.

وە هەموو هەفتەیەك بەرتاشین و مووی بن باڵ هەڵکەندن و نینۆك کردن و سمێڵ قرتاندن یان زیادەڕەوی لە کورت کردنەوەیدا(مستحب)ە پەسەند کراوە، ئەوەش بۆ خاوێنی تەواوەتی و جوانەوەی دەرون، چونکە مانەوەی هەندێ موو بە لەشەوە ئادەمیزاد دڵتەنگ و خەفەتبار ئەکات، وە ڕێ دراوە ئەم شتانە هەتا چل ڕۆژ دووا بخرێن، ئیتر دووای چل ڕۆژ هیچ بەهانە نامێنێ بۆ هێشتنەوەیان، بەپێی ئەوەی ئەنەس خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: (پێغەمبەر ﷺ کاتی بۆ سمێڵ گرتن و نینۆك کردن و مووی بن باڵ لابردن و بەرتاشین بۆ دیاری کردبووین کە ئەبوایە لە چل ڕۆژ زیاتر نەمانایەوە) ئەحمەد و ئەبو داود و کەسانی تریش گێڕاویانەتەوە.

٦- هێشتنەوەی ڕیش و دەست لێ نەدانی تاوەکو زۆر ئەبێت، بۆ ئەوەی ببێتە دیمەنێك لە دیمەنەکانی ڕێزو شکۆداری، جا نە ئەوەندە کورت بێت نزیك بێت لە تاشین، نە ئەوەندەش درێژ بێ کە دیمەنی ناشیرین بێت، بەڵکو مام ناوەندبێ چونکە میانەڕەوی لە هەموو شتێکدا چاکە لەپاشاندا هێشتنەوەی ڕیش نیشانەی تەواوی پیاوەتی و نێریەتیە، لە ئیبنو عومەرەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: (خَالِفُوا المُشرِكِين؛ وَفِّرُوا اللِّحَى، وَأحفُوا الشَّوَارِبَ) متفق عليه. واتە: پێچەوانەی بێ باوەڕان بن ئێوە ڕیش بهێڵنەوە و زیادەڕەوی بکەن لە کورت کردنەوەی سمێڵ.

وە لە بوخاری دا ئەم زیادەیەی لەگەڵدایە دەفەرمووێت: ئیبنو عومەر ئەگەر حەج یا عەمرەی بکردایە بە دەستی ڕیشی ئەگرت هەرچی لە مشتە دەستی زیاد بووایە ئەی قرتاند.

وە زانایان ئەو فەرمانەی کە پێغەمبەر ﷺ داویەتی ئەیکەنە سەر (واجب) بوون و ئەڵێن: تاشینی ڕیش حەرامە بەپێی ئەو فەرمانەی پێغەمبەر ﷺ.

٧- ڕێز گرتن له موو كاتێ هێڵرایەوە زۆر بوو، بەوەی كه شانەی بكات و چەوری بكات و بۆنی خۆشی لێ بدات، بەپێی ئەوەی ئەبی هورەیرە خوا لێی ڕازی بێت ئەگێڕێتەوە كه پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن كَانَ لَهُ شَعرٌ فَلْيُكرِمهُ) رواه أبوداود. واته: هەركەس خاوەنی مووی سەر و ڕیش بوو با ڕێزی لێ بگرێت.

وه له (عطاء) ی كوڕی یەسارەوە هاتووە خوا لێی ڕازی بێت ئەفەرمووێت: (پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ مووی سەرو ڕیشی دێزو شیواو بوو، پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بۆ كرد وەك ئەوەی فەرمانی پێ بكات كه سەرو ڕیشی ڕێكو پێك بكات، ئەویش ڕۆیشت خۆی ڕێك خست و هاتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أَلَيسَ هَذَا خَيراً مِن أن يَأتِيَ أحدُكُم ثائِرَ الرَّأسِ كَأنَّهُ شَيطَانٌ) رواه مالك. واته: ئەم شێوەیە چاكتر نیه لەوەی كەسێكتان بێت و سەرو قژی شێواو بێت وێنەی شەیتان[1].

له ئەبی قەتادەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: (مویەكی پڕو درێژم هەبوو دەربارەی پرسیم له پێغەمبەر ﷺ ئەویش فەرمانی پێ دام كه خزمەتی بكەم و هەموو ڕۆژێك شانەی بكەم) نەسائی گێڕاویەتیەوە.

وه مالیك به زاراوەیەكی تر له (الموطأ)دا هێناویەتی دەفەرمووێت: (ووتم: ئەی نێرراوی خوا مویەكی پڕو درێژم هەیه ئایا شانەی بكەم؟ فەرمووی: بەڵێ.. وه ڕێزیشی لێ بگرە)[2] هەر بۆیە ئەبو قەتادە لەوانە بوو كه ڕۆژی دوو جاری چەور بكردایە لەبەر ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ كه فەرمووی: (وه ڕێزیشی لێ بگرە).

وه تاشینی موی سەر ڕەوایە هەروەها هێشتنەوەشی بۆ كەسانێك كه ڕێزی لێ ئەگرن، بەپێی ئەوەی كه ئیبنو عومەر خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ ئەی فەرموو: (أَحلِقُوا

(١) ئەو دوو حەدیسەی دانەر باسی كردوون له ئەبی قەتادەو جابیرەوە (منكر)ن له ڕووی سەنەدو مەتنەوە، كەواته پشتیان پێ نابەسترێت، وه دروست نیه كاریان پێ بكرێت لەبەر ئەوەی كه پێچەوانەی دوو فەرموودەی صەحیحەن:

یەكەم: پێغەمبەر ﷺ نەهی كروە له قژ داهێنان و چەور كردنی ئیللا ڕۆژ نارۆژێك نەبێ.

دووەم: پێغەمبەر ﷺ لێی قەدەغە كردبووین كه هەموو ڕۆژێك مومان پاك كەینەوەو شانەی كەین ڕێكی خەین. ئەم دوو حەدیسە له (الصحيحة) دا به ژمارە (٥٠١،٥٠٢) تەخریج كراون. (تمام المنة).

(٢) (عطاء)ی كوڕی یەسار تابیعیەیەو ناسراوە، جا حەدیسەكە (مرسل)ێكی (ضعيف)ە، وه به مەوصولی هاتوە له حەدیسی جابیرەوە به (لفظ) ێكی تر كه تەواو ترە لەو، بەڵام باسی (لحيه) ڕیشی تێدا نیەیە. ئەبوداود و جگه لەو ریوایەتیان كردوە. وه له (الصحيحه ٤٩٣) دا تەخریج كراوە. (تمام المنة).

كُلَّهُ أو ذَرُوا كُلَّه) رواه أحمد ومسلم وأبوداود والنسائي. واته: یا هەمووی بتاشن یا هەمووی بهێڵنەوە.

ئەمما تاشینی لایەکی سەر و هێشتنەوەی بەشێکی کەراهەتی هەیە بە کەراهەتی تەنزیهی، بەپێی ئەوەی نافیع لە ئیبنو عومەرەوە ئەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (پێغەمبەر ﷺ نەهی کردبوو لە قەزەع، بە نافیعیان ووت: (قزع) چیە؟ ووتی تاشینی بەشێکی سەری منداڵ و هێشتنەوەی بەشەکەی تری) متفق علیه، وە لەبەر حەدیسەکەی پێشەوەی ئیبنوعومەر ڕەزای خوایان لەسەر بێ.

٨- هێشتنەوەی مووی سپی جا چ لە ڕیشدا بێ یا لەسەردا بێ، وە ژن و پیاو لەمەدا یەکسانن، بەپێی ئەوەی عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکی‌یەوە لە باپیری‌یەوە ئەگێڕێتەوە خوا لێی ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لاتَنْتِف الشَّيْبَ فإنَّهُ نورُ المُسلِمِ، ما من مسلم يَشيبُ شَيبةً فِي الإسلامِ إلا كَتَبَ اللهُ لَهُ بِهَا حَسَنَةً وَرَفَعَهُ بِهَا دَرَجةً وَحَطَّ عَنهُ بِهَا خَطِيئَةً) رواه أحمد وأبوداود والترمذي والنسائي وابن ماجة. واته: مووی سپی سەر و ڕیش هەڵ مەکەنن چونکە ڕۆشنایی موسڵمانە، هیچ موسڵمانێك نی‌یە موویەکی سپی کردبێت لە ئیسلامدا ئیللا خوا چاکەیەکی بەو موەوە سپی‌یە بۆ ئەنووسێت و پلەیەکی پێ بەرز ئەکاتەوە و تاوانێکی لەسەر ئەکوژێنێتەوە.

لە ئەنەسەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: (پێمان ناخۆش بوو پیاوێك موویەکی سپی لەسەر یا لە ڕیشیدا هەبێت و هەڵی بکەنێت) موسلیم گێڕاویەتی‌یەوە.

٩- گۆڕینی مووی سپی بە خەنە و شتی زەرد و سوورو وێنەی ئەوانە.

بە پێی ئەوەی ئەبی هورەیرە خوا لێی ڕازی بێت ئەگێڕێتەوە ئەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إنَّ اليَهُودَ والنَّصارَى لايَصبِغُوْنَ فَخَالِفُوهُم) رواه الجماعة. واته: جوولەکەو گاورەکان سەر و ڕیشیان کاتێ کە سپی بوو، ڕەنگ ناکەن، ئێوە پێچەوانەی ئەوان بکەن، وە بەپێی حەدیسی (أبوذر) خوا لێی ڕازی بێت ئەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إنَّ أحسَنَ مَا غَيَّرتُم بِهِ هَذَا الشَّيبَ الحِنَّاءَ وَالكَتَم) رواه الخمسة. واته: بەڕاستی باشترین شتێك مووی سپی پێ بگۆڕن خەنە و ووسمەیە.

وە ڕیوایەتی وا هاتوە کە کەراهەتی ڕەنگ کردن ئەگەیەنێ[1]، ئەمیش وا دەرئەکەوێت بە پێی تەمەن و عورف و عادەت بگۆڕێت، چونکە لە هەندێ صەحابەوە ئەگێڕنەوە کە ڕەنگ نەکردن

---

(١) ئەم دەعوایەی دانەر ئەصلی نی‌یە ، وە لەوانەیە مەبەستیشی ئەوە بێت کە لە صەحابەوە هاتوە، وە ئەوەی شەوکانی هێناویەتی لە صەحابەوە لە (النیل ١/١٠٣) دا، ئەوە تەنها جیاوازی‌یە لەبارەی ئەوەوە کە کامە چاکترە،

باشترە، وە لە هەندێکی تریانەوە ئەگێڕنەوە کە ڕەنگ کردن باشترە، هەندێکیان بە زەرد ڕەنگی ئەکرد و هەندێکیان بە خەنە و ووسمە و هەندێکیان بە زەعفەران[1]. وە هەندێکیان بە ڕەش ڕەنگیان

---

نەك کەراهەت، وە لە فەرزێکا ریوایەتی وا هاتبێتیش لە یەکێ لە صەحابەوە، بۆ بەڵگەی کەراهەت ناگونجێت. (تمام المنە).

(١) لە ڕاستی دا ڕەنگ کردن بە خەنەو شتی تر سوننەتێکی (ثابت)ە، و پێشینەکان کاریان پێ کردووە وە لەو بارەیەوە چەندەها فەرموودەی صەحیح هاتووە، کە دروست نیە (معارضە) و بەرهەڵستیان بکرێت بە چەند حەدیسێکی (ضعیف)، خۆ ئەگەر شتێکیش لەوان صەحیح بێت پێویستە ڕێکخستن لە نێوانیاندا بکرێت بە ڕێگەیەك لە ڕێگاکانی کۆ کردنەوەی نێوان حەدیسەکان، چەند زۆریشن ئەو ڕێگایانە، وە دروست نی‌یە بۆ موسڵمان خوو نەریتێك دابهێنێت پێچەوانەی ئەوە بێت، بە تایبەتی کە هۆی ڕەنگ کردن هەر ماوەو دەقی لەسەر هاتووە لەو حەدیسەدا کە (جماعە) ریوایەتیان کردوە، ئەفەرموێ: (جولەکە و گاور قژیان ڕەنگ ناکەن، جا ئێوە پێچەوانەی ئەوان بکەن). ئەم فەرموودەیە لە (غاية المرام في تخريج أحاديث الحلال والحرام /١٠٤) دا تەخریج کراوە. وە ئەوەی کە دانەر فەرمانی ڕەنگ کردن ئەگێڕێتەوە بۆ عورف و عادەت ئەڵێین: ئەوە هەڵەیەکی ئاشکرایە نابێت پێی هەڵخەڵەتێین. پاشان شێخ ئەلبانی دەفەرموێت: من پێم وایە کە دانەر ـ خوا من و ئەویش عەفو کات ـ بەم بۆچوونەی دەرگایەکی فراوانی کردۆتەوە لە خراپە، کە داناخرێ مەگەر بە ڕێزگرتن و گرینگی پێ دان بە فەرمانەکانی پێغەمبەر ﷺ و سوننەتە عیبادەتی‌یەکانی بەو جۆرەی کە شایستەیە، چونکە وەختێك ئەو پێی وابێت کە تەرکی بەکارهێنانی ڕەنگ بکرێت بۆ سەرو ریش تەنها لەبەر ئەوەی کە لەگەڵ عادەت و نەریتی موسڵمانانی ئەمڕۆدا جیاوازی هەیە، هەرچەندە سابت بوە کە پێغەمبەر ﷺ کردویەتی و فەرمانیشی پێ داوە، جا نیتر چ شتێك ڕێ لە دانەر ئەگرێت ـ کە بە قەدەر ئەویش شارەزایی‌یان نی‌یە لە سوننەت و پلەو پایەی سوننەتیان بە قەد ئەو بەلاوە گرینگ نی‌یە ـ کە تەرکی چەندین سوننەتی تر بکەن ، هەر تەنها لەبەر ئەوە کە جیاوازە لەگەڵ عادەتی موسڵمانان و ئارەزوویاندا؟! وە کام موسڵمانانەش؟ موسڵمانانی چاخی بیستەم؟!

ئێمە جاران و ئێستاش سکاڵامان لە دەست زۆربەی موسڵمانان هەبو لەسەر دوورەپەرێزیان لەسەر کارکردن بە حەدیس بە هۆی دەمارگیری‌یان بۆ پێشەواکانیان.

هەروەها سکاڵامان لە سەرپێچی کردنی هەندێك صۆفی هەبو بۆ فەرمانە شەرعی‌یەکان، چونکە ئەو فەرمانانە بە قسەی خۆیان لەگەڵ زەوق و ئارەزویان نایەتەوە، بەڵام ئەوەتا ئەمڕۆ لەگەڵ ئەوەشدا کە ئێمە ئیدعای غیرەت و پەرۆشی ئەکەین لەسەر ئیسلام، و ئیدعای کار کردن بە سوننەت ئەکەین، لەبەردەم دەمارگیری‌یەکی تازەو صۆفی-یەتی‌یەکی نوێ دا وەستاوین، کە عادەت و ئارەزوی خۆمان پێش سوننەت و ڕەوشتی پێغەمبەر ﷺ ئەخەین و دەمارگیریمان بۆی هەیە، بێ ئەوەی پێشەنگ و پێشەوایەکمان هەبێ لەم کارەدا کە متمانە بە زانست و خووڕەوشتی بکرێت!

كردووه. (حافظ) له (الفتح) دا باسی ئەوه ئەكات كه ئیبنو شیهابی زوهری دەفەرمووێت: هەتا ڕوومان گەنج بوو به ڕەش ڕەنگمان ئەكرد، كاتێ ددان و ڕوومان داكەوت وازمان لێ هێنا.

ئەمما حەدیسەكەی جابیر خوا لێی ڕازی بێت كه ئەفەرمووێت: ئەبو قوحافەی باوكی ئەبوبەكریان هێنا بۆلای پێغەمبەر ﷺ له ڕۆژی فەتحی مەككەدا سەری ئەت ووت (ثغامة) یه، (ثغامة) جۆره

---

لەم چەند ڕۆژەی پێشودا كتێبێكم خوێندەوه به ناوی (الإسلام المصفى) كه هی یەكێ له نوسەره به پەرۆشەكانی ئیسلام بوو ـ وەك له كتێبەكەیەوه دەر ئەكەوێ ـ لەوانەی كه سورن لەسەر مانەوەی ئیسلام به پاك و بێ‌گەردی هەروەك له سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ بەو جۆره بوو، كەچی سەیر ئه كەم ـ له دوای ئەوەی كه چەند حەدیسی صەحیحی هێناوه له بارەی فەرمان به هێشتنەوەی ڕیش لەبەر جیاوازی كردن لەگەڵ موشریكەكان ـ ئەڵێت:

فەرمان كردنی پێغەمبەر ﷺ به هێشتنەوەی ڕیش تەنها له ڕووی پەسەندیەوه بوه وه ڕیش هەروەكو ڕواڵەتەكانی تر وایه كه ئیسلام گرنگی پێ نادات ، و نایكات به پێویست لەسەر شوێن كەوتوانی، بەڵكو وازی لێ ئەهێنێ بۆ زەوق و ئارەزووی خۆیان، وه به پێی ئەوەی كه بارودۆخ و سەردەمیان داوای ئەكات.

جا سەیری ئەم خەم خۆرەی فەرمانەكانی ئیسلام بكه چۆن ڕێگا خۆش ئەكات بۆ لەناو بردنی فەرمانی ڕیش هێشتنەوه بەوەی كه هەر له سەرەتاوه فەرمانەكه لەسەر پەسەندی دائەنێ، پاشانیش ئەڵێت كه ئیسلام ئەم شته پەسەندەی واز لێ هێناوه بۆ ئارەزووی موسڵمانان و بارو دۆخیان، جا ئەگەر ئارەزویان كرد ئەوه ئەنجامی ئەدەن ، نەك لەبەر ئەوەی كه پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ كردوه ، بەڵكو لەبەر ئەوەی ڕێك و گونجاوه لەگەڵ ئارەزوو سەردەمیاندا، وه ئەگەر ئارەزوشیان نەكرد، وازی لێ دێنن و هەر گوێش نادەن بەوەی كه سەرپێچی پێغەمبەریان كردوه ﷺ ، با له فەرزێكدا ئەو فەرمانه بۆ پەسەندیش بێت!

وه من ئەترسم كه ڕای دانەریش نزیك بێت لەم ڕایەوه، ئەگینا ئەی بۆ حوكمی هێشتنەوەی ڕیشی ڕوون نەكردۆتەوه لەگەڵ ئەوەشدا كه دەقی زۆر لەبارەیەوه هاتوه هەروەك باسی دێت، له كاتێكدا ئەبینین جەخت ئەكات لەسەر ڕوون كردنەوەی حوكمی خەتەنه كردن هەرچەنده كه دەق لەبارەیانەوه نی‌یه وەكو له پێشەوه ئیشارەتی بۆ كردو ڕەددیش درایەوه. تەنها ئەوه نەبێت كه لەسەر فەرمودەكەی پێغەمبەر ﷺ : (وَفِّرُوا اللحى...) قسەی زانایانی هێناوه، ئەویش ئاشكرا نی‌یه له دەربڕینی ڕای شەخصی خۆی، به تایبەت ئەو ئەزانێ كه سەرپێچی كردن له هێشتنەوەی ڕیش زیاترو دیارتره له سەرپێچی كردنی خەتەنه كردن، چونكه زۆر له زانایان و شێخەكان كەوتونەته ئەو سەرپێچی‌یەوه، بەڵكو خۆشیانی پێ ئەڕازێننەوه، بەڵكو هەندێكیان فەتوا ئەدەن به دروستی ڕیش تاشین، به تایبەتی له میسردا كه سید سابق و دانەری كتێبەكەی پێشوی تێدا ئەژین بۆیه هەر ئەوه بەس بوو بۆ ئەوەی حوكمی ئەو سەرپێچی‌یه ڕوون بكاتەوه.

پاشان شێخ ئەلبانی به حەدیس و بەڵگه ڕەددی دانەری كتێبی (الإسلام المصفى) ی داوەتەوه ، و باسی حوكمی ڕیش هێشتنەوەی كردوه ، بۆ زیاتر شارەزا بوون بگەڕێرەوه بۆ (تمام المنه).

گیایەكی سپی‌یە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (اذهَبُوا بِهِ إلَى بَعضِ نِسَائِهِ فلتُغَيِّرهُ بشَيءٍ وجنّبوهُ السَّوادَ) رواه الجماعة إلا البخاري والترمذي. واتە: بیبەنەوە بۆلای یەكێ لە ژنەكانی با ئەو سپیایەتی‌یەی قژی سەری بگۆڕێت، بەڵام بە ڕەنگی ڕەش نا، ئەوە ڕووداوێكی تایبەتە، وە ڕووداوە تایبەتی‌یەكان گشتی نین[1].

پاشان هەر جوان نیە بۆ پیاوێكی وەك ئەبو قوحافە كە سەری مووی ڕەشی تێدا نەمابوو، سەری بە ڕەش ڕەنگ بكرێت، چونكە ئەوە شیاو نی‌یە بۆ هی وەكو ئەو.

١٠ - بۆنی خۆش لە خۆدان بە میسك و شتی تری بۆن خۆش، بە تایبەتی ئەو بۆنانەی دەروون ئەحەوێننەوە و دڵ خۆشی ئەكەن و سنگ فراوان ئەكەن و گیان ئەهەژێنن و گورج و گۆڵی و توانا ئەدەن بە لەش، بە پێی ئەوەی ئەنەس خوا لێی ڕازی بێت ئەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (حُبِّبَ إلَيَّ مِنَ الدُّنيا النِّساءُ وَالطِّيبُ، وجُعِلَت قرَّةُ عَيْنِي فِي الصَّلاةِ) رواه أحمد

---

(١) ڕەنگ كردنی سەر و ڕیش بە جگە لە ڕەنگی ڕەش (ثابت)ە بوە لە صەحابەوە، وە ڕێكیشە لەگەڵ ووتەو كردەوەی پێغەمبەر ﷺ. وە ئەوەی دانەر ئەڵێت: كۆمەڵێكیان بە ڕەش ڕەنگیان ئەكرد، ئەڵێم: ئەگەر (ثابت) بوبێت لەوانەوە، ئەوە بەڵگە نی‌یە لەوەدا، چونكە دانەر پێچەوانەی سوننەتی (ثابت)ە لە پێغەمبەرەوە ﷺ بە كردەوەو بە ووتە، لە كاتێكدا خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ﴾ (نساء/٥٩)، وە سابت بوە لە پیاوانی گەورەی صەحابەوە كە بە خەنەو بە ووسمە ڕەنگیان كردوە، هەر بۆیە نەوەوی ئەڵێت: صەحابە هەموو ڕێكن لەسەر ئەوەی مووی سەر و ڕیش ڕەش كردن خراپە، وە ڕووالەتی عیبارەتی هاوەڵەكانمان كە ئەڵێن: كەراهەتی هەیە، كەراهەتی تەنزیهە، بەلام ڕاستی ئەوەیە كە ئەو كارە حەرامە، وە بەڵگەی حەرامی‌یەكەشی (حدیث)ەكەی جابیرە، وە ئەوەی كە دراوەتە پاڵ زوهری ئەگەر ڕاستیش بێت ناكرێتە بەڵگە چونكە پچڕ پچڕە، وە وەستاوە لەسەر زوهری، وە ئەگەر بەرزیشی بكاتەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ هەر كاری پێ ناكرێت چونكە هێنانی بەو شێوەیە ئەبێتە (مرسل).

وە ئەوەی كە دانەر ئەڵێت حەدیسەكەی ئەبوقوحافە ڕوداوێكی تایبەتەو ڕوداوە تایبەتەكانیش گشتی‌یەتیان نی‌یە، منیش ئەڵێم: من وا نازانم كە ئەم حەدیسە لەو تایبەتی‌یانە بێت كە گشتی‌یەتی ناگرێتەوە، بەڵكو لەو بەشەیە (كە فەرمان كردن بە تاكێك فەرمانە بە گشت نەتەوە). وە ئەوەی پشت گیری قسەكانمان ئەكات لەبارەی حەرامی‌یەتی بەكارهێنانی ڕەنگی ڕەش، چوار فەرموودەیە لە ئیبنو عەبباس و (أبي الدرداء) و ئەنەس و عبد الله ی كوڕی عومەر. ئەتوانن بگەڕێن بە شوێنیاندا (تمام المنة).

والنسائي. واتە: لە دنیادا ئافرەت و بۆنی خۆشم لا خۆشەویست کراوە، وە ڕۆشنایی چاوەکانیشم لە نوێژدایە.

وە بە پێی حەدیسەکەی ئەبوهورەیرە کە ئەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن عُرِضَ عليه طِيبٌ فَلا يَرُدَّهُ، فَإنَّهُ خَفِيفُ المَحمَلِ طَيِّبُ الرَّائِحةِ) رواه مسلم والنسائي وأبو داود. واتە: هەرکەس بۆنی خۆشی پێشکەش کرا با نەی گێڕێتەوە، چونکە هەڵگرتنی ئاسانەو بۆنەکەشی خۆشە.

وە لە ئەبی سەعیدەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە ئەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ دەربارەی میسك فەرموویەتی: (هُوَ أطيَبُ الطِّيبِ) رواه الجماعة إلا البخاري وابن ماجة. واتە: میسك لە بۆنە هەرە خۆشەکانە.

وە لە نافیعەوە هاتوە دەفەرمووێت: (ئیبنو عومەر داری عوودی تەنیای بەکار ئەهێنا، یا بە کافورەوە ئەی‌خستە سەر دارعوودەکەو ئەی‌فەرموو: پێغەمبەر ﷺ بەو شێوەیە هەڵمی بۆن خۆشی دروست ئەکرد). موسلیم و نەسائی گێڕاویانەتەوە.

# دەست نوێژ – (الوضوء)

دەست نوێژ ناسراوە بەوەی: خاوێن کردنەوەیەکی ئاوی‌یە پەیوەندی بە دەم و چاو و هەردوو دەست و سەر و هەردوو قاچەوەیە.

وا لە خوارەوە باسەکانی ڕوون ئەکەینەوە.

**١- مەشروعیەتی دەست نوێژ:**

مەشروعی‌یەتی دەست نوێژ بە سێ بەڵگە سابت بووە.

(بەڵگەی یەکەم) قورئانی پیرۆز :

خوای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِ﴾ (المائدة/٦). واتە: ئەی ئەوکەسانەی کە باوەڕتان هێناوە کاتێ ویستتان نوێژ بکەن، دەم و چاو و دەستتان لەگەڵ ئەنیشکا بشۆرن، وە دەستی تەڕ بهێنن بە سەرتاندا، هەروەها پێکانتان لەگەڵ قولەپێ بشۆرن.

(بەڵگەی دووەم) سوننەت:

ئەبوهورەیرە خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لايَقبَلُ اللهُ صَلاةَ أحَدِكُم إذا أحدَثَ حَتَّى يَتَوَضَّأَ) رواه الشيخان وأبوداود والترمذي. واتە: ئەگەر کەسێك لە ئێوە دەست نوێژی شکا، خوا نوێژی لێ وەرناگرێ هەتا دەست نوێژێکی تر نەگرێتەوە.

(بەڵگەی سێ‌یەم) (إجماع):

ئیجماعی هەموو موسڵمانان لەسەر شەرعیەتی دەست نوێژ پێك هاتووە لە لایەنی پێغەمبەرەوە ﷺ هەتا ئەمڕۆ، هەربۆیە دەست نوێژ لە دیندا شتێکە کە بە زەرورەت مەعلومە.

**فەزڵ و گەورەیی دەست نوێژ:**

دەربارەی (فضل)و گەورەیی دەست نوێژ گەلێك فەرموودە لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتوون لێرەدا دەست نیشانی هەندێکیان ئەکەین.

أ- لە عبداللّەی صونابچی‌یەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (کاتێ بەندەی خوا دەست نوێژی گرت و ئاوی لە دەمی وەردا ئەوە ئەو تاوانانەی کە کردوویەتی لە دەمی‌یەوە دەر ئەچن، کاتێ ئاو لە لوتی ڕائەدا تاوانەکانی لە لوتی‌یەوە دەرئەچن، پاشان کاتێ ڕوخساری ئەشوا تاوانەکانی لە ڕوویەوە دەرئەچن هەتا لە ژێر پێڵووی چاوەکانیشی‌یەوە، وە کاتێ دەستەکانی ئەشۆرێت تاوانەکانی لە دەستی‌یەوە دەرئەچێت، هەتا لەژێر نینۆکەکانی پەنجەکانی دەستی‌یەوە دەرئەچێت، کاتێ مەسحی سەری ئەکا تاوانەکانی لەسەریەوە دەرئەچن، هەتا لە هەردوو کونە گوێ‌یەوە، کاتێ پێ‌یەکانی ئەشورێت تاوانەکانی لە هەردوو پێ‌یەوە دەرئەچێت هەتا لەژێر نینۆکەکانی پەنجەکانی قاچەکانیەوە، هەتا وای لێ دێت ڕۆیشتنی بۆ مزگەوت و نوێژەکەی بە زیادە بۆی ئەنووسرێت) مالیك و نەسائی و ئیبنو ماجە و حاکم گێڕاویانەتەوە.

ب- لە ئەنەسەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إِنَّ الْخَصلَةَ الصَّالِحَةَ تَكُونُ فِي الرَّجلِ يُصلِحُ اللهُ بِهَا عَمَلَهُ كُلَّه، وَطُهُورُ الرَّجُلِ لِصَلَاتِهِ يُكَفِّرُ اللهُ بِطُهُورِهِ ذُنُوبَهُ وَتَبقَى صَلَاتُهُ لَهُ نَافِلَةً) رواه أبو يعلى والطبراني والبزار في الأوسط. واتە: بوونی ڕەوشتێکی چاك لە پیاودا خوا هەموو کردەوەکانی پێ چاك دەکات، وە دەست نوێژ گرتنی پیاو بۆ نوێژەکانی، خوا بەو دەست نوێژە تاوانەکانی ئەسڕێتەوە و نوێژەکەی بە زیادە بۆ ئەمێنێتەوە[1].

ج - لە ئەبی هورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أَلَا أَدُلُّكُم عَلَى مَا يَمحُوا اللهُ بِهِ الخَطَايَا وَيَرفَعُ بِهِ الدَّرَجَات؟ قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ الله، قَالَ: إِسبَاغُ الوُضُوءِ عَلَى المَكَارِه، وَكَثرَةُ الخُطَا إِلَى المَسَاجِدِ، وَانتِظَارُ الصَّلَاةِ بَعدَ الصَّلَاةِ، فَذَلِكُمُ الرِّبَاطُ، فَذَلِكُمُ الرِّبَاطُ، فَذَلِكُمُ الرِّبَاطُ) رواه مالك ومسلم والترمذي والنسائي. واتە: ئایا ڕێنمایی تان

---

(١) ئەم حەدیسە (منکر) ە هەروەك ئیبنوعەدی و ئیبنوحیببان فەرموویانە، وە دانەر بە هێنانی ئەو حەدیسە دوو هەڵەی کردوە.

یەکەمیان: تەخریجی کردووەو بێ دەنگی لەسەر کردوە، بەوەش خوێنەر وا تێ ئەگەیەنێت کە سابتە.

دوەمیان: ئەم تەخریجە هی خۆی نی‌یە ـ هەروەك تەخریجەکانی تر ـ بەڵکو ئەمەی نەقڵ کردووە لە (ترغیب المنذري) (١/٩٥) و (مجمع الهیثمي) (١/٢٢٥)، وە ئەمەمان ڕوون کردۆتەوە کە ئەو حەدیسە (معلول)ە چونکە لە ڕیوایەتی بەشاری کوڕی حەکەمە، ئەویش ئیجماعی لەسەرە کە (منکر الحدیث) ە ڕیوایەتی ناکرێتە بەڵگە کاتێك بە تەنها بیهێنێت، هەروەك ڕوونم کردۆتەوە لە (الأحادیث الضعیفة ٢٩٩٩)، وە لەوێدا ڕوونم کردۆتەوە کە بەشی دووەمی حەدیسەکە صەحیحە بە هۆی شەواهیدەکانی‌یەوە، لەو شاهیدانە حەدیسی صونابچی‌یە ئەوەی لە کتێبەکەدایە بەر لەمە، جا ئەگەر دانەر خۆی لێ لابدایە ئەوە دەیپێکا، ئەگینا پێویست بوو عیللەتەکەی ئاشکرا بکات و نەیشارێتەوە (تمام المنه).

نەکەم بۆ ئەو کردەوەیەی کە تاوانی پێ ئەسڕێتەوە و پلەی پێ بەرز ئەبێتەوە ؟ ووتیان: بەڵێ ئەی نێرراوی خوا ڕێنماییمان بکە، فەرمووی: باش دەست نوێژ گرتن لە کاتی سەرماو سۆڵ و ناخۆشی دا، و زۆر هەنگاو نان بەرەو مزگەوتان و چاوەڕووان کردنی نوێژ بە دووای نوێژدا، ئا ئەوەیە جیهاد لە ڕێی خوادا (واتە وەك جیهاد وایە)، سێ جار ئەمەی فەرموو.

د- وە هەر لە ئەبی هورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ هاتە سەر گۆڕستان و فەرمووی: (سڵاوتان لێ بێت ماڵی گەلی باوەڕداران، ئێمەش بە ویستی خوا بەم نزیکانە پێتان ئەگەین، پێم خۆش بوو ئێمەش براکانمان ببینیایە، صەحابەکان ووتیان: ئەی بۆ ئێمە برات نین ئەی نێرراوی خوا ؟ فەرمووی: ئێوە هاوەڵی منن، براکانمان ئەوانەن هێشتا نەهاتوونە دنیاوە، ووتیان: ئەی نێرراوی خوا چۆن کەسانێك ئەناسی لە ئوممەتەکەت کە هێشتا نەهاتوونە دنیاوە؟ فەرمووی: پێم بڵێن ئەگەر پیاوێك کۆمەڵێك ئەسپی دەست و پێ و ناوچاوان سپی هەبێت لەناو کۆمەڵێك ئەسپی ڕەشدا نای ناسێتەوە ؟ ووتیان: بەڵێ ئەی ناسێتەوە ئەی نێرراوی خوا، فەرمووی: ئەوانیش کە دێن دەست و پێ و ناوچاوان سپین بە هۆی دەست نوێژەوە، من پێشیان دەکەوم لە ڕۆژی دوایی‌دا بۆسەر حەوزەکەم، ئاگادارین کە پیاوانێك دەرئەکرێن لەسەر حەوزەکەم وەك چۆن ووشتری سەرلێ شێواو دەرئەکرێ، منیش بانگیان ئەکەم ئەڵێم: ئادەی وەرن، پێم ئەوترێ: تۆ نازانی ئەوانە دووای تۆ گۆڕانکاریان کردوە؟ منیش ئەڵێم دە دووریان بخەنەوە دە دووریان بخەنەوە) موسلیم گێڕاویەتی‌یەوە.

### فەرزەکانی دەست نوێژ

بۆ دەست نوێژ چەند پایەو فەرزێك هەیە کە حەقیقەتی دەست نوێژیان لێ پێك دێت، بە شێوەیەك ئەگەر یەکێك لەو فەرزانە بەجێ نەهات دەست نوێژەکەش بەجێ ناگات، و بەپێی شەرعی ئیسلام بە دەست نوێژ دانانرێت.

وا لە خوارەوە ڕوونیان ئەکەینەوە :

فەرزی یەکەم: نیەتە، حەقیقەتی نیەتیش ئەو ویستەیە کە بەرەو کارێك ئاراستە ئەکرێ، لەبەر ڕەزامەندی خواو سەر دانەواندن بۆ بەجێ هێنانی فەرمانەکانی، کەواتە نیەت کارێکە تەنها هی دڵە پەیوەندی بە زمانەوە نیە، وە ووتنی بە دەم شەرعی نیە.

بەڵگەی فەرزیەتی نیەت ئەو حەدیسەیە کە عومەر خوا لێی ڕازی بێت ئەگێڕێتەوە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إِنَّمَا الأَعمَالُ بِالنِّيَّات وإِنَّمَا لِكُلِّ امرِئٍ مَا نَوَى...) رواه الجماعة. واتە: دروستی کردەوەکان تەنها بە نیەتەکانە، وە هەرکەسێك نیەتی چی هەبێت پاداشی ئەوەی بۆ ئەبێت... حەدیسەکە.

فەرزی دووەم: دەم و چاو شتن یەك جار، واتە ئاوی پێدا بێتە خوارەوە چونكە واتای شتن ئاو پێدا هاتنە خوارەوەیە بە گشتی. سنووری دەم و چاویش لەسەرووی نێوچاوانەوەیە هەتا ژێر چەناگەی بە درێژی، بە پانیش لە نەرمەی گوێچكەوە هەتا نەرمەی گوێچكە.

فەرزی سێیەم: شۆردنی هەردوو دەست لەگەڵ ئەنیشك، ئەنیشك ئەو جومگەیەیە باڵ و بازوو لەیەك جیا ئەكاتەوە، ئەنیشیك واجبە بشۆرێ چونكە پێغەمبەر ﷺ بەو شێوەیە هاتوە لە رێنمایی پێغەمبەرەوە ﷺ، وە نەهاتوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ كە تەنها جارێك ئەنیشكەكانی نەشۆردبن.

فەرزی چوارەم: مەسحی سەر، مەبەست لە مەسحی سەر دەست پێدا هێنانە بە تەڕی، وە ئەو مەسحەش بەجێ ناگات تا ئەندامی مەسح كەرەكە لەگەڵ جووڵەدا نەنووسێت بە ئەندامە مەسح كراوەكەوە، كەواتە دەستی تەڕ یا پەنجە خستنە سەر سەر یا شوێنێكی تر بە مەسح دانانرێت، وە پێی ناوترێت (مسح). لەپاشان (ظاهر) ی فەرمودەكەی خوا ﴿وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ﴾ ئەوە دەر ئەخات كە پێویست ناكات هەموو سەر مەسح بكرێت، بەڵكو ئەوەی لێی تێ ئەگەین ئەوەیە: مەسح كردنی هەندێكی سەر بەسە بۆ ئەوەی فەرمانەكە بەجێ بگەیەنرێ، وە ئەوەی لەم بارەیەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ لەبەر كراوە سێ شێوەیە:

أ- مەسح كردنی هەموو سەری، لە حەدیسەكەی عبداللەی كوڕی زەیددا هاتووە: (پێغەمبەر ﷺ مەسحی سەری كرد بە هەردوو دەستی ئەی بردن بۆ دواوەو ئەیهێنانەوە، لە پێش سەرییەوە دوو دەستەی ئەهێنا هەتا پاشی سەری، لەپاشاندا دەستی ئەگێڕایەوە هەتا ئەگەیشتە ئەو شوێنەی مەسحەكەی لێوە دەست پێ كردبوو) (جماعة) گێڕاویانەتەوە.

ب- مەسح كردنی تەنها بەسەر مێزەرەكەیەوە، لە حەدیسی عەمری كوڕی ئومەییەدا خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرموێت: (پێغەمبەرم ﷺ بینیوە مەسحی كردووە بەسەر مێزەر و هەردوو خوففەكەی) ئەحمەد و بوخاری و ئیبنو ماجە گێڕاویانەتەوە، وە لە بیلالەوە هاتووە ڕەزای خوای لێ بێ كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مەسح بكەن بەسەر خوف و خیماردا) ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە[1].

وە عومەر خوا لێی ڕازی بێت ئەفەرموێت: (هەركەس مەسح كردنی مێزەر پاكی نەكاتەوە دەك خوا پاكی نەكاتەوە).

---

(١) خیمار ئەو پۆشاكەیە كە ئەدرێ بەسەردا وەك مێزەرو شتی تر.

وە لەم بارەیەوە فەرمودەی زۆر هاتووە، بوخاری و موسلیم و پێشەوایانی تر ریوایەتیان کردون. هەروەها هاتووە کە زۆربەی زانایان کاریان پێ کردووە.

ج – مەسح کردنی ناوچاوان و مێزەر، لە حەدیسەکەی موغیرەی کوڕی شوعبەدا هاتووە خوا لێی ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ دەست نوێژی گرتووە مەسحی ناوچەوان و مێزەر و خوفی کردووە) موسلیم گێڕاویەتیەوە.

ئەوەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ لەبەر کراوە ئەوانەیە، وە نەهاتووە لێیەوە ﷺ کە تەنها هەندێکی لێ مەسح کردبێت، هەرچەندە (ظاهری) ئایەتەکە وا پێویست ئەکات وەك لە پێشەوە باسمان کرد، لەپاشاندا دەست هێنان بەسەر ئەو قژە زیادەیەی ئەم لاولای سەر بەس نیە بۆ مەسح کردن (وەك پرچ).

فەرزی پێنجەم:

شۆردنی هەردوو پێ لەگەڵ قولەپێ، ئەم شێوەیش بە (ثابت)ە و (متواتر)ە و بەزۆری هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ بە کردەوە کردوویەتی و فەرمانیشی داوە بە کردنی.

ئیبنو عومەر خوا لێی ڕازی بێت ئەفەرمووێت: (جارێکیان پێغەمبەر ﷺ لە سەفەرێکدا لێمان دوواکەوت، کاتێك پێمان گەیشت نوێژی عەسر زۆری نەمابوو بچێت، ئێمەش کەوتینە پەلە بۆ دەست نوێژ گرتن و مەسحی پێ‌کانمان ئەکرد، ئەویش ﷺ بە دەنگی بەرز هاواری کرد و فەرمووی: (ئاگری دۆزەخ بۆ پاژنە پێکان) ئەمەی دوو یا سێ جار فەرموو). متفق علیه.

عبدالرحمن ی کوڕی ئەبی لەیلا دەفەرمووێت: هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ئیجماعیان کردووە و کۆن لەسەر ئەوەی کە ئەبێ پاژنەی پێ بشۆررێ.

وە ئەو فەرزانەی لە پێشەوە باسمان کردن ئەوەیە کە لەم ئایەتە قورئانیەدا بڕیاری لەسەر دراوە ئەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِۚ﴾ (المائدة/٦). واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە، کاتێ ویستتان نوێژ بکەن، دەم و چاوتان و هەردوو دەستان لەگەڵ ئەنیشکەکانتان بشۆرن، لەپاشاندا مەسحی سەرتان بکەن، ئینجا هەردوو پێتان لەگەڵ قولەپێ‌کانتان بشۆن.

فەرزی شەشەم: ڕیز کردنی فەرزەکان، چونکە خوای گەورە لە ئایەتەکەدا بە ڕیز باسی فەرزەکانی دەست نوێژی کردووە، وە مەسحی سەری خستۆتە نێوان شۆردنی هەردوو دەست و هەردوو پێ، وە عەرەب دووشتی لەیەك چوو دانابڕێت بۆ سوودێك نەبێت، ئەو سوودەش لێرەدا تەرتیب و یەك لە دووای یەك هاتنە، ئایەتەکەش هەر بۆ ئەوە هاتوە کە واجب ڕوون بکاتەوە، وە لەبەر گشتی‌یەتی فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ لە حەدیسێکی صەحیحدا کە دەفەرمووێت: (إبدَأوا بِمَا بَدَأَ اللهُ بِهِ). واتە: بەوە دەست پێ بکەن کە خوا دەستی پێ کردووە[1].

وە سوننەتی عەمەلیش لەسەر ئەو تەرتیبە ڕۆیشتووە لە ڕوکنەکانی دەست نوێژدا، وە نەقڵ نەکراوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە دەست نوێژی گرتبێت ئیللا بە تەرتیب نەبێت.

وە دەست نوێژ عیبادەتێکە و تەوەرەی فەرمان لە عیبادەتەکانا لەسەر شوێن کەوتنە، کەواتە بۆ کەس نیە موخالەفەی ئەوە بکات، کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتووە دەربارەی چۆنیەتی دەست نوێژگرتنی، بە تایبەتی موخالەفە کردنی ئەو شتانەی کە پێغەمبەر ﷺ بەردەوام لەسەری بووە[2].

**سوننەتەکانی دەست نوێژ:**

مەبەست لە سوننەتەکانی دەست نوێژ: ئەوانەن کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتوون بە (ثابت) ی چ بەقسە و چ بەکردەوە، بێ ئەوەی واجبی کردبن لەسەر کەس و بێ ئەوەی ئینکاری کردبێت لەسەر کەسێك کە تەرکی کردبن.

وا لە خوارەوە ئەو سوننەتانە ڕوون ئەکەینەوە:

١- ووتنی (بسم الله) لەسەرەتای دەستنوێژەوە:

---

(١) حەدیسەکە بەو زاراوەیە (شاذ)ە و صەحیح نیە، وە ئەوەی زانرابێت ئەوەیە کە زاراوەکە بە شێوەی خەبەری هاتووە، نەك بە شێوەی فەرمان، موسلیم و کەسانی تر گێڕاویانەتەوە هەروەك تەحقیقم کردووە لە (إرواء الغليل ٣١٦/٤- ٣١٩/١١٢٠) جا بۆی بگەڕێرەوە.

(٢) دانەر لەمەدا شوێن ئیبنوقەییم کەوتووە ڕەحمەتی خوای لێ بێت کە لە (زاد المعاد) دا ووتوویەتی، منیش لە (التعليقات الجياد) دا ڕوونم کردۆتەوە بەوەی کە ئەحمەد تەخریجی کردوە، وە لە ڕێگای ئەوەوە ئەبوداود لە میقدامی کوڕی مەعدی کەربەوە فەرموویەتی: (ئاوی دەست نوێژیان هێنا بۆ پێغەمبەر ﷺ کە دەست نوێژی پێ بگرێ، سێ جار دەستەکانی شۆری، و لەپاشاندا سێ جار ڕوخساری، پاشان هەردوو قۆڵی سێ جار شۆری، ئینجا سێ جار ئاوی لە دەم و لوتی وەردا و مەسحی سەرو هەردوو گوێچکەی کرد ناوەیان و دەرەوەیان ، لەپاشاندا قاچەکانی سێ‌جار شۆری) ئەم فەرموودەیە سەنەدەکەی صەحیحە. شەوکانی دەفەرمووێت: سەنەدەکەی (صالح)ە، ئەمەش ئەبێتە بەڵگەی ئەوەی کە تەرتیب لە دەست نوێژدا واجب نیە. (تمام المنة).

دەربارەی ووتنی بسم الله لەسەرتای دەست نوێژگرتنەوە چەند (حدیث)ێکی (ضعیف) هاتووە بەڵام بە هەموویان (هێز) بە یەکتری ئەبەخشن و ئەبنە بەڵگەی ئەوەی کە ووتنی (بسم الله) بنەمایەکی هەبێت، وە ووتنی (بسم الله) خۆی لە خۆیدا شتێکی باشە و دروستە بە شێوەیەکی گشتی[1].

٢- سیواك کردن.

سیواك بەو دارە ئەووترێ کە سیواکی پێ ئەکرێ و بە خودی سیواك کردنەکەش ئەوترێ، ئەوێش هێنانی داری سیواکە بە داندا یا وێنەی ئەو لە هەر شتێکی زبر کە دانی پێ پاك بکرێتەوە، وە چاکترین شت بۆ سیواك کردن داری ئەراکە کە لە خاکی حیجازەوە دەهێنرێ، چونکە سیفەتی ئەم دارە بەهێزکردنی پوکەو نایەڵێت دانەکان تووشی نەخۆشی بن، وە یارمەتی کرداری هەرس کردن ئەدات و بۆ گورچیلەکانیش باشە.

هەرچەندە سوننەت بەجێ دێت بە هەموو ئەو شتانەی کە زەردی ددان لادەبەن و دەم پاك ئەکەنەوە وەك فڵچە و وێنەی فڵچە.

لە ئەبی هورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لَوْلَا أن أشُقَّ عَلى أُمَّتي لأمَرتُهُم بِالسِّوَاكِ عِندَ كُلِّ وُضُوءٍ) رواه مالك والبيهقي والشافعي والحاكم[2]. واتە: ئەگەر نەبووایە بە ئەرك وزەحمەت لەسەر ئوممەتەکەم، فەرمانم پێ ئەکردن بۆ هەموو دەست نوێژێك سیواك بکەن.

لە عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (السِّوَاكُ مَطْهَرَةٌ للفَمِ مَرضاةٌ للرَّبِ) رواه أحمد والنسائي والترمذي. واتە: سیواك کردن کارێکە کە دەم و ددان پاك ئەکاتەوە و پەروەردگار ڕازی ئەکات.

---

(١) صەحیح ترین فەرموودە لەو بارەیەوە فەرموودەکەی ئەبی هورەیرەیە کە بە مەرفوعی هێناویەتی بە زاراوەی: (نوێژ بۆ کەسێك نیە دەست نوێژی نەبێت، کەسێکیش لەسەرەتاوە (بسم الله) ی نەکردبێت دەست نوێژی نیە). ئەم فەرموودەیە سێ ڕێگا و شایەتی زۆری هەیە ئەبووایە دانەر بە ڕوواڵەتی حەدیسەکەی بکردایە و بە واجبی دابنایە، وە بەڵگە نی‌یە بۆ دەرچوون لە ڕوواڵەتی حەدیسەکە تاوەکو بوترێت ئەو فەرمانە بۆ پەسەندی‌یە و بەس، کەواتە واجب بوونەکە سابتە، وە ئەوە مەزهەبی (ظاهري)یەکان و ئیسحاق و یەکێك لە دوو ریوایەتەکانە لە ئەحمەدەوە، بگەڕێرەوە بۆ (السيل الجرار ١/٧٦-٧٧). (تمام المنة).

(٢) صحيح الجامع الصغير (٥٣١٦).

وە سیواك کردن هەموو کات (مستحب) ە، بەڵام لە پێنج کاتدا زیاتر (مستحب)ە، ئەو کاتانەش ئەمانەن:

(١) کاتی دەس نوێژ گرتن.

(٢) کاتی نوێژ کردن.

(٣) کاتی خوێندنی قورئان.

(٤) کاتی هەڵسان لە خەو.

(٥) کاتی گۆڕانی تامی دەم.

وە ڕۆژووان و غەیری ڕۆژووان وەکو یەکە لە بەکار هێنانی سیواکدا چ لەسەرتای ڕۆژەوە وە بێت یان لەکۆتایی ڕۆژدا.

بەپێی ئەوەی کە عامیری کوڕی ڕەبیعە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: (پێغەمبەرم ﷺ ئەوەندە بینیوە ناتوانم بیژمێرم، سیواکی دەکرد لە حاڵێکدا کە بەڕۆژوو بوو) رواه أحمد وأبوداود والترمذي[1].

وە ئەگەر سیواك بەکار هێنرا سوننەت وایە دووای بەکار هێنانەکەی بشۆررێت بۆ ئەوەی خاوێن بێت، بەپێی ئەوەی عائیشە خوای لێ ڕازی بێت ئەفەرمووێت: (پێغەمبەر ﷺ سیواکی ئەکرد، سیواکەکەی ئەدایە دەستم بیشۆرم، منیش خۆم سیواکم پێ ئەکرد پاشان ئینجا ئەمشۆری و ئەم دایەوە دەستی) رواه أبو داود والبيهقي[2].

---

(١) هێنانی ئەم فەرموودەیە وەك بەڵگەو بێ دەنگ بوون لەسەری وادەرئەخات کە (ثابت) بێت، بەڵام بەو شێوەیە نیە، چونکە سەنەدەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ سەر عاصمی کوڕی عبداللە، کە ئەویش (ضعیف)ە وەك (حافظ) لە (التقريب)دا فەرمویەتی، وە بوخاری لە صەحیحەکەیدا ئیشارەتی کردووە بۆ (ضعیف) ی ئەو فەرموودەیە ووتویەتی: (لە عامیری کوڕی ڕەبیعەوە ئەگێڕنەوە... کە هێنانی بەو سیغەیە (ضعیف) ئەبێت) و قسەی (حافظ) لە (التلخيص) دا جیاوازی تێدایە لەبارەیەوە، چونکە لە شوێنێك بە حەسەنی داناوە و لە شوێنێك بە (ضعیف)، کە هەر ئەمەیان ڕاستە (إن شاء الله)، چونکە لە کتێبی یەکەمدا بڕیاری داوە لەسەر لاوازی حەدیسەکە، بۆیە ئێمە هیوادار بوین کە دانەر بەڵگەی لەسەر بهێنایەتەوە لەسەر ئەوەی کە بۆی چوە لە پەسندیەتی سیواك کردن بۆ ڕۆژووان لە سەرەتاو کۆتایی ڕۆژەوە بە (البراءة الأصلية)، وە لاوازی حەدیسەکەشی ڕون بکردایەتەوە (تمام المنة).

(٢) دانەر بێدەنگی کردووە لەسەر فەرموودەکەو شوێن ئەبی داود کەوتووە لەوەدا، لەپاشاندا (منذري) لە (مختصر)ەکەیدا، وە لە ئیسنادی حەدیسەکەدا (کثیر)ی کوڕی عەبید هەیە، شیری خواردووە لەگەڵ عائیشەدا، بێجگە لە ئیبنوحیببان کەس بەجێی باوەڕی دانەناوە، کۆمەڵێك لێیەوە ریوایەتیان کردوە، وە لە (التقريب) دا بە

وە سوننەتە بۆ ئەوکەسانەی کە دانیان نەماوە لە دەمدا بە پەنجە سیواک بکەن، بەپێی ئەوەی عائیشە خوا لێی ڕازی بێت ئەفەرمووێت: (ووتم: ئەی نێرراوی خوا ئەگەر کەسێك دانی لەدەمدا نەمابوو، ئایا ئەبێت سیواک بکات؟ فەرمووی: بەڵێ، ووتم: چۆن چۆنی بکات؟ فەرمووی پەنجە بخاتە دەمی‌یەوە) (طبراني) گێڕاویەتی‌یەوە[1].

٣- شۆردنی هەردو دەست سێ جار لەسەرەتای دەست نوێژ گرتنەوە: بەپێی ئەوەی ئەوسی کوڕی ئەوسی (ثقفي) ئەفەرموێت: (بینیومە پێغەمبەر ﷺ دەس نوێژی گرتووە لەپێشەوە سێجار دەستی ئەشۆری) رواه أحمد والنسائي.

وە لە ئەبو هورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە کە ووتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذا استَيقَظَ أحَدُكُم مِن نَومِهِ، فَلا يَغمِس يَدَهُ فِي إناءٍ حَتَّى يَغسِلَهَا ثَلاثاً، فَإنَّهُ لايَدرِي أينَ بَاتَت يَدُهُ) رواه الجماعة. واتە: کاتێك کەسێکتان لە خەو هەڵئەستێت با دەست نەخاتە ئەو قاپەی ئاوی دەست نوێژی تێدایە هەتا سێجار دەستەکانی نەشوات، چونکە نازانێ شەو دەستی لەکوێدا ڕۆژی کردۆتەوە.

بەڵام بوخاری کاتێ کە ئەم فەرموودەیە ئەگێڕێتەوە باسی ژمارەی شۆردنەکەی تێدا نەکردووە.

٤- سێ جار ئاو لە دەم ڕادان:

بەپێی ئەوەی (لقيط)ی کوڕی صەبرە خوا لێی ڕازی بێت ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذا تَوَضَّأتَ فَمَضمِض) رواه أبو داود والبيهقي. واتە: ئەگەر دەست نوێژت گرت ئاو لە دەمەت ڕابدە.

٥- ئاو لە لوت کردن و فڕێ کردنەوەی سێجار[2]:

(مقبول) هاتوە... کەواتە حەدیسەکە ئەگەری (تحسين) ی هەیە ، ئیمامی ئەڵبانی بە حەسەنی داناوە، (حافظ) بەهێزی کردووە و بەڵگەی پێ وەك لە صەحیحی ئەبو داود دا بە ژمارە (٤١) ڕوونم کردۆتەوە، والله أعلم (تمام المنة).

(١) لە (معجم الأوسط) دا ، وە لە سەنەدەکەی دا عیسای کوڕی عبدالله ی ئەنصاری تێدایە کە ئەویش (ضعيف)ە، وەك (هيثمي) لە (المجمع) دا (٢/١٠٠) دەفەرموێت.

(٢) ئەوەی کە دانەر ئەڵێت: ئاو لە دەم و لوت ڕادان سێ جار سوننەتە، ئەگەر مەبەستی سێ جارەکە بێت کە سوننەتە ئەوە قەبوڵە، بەڵام ئەگەر مەبەستی ئەصلی ئەو باس کراوانە بێت ـ وەك دەرئەکەوێت ـ ئەوە وەرناگیرێت، چونکە ئاو لە دەم و لوت ڕادان خۆی واجبە ، وە لە چەند حەدیسی صەحیحدا فەرمانی پێ کراوە ، وە سابت بوە کە

بەپێی ئەوەی ئەبی هورەیرە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذَا تَوَضَّأَ أحَدُكُم فَلْيَجعَل فِي أنفِهِ مَاءً ثُمَّ لِيَستَنثِر) رواه الشيخان وأبو داود. واتە: ئەگەر کەسێك لە ئێوە دەست نوێژی گرت با ئاو بکاتە لوتی‌یەوە و پاشان فم بکا .

وە سوننەت وایە بەدەستی ڕاست ئاو لە لوتی بکات و بە دەستی چەپ فمی بکاتەوە ؛ بەپێی ئەوەی لە عەلی‌یەوە هاتووە: کە داوای ئاوی دەست نوێژی کرد ، جا ئاوی لە دەم ڕادا و بە لوت ئاوی هەڵمژی و بە دەستی چەپی فمی کردەوە، سێ جار ئەمەی کرد پاشان فەرمووی: ئەمە شێوازی دەست نوێژی پێغەمبەرە ﷺ ) ئەحمەد و نەسائی گێڕاویانەتەوە.

وە ئاو لە دەم و لوت ڕادان بەئاو گەیاندن بە دەمو لوت بەهەرشێوەیەك بێت بەجێ ئەگات.

بەڵام ئەوەی صەحیح و (ثابت)ە لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەوەیە ئاو لە دەمو لوت ڕادانی بەیەکەوە کردووە، عبد الله ی کوڕی زەید دەفەرمووێ: (پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوی لە دەم و لووتی وەردا بە سێ مست) بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە.

وە لە ڕیوایەتێکی تری بوخاری و موسلیم دا ئاوا هاتووە: (بە سێ لەوێچ ئاوی لە دەم و لوتی وەردا ).

وە سوونەت وەهایە دەستنوێژگر زیادەڕەوی بکات لەم ئاو ڕادانەدا جگە لە ڕۆژوەوان نەبێت، بەپێی ئەوەی (لقیط) ئەگێڕێتەوە ئەفەرمووێت: (ووتم: ئەی نێرراوی خوا ﷺ دەربارەی دەست نوێژ فێرم بکە فەرمووی: (أسبِغِ الوُضُوءَ، وَخَلِّل بَينَ الأصَابِعِ وَبَالِغ فِي الاستِنشَاقِ إلا أن تَكُونَ صَائِماً) رواه الخمسة وصححه الترمذي. واتە بەباشی دەست نوێژ بگرە پەنجە بخە نێوان پەنجەکانت و بە زیادەوە ئاو لە لوتت ڕابدە مەگەر بەڕۆژوو بیت.

٦- پەنجە خستنە نێوان مووەکانی ڕیش:

بەپێی ئەوەی کە (عثمان) خوا لێی ڕازی بێت ئەگێڕێتەوە ئەفەرمووێت: (پێغەمبەر ﷺ کاتێ دەست نوێژی ئەگرت پەنجەکانی بە تەڕی ئەخستە نێوان مووەکانی ڕیشی) ئیبنو ماجە و (ترمذي) گێڕاویانەتەوە، و (ترمذي) بە صەحیحی داناوە.

وە لە ئەنەسەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ دەست نوێژی بگرتایە لەپێك ئاوی دەهێنا و ئەیدا بەژێر چەناگەیەوە، نێوان مووەکانی ڕیشی پێ تەڕ ئەکرد بە پەنجەکانی و

---

پێغەمبەر ﷺ لە هەموو دەستنوێژێکا کردوێتی، ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێت کە ئەو دەم و چاو شتنەی لە قورئانەدا هاتوە لەگەڵ ئاو لە دەم و لوت ڕداندایە (تمام المنة).

ئەیفەرموو: (هَكَذَا أَمَرَنِي رَبِّي عَزَّوَجَل) رواه أبو داود والبيهقي والحاكم. واتە: پەروەردگارم بەو شێوەیە فەرمانی پێکردووم (عزوجل).

٧- پەنجە خستن لەنێوان پەنجەکانی دەست و پێ:

بەپێی ئەوەی ئیبنو عەبباس خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إِذَا تَوَضَّأْتَ فَخَلِّلْ بَيْنَ أَصَابِعِ يَدَيْكَ وَرِجلَيكَ) رواه أحمد والترمذي وابن ماجة. واتە: ئەگەر دەست نوێژت گرت دەست بخە لەنێوان پەنجەکانی دەست و پێت.

وە لە موستەوریدی کوڕی شەددادەوە هاتوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: (پێغەمبەرم ﷺ بینیوە بە پەنجە تووتەی نێوان پەنجەکانی پێی ئەشۆری) رواه الخمسة إلا أحمد.

وە لەبارەی پەسەندی جوڵاندنی ئەنگوستیلەو وێنەی ئەوە وەك بازن ریوایەت هاتووە بەڵام نەگەیشتۆتە پلەی صەحیح، بەڵام پێوستە کاری پێبکرێت چونکە ئەچێتە ژێر گشتێتی فەرمان بە باش دەست نوێژ گرتن.

٨- سێ جار شۆردنی ئەندامەکان:

ئەوەش سوننەتێکە بەزۆری کاری پێکراوە، وە ئەوەی بە پێچەوانەی ئەمە هاتووە ئەوە بۆ ڕوون کردنەوەی دروستی یەکجار و دووجاریشە.

لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکیەوە لە باپیریەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پیاوێکی دەشتەکی هاتە لای پێغەمبەر ﷺ دەربارەی چۆنیەتی دەست نوێژگرتن پرسیاری لێ کرد، ئەویش ﷺ نیشانی دا، (واتە: دەست نوێژێکی گرت لەبەر چاویا) سێجار سێجار ئەندامەکانی ئەشۆری و پێی فەرموو: (هَذَا الوُضُوءُ فَمَن زَادَ عَلَى هَذَا فَقَد أَسَاءَ وَتَعَدَّى وَظَلَمَ) رواه أحمد والنسائي وابن ماجة. واتە: ئەوە دەست نوێژ گرتنە، جا هەرکەسێك لەمە زیاتر بکات ئەوە خراپەو زیادەڕەوی و ستەمی کردووە.

وە لە (عثمان)ەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە دەفەرمووێت: (پێغەمبەر ﷺ سێجار سێجار ئەندامەکانی دەست نوێژی ئەشۆری) ئەحمەد و نسائی و (ترمذي) گێڕاویانەتەوە[1].

وە بە صەحیحی هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ یەکجار یەکجار و دووجار دووجاریش ئەندامەکانی دەست نوێژی شۆریوە کاتی دەست نوێژ گرتن، بەڵام مەسحی سەر لە زۆربەی ڕیوایەتەکاندا یەك جار هاتووە[1].

---

(١) وە حەدیسەکە (حسن صحيح) ە بڕوانە (صحيح الترمذي) شیخ ئەلبانی ڕەحمەتی خوای لێ بێت (وەرگێڕ).

٩- دەست پێ‌کردن لەلای ڕاستەوە:

واتە: شۆردنی لای ڕاست پێش لای چەپ لە دەست و قاچدا، لە عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: (پێغەمبەر ﷺ حەزی ئەکرد لە نەعل لەپێ کردندا و لە شانەکردندا و لە دەست نوێژدا و لە هەموو کارەکانیدا، لەلای ڕاستەوە دەست پێ‌بکات) متفق علیه.

وە لە ئەبی هورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إِذَا لَبِستُم وَإِذَا تَوَضَّأتُم فَابدَأُوا بِأَيَامِنِكُم) رواه أحمد وأبو داود والترمذي والنسائي. واتە: ئەگەر جل‌وبەرگتان پۆشی یا دەست نوێژتان گرت لەلای ڕاستەوە دەست پێ‌بکەن.

١٠- دەست خستن لە ئەندامەکان:

ئەمیش دەست خستنە لە ئەندامەکانی دەست نوێژ لەگەڵ ئاوەکەدا یان دوای ئاوەکە، لە عبد الله ی کوڕی زەیدەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ سێ‌یەکی مووددێك ئاوی بۆ هێنرا دەست نوێژی پێ گرت و لە کاتی دەست نوێژ گرتنەکەدا دەستی ئەخست لە هەردوو قۆڵی) ئیبنو خوزەیمە گێڕاویەتی‌یەوە[2].

وە هەر لەوەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە ئەفەرمووێت: (پێغەمبەر ﷺ کاتێ دەست نوێژی ئەگرت ئاوها دەستی لە ئەندامەکانی ئەخست) ئەبو داودی (طیالسي) و ئەحمەد و ئیبنوحببان و ئەبو یەعلا گێڕاویانەتەوە.

١١- شۆردنی ئەندامەکان بەدووای یەکدا:

---

(١) بە صەحیحی هاتووە لە حەدیسی (عثمان)ەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ سێ‌جار مەسحی سەری کردووە، ئەبو داود بە دوو ئیسنادی (حسن) تەخریجی کردوە، وە ئیسنادێکی تری (حسن)ی هەیە، وە ئەوە ڕاستی‌یە، چونکە ئەو ڕیوایەتانەی مەسحی سەریان بە یەکجار هێناوە با زۆریش بن بەرهەڵستی ئەو ڕیوایەتانە ناکەن کە بە سێ جار هێناویەتی، بەو پێ‌یە سێ‌جاریش هەر سوننەتە، هەندێ جار ئەکرێت و هەندێ جار وازی لێ ئەهێندرێت، ئەمەش هەڵبژاردەی صەنعانیە لە (سبل السلام) دا. (تمام المنة).

(٢) ئەم حەدیسە لە (بلوغ المرام) و جگە لەودا بە ڕیوایەتی ئیبنو خوزەیمە بە زاراوەی دووسێ‌یەك (ثلثان) هاتوە، هەروەها لە (المستدرك) ی حاکم و (سنن البيهقي) دا بەو جۆرە هاتوە، جا دیارە ئەوەی کە لەم کتێبەدا هاتووە هەڵەیەکی چاپی‌یە و ئەبێت چاك بکرێت، وە صەنعانی دەفەرمووێت: (دووسێ‌یەکی موود کەمترین ئاوە کە هاتووە پێغەمبەر ﷺ دەست نوێژی پێ گرتووە، بەڵام ئەوەی کە هاتووە بە سێ‌یەکی مووددێك دەست نوێژی گرتووە ئەصلی نیە). (تمام المنة).

واتە: شۆردنی ئەندامەکانی دەست نوێژ بەدووای یەکدا بە شێوەیەك دەست نوێژگر بەکارێکی دەرەکی دەست نوێژەکەی نەپچڕێنێ کە پەیوەندی بە دەست نوێژەوە نەبێ و لە عورفدا بە لادان لە دەست نوێژ بژمێردرێ، وە سوننەتیش هەر لەسەر ئەمەی باسمان کرد ڕۆیشتووە، هەروەها کاری موسڵمانانی سەلەف و خەلەفیش هەروا بووە.

١٢- مەسحی هەردوو گوێچکە:

سوننەت وایە ناو گوێچکە بە پەنجەی شایەتی و دەرەوەی گوێچکە بە پەنجە گەورە مەسح بکرێت هەر بەو ئاوەی کە مەسحی سەری پێ ئەکرێ، چونکی گوێچکەش بەشێکە لەسەر .

لە میقدامی کوڕی مەعدی کەربەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ لەکاتی دەست نوێژ گرتندا دەستی تەڕی ئەهێنا بەسەریاو بە ناوەوە و دەرەوەی هەردوو گوێچکەیدا، وە پەنجەی ئەخستە کرکراگەی گوێچکەکانی) رواه أبوداود والطحاوي.

وە لە ئیبنو عەبباسەوە ڕەزای خوای لێ بێت لە باسی دەستنوێژ گرتنی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: (یەکجار مەسحی سەری و هەردوو گوێچکەی کرد).

وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە (مەسحی سەری ئەکرد و مەسحی هەردوو گوێچکەی، ناوەکانیان بە پەنجەی شایەتی و دەرەوەیان بەپەنجە گەورەکان دەکرد)٠

١٣- درێژکردنەوەی شوێنی شۆردن لە ڕوخسار و دەست و پێدا:

ڕوخسار بەوە درێژ ئەکرێتەوە هەندێکی پێشی سەری پێشەوەی پێوە بشۆررێت زیادە لەوەی کە دانراوە بۆ شۆردن، بەڵام درێژکردنەوەی شوێنی شۆردن لە دەستو پێدا بەوە ئەبێت کە لای سەرووی ئانیشك و قولەپێکان بشۆرێت، بەپێی حەدیسی ئەبی هورەیرە خوا لێی ڕازی بێت کە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إنَّ أُمَّتِي يَأتُونَ يَومَ القِيَامَةِ غُراً مُحَجَّلِينَ مِن آثَارِ الوُضُوءِ، فَقَالَ أَبُو هُرَيرَةَ مَنِ استَطَاعَ مِنكُم أن يُطِيلَ غُرَّتَهُ فَلْيَفعَل) رواه أحمد والشيخان. واتە: ئوممەتی من لە ڕۆژی دوایی کاتێك دێن ڕوخسار و دەست و پێ سپین لە ئەنجامی دەست نوێژ گرتن. ئەبو هورەیرە فەرمووی: جا هەرکەس لە ئێوە ئەتوانێ شوێنی شۆردنی ڕوخسار و دەست و پێ درێژ بکاتەوە با بیکات[1].

---

(١) ئەم ڕستەیەی ناو حەدیسەکە کە ئەفەرموێ: (جا هەرکەس لە ئێوە ئەتوانێ ...) (مدرج)ە لەلایەن یەکێك لە گێڕەرەوەکانی ئەم حەدیسەوە، وە لە فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ نییە ، هەروەك چەند کەس لەوانەی (حافظ)ی حەدیسن باسیان کردوە، وە حەدیسەکە لای ئەوان لە ڕیوایەتی تەمیمی کوڕی مێجمەرە لە ئەبوهورەیرەوە. (حافظ)

وە لە ئەبو زورعەوە هاتووە خوا لێی ڕازی بێت کە ئەبو هورەیرە داوای ئاوی دەست نوێژی کرد کاتێ بۆیان هێنا دەست نوێژی گرت، هەردو قۆڵی شۆری هەتا لە ئەنیشکەکانیشی تێ پەڕی، کاتێ پێکانی شۆری لە قولاپەکانیشی تێ پەڕی تا هەردو لاق) منیش ووتم: ئەوە چی‌یە؟ ووتی: ئەوە شوێنی خشڵەکەیە. ئەحمەد گێڕاویەتی‌یەوە، زاراوەکەش هی ئەحمەدە، ئیسنادەکەشی صەحیحە لەسەر مەرجی بوخاری و موسلیم.

١٤- دەست گرتن بە ئاوەوە با هەڵێنجان لە دەریاش بێت:

بەپێی ئەوەی ئەنەس خوا لێی ڕازی بێت ئەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ بە صاعێك تا پێنج موود خۆی ئەشۆری و بە موودێك دەست نوێژی ئەگرت. متفق علیه.

وە لە عبید الله ی کوڕی یەزیدەوە هاتوە دەفەرمووێت: پیاوێك بە ئیبنو عەبباسی ووت: چەندم ئاو بەسە بۆ دەست نوێژ گرتنێك ؟ فەرمووی: موودێك، کابرا ووتی: ئەی بۆ خۆشۆردنێك؟ فەرمووی: (صاعێك، پیاوەکە ووتی: بەشم ناکات، ئیبنو عەبباس فەرمووی: بێدایك، ئەوکەسەی کە لە تۆچاکتر بوو بەشی ئەکرد کە پێغەمبەرە ﷺ. ئەحمەد و بەززار و (طبراني) لە (الکبیر) دا گێڕاویانەتەوە بەسەنەدێك کە پیاوەکانی جێی سیقەن.

وە لە عەبدالله ی کوڕی عومەرەوە خوا لێیان ڕازی بێت ریوایەت کراوە کە: (پێغەمبەر ﷺ بەلای سەعددا تێپەڕی دەست نوێژی ئەگرت، ئاوی زۆر بەکار ئەهێنا فەرمووی: ئەو ئیسرافە چی‌یە ئەی سەعد؟! سەعد فەرمووی: بۆچی لەئاو بەکارهێناندا ئیسراف هەیە؟ فەرمووی: بەڵێ ئەگەر لەسەرڕووبارێکی ڕۆیشتووش بێت) ئەحمەد و ئیبنو ماجە ریوایەتیان کردووە، وە لە سەنەدی ئەم حەدیسەدا (ضعف) هەیە، ئیسرافیش بەوە ئەبێت کە ئاو بۆ سوودێکی غەیرە شەرعی بەکار بێت، وەك ئەوەی لە سێجار زیاتر ئاو بۆ شۆردنی ئەندامەکانی دەست نوێژ بەکار بێت.

لە حەدیسی عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکی‌یەوە لە باپیری‌یەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: (پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی فێری دەست نوێژ گرتنی بکات پێغەمبەریش ﷺ سێجار سێجار شۆردنی ئەندامەکانی فێر ئەکرد و فەرمووی: ئەوە شێوەی دەس نوێژ گرتنە هەرکەس لەوە زیاتری کرد ئەوە خراپە و زیادەڕەوی و ستەمی کردووە) ئەحمەد و نەسائی و ئیبنو ماجە و ئیبنو خوزەیمە بە چەند ئیسنادی صەحیح گێڕاویانەتەوە.

---

لە فەتحدا فەرمویەتی: ئەم ڕستەیەم نەدیوە لە ریوایەتی هیچ کەس لەوانەی حەدیسیان گێڕاوەتەوە لە صەحابەوە کە دە ئەفەرن، وە هەتا ئەوانەش کە لە ئەبوهورەیرە ریوایەتیان کردوە تەنها ئەم ریوایەتەی نەعیم نەبێت. (تمام المنة).

وە لە عبداللەی کوڕی موغەففەلەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەر ﷺ ئەیفەرموو: (إِنَّهُ سَيَكُونُ فِي هَذِهِ الأُمَّةِ قَومٌ يَعتَدُونَ فِي الطُّهُورِ وَالدُّعَاءِ) رواه أحمد وأبو داود وابن ماجة. واتە: لەم ئوممەتەی مندا کۆمەڵێك دروست ئەبن زیادەڕەوی ئەکەن لە دەست نوێژ گرتن و پاڕانەوەدا.

بوخاری دەفەرمووێت: زانایان بە کەراهەتیان داناوە لە بەکارهێنانی تاوی دەست نوێژدا لەوە تێپەڕن کە پێغەمبەر ﷺ بەکاری هێناوە.

١٥- پاڕانەوە لە کاتی دەست نوێژ گرتندا:

لە پێغەمبەرەوە ﷺ هیچ پاڕانەوەیەکی دەست نوێژ (ثابت) نەبووە، جگە لەوەی ئەبو موسای ئەشعەری ئەبێ خوای لێ ڕازی بێت کە دەفەرمووێت: (ئاوی دەست نوێژم برد بۆ پێغەمبەر ﷺ دەست نوێژی پێ گرت گوێم لێ بوو ئەپاڕایەوە ئەی فەرموو: (اللَّهُمَّ اغفِر لِي ذَنبِي، وَوَسِّع لِي فِي دَارِي، وَبَارِك لِي فِي رِزقِي) واتە: خوایە لە تاوانەکانم ببورە و خانەم فراوان کە و بەرەکەت بخەرە ڕۆزیم. منیش ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ گوێم لێت بوو بەوەو بەوە دوعات دەکرد، فەرمووی: بۆ ئەو دوعایانە هیچیان بەجێ هێشتووە[1]؟ رواه النسائي وابن السني بإسناد صحيح.

بەڵام نەسائی لە باسی ئەو دوعایانەدا هێناویەتی کە دەستوێژگر لە دووای لێ بونەوە لە دەست نوێژ ئەیانڵێت. وە ئیبنوسوننی بەشێکی بۆ داناوە دەفەرمووێت: (باسی ئەوەی کە دەستنوێژگر لە کاتی دەستوێژەکەیدا ئەیڵێت). نەوەوی دەفەرمووێت: هەردووکیان ڕێی تێ ئەچێ.

١٦- پاڕانەوە لە دووای دەست نوێژ:

---

(١) ئەم (حدیث)ە چەند شتی لەسەرە:

یەکەمیان: ئەو (حدیث)ە لە (ذکر)ەکانی دەست نوێژ نیە، بەڵکو لە (ذکر)ەکانی نوێژە، بەپێی ئەوەی ئیمامی ئەحمەد لە موسنەدەکەیدا ریوایەتی کردووە، هەروەها عبد الله ی کوڕی لە زەوائیدیدا.

دوەمیان: (حدیث)ەکەی دراوەتە پاڵ نەسائی وای دەرئەخات کە لە (سنن)ەکەیدا هاتووە، بەڵام لە (عمل اليوم والليلة) دا هاتووە.

سێهەمیان: لەگەڵ ئەوەی دا ڕۆیشتوە لەسەر بە صەحیح دانانی ئیسنادەکەی! وە بەو شێوەش، نیە بەڵکو (ضعيف)ە لەبەر پچڕ پچڕی ئیسنادەکەی.

عیللەتێکی تریشی هەیە ئەویش ئەوەیە مەوقوفە، وەك ئیبنو ئەبی شەیبە لە (المصنف)دا تەخریجی کردوە (١/٢٩٧). (تمام المنة).

بەپێی حەدیسی عومەر خوا لێی ڕازی بێت کە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ کەسێك نیە لە ئێوە بەباشی دەست نوێژ بگرێت و پاشان بڵێت: (أشهَدُ أن لَا إلَهَ إلا اللهُ وَحدَهُ لاشَرِيكَ لَهُ وَأشهَدُ أنَّ مُحَمَّداً عَبدُهُ وَرَسُولُهُ) ئیللا هەر هەشت دەرگای بەهەشتی بۆ ئەکرێتەوە، خۆی لە کامەیانەوە بیەوێ ئەچێتە ژوورەوە، موسلیم گێڕاویەتیەوە.

وە لە ئەبی سەعیدی خودریەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس دەست نوێژی گرت و پاشان ووتی: (سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أشهَدُ أن لا إلَهَ إلَّا أنتَ، أستَغفِرُكَ وَأتُوبُ إلَيكَ) لەسەر جێ نووسێك ئەنووسرێت و مۆر ئەکرێت هەتا ڕۆژی دوایی شکاندنی بۆ نیە، (طبراني) لە (الأوسط) دا ریوایەتی کردوە، وە ڕاوییەکانی ڕاوی صەحیحن، زاراوەکەش هی (طبراني)یە.

وە نەسائی گێڕاویەتییەوە لە کۆتاییەکەیدا دەفەرموێت: (مۆرێکی لێ ئەدرێت ئەخرێتە ژێر عەرشەوە هەتا ڕۆژی دوایی شکاندنی بۆ نیە[1]) وە وەقفەکەی بە صحیح داناوە.

بەڵام ئەو پاڕانەوەی کە دەفەرموێت: (اللَّهُمَّ اجعَلنِي مِنَ التَّوَّابِينَ وَاجعَلنِي مِنَ المُتَطَهِّرِين) ئەوە لە ریوایەتی (ترمذي)یە، خۆی دەفەرموێت: لە ئیسنادەکەیدا (إضطراب) هەیە و زۆری صەحیح نییە[2].

١٧- کردنی دوو ڕکات نوێژ لە دوای دەستنوێژەوە:

---

(١) ئەمەش چەند شتی لەسەر هەیە:

یەکەم: دراوەتە پاڵ نەسائی وای دەرئەخات کە لە سونەنەکەیدایە، بەڵام وا نیە، بەڵکو لە (عمل اليوم والليلة)دا تەخریجی کردوە.

دوەم: نەسائی لە (حدیث)ە مەرفوعەکەدا دەفەرموێت: (ئەمە هەڵەیە و ڕاستی ئەوەیە کە مەوقوفە) جا ئەبووایە دانەر ئەوەی نەقل بکردایە.

سێهەم: ئەو تەخریجەی باس کراوە لە ریوایەتی (طبراني)، دانەر لە کتێبی (الترغيب) ی (منذري) نەقلی کردووە (١/١٠٥) لە کۆتاییەکەیدا ئەڵێت: وەقفەکەی لەسەر ئەبی سەعید بە صەحیح دانراوە، وە هەروەها (هیثمی)ش لە (مجمع الزوائد/١/٢٣٩) دا وەی فەرمووە. (تمام المنة).

(٢) ئەو قسەیە وا دەرئەخات ئەو پاڕانەوەیەی لە (حدیث)ەکەدا هاتووە تەنها (ترمذي) تەخریجی کردوەو (علة) ی (اضطراب)یشی داوەتە پاڵی، بەڵام ئەصلی (حدیث)ەکە لای موسلیم و جگە لەویشە لە (حدیث)ی عومەرەوە، وە ڕاستیەکەی ئەوەیە کە (حدیث)ەکە صەحیحە، وە ئەو (اضطراب)ەش کە ئیشارەی پێ کردوە بەو جۆرە نیە کە حەدیسەکە عیللەتدار بکات. (تمام المنة).

بەپێی حەدیسی ئەبی هورەیرە خوا لێی ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ بە بیلالی فەرموو: (حَدِّثنِي بِأرجَى عَمَلٍ عَمِلتَهُ فِي الإسلامِ، إنِّي سَمِعتُ دُفَّ نَعلَيكَ بَينَ يَدَيَّ فِي الجَنَّة، قَالَ: مَا عَمِلتُ عَمَلاً أرجَى عِندِي مِن أنِّي لَم أتَطَهَّر طُهُوراً فِي سَاعَةٍ مِن لَيلٍ أو نَهَارٍ إلَّا صَلَّيتُ بِذَلِكَ الطُّهُورِ مَا كُتِبَ لِي أن أُصَلِّي) متفق عليه. واتە: ئەی بیلال پێم بڵێ کام کردەوە کە کردووتە لە ئیسلامدا زۆر ئومێدت پێی بووە، چونکە من گوێم لە دەنگی نەعلەکانت بوو لەبەر دەممەوە کە ئەڕۆیشتی لە بەهەشتدا؟ ئەویش فەرمووی: کردەوەیەکم نەکردووە کە زۆر ئومێدم پێی بووبێت بێجگە لەوەی هەر دەستنوێژێکم گرتبێت لە ڕۆژدا بووبێت یا لە شەودا، چەندە خوا بۆی نووسیبم نوێژم کردووە دووای ئەو دەست نوێژە.

وە لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَا مِن أحَدٍ يَتَوضَّأُ فَيُحسِنُ الوُضُوءَ وَيُصَلِّي رَكعَتَينِ يُقبِلُ بِوَجهِهِ وَقَلبِهِ عَلَيهِمَا إلَّا وَجَبَت لَهُ الجَنَّةُ) رواه مسلم وأبوداود وابن ماجة وابن خزيمة في صحيحه. واتە: هیچ کەسێك نیە بە چاکی دەست نوێژ بگرێت و دوایی دوو ڕکات نوێژ بکات، بە دڵ و بەگیان ئاگاداری نوێژەکە بێت، ئیللا بەهەشتی بۆ واجب ئەبێت - واتە: ئەچێتە بەهەشت-.

وە لە خومرانی خزمەتکاری عوسمانەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: (عوسمانی کوڕی عەففانم بینی خوا لێی ڕازی بێت، ئاوی دەست نوێژیان بۆ هێنا ئەویش کردی بەسەر دەستی ڕاستی دا سێ جار شوشتی، پاشان دەستی ڕاستی خستە ناو قاپە ئاوەکەوەو ئاوی دەرهێنا، ئاوی لە دەمی ڕادا و ئاوی بە لوت هەڵمژی و فمی کردەوە، لەپاشاندا سێجار دەم و چاوی شۆرد و ئینجا سێ جار هەردوو دەستی لەگەڵ ئانیشکی شۆرد، و قاچەکانی سێجار شۆرد و فەرمووی: پێغەمبەرم ﷺ بینیوە وەك ئەم دەستنوێژەی من دەست نوێژی گرتووە، پاشان فەرمویەتی: (مَن تَوَضَّأ نَحوَ وُضُوئِي هَذَا ثُمَّ صَلَّى رَكعَتَينِ لَا يُحَدِّثُ فِيهِمَا نَفسَهُ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِهِ) رواه البخاري ومسلم وغيرهما. واتە: هەرکەسێك بەو شێوەیەی من دەست نوێژ بگرێت لەپاشاندا دووڕکات نوێژ بکات لەکاتی نوێژەکەیدا بیر لەهیچ نەکاتەوە و دڵی لای نوێژەکەی بێت، خوا لە تاوانەکانی لەوەوپێشی ئەبوورێ.

وە ئەوەی کە ماوەتەوە لە شۆردنی پێڵوەکانی چاوو چرچی دەم و چاوو جوڵاندنی ئەنگوستیلەو مەسحی گەردن باسمان نەکردووە، چونکە ئەو (حدیث)انەی کە لەو بارەیەوە هاتوون نەگەیشتوونە پلەی صەحیح، هەرچەندە کاری پێ ئەکرێت بۆ تەواویەتی پاکەو خاوێنی[1].

**ئەو شتانەی کە کردنیان (مکروه)ە بۆ دەست نوێژ گر:**

(مکروه)ە بۆ ئەوکەسەی دەست نوێژ ئەگرێت سوننەتێك لەو سوننەتانە واز لێ بهێنێ کە لەپێشەوە باسمان کرد، بۆ ئەوەی لە پاداشتیان بێبەش نەبێت، چونکە کردنی شتی (مکروه) ئەبێتە هۆی بێ بەش بوون لە پاداشتی چاك، وە ئەو کەراهەتەش بە واز هێنان لە سوننەت بەجێ دێت.

**ئەو شتانەی کە دەست نوێژ پوچەڵ ئەکەنەوە:**

چەند شتێك هەیە کە دەست نوێژ پوچەڵ ئەکەنەوەو دەری ئەکەن لە گەیاندنی مەبەستەکەی، وا لە خوارەوە باسیان ئەکەین:

١- هەرچی لە پاش و پێش دەرچوو کە ئەمانە ئەگرێتەوە:

(أ) میز.

(ب) پیسایی.

بەپێی فەرمودەی خوای گەورە کە ئەفەرموێت: ﴿أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ...﴾ (مائدة/٦). واتە: یان یەکێ لە ئێوە دەستی بە ئاو گەیاند. کە ئەوە کینایەتە لە چونە سەر ئاو.

(جـ) دەرچوونی بای پاش، بەپێی ئەو حەدیسەی کە ئەبی هورەیرە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا يَقبَلُ اللهُ صَلاةَ أحَدِكُم إذا أحدَثَ حَتَّى يَتَوَضَّأ) رواه البخاري ومسلم. واتە: خوا نوێژی ئەو کەسەتان وەرناگرێ ئەگەر شتێکی لێ ڕوودا کە دەستنوێژەکەی بشکێنێ هەتا دەست نوێژ نەگرێتەوە. پیاوێکی (حضرموت)ی وتی: ئەی ئەبا هورەیرە ڕووداو چییە؟ فەرمووی: تسو تڕ. متفق علیه.

---

(١) گەردن و مل لە دەست نوێژدا بەپێی شەرع شوێنی خاوێن کردنەوە نیە، لەبەر ئەوە من بە دروستی نازانم لەکاتی دەست نوێژ گرتندا مل دەستی تەڕی پێدا بهێنرێت، بە بەڵگەی تایبەت نەبێت کە کاری پێ بکرێت، ئەو بەڵگەیەش نیە هەروەك دانەر ئەڵێت، وە پێچەوانەی ئەوە شەرع دانانە بە ڕەئی و دروست نیە، بەڵام جوڵاندنی ئەنگوستیلە ئەبێ بکرێت ئەگەر تەسك بوو - خواش یارمەتی دەری هەمووانە — (تمام المنة).

وە هەر لەوەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذا وَجَدَ أحَدُكُم فِي بَطنِهِ شَيئاً فَأشكَلَ عَلَيهِ أخَرَجَ مِنهُ شَيئٌ أم لا؟ فَلا يَخرُجَنَّ مِنَ المَسجِدِ حَتَّى يَسمَعَ صَوتاً أو يَجِدَ رِيحاً) رواه مسلم. واتە: ئەگەر کەسێکتان هەستی بەشتێك کرد لە سکیدا، سەری لێ تێك چوو نەی زانی هیچی لێ دەرچووە یان نا ؟ با مزگەوت بەجێ نەهێڵێ هەتا دەنگ نەبیسێ یا بۆن نەکا.

بەڵام نەبیستن و بۆن نەکردن هیچیان مەرج نین لەوەدا بەڵکو لێرەدا مەبەستی دڵنیایی بوونی تەواوە لە هاتنە دەرەوەی شتێك لێی.

(د ، هـ ، و) دەرچوونی مەنی و (مذي) و وەدی، بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە دەربارەی (مذي) فەرموویەتی: (فيه الوضوء). واتە: بۆ هاتنە دەرەوەی (مذي) دەست نوێژگرتنەوە پێویستە. وە بەپێی ئەو حەدیسەی کە ئیبنو عەبباس دەفەرمووێت: ئەما مەنی ئەوەیە کە غوسڵی بۆ دەکرێت، ئەما (مذي)و وەدی، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: «زەکەرت یان دامێن و ناوگەڵت بشۆ و دەست نوێژێك بگرە هەروەك چۆن دەست نوێژ بۆ نوێژ ئەگری» بەیهەقی لە سونەنەکەیدا گێڕاویەتیەوە[1].

٢- خەوی قوڵ: بەشێوەیەك کە ئەوکەسە هیچ ئاگای لەخۆی نەمێنێ و نەتوانێ پاشی خۆی لە زەوی توند بکات، بەپێی حەدیسی صەفوانی کوڕی عەسسال خوا لێی ڕازی بێت ئەفەرمووێت: (پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ ئەکردین کە لەسەفەرەکانمانا کاڵەکانمان دانەکەنین بۆماوەی سێ ڕۆژو سێ شەو دانەکەنین مەگەر بەهۆی لەش گرانیەوە، بەڵام بەهۆی میزو پیسایی و خەوەوە داینەکەنین) - واتە مەسحیان بەسەردا بکەین - ئەحمەد و نەسائی و (ترمذي) گێڕاویانەتەوەو (ترمذي) بە صەحیحی داناوە[2].

بەڵام ئەگەر کەسی خەوتوو دانیشتبوو، پاشی لەزەوی گیر کردبوو ئەوە دەست نوێژەکەی پوچەڵ نابێتەوە، (حديث)ەکەی ئەنەسیش ڕەزای خوای لێ بێ هەر لەسەر ئەمە حەمل ئەکرێ کە دەفەرمووێت: (یارەکانی پێغەمبەر ﷺ چاوەڕووانی نوێژی خەوتنانیان ئەکرد لە مزگەوتدا هەتا ملیان لار ئەبووەوە لەبەر خەو، پاشان نوێژیان ئەکردو دەست نوێژیان نەئەگرتەوە) شافیعی و

---

(١) ئەوە مەوقوفە، وە بەڵگە هێنانەوە بە تەنها بەوە - لەگەڵ ئەوەشدا کە جیاوازی هەیە لە گونجانی بۆ بەڵگە پێ هێنانەوە - وا دەرئەخات کە لە فەرموودەی مەرفوعدا شتی وا نیە بەڵگە بێت بۆ ئەوە، بەڵام بەو شێوەیە نیە، چونکە لەسەر (مذي) (حديث)ی زۆر هەیە؛ بەناوبانگترینیان (حديث)ەکەی عەلی کوڕی (أبوطالب)ە خوا لێی ڕازی بێت. (تمام المنة).

(٢) ئەم حەدیسە حەسەنە بڕوانە (صحيح سنن النسائي ١٢٣)ی شێخ ئەلبانی.

موسلیم و ئەبو داود و (ترمذي) گێڕاویانەتەوە. وە لای (ترمذي) لە ڕێگای شوعەیبەوە هاتوە بە زاراوەی: (یارەکانی پێغەمبەرم ﷺ بینیوە، لە خەو هەڵیان ئەستاندن بۆ نوێژ هەتا پرخەی هەندێکیانم گوێ لێ ئەبوو، لەپاشاندا هەڵئەستان و نوێژیان ئەکرد بێ ئەوەی دەست نوێژ بگرنەوە)، ئیبنو موبارەك دەفەرموێت: ئێمە وا لێی تێ ئەگەین کە بە دانیشتنەوە بوو بێتن[1].

٣- لەدەس دانی عەقڵ: جا ئەو لەدەس دانە چ بە شێت بوون بێ، یان بە بوورانەوە بێت یان بە مەست بوون بێ یا بە دەرمان بێ، وە چ زۆر بێ یا کەم، وە ئایا پاش جێگیر کرابێ لە زەوی یا جێگیر نەبێ، لەبەر ئەوەی بێ ئاگایی ئینسان بەم هۆیانە لە خەو لێ کەوتن لەپێش ترە، قسەی زانایانیش یەکە لەسەر ئەم بۆچوونە.

٤- دەست دان لە عەورەت بە ڕووتی:

بەپێی ئەوحەدیسەی بوسرەی کچی صەفوان کە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن مَسَّ ذَكَرَهُ فَلا يُصَلِّ حَتَّى يَتَوَضَّأ) رواه الخمسة وصححه الترمذي. واتە: هەر کەسێك دەستی دا لە زەکەری خۆی هەتا دەست نوێژ نەگرێتەوە نوێژ نەکات. بوخاری دەفەرموێت: لەم بابەدا ئەمە صەحیح ترین شتە.

وە هەروەها مالیك و شافیعی و ئەحمەدو جگە لەوانیش ئەو (حدیث)ەیان گێڕاوەتەوە. ئەبو داود دەفەرموێت: بە ئیمام ئەحمەدم ووت: (حدیث)ەکەی بوسرە صەحیح نیە؟ فەرمووی: صەحیحە.

وە لە ریوایەتێکدا لە ئەحمەد و نەسائیەوە هاتووە لە بوسرەوە: کە گوێی لە پێغەمبەر بوو ﷺ دەیفەرموو: (وَيَتَوَضَّأُ مِن مَسِّ الذَّكَرِ) واتە هەرکەس دەستی لە زەکەری خۆی دا دەست نوێژی ئەشکێ ئەبێ دەست نوێژ بگرێتەوە.

ئەمەش زەکەری خۆی و زەکەری کەسێکی تریش ئەگرێتەوە. وە لە ئەبی هورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن أفضَى بِيَدِهِ إلَى ذَكَرِهِ لَيسَ دُونَهُ سِترٌ، فَقَد وَجَبَ عَلَيهِ الوُضُوءُ) رواه أحمد وابن حبان والحاكم وصححه هو وابن عبد البر. واتە: هەرکەس دەستی لە

---

(١) لە ڕاستیدا خەو بە گشتی پوچەڵ کەرەوەی دەست نوێژە، وە بەڵگە نیە بۆ بەستنەوەی (حدیث)ەکەی صەفوانی کوڕی عەسسال، بەڵکو (حدیث)ەکەی عەلی کە مەرفوعە پشتگیری ئەکات کە ئەفەرموێت: (دەم هەڵێنی کۆم چاوەکانە، جا هەرکەس خەوی لێکەوت با دەست نوێژ بگرێتەوە) وە ئیسنادەکەی حەسەنە وەك (ابن المنذر) و نەوەوی و ئیبنو صەلاح فەرموویانە، وە لە صەحیحی ئەبوداووددا بە ژمارە (١٩٨) ڕوونم کردۆتەوە، وە (حدیث)ەکەی ئەنەس ئەبێت ئەو کاتە بووبێت کە هێشتا دەست نوێژگرتنەوە لە خەو واجب نەکرابێت. بۆ زیاتر بڕوانە (تمام المنة).

زەکەری خۆی دا بە ڕووتی، دەست نوێژگرتنەوەی لەسەر واجب ئەبێت»· ئیبنو سەکەن دەفەرمووێت: ئەم (حدیث)ە چاکترین (حدیث)ە کە ڕیوایەت کراوە لەم بابەدا.

وە لە زاراوەکەی شافیعی دا هاتووە دەفەرمووێت: (إذَا أفضَى أحَدُكُم بِيَدِهِ إلَى ذَكَرِهِ، لَيسَ بَينَهَا وَبَينَهُ شَيئٌ فَلْيَتَوَضَّأْ). واتە: هەرکەس دەستی لە زەکەری خۆی دا بە ڕووتی و هیچی بەسەرەوە نەبوو، با دەست نوێژ بگرێتەوە.

وە لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکی یەوە لە باپیری یەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: (هەر پیاوێك و هەر ئافرەتێك دەستیان بەر شوێنی عەورەتیان بکەوێت با دەست نوێژ بگرنەوە)، ئیمامی ئەحمەد گێڕاویەتی یەوە، وە ئیبنو قەییم دەفەرمووێت: حازمی ی فەرمویەتی : ئەم ئیسنادە صەحیحە.

بەڵام حەنەفی یەکان ڕایان وایە کە دەست دان لە عەورەت دەست نوێژ ناشکێنێ بەپێی (حدیث)ەکەی (طلق) کە دەفەرمووێت: (پیاوێك لە پێغەمبەری پرسی ﷺ ئەگەر کەسێك دەستی بدات لە زەکەری خۆیەوە دەست نوێژ بگرێتەوە ؟ فەرمووی: نەخێر، چونکە ئەویش پارچەیەکە لە خۆت) خاوەنی پێنج سونەنەکان ڕیوایەتیان کردوە، ئیبنو حبان بە صەحیحی داناوە، ئیبنو مەدینی دەفەرمووێت: ئەم (حدیث)ە لە (حدیث)ەکەی بوسرە حەسەن ترە[1].

### ئەو شتانەی دەست نوێژ پوچەڵ ناکەنەوە

حەزمان کرد لێردا دەست نیشانی ئەو شتانە بکەین کە گومان ئەکرێ دەست نوێژ بشکێنن، بەڵام دەست نوێژ ناشکێنن لەبەر ئەوەی بەڵگەی صەحیح دەربارەیان نەهاتووە کە پشتیان پێ ببەسترێت.

وا لە خوارەوە ئەو شتانە ڕوون ئەکەینەوە:

(١) فەرموودەکە ئاماژەیەکی جوانی تێدایە، ئەویش ئەوەیە ئەو دەست لێدانەی دەست نوێژ ناشکێنێ ئەوەیە کە بێ شەهوەت بێت، چونکە لەم حاڵەتەدا بە بەشەکانی تری لەش ئەچوێنرێت کاتێ کە دەستیان لێ ئەدەی دەست نوێژ ناشکێت، بە پێچەوانەی ئەوەوە ئەگەر دەست لێدانەکە بە شەهوەت بوو ئەوە بە ئەندامەکانی تری لەش ناچوێنرێت، ئەمەش شتێکی ئاشکرایە وەك ئەبینی، بەم پێیە حەدیسەکە نابێتە بەڵگە بۆ حەنەفی یەکان کە ئەڵێن: دەست لێ دان بە گشتی دەست نوێژ ناشکێنێ، بەڵکو ئەبێتە بەڵگە بۆ ئەو کەسانەی کە ئەڵێن: دەست لێ دان بەبێ شەهوەت دەستنوێژ ناشکێنێ، بەڵام ئەگەر بە شەهوەت بوو ئەوە دەست نوێژ ئەشکێنێ، بەپێی (حدیث)ەکەی بوسرە، بەو شێوەیە ئەو دوو (حدیث)ە کۆ ئەکرێنەوە. وە ئەمە هەڵبژاردەی ئیبنو تەیمیەیە لە هەندێ پەراوەکانیدا، والله أعلم (تمام المنة).

١- دەست دان لە پێستی ئافرەت بەبێ پەردە:

لە عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ ماچی کردووە کاتێ کە بەڕۆژوو بووە فەرموویەتی: (إنَّ القُبلَةَ لَايَنقُضُ الوُضُوءَ وَلا تُفطِرُ الصَّائِمَ) أخرجه إسحاق وابن راهويه، والبزار بسندٍ جيد. واتە: بەڕاستی ماچ نە دەست نوێژ ئەشکێنێ و نە ڕۆژوو. (عبد الحق) دەفەرمووێت، من عیللەتێك لەم (حدیث)ەدا نابینم تاوەکو ببێتە هۆی تەرك کردنی.

وە هەر لە عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: شەوێك لەجێگەدا پێغەمبەرم ﷺ لێ ون بوو، منیش بۆی گەڕام لە مزگەوت بوو دەستم کەوتە بەر بەری پێی کە هەڵی نابوو لە کڕنووشدا بوو ئەیفەرموو: (اللَّهُمَّ إنِّي أعُوذُ بِرِضَاكَ مِن سَخَطِكَ وَأعُوذُ بِمُعَافَاتِكَ مِن عُقُوبَتِكَ وَأعُوذُ بِكَ مِنكَ لا أُحصِي ثَنَاءً عَلَيكَ أنتَ كَمَا أثنَيتَ عَلَى نَفسِكَ) رواه مسلم والترمذي وصححه. واتە: خوایە! من پەنا بە ڕازی بوونت ئەگرم لە خەشمو قینت، وە پەنا بە لێبوردنەکانت ئەگرم لە سزاکانت، وە پەنا ئەگرم بەخۆت لە خۆت، من ناتوانم سوپاس وستایشی تۆ بکەم، تۆ ئاوای کە خۆت ستایشی خۆتت کردووە.

وە هەر لە عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: (پێغەمبەر ﷺ هەندێ لە ژنەکانی خۆی ماچ ئەکرد و لەپاشاندا ئەچوو بۆ مزگەوت بێ ئەوەی دەست نوێژ بگرێتەوە) رواه أحمد والأربعة بسند رجاله ثقات.

وە هەر لەوەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: (لەبەر دەم پێغەمبەردا ﷺ ئەنوستم قاچەکانم لای قبلەکەیەوە بوو، کاتێ سەجدەی ئەبرد ئەیژەن لە قاچمەوە، منیش قاچم کۆ ئەکردەوە) وە لە زاراوەیەکی تردا (هەرکاتێ بیویستایە سوجدە بەرێت ئەیژەن لە قاچمەوە) متفق عليه.

٢- هاتنە دەرەوەی خوێن لە غەیری ئەو شوێنەی کە عادەتەن خوێنی لێ دێتە دەروە، چ بەبریندار کردن بێت یا بە کەڵەشاخ گرتن یا بە لوت پژان، وە چ زۆر بێ یا کەم.

حەسەن خوای لێ ڕازی بێت دەفەرمووێت: (بەردەوام موسڵمانان نوێژیان بە برینەکانیانەوە دەکرد ) بوخاری گێڕاویەتیەوە.

وە دەفەرمووێت: (ئیبنو عومەر خوایان لێ ڕازی بێت زیبکەیەکی پێوە بوو گوشی و خوێنی لێهات نەچوو دەست نوێژ بگرێتەوە.

ئیبنو ئەبی ئەوفاش خوێنی تف کردەوەو نوێژەکەی نەبڕی.

عومەری کوڕی (خطاب) خوا لێی ڕازی بێت برینەکەی خوێنی لەبەر ئەڕۆی و نوێژیشی ئەکرد.

عەببادی کوڕی بیشر لە کاتی نوێژدا چەند تیرێکی بەرکەوت، کەچی هەر بەردەوام بوو لە نوێژەکەیدا). رواه أبو داود وابن خزيمة والبخاري تعليقاً.

٣- ڕشانەوە:

چ پڕ بە دەم بێ یا کەم بێ وەك یەکە، وە دەربارەی پوچەڵ کردنەوەی دەست نوێژ بە ڕشانەوە (حدیث) ێکی وا نەهاتووە بکرێتە بەڵگە و کاری پێ بکرێت.

٤- خواردنی گۆشتی ووشتر:

ئەمەش ڕای هەر چوار خەلیفەکان و زۆر لەصەحابە و تابیعینە، بەڵام (حدیث)ی صەحیح هاتووە کە ئەبێ دەست نوێژ تازە بکرێتەوە لە خواردنی گۆشتەکەی. لە جابری کوڕی سەمورەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: (پیاوێك پرسی لە پێغەمبەر ﷺ ئایا دەست نوێژ لە گۆشتی مەڕ بگرینەوە؟ فەرمووی: (ئارەزووی خۆتە ئەیگریتەوە یا نای گریتەوە)، ووتی: ئەی لەگۆشتی ووشتر؟ فەرمووی: (بەڵێ لە گۆشتی ووشتر دەست نوێژ بگرەوە)، ووتی: ئەی لە مۆڵگە و پشتیری مەڕدا نوێژ بکەم؟ فەرمووی: (بەڵێ نوێژ بکە) ووتی: ئەی لە مۆڵگەی ووشتردا نوێژ بکەم؟ فەرمووی: (نەخێر) ئەحمەد و موسلیم گێڕاویانەتەوە.

وە لە بەڕائی کوڕی عازیبەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: (پرسیار لە پێغەمبەر کرا ﷺ دەربارەی دەست نوێژ گرتنەوە لەگۆشتی ووشتر ؟ فەرمووی: (دەست نوێژی لێ بگرنەوە)، وە دەربارەی گۆشتی مەڕ پرسیاری لێ کرا ؟ فەرمووی: (دەست نوێژی لێ مەگرنەوە)، وە دەربارەی نوێژ کردن لە ئاغەڵ و مۆڵگەی ووشتر پرسیاری لێ کرا ؟ فەرمووی: (نوێژی تێدا مەکەن، چونکە ئەوانە لە شەیتانەوەیە)، وە دەربارەی پشتیر و مۆڵگەی مەڕ پرسیاری لێ کرا ؟ فەرمووی: (نوێژی تێدا بکەن، چونکە ئەوانە پیرۆزن) ئەحمەد و ئەبو داود و ئیبنوحیببان گێڕاویانەتەوە[1].

وە ئیبنو خوزەیمە دەفەرمووێت: لەنێوان زانایانی حەدیسدا هیچ خیلافێکم نەبینیوە لەوەدا کە ئەم خەبەرە صەحیحە لەڕووی نەقڵەوە، لەبەر عەدالەتی ئەوانەی نەقڵیان کردووە. وە ئەوەی دەفەرمووێت: ئەم (مذهب)ە بەهێزترە لە ڕووی بەڵگەوە هەرچەندە (جمهور) پێچەوانەی ئەوەن[2].

---

(١) (صحيح سنن ابن ماجة ٤٠١).

(٢) دووای ئەوەی فەرموودەکە صەحیح بێ لە پێغەمبەرەوە ﷺ بە ئیعترافی دانەر، ئیتر نابێت بەهیچ جۆرێك واز لەو فەرموودەیە بهێنرێت موخالیفەکانی هەرکەس بن وە پلە و پایەیان هەرچی بێت، چونکە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ خۆی بەخۆی (ثابت) ئەبێت نەك بە کردەوەی کەسانی تر لە دوای ئەوەوە. وەك ئیمامی شافیعی ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت وا دەفەرمووێت. (تمام المنة).

٥- گومانی دەست نوێژ گرتوو لەوەی کە ڕووداوێکی لێ ڕوودابێت:

ئەگەر کەسێك دەست نوێژی هەبوو، گومانی بۆ دروست بوو لەوەی کە ئایا دەستنوێژەکەی شکاوە یان نا؟ ئەوە ئەو گومانەی زەرەری نیە و دەست نوێژەکەی پوچەڵ ناکاتەوە، لەنوێژدا بێت یان نا، هەتا بەتەواوی دڵنیا نەبێت کە دەست نوێژەکەی شکاوە.

لە عەببادی کوڕی تەمیمەوە لە مامی‌یەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: (باس کرا بۆ پێغەمبەر ﷺ کە پیاو وا خەیاڵ ئەکا لە نوێژەکەیدا شتێکی لێ پەیدا بووبێ؟ ئەویش فەرمووی: (نوێژەکەی نەبڕێ هەتا دەنگ نەبیستێ یا بۆن نەکا) (جماعة) گێڕاویانەتەوە جگە لە (ترمذي).

وە لە ئەبی هورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێکتان هەستی بە شتێك کرد لە سکی خۆیداو نەی زانی لێی دەرچووە یان نا ؟ با لە مزگەوت نەچێتە دەر هەتا دەنگ نەبیسێ یان بۆن نەکات) موسلیم و ئەبو داود و (ترمذي) گێڕاویانەتەوە.

لێرەدا مەبەست ئەوە نیە ئەبێت هەر گوێی لە دەنگ بێت یا بۆن بکات، بەڵکو گرینگ دڵنیایی تەواوە لەوەی ئەو کەسە ئەوەی لێ دەرچوە کە دەنگ یا بۆنی هەیە.

ئیبنوموبارەك دەفەرمووێت: ئەگەر کەسێك گومانی لە ڕووداو هەبوو پێویست نیە لەسەری دەست نوێژ بگرێتەوە هەتا تەواو دڵنیا نەبێت بەشێوەیەك بتوانێت سوێندی لەسەر بخوات، بەڵام ئەگەر دڵنیا بوو لە ڕووداوو گومانی لە دەست نوێژەکەی هەبوو، ئەوە پێویستە دەست نوێژەکەی تازە بکاتەوە بە (إجماع)ی موسڵمانان.

٦- قاقای پێکەنین لەنوێژدا دەست نوێژ ناشکێنێ چونکە لەو بارەیەوە شتێکی ڕاست نەهاتووە.

٧- شۆردنی مردوو:

کەسێك مردوویەك بشۆرێ پێویست نیە دەست نوێژی لێ بگرێتەوە لەبەر لاوازی بەڵگەی هەڵوەشاندنەوەی.

ئەو شتانەی واجبە دەست نوێژیان بۆ بگیرێت:

دەست نوێژگرتن بۆ سێ شت واجبە:

١- نوێژ:

نوێژی (فرض) بێت یا نوێژی سوننەت یا نوێژی مردوو، بەپێی فەرمانی خوای گەورە کە ئەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى ٱلْمَرَافِقِ وَٱمْسَحُواْ بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى ٱلْكَعْبَيْنِ﴾ (المائدة ⁄ ٦).

واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە ئەگەر ویستتان نوێژ بکەن و دەستوێژتان نەبوو، دەم و چاو و دەستەکانتان بشۆن لەگەڵ ئەنیشکەکانتانا، وە مەسحی سەرتان بکەن و قاچەکانیشتان بشۆن لەگەڵ قولە پێکانا.

وە بەپێی ئەو حەدیسەی کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا يَقبَلُ اللهُ صَلاةً بِغَيرِ طُهُورٍ، وَلا صَدَقَةً مِن غُلُول) رواه الجماعة إلا البخاري. واتە: خوا نوێژێکی ناوێ کە بێ دەست نوێژ کرابێ، هەروەها صەدەقەیەکیش کە لە دزی بێت.

٢- تەوافی کەعبە:

بەپێی ئەو حەدیسەی ئیبنو عەبباس خوا لێیان ڕازی بێت کە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الطَّوَافُ صَلاةٌ إلا أنَّ اللهَ تَعَالَى أحَلَّ فِيهِ الكَلامَ فَمَن تَكَلَّم فَلا يَتَكَلَّم إلا بِخَيرٍ) رواه الترمذي والدارقطني وصححه الحاكم وابن السكن وابن خزيمة[1]. واتە: تەواف نوێژە، بەڵام ئەوەی هەیە خوا قسەکردنی تێدا ڕەوا کردووە، جا هەرکەس قسەی کرد باقسەی خێر نەبێ نەیکات.

٣- دەست دان لە قورئانەوە:

بە پێی ئەو حەدیسەی کە ئەبو بەکری کوڕی موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی حەزم لە باوکی-یەوە لە باپیری‌یەوە خوایان لێ ڕازی بێت ئەیگێڕێتەوە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ نامەیەکی نووسی بۆ خەڵکی یەمەن تێیدا نوسرابوو: (لا يَمَسُّ القُرآنَ إلا طَاهِر) رواه النسائي والدارقطني والبيهقي والأثرم. واتە: کەسێ خاوێن نەبێ با دەست لە قوڕئان نەدات.

(ابن عبدالبر) لەسەر ئەم (حديث)ە دەفەرموێت: زۆر لە حەدیسی متواتر ئەچێت لەبەر ئەوەی خەڵك بە قەبوول وەریان گرتووە.

وە لە عبداللەی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتوە کە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا يَمَسُّ القُرآنَ إلا طَاهِر). واتە: کەسێ خاوێن نەبێ نابێ دەست بدات لە قوڕئان.

---

(١) حەدیسێکی صەحیحە بڕوانە (صحيح سنن ابن ماجة)ی ئەلبانی ڕەحمەتی خوای لێ بێت.

(هیثمي) لە (مجمع الزوائد) دا باسی کردووە دەفەرموێت: پیاوەکانی (ثقة) پێ کراون. کەواتە (حدیث)ەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دروست نیە دەست دان لە قورئان، ئیللا بۆ کەسێ نەبێ کە پاکە، بەڵام ووشەی (طاهر) واتە: پاك زاراوەیەکی هاوبەشە بە خاوێنی لە ڕووداوی گەورە ئەوتریێ، وە بە خاوێنی لە ڕووداوی بچووکیش ئەوتریێ، وە بە باوەڕدار و ئەو کەسانەش ئەووتریێ کە چڵك بەسەر لەشیانەوە نەبێت، وە بۆ حەمل کردنی ووشەی (طاهر) لەسەر یەکێکی دیاری کراو لەمانە پێویستە قەرینەیەك هەبێ، کەواتە (حدیث)ەکە دەقێك نیە بۆ قەدەغە کردنی ئەوانەی بێدەستنوێژی بچوکیان هەیە کە دەست لە قورئانەوە بدەن[1]، وە ئەوەی کە خوای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُطَهَّرُونَ﴾ (الواقعة/٧٩). واتە: پاکەکان نەبێ دەستی لێ نادەن، (ظاهر) ئەوەیە کە (ضمیر)ەکە لێرەدا ئەگەڕێتەوە بۆ کیتابی مەکنون کە (لوح المحفوظ)ە لەبەر ئەوەی نزیکترینیانە بۆ (ضمیر)ەکە، وە مەبەست لە (المُطَهَّرون) پاکەکان، فریشتەکانە، ئەمەش وەك ئەو فەرموودەیە وایە کە ئەفەرموێت: ﴿فِي صُحُفٖ مُّكَرَّمَةٖ ١٣ مَّرۡفُوعَةٖ مُّطَهَّرَةِۭ ١٤ بِأَيۡدِي سَفَرَةٖ ١٥ كِرَامِۭ بَرَرَةٖ﴾ (عبس/١٣-١٦).

واتە: لە چەندین پەڕەی بەڕێزدایە، بەرز و خاوێنە بە دەستی چەند نێرراوێکەوەیە (کە فریشتەن) و بەڕێز و چاکن.

وە ئیبنو عەبباس و شەعبی و (ضحاك) و زەیدی کوڕی عەلی و (مؤید بالله) و داود و ئیبنو حەزم و حەممادی کوڕی ئەبی سولەیمان، بۆ ئەوە چوون کە دروستە بۆ ئەوانەی دەست نوێژیان نیە بە ڕووداوی بچوك، دەست بدەن لە قورئانەوە، بەڵام خوێندنەوەی قورئان بێ دەست لێ دان دروستە لەلایەن بێ دەست نوێژەوە بە (إتفاق)ی هەموو زانایان.

(١) مەبەست لە پاك لەم فەرموودەیەدا باوەڕدارە، ئیتر چ ڕووداوی گەورەی لێ ڕوودابێت، یا ڕووداوی بچوك، یا بێنوێژی، یا بەسەر لاشەیەوە پیسی هەبێت، بەپێی فەرموودەیەکی تری پێغەمبەر ﷺ کە ئەفەرموێت: (باوەڕدار پیس نابێت). ئەم (حدیث)ە زانایان ڕێکن لەسەر صیحەتی، وە مەبەست ئەوەیە کە نەهێڵرێ بێ باوەڕ دەست لە قورئانەوە بدات، ئەوەش وەك ئەم حەدیسە وایە کە ئەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ نەهی کردوە کە قورئان بگوازرێتەوە بۆ خاکی دوژمنان) کە ئەمیش زانایان ڕێکن لەسەر صیحەتی. پاشان ئەو حەدیسەم تەخریج کردووە لە چەند ڕێگایەکەوە لە (إرواء الغلیل/١٢٢)دا. (تمام المنة).

**ئەو شتانەی کە (مستحب)ە دەست نوێژیان بۆ بگیرێت:**

**(مستحب)ەو مەندووبە دەست نوێژ لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا بگیرێت:**

**١- کاتی (ذکر)ی خوا کردن:**

به پێی ئەو حەدیسەی که موهاجری کوڕی (قنفذ) ڕەزای خوای لێ بێ ئەگێڕێتەوە: (کە سڵاوی کرد لە پێغەمبەر ﷺ لەکاتێکدا کە دەستنوێژی دەگرت وەڵامی نەدایەوە تا دەست نوێژی گرت و ئەوجا وەڵامی دایەوەو فەرمووی: هیچ شتێك ڕێی ئەوەی لێ نەگرتبووم وەڵامی سڵاوەکە بدەمەوە ئەوە نەبێت کە حەز ناکەم بە دەستنوێژەوە نەبێت یادی خوا بکەم)[1]، قەتادە دەفەرمووێت: لەبەر ئەوەبوو حەسەن حەزی نەئەکرد نە یادی خوا بکات نە قورئان بخوێنێت هەتا دەست نوێژی نەگرتایە٠ ئەحمەد و ئەبو داودو نەسائی وئیبنو ماجە گێڕاویانەتەوە.

لە ئەبی جوهەیمی کوڕی (حارث)ەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە کە دەفەرمووێت: (پێغەمبەر ﷺ لای بیری جەمەلەوە ئەهات کابرایەکی پێ گەیشت سڵاوی لێ کرد پێغەمبەریش ﷺ وەڵامی نەدایەوە هەتا گەیشتە لای دیوارێك و مەسحی دەم و چاوی و هەردوو دەستی کرد، لەپاشاندا وەڵامی سڵاوەکەی دایەوە) ئەحمەد و بوخاری موسلیم و ئەبوداود و نەسائی گێڕاویانەتەوە.

ئەمەش هەر بۆ چاکی و پەسەندیە ئەگینا یادی خوای گەورە دروستە بۆ دەست نوێژدار و بێدەست نوێژ و لەش گران و ڕاوەستاو و ڕاکشاو و دانیشتوو ڕۆیشتو و پاڵ کەوتوو، بێ ئەوەی کەراهەتی تێدا بێ. بەپێی ئەو حەدیسەی عائیشە خوا لێی ڕازی بێت کە دەفەرمووێت: (پێغەمبەر ﷺ لە هەموو حاڵ و کاتێکدا یادی خوای ئەکرد) خاوەنی پێنج سونەنەکان گێڕاویانەتەوە جگە لە نەسائی، وە بوخاری بێ ئیسناد باسی کردووە.

وە لە عەلیەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە کە دەفەرمووێت: (پێغەمبەر ﷺ لەسەر پێشاو ئەهاتە دەر قورئانی بۆ ئەخوێندین و گۆشتی لەگەڵ ئەخواردین، وە هیچ شتێ ڕێگری نەبوو لە خوێندنی قورئان خوێندنی لێ نەئەگرت جگە لە لەش گرانی) هەر پێنجەکان گێڕاویانەتەوە. وە (ترمذي) و ئیبنو سەکەن بە صەحیحیان داناوە[2].

---

(١) ئەم حەدیسە صەحیحە بڕوانە (صحیح ابن ماجة ٤٠١).

(٢) (ترمذی) لەناو زانایاندا بەوە ناسراوە کە ئاسان کاری ئەکات لە بە صەحیح دانانی فەرموودەدا، وە هەروەها ئیبنو سەکەنیش پشت بە تەصحیح کردنەکەی نابەسترێت، لەبەر ئەوە ئەبێ وورد بونەوە بکرێت لە سەنەدی ئەو حەدیسەی کە گەلێ لەم دووانە بە صەحیحیان دانابوو، یا ئەوانەی کە وەك ئەم دوانەن وەك؛ ئیبنوخوزەیمەو ئیبنوحیببان تاوەکو موسڵمان بە تەواوی ئاگای لە ڕاستی فەرموودەکانی پێغەمبەرەکەی بێت ﷺ، وە ئەم

٢- کاتی نوستن:

بە پێی ئەو حەدیسەی بەرائی کوڕی عازب خوا لێی ڕازی بێت کە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذا أتيتَ مَضجِعَكَ فَتَوَضَّأ وُضُوءَكَ لِلصَّلاةِ ثُمَّ اضطَجِع عَلَى شِقِّكَ الأيمَنِ، ثُمَّ قُل: اللَّهُمَّ أسلَمتُ نَفسي إلَيكَ، وَوَجَّهتُ وَجهي إلَيكَ، وَفَوَّضتَ أمري إلَيكَ، وَألجَأتُ ظَهري إلَيكَ، رَغبَةً وَرَهبَةً إلَيكَ، لا مَلجَأَ وَلا منجى مِنكَ إلا إلَيكَ، اللَّهُمَّ آمَنتُ بِكِتَابِكَ الَّذي أنزَلتَ وَنَبِيِّكَ الَّذي أرسَلتَ. فَإن مِتَّ مِن لَيلَتِكَ فَأنتَ عَلَى الفِطرَةِ، وَاجعَلهُنَّ آخِرَ مَا تَتَكَلَّمُ بِهِ) رواه أحمد والبخاري والترمذي. واتە: کاتێك ویستت بخەویت، دەست نوێژ بگرە چۆن دەست نوێژ ئەگریت بۆ نوێژ کردن، لەپاشاندا ڕاکشێ لەسەر لای ڕاست و بڵێ: (خوایە من نەفسی خۆمم تەسلیمی تۆ کردووە، وە ڕووم لە تۆ کردوە، وکاروبارم بە تۆ سپاردوە، وە پشتم بە تۆ بەستوە، لەبەر خۆشەویستی و ترس لە تۆ، هیچ پەناگەو شوێنی ڕزگاری نیە جگە لە تۆ، خوایە باوەڕم بەو کتێبە هێناوە کە ناردووتە خوارەوە، وە بەو نێرراوەی کە ناردووتە. جا ئەگەر ئەو شەوە مردی لەسەر سروشتی ئیمانداری ئەمری، وە با ئەو قسەیەش دووا وتەت بێت). (براء) فەرمووی: پاشان ئەم دوعایەم خوێندەوە لای پێغەمبەر ﷺ ، کاتێ گەیشتمە: (اللَّهُمَّ آمَنتُ بِكِتَابِكَ الَّذي أنزَلتَ) ووتم: (وَرَسُولِكَ)، فەرمووی: (لا... وَنَبِيِّكَ الَّذي أرسَلتَ).

وە ئەم دەست نوێژ گرتنە بۆ کەسێك کە لەشیشی گران بێ نەبێت، بەپێی ئەو حەدیسەی ئیبنو عومەر خوا لێیان ڕازی بێت کە دەفەرموێت: (ووتم: ئەی نێرراوی خوا! ئایا کەسێك لە ئێمە لەش گران بێت بە لەشی گرانەوە بخەوێ ؟ فەرمووی: بەڵێ ئەگەر دەست نوێژی گرت).

وە لە عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە کە دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ ئەگەر بیویستایە بخەوێ بە لەشی گرانەوە، زەکەر و ناوگەڵی ئەشۆری و دەست نوێژی ئەگرت وەك چۆن دەست نوێژی ئەگرت بۆ نوێژ) رواه الجماعة.

٣- دەستنوێژ گرتن (مستحب)ە بۆ لەش گران:

ئەگەر کەسێك لەشی گران بوو ویستی خواردن بخوات یا ناو بخواتەوە یا دووبارە جیماع بکاتەوە، (مستحب)ە لەپێشەوە دەست نوێژێك بگرێت بەپێی ئەو حەدیسەی عائیشە خوا لێی ڕازی بێت کە دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ ئەگەر لەش گران بووایەو بیویستایە نان بخوات یا بخەوێت دەست نوێژێکی ئەگرت).

---

فەرموودەیە زۆر لە زانایانی تریش وەك شافیعی و بەیهەقی و ئەحمەد (خطابي) بە لاوازیان داناوە، وە (حدیث)ەکەی عائیشە بەرەنگاری نەکات چونکە ئەو (حدیث)ە بە عوموەمەکەی لەش گرانیش ئەگرێتەوە (تمام المنة).

وە لە عەممارى کوڕى یاسرەوە هاتوە کە دەفەرموویت: (پێغەمبەر ﷺ ڕێی دابوو کاتێ لەش گران بیویستایە بخوات و بخواتەوە یا بخەوێت دەست نوێژ بگرێت وەك بۆ نوێژ دەست نوێژی ئەگرت) ئەحمد و (ترمذی) گێڕاویانەتەوەو بە صەحیحیان داناوە.

وە لە ئەبی سەعیدەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: (ئەگەر کەسێك لە ئێوە جیماعی کرد و ویستی دووبارەی بکاتەوە با دەست نوێژێك بگرێت) (جماعة) جگە لە بوخاری گێڕاویانەتەوە. وە ئەوەشیان زیاد کردووە کە فەرموویەتی: (ئەو دەست نوێژە ئادەمیزاد گورج ئەکاتەوە بۆ دووبارە کردنەوەی جیماع).

٤- دەستنوێژ گرتن (مندوب) ە پێش خۆشۆردن خۆ شۆرینەکە واجب بێت، یا (مستحب) ؛ بەپێی ئەوەی عائشە خوا لیی ڕازی بێت دەفەرمووێت: (پێغەمبەر ﷺ کاتێ کە بە هۆی لەش گرانی خۆی بشۆردایە، لەپێشەوە هەردوو دەستی ئەشۆری پاشان بەدەستی ڕاستی ئاوی ئەکرد بەلای چەپیدا پاشان شەرمینگەی ئەشۆری، ئینجا وەك چۆن دەست نوێژی ئەگرت بۆ نوێژ بەو شێوەیە دەست نوێژی ئەگرت) (جماعة) گێڕاویانەتەوە.

٥- دەستنوێژ گرتن (مندوب)ە بۆ ئەوکەسەی کە شتی کوڵاوی خواردبێت:

بەپێی ئەوەی کە ئیبراهیمی کوڕی عبداللەی کوڕی (قارظ) دەفەرمووێت: بەلای ئەبی هورەیرەدا تێپەریم دەست نوێژی ئەگرت، فەرموی: ئەزانی بۆچی دەست نوێژ ئەگرم ؟ لەبەر ئەوەی چەند پارچەیەك کەشکم خواردووە، چونکە گوێم لە پێغەمبەر بوو ﷺ کە ئەیفەرموو: (تَوَضَّؤا مِمَّا مَسَّتِ النَّارُ) رواه أحمد ومسلم والأربعة. واتە: دەست نوێژ بگرن لەوانەی کە بە ئاگر کوڵاون یا برژاون.

وە لە عائیشەوە خوا لیی ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (تَوَضَّؤا مِمَّا مَسَّتِ النَّار) رواه أحمد ومسلم والنسائي وابن ماجة. واتە: دەست نوێژ بگرن لەو خۆراکانەی کە ئاگریان بەر کەوتووە.

وە ئەو فەرمانەی پێغەمبەر ﷺ پەسەندی (استحباب) ئەگەیەنێ، بەپێی ئەو حەدیسەی کە عەمری کوڕی ئومەییەی (ضمري) خوا لیی ڕازی بێت کە دەفەرمووێت: (پێغەمبەرم ﷺ بینی لەشانی مەڕێکی سەربڕاو گۆشتی لێ ئەکردەوە و ئەیخوارد، لەو کاتەدا بانگ درا بۆ نوێژ هەڵسا و چەقۆکەی فڕێ دا و نوێژەکەی کرد بێ ئەوەی کە دەست نوێژ بگرێتەوە) بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە، ئەوەی دەفەرمووێت: ئەمە باسی دروستی گۆشت بڕینی تێدایە بە چەقۆ.

٦- دەست نوێژ تازە کردنەوە بۆ هەموو نوێژێك:

بەپێی ئەو حەدیسەی بورەیدە خوا لێی ڕازی بێت کە فەرمویەتی: (پێغەمبەر ﷺ بۆ هەموو نوێژێك دەست نوێژی ئەگرت، بەڵام ڕۆژی فەتحی مەککە دەست نوێژی گرت و مەسحی کرد بەسەر خوفەکانیا و هەموو نوێژەکانی بە یەك دەست نوێژ کرد، عومەر پێی فەرموو: ئەی نێرراوی خوا ئەمڕۆ شتێکت کرد کە لەوە پێش نەت ئەکرد! فەرمووی: (بە قەستی وام کرد ئەی عومەر) ئەحمەد و موسلیم و غەیری ئەوان گێڕاویانەتەوە.

وە لە ئیبنوعەمری کوڕی عامری ئەنصاریەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: (ئەنەسی کوڕی مالیك ئەی فەرموو: پێغەمبەر ﷺ بۆ هەموو نوێژێ دەست نوێژی ئەگرت ئەڵێ ووتم: ئەی ئێوە چۆنتان ئەکرد ؟ فەرمووی: ئێمە جاری وا هەبوو هەر پێنج فەرزەکانمان بە یەك دەست نوێژ بەجێ ئەهێنا، ئەگەر دەست نوێژەکەمان نەشکایە) ئەحمەد و بوخاری گێڕاویانەتەوە.

وە لە ئەبوهورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لَولا أن أشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لَأمَرتُهُم عِندَ كُلِّ صَلاةٍ بِوُضُوءٍ، وَمَعَ كُلِّ وُضُوءٍ بِسِوَاكٍ) رواه أحمد بسند حسن. واتە: ئەگەر بە گرانم نەزانیبا لەسەر ئوممەتم فەرمانم پێ ئەکردن بۆ هەموو نوێژێك دەست نوێژێك بگرن و لەگەڵ هەموو دەست نوێژێکدا سیواك بکەن.

وە لە ئیبنو عومەرەوە خوا لێیان ڕازی بێت گێڕدراوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن تَوَضَّأَ عَلَى طُهرٍ كُتِبَ لَهُ عَشرُ حَسَنَاتٍ) رواه أبوداود والترمذي وابن ماجة[1]. واتە: هەرکەس بە دەست نوێژەوە دەست نوێژی گرت، دە چاکەی بۆ ئەنوسرێت.

---

(١) ئەم بێ دەنگیەیە لەسەر ئەم حەدیسە ئەوە دەگەیەنێت کە (ترمذي) - کە عادەتی‌یەتی قسە بکات لەسەر حەدیس بە صەحیح دانان یان بە (ضعیف) دانان - بێ دەنگ بووە لەسەر ئەم حەدیسە، کەچی واش نی‌یە، بەڵکو پاش هێنانی حەدیسەکە بە ڕاشکاوی ڕایگەیاندوە کە سەنەدەکەی (ضعیف)ە، وە ڕەنگە دانەر عوزری لێ قەبوڵ بکرێت بەوەی کە ئاماژەیێکی کورتی بە لاوازی حەدیسەکە کردووە کە بە صیغەی (رُوِيَ) گێڕدراوەتەوە هێناویەتی، بەڵام ئەمە بەس نی‌یە...

بە هەرحاڵ حەدیسەکە زانایان پێك هاتون لەسەر (ضعیف) ی، وە دەقەکانیانم لەو بارەیەوە باس کردووە، لە کیتێبەکەمدا (ضعيف سنن أبي داود رقم٩)، لەوانە (منذري)یە کە بە صیغەی (رُوِيَ) هێناویەتی، وە دانەریش دەقاودەق لەوی وەرگرتووە.

وە بۆ تەواو سوود بەخشین چەند شوێنێکی تر باس دەکەم، کە موستەحەببە دەست نوێژ گرتن بۆی کە دانەر باسی لێوە نەکردووە، لە کیتابی (الثمر المستطاب في فقه السنة والكتاب)دا باسم کردووە وە لەوێوە ئەم کورتەیەم هێناوە:

**چەند فائیدەیەك كە دەست نوێژگر پێویستی پێی هەیە:**

**١- قسەی (مباح) ڕەوا كاتی دەست نوێژ گرتن ڕەوایە، وە لە سوننەتدا شتێكی وا نەهاتووە بەڵگە بێت لەسەر قەدەغە بوونی.**

**٢- پاڕانەوە كاتی شۆردنی ئەندامەكانی دەست نوێژ (باطل)ە و هیچ ئەصڵێكی نیە. وە ئەوەی داوا كراوە تەنها ئەو پاڕانەوەیە كە لە سوننەتەكانی دەست نوێژدا باسمان كردووە.**

**٣- ئەگەر دەست نوێژگر دەربارەی ژمارەی شۆردنی ئەندامەكانی گومانی بوو با بینا بكات لەسەر یەقین، كە كەمترینی ژمارەیە.**

**٤- بونی شتێك لەسەر هەر ئەندامێك لە ئەندامەكانی دەستنوێژ كە ڕێ لە ئاو بگرێت نەیەڵێت ئەو شوێنە تەڕ ببێت وەك: مێو دەست نوێژەكە پوچەڵ ئەكاتەوە، بەڵام ڕەنگ بە تەنها وەك ڕەنگ كردن بە خەنە؛ ئەوە كار ناكاتە سەر دروستی دەست نوێژەكە، چونكە ڕەنگ نابێتە بەربەست لەنێوان ئاوەكە و پێستدا.**

**٥- ئەو ئافرەتانەی كە بێ‌نوێژی هەمیشەیی‌یان هەیە، وە هەروەها ئەوانەی مێزە چوڕكەیان هەیە، یا ئەوانەی با ڕاگر نین، یان هەر مەعزەرەتێكی تریان هەیە ئەوە ئەبێ بۆ هەموو نوێژێك**

---

١- دەست نوێژ گرتن لە كاتی هەموو دەستنوێژ شكانێكدا، بە بەڵگەی حەدیسی بورەیدەی كوڕی حوصەیب خوای لێ ڕازی بێت دەفەرموێت: «ڕۆژێكیان پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا، جا بانگی بیلالی كرد فەرمووی: ئەی بیلال بەچی پێشم كەوتی لە بەهەشت؟! من دوێنێ چوومە بەهەشتەوە گوێم لە خشەخشی پێت بوو لە پێشمەوە؟ بیلال فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا! هەركاتێك بانگم دابێت ئیللا دوو ڕكاعەت نوێژم كردووە، وە هیچ كاتێك بێ دەستنوێژیم بەسەرا نەهاتوە ئیللا دەست نوێژم بۆ گرتۆتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە بۆیە.

(ترمذي) و حاكم وئیبنو خوزەیمە لە صەحیحەكەیدا گێڕاویانەتەوەو سەنەدەكەی صەحیحە لەسەر مەرجی موسلیم.

٢- دەست نوێژ گرتن لە ڕشانەوە، بە بەڵگەی حەدیسی مەعدان ی كوڕی (أبي طلحة) لە (أبي الدرداء)ەوە: «كە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕشایەوە، ڕۆژووەكەی شكاند و دەست نوێژی گرت، وە لە مزگەوتی دیمەشقدا گەیشتم بە (ثوبان) ئەمەم بۆ باس كرد فەرمووی: ڕاستی فەرمووە، من خۆم ئاوم كرد بە دەستیا».

(ترمذي١/١٤٢-١٤٣) تەخریجی كردوەو جگە لەمیش بە سەنەدێكی صەحیح ریوایەتیان كردووە.

٣- دەست نوێژ گرتن لە هەڵگرتنی مردوو: بە بەڵگەی فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ: «هەركەسێك مردوویەكی شۆرد با غوسڵ دەركات، وەهەركەسێك هەڵی گرت با دەست نوێژ بگرێت».

ئەمە حەدیسێكی صەحیحە لە چەند ڕێگایەكەوە هاتووە، هەندێكیان صەحیحە و هەندەكەی تری حەسەنە، وەك باسم كردووە لە (إرواء الغليل) دا (رقم ١٤٤) بڕوانە (تمام المنة في التعليق على فقه السنة).

دەست نوێژ بگرن، مەگەر ئەو عوزرە سەرتاپای کاتی نوێژەکەی داگیر ئەکرد، یان کاتەکەی دیاری و دەست نیشان نەئەکرا، ئەمە نوێژەکانیان بە دروست دائەنرێ لەگەڵ بەردەوامی عوزرەکە.

٦- دروستە داوای یارمەتی لە کسانی تر بکرێت بۆ دەست نوێژ گرتن.

٧- ڕەوایە بۆ دەست نوێژگر ئەندامە تەڕ بووەکانی بە خاولی یا شتی تر بسڕێت هاوین و زستان.

**مەسح کردن بەسەر خوفدا:**

**١- بەڵگەی شەرعیەتی ئەم مەسحە:**

مەسح کردن بەسەر خوفدا بە سوننەتی صەحیح (ثابت) بوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ. نەوەوی دەفەرموێت: هەموو ئەوانەی کە بۆ ئیجماع پشتیان پێ ئەبەسترێ لە زانایان، کۆن لەسەر دروستی مەسح بەسەر خوفدا هەم لە سەفەرا و هەم لە ماڵەوە، چ بۆ پێویستی و چ بۆ غەیری پێویستی. هەتا بۆ ئەو ئافرەتانەی کە هەر لە ماڵەوەن وە ئەو کەسانەی کە نەخۆشی هەمیشەیی لەقاچی خستوون. بەڵام شیعە و خەواریج دان نانێن بە دروستی ئەم مەسحەدا، وە ئەوانیش حیساب بۆ خیلافەکەیان ناکرێ. (حافظ) ئیبنو حەجەر لە (الفتح)دا دەفەرموێت: کۆمەڵێك لە (حفاظ) زانایانی (حدیث) دانیان ناوە بەوەدا کە مەسح کردنی خوف (متواتر)ە. وە هەندێك لە زانایان گێڕەرەوەکانی (حدیث)ی مەسحی خوفیان کۆ کردۆتەوە لە هەشتا کەس تێ ئەپەڕن، دە کەسە مژدە پێدراوەکانیش لەوانەن، تەواو.

وە بەهێزترینی ئەو حەدیسانە کە بەڵگەیە لەسەر مەسحی خوف ئەو (حدیث)ەیە کە ئەحمەد و بوخاری و موسلیم و ئەبو داود و (ترمذي) لە هەمامی نەخەعیەوە ئەی گێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموێت: (جەریری کوڕی عبداللە چوو میزی کرد و پاشان دەست نوێژی گرت و مەسحی کرد بەسەر خوفەکانیدا پێیان ووت: میزیشت کردووە و ئاوا ئەکەیت ؟ فەرمووی: بەڵێ پێغەمبەرم ﷺ بینیوە میزی کردووە و لەپاشاندا دەست نوێژی گرتۆتەوە لەجیاتی ئەوەی کە پێکانی بشۆرێ مەسحی کردووە بەسەر خوففەکانیا) ئیبراهیم دەفەرموێت: ئەو (حدیث)ەیان لا خۆش بوو چونکە موسڵمان بوونی جەریر دووای هاتنە خوارەوەی سوورەتی مائیدە بوو، واتە: جەریر ساڵی دەیەمی کۆچی موسڵمان بووە دووای هاتنە خوارەوەی ئایەتی دەست نوێژ کە واجبیەتی شۆردنی هەردوو پێ ئەگەیەنێ، جا بەو پێیە (حدیث)ەکەی جەریر مەبەستی ئایەتەکە لێك ئەداتەوە، واتە: بۆ کەسانێ کە خوفیان لە پێدا نیە واجبە قاچیان بشۆرن، بەڵام ئەوانەی کە خوفیان لە پێدایە فەرزەکەیان ئەوەیە کە مەسح بکەن بەسەریا، کەواتە سوننەت (مخصص) تایبەتمەندکەری ئایەتەکەیە .

**٢- شەرعیەتی مەسح کردن بەسەر گۆرەویدا:**

دروستە مەسح بەسەر گۆرەوی دا بکرێت، ئەمەش لە زۆر لە یارەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ ریوایەت کراوە. ئەبو داود دەفەرموێت: عەلی کوڕی ئەبو (طالب)و ئیبنومەسعودو بەڕائی کوڕی عازیب و ئەنەسی کوڕی مالیك و ئەبو ئومامە و سەهلی کوڕی سەعد و عەمری کوڕی (حریث) مەسحیان کردووە بەسەر گۆرەویدا.

وە هەروەها لە عەممار و بیلالی کوڕی عبداللهی کوڕی ئەبی ئەوفا و ئیبنو عومەرەوە ریوایەت کراوە وە لە (تهذیب السنن)ی ئیبنو قەییم دا هاتووە لە (ابن المنذر)ەوە کە ئەحمەد دانی ناوە بە ڕەوا بوونی مەسح کردن بەسەر گۆرەویدا، ئەمەش لە ئینصاف و عەدلی ئەحمەدەوەیە، پشتیوانیشی لەمەدا ئەو کۆمەڵە صەحابایەو قیاسی صەریحە. چونکە لەنێوان گۆرەوی و خوفدا جیاوازی وەها کاریگەر نیە کە بەرگری ئەو حوکمە بکات لەسەر گۆرەوی، وە مەسح کردن بەسەر گۆرەوی قسەی زۆربەی زانایانە، تەواو.

لەوانەی کە ڕێیان داوە مەسح بکرێت بەسەر گۆرەوی دا سوفیانی (ثوري) و ئیبنوموبارەك و (عطاء) و حەسەن و سەعیدی کوڕی موسەییبن، ئەبویوسف و موحەممەد دەفەرموون: دروستە گۆرەویش مەسحی بەسەردا بکرێت ئەگەر هاتوو ئەستوور بوو و ژێرەوەی دەرنەکەوت.

ئەبو حەنیفە لە سەرەتاوە بە دروستی نەئەزانی مەسح بکرێ بەسەر گۆرەوی ئەستووردا بەڵام پێش مردنی بە سێ ڕۆژ یان حەوت ڕۆژ پەشیمان بووەوەو ڕێی دا بە مەسح کردنیان.

وە بۆ خۆی لە نەخۆشی‌یەکەیدا مەسحی گۆرەوی‌یە ئەستوورەکانی کرد، وە بەو کەسانەی کە هاتبوونە سەردانی فەرمووی: ئەو کارەی قەدەغەم کردبوو ئێستا خۆم کردم.

لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە هاتووە: (کە پێغەمبەر ﷺ دەست نوێژی گرت و مەسحی کرد بەسەر گۆرەوی و نەعلەکانیدا) ئەحمەدو (طحاوي)و ئیبنوماجەو (ترمذي) گێڕاویانەتەوە، وە (ترمذي) دەفەرموێت: (حسن صحیح)، بەڵام ئەبو داود بە (ضعیف)ی داناوە[1] وە لێرەدا مەسحی گۆرەوی‌یەکانی مەبەست بووە جا مەسحی نەعلەکانیشی ڕەگەڵ خستووە.

(١) ئەبوداود لەپاش ئەوەی حەدیسەکەی هێناوە لە (سنن)ەکەیدا دەفەرموێت: (عبدالرحمن) ی کوڕی (مهدی) ئەم حەدیسەی نەئەگێڕایەوە، لەبەر ئەوەی زاندراو بوو لە موغیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ مەسحی ئەکرد لەسەر خوفڤەکانی.

جا بڕوانە ئەبو داود ئەم حەدیسەی بە (ضعیف) داناوە نەك لەبەر بوونی عیللەتێك لە سەنەدی حەدیسەکەدا، بەڵکو لەبەر پێچەوانەی زاندراو لە موغیرەوە کە مەسح کردنی پێغەمبەر ﷺ بوو لەسەر خوفڤەکانی، وە شتێکی شاراوە نی‌یە کە ئەمە عیللەتێکی لەکەدارکەر نی‌یە، چونکە (ثابت) بوونی مەسح کردنی پێغەمبەر ﷺ بەسەر

وەك چۆن دروستە مەسحی گۆرەوی بكرێت، دروستە مەسحی هەموو ئەو شتانە بكرێت كە ئەپێچرێن لە قاچەوە، وەك لەفاف و وێنەی لەفاف، لەفافیش ئەو شتەیە ئەپێچری لە قاچەوە لەبەر سەرما یا لەبەر پێ پەتیەتی یا لەبەر برین و شتی وا.

ئیبنوتەیمیەیە دەفەرمووێت: ئەوەی ڕاست بێت لەفافیش مەسح ئەكرێت، ئەو لە ل لەپێشتریشە بۆ مەسح كردن لە خوف و گۆرەوی، چونكی لەفاف عادەتەن بۆ پێویستی نەبێ بەكار ناهێنرێ، وە لە لێكردنەوەیدا زەرەر و زیان هەیە، جا یان سەرما بونە، یا ئەزیەت پێ‌گەیشتنە بەهۆی پێ پەتی بوون یان بەهۆی برین، وە ئەگەر دروست بێ مەسح بەسەر خوفـو گۆرەویدا بكرێ ئەوە بەسەر لەفافدا بە شێوەیەكی چاكتر دروستە، وە هەركەسێ لەبارەی دروست نەبوونی مەسح كردن بەسەر لەفافدا ئیدعای ئیجماع بكا ئەوە لە بێ عیلمی زیاتر هیچی پێ نیە، وە ناتوانێ هەتا لە دە زانای بەناوبانگەوە نەقلی دروست نەبوون بكا، سەرەڕای ئەوە بتوانێ نەقلی ئیجماع بكا. تا ئەوەی دەفەرمووێت: هەركەس باش لە زاراوەكانی پێغەمبەر ﷺ بگات و مافی تەواوەتی قیاس بدات، بۆی دەر ئەكەوێت كە ڕوخسەت لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ فراوانە لەم بابەتەدا، وە ئەمەش لە چاكیەتی‌یەكانی شەریعەتی ئیسلامەوەیە، وە لەو ڕەوانی و ئاسانكاری‌یانەیە كە ئەو شەریعەتەی بۆ نێرراوە. (تەواو).

وە ئەگەر خوف یا گۆرەوی كونیان تێدا بوو قەیناكە مەسح كردنیان بە مەرجێ لەناو خەڵكیدا ئاسایی بێ لەپێ كردنی خوف و گۆرەوی‌یەك كە كونیان تێدا بێ.

(ثوري) دەفەرمووێت: خوفەكانی موهاجیرین و ئەنصار بێ كون و دڕاوی نەئەبوون وەك هی خەڵكی ئێستا، جا ئەگەر لەو بارەیەوە قەدەغەیی‌یەك هەبووایە لێیانەوە نەقل ئەكرا.

---

خوفەكانا نەفی سابت بوونی مەسح كردنی پێغەمبەر ﷺ ناكات لەسەر گۆرەوی و نەعل، جا ئەگەر ئەوەی ئەمەی گێڕاوەتەوە لە موغیرەوە سیقەیە، پێویستە كاری پێ بكرێت چونكە پێچەوانەی نی‌یە بۆ ئەوەی كە جگە لەو موغیرەوە دەیگێڕێتەوە لەبارەی مەسح كردن لەسەر خوفەین، وە لە ڕاستی دا گێڕەرەوەكانی ئەم حەدیسە هەموویان جێی باوەڕن، وە سەنەدەكەی صەحیحە لەسەر مەرجی بوخاری. بۆ زیاتر لێكۆڵینەوە بڕوانە (سنن الترمذي ٢/١٦٧-١٦٨) و (الإرواء ١٠١). هەروەها دانەر لە دووای حەدیسەكەوە ئەڵێت: (مەسحی گۆرەوی‌یەكانی مەبەست بوە جا مەسحی نەعلەكانیشی ڕەگەڵ خستوە) ئەم قسەگە ئەوە ئەگەیەنێ كە مەسح كردن بە سەر نەعلدا دروست نی‌یە، وە دور خستنەوەی ئەمە ئەڵێم: بە صەحیحی لە پێغەمبەرەوە مەسح كردن بەسەر نەعلدا هاتوە بە تەنیایی، بە بێ ئەوەی باسی گۆرەوی بكات لە حەدیسی عەلی كوڕی (أبوطالب)، وە حەدیسی ئەوسی كوڕ ئەوسی (ثقفي)، و حەدیسی ئیبنوعومەر، وە (ابن القطان) بە صەحیحی داناوە، هەروەك لە شەرحی (علوم الحديث)ی عراقیشدایە (ل١٢)، منیش باسی سەنەدەكانیانم كردوە لە (صحيح سنن أبي داود/١٥٠و١٥٦) دا. (تمام المنة).

٣- مەرجەکانی مەسح کردنی خوف و ئەوانەی حوکمیان وەك خوف وایە:

بۆ دروستیێەتی مەسح کردنی خوف و ئەوانەی حوکمیان وەك خوف وایە مەرجە کە بە دەست نوێژەوە لەپێ کرابن، بەپێی ئەوەی موغیرەی کوڕی شوعبە دەفەرمووێت: شەوێك لەگەڵ پێغەمبەردا بووم ﷺ لە سەفەرێکدا، بە جەوەندە ئاوم کرد بە دەستیا بۆ ئەوەی دەست نوێژ بگرێت، دەم و چاو و قۆڵی شۆری و مەسحی سەری کرد، داهاتمەوە تاوەکو خوفەکانی لەپێ داکەنم، فەرمووی: (وازیان لێ بێنە بە دەست نوێژەوە لەپێم کردوون)، وە مەسحی کرد بەسەریانا. ئەحمەد و بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە.

وە حومەید لە موسنەدەکەیدا ئەگێڕێتەوە لە موغیرەوە دەفەرمووێت: (ووتمان: ئەی نێرراوی خوا ئایا هەرکام لە ئێمەش مەسح بکات بەسەر خوفەکانیا؟ فەرمووی: (بەڵێ ئەگەر بە دەست نوێژەوە لەپێی کرد).

وە ئەو مەرجانەی هەندێ لە زانایان دایان ناوە کە ئەبێت خوف داپۆشەری ئەو شوێنە بێ کە ئەبێ بشۆررێ و ئەبێ خۆی توند بێت بە هیچ توند نەکرابێت و ئەو کەسە بتوانێ پێوەی بڕوات، ئەوە شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمیەیە بە زەعیفی داناون لە (الفتاوی) دا٠

٤- ئەو شوێنەی مەسح ئەکرێ:

ئەو شوێنەی کە شەرع دایناوە مەسح بکرێت سەرەوەی خوفە، بەپێی ئەوەی موغیرە خوای لێ ڕازی بێت دەفەرمووێت: (پێغەمبەرم ﷺ بینیوە سەرەوەی خوفەکانی مەسح کردووە) ئەحمەدو ئەبوداودو (ترمذي) گێڕاویانەتەوە، وە (ترمذي) بە حەسەنی داناوە[1].

وە لە عەلیەوە خوا لیی ڕازی بێت هاتوە کە دەفەرمووێت: (ئەگەر دین بە ڕەئی بووایە بنی خوف لەپێش تر بوو مەسح بکرێت وەك لەسەرەوەی، وە پێغەمبەرم ﷺ بینیوە مەسحی پشتی خوفەکانی کردووە) ئەبو داود و (دارقطني) گێڕاویانەتەوە وە ئیسنادەکەی حەسەنە یا صەحیحە[2].

ئەوەی واجبە لە مەسح کردندا ئەوەیە کە ووشەی مەسحی پێ بووترێت بەبێ ئەوەی شێوەیەکی تایبەتی بۆ دیاری بکرێ، وە لە شێوەی مەسح کردندا هیچ شتێکی وا صەحیح نەهاتووە.

٥- ماوەی مەسح:

ماوەی مەسح کردنی خوف بۆ نیشتەجێ شەوو ڕۆژێکە، وە بۆ موسافریش سێ شەو و سێ ڕۆژە.

---

(١) بەڵکو (حسن صحيح)ە، بۆ زیاتر بڕوانە (صحيح سنن الترمذي/٩٨) وە (صحيح أبي داود/١٥١-١٥٢).

(٢) بڕوانە (إرواء الغليل ١٠٢).

صەفوانی کوڕی عەسسال خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: (پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کردین کە سەفەرمان کرد سێ شەوو ڕۆژ خوفەکانمان مەسح بکەین ئەگەر بە دەست نوێژەوە لەپێمان کردبو، وە شەوو ڕۆژێك ئەگەر نیشتەجێ بووین (لە شوێنی خۆمان)، وە دایان نەکەنین بۆ خۆشۆردنی لەش گرانی نەبێت) شافیعی و ئەحمەد و ئیبنو خوزەیمە گێڕاویانەتەوە، وە (ترمذي) و نسائی بە صەحیحیان داناوە[1].

لە شورەیحی کوڕی هانیئەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە کە دەفەرمووێت: (لە عائیشەم پرسی دەربارەی مەسحی خوف، فەرمووی: لە عەلی بپرسە چونکە ئەو لە من شارەزایی زۆرترە لەو بارەیەوە، ئەو لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ئەچووە سەفەر، منیش پرسیارم لێ کرد فەرمووی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لِلْمُسَافِرِ ثَلاثَةَ أَيَّامٍ وَلَيَالِيهِنَّ وَلِلْمُقِيمِ يَوْمٌ وَلَيْلَةٌ) رواه أحمد ومسلم والترمذي والنسائي وابن ماجة. واتە: بۆ موسافیر سێ ڕۆژ و سێ شەوە، وە بۆ نیشتەجێ شەو و ڕۆژێکە، بەیهەقی دەفەرمووێت: ئەمە ڕاست ترین شتە کە لەم باسەدا ریوایەت کراوە، وە ئەوەی هەڵبژێرراوە ئەوەیە سەرتای ماوەی مەسح کردنەکە لەو کاتەوە دەست پێ ئەکات کە مەسحەکە ئەکرێت، وە ووتراوە لەکاتی دەست نوێژ شکاندنی دووای لەپێ کردنیەوە دەست پێ ئەکا.

٦- شێوەی مەسح کردن:

ئەو کەسەی ئەیەوێ مەسحی خوف بکات ئەبێ دەست نوێژێك بگرێت ئینجا خوفەکانی یا گۆرەوییەکانی لەپێ بکات، ئیتر هەرکاتێ ویستی دەست نوێژ بگرێ دایان نەکەنێ و دروستە مەسحیان بەسەردا بکات لە جیاتی ئەوەی پێیەکانی بشۆرێت، وە ئەتوانێ ئەوە بکات ئەگەر نیشتەجێ بوو لە شوێنی خۆی بۆ ماوەی شەوو ڕۆژێك، وە سێ شەوو سێ ڕۆژ ئەگەر لە سەفەردا بوو جا دوای ئەو ماوەیە ئەبێ دایان کەنێ و دەست نوێژ بگرێتەوە و قاچەکانی بشوات، بەڵام ئەگەر لەشی گران بوو پێویستە لەسەری دایان کەنێ و خۆی بشۆرێت. بە پێی (حدیث)ەکەی صەفوان کە لە پێشەوە باس کرا.

٧- ئەو شتانەی مەسح پوچەڵ ئەکەنەوە:

مەسح کردنی خوف بەمانەی خوارەوە پوچەڵ ئەبێتەوە[2]:

(١) شێخ ئەلبانی دەفەرمووێت حەسەنە بڕوانە (صحيح سنن الترمذي ٩٦) و (ابن ماجة٤٧٨).

(٢) دووەمیان ئاشکرایە بەبەڵگەی حەدیسی صەفوانی پێشوو، ئەمما یەکەم وسێیەم هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیەیە، هەر بۆیە شێخی ئیسلام لە (الإختيارات ص٩) دا دەفەرمووێت: «بە داکەنینی خوف و عەمامە دەست نوێژی مەسحکەر بەتاڵ نابێتەوە، هەروەها بە بەسەرچوونی کاتەکەی، وە واجب نیەیە لەسەری کە مەسحی سەر بکات یا

(١) کۆتایی هاتنی ماوەکە.

(٢) لەش گران بوون.

(٣)داکەندنی خوفەکان.

وە ئەگەر ماوەکە کۆتایی هات، یا خوفەکانی داکەند و پێش ئەوە دەست نوێژی گرتبوو، تەنها قاچەکانی بشوات.

## خۆ شۆردن (الغسل)

خۆ شۆردن: ئەویە هەموو لەش ئاوی بەر بکەوێت، ئەمەش کارێکە شەرع داینا وە بەپێی فەرموودەی خوای گەورە کە ئەفەرموێت: ﴿وَإِن كُنتُمْ جُنُبًا فَاطَّهَّرُوا﴾ (مائدة/٦).

واتە: ئەگەر لەشتان گران بوو خۆتان پاك بكەنەوە، ـ بە خۆ شۆردن ـ .

وە ئەوەی ئەفەرمووێ: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُوا النِّسَاءَ فِي الْمَحِيضِ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ﴾ (البقرة/٢٢٢). واتە دەربارەی بێ نوێژی ئافرەتان حەیز پرسیارت لێ ئەکەن، تۆش بڵێ ئەوە زیان و چەپەڵی‌یەکە لە کاتی بێ‌نوێژیدا، جا لە ژنەکانتان دوور بکەونەوە و جیماع مەکەن لەگەڵیاندا هەتا پاك ئەبنەوە، جا کاتێك پاك بوونەوە بەو شێوەیەی خوا فەرمانی پێ

---

قاچەکانی بشۆرێت، وە ئەمە بۆ چوونی حەسەنی بەصری‌یە، وەك لابردنی مووی سەری مەسح کراو وایە، لەسەر ووتەی صەحیح لە مەزهەبی ئەحمەد و ووتەی جمهور»، وە ئەمە مەزهەب و بۆچوونی عەلی کوڕی ئەبی (طالب) ە هەروەها بەیهەقی (١/٢٢٨) و (طحاوي) لە (شرح المعاني١/٥٨) لە (أبي ظبيان)ەوە دەفەرموێت: عەلی کوڕی ئەبی (طالب) م بینی بە پێوە میزی کرد، پاشان داوای ئاوی کرد، جا دەست نوێژی گرت و مەسحی لەسەر نەعلەکانی کرد، پاشان چووە ناو مزگەوتەکە، هەردوو نەعلەکەی داکەند، پاشان نوێژی کرد، بەیهەقی ئەمەی بۆ زیاد کرد: «ئیمامەتی بۆ خەڵك کرد» وە ئیسنادی هەردووکیان صەحیحە لەسەر مەرجی شەیخەین.

وە لەمەدا بەڵگەی دروستێتی مەسح کردن لەسەر نەعلی تێدایە، وە لە پێغەمبەرەوە ﷺ بە صەحیحی هاتووە لە چەند حەدیسێکی پێشوو کە ئاماژەی بۆ کرا. (تمام المنة ١١٤-١١٥).

داوون بچنە لایان،، چونکە بەراستی خوا تۆبەکاران و ئەوانەی خۆیان خاوێن ڕائەگرن ـ لە پیسی و تاوان ـ خۆش دەوێت.

وە دەربارەی خۆ شۆردن چەند باسێك هەیە لەمانەی خوارەوەدا کۆیان دەکەینەوە:

**ئەو شتانەی خۆ شۆردن واجب ئەکەن:**

خۆ شۆردن واجب ئەبێ بە هۆی پێنج شتەوە:

یەکەم: هاتنە دەری مەنی.

هاتنە دەری مەنی بە شەهوەتەوە، لە کاتی نوستن دا بێت یا کاتی ئاگایی، نێر بێت یا مێ، ئەمەش ڕای گشت زانایانە، بەپێی ئەوەی ئەبو سەعید دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (المَاءُ مِنَ المَاءِ) رواه مسلم. واتە: خۆشۆرردن بە ئاو هاتنەوە واجب ئەبێت.

لە ئومو سەلەمەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە کە دەفەرمووێت: ئومو سولەیم فەرمووی: ئەی نێرراوی خوا، خوا لە حەق شەرم ناکات، ئایا ئافرەت کاتێ ئیحتلام ئەبێ خۆ شۆردنی لەسەرە؟ فەرمووی: بەڵێ (إذَا رَأَتِ المَاءَ) رواه الشيخان وغيرهما. واتە: بەڵێ ئەگەر ئاوی بینی.

لێرەدا چەند شێوەیەك زۆرجار ڕوو ئەدا حەزمان کرد خەڵکی لەسەر ئاگاردار بکەینەوە لەبەر پێویستی:

أ- ئەگەر مەنی هاتە دەر بێ هەست کردن بە خۆشی، بەڵکو بەهۆی نەخۆشی یا سەرما ئەوە خۆشۆردن واجب نابێ، چونکە لە (حديث)ەکەی عەلی دا خوا لێی ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموە: (فَإذَا فَضَخْتَ المَاءُ فَاغتَسِلْ). واتە: ئەگەر ئاو دەرپەڕییە دەر خۆت بشۆرە. ئەبو داود گێڕاویەتیەوە.

موجاهید دەفەرمووێت: لە کاتێکدا ئێمە ـ هاوەڵانی ئیبنوعەبباس ـ لە مزگەوت بە ئەلقە دانیشتبوین: (طاوس) و سەعیدی کوڕی جوبەیرو عیکریمە، و ئیبنوعەبباسیش بەپێوە بوو نوێژی ئەکرد، لەناکاو پیاوێك بەسەرمانەوە وەستاو وتی: کەس لە ئێوە فەتوا ئەدات ؟ ئێمەش وتمان: پرسیار بکە، ووتی: من هەرکاتێك میز بکەم بە دووای میزەکەمەوە ئاوی بە تەوژم بەشوێنیا دێ، ووتمان: ئەوەی منداڵی لێ دروست ئەبێت ؟ ووتی: بەڵێ، ووتمان: خۆشۆردنت لەسەر پێویستە، دەفەرمووێت: جا کابرا ڕووی وەرگێڕاو و ڕۆیشت (إنا لله وإنا إليه راجعون)ی ئەووت: ئیبنو عەبباس بە پەلە نوێژەکەی تەواو کرد و بە عیکرمەی ووت: ئەو کابرایەم بۆ بانگ بکەوە، ڕووی کردە ئێمە و ووتی: ئەوە ئەو فەتوایەی بەو کابرایەتان دا پێم بڵێن: ئایا لە قورئاندا هاتوە؟ ووتمان: نا، فەرمووی: ئەی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ؟ ووتمان: نا، فەرمووی: ئەی لە یارەکانی

پێغەمبەرەوە ﷺ هاتوە؟ وتمان: نا، فەرمووی: ئەی لە چیەوە هاتبوو، وتمان:-بەڕای خۆمان، فەرمووی: لەبەر ئەمەیە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (فَقِيهٌ وَاحِدٌ أَشَدُّ عَلَى الشَّيطَانِ مِن أَلفِ عَابِد)[1]. واتە: زانایەك لە هەزار عابید لەسەر شەیتان گرانترە.

ئەڵێ پیاوەکە گەڕایەوە ئیبنو عەبباس ڕووی تێ کرد و فەرمووی: کاتێ ئەو ئاوە دێت لەپێشت، پێم بڵێ: هەست بە خۆشی ئەکەیت ؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: ئەی هەست بە سستی و سڕی لەشت ئەکەیت ؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: ئەمە کە تووشت بووە ئیبریدەیە تەنها دەست نوێژێکت بەسە بیگریت.

ئیبریدە جۆرە نەخۆشییەکە لەسەرمای زۆر و تەڕو تووشییەوە پەیدا ئەبێ.

ب- ئەگەر کەسێك ئیحتیلام بوو کە هەستا لە خەو مەنی نەبینی خۆشۆردنی لەسەر نابێت، ئیبنومونذیر دەفەرموێت: هەموو ئەوانەی من زانیاریم لێوە وەرگرتوون لەسەر ئەوە کۆن.

وە لە (حديث)ەکەی ئوموسولەیمدا کە لە پێشەوە باسمان کرد هاتووە ئایا ژن خۆ شتنی لەسەرە ئەگەر ئیحتیلام بوو ؟ فەرمووی: (بەڵێ ئەگەر ئاوی بینی) ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەگەر ئاوی نەبینی خۆشۆردنی لەسەر نیە، بەڵام ئەگەر ئاوەکە دووای هەڵسان لە خەو هاتە دەرەوە ئەوە خۆشۆردنی لەسەر واجب ئەبێت.

جـ- ئەگەر کەسێك لە خەو هەستا و تەڕی بینی بە خۆیەوە بەڵام ئیحتیلامی وەبیر نەکەوتەوە، ئەوە ئەگەر دڵنیا بوو ئەو تەڕیە مەنیە ئەبێ خۆی بشۆرێت، چونکە ئەو مەنیە بە ئیحتیلام هاتۆتە دەر، بەڵام ئەم بیری ناکەوێتەوە، جا ئەگەر گومانی هەبوو نەیزانی ئەو تەڕیە مەنیە یا شتی تر، ئەبێ بۆ ئیحتیات خۆی بشۆرێت، موجاهید و قەتادەش دەفەرموون: ئەو جۆرە کەسانە خۆ شۆردنیان لەسەر نیە هەتا دڵنیا نەبن کە ئەو تەڕیە مەنیە، چونکە یەقین مانەوەی پاکیەوە بە گومان لاناچێت.

د- ئەگەر کەسێك هەستی کرد بەوەی خەریکە ئاوی دێتەوە و زەکەری توند گرت و نەی هێشت ئاوەکە دەر بچێت ئەو کەسە خۆشۆردنی لەسەر نیە، چونکە لە پێشەوە باسمان کرد کە پێغەمبەر

(١) ئەم حەدیسە (ترمذي) و ئیبنو ماجە و (ابن عبد البر) لە (جامع العلم) دا بە مەرفوعی هێناویانە بەبێ ئەوەی باسی ئەو بەسەرهاتە بکەن، وە (ترمذي) دەفەرموێت: (حديث غريب) وە موناوی لە (حافظ عراقي) یەوە نەقلی کردووە دەفەرموێت: سەنەدەکەی زۆر زەعیفە، وە هەروەهایشە، وە ڕوون کردنەوەکەی لە تەعلیقدایە لەسەر (المشكاة ٢١٧). ئەما بەسەرهاتەکە من تا ئێستا هەڵوێستەم نەکردوە لەسەر سەنەدەکەی بۆ وورد بونەوە لێی، وە پێم وانیە کە صەحیح بێت. هەروەها نەکارەتیشی تێدایە، والله أعلم. (تمام المنة).

ﷺ خۆشۆردنی بەستۆتەوە بە هاتنەوەی ئاوەوە و بە بینینی، وە حوکمی پێویستی خۆ شۆردن بۆ ئەو بینینە (ثابت) نابێ، بەڵام ئەگەر دوایی هەڵسا بڕوات ئاوەکە بێتە دەرەوە ئەوە خۆشۆردنی لەسەرە.

هـ- ئەگەر کەسێك بە لیباسەکەیەوە مەنی بینی و نەی ئەزانی کەی وای لێ هاتووەو نوێژیشی پێوە کردبوو ئەبێ لەو کاتەوەی دووا جار نوستووە نوێژەکانی بگێڕێتەوە، مەگەر بە بەڵگە بۆی دەربکەوێت ئەو مەنیە لە پێش ئەو دووا جارەشەوە بووە کە خەوتووە، ئەوکاتە ئەبێت لە نزیك ترین نوستنەوە کە لەوانەیە لەو کاتەوە بووبێت نوێژەکانی بگێڕێتەوە.

دووەم: گەیشتنی هەردوو شوێنی خەتەنە بە یەکتر:

واتە: سەری زەکەر لە هێنی ئافرەتدا وون بکرێت با ئاویش نەیاتەوە، بە پێی فەرموودەی خوای گەورە کە ئەفەرمووێت: ﴿وَإِن كُنتُمۡ جُنُبٗا فَٱطَّهَّرُواْۚ﴾. واتە: ئەگەر لەشتان گران بوو خۆتان پاك بکەنەوە.

شافیعی دەفەرمووێت: (قسەی عەرەب وا ئەگەیەنێت کە ـ جنابة ـ لەش گرانی لە ڕاستی دا بە جیماع بوترێ، با هاتنە دەرەوەی مەنیشی لەگەڵدا نەبێ، چونکە بە هەرکەس بووترێ فلان پیاو لەشی گران بوو لە فلان ئافرەت ئەوا تێ ئەگا کە ئەو فلان پیاوە جیماعی لەگەڵدا کردووە با ئاویشی نەهاتبێتەوە) وە دەفەرمووێت: (هیچ کەس لە زانایان خیلافی نیە لەوەدا ئەو زینایەی حەددی شەرعی پێویست ئەکات جیماعە با ئاویشی پێوە نەهاتبێتەوە).

وە بە پێی ئەو حەدیسەی ئەبوهورەیرە خوا لێی ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذَا جَلَسَ بَينَ شِعَبِهَا الأربَعِ ثُمَّ جَهَدَهَا فَقَد وَجَبَ الغُسلُ، أنزَلَ أم لَم يُنزِل) رواه أحمد ومسلم. واتە: ئەگەر لەناو چوار پەلیا دانیشت و دخولی پێ کرد، خۆشۆردن پێویست ئەبێت ئاوی بێتەوە یان نا.

وە لە سەعیدی کوڕی موسەییبەوە هاتووە کە ئەبو موسای ئەشعەری خوا لێی ڕازی بێ بە عائیشەی ووت: ئەمەوێ پرسیاری شتێکت لێ بکەم بەڵام شەرمت لێ ئەکەم، ئەویش فەرمووی: شەرم مەکە بپرسە من دایکی تۆم، ئەویش فەرمووی: ئەگەر پیاوێك چووە لای ژنەکەی خۆی بەڵام ئاوی نەهاتەوە چی پێویست ئەبێت لەسەری؟ ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: پێغەمبەر ﷺ ئەیفەرموو (إذَا أصَابَ الخِتَانُ الخِتَانَ فَقَد وَجَبَ الغُسلُ) رواه أحمد ومالك بألفاظٍ مختلفة. واتە: ئەگەر شوێنی خەتەنە بەر شوێنی خەتەنە بکەوێت خۆ شۆردن پێویست ئەبێت.

بەڵام بۆ واجب بوونی خۆ شۆردن ئەبێ (إدخال)ی ڕاستی هەبێت، بەڵام ئەگەر تەنها ئەو دووانە لە یەك بدرێن بێ (دخول) ئەوە خۆشۆردن واجب نابێت لەسەر هیچیان بەڕای هەموو زانایان (إجماع).

سێیەم: پاك بوونەوە لە خوێنی حەیز و زەیستانی:-

بەپێی فەرموودەی خوای گەورە کە فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ﴾ الآية. واتە: لێیان نزیك مەبنەوە بە جیماع هەتا پاك ئەبنەوە، کاتێ پاك بوونەوە بچنە لایان لەو شوێنەوە کە خوا فەرمانی پێ کردوون، بەڕاستی خوا تۆبەکاران و ئەوکەسانەی کە خۆیان پاك ڕائەگرن خۆش ئەوێت.

وە بە پێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کاتێ بە (فاطمة) ی کچی ئەبی حوبەیشی فەرموو: (دَعي الصَّلاةَ قَدرَ الأيَّامِ الَّتي كُنتِ تَحِيضِينَ فِيهَا ثُمَّ اغتَسِلِي وَصَلِّي) متفق عليه. واتە: بە ئەندازەی ئەو ماوەیەی کە تێیدا تووشی حەیز ئەبوویت واز لە نوێژەکانت بهێنە لەپاشاندا خۆت بشۆرە و نوێژ بکە. وە ئەمە هەرچەندە لەبارەی حەیزەوە هاتووە بەڵام زەیستانیش وەك حەیز وایە بە ئیجماعی هەموو صەحابە.

جا ئەگەر ئافرەتێك منداڵی بوو، خوێنی نەدی ووتراوە: هەر خۆشۆردنی لەسەرە، وە ووترایشە: خۆشۆردنی لەسەر نیە، وە لەو بارەیەوە دەقێك نەهاتووە ڕوونی بکاتەوە.

چوارەم مردن:-

ئەگەر موسڵمانی مرد شۆرینی واجبە بە ئیجماع. وەك بە درێژی لە شوێنی خۆیدا باسی ئەکەین - إن شاء الله - .

پێنجەم: بێ باوەڕ کاتێك موسڵمان بوو:-

کاتێك بێ باوەڕێك موسڵمان بوو پێویستە لەسەری خۆی بشۆرێت. بەپێی ئەوەی کە ئەبوهورەیرە ئەگێڕێتەوە دەفەرموێت: (ثمامة)ی حەنەفی بە دیل گیرابوو پێغەمبەر ﷺ بەیانیان سەری لێ ئەدا و ئەی فەرموو: ئەی (ثمامة) چیت لایە؟ ئەویش ئەی ووت: ئەگەر بکوژی خاوەن خوێن ئەکوژی، وە ئەگەر چاکەش ئەکەیت چاکە لەگەڵ کەسێکدا ئەکەیت سوپاس کە گوزارە، وە ئەگەر ماڵیشت ئەوێت چەندە داوا ئەکەیت ئەت دەینێ، وە یارەکانی پێغەمبەر ﷺ حەزیان لە

بریتی (فدیة) ئەکردو ئەیان ووت: چی لە کوشتنی ئەمە بکەین؟ پاشان ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ چوو بۆلای ئەویش موسڵمان بوو، پێغەمبەر ﷺ دەستی کردەوە و ناردی بۆناو باخەکەی ئەبو (طلحة)و فەرمانی پێدا خۆی بشۆرێت، ئەویش خۆی شۆردو دوو ڕکات نوێژی کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (بەڕاستی ئیسلامەتی براکەتان جوان بووە). ئەحمەد گێڕاویەتیەوە، وە ئەصلی ئەم (حدیث)ە لای بوخاری و موسلیمە.

**ئەوەی کە حەرامە لەسەر لەش گران :**

ئەمانەی خوارەوە لەسەر لەش گران حەرامە:

١- نوێژ کردن.

٢- (طواف). لە پێشەوە بەڵگەی ئەمە ڕوون کراوەتەوە لە باسی ئەو شتانەدا کە واجبە دەست نوێژی بۆ بگیرێت.

٣- دەست دان لە قورئان و هەڵگرتنی:-

حەرامیەتی ئەمە پێشەواکانی ئیسلام لەسەری ڕێکن، وە لە صەحابە کەس نەبوە خیلاف و جیاوازی بوبێت لەوەدا، بەڵام داود و ئیبنو حەزم ڕێیان داوە بە لەش گران دەست لە قورئان بدات و هەڵی بگرێت و بە خراپیان نەزانیوە، بەڵگەشیان ئەوەیە کە لە صەحیحی بوخاری و موسلیم دا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ نامەیەکی نارد بۆ هیرەقل ئەمەی تێدا بوو: (بسم الله الرحمن الرحیم... هەتا ﴿قُلْ يَـٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَقُولُوا۟ ٱشْهَدُوا۟ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾ (آل عمران/٦٤).

ئیبنوحەزم دەفەرمووێت: ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ نامەیەکی ڕەوانە کرد بۆلای نەصارا ـ گاورەکان ـ کە ئەم ئایەتەشی تێدا بوو، وە دڵنیاش بوو کە ئەوان دەست لەو نووسراوە دەدەن، جومهوریش زانایانیش وەڵامی ئەوەیان داوەتەوە بەوەی کە ئەوە نامە بووە، وە هیچ ڕێگرێك نیە بۆ دەست دان لەو شتانەی کە ئایەتی قورئانیان تێدا بێت وەك نامە و کتێبی تەفسیر و کتێبی فیقهی و غەیری

ئەوانە، چونکە ئەوانە پێیان ناووترێت کتێبی قورئان، وە حەرامی‌یەتی دەست لێدان و هەڵگرتنی ئەمانە (ثابت) نەبووە[1].

٤- قورئان خوێندن:-

لای جومهوری زانایان حەرامە بۆ لەش گران ك شتێك لە قورئان بخوێنێ، بە پێی ئەوەی عەلی خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: (پێغەمبەر ﷺ هیچ شتێك ڕێی قورئان خوێندنی لێ نەئەگرت ئیللا لەش گرانی نەبێت). خاوەن سونەنەکان گێڕاویانەتەوە، (ترمذي) و غەیری ئەو بە صەحیحیان داناوە، (حافظ) لە (الفتح)دا دەفەرمووێت: هەندێ لە زانایان هەندێ لە گێڕەرەوەکانی ئەم (حديث)ە بە (ضعيف) دائەنێن، وە لە ڕاستی دا نزیکە لە (حسن)ەوە بۆ کار پێ کردن ئەشێت[2].

وە هەر لە عەلی‌یەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە کە دەفەرمووێت: (پێغەمبەری خوام بینی ﷺ دەست نوێژی گرت، پاشان کەمێك قورئانی خوێند پاشان فەرمووی: (ئەمە بۆ ئەو کەسانەیە کە لەشیان گران نیە، بەڵام لەش گران نا، هەتا ئایەتێکیش) ئەحمەد و ئەبو یەعلا گێڕاویانەتەوە، وە ئەمە لەفزی ئەبو یەعلایە.

---

(١) ئەم وەڵامە بینا کراوە لەسەر ووتەی حەرامێتی دەست لێدانی قورئان لەلایەن لەش گرانەوە، وە دانەر لێرەدا بەڵگەی بۆ نەهێناوەتەوە، بەڵام ئاماژەی بۆ کردووە لە فەصلی: «ئەوەی پێویستە دەست نوێژی بۆ بگیەدرێت» کە بەڵگەش فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ: «لا يَمَسُّ القُرآنَ إلا طَاهِر» لەگەڵ ئەوەی لەوێدا بە ڕاشکاوی دەیوت کە زاراوەی (طاهر) هاوبەش (مشترك)ە چەند واتایەك دەگرێتە خۆ، وە کە حەمل بکرێت لەسەر واتایەکی دیاری کراو پێویستە قەرینە هەبێت، پاشان ئەو خۆی حەملی کردووە لەسەر غەیری لەش گران بەبێ قەرینە، و ئێمە ئەوەی مەبەست بێ لەوێدا بەرپەرچمان دایەوە، وە لەوێدا مەبەستی حەدیسەکەمان ڕوون کردەوە، کە بەڵگە نی‌یە بۆ حەرامێتی دەست لێدانی قورئان بۆ ئیماندار (مطلقاً) بە تێکڕایی جا بۆی بگەڕێوە.

وە بەرانەتی بنچینەیی لەگەڵ ئەوانەیە کە دەڵێن بە دروستێتی دەست لێدانی قورئان لەلایەن موسڵمانی لەش گرانەوە، وە لەم بابەدا نەقڵ کراوێکی ڕاست و دروست نەهاتووە کە دەرچون لەوە دروست بکات، جا وورد بەرەوە. (تمام المنة ١١٦).

(٢) نەخێر، بەڵکو لە بابەتی ئەو (ضعيف)انەیە کە کاری پێ ناکرێت، لەبەر ئەوەی عبدالله ی کوڕی (سَلِمة) بە تەنهایی گێڕاویەتی‌یەوە، وە ئەویش گۆڕانکاری بەسەر بیرەوەریشیدا هاتوە لە دووا تەمەنی، بە دان پێدانانی (حافظ ابن حجر) خۆی لە (تقريب)دا، وە لە عائیشەوە پێچەوانەی ئەوە (ثابت) بووە... (تمام المنة ١١٧).

(هیثمي) دەفەرمووێت: پیاوەکانی (ثقة) ن، شەوکانی دەفەرمووێت: ئەگەر ئەم (حدیث)ە صەحیح بێت، شیاوی ئەوەیە بکرێتە بەڵگە لەسەر حەرامیەتی قورئان خوێندن لەسەر لەش گران[1].

ئەمما (حدیث)ەکەی یەکەم شتێکی وای تێدا نیە بەڵگە بێت لەسەر حەرامی‌یەتی چونکە مەبەست لێی ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ کاتی لەش گرانی وازی لە قورئان خوێندن هێناوە، وە ئەم (حدیث)ە بۆ ئەوە نابێت بۆ کەراهەتیش بکرێتە بەڵگە، ئیتر چۆن ئەکرێتە بەڵگە لەسەر حەرامیەتی؟ (تەواو).

بوخاری‌و (طبراني)و داوود و ئیبنو حەزم بۆ ئەوە چوون کە دروستە لەش گران قورئان بخوێنێ، بوخاری دەفەرمووێت: ئیبراهیم دەفەرمووێت: قەیناکا ئافرەتی حەیزدار ئایەتی قورئان بخوێنێ، ئیبنو عەبباسیش بە خراپی نەئەزانی لەش گران قورئان بخوێنێ، پێغەمبەریش ﷺ لە هەموو حاڵێکدا یادی خوای کردووە.

(حافظ) تەعلیق ئەدات لەسەر ئەم قسەیەی بوخاری و دەفەرمووێت: لای بوخاری هیچ کام لەو (حدیث)انە کە لەو بارەیەوە هاتوە صەحیح نیە: واتە لە بارەی رێگە نەدان بە لەش گران و حەیزدار کە قورئان بخوێنێ، هەرچەندە لەلای غەیری بوخاری ئەو (حدیث)انەی لەو بارەیەوە هاتون ئەکرێ بە بەڵگەی رەوا نەبوونی قورئان خوێندن بۆ لەش گران و حەیزدار، بەڵام زۆربەی ئەو (حدیث)انە قابیلی لێك دانەوەن.

٥- مانەوە لە مزگەوتدا:-

حەرامە بۆ لەش گران کە لە مزگەوتدا بمێنێتەوە، بە پێی ئەوەی عائیشە رەزای خوای لێ بێ دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ هات سەیری کرد دەرگای خانووی صەحابەکان لەناو مزگەوتدایە فەرمووی: (وَجِّهُوا هَذِهِ البُيُوت عَنِ المَسجِدِ). واتە: دەرگای ئەو خانووانەتان لە مزگەوت وەرگێرن.

لەپاشان پێغەمبەر ﷺ چووە ژوورەوە، خەڵکەکە هیچیان نەکرد بە هیوای ئەوەی خوا لەو بارەیەوە شتێك بنێرێتە خوارەوە کە رێیان بدات دەرگای خانووەکانیان لەناو مزگەوتدا بێت، ئینجا پێغەمبەر ﷺ هاتە دەرەوەو فەرمووی: (وَجِّهُوا هَذِهِ البُيُوت عَنِ المَسجِدِ فَإنّي لا أُحِلُّ المَسجِدَ

---

(١) بۆ ئەم رێگایە دوو عیللەت هەیە ئەویش (ضعف) و (وقف)ە، بەو شێوەیە (حدیث)ەکە ناکرێت بە بەڵگە بۆ حەرامێتی، وە گەڕانەوە بۆ ئەصل پێویستە کە ئەویش دروستی‌یە، ئەمەش (مذهب)ی داود و هاوەڵەکانیەتی، وە ئیبنوحەزمیش بەڵگەی بۆ هێناوەتەوە (١/٧٧-٨٠)، وە لە ئیبنو عەبباس و سەعیدی کوڕی موسەییب و سەعیدی کوڕی جوبەیریشەوە ریوایەت کراوە. بەڵام شاراوە نی‌یە کە ئەوە بەبێ کەراهەت نی‌یە ، بەفۆی حەدیسی: (إنّي كَرِهتُ أن أذكُرَ الله إلا على طُهرٍ). تەماشای (الصحیحە) بکە (٨٣٤). (تمام المنة).

لِحَائِضٍ وَلا جُنُبٍ). واتە: دەری ئەو خانووانەتان لە مزگەوت وەرگێڕن، چونکە من مزگەوت ڕەوا ناکەم بۆ ئافرەتانی حەیزدارو کەسانی لەش گران. ئەبوداود گێڕاویەتیەوە.

ئوممو سەلەمە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ هاتە ناو حەوشەی ئەم مزگەوتەوە بە دەنگی بەرزی هاواری کردو فەرمووی: (إِنَّ المَسجِدَ لايَحِلُّ لِحَائِضٍ وَلا جُنُبٍ) رواه إبن ماجة والطبراني. واتە: ڕەوا نیە بۆ ئافرەتانی بێ نوێژ و کەسانی لەش گران، بچنە ناو مزگەوتەوە[١].

ئەم دوو (حدیث)ە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ڕەوا نیە بۆ حەیزدار و لەش گران مانەوە لە مزگەوتدا، بەڵام ڕێگایان پێ دراوە بەناو مزگەوتدا تێپەڕ بن بەپێی فەرموودەی خوای گەورە: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقْرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَـٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُواْ

(١) هێنانی حەدیسەکە بەم شێوەیە بۆ خوێنەر وادەرئەخات کە ئەمە دوو حەدیس بن بە دوو ئیسنادی جیاواز، یەکێکیان لە عائشەوە و ئەوی تریان لە ئوممو سەلەمەوە، وە ئەمە وا نیە بەڵکو هەردووکیان یەك حەدیسن و بەیەك ئیسناد، وە ئەگەڕێتەوە سەر (جَسْرَة)ی کچی (دجاجة) کە (اضطراب)ی کردووە لە ریوایەتەکەی، جارێك دەڵێت: لە عائیشەوە، وە جارێك دەڵێت لە ئومموسەلەمەوە، وە (إضطراب) لەو شتانەیە کە حەدیس لەکەدار ئەکات هەروەك زاندراوە لەلای فەرموودە ناسان، چونکە ئەمە بەڵگەیە لەسەر نەبوونی (ضبط الراوي) واتە: لەبەرکردنی، هەروەها ئەم (جسرة)یە کەسێکی وا بەجێی متمانەی دانەناوە کە متمانە بە تەوسیق کردنەکەی بکرێت، بەڵکو بوخاری دەفەرمووێت شتی سەیری لا هەیە.

هەربۆیە کۆمەڵێك ئەم حەدیسەیان بە زەعیف داناوە وەك (خطابي) دەفەرمووێت: وە بەیهەقی دەفەرمووێت: (لیس بالقوي). وە (عبدالحق) دەفەرمووێت: (لا یشبت). وە ئیبنوحەزم زیادەڕەوی تێدا کردووەو دەفەرمووێت: (إنه باطل). وە بۆ حەدیسەکە دوو شاهید هەیە کە بۆ ئەوە نابن پشتگیری و بەهێزی بکەن، لەبەر ئەوەی لە یەکێکیانا مەتروکی تێدایە، وە ئەوی تریان درۆزنی تێدایە، کە تەخریجم کردوون و ڕوونم کردونەوە لە (ضعیف سنن أبي داود/٢٣).

وە قسە لەم مەسەلەیە لە لای ئێمە لە ڕووی فیقهیەوە، وەکو قسەی دەست لێدانی قورئان وایە لەلایەن لەش گرانەوە، لەبەر بەرائەتی بنچینەیی یە، وە لەبەر نەبوونی شتێك کە حەرامی کات، وە ئەمە بۆچوونی ئیمامی ئەحمەد و غەیری ئەوە، بەغەوی لە (شرح السنة) دا (٢/٤٦)، دەفەرمووێت: ئەحمەد و (مزني) مانەوەیان بە دروست زانیوە، وە ئیمام ئەحمەد حەدیسەکەی بە لاواز داناوەو تەئویلی ئایەتی ﴿عَابِرِى سَبِيلٍ﴾ ی کردووە بەوەی کە موسافیرن تووشی لەش گرانی دەبن، جا تەیەممومم دەکەن و نوێژ دەکەن، وە ئەمە لە ئیبنو عەبباسەوە ریوایەت کراوە (تمام المنة ١١٨-١١٩).

مَا تَقُولُونَ وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ حَتَّىٰ تَغْتَسِلُوا﴾ (النساء/٤٣). واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە نزیکی نوێژ مەکەون لەحاڵێکدا کە مەستن تا بزانن چی ئەڵێن و هۆشتان بەلای خۆتانەوە بێ. - ئەمە پێش ئەوە بو کە ئارەق بە یەکجارەکی حەرام بکرێ - هەروەها بە لەش گرانیەوە نزیکی نوێژ مەکەون هەتا خۆتان نەشۆن، مەگەر هەر بەناویدا تێپەڕ بن.

لە جابیرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە کە فەرمویەتی: (کەسێك لە ئێمە لەشی گران بویایە بە ڕاڕەوی بەناو مزگەوتدا تێ ئەپەڕی) ئیبنو ئەبی شەیبە و سەعیدی کوڕی مەنصور لە سونەنەکەیدا گێڕاویانەتەوە.

لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە هاتوە فەرمویەتی: هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بە لەش گرانی بەناو مزگەتا ئەڕۆیشتن.

لە یەزیدی کوڕی حەبیبەوە هاتووە دەفەرمووێت: (کۆمەڵێك پیاو لە ئەنصار دەرگای خانووەکانیان بۆناو مزگەوت بوو، تووشی لەش گرانی ئەبوون و ئاویان دەست نەئەکەوت خۆیانی پێ بشۆرن، لەناو مزگەوتەکەشەوە نەبووایە ڕێگا نەبوو بچن بۆ ئاو، خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ حَتَّىٰ تَغْتَسِلُوا﴾) ئیبنو جەریر گێڕاویەتی-یەوە[1].

شەوکانی بە دووای ئەوەدا دەفەرمووێت: ئەمە لەو بەڵگانەیە کە گومان بەجێ ناهێڵن.

لە عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: (پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پێم: ئەو خومرەیەم لەناو مزگەوتدایە بۆ بهێنە، ووتم: من لە حەیزدام، فەرمووی: خۆ حەیزەکەت لە دەستتا نیە) رواه الجماعة إلا البخاري. خومرە پارچەیەکە کە لە حەسیر یا لە شتی تر دروست کراوە، بە ئەندازەی ئەوەیە لە نوێژا ناوچاوانی لەسەر دابنرێ، یا لەسەری دابنیشرێ.

وە لە (میمونة)ەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: (پێغەمبەر ﷺ ئەهات بۆلای هەردانەیەکمان -لە خێزانەکانی- کە لە حەیزا ئەبوو، سەری ئەکردە سەر کۆشی و قورئانی ئەخوێند لەحاڵێکدا کە لە حەیزا بوو، پاشان هەردانەیەك لە ئێمە کە لە حەیزدا بوو هەڵ ئەستاو خومرەکەی پێغەمبەری ﷺ ئەبرد و لە مزگەوت دای ئەنا) رواه أحمد والنسائي وله شواهد.

---

(١) ئاوها لە ئەصلدا ئیبنوحەبیبە لەوانەیە ئەمە هەڵەی چاپی بێت وە ڕاست: ئیبنوئەبی حەبیبە، هەروەك لە تەفسیری ئیبنو جریر و (کتاب الرجال) دا هاتووە، وەئەمە ئەبو ڕەجائی میسریە فەقیهێك بووە لە باوەڕ پێ کراوەکانی تابیعی، بەڵام ئیرسالی هەیە، جا ئەم ریوایەتەش عیللەتی ئیرسالی هەیە، بۆیە دڵی پێ خۆش ناکرێت.

## ئەو خۆشۆردنانەی (مستحب)ن

پەسەند (مستحب) ئەوەیە ئەگەر موکەللەف ئەنجامی بدات پاداشی لەسەر وەربگرێت، وە بە ئەنجام نەدانی لۆمە و سزای لەسەر نەبێ.

ئەو خۆشۆردنانەش شەشن وا لە خوارەوە باسیان ئەکەین:

١- خۆ شۆردنی ڕۆژی جومعە:-

لەبەر ئەوەی ڕۆژانی جومعە ڕۆژانی کۆبوونەوەن بۆ خوا پەرستی و نوێژ کردن، شەرع دانەر فەرمانی داوە لەو ڕۆژەدا خۆ بشۆررێت و تەئکیدی لەسەر کردۆتەوە، تاوە بۆ ئەوەی کە موسڵمانان لەو کۆبوونەوەیانەدا لەسەر چاکترین شێوەی پاك و خاوێنی بن.

لە ئەبو سەعیدەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (غُسلُ الجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحتَلِمٍ وَأن يَمَسَّ مِنَ الطِّيبِ مَا يَقدِرُ عَلَيهِ) رواه البخاري و مسلم. واتە: خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی لەسەر هەموو باڵغێك واجبە، هەروەها بۆنی خۆش لە خۆدان چەندە توانی لەو ڕۆژەدا.

مەبەست لە واجب بوون تەئکید کردنە لەسەر (مستحب) بوون، بەڵگەی ئەوەی کە بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنو عومەرەوە: (کە عومەری کوڕی (خطاب) ڕۆژێکی هەینی ووتاری ئەخوێند، لەو کاتەدا پیاوێك لە موهاجیرە ئەووەڵەکان لە یارەکانی پێغەمبەر ﷺ کە ئەویش (عثمان) بوو خۆی کرد بەناو مزگەوتدا، عومەر هاواری لێ کرد: ئێستا چ کاتە؟ ئەویش فەرمووی: سەرم قاڵ بوو نەچوومەماڵەوە هەتا گوێم لە بانگ بوو لە دەست نوێژ گرتنێك زیاترم بۆ نەکرا، عومەر فەرمووی: هەر دەست نوێژیش؟ نەشزانی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی ئەکرد بە خۆشۆردن؟)).

شافیعی دەفەرمووێت: جا لەبەر ئەوەی (عثمان) وازی لە نوێژەکە نەهێنا بۆ خۆشۆردن، وە عومەریش فەرمانی پێ نەکرد لە مزگەوت دەر بچێت بۆ خۆشۆردن، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەردووکیان زانیویانە فەرمان بەخۆشۆردن ئیختیارییە. وە هەروەها بەڵگە لەسەر ئەوەی کە خۆشۆردنی جومعە (مستحب)ە ئەو (حديث)ەیە کە موسلیم لە ئەبی هورەیرەوە ئەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (هەرکەس بە شێوەیەکی باش دەست نوێژی گرت و لەپاشاندا هات بۆ نوێژی هەینی و باش گوێی گرتو بێدەنگ بوو، خوا لە تاوانەکانی نێوان ئەو هەینیە تا هەینیەکی تری ئەبورێ و سێ ڕۆژیش زیادە).

(قرطبـي) لە میانەی ئیقرار کردن بەوەی کە بەم (حدیث)ە بەڵگە بهێنرێتەوە لەسەر ئەوەی کە ئەم خۆشۆردنە (مستحب)ە دەفەرمووێت: باس کردنی دەست نوێژ و ئەو شتانەی کە لەگەڵ دەست نوێژدایە، وە ئەو پاداشەی ئەدرێتەوە لەسەری کە چاکی‌یەتی دەستنوێژەکە ئەگەیەنێ، دەلالەت ئەکات لەسەر ئەوەی کە دەست بەسە نوێژ کافیە.

(حافظ) ئیبنوحەجەر لە (التلخیص)دا دەفەرمووێت: ئەمە لە هەموو ئەو بەڵگانە بەهێزترە کە کراونەتە بەڵگە بۆ ئەوەی کە خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی فەرز نیە، وە قەول کردن بەوەی کە (مستحب)ە لەسەر ئەساسی ئەوەیە کە تەرك کردنی خۆشۆردن زیان ناگەیەنێت، بەڵام ئەگەر تەرك کردنی ئەو خۆشۆردنە بوو بە هۆی ئەوە کە خەڵکی ئازار بدرێ بە بۆنی عارەق و بۆنی ناخۆش ئەوە ئەو خۆشۆردنە واجب ئەبێ و تەرك کردنی حەرامە،

وە کۆمەڵێك لە زانایان بۆ ئەوە چوون کە خۆشۆردن بۆ ڕۆژی هەینی (واجب)[1]ە با لە نەکردنەکەیدا بە هۆی بۆنی عارەق و چڵکەوە کەسیش تووشی ئازار نەبێ، بەڵگەشیان قسەی ئەبوهورەیرەیە خوا لێی ڕازی بێت کە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لەسەر هەموو موسڵمانێك حەقە هەفتەی یەکجار سەر و لاشەی بشۆرێت) بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە.

---

(١) ئەم ووتەیە حەقە و ڕەوایە کە پێویستە لێی لانەدرێت، لەبەر ئەوەی ئەو حەدیسانەی کە دەلالەت دەکەن لەسەری بەهێزترو ئاشکراترن لە دەلالەتدا لەو حەدیسانەی کە (مخالفون) کردویانە بە بەڵگە لەسەر (إستحباب)، بۆ نمونە بڕوانە حەدیسی عومەر کە باس کرا لە کیتابەکەدا، ئەمە بەڵگە نی‌یە بۆ ئەوان، بەڵکو بەڵگەیە لەسەریان، لەبەر ئەوەی ئینکار کردنی عومەر لەسەر مینبەر لەبەردەم ئەو کۆمەڵە زۆرە لەو صەحابی‌یە بەڕێزە، و دان پێدانانی سەرجەم ئامادە بووان لە صەحابەو غەیری ئەوانیش بۆ ئەم ئینکار کردنە، ئەمە بەهێزترین بەڵگەی حوکم دەرە بەوەی کە واجب بوون، شتێکی مەعلوم بووە لەلای صەحابە، وە ئەگەر لەلای ئەوان واجب نەبووایە ئەو صەحابی‌یە لە عوزر هێنانەوەکەیدا پەنای نەئەبرد بۆ غەیری خۆی، جا ئیتر لە دوای ئینکاری کردنی عومەر و دان نانی صەحابەکان بەمە چیتر هەیە؟! هەروەها بەڵگەهێنانەوەیان بە حەدیسی ئەبوهورەیرە کە دەفەرموێ: (مَن تَوَضَّأَ فَأَحسَنَ الوُضُوءَ....) (حافظ) لە (فتح) دا وەڵامی داوەتەوەو فەرمویەتی: لەوێدا نەفی غوسڵ ناکات) ، وە ئەو حەدیسە لە ڕویەکی ترەوە هاتوە لە صەحیح دا بە لەفزی (منِ اغتَسَلَ) جا لەوانەیە کە باسی دەستنوێژ بۆ کەسێك بێت کە پێش ڕۆشتن خۆی شۆردبێ و پاشان پێویستی بە دەست نوێژ گرتنەوە بوبێت.

وە کۆی ووتە ئەوەیە کە ئەو حەدیسانەی بە ڕاشکاوی باس لە واجبێتی غوسلی جومعە دەکەن حوکمێکی پتریان تێدایە لەو حەدیسانەی کە (استحباب) ئەگەیەنن، کەواتە هیچ (تعارض)ێك لە نێوانیانا نی‌یە، وە پێویستە ئەوەی حوکمی زیاتر دەگرێتە خۆ، ئەوە وەربگیرێت. بۆ زیاتر درێژەدان بەم باسە بگەڕێوە بۆ (نیل الأوطار)ی شەوکانی و (المحلی)ی ئیبنوحەزم. (تمام المنة ١٢٠).

وە ئەمان ئەو (حدیث)انەی هاتوون لەو بارەیەوە لەسەر (ظاهر) ی یەکەی وەریان گرتووە، وە هەرچی بەرنگاری ئەو (حدیث)انە وەستاوە ڕەدیان کردۆتەوە·

کاتی خۆشۆردنیش لە بەرەبەیانەوە درێژەی هەیە هەتا کاتی نوێژی هەینی، هەرچەندە وا (مستحب)ە کاتی چوون بۆ مزگەوت خۆ بشۆرڕێت.

وە ئەگەر دووای خۆشۆردنەکە دەست نوێژی شکا تەنها دەست نوێژ گرتنەوەی بەسە.

(أثرم) دەفەرمووێت: گوێم لێ بوو کاتێك لە ئیمام ئەحمەدیان ئەپرسی ئایا کەسێك خۆی شۆردو دوایی دەست نوێژەکەی شکا ئەبێ تەنها دەست نوێژ بگرێتەوە؟ فەرمووی: بەڵێ، وە دەربارەی ئەمە لە (حدیث)ەکەی ئیبنو ئەبزا بەرزترم نەبیستووە (تەواو بوو).

ئەحمەد ئاماژە بۆ ئەو (حدیث)ە ئەکات کە ئیبنو ئەبی شەیبە بە ئیسنادی صەحیح لە عبدالرحمنی کوڕی ئەبزاوە لە باوکی یەوە گێڕاویەتی یەوە، وە ئەو هاوڕێیەتی پێغەمبەری ﷺ کردوە کە: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی هەینی خۆی ئەشۆری، لەپاشاندا ئەگەر دەست نوێژەکەی بشکایە خۆ شۆردنەکەی دووبارە نەئەکردەوە.

وە کاتی خۆشۆردن کۆتایی دێت بە کۆتایی هاتنی نوێژی هەینی، جا هەرکەس دووای نوێژی هەینی خۆی بشۆرێت، ئەو خۆشۆردنەی بە خۆشۆردنی هەینی بۆ ناژمێررێت، وە ئەوەی ئەو کارە ئەکات بە بەجێ هێنەری فەرمانی خوا دانانرێت، بەپێی ئەوەی ئیبنو عومەر خوا لێیان ڕازی بێت دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إِذَا جَاءَ أَحَدُكُم إِلَى الجُمُعَةِ فَلْيَغتَسِل) رواه الجماعة. واتە: هەرکەسێ لە ئێوە هات بۆ نوێژی هەینی با خۆی بشوات، وە لە ڕیوایەتی موسلیم دا بەم شێوەیە هاتووە: (إِذَا أَرَادَ أَحَدُكُم أن يَأْتِيَ الجُمُعَةَ فَلْيَغتَسِل). واتە: هەرکەسێك لە ئێوە ئەگەر ویستی بێ بۆ نوێژی هەینی با خۆی بشوات، وە (ابن عبدالبر) لەسەر ئەمە ئیجماعی نەقڵ کردووە.

٢- خۆشۆردن بۆ هەردوو جەژنەکان:-

زانایان بە (مستحب) پەسەندیان داناوە بۆ هەردوو جەژنەکە خۆ بشۆرێت، وە لەو بارەیەوە (حدیث)ێکی صەحیح نەهاتووە.

لە (البدر المنير)دا ئەفەرمووێت: ئەو (حدیث)انەی هاتوون دەربارەی خۆشۆردن بۆ هەردوو جەژن (ضعیف)ن، وە لەو بارەیەوە چەند (أثر)ێکی باش هەیە لە صەحابەوە.

٣- خۆشۆردنی کەسێك مردووی شۆردبێت:-

(مستحب)ە ئەگەر کەسێك مردوویەکی شۆری خۆی بشوات لای زۆر لە زانایان، بەپێی ئەوەی ئەبو هورەیرە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن غَسَّلَ مَيِّتاً فَلْيَغتَسِل، وَمَن حَمَلَهُ فَلْيَتَوَضَّأ) رواه أحمد وأصحاب السنن وغيرهم. واتە: هەرکەس مردوویەکی شۆری با خۆی بشوات، وە هەرکەس هەڵی گرت با دەست نوێژ بگرێت.

پێشەواکان تانەیان لە سەنەدی ئەم (حديث)ە داوە، عەلی کوڕی مەداینی و ئەحمەد و ئیبنو مونذیر و رافیعی و چەند کەسی تر فەرموویانە: زانایانی (حديث) لەم بەشەدا هیچ (حديث) ێکیان بە صەحیح دانەناوە.

بەڵام (حافظ) ئیبنو حەجەر دەربارەی ئەم (حديث)ە دەفەرمووێت: (ترمذي) بە حەسەنی داناوە، وە ئیبنو حیببانیش بە صەحیح، وە حەدیسەکە (بە زۆری ڕێگاکانی) کەمترین حاڵەتی ئەوەیە کە حەسەن بێت. کەواتە ئینکار کردنی ئەوەوی لە تەحسین کردنەکەی (ترمذي) بەرپەرچ دراوەتەوە. (ذهبي) دەفەرمووێت: ڕێگاکانی ئەم (حديث)ە بەهێزترە لە چەند (حديث)ێك کە زانایان بەڵگەیان پێ هێناوەتەوە، وە ئەو فەرمانەی کە لەم (حديث)ەدایە لەسەر (ندب) پەسەندی دائەنرێت نەك وجوب، بەپێی ئەوەی لە عومەرەوە خوا لێی ڕازی بێت ریوایەت کراوە دەفەرمووێت: (ئێمە کاتێ مردوومان ئەشۆرێ هەمان بوو دوایی خۆی ئەشۆری و هەمان بوو خۆی نەئەشۆرێ) (خطیب) بە ئیسنادی صەحیح گێڕاویەتیەوە[1].

---

(١) بێ گومان کە ئیسنادەکەی صەحیحە، بەڵام هێنانی حەدیسەکە بە ووشەی (رُوِي) ـ ریوایەت کراوە ـ ناگونجێت لەگەڵ ئەوەی کە زانایانی (حديث) لەسەتري ڕێك کەوتون کە ووشەی (روي) و وێنەی ئەو تەنها (حديث)ی (ضعيف)ی پێ ئەهێنرێت.

وە دانەر لێرەدا چاودێری ئەم زاراوەیەی نەکردووە بێدەنگی لێ کردوە، هەر وەکو لە حەدیسەکەی پێشەوەشدا لە لاپەڕە (٤٤)دا هەروەهای کردوە.

لەپاشان ئەوە دانەر شوێن (حافظ) ئیبنو حەجەر کەوتووە کە لە (تلخيص)ەکەیدا ئەم حەدیسەی داوەتە پاڵ (خطیب) بە تەنها لە مێژوەکەیدا، وە ئەمەش وا ئەگەیەنێت کە (حديث)ەکە لای کەسێکی تر نەهاتوە کە پایەی بەرزتر بێت لە (خطیب)، وە کتێبەکەی ئەم مەشهورتر بێت لە کتێبەکەی ئیبنوحەجەر، بەڵام بەو شێوەیە نیە، چونکە (دارقطني)ش لە سونەنەکەیدا لاپەڕە (١٩١) تەخریجی کردوە. (تمام المنة).

وە كاتێك ئەسمای كچی عومەیس ئەبو بەكری مێردی شۆری خوا لێی ڕازی بێت كاتێ وەفاتی كردبوو هاتە دەرەوەو پرسیاری لە ئامادە بووان كرد ئەوانەی موهاجیر بوون ووتی: ئەمڕۆ زۆر ساردە و بەڕۆژووم ئایا پێویستە لەسەرم خۆم بشۆم ؟ ووتیان: نەخێر. مالیك گێڕاویەتی‌یەوە[1].

---

(١) جەزم كردنی دانەر بەمە كە ئەسما مێردەكەی شۆریوە.. تا كۆتایی. وا دەرئەخات بەسەرهاتەكە ئیسنادەكەی ڕاست بێت، بەڵام بەو شێوەیە نیە، چونكە سەنەدەكەی پچڕ پچڕی تێدایە. مالیك لە (الموطأ) دا (١/٢٢٢-٢٢٣) دەری هێناوە لە عبد اللهی كوڕی ئەبی بەكرەوە. وە ئەو عبداللهی كوڕی ئەبی بەكرە كوڕی ئەبی بەكری صدیق نیە وەك بە بیردا دێ، بەڵكو عبد الله ی كوڕی ئەبی بەكری كوڕی موحەممەدی كوڕی عەمری كوڕی حەزمی ئەنصاری‌یە، كە جێی باوەڕو پێشەوایە، وە مامۆستای مالیكە، بەڵام نەگەیشتوە بە ئەسماء، چونكە مردنی ئەسماء پێش ساڵی (٥٠ ك) بووە، بەڵام لە دایك بوونی عبد الله دووای ساڵی (٦٠ هـ) بووە وەك لە (التهذیب) دا هاتووەو لەجێی تریشدا.

جا ئەگەر ئەو (أثر)ە صەحیح بێت بەڵگەیە لەسەر پێویستی خۆشۆردن دووای شۆردنی مردوو وەكو بۆچوونی ئیبنوحەزمیشە، چونكە صەحابەكان تەنها لەبەر سەرمای توند فەتوایان بۆ داوە خۆی نەشوات لەگەڵ ئەوەشدا كە بەڕۆژوو بوە. (تمام المنة).

فائیدەیەك: لێرەدا چەند خۆشۆردنێكی (ثابت) هەیە، كە دانەر بۆ باسكردنی نەچووە، جا من بە سودم زانی كە لەبیری نەكەین:

یەكەم - خۆشۆردن بۆ هەموو سەرجێیی كردنێك، بە بەڵگەی حەدیسی ئەبی رافع كە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێكیان هەموو خێزانەكانی بەسەر كردەوە، لەلای ئەمو لەلای ئەو خۆی دەشۆری، ئەڵێ: ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا! بۆ یەكجار خۆت ناشۆیت؟ فەرمووی: ئەمە باشتر وخۆشتر و پاكترە، ئەبوداود و جگە لەویش گێڕاویانەتەوە بەسەنەدێكی حەسەن، هەر بۆیە لە صەحیحی ئەبی داوددا هێناومەتەوە، وە تیایدا باسی ئەوەم كردووە كە (حافظ) بەهێزی كردووە و كردوویەتی‌یە بەڵگەی ئەوەی كە باسمان كرد.

دوەم - خۆ شۆردنی ئافرەتی (مستحاضة) كە خوێنی نەخۆشی لێ دێت بۆ هەموو نوێژێك، یان بۆ نیوەڕۆو عەسر بە یەكەوە یەك غوسل، وە بۆ مەغریب و عیشا بە یەكەوە یەك غوسل، وە بۆ نوێژی بەیانی یەك غوسل، بە بەڵگەی حەدیسی عائیشە كە دەفەرموێت: ئومو حەبیبە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ تووشی (استحاضة) بوو، جا فەرمانی پێ دا كە بۆ هەموو نوێژێك خۆی بشوات... حەدیسەكە، وە لە ریوایەتێكی تردا هەر لەوەوە: ئافرەتێك لەسەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ تووشی (استحاضة) بوبو جا فەرمانی پێ كرا كە پەلە لە عەسر بكاتو نیوەڕۆ دووا بخات و بۆ هەردووكیان یەك غوسل بكات، و مەغریب دووا بخات وپەلە لە عیشا بكات و بۆ هەردووكیان یەك غوسل بكات، وە بۆ نوێژی بەیانی‌یەك غوسل بكات، وە سەنەدی ئەم ریوایەتە صەحیحە لەسەر مەرجی شەیخەین، وە ئەوەی یەكەمیان تەنها صەحیحە هەروەك لە (صحیح السنن) دا بە ژمارە (٣٠٠و٣٠٥) ڕوونم كردۆتەوە.

٤- خۆشۆردن بۆ ئیحرام بەستن:-

لای جەماوەری زانایان (مندوب) پەسەندە بۆ ئەو کەسەی کە بیەوێ ئیحرام ببەستێ بۆ حەج یا عومرە خۆی بشوات، بەپێی حەدیسی زەیدی کوڕی (ثابت) کە ئەگێڕێتەوە دەفەرمووێت: (پێغەمبەرم ﷺ بینیوە خۆی ڕووت کردۆتەوە بۆ ئیهلال کردن و خۆی شۆریوە). (دارقطني و بيهقي وترمذي) کە بە حەسەنی داناوە گێڕاویانەتەوە[1]، وە عوقەیلی بە (ضعیف) ی داناوە.

٥- خۆ شۆردن بۆ چوونە ناو مەککە:-

هەرکەس بیەوێ بچێتە ناو شاری مەککە (مستحب)ە خۆی بشۆرێت، بە پێی ئەوەی لە ئیبنو عومەرەوە خوا لێیان ڕازی بێت ڕیوایەت کراوە کە (نەئەچووە ناو شاری مەککە هەتاوەکو لە (ذی طوی) ڕۆژی نەکردایەتەوە، لەپاشاندا بە ڕۆژ ئەچووە ناو مەککەوە) وە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ ئەوەی کردووە. بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە. وە ئەمە لەفزی موسلیمە.

ئیبنو مونذیر دەفەرمووێت: کاتی چوونە ناو شاری مەککە خۆشۆردن (مستحب)ە لای هەموو زانایان، وە بە نەکردنی فیدیە پێویست نابێت لەلای زانایان، وە بەشی زۆریان ئەفەرموون: دەست نوێژ بری خۆشۆردن ئەکەوێت.

٦- خۆشۆردنی وەستان لە عەرەفە:-

هەرکەس بیەوێ لە عەرەفە بۆحەج بووەستێ (مندوب)ە خۆی بشوات بە پێی ئەوەی مالیك لە نافیعەوە ئەگێڕێتەوە کە (عبد الله) ی کوڕی عومەر خوا لێیان ڕازی بێت پێش ئەوەی ئیحرام ببەستێ خۆی ئەشۆری بۆ ئیحرام بەستن، و بۆ چوونە ناو مەککە، و بۆ وەستانی لە عەرەفە ئێوارەی عەرەفە.

---

سێیەم ـ خۆشۆردن دوای بێ هۆش بوون: بەبەڵگەی حەدیسی عائیشە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێ: پێغەمبەر ﷺ بورایەوە کاتێ نەخۆشی‌یەکەی، کە هۆشی هاتەوە فەرمووی: (خەڵکەکە نوێژیان کرد؟) ووتمان: نا، ئەوان چاوەڕێی تۆیانە ئەی نێرراوی خوا. فەرمووی: (ئاوم بۆ بکەنە دەفرەکەوە) عائیشە ئەفەرمووێ: ئێمەش وامان کردو خۆی شۆرد... تا کۆتایی حەدیسەکە.

چوارەم ـ خۆ شۆردن دووای ناشتنی بێ باوەڕ، چونکە عەلی کاتێ باوکی لە گۆڕ نا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بچۆ خۆت بشۆرە. (تمام المنة).

(١) ئەم حەدیسە حەسەنە وەك شێخ ئەلبانی دەفەرمووێت لە (إرواو الغليل) دا ژمارە (١٤٩).

## پایەکانی (غسل) خۆشۆردن

حەقیقەتی خۆشۆردنی شەرعی نایەتە جێ بە دوو شت نەبێت:

١- نیەت:-

لەبەر ئەوەی بە نیەت عیبادەت لە عادەت جیا دەکرێتەوە، وە نیەت کارێکی پەتی دڵە، ئەما ئەوەی خەڵك لەسەری ڕاهاتوون کە بە دەم نیەت ئەڵێن، ئەوە شتێکی پەیدا بووەو شەرعی نیە، پێویستە وازی لێ بهێنرێت، وە لە باسی دەست نوێژدا قسەمان کردووە لەسەر حەقیقەتی نیەت.

٢- شۆردنی هەموو ئەندامەکانی لەش:-

بە پێی فەرمانی خوای گەورە کە ئەفەرمووێت: ﴿وَإِن كُنتُمْ جُنُبًا فَاطَّهَّرُوا﴾ (مائدة/٦) واتە: کاتێ لەشتان گران بوو خۆتان پاك بکەنەوە خۆتان بشۆن.

هەروەها ئەوەی ئەفەرمووێت: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُوا النِّسَاءَ فِي الْمَحِيضِ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ﴾ (البقرة/٢٢٢). واتە: دەربارەی حەیز پرسیارت لێ ئەکەن بڵێ ئەوە زیان و چەپەڵیە، جا لە کاتی حەیزا لە ژنان دووری بکەن و مەچنە لایان و نزیکیان مەکەن تا پاك ئەبنەوە، واتە: تا خۆیان ئەشۆرن.

وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە مەبەست لە (تطهر) خۆشۆردنە ئەوەیە کە بەڕاشکاوی لەم ئایەتەدا هاتووە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَقْرَبُوا الصَّلَاةَ وَأَنتُمْ سُكَارَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ حَتَّىٰ تَغْتَسِلُوا﴾ (النساء/٤٣). واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە بە سەرخۆشی نزیکی نوێژ مەکەونەوە هەتا ئاگاتان لە خۆتان بێ و بزانن چی ئەڵێن، وە نزیکی نوێژو جێگەی نوێژ کە مزگەوتە مەبنەوە بە لەشی گرانەوە هەتا خۆتان ئەشۆن، مەگەر بە پەلە تێیدا تێپەڕن. حەقیقەتی خۆشۆردنیش شۆردنی هەموو ئەندامەکانی لەشە.

**سوننەتەکانی خۆشۆردن:**

سوننەتە بۆ ئەو کەسەی کە خۆی ئەشۆرێ ئاگاداری سوننەتەکانی پێغەمبەر بێت ﷺ لە خۆشۆردنەکەیدا و بەم جۆرە دەست پێ بکا:

١- هەردوو دەستی سێ جار بشوات.

٢- لەپاشاندا شوێنی شەرمی بشوات.

٣- لەپاشاندا دەست نوێژێکی تەواو بگرێت وەك چۆن دەست نوێژ بۆ نوێژ ئەگرێت، وە بۆی هەیە شۆردنی هەردوو پێی دووا بخات هەتا لەشی ئەشۆرێ.

٤- پاشان سێ جار ئاو بکات بە سەریا و دەست بخاتە نێوان مووەکانی سەری بۆ ئەوەی ئاو بگاتە بەینی مووەکان و تەڕ بێن.

٥- ئینجا ئاو بکات بەسەر هەموو لەشیدا و لای ڕاست پێش بخات لە شۆردندا دوایی لای چەپ و باش دەست بخات لە بن هەردوو باڵی و ناوی هەردوو گوێچکەکانی و ناوکی، وە دەست بخات لەنێوان پەنجەکانی هەردوو پێی، وە هەروەها ئەو شوێنانەی لەشی کە ئەتوانێ دەستیان لێ بخات.

وە ئەصڵی هەموو ئەمانە ئەوەیە عائیشە خوای لێ ڕازی بێت گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ خۆی بۆ لەش گرانی ئەشۆری لەسەرەتاوە هەردوو دەستی ئەشۆری، لەپاشاندا بە دەستی ڕاستی ئاوی ئەکرد بە دەستی چەپیداو شەرمگەی ئەشۆری، پاشان دەست نوێژێکی ئەگرت وەك ئەوەی دەست نوێژی بۆ نوێژ ئەگرت، لەپاشاندا ئاوی ئەکرد بەسەریا و دەستی ئەخستە بنی مووەکانی سەری هەتا دڵنیا ئەبوو لەوەی بنی مووەکان بە تەواوی تەڕ بوون، لەپاشاندا سێ لەوێچ ئاوی ئەکرد بەسەریا، ئینجا ئاوی ئەکرد بەسەر باقی لەشیا. بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە.

وە لە ریوایەتێکی تریاندا هاتووە (لەپاشاندا دەستی ئەخستە ناو قژی سەری هەتا دڵنیا ئەبوو کە پێستی سەری تەڕ بووە ئینجا سێ جار ئاوی ئەکرد بەسەریا).

وە هەر لە بوخاری و موسلیمەوە هاتووە لە عائیشەوە کە دەفەرمووێت: (پێغەمبەر ﷺ کاتێ خۆی بشۆردایە بۆ لەش گرانی داوای هەندێ ئاوی ئەکرد و ئاوی ئەکردە لەپی دەستی و لای ڕاستی سەری ئەشۆری و لەپاشاندا لای چەپی ئینجا بە مستی ئاوەکەی ئەکرد بەسەریا).

وە لە (میمونة)وە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە کە دەفەرمووێت: (ئاوم دانا بۆ پێغەمبەر ﷺ خۆی پێ بشوات، ئاوی کرد بە دەستەکانیدا و دوو یان سێ جار شۆردنی، پاشان بە دەستی ڕاستی ئاوی کرد بەلای چەپی دا و شەرمگەی شۆری و لەپاشاندا دەستی خشان بە زەویدا، پاشان ئاوی لە دەمی ڕادا و بە لووت ئاوی هەڵمژی و فمی کردەوە، پاشان دەم وچاو و هەردوو دەستی شۆری، پاشان سێ جار ئاوی کرد بەسەریا، ئینجا ئاوی کرد بە لەشیا، لەپاشاندا لە شوێنەکەی هاتە ئەم

لاوە و ئاوی کرد بە هەردوو پێ ی دا، (عائیشە) دەفەرمووێت: پارچە قوماشێکم بۆ هێنا خۆی پێ ووشك بکاتەوە نەی ویست، وە بە دەستی ئاوەکەی لە خۆی کردەوە) (جماعة) گێڕاویانەتەوە.

## خۆشۆردنی ئافرەت

خۆ شۆردنی ئافرەتیش وەك خۆشۆردنی پیاوە، بەڵام ئەوەی تێدا هەیە ئافرەت واجب نیە لەسەری پرچەکانی بکاتەوە مادام ئاو بگاتە بنی مووەکان، بە پێ ی حەدیسی ئومو سەلەمە خوا لێی ڕازی بێت، کە (ئافرەتێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا! من ئافرەتێکم قژی خۆم ئەکەم بە پرچ و ئەی‌بەستم ئایا ئەبێت بۆ خۆشۆردن بی‌کەمەوە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوەندەت بەسە سێ مشت ئاو بکەیت بەسەرتداو، لەپاشاندا ئاو بکەیت بەسەر هەموو لەشدا بەوە پاك ئەبیتەوە) ئەحمەدو موسلیم و (ترمذي) گێڕاویانەتەوە. وە (ترمذي) دەفەرمووێت: (حدیث) ێکی حەسەن و صەحیحە.

وە لە عوبەیدی کوڕی عومەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: (گەیشتەوە عائیشە کە عبد الله ی کوڕی عومەر فەرمان بە ژنان ئەکا بۆ خۆشۆردن پرچەکانیان بکەنەوە، فەرمووی: ئای چەندە سەیرە ئیبنو عومەر، فەرمان بە ژنان ئەدا کاتێ خۆیان شۆری پرچەکانیان بکەنەوە، ئایا فەرمانیان پێ نادا کە سەریان بتاشن؟ من خۆم لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ لە تەشتێکدا خۆمان ئەشۆری و لە سێ جار زیاتر ئاوم نەئەکرد بەسەرما) ئەحمەد و موسلیم گێڕاویانەتەوە.

(مستحب)ە بۆ ئافرەت ئەگەر بۆ حەیز یا زەیستانی خۆی شۆری پارچە لۆکەیەك یا شتێکی تر بگرێت و میسك یا بۆنێکی خۆشی لێ بدا و شوێنی خوێنەکەی پێ بسڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەو شوێنە بۆنی خۆش بێت و بۆنە ناخۆشەکەی خوێنەکەی لێ ببێتەوە.

لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتوە دەفەرمووێت: (ئەسمائی کچی یەزید پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کردووە دەربارەی خۆشۆردن لە حەیز، ئەویش فەرمووی: هەرکەس لە ئێوە ئەو کارەی کرد با ئاوو سیدرەکەی ئامادە بکات، لە پێشەوە بە چاکی دەست نوێژێك بگرێت، پاشان ئاو بکات بەسەریاو بە دەست هەڵی گلۆفێ بە توندی هەتا ئاو ئەگاتە بنی مووەکان، لەپاشاندا ئاوێ بکات بەسەریدا، لەپاشان پارچە لۆکەیەکی مسکاوی کراو بێنێ خۆی پێ پاك بکاتەوە) ئەسماء فەرمووی: چۆن خۆی پێ پاك بکاتەوە ؟ فەرمووی: (سبحان الله، خۆتی پێ پاك بکەرەوە) جا عائیشە وەك بلێ ی ئەمە بشارێتەوە فەرمووی: شوێنی خوێنەکەی پێ پاك بکەرەوە، وە پاشان دەربارەی خۆشۆردن بۆ لەش گرانی پرسی، فەرمووی: (ئاو ئامادە بکە باش دەست نوێژی پێ بگرە، پاشان ئاو بکە بە سەرتا و دەستی لێ بخە هەتا ئاو ئەگاتە بنی مووەکانی سەرت لەپاشاندا

ناوی پێدا بکە) عائیشە فەرمووی: (چاکترین ئافرەت ئافرەتی ئەنصارن شەرم ڕێی لێ نەگرتن کە شارەزایی پەیدا بکەن لە دیندا) رواه الجماعة إلا الترمذي[1].

چەند بابەتێك کە پەیوەندی هەیە بە خۆشۆردنەوە:

١- یەکجار خۆشۆردن بۆ حەیز و لەش گرانی بەسە، وە هەروەها بۆ جومعە و جەژن، یا بۆ لەش گرانی و جومعە ئەگەر نیەتی هەردووکیان بێنێ، بە پێی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (وَإِنَّمَا لِكُلِّ إمرِئٍ مَا نَوَى). واتە: وە هەرکەس نیەتی چی هەبێت لەکارێکدا تەنها پاداشتی ئەوەی بۆ ئەبێت[2].

---

(١) ئەمە دوو گومانی لەسەرە: یەکەم ئەو کۆمەڵەی باسی ئەکات ئەو فەرموودەیەیان بە تەواوی نەگێڕاوەتەوە بەڵکو بەو شێوەیە موسلیم و ئەبو داود و ئیبنو ماجە و ئەحمەد (٦/١٤٧-١٤٨) گێڕاویانەتەوە، بەڵام باقی کۆمەڵەکە کە بوخاری و نەسائین تەنها بەشی یەکەمی (حدیث)ەکەیان تەخریج کردوە بێ ئەوەی پرسیار لەبارەی خۆشۆردنی لەش گرانی تێدا بێت. هەر ئەوەندەش لە (المنتقى) دا هاتووە (١/٢١٧-٢١٨) کە شەوکانی شەرحی کردووە، بۆ ریوایەتی جەماعەت بێجگە لە (ترمذي)، وە بوخاری بەشی دووەمی قسەکەی عائیشەی کە لە ئاخری حەدیسەکەدایە: (نعم النساء...)ی بە موعەللەقی ریوایەت کردووە، (حافظ) لە شەرحەکەیدا (١/١٨٤) ئەفەرموێت: (ئەو تەعلیقە موسلیم وەصلی کردوە.. لە عائیشەوە لە حەدیسێکدا کە سەرەتاکەی کە (ئەسمائی کچی یەزیدی ئەنصاری پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ لەبارەی خۆشۆردنی ئافرەتی بێ‌نوێژ...)، جا ئەمە گومانی گێڕانەوەی حەدیسەکە بە گشتی بۆلای بوخاری دەرئەخات، وە شیخ مەحمودی سەبوکیش تووشی ئەو وەهمە بووە لە (الدين الخالص)دا (١/٣١٣) لەوە ئەچێ هەردوکیان تەقلیدی غەیری خۆیان کردبێت.

دووەم: لای هیچ کەس لەوانەی (حدیث)ەکەیان بە درێژی یا بە کورتی گێڕاوەتەوە نەهاتووە کە پرسیار کەر ئەسمائی کچی یەزید بێت، بەڵکو بە ئەسماء هاتووە بێ ئەوەی ناوی باوو باپیری هاتبێ وە هەندێکیان هەر ناوەکەشی نەهێناوە، لای موسلیم نەبێت (١/١٨٠) بەناوی ئەسمائی کچی شەکەل ناوی بردوە، وە ئەوەی (حافظ) هێناویەتی لە موسلیمەوە بە ئەسمائی کچی یەزیدی ئەنصاری گومانیکە لە (حافظ)ەوە ـ ڕەحمەتی خوای لێ بێ ـ وە لەوانەیە دانەر لەوەوە تووشی ئەو وەهمە بووبێت. پاشان (حدیث)ەکە دەری ئەخات کە خۆشۆردن بۆ بێ‌نوێژی و خۆ شۆردن بۆ لەش گرانی جیاوازن لە یەك، بۆ بێ نوێژی ئەبێت زۆر دەست لە خۆی بخات، بەڵام بۆ لەش گرانی بەو شێوەیە نیە، وە بۆ خۆشۆردنی بێ نوێژی ئەبێ پرچ بکرێتەوە، بۆ لەش گرانی پێویست نیە. (تمام المنة).

(٢) وەك بۆم ڕوون بۆتەوە یەك غوسل بری ناکەوێ، بەڵکو غوسلێکی سەربەخۆ پێویستە بۆ هەریەك لەوانەی کە پێویستە خۆی بۆ بشۆرێت، بۆ نموونە ئەگەر کەسێك بێ نوێژ بێت و لەشی گران بێت، ئەبێ دووجار لەسەریەك خۆی بشۆرێت، هەریەکەیان بە تەنها واجبە. (تمام المنة).

٢- ئەگەر كەسێك بۆ لەش گرانی خۆی شۆری و دوایی دەست نوێژی نەگرت، ئەوە ئەو خۆشۆردنە بری دەست نوێژیش ئەكەوێ، عائیشە دەفەرموورێت: (پێغەمبەر ﷺ دووای خۆشۆردن دەست نوێژی نەئەگرت).

وە لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێت هاتووە كە بە پیاوێكی فەرموو: (تۆ شت قوڵ ئەكەیتەوە، كاتێك پیاوەكە پێی ووت: من دووای خۆ شتن دەست نوێژ ئەگرمەوە).

ئەبوبەكری (ابن العربي) دەفەرموورێت: زانایان لەوەدا ئیختلافیان نیە كە دەست نوێژ ئەچێتە ناو خۆشۆردنەوە، وە نیەتی خۆ پاك كردنەوە لە لەش گرانی دێت بەسەر خۆ پاك كردنەوە لە بێ دەست نوێژیشداو بێدەستنوێژیەكەی ناهێڵێ، چونكە ڕێگرەكانی لەش گرانی زۆرترن لە ڕێگرەكانی بێ دەست نوێژی، كەواتە كەم ئەچێتە ناو زۆرەوە، وە نیەتی گەورەكە بچوكەكەش ئەگرێتەوە[1].

٣- دروستە لەش گران و بێ نوێژ موو لە خۆیان بكەنەوە و نینۆك بكەن و بچن بۆ بازاڕ و گەلێ شتی تر بێ ئەوەی كەراهەتی هەبێ. (عطاء) فەرمویەتی: لەشگران كەڵەشاخ ئەگرێ و نینۆك ئەكاو سەری ئەتاشێ، با دەست نوێژیشی نەگرتبێ. بوخاری ریوایەتی كردوە.

٤- هیچی تێدا نیە چوون بۆ حەمامی دەرەوە ئەگەر ئەو كەسە پارێزراو بێت لەوەی سەیری عەورەتی بكرێت، وە لەوەی چاوی بە عەورەتی كەسانی تر بكەوێت[2]، ئەحمەد دەفەرموورێت: ئەگەر

(١) كردنی ئەمانە بە بەڵگە چاو پیا خشاندنی ئەوێت چونكە (حدیث)ەكەی عائیشە ئەوەی تێدا نیە كە ئایا پێغەمبەر ﷺ پێش خۆشۆردنەكە دەست نوێژی گرتووە یان نا؟ وە ئەسەرەكەی ئیبنوعومەریش (موقوف)ە، وە ئەگەر ڕاستیش بێت بەڵگەی تێدا نیە، پاشان مەبەست لەو ئەسەرە هەر ئەوەیە كە لە حەدیسەكەدایە ئەویش ئەوەیە كە سوننەت وایە دەستنوێژ لە پێش خۆشۆردندا بگیرێت نەك لە دوایەوە، بە بەڵگەی حەدیسەكەی تری عائیشە كە فەرموی : پێغەمبەر كاتێ خۆی بۆ لەشگرانی بشۆردایە لە سەرەتاوە هەردو دەستی ئەشۆری و دەست نوێژی ئەگرت وەك ئەوەی دەستنوێژی بۆ نوێژ ئەگرت، پاشان خۆی ئەشۆری... تا كۆتایی حەدیسەكە. موسلیم و بوخاری و جگە لەوانیش تەخریجیان كردوە. وە ئەوەی ئەبوبەكری (ابن العربي) ووتوویەتی وانیە، بەڵكو زانایان ئیختلافیان هەیە لەوەدا، ئەو قسەیەی بەپێی زانستی خۆی بووە. سەیری (المحلى) (٢/٢٨) بكە. (تمام المنة).

(٢) ئەم قسەیە بە گشتی وا دەر ئەخات كە بۆ ژن و پیاو هەیە بچنە گەرماوی دەرەوە، بەڵام وا نیەیە، چونكە چوون بۆ گەرماوی دەرەوە حەرامە لەسەر ژنان بەپێی فەرموودەی: (مَن كَانَ يُؤمِنُ بِاللهِ وَاليَومِ الآخِرِ فَلا يَدخُلِ الحَمَّامَ إلا بِمِأزَرٍ، وَمَن كَانَ يُؤمِنُ بِاللهِ وَاليَومِ الآخِرِ فَلا يُدخِلْ حَلِيلَتَهُ الحَمَّامَ) رواه الترمذي وحسنه وله شواهد كثيرة. واتە: هەركەسێ باوەڕی بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە بە بە پشتەماڵەوە نە بێت نەچێتە حەمام ـ ی گشتیەیە ـ وە، و

زانیت هەرچی لەناو حەمامدایە پەشتە ماڵی پێویە بچۆ، ئەگینا نەچیت، وە لە (حدیث)دا هاتووە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا يَنظُرِ الرَّجُلُ إِلَى عَورَةِ الرَّجُلِ وَلا تَنظُرِ المَرأَةُ إِلَى عَورَةِ المَرأَةِ) واتە: نابێت پیاو سەیری عەورەتی پیاو بکات، و نابێ ژن سەیری عەورەتی ژن بکات.

وە لە حەمامدا یادی خوا کردن هیچی تێدا نی‌یە، چونکە یادی خوا کردن لە هەموو حاڵەتێکدا چاکە مادام ڕێگرێك نەبێ مەنعی بکا، وە پێغەمبەر ﷺ لە هەموو کاتێکدا یادی خوای کردووە.

٥- خۆ ووشك کردنەوە بە خاولی و شتی تر هیچی تێدا نیە لە خۆ شۆردن و دەست نوێژ گرتن دا بە هاوین و بە زستان.

٦- دروستە پیاو بەو ئاوەی کە لە ئافرەت ئەمێنێتەوە خۆی بشوات و بە پێچەوانەشەوە دروستە، وە هەروەها دروستە بۆ ژن و مێرد بە یەکەوە خۆیان بشۆرن لەسەر تەشتێك، ئیبنو عەبباس دەفەرموێت: یەکێك لە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ لەسەر تەشتێك ئاو خۆی شۆری، پێغەمبەر ﷺ هات دەست نوێژ لە ماوەکەی بگرێت یا خۆی بشوات ، ئەویش پێی ووت: ئەی نێرراوی خوا ! لەشم گران بوو کە خۆم شۆری لێی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (إِنَّ المَاءَ لا يَجنُبُ). واتە: خۆ ئاوەکە پیس نابێت. ئەحمەد و ئەبو داود و نەسائی و (ترمذي) گێڕاویانەتەوە و (ترمذي) دەفەرموێت: (حسن صحيح).

وە عائیشەو پێغەمبەر ﷺ خۆیان لەسەر تەشتێك شۆردووە و پێش برکێیان کردووە هەتا پێغەمبەر ﷺ بە عائیشەی فەرمووە: ئاوم بۆ بهێڵەرەوە، وە ئەویش بە پێغەمبەری ﷺ ئەووت: ئاوم بۆ تێدا بهێڵەرەوە.

٧- خۆ شۆردن و خۆ ڕووت کردنەوە دروست نی‌یە لەناو خەڵکیدا، چونکە دەرخستنی عەورەت حەرامە، ئەگەر بە کراسێك یا بە قوماشێك خۆ داپۆشرێت ئەوە ئەو کاتە قەیناکە. (فاطمة) بە پارچە قوماشێك بەری پێغەمبەری ﷺ ئەگرت، ئەویش خۆی ئەشۆری. بەڵام ئەگەر دوور لە خەڵك خۆ بشۆررێت بە ڕووتیش هیچی تێدا نی‌یە.

چونکە موسا علیه السلام بە ڕووتی خۆی شۆریوە وەك بوخاری گێڕاویەتی‌یەوە.

ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێت ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لەکاتێکدا ئەیوب (عليه السلام) بە ڕووتی خۆی ئەشۆری کوللەی زێڕی بەسەردا ئەباری ئەویش کۆی ئەکردەوە و ئەی خستە ناو جلەکانی، پەروەردگاری بانگی لێ کرد: ئەی ئەیوب ! مەگەر دەوڵەمەندم

هەکەسێك کە باوەڕی بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە با خێزانەکەی نەباتە حەمام ـ ی گشتی و دەر لە ماڵەکەیە ـ وە (تمام المنة).

نەکردووی لەوەی ئەی بینی ؟ ئەویش فەرمووی: بەڵێ بە گەورەیی تۆ قەسەم، بەڵام لە بەرکەتی تۆ بێ نیاز نابم) ئەحمەد و نەسائی و بوخاری گێڕاویانەتەوە.

## تەیەمموم

١- پێناسە کردنی تەیەممومم:

مانای تەیەممومم لە لۆغەتدا: یەعنی ڕوو تێکردن، یان قەصد کردن، وە لە شەرعدا: یەعنی ڕوو تێ کردن، یان قەصد کردن بۆلای خاك بۆ مەسح کردنی ڕوخسار و هەردوو دەست بە مەبەستی ئەوەی نوێژکردن و وێنەی نوێژ کردن ڕەوا بکرێت.

٢- بەڵگەی شەرعیەتی تەیەممومم:

شەرعی‌یەتی تەیەممومم بەپێی قورئان و سوننەت و ئیجماع ساب بوە.

ئەما بە پێی قورئان ئەم ئایەتەیە کە ئەفەرموێت: ﴿وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ أَوْ لَـٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمْ تَجِدُوا۟ مَآءً فَتَيَمَّمُوا۟ صَعِيدًا طَيِّبًا فَٱمْسَحُوا۟ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا غَفُورًا﴾ (النساء/٤٣). واتە: ئەگەر نەخۆش بوون یا لە سەفەردا بوون، یا کەسێکتان چوویتە سەر پێشاو یا چوونە لای خێزانەکانتان و ئاوتان دەست نەکەوت (بۆ دەست نوێژ گرتن یا خۆ شتن) ڕوو بکەنە گڵ و خۆڵێکی خاوێن، جا مەسحی ڕوخسار و هەردوو دەستانی پێ بکەن، بەڕاستی خوا هەمیشە لێ بوردە و لێ خۆش بووە.

ئەما بەپێی سوننەت (حدیث)ەکەی ئەبو ئومامەیە کە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (زەوی هەمووی بۆ حۆم و بۆ ئوممەتەکەم کراوە بە خاوێن کەرەوەو مزگەوت، جا هەرکاتێك کاتی نوێژ هات پیاو خاوێن کەرەوەی خۆی لایەتی) ئەحمەد گێڕاویەتی‌یەوە.

ئەما بە پێی ئیجماع چونکە هەموو موسڵمانان لەسەر ئەوە کۆن کە تەیوممومم شەرعی‌یە، وە دانراوە لە جیاتی دەست نوێژ و خۆشۆردن لە چەند حاڵەتێکی تایبەتیدا.

٣- تایبەتمەندی ئەم ئوممەتە بە تەیەممومەوە:

تەیەمموم کردن یەکێکە لەو شتانەی کە خوا ئەم ئوممەتەی تایبەت کردووە پێیەوە، لە جابیرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە کە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أُعطِيتُ خَمساً لَم يُعطَهُنَّ أحَدٌ قَبلِي، نُصرتُ بِالرُّعبِ مَسيرَةَ شَهرٍ، وَجُعِلَت لِيَ الأرضُ مَسجِداً وَطَهوراً، فَأيُّما رَجُلٍ مِن أُمَّتِي أدرَكَتهُ الصَّلاةُ فَلِيُصَلِّ، وَأُحلَّت لِي الغَنَائِمُ وَلَم تَحِلَّ لأحدٍ قَبلِي، وأُعطِيتُ الشَّفَاعَةَ، وَكَانَ النَّبِيُّ يُبعَثُ فِي قَومِهِ خَاصةً وبُعِثتَ إلى النَّاسِ عَامَّةً) رواه الشيخان. واتە: من پێنج شتم پێ بەخشراوە پێش من کەس پێی نەبەخشراوە، مانگە ڕێیەك دوژمن زیرەی کردووە لێم، وە زەویم بۆ کراوە بە مزگەوت و خاوێن کەرەوە، جا هەر پیاوێك لە هەرشوێنێك بوو کاتی نوێژی بەسەردا هات با نوێژەکەی بکات، وە تالآنی جەنگیم بۆ ڕەوا کراوە کە بۆ هیچ کەس پێش من ڕەوا نەکراوە، وە شەفاعەت کردنیشم پێ بەخشراوە، وە هەموو نێرراوەکانی پێش من بەتایبەتی بۆ نەتەوەکانی خۆیان نێرراون، بەلآم من بۆ گشت ئادەمیزاد نێرراوم.

٤- هۆی شەرعی‌یەت و دانانی تەیەمموم:

عائیشە خوای لێ ڕازی بێت ئەگێڕێتەوە دەفەرموێت: (لەگەڵ پێغەمبەردا بووین ﷺ لە سەفەرێکدا ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە چۆڵەوانیەك ملیوانکەکەم پچڕا، پێغەمبەر ﷺ مایەوە بۆ گەڕان بە دوایدا، خەڵکەکەش لەگەڵیا مانەوە، ئەو جێگایەش ئاوی لێ نەبوو خۆشیان ئاویان پێ نەبوو، خەڵکەکە چوونە لای ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ پێیان ووت: ئاگات لێ نیە عائیشە چی کرد، ئەویش هات بۆلام، لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ سەری کردبووە سەر ڕانم خەوتبوو چەندێ ویستی خوای لەسەر بوو لۆمەی کردم و قسەی پێ ووتم، و ئەی کوتایە بن دەستم منیش لەبەر پێغەمبەر ﷺ جوڵەم نەئەکرد، هەتا بەیانی پێغەمبەر ﷺ بێ ئاو خەوت، ئیتر خوا ئایەتی تەیەممومی ناردە خوارەوە، ئوسەیدی کوڕی (حُضَیر) فەرمووی: ئەمە یەکەم بەرەکەتی ئێوە نیە ئەی کەس‌وکاری ئەبوبەکر!! ئەفەرموێ: پاشان ئەو ووشترەی من سوواری بوبوم هەڵمان ساند سەیرمان کرد میلوانکەکەمی لە ژێردا بوو) رواه الجماعة إلا الترمذي.

٥- ئەو هۆیانەی تەیەمموم کردن ڕەوا ئەکەن:

تەیەمموم ڕەوایە بۆ ئەو کەسەی ڕووداوی گەورە -لەش گرانی- یا بچوکی -بێ دەست نوێژی- لێ ڕوو بدات، نیشتەجێ بێ یان لەسەفەردا بێ، ئەگەر هۆیەك لەم هۆیانەی خوارەوەی هەبوو:

أ- ئاوی دەست نەکەوت، یا ئاوی دەست ئەکەوت بەڵام بەشی دەست نوێژی نەئەکرد، بەپێی ئەو حەدیسەی عومرانی کوڕی حوصەین ڕەزای خوای لێ بێ ئەگێڕێتەوە دەفەرموێت: لە سەفەرێکدا لەگەڵ پێغەمبەردا بووین ﷺ کاتی نوێژ هات پێغەمبەر ﷺ نوێژی بە خەڵکەکە کرد، لەپاشاندا سەیری کرد پیاوێك دوورە پەرێز وەستاوە، فەرمووی: چ شتێك وای لێ کردیت نوێژ نەکەیت ؟

ووتی: لەش گرانیم بەسەردا هاتووەو ئاوم دەست ناکەوێت خۆمی پێ بشۆم، ئەویش ﷺ فەرمووی: ئاو دەرە خۆڵ خۆڵت بەسە. رواه البخاري ومسلم.

وە لە (أبي ذر)ەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إنَّ الصَّعِيدَ طَهُورٌ لِمَن لَم يَجِدِ المَاءَ عَشرَ سِنِينَ) رواه أصحاب السنن وقال الترمذي حسن صحيح. واتە: گڵو خۆڵ پاك کەرەوەیە بۆ ئەو کەسانەی ئاویان دەست ناکەوێت با دە ساڵیشی پێ بچێت.

بەڵام لەسەر ئەوکەسە پێویستە پێش ئەوەی تەیەمومەکە بکات داوای ئاو بکات لە دەور و بەر و هاوەڵەکانی یا ئەو شوێنانەی عادەتەن لێی نزیکن، جا ئەگەر دڵنیا بوو ئاوی دەست ناکەوێت، یا هەبوو بەڵام دوور بوو لێیەوە ئەوە واجب نیە لەسەری زیاتر داوای بکات.

ب- ئەگەر ئەو کەسە نەخۆش بوو یا برینێکی پێوە بوو، ترسا ئەگەر ئاو بەکار بهێنێ نەخۆشی- یەکەی زیاد بکات یا چاك بوونەوەی دووا بکەوێ بە تەجروبەی خۆی ئەوەی زانی یا پزیشکی جێی باوەڕ پێی ڕاگەیاند، بە پێی ئەوەی جابیر خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموێت: لە سەفەرێکدا دەرچووین پیاوێکمان بەردێك بەر سەری کەوت و برینداری کرد لەپاش ئەوە ئیحتیلام بوو، لە هاوەڵەکانی پرسی: ئایا ئێوە ئەڵێن ڕوخصەتم هەیە تەیەمموم بکەم ؟ ووتیان: ڕوخصەتت نیە چونکە ئاوت دەست ئەکەوێت، ئەویش خۆی شۆری و مرد، جا کاتێك گەڕانەوە لای پێغەمبەر ﷺ ئەو هەواڵەی پێ درا فەرمووی: (قَتَلُوهُ قَتَلَهُمُ اللهُ، ألا سَألُوا إذَا لَم يَعلَمُوا ؟ فَإنَّمَا شِفَاءُ العَيِّ السُّؤالُ، إنَّما كَانَ يَكفِيهِ أن يَتَيَمَّمَ وَيَعصُرَ، أو يَعصِبَ عَلَى جُرحِهِ خِرقَةً ثُمَّ يَمسَحَ عَلَيهِ وَيَغسِلَ سَائِرَ جَسَدِهِ) رواه أبو داود وابن ماجة والدارقطني وصححه ابن السكن. واتە: کوشتوویانە خوا بیان کوژێت، نەئەبوو پرسیار بکەن کە نەیان ئەزانی ؟ چونکە چارەی نەزانین پرسیار کردنە، ئەوەندەی بەس بوو تەیەمومی بکردایە ئینجا پارچە قوماشێکی ببەستایە بە برینەکەیەوە و مەسحی بکردایە، لەپاشان ئەندامەکانی تری لەشی بە ئاو بشۆردایە[1].

جـ – ئەگەر ئاو زۆر سارد بوو وە بۆی دەرکەوت بە بەکارهێنانی تووشی زیان ئەبێت بە مەرجێك بە کرێش نەی ئەتوانی گەرمی بکات، یا بۆی نەئەکرا بچێتە حەمام.

بەپێی حەدیسی عەمری کوڕی عاص ڕەزای خوای لێ بێ ئەگێڕێتەوە: کاتێك نێررا بۆ جەنگی (ذات السلاسل) ئەفەرموێ: شەوێکی زۆر سارد ئیحتلام بووم، ترسام ئەگەر خۆم بشۆم بمرم، پاشان

---

(١) ئەم (حديث)ە بەیهەقی و عەسقەلانی بە (ضعيف) یان داناوە بەڵام شایەتی هەیە لە (حديث)ی ئیبنو عەبباسەوە پێی ئەگات بە پلەی حەسەن، بەڵام ئەوەی تێدا نیە: (خرقەیەك ببەستێ بە برینەکەیەوە...) واتە باسی بەکارهێنانی خرقەکە (ضعيف و منكر) ە. (تمام المنة).

نوێژی بەیانیم بە هاوەڵەکانم کرد، کاتێك گەڕاینەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ بۆیان گێڕایەوە ئەویش فەرمووی: ئەی عەمر بە لەشی گرانەوە نوێژی بەیانیت بە هاوەڵەکانت کردووە؟ منیش ووتم: ئەم فەرموودەی خوای گەورەم کەوتەوە یاد: ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا﴾ (النساء/٢٩). واتە: بە دەستی خۆتان خۆتان مەکوژن چونکە بەڕاستی خوا بەرامبەر بە ئێوە میهرەبانە. بۆیە منیش تەیەمومم کرد و نوێژەکەم کرد، دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ پێ‌کەنی و هیچی نەفەرموو. ئەحمەدو ئەبو داودو حاکم و (دارقطني)و ئیبنوحببان گێڕاویانەتەوە، وە بوخاری بە موعەللەقی گێڕاویەتی‌یەوە.

وە ئەو بێ دەنگی‌یەی پێغەمبەر ﷺ ئیقرارە، ئیقراریش بەڵگەیە چونکە پێغەمبەر ﷺ ئیقرار ناکا لەسەر (باطل).

د- ئەگەر ئاو نزیك بوو لێوەی بەڵام ترسی گیان یا ماڵ یا شەرەف یا وون بوون لە هاوڕێی هەبوو، یا دوژمنێك کە لێی ئەترسا لەنێوان ئەو و ئاوەکەدا هەبوو، جا ئەو دوژمنە چ ئادەمی بێ یا شتی تر، یا ئەو کەسە زیندانی بوو، یا توانای دەرهێنانی ئاوەکەی نەبوو لەبەر نەبوونی ئامێری ئاو دەرهێنان، وەك دۆڵچەو پەت، چونکە لەم حاڵەتانەدا بوونی ئاو وەك نەبوون وایە، وە هەروەها کەسێك ئەگەر خۆی بشوات ترسی ئەوەی هەبێت خراپەیەکی بخرێتە پاڵ کە لێی بەری‌یە و تووشی زیانی ئەکات وەکو: ئەو کەسەی شەو لە ماڵی هاوڕێ‌یەکی ئەخەوێ کە ژنی هەیە و ئەو شەوە ئیحتیلام ئەبێ، ئەوە دروستە تەیەمووم بکات.

هـ – ئەگەر کەسێك ئاوی پێ بوو بەڵام لەو کاتەدا یا دوایی خۆی یا کەسانێکی تر پێویستی‌یان پێ‌ی هەبوو بۆ خواردنەوە، هەتا ئەگەر سەگێکیش پێویستی پێ‌ی هەبێ بە مەرجێك سەگەکە هار نەبێت کە زیان بە ئادەمیزاد بگەیەنێ، یا پێویستی بەو ئاوە هەبو بۆ هەویر شێلان یا چێشت لێنان یا بۆ لابردنی پیسی‌یەك کە شەرع عەفووی لێ نەداوە، ئەوە لەم حاڵەتانەدا بۆی هەیە تەیەمووم بکات و ئاوەکە بەکار نەهێنێ لەبەر ئەو شتانە.

ئیمامی ئەحمەد ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت دەفەرمووێت: چەندەها صەحابە تەیەمومیان کردووە، وە ئەو ئاوەی کە پێ‌یان بووە هەڵیان گرتووە بۆ خواردنەوە.

وە لە عەلی‌یەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە کە دەفەرمووێت: (ئەگەر پیاوێك لە سەفەردا بوو لەش گرانی بەسەردا هات ئاوێکی کەمی پێ بوو ترسی ئەوەی هەبوو ئەگەر خۆی بشوات ئاوی لێ

ببڕێ و تووشی تینوێتی ببێ، بۆی هەیە تەیەمموم بکات و خۆی بەو ئاوە نەشوات) (دارقطني) گێڕاویەتی‌یەوە.

ئیبنو تەیمی‌یە دەفەرمووێت: ئەگەر کەسێك دەست نوێژی بوو بەڵام تەنگاو بوو و ئاویشی لەلا نەبوو چاکتر وایە تەنگاوی‌یەکە لابەرێ و بە تەیەمموم نوێژ بکات و بەو دەست نوێژەوە نوێژ نەکات کە تەنگاوی لەگەڵایە.

و- ئەگەر توانایی بەکارهێنانی ئاوی هەبوو، بەڵام ترسی ئەوەی هەبوو هەتا ئەگاتە ئاوەکە دەست نوێژی پێ بشوات یا خۆی پێ بشۆرێت کاتی نوێژەکەی بەسەر بچێت، ئەوە تەیەمموم بکات و نوێژەکەی پێ بکات، وە گێڕانەوەشی لەسەر نیە[1].

(١) ئەوەی بۆ من ڕوون و ئاشکرا دەبێت پێچەوانەی ئەمەیە، چونکە ئەوەی (ثابت) و جێگیر بووە لە شەریعەتی ئیسلامدا ئەوەیە کە تەیەمموم کاتێك دروستە کە ئاو نەبێت، بە دەقی قورئان و سوننەتی پیرۆز ئەمەی بە بەرفراوانی باس کردووەو ڕێگای داوە بە تەیەمموم بۆ کەسێك کە نەخۆش بێت یان سەرمایەکی زۆر هەبێت وەك دانەر باسی لێوە کرد، بەڵام کوا بەڵگە لەسەر دروستی‌یەتی تەیەمموم لەگەڵ بوونی توانا بۆ بەکار هێنانی ئاو؟ ئەگەر ووترا: بەڵگە ترسی دەرچوونی کاتەکەیە، دەڵێم: ئەمە بەتەنها نابێت بە بەڵگە، چونکە ئەوکەسەی دەترسێ لە دەرچوونی کات دوو حاڵەتی بۆ هەیە و سێ‌هەمیان نی‌یە: یان ئەوەیە کاتەکەی لەسەر تەنگەوە بووە بە هۆی خۆی وتەمبەڵی خۆی، یان بە هۆیەك کە دەسەڵاتی نی‌یە وەك خەو و لەبیر چوونەوە، جا لەم حاڵەتی دووەمەدا کات لەو کاتەوە دەست پێ دەکات کە خەبەری بۆتەوە یان هاتۆتەوە بیری بە ئەندازەی ئەوەی کە نوێژەکەی تێدا جێ‌بەجێ بکات. هەروەك فەرمانی پێکراوە، بە بەڵگەی ووتەی پێغەمبەر ﷺ: (مَن نَسِيَ صَلاةً أو نَامَ عَنهَا فَكَفَّارَتُهَا أن يُصَلِّيَهَا إذَا ذَكَرَهَا) (أخرجه الشيخان وغيرهما واللفظ لمسلم) واتە هەرکەسێك نوێژێکی بیر چوو یان بەسەریدا خەوت کەفارەتەکەی ئەوەیە جێ بەجێی بکات ئەو کاتەی کە بیری کەوتەوە. ئەوەتا خوای گەورە کاتێکی تایبەتی داناوە بۆ ئەم عوزرە، جا ئەو ئەگەر نوێژی کرد بەو جۆرەی فەرمانی پێ کراوە، بۆ غوسلی یان بۆ دەست نوێژی ئاو بەکار دەهێنێت، ئیتر دەرچوونی کات هیچ ترسێك نی‌یە لەسەری، کەواتە (ثابت) بوو کە دروست نی‌یە تەیەمموم بکات، وەئەمە ئیختیاری (شيخ الإسلام) ە لە (الإختيارات) دا (ص١٢) وە لە (المسائل الماردينية ص٦٥) دا باسی ئەوە کراوە کە ئەمە مەزهەبی جومهورە.

ئەمما حاڵەتی یەکەم، ئاشکرایە کە ئەو لە ئەصلدا فەرمانی پێ کراوە بە بەکارهێنانی ئاو، وە ئەو نابێت تەیەمموم بکات، چونکە لەم حاڵەتەشدا پێویستە ئاو بەکار بهێنێ، جا ئەگەر فریای کاتی نوێژ کەوت ئەوە باشە، وە ئەگەر کاتی لە دەست چوو ئەوە لۆمەی کەس ناکات خۆی نەبێت، چونکە خۆی بۆتە هۆی ئەم سەرەنجامە، ئەم ڕەئی‌یەیە کە من پێی دڵنیا بوم و دڵمی پێ کراوەتەوە، هەرچەندە شيخ الإسلام وغەیری ئەمیش فەرموویانە: تەیەمموم بکات ونوێژەکەی بکات. والله أعلم.

٦- ئەو شتەی تەیەممومی پێ ئەکرێت:

دروستە بە گڵێکی خاوێن یا بە هەر شتێك کە لە ڕەگەزی زەوی بێت، وەك لم و بەرد و گەچ تەیەممومی بکرێت، بەپێی فەرموودەی خوای گەورە کە ئەفەرمووێت: ﴿فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا﴾ (مائدة/٦). واتە: تەیەممومی بکەن بە صەعیدێکی پاك. وە زانایانی زمانی عەرەبی یەکن لەسەر ئەوەی (صعید) یەعنی ڕووی زەوی جا چ گڵ بێ یا غەیری گڵ.

٧- چۆنیەتی تەیەممومی کردن:

ئەو کەسەی تەیەمموم ئەکات پێویستە لەسەری لەپێشدا نیەت بهێنێ. وە لەباسی دەست نوێژدا باسی نیەتمان کرد. لەپاشاندا (بسم الله) بکات، ئینجا هەردوو دەستی بکێشێ بە ڕوی زەوی پاکدا، پاشان دەم و چاو و هەردوو دەستی هەتا مەچەکی پێ مەسح بکا، وە لەم بارەیەوە لە (حدیث)ەکەی عەممار صەحیح ترو ئاشکراتر نەهاتووە کە دەفەرمووێت: تووشی لەش گرانی بووم، ئاوم دەست نەکەوت، خۆم لە خۆڵ وەردا و نوێژەکەم کرد، پاشان ئەوەم بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: (إنَّما كَانَ يَكفِيكَ هَكَذَا) رواه البخاري و مسلم. واتە: تەنها ئەمەت بەس بوو، ئەڵێ پێغەمبەر ﷺ هەردوو لەپی دەستی کێشا بە زەوی دا و فووی لێ کردن و مەسحی دەم و چاوو هەردو دەستی پێ کرد.

وە لە (لفظ) ێکی تردا هاتووە کە فەرموویەتی: (إنَّما كَانَ يَكفِيكَ أن تَضرِبَ بِكَفَّيكَ فِي التُّرَابِ ثُمَّ تَنفُخَ فِيهِمَا، ثُمَّ تَمسَحَ بِهِمَا وَجهَكَ وَكَفَّيكَ إلَى الرُّسغَينِ) رواه الدارقطني. واتە: ئەوەندەت بەس بوو هەردوو دەستت بکێشی بە زەوی دا و لەپاشاندا فوویان پێ دا بکەیت و مەسحی دەم و چاو و هەردوو دەستی پێ بکەیت هەتا مەچەك.

وە لەم فەرموودەیەدا ئەوەمان بۆ دەرئەخات کە تەنها یەك جار دەست دان بە زەوی دا بەسە و مەسح کردنی دەم و چاو و هەردوو دەست هەتا مەچەك بەسن لە تەیەمموم کردندا، وە سوننەتە بۆ ئەو کەسەی کە بە گڵ تەیەمموم ئەکات، دەستەکانی بتەکێنێ و فوویان پێدا بکات، و سەر و چاوی لە خۆڵ هەڵ نەکێشێ.

٨- ئەو کردەوانەی کە تەیەمموم ڕەوایان دەکات:

---

پاشان بۆچوونی شەوکانیم بینی وەك بڵێی بەلای ئەم بۆچوونەوە دەچێت کە من باسم کرد، جا بگەڕێوە بۆ (السیل الجرار ١/١٢٦-١٢٧). (تمام المنة).

تەیەممومیش جێی دەست نوێژ و خۆشۆردن ئەگرێت لەکاتی بێ ئاوی دا، لەبەر ئەوە هەر کردەوەیەك کە دەست نوێژ و خۆشتن ڕەوای بکات، تەیەممومیش ڕەوای ئەکات وەك: نوێژ کردن و دەست دان لە قورئان و شتی تر، وە هاتنی کاتی نوێژ مەرجی دروستی تەیەممووم نیە، بەڵکو پێش کاتی نوێژیش دروستە تەیەممووم بکرێت، وە ئەو کەسەی تەیەممووم ئەکات بۆی هەیە چەندە پێی خۆش بوو فەرز و سوننەت بەیەك تەیەممووم بکات، چونکە حوکمی تەیەممووم وەك حوکمی دەست نوێژ وایە، بە یەکسانی لە (أبوذر)ەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إِنَّ الصَّعِيدَ طَهُورُ الْمسلِمِ وَإِن لَم يَجِدِ المَاءَ عَشرَ سِنِينَ، فَإِذَا وَجَدَ المَاءَ فَلْيَمَسَّهُ بَشرَتَهُ فَإِنَّ ذَلِكَ خَيرٌ) رواه أحمد والترمذي وصححه. واتە: گڵ و خۆڵ خاوێن کەرەوەی موسڵمانە، با دە ساڵیش ئاوی چنگ نەکەوێت، بەڵام ئەگەر ئاوی چنگ کەوت بەکاری بهێنێ، چونکە ئەوە خێری تێدا هەیە.

٩- هەڵوەشێنەرەوەکانی تەیەممووم:-

هەرچی دەست نوێژ هەڵبوەشێنێت، تەیەممومیش هەڵئەوەشێنێت، چونکە تەیەممووم جێ گری دەست نوێژە، هەروەها پەیدا بوونی ئاویش هەڵیئەوەشێنێتەوە یا توانای بەکارهێنانی ئاو بۆ کەسێك کە توانای نەبووە.

بەڵام ئەگەر نوێژی کرد بە تەیەممووم، لەپاشاندا ئاوی چنگ کەوت، یا توانای بەکارهێنانی پەیدا بۆوە، پێویست نیە لەسەری نوێژەکە بکاتەوە، هەرچەندە کاتی ئەو نوێژەش بمێنێ، لە ئەبو سەعیدی خودریەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە دەفەرمووێت: (دوو پیاو چوونە سەفەرێك، کاتی نوێژ هات و ئاویان پێ نەبوو، هەردووکیان بە خۆڵێکی خاوێن تەیەممومیان کرد و نوێژەکەیان کرد، هێشتا کاتی ئەو نوێژە بەسەر نەچووبو ئاویان دەست کەوت، یەکێکیان بەو ئاوە دەست نوێژی گرت و نوێژەکەی کردەوە، ئەوی تریان نوێژەکەی نەکردەوە، کاتێ گەڕانەوە لای پێغەمبەر ﷺ ئەوەیان بۆ گێڕایەوە ئەویش بەوەیان کە نوێژەکەی نەگێڕابۆوە فەرمووی: (سوننەتت پێکاو نوێژەکەشت بری کەوتوە)، وە بەوەی تریان کە دەست نوێژی گرتبوو نوێژەکەی گێڕابۆوە فەرمووی: (تۆ دوو پاداشتت بۆ نووسراوە) ئەبو داود و نەسائی گێڕاویانەتەوە.

بەڵام ئەگەر هێشتا لە نوێژ نەبوبۆوە، ئاو و توانایی بۆ پەیدا بۆوە ئەوە دەست نوێژەکەی هەڵئەوەشێنێتەوە، وە پێویستە بە ئاو دەست نوێژ بگرێت و نوێژەکەی بکات بەپێی (حديث)ەکەی (أبو ذر) کە لە پێشەوە باس کرا.

وە ئەگەر لەش گرانێك یا حەیزدارێك کە حەیزەکەی تەواو بووە تەیەممومی کرد، بە هۆیەك لە هۆیەکانی ڕەوابوونی تەیەممووم و نوێژی کرد، واجب نیە لەسەری ئەو نوێژە بگێڕێتەوە، بەڵام واجبە لەسەری هەرکاتێك توانای بەکارهێنانی ئاوی هەبوو یا ئاوی دەست کەوت خۆی بشوات، بە پێی

ئەوەی (عمران) خوا لێی ڕازی بێت ئەگێڕێتەوە کە (پێغەمبەر ﷺ بەرنوێژی کرد بۆ خەڵکی کاتێ لە نوێژەکەی بووەوە سەیری کرد پیاوێك دوورە پەرێز وەستاوە و نوێژی لەگەڵ کۆمەڵەکەدا نەکرد فەرمووی: (فلان کەس چی نەی هێشتووە نوێژەکەت بکەیت لەگەڵ ئەم کۆمەڵەدا؟) ووتی: تووشی لەش گرانی بووم و ئاوم دەست نەکەوت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (بچۆ بە خۆڵ تەیەمموم بکە بەستە). لەپاشاندا (عمران) دەفەرموێت: کاتێ ئاویان چنگ کەوت پێغەمبەر ﷺ دەفرێ ئاوی دایە و فەرمووی: (بچۆ بیکە بەسەرتا) بوخاری گێڕاویەتیەوە.

## مەسح کردن بەسەر (جبیرة) برین پێچ و وێنەی برین پێچ

شەرعیەتی ئەم مەسح کردنە :

شەرعیە مەسح کردن بەسەر برین پێچ و لەفاف و وێنەی ئەم دووانە، کە ئەندامی برینداریان پێ ئەپێچرێ، بەپێی چەند (حدیث)ێك کە لەو بارەیەوە هاتوون، هەرچەندە ئەو (حدیث)انە (ضعیف)یشن، بەڵام چەند ڕێگایەکیان هەیە کە یەکتر بەهێز ئەکەن و وایان لێ ئەکەن چاك بن بۆ بەڵگە هێنانەوە لەسەر شەرعیەتی ئەو مەسح کردنە.

لەو (حدیث)انەش (حدیث)ی جابیرە کە ئەگێڕێتەوە: پیاوێك بەرد بەر سەری کەوت و سەری بریندار کرد، پاشان ئیحتیلام بوو، لە هاوڕێکانی پرسی ئێوە ئەڵێن: ڕوخصەت هەیە تەیەمموم بکەم ؟ ووتیان: بۆت نیە چونکە توانای بەکارهێنانی ئاوت هەیە، ئەویش خۆی شۆری و مرد، کاتێك گەڕاینەوە بۆ پێغەمبەریان ﷺ گێڕایەوە، فەرمووی: کوشتوویانە خوا بیان کوژێت نەئەبوو پرسیار بکەن کە نەیان ئەزانی؟ چونکە چارەی نەزان پرسیار کردنە، ئەوەندی بەس بوو تەیەممومی بکردایەو شتێکی ببێچایە لەبرینەکەی سەری و لەپاشاندا مەسحی بکردایەو ئەندامەکانی تری لەشی بشۆردایە. ئەبو داود و ئیبنو ماجەو (دارقطني) گێڕاویانەتەوەو ئیبنوسەکەن بە صەحیحی داناوە، وە بە صەحیحی لە ئیبنو عومەرەوە هاتووە کە مەسحی کردووە بەسەر برین پێچدا[1].

حوکمی ئەم مەسح کردنە:

واجبە مەسح بکرێ بەسەر برین پێچ و وێنەی برین پێچدا، لە دەست نوێژ گرتن و خۆ شۆریندا لە جیاتی شۆردن و مەسح کردنی ڕاستەوخۆی ئەندامە نەخۆشەکە.

(١) لە ڕاستی دا (حدیث) بە ڕێگای زۆر بەهێز نابێت ئەگەر لاوازیەکەی زۆر بوو، وە ئەو چوار (حدیث)ەی ئەکرێنە شاهید لێرەدا هەموویان لاوازن، تەنها ڕێگا بۆ ئەو مەسح کردنە ئەسەرەکەی ئیبنو عومەرە کە ئاکرێتە بەڵگەی شەرعی. (تمام المنة).

چ کاتێك ئەم مەسح کردنە واجبە؟:

هەرکەسێك برینێکی پێوە بێت یا شوێنێکی شکابێت و بیەوێ دەست نوێژ بگرێت یا خۆی بشۆرێت واجبە لەسەری ئەندامەکانی لەشی هەموو بشۆرێت، ئەگەرچی بۆ ئەم مەبەستە پێویستی بە گەرم کردنی ئاوەکەش بێت. جا ئەگەر ترسی زیانی هەبوو لە شۆردنی ئەندامە نەخۆشەکە، وەك ئەوەی ئەگەر بیشوات و ئاوی بەربکەوێت تووشی نەخۆشی ببێت، یا ئازاری زیاد کات، یا چاك بوونەوەی دووا بکەوێ، ئەوکاتە فەرزی شتنەکە ئەبێتە دەستی تەڕ پێدا هێنان، جا ئەگەر ترسی ئەوەی هەبوو تووشی زیان ببێ بەهێنانی دەستی تەڕ پێیدا، ئەوکاتە واجبە برینەکە بە پارچە قوماشێك بپێچێت، یا شوێنە شکاوەکە بە موشەمما بپێچێت بە مەرجێ لە ئەندامە نەخۆشەکە تێ نەپەڕێت لەبەر پێویستی بەستن نەبێت، ئینجا مەسحی بکات یەکجار بە شێوەیەك هەمووی بگرێتەوە، وە موشەمما یا برین پێچ مەرج نیە پێش بەستنیان دەست نوێژ هەبێ، وە کاتیشی بۆ نیە، بەڵکو هەمیشە لە دەست نوێژو خۆشۆردندا مەسح دەکرێت، مادام ئەو مەعزەرەتە هەبێ.

ئەو شتانەی مەسح کردن باتڵ ئەکەنەوە:

مەسح بەسەر برین پێچ یا لەفافدا باتڵ ئەبێتەوە ؛ ئەگەر بێت و ئەو برین پێچە یا ئەو لەفافە لەسەر برینەکە لاچوو، یا کەوتە خوارێ، یا نەکەوتە خوارێ بەڵام برینەکە چاك بۆوە.

کەسێك ئاوو گڵ و خۆڵی دەست نەکەوت چۆن نوێژ بکات؟!

ئەگەر کەسێك ئاوو ئەو شتانەی تەیەمومی پێ ئەکرێت چنگی نەکەوت، بەپێی حاڵی خۆی نوێژەکەی ئەکات و گێڕانەوەشی لەسەر نیە. بەپێی ئەوەی موسلیم لە عائیشەوە ئەگێڕێتەوە دەفەرموێت: (ملیوانکەیەکم لە (أسماء) بە ئەمانەت وەرگرت، لێم وون بوو، پێغەمبەر ﷺ کەسانێکی نارد بۆی بگەڕێن، لەو ماوەیەدا کاتی نوێژ هات ئەوانیش بەبێ دەست نوێژ نوێژەکەیان کرد. کاتێ گەڕانەوە بۆ پێغەمبەریان ﷺ گێڕایەوە. ئەوە بوو ئایەتی تەیەموم هاتە خوارەوە) ئوسەیدی کوڕی (حضیر) فەرمووی: خوا پاداشتت بداتەوە، سوێند بە خوا شتێك نەبووە تووشت بێ ئیللا خوا دەروەیەکی بۆت کردۆتەوە لەو شتە، و بۆ موسڵمانانیش کردوویەتی‌یە بەرەکەت.

ئەوەتا یارەکانی پێغەمبەر ﷺ کاتێ ئەو شتانەی بۆ دەست نوێژ و تەیەموم بەکار دێت لایان نەبوو بێ دەست نوێژ نوێژیان کرد، وە کاتێکیش بۆ پێغەمبەریان باس کرد ئینکاری لەو کارەیان نەکردو فەرمانی پێ نەکردن نوێژەکەیان بکەنەوە، ئیمام نەوەوی دەفەرموێت: ئەوە بەهێزترین وتەیە کە بەڵگە بێ بۆ دروستی کردنی نوێژ لەم حاڵەتەدا.

## حەیز

**١- پێناسەی حەیز:**

ئەصلی حەیز لە زمانی عەرەبیدا واتە: لەبەر ڕۆیشتن (سَیَلان) وە مەبەست لە حەیز لێرەدا ئەو خوێنەیە کە لە پێشی ئافرەتەوە دێتە دەرێ لەکاتی لەش ساغیدا، بەبێ هۆی منداڵ بوونی، یا پەردە دڕانی.

**٢- کاتەکەی:**

زۆر لە زانایان ڕایان وایە هەتا ئافرەت نەگاتە نۆ ساڵ لە تەمەن کاتی حەیزی نایات، جا ئەگەر پێش ئەو تەمەنە خوێنی بینی خوێنی حەیز نیە، بەڵکو خوێنی نەخۆشی و ناسازیيە، وە هیچ بەڵگەیەك نیە لەسەر ئەوەی کە حەیز لە تەمەنی ئافرەتدا کۆتاییەکی دیاری کراوی هەیەو تێیدا ئەوەستێ، وە هەرکاتێك پیرەژنێك لەو پیریەیدا خوێنی بینی ئەوە خوێنی حەیزە.

**٣- ڕەنگەکەی:**

مەرجە خوێنی حەیز لەسەر ڕەنگێك لەم ڕەنگە خوێنانەی خوارەوە بێت.

(أ) ڕەش: بەپێی حەدیسی (فاطمة)ی کچی ئەبی حوبەیش کاتێ تووشی حەیزی هەمیشەیی بوو، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (ئەگەر خوێنەکە خوێنی حەیز بوو ئەوە ڕەشە و ئەناسرێ، جا ئەگەر وابوو ئەو ماوەیە واز لە نوێژ کردن بهێنە، وە ئەگەر ڕەنگێکی تری هەبوو دەست نوێژ بگرە و نوێژ بکە چونکە ئەوە دەمارە) رواه أبوداود والنسائي وابن حبان والدارقطني[1].

(دارقطني) دەفەرمووێت: گێڕەرەوەکانی ئەم (حدیث)ە هەموو جێی باوەڕن، وە حاکمیش گێڕاویەتیەوە و دەفەرمووێت: لەسەر مەرجی موسلیم.

(ب) سوور: چونکە لە بنەڕەتدا ڕەنگی خوێن سوورە.

(جـ) زەرد: ئەویش جۆرە ئاوێکە بە ئافرەتدا دێتە خوارەوە وەك کێم وایە و زەردیيەکەی زۆرترە.

(د) لێڵ: ئەمیش لەنێوان سپێتی و ڕەشی دایە وەك ئاوێکی پیس، بەپێی ئەوەی عەلقەمەی کوڕی ئەبی عەلقەمە لە مەرجانەی دایکیەوە ئەگێڕێتەوە کە کارەکەری عائیشە بوو خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: ژنان لەناو قوتووەکانیاندا لۆکەیان ئەنارد بۆ عائیشە کە زەردی پێوە بوو ئەویش ئەی فەرموو: پەلە مەکەن هەتا لۆکەکە بە سپێتی ئەبینن. مالیك و موحەممەدی کوڕی حەسەن گێڕاویانەتەوەو بوخاری بە موعەللەقی.

---

(١) حەدیسەکە صەحیحە وەك شێخ ئەلبانی دەفەرمووێت لە (الإرواء) دا بە ژمارە (٢٠٤).

وە زەردایی و لێڵی کاتێ بە حەیز دائەنرێ کە لە ڕۆژانی حەیزا بوو، وە لە غەیری ڕۆژانی حەیزدا بە حەیز دانانرێت[1] بەپێی (حدیث)ی (أم عطیة) خوا لێی ڕازی بێت کە دەفەرمووێت: (ئێمە زەردایی و لێڵی دووای پاك بوونەوەمان بە هیچ نەئەزانی) ئەبو داود وبوخاری گێڕاویانەتەوە، وە بوخاری -دووای پاك بوونەوەی- باس نەکردووە.

٤- ماوەکەی:

لایەنی کەمی و زۆری حەیز دیاری ناکرێت، وە دەربارەی دیاری کردنی ماوەکەی شتێکی وا نەهاتووە کە بەڵگەی پێ بهێنرێتەوە. لەپاشاندا بۆ ئافرەتان کاتێك هەیە وەك عادەت لەسەری ئەڕۆن و ماوەکەی دیاری ئەکەن، بەپێی حەدیسی ئوم‌موسەلەمە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: (خۆی دەربارەی ئافرەتێك کە خوێنی لەبەر بڕوات بە هەمیشەیی پرسیاری کردووە لە پێغەمبەر ﷺ ئەویش فەرمووبەتی: (با تەماشای ماوەی ئەو شەوو ڕۆژە بکات کە ئەو لە هەر مانگێکدا تووشی حەیز ئەبوو تێ‌یاندا، جا بە ئەندازەی ئەو ماوەیە با نوێژ نەکات، وە کە ئەو ئەندازەیە ڕۆیشت با خۆی بشوات و پارچە پەڕۆیەك بە خۆیەوە هەڵگرێ و نوێژ بکات) رواه الخمسة إلا الترمذي.

---

(١) ئەم (مرجانة)یە کەس بەهێزی نەکردووە جگە لە ئیبنوحیببان نەبێت، بەڵام (عمرة)ش شوێن ئەم کەوتوەو مانای ئەم حەدیسەی هێناوە لە عائیشەوە، بەیهەقی تەخریجی کردووە (١/٣٣٦) بە سەنەدێکی حەسەن بڕوانە (إرواء الغليل ١/١١٨/١٩٨ ).

وە حەدیسەکە هەرچەندە مەوقوفە بەڵام حوکمی مەرفوعی هەیە لە چەند ڕوویەکەوە، بەهێزترینیان ئەوەیە کە مەفهوومی حەدیسەکەی (أم عطية)ی باسکراو لە کیتابەکەدا شاهیدی بۆ ئەدا بە لەفزی: (ئێمە لە دوای پاك بوونەوە زەردی و لێڵیمان بە هیچ شتێك نەدەزانی)، ئەمە بە ڕێگای مەفهوم دەلالەت دەکاتە سەر ئەوەی ئەوان ئەمەیان بەر لە پاك بوونەوە بە حەیز دادەنا، وەئەمە مەزهەبی جمهورە هەروەك شەوکانی دەفەرمووێت.

وە من لە زووەوە پێم وابو کە تەنها خوێنی ڕەش حەیزە بەپێی زاهیری حەدیسەکەی (فاطمة) ی کچی ئەبی حوبەیشی باسکراو لە کتێبەکەدا، پاشان بۆم ڕوون بۆوە لەکاتی تەعلیق نوسین لەسەر ئەم کیتابە کە حەق ئەوەیە کە سەید سابق باسی کردووە: کە سووری وزەردی ولێڵیشە، لەپێش پاك بونەوە، بەپێی حەدیسەکەی مەرجانە و شاهیدەکەی، هەروەها بۆم ڕون بۆوە کە حەدیسەکەی (فاطمة) (معارض) نیە بۆ حەدیسەکەی مەرجانەو شاهیدەکەی، چونکە ئەو لەبارەی ئافرەتی (مستحاضة)یە کە خوێنی حەیزو (استحاضة)ی لێ تێك چووە، جا ئەو ئافرەتە جیاوازی دەخاتە نێوان خوێنی (استحاضة) و نێوان خوێنی حەیز بە ڕەشێتی، هەرکاتێك بینیتی واز لە نوێژ دێنێ، وە ئەگەر جگە لەمەش ببینێ ئەوە دەست بە نوێژ دەکات، وە حەدیسەکە جگە لەم واتایە هیچ هەڵێ ناگرێت (تمام المنة).

بەڵام ئەگەر عادەتێکی دیاری کراوی نەبوو کە لە حەیزا لەسەری بڕوات، ئەبێ سەیری نیشانەکانی خوێنەکەی بکات. بەپێی (حدیث)ەکەی (فاطمة) ی کچی ئەبی حوبەیش کە لە پێشەوە باس کرا، کە پێغەمبەر ﷺ تێیدا ئەفەرموێت: (إِذَا كَانَ دَمُ الْحَيضَةِ فَإِنَّهُ أَسوَدُ يُعرَفُ). واتە: ئەگەر ئەو خوێنە خوێنی حەیز بوو، ئەوە ڕەشەو ئەناسرێ. جا ئەم (حدیث)ە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خوێنی حەیز جیاوازە لە خوێنی غەیری حەیز، وە ناسراویشە لەلای ئافرەتان.

٥- ماوەی پاکێتی نێوان دوو حەیز:

زانایان لەسەر ئەوە ڕێکن کە ماوەی زۆری پاکیەتی نێوان دوو حەیز ئەندازەیەکی دیاری کراوی نیە، وە ئیختلافیان هەیە لە ماوەی هەرە کەمی پاکێتیەدا، جا هەندێکیان ماوەی هەرە کەمیان بە پانزە ڕۆژ داناوە، وە هەندێکیان بۆ ئەوە چوون کە سیانزە ڕۆژ بێت، وە لە ڕاستیەدا دەربارەی دیاری کردنی ماوەی هەرە کەمی شتێکی وا نەهاتووە بکرێتە بەڵگە و کاری پێ بکرێت.

## زەیستانی – (نفاس)

١- پێناسەکەی:

ئەو خوێنەیە کە لە پێشی ئافرەت دێتە دەرێ بەهۆێ منداڵ بوونەوە ئەگەر لەبار چوونیش بێت.

٢- ماوەکەی:

لایەنی کەمی زەیستانی بێ سنوورە بە لەحزەیەك دێتە جێ، چونکە ئەگەر منداڵەکەی لێ بۆوە و خوێنەکەی وەستا، یا بێ ئەوەی خوێنی هەبێت منداڵەکەی ببێت، ئەو کاتە ئافرەتی پاك چی لەسەرە لە نوێژ و ڕۆژوو شتی تر ئەویش لەسەریەتی. بەڵام لایەنە زۆرەکەی چل ڕۆژە. بەپێی ئەوەی ئومموسەلەمە ئەگێڕێتەوە دەفەرموێت: (ژنە زەیستانەکانی زەمانی پێغەمبەر ﷺ چل ڕۆژ دا ئەنیشتن) رواه الخمسة إلا النسائي.

وە (ترمذي) دووای ئەم (حدیث)ە دەفەرموێت: زانایان لە صەحابە و تابیعین و دووای ئەوانیش هەموو لەسەر ئەوە یەکن کە ئافرەتی زەیستان هەتا چل ڕۆژ نابێت نوێژ بکات، مەگەر پێش ئەوکاتە پاکی بە خۆیەوە ببینێ، ئەگەر پاکی بینی ئەبێ خۆی بشوات و نوێژەکانی دەست پێ بکاتەوە، وە ئەگەر دووای چل ڕۆژەکە خوێنی بینی بەشی زۆری زانایان ئەڵێن نابێ واز لە نوێژ کردن بهێنێت لەدووای چل ڕۆژ.

ئەوەی لەسەر حەیزدار و زەیستان حەرامە :

حەیزدار و زەیستان هاوبەشن لەگەڵ لەش گراندا لە هەموو ئەو شتانەدا کە لەسەر لەش گران حەرامە کە لەپێشەوە باسمان کرد، وە هەروەها لەوەدا هاوبەشن کە هەریەك لەم سیانە پێڕیان نەوتریێ خاوەنی (ڕووداوی بێ دەست نوێژی) گەورە، وە سەرەڕای ئەوەی کە باسمان کرد چەند شتێکی تریش هەن کە حەرامن لەسەر حەیزدار و زەیستان:

١- ڕۆژوو:

حەڵاڵ نیە بۆ ئافرەتی حەیزدار و زەیستان بەڕۆژوو بن، جا ئەگەر هات و بەڕۆژوو بوون ڕۆژووەکەیان دانامەزرێ و بە (باطل) ئەژمێررێ، وە واجبە لەسەریان لەدووای مانگی ڕەمەزان ئەو ڕۆژووانە بگرنەوە کە لە ڕۆژانی حەیز و زەیستانیدا لە دەستیان چووە، بەڵام واجب نیە لەسەریان نوێژی چووای ئەو ڕۆژانەیان بگرنەوە، بۆ ئەوەی نەبێتە بارێکی گران بەسەریانەوە، چونکە نوێژ زۆر دووبارە ئەبێتەوە، و وەك ڕۆژوو نیە ساڵی یەکجار بێت، بەپێی حەدیسی ئەبو سەعیدی خودری خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموێت: (جارێك یا جەژنی قوربان بوو یا جەژنی ڕەمەزان، پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ (مصلی) - شوێنی نوێژی جەژن - بەلای کۆمەڵێك ئافرەتدا تێپەڕی و فەرمووی: (ئەی چینی ئافرەتان صەدەقە بکەن چونکە من ئێوەم بینیوە بەشی زۆری دۆزەخیانن) ووتیان: بۆچی ئەی نێرراوی خوا؟ فەرمووی: (زۆر جنێو ئەدەن و ئینکاری چاکەی مێردەکانتان ئەکەن. من عەقڵ ناتەواو دین ناتەواوانێکم نەبینیوە وەك ئێوە، کە هۆشی پیاوی دووربین و دانا بەرێ!) ووتیان: ناتەواوی دین و عەقڵمان چییە ئەی نێرراوی خوا؟ فەرمووی: (ئایا شایەتی ئافرەتێك وەك نیوەی شایەتی پیاوێك نیە؟) ووتیان: بەڵی وایە، فەرمووی: (ئەوە لە کەمی عەقڵیەوەیەتی، ئایا ئەگەر تووشی حەیز بوو تەرکی نوێژو ڕۆژو ناکا؟) ووتیان: بەڵێ، فەرموووی: (دە ئەوەیە ناتەواوی دینەکەی) رواه البخاري ومسلم.

وە لە (معاذة)ەوە هاتوە دەفەرموێت: (لە عائیشەم پرسی خوا لێی ڕازی بێت ووتم: بۆچی ئافرەتی بێ نوێژ ڕۆژوو ئەگێڕێتەوەو نوێژ ناگێڕێتەوە؟ ووتی: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەردا بووین کاتێ تووشی ئەوە ئەهاتین فەرمانمان پێ ئەکرا ڕۆژووەکانمان بگرینەوە بەڵام فەرمانمان پێ نەکراوە نوێژەکانمان بگێڕینەوە) رواه الجماعة.

٢- سەر جێیی کردن – (الوطء):

هەموو موسڵمانان لەسەر ئەوە ئیجماعیان کردوەو کۆن کە چوونە لای ژنی حەیزدار یا زەیستان حەرامە بە دەقی قورئان و سوننەت، وە دروست نیە چوونە لایان هەتا پاك نەبنەوە، بەپێی حەدیسی ئەنەس کە دەفەرموێت: (جوولەکە ئەگەر ژنەکانیان تووشی حەیز بوونایە نەخواردنیان لەگەڵدا ئەخواردو نە ئەچوونە لایان، صەحابە لەو بارەیەوە لە پێغەمبەریان پرسی ﷺ، جا خوای گەورە ئەم

تایەتانەی نارده خوارەوە کە ئەفەرمووێت: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ﴾ (البقرة/٢٢٢). واتە: دەربارەی حەیز پرسیارت لێ ئەکەن بڵێ ئەوە ڕەنجو ئەزیەتە لەبەر ئەوە لەکاتی حەیزا لە ژنان دووری بکەن ومەچنە لایان ـ جیماعیان لەگەڵدا مەکەن ـ تا پاك ئەبنەوە، جا ئەگەر پاك بوونەوە بەو جۆرەی خوا فرمانی پێ کردوون بچنە لایان، بەڕاستی خوا تۆبەکاران و ئەوکەسانەی کە خۆیان ڕائەگرن ـ لە پیسی و تاوان ـ خۆش دەوێ و پاکانیشی خۆش دەوێ. جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (هەموو شتێکیان لەگەڵدا بکەن جگە لە جیماع) رواه الجماعة إلا البخاري.

ئیمام نەوەوی دەفەرمووێت: ئەگەر پیاوێکی موسڵمان باوەڕی وابێت کە چوونە لای ئافرەتی حەیزدار لە پێشیەوە حەڵاڵە، کافر ئەبێت و هەڵگەڕاوە (مرتد) ئەبێ لە ئیسلام، بەڵام ئەگەر ئەوەی کرد بێ ئەوەی باوەڕی وابێت حەڵاڵە جا لە بیری نەبوو یا نەیزانی حەرامە یا نەیزانی لە حەیزدایە، ئەوە نە گوناهبار ئەبێت و نە کەفارەتی لەسەر ئەبێت، وە ئەگەر بە ئەنقەست ئەوەی کردو ئەشیزانی کە لە حەیزدایە و ئەشیزانی کە حەرامە و بە ئارەزووی خۆی کردی، ئەوە تاوانێکی گەورەی کردووە و واجبە لەسەری تۆبەی لێ بکات، وە دەربارەی واجب بوونی کەفارەت لەسەر ئەو جۆرە کەسانە دوو قەول هەیە، ڕاستترینیان ئەوەیە کە دەفەرمووێت: کەفارەتی لەسەر نیە، پاشان نەوەوی دەفەرمووێت: جۆری دووەم ئەوەیە ئارەزووی خۆی پێ بشکێنێ لەسەرووی ناوکیەوە و خوارووی ئەژنۆیەوە ئەمەش حەڵاڵە بەڕای هەموو (إجماع).

وە جۆری سێیەم ئەوەیە ئارەزووی خۆی پێ بشکێنێ بەنێوان ناوك و ئەژنۆی بەڵام نەچێ بەلای پاش و پێشیدا. وە بەشی زۆری زانایان ڕایان وایە ئەم کارە حەرامە.

لەپاشاندا نەوەوی بۆ ئەوەی نێوان ناوك و ئەژنۆ ئەو قەولەی هەڵبژاردووە کە ئەڵێ حەڵاڵە، بەڵام کەراهەتی هەیە لەبەر ئەوەی بەهێزترین قەولە لە ڕووی بەڵگەوە. ـ قسەکەی نەوەوی تەواو بوو بە کورتی ـ .

وە ئەو بەڵگەیەی ئاماژەی بۆ کردووە ئەوەیە کە لە خێزانەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ ئەگێڕنەوە دەفەرموون: ئەگەر شتێکی بویستایە لە خێزانی کە لە حەیزدا بووایە شتێکی ئەدا بەسەر عەورەتی خێزانەکەیدا. ئەبوداود گێڕاویەتیەوە، (حافظ) دەفەرمووێت: ئیسنادەکەی بەهێزە.

وە لە مەسروقی کوڕی ئەجدەعەوە هاتووە دەفەرمووێت: لە عائیشەم پرسی ؛ پیاو چی بۆ هەیە لەگەڵ خێزانی خۆیدا بیکات ئەگەر لە حەیزدا بوو، ئەویش فەرمووی: هەموو شتێك جگە لە عەورەت، بوخاری لە تەئریخەکەیدا گێڕاویەتیەوە.

## خوێنی بەردەوام (الإستحاضة)

١- پێناسەکەی:

(إستحاضة) هاتنە خوارەوەی خوێنە بە بەردەوامی بە پێشی ئافرەتدا لەناوەختدا.

٢- حاڵەتەکانی ئافرەتی هەردەم لە حەیزدا (مستحاضة):

(مستحاضة) ئافرەتی هەردەم لە حەیز سێ حاڵەتی هەیە.

(أ) : ئەوەیە پێش ئەوەی تووشی ئەو جۆرە حەیزە بێت ماوە و کاتی حەیزەکەی زانراو بێت بەلایەوە لەم حاڵەتەدا هەموو مانگێك ئەو ماوە زانراوە بە ماوەی بێ نوێژی دائەنرێت، و ماوەکەی تر بە (إستحاضة) حەیزی ناوەخت.

بەپێی حەدیسی ئوممو سەلەمە ئەگێڕێتەوە کە ئەو دەربارەی ئافرەتێك کە بەردەوام خوێنی هەبێ لە پێغەمبەری ﷺ پرسی، ئەویش فەرمووی: (با تەماشای ماوەی ئەو شەوو ڕۆژانە بکات کە ئەو لە هەر مانگێکدا تووشی حەیز ئەبوو تێیاندا، جا بە ئەندازەی ئەو ماوەیە با نوێژ نەکات، وە کە ئەو ئەندازەیە ڕۆیشت با خۆی بشوات و پارچە پەڕۆیەك بە خۆیەوە هەڵگرێ و نوێژ بکات). رواه مالك والشافعي والخمسة إلا الترمذي.

نەوەوی دەفەرمووێت: ئەم (حدیث) ە ئیسنادەکەی لەسەر (شیخین) ـ بوخاری و موسلیم ـ . (خطابي) دەفەرمووێت: ئەمە حوکمی ئەو ئافرەتانەیە کە لە کاتی ساغیدا پێش ئەوەی تووشی ئەم نەخۆشیە بن لە هەر مانگێکدا ڕۆژانێکی دیاری کراویان هەبووە تێیدا تووشی حەیز بون، پاشان بە بەردەوامی ئەکەونە حەیزەوە و خوێنیان لێ ئەڕوا.

پێغەمبەر ﷺ فەرمان بەو جۆرە ئافرەتانە ئەکات کە واز لە نوێژ بهێنن بە ئەندازەی ئەو ڕۆژانەی کە تێیدا تووشی حەیز ئەبوون لە حاڵەتی ساغیاندا، جا کاتێ ژمارەی ئەو ڕۆژانەیان تەواو

کرد یەکجار خۆیان بشۆرن و نوێژ بکەن، وە حوکمی ئەو جۆرە ئافرەتانە هەروەك حوکمی ئافرەتی خاوێن وایە.

(ب):

ئەوەیە بە بەردەوامی خوێنی هەبێت و ڕۆژەکانی حەیزی نەزانێت، جا یان لەبەر ئەوەی عادەتی خۆی لەبیر چۆتەوە، یان کاتێك بالغ بوو بەو شێوەیە هەمیشە حەیزدار بووە و ناتوانێ خوێنی حەیزی لە خوێنی تر جیا بکاتەوە. جا لەم حاڵەتەدا حەیزەکەی لە مانگدا شەش ڕۆژ یا حەوت ڕۆژی بۆ دائەنرێت لەسەر عادەتی بەشی زۆری ژنان، بەپێی حەدیسی حەمنەی کچی جەحش کە دەفەرمووێت: تووشی حەیزێکی هەمیشەیی توند بووم، هاتمە لای پێغەمبەر ﷺ لەو بارەیەوە پرسیاری لێ بکەم، سەیرم کرد لە ماڵی زەینەبی کچی جەحشی خوشکم بوو، ووتم: ئەی نێرراوی خوا تووشی حەیزێکی هەمیشەیی زۆر بووم، بە شێوەیەك نایەڵێت نوێژ و ڕۆژووەکانم بەجێ بهێنم، چ فەرمانێکت هەیە، فەرمووی: (لۆکەت بۆ وەصف ئەکەم بەکاری بهێنە چونکی خوێن لائەبا)، دەفەرمووێت ووتم: لەوە زۆرترە بە لۆکە بگیرێتەوە، فەرمووی: (بە پەڕۆیەك توند بیبەستە وەك لغاوی بۆ بکەی)، ووتم: بە خوڕ پێمدا دێتە خوارەوە، فەرمووی: (فەرمانت پێ ئەکەم بە دوو شت هەرکامیانت کرد ئەوی تریانت لەسەر ئەکەوێ، وە ئەگەر توانایت بەسەر هەردووکیاندا هەبوو ئەوە بۆ خۆت چاکتر ئەزانی)، جا فەرمووی: (ئەوەی کە تووشت بووە لەقەیەکە لە لەقەکانی شەیتان ـ واتە ئازارێکە لەوەوە ـ جا شەش تا حەوت ڕۆژ کە هەر خوا ئەزانێ کەیە لە مانگدا حەیز دەبێ، خۆت دای بنێ هەتا کاتێ ئەزانی پاك ئەبیتەوە لەو حەیزە (بەپێی ئەو شەش حەوت ڕۆژە) خۆت بشۆ، بیست‌وچوار ڕۆژ یا بیست‌وسێ شەوورۆژ نوێژ بکەو بەڕۆژوو ببە، ئەمە بری ئەکەوێ، وە لە هەموو مانگێکدا بەو شێوەیە بکە هەروەك چۆن ئافرەتان حەیز ئەبینن و پاك ئەبنەوە بە پێی حەیز و پاکی ئەوان، وە ئەگەر توانیت نوێژی نیوەڕۆ درەنگ بخەیت و نوێژی عەسر زوو بکەیت، جا خۆت بشۆیت و ئەو دوو نوێژە نیوەڕۆو عەسرە پێکەوە بکەی، پاشان نوێژی ئێوارە درەنگ بخەیت و نوێژی خەوتنان زوو بکەیت، دوای ئەوە خۆت بشۆریت و هەردو نوێژە پێکەوە بکەیت ئەوە بیکە، وە لەگەڵ نوێژی بەیانیاندا هەڵسە خۆت بشۆو نوێژەکەی بەیانیانت بکە، وە بەو شێوەیە نوێژو ڕۆژوو بکە ئەگەر ئەتوانیت). وە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئەمەی دواییم بەلاوە باشترە لەم دوو شێوەیە). ئەحمەد و ئەبو داود و (ترمذي) گێراویانەتەوە، (ترمذي) دەفەرمووێت: ئەمە (حدیث)ێکی حەسەن و صەحیحە. وە دەفەرمووێت: دەربارەی پرسیارم لە بوخاری کرد فەرمووی: (حدیث)ێکی حەسەنە. ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەفەرمووێت: (حدیث)ێکی حەسەن و صەحیحە.

(خطابي) لە تەعلیق و قسەکردن لەسەر ئەم (حدیث)ە دەفەرمووێت: ئەمە ئافرەتێکە هەر لەسەرتاوە لەم حاڵەتەدا بووە، وە لە پێش ئەم حاڵەتەیدا ڕۆژانێکی زانراوی نەبووە بۆ حەیزەکەی، وە نەشی توانیوە خوێنی حەیزەکەی لە خوێنی تر جیا بکاتەوە، وە خوێنی بەردەوام بووە تاوەکو زاڵ بووە بەسەریدا، جا پێغەمبەر ﷺ کاری ئەم ئافرەتەی گێڕایەوە بۆ عورف و عادەت و حاڵی زۆربەی ئافرەتان، هەروەك چۆن کارەکەی لە عادەبونیدا لە هەر مانگێکدا یەکجار گێڕراوەتەوە بۆ عادەتی زۆربەی ئافرەتان. وە ئەم فرمایشەی ئەوە ئەگەیەنێ کە ئەفەرمووێ: (هەروەك چۆن ئافرەتان حەیز ئەبینن و پاك ئەبنەوە بەپێی ماوەی حەیز و پاکی ئەوان). (خطابي) دەفەرمووێت: ئەم (حدیث)ە ئەصل و بنچینەیە بۆ ئەوەی حاڵی هەندێ لە ئافرەتان قیاس بکرێتە سەر حاڵی هەندێکی تریان لە مەسەلەی حەیز و دووگیانی و باڵغ بوون و وێنەی ئەمانە لە کاروباری ئافرەتاندا.

(جـ-):

ئەوەیە عادەتێکی نەبێت لەسەری بڕوات، بەڵام بتوانێت خوێنی حەیزەکەی لە خوێنی تر جیا بکاتەوە، لەم حاڵەتەدا بەو جیا کردنەوەیە کار ئەکات بەپێی (حدیث)ی (فاطمة) ی کچی ئەبی حوبەیش کە تووشی حەیزی بەردەوام بوو، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (ئەگەر خوێنەکە خوێنی حەیز بێت ئەوە ڕەشەو ئەناسرێ، جا ئەگەر وابوو خۆت لە نوێژ بگرەوە، وە ئەگەر جۆرێکی تر بوو دەست نوێژ بگرەو نوێژەکەت بکە چونکە ئەوە دەمارە) وە ئەمە لە پێشەوە باس کرا.

٣- حوکمەکانی (مستحاضة) :

بۆ ئافرەتی هەمیشە حەیزدار (مستحاضة) چەند حوکمێك هەیە کە ئەمانەن:

یەکەم: ئەوەیە کە واجب نیە لەسەری یەکجار زیاتر خۆی بشوات بۆ نوێژ کاتێ حەیزەکەی کۆتایی دێت. ئەمەش ڕای جومهوری زانایانە لە سەلەف و خەلەف (پێشین و دوایین).

دووەم: ئەوەیە کە واجبە لەسەری بۆ هەموو نوێژێك دەست نوێژ بگرێ، بەپێی فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ لە ریوایەتەکەی بوخاری دا کە ئەفەرمووێت: (پاشان بۆ هەموو نوێژێك دەست نوێژ بگرە)، وە لای مالیك (مستحب)ە بۆ ئەو جۆرە ژنانە دەست نوێژ گرتن بۆ هەموو نوێژێك، وە واجب نیە لەسەری دەست نوێژ بۆ هەموو نوێژێك تازە بکاتەوە بە ڕووداوێکی تر نەبێت کە بەسەریا دێ.

سێیەم: ئەوەیە کە فەرجی بشوات پێش دەست نوێژ گرتن، پاشان پارچە پەڕۆیەك یا لۆکەیەکی تێ ئاخنێ بۆ ئەوەی پیسی نەمێنێ و کەم ببێتەوە، جا ئەگەر بەو شێوەیەش خوێن هەر هات لەگەڵ ئەواندا بە پەڕۆیەك خۆی هەڵبەستێ ئەمەش واجب نیە لەسەری بەڵام باشترە.

چوارەم: ئەوەیە پێش هاتنی کاتی نوێژ دەست نوێژ نەگرێت بەڕای جومهوری زانایان چونکە خاوێنیتی زەرورییە، کەواتە بۆی نیە پێش کاتی پیویستی بخات.

پێنجەم: دروستە بۆ پیاوەکەی بچێتە لای هەتاوەکو لە کاتی هاتنە خوارەوەی خوێنیش هەر دروستە. بەڕای جومهوری زانایان چونکە بەڵگە نەهاتووە لەسەر حەرامیەتی جیماع کردنی.

ئیبنوعەبباس دەفەرمووێت: ئەو ئافرەتانەی تووشی حەیزی هەمیشەیی بوون ئەگەر نوێژ بکەن دروستە پیاوەکانیشیان بچنە لایان چونکە نوێژ گەورەترە، بوخاری ریوایەتی کردووە. واتە: ئەگەر دروست بێت نوێژ بکات لەحاڵەتێکدا کە خوێنی لەبەر ئەڕوا، و نوێژیش گەورەترین شتە کە خاوێنییەتی پێویستە، چونە لایش بۆی دروستە، وە لە عیکریمەی کچی حەمنەوە هاتووە کە (ئەو لە حەیزی هەمیشەیی دا بووە و مێردەکەی جیماعی لەگەڵدا کردووە) ئەبو داود و بەیهەقی گێڕاویانەتەوە. نەوەوی دەفەرمووێت: ئیسنادەکەی حەسەنە.

شەشەم: ئەو جۆرە ئافرەتانە حوکمی ئافرەتی خاوێنیان هەیە، نوێژ بکەن و ڕۆژوو بگرن و ئیعتیکاف بکەن و قورئان بخوێنن و دەست لە قورئانەوە بدەن و هەڵی بگرن و هەموو عیبادەتێك بکەن، وە ئەمەش ڕای هەموو زانایانی لەسەرە[1].

(١) خوێنی حەیز خوێنێکی فاسیدە، بەڵام خوێنی (استحاضة) خوێنێکی تەبیعیە ، هەربۆیە لە یەکەمیاندا ڕێی عیباداتی لێ گیراوە، بەڵام لە دووەمدا نا.

# نوێژ

نوێژ عیبادەتێکە چەند کردارو گوفتارێکی تایبەتی تێدایە بە ووشەی (الله اکبر) دەست پێ دەکات و بە سلاّودانەوە کۆتایی پێ دێت.

پلەو پایەی نوێژ لە ئیسلامدا :

بۆ نوێژ لە ئیسلامدا پلەو پایەیێك هەیە كە هیچ عیبادەتێكی تر ئەو پلەو پایەیەی نیە، چونكی نوێژ كۆڵەكەی دینە، كە بەو نەبێ ڕاناوەستێ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (رَأسُ الأمرِ الإسلامُ وَعَمُودُهُ الصَّلاةُ وَذُروَةُ سَنَامِهِ الجِهَادُ فِي سَبيلِ الله). واتە: سەری كار ئیسلامە، و پایەكەی نوێژە، لوتكە هەرەبەرزەكەی جیهاد كردنە لە پێناوی خوادا.

نوێژ یەكەم عیبادەتە كە خوا واجبی كردووە لەسەر خەڵكی، خوا بۆخۆی سەرپەرشتی واجب بوونەكەی كردووە لە شەوی میعراج، وە خوا بۆخۆی بەبێ (واسطة) لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دواوە بۆ واجب بوونی، ئەنەس خوا لێی ڕازی بێت فەرموویەتی: (شەوی شەوڕەوی (إسراء) نوێژ واجب كرا لەپێشدا پەنجا نوێژ بوو لە ڕۆژێكدا، پاشان كەم كرایەوە هەتا بووە پێنج نوێژ لە ڕۆژێكدا، پاشان بانگ كرا ئەی موحەممەد ﷺ: قسە لەلای من گۆڕینی نیە، وە ئەو پێنج نوێژە پاداشی پەنجا نوێژی هەیە) ئەحمەد و نەسائی و (ترمذي) گێڕاویانەتەوە وە (ترمذي) بە صەحیحی داناوە[1].

نوێژ یەكەم شتە كە خوا بەندەكانی لەسەر موحاسەبە ئەكات، (عبد الله)ی كوڕی (قرط) ئەگێڕێتەوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أوَّلُ مَا يُحَاسَبُ عَلَيهِ العَبدُ يَومَ القِيَامَةِ الصَّلاةُ فَإن صَلُحَت صَلُحَ سَائِرَ عَمَلِهِ، وَإن فَسَدَتَ فَسَدَ سَائِرُ عَمَلِهِ) رواه الطبراني[2]. واتە: یەكەم شتێك كە بەندەی لەسەر موحاسەبە ئەكرێت لە ڕۆژی دوایی‌دا نوێژە، جا ئەگەر نوێژەكانی چاك بوو، ئەوە هەموو كردەوەكانی تریشی چاك ئەبێت، وە ئەگەر خراپ بوو هەموو كردەوەكانی تریشی خراپ ئەبێت.

---

(١) بەڵكو ئەم حەدیسە بوخاری وموسلیم بە كورتی ودرێژی گێڕاویانەتەوە.

(٢) دانەر لە (الترغيب) ەوە نەقڵی كردووە كە ئەڵێت: لە عبدالله ی كوڕی (قرط)ەوە، بەڵام لە ڕاستیدا لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوەیە، بڕوانە (السلسلة الصحيحة ١٣٥٨). (تمام المنة).

وه دووا وەسیەتی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئوممەتەکەی نوێژ بووە لەوکاتەدا کە دونیای بەجێ ئەهێشت وئاخر هەناسەی ئەدا ئەی فەرموو: (الصَّلاةَ الصَّلاةَ، وَمَا مَلَكَت أَيمَانُكم). واتە نوێژەکانتان نوێژەکانتان، وە ئاگاتان لە بەردەکانتان بێت.

نوێژ دووا شتە کە لە دیندا لەدەست ئەدرێ، جا کاتێ نوێژ لەدەست درا دین هەمووی لەدەست ئەدرێ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لَتَنقُضَنَّ عُرَى الإسلامِ عُروَةٌ عُروَةٌ فَكُلَّما انتَقَضَت عُروَةٌ تَشَبَّثَ النَّاسُ بِالَّتِي تَلِيها. فَأَولُهنَّ نَقضاً الحُكمُ، وَآخِرُهُنَّ الصَّلاةُ) رواه ابن حبان من حديث أبي أمامة. واتە: دەستەگیرەکانی ئیسلام دەستەگیرە لەدووای دەستەگیرە بە تەنکید هەڵ ئەوەشێت، جا هەرکاتێك دەستەگیرەیەك هەڵوەشا خەڵکی خۆ هەڵ ئەواسن بە دەستەگیرەی دووای ئەوەوە، جا یەکەمین دەستەگیرە کە هەڵ ئەوەشێ حوکمە، وە دوواترینیان نوێژە.

هەرکەس بەباشی ئایەتەکانی قورئان بخوێنێتەوە ئەبینێ خوای گەورە کاتێ باسی نوێژ ئەکات جارێك ئەی بەستێت بە یادی خۆیەوە وەك: ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۗ وَلَذِكۡرُ ٱللَّهِ أَكۡبَرُۗ﴾ (العنكبوت/٤٥). واتە: بەڕاستی نوێژ خراپەو تاوان قەدەغە ئەکات لەسەر نوێژکەر وە یادی خوا گەورەترە.

هەروەها: ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ۝ وَذَكَرَ ٱسۡمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ﴾ (الأعلى/١٤،١٥). واتە: بەڕاستی ئەوکەسەی کە خۆی پاك ڕاگرتوە ـ لە ئەخلاقی خراپ ـ و یادی پەروەردگاری خۆی کردوەو نوێژی بەجێ هێناوە بە بەردەوامی و لەکاتی خۆیدا ڕزگاری بووە.

هەروەها ئەفەرموێت: ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ﴾ (طه/١٤). واتە: نوێژ بکە بۆ ئەوەی زیکرو یادی من بکەی لە نوێژدا.

جاری وا هەیە لەگەڵ زەکاتدا باسی ئەکات وەك: ﴿وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ (البقرة/١١٠). واتە: نوێژ بکەن و زەکات بدەن.

جاری وا هەیە لەگەڵ ئارام گرتندا باسی ئەکات وەك ئەفەرموێت: ﴿وَٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِ﴾ (البقرة/٤٥). واتە: لە هەمو کاروبارتاندا پەنا بەرنە بەر ئارامگرتن و نوێژ کردن.

وە جاری وا هەیە لەگەڵ سەربڕینندا باسی ئەکات وەك: ﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ﴾ (الكوثر/٢). واتە: نوێژ و سەربڕین بۆ پەروەردگارت بکە.

هەروەها: ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُۥ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُسْلِمِينَ﴾ (الأنعام/١٦٢و١٦٣). واتە: بڵێ ـ ئەی محمد! ـ من نوێژو سەربڕینو ژیان و مردنم بۆ پەروەردگاری جیهانیانە، کە شەریکی نیʼیە لە فەرمانڕەوایی ێ بەڕێوە بردنا، وە بەم تەوحیدە پوختە فەرمانم پێ کراوە، وە من یەکەمین کەسم کە ئیقرارم کردوە و گوێ ڕایەڵ بوم بۆ خوا.

جاری وا هەیە سەرەتای کارە خێرەکانی پێ دەست پێ ئەکات، وە کۆتاییشیان هەر بەو دێنێ، هەروەك سوڕەتی (المعارج) و سەرەتای سوڕەتی (المؤمنون) دا هاتووە کە ئەفەرموێت: ﴿قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَٰشِعُونَ﴾ (المؤمنون/١،٢). واتە: بەڕاستی ئەو باوەڕدارانە ڕزگاریان بووە کە لە نوێژەکانیاندا ملکەچن. تا ئەوێ کە ئەفەرموێ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْوَٰرِثُونَ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ واتە ئا ئەو ئیماندارانەی کە ئەو سیفەتانەیان هەیە فیردەوس بۆ ئەوان ئەبێ و بۆ هەتا هەتایە تێیدا ئەمێننەوە.

بایەخ دان بە نوێژ لەلایەن ئیسلامەوە گەیشتۆتە ڕادەیەك کە فەرمان ئەدات بە ئاگاداری کردنی لەکاتی نیشتەجێیی و سەفەردا وە لە کاتی ناسایشو ترسدا، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ ﴿٢٣٨﴾ فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالًا أَوْ رُكْبَانًا فَإِذَآ أَمِنتُمْ فَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَمَا عَلَّمَكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ تَعْلَمُونَ﴾ (البقرة/٢٣٨-٢٣٩). واتە: نوێژەکانتان بپارێزن لەچوون و بە بەردەوامی ئەنجامیان بدەن لەکاتی خۆیدا، بەتایبەتی نوێژی ناوەڕاست (کە عەسرە) وە بە ملکەچیʼیەوە بۆ خوا بوەستن لە نوێژەکانتاندا، جا ئەگەر ترستان هەبوو لە دوژمن ئەوە ـ نوێژی

ترس بكەن - بە پیادەیی بێ، یان بەسواری، هەر ئەنجامیان بدەن، جا كاتێ ترسەكەتان نەما، نوێژی تەواو بكەن و یادی خوای تێدا بكەن، وە ستایشی بكەن لەسەر ئەو شتانەی كە فێری كردوون لە كاروباری عیبادات و حوكمەكان كە لەوەو پێش نەتان ئەزانی.

وە دەربارەی چۆنیەتی بەجێ هێنانی نوێژی فەرز لەكاتی سەفەرو جەنگو ئاسایش دا ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي ٱلْأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا۟ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱلْكَـٰفِرِينَ كَانُوا۟ لَكُمْ عَدُوًّا مُّبِينًا ﴿١٠١﴾ وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُوٓا۟ أَسْلِحَتَهُمْ فَإِذَا سَجَدُوا۟ فَلْيَكُونُوا۟ مِن وَرَآئِكُمْ وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَىٰ لَمْ يُصَلُّوا۟ فَلْيُصَلُّوا۟ مَعَكَ وَلْيَأْخُذُوا۟ حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ ۗ وَدَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَٰحِدَةً ۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَن تَضَعُوٓا۟ أَسْلِحَتَكُمْ ۖ وَخُذُوا۟ حِذْرَكُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْكَـٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿١٠٢﴾ فَإِذَا قَضَيْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ قِيَـٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِكُمْ ۚ فَإِذَا ٱطْمَأْنَنتُمْ فَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ۚ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتْ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ كِتَـٰبًا مَّوْقُوتًا﴾ (النساء/١٠١-١٠٣). واتە: كاتێ سەفەرتان كرد گوناح نیيە قەيناكا نوێژ كورت بكەنەوە ئەگەر ترسان لەوەی كە كافرەكان دەست درێژی بكەنە سەرتان لە كاتی نوێژەكەتاندا، بەڕاستی كافرەكان دوژمنێكی ئاشكرای ئێوەن، وە ئەگەر تۆ لەناو كۆمەڵەكەتدا بوویت و ویستت نوێژیان بۆ بكەی بیان كە بە دوو دەستەوە، جا با دەستەیەكیان لەگەڵتا بن,و چەكەكانیشیان هەڵگرن، وەكاتێ سەجدەیان برد لەگەڵتا، با دەستەی دووەم لە دواتانەوە بن بۆ پاسەوانی كردنتان، وە دەستەی یەكەم ڕكاتی دووەم تەواو نەكەن وسەلام ئەدەنەوە، پاشان ئەو دەستەی دووەمە كە نوێژیان نەكردووە با بێن

لەگەڵتا نوێژ بکەن، وە با ووریابن و چەکەکانیشیان هەڵگرن. کافرەکان ئاواتیان وایە بێ ئاگابن لە چەك و شت‌ومەکەکانتان بۆ ئەوەی لەپڕتاو هێرشێك بکەنە سەرتان و لەناوتان ببەن، وە گوناح نیە ئەگەر ئازارتان تووش بوو لە بارانێکەوە، یا ئەگەر نەخۆش بوون چەکەکانتان دابنێن، بەڵام ووشیاری خۆتان وەرگرن، بەڕاستی خوا بۆ کافران سزایەکی ئامادە کردووە کە سوك و ڕیسوایان ئەکات، جا کاتێ نوێژەکانتان بەو شێوەیە ئەنجام دا، بەردەوام یادی خوا بکەن لە هەمو حاڵەتەکانتاندا بە پێوەو بە دانیشتنەوەو بەلاتەنیشتتانەوە، پاشان کاتێ دڵنیا بونەوە ترستان نەما ، ئەوکاتە بەتەواوەتی نوێژ ئەنجام بدەن، چونکە بەڕاستی نوێژ لەسەر ئیمانداران واجبەو کاتی دیاری کراوی هەیە.

وە بە توندی ئینکاری لەو کەسانە ئەکات کە درێغی ئەکەن لەنوێژدا و هەڕەشەش ئەکات لەو کەسانەی ئەیان فەوتێنن، ئەفەرمووێت: ﴿فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٌ أَضَاعُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُواْ ٱلشَّهَوَٰتِۖ فَسَوۡفَ يَلۡقَوۡنَ غَيًّا﴾ (مریم/٥٩). واتە: پاشان لەدووای ئەو نیعمەت بەسەرا ڕژاوانە چەند وەچەیەکی خراپ هاتن کە نوێژیان فەوتاندو شوێن هەوەس‌و ئارەزووەکان کەوتن، جا خۆیان ئەبیننەوە چۆن تووشی سزای سەختی خوایی ئەبن.

هەروەها ئەفەرمووێت ﴿فَوَيۡلٌ لِّلۡمُصَلِّينَ ۝ ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ﴾ (ماعون/٤،٥). واتە: سزای سەخت بۆ ئەو نوێژکەرانەی کە لە نوێژەکانیان بێ ئاگان و بە ڕێك‌و پێکی بەجێ‌یان ناهێنن لەکاتی خۆیدا.

وە لەبەر ئەوەی نوێژ لەو کارە هەرە گەورانەیە کە پێویستی بە ڕێنمایی تایبەت هەیە، بۆیە ئیبراهیم علیه السلام داوای لە پەروەردگاری خۆی کرد وا لە خۆی و نەوەکانی بکات بە بەردەوامی و ڕێك‌وپێکی نوێژەکانیان بەجێ بهێنن وە فەرمووی: ﴿رَبِّ ٱجۡعَلۡنِي مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ وَمِن ذُرِّيَّتِيۚ رَبَّنَا وَتَقَبَّلۡ دُعَآءِ﴾ (إبراهیم/٤٠). واتە: خوایە خۆم و نەوەکانم وا لێ بکەی بەڕێك‌وپێکی نوێژەکانمان بەجێ بهێنین، پەروەردگارمان ئەم نزاو پاڕانەوەمان لێ وەربگرە.

**حوکمی نوێژنەکردن:**

نەکردنی نوێژ لەبەر باوەڕ پێ‌نەبوون و ئینکاری کردنی کە فەرزێکە لەلایەن خواوە دانراوە، ئادەمیزادی پێ کافر ئەبێت و دەرئەچێت لە دینی ئیسلام بە ئیجماعی موسڵمانان.

بەڵام ئەگەر کەسێك وازی لێ هێنا لەگەڵ ئەوەشدا کە باوەڕی هەبوو نوێژ فەرزێکە لەلایەن خواوە دانراوە ئەبێ بەجێ بهێنرێت، بەڵام لەبەر تەمەڵی یا مەشغول بوون بە شتێکەوە کە لە شەرعا بە عوزر دانانرێ وازی لێ هێنا، ئەوە چەندین (حدیث) دانی ناوە بەوەدا کە ئەو کەسە کافرەو واجبە بکوژرێ. وە ئەو (حدیث)انەی دانیان ناوە بە کافربوونی ئەمانەن:

(١) لە جابرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە کە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (بَينَ الرَّجُلِ وَبَينَ الكُفرِ تَركُ الصَّلاةِ) رواه أحمد ومسلم وأبوداود والترمذي وابن ماجه. واتە: نێوان ئادەمیزادو نێوان کوفر تەرکی نوێژە.

(٢) وە لە بورەیدەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: (پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (العَهدُ الَّذِي بَينَنَا وَبَينَهُمُ الصَّلاةُ، فَمَن تَرَكَهَا فَقَد كَفَرَ) رواه أحمد وأصحاب السنن[1]. واتە: پەیمانی نێوان ئێمەو ئەوان نوێژە جا هەرکەس وازی لە نوێژکردن هێنا کافر ئەبێ.

(٣) لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە هاتووە: کە پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێك باسی نوێژی کرد فەرمووی: (مَن حَافَظَ عَلَيهَا كَانَت لَهُ نُوراً وَبُرهاناً وَنَجاةً يَومَ القِيَامَةِ، وَمَن لَم يُحَافِظ عَلَيهَا لَم تَكُن لَهُ نُوراً وَلا بُرهَاناً وَلا نَجاةً وَكَانَ يَومَ القِيَامَةِ مَعَ قَارُون وَفِرعَونَ وَهَامَانَ وَأُبَيِّ بنِ خَلَف) رواه أحمد والطبراني وابن حبان، وإسناده جيد.

واتە: هەرکەس نوێژەکانی پاراستو بەرێكوپێکی کردنی بۆی ئەبن بە ڕووناکی و بەڵگەو ڕزگاری لە ڕۆژی دواییدا، وە هەرکەس نەی پاراستن نە ئەبنە ڕوناکی و نە بەڵگەو نە ڕزگار بوون، وە لە ڕۆژی دوایىدا لەگەڵ قارون و فیرعەون و هامان و ئوبەی کوڕی خەڵەفدا حەشر ئەکرێت.

وە مادام ئەو کەسەی پارێزگاری لە نوێژەکانی نەکات لەگەڵ سەرانی کوفردا بێت لەڕۆژی دوایی دا، مانای وایە کافرە.

ئیبنوقەییم دەفەرمووێت: ئەوکەسەی پارێزگاری لە نوێژ ناکات، یا ماڵەکەی مەشغوڵی ئەکات یا موڵکەکەی یا سەرۆکایەتی‌یەکەی یا بازرگانیەکەی، جا هەرکەس ماڵەکەی مەشغولی کرد لە نوێژ ئەوە لەگەڵ قاروندا ئەبێت، وە هەرکەس موڵکەکەی مەشغوڵی کرد ئەوە لەگەڵ فیرعەون دەبێت، وە هەرکەس کاربەدەستی و سەرۆکایەتی مەشغولی کرد ئەوە لەگەڵ هامان دەبێت، وە هەرکەس بازرگانیەکەی مەشغولی کرد ئەوە لەگەڵ ئوبەی کوڕی خەلەف ئەبێت.

---

(١) ئەم حەدیسە صەحیحە بڕوانە (صحيح سنن ابن ماجة) (٢٨٤٨)ی شیخ البانی.

(٤) وه له عـبدوڵلای کوڕی شهقیقی عوقهیلی‌یهوه هاتوه دهفهرمووێت: (یارهکانی پێغهمبهر ﷺ وازهێنانیان له هیچ کارێ به کوفر دانهئهنا جگه له نوێژ) (ترمذي) و حاکم ریوایهتیان کردووه وه حاکم به صهحیحی داناوه لهسهر مهرجی شهیخهین.

(٥) موحهممهدی کوڕی نهصری مهروهزی دهفهرمووێت: (له ئیسحاقم بیستووه ئهی فهرموو: به صهحیحی له پێغهمبهرهوه ﷺ هاتووه که نوێژنهکهر کافره).

وه هەروەها ڕای زانایان و شارەزایان له نزیك پێغهمبهرهوه ﷺ ئهوهیه که ههرکهس به ئهنقهست بهبێ ئهوهی عوزری ههبێ تهرکی نوێژ بکات تا کاتهکهی ئهڕوات کافره.

(٦) ئیبنوحهزم دهفهرمووێت (له ئیبنو عومهرو عبد الرحمن ی کوڕی عهوف و (معاذ)ی کوڕی جهبهل و ئهبی هوڕهیرهو صهحابهی ترهوه هاتووه که: (ههرکهس یهك نوێژی فهرز به ئهنقهست نهکات ههتا کاتهکهی بهسهر ئهچێت، ئهوکهسه کافرو ههڵگهڕاوهیه له ئیسلام) وه نازانین کهسێ ههبێ پێچهوانهی ئهو صهحابانه بێت ). (منذري) له (الترغیب و الترهیب) دا ئهمهی باس کردووه.

پاشان فهرمویهتی: کۆمهڵێك له صهحابهو کۆمهڵێك دووای ئهوان بۆ ئهوه چوون که ههرکهس واز له نوێژکردن بهێنێ کافر ئهبێ، ئهگهر به ئهنقهست نهیکا ههتا ههموو کاتهکهی بهسهر ئهچێت، لهوانه: عومهری کوڕی (خطاب) و عبد الله ی کوڕی مهسعودو عبد الله ی کوڕی عهبباس و (معاذ)ی کوڕی جهبهل و جابیری کوڕی عبد الله و ئهبو (درداء) خوا لێیان ڕازی بێت، وه جگه له صهحابه ئهحمهدی کوڕی حهنبهل و ئیسحاقی کوڕی (راهویه) و عبداللهی کوڕی موبارهك و نهخهعی و حهکهمی کوڕی عوتهیبه و ئهبو ئهییوبی سهختیانی و ئهبو داودی (طیالیسی) و ئهبو بهکری کوڕی ئهبو شهیبه و زوههیری کوڕی حهرب و جگه لهوانیش ڕهحمهتی خوایان لهسهر بێت.

وه ئهو (حدیث)انهی دان به واجب بوونی کوشتنی نوێژنهکهردا ئهنێن ئهمانهن:

(١) له ئیبنو عهبباسهوه خوا لێیان ڕازی بێت هاتوه له پێغهمبهرهوه ﷺ که فهرموویهتی: (عُرَى الإسلامِ وَقَوَاعِدُ الدِّينِ ثَلاثَةٌ، عَلَيهِنَّ أُسِّسَ الإسلامُ، مَن تَرَكَ وَاحِدةً مِنهُنَّ فَهُوَ بِهَا كَافِرٌ حَلالُ الدَّمِ؛ شَهَادَةُ أن لا إِلَهَ إلا اللهُ، وَالصَّلاةُ الْمَكتُوبَةُ، وَصَومُ رَمَضَانَ) رواه أبو يعلى بإسنادٍ حسن. واته: دهستهگیرهکانی ئیسلام و بناغهکانی دین سیانن، لهسهر ئهو سیانه ئیسلام دامهزراوه، ههرکهسێ یهکێ لهو سیانه واز لێ بهێنێ ئهوه کافرو بێباوهڕه پێیان و خوێنیشی حهڵاڵه: شههادهتی (لاإله إلا الله)، وه نوێژه فهرزهکان، و ڕۆژووی ڕهمهزان[1].

---

(١) شێخ ئهلبانی دهفهرمووێت: من گومانێکی زۆرم ههیه له (ثابت) بوونی ئهم حهدیسه له پێغهمبهری خواوه ﷺ وه دانهر شوێن (منذري) کهوتوه که به حهسهنی داناوه، وه بهلای منهوه ورد بونهوهی ئهوێت، چونکه عهمری

له ریوایەتێکی تردا هاتووه: (هەرکەس واز له یەکێ لەوانه بهێنێ ئەوه باوەڕی به خوا نیه نه فەرزی لێ وەرئەگیرێ و نه سوننەت).

(٢) له ئیبنو عومەرەوه هاتووه که پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أُمِرتُ أن أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشهَدُوا أن لا إلَهَ إلا اللهُ وأنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ وَيُقِيمُوا الصَّلاةَ وَيُؤتُوا الزَّكَاةَ فَإِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ عَصَمُوا مِنِّي دِمَائَهُم وَأَموَالَهُم إلا بِحَقِّ الإسلامِ وَحِسَابُهُم عَلَى اللهِ عَزَّوَجَل) رواه البخاري ومسلم. واته: فەرمانم پێ کراوه که لەگەڵ خەڵکدا بجەنگم هەتا شاهیدی ئەدەن به (لا إله إلا الله محمد رسول الله) (هیچ مەعبودێکی به حەق نیه که شایستەی پەرستن بێت ئیللا الله نەبێ وه موحەممەدیش ڕەوانەکراوی خوایه) وه نوێژ بکەن و زەکات بدەن، ئەگەر ئەوانه ئەوەیان کرد. خوێن و ماڵی خۆیان ئەپارێزن لێم به حەقی ئیسلام نەبێت، وه دووای ئەوه موحاسەبه و لێ پرسینەوەیان لای خوایه.

(٣) له ئوممو سەلەمەوه هاتوه که پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إنَّهُ يُستَعمَلُ عَلَيكُم أُمَرَاءَ فَتَعرِفُونَ وَتُنكِرُونَ فَمَن كَرِهَ فَقَد بَرِئَ وَمَن أنكَرَ فَقَد سَلِمَ وَلَكِن مَن رَضِيَ وَتَابَعَ، قَالُوا يَا رَسُولَ الله! ألا نُقَاتِلُهُم؟ قَالَ: لا مَا صَلَّوا) رواه مسلم. واته: فەرمان دەرو کاربەدەستانێکتان لەسەر دائەنرێن ئەبینن شتی چاکیش ئەکەن و شتی خراپیش، جا هەرکەسێ خراپەکانیانی پێ ناخۆش بوو ئەوه بەری ئەبێت، وه هەرکەس ئینکاری کرد لێیان سەلامەت ئەبێ، بەڵام ئەوانەی ڕازین و شوێنیان ئەکەون خراپن. ووتیان: ئەی نێرراوی خوا نەجەنگین دژیان ؟ فەرمووی: نا، مادام نوێژ بکەن.

ئەبینین پێغەمبەر ﷺ نوێژکردنی کردۆته بەرگری جەنگاندن دژی فەرماندەرو کاربەدەستانی ستەمکار.

(٤) له ئەبو سەعیدەوه خوا لێی ڕازی بێت هاتوه که دەفەرموێت: کاتێ عەلی والی بوو لەسەر یەمەن هەندێ زێری نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەویش دابەشی کرد بەسەر چوار کەسدا، پیاوێك

---

کوڕی مالیکی (النكري) تێدایه، وه کەس به سیقەی دانەناوه جگه له ئیبنوحیببان، لەگەڵ ئەوەشدا که ابن حبان خۆی وەصفی کردووه بەوەی که (يخطئ ويغرب) واته: هەڵه ئەکات و شتی غەریب ئەهێنێ.

جا که به سیقه دانانی ئیبنوحیببان به تەنها بۆ راوی متمانەی پێ نەکرێ، هەروەك له پێشەکیەکەدا ڕونمان کردەوه، ئەی ئەگەر ئیبنوحیببان وەصفی راویەکه بکات بەوەی که (هەڵه دەکات) چۆن وەردەگیرێ؟!

هەر بۆیه زۆرینەی گومان ئەوەیه که حەدیسەکه ئەگەر بنەمایەکی هەبێت له ئیبنو عەبباسەوه ئەوه مەوقوفه لەسەر ئیبنوعەبباس و ئەم (النكري) یه به هەڵەدا چووەو حەدیسەکەی ڕەفع کردووه بۆ پێغەمبەر ﷺ والله أعلم. بۆ زیاتر بڕوانه (الضعيفة) (٩٤) سوودی زیاتری تێدایه وەك لەوەی لێرەدایه. (تمام المنة).

لەولاوە ووتی: ئەی نێرراوی خوا لە خوا بترسە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (وەیل بۆ تۆ بۆ من لە هەموو خەڵکی زەوی لەپێش ترم نیم کە لە خوا بترسم؟) پاشان کابرا ملی ناو ڕۆیشت، خالیدی کوڕی وەلید فەرمووی: نەدەم لە گەردنی ئەی نێرراوی خوا؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (نا لەوانەیە نوێژ بکات)، خالید ووتی: زۆر کەس ئەوەی بە زمانی ئەیلێت لە دڵی دا نی‌یە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (من فەرمانم پێ نەدراوە دڵی خەڵك بگەڕێم و سکی خەڵك بدڕم). ئەمە کورتەیەکە لە (حدیث)ی بوخاری و موسلیم.

هەروەها لەم حەدیسەشدا، پێغەمبەر ﷺ نوێژی کرد بە بەرگرێك (مانع) لە کوشتن، وە مەفهومی ئەمە ئەوەیە، کە نوێژ نەکردن کوشتن پێویست دەکات.

ڕای هەندێ لە زانایان:

ئەو (حدیث)انەی پێشوو لە ڕواڵەتدا وا پێویست ئەکەن نوێژنەکەر کافرەو خوێنی ڕەوایە، بەڵام زۆر لە زانایانی پێشین و دوایین - واتە: سەلەف و خەلەف - لەوانە ئەبو حەنیفەو مالیك و شافیعی لەسەر ئەو ڕایەن کە نوێژنەکەر کافر نیە بەڵکو لە فەرمانی خوا دەرچووە و فاسقەو ئەبێ داوای تۆبەکردن و پەشیمان بوونەوەی لێ بکرێت، پاشان ئەگەر پەشیمان نەبۆوەو تۆبەی نەکرد ئەوە بە حەددی شەرعی ئەکوژرێت لە لای مالیکو شافیعی‌و چەند زانای تر، ئەبو حەنیفەش دەفەرمووێت: نوێژنەکەر ناکوژرێت بەڵکو سەرزەنش (تعزیر) ئەکرێت و زیندان ئەکرێت هەتا دەست ئەکات بە نوێژ کردن، وە (حدیث)ەکانی کافر بوونی نوێژنەکەر بەسەر ئەو کەسەدا حەمل ئەکەن کە ئینکاری فەرزیەتی نوێژ ئەکا یان نەکردنەکەی بە حەڵاڵ ئەزانێ، وە بەرەنگاری ئەو (حدیث)انە ئەبنەوە بە چەند دەقێکی گشتی وەك ئایەتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ﴾ (النساء/١١٦). واتە: بەڕاستی خوا لە کەسێك خۆش نابێت کە شەریکی بۆ خوا دابنێت و بەو حاڵەوە مردبێ، بەڵام لە گوناحێك کە لە خوار شیرکەوەیە خۆش ئەبێ لەکەسێ کە بۆخۆی ویستی لەسەر بێ.

هەروەها وەك ئەو (حدیث)ەی ئەبوهورەیرە کە ئەحمەدو موسلیم هێناویانە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لِكُلِّ نَبِي دَعوَةٌ مُستَجَابَة، فَتَعَجَّلَ كُلُّ نَبِيٍ دَعوَتَهُ وَإِنِّي اختَبَأتُ دَعوَتي شَفَاعَةً لِأُمَّتِي يَومَ القِيَامَةِ فَهِيَ نَائِلَةٌ إن شَاءَ اللهُ مَن مَاتَ لايُشرِكُ بِاللهِ شَيئاً) رواه أحمد والبخاري. واتە: هەر پێغەمبەرێك دوعایەکی وەرگیراوی پێ دراوە، جا هەموو پێغەمبەرەکان بە پەلە دوعاکەیان کردووە من نەبەم دوعاکەم شاردۆتەوە بۆ کاتی تکاکردن بۆ ئوممەتەکەم لە ڕۆژی قیامەت دا، (خوا بیەوێ) بەر ئەو کەسانە ئەکەوێت کە مردوون و هیچ هاوبەشیان بۆ خوا دانەناوە.

هەر لەوەوە لای بوخاری هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أسعَدُ النَّاسِ بِشَفَاعَتِي مَن قَالَ لا إلَهَ إلا اللهُ خَالِصاً مِن قَلبِهِ). واتە: بەختەوەرترین کەس کە بەر شەفاعەتی من ئەکەوێت کەسێکە کە لە دڵییەوە بە پاکی ووتبێتی (لا إله إلا الله) واتە: هیچ مەعبودێکی بەحەق نیە کە شایستەی عیبادەت بێ ئیللا الله نەبێ.

گفتوگۆیەك دەربارەی نوێژنەکەر:

(سبكي) لە کتێبی (طبقات الشافعية) دا باسی ئەوە ئەکا کە ئیمام شافیعی و ئیمام ئەحمەد ڕەحمەتی خوایان لەسەر بێت دەربارەی نوێژنەکەر گفتوگۆیەکیان کرد: شافیعی ووتی: ئەحمەد تۆ ئەڵێی نوێژنەکەر بە کافر دائەنرێ؟ ووتی: بەڵێ، شافیعی ووتی: ئەگەر کافرە بەچی موسڵمان ئەبێت: ئەحمەد ووتی: بڵێت (لا إله إلا الله محمد رسول الله) ووتی: خۆ ئەو نوێژنەکەرە بەردەوام ئەو قسەیە ئەڵێ و وازی لێ نەهێناوە. ئەحمەد ووتی: بەوە موسڵمان ئەبێت کە نوێژ بکات، شافیعی ووتی: باشە خۆ نوێژی کافر دروست نیە، وە حوکمی ئیسلام بوونیشی بەو نوێژە بۆ نادرێ، ئیمام ئەحمەد بێ دەنگ بوو، ڕەحمەتی خوا لە هەردووکیان بێ.

لێکۆڵینەوەی شەوکانی:

شەوکانی دەفەرموێت: ئەوەی ڕاست بێت نوێژنەکەر کافرەو ئەبێ بکوژرێت: ئەمما کوفرەکەی لەبەر ئەوەیە چونکە (حديث)ەکان بە صەحیحی هاتوون کە شەرع دانەر نوێژنەکەری ناو بردووە بە کافر، وە ئەو پەردەیەی دایناوە لە نێوان ئادەمیزاد و لەنێوان ناونانی بە کافر نوێژە، کەواتە: وازهێنان لە نوێژ ئەوە ئەگەیەنێ کە دروست بێ بەو نوێژنەکەرە بووترێ کافر، ئیتر هیچ پێویستمان بەو ڕەددانە نیە کە لایەنە بەرهەڵستەکان ئەیهێنن، چونکی ئێمە ئەڵێین: مانع نیە لەوەی کە هەندێ لە جۆرەکانی کوفر ڕێ ناگرێ لەوەی کە ئادەمیزاد لێ خۆشبوونی بۆ هەبێ یا شایستەی شەفاعەت بێ، وەك کوفری هەندێ لە ئەهلی قیبلە بەهۆی هەندێ تاوانەوە کە شەرع دانەر (شارع) ناوی ناوە کوفر، کەواتە شتێ نیە کە ناچارمان بکات بکەوینە ئەو تەئویلاتەوە کە خەڵکی تێی کەوتوون.

نوێژ لەسەر کێ واجبە؟:

نوێژ واجبە لەسەر موسڵمانی عاقڵی باڵغ، بەپێی ئەوەی عائیشە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (رُفِعَ القَلَمُ عَن ثَلاثٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَستَيقِظَ، وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَحتَلِمَ وَعَنِ المَجنُونِ حَتَّى يَعقِلَ) رواه أحمد وأصحاب السنن والحاكم وقال: صحيح على شرط الشيخين، وحسنه الترمذي. واتە: قەڵەم لەسەر سێ جۆر کەس هەڵگیراوە، لەسەر خەوتوو هەتا ئاگای دەبێتەوە، وە لەسەر منداڵ هەتا باڵغ ئەبێت، وە لەسەر شێت هەتا هۆشی دێتەوە.

**نوێژی منداڵ :**

**هەرچەندە منداڵ نوێژی لەسەر واجب نیە، بەڵام واجبە لەسەر سەرپەرستی ئەو منداڵە، کاتێ تەمەنی گەیشتە حەوت ساڵ فرمانی پێ بکات نوێژ بکات، وەکاتێ تەمەنی گەیشتە دە ساڵ لێی بدات لەسەر نەکردنی، بۆ ئەوەی ڕابێت لەسەر نوێژکردن و خووی پێوە بگرێ لەدووای ئەوەی باڵغ بوو، لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکی یەوە لە باپیری یەوە هاتووە دەفەرمووێت: (پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مُرُوا أولادَكُم بِالصَّلاةِ إذا بَلَغُوا سَبعاً وَاضرِبُوهُم عَلَيهَا إذا بَلَغُوا عَشراً وَفرِّقُوا بَينَهُم فِي المَضَاجِعِ) رواه أحمد وأبوداود والحاكم، وقال صحيح على شرط مسلم. واتە: کاتێ منداڵەکانتان تەمەنیان گەیشتە حەوت ساڵ فەرمانیان پێ بکەن نوێژ بکەن، وە لەسەر نوێژ لێیان بدەن کاتێ تەمەنیان گەیشتە دە ساڵ، و جێگایان لەیەك جیا بکەنەوە کاتی نوستن[1].**

**ژمارەی نوێژە فەرزەکان :**

**ئەو نوێژانەی خوا لە شەوو ڕۆژێکدا فەرزی کردوون لەسەر موسڵمانان پێنج نوێژن: لە ئەبو (محیریز)ەوە هاتوە دەفەرموێت: پیاوێکی بەنی کینانە ناوی مەخدەجی بوو بیستبووی لە پیاوێك ناوی ئەبو موحەممەد بوو لە شام ووتبووی نوێژی وەتر یەکێکە لە نوێژە فەرزەکان، مەخدەجی دەفەرمووێت: ڕۆیشتم بۆلای عوبادەی کوڕی صامت و پێم ڕاگەیاند عوبادە فەرمووی: درۆی کردووە ئەبو موحەممەد، چونکە خۆم لە پێغەمبەرم ﷺ بیستووە فەرموویەتی: (خَمسُ صَلَوَاتٍ كَتَبَهُنَّ اللهُ عَلَى العِبَادِ، مَن أتَى بِهِنَّ لَم يُضَيِّع مِنهُنَّ شَيئاً استِخفَافاً بِحَقِّهِنَّ كَانَ لَهُ عِندَ اللهِ عَهدٌ**

---

(١) بە هەڵەدا چونێکی تێدایە، کە دەڵێ حاکم ئەم حەدیسەی تەصحیح کردووە لەم ڕێگایەوە لەسەر مەرجی موسلیم، وەئەمە وانیە عەمری کوڕی شوعەیب لە ئەسانیدی موسلیم نیە، وە ئەم حەدیسە لە واقیعدا دوو ئیسنادی هەیە ئەمە یەکێکیانە، ئەوەی تریان لە (عبدالملك بن رفيع بن سبيرة عن أبيه عن جده مرفوعاً نحوه) ئەو ئیسنادەیانە کە حاکم دەڵێت: (صحيح على شرط مسلم) جا ئەگەر دانەر ئەمەی ڕوون بکردایەتەوە ئەوە دوو سوودی ئەبەخشی:

یەکەم: ئەو لێ تێك چوونەی نەدەکرد کە باس کرا.

دووەم: حەدیسەکەی بەهێز دەکرد بە هاتنی لە ڕێگایەکی ترەوە، بە تایبەت کە هەندێك لە زانایان ڕێگای یەکەم (ضعیف) دەکەن، هەرچەندە سەرەنجامی ڕێگای یەکەم حەسەنەو گەورە زانایان کردوویانە بە بەڵگە وەك ئەحمەد و بوخاری و جگە لەوانیش.

هەروەها سەنەدی دووەمیش لەسەر مەرجی موسلیم نیە، لەبەر ئەوەی لە عەبدولمەلیکی کوڕی (الربیع)ەوەیە. موسلیم تەنها بۆ لێکۆڵینەوەو بە دواداچون حەدیسی لێوە ریوایەت کردووە، هەروەك ڕوونم کردۆتەوە لە (صحيح سنن أبي داود ٥٨) دا. (تمام المنة).

أن يُدخِلَهُ الجَنَّةَ وَمَن لَم يَأتِ بِهِنَّ فَلَيسَ لَهُ عِندَ اللهِ عَهدٌ إن شَاءَ عَذَّبَهُ وَإن شَاءَ غَفَرَ لَهُ) رواه أحمد وأبوداود والنسائي وابن ماجة[1]. واته: خوا لەسەر بەندەکانی نووسیوە لە ڕۆژێکدا پێنج جار نوێژ بکەن، هەرکەس کردنی و هیچی لێ نەفەوتاندن بەوەی بە سووکیان بزانێت، لای خوا پەیمانی دراوەتێ بیخاتە بەهەشتەوە، وەهەرکەس نەی کردن ئەوە لای خوا پەیمانی چوونە بەهەشتی نیە خوا ئارەزووی خۆیەتی یا سزای ئەدات یا لێی ئەبوورێ.

لە (طلحة) ی کوڕی (عبيد الله) وە هاتووە دەفەرمووێت: پیاوێکی عەرەبی دەشتەکی سەرئاڵۆزکاو هاتە لای پێغەمبەر ﷺ ووتی: ئەی نێرراوی خوا! پێم بڵێ خوا چەند نوێژی لەسەر واجب کردووم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئەو پێنج نوێژانەی لەسەر واجب کردووی مەگەر خۆت بە ئارەزووی خۆت نوێژی زیادە بکەیت)، ووتی: ئەی ڕۆژوو چی لەسەر واجب کردووم؟ فەرمووی: (لەساڵێکدا مانگی ڕەمەزان، مەگەر خۆت بە ئارەزووی خۆت زیاد بەڕۆژوو بیت)، ووتی: ئەی لە زەکات چی لەسەر واجب کردووم؟ پێغەمبەر ﷺ هەموو یاساکانی ئیسلامی تێگەیاند. کابرا ووتی: بەو خوایەی ڕێزی لێ نای هیچ زیادەیەك ناکەم و هیچیش لەوانە کەم ناکەمەوە کە خوا لەسەرمی فەرز کردووە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئەگەر ڕاست بکات ڕزگاری بووە، یا ئەگەر ڕاست بکات ئەچێتە بەهەشتەوە). بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە.

## کاتەکانی نوێژ

نوێژ چەند کاتێکی دیاری کراوی بۆ دانراوە ئەبێ هەر نوێژێك لەو کاتەدا بکرێت کە بۆی دیاری کراوە، بەپێی ئەوەی خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتۡ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ كِتَٰبٗا مَّوۡقُوتٗا﴾ (النساء/١٠٣). واتە: بەڕاستی نوێژ فەرزێکە لەسەر باوەڕداران کاتی دیاری کراوی هەیە.

وە قورئان ئاماژە بۆ ئەو کاتانە ئەکات و ئەفەرمووێت: ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفٗا مِّنَ ٱلَّيۡلِۚ إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ذَٰلِكَ ذِكۡرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ﴾ (هود/١١٤). واتە: نوێژ بکە لە سەرەتاو کۆتایی ڕۆژدا ـ کە نوێژی بەیانی و

(١) ئەم حەدیسە صەحیحە بڕوانە صەحیحی ئیبنو ماجە بە ژمارە (١١٥٠) ی شێخ ئەلبانی.

هەردو نوێژی نیوەڕۆو عەسرە ـ وە لە چەند کاتێکیش لە شەودا نوێژ بکە، ـ کە ئێوارەو خەوتنان و شەونوێژ ئەگرێتەوە ـ جا ئەم پێنج نوێژەو سوننەتەکانیان گەورەترین (حسنات)ن کە تاوانە بچوکەکان ئەسڕنەوە، ئائەمە ئامۆژگاری و پەندێکە بۆ ئامۆژگارو پەند وەرگران.

وە لە سوڕەتی (إسراء) دا دەفەرموێت: ﴿أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ ٱلشَّمْسِ إِلَىٰ غَسَقِ ٱلَّيْلِ وَقُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا﴾ (٧٨).

واتە: لەو کاتە کە ڕۆژ لەناوەڕاستی ئاسمان لائەدا لە نیوەڕۆدا هەتا دنیا تاریك ئەبێت، نوێژ بکە ـ ئەمەش نوێژی نیوەڕۆو عەسرو ئێوارەو خەوتنان ئەگرێتەوە ـ وە نوێژی بەیانیان بکە ـ و قورئانی زۆر تێدا بخوێنەرەوە ـ چونکە قورئان خوێندنی نوێژی بەیانیان فریشتەکانی شەوو ڕۆژ ئامادەی ئەبن.

وە لە سوڕەتی (طه) دا دەفەرموێت: ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا وَمِنْ ءَانَآيِٕ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْ وَأَطْرَافَ ٱلنَّهَارِ لَعَلَّكَ تَرْضَىٰ﴾ (١٣٠). واتە: خەریکی ستایش و بە پاك ڕاگرتنی پەروەردگارت بە لە نوێژی بەیانیاندا لە پێش ڕۆژهەڵاتنەوە، وە لە نوێژی عەسردا پێش ڕۆژئاوا بون، وە لە نوێژی خەوتناندا لە کاتەکانی شەودا، وە لە نوێژی نیوەڕۆو شەواندا لە سەرەتاو کۆتایی ڕۆژدا، بەو هیوایەی پاداش بدرێگتەوە بەوەی کە پێی ڕازیت.

لێرەدا مەبەست لە تەسبیحی پێش خۆر هەڵاتن (کە لە ئایەتەکەدا هاتووە) نوێژی بەیانیە، وە پێش ڕۆژ ئاوا بوون نوێژی عەسرە، بەپێی ئەوەی لە صەحیحی بوخاری و موسلیم دا هاتووە لە جەریری کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلیەوە کە دەفەرموێت: جارێك لەلای پێغەمبەر ﷺ دانیشتبووین سەیری مانگی کرد لە شەوی چواردەدا بوو فەرمووی: (إِنَّكُم سَتَرَونَ رَبَّكُم كَمَا تَرَونَ هَذَا القَمَرَ، لا تُضَامُونَ فِي رُؤيَتِهِ، فَإِنِ استَطَعتُم ألا تَغلِبُوا عَلَى صلاةٍ قَبلَ طُلُوعِ الشَّمسِ وَقَبلَ غُرُوبِهَا فَافعَلُوا). واتە: ئێوە لە ڕۆژی دواییدا خوای خۆتان ئەبینن وەك چۆن ئەم مانگە ئەبینن هیچ تووشی ستەم نابن لە بینینیدا بەمە کە هەندێکتان ببینێ و هەندێکتان نەی بینێ، جا ئەگەر ئەتوانن خەو بەسەرتانا زاڵ نەبێت پێش ڕۆژهەڵاتن (بەیانیان) نوێژ بکەن و پێش ڕۆژ ئاوا بوون (عەسر) ئەوە بیکەن، ئەفەرموێت: پاشان پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە.

ئەمانە کاتەکانی نوێژ بوون کە قورئان ئیشارەتی بۆ کردون، وە سوننەتیش بەم شێوەیەی خوارەوە دیاری کردون و سنووری بۆ داناون:

(١) لە (عبد الله) ی کوڕی عەمرەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (وَقتُ الظُّهرِ إذَا زَالَتِ الشَّمسُ وَكَانَ ظِلُّ الرَّجُلِ كَطُولِهِ مَا لَم يَحضُرِ العَصرُ، وَوَقتُ العَصرِ مَا لَم تَصفَرَّ الشَّمسُ، وَوَقتُ صَلاةِ المَغربِ مَا لَم يَغِبِ الشَّفَقُ، وَوَقتُ صَلاةِ العِشَاءِ إلَى نِصفِ اللَّيلِ الأوسَطِ، وَوَقتُ صَلاةِ الصُّبحِ مِن طُلُوعِ الفَجرِ مَا لَم تَطلُعِ الشَّمسُ، فَإذَا طَلَعَتِ الشَّمسُ فَأمسِك عَنِ الصَّلاةِ، فَإنَّهَا تَطلُعُ بَينَ قَرنَي شَيطَانٍ) رواه مسلم. واتە: کاتی نوێژی نیوەڕۆ ئەو کاتە دەست پێ ئەکات کە ڕۆژ لەناوەڕاستی ئاسمان لائەدا بەرەو ڕۆژئاوا هەتا ئەو کاتەی سێبەری پیاو ئەوەندەی خۆی لێ دێ بە مەرجێ کاتی نوێژی عەسر نەیات، وە کاتی نوێژی عەسر لەو کاتەوە دەست پێ ئەکات کە سێبەری پیاو ئەوەندەی خۆی لێ دێ هەتا ڕۆژ زەرد ئەبێت، وە کاتی نوێژی ئێوارە لە ڕۆژ ئاوا بوونەوەیە هەتا سوورایی ئاسمان نامێنێ، وە کاتی نوێژی خەوتنان درێژ ئەبێتەوە هەتا کاتی یەکەمی نیوەی شەو، وە کاتی نوێژی بەیانی لە دەرکەوتنی (فجر) سپیدەی بەیانەوە هەتا خۆر هەڵاتن، کاتێ خۆر دەرکەوت نوێژ مەکە چونکە لە نێوان دووشاخەی شەیتانەوە هەڵدێ.

(٢) لە جابیری کوڕی عبد اللهوە هاتوە دەفەرمووێت: (جبریل) (علیە السلام) هاتە لای پێغەمبەر ﷺ ئەو کاتەی ڕۆژ لە نیوەی ئاسمان لای دابوو پێی ووت: هەڵسە کاتی نوێژە نوێژ بکە، ئەویش هەڵسا نوێژی نیوەڕۆی کرد، لەپاشاندا سێبەری هەموو شتێك وەکو خۆی لێ هاتبوو، هاتەوە پێی ووت: کاتی نوێژە نوێژ بکە، ئەویش هەڵسا نوێژی عەسری کرد، کاتێ خۆرئاوا بوو هاتەوە بۆلای و پێی ووت: کاتی نوێژە نوێژ بکە، ئەویش هەڵسا نوێژی ئێوارەی کرد، کاتێ سوورایی ئاسمان نەما هاتەوە بۆلای پێی ووت: کاتی نوێژە نوێژ بکە، ئەویش هەڵسا نوێژی خەوتنانی کرد، لەپاشاندا کاتێ سپیدەی بەیان (فجر) دەرکەوتبوو هاتەوە بۆلای پێی ووت: کاتی نوێژە نوێژ بکە ئەویش نوێژی بەیانی کرد، ڕۆژی دوایی کاتێ سێبەری هەموو شت ئەوەندەی خۆی لێ هاتبوو هاتەوە ووتی: هەڵسە نوێژ بکە، ئەویش ﷺ نوێژی نیوەڕۆی کرد، کاتێ سێبەری هەموو شت دوو ئەوەندەی خۆی لێ هاتبوو هاتەوە بۆلای ووتی: نوێژ بکە، ئەویش هەڵسا نوێژی عەسری کرد، ڕۆژی پێشوو چ کاتێك هات ئەم جارەش ئەو کاتە هاتەوە بۆلای پێی ووت: نوێژ بکە ئەویش نوێژی ئێوارەی کرد، نیوە شەو ڕۆیشتبوو یا فەرمووی سێ‌یەکی شەو ڕۆیشتبوو هاتەوە بۆلای پێی ووت: هەڵسە نوێژ بکە ئەویش ﷺ هەڵسا نوێژی خەوتنانی کرد، کە دونیا تەواو ڕوون بۆوە هاتەوە بۆلای پێی ووت: هەڵسە نوێژ بکە، ئەویش هەڵسا نوێژی بەیانی کرد، لەپاشاندا پێی

ووت: نێوان ئەو دووکاتەش کاتێکە. ئەحمەد و نەسائی و (ترمذي) ریوایەتیان کردووە[1]. بوخاری دەفەرمووێت: ئەوە ڕاستترین شتە بۆکاتی نوێژەکان. مەبەستی پێش نوێژی‌یەکەی جبریل بوو.

کاتی نوێژی نیوەڕۆ:

بەو دوو (حديث)ەی پێشوودا دەردەکەوێت کە نوێژی نیوەڕۆ لەو کاتەوە دەست پێ ئەکات کە ڕۆژ لەناوەڕاستی ئاسمان لای دابێت، وە کاتەکەی درێژ ئەبێتەوە هەتا سێبەری شت بێجگە لە سێبەری لادان (زەوال) ئەوەندەی خۆی لێ دێت، بەلاّم موستەحەببە کاتی زۆرگەرم نیوەڕۆ دووا بخرێت بۆ ئەوە تینی گەرما نوێژکەر بێ تاقەت نەکات و بێ ئاگای نەکا لە نوێژ، ئیتر جگە لە کاتی گەرما ئەبێ زوو بکرێت بەپێی ئەم بەڵگانە:

(١) ئەنەس خوا لێی ڕازی بێت ئەگێڕێتەوە دەفەرمووێت: (پێغەمبەر ﷺ ئەگەر دونیا زۆر سارد بووایە زوو نوێژەکەی ئەکرد، بەلاّم ئەگەر گەرما بووایە نوێژەکەی دووا ئەخست هەتا فێنکی ئەکرد) بوخاری گێڕاویەتی‌یەوە.

(٢) لە (أبوذر)ەوە هاتوە دەفەرمووێت: لە سەفەرێکدا لەگەڵ پێغەمبەردا بووین، نیوەڕۆ هات و بانگدەر ویستی بانگ بدات فەرمووی: (بانگ مەدە جارێ با فێنك بکات)، پاش ماوەیەکی تر هەڵسا ویستی بانگ بدات هەر فەرمووی: (با فێنك بکات)، کابرا دوو یا سێ جار هەستا پێغەمبەر ﷺ هەر ڕێی نەدا بانگ بدات، هەتا سێبەری گردەکانمان بینی ئینجا نوێژمان کرد، لەپاشاندا فەرمووی: (گەرمای بەتین لە هەناسەی جەهەننەمەوەیە، جا کاتێك گەرما تینی سەند با هەوا فێنك بکات ئینجا نوێژ بکەن). بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە.

ماوەی فێنك بون:

(حافظ) لە (الفتح) دا دەفەرمووێت زانایان جیاوازی‌یان هەیە لەو ماوەیەدا، ووتراوە: هەتا سێبەر ئەوەندەی قۆڵێك ئەکشێ دووای سێبەری لادان (زەوال)ەوە ووتراوە چارەکە بالاّیەك، وە ووتروواوە سێ‌یەکە بالاّیەك، وە ووتراوە نیوە بالاّیەك، وە جگە لەوەش ووتراوە، وە ئەوەی لەسەر بنەما هاتووە ئەوەیە کە ماوەکە بەپێی حاڵ ئەگۆڕێت، بەلاّم بە مەرجێ درێژ نەخایەنێ تا کۆتایی کاتی نیوەڕۆ.

کاتی نوێژی عەسر :

نوێژی عەسر لەو کاتەوە دەست پێ دەکات کە سێبەری هەموو شت وەکو خۆی لێ دێت جگە لە سێبەری (زەوال)، وە کاتەکەی هەتا خۆرئاوابوون درێژ ئەبێتەوە. لە ئەبی هورەیرەوە خوا لێی ڕازی

---

(١) ئەم حەدیسە صەحیحە وەك شێخ ئەلبانی دەفەرمووێت لە (إرواء الغليل) دا بە ژمارە (٢٥٠).

بێت هاتوه دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن أدركَ رَكعَةً مِنَ العَصرِ قَبلَ أن تَغرُبَ الشَّمسُ فَقَد أدركَ العَصرَ) رواه الجماعة. واتە: هەرکەس فریای یەك ڕکات بکەوێت لە نوێژی عەسر پێش ئەوەی خۆر ئاوابێت ئەوە فریای نوێژی عەسر کەوتووە.

وە بەیهەقی بەم شێوەیە هێناویەتی: (مَن صَلَّى مِنَ العَصرِ رَكعَةً قَبلَ أن تَغرُبَ الشَّمسُ ثُمَّ صَلَّى مَا بَقِيَ بَعدَ غُرُوبِ الشَّمسِ لَم يَفُتهُ العَصرُ). واتە: هەرکەس یەك ڕکات لە نوێژی عەسر بکات پێش ئەوەی خۆر ئاوابێت پاشان باقی نوێژەکەی دووای خۆرئاوابوون تەواو کرد، ئەوە نوێژی عەسری نەچووە.

کاتی ئیختیارو کاتی کەراهەت لە نوێژی عەسردا :

بە زەرد بوونی خۆر کاتی (فضیلة) و ئیختیار لە نوێژی عەسردا کۆتایی دێت، ئەمەش بەپێی حەدیسەکەی جابیرو حەدیسەکەی عبد الله ی کوڕی عەمر کە لە پێشەوە باس کرا.

بەڵام دووا خستنی ئەو نوێژە بۆ دووای زەرد بوونی ڕۆژ هەرچەندە دروستە بەڵام کەراهەتی هەیە ئەگەر هاتوو مەعزەرەتی شەرعی نەبوو، لە ئەنەسەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: لە پێغەمبەرم ﷺ بیستووە ئەی فەرموو: (تِلكَ صَلاةُ المُنَافِقِ، يَجلِسُ يَرقُبُ الشَّمسَ حَتَّى إذَا كَانَ بَينَ قَرنَي الشَّيطَانِ قَامَ فَنَقَرَهَا أربَعاً. لا يَذكُرُ اللهَ إلا قَلِيلاً) رواه الجماعة إلا البخاري وابن ماجة. واتە: ئەوە نوێژی مونافیقە دائەنیشێ چاودێری ڕۆژ ئەکات هەتا ئەگاتە نێوان دووشاخەی شەیتان ئەوسا هەڵ ئەسێ چوار دەنووك ئەدا بە زەویدا. بە کەمی نەبێت یادی خوا ناکات.

ئیمام نەوەوی لە شەرحی موسلیم دا دەفەرمووێت: هاوەڵانی ئێمە ووتوویانە، نوێژی عەسر پێنج کاتی هەیە:

(١) کاتی (فضیلة)، (٢) کاتی ئیختیار، (٣) کاتی دروستی بە بێ کەراهەت، (٤) کاتی دروستی بە کەراهەت، (٥) کاتی مەعزەرەت.

ئەمما کاتی (فضیلة) ئەوە ئەوەڵی کاتی نوێژەکەیە. وە کاتی ئیختیار لە دووای کاتی (فضیلة) ەوە دەست پێ ئەکات، هەتا ئەو کاتەی سێبەری شت دوو ئەوەندەی خۆی لێ دێت، وە کاتی دروستی بێ کەراهەت هەتا زەرد بوونی خۆرە. وە کاتی دروستی بە کەراهەت لە زەرد بوونی رووی خۆرەوە هەتا خۆر ئاوابوونە. وە کاتی مەعزەرەت کاتی نیوەڕۆیە ئەویش بۆ کەسێکە کە نوێژی نیوەڕۆو عەسر کۆ بکاتەوە لە کاتی نیوەڕۆدا بیکات، بەهۆی سەفەرەوە یا بەهۆی بارانەوە، وە بەجێهێنانی نوێژی عەسر لەم کاتانەدا بە (أداء) حازری ئەبێت، بەڵام ئەگەر ئەو کاتانە کۆتاییان هات بەهۆی خۆرئاوابوونەوە، ئەوە نوێژەکە ئەبێت بە گێڕانەوە (قضاء).

**تەئکید کردن لەسەر ئەوەی کە نوێژی عەسر زوو بکرێت لە ڕۆژی هەورو هەڵادا:**

**لە بورەیدەی ئەسلەمی‌یەوە هاتوە دەفەرموێت: لە غەزایەکدا بووین لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (بَكِّرُوا بِالصَّلاةِ فِي يَومِ الغَيمِ، فَإِنَّ مَن فَاتَتهُ صَلاةُ العَصرِ فَقَد حَبِطَ عَمَلُهُ) رواه أحمد وابن ماجه. واتە: لە ڕۆژی هەورو هەڵادا زوو نوێژەکانتان بکەن، چونکە هەرکەس نوێژی عەسری چوو کاری هەڵ ئەوەشێتەوە[1].**

**ئیبنو قەییم دەفەرموێت: نەکردنی نوێژ دووجۆرە: نەکردنی بە هەمیشەیی، ئەمەیان هەموو کردەوەکان پوچەڵ ئەکاتەوە. وە نەکردنی لە ڕۆژێکی دیاری کراودا، ئەمەیان هەر کاری چاکەی ئەو ڕۆژە پوچەڵ ئەکاتەوە.**

**نوێژی عەسر نوێژی (وسطى) یە :**

**خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلۡوُسۡطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ﴾ (البقرة/٢٣٨). واتە: نوێژەکانتان لە چوون بپارێزن بە تایبەتی نوێژی (وسطى) وە بە ملکەچی تەواوەوە بوەستن بۆ خوا.**

**وە چەند (حديث)ێکی صەحیح هاتووە دان بەوەدا ئەنێت کە نوێژی عەسر ئەو نوێژەیە کە خوا بە نوێژی (وسطى) ناوی بردووە.**

**(١)لە عەلی‌یەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرموێت: لە جەنگی ئەحزابدا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ملأ الله قبورهم وبيوتهم ناراً كما شغلونا عن الصلاة الوسطى حتى غابت الشمس) رواه البخاري ومسلم. واتە: خوا گۆڕو ماڵەکانیان پڕ لە ئاگر بکات وەك مەشغوڵیان کردین لە نوێژی (وسطى) هەتا خۆر ئاوابوو.**

**وە لای موسلیم و ئەحمەدو ئەبوداود ئاوا هاتووە: (شَغَلُونَا عَنِ الصَّلاةِ الوُسطَى، صَلاةِ العَصرِ). واتە: مەشغولیان کردین لە نوێژی (وسطى)، نوێژی عەسر.**

---

**(١) ئەو بەشەی کە ئەفەرموێت: (هەرکەس نوێژی عەسری چوو کاری هەڵ ئەوەشێتەوە)، صەحیحە. فەرموودەی پێغەمبەرە، بەڵام بەشی پێش ئەوە مەوقوفە لەسەر بورەیدە، یەکێ لە ڕاویەکانی حەدیسەکە هەڵەی کردوەو ڕەفعی کردۆتەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ، هەروەك (حافظ) لە (التهذيب) دا فەرمویەتی، بڕوانە (إرواء الغليل٢٥٥) (تمام المنة ).**

(٢) لە ئیبنو مەسعودەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرموێت: بێ باوەڕەکان ڕێیان نەدا پێغەمبەر نوێژی عەسر بکات هەتا خۆر سوورو زەرد بوو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (شَغَلُونَا عَنِ الصَّلاةِ الوُسطَى صَلاةِ العَصرِ، مَلأَ اللهُ أجوَافَهُم وَقُبُورَهُم نَاراً) أو (حَشَا أجوَافَهُم وَقُبُورَهُم نَاراً) رواه أحمد ومسلم وابن ماجه. واتە: مەشغولیان کردین لە نوێژی (وسطی) نوێژی عەسر، دەك خوا ناوسك و قەبرەکانیان پڕ بکات لە ئاگر، یان فەرمووی: ناو سك و قەبرەکانیان بئاخنێ لە ئاگر.

کاتی نوێژی ئێوارە:

نوێژی ئێوارە لەو کاتەوە دەست پێ ئەکات کە خۆر ئاوا ئەبێت و لەچاو وون ئەبێت، وە ماوەکەی درێژ ئەبێتەوە هەتا سوورایی کەناری ئاسمان نامێنێ، بەپێی حەدیسی عبد الله ی کوڕی عەمر کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (وَقتُ صَلاةِ المَغرِبِ إذَا غَابَتِ الشَّمسُ مَا لَم يَسقُطِ الشَّفَقُ) رواه مسلم. واتە: کاتی نوێژی ئێوارە لە ڕۆژئاوا بوونەوە هەتا سوورایی ئاسمان نامێنێ.

هەروەها لە ئەبو موساوە ئەگێڕنەوە دەفەرموێت: پیاوێك کاتی نوێژەکانی پرسی لە پێغەمبەر ﷺ، جا (حدیث)ەکەی باس کرد، وە ئەمەی تێدا هاتووە: فەرمانی پێ دا ئەویش کاتێ ڕۆژ ئاوا بوو نوێژی ئێوارەی کرد، جا ڕۆژی دوایی نوێژەکەی دووا خست هەتا نزیك نەمانی شەفەق سورایی، ئینجا فەرمووی: کاتی نوێژی ئێوارە لەنێوان ئەم دووانەدایە.

نەوەوی لە شەرحی ئەم (حدیث)ەدا دەفەرموێت: لێکۆڵەرەوانی هاوەڵمان بۆ ئەوە چوون کە ئەو قسەیە (راجح)ترە کە دەفەرموێت: دروستە نوێژی ئێوارە دووا بخرێت مادام شەفەق سورایی کەناری ئاسمان وون نەبێ، وە دروستە لە هەموو ئەو کاتانەی نێوان ئەو دوو کاتە نوێژ بکرێت، وە بە دوواخستنی لە ئەوەڵی کاتەکەی گوناحبار نابێ، وە ئەمە ئەو ڕاستیەیە کە غەیری ئەوە دروست نیە. ئەمما (حدیث)ی پێش نوێژی کردنی جبریل کە لە پێشەوە باس کرا کە: لە دوو ڕۆژدا لە یەك کاتدا کە ڕۆژ ئاوا بوو نوێژی کرد، ئەوە ئەبێتە بەڵگە بۆ (إستحباب) ی خێرا کردنی نوێژی ئێوارە کە چەند (حدیث) ێك هاتووە بە ئاشکرا دان بەوەدا ئەنێن:

١- لە سائیبی کوڕی یەزیدەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا تَزَالُ أُمَّتِي عَلَى الفِطرَةِ مَا صَلُّوا المَغرِبَ قَبلَ طُلُوعِ النُّجُومِ) رواه أحمد والطبراني[1]. واتە: بەردەوام ئوممەتەکەم لەسەر سروشت و فیترەتی ئیسلامن مادام نوێژی ئێوارە (مەغریب) بەر لە هەڵاتنی ئەستێرە بکەن.

---

(١) ئەم حەدیسە صەحیحە وەك شێخ ئەلبانی دەفەرموێت، بڕوانە (صحيح أبي داود ٤٠٣).

٢- له (المسند) دا هاتووه له ئەبو ئەییوبی ئەنصاریيەوه دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (صَلُّوا المَغرِبَ لِفِطرِ الصَّائِمِ وَبَادِرُوا طُلُوعَ النُّجُومِ). واته: نوێژی ئێواره بکەن کاتی ڕۆژوو شکاندن پێش هەڵهاتنی ئەستێره بکەون.

٣- وه له صەحیحی موسلیم دا هاتووه له ڕافیعی کوڕی خەدیجەوه دەفەرمووێت: له دووای پێغەمبەرەوه ﷺ نوێژی ئێوارەمان ئەکرد کاتێ سلاومان ئەدایەوەو ئەگەڕاینەوه بۆ ماڵەوه تیر نیشانمان ئەبینی.

وه هەر له صەحیحی موسلیم دا هاتووه له سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوه که پێغەمبەر ﷺ کاتێ نوێژی ئێوارەی ئەکرد که خۆر ئاوا ئەبوو، وه له چاو وون ئەبوو.

کاتی نوێژی خەوتنان:

نوێژی خەوتنان له نەمانی (شفق) سوورایی کەناری ئاسمانەوه دەست پێ ئەکات، وه کاتەکه هەتا نیوەی شەو درێژ ئەبێتەوه؛ له عائیشەوه خوا لێی ڕازی بێت هاتوه دەفەرمووێت: لەو کاتەوه که سورایی کەناری ئاسمان نەئەما نوێژی خەوتنانیان ئەکرد هەتا سێیەکی شەو ئەڕۆیشت. بوخاری ریوایەتی کردووه.

وه له ئەبی هورەیرەوه خوا لێی ڕازی بێت هاتوه دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لَولا أن أشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لَأمَرتُهُم أن يُؤَخِّرُوا العِشَاءَ إلَى ثُلُثِ اللَّيلِ أو نِصفِهِ) رواه أحمد وابن ماجه والترمذي وصححه. واته: ئەگەر بە گرانم نەزانیایه لەسەر ئوممەتەکەم فەرمانم پێ ئەکردن نوێژی خەوتنان دووا بخەن هەتا سێیەکی شەو یان نیوەی شەو ئەڕۆیشت.

له ئەبو سەعیدەوه هاتووه فەرمویەتی: شەوێك چاوەڕوانی پێغەمبەر بووین بۆ نوێژی خەوتنان هەتا بەشێك له شەو ئەڕۆیشت نەهات، ئەوسا هات نوێژی پێ کردین، ئینجا فەرمووی: (خُذُوا مَقَاعِدَكُم فَإنَّ النَّاسَ قَد أخَذُوا مَضَاجِعَهُم، وَإنَّكُم لَن تَزَالُوا فِي الصَّلاةِ مُنذُ انتَظَرتُمُوهَا، لَولا ضَعفُ الضَّعِيفِ وَسُقمُ السَّقِيمِ وَحَاجَةِ ذِي الحَاجَةِ لَأخَّرتُ هَذِهِ الصَّلاةَ إلى شَطرِ اللَّيلِ) رواه أحمد وابو داود وابن ماجه والنسائي وابن خزيمة، وإسناده صحيح[1]. واته: شوێنی خۆتان بگرن له بەهەشتا، چونکه ئێستا خەڵك جێخەوی خۆیان گرتووه، وه ئێوه لەوکاتەوه که چاوەڕوانن بۆ کردنی نوێژی خەوتنان، هەر له نوێژدان، لەبەر زەعیفی زەعیف و نەخۆشی نەخۆش و پێویستی خاوەن پێویستی نەبووایه ئەم نوێژەم دووا ئەخست هەتا بەشێ لەشەو.

---

(١) بڕوانه (صحيح ابن ماجة ٥٧٧ وصحيح أبي داود ٤٤٨).

ئەمە کاتی ئیختیارە. ئەمما کاتی دروستی و ناچاری (إضطرار) ئەوە درێژە ئەخایەنێ هەتا فەجر بەپێی حەدیسی ئەبو قەتادە کە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أمَا إنَّهُ لَيسَ فِي النَّومِ تَفرِيطٌ إنَّمَا التَّفرِيطُ عَلَى مَن لَم يُصَلِّ الصَّلاةَ حَتَّى يَجِيءَ وَقتُ الصَّلاةِ الأُخرَى) رواه مسلم. واتە: لە خەودا درێغی نیە درێغی کردن لەوەدایە کە یەکێك نوێژ نەکات هەتا کاتی نوێژێکی تر دێت.

وە ئەو (حديث)ەی پێشوو کە دەربارەی کاتی نوێژەکان هاتووە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هەموو نوێژێك کاتەکەی درێژ ئەبێتەوە هەتا کاتی نوێژێکی تر دێت، تەنها نوێژی بەیانی نەبێت کە ئەو هەتا نوێژی نیوەڕۆ درێژ نابێتەوە[1]، چونکە زانایان هەموو لەسەر ئەوە کۆن کە کاتی نوێژی بەیانی بە دەرکەوتنی خۆر کۆتایی دێت.

دووا خستنی نوێژی خەوتنان لە ئەووەڵی کاتەکەی (مستحب)ە:

چاکتر وایە کە نوێژی خەوتنان دووا بخرێت تا کۆتایی کاتی ئیختیار، کە ئەویش نیوەی شەوە، بەپێی ئەوەی عائیشە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: (پێغەمبەر ﷺ شەوێك نوێژی خەوتنانی دووا خست هەتا زۆرێك لە شەو ڕۆیشت، هەتا ئەهلی مزگەوت خەوتن، پاشان هاتە دەرەوە بۆ ناو مزگەوت و نوێژەکەی کرد و فەرمووی: (إنَّهُ لَوَقتُهَا لَولا أن أشُقَّ عَلَى أُمَّتِي) رواه مسلم والنسائي. واتە: ئەمە کاتی نوێژی خەوتنانە ئەگەر ناڕەحەت نەبووایە لەسەر ئوممەتەکەم. وە مەبەست بەم فرمایشتە دووای نیوەی شەو نیە. وە لە پێشەوە باسی (حديث)ەکەی ئەبو هورەیرەو (حديث)ەکەی ئەبو سەعیدمان کرد، ئەوانیش مانای ئەم (حديث)ەی عائیشەیان هەیە و هەموویان بەڵگەن لەسەر پەسەندیەتیو چاکیەتی دوواخستنی نوێژی خەوتنان، وە پێغەمبەر ﷺ بۆیە بەردەوام نەبوو لەسەر دووا خستنی چونکە گرانی تێدایە بۆ نوێژکەران، وە پێغەمبەر ﷺ سەیری حاڵی ئەوانەی ئەکرد کە لە دوایەوە نوێژیان ئەکرد، بۆیە جاری وا هەبوو بەپەلە نوێژەکەی بۆ ئەکردن، وە جاری وا هەبوو دووای ئەخست. لە جابیرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: (پێغەمبەر ﷺ نوێژی نیوەڕۆی ئەکرد لەکاتی گەرمایی نیوەڕۆدا لە دووای زەوال، وە نوێژی عەسری ئەکرد لە کاتێکدا کە خۆر پاك و بێگەرد بوو، وە نوێژی ئێوارەی ئەکرد کاتێ خۆر ئاوا

---

(١) ئەو فەرموودەیە نابێتە بەڵگەی ئەوەی کە کاتی نوێژی خەوتنان درێژ ئەبێتەوە هەتا بەرە بەیان، بەڵکو کاتی نوێژی خەوتنان هەتا نیوەی شەوە بەپێی ئەو فەرموودە صەحیحانەی کە هاتوون لەو بارەیەوە، لەوانە فەرموودەی: (وَقتُ صَلاةِ العِشَاءِ إلى نِصفِ اللَّيلِ الأوسَطِ) رواه مسلم وغيره، کە بە صەراحەت ئەفەرموێ کاتەکەی تا نیوەی شەوە. (تمام المنة).

ئەبوو، وە نوێژی خەوتنان جاری واهەبوو دووای ئەخست، وە جاری وا هەبوو زو ئەیکرد، ئەگەر بیزانیایە خەڵکەکە کۆبوونەتەوە زوو ئەیکرد، وە دووای ئەخست ئەگەر خەڵکەکە دووا بکەوتنایە، بەڵام نوێژی بەیانی ئەوە پێغەمبەر ﷺ لە تاریکیدا ئەیکرد).

نوستن لەپێش نوێژی خەوتنان و قسەکردن لە دووای نوێژی خەوتنان:

نوستن لە پێش نوێژی خەوتنان کەراهەتی هەیە، هەروەها قسەکردنیش لەدووای نوێژی خەوتنان هەر کەراهەتی هەیە، بەپێی حەدیسی ئەبو بەرزەی ئەسلەمی، کە پێغەمبەر ﷺ دوواخستنی نوێژی خەوتنان کە ئێوە ناوی ئەنێن عەتەمە لای پەسەند بوو، وە حەزی نەئەکرد پێش کردنی نوێژی خەوتنان بخەوێت، و دووای نوێژ دانیشێ بۆ قسەکردن. رواه الجماعة.

لە ئیبنو مەسعودەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ نەهی کردبوو لێمان لەوە کە دووای نوێژی خەوتنان دانیشین بۆ قسەکردن، ئیبنو ماجە گێڕاویەتیەوە[1].

وە هۆی کەراهەتی نوستن لەپێش نوێژی عیشاو قسەکردن لەدوایەوە: ئەوەیە کە نوستن جاری وا هەیە نوێژی خەوتوەکە ئەفەوتێنێ کە لەکاتی (مستحب)دا بکرێت، یان جەماعەتی لەدەس ئەدا، وەکو چۆن دانیشتن و قسەکردن لە دوای نوێژی عیشاوە ئەبێتە هۆی بەفیڕۆدانی سودی زۆر، جا ئەگەر ویستی بخەوێ و کەسێکی لەگەڵدا بوو کە هەڵی بستێنێ، یان قسەکردنەکەی خێری تێدابوو، ئەو وەختە هیچی تێدا نییە.

لە ئیبنوعومەرەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتوە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ بەشەو دانیشتنی ئەکرد لەلای ئەبوبەکر لەبارەی کاروباری موسڵمانانەوە ئەدوان، منیش لەگەڵی بوم. ئەحمەد و (ترمذي) گێڕاویانەتەوە وە (ترمذي) بە حەسەنی داناوە.

لە ئیبنوعەبباسەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتوە کە فەرمویەتی: شەوێك لە ماڵی (میمونة) خەوتم کە پێغەمبەر ﷺ لەلای بوو، تاوەکو شەونوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ ببینم، پێغەمبەر ﷺ ساتێك لەگەڵ خێزانەکەی گفتوگۆی کرد، پاشان خەوت. موسلیم گێڕاویەتیەوە.

کاتی نوێژی بەیانی:

کاتی نوێژی بەیانی لە دەرکەوتنی کازیوەی ڕاستی بەیانەوە، واتە: فەجری صادق، دەست پێ ئەکات هەتا ڕۆژ هەڵدێ، وەك لە (حدیث)ەکەی پێشەوە باس کرا.

(مستحب)ە نوێژی بەیانی زوو بکرێت:

---

(١) ئەم حەدیسە صەحیحە وەك شێخ ئەلبانی دەفەرمووێت. بڕوانە (صحیح ابن ماجة٥٨٢) و(الصحیحة ٢٤٣٥).

(مستحب)ه نوێژی بەیانی زوو لەسەرەتای کاتەکەیەوە بکرێت، بەپێی ئەوەی ئەبو مەسعودی ئەنصاری ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ جارێك دنیا تاریك بوو نوێژی بەیانی بۆ کردین، وە جارێکی تریان دنیا تەواو ڕووناك بوبو نوێژی بەیانی بۆ کردین، لەپاش ئەوە هەتا لە دنیا دەرچوو هەر زوو لەکاتی تاریکیدا نوێژی بۆ ئەکردین و نەمان بینی جارێکی تر بە ڕووناکی نوێژمان بۆ بکات. ئەبو داود و بەیهەقی گێڕاویانەتەوە سەنەدەکەشی صەحیحە.

وە لە عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: ژنە باوەڕدارەکان نوێژی بەیانیان بە کۆمەڵ لە دووای پێغەمبەرەوە ﷺ ئەکرد خۆیان ئەپێچا لە عەباکانیانەوە کاتێ لە نوێژ ئەبوونەوە و ئەگەڕانەوە بۆ ماڵەکانیان لەبەر تاریکی کەسیان نەئەناسران. رواه الجماعة.

ئەمما ئەوەی ڕافیعی کوڕی خەدیج گێڕاویەتیەوە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أصبِحُوا بِالصُّبحِ فَإِنَّهُ أعظَمُ لِأُجُورِكُم). وە لە ڕیوایەتێکی تردا: (أسفِرُوا بِالفَجرِ فَإِنَّهُ أعظَمُ لِلأجرِ) رواه الخمسة وصححه الترمذي وابن حبان. واتە: نوێژی بەیانی بە دنیا ڕووناکی بکەن چونکە پاداشتەکەی زۆرترە.

مەبەستی ئەوە بووە ئەوەندە نوێژەکە درێژ بکەنەوە کاتێ لێ بوونەوە لە نوێژ دنیا ڕووناك بێت، نەك بە دنیا ڕووناکی دەست پێ بکەن، واتە زۆر قورئان بخوێنن لەو نوێژەدا تا کاتێ لە نوێژ بوونەوە دنیا ڕووناك بێت، وەك پێغەمبەر ﷺ بۆخۆی ئەمەی ئەکرد، شەست تاسەد ئایەتی قورئانی تێدا ئەخوێند، یا مەبەستی ئەوە بوو تەواو دڵنیا بن لە دەرکەوتنی فەجر، وە بە گومانەوە نوێژ مەکەن.

فریاکەوتنی یەك ڕکاعەت لە نوێژ پێش بەسەر چوونی کاتەکەی:

هەرکەس فریای ڕکاتێك لە نوێژە فەرزەکان بکەوێت و بیکات پێش ئەوەی کاتەکەی بەسەر بچێت ئەوە ئەوکەسە فریای ئەو نوێژە کەوتووە و نوێژەکەی نەچووە، بەپێی ئەوەی ئەبی هورەیرە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن أدرَكَ رَكعَةً مِنَ الصَّلاةِ فَقَد أدرَكَ الصَّلاةَ) رواه الجماعة. واتە: هەرکەس فریای ڕکاتێك لە نوێژ بکەوێت ئەوە فریای نوێژەکە کەوتووە، ئەمەش هەموو نوێژەکان ئەگرێتەوە.

وە لە بوخاری دا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذَا أدرَكَ أحَدُكُم سَجدَةً مِن صَلاةِ العَصرِ قَبلَ أن تَغرُبَ الشَّمسُ فَلِيُتِمَّ صَلاتَهُ، وَإذَا أدرَكَ سَجدَةً مِن صَلاةِ الصُّبحِ قَبلَ أن تَطلُعَ الشَّمسُ فَلِيُتِمَّ صَلاتَهُ). واتە: «هەرکەس لە ئێوە فریای سەجدەیەك لە نوێژی عەسر بکەوێت پێش ئەوەی خۆر ئاوا بێت با نوێژەکەی تەواو بکات، وە ئەگەر فریای سەجدەیەك لە نوێژی بەیانی بکەوێت پێش ئەوەی ڕۆژ هەڵبێت با نوێژەکەی تەواو بکات»، مەبەست لە سەجدە لێرەدا ڕکاتە، وە

(ظاهر)ی (حدیث)ەکان ئەوە ئەگەیەنن کە هەرکەسێك فریای ڕکاتێك لە نوێژی عەسر یا نوێژی بەیانی بکەوێت، نوێژەکە کەراهەت نابێ بۆی کە لەکاتی ڕۆژهەڵاتن و ڕۆژئاوابووندا بیکا، هەرچەندە ئەو دوو ڕکاتە کاتی کەراهەتیشن، وە بە فریاکەوتنی ڕکاتێکی تەواو لە نوێژ ئەو نوێژە بە (أداء) حازر دائەنرێت، هەرچەندە دروست نیە دوواخستنی نوێژ بە ئەنقەست تا ئەوکاتە.

نوستن بەسەر نوێژدا یا لەبیر چوونی:

هەرکەس نوست و بەئاگا نەبۆوە هەتا کاتیّ نوێژەکەی بەسەرچوو، یان لەبیری نەبوو نوێژەکەی بکات و کاتێ بیری کەوتەوە نوێژەکەی چووبوو، ئەوە هەرکاتێك هەڵسا لە خەو یا وەبیری هاتەوە ئەبێ ئەو کاتە بیکات، بەپێی حەدیسی ئەبو قەتادە کە دەفەرموێت: باسی خەوی کاتی نوێژیان کرد بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەویش فەرمووی: (إِنَّهُ لَيسَ فِي النَّومِ تَفرِيطٌ إِنَّمَا التَّفرِيطُ فِي اليَقَظَةِ، فَإِذَا نَسِيَ أَحَدُكُم صَلاةً أو نَامَ عَنهَا فَلْيُصَلِّها إِذَا ذَكَرَهَا) رواه النسائي والترمذي وصححه. واتە: لە خەوتنا تەقصیر نیە تەقصیر لە بەئاگایی دایە، جا هەرکەس لە ئێوە لەبیری چوو یا نوست بەسەر نوێژەکەیداو نەیکرد، با ئەوکاتەی بیری هاتەوە نوێژەکەی بکات.

لە ئەنەسەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن نَسِيَ صَلاةً فَلْيُصَلِّهَا إِذَا ذَكَرَهَا لا كَفَّارَةَ لَهَا إلا ذَلِك) رواه البخاري ومسلم. واتە: هەرکەس نوێژێکی لەبیر چوو بیکات هەرکاتێ بیری کەوتەوە با بیکات، لەوە زیاتر کەفارەتی نیە.

لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرموێت: (شەوێك بە ڕێگادا ئەڕۆیشتین لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ، کاتێ ئاخیری شەو هات دابەزین بۆ پشوودان، ئاگامان نەبۆوە لە خەو هەتا تیشکی گەرمی خۆر بەئاگای هێناینەوە، کە هەستاین بە پەلەو شڵەژاوی ڕامان کرد بۆلای ئاوی دەست نوێژ، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کردین لەسەرخۆ بین، لەپاشاندا لەو شوێنە ڕۆیشتین هەتا ڕۆژ بە تەواوی بەرز بۆوە، ئینجا پێغەمبەر ﷺ دەست نوێژی گرت و بە بیلالی فەرموو: (بانگ بدە)، ئینجا دوو ڕکات نوێژی پێش نوێژی بەیانی کرد، پاشان بیلال قامەتی کردو نوێژمان کرد، خەڵکەکە وتیان: ئەی نێرراوی خوا! سبەینێ لەکاتی نوێژی بەیانیدا ئەم نوێژە نەگێڕینەوە؟ فەرمووی: (أَيَنهَاكُم رَبُّكُم تَعَالَى عَنِ الرِّبَا وَيَقبَلُهُ مِنكُم) رواه أحمد وغيره. واتە: ئایا پەروەردگاری مەزن سوود خواردن لە ئێوە قەدەغە ئەکات و سوودتان لێ وەرئەگرێت.

ئەو کاتانەی قەدەغە کراوە نوێژیان تێدا بکرێت

دووای نوێژی بەیانی هەتا خۆر دەرکەوتن نەهی هاتوە لە نوێژ کردن.

لە خۆر دەرکەوتنەوە هەتا بەرز بوونەوەی ئەوەندەی ڕمێك.

وەکاتێ خۆر گەیشتە ناوەڕاستی ئاسمان هەتا نەختێ لار ئەبێتەوە بۆلای ڕۆژئاوا.

وە دووای نوێژی عەسر هەتا خۆر ئاوا ئەبێت.

لە ئەبو سەعیدەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا صَلاةَ بَعدَ صَلاةِ العَصرِ حَتَّى تَغرُبَ الشَّمسُ وَلا صَلاةَ بَعدَ صَلاةِ الفَجرِ حَتَّى تَطلُعَ الشَّمسُ) رواه البخاري ومسلم. دووای نوێژی عەسر هەتاخۆرئاوابوون نوێژ کردن نیە، وە دووای نوێژی بەیانی هەتا خۆرهەڵاتن نوێژکردن نیە.

لە عەمری کوڕی عەبسەوە هاتووە دەفەرمووێت: ووتم: ئەی نێرراوی خوا فێرم بکە دەربارەی نوێژ، فەرمووی: (صَلِّ صَلاةَ الصُّبحِ ثُمَّ أقصِر عَنِ الصَّلاةِ حتى تَطلُعَ الشَّمسُ وَتَرتَفِعَ، فَإنَّها تَطلُعُ بَينَ قَرنَي شَيطَانٍ وَحِينَئِذٍ يَسجُدُ لَهَا الكُفَّارُ، ثُمَّ صَلِّ فَإنَّ الصَّلاةَ مَشهُودَةٌ مَحضُورَةٌ حَتَّى يَستَقِلَّ الظِّلُّ بِالرُّمحِ، ثُمَّ أقصِر عَنِ الصَّلاةِ فَإنَّ حِينَئِذٍ تُسجَرُ جَهَنَّمُ فَإذَا أقبَلَ الفَيءُ فَصَلِّ فَإنَّ الصَّلاةَ مَشهُودَةٌ مَحضُورَةٌ حَتَّى تُصَلِّيَ العَصرَ، ثُمَّ أقصِر عَنِ الصَّلاةِ حتى تَغرُبَ الشَّمسُ فَإنَّهَا تَغرُبُ بَينَ قَرنَي شَيطَانٍ، وَحِينَئِذٍ يَسجُدُ لَهَا الكُفَّارُ) رواه أحمد ومسلم. واتە: نوێژی بەیانی بکەو دەستبەردار بە لە نوێژ هەتا ڕۆژ هەڵدێو بەرز ئەبێتەوە، چونکە خۆر ئەو کاتە لەنێوان دووشاخەی شەیتانەوە هەڵدێ و بێ باوەڕەکان سەجدەی بۆ ئەبەن، پاشان نوێژ بکە چونکە ئەو نوێژە فریشتەکان ئەی بینن و ئامادەی ئەبن هەتا ئەو کاتەی سێبەری ڕم ئەکەوێتە لایەنی ڕمەکەوەو لەسەر زەوییەکە هیچی لێ نامێنێ، کە ئەو کاتەش کاتی ڕاوەستانی ڕۆژە لەناوەڕاستی ئاسمان (إستواء) ئیتر دەستبەردار بە لە نوێژ، چونکە ئەوکاتە ئاگری جەهەننەم جۆش ئەکرێت، پاشان کاتێ سێبەری ئاسمان لار بووەوە و ڕۆژ لەناوەڕاستی ئاسمان لایدا نوێژ بکە چونکە ئەو نوێژە فریشتەکان ئەی بینن و ئامادەی ئەبن هەتا نوێژی عەسر دەکەی، ئینجا دەستبەردار بە لە نوێژ هەتا خۆر ئاوا دەبێت چونکە ئەو کاتە لەنێوان دووشاخەی شەیتانەوە ئاوا دەبێت و ئەوکاتە بێ باوەڕەکان سەجدەی بۆ دەبەن.

لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە هاتوە دەفەرمووێت: (سێ کات هەیە پێغەمبەر ﷺ نەهی لێ کردووین کە نوێژی تێدا بکەین و مردوومانی تێدا بنێژین؛ ئەو کاتەی تازە خۆر هەڵدێ هەتا بەرز ئەبێتەوە، و کاتێ ئەگاتە نیوەی ئاسمان، وە کاتێ خەریکە ئاوا ئەبێ) رواه الجماعة إلا البخاري[1].

---

(١) نەوەوی لە (شرح صحيح مسلم) دا ئەو قەدەغەبوونە ئەگێڕێتەوە بۆ قەست یەعنی ئەگەر بەقەستی جەنازەکە دوواخرا هەتا ئەو کاتە ئەوە قەدەغەیە، بەڵام ئەگەر شاردنەوەکە بە قەست نەبوو، ئەوکاتە قەدەغە نیە. منیش ئەڵێم: فەرموودەکە گشتییە تایبەت کردنی بۆ قەست بەڵگەی لەسەر نیە وەك ئەمەم ڕوون کردۆتەوە لە (أحكام الجنائز) دا، کەواتە پێویستە ئەگەر ترسی بۆگەن کردنی لاشەکە نەبێت لەو کاتانەدا نەشاررێتەوە وە ئەمە بۆچوونی حەنبەلی-یەکانە هەروەك دانەر باسی کردوە لە (أحكام الجنائز) دا. (تمام المنة).

رای زانایان دەربارەی نوێژکردن دووای نوێژی بەیانی و عەسر:

زانایان ڕایان لەسەر ئەوەیە کە دروستە دووای نوێژی بەیانی و عەسر نوێژە چووەکان بگێڕڕێتەوە، بە پێی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: (مَن نَسيَ صَلاةً فَلْيُصَلِّهَا إذَا ذَكَرَهَا) رواه البخاري ومسلم. واتە: هەرکەس لەبیری چوو یەکێ لە نوێژەکانی بکات با کاتێ بیری هاتەوە نوێژەکەی بکات.

بەڵام کردنی نوێژی سوننەت لەدووای نوێژی بەیانی و عەسر لە صەحابەکان عەلی و ئیبنو مەسعود و زەیدی کوڕی (ثابت) و ئەبو هورەیرە و ئیبنو عومەر ڕەزای خوایان لێ بێت فەرموویانە: کردنی کەراهەتی هەیە.

وە عومەر لەبەر چاوی صەحابەکان هەرکەس دووای نوێژی عەسر نوێژی بکردایە لێی ئەدا، وە کەسیان ئینکاریان نەئەکرد، هەروەها خالیدی کوڕی وەلیدیش ئەو کارەی ئەکرد، وە لە تابیعین حەسەن و سەعیدی کوڕی موسەییب، وە لە پێشەوایانی مەزهەبەکان ئەبو حەنیفەو مالیك بە کەراهەتیان زانیوە.

بەڵام شافیعی بۆ ئەوە چووە کە ئەو نوێژانەی هۆ هەیە بۆ کردنیان دروستە لەو کاتانەدا بکرێت، وەك سوننەتی چونە ناو مزگەوت (تحية المسجد)، وە دوو ڕکاتی دووای دەست نوێژ، وە ئەم بۆچوونە نزیکە لە حەقەوە[1]، بەڵگەشی بەوە هێناوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ سوننەتی نیوەڕۆی کردووە لە دووای نوێژی عەسر.

بەڵام حەنبەلییەکان بۆ حەرام کردنی نوێژی سوننەت چوون لەو دوو کاتەدا هەرچەندە هۆش هەبێت. جگە لە دوو ڕکاعەتی سووڕانەوە بە دەوری کەعبەدا (طواف) بە پێی ئەوەی جوبەیری کوڕی (مطعم) گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (يَا بَني عَبدِ مَنَاف لا تَمنَعُوا أحَداً طَافَ بِهَذَا البَيتَ وَصَلَّى أيَّةَ سَاعَةٍ شَاءَ مِن لَيلٍ أو نَهَارٍ) رواه البخاري وأصحاب السنن وصححه ابن خزيمة والترمذي. واتە: ئەی نەوەکانی عەبدومەناف، هەرکاتێك هەرکەسێك ویستی بە دەوری ئەم خانەیەدا بسووڕێتەوە و نوێژ بکات شەو بێت یا ڕۆژ ئێوە ڕێی لێ مەگرن.

رای زانایان دەربارەی نوێژکردن کاتی ڕۆژهەڵاتن و ئاوابوون و کاتی ڕاوەستانی ڕۆژ لە ناوەڕاستی ئاسماندا:

(١) ئەمە بۆچوونی شێخی ئیسلامە ڕەحمەتی خوای لێ بێت لە (الرسائل والمسائل) دا.

حەنەفی‌یەکان ڕایان وایە لەم کاتانەدا بەهیچ شێوەیەك نوێژ کردن دروست نیە، چ نوێژی فەرز بێت یا واجب، یا سوننەت، گێڕانەوە بێت یا نوێژی حازر، بەڵام سوننەتی عەسری ئەو ڕۆژەو نوێژی مردوویان جیا کردۆتەوە، ووتوویانە: (ئەگەر لە هەریەك لەم کاتانەدا جەنازەیەك ئامادە بوو دروستە نوێژی لەسەر بکرێت و کەراهەتی نیە)[1]، هەروەها سەجدەی تیلاوەتی قورئان ئەگەر ئەو کاتانە قورئان خوێندراو قورئان خوێن گەیشتە شوێنی سەجدەی تیلاوەت، وە ئەبو یوسف سوننەتی لە ڕۆژی جومعەدا جیا کردۆتەوە لەکاتی ڕاوەستانی ڕۆژ لەناوەڕاستی ئاسماندا، بەڵام شافیعی‌یەکان ئەو نوێژە سوننەتانەی لەم کاتانەدا بکرێن بەبێ هۆ بە کەراهەتیان داناوە. ئەمما نوێژی فەرز و ئەو سوننەتانەی بە هۆیەکەوە ئەکرێن لەو کاتانەدا و سوننەت لە ڕۆژی جومعە لە کاتی ڕاوەستانی ڕۆژ لەناوەڕاستی ئاسمان (إستواء) دا و سوننەتی ناو حەرەمی مەککەیان بە ڕەوا داناوە بەبێ کەراهەت.

مالیکی‌یەکان ڕایان وایە کە حەرامە کردنی نوێژی سوننەت لەکاتی ڕۆژئاوابوون و ڕۆژهەڵاتنەدا گەرچی سوننەتەکە هۆیەکیشی هەبێ، هەروەها نوێژی نەزرو سەجدەی تیلاوەت و نوێژی مردووشیان لەو دوو کاتەدا بە حەرام داناوە.

بەڵام ئەگەر ترسی تێك چوونی لاشەی مردووەکە هەبوو ئەوە دروستە نوێژی لەسەر بکرێت لەو دوو کاتەدا، وە فەرزە عەینی‌یەکان بە (أداء) حازر یا گێڕانەوە لەو دوو کاتەدا بە ڕەوا دائەنێن، هەروەها نوێژ بە شێوەیەکی گشتی (مطلقاً) چ فەرز بێ یا سوننەت بێ، لەکاتی وەستانی ڕۆژ لەناوەڕاستی ئاسماندا (إستواء) بە ڕەوایان زانیوە.

(باجی) لە شەرحی (الموطأ) دا دەفەرمووێت: لە (المبسوط) دا هاتووە لە ئیبنو وەهبەوە: پرسیار کرا لە مالیك دەربارەی نوێژ کردن لەکاتی نیوەی ڕۆژدا، فەرموی: خەڵکم ئەبینی کە لە نیوەی ڕۆژدا ڕۆژی جومعە نوێژیان ئەکرد (واتە: سوننەت)، وە لە هەندێ (حدیث)دا نوێژ کردن

---

(١) جیاکردنەوەی عەسری ئەو ڕۆژە ڕاستە، بەڵام جیا کردنەوەی نوێژی جەنازە وانی‌یە، لەبەر ئەوەی بەڵگەی لەسەر نی‌یە، بەڵکو گشتی‌یەتی حەدیسی عوقبەی پێشو ئەوەی لە واتایدایە ئەی گرتەوە، وە ئەوەی پشتی دەگرێت ئەوەیە کە ئیبنو عومەر نەهی دەکرد نوێژ بکرێت لەسەر جەنازە لەکاتی خۆر هەڵاتن هەروەك لە (الموطأ) دا وجگە لەویشدا هاتووە. وە چاکتر ئەوەیە کە نوێژی لەبیر چوو و نوێژی خەوتوو جیا بکرێتەوە، جا نوێژ ئەکات هەرکاتێك بیری کەوتەوە لەکاتی کەراهەتیشدا بێ، بەپێی حەدیسی شەیخەین کە لە بابی پێشووی ئەم کیتابەدا باس کرا.

پاشان ئەوەی دانەر باسی کردووە لە جیاکردنەوەی هەندێك لە پێشەوایان، بۆ نوێژی سوننەت لە ڕۆژی جومعەدا لەکاتی (استواء)دا، ئەویش ڕاست ودروستە، وە حەدیسێکی زۆر لەبارەیەوە هەیە بۆی بگەڕێوە لە (زاد المعاد) و (إعلام أهل العصر بحكم ركعتي الفجر) ی (عظيم آبادي)، وە جگە لەمانش. (تمام المنة).

لەو کاتەدا نەهی لێ کراوە، بەڵام من نەهی لێ ناکەم لەبەر ئەوەوی ئەم بینین نوێژیان ئەکرد، وە من بۆ خۆم پێم خۆش نیە لەو کاتەدا نوێژ بکرێ لەبەر ئەو نەهی‌یەی کە لەو بارەوە هاتووە.

بەڵام حەنبەلی‌یەکان بۆ نادروستی نوێژی سوننەت چوون بە شێوەیەکی گشتی (مطلقاً) لەو سێ کاتەدا، جا ئەو سوننەتە چ لەبەر هۆیەك بێ یان نا، وە چ لە مەککە بێ یا لە غەیری مەککە، وە چ لە ڕۆژی جومعەدا بێ یان لە غەیری ڕۆژی جومعە، ئیللا (تحية المسجد) نەبێ لە ڕۆژی جومعە، کە بەبێ کەراهەت لەکاتی (إستواء) و لەکاتی (خطبة) کەدا ڕێگای کردنیان داوە، وە هەروەها لای ئەوان لەو سێ کاتەدا کردنی نوێژی مردووش حەرامە، مەگەر مەترسی تێك چوونی لاشەی مردووەکە هەبێت، ئەوسا نوێژ کردن لەسەری دروستە بەبێ ئەوەی کەراهەتی هەبێ، وە لەو سێ کاتەدا بە ڕەوایان داناوە گێڕانەوەی نوێژی فەوتاو و کردنی نوێژی فەرزو دوو ڕکاتەی تەواف، با سوننەتیش بێ.

نوێژی سوننەت لە دوای دەرکەوتنی کازیوەی بەیان (فجر) و پێش نوێژی بەیانی:

لە خزمەتکارەکەی ئیبنو عومەرەوە کە ناوی یەسار بوو هاتووە دەفەرمووێت: ئیبنو عومەر چاوی پێم کەوت دووای دەرکەوتنی فەجر نوێژم ئەکرد، فەرمووی: پێغەمبەر ﷺ جارێك هاتە لامان ئەم کاتە نوێژمان ئەکرد فەرمووی: (لِيُبَلِّغ شَاهِدُكُم غَائِبَكُم أن لا صَلاةَ بَعدَ الصُّبح إلا رَكعَتَينِ) رواه أحمد وأبو داود[1]. واتە: با ئەوانەی ئامادەن لێرەدا ئاگاداری غائیبەکان بکەن کە دووای دەرکەوتنی بەیان جگە لەو دوو ڕکات نوێژە نوێژی تر نیە، وە (حديث)ەکە هەرچەندە (ضعيف)ە بەڵام چەند ڕێگایەکی هەیە یەکتر بەهێز ئەکەن، کەواتە ئەکرێتە بەڵگەی ئەوەی دووای دەرکەوتنی فەجر دوو ڕکات نوێژ زیاتر کەراهەتی هەیە، شەوکانی ئەم سوودەی بەخشیوە.

وە حەسەن و شافیعی و ئیبنو حەزم بۆ دروستی کردنی نوێژی سوننەت چوون بە گشتی (مطلقاً) بێ کەراهەت.

بەڵام مالیك تەنها بۆ ئەو کەسانەی شەونوێژیان بۆ نەکراوە لەبەر مەعزەرەتێك بە دروستی داناوە.

وە دەفەرمووێت: پێم گەیشتووە عبداللەی کوڕی عەبباس و قاسمی کوڕی موحەممەدو عبد الله ی کوڕی عامیری کوڕی ڕەبیعە لە دووای فەجر نوێژی وەتریان کردووە.

عبد الله ی کوڕی مەسعود دەفەرمووێت: گوێ نادەمێ لەو کاتەدا من نوێژی وەتر بکەم و لەولامەوە قامەت بۆ نوێژی بەیانی بکرێت.

---

(١) ئەم حەدیسە صەحیحە هەروەك شێخ ئەلبانی لە (صحيح ابن ماجة) دا بە ژمارە (٥٢٥٢) دەفەرمووێت.

وە لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە هاتوە دەفەرمووێت: عوبادەی کوڕی صامت پێش نوێژی بۆ کۆمەڵێك ئەکرد ڕۆژێك هات بۆ نوێژی بەیانی، جا بانگدەر قامەتی کرد بۆ نوێژی بەیانی، عوبادەش بێ دەنگی کرد تا لە نوێژە وەترەکەی بۆوە، پاشان پێش نوێژی بۆ کردن.

لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە هاتووە ئیبنو عەبباس جارێك ڕاکشا بوو لەپاشاندا هەڵسا و بە خزمەتکارەکەی فەرموو: سەیرکە بزانە خەڵکەکە چی ئەکەن ـ ئەو کاتە کوێر ببو ـ خزمەت کارەکە ڕۆیشت و گەڕایەوە ووتی: خەڵکەکە نوێژی بەیانیان کردووە و سڵاویان داوەتەوە، ئیبنوعەبباس هەڵسا نوێژە ویترەکەی کرد ئینجا نوێژی بەیانی کرد.

نوێژی سوننەت لە کاتی قامەت کردندا:

کاتێ قامەت کرا بۆ نوێژ کەراهەتی هەیە خۆ مەشغوڵ بکرێ بە نوێژی سوننەتەوە، لە ئەبی هورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذا أُقِيمَتِ الصَّلاةُ فَلا صَلاةَ إلا المَكتُوبَةَ) وفي رواية (إلا التِي أُقِيمَت) رواه أحمد ومسلم وأصحاب السنن. واتە: کاتێ قامەت کرا بۆ نوێژ جگە لە نوێژە فەرزەکە نوێژی تر ناکرێت، وە لە ریوایەتێکی تردا هاتووە فەرموویەتی: جگە لەو نوێژەی قامەتی بۆ کراوە نوێژی تر ناکرێت.

لە عبد الله ی کوڕی سەرجسەوە هاتووە دەفەرمووێت: پیاوێك هاتە ناو مزگەوتەوە پێغەمبەر ﷺ نوێژی بەیانی ئەکرد، کابرا چوو لەلای مزگەوتەکەوە دوو ڕکات نوێژی کرد، ئینجا هاتە ناو ڕیزەوە بۆ نوێژی بەیانی، پێغەمبەر ﷺ کاتێ سڵاوی دایەوە فەرمووی: (يَا فُلان بِأيِّ الصَّلاتَينِ اعتَدَدتَ، بِصَلاتِكَ وَحدَكَ أم بِصَلاتِكَ مَعَنَا؟) رواه مسلم وأبوداود والنسائي. واتە: فلان کام نوێژیانت بۆ خۆت حساب کرد، ئەو نوێژەی بە تەنها کردت یا ئەو نوێژەی لەگەڵ ئێمەدا کردت.

پێغەمبەر ﷺ هەرچەندە ئینکاری لەو کارە کرد بەڵام فەرمانی نەکرد بە کابرا نوێژەکەی بگێڕێتەوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو نوێژە دروستە هەرچەندە کەراهەتی هەبووە.

لە ئیبنو عەبباسەوە هاتووە دەفەرمووێت: بانگبێژ دەستی کرد بە قامەت و من نوێژم ئەکرد، پێغەمبەر ﷺ ڕای کێشام و فەرمووی: (أتُصَلِّي الصُّبحَ أربَعاً؟) رواه البيهقي والطبراني وأبوداود والطيالسي وأبويعلى والحاكم وقال إنه على شرط الشيخين. واتە: ئایا نوێژی بەیانی چوار ڕکات ئەکەیت؟.

لە ئەبو موسای ئەشعەرییەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی بینی دوو ڕکات نوێژی سوننەتی بەیانی ئەکرد لەوکاتەدا کە بانگ بێژ بانگی ئەدا، پێغەمبەریش

له هەردوو شانیەوە ژەن و فەرمووی: (ألا كَانَ هَذَا قَبلَ هَذَا) رواه الطبراني. قال العراقي: إسناده حسن. واته: نەئەبوو ئەو نوێژەت پێش ئەو بانگە بەجێ بهێنایە.

## بانگ دان

(١) بانگ دان:

ڕاگەیاندنە بۆ كاتی هاتنی نوێژ بەهۆی كۆمەڵە ووشەیەكی تایبەتی‌یەوە. وە بەو ڕاگەیاندنە خەڵكی بانگ ئەكرێن بۆ نوێژی جەماعەت وە دەرخستنی (شعائر) دروشمەكانی ئیسلامە. وە بانگ یان واجبە یان سوننەتە[1].

(قرطبـــي) و هەندێ لە زانایانی تر ئەڵێن: بانگ هەرچەندە ووشەكانیشی كەمە، مەسەلەكانی عەقیدەی تێدایە، چونكە بە گەورە دانانی خوا دەست پێ ئەكات كە ئەویش وجودی خواو كەماڵی خوا ئەگەیەنێ، پاشان هاواری یەكتایی و بێ هاوبەشی خوا ئەكرێت، پاشان ئیسباتی (رساله) ی پێغەمبەرایەتی موحەممەد ئەكا ﷺ، پاشان لە دووای شایەتی دانی پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺ خەڵكی بانگ ئەكات بۆ عیبادەتێكی تایبەتی، چونكە ئەو عیبادەتە لە لایەنی پێغەمبەرەوە ﷺ نەبێ نازانرێ، پاشان خەڵكی بانگ ئەكا بۆ ڕزگاری، كە ئەویش مانەوەی هەمیشەیی‌یە، وە هەروەها لە بانگدا ئاماژەی ڕۆژی دوایی و زیندووبوونەوەی تێدایە، پاشان ئەو شتانە لە بانگەكەدا دووبارە ئەكرێتەوە لەبۆ تەئكید كردنە.

(٢) (فضل) و گەورەیی بانگ:

---

(١) وا پێ دەچێت دانەر ڕەحمەتی خوای لێ بێت فورسەتی بۆ نەرەخسابێت بۆ ئەوەی لە ووتەكە بكۆڵێتەوە تا ڕوونی بكاتەوە لەو دوو قەولە كامیان حەقە، چونكە ووتن بەوەی كە بانگ دان كارێكی مەندووبە گومانمان نی‌یە لەوەدا كە ووتەیەكی بەتاڵە، چۆن مەندووب نەبێت لەكاتێكدا كە بانگ دان لە گەورەترین دروشمەكانی ئیسلامی‌یە كە ئەگەر پێغەمبەر ﷺ لە زەوی قەومێكدا گوێبیستی نەبووایە دەهات و دەیدا بەسەریاندا و غەزایانی دەكرد، وە ئەگەر گوێ بیستی ببووایە ئەوا هێرشی نەدەكردە سەریان هەروەك سابت بوە لە صەحیحەین و جگە لەوانیشدا كە فەرمانی پێ كردوە لە زیاتر لە حەدیسێكی صەحیحدا، وە واجب بون بە كەمتر لەوەش سابت نەبێ ، جا ڕاستی ئەوەیە كە بانگ دان فەرزی كیفایەیە، هەرئەوەشە كە شێخی ئیسلام لە (الفتاوی) دا (١/٦٧-٦٨و٤-٢٠) بە صەحیحی داناوە، بەڵكو تەنها لەسەر تاكە كەسێكیشی واجب كردووە وەك باسی دێت. وە بەڵگەی تریش دێنین لەسەر واجبی‌یەتی بانگ لە باسی (نوێژی جەماعەت)دا (تمام المنة).

دەربارەی (فضل) ی بانگ و بانگدەران (حدیث)ی زۆر هاتووە، وا لە خوارەوە هەندێکیان باس ئەکەین:

١- لە ئەبی هورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لَو يَعلَمُ النَّاسُ مَا فِي الأذَانِ وَالصَّفِّ الأوَّلِ ثُمَّ لَم يَجِدُوا إلَّا أن يَستَهِمُوا عَلَيهِ لاستَهَمُوا، وَلَو يَعلَمُونَ مَا فِي التَّهجِيرِ لاستَبَقُوا إلَيهِ وَلَو يَعلَمُونَ مَا فِي العَتَمَةِ وَالصُّبحِ لأتَوهُمَا وَلَو حَبواً) رواه البخاري ومسلم. واتە: ئەگەر خەڵك ئەیانزانی چ (فضل) و پاداشێك لە بانگدان و ڕیزی پێشەوەی جەماعەتدا هەیە هیچیان بۆ نەئەماوە ئەوە نەبێت قورعەیان بۆ ئەکرد، وە ئەگەر ئەیان زانی زوو چوون بۆ نوێژی نیوەڕۆ چی تێدایە پێش برکێیان بۆ ئەکرد، وە ئەگەر ئەیان زانی چ پاداش و (فضل) ێك لە نوێژی خەوتنان و بەیانیدا هەیە بە گاگۆلکێش بوایە بۆی ئەهاتن.

٢- لە موعاویەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إنَّ المُؤَذِّنِينَ أطوَلُ النَّاسِ أعنَاقاً يَومَ القِيَامَةِ) رواه أحمد ومسلم وابن ماجه. واتە: بانگ بێژەکان لە ڕۆژی دواییدا گەردنیان لە هەموو کەس درێژترە.

٣- لە بەرائی کوڕی عازیبەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إنَّ اللهَ وَمَلائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى الصَّفِّ المُقَدَّمِ وَالمُؤَذِّنُ يُغفَرُ لَهُ مُدَّ صَوتِهِ وَيُصَدِّقُهُ مَن سَمِعَهُ مِن رَطبٍ وَيَابِسٍ وَلَهُ مِثلُ أجرِ مَن صَلَّى مَعَهُ) قال المنذري: رواه أحمد والنسائي بإسنادٍ حسنٍ جيد. واتە: خوا ڕەحمەت ئەڕژێنێ و فریشتەکان ئەپاڕێنەوە بۆ ئەوانەی لە ڕیزی یەکەمی نوێژدا وەستاوون، وە بانگدەر چەند دەنگی بڕوات ئەوەندە لێ خۆش بوونی بۆ هەیە، وە هەرچی لە تەڕ و ووشك ئەو بانگە ببیستێ شایەتی بۆ ئەدات و باوەڕی پێ ئەکات، وە ئەوەندەی پاداشتی ئەو کەسانەی بۆ ئەنووسرێت کە بەو بانگە نوێژ دەکەن لەگەڵی.

٤- لە ئەبو دەردائەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرموێت: لە پێغەمبەرم ﷺ بیستووە ئەی فەرموو: (مَا مِن ثَلاثَةٍ لا يُؤَذِّنُونَ وَلا تُقَامُ فِيهِمُ الصَّلاةُ إلا استَحوَذَ عَلَيهِمُ الشَّيطَانُ) رواه أحمد. واتە: هیچ سێ کەسێك نیە بە یەکەوە بن نە بانگ بدەن و نە قامەت بکەن ئیللا شەیتان بەسەریاندا زاڵ ئەبێت.

٥- لە ئەبی هورەیرەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الإمَامُ ضَامِنٌ وَالمُؤَذِّنُ مُؤتَمَنٌ، اللَّهُمَّ أرشِدِ الأئِمَّةَ وَاغفِر لِلمُؤَذِّنِينَ). واتە: پێش نوێژ زامنەو بانگدەر جێی متمانەیە. خوایە ڕێ نومایی پێش نوێژەکان بکە، و لە بانگدەرانیش خۆش بە.

٦- لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (يَعجَبُ رَبُّكَ عَزَّوَجَلَّ مِن رَاعِي غَنَمٍ فِي شَظِيَةٍ بِجَبَلٍ يُؤَذِّنُ لِلصَّلاةِ وَيُصَلِّي، فَيَقُولُ اللهُ عَزَّوَجَل:

أُنظُروا لِعَبدي هَذَا يُؤَذِّنُ وَيُقِيمُ الصَّلاةَ يَخافُ مِنِّي! قَد غَفَرتُ لِعَبدِي وَأَدخَلتُهُ الجَنَّةَ) رواه أحمد وأبوداود والنسائي. واته: پەروەردگاری بەدەسەڵات و بەتوانات (معجب)ە بەو شوانەی بە بناری شاخێکەوە تاژەڵ ئەلەوەڕێنێ، کاتێ کاتی نوێژ هات بۆخۆی بانگ ئەدات و نوێژ ئەکات، ئەفەرمووێت: سەیری ئەو بەندەیەم بکەن بانگ ئەدات و قامەت بۆ نوێژ ئەکات، وە ئەو لە من ئەترسێ، وا لێی خۆش بووم و ئەیخەمە بەهەشتەوە.

(٣) هۆی دانانی بانگ لە شەرعدا:

لە ساڵی یەکەمی کۆچیدا بانگ دانرا، وە هۆی دانانی ئەم (حدیث) انەی خوارەوە ڕوونی ئەکاتەوە:

أ- لە نافیعەوە هاتووە کە ئیبنو عومەر دەیفەرموو: (موسڵمانەکان کۆ ئەبوونەوە بۆ کردنی نوێژ، کاتیان بۆ نوێژ تەقدیر ئەکرد بۆ ئەوەی بێن نوێژەکانیان بکەن، وە هیچ کەس بانگی نەئەدا بۆ نوێژ، جا ڕۆژێك لەو بارەیەوە دووان، هەندێك وتیان: زەنگێك دابنێن وەك زەنگی گاورەکان خەلکی پێ کۆ بکەینەوە بۆ نوێژ. وە هەندێکیان وتیان: نەخێر با کەرەنایەك وەك کەرەنای جوولەکە بەکار بهێنین، عومەر فەرمووی: ئەی بۆچی کەسێك نانێرن بانگ بدات بۆ نوێژ. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئەی بیلال هەڵسە بانگ بکە بۆ نوێژ) ئەحمەدو بوخاری گێڕاویانەتەوە.

ب- لە عەبدوڵلای کوڕی زەیدی کوڕی (عبد ربه) ی‌یەوە هاتووە دەفەرمووێت: کاتێ پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دا بە لێدانی زەنگ بۆ ئەوەی خەڵك کۆ بکەنەوە بۆ نوێژ. وە لە ڕیوایەتێکدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ ئەو کارەی پێ ناخۆش بوو چونکە موافەقەی گاورەکانە، شەو خەوتم لە خەومدا کابرایەك ناقوسێکی بەدەستەوە بوو. منیش پێم وت: ئەی بەندەی خوا ئەو ناقوسە نافرۆشێت؟ وتی: بۆچیتە؟ وتم: بانگی خەڵکی پێ ئەکەم بۆ نوێژ. وتی: ئەی بۆ شتێکت فێر نەکەم لەوە چاکتر بێت ؟ وتم: باشە فێرم بکە، وتی: بڵێ:

الله أكبر، الله أكبر، الله أكبر الله أكبر. أشهد أن لاَّ إله إلا الله، أشهد أن لاَّ إله إلا الله. أشهد أنَّ محمداً رسول الله، أشهد أنَّ محمداً رسول الله. حيَّ على الصَّلاة، حيَّ على الصَّلاة. حيَّ على الفلاح، حيَّ على الفلاح. الله أكبر، الله أكبر، لا إله إلا الله.

پاشان ماوەیەکی زۆری پێ نەچوو پێی وتم: بۆ قامەتیش ئەمە بڵێ[1]:

---

(١) سودێك :

ئەم حەدیسە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە سوننەتە قامەت لە خودی شوێنی بانگ دانەکەدا نەکرێت.

الله أكبر، الله أكبر، أشهد أن لا إله إلا الله، أشهد أنَّ محمداً رسول الله. حيَّ على الصلاة، حيَّ على الفلاح، قد قامت الصلاة، قد قامت الصلاة، الله أكبر، الله أكبر، لا إله إلا الله.

ئەڵێ: کاتێ بەیانی هەڵسام لە خەو چوومە لای پێغەمبەر ﷺ چیم دی بۆم گێڕایەوە فەرمووی: ئەوە خەوی هەقە (إن شاء الله) هەڵسە لەگەڵ بیلال چۆنت بینیوە بۆی بڵێ با بانگی پێ بدات، چونکە ئەو دەنگی لە دەنگی تۆ بەرزترو خۆشترە، ئەڵێ: هەڵسام لەگەڵ بیلال من بۆم ئەوت و ئەو بانگی پێ ئەدا، عومەر کە لە ماڵی خۆیان بوو گوێی لەوە بو بەپەلە هات و ڕیدائەکەی ڕائەکێشاو ئەیووت بە پێغەمبەر ﷺ: بەو زاتەی تۆی بە هەق ناردووە منیش وەك ئەو ەم بینی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (الحمد لله) ئەحمەدو ئەبو داودو ئیبنوماجەو (ترمذي) گێڕاویانەتەوە، (ترمذي) دەفەرموێت: (حسنٌ صحيحٌ)[1]. ـ ڕیداء بالاپۆش ـ

(٤) چۆنیەتی بانگ.

بانگ بەسێ شێوە هاتووە، وا لە خوارەوە باسیان ئەکەین:

یەکەم: چوار جار ووتنی (الله أكبر) وە ئەوانی تر دووجار بەبێ (ترجيع) بێجگە لە کەلیمەی تەوحید، لەم شێوەیەدا ووشەکانی پانزە ووشە دەرئەچن. بەپێی (حديث)ەکەی عەبدوڵلای کوڕی زەید کە لەپێشەوە باس کرا.

دووەم : چوار جار ووتنی (الله أكبر) وە (ترجيع) ی هەریەك لە دوو شەهادەت، واتە: بانگ بێژ بڵێ: (أشهد أن لا إله إلا الله، أشهد أن لا إله إلا الله، أشهد أن محمداً رسول الله، أشهد أن محمداً رسول الله) لە ئەوەی ئەوەڵ دا کەمێ دەنگی نزم بکاتەوە پاشان دووبارەی بکاتەوە بەدەنگی بەرزەوە.

لە (أبو محذورة)ەوە هاتوە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ بانگی فێر کردم نۆزدە ووشە بوو. (رواه الخمسة وقال الترمذي: حديث حسن صحيح).

سێیەم: دوو جار ووتنی: (الله أكبر) لەگەڵ (ترجيع) دووبارە کردنەوەی، بەرزو نزمی شایەتومان، لەم شێوەیاندا ژمارەی ووشەکان حەڤدە ووشە دەرئەچێت، بەپێی ئەوەی موسلیم لە (أبو محذورة) ەوە ئەگێڕێتەوە کە دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ ئەم بانگەی فێر کردم:

(الله أكبر، الله أكبر، أشهد أن لا إله إلا الله، أشهد أن لا إله إلا الله، أشهد أنَّ محمداً رسول الله، أشهد أنَّ محمداً رسول الله) پاشان بگەڕێتەوە بڵێت: (أشهد أن لا إله إلا الله) دووجار (أشهد أنَّ

---

پاشان شێخ ئەلبانی ڕای هەندێك لە زانایان باس دەکات و بەڵگەکانیشیان باس دەکات کە پێیان وایە قامەت هەر لە شوێنی بانگەکەدا بوترێت باشە، وە ڕەددی ئەم ڕایەشی داوەتەوە، بۆ زیاتر بڕوانە (تمام المنة).

(١) بڕوانە صحيح أبي داود (٤٦٩).

محمداً رسول الله) دوو جار، (حيَّ على الصلاة) دوو جار، (حيَّ على الفلاح) دوو جار (الله أكبر، الله أكبر، لا إله إلا الله).

(٥) (تثويب) :

شەرع داینـاوە بۆ بانگبێژ کە (تثويب) بکات ئەویش ئەوەیە لە بانگی بەیانیدا بڵێت: (الصلاة خير من النوم) واتە: نوێژ باشترە لە نوستن.

(أبو محذورة) فەرموویەتی: ئەی نێرراوی خوا فێری سوننەتی بانگدانم بکە. ئەویش فێری کردو فەرمووی: ئەگەر بانگەکە بۆ نوێژی بەیانی بوو بڵێ: (الصَّلاةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوم، الصَّلاةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوم، الله أكبر، الله أكبر، لا إله إلا الله) ئەحمەدو ئەبو داود گێڕاویانەتەوە، وە (تثويب) لە بانگی بەیانیدا نەبێت شەرعی نیە[1].

---

(١) ووتنی (الصلاة خير من النوم) لە بانگی یەکەمی بەیانیدایە، کە بەر لەکاتی نوێژە بە چارەکە سەعاتێك، بە بەڵگەی حەدیسی ئیبنو عومەر خوای لێ ڕازی بێت دەفەرموێت: (الصلاة خير من النوم) دو جار بوو لە بانگی یەکەمی بەیانیدا لە دوای (حي على الفلاح)ەوە بو) رواه البيهقي (١/٤٢٣)، كذا الطحاوي في شرح المعاني (١/٨٢) وسەنەدەکەی حەسەنە وەك (حافظ) دەفەرموێت. وە حەدیسی (أبو محذورة مطلق) ڕەهایە، هەردوو بانگەکە دەگرێتەوە، بەڵام بانگی دووەم مەبەست نیە، لەبەر ئەوەی بە موقەییەدی هاتووە لە ڕیوایەتێکی تردا بە لەفزی: «ئەگەر بانگی یەکەمت دا لە بەیانیدا بڵێ: (الصلاة خير من النوم، الصلاة خير من النوم) أخرجه أبوداود والنسائي والطحاوي وغيرهم وە تەخریج کراوە لە صەحیحی ئەبوداوددا (٥١٠-٥١٦)» جا حەدیسەکەی (أبو محذورة) لەگەڵ حەدیسەکەی ئیبنوعومەر پێك هات، هەر بۆیە صەنعانی لە (سبل السلام) دا (١/١٦٧-١٦٨) لەپاش لەفزەکەی نسائی دەفەرموێت:

«لەمەدا تەقیید کردنی ئەو ڕیوایەتە (مطلق)انەی تێدایە، ئیبنو ڕەسلان دەفەرموێت: ئەم ڕیوایەتە ئیبنوخوزەیمە بە صحیحی داناوە، وە دەفەرموێت: شەرعیەتی ووتنی (الصلاة خير من النوم) بۆ بانگی یەکەمە لە فەجر، چونکە بۆ ئاگا کردنی خەوتووانە، ئەما بانگی دووەم بۆ ڕاگەیاندنی هاتنی کاتەکەیە بە خەڵکی و بانگ کردنە بۆ نوێژ. لە (تخريج الزركشي لأحاديث الرافعي)دا ئەم باسە هاتوە. وە وتنەی ئەمە لە (سنن البيهقي الكبرى) لە ئەبی مەحزورەوە هاتوە کە ئەو بە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ لە بانگی یەکەم لە بەیانیدا ئەی ووت: (الصلاة خير من النوم).

منیش دەڵێم: (واتە شێخ ئەلبانی): بەپێی ئەمە (الصلاة خير من النوم) لە لەفزەکانی بانگ نیە کە دانراوە بۆ بانگ کردن بۆ نوێژ و بۆ ڕاگەیاندنی هاتنی کاتەکەی، بەڵکو لەو لەفزانەیە کە دانراوە بۆ بە خەبەر کردنەوەی خەوتوو، جا خەڵکی لەم چەرخەدا خوویان پێوە گرتووەو لە بانگی دوەمدا دەیڵێن، وەك لە فزەکانی تەسبیحاتی دوایی کە دەیڵێن لە جیاتی بانگی یەکەم.

**(٦) چۆنیەتی قامەت کردن:-**

**بە سێ شێوە قامەت کردن هاتووە کە ئەمانەن:**

**یەکەم: چوار جار وتنی: (الله أکبر) ی ئەووەڵ، دوو جار وتنی ووشەکانی تر جگە لە ووشەی دوایی، بەپێی (حدیث) ەکەی (أبو محذورة) کە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فێری قامەتی کردووم حەڤدە ووشەیە: (الله أکبر) چوار جار، (أشهد أن لا إله إلا الله) دوو جار، (أشهد أن محمداً رسول الله) دوو جار، (حي على الصلاة) دوو جار، (حي على الفلاح) دوو جار، (قد قامت الصلاة، قد قامت الصلاة، الله أکبر، الله اکبر، لا إله إلا الله) رواه الخمسة وصححه الترمذي.**

**دووەم : لەم شێوەیەدا (الله أکبر) ی یەکەم و کۆتایی دووجار، (قد قامت الصلاة) دوو جار، ووشەکانی تر یەکجار ، کەواتە ژمارەی هەموو ووشەکانی ئەکاتە (١١) ووشە، وە لە (حدیث)ەکەی عبد الله ی کوڕی زەیددا کە لە پێشەوە باس کرا دەفەرمووێت: پاشان کاتێ قامەتت کرد ئەڵێیت: (الله أکبر، الله أکبر، أشهد أن لا إله إلا الله، أشهد أن محمداً رسول الله، حي على الصلاة، حي على الفلاح، قد قامت الصلاة، قد قامت الصلاة، الله أکبر، الله أکبر، لا إله إلا الله).**

**سێیەم: ئەم شێوەیان وەك شێوەکەی پێشوو وایە تەنها لێرەدا ووشەی (قد قامت الصلاة) تێیدا دووبارە ناکرێتەوە، بەڵکو یەکجار ئەووترێ، کەواتە بەم شێوەیە، ووشەکانی (دە) ووشە ئەبن، وە ئیمامی مالیك لەسەر ئەم شێوەیەیان ڕۆیشتووە، چونکە کاری خەڵکی مەدینە بووە بەڵام ئیبنوقەییم دەفەرمووێت: هەرگیز بە صەحیحی لە پێغەمبەرەوە ﷺ نەهاتووە (قد قامت الصلاة) یەکجار بوترێت. (ابن عبدالبر)یش دەفەرمووێت: لە هەموو حاڵەتێکدا دووجار دووبارە ئەکرێتەوە.**

---

وە بۆیە قسەم درێژی پێ دا لەم مەسەلەیەدا چونکە یەکەم، کاری زۆربەی بانگ دەران لە وڵاتە ئیسلامییەکان بە پێچەوانەی سوننەتە، وە دووەم لەبەر ئەوەی کەم لە دانەران بە ڕاشکاوی باسیان کردووە، چونکە جومهوریان ـ وە لە پشتیانەوە سید سابق ـ کەمتەر خەمی ئەکەن لە درێژەدانی ووتە لەو بارەیەوە، وە ڕوونی ناکەنەوە کە ئەوە لە بانگی یەکەمە لە فەجر. هەروەك بە ڕاشکاوی هاتوە لە حەدیسە صەحیحەکاندا، بە پێچەوانەی ئەو ڕوون کردنەوەی ئیبنو ڕەسلان و صەنعانی کە کردوویانە خوا پاداشی خێریان بداتەوە.

وە لەوەی کە باس کرا بۆت ڕوون بۆوە کە ووتنی (الصلاة خیر من النوم) لە بانگی دووەمدا بیدعەتە و پێچەوانەی سوننەتە، وە پێچەوانەییەکە زیاتر دەبێت کاتێك بە یەکجاری پشت لە بانگی یەکەم دەکەنەوە نایدەن، وە سوور دەبن لەسەر ووتنی (الصلاة خیر من النوم) لە بانگی دووەمدا، چەندە شیاون بەم فەرمودەی خوای گەورە: ﴿أَتَسۡتَبۡدِلُونَ ٱلَّذِي هُوَ أَدۡنَىٰ بِٱلَّذِي هُوَ خَيۡرٌ﴾ ، ﴿لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ﴾ واتە: «ئایا لەباتی چاکتر کەم بایەخترتان دەوێت؟» ، «ئەگەر بتانزانیبایە». (تمام المنة).

(٧) ـ ذکر ـ یادی خوا کردن کاتێ بانگ ئەدرێ :

(مستحب) ە هەرکەس گوێی لە بانگ بوو ئەم یادانە بکات:

أ- بانگدەر چی بڵێت ئەمیش بیڵێتەوە جگە لە دوو (حيَّ على)کانا نەبێت، کە بڵێت: (لاحول ولا قوة إلا بالله).

لە ئەبو سەعیدی خودریەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إِذَا سَمِعتُمُ النِّدَاءَ فَقُولُوا مِثلَ مَا يَقُولُ المُؤَذِّن) رواه الجماعة. واتە: کاتێ گوێتان لە بانگ بوو بانگ بێژ چی دەفەرموێت ئێوەش ئەوە بڵێن.

لە عومەرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (هەرکاتێك بانگبێژ ووتی: (الله أكبر، الله أكبر) یەکێك لە ئێوە بە دوایدا ووتی (الله أكبر، الله اكبر)، وە ئەگەر ووتی: (أشهد أن لا إله إلا الله) بڵێ: (أشهد أن لا إله إلا الله) وە ئەگەر ووتی: (أشهد أن محمداً رسول الله) بڵێ: (أشهد أن محمداً رسول الله)، وە ئەگەر ووتی: (حي على الصلاة) بڵێ: (لاحول ولا قوة إلا بالله)، وە ئەگەر ووتی: (حي على الفلاح) بڵێ: (لاحول ولاقوة إلا بالله)، پاشان ئەگەر ووتی: (ألله أكبر، الله أكبر) بڵێ: (الله أكبر، الله أكبر) پاشان ئەگەر ووتی: (لا إله إلا الله) بڵێ: (لا إله إلا الله) لە دڵیەوە وا بڵێت، ئەوە ئەچێتە بەهەشت). رواه مسلم وأبو داود.

نەوەوی دەفەرموێت: هاوەڵەکانی ئێمە ووتوویانە: هەرکەس گوێی لە بانگ بوو پەسەندە بۆی بەدووای بانگ بێژدا ووشەکان بڵێتەوە جگە لە (حي على)کان نەبێ چونکە ووتنەوەیان بەڵگەیە لەسەر ڕازی بوونی و ڕێك کەوتنی لەسەر بانگ، بەڵام (حي على) بانگ کردنە بۆ نوێژ، ئەمەش شیاوی بانگ بێژە بیڵێت، بۆیە پەسەندە بۆ ئەو کەسە یادێکی تر بکات، ئەویش ووتنی: (لاحول ولا قوة إلا بالله)یە، چونکە حەواڵە کردنێکی تەواوی تێدایە بۆلای خوا.

وە لە هەردوو صەحیحی بوخاری و موسلیمدا (ثابت) بوە لە ئەبو موسای ئەشعەریەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا حَولَ وَلا قُوَّةَ إلا بِاللهِ كنزٌ مِن كُنُوزِ الجَنَّة). واتە: (لاحول ولا قوة إلا بالله) گەنجینەیەکە لە گەنجینەکانی بەهەشت.

هەروەها هاوەڵەکانمان فەرموویانە: (مستحب)ە بۆ هەموو کەس دەست نوێژدار و بێ دەست نوێژ لەش گران و حەیزدار گەورەو بچوك لەدووای بانگ دەرەوە ئەو ووتانە بڵێتەوە، چونکە یادی خوای گەورەن، وە ئەمانیش هەموویان ئەهلی (ذِکر)ن، تەنها کەسێك لەوان جیا ئەکرێتەوە کە لەو کاتەدا نوێژ بکات، یا لەسەر پێشاو بێت یا خەریکی جیماع کردن بێت، جا ئەگەر لە پێشاو هاتە دەرو بانگ بێژ لێ نەبوبۆوە بە دوایدا بیڵێتەوە، وە ئەگەر کەسێك خەریکی قورئان خوێندن بوو یا

خەریکی یادی خوا بوو، یا خەریکی دەرس بوو، بیان بڕێت و شوێن بانگ بێژ بکەوێت لەپاشاندا بگەڕێتەوە سەریان ئەگەر پێی خۆش بوو، وە ئەگەر لە نوێژی فەرزدا بوو یا سوننەت، ئەوە شافیعی و هاوەڵەکان، ووتوویانە: با لە دوایەوە نەیڵێتەوە، وە هەرکاتێ لە نوێژەکە بۆوە بیڵێتەوە.

لە (المغنی) دا هاتووە: ئەگەر کەسێك چووە ناو مزگەوتەوە گوێی لە بانگ بێژ بوو بانگی ئەدا، موستەحەببە بۆی چاوەڕوانی بکات تاوەکو لە بانگەکە ئەبێتەوە، بانگ بێژەکە چی ووت ئەویش ئەوە بڵێتەوە، بۆ ئەوەی هەردوو (فضیلة) کەی پێکەوە دەست بکەوێت، بەڵام ئەگەر ئەوەی بانگ بێژ ئەی ووت ئەم نەی ووتەوەو دەست بکات بە نوێژ کردن ئەوە هیچی لەسەر نیە، ئەحمەد دانی پەمەدا ناوە.

ب- سڵاوەت دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ دووای بانگ بە یەکێ لەم شێوانەی خوارەوە کە هاتوون، پاشان داوای وەسیلە لە خوا بکات بۆ پێغەمبەر ﷺ ، بە پێی ئەوەی عەبدوڵلای کوڕی عەمر گێڕاویەتی‌یەوە کە گوێی لێ بووە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذا سَمِعتُمُ المُؤَذِّنَ فَقُولُوا مِثلَ مَا يَقُولُ ثُمَّ صَلُّوا عَلَيَّ فَإنَّهُ مَن صَلَّى عَلَي صلاةً صَلَّى اللهُ عَلَيهِ بِهَا عَشراً، ثُمَّ سَلُوا اللهَ لِيَ الوَسِيلَةَ فَإنَّها مَنزِلَةٌ فِي الجَنَّةِ لا تَنبَغِي إلا لِعَبدٍ مِن عِبَادِ اللهِ، وَأرجُوا أن أكُونَ انَا هُوَ، فَمَن سَألَ اللهَ لِيَ الوَسِيلَةَ حَلَّت لَهُ شَفَاعَتِي) رواه مسلم. واتە: کاتێ گوێتان لە بانگ بوو، بانگ بێژ چی ووت بیڵێنەوە، لەپاشان سڵاواتم لەسەر بدەن، چونکە هەرکەس یەك سڵاواتم لەسەر بدات خوا دە سڵاواتی لەسەر ئەدا، لەپاشان داوای وەسیلەم بۆ بکەن لە خوا، وەسیلە پلەیەکە لە بەهەشت بۆ یەکێك لە بەندەکانی خوا نەبێ بۆ کەسی تر نیە، بە هیوام ئەو بەندەیە من بم، جا هەرکەس داوای وەسیلەم بۆ بکات شەفاعەتی منی بۆ ڕەوا دەبێت.

لە جابیرەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس گوێی لە بانگ بوو لەو کاتەدا ووتی: (اللّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعوَةِ التَّامَّةِ، وَالصَّلاةِ القَائِمَةِ، آتِ مُحَمَّداً الوَسِيلَةَ وَالفَضِيلَةَ وَابعَثهُ مَقَاماً مَحمُوداً الَّذِي وَعَدتَّهُ) ئەوە لە ڕۆژی قیامەت شەفاعەتی منی بۆ ڕەوا دەبێت. رواه البخاري. واتە: خوایە، پەروەردگاری ئەم بانگەوازە تەواوە، وە ئەم نوێژە دابەستراوە، وەسیلەو (فضیلة) ببەخشە بە موحەممەد ﷺ وە لەسەر ئەو شوێنە پیرۆزەی کە پەیمانت پێ داوە زیندووی بکەرەوە.

(٨) پاڕانەوەی دووای بانگ:-

کاتی نێوان بانگ و قامەت کاتێکە هیوای ئەوەی لێ ئەکرێت کە پاڕانەوەی تێدا وەربگیرێت لەلایەن پەروەردگارەوە، بۆیە پەسەندە باوەڕدار زۆر بپاڕێتەوە لەخوای گەورە لەو کاتەدا. لە ئەنەسەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لايُرَدُّ الدُّعَاءُ بَينَ الأذَانِ

وَالإقَامَةِ) رواه أبو داود والنسائي والترمذي وقال: حسنٌ صحيح[1]. واته: پاڕانەوەی نێوان بانگ و قامەت گێڕانەوەی نیە. وە (ترمذي) بەم زیادەوە هێناویەتی: ووتیان: ئەی نێرراوی خوا چی بڵێین ؟ فەرمووی: (سَلُوا اللهَ العَفوَ وَالعَافِيَةَ فِي الدُّنيَا وَالآخِرَة). واته: داوا لە خوا بکەن لێخۆشبوون و سەلامەتی دنیاو قیامەتتان پێ بدا[2].

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: (پیاوێك بە پێغەمبەری ﷺ ووت: ئەی نێرراوی خوا بانگدەرەکان لە ئێمە پاداشیان چاکتر بۆ ئەنووسرێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوان چیان ووت تۆش لە دوایانەوە دووبارەی بکەرەوە پاشان داوا بکە لە خوا با پاداشت پێ بدا). ئەحمەدو ئەبو داود گێڕاویانەتەوە.

لە سەهلی کوڕی سەعدەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ثِنتَانِ لاتُرَدَّانِ، أو قَال: مَا تُرَدَّانِ ؛ الدُّعَاءُ عِندَ النِّدَاءِ، وَعِندَ البَأسِ، حِينَ يُلحِمُ بَعضُهُم بَعضاً) رواه أبو داود بإسنادٍ صحيح. واته دو دانە دوعاو پاڕانەوە گەڕانەوەیان نیە، کاتی بانگ دان و کاتێ سوپای باوەڕو سوپای بێ باوەڕ ئەدەن بە یەکدا.

لە ئومو سەلەمەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فێری کردووم کاتی بانگی ئێوارە بڵێم: (اللَّهُمَّ إنَّ هَذا إقبَالُ لَيلِكَ، وَإدبَارُ نَهَارِكَ وَأصوَاتُ دُعَائِكَ فَاغفِر لِي). واته: خوایە ئێستا کاتی هاتنی شەوەکەتە و ڕۆیشتنی ڕۆژەکەت، ئەوەش دەنگی بانگەوازکەرانی تۆیە جا لێم خۆش بە[3].

(٩) یادکردن لە کاتی قامەت کردندا:

(١) بڕوانە (صحيح أبي داود ٤٨٩).

(٢) حەدیسەکە صەحیحە وەك (ترمذي) فەرمویەتی، بەڵام ئەو زیادەیە لاوازو مونکەرە، لە سەنەدەکەیدا یەحیای کوڕی یەمان و زەیدی (عمّي) هەیە کە هەردووکیان لاوازن (تمام المنة).

(٣) دانەر لێی بێ دەنگ بووە وا دەردەخات کە سابت بووە، بەڵام وا نیە، لەبەر ئەوەی حەدیسێکی (ضعیف)ە، بێ دەنگ بووە لە تەخریجەکەی، وە ئەمە کارێکی باش نیە، وە (ترمذي) و جگە لەمیش لە ڕێگای (أبي كثير مولي أم سلمة)وە دەیگێڕێتەوە وە (ترمذي) دەفەرمووێت: حەدیسێکی غەریبە وە ئەبو کسیر ئێمە نایناسین، هەر بۆیە ئەوەوی دەفەرمووێت:

(رواه أبوداود والترمذي، وفي إسناده مجهول لا نعرفه) لەبەر ئەوە وتنەی ئەم حەدیسە دروست نیە بڵاو بکرێتەوە لە نێو ئومەتدا ئیللا لەگەڵ ئاشکرا کردنی لاوازی حاڵی نەبێت. (تمام المنة).

موستەحەببە بۆ ئەوکەسەی کە گوێی لە قامەت ئەبێت قامەت بێژ چی ئەڵێت بیڵێتەوە (قد قامت الصلاة) نەبێت کە پەسەندە بڵێت: (أقامها الله وأدامها) واتە: خوا ڕاوەستاوو بەردەوامی بکات.

لە هەندێ یارانی پێغەمبەرەوە ﷺ هاتووە فەرموویانە: کاتێ بیلال قامەتی کرد و گەیشتە (قد قامت الصلاة) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أقامها الله وأدامها) لە هەردوو (حي علی)کاندا نەبێت بڵێت: (لاحول ولا قوة إلا بالله)[1].

(١٠) بانگ دەر دەبێ چۆن بێت:

موستەحەببە کە بانگدەر ئەم سیفاتانەی خوارەوەی تێدا بێت:

١- تەنها لەبەر خوا بانگ بدات و کرێ وەرنەگرێت. لە (عثمان) ی کوڕی ئەبی عاصەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرموێت: ووتم: ئەی نێرراوی خوا بم کە بە ئیمامی هۆزەکەم با پێش نوێژیان بۆبکەم، فەرمووی: تۆ ئیمامی هۆزەکەت بە، لە نوێژ کردندا ئاگات لە لاوازو پەك کەوتەکان بێت، بانگدەرێك بگرە کرێ لەسەر بانگدانەکەی وەرنەگرێت، ئەبو داودو نەسائی و ئیبنو ماجە گێڕاویانەتەوە[2] وە (ترمذي) بە لەفزێکی تر هێناویەتی کە ئەمەیە: (ئاخر وەسیەت کە پێغەمبەر ﷺ بۆی کردم فەرموی: بانگ بێژێ بگرە کە لەسەر بانگ دانەکەی کرێ وەرنەگرێ) وە دووای ئەم ریوایەتەی ووتوویەتی: (حدیث حسن).

بەشی زۆری زانایان کار بەوە دەکەن و ئەفەرموون: باش نیە کرێ لەسەر بانگ دان وەربگیرێت، وە فەرموویانە: پەسەندە بانگ دەر لە ڕێی خوا بانگ بدات.

---

(١) بەڵکو ئەوەی (مستحب)ە ئەوەیە کە هەروەك چۆن قامەتکەر بڵێت: (قد قامت الصلاة) لەبەر (عموم) گشتێتی ووتەی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێت: (ئەگەر گوێتان لە بانگدەر بوو ئەو چۆن دەڵێت ئێوەش ئاوها بڵێن...) وە تایبەت کردنی بە وتنەی ئەم حەدیسە دروست نیە، لەبەر ئەوەی حەدیسێکی (واه) یە، وە نەوەوی وعەسقەلانی و جگە لەمانیش بە (ضعیف)یان داناوە، جا بە ووتەی خاوەنی (التاج الجامع للأصول) هەڵنەخەڵەتێیت کە دەڵێ: (سنده صالح) لەبەر ئەوەی ئەویش خەڵەتاوە بە بێ دەنگ بوونی ئەبوداود، وە هۆی بێ دەنگی ئەبوداودمان باس کردووە لە پێشەکی‌یەکەدا، (پێشەکی تمام المنة) جا بگەڕێوە بۆی، وە ڕوونیشم کردۆتەوە کە چی عیللەتێك لە سەنەدەکەیدا هەیە لە (ضعیف أبي داود٨٣)، پاشان لە (الإرواء) (٢٤)دا.
هەر بەم بۆنەیەوە دەڵێم کە کیتابی (التاج) پڕە لە هەڵەی زانستی وە من بەر لە دانانی ئەم کتێبە بە زیاتر لە دە ساڵ نەقدی بەشی یەکەمیم کردبوو، وە ڕەش نووسەکەی لەلای خۆمە، ئەگەر بۆمان کرا بڵاوی دەکەینەوە وەك ئامۆژگاری‌یەك بۆ ئەم ئومەتە (تمام المنة ١٤٩-١٥٠).

(٢) حەدیسەکە صحیحە بڕوانە صەحیحی ئەبوداود (٤٩٧).

٢- خاوێن بێت له ڕووداوی گەورەو بچووك، بەپێی ئەوەی موهاجیری کوڕی (قنفذ) دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: (إِنَّهُ لَم يَمنَعنِي أن أُردَّ عَلَيهِ إلا أنِّي كَرِهتُ أن أذكُرَ اللهَ إلا عَلَى طَهَارَةٍ) رواه أحمد والنسائي وابن ماجه، وصححه ابن خزيمة. واتە: هیچ ڕێی لێ نەگرتم وەڵامی سەلامەکەی بدەمەوە تەنها ئەوە نەبێت خۆم حەزم نەکرد بە دەست نوێژەوە نەبێت یادی خوا بکەم، وە ئەگەر کەسێك بەبێ دەست نوێژ یا بە لەشی گرانەوە بانگی دا دروستە بەڵام کەراهەتی هەیە لای شافیعیەکان، وە مەزهەبی ئەحمەد و حەنەفیەکان و غەیری ئەوان ئەوەیە کە کەراهەتی نیە.

٣- ڕوو بکاتە قیبلەو بە پێوە بێت، (منذري) دەفەرمووێت: زانایان هەموو لەسەر ئەوەن کە بەپێوە وەستان لە بانگ داندا سوننەتە، چونکە باشتر دەنگەکە ئەگاتە گوێی خەڵك، وە سوننەتیشە بانگ دەر کاتی بانگ دان ڕوو بکاتە قیبلە، چونکە بانگ دەرەکانی پێغەمبەر ﷺ ڕووەو قیبلە بانگیان ئەدا، بەڵام ئەگەر ڕوەو قیبلەکەی تێك چوو، بانگەکە دروستە، بەڵام کەراهەتی هەیە بۆ بانگ دەر.

٤ - لەکاتی وتنی (حي على الصلاة) سەرو مل و سنگی وەرگێرێت بەلای ڕاستدا، وە کاتی وتنی: (حي على الفلاح) بەلای چەپدا[1].

نەوەوی دەربارەی چۆنیەتی ئەم شێوە دەفەرمووێت: ئەمە ڕاست ترین شێوەی بانگدانە[2].

---

(١) ئەما وەرچەرخاندنی سنگ لەکاتی وتنی (حي على الصلاة و حي على الفلاح) دا ئەوە هیچ ئەصل و بنەمایەکی نیە لە سوننەتدا بە هیچ شێوەیەك، وە لەو حەدیسانەی کە هاتووە لەبارەی وەرچەرخاندنی گەردن بەلای ڕاست وبەلای چەپدا باسی لێ نەکراوە، وە ڕەنگە ئەمە هەڵەی قەڵەم بێت لەلایەن دانەرەوە هەرچەندە بەردەوام بووە لەسەری لە هەموو چاپەکان. (تمام المنة).

(٢) نەوەوی لە (المجموع) دا (٣/١٠٤) لە دوای حەدیسی شیخین لە ئەبی (جحيفة) وە کە دانەر باسی لێوە کردووە، فەرمویەتی: ئەمەی تێدا هاتووە: جا بەچاو بەدووی دەمی دەکەوتم لێرەو لەوێ کە بە لای ڕاستو چەپدا ڕوی نەکرد.

وە لە ریوایەتی ئەبوداوددا: (کاتێك گەیشتە (حي على الصلاة حي على الفلاح) ملی بەلای ڕاست و بەلای چەپدا ئەسووڕاندو بۆخۆشی نەشدەسوڕایەوە، وە سەنەدەکەی صەحیحە.

پاشان فەرمویەتی: (٣/١٠٦-١٠٧) سوننەت وایە کە لە کاتی (حي على) کاندا بە لای ڕاست و چەپدا تەماشا بکات بەڵام نەسوڕێت، هەروەك دانەر باسی کردوە.

لە دوای ئەوە فەرمویەتی : هاوەڵەکانی ئێمە وتویانە: مەبەست لە ئاوڕدانەوە ئەوەیە کە گەردن و مل بسوڕێنێت، بەڵام سنگی لە قیبلە لا نەدات و پێی لە جێی خۆی نەجوڵێنێ. مانای قسەی دانەریش هەر بەم شێوەیە کە دەڵێت:

ئەبو جوحەیفە دەفەرمووێت: بیلال بانگی ئەدا من سەیری دەمیم ئەکرد لێرەو لەوێ بەلای ڕاست و بەلای چەپدا کاتێ ئەگەیشتە (حي على الصلاة و حي على الفلاح) ئەحمەدو شێخێن گێڕاویانەتەوە.

بەڵام خۆ وەرگێڕانی بانگبێژ لەکاتی بانگدا بەیەهەقی دەفەرمووێت: ئەو شێوەیە لە هیچ ڕێگایەکی ڕاستەوە نەهاتووە، وە لە (المغنی)دا هاتووە لە ئەحمەدەوە: نابێت بانگدەر بە دەوری خۆیدا بسوڕێتەوە مەگەر لەسەر منارە بێت و بیەوێت هەردوو لاکان گوێیان لێ بێت.

٥- هەردوو پەنجەی شایەتی بخاتە هەردوو گوێی، بیلال دەفەرمووێت: پەنجەم خستە هەردوو گوێمەوەو بانگم دا. ئەبو داودو ئیبنوحیببان گێڕاویانەتەوە. (ترمذي) دەفەرمووێت: زانایان وتوویانە: پەسەندو موستەحەببە بانگدەر هەردوو پەنجەی بخاتە هەردوو گوێی لەکاتی بانگدا.

٦ - لەکاتی بانگ داندا دەنگ بەرز بکاتەوە با خۆیشی بێت بە تەنها لە چۆڵی و بیاباندا. لە عەبدوڵڵای کوڕی عبدالرحمنی کوڕی ئەبو صەعصەعەوە لە باوکی‌یەوە ئەگێڕێتەوە کە ئەبوسەعیدی خودری ڕەزای خوای لێ بێت فەرمویەتی: ئەت بینم حەزت لە مەڕو دەشتە جا هەرکاتێ لەناو مەڕەکەتدا بوویت، وە یا لەناو دەشتەکەتدا بە دەنگی بەرز بانگ بدە چونکە جینن و ئینس و هەرچی شت هەیە کە دەنگی بانگ بێژیان بیست، ڕۆژی دوایی شایەتی بۆ ئەدەن، ئەبو سەعید فەرموی: ئەمەم لە پێغەمبەر بیستووە ﷺ. ئەحمەدو بوخاری و نسائی و ئیبنوماجە گێڕاویانەتەوە.

٧- بە ڕەوانی بانگ بدات، واتە: لەسەرخۆ بێت و ووشەکان جیا بکاتەوە بەبێ دەنگی‌یەك، بەڵام لە قامەتدا پەلە بکات، وە (حدیث)ی وا ریوایەت کراوە لە چەند ڕێگایەکەوە کە بەڵگەیە لەسەر (إستحباب).

---

بەڵام نابێت بسوڕێت. وە هە ئەوەش بەناوبانگەو صەحیحە لە شافیعی‌یەوە. جومهوریش بەوە ئیقراریان کردوە. پاشان شێخ ئەلبانی باسی ئەوە ئەکات کە ئەوەی ئیسنادەکەی ئەبوداوود کە لەمەو پێش باسی کردوە بە صەحیحی داناوە، صەحیح نی‌یە. هەروەها ئاماژە بۆ ئەوە ئەکات کە لەو حەدیسەدا کە سید سابق باسی کردوە لە ئەبو جەحیفەوە لە ریوایەتی بوخاریدا (بەلای ڕاست و بەلای چەپیدا)ی تێدا نی‌یە، بەڵکو ئەوە تەنها لای موسلیمە ، وەکو لە تەخریجی حەدیسەکەدا لە (إرواء الغليل٢٣٣)دا باسی ئەوەی کردوە، وە ئەمە کە دانەر شوێن ئەوەی کەوتوە و گەڕاندویەتی- یەوە بۆ موسلیم و بوخاری ئاسانکاری‌یەکی ئاشکرای تێدایە. ئەگەر ئەتەوێ سەیری (فتح الباري) بکە (٢/١١٤- ١١٥). (تمام المنة).

٨- کاتی قامەت کردندا قسە نەکات، بەڵام کۆمەڵێ لە زانایان قسە کردنی کاتی بانگ دان بە کەراهەت ئەزانن، وە حەسەن و (عطاء) رێیان پێ داوە، ئەبو داود دەفەرمووێت: بە ئەحمەدم ووت: بانگدەر لەکاتی بانگداندا قسە بکات ؟ ووتی: بەڵێ، پێیان ووت: ئەی لەکاتی قامەتدا قسە بکات ؟ ووتی: نەخێر ، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە قامەت کردن وا پەسەندە پەلەی تێدا بکرێت.

(١١) بانگ دان لەسەرتای کاتەوەو پێش کات:-

بانگ دان ئەبێت لەسەرەتای کاتی نوێژدا بێت نە پێش بخرێت، نە دووا بخرێت، جگە لە نوێژی بەیانی کە شەرعی‌یە پێش کاتەکە بخرێت، کاتێ توانرا بانگی یەکەم و دووەم جیا بکرێتەوە، بۆ ئەوەی کەس نەکەوێتە گومانەوە.

لە عبداللەی کوڕی عەمرەوە هاتووە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إنَّ بِلالاً يُؤَذِّنُ بِلَيل، فَكُلُوا وَاشرَبُوا حَتَّى يُؤَذِّنَ ابنُ أُمِّ مَكتُوم) متفقٌ عليه. واتە: بیلال شەوی ئەمێنێ بانگ ئەدات، جا ئێوە بخۆن و بخۆنەوە هەتا ئیبنو ئومی مەکتوم بانگ ئەدات.

وە حیکمەت لە دروستی پێش خستنی بانگی بەیانی ئەو (حدیث)ەیە کە ئەحمەدو چەند کەسی تر گێڕاویانەتەوە لە ئیبنو مەسعودەوە کە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا يَمنَعنَّ أحَدَكُم أذانُ بِلال مِن سُحُورِهِ، فَإنَّهُ يُؤَذِّنُ، أو قَال: يُنَادِي لِيُرجِعَ قَائِمَكُم وَيُنَبِّهَ نَائِمَكُم). واتە: بانگەکەی بیلال لە پارشێو کردنتان نەکات، چونکە بۆ ئەوە بانگ ئەدات کە هەڵساوەکانتان بۆ شەونوێژ بەسەی لێ بکەن، وە نوستووەکانتان بەئاگا بکاتەوە. وە بیلال تەنها بە ووشەکانی بانگ بانگی ئەدا.

(طحاوي) و نسائی ئەگێڕنەوە: کە لە بەینی بانگەکەی بیلال و ئیبنوئومی مەکتوم هەر ئەوەندەی ماوە هەبوو کە ئەم سەر بکەوێ (بۆ بانگ ووتن) و ئەویش بێتە خوارێ.

(١٢) لە یەك جیا کردنەوەی بانگ و قامەت:-

پێویستە بانگ و قامەت ئەوەندە نێوانیان هەبێت هەتا خەڵك بتوانن خۆیان ئامادە بکەن بۆ نوێژو بێن، چونکە بانگ بۆ ئەوە دانراوە. ئەگینا سوودەکە دەڕوات. وە ئەو (حدیث)انەی هاتوون لەو بارەیەوە هەموویان زەعیفن، بوخاری لە کتێبەکەیدا بەشێکی داناوە نووسیویەتی: (بانگ و قامەت ماوەی چەندیان نێوانە). بەڵام ئەو ئەندازە دانانە (ثابت) نیە.

(ابن بطال) دەفەرمووێت: ئەو ماوەیە دیاری نەکراوە تەنها ئەوە نەبێت کاتی نوێژەکە بێتو خەڵك کۆ ببێتەوە.

لە جابیری کوڕی سەمورەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: بانگ دەری پێغەمبەر ﷺ بانگی ئەدا ماوەیەك ئەوەستاو قامەتی نەئەکرد، وە کە پێغەمبەری ﷺ ئەبینی ئەهاتە دەرەوە ئینجا قامەتی ئەکرد. ئەحمەدو موسلیم و ئەبو داودو (ترمذي) گێڕاویانەتەوە.

(١٣) هەرکەس بانگی دا ئەو کەسە قامەت ئەکات:-

دروستە بانگدەر یا کەسێکی تر قامەت بکات بە ڕای هەموو زانایان، بەڵام وا باشترە کە بانگدەر قامەت بکات، شافیعی دەفەرمووێت: ئەگەر کەسێك بانگ بدات پێم خۆشە هەر بۆخۆی قامەتیش بکا، وە (ترمذي) دەفەرمووێت: لای بەشی زۆری زانایان کار لەسەر ئەوەیە کە ئەوەی بانگ ئەدات قامەتیش بکات[1].

(١٤) کەی خەڵکی هەڵدەستێت بۆ نوێژ کردن:-

مالیك لە (الموطأ) دا دەفەرمووێت: ئەم بیستووە بۆ کاتی هەڵسان بۆ نوێژ ئەندازەیەکی دیاری کراو هەبێت، وە من ڕام وایە ئەوە بەپێی تاقەتی خەڵك بێت، چونکە لەش سووك و لەش قورسیان تێدایە، وە (ابن المنذر) لە ئەنەسەوە ئەگێڕێتەوە کە هەرکاتێ گوێی لە قامەتکەر بوو ئەی ووت: (قد قامت الصلاة) هەڵئەستا بۆ نوێژ[2].

(١٥) چوونەدەر لە مزگەوت دووای بانگ:-

---

(١) ئەو حەدیسەی کە پشتی پێ ئەبەستن: (من أَذَّنَ فَهُوَ يُقِيمَ) واتە: هەرکەسێك بانگی دا با ئەو قامەت بکات، ئەمە حەدیسێکی (ضعیف)ە کاری پێ ناکرێت، ئەبو حاتم لە (العلل) دا بە ژمارە (٣٢٦) بە کوڕەکەی ووت: ئەمە حەدیسێکی مونکەرە، وە بەیهەقی شافعی مەزهەبیش لە (السنن الکبری) دا ئاماژەی بۆ (ضعیف)ی کردووە، بۆ زیاتر بڕوانە (السلسلة الضعيفة رقم ٣٥) وە شێخ ئەلبانی لە میانەی ئەم حەدیسە لە (الضعيفة) دا دەفەرمووێت: لە شوێنەواری ئەم حەدیسە خراپە، ئەوە کە بۆتە هۆیەك بۆ نانەوەی ناکۆکی نێوان نوێژکەران، وەکو چەند جار ئەمە ڕووی داوە کاتێك بانگدەر لە هاتنە ناو مزگەوتەوە ئاخر کەس دەبێت بە هۆی هەر عوزرێك، کاتێك هەندێك لە ئامادە بووان دەیانەوێت قامەت بکرێت بۆ نوێژ، یەکێکیان لێ ڕائەپەڕێت و ڕێیان لێ ئەگرێت بەم حەدیسە، وە ئەو نازانێت کە ئەمە حەدیسێکی زەعیفە، دروست نیەیە نیسبەت بدرێت بۆلای پێغەمبەر ﷺ، چ جای ئەوەی ڕێی پێ بگرێت لە خەڵکی لە دەست پێش خەری کردن لە تاعەتێکی خوادا، کە ئەویش قامەت کردنە بۆ نوێژ.

(٢) پێویستە کار بەو شێوەیە بێت کاتێك ئیمام لە مزگەوتدا ئامادە بێت، بەڵام ئەگەر ئیمام ئامادە نەبوو نابێ کەس هەڵسێت هەتا دێت، بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: (ئەگەر قامەت کرا هەڵمەستن هەتا من ئەبینن لەماڵ دەرئەچم) متفق عليه. وە لەفزەکەش هی موسلیمە. (تمام المنة).

دەربارەی وەلاّم نەدانەوەی بانگدەرو چوونەدەر لە مزگەوت دووای بانگ، نەهی هاتووە مەگەر عوزر هەبێ بۆ دەرچوون، یا نیەتی گەڕانەوەی هەبێ، لە ئەبی هورەیرەوە خوای لیّ ڕازی بێت هاتوە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ ئەکردین ئەی فەرموو: (إذَا كُنتُم فِي المَسجِدِ فَنُودِي بالصَّلاةِ فَلا يَخرُج أحَدُكُم حَتَّى يُصَلِّي) رواه أحمد وإسناده صحيح. واتە: ئەگەر لە مزگەوت بوون و بانگی دا کەستان نەچێتە دەر هەتا نوێژەکەی ئەکات.

لە (أبو الشعثاء) هوە لە باوکی یەوە لە ئەبی هورەیرەوە خوای لیّ ڕازی بێت هاتوە دەفەرموێت: (پیاوێك دووای بانگ لە مزگەوت دەرچوو، ئەویش فەرمووی ئەمما ئەم پیاوە ئەوە سەرپێچی فەرمانی ئەبولقاسمی کردووە ﷺ) موسلیم و خاوەن سونەنەکان گێڕاویانەتەوە.

لە (معاذ) ی جوهەنیەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الجَفَاءُ كُلُّ الجَفَاءِ، وَالكُفرُ وَالنِّفَاقُ، مَن سَمِعَ مُنَادِي اللهِ يُنَادِي يَدعُوا إلَى الفَلاحِ وَلا يُجِيبُهُ) رواه أحمد والطبراني. واتە: جەفاو هەموو جەفایەك و کوفرو نیفاقە، کەسێك گوێی لە بانگ بێژی خوا بوو ئەی ووت: (حي على الفلاح) - وەرن بۆ ڕزگاری - ئەمیش نەچێ بە دەنگی یەوە[1].

(ترمذي) دەفەرموێت: لە چەند صەحابەیەکەوە ئەگێڕنەوە کە فەرمویانە: (هەرکەس گوێی لە بانگ بوو نەچوو بە دەمی یەوە نوێژی دروست نیە)، هەندێ لە زانایان ئەڵێن: ئەمە لە ڕووی قایمکاری و سەرزەنش کردنەوەیە، وە هیچ کەس ڕوخسەتی نیە تەرکی جەماعەت بکات مەگەر لەبەر عوزرێك.

(١٦) بانگ دان و قامەت کردن بۆ نوێژە چووەکان:-

ئەگەر کەسێك بەسەر نوێژێکدا خەوت ئاگای نەبۆوە، هەتا نوێژەکەی چوو، یا لەبیری نەبوو بیکات، ئەوە هەرکاتێ ویستی ئەو نوێژە بکات دروستە بۆی بانگ بدات و قامەت بۆخۆی بکات، چونکە لە ریوایەتەکەی ئەبوداوددا لە بارەی ئەو بەسەرهاتەی کە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەکانی خەوتن و بە ئاگا نەبوونەوە تا خۆر دەرکەوت، ئەوەی تێدایە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دا بە بیلال بانگی داو قامەتی کردو نوێژی کرد.

بەلاّم ئەگەر نوێژە چووەکە لە یەك زیاتر بوو وا موستەحەببە یەك بانگ بدات لە ئەووەڵیانەوە، بەلاّم بۆ هەر نوێژەی قامەتێك بکات، وە بانگەکەی وا نەبێت کە سەر لە خەڵکی تێك بدات.

---

(١) لەسەر (حديث)ەکە بێ دەنگە وا ئەزانێ صەحیحە بەلاّم نە صەحیحەو نە حەسەن، چونکە لە ڕێگای ئیبنولەهیعەوە لە زەببانی کوری فائیدەوە هاتووە، هەردووکیان لاوازن. وە ئەوەی (هیثمي) تەنها دووەمی بە لاواز داناوە، کەمتەرخەمی یەکە لە خۆیەوە (تمام المنة).

(أثرم) دەفەرمووێت: گوێم لە ئەبوعبداللە بوو پرسیاری لێ کرا؟ کابرایەك نوێژ ئەگێرێتەوە، لەبارەی بانگەوە چی بکات، ئایا بانگ بدات یان نا ؟ ئەویش (حدیث) ی هوشەیمی باس کرد لە ئەبو زوبەیرەوە لە نافیعی کوڕی جوبەیرەوە لە ئەبو عوبەیدەی کوڕی عبداللەوە لە باوکی یەوە دەفەرمووێت: موشریکەکان ڕۆژی خەندەق پێغەمبەریان ﷺ مشغولّ کرد چوار نوێژی بۆ نەکرا هەتا ماوەیەك لە شەو ڕۆیشت، ئینجا فەرمانی بە بیلال کرد بانگی داو قامەتی کرد بۆ نوێژی نیوەڕۆ، وە نوێژی نیوەڕۆی کرد، لەپاشاندا فەرمانی پێ کردەوە قامەتی کرد بۆ نوێژی عەسر، وە نوێژی عەسری کرد، لەپاشاندا فەرمانی پێ کردەوە قامەتی کرد بۆ نوێژی ئێوارە، وە نوێژی ئێوارەی کرد، ئینجا فەرمانی پێ کردو قامەتی کرد بۆ نوێژی خەوتنان و نوێژی خەوتنانی کرد.

(١٧) بانگ دان و قامەت کردن لەلایەن ئافرەتەوە:-

ئیبنو عومەر خوا لێیان ڕازی بێت دەفەرمووێت: ئافرەت بانگ و قامەتی لەسەر نیە. بەیهەقی بە سەنەدێکی صەحیحەوە گێڕاویەتی یەوە[1]، وە ئەنەس و حەسەن و ئیبنوسیرین و نەخەعی و (ثوري)و مالیك و (أبو ثور)و خاوەنانی ڕەئی بۆ ئەوە چوون کە ئافرەت بانگ و قامەتی لەسەر نیە، وە شافیعی و ئیسحاق فەرموویانە: ئەگەر بانگ بدەن و قامەت بکەن قەیناکە، وە لە ئەحمەدەوە ریوایەت کراوە: ئەگەر بیکەن قەیناکە، وە ئەگەر نەشیکەن دروستە.

لە عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە کە بانگی داوەو قامەتی کردووەو بەرنوێژی بۆ ژنان کردووە لەناوەڕاستیاندا وەستاوە. بەیهەقی گێڕاویەتی یەوە[2].

---

(١) ئەمە هەڵەیەکی زۆر خراپە دانەر لاسای شەوکانی کردۆتەوە لە (نیل الأوطار ٢/٢٧) وە ئەویش لاسای (حافظ) ئیبنو حەجەری کردۆتەوە لە (التلخیص دا ١/٢١١) لەبەر ئەوەی لە ریوایەتی عبداللە ی کوڕی عومەرە لە نافیعەوە لە ئیبنو عومەرەوە، وە ئەو عەبدوللای کوڕی عومەرە (العمري المكبَّر) ە وە ئەمە (ضعیف)ە، وەك ڕوونم کردۆتەوە لە (الضعیفة ٢/٢٧٠) وە تەخریجم کردووە لە ڕێگای (مصنف عبدالرزاق)ەوە هەر لەم ڕووەوە، جا وەك بڵێیت لێیان تێك چووە کە ئەم عبداللەیە (عبیداللە بن عمر) بێت کە ئەمە سیقەیە، پاشان ئەو حەدیسە بە بە ڕواڵەتی پێچەوانەی ئەوەیە کە ئیبنو ئەبی شەیبە لە (المصنف)دا (١/٢٢٣) بە سەنەدێکی (جید) لە وەهبی کوڕی کەیسانەوە ریوایەتی کردووە دەفەرمووێت: پرسیار کرا لە ئیبنو عومەر کە ئایا ئافرەت بانگ دانی لەسەرە ؟ ئەویش تووڕە بوو فەرمووی: (من نەهی بکەم لە زکری خوا؟) و وەك لەوێ باسم کردووە ئیمام ئەحمەد کردویەتی بە بەڵگە (تمام المنه).

(٢) بەیهەقی لە (السنن الکبری) دا (١/٤٠٨و٣/١٣١) لە ڕێگای حاکمەوە لە (المستدرك) (١/٢٠٣-٢٠٤) گێڕاویەتیەوە ، وە ئەم سەنەدە (لیث بن أبي سلیم)ی تێدایە، وە لە ڕێگای ئەم (لیث)ەوە (عبدالرزاق) (٣/١٢١) و (ابن أبي شیبة ١/٢٢٣) بەبێ زاراوەی پێش نوێژی کردنی بۆ ئافرەتان. بەڵام ئەم زیادەیە (ابن أبي لیلی)ش

**(١٨) چوونە مزگەوت دووای ئەوەی نوێژی جەماعەت کرابوو:-**

**خاوەنی کتێبی (المغنی) دەفەرموێت: هەرکەس دووای نوێژی جەماعەت گەیشتە مزگەوت بۆی هەیە بانگ بدات و قامەت بۆخۆی بکات، ئەحمەدیش لەسەر ئەوە بڕیاری داوە بەپێی ئەوەی (أثرم) و سەعیدی کوڕی مەنصور لە ئەنەسەوە ئەگێڕنەوە کە ئەنەس چۆتە مزگەوتێك نوێژی جەماعەت تەواو بوبو، بە کابرایەکی ووت: بانگی داو قامەتی کرد، ئەویش نوێژی جەماعەتی بۆکردن[١].**

---

ڕێکە لەسەری لەگەڵ (لیث) دا لە (عطاء)ەوە لە عائشەوە (ابن أبي شيبة ٢/٨٩) تەخریجی کردوە جا هەریەکێکیان ئەوی تر بەهێز دەکات، وە ڕێگایەکی تری هەیە لە حەدیسی (رائطة الحنفية) وە کە عائشە بەرنوێژی بۆ چەند ئافرەتێك کرد لە نوێژی فەرزدا، وە لەناوەڕاستیانەوە ڕاوەستا.

(أخرجه عبد الرزاق ٣/١٤١ والدارقطني ١/٤٠٤ والبيهقي ٣/١٣١). وە نەوەوی لە (المجموع دا٤/١٩٩) دەفەرموێت: سەنەدەکەی صەحیحە! وە زەیلەعیش قەبولی کردووە لە (نصب الراية٢/٣١) دا، ئەمما (حافظ) بێ دەنگ بووە لە ئیسنادەکەی لە (التلخيص٢/٤٢) دا، وە ئەمە نزیکترە لە ڕاستی، چونکە ئەم (رائطة)یە هیچ باسێکم لە بارەیەوە نەبینیوە، (حافظ) لە التقريب دا دەفەرموێت: (ناناسرێت).

جا ڕەنگە ئەمە ئەوبێت ؛ یان جگە لەو، ئیتر ئەم سەنەدە لەکوێ صەحیح دەبێت؟!

وە شاهیدێکی هەیە لە ریوایەتی (حجيرة) ی کچی حوصەین، دەفەرموێت: (ئوممو سەلەمە بەرنوێژی بۆ کردین لە نوێژی عەسر و لەناوەڕاستماندا وەستا). رواه عبدالرزاق أيضاً، وابن أبي شيبة (٢/٨٨)، والبيهقي. وە پیاوەکانی تێکڕا سیقەن جگە لەم (حجيرة) یە نەبێت نای ناسم، لەگەڵ ئەوەشدا نەوەوی بە صەحیحی داناوە، وە (حافظ)یش بێ دەنگ بووە لەسەری، بەڵام ئەوەی کە لای ئیبنو ئەبی شەیبەیە بەهێزی دەکات لە ڕێگای قەتادەوە لە (أم الحسين) وە کە ئوممو سەلەمەی خێزانی پێغەمبەری ﷺ بینیوە بەرنوێژی بۆ ئافرەتان دەکرد، لە صەفەکەدا لەگەڵیان دەوەستا. وە ئەمە سەنەدەکەی صەحیحە ڕاوی‌یەکانی سیقەو ناسراوون لە پیاوانی شەیخەین جگە لە ئوممو حەسەنی بەصری نەبێت کە ناوی (خَيِّرة)یە خزمەتکاری ئوممو سەلەمەیە، کۆمەڵێکی باوەڕ پێکراو ریوایەتیان لێوە کردوە، وە لە (المهذب)یشدا ئیشارەی پێ کراوە کە یەکێکە لەوکەسانەی موسلیم ریوایەتی لێوە کردوە، وە ئیبنو حیببان لە (الثقات) دا باسی کردوە (٤/٢١٦).

وە بە تێکڕا ئەم ئەسەرانە بە کەڵکی کار پێ کردن دێن، بە تایبەت ئەوانەی پشت گیری کراوون بە گشتێتی ووتەی پێغەمبەر ﷺ (إِنَّمَا النِّسَاءُ شَقَائِقُ الرِّجَالِ) واتە بەڕاستی ئافرەتان هاوشانی پیاوانن. (تمام المنة).

(١) بوخاری بە موعەللەقی هێناویەتی و بەیهەقی بە مەوصولی بە سەنەدی صەحیح، هەندێ ئەم ئەسەرە ئەکەنە بەڵگە لەسەر دروستی چەند جار نوێژی جەماعەت کردن لە یەك مزگەوتدا بۆ یەك نوێژ، بەڵام ئەمە نابێتە بەڵگە لەبەر دوو هۆ: یەکەم: مەوقوفە، دووەم: بە پێچەوانەی کاری ئەو صەحابانەیە کە لەو زاناتر بوون وەك: عبداللەی کوڕی مەسعود خوا لێیان ڕازی بێت، چونکە عبدالرزاق گێڕاویەتی‌یەوە لە (المصنف)دا (٢/٤٠٩/٣٨٨٣)، وە لای (طبراني) لە (المعجم الكبير)دا (٩٣٨٠) بە سەنەدێکی حەسەن لە ئیبراهیمەوە، کە عەلقەمەو ئەسوەد لەگەڵ

وە دروستە بەبێ بانگ و قامەتیش نوێژ بکرێت. لە عورووەوە هاتووە دەفەرمووێت: (ئەگەر ڕێت کەوتە مزگەوتێکەوە خەڵکەکە نوێژیان کردبوو، وە بانگ و قامەتیان کردبوو، ئەوا بانگ و قامەتە بری ئەو کەسانەش ئەکەوێ کە لە دوایانەوە دێن، ئەمەش قسەی حەسەن و شەعبی و نەخەعی‌یە، بەڵام حەسەن دەفەرمووێت: صەحابە لایان باش بوو ئەوانەی دوایی دێن قامەت بکەن، وە ئەگەر بانگی دا ئەبێ دەنگ بەرز نەکاتەوە و بە نهێنی بێت، بۆ ئەوەی سەر لە خەڵك تێك نەدات بەو بانگە ناوەختە.

(١٩) جیاکردنەوەی قامەت لە نوێژ:-

دروستە قامەت لە نوێژ جیا بکرێتەوە بە قسە کردن و شتی تر، وە قامەت کردنەکە دووبارە نەکرێتەوە، ئەگەر ئەو جیا کردنەوەیە ماوەیەکی زۆریش بخایەنێ، لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: (جارێك قامەت کرا بۆ نوێژ، پێغەمبەر ﷺ لەو کاتەدا قسەی لەگەڵ کابرایەك ئەکرد لە لایەکی مزگەوتەکەوە، وە نەهات بۆ نوێژ هەتا خەڵکەکە خەویان پیا کەوت) بوخاری گێڕاویەتی‌یەوە.

وە پێغەمبەر ﷺ جارێك دووای ئەوەی قامەت کرا وە بیری کەوتەوە کە لەشی گرانە، گەڕایەوە ماڵەوە خۆی شۆری و هاتەوە بێ ئەوەی قامەتی تر بکرێت نوێژەکەی بە جەماعەت کرد بۆ هاوەڵەکانی.

(٢٠) کەسێك بە بانگ بێژ دانەنرێت و بانگ بدات:-

دروست نیە کەسێك بە بانگ بێژ دانەنرابێت بانگ بدات مەگەر بە ڕێگاپێدانی بانگ بێژی دانراو بێت، یا بانگ بێژی دانراو دووا بکەوێت، وە خەڵك ترسی ئەوەیان هەبێت کاتی بانگدان بەسەر بچێت ئەوکاتە دروستە کەسێکی تر بانگ بدات.

---

ئیبنو مەسعود ڕوویان کردە مزگەوت تەماشایان کرد جەماعەت کراوە، جا ئیبنو مەسعود هەردووکیانی برد بەرەو ماڵ... پاشان نوێژی بۆیان کرد.

جا ئەگەر جەماعەتی دووەم دروست بووایە لە مزگەوت بە (مطلق)ی، ئیبنو مەسعود بۆ ئەیانی بردەوە بەرەو ماڵ و نوێژی بۆیان دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا کە نوێژی فەرز لە مزگەوتدا چاکترە هەروەك مەعلومە، دوای ئەوە بەڵگە هەیە کە ئەم ئەسەرە حوکمی مەرفوعی هەیە، چونکە ئەوەی کە (طبراني) لە (الأوسط) دا (٤٧٣٩) گێڕاویەتی‌یەوە شاهیدە بۆی، لە عبدالرحمنی کوڕی بەکرەوە لە باوکی‌یەوە هاتوە کە جارێکیان پێغەمبەر ﷺ لە قەراغ مەدینەوە هاتەوە بە مەبەستی نوێژی جەماعەت، کەچی جەماعەت کرابوو، ئەویش گەڕایەوە بۆ ماڵ کەس و کارەکەی کۆ کردەوەو نوێژی بۆ کردن. بۆ زیاتر بڕوانە (تمام المنة).

(٢١) ئەو شتانەی لە بانگ نین و پێیان زیاد کردووە:-

بانگ عیبادەتێکە، خولگەی عیبادەتەکانیش شوێن کەوتنی قورئان و سوننەتە، لەبەر ئەوە دروست نیە بۆ ئێمە هیچ لە دینەکەماندا زیاد بکەین یا کەم بکەین.

وە لە (حدیث) ی صەحیحدا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن أحدَثَ فِي أمرِنَا هَذَا مَا لَيسَ مِنهُ فَهُوَ رَدٌّ). واتە: هەرکەس شتێکی تازەی داهێنا کە لە دینەکەماندا نەبوو ئەوە قەبووڵ نیە واتە: باتڵە.

جا ئێمە لێرەدا هەندێ شتی ناشەرعی دەست نیشان ئەکەین کە هێنراوەتە ناو بانگەوەو خەڵکێکی زۆر لەسەری ئەڕۆن، هەتا هەندێ کەس وا ئەزانن ئەو شتانە لە دینە، بەڵام هیچ مافێکی بەسەر دینەوە نیە. لەوانە:

١- ئەوەی بانگدەر لە بانگ و قامەتدا ئەڵێت: (أشهد أن سيدنا محمداً رسول الله) (حافظ ابن حجر) ڕەئی وایە کە نابێت ئەوە زیاد بکرێت لە هیچ کەلیمەیەك لەو کەلیماتانەی کە (مأثور)ن و لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتوون، وە لە غەیری ئەوانەدا دروستە زیاد بکرێت.

٢- شێخ ئیسماعیلی عەجلونی لە (كشف الخفاء)دا دەفەرمووێت: ماچ کردنی سەری هەردوو پەنجە مژەو مەسح کردنی هەردوو چاوان پێیان لەکاتی بیستنی (أشهد أن محمداً رسول الله) لە بانگداو ووتنی: (أشهد أن محمداً عبده ورسوله، رَضِيتُ بِاللهِ رَباً وَبِالإسلامِ دِيناً وَبِمُحَمَّدٍ ﷺ نَبِيّاً). دەیلەمی لە ئەبو بەکرەوە ئەگێڕێتەوە کاتێ گوێی لە بانگدەر بوو دەیفەرموو: (أشهد أن محمداً رسول الله) ئەوەی دەوتەوە و بەری هەردوو پەنجە مژەی ماچ دەکرد و دەیهێنا بە چاوەکانیدا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: هەرکەس وەك خۆشەویستم ئەبوبەکر بکات بەر شەفاعەتم ئەکەوێت. لە (المقاصد) دا هاتووە دەفەرمووێت: ئەو (حدیث)ە صەحیح نیە.

وە ئەوەش صەحیح نیە کە ئەبو عەبباسی کوڕی ئەبوبەکری ڕەددادی یەمەنی صۆفی گێڕاویەتی- یەوە لە کتێبی (موجبات الرحمة وعزائم المغفرة) دا بە سەنەدێك کە (مجاهيل) نەناسراوی تێدایەو (منقطع)ە، لە (خضر)ەوە علیه السلام هاتووە کە دەفەرمووێت: (هەرکەس گوێی لە بانگدەر بوو ئەی ووت: (أشهد أن محمداً رسول الله) بڵێت: (مرحباً بحبيبي وقرة عيني محمد بن عبدالله) ﷺ لەپاشاندا هەردوو پەنجە کەڵەکەی ماچ بکات و بیهێنێ بە چاوەکانیدا چاوی هەرگیز کوێر نابێ و ژان ناکەن) وە غەیری ئەوەشی نەقل کردووە پاشان فەرمووی: لە هەمو ئەوانەدا کە مەرفوعن صەحیحیان تێدا نییە.

٣- بانگ دان بە گۆرانیو لاواندنەوەوە، بەمە کە حەرفێ یا حەرەکەیەك یا مەددەیەکی لێ زیاد بکرێ، ئەمەش کەراهەتی هەیە، بەڵام ئەگەر ئەو زیاد کردنە بووە هۆی گۆڕینی مەعنا یان گومان پێدانێك لە ووتنی: کەلیمەیەکدا کە بە خراپی لێی تێگەیشرێ ئەو کاتە ئەبێتە حەرام.

لە یەحیای (بکاء) ەوە ڕەحمەتی خوای لێ بێ هاتوە کە دەیفەرموو: ئیبنو عومەرم بینی بە کابرایەکی ئەفەرموو: من لەبەر خوا ڕقم لە تۆیە، پاشان بە هاوەڵەکانی فەرموو: ئەو کابرایە بە گۆرانیەوە بانگ ئەدات وکرێی لەسەر وەرئەگرێت.

٤- تەسبیحاتی پێش بانگی بەیانی: لە کتێبی (الإقناع) دا کە یەکێکە لەو کتێبانەی حەنبەلیەکان شەرحیان کردووە هاتووە ئەڵێت: جگە لە بانگی پێش بانگی فەجر هەرچی شتێکی تر کە بووترێت لە تەسبیحات و سروودو هۆنراوەو دەنگ بەرز کردنەوە بەدوعاو پاڕانەوەو وێنەی ئەوانە لە منارەکانەوە هیچیان سوننەت نین، وە کەس لە زانایان دانی پێدا نەناوەو بە پەسەندی دانەناوە، بەڵکو هەموو ئەمانە لەو تازەداهاتووانەو بیدعە مەکروهانەن کە لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ نەبوون، وە هەروەها لەسەردەمی صەحابەشدا، و ئەصڵێکیشی نییە کە لەسەردەمی ئەواندا بووبێت و گەڕانەوەی بۆ بکرێ، وە بۆ هیچ کەسێکیش ڕەوا نییە فەرمان بەووتنی ئەوشتانە بکات، وە لۆمەی ئەو کەسە بکات کە تەرکی ئەکات، وە مووچەیەکیش لەسەر ووتنی ئەوشتانە بە کەس نادرێ چونکە یارمەتی دانە لەسەر بیدعەت، وە نابێ بکرێت ، باخاوەن وەقفیش ووتنەکەیان بە مەرج دابنێ چونکە موخالەفەی سوننەتە.

لە کتێبی (تلبیس إبلیس)ی (عبدالرحمن ابن الجوزي) دا هاتووە: ئاگادارم چەند کەسانێ هەن بەشی زۆر لەشەو لەسەر منارەکان ووتار ئەدەن و یادی خوا ئەکەن و قورئان ئەخوێنن بە دەنگی بەرز، جا خەو لە خەڵك ئەزڕێنن و قیرائەت لە شەونوێژ خوێنەکان تێك ئەدەن، لەحاڵێکدا هەموو ئەو شتانە مونکەرو ناشەرعین.

(حافظ) لە (الفتح) دا دەفەرموورێت: ئەو شتانەی تازە داهاتوون و لەپێش بانگی بەیانی و هەینی ئەووترێن لە تەسبیحات و سلاوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ، هیچیان لەبانگ نین نە لە ڕووی زمانەوەو نە لە ڕووی شەرعەوە.

٥- بەدەنگی بەرز سڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ لەدوای بانگ شەرعی نی‌یە، بەڵکو داهێنراوێکی مەکروهە[١]. ئیبنوحەجەر لە (الفتاوى الكبرى)دا دەفەرمووێت: دەربارەی سڵاوات دان دوای بانگ بەو شێوەی بانگ بێژەکان ئەی کەن لەمامۆستاکانمانیان پرسیوە ئەوانیش وەڵامیان داوەتەوە فەرموویانە: ئەصڵی صلاوات دان سوننەتە، بەڵام بەو شێوەیە ووتنی بیدعەیە. وە هەروەها دەربارەی ئەوە لە شێخ (محمد عبده) موفتی میصریان پرسی؟ وەڵامی دانەوە فەرمووی: بانگ دان وەك لە (الخانية)دا هاتووە بۆ نوێژە فەرزەکان نەبێت دروست نی‌یە، وە ئەو بانگەش پانزە ووشەیە، لای ئێمە دووا ووشەی (لا إله إلا الله)ە، وە ئەو شتانەی لەپێشی‌یەوە یا لەدوایەوە ئەووترێت لە تازەداهێنراوەکانەو بیدعەتە، بۆ گۆرانی (تەلحین) داهێنراوون بۆ هیچی تر نا، کەسیش نی‌یە بڵێت: ئەو (تلحین)ە دروستە. وە نابێت گوێ بدرێتە قسەی ئەوانەی کەئەڵێن: ئەمانە لە بیدعەتی حەسەنەن ، چونکە هەموو بیدعەتێك لە عیبادەتەکاندا لەسەر ئەو شێوەیە بێت بیدعەتی (سیئە)یەو خراپە. وە هەرکەس بڵێت: ئەوە بۆ (تلحین) نی‌یە درۆ ئەکات.

## مەرجەکانی نوێژ – (شروط الصلاة)

ئەو مەرجانەی کە پێش نوێژ ئەکەونو واجبە لەسەر نوێژکەر بەحۆریان بهێنێت بەشێوەیەك ئەگەر واز لەیەکێك لەوانە بهێنێت نوێژەکەی باتڵ ئەبێت ئەمانەن:-

١- بزانێت چۆتە ناو کاتەکەیەوە:

---

(١) ئەوەی لێوەی ئەزاندرێ ئەوەیە کە ئەگەر بە دەنگی نزم ووترا سوننەتە، جا کوا بەڵگە لەسەر ئەمە؟ ئەگەر ووترا: ووتەکەی پێغەمبەرە ﷺ کە دەفەرمووێت: (ئەگەر گوێتان لە بانگدەر بوو بانگی دا ئەوەی ئەو ئەیووت ئێوەش بیڵێنەوە، پاشان سڵاوات لەسەر من بدەن...)

کە لە (باسی یادکردنی خوا لەکاتی بانگدان) دا تێپەری، وەڵام ئەوەیە کە ئەو فەرمانە لەوێدا بۆ ئەو بیسەرە فەرمان پێ کراوانەیە کە وەڵامی بانگدەر بدەنەوە، ئیتر خودی بانگدەرەکە ناگرێتەوە، ئەگینا دەبووایە بووترایە واجبە لەسەر بانگدەر وەڵامی خودی خۆی بداتەوە، وە ئەم ووتەیە کەس نایڵێت، وە دان نان بەم ووتەیە دابیدعەتە لە دین.

وە ئەگەر ووترا: جا ئایا ئەمە مەنعی بانگبێژ دەکات لەوەی سڵاوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ بدات بە نهێنی؟ منیش دەڵێم مەنعی ناکات بە (مطلق)ی، بەڵکو مەنعی دەکات کە دووا بە دوای بانگ بووترێت، لە ترسی ئەوەی نەبادا لێی زیاد بکرێت، وە شتێك بدرێتە پاڵی کە لەو نی‌یە، وە یەکسانی بکرێت لە نێوان ئەوەی کە وا دەقی پێغەمبەری ﷺ لەسەرە ـ کە بیسەرە ـ وە لە نێوان ئەوەی کە دەقی لەسەر نی‌یە ـ کە بانگبێژە ـ وە هەموو ئەمانە دروست نی‌یە بووترێت. جا وورد بەرەوە (تمام المنة).

ئەو زانینە بەسەر گوماندا زاڵ بێت بەسە، جا هەرکەس دڵنیا بوو یا زانینی بەسەر گومانیدا زاڵ بوو کە چۆتە ناو کاتی ئەو نوێژەوە دروستە نوێژ بکات، جا ئەو زانینە چ بەهۆی کەسێکەوە بێ کە باوەڕ پێکراو بێ، یا بەهۆی بانگی بانگدەری ئەمیندارەوە بێت، یا خود هەوڵ بدات و بگەڕێت بۆئەوەی بزانێت ئایا کاتەکەی هاتووە یان نا، یا بە هەر هۆیەك بێت لەو هۆیانەی زانینەکەی پێ دێتە ئەنجام.

٢ - خاوێنی لەڕووداوی بچووك و گەورە (بێ دەسنوێژی بچووك و گەورە):-

بەپێی فەرموودەی خوای گەورە کە فەرموویەتی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى ٱلْمَرَافِقِ وَٱمْسَحُواْ بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى ٱلْكَعْبَيْنِ ۚ وَإِن كُنتُمْ جُنُبًا فَٱطَّهَّرُواْ﴾. واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە کاتێك ویستتان نوێژ بکەن، ئەوە ڕوخسارتان و هەردو دەستتان لەگەڵ ئەنیشکتاندا بشۆن ، وە مەسحی سەرتان بکەن، و پێتان لەگەڵ قولەپێکانتاندا بشۆن، وە ئەگەر لەش گران بوون خۆتان بشۆرن.

وە بەپێی حەدیسی ئیبنوعومەر خوا لێیان ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا يَقبَلُ اللهُ صَلاةً بِغَيرِ طُهُورٍ، وَلا صَدَقَةً مِن غُلُولٍ) رواه الجماعة إلا البخاري. واتە: خوا نوێژی بێ دەست نوێژ وەرناگرێت هەروەها صەدەقەش لەشتی دزراوی بەجێماوی جەنگ وەرناگرێت.

٣- خاوێنی لاشەو جلوبەرگ و ئەو شوێنەی نوێژی لێ ئەکا:-

خاوێن بێ لە پیسی هەست پێکراو ئەگەر بتوانێ، بەڵام ئەگەر توانای لابردنی نەبوو دروستە نوێژی پێوە بکات و گێڕانەوەشی لەسەر نییە، ئەمما خاوێنی لاشە ئەوە بەپێی ئەوحەدیسەیە کە ئەنەس ئەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (تَنَزَّهُوا مِنَ البَولِ فَإنَّ عَامَّةَ عَذَابِ القَبرِ مِنهُ) رواه الدارقطني وحسنه. واتە: خۆتان لەمیز بپارێزن چونکە بەشی زۆری سزای گۆڕ لەوەوەیە.

لە عەلییەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە کە دەفەرموێت: (من پیاوێکی (مذي)اوی بووم بە پیاوێکم ووت: لەو بارەیەوە لە پێغەمبەر ﷺ بپرسێ لەبەر جێی کچەکەی، ئەویش لێی پرسی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: زەکەرت بشۆرەو دەست نوێژ بگرە) بوخاری و غەیری ئەو گێڕاویانەتەوە.

هەروەها لە عائیشەوە هاتوە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ بەو ئافرەتەی کە هەمیشە لەحەیزدا بوو فەرمووی: (خوێنەکە بە ئاو لە خۆت بکەرەوەو نوێژەکانت بکە).

ئەمما خاوێنی جلوبەرگ ئەوە بەپێی فەرموودەی خوای گەورەیە کە ئەفەرمووێت: ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ﴾ (المدثر/٤). واتە: پۆشاکت با خاوێن بێت.

لە جابیری کوڕی سەمورەوە خوای لێ ڕازی بێت دەفەرمووێت: (گوێم لێ بوو پیاوێك لە پێغەمبەری ﷺ پرسی ئایا بەو جلوبەرگەوە نوێژ بکەم کە جیماعی پێوە ئەکەم؟ ئەویش فەرمووی: بەڵێ مەگەر شتێکی پیسی پێوە ببینی، ئەوکاتە بیشۆرە) ئەحمەدو ئیبنو ماجە ریوایەتیان کردووە بە سەنەدێك کە پیاوانی سەنەدەکە جێی (ثقة)ن.

لە موعاویەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: (بە ئوموو حەبیبەم ووت: ئایا پێغەمبەر ﷺ بەو جلانەوە نوێژی ئەکرد کە جیماعی پێوە ئەکرد ؟ فەرمووی: بەڵێ ئەگەر پیسی پێوە نەبوایە) ئەحمەدو خاوەن سوننەکان گێڕاویانەتەوە جگە لە (ترمذي).

لە ئەبو سەعیدەوە خوایان لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: جارێك پێغەمبەر ﷺ نوێژی ئەکرد، نەعلەکانی لە نوێژەکەدا داکەند، خەڵکەکەش نەعلەکانیان لە نوێژەکەدا داکەند، کاتێ سلاوی دایەوە فەرمووی: بۆچی ئێوە نەعلەکانتان داکەند ؟ ووتیان: بینیمان تۆ دات کەند ئێمەش چاومان لەتۆ کرد، فەرمووی: ئەوە جبریل هات پێی ڕاگەیاندم پیسی بە نەعلەکانتەوەیە، جا لەبەر ئەوە ئێوە ئەگەر هاتن بۆ مزگەوت نەعلەکانتان هەڵ گێڕنەوەو سەیریان بکەن ئەگەر پیسی‌یەکیان پێوە بوو بیسڕن بە زەوی داو نوێژیان پێوە بکەن. ئەحمەدو ئەبوداودو ئیبنوحیببان و ئیبنو خوزەیمە کە بە صەحیحی داناوە گێڕاویانەتەوە.

جا ئەم (حدیث)ە بەڵگەیە بۆ ئەوەی ئەگەر کەسێك نوێژی دابەست و پیسی پێوە بوو پێی نەزانیبوو، یا لەبیری چوبۆوە، پاشان لە نوێژەکەیدا پێی زانی ئەوە پێویستە لەسەری پیسی‌یەکەی لێ بکاتەوەو بەردەوام بێت لەسەر نوێژەکەی‌و چەند ڕکاتی کردبوو لەسەر ئەوەوە دەست پێ بکاتەوە، وە گێڕانەوەی لەسەر نی‌یە.

ئەمما خاوێنی ئەو شوێنەی نوێژی لێ ئەکا بە بەڵگەی حەدیسی ئەبو هورەیرەیە کە دەفەرمووێت: (کابرایەکی دەشتەکی هەڵسا لەناو مزگەوتدا میزی کرد، خەڵکەکە بۆی هەڵسان لێی بدەن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (وازی لێ بهێنن دۆڵچەیەك ئاو بکەن بەسەر شوێنی میزەکەیدا، چونکە ئێوە بۆ ئاسان کردنی شت نێرراون نەك گران کردنی) رواه الجماعة إلا مسلماً. شەوکانی دوای ئەوەی لە بەڵگەکانی ئەوانە کۆڵاوەتەوە کە ئەڵێن: خاوێنی جلوبەرگ مەرجە بۆ نوێژ، دەفەرمووێت: مادام ئەو بەڵگانەی کە بۆمان هێناوی و ئەو حوکمانەی کە تێیاندایە سابت بوو، ئەوە بزانە کە ئەو

بەڵگانە کەمو کوڕی ئەوەیان تێدا نی‌یە کە خاوێنی جلوبەرگ بگەیەنن، جا ئەگەر کەسێك نوێژی کردو پیسی‌یەك بە جلەکانی‌یەوە بوو ئەوکەسە واجبێکی واز لێ‌هێناوە، ئەمما ئەوە کە بووترێ نوێژەکەی باتڵە ـ هەروەك لە حاڵەتی لەدەست دانی مەرجی دروستی دا ـ ئەوە نا ، نوێژەکەی باتڵ نی‌یە.

لە (الروضة الندية) دا هاتووە کە جومهور بۆ واجبێتی خاوێنی سێ شت چوون، لاشەو جلوبەرگ و شوێنی نوێژ، وە کۆمەڵێکیان بۆ ئەوە چوون کە خاوێنی ئەو سیانە مەرجێکە بۆ دروستی نوێژ، وە هەندێك ئەڵێن: سوننەتە بەڵام لە ڕاستی دا خاوێنی ئەو سیانە واجبە، بۆیە هەرکەس نوێژی کردو پیسی‌یەکی پێوە بوو بە قەست لێی نەکردەوە ئەوە واجبێکی تێك داوە بەڵام نوێژەکەی دروستە.

٤- داپۆشینی عەورەت:-

بەپێی فەرمودەی خوای گەورە کە ئەفەرمووێت: ﴿يَـٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ﴾ (الأعراف/٣١). واتە: ئەی نەوەکانی ئادەم هەرکاتێك نوێژتان کرد خۆتان داپۆشن بە جوانترین شێوە با عەورەتتان دەر نەکەوێت.

لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: ووتم: ئەی نێرراوی خوا بە تەنها کراسێکەوە دروستە نوێژ بکەم؟ فەرمووی: (بەڵێ ئەگەر بە دڕکیش بێ بەرۆکەکەی دابخە). رواه البخاري في تأريخه وغيره.

سنووری عەورەتی پیاو:-

لە پیاودا ئەو شوێنەی بە عەورەت دائەنرێت وواجبە لەکاتی نوێژ کردندا بپۆشرێت، پاش و پێشە، بەڵام لەوە بەولاوە لەناوکەو ئەژنۆو ڕان، زانایان جیاوازن تێیدا، لەبەر جیاوازی حەدیسەکان لەو بارەیەوە، جا هەندێ لە زانایان ئەڵێن: ئەوانە عەورەت نین، وە هەندێکی تر بۆچونیان وایە کە عەورەتن.

بەڵگەی ئەوانەی ڕایان وایە کە ئەوانە عەورەت نین:-

ئەوانەی ئەڵێن: ناوك و ڕان و ئەژنۆی پیاو عەورەت نین ئەم (حديث) انەیان کردۆتە بەڵگە:

١- عائیشە خوای لێ ڕازی بێت دەفەرمووێت: جارێك پێغەمبەر ﷺ دانیشتبوو ڕانی بەدەرەوە بوو ئەبوبەکر ئیزنی خواست بۆ هاتنە ژوورەوە پێغەمبەر ﷺ هەر بەو حاڵەتەی خۆیەوە ئیزنی دا (بۆ ژووری)، پاشان عومەر ئیزنی خواست ئیزنی ئەویشی دا، پاشان (عثمان) ئیزنی خواست

پێغەمبەر ﷺ بە جلەکانی ڕانی داپۆشی، کاتێ هەڵسان و ڕۆیشتن ووتم: ئەی نێرراوی خوا ئەبوبەکرو عومەر ئیزنیان خواست هەر بەو حاڵەتەی خۆتەوە ئیزنت دان، کەچی (عثمان) کاتێك ئیزنی خواست تۆ بە جلەکانت ڕانت داپۆشی؟ فەرمووی: (ئەی عائیشە ئایا شەرم لە پیاوێك نەکەم کە سوێند بە خوا فریشتەکان شەرمی لێ ئەکەن). ئەحمەد گێڕاویەتی‌یەوەو بوخاری بە موعەللەقی باسی کردووە.

٢ - لە ئەنەسەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی جەنگی خەیبەر ئیزارەکەی لەسەر ڕانی لابردبوو هەتا من خۆم سەیری سپێتی ڕانیم ئەکرد. ئەحمەدو بوخاری گێڕاویانەتەوە.

ئیبنو حەزم دەفەرموێت: کەواتە بە صەحیحی هاتووە کە ڕانی پیاو عەورەت نی‌یە، چونکە ئەگەر عەورەت بووایە خوای گەورە ڕانی پێغەمبەری پاك و پارێزراوی دەر نەئەخست لە حاڵەتی پێغەمبەرایەتیدا، وە نیشانی ئەنەسی کوڕی مالیکو غەیری ئەوی نەئەدا، لە کاتێکدا وە خوا بۆ خۆی پێغەمبەری پاراستووە لەوە کە عەورەتی دەربکەوێ لەحاڵی منداڵی و پێش پێغەمبەرایەتیشدا، ئەوەتا لە صەحیحی بوخاری و موسلیم دا هاتووە لە جابیرەوە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ بەردی ئەکێشا بۆ کەعبە، وە ئیزارەکەشی پێوەی بوو، عەبباسی مامی پێی ووت: برازا ئەگەر ئیزارەکەت دانایەو بتدایە بەسەر شانتدا لەژێر بەردەکانەوە چاکتر نەبوو؟ ئەویش دایناو دای بەسەر شانیدا کوتوپڕ کەوت و بورایەوە، ئیتر لەو ڕۆژەوە بەڕووتی نەبینراوە.

٣- لە موسلیمەوە هاتووە لە (أبو العالیة البراء) ەوە دەفەرموێت: عبد الله ی کوڕی صامت دەستی کێشا بە ڕانمدا و فەرمووی: من پرسیارم کرد لە (أبوذر) ئەویش وەك من چۆن کێشام بە ڕانتدا بەو شێوەیە کێشای بە ڕانمداو فەرمووی: من پرسیارم کرد لە پێغەمبەر ﷺ وەك چۆن تۆ پرسیارت لێ کردم، ئەویش بەو شێوەیە کێشای بەڕانمدا وەك چۆن من کێشام بەڕانتدا، فەرمووی: (نوێژ لەکاتی خویدا بکە..) تا کۆتایی حەدیسەکە.

ئیبنوحەزم دەفەرموێت: ئەگەر ڕان عەورەت بووایە پێغەمبەر ﷺ هەرگیز دەستی نەئەکێشا بەڕانی (أبو ذر) دا بە دەستە پیرۆزەکانی، وە ئەگەر ڕان لای (أبوذر) عەورەت بووایە بەدەست نەی ئەکێشا بەڕانی عبد اللەدا، وە هەروەها عبد الله ی کوڕی صامت و (أبو العالیة)ش هەر بەو شێوەیە، وە ڕەوا نی‌یە بۆ هیچ موسڵمانێك دەست بکێشی بەپێشی کەسێکی تردا لەسەر پۆشاکیشەوە، یا دەست بکێشێ بەگرێی کۆمی کەسێکی تردا لەسەر پۆشاکیشەوە، یا دەست بەرێ بۆ لاشەی ئافرەتێکی نامەحرەم لەسەر پۆشاکیشەوە بەهیچ شێوەیەك.

٤- ئیبنو حەزم بە ئیسنادی خۆی هەتا ئەگاتە سەر جوبەیری کوڕی (حویرث) باسی ئەوەی کردووە کە جوبەیر خۆی ڕانی ئەبوبەکری بینیوە بە ڕووتی، وە ئەنەسی کوڕی مالیك چووە بۆلای قەیسی کوڕی شەمماس لە کاتێکدا ڕانی بەڕووتی هەڵمالّی بوو.

بەڵگەی ئەوانەی ئەژنۆو ڕان و ناوك بە عەورەت ئەزانن:-

ئەوانەی ئەژنۆو ڕان و ناوك بە عەورەت ئەزانن ئەم دوو (حدیث)ەیان کردۆتە بەڵگە:-

١- لە موحەممەدی کوڕی جەحشەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ بەلای مەعمەردا تێپەڕی بینی هەردوو ڕانی دەرخستووە فەرمووی: (یَا مَعمَر! غَطِّ فَخذَیكَ فَإنَّ الفَخِذَینِ عَورَةٌ) رواه أحمد والحاكم والبخاري في تأريخه وعلقه في صحيحه. واتە: مەعمەر ڕانەکانت داپۆشە چونکە ڕان عەورەتە.

٢- وە لە جەرهەدەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: ڕۆژێك بوردەیەکم لەبەردا بوو ڕانەکانم دیار بوو پێغەمبەر ﷺ بەلامدا تێپەڕی فەرمووی: (غَطِّ فَخِذَیكَ فَإنَّ الفَخِذَ عَورَةٌ) رواه مالك وأحمد وأبوداود والترمذي وقال: حسن، وذكره البخاري في صحيحه معلقاً. واتە ڕانەکانت داپۆشە چونکە ڕان عەورەتە.

ئەوانەی باس کران بەڵگەی هەردوو لایەنەکان بوون، وە موسڵمان بۆی هەیە هەرکامێکیان هەڵبژێرێ، هەرچەندە لەبەر ئیحتیات لە دینا وا باشە نوێژکەر هەتا ئەتوانێ بەینی ناوك و ئەژنۆی داپۆشێ[(١)].

---

(١) لێرەدا چەند شتێکی تیایە پێویستە ڕوون بکرێتەوە:

یەکەم: ئیحتیات کردن کارێکی واجب نیە، بەڵکو ئەمە لەبابی وەرعەوەیە، وە شتێکی شاراوە نیە هەموو تەکلیف لەسەرێ ڕەغبەتی ئەوەی نیە کە وارع بێت.

دووەم: دانەر ئەمەی بەستۆتەوە بە نوێژەوە جا مەفهوومی ئەمە ئەوەیە کە بەدەر لە نوێژا ئەو داپۆشینە ئیحتیات نیە، ئەمە شتێکی تیایە کە ڕوون کردنەوەکەی دێت.

سێیەم: ئەو ئیختیار و هەڵبژاردنەی دانەر ئاماژەی بۆ دەکات پێویستە پابەند بێت، لەسەر بنچینەکانی زانستی (أصول الفقه)، بۆ ئەوەی چۆنیەتی ئەو ئیختیارانە شوێن داب و نەریت و هەواو ئارەزوو نەکەوێت.

ئاشکراشە لای هەرکەسێك کە بڕوانێتە ئەو بەڵگانەی دانەر هێناویەتی، کە بەڵگەی ئەوانەی دەڵێن: ڕان عەورەت نیە فیعلیە لە ڕویەکەوە، وە موبیحە لە ڕوویەکی ترەوە، وە بەڵگەی ئەوانەی کە دەڵێن: ڕان عەورەتە قەولیە، لە ڕوویەکەوە، وە مانیعە لە ڕوویەکی ترەوە، وە لەو بنچینە ئوصولیانەی کە یارمەتی دەدات بۆ تەرجیح کردن لە نێوان بەڵگە و ئیختیار دوور لە هەواو مەبەستێك. دوو بنچینەیە:

یەکەمیان: مانع دەخرێتە پێش موبیحەوە.

بوخاری ووتوویەتی (حدیث)ەکەی ئەنەس (ئەوەی پێشەوە) لەڕووی سەنەدەوە صەحیح ترە، وە (حدیث)ەکەی جەرهەد ئیحتیاتی زیاتر تێدایە.

سنووری عەورەتی ئافرەت:

لەشی ئافرەت هەمووی عەورەتە پێویستە داپۆشرێت جگە لە ڕوخسارو هەردوو دەستی نەبێت، خوای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾ (النور/٣٠). واتە: با شوێنی جوانی خۆیان دەرنەخەن جگە لەو شوێنانەی دەرئەکەون واتە: جگە لە ڕوخسارو هەردوو دەستە. هەروەك ئەمە بە صەحیحی لە ئیبنو عەبباس و ئیبنو عومەرو عائیشەوە هاتووە[1].

---

ئەوی تریان: ووتە (قول) دەخرێتە پێش کردار (فعل) لەبەر ئەوەی ئیحتیمالی تایبەتمەندیەو شتی تری لێ ئەکرێت، لەگەڵ ئەوەش هەندێ فیعل لە هەندێ لەو بەڵگانەدا کە ئاماژەیان بۆ کراوە وت دەرناکەوێ کە بەڵگەی ئاماژە بۆ کراو دیار نابێت تێیدا کە بە مەبەست و عەمد بووە، وەك حەدیسی ئەنەس و ئەسەری ئەبوبەکر، جگە لەمەش ئەوانە ڕووداوی (عین)ن و گشتێتی‌یان بۆ نیە، بە پێچەوانەی ئەو بەڵگانەی (قولی)ن، کە ئەوان شەریعەتێکی (عام)ن، لەسەر ئەمە کاری موسڵمانان سەلەف و خەلەف ڕۆشتووە، بە شێوەیەك کە نەمان بیستوە کەسێك بڕوا یا دانیشێ و ڕانی ڕوت بێ، هەروەك هەندێ لە بێ باوەڕانی ئەمڕۆ و ئەوانەی کە لاساییان دەکەنەوە لە موسڵمانان دەیکەن، ئەوانەی کە شۆرت و جلی کورت لەبەر دەکەن.

هەر بۆیە نابێت دوو دڵی هەبێت لەوەی کە ڕان عەورەتە بەپێی تەرجیحو پارسەنگ کردنی بەڵگە قەولی‌یەکان، پاشان گومانی تێدا نیە کە زۆربەی زانایان بۆ ئەوە چوون، وە شەوکانی لەسەر ئەوە بڕیویەتی‌یەوە لە (نیل الأوطار٢/٥٢و٥٣ و السيل الجرار ١/١٦٠-١٦١)

بەڵێ دەتوانرێت بووترێت: عەورەتی هەردوو ڕان حوکمی (أخف) ئاسان ترە لە عەورەتی هەردوو سمت، ئەم بۆ چوونەشە کە (ابن قيم) لە (تهذيب السنن) دا بۆی چووە، منیش لە (الإرواء١-٣٠١)دا هێناومە، کەواتە ئەو دەست لە ڕان دانەی کە لە حەدیسی (أبو ذر) ڕووی داوە، وە وادیارە کە بەسەر کراسیشەوە بوبێت، وەکو دەست دان لە عەورەت نیە، بە پێچەوانەی ئەوە کە ئیبنوحەزم دەورەی ئەدات، وە دانەریش لەوەوەی نەقڵ کردووە و ئیقراری کردووە.

شتێك ماوە، ئەویش ئەوەیە کە دانەر ئەژنۆو ناوکی لکاندووە بە ڕانەوە، پاشان بەڵگەشی بۆ نەهێناوەتەوە، لە ڕاستیشدا هیچ شتێکی صەحیحیش نیە لەو بارەیەوە وەك شەوکانی ڕوونی کردۆتەوە (٢/٥٥)، بەڵکو ئەم ووتەیەی پێغەمبەر ﷺ نەفی دەکات کە فەرمویەتی: «نێوان ناوك و ئەژنۆ عەورەتە» وە ئەمە حەدیسێکی حەسەنە وەك لە (الإرواء) دا (٢٤٧و٢٧١) ڕوونم کردونەتەوە (تمام المنة).

(١) بۆ ئەوە سەیری کتێبی (حجاب المرأة المسلمة) ص٢٣- ٢٥ بکە. (تمام المنة).

لە عائیشەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا يَقبَلُ اللهُ صَلاةَ حَائِضٍ إلا بِخِمَارٍ) رواه الخمسة إلا النسائي، وصححه ابن خزيمة والحاكم، وقال الترمذي: حديث حسن. واتە: خوا نوێژی ئافرەتی بالغ وەرناگرێت ئیللا بە سەرپۆشەوە نەبێت.

لە ئوموسەلەمەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرموێت: لە پێغەمبەرم ﷺ پرسی ئایا ئافرەت بەکراسێك و سەرپۆشەوە بێ دەرپێ نوێژ بکات فەرمووی: (إذا كَانَ الدِّرعُ سَابِغاً يُغَطّي ظُهُورَ قَدَمَيهَا) رواه أبو داود وصحح الأئمة وقفه. واتە: ئەگەر کراسەکە ئەوەندە درێژ بوو کە پشتە پێی پێ داپۆشی دروستە[1].

لە عائیشەیان پرسی ئایا ئافرەت بە چەند پۆشاکەوە نوێژ بکات ؟ فەرمووی: لە عەلی بپرسە لەپاشاندا بگەڕێوە بۆلام چی ووت پێم بڵێ، ئەویش چوو بۆلای عەلی و پرسیاری لێ کرد عەلی‌ش فەرمووی: بە سەرپۆشێك و کراسێکی ئاودامانەوە کە هەموو لاشەی داپۆشێ» پرسیارکەرەکە گەڕایەوە بۆلای عائیشەو پێی ڕاگەیاند ئەویش فەرمووی: ڕاست ئەکات[2].

ئەوەی واجبە لە جلوبەرگدا وە ئەوەی موستەحەبە:-

جلوبەرگی واجب ئەو جلوبەرگەیە کە عەورەت داپپۆشێت، وە ئەگەر ئەو جلە پۆشەرە تەسك بوو عەورەتی دەست نیشان ئەکرد و تەنکیش بوو ڕەنگی سوورو سپێتی پێستی لەژێرەوە دیار بوو

---

(١) دانەر لە پەراوێزی کتێبەکەدا ئەڵێت: ئەم حەدیسە حوکمی (مرفوع)ی هەیە.

منیش دەڵێم: سەنەدەکەی صەحیح نییە نە بە مەرفوعی و نە بە مەوقوفی، لەبەر ئەوەی ئیسنادەکە ئەگەڕێتەوە بۆ سەر ئوموموحەمەدی کچی زەید، کە ئەمیش مەجهولە ناناسرێت، روون کردنەوەی لە (الإرواء٢٧٤) و (ضعيف أبي داود ٩٧-٩٨) دایە. وە ئەم ڕاستییە لە شەوکانی شاراوە بووە، لە (نيل الأوطار ٢/٥٨) دا هەربۆیە بە مەرفوعی داناوە، و بێئاگا بوە لە جەهالەتەکەی ، بەڵام لە (السيل الجرار)دا (١/١٦١) فەرمویەتی: (لاتقوم به حجة) بەکەڵکی ئەوە نایەت بکرێت بە بەڵگە.

جا لێرەدا پێکاویەتی، بەڵام پێك دادان (اضطراب) هەیە لە تەوجیهی قسەکەی، کە ئێستا ئێرە جێی ئەوە نییە ڕوونی بکەینەوە.

(٢) پیاوانی سەنەدەکەی جێی باوەڕن بەڵام ئەو پیاوەی تێدایە کە ناوی نەبراوە لە نێوان مەکحول و عائیشە.

بەڵام عبدالرزاق ریوایەتی کردوە لە ڕێگای ئوموحەسەنەوە فەرمویەتی: ئومو سەلەمەی خێزانی پێغەمبەرم ﷺ بینیوە بە کراسێك و سەرپۆشێکەوە نوێژی دەکرد. ئیسنادەکەی صەحیحە. هەروەها بە صەحیحی هاتوە لە(ميمونة)وە کە بە کراسێك و سەرپۆشێکەوە نوێژی دەکرد.

وە ئەوەی کە بە صەحیحی هاتووە لە (عمر بن الخطاب وابن عمر)ەوە کە ئافرەت لە هەمو لیباسەکانیدا نوێژ بکات، ئەوە حەمل ئەکرێتە سەر تەواوتر و چاکتر. والله أعلم. بڕوانە (تمام المنة).

دروست نییە نوێژی پێوە بکرێ٠ وە دروستە بەتەنها پۆشاکێکەوە نوێژ بکرێت وەك لەپێشەوە باس کرا لە (حدیث)ی سەلەمەی کوڕی ئەکوەع دا.

لە ئەبوهورەیرەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا ئایا بە تەنها پۆشاکێکەوە نوێژ ئەکرێت، ئەویش فەرمووی: (أَوَلِكُلِّكُم ثَوبَانِ) رواه مسلم ومالك وغيرهما. واتە بۆچی هەمووتان دوو کراستان هەیە؟.

وە موستەحەببە بە دوو پۆشاك و زیاتر لە دوو پۆشاك نوێژ بکرێت، وە بەپێی توانا خۆ جوان بکرێت و برازێنرێتەوە. ئیبنوعومەر دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذا صلى أَحَدُكُم فَلْيَلبَس ثَوبَيهِ فَإنَّ اللهَ أَحَقُّ مَن تُزُيِّنَ لَهُ، فَإن لَم يَكُن لَهُ ثَوبَانِ فَلْيَتَّزِر إذا صلى، وَلا يَشتَمِل أَحَدُكُم فِي صَلاتِهِ اشتِمَالَ اليَهُودِ) رواه الطبراني والبيهقي. واتە ئەگەر یەکێ لەئێوە ویستی نوێژ بکات با هەردوو پۆشاکەکەی لەبەر بکات چونکە خوا لە هەموو کەس شایستەترە خۆی بۆ برازێنرێتەوە، بەڵام ئەگەر دوو پۆشاکی نەبوو ئیزارەکەی پەشماڵەکەی ببەستێ کاتێ ئەیەوێ نوێژ بکا، وە کەس لەئێوە کاتی نوێژ کردنی بەپۆشاکەکەی خۆی نەپێچێتەوە (بەمە کە بیناڵێنێ لە خۆیەوە) وەك خۆ پێچانەوەی یەهود.

عبد الرزاق ئەگێڕێتەوە دەفەرمووێت: جارێك ئوبەی کوڕی کەعب و عبداللهی کوڕی مەسعود لەنێوان یەکدا جیاوازیان ئەبێت، ئوبەی دەفەرمووێت: نوێژ بە تەنها پۆشاکێکەوە کەراهەتی نییە، ئیبنو مەسعودیش دەفەرمووێت: ئەوە سەردەمێك بوو جلوبەرگ کەم بوو، عومەر چووە سەر مینبەرو فەرمووی: قسە قسەی ئوبەی کوڕی کەعبەو ئیبنو مەسعودیش درێغی نەکردووە، ئەگەر خوا ماڵی دانێ ئێوەش بەپێی ئەوە بجوڵێنەوە، دروستە پیاو جلەکانی لەخۆدا کۆبکاتەوە، (واتە: جلی زۆر لەبەر بکات) دروستە بە ئیزارێك پەشماڵێك و ڕیدائیێکەوە (کە جلێکی سەرەوەیە نوێژ بکات)، بە ئیزارێك و کراسێکەوە بیکا، بە ئیزارێك و قەبائێکەوە (ئەویش جۆرە جلێکە لەسەرەوە لەبەر ئەکرێ)، بە شەرواڵێك و ڕیدائیێکەوە، بە شەرواڵێك و کراسێکەوە، بە شەرواڵێك و قەبائێکەوە، بە توببانێك (شەرواڵێکی چەرمی بێ دەرلینگ) و قەبائێکەوە، بە توببانێك و کراسێکەوە، ئەڵێ وابزانم فەرمووی: بە توببانێك و ڕیدائێکەوە. وە ئەمە لە بوخاریدا هاتووە بەبێ ئەوەی باسی هۆی قسەکردنی عومەر بکرێ.

لە بورەیدەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: «پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە لەوەی کە پیاو بە تەنها پوشاکێکەوە نوێژ بکاو لە خۆیەوە بناڵێنێ. وە هەروەها نەهی کردووە لەوەی بە

شەرواڵێکەوە نوێژ بکاو ڕیدائی لەبەرا نەبێ»· ئەبو داودو بەیهەقی ڕیوایەتیان کردووە[1]، وە لە حەسەنی کوڕی عەلی‌یەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە: کاتێ هەڵسایە بۆ نوێژ کردن کام پۆشاکەی چاك بووە لەبەری دەکرد، لەو بارەوە پرسیاریان لێ کرد فەرمووی: خوا جوانە و جوانی پێ خۆشە، بۆیە خۆم بۆ پەروەردگارم جوان ئەکەم، وە ئەو ئەفەرمووێ: ﴿يَـٰبَنِىٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ﴾ واتە: لەکاتی هەموو نوێژێکدا بە خۆ داپۆشین خۆتان جوان بکەن.

سەر ڕووت کردن لە نوێژدا:-

ئیبنو عەساکیر لە ئیبنو عەبباسەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ قەڵەنسوەکەی دائەناو ئەیکردە (سترة) بەربەست لەبەردەم نوێژەکەیدا[2] وە لەلای حەنەفی‌یەکان قەیناکە پیاو بە سەری

(۱) سەنەدەکەی حەسەنە بڕوانە (صحيح أبي داود ٦٤٦) وە ئەم حەدیسە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە واجبە لەسەر نوێژکەر ئەو بەشەی کە عەورەت نی‌یە بیپۆشێت، کە بەشی لای سەرەوەیە، ئەگەر دەستی کەوت وەك حەدیسی (ابن عمر) و غەیری ئەمیش، وە زاهری ئەمی‌یەکە بەتاڵی نوێژ دەگەیەنێت، وە ئەوەی کە تەئکید لەسەر ئەمە دەکات وتەکەی پێغەمبەرە ﷺ کە دەفەرمووێت هیچ کەسێك لە ئێوە نوێژ نەکات بە یەك جلێك کە هیچی بەسەر شانی‌یەوە نی‌یە، (رواه الشيخان وأبوداود وغيرهم) (تمام المنة).

(۲) ئەم (حديث) ە ناکرێتە بەڵگەی ڕووت کردنی سەر لەبەر دوو ڕوو:

یەکەم: ئەمە (حديث) ێکی (ضعيف) ە، وە بەسە بۆ دەلالەت کردنە سەر ئەمە کە ئیبنو عەساکیر بە تەنها دەیگێڕێتەوە، وە عیللەتەکەیم ئاشکرا کردووە لە (الضعيفة٢٥٣٨) دا.

دووەم: ئەگەر ئەمە صەحیحیش بێت ناکرێتە بەڵگەی سەر ڕووت کردن بە (مطلق) ی، لەبەر ئەوەی زاهیری ئەوەیە کە ئەو ئەم کارەی دەکرد کە شتێکی دەست نەکەوتایە بیکات بە سوترە،، لەبەر ئەوەی دانانی سوترە گرنگترە، بەپێی ئەو حەدیسانە کە هاتووە لەو بارەیەوە.

وە ئەوەی من دەیبینم لەم مەسەلەیەدا کە نوێژی سەر ڕووت مەکروهە، لەبەر ئەوەی شتێکی براوەیە کە موستەحەببە موسڵمان بە تەواوترین ڕوخساری ئیسلامی‌یەوە بچێتە ناو نوێژ لەبەر ئەو حەدیسەی پێشوو لە کیتابەکە: «...خوا شیاوترە کە خۆی بۆ برازێندرێتەوە» وە ڕواڵەتێکی جوان نی‌یە لە داب و نەریتی سەلەف بەردەوام سەر ڕووتی و گەڕان بە ڕێگاکان و چوونە ناو جێگای خوا پەرستن بەو شێوەیە، بەڵکو ئەمە داب و نەریتی بیانی‌یە، کشاوە بۆ زۆربەی وڵاتانی ئیسلامی، کاتێك کافرەکان هاتنە ناوی، وە داب و نەریتە خراپەکانی خۆیان هێنا بۆی، وە موسڵمانەکانیش چاویان لێیان کرد، جا بەمانەو وێنەی ئەمانە تەقالیدی شەخصی‌یەتی ئیسلامی خۆیان لەدەس دا، جا ئەم دیاردە کتوپڕی‌یە بە کەڵکی ئەوە نایەت کە بکرێتە ڕێگا خۆشکەر بۆ پێچەوانە کردنی عورفی ئیسلامی

ڕووتی‌یەوە نوێژ بکات، وە ئەمەیان بە (مستحب) داناوە ئەگەر نوێژکەر مەبەستی خشوع بێت، وە بەڵگە نەهاتووە لەسەر ئەوەی کە بڵێت داپۆشینی سەر لە نوێژدا چاکترە.

**٥- ڕوو کردنە قیبلە:-**

زانایان هەموو لەسەر ئەوە ڕێکن کە واجبە لەسەر نوێژکەر ڕووبکاتە مزگەوتی حەرام لەکاتی نوێژدا. بەپێی فەرمودەی خوای گەورە کە ئەفەرمووێت: ﴿فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُۥ﴾ (البقرة/١٤٤). واتە: کاتێ ویستت نوێژ بکەیت ڕوو بەرەو مزگەوتی حەرام وەربگێڕە و ڕووی تێ بکە، وە لە هەر شوێنێك بوون و ویستتان نوێژ بکەن ئەوە ڕووی تێ‌بکەن.

لە بەرائی کوڕی عازیبەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرموێت: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ شانزە یا حەڤدە مانگ ڕووەو (بيت المقدس) نوێژمان کرد لەپاشاندا ڕوومان پێ وەرگێڕدرا بەرەو کەعبە، موسلیم گێڕاویەتی‌یەوە.

**حوکمی کەسێك چاوی لە کەعبە بێت و کەسێك چاوی لێ‌ی نەبێت:-**

پێویستە لەسەر ئەوکەسەی کە چاوی لە کەعبەیە ڕوو بکاتە عەینی کەعبە، بەڵام ئەوکەسەی نایبینێ پێویستە بەرەوڕووی ئەوێ نوێژ بکات، چونکە هەر ئەوەندەی توانا هەیە وە خوا تەکلیف لە کەس ناکات بە ئەندازەی خۆی نەبێت.

---

پێشوو وە بشکرێت بە بەڵگەی دروستێتی چوونە ناو نوێژ بە سەر ڕووتی، ئەمّا سەر ڕووت کردن بە نیەتی خشوع ئەوە بیدعەیە لە دیندا، جگە لە ڕەئی هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە، وە ئەگەر ئەمە حق بووایە ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ دەی کرد، وە ئەگەر بیکردایە ئەوە لێوەی نەقڵ دەکرا، وە ئەگەر لێوەی نەقڵ نەکرابێت ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بیدعەیە جا ئاگادار بە.

وە لەوەی کە لە پێشەوە باس کرا بۆت دەر دەکەوێت کە نەفی کردنی دانەر بە بوونی بەڵگە لەسەر چاکێتی سەر داپۆشین لە نوێژا بە (مطلق) ی ڕاست نیە، ئیللا ئەگەر مەبەستی بەڵگەیەکی تایبەتی بێت، ئەوە وایە، بەڵام نەفی بوونی بەڵگەی گشتی ناکات لەسەر ئەوەی ڕوونمان کردۆتەوە، کە ئەویش خۆ ڕازاندنەوە بە پۆشاکی ئیسلامی ناسراو لەپێش ئەم چەرخەدا، وەبەڵگەی گشتی (عام) بەڵگەیە لەلای هەمووان ئیللا کاتی پێك دادان نەبێت (تعارض) جا وورد بەرەوە (تمام المنة).

له ئەبو هورەیرەوه ڕەزای خوای لەسەر بێت هاتوه که پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (ما بين المشرق والمغرب قبلة)[1] واته نێوان ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا قیبلەیە. ئەمه به نیسبەت خەڵکی مەدینەو ئەوانەی وەك ئەوانن وەك ئەهلی شامو جەزیرەو عراق، وه ئەمما خەڵکی میسر ئەوه قیبلەیان لەنێوان ڕۆژهەڵاتو باشوره، بەڵام بۆ خەڵکی یەمەن ڕۆژهەڵات ئەکەوێته لای ڕاستی نوێژکەرەوه، وه ڕۆژئاوا ئەکەوێته لای چەپی‌یەوەی، وه بۆ خەڵکی هیند ڕۆژهەڵات ئەکەوێته دووای نوێژکەرەوه، وه ڕۆژئاوا ئەکەوێته بەردەمی، وه جێگاکانی تریش هەر بەوجۆرە.

قیبله بەچی ئەزاندرێت:

هەموو وڵاتێك چەند بەڵگەیەکی تایبەتی هەیه که قیبلەی پێ ئەناسێت، لەوانە: ئەو میحرابانەی که موسڵمانان له مزگەوتەکانا دایان ناون، وه هەروەها قیبلەنوما.

حوکمی کەسێك که قیبلەی لێ وون بوبێت:

هەرکەس نیشانەکانی دۆزینەوەی قیبلەی لێ وون بوو، بەهۆی هەور یا شتی تر ئەوه واجبه لەسەری پرسیار بکات بۆ ئەوەی قیبلەی نیشان بدرێت، بەڵام ئەگەر کەسی دەست نەکەوت ئەوه ئەبێ خۆی هەوڵی دۆزینەوەی بدات، هەوڵەکەی بەچی گەیشت ئەوه بۆ ئەولایەوه ئەبێ نوێژ بکات، نوێژەکەشی دروستەو گێڕانەوەی لەسەر نی‌یە، هەتا ئەگەر لەدوای لێبوونەوەی له نوێژەکەی بۆشی دەرکەوێ که بەرەو قیبله نوێژی نەکردووه، بەڵام ئەگەر لەناو نوێژەکەدا قیبلەی بۆدەرکەوت له کوێوەیه با ڕوو وەربگێڕێت بۆلای قیبلەو نوێژکەی نەبڕێت.

له ئیبنو عومەرەوه خوای لێ ڕازی بێت هاتوه دەفەرموورێت: (نوێژی بەیانی بوو خەڵك له مزگەوتی قوبا نوێژیان ئەکرد کەسێك هات ووتی: پێغەمبەر ﷺ وەحی بۆ هاتووەو فەرمانی پێ کراوه له نوێژدا ڕوو بکاته کەعبه ئێوەش ڕووی تێ بکەن، لەو کاتەدا خەڵکەکه ڕوویان لەشام بوو، له نوێژەکەدا ڕوویان وەرگێڕا بۆلای کەعبه). (متفق عليه).

پاشان ئەگەر کەسێك هەوڵی دۆزینەوەی قیبلەی دا بۆ نوێژێك، وه بەرەو لایەك نوێژی کرد، ئەبێ بۆ نوێژێکی تر هەوڵێکی تر بدا، جا ئەگەر له هەوڵی جاری دووەمدا قیبلەی گۆڕی ئەبێ ڕووبکاته ئەو شوێنەو نەگەڕێتەوه بۆ شوێنی یەکەم، وه نوێژی جاری یەکەمیش نەگێڕێتەوه.

چ کاتێك ڕووکردنه قیبله فەرز نابێت:-

ڕوو کردنه قیبله فەرزە بەڵام لەم حاڵەتانەی خوارەوه ئەو فەرزی‌یەته نامێنێ:-

---

(١) ئیبنوماجەو (ترمذي) ریوایەتیان کردوه، و (ترمذي) ووتویەتی: حەسەن و صەحیحه، هەروەها بوخاریش خوێندویەتی‌یەوه.

١- سوارێك نوێژی سوننەت بكات:-

دروستە بۆ سووار بەسەر پشتی وولاغەكەیەوە نوێژی سوننەت بكات، ڕوكوع و سجودەكەی بە ئیشارەت بێتو سوجودەكەی نزمتر بێت لە ڕوكوعەكەی، قیبلەكەشی ڕووەو ئەوشوێنەیە وولاغەكەی بۆی ئەڕوات، لەعامیری كوڕی ڕەبیعەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: بینیومە پێغەمبەر ﷺ بەسوواری وولاغەكەیەوە نوێژی كردووە بەرەو ئەولایەی كە وولاغەكە ئەوی بردووە بۆلای. بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە، بوخاری ئەمەشی زیاد كردووە دەفەرمووێت: بەسەر ئاماژەی ئەكرد. وە (ترمذي) ئەمەی زیاد كردووە دەفەرمووێت: نوێژە فەرزەكانی بەوشێوەیە نەكردووە.

وەلای ئەحمەدو موسلیم و (ترمذي) هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ نوێژی ئەكرد بەسەر وولاغەكەیەوە لە كاتێكدا لە مەككەوە بەرەو مەدینە ئەهات، وولاغەكەی بەرەو كوێی ئەبرد ئەو بەرەو ئەولایە نوێژی ئەكرد، وە لەو بارەیەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡمَشۡرِقُ وَٱلۡمَغۡرِبُۚ فَأَيۡنَمَا تُوَلُّواْ فَثَمَّ وَجۡهُ ٱللَّهِۚ﴾ (البقرة/١١٥). واتە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا هی خوایە جا ئێوە ڕووبكەنە هەركوێیەك لەوێ زانیاری و توانایی خوای لێیە.

لە ئیبراهیمی نەخەعیەوە هاتووە دەفەرمووێت: وەلاغەكانیان بەرەو كوێ برۆیشتایە ئەوان بەسەریەوە بەرەو ئەولایە نوێژیان ئەكرد، ئیبنو حەزم دەفەرمووێت: مەبەستی لە صەحابەو تابیعینە بە گشتی لە سەفەرو نیشتەجێ بوونیان.

٢- كەسێك زۆری لێ كرابێت یا نەخۆش بێت یاترسی هەبێت:-

كەسێك ترسی هەبێت یا زۆری لێكرابێت یا نەخۆش بێت، دروستە بەرەو لایەكی تر نوێژ بكات ئەگەر بۆی نەكرا ڕوو بكاتە قیبلە، چونكە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذَا أمَرْتُكُم بِأمرٍ فَأْتُوا مِنهَ مَا استَطَعتُم). واتە: كاتێ فرمانی كردنی كارێكتان پێ ئەكەم چەندە ئەتوانن ئەوەندەی لێ بكەن.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَإِنۡ خِفۡتُمۡ فَرِجَالًا أَوۡ رُكۡبَانٗاۖ﴾ (البقرة/٢٣٩). واتە: ئەگەر ترستان هەبو ئەوە بە پێوە یا بەسواریەوە نوێژەكانتان بكەن. ئیبنو عومەر خوایان لێ ڕازی بێ دەفەرمووێت: واتە: ڕووتان لەقیبلە بێ یا ڕووتان لێی نەبێ، بوخاری گێڕاویەتیەوە.

**چۆنی‌یەتی نوێژ کردن:**

چەندین (حدیث) لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتووەو ڕوونی کردۆتەوە نوێژ چۆن چۆنی ئەکرێت و شێوەکەی چۆنە، ئێمە لێرەدا تەنها دوو (حدیث) ئەهێنینەوە یەکێکیان لەکردەوەکانی‌یەتی و دووەمیان لە فەرمایشتەکانی:-

١- لە عبداللّەی کوڕی غەنمەوە دەفەرمووێت ئەبو مالیکی ئەشعەری هۆزەکەی خۆی کۆ کردەوەو فەرمووی: هۆزی ئەشعەر خۆتان و ژن و مناڵتان کۆ بکەنەوە با فێری چۆنی‌یەتی نوێژ کردنی پێغەمبەرتان بکەم ﷺ کە لە مەدینە نوێژی پێ ئەکردین، ئەوانیش خۆیان و ژن و مناڵیان هاتن کۆ بوونەوە، ئینجا لەبەر چاویان دەست نوێژێکی گرت و نیشانی دان چۆن دەست نوێژ ئەگیرێت بەرێك و پێکی، وە نیشانی دان ئەندامەکانی دەست نوێژ چۆن ئەشۆرێ و هەتا کوێ ئەشورێت، ئینجا کە سێبەر داهات هەستا بانگی دا، پاشان پیاوەکانی لەپێشەوە ڕیز کردو مناڵەکانیش لەدوایانەوە و ژنەکانی لەدوای مناڵەکانەوە ڕیز کرد، جا قامەتی بۆ کردن و چووە پێشەوە هەردوو دەستی بەرز کردەوەو (الله أکبر)ی کرد، لەپاشاندا سوورەتی فاتیحەو سورەتێکی تری بەبێ دەنگی خوێند، پاشان ووتی: (الله أکبر)و چووە ڕوکوعەوە ووتی: (سبحان الله وبحمده) سێ جار، لەپاشاندا ووتی: (سمع الله لمن حمده) ئینجا ڕاست بۆوەو ڕێك وەستا، ئینجا ووتی: (الله أکبر) و دانەوی‌یەوە بۆ سەجدەو سەجدەی برد، لەپاشاندا ووتی‌یەوە (الله أکبر)و سەری بەرز کردەوە، ئینجا (الله أکبر)ی کردو سوجدەی بردەوە لەپاشاندا ووتی‌یەوە (الله أکبر) و هەڵسایەوە سەرپێ. وە ژمارەی (الله أکبر) ەکانی لە ڕکاتی یەکەمدا شەش جار بوو، وە کە هەڵسایەوە بۆ ڕکاتی دوەم (الله أکبر)ی کردەوە. پاشان کاتێ لە نوێژەکە بۆوە ڕووی کردە هۆزەکەی و فەرمووی: ئەو (الله أکبر)انەی کردم باش لەبەری بکەن، چونکی ئەوە شێوەی نوێژ کردنی پێغەمبەر ﷺ بوو، کە تا لەم کاتەدا پێی کردووین، لەپاشاندا کاتێ پێغەمبەر ﷺ لەنوێژ لێ ئەبۆوە ڕووی ئەکردە خەڵکەکەو ئەی فەرموو: (ئەی خەڵکینە گوێ بگرن و باش هۆشی بدەنێ، وە بزانن کە خوای گەورە خەڵکی وای هەیە نە پێغەمبەرن، نە شەهید، پێغەمبەرانو شەهیدان خۆزگەیان پێ ئەخوازن، چونکە ئەوەندە لەخواوە نزیکن)، لای خوارووی خەڵکەکەوە کابرایەکی عەرەبی دەشتەکی لێ بوو کە گوێی لەوەبوو هات و بەدەستی ئاماژەی بۆ پێغەمبەر ﷺ کردو ووتی: ئەی نێرراوی خوا کەسانێك لە خەڵکی نە پێغەمبەر بن و نەشەهید، وە پێغەمبەران لەبەر نزیکیان لەخواوە خۆزگەیان پێ ببەن؟ ئەوانەمان بۆ وەصف بکە، پێغەمبەر ﷺ شاد بوو بە پرسیارەکەی کابراو فەرمووی: (ئەوانە کەسانێکن کە لە پاڵاوتەی خەڵکین لە تایفەو هۆزەکاندا، لەبەینی یەکتردا خزمایەتیان نی‌یە، بەڵام لەبەر خوا یەکتریان خۆش دەوێو دڵیان لەیەك پاکە، خوا لە ڕۆژی دوایی دا لەنوور چەندەها

مینبەریان بۆ دروست ئەکات و دایان ئەنیشێنێ لەسەری، جا ڕوخسارەکانیشیان ئەکا بە نوورو جلەکانیشیان ئەکا بەنوور، لەو ڕۆژەدا خەڵك ئەترسن بەڵام ئەوان ناترسن، چونکە دۆستی خوان و ترسیان نی‌یە و بێ‌غەم و پەژارەن). ئەحمەدو ئەبو یەعلا بە ئیسنادێکی حەسەن گێڕاویانەتەوە و حاکمیش دەفەرمووێت: ئیسنادەکەی صەحیحە[1].

٢- لە ئەبی هورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە دەفەرمووێت: پیاوێك هاتە ناو مزگەوت و دەستی کرد بە نوێژ کردن، کاتێ سلاوی دایەوە هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ سلاوی لێ کرد. پێغەمبەر ﷺ وەلامی سلاوەکەی دایەوە و فەرمووی: (بچۆ نوێژەکەت بکەرەوە چونکە ئەوە نوێژ نەبوو کردت) ئەویش گەڕایەوە نوێژەکەی کردەوە. بەو شێوەیە هەتا سێ جار گێڕایەوە، دوای سێ جارەکە ووتی: بەو زاتەی تۆی ناردووە بەهەق لەوە زیاتر نازانم، دە فێرم بکە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (کاتێ کە هەڵسای بۆ نوێژ بڵێ: (الله أكبر) پاشان لە قوڕئان چیت لەبەر بوو بیخوێنە، کاتێ لێ بوویتەوە بڵێ: (الله أكبر) و بچۆ بۆ ڕکوع، ئەوەندە لە ڕکوعدا بوەستە هەتا بە ئارام لە ڕکوعدا ئەمێنیتەوە و ئێسکەکانت لە جووڵە ئەکەون، لەپاشان سەر بەرز بکەرەوە لە ڕکوع بەپێوە بووەستەو تەواو ڕێك بەرەوە، لەپاشاندا بچۆ بۆ سەجدە، ئەوەندە لە سەجدە بمێنەرەوە هەتا ئارام ئەبیتەوە لەسەجدەدا، لەپاشاندا سەر لە سەجدە بەرز بکەرەوەو دانیشە، ئەوەندە دانیشە هەتا ئارام ئەبیتەوە لە دانیشتندا، لەپاشاندا بچۆرەوە سەجدە ئەوەندە بمێنەرەوە لە سەجدەدا هەتا ئارام ئەبیتەوە لەسەجدەدا، بەو شێوەیە بکە لەهەموو نوێژێکتا). ئەحمەدو بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە. وە ئەم (حديث)ە پێی ئەڵێن: (حديث)ی ئەوکەسەی نوێژەکەی بەخراپی کرد.

ئەمەی کە باسمان کرد تێکڕای ئەوە بوو کە هاتووە لەبارەی چۆنی‌یەتی نوێژەوە کە لە کردەو ووتەی پێغەمبەرەوە ﷺ وەرگیراوە، وە ئێمەش بەو شێوەیە ئەیکەین لەگەڵ زانین و جیاکردنەوە لە نێوان فەرزەکان و سوننەتەکان.

---

(١) ئەو تەخریجە دانەر لە (الترغيب) (٤٨/٤)ەوە وەری گرتووە. وە ئێمە دەڵێین لە تەحسین کردنەکەیدا ئەی پێکاوە، لەبەر ئەوەی خولگەی سەنەدەکەی لەسەر شەهری کوڕی حەوشەبە، وە ئەمیش (ضعيف)ە لەبەر خراپی (حفظ)ی و (اضطراب)ی لە ڕیوایەتەکانی هەروەك ناشکرا دەبێت بۆ کەسێك کە بە دووی بکەوێت، یان پێ ڕووانینی هەبێت بەسەر ووتەی پێشەواکان، بەڵام (حافظ) لە التقريب دا کورتی کردۆتەوە بەوەی (صدوق كثير الإرسال والأوهام).

پاشان سید سابق دەڵێت: لە عەبدوڵڵای کوڕی غونمەوە. ئەمە هەڵەیە، ڕاست ئەوەیە: عبدالرحمن ی کوڕی غەنمەوە، هەروەك لە المسندا هاتووە، وە دانەر لە شوێنێکی تریش باسی کردووە، بەڵام هەر دەڵێت: غونم بە (ضمة)، بەڵکو دەبێت بە فەتحە بێت، وەك لە التقريب دایە، (تمام المنة).

## فەرزەکانی نوێژ

بۆ نوێژ چەند فەرزو چەند ڕوکنێك هەیە کە حەقیقەتی نوێژیان لێ پێك دێ، بەجۆرێك ئەگەر یەکێك لەو فەرزانە نەبێتە جێ بەپێی یاسای ئیسلام ئەو نوێژە بە نوێژ دانانرێت وبەجێ ناگات. وا لە خوارەوە ڕوونیان ئەکەینەوە:-

١- نییەت هێنان:-

بەپێی فەرمودەی خوای گەورە کە فەرموویەتی: ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ﴾ (بینە/٥). واتە، وەئەوان فەرمانیان پێ نەدراوە ئیللا ئەوە نەبێ کە عیبادەت بۆ خوا بکەن و دینەکەیان خالیص و پوختە بۆ ئەو ئەنجام بدەن.

وە بەپێی فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ کە ئەفەرموێت: (إنَّمَا الأعمَالُ بِالنِّيَّاتِ وَإنَّمَا لِكُلِّ امرِئٍ مَا نَوَى، فَمَن كَانَت هِجرَتُهُ إلى اللهِ وَرَسُولِهِ فَهِجرَتُهُ إلى اللهِ وَرَسُولِهِ، وَمَن كَانَت هِجرَتُهُ لِدُنيَا يُصِيبُهَا أوِ امرَأةٍ يَنكِحُهَا فَهِجرَتُهُ إلى مَا هَاجَرَ إلَيهِ) رواه البخاري. واتە: قەبووڵ بوونی کردەوەکان لەلای خوا تەنها بەپێی نییەتەکانە، وە هەرکەس چی لەنییەتدا بێ هەر پاداشی ئەوەی بۆئەنووسرێ، جا هەرکەس کۆچ کردنی بۆلای خواو پێغەمبەرەکەی بێت، ئەوە کۆچ کردنی بۆلای خواو پێغەمبەرەکەیەتی، وە هەرکەس کۆچ کردنی لەبەر دنیایەك بێ کەبەدەستی بێنێ یا لەبەر ئافرەتێك کە بیهێنێ، ئەوە کۆچ کردنەکەی بۆلای ئەوەیە کە هیجرەتی کردووە بۆلای. وە باسی حەقیقەتی نییەت لە دەست نوێژدا کراوە.

بەدەم نییەت هێنان:

ئیبنو قەییم لەکتێبی (إغاثة اللهفان)دا دەفەرموێت: نییەت ویست و بڕیارە بۆ کردنی شت، وە شوێنی نییەتیش دڵە وە لە ڕاستی دا پەیوەندی بەزبانەوە نیيە، هەربۆیە لە پێغەمبەرەوە ﷺ نەهاتووە کە بە دەم نییەتی هێنابێت.، هەروەها لەصەحابەشەوە نەهاتووە کە بەهیچ شێوەیەك نییەتیان بەدەم هێنابێ، وە ئەو عیبارەتانەی داهێنراوون و کاتی دەست نوێژگرتن و نوێژ کردن ئەووترێن، شەیتان کردوویەتیيە شوێنی بە گژا چونەوە بۆ ئەوانەی وەسوەسەیان هەیە، لە کاتی نی- یەتدا ڕایان ئەگرێت و سزایان ئەدات، وایان لێ ئەکات لە نییەتەکاندا بەدەم هەڵە بکەن و بەشوێن ڕاست کردنەوەی دا بگەڕێن، بۆیە ئەبینی ئەو کەسە چەند جار نییەتەکەی دووبارە ئەکاتەوەو خۆی ماندوو ئەکات بۆ ووتنی، هەرچەندە ئەو عیبارەتانە لەنوێژیش نین.

٢- (الله أكبر) ی (إحرام) نوێژ دابەستن:

بەپێی ئەوەی عەلی خوا لێی ڕازی بێت ئەگێڕێتەوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مِفتَاحُ الصَّلاةِ الطُّهُورُ، وَتَحرِيمُهَا التَّكبِيرُ، وَتَحلِيلُهَا التَّسلِيمُ) رواه الشافعي وأحمد وأبوداود وابن ماجة والترمذي[1]. واتە: کلیلی نوێژ دەست نوێژە، و تەحریمەکەی (دابەستنەکەی) وتنی (الله أكبر)ە، وتەحلیلەکەی (کۆتایی هێنانەکەی) سەلام دانەوەیە. (ترمذي) دەفەرمووێت: ئەمە صەحیح ترین و حەسەن ترین (حدیث)ە لەم باسەدا.

هەروەها بەپێی ئەوەی کە (ثابت) بووە لە کردار و ووتەی پێغەمبەر ﷺ، وەك لەو دوو فەرموودەیەدا هاتووە کەباسمان کردن.

وە هەر ئەبێ عەینی ووشەی (الله أكبر) بووترێ بەپێی ئەوەی ئەبو حومەید دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ هەڵئەستا بۆ نوێژ کردن بە ڕێکی ڕائەوەستا و هەردوو دەستی بەرز ئەکردەوەو لەپاشاندا ئەی فەرموو: (الله أكبر). ئیبنو ماجە گێڕاویەتی‌یەوەو ئیبنو خوزەیمەو ئیبنو حببان بە صەحیحیان داناوە.

وە بەززار ووتنەی ئەو (حدیث)ە بە ئیسنادێکی صەحیح لەسەر مەرجی موسلیم ئەگێڕێتەوە لە عەلی‌یەوە کە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ هەڵئەسا بۆ نوێژ ئەی‌فەرموو: (الله أكبر) وە لە (حدیث)ی هەڵەکار لەنوێژەکەیدا لای (طبراني) ئەمە هاتووە: (لەپاشاندا ئەڵێت: (الله أكبر).

٣- بەپێوە وەستان لە نوێژە فەرزەکاندا:

وەستان بە پێوە بەپێی قورئان و سوننەت و ئیجماعی زانایان واجبە لەسەر ئەو کەسانەی کەتوانای بەپێوە وەستانیان هەیە. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿حَـٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَـٰنِتِينَ﴾ (البقرة/٢٣٨). واتە ئاگاداری نوێژەکانتان بکەن بە بەجێ هێنانیان بە بەردەوامی لە کاتی خۆیاندا، (بە تایبەت) نوێژی ناوەڕاست (کە نوێژی عەسرە) وە ـ لەو نوێژانەدا ـ بە ئیخلاص و ملکەچی‌یەوە بۆ خوا ڕاوەستن.

لەعمرانی کوڕی حوصەینەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: توشی مایەسیری بووم، دەربارەی چۆنی‌یەتی نوێژ کردنم پرسیارم لەپێغەمبەر ﷺ کرد ؟ فەرمووی: (بە ڕاوەستانەوە نوێژ بکە، جا ئەگەر نەتتوانی دانیشە، ئەگەر هەر نەتتوانی لەسەر لاتەنیشت). بوخاری گێڕاویەتی‌یەوە.

---

(١) ئەم حەدیسە حەسەن و صەحیحە هەروەك شێخ ئەلبانی دەفەرمووێت لە (صحيح ابن ماجة رقم ٢٢٢) دا.

وە قسەی زانایان لەسەر ئەوە پێك هاتووە، وەهەروەها پێك هاتوون لەسەر ئەوەی کە موستەحەببە کاتی ڕاوەستان قاچەکان لەیەك جیا بکرێنەوە.

**ڕاوەستان لەنوێژی سوننەتدا:-**

بەڵام نوێژە سوننەتەکان دروستە بەدانیشتنەوە بکرێن لەگەڵ ئەوەشدا کە توانای بەپێوە وەستان هەبێت، بەڵام پاداشی بەپێوە وەستاو تەواوترە وەك لە پاداشی دانیشتوو، لە عبداللەی کوڕی عومەرەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: بۆیان گێڕامەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (صَلاَةُ الرَّجُلِ قَاعِداً نِصفُ الصَّلاَةِ) رواه البخاري ومسلم. واتە نوێژی پیاوی دانیشتوو نیوە نوێژە.

**نەبوونی توانای بەپێوە وەستان لەنوێژی فەرزدا:-**

هەرکەس توانای نەبوو بەپێوە بووەستێت لەنوێژی فەرزدا، ئەوە چۆن توانی نوێژ بکات بیکات، چونکە خوای گەورە لەتوانا بەولاوە داوا ناکات، وە ئەو جۆرە کەسانە پاداشی تەواو لەسەر نوێژەکەیان وەرئەگرن. لە ئەبو موساوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذَا مَرِضَ العَبدُ أو سَافَرَ كَتَبَ اللهُ لَهُ مَا كَانَ يَعمَلُهُ وَهُوَ صَحِيحٌ مُقِيم) رواه البخاري. واتە ئەگەر موسڵمانێك نەخۆش بوو یا چوو بۆ سەفەر، لەکاتی لەش ساغی و نیشتەجێ بوونیدا چی کردووە هەربۆی ئەنووسرێ لەلایەنی خوای گەورەوە.

**٤- خوێندنی سوورەتی فاتیحە:-**

ئەبێ سوورەتی فاتیحە لە هەموو ڕکاتێك لەرکاتەکانی نوێژدا بخوێنرێت، نوێژەکە نوێژی فەرز بێت، یا نوێژی سوننەت، وە چەند (حدیث) ێکی صەحیح هاتووە دەربارەی ئەوەی خوێندنی سوورەتی فاتیحە فەرزە لەهەموو ڕکاتەکانی نوێژدا، جا لەبەر ئەوەی (حدیث) ی صەحیح و ئاشکرا لەو بارەیەوە هاتووە ئیتر ڕێگای جیاوازی زانایان نەماوە، وە ئێمەش ئەو (حدیث) انە باس ئەکەین لەخوارەوە:

١- لە عوبادەی کوڕی صامتەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا صَلاَةَ لِمَن لَم يَقرَأ بِفَاتِحَةِ الكِتَابِ) رواه الجماعة، واتە: هەرکەس لەنوێژەکەیدا سوورەتی فاتیحەی نەخوێند نوێژی نەکردووە.

٢- لە ئەبو هورەیرەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن صلى صَلاَةً لَم يَقرَأ فِيهَا بِأُمِّ القُرآنِ ـ وفي روايةٍ ـ بِفَاتِحَةِ الكِتَابِ، فَهِيَ خِدَاجٌ هِيَ خِدَاجٌ غَيرُ

تَمَامٍ) رواه أحمد والشيخان. واته: هەرکەس نوێژی کردو سوورەتی (أم القرآن)ی ـ لەڕیوایەتێکی ترا ـ فاتیحەی کتابی تێدا نەخوێند، ئەو نوێژە نوقسانە، نوقسانە، تەواو نییە[1].

٣- وە هەر لە ئەبی هورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا تُجزِئُ صَلاةٌ لا يُقرَأُ فِيهَا بِفَاتِحَةِ الكِتَاب) رواه ابن خزيمة بإسنادٍ صحيح. واته: ئەو نوێژە دروست نییە کە سوورەتی فاتیحەی تێدا نەخوێنرابێت.

٤- وە لەلای (دارقطني) بەئیسنادێکی صەحیحەوە هاتووە: (لا تُجزِئُ صَلاةٌ لِمَن لَم يَقرَأ بِفَاتِحَةِ الكِتَابِ). واتە نوێژی کەسێك، دروست نییە کە فاتیحەی تێدا نەخوێندبێت.

٥- لە ئەبو سەعیدەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: ئێمە فەرمانمان پێ کرابوو لەنوێژدا سوورەتی فاتیحەو چەند بتوانین لەسورەتەکاتی تری قورئان بخوێنین. رواه أبو داود وقال الحافظ وابن سيد الناس: إسناده صحيح.

وە لە هەندێ ڕێگاوە لە (حدیث)ی هەڵەکار لەنوێژەکەیدا هاتووە فەرموویەتی: (لەپاشاندا (أم القرآن) کە سوورەتی فاتیحەیە بخوێنە). تا ئەوەی کە پێی فەرمو: (پاشان ئەو کارە بکە لە هەمو ڕکاتێکدا).

٧- لەپاش ئەوانە لە پێغەمبەرەوە ﷺ (ثابت)ە کەخۆی لەهەموو ڕکاتێك لە ڕکاتەکانی نوێژی فەرزو سوننەت سورەتی فاتیحەی خوێندووە، وە پێچەوانەی ئەوە (ثابت) نییە، وە خولگەی عیبادەتەکانیش شوێن کەوتنی پێغەمبەرە ﷺ، چونکە خۆی فەرموویەتی: (صَلُّوا كَمَا رَأيتُمُونِي أُصَلِّي) رواه البخاري. واتە: من چۆن ئەبینن نوێژ ئەکەم ئێوەش بەو شێوەیە نوێژ بکەن.

---

(١) ئەمە دووشتی لەسەرە:

یەکەم: بە (مطلق)ی داویەتییە پاڵ شەیخەین بوخاریو موسلیم، وە وای زانیوە کە ئەم حەدیسە لەلای بوخارییە لە (الصحيح) دا وە ئەمە هەڵەیە، لەبەر ئەوەی ئەمە موسلیم بە تەنهایی دەیگێڕێتەوە بەبێ بوخاری، ڕەنگە هۆی ئەم بەهەڵەداچوونە ئەوە بێت کە بوخاری لە (جزء القراءة) و لە (أفعال العباد)دا گێڕاویەتییەوە، جا ئەو، یان ئەوەی کە ئەم لێوەی نەقل کردووە بە (مطلق)ی داویەتییە پاڵی بەبێ ئەوەی بیبەستێتەوە بە (الجزء) یان (الأفعال)ەوە، بۆیە هەڵەکە ڕووی داوە لەبەر ئەوەی دانە پاڵی ئەو دو کیتابە مانای ئەوە ناگەیەنێت کە حەدیسەکە صەحیحە، بە پێچەوانەی دانەپاڵ صەحیحی بوخاری لە زاراوەی زانایاندا.

وە ئەوی تریان: ئەوەیە (لفظ) ی (فهي خداج هي خداج) ئەمە ڕیوایەتێکی ئەحمەدە (٢/٢٨٥)، وە لە ڕیوایەتێکی تریدا (فهي خداج، ثم هي خداج، ثم هي خداج) وە ئەمەیان یەکە لەگەڵ ڕیوایەتەکەی موسلیم (١٠/٢) بە لەفزی (فهي خداج، يقولها ثلاثاً) ئەبو داودو باقی خاوەن سوننەکان و جگە لە مانیش گێڕاویانەتەوە، وە ئەمەش تەخریج کراوە لە (صحيح أبي داود٧٧٩). (تمام المنه).

وتنی (بسم الله) بەسمەلە:

(بسم الله الرحمن الرحيم)، زانایان لەسەر ئەوە یەك هاتوون کە بەسمەلە بەشێکە لە ئایەتی سورەتی (النمل)، بەڵام جیاوازیان هەیە لەو بەسمەلانەی کە کەوتوونەتە سەرەتای سوورەتەکانی قورئانی پیرۆزەوە، لەمەدا سێ بۆچوونی بەناوبانگ هەیە کە ئەمانەن:

یەکەم: (بسم الله الرحمن الرحيم) ئایەتێکە لەسوورەتی فاتیحەو هەموو سورەتەکانی تری قورئان، کەواتە خوێندنی لە سورەتی فاتیحەدا واجبە، وە حوکمەکەی وەك حوکمی فاتیحەیە لە ئاشکرا و نهێنی دا، وە بەهێزترین بەڵگە بۆ ئەم بۆچوونە (حدیث)ەکەی نوعەیمی کوڕی موجەممیرە کە دەفەرمووێت: لەدوای ئەبی هورەیرەوە نوێژم ئەکرد (بسم الله الرحمن الرحيم)ی خوێند، وپاشان فاتیحەی خوێند، کە لە نوێژەکە بۆوە فەرمووی: بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە من لەهەمووتان زیاتر نوێژەکەم لەنوێژی پێغەمبەر ﷺ ئەچێت. نەسائی و ئیبنو خوزەیمەو ئیبنو حببان گێڕاویانەتەوە.

(حافظ) لە (الفتح) دا دەفەرمووێت: ئەوە صەحیح ترین (حدیث)ە کە هاتووە دەربارەی بە ئاشکرا خوێندنی (بسم الله...)[1].

---

(١) پێویستە بزانرێت کە ئەو عیبارەتەی (حافظ) لە لای زانایانی (حدیث) ئەوە ناگەیەنێت کە (حدیث) ەکە صەحیح بێت، بەڵکو صەحیحی نیسبەتی پێ ئەبەخشێت، ئەوەی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت:
ئەم عیبارەتە ئەوە ناگەیەنێت کە حەدیسەکە صەحیحە، ئەوان دەڵێن: ئەمە ڕاست (أصح) ترین شتە کە لەم بابەدا هاتبێت، هەرچەندە زەعیفیش بێت، مەبەستیان پێی راجحترینیان یان کەمترین (ضعیف)ی.
منیش دەڵێم: ڕەنگە (حافظ) ڕەحمەتی خوای لێ بێت ئەم حەدیسەی تەصحیح نەکردبێت لەبەر ئەوەی هەندێك لە فەرموودە ناسان باسی (بسم الله) کەیان بە (شاذ) ی گێڕاوەتەوە، وە پێچەوانەی سەرجەم متمانە پێکراوەکان (ثقات) دەکات، ئەوانەی کە حەدیسەکەیان گێڕاوەتەوە لە (أبو هريرة) وە ئەوان باسیان نەکردووە، هەروەك (شەیخان) بوخاری و موسلیم و جگە لەوانیش گێڕاو یانەتەوە لە حەدیسی (أبي سلمة) لە ئەبی هورەیرەوە، وە زەیلەعی بۆ ڕوون کردنەوەی ئەمە لە (نصب الراية) (١/٣٢٠-٣٣٧) درێژەی بە باسی داوە جا بۆی بگەڕێوە.
پاشان ئەگەر حەدیسەکە صەحیحیش بێت خۆ بە ڕاشکاوی باسی بە ئاشکرا وتنی (بسم الله) ی تێدا نییە، وە باسی ڕەفع کردنیشی تیا نییە بۆلای پێغەمبەر ﷺ، وە ووتەکەی ئەبوهورەیرە کە لە کۆتاییەکەی دەفەرمووێت: من زیاتر لە ئێوە نوێژەکەم بە نوێژی پێغەمبەر ﷺ دەچێت. ئەوە ناگەیەنێت هەرچییەك ئەبوهورەیرە کردبێتی ڕەفع بکرێت هەروەك شەیخی ئیسلام بە درێژی باسی کردووە لە (الفتاوي) (١/٨١) جا بۆی بگەڕێوە.
وە حەق ئەوەیە کە لە بارەی ئاشکرا ووتنی (بسم الله) حەدیسێکی بە ڕاشکاوو صەحیح نەهاتووە، بەڵکو لە پێغەمبەرەوە ﷺ بە صەحیحی هاتووە کە بە نهێنی ووتویەتی لە حەدیسی ئەنەسدا، وە من دە ڕێگام بۆ

دووەم: (بسم الله الرحمن الرحيم) ئایەتێکی سەر بەخۆیە بۆ پیرۆزی و جیاکردنەوەی سورەتەکان هاتووە، وە خوێندنی لەسەرەتای سورەتی فاتیحەدا دروستە بەڵکو موستەحەبیشە، بەڵام بەدەنگی بەرز وتنی: سوننەت نی یە. بەپێی ئەوەی ئەنەس دەفەرمووێت: لەدوای پێغەمبەرەوە ﷺ نوێژم کردوە ، وە لە دوای ئەبوبەکرو عومەرو (عثمان)ەوە نوێژم کردووە بەدەنگی بەرز نەیان ئەووت: (بسم الله الرحمن الرحيم). نەسائی و ئیبنو حیببان و (طحاوي) بەئینسادێك لەسەر مەرجی هەردوو شێخ گێراویانەتەوە.

سێیەم: (بسم الله الرحمن الرحيم) ئایەتێك نی یە نە لە سورەتی فاتیحە و نە لە سورەتەکانی تری قورئان، وە خوێندنی لەنوێژدا مەکروهە بەدەنگی بەرزو بەدەنگی نزم، لە نوێژی فەرزا نەك سوننەت، وە ئەم بۆچوونە بەهێز نی یە.

ئیبنو قەییم مەزهەب و بۆچوونی یەکەم و دووەمی کۆ کردۆتەوە و دەفەرمووێت:

پێغەمبەر ﷺ بە دەنگی بەرز هەندێ جار (بسم الله الرحمن الرحيم) ی دەخوێند , وە زیاتر بە نهێنی دەیخوێند، وە گومانی تێدا نی یە کە پێغەمبەر ﷺ هەرگیز بەردەوام نەیخوێندوە بە دەنگی بەرز لە شەوو رۆژێکدا پێنج جار، لە ماڵەوەو سەفەردا، لە حاڵێکدا ئەمە شاراوە بێت لە خولەفای راشدین و وجومهوری صەحابە و ئەهلی شارەکەی لەچەرخە چاکەکاندا.

کەسێك نەزانێت فاتیحە بخوێنێت:

(خطابي) دەفەرمووێت: ئەصل ئەوەیە کە نوێژ بەبێ خوێندنی سورەتی فاتیحە تێیدا دروست نی یە، وە مەعقول و بەجێ یە کە خوێندنی سورەتی فاتیحە لەسەر کەسێك واجبە کە بیزانێ بیخوێنێ نەك ئەوەی نایزانێ،، جا ئەگەر کەسێك نەزانێ سورەتی فاتیحە بخوێنێ بەڵام سورەتێکی تر بزانێت، لەسەری واجبە ئەوەندەی حەوت ئایەتەکەی سورەتی فاتیحە لەوسورەتە بخوێنێ کە ئەیزانێ، چونکە لەپێشترین زیکر دوای فاتیحە بە ئەندازەی خۆیەتی لە قورئان، بەڵام ئەگەر هەرتوانای نەبوو هیچ لەقورئان فێر ببێت، لەبەر نەتوانایی لە سروشتیدا یالەبەر خراپی لەبەر کردنی، یا عەرەب نەبوو، یا بەهۆی نەخۆشی، ئەوە لەوکاتەدا لەپێش ترین (ذکر) دوای قورئان ئەو

---

دۆزیوەتەوە، هەمووریم باس کردووە لە کتێبەکەمدا (صفة صلاة النبي ﷺ) کە بەشی زۆریان سەنەدەکانیان صەحیحە، وە لە هەندێ لەفزدا بە راشکاوی باسی ئەوە دەکات کە پێغەمبەر ﷺ بە نهێنی دەیووت، وە سەنەدەکەیان صەحیحە، لەسەر مەرجی موسلیم، وە ئەمە بۆچوونی سەرجەم جومهوری فوقەهایەو زۆربەی خاوەنانی حەدیس، ئەمەش حەقە کە گومانی تێدا نی یە، وە هەرکەس دەیەوێت بە بەرفراوانی لەم باسە بکۆڵێتەوە با بگەرێتەوە بۆ فەتاوای شێخی ئیسلام. (تمام المنة).

(ذکر)انەیە کە پێغەمبەر ﷺ فێری خەڵکی کردووە هەروەك: (سبحان الله و الحمد لله و لا إله إلا الله).

لە پێغەمبەرەوە ﷺ ریوایەت کراوە کە فەرموویەتی: (أفضَلُ الذِّكرِ بَعدَ كَلامِ اللهِ سُبحَانَ اللهِ وَالحَمدُ للهِ وَلا إلَهَ إلا اللهُ وَاللهُ أكبَر). واتە باشترین یادی خوا دوای قورئان (سبحان الله، و الحمد لله ، و لا إله إلا الله ، و الله أكبر)ە. تەواو.

وە (حديث)ی ریفاعەی کوڕی ڕافیع کە (خطابي) باسی کرد ئەمە پشتگیری ئەکات کە پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی فێری نوێژ ئەکرد ئەی فەرموو: (إن كَانَ مَعَكَ قُرآنٌ فَاقرَأ وَإلا فَاحمَدهُ وَكَبِّرهُ وَهَلِّلهُ ثُمَّ اركَع) رواه أبوداود والترمذي وحسنه، والنسائي والبيهقي. واتە: ئەگەر قورئانت لەبەر بوو بیخوێنە، ئەگینا (الحمد لله و الله أكبر و لاإله إلا الله) بکە لەپاشاندا بچۆرە ڕکوعەوە.

٥- چوونە ركوع:-

زانایان هەموو لەسەر ئەوە ڕێکن کە چوونە ڕکوع فەرزە لەنوێژدا، بەپێی فەرمودەی خوای گەورە کەئەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱرۡكَعُواْ وَٱسۡجُدُواْ﴾ (الحج/٧٧).

واتە: ئەی ئەو کەسانەی کەباوەڕتان هێناوە ڕکوع بەرن و سەجدە بەرن.

ركوع بردن بەچی دێتە جێ؟:

ركوع تەنها بە چەمینەوە دێتە جێ بەشێوەیەك هەردوو دەست بگاتە ئەژنۆ، وە ئەبێ (طمأنينة) ئارام بوونەوە لە ركوع دا هەبێت، بەپێی ئەوەی لە (حديث)ی هەڵەکار لە نوێژەکەیدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (ثُمَّ اركَع حتى تَطمَئِنَّ رَاكِعاً). واتە لەپاشان بچۆرە رکوعەوە ئەوەندە بمێنەرەوە هەتا ئارام ئەبیتەوە.

لە ئەبو قەتادەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أسوَأُ النَّاسِ سَرِقَةً الَّذِي يَسرِقُ مِن صَلاتِهِ)، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ! وَكَيفَ يَسرِقُ مِن صَلاتِهِ؟ قَالَ: (لا يُتِمُّ رُكُوعَهَا وَلا سُجُودَهَا) أو قَالَ: (لا يُقِيمُ صُلبَهُ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ) رواه أحمد والطبراني وابن خزيمة والحاكم وقال صحيح الإسناد٠ واتە خراپترین کەس ئەو دزەیە کە لەنوێژی خۆی ئەدزێ، ووتیان: ئەی نێرراوی خوا چۆن لە نوێژی خۆی دزی ئەکات؟ فەرمووی: رکوع و سجودەکەی تەواو ناهێنێتە جێ، یان فەرموی: پشتی ڕاست ناکاتەوە لە رکوع و سجوددا. ئەحمەد و (طبراني)و ئیبنوخوزەیمەو حاکم گێڕاویانەتەوە، وە حاکم ئیسنادەکەی بە صەحیح داناوە.

لە ئەبو مەسعودی بەدرییەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا تُجزِئُ صَلاةٌ لا يُقِيمُ الرَّجُلُ فِيهَا صُلبَهُ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُود) رواه الخمسة وابن خزيمة وابن حبان والطبراني والبيهقي،

وقال: إسناده صحيح، وقال الترمذي: حسنٌ صحيح. واته ئەو نوێژە دروست نىیە پیاو لە ركوع و سجودەكەیدا پشتی تەواو ڕێك نەكاتەوە. وە كار بەمە كراوە لای ئەهلی عیلم لە صەحابەی پێغەمبەر ﷺ و پاش ئەوانیش، هەموویان لەسەر ئەوە بون كە ئەبێ نوێژكەر پشتی ڕاست بكاتەوە لە ركوع و سجوددا.

لە حوزەیفەوە هاتووە كە پیاوێكی بینی ڕكوع و سجودەكەی تەواو نەئەكرد، پێی فەرموو: ئەمە نوێژ نەبوو كردت، وە ئەگەر بمریت لەسەر ئەو ئاینە نامریت كە خوا بۆ پێغەمبەری ناردووە. بوخاری گێڕاویەتی‌یەوە.

٦- هەڵسانەوە لە ركوع و ڕێك وەستان بۆ ماوەیەك بەئارامی:

بەپێی ئەوەی ئەبو حومەید لەبارەی چۆنی‌یەتی نوێژی پێغەمبەرەوە ﷺ دەفەرمووێت: (كاتێ سەری بەرز ئەكردەوە لە ڕكوع ڕێك ئەبووەوە هەتا هەموو جومگەكانی پشتی ئەچوونەوە جێی خۆیان و لەجوڵە ئەكەوتن). بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە.

عائیشە لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەگێڕێتەوە دەفەرمووێت: كاتێ سەری بەرز ئەكردەوە لە ڕكوع نەئەچووە سەجدەوە هەتا تەواو ڕێك نەبووایەوە. موسلیم گێڕاویەتی‌یەوە.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ثُمَّ ارفَع حتى تَعتَدِلَ قَائِماً). واتە: لەپاشاندا سەر بەرز بكەرەوە تاوەكو ڕێك دەبیتەوە. بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە.

لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا يَنظُرُ اللهُ إلى صَلاةِ رَجُلٍ لا يُقِيمُ صُلبَهُ بَينَ رُكُوعِهِ وَسُجُودِهِ) رواه أحمد. وقال المنذري: إسناده جيد. واتە: خوای گەورە ناڕوانێتە نوێژی هیچ نوێژكەرێك ئەگەر لە نێوان ڕكوع و سجوددا پشتی ڕێك نەكاتەوە.

٧- سجود:

ئەوەی لەپێشەوە باس كرا بەڵگەیە لەسەر واجب بوونی سەجدە بەپێی قورئان، وە پێغەمبەر ﷺ ڕوونی كردۆتەوە لەو فەرمودەیەدا كە بەو كابرایەی فەرموو كە نوێژەكەی بە هەڵە كردبوو، فەرمووی: (ثُمَّ اسجُد حتى تَطمَئِنَّ سَاجِداً ثُمَّ ارفَع حتى تَطمَئِنَّ جَالِساً ثُمَّ اسجُد حتى تَطمَئِنَّ سَاجِداً). واتە: پاشان سەجدە بەرە تاوەكو دڵنیا دەبیت كە سەجدەت بردووە، پاشان سەرت بەرز بكەرەوە تاوەكو دڵنیا دەبیت كەوا دانیشتووی، پاشان سەجدە بەرە تاوەكو دڵنیا دەبیت كە سەجدەت بردووە.

جا کەواتە سەجدەی یەکەم و ئارام بوونەوە لەو سەجدەیەداو سەربەرزکردنەوە و ئارام بوونەوە لەو دانیشتنەدا وپاشان سەجدەی دووەم و ئارام بوونەوە لەو سەجدەیەدا، گشتی فەرزە لە هەموو ڕکاتەکانی نوێژدا، نوێژەکە فەرز بێت یا سوننەت.

سنوور و ماوەی مانەوە و ئارام بوونەوە (طمأنينة):

مانەوەو ئارام بوون ئەوەندەیە هەتا ئەندامەکانی لەشی نوێژکەر ئەچنە جێگای خۆیان و قەرار ئەگرن، زانایان ئەوەندەی وتنی ووشەی: (سبحان الله) یان داناوە بۆ ئەوماوەیە.

**ئەندامەکانی سەجدە بردن:**

ئەندامەکانی سەجدە بردن ڕوخسارو هەردوو ناو لەپ و هەردوو ئەژنۆ و هەردوو سنگی پێیە. لە عەبباسی کوڕی (عبد المطلب)ەوە هاتوە دەفەرموێت: خۆم لە پێغەمبەرم ﷺ بیستووە فەرموویەتی: (إذَا سَجَدَ العَبدُ سَجَدَ مَعَهُ سَبعَةُ آرَابٍ ؛ وَجهُهُ وَكَفَّاهُ وَرُكبَتَاهُ وَقَدَمَاهُ) رواه الجماعة إلا البخاري. واتە: کاتێ بەندەیەکی خوا سەجدە ئەبات حەوت شوێنی لەگەڵیا سەجدە ئەبەن، ئەوانیش: ڕوخساری و هەردوو لەپی دەستی و هەردوو ئەژنۆی و هەردوو پێیەتی.

لە ئیبنو عەبباسەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی ئەکرد سەجدە ببرێ لەسەر حەوت ئەندام: وە جل و قژ کۆنەکرێتەوە - لەکاتی سەجدەدا — ئەوانیش ناوچەوان و هەردوو لەپی دەست و هەردوو ئەژنۆو هەردوو پێیە.

لە ڕیوایەتێکی تردا ئەفەرموێت: (أُمِرتُ أن أسجُدَ على سَبعَةِ أعْظُمٍ: على الجَبهَةِ وَأشَارَ بِيَدِهِ إلى أنفِهِ، وَاليَدَينِ وَالرُكبَتَينِ وَأطرَافِ القَدَمَينِ) متفقٌ عليه. واتە فەرمانم پێ دراوە لەسەر حەوت ئێسقان سەجدە بەرم: ناوچاوان، وە بەدەستی ئاماژەی کرد بۆ لووتی، و هەردوو دەست و هەردوو ئەژنۆو سنگی هەردوو پێ.

لە ڕیوایەتێکی تردا فەرموویەتی: (أُمِرتُ أن أسجُدَ على سَبعٍ: وَلا أكفُتَ الشَّعرَ وَلا الثِّيَابَ، الجَبهَةُ وَالأنفُ وَاليَدَينِ وَالرُكبَتَينِ وَأطرَافَ القَدَمَينِ) رواه مسلم والنسائي. واتە: فەرمانم پێ کراوە لەسەر حەوت ئەندام سەجدە بەرم و قژم و جلم کۆ نەکەمەوە (لەحاڵەتی سەجدەدا) ئەوانیش ناوچاوان و لوت و هەردوو دەست و هەردوو ئەژنۆو هەردوو پێکانن.

لە ئەبو حومەیدەوە هاتوە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ سەجدەی ئەبرد لوت و ناوچاوانی لە زەوی جێگیر ئەکرد. ئەبو داودو (ترمذي) کە بە صەحیحی داناوە گێڕاویانەتەوە.

وە دەفەرموێت: کار لەسەر ئەمەیە لەلای ئەهلی عیلم: کە ئەبێت پیاو لەسەر ناوچاوانی و لووتی سەجدە بەرێت، جا ئەگەر کەسێك ناوچاوانی دا لە زەوی، بەڵام لووتی نەدا لە زەوی،

کۆمەڵێك لە زانایان دەفەرموون: لەسەری لائەچێت، بەڵام هەندێکی تر ئەڵێن: لەسەری لاناچێت تا سەجدە نەبات لەسەر ناوچەوان و لووتی[1].

٨- دانیشتنی دوایی و خوێندنی تەحییات تێیدا:

ئەوەی (ثابت)ەو زانراوە لە ڕێنمایی‌یەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ ئەوەیە کە لەکۆتایی‌دا دائەنیشت و تەحییاتی ئەخوێند، وە بەو کەسەشی کە نوێژەکەی بە هەڵە کرد فەرموو: (فَإِذَا رَفَعتَ رَأسَكَ مِن آخِرِ سَجدَةٍ وَقَعَدتَ قَدرَ التَّشَهُّدِ فَقَد تَمَّت صَلاتُكَ). واتە: کاتێ سەرت لە دووا سەجدە بەرز کردەوەو ئەوەندەی تەحییات خوێندنێك دانیشتی ئەوە نوێژەکەت تەواوەو کۆتایی دێت[2].

ئیبنو قودامە دەفەرموێت: لە ئیبنو عەبباسەوە گێڕراوەتەوە دەفەرمووێت: پێش ئەوەی تەحییاتمان لەسەر فەرز بکرێ لە نوێژەکەدا ئەمان ووت: (السلام على الله قبل عباده، السلام على جبريل، السلام على ميكائيل) واتە: سڵاو لەسەر خوا بێت پێش بەندەکانی، سڵاو لەسەر جبریل، سڵاو لەسەر میکائیل. پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: مەڵێن: (السلام على الله) بەڵکو بڵێن: (التَّحِيَّاتُ للهِ)[3].

---

(١) تا ئەوە حەقە، لەبەر ووتەی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرمووێت: نوێژی ئەو کەسە دانەمەزراوە کە لووتی بەر زەوی نەکەوێت، بە ئەندازەی کەوتنی نێوچەوان بە زەوی، وە ئەمە حەدیسێکی صەحیحە لەسەر مەرجی بوخاری هەروەك حاکم و (ذهبي) دەفەرموون، وە لە چەند ڕێگایەکەوە لە عیکریمەوە لە ئیبنو عەبباسەوە بە مەرفوعی هاتووە هەروەك ڕوونم کردۆتەوە لە تەخریجی (صفة الصلاة)، (تمام المنه).

(٢) ئەم لەفزە لەهیچ ڕێگایەکی حەدیسی کابرای کە نوێژەکەی بەهەڵە کرد نەم بینیوە، لەسەرەتای تەخریجەکەوە ڕێگاکانی ئەم حەدیسەم کۆ کردبۆوە، لە هەندێ ڕێگایەوە بە لەفزی: جا ئەگەر لەناوەڕاستی نوێژدا دانیشتی دڵنیابە و ڕانی چەپت ڕاخە و پاشان تەحییات بخوێنە، ئەبوداود (١/١٣٧) بە سەنەدێکی حەسەن دەیگێڕێتەوە، وە ئەمە بەڵگەی واجب بوونی تەحییاتی تێدایە لە دانیشتنی یەکەم، وە پێویستی کردووە دانیشتن بۆی، چونکە ئەوەی واجب بەو نەبێت نەیەتە جێ واجبە، وە ئەمە بە پێچەوانەی ڕیوایەتی کیتابەکەیە، وە ئەو تەواوی نوێژی بەستووە بە دانیشتن بە ئەندازەی تەحییات لە دانیشتنی دوایی، مەفهومەکەی ئەوەیە کە خوێندنی تەحییات واجب نییە، بەڵام ئەم مەفهومە (ئەگەر حەدیسەکە صەحیح بێت) مەبەست نییە، بەپێی حەدیسی ئیبنوعەبباس کە لە دوای ئەو هاتووە (تمام المنه).

(٣) ئەمە دوو شتی لەسەرە:

یەکەمیان: (حديث)ەکە لە موسنەدی ئیبنو مەسعودە نەك ئیبنو عەبباس، هەروەها نەسائی و (دارقطني) و بەیهەقی گێڕاویانەتەوە، وە سەنەدەکەی صەحیحە لەسەر مەرجی شەیخەین، (دارقطني) ش بە صەحیحی گێڕاوە هەروەها (حافظ) یش لە فەتحدا.

ئەمەش ئەبێتە بەڵگەی ئەوە کە تەحییات لەپێشەوە فەرز نەبووە دوایی فەرز بووە.

صەحیح ترین (حدیث) کە هاتووە لەبارەی تەحییاتەوە:

صەحیح ترین (حدیث) کە هاتبێت لەبارەی تەحییاتەوە تەحییاتەکەی ئیبنو مەسعودە کە دەفەرموورێت: (کاتێ لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دائەنیشتین لە نوێژدا ئەمان ووت: (السلام على الله قبل عباده، السلام على فلانٍ وفلان) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (مەڵێن: (السلام على الله) چونکە (الله) بۆخۆی سەلامە بەڵکو کاتێ کسێکتان دائەنیشێ بۆ تەحییات با بڵێت: (التَّحِيَّاتُ لله، وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلامُ عَلَيكَ أَيُّها النَّبِيَّ وَرَحمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلامُ عَلَينَا وَعلى عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِينَ، فَإنَّكُم إذا قُلتُم ذلِكَ أصَابَ كُلَّ عَبدٍ صَالِحٍ فِي السَّمَاءِ وَالأرضِ، أو بَينَ السَّمَاءِ وَالأرضِ. أشهَدُ أن لا إلَهَ إلا اللهُ وَأشهَدُ أنَّ مُحَمَّداً عَبدُهُ وَرَسُولُهُ. ثُمَّ لِيَختَر أحَدُكُم مِنَ الدُّعَاءِ أعجَبَهُ إلَيهِ فَيَدعُوَ بِهِ) واتە ئەو ووشانەی دەلالەت ئەکەن لەسەر سەلام و موڵك و مانەوە هەمووی هی خوایە، هەروەها گشت ئەو دوعایانەی کە بەگەورە دانان و (تعظیم) ی تێدایە شایستەی خوایە، هەروەها کام قسەیە جوان و شیرینە بووترێ شایستەی خوایە، سەلام و ڕەحمەت و بەرەکاتی خوات لەسەر بێت ئەی پێغەمبەر ﷺ، وە سەلام لەسەر خۆمان و بەندە چاکەکانی خوای گەورە، جا ئەگەر ئەوەتان ووت هەرچی بەندەی چاك هەیە لەنێوان ئەرزو ئاسمانا ئەو پاڕانەوە ئەی گرێتەوە. شاهیدی ئەدەم کە هیچ مەعبودو پەرستراوێکی بە هەق نی‌یە کە شایستەی عیبادەت بێ بێجگە لە (الله)، وە شاهیدی ئەدەم کە موحەممەد بەندەو ڕەوانەکراوی ئەوە، دوای ئەوە کام پاڕانەوەتان پێ خۆشە پێی بپاڕێنەوە). رواه الجماعة.

ئیمام موسلیم دەفەرموورێت: خەڵك لەسەر تەحییاتەکەی ئیبنو مەسعود کۆن، چونکە هاوەڵەکانی جیاوازیان نی‌یە لەسەری، بەڵام غەیری ئەو تەحییاتە هاوەڵانی جیاوازیان هەیە تێیدا.

(ترمذي و خطابي و ابن عبد البر و ابن المنذر) ووتوویانە: صەحیح ترین (حدیث) لە تەحییاتدا تەحییاتەکەی ئیبنو مەسعودە.

دوای تەحیاتی ئیبنو مەسعود تەحییاتەکەی ئیبنو عەبباسە کە دەفەرموورێت: پێغەمبەر ﷺ چۆن فێری قورئانی ئەکردین بەو شێوەیەش فێری تەحییاتی ئەکردین و ئەی فەرموو بڵێن: (التَّحِيَّاتُ المُبَارَكَاتُ وَالصَّلَوَاتُ الطَّيِّبَاتُ لله، السَّلامُ عَلَيكَ أَيُّها النَّبِيُّ وَرَحمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلامُ

---

دووەمیان: هێنانی (حدیث)ەکە بە ووتەی (رُوِيَ) ئەگێڕنەوە، کە واتای لاوازی حەدیسەکە دەبەخشێت، تۆش ئەوەت زانی کە حەدیسەکە صەحیحە، وە تەخریج کراوە لە (الإرواء ٣١٩) دا (تمام المنة).

عَلَينَا وَعلى عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِينَ، أشهَدُ أن لا إلَه إلا اللهُ وَأشهَدُ أنَّ مُحَمَّداً عَبدُهُ وَرَسُولُهُ) رواه الشافعي وأبو داود ومسلم والنسائي.

شافیعی دەفەرموێت: دەربارەی تەحییات چەند (حدیث)ێکی جۆراو جۆر هاتووە، بەڵام تەحییاتەکەی ئیبنو عەبباسم لا باشترە چونکە لە هەموویان تەواوترە، (حافظ) دەفەرموێت: لە شافیعی‌یان پرسی بۆچی تەحییاتەکەی ئیبنو عەبباست هەڵبژاردووە؟ فەرمووی: لەبەر ئەوەی فراوانەو لە ئیبنو عەبباسەوە بە صەحیحی بیستوومە، وە لای من زاراوەکانی کۆگرتر و زۆرترە لەوانی تر، بێ ئەوەی ڕەخنەم هەبێت لەوانەی تەحییاتەکەی تر هەڵئەبژێرن، بە مەرجێك ڕاست بێت.

تەحییاتێکی تر هەیە مالیك هەڵی بژاردووە لە (الموطأ)دا ریوایەتی کردووە لە (عبد الرحمن) ی کوڕی (عبد القاري) یەوە کە گوێی لە عومەری کوڕی (خطاب) بووە لەسەر مینبەرەوە تەحییاتی فێری خەڵك کردووە و دەیفەرموو: بڵێن: (التَّحِيَّاتُ للهِ، الزَّاكِيَاتُ للهِ، الطَّيِّبَاتُ وَالصَّلَوَاتُ للهِ، السَّلامُ عَلَيكَ أيُّها النَّبِـيُّ وَرَحمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلامُ عَلَينَا وعلى عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِينَ، أشهَدُ أن لا إلَهَ إلا اللهُ وَأشهَدُ أنَّ مُحَمَّداً عَبدُهُ وَرَسُولُهُ).

نەوەوی دەفەرموێت: ئەم (حدیث)انە کە دەربارەی تەحییات هاتوون هەموویان صەحیحن، وە صەحیح ترینیان بەڕای (محدثین) زانایانی (حدیث)، (حدیث)ەکەی ئیبنو مەسعودە، لەپاش ئەو (حدیث)ەکەی ئیبنو عەبباس. شافیعی دەفەرموێت: هەرکامێکیان بخوێنرێت دروستە، وە زانایان هەموو پێك هاتوون لەسەر ئەوەی هەموو یەکێك لەو تەحییاتانە ڕاستە.

٩- سلاو دانەوە:-

فەرزی‌یەتی سەلام دانەوە (ثابت)ە لە ووتە و کرداری پێغەمبەری خوا ﷺ، چونکە لە عەلی‌یەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مِفتَاحُ الصَّلاةِ الطُّهُورُ، وَتَحرِيمُهَا التَّكبِيرُ، وَتَحلِيلُهَا التَّسلِيمُ) رواه أحمد والشافعي وأبو داود وابن ماجة والترمذي. واتە کلیلی نوێژ دەست نوێژە، وە چونە ناو نوێژ ووتنی (الله اکبر)ە، و هاتنە دەرەوە لەنوێژ سلاو دانەوەیە. (ترمذي) دەفەرموێت : ئەم (حدیث)ە صەحیح ترین (حدیث)ە کە لەوبارەیەوە هاتبێ.

لە عامری کوڕی سەعدەوە لە باوکی‌یەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرموێت: من خۆم پێغەمبەرم بینیوە ﷺ کاتێ سلاوی ئەدایەوە بەلای ڕاست و چەپیدا سپێتی گۆنا و ڕوومەتی لەپشتەوە ئەبینرا. ئەحمەدو نەسائی و موسلیم و ئیبنو ماجە گێڕاویانەتەوە.

لە وائیلی کوڕی حیجرەوە هاتوە دەفەرموێت: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژم کردووە بەلای ڕاستیدا سلاوی ئەدایەوە ئەی فەرمو: (السلام عليكم ورحمة الله وبركاته) وە بەلای چەپیشیدا

سلاوی ئەدایەوە ئەی فەرمو: (السلام عليكم ورحمة الله وبركاته). (حافظ) ئیبنو حەجەر لەکتێبی (بلوغ المرام) دا دەفەرمووێت: ئەبو داود بە ئیسنادێکی صەحیح گێڕاویەتیەوە[1].

سلاودانەوەی یەکەم واجبە و دووەم پەسەندە:-

جومهوری زانایان ڕایان وایە کە سلاودانەوەی یەکەم فەرزە، بەڵام سلاوی دووەم موستەحەببە. (ابن منذر) دەفەرمووێت: زانایان هەموو لەسەر ئەوە کۆن کەسێك یەك سلاو بداتەوە نوێژەکەی دروستە. ئیبنو قودامە لە کتێبی (المغني) دا دەفەرمووێت: دەقەکەی ئیمام ئەحمەد ڕاشکاو نیە لە واجبێتی هەردوو سلاودانەوە لە نوێژدا، بەڵکو دەفەرمووێت ڕاستتر ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ بەهەردوو لادا سلاوی داوەتەوە , لەبەر ئەوە دروستە کەسێك بڵێت: دووجار سلاودانەوە بەلای ڕاست و چەپدا شەرعیە نەك واجب، هەروەك کەسانی تر بێجگە لە ئەحمەد بۆ ئەمە چوون.

وە لە ڕیوایەتێکی تردا وتەکەی دەلالەت دەکات لەسەر ئەوە، دەفەرمووێت: (من بە هەردوو لادا سلاودانەوەم لا باشە)، وە لەبەر ئەوە عائیشەو سەلەمەی کوڕی ئەکوەع و سەهلی کوڕی سەعد گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ بەیەك لادا یەك جار سلاوی ئەدایەوە، وە موهاجیرەکانیش هەر بە یەك لادا سلاویان ئەدایەوە.

ئەوەی کە باسمان کرد کۆکراوەیەکی (أخبار) و قسەی صەحابە بوو. کە ئەوە ئەگەیەنن شەرعی و سوننەت ئەوەیە سلاودانەوە بە هەردوو لادا بێ، بەڵام واجب یەك لایە، وە ئەوەی دەلالەت ئەکا لەسەر ڕاستی ئەمە ئەو ئیجماعەیە کە (ابن المنذر) باسی کرد، کەواتە نابێ لادانی لێ بکرێ.

نەوەوی دەفەرمووێت: مەزهەبی شافیعی و جەماوەری پێشینان و پاشینان ئەوەیە کە دووجار سلاودانەوە سوننەتە.

مالیك و کۆمەڵێك لە زانایان دەفەرموون: ئەوەی سوننەت بێت یەکجار سلاودانەوەیە، بەڵام خۆیان بەستوە بەچەند (حديث) ێکی زەعیفەوەکە ئەو (حديث) انە ناتوانن لەبەرابەر ئەو (حديث) ە

---

(١) هەروەك (حافظ) دەفەرمووێت وایە ڕەحمەتی خوای لێ بێت، بەڵام هەرچی ئەو نوسخانەی لەبەر دەستی مندایە لە (سنن أبي داود) زیادەی (وبركاته) ی تێدا نیە لە سلاو دانەوەی دووەم، بەڵکو لە سلاو دانەوەی یەکەمەو بەس، هەروەها (طيالسي) لە حەدیسی ئیبنو مەسعود بە مەوقوفی بە سەنەدێك کە پیاوانی جێی متمانەن گێڕاویانەتەوە، و (طبراني) بە مەرفوعی لە (الكبير ١٠١٩١) دا گێڕاویەتیەوە، وە هەر بۆیە لە کیتابی (صفة صلاة النبي ﷺ) ئەوەم تەرجیح کردووە کە ئەم زیادەیە ئەووترێت لە سەلام دانەوەی دووەم تاوەکو (ثابت) دەبێت بە ڕێگایەك کە بکرێتە بەڵگە، وە ئەم حەدیسەم تەخریج کردووە لە (الإرواء ٢/٣٠-٣٢) و (صحيح أبي داود ٩١٥)دا. (تمام المنه).

صەحیحانەدا بووەستن، وە ئەگەر لەو زەعیفانەدا یەکێکیان صەحیح بێ لەسەر ئەوە حەمل ئەکرێ که دروستیشه یەك سەلامدانەوە بکرێ٠ وە هەموو ئەو زانایانە کە متمانەیان پێ ئەکرێ لەسەر ئەوە کۆن کە سەلامدانەوە لە یەك جار زیاتر واجب نییە، جا ئەگەر نوێژکەر سلاوێکی دایەوە نەبێت لەبەردەمی خۆیەوە بێت، بەڵام ئەگەر دوو سلاوی دایەوە ئەبێ یەکێ بەلای ڕاست و ئەوی تر بەلای چەپدا، وە ئەوەندە ڕوو وەربگێڕێ کە وابێت سپێتی ڕوومەتی لەپشتەوە دیاربێت، ئەمەیە کە صەحیحە. هەتا ئەگاتە ئەو شوێنەی دەفەرموێت: ئەگەر نوێژکەر دووسلاوی داوە یەکێ بەلای ڕاست و یەکێ بەلای چەپدا، یا هەردووکیان لەبەردەم خۆیەوە، یا یەکەم بەلای چەپداو دووەم بەلای ڕاستدا، ئەوە نوێژەکەی دروستەو هەردوو سلاودانەوەکەی بەجێ گەیاندووە، بەڵام لە چۆنییەتییەکەیدا (فضیلة)و گەورەیی لەدەست چووە.

## سوننەتەکانی نوێژ

بۆ نوێژ چەند سوننەتێك هەیە کە موستەحەببە نوێژکەر پارێزگاریان بکات و بەجێیان بگەیەنێت بۆ ئەوەی پاداشی ئەوکارانەی دەست بکەوێت و مەحروم نەبێت لێیان کە ئەمانەن:

١- دەست بەرز کردنەوە:

موستەحەببە بۆ نوێژکەر لە چوار حاڵەتدا دەست بەرز بکاتەوە:

یەکەم: کاتی نوێژ دابەستن و ووتنی (الله أکبر)، ئیبنو مونذیر دەفەرموێت: لەناو زانایاندا کەسێك نییە جیاوازی هەبێت لەوەدا کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ نوێژی دابەستووە هەردوو دەستی بەرز کردۆتەوە[1].

---

(١) هەروەها دەست بەرز کردنەوە لە (الله أکبر)ەکانی تری ناو نوێژ (ثابت)ە، ئەما دەست بەرز کردنەوە لەکاتی چوون بۆ ناو سەجدە و هەڵسانەوە لێی حەدیسێکی زۆری لەبارەوە هاتووە لە دە صەحابەوە، لە (التعلیقات الجیاد) دا تەخریجیانم کردووە، لەوانە لە مالیکی کوڕی (حویرث)ەوە کە ئەو پێغەمبەری ﷺ بینیوە دەستی بەرز کردۆتەوە لە نوێژەکەی ئەوەندەی دەستی ئەگەیشتە نەرمایی گوێی کاتێك کە بچووایە بۆ رکوع، وە ئەگەر سەری بەرز بکردایەتەوە لە رکوع، نەسائی و ئەحمەد و ئیبنو حەزم گێڕاویانەتەوە بە سەنەدێکی صەحیح لەسەر مەرجی موسلیم، وە ئەبو عوانە لە صەحیحەکەیدا تەخریجی کردوە هەروەك (حافظ) لە فەتحدا، پاشان دەفەرموێت: ئەمە صەحیح ترین حەدیسە کە تاکو ئێستا بینیبێتم لە بارەی دەست بەرز کردنەوە لە سوجدەدا.

ئەما دەست بەرز کردنەوە لەکاتی (الله أکبر)ەکانی تر، ئەوە چەند حەدیسێك لە پێغەمبەرەوە ﷺ لەوبارەیەوە هاتووە کە هەردوو دەستی بەرز دەکردەوە لەگەڵ هەموو (الله أکبر)ێکدا.

(حافظ) ئیبنوحەجەر دەفەرموێت: دەست بەرز کردنەوەی سەرەتای نوێژ پەنجا صەحابە گێڕاویانەتەوە، لەوانە ئەو دە کەسەن کە مژدەی بەهەشتیان پێ دراوە، بەیهەقی لە حاکمەوە ئەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: هیچ سوننەتێکمان نەبینیوە جگە لەم سوننەتە کە چوار خەلیفەکان و دە مژدە پێدراوەکەو دوای ئەوانیش صەحابە ئاوا پێك هاتبن لەسەری، هەرچەندە پەرت و بڵاو بوون لە وڵاتاندا. بەیهەقی دەفەرموێت: مامۆستاکەمان (أبو عبد الله) چۆنی فەرمووە بەو شێوەیەیە.

شێوەی دەست بەرز کردنەوەکە:

چەند ریوایەتێك هاتووە دەربارەی چۆنیەتی بەرز کردنەوەی دەست، وە ئەوەی هەڵبژێرراوەو جەماوەر لەسەری ڕێکن ئەوەیە کە هەردوو دەست هەتا ڕێکی شان بەرز بکرێتەوە، بەشێوەیەك سەرپەنجەکانی دەست لەڕێکی بەشی سەرەوەی گوێ بێت، وە دوو پەنجە کەڵەکەی لەڕێکی بەشی خوارەوەی بێت، وە لەپە دەستەکانی لەڕێکی شاندا بن.

نەوەوی دەفەرموێت: شافیعی بەو شێوەیە ریوایەتی (حدیث)ەکانی ڕێك خستووە، وە ئەوەی کردوویەتی بەکارێکی باش دانراوە لەلایەنی خەڵکیەوە. وە موستەحەببە پەنجەکان درێژکراوەو ڕێك بن کاتی بەرز کردنەوە. لە ئەبو هورەیرەوە هاتوە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ هەڵئەسا بۆ نوێژ و نوێژی دائەبەست هەردوو دەستی بەکراوەیی بەرز ئەکردەوە. رواه الخمسة إلا ابن ماجة.

کاتی بەرز کردنەوە:

---

وە هیچ پێکدادانێك نیە لە نێوان ئەم حەدیسانە و حەدیسی ئیبنو عومەری پێشوو لە کیتابەکە بە لەفزی: «... وە بەرزیانی نەدەکردەوە لە نێوان سەجدەکان» لەبەر ئەوەی ئەم نافیە نەفی دەست بەرز کردنەوە دەکات و ئەو موسبەتێش ئیسباتی دەست بەرز کردنەوە دەکات، و موسبەتەش دەخرێتە پێش نافی هەروەك دارێژراوە لە زانستی (أصول الفقه).

وە بەرز کردنەوەی دەست لە نێوان سەجدەکان سابت بووە لە کۆمەڵێك لە پێشینانەوە، لەوانە ئەنەس خوای لێی ڕازی بێت، بەڵکو لەوانە خودی ئیبنو عومەر، ئیبنو حەزم دەگێڕێتەوە لە نافیعەوە کە ابن عمر هەردوو دەستی بەرز دەکردەوە ئەگەر سەجدەی بېردایە هەروەها لە نێوان دوو ڕەکعەتەکەشدا دەستی بەرز کردەوە، وە سەنەدەکەی بەهێزە. بوخاری لە (جزء رفع اليدين ص٧) دا دەگێڕێتەوە لە سالمی کوڕی عەبدوڵڵاوە کە باوکی ئەگەر بیویستایە سەر بەرز بکاتەوە لە سجود، وە ئەگەر بیویستایە هەڵسێتەوە دەستەکانی بەرز دەکردەوە، سەنەدەکەی صەحیحە لەسەر مەرجی بوخاری لە (الصحيح) دا وە ئیمامی ئەحمەد کاری بەم سوننەتە کردووە، هەروەك (أثرم) دەیگێڕێتەوە، وە ریوایەت کراوە لە ئیمامی شافیعیەوە کە ئیقراری بەم ووتەیە کردووە، وە ئەمە مەزهەبی ئیبنو حەزمە. جا بگەڕێوە بۆ (المحلى) (تمام المنه).

پێویستە دەست بەرزکردنەوەکە هاوشان لەگەڵ (الله أکبر)دا بێت، یا لەپێش وتنی دا بێت. لە نافیعەوە هاتووە کە ئیبنو عومەر خوایان لێ ڕازی بێ کاتێ نوێژی دائەبەست (الله أکبر) ی ئەکردو هەردوو دەستی بەرز ئەکردەوە، وە ئەیفەرموو: پێغەمبەر ﷺ بەو شێوەیە نوێژی دائەبەست. بوخاری و نەسائی و ئەبو داود گێڕاویانەتەوە.

وە هەر لە ئیبنو عومەرەوە خوایان لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: کاتێ پێغەمبەر ﷺ نوێژی دائەبەست هەردوو دەستی بەرز ئەکردەوە هەتا ڕێکی شانی یا نزیك لەوە. ئەحمەدو غەیری ئەو گێڕاویانەتەوە.

ئەمما دەست بەرز کردنەوەی پێش وتنی (الله أکبر) ئەوە هەر لە ئیبنو عومەرەوە هاتوە کە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ هەڵئەستا بۆ نوێژ دەستی بەرز ئەکردەوە هەتا ڕێکی شانی لەپاشاندا ئەیفەرموو: (الله أکبر) بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە.

وە لە مالیکی کوڕی (حویرث)ەوە هاتووە بە لەفزی: «الله أکبر ی کرد پاشان دەستی بەرز کردەوە» رواه مسلم، ئەمەش ئەوە دەرئەخات کە (الله أکبر) وتن پێش دەست بەرز کردنەوەیە، بەڵام (حافظ) دەفەرمووێت: کەسم نەبینیوە بڵێت (الله أکبر) پێش دەست بەرز کردنەوەیە[1].

دەست بەرزکردنەوەی دووەم و سێیەم:

کاتی داهاتنەوە بۆ ڕکوع و بەرز بوونەوە لە ڕکوع دەست بەرز کردنەوە موستەحەببە، وە بیستودوو صەحابە گێڕاویانەتەوە ڕەزای خوایان لێ بێت کە پێغەمبەر ﷺ ئەوەی کردووە، وە لە ئیبنو عومەرەوە هاتووە خوا لێیان ڕازی بێت دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ هەڵئەسا بۆ نوێژ دەستەکانی ڕێك ئەکردەوە هەتا ڕێکی شانی و لەپاشاندا ئەی فەرموو: (الله أکبر) و نوێژی دائەبەست، وەکاتێ بیویستایە بچەمێتەوە بۆ ڕکوع وەك جاری پێشوو بەرزی ئەکردنەوە، وەکاتێ سەری بەرز ئەکردەوە لە ڕکوع دووبارە دەستەکانی بەرز ئەکردەوە ئەی فەرموو: (سمع الله لمن حمده ربنا ولك الحمد) بوخاری و موسلیم و بەیهەقی گێڕاویانەتەوە.

وە لای بوخاری هاتووە: پێغەمبەر ﷺ کاتێ ئەچووە سجودەوە دەستی بەرز نەئەکردەوە، هەروەها کاتێکیش سەری لە سەجدە بەرز ئەکردەوە، وەلای موسلیم هاتووە: ئەوەی نەئەکرد کاتێ

(١) بەڵێ، ئەوە قسەیەکە لە مەزهەبی حەنەفیەکاندایە، وە لەپاش صەحیحێتی حەدیسەکە عوزر بۆ کەس نیە کە بووەستێت تیایا و کاری پێ نەکات، بە تایبەت کە حەدیسەکە شاهیدی هەیە لە ریوایەتی ئەنەس لەلای (دارقطني ١١٣)، حەق ئەوەیە کە کار بەم سێ شێوەیە بکرێت، جارێك بەمە و جارێك بەوە، جارێکیش بەویان، لەبەر ئەوەی لە تەواوی شوێن کەوتنی پێغەمبەرە ﷺ. (تمام المنه).

سەری لە سەجدە بەرز ئەکردەوە. وە هەر لای موسلیم هاتووە: کە پێغەمبەر ﷺ دەستەکانی بەرز نەئەکردەوە لەنێوان دوو سەجدە بردنەکەدا، وە بەیهەقی ئەمەشی زیاد کردووە: هەتا گەیشتە پەروەردگاری هەمیشە بەوشێوەیە نوێژی کردووە.

(ابن المدائني) دەفەرمووێت: ئەو (حدیث)ە لای من ئەبێتە (حجة) بەڵگە بەسەر خەڵکەوە، هەرکەس ئەوەی بیست لەسەریەتی کاری پێ بکات، چونکە ئیسنادەکەی هیچ شتێکی تێدا نی‌یە، وە بوخاری لەم مەسەلەیەدا بەشێکی سەربەخۆی داناوە، وە تێیدا لە حەسەن و حومەیدی کوڕی هیلالەوە ئەگێڕێتەوە دەفەرموون: صەحابە بەوشێوەیە کردوویانە، واتە لەو سێ شوێنەدا دەستیان بەرز کردۆتەوە، وە حەسەن کەسی لە صەحابە جیا نەکردۆتەوە.

ئەمما بۆچوونی حەنەفی‌یەکان کە ئەڵێن دەست بەرز کردنەوە شەرعی نی‌یە تەنها لەکاتی نوێژ دابەستندا نەبێت، وە بەڵگەیان بەوە هێناوەتەوە کە ئیبنو مەسعود دەفەرمووێت: ئێستا لەبەر چاوتان پێغەمبەر ﷺ چۆن نوێژی کردووە ئاوا بۆتان ئەکەم، وەکاتێ نوێژەکەی کرد یەکجار نەبێت دەستی بەرز نەکردەوە. ئەوە مەزهەبێکی بەهێز نی‌یە، چونکە زۆربەی پێشەواکانی (حدیث) ڕەخنەیان لێ گرتووە.

ئیبنوحیببان دەفەرمووێت: ئەمە باشترین خەبەرە کە خەڵکی کوفە گێڕاویانەتەوە لەبارەی ئینکارکردنی دەست بەرزکردنەوە لەکاتی ڕکوع، وە لەکاتی بەرز بوونەوە لێی، وە لە ڕاستیدا ئەمە زەعیفترین شتە، چونکە چەند عیللەتی تێدایە خەبەرەکە باتڵ ئەکاتەوە، وە لە فەرزێکدا ئەگەر تەسلیم بین بەڕاستی ئەو خەبەرە وەك (ترمذي) بە ڕاشکاوی باسی ئەمەی کردووە، بەرەنگاری ئەو حەدیسە صەحیحانە ناکات کە گەیشتوونەتە ڕادەی مەشهور، وە خاوەنی کتێبی (التنقیح) دەفەرمووێت: لەوانەیە ئیبنومەسعود ئەو دەست بەرزکردنەوانەی لەبیر چووبێت وەك چۆن چەند شتی تری لەبیر چوبۆوە. زەیلەعی لە (نصب الراية) دا کە لە (التنقیح) ەوە نەقلی کردووە دەفەرمووێت: لەبیر چوونەوەی ئیبنو مەسعود لەو بارەیەوە شتێکی سەیر نی‌یە، چونکە ئیبنو مەسعود لە قورئاندا شتی وەهای لەبیر چووە کە هەموو موسڵمانان لەسەر ئەوەن کە ئەوشتە لە قورئانە. وەك سورەتی فەلەق و سورەتی ناس. هەروەها ئەوەشی لەبیر نەمابوو کەزانایان هەموو لەسەر نەسخ بوونەوەی پێك هاتوون وەك (التطبيق). وە لەبیری نەمابوو چۆن دوو کەس ئەوەستێ لەدوای ئیمامەوە، وە لەبیری چوبۆوەکە پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی سەربڕین (نحر) لەکاتی خۆیدا نوێژی بەیانی کرد، کە کەس لەزانایان جیاواز نین لەسەری، هەروەها چۆنی‌یەتی کۆکردنەوەی نوێژی لە عەرەفە لەبیر چوبۆوە، وە لەبیری چوبووە کە نابێ ئەنیشك و باسك لەسەر زەوی دابنرێ کاتی سەجدە

بردن،کە زانایان جیاوازیان لەمەدا نییە. وە لەبیری چوبۆوە پێغەمبەر ﷺ چۆن ﴿وَمَا خَلَقَ ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰٓ﴾ (الليل/٣) ی خوێندووە، جا ئەگەر دروست بێت ئیبنو مەسعود ئەوانەی لەبیر چووبێت، چۆن دروست نییە وەك ئەو دەست بەرز کردنەوەی لەنوێژدا لەبیر بچێت؟.

چوارەم کاتی هەڵسانەوە بۆ رکاتی سێیەم:

لە نافیعەوە هاتووە کە ئیبنو عومەر خوا لێیان ڕازی بێت کاتێ هەڵئەسایەوە بۆ ڕکاتی سێیەم، دەستەکانی بەرز ئەکردەوە، وە ئەو کارەی بەرز ئەکردەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ. بوخاری و ئەبوداودو نەسائی گێڕاویانەتەوە.

لە عەلی‌یەوە هاتووە کاتێ وەسفی شێوەی نوێژکردنی پێغەمبەری ﷺ ئەکرد ئەی فەرموو: کاتێ دوای دوو ڕکاتەکە هەڵئەساوە بۆ سێیەم ڕکات هەردوو دەستی هەتا ڕێکی هەردووشانی بەرز ئەکردەوەو ئەی فەرموو: (الله أكبر) ئەبو داودو ئەحمەدو (ترمذي) کە بەصەحیحی داناوە گێڕاویانەتەوە.

پیاوو ژن یەکسانن لەم سوننەتەدا:

شەوکانی دەفەرموێت: بزانە کە ئەم سوننەتە پیاوو ژن تێیدا یەکسانە، وە لەو بارەیەوە بەڵگەیەکی وا نەهاتووە کە جیاوازی بکا لەنێوان پیاوو ژن دا، وە شتێکی وانەهاتووە کە ببێتە بەڵگە لەنێوان جیاوازی پیاوو ژن لە ئەندازەی دەست بەرز کردنەوەدا.

دانانی دەستی ڕاست لەسەر چەپ:

واباشە (مەندوبە) دەستی ڕاست لەسەر دەستی چەپ دابنرێت لەنوێژدا، وە لەو بارەیەوە بیست (حديث) هاتووە لە هەژدە صەحابەو تابیعی‌یەوە کە لەپێغەمبەرەوە گێڕاویانەتەوە.

لە سەهلی کوڕی سەعدەوە هاتوە دەفەرموێت: موسڵمانان لە زووەوە فەرمانیان پێ ئەکرا لە نوێژدا دەستی ڕاستیان لەسەر مەچەکی چەپیان دابنێن. ئەبو حازم دەفەرموێت: ئەوەی من بزانم سەهل ئەو فەرمانە بەرز ئەکاتەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ. بوخاری و ئەحمەد گێڕاویانەتەوە. وە مالیك لە (الموطأ) دا.

(حافظ) دەفەرموێت: ئەم حەدیسە حوکمی ڕەفعی هەیە ـ واتە: هی پێغەمبەرە ﷺ ـ چونکی لەسەر ئەوە حەمل ئەکرێ ئەو کەسەی فەرمانی پێ کردون بەوە هەر پێغەمبەر بووە ﷺ، وە لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتووە فەرموویەتی: (إنَّا مَعشَرَ الأنبِيَاءِ أُمِرنَا بِتَعجِيلِ فِطرِنَا وَتَأخِيرِ سُحُورِنَا،

وَوَضع أيمَانِنَا على شَمَائِلِنَا فِي الصَّلاةِ)[1]. واتە: ئێمەی پێغەمبەران فەرمانمان پێ کراوە پەلە بکەین لە ڕۆژوو شکاندندا و پارشێومان دووا بخەین و دەستی ڕاستمان بنێینە سەر دەستی چەپمان لەنوێژدا.

وە لە جابیرەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ بەلای پیاوێکدا ڕۆیشت نوێژی ئەکرد، دەستی چەپی نابووە سەردەستی ڕاستی ئەویش دەستی هەڵگرت و ڕاستی نایە سەر چەپی. ئەحمەدو غەیری ئەو گێڕاویانەتەوە، وە نەوەوی دەفەرمووێت: ئیسنادی حەدیسەکە صەحیحە[2].

(ابن عبدالبر) فەرمویەتی: لە پێغەمبەرەوە ﷺ پێچەوانەی ئەوە نەهاتووە لەو بارەیەوە، وە ئەمەش قسەی صەحابەو جەماوەری تابیعی‌یەکانە، مالیك لە (الموطأ)دا باسی کردووەو فەرمویەتی: مالیك هەتا مرد هەر دەستی ڕاستی لەسەردەستی چەپی دائەنا.

شوێنی دەست دانان:

کەمالی کوڕی هومام دەفەرمووێت: (حدیث)ێکی صەحیح نی‌یە واجبی بکا لەسەر نوێژکەر دەست لەژێر سنگا یا لەخوار ناوکەوە بگرێت، وە ئەوەی لای حەنەفی‌یەکان زاندراوە دەست گرتنە لەخوار ناوکەوە، بەڵام شافیعی‌یەکان لەژێر سنگدا دەست ئەگرن، وە لە ئەحمەدەوە دوو قسە هەیە وەك هەردوو (مذهب)ەکە، وە ڕاستی ئەوەیە کە هەردوو شێوەکە وەك یەکن، (ترمذي) دەفەرمووێت زانایانی صەحابەو تابعین و دوای ئەوانیش ڕایان وایە ئەبێ پیاو لەنوێژدا دەستی ڕاست لەبان دەستی چەپ دابنێ وە هەندێکیان ڕایان وایە لەسەروو ناوکەوە دابنرێ، وە هەندێکیان ڕایان وایە لەژێر ناوکەوە دابنرێ، وە هەردوو شێوەکەیان کردووە. ـ تەواو بوو ـ .

بەڵام چەند ریوایەتێك ئەوە ئەگەیەنێت کە پێغەمبەر ﷺ دەستی لەسەر سنگی داناوە[3] لە (هلب) ی (طائي) یەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەرم بینیوە ﷺ دەستی ڕاستی لەسەر مەچەکی دەستی چەپ دائەنا لەسەر سنگی. ئەحمەد ریوایەتی کردووەو (ترمذي) بە حەسەنی داناوە.

---

(١) ئیبنو حیببان و (ضیاء) بە سەنەدێکی صەحیح دەی گێڕنەوە. بڕوانە (صفة صلاة النبي ﷺ ص٦٠).

(٢) هەروایە وەك شێخ ئەلبانی دەفەرمووێت لە (صفة صلاة النبي ﷺ).

(٣) شێخ ئەلبانی لە (صفة صلاة النبي ﷺ) دا دەفەرمووێت دانانی لەسەر سنگ ئەوەیە کە سابت بوو لە سوننەتدا، وە پێچەوانەکەی یان ئەوەتا (ضعیف) ە یان ئەصلی نی‌یە، وە ئیمامی ئیسحاقی کوڕی ڕاهەویهی کاری پێ کردووە وەك مەروەزی لە (المسائل) دا دەفەرمووێت، بۆ زیاتر بڕوانە (صفة صلاة النبي ﷺ ٦٠-٦١).

له وائیلی کوڕی حوجرەوە خوای لیٚ ڕازی بێت هاتوە دەفەرموویٚت: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژم کرد دەستی ڕاستی لەسەر دەستی چەپی دانا لەسەر سنگی. ئیبنو خوزەیمە ڕیوایەتی کردووە. وە ئەبو داود و نەسائی بەم شێوەیە ڕیوایەتیان کردووە: پاشان دەستی ڕاستی دانا لەسەر پشتەدەست و مەچەك و باسك و دەستی چەپی[1].

دوعای سەرەتای نوێژ (إستفتاح):

وا باشە (مەندوبە) نوێژکەر دوعایەك لەو دوعایانە بکات کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی پیٚ دەست پیٚ ئەکرد دوای (الله أكبر) ی ئیحرام و پێش خوێندنەوەی فاتیحە. وە ئێمە هەندیٚ لەو دوعایانە لە خوارەوە باس ئەکەین:

١- لە ئەبی هورەیرەوە خوای لیٚ ڕازی بێت هاتوە دەفەرموویٚت: پێغەمبەر ﷺ کاتیٚ نوێژی دائەبەست دوای (الله أكبر) و پێش ئەوەی فاتیحە بخوێنیٚ ماوەیەکی کەم بیٚ دەنگ ئەبوو، منیش پێم ووت: ئەی نێرراوی خوا بە باوك و دایکەوە بەفیدات بم، پێم بڵیٚ چی ئەخوێنی لەو بیٚ دەنگی‌یەتدا لەبەینی (الله أكبر) و خوێندنەوەی فاتیحەدا؟ فەرمووی: ئەڵێم: (اللّهُمَّ بَاعِد بَينِي وَبَينَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدتَ بَينَ المَشرِقِ وَالمَغرِبِ، اللّهُمَّ نَقِّنِي مِن خَطَايَايَ كَمَا ينقى الثَّوبُ الأبيَضُ مِنَ الدَّنَسِ، اللّهُمَّ اغسِلنِي مِن خَطَايَايَ بِالثَّلجِ وَالمَاءِ وَالبَرَدِ) رواه البخاري ومسلم وأصحاب السنن إلا الترمذي. واتە: خوایە نێوان من و تاوانەکانم ئەوەندەی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا دوور بخەرەوە، خوایە لە تاوانەکانم پاکم بکەرەوە وەك چۆن جلوبەرگی سپی لە چڵك و پیسی پاك ئەکرێتەوە، خوایە بە بەفرو ئاوو تەرزە لە تاوانەکانم بم شۆرە.

٢- لە عەلی‌یەوە خوای لیٚ ڕازی بێت هاتوە دەفەرموویٚت: پێغەمبەر ﷺ کاتیٚ هەڵئەستا بۆ نوێژ[2] ئەی‌فەرموو: (الله أكبر) لەپاشاندا ئەی فەرموو: (وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَوَاتِ والأَرْضَ حَنِيْفَاً مُسْلِماً وما أنا مِنَ المُشْرِكِيْنْ، إنَّ صَلاتِي وَنُسُكِيْ وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِيْ لله رَبِّ العَالَمِيْن لاشَرِيْكَ لَهُ وبِذلكَ أُمِرْتُ وأنا مِنَ المُسْلِمِيْن، اللهمَّ أنتَ المَلِكُ لا إله إلاّ إنتَ، أنتَ رَبِّي وأنا عَبْدُكَ، ظَلَمْتُ نَفْسِيْ واعتَرَفْتُ بِذَنْبِي فاغْفِرْ لِيْ ذُنُوبِيْ جَمِيْعاً، إنَّهُ لا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إلاّ أنْتَ،

---

(١) ئەم حەدیسە ئەبو داود و نەسائی و ئیبنو خوزەیمە (١/٥٤/٢) بە سەنەدێکی صەحیح گێڕاویانەتەوە، هەروەك شێخ ئەلبانی ڕەحمەتی خوای لیٚ بێت دەفەرموویٚت لە (صفة صلاة النبي)دا، وە ئیبنو حیببانیش بە صەحیحی داناوە.

(٢) جگە لە ڕیوایەتەکەی موسلیم نەبێت سەرجەم لە ڕیوایەتەکانی تر تەقیید کراوە بە نوێژە فەرزەکانەوە نەك بە نوێژی شەو، وەك شەوکانی دەفەرموویٚت. بۆ زیاتر سوود بڕوانە (تمام المنة).

واهْدِنِيْ لأحْسَنِ الأخلاقِ لا يَهْدِيْ لأحْسَنِهَاْ إلاّ أنت، واصرِف عَنِّيْ سَيِّئَها لايَصْرِفُ عَنِّي سَيِّئَهَاْ إلاّ أنت، لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ والخَيْرُ كُلُّهُ فِيْ يَدَيْك، والشَّرُّ لَيْسَ إلَيك، وأنا بِكَ وإلَيْك، تَبَاْرَكْتَ وَتَعاَلَيْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وأَتُوْبُ إلَيكَ) رواه أحمد ومسلم والترمذي وأبو داود وغيره. واته: ڕووم کرده بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی، لە حاڵێکدا کە ڕاستگۆو موسڵمانم، وە من لە هاوتادانەران نیم، بەڕاستی نوێژم و سەربڕینم و ژیانم و مردنم بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیانە، ئەو پەروەردگارەی بێ هاوبەشە، وە هەر بەوەش فەرمانم پێ دراوە، وە من یەکەمی موسڵمانانم، خوایە تۆ خاوەن مولکی و هیچ مەعبودێکی بەهەق نی‌یە جگە لەتۆ، تۆ پەروەردگاری منی و منیش بەندەی تۆم، خوایە من ستەمم کردووەو دان بە تاوانەکانمدا ئەنێم تۆش لە هەموو تاوانەکانم خۆش بە، چونکە بەڕاستی تۆ نەبیت کەس لەتاوان نابوورێت، خوایە ڕێنمایم بکە بۆ چاکترین خووڕەوشت چونکە تۆ نەبیت کەس ناتوانێ ڕێنمایی کەس بکات بۆ چاکترین ڕەوشت، خوایە ڕەوشتی خراپم لێ بەدوور کە، تۆ نەبیت کەس ڕەوشتی خراپم لێ بەدوور ناکات، خوایە من بەدەنگ بانگەوازەکەتەوە دێم، وە شوێن دینەکەت ئەکەوم، خێرو چاکە هەمووی بە دەست تۆن، وە خراپەو شەڕ نابێ بە هۆی خۆ نزیک کردنەوە بۆلای تۆو نیسبەت نادرێ بۆلای تۆ، من بە تۆوە هەم و بۆلای تۆ ئەگەڕێمەوە، خێرو بەرەکەتت زۆرەو بەرزو بڵندی، داوای لێ بوردنت لێ ئەکەم و ئەگەڕێمەوە بۆلای تۆ.

٣- وە هاتووە کە عومەر دوای دابەستنی نوێژ ئەیفەرموو: (سُبحَانَكَ اللّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ وَتَبَاْرَكَ اسْمُكَ وتعالى جَدُّكَ وَلا إلَه غَيرُكَ) رواه مسلم بسندٍ منقطع[1]. واته: خوایە تۆ پاك و بێگەردی سوپاس و ستایش شایستەی تۆیە، ناوت پیرۆزەو خاوەنی بەرزی و شکۆی، وە هیچ مەعبودێکی هەق نی‌یە کە شایستەی عیبادەت بێ جگە لە تۆ. ئەم (حدیث)ە (دارقطني) بە مەوقوفی و مەوصولی گەیاندوویەتی‌یە سەر عومەر، ئیبنوقەییم دەفەرموێت: بە صەحیحی هاتووە لە عومەرەوە کە لەشوێنەکەی پێغەمبەردا ﷺ لەسەرەتای نوێژەوە بەو شێوەیە پاڕاوەتەوە، وە بەئاشکرا ووتوویەتی بۆ ئەوەی خەڵکی فێر ببێ، جا ئەمە بەم شێوەیە حوکمی مەرفوعی هەیە - واته: حوکمی ئەوەی هەیە کە هی پێغەمبەر بێ ﷺ - لەبەر ئەوەیە ئیمام ئەحمد دەفەرموێت:

(١) ئەم تەخریج و تەحقیقە زانستی نین، چونکە ئەگەر (منقطع) پچڕاو بێت سەنەدەکەی، واته صەحیح نی‌یە، بەڵام ئەم حەدیسە بە مەوصولی هاتووە لەلای ئیبنو ئەبی شەیبە لە (المصنف) دا (١/٩٢/١) وە (طحاوي ١/١١٧) و (دارقطني ص١١٣) و حاکم (١/٢٣٥) و بەیهەقی (٢/٣٤-٣٥) لە چەند ڕێگایەکەوە لە ئەسوەدی کوڕی یەزیدەوە، وە سەنەدەکەشی صەحیحە حاکم و (ذهبي) و هەروەها (دارقطني)یش بە صەحیحیان گێڕاوە، بۆ زیاتر لێکۆڵینەوە بڕوانە (إرواء الغليل ج ٣٤٠).

ئەما من بۆچوونم بۆ ئەوە دەچێت کە لە عومەرەوە ڕیوایەت کراوە، بەڵام ئەگەر کەسێك بە هەندێ لەو دوعایانەش کە ڕیوایەت کراوە نوێژەکەی دەست پێ بکا ئەوە چاکە.

٤- لە عاصیمی کوڕی حومەیدەوە هاتوە دەفەرمووێت: لە عائیشەم پرسی پێغەمبەر ﷺ بەچی شەونوێژی دەست پێ ئەکرد؟ ئەویش فەرمووی: دەربارەی شتێك پرسیارت لێکردووم هەتا ئێستا کەس ئەو پرسیارەی لێ نەکردووم، پێغەمبەر ﷺ دوای دابەستنی نوێژ دەجار ئەیفەرموو: (الله أكبر) و دەجار (الحمد لله) و دەجار (سبحان الله) و دەجار (لا إله إلا الله) و دەجار (أستغفر الله)ی ئەکردو ئەی فەرموو: (اللَّهُمَّ اغفِر لِي وَاهدِنِي وَارزُقنِي وَعَافِنِي) واتە: خوایە لەتاوانەکانم ببورەو ڕێنمایم بکەو ڕۆزیم بدەو تەندروستم بکە. وە هەروەها پەناشی ئەگرت لە تەنگی و ناڕەحەتی مەقام لە ڕۆژی قیامەتدا. ئەبو داودو نەسائی و ئیبنو ماجە ڕیوایەتیان کردوە.

٥- لە عبدالرحمنی کوڕی عەوفەوە هاتوە دەفەرمووێت: لە عائیشەم پرسی پێغەمبەر ﷺ بەچی سەرەتای شەونوێژی ئەکردەوە؟ فەرمووی: کاتێ هەڵئەسا بۆ شەونوێژ دوای نوێژ دابەستن ئەی فەرموو: (اللَّهُمَّ رَبَّ جِبرِيلَ وَمِيكَائِيلَ وَإِسرَافِيلَ، فَاطِرَ السَّمَوَاتِ وَالأَرضَ عَالِمَ الغَيبِ وَالشَّهَادَةِ، أَنتَ تَحكُمُ بَينَ عِبَادِكَ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَختَلِفون، إهدني لِما اختُلِفَ فِيْهِ مِنَ الحَقِّ بإذنك، إنَّك تَهدِيْ مَن تَشاءُ إلى صِراطٍ مُّستَقِيْم) رواه مسلم وأبوداود والترمذي والنسائي وابن ماجة٠ واتە: خوایە پەروەردگاری جوبرائیل و میکائیل و ئیسرافیل، ئەی بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی، زانا بە نهێنی و ئاشکراکان، تەنها تۆ دادوەری نێوان بەندەکانت دەکەیت لەوانەدا کەتێیدا چەند بەرەکێن، ڕێنمایم بکە بۆ ڕاستی ئەو ڕاستی‌یەی کەتێیدا چەند بەرەکێیی دروست کراوە، چونکە خۆت کێت ویست ڕێنمایی ئەکەیت بۆ ڕێی ڕاست.

٦- لە نافیعی کوڕی جوبەیری کوڕی (مطعم) ەوە لە باوکی‌یەوە هاتوە دەفەرمووێت: گوێم لە پێغەمبەر بوو ﷺ لەنوێژی سوننەتدا ئەی فەرموو: (الله أكبر كبيراً) سێ جار، (واتە خوا زۆر لەهەموو شتێ گەورەترە)، (والحمد لله كثيراً) سێ جار (واتە: زۆر سوپاس و ستایش بۆ خوا)، (وسبحان الله بكرةً وأصيلاً) سێ جار، (واتە: پاك و مونەززەهی بۆ خوا هەر دەم لە بەیانیان و ئێوارااندا)، (اللَّهُمَّ إنِّي أعُوذُ بِكَ مِنَ الشَّيطَانِ الرَّجِيمِ مِن هَمزِهِ وَنَفثِه وَنَفخِه)، (واتە: خوایە من پەنات پێ ئەگرم لە شەیتانی دەرکراو لە ڕەحمەت، پەنات پێ ئەگرم لە (همز)ەکەی و (نفث)ەکەی و (نفخ)ەکەی) ووتم: ئەی نێرراوی خوا (همز و نفث و نفخ) ی شەیتان چی‌یە ؟ فەرمووی: (همز) ەکەی ئەو پەرکەمەیە کە تووشی ئادەمیزاد ئەبێ، (نفخ) ەکەی فیزو دەمارە، (نفث) ەکەی شیعرە، (واتە: شیعری خراپ) رواه أحمد وأبو داود وابن ماجة وابن حبَّان مختصراً.

٧- وە لە ئیبنو عەبباسەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ هەڵئەستا بۆ شەونوێژ دوای دابەستنی نوێژ ئەی فەرموو: (اللّهُمَّ لَكَ الحَمدُ أنتَ قَيِّمُ السَّمَوَاتِ والأرضِ وَمَن فِيهِنَّ، وَلَكَ الحَمدُ أنتَ نُورُ السَّمَواتِ والأرضِ وَمَن فِيهِنَّ، ولَكَ الحَمدُ، أنتَ الحَقُّ، وَوَعدُكَ الحَقُّ، وَلِقَائُكَ حَقٌّ، وَقَولُكَ حَقٌّ، وَالجَنَّةَ حَقٌّ، وَالنَّارَ حَقٌّ، وَالنَّبِيُّونَ حَقٌّ، وَمُحَمَّدٌ حَقٌّ، وَالسَاعَةَ حَقٌّ، اللّهُمَّ لَكَ أسلَمتُ، وبِكَ آمنتُ، وعَلَيْكَ تَوَكَّلتُ وإليكَ أنَبْتُ وبِكَ خاصَمتُ وإليكَ حاكَمتُ، فَاغفِر لِي مَا قَدَّمتُ وما أخَّرْتُ وَمَا أسرَرتُ وَمَا أعلَنتُ، أنتَ المُقَدِّمُ وَأنتَ المُؤَخِّرُ، لا إلَهَ إلا أنتَ، وَلا إلَهَ غَيرُكَ وَلا حَولَ وَلا قُوَّةَ إلا بِاللهِ) رواه البخاري ومسلم وأبوداود والترمذي والنسائي وابن ماجة ومالك. واتە: خوایە سوپاس و ستایش بۆ تۆ، تۆ ڕاگری ئاسمانەکان و زەویت و ئەوەی تێیاندایە، وە سوپاس و ستایش بۆ تۆ، تۆ ڕووناکی ئاسمانەکان و زەویت و ئەوەی تێیاندایە، وە سوپاس بۆ تۆ، تۆ خاوەنی ئاسمانەکان و زەویت و ئەوەی تێیاندایە، وە سوپاس و ستایش بۆ تۆ، تۆ حەقیت و پەیمانەکەشت حەقە، وە گەیشتن بە تۆ حەقە و ووتەکەت حەقەو بەهەشت حەقەو دۆزەخ حەقەو نێرراوەکانت حەقن و موحەممەدیش حەقەو ڕۆژی دوایی حەقە، خوایە , من خۆم سپاردووە بەتۆو باوەڕیشم بە تو هێناوە، وە تەوەککولم هەر لەسەر تۆیەو بۆلای تۆ گەڕاوەمەوە، وە بە گژاچونم لەگەڵ بێ باوەڕاندا لە بەر تۆیەو دادم هێناوەتە لای تۆ، جا تۆش لێم خۆش بە لە تاوانی کۆن و نوێ و ئاشکراو نهێنیم، خوایە تۆ پێش خەرو دوواخەری، هیچ مەعبودێکی بەحەق نییە جگە لە تۆ، وە هیچ مەعبودێکی حەق نییە غەیری تۆ، وە هیچ هەوڵ و توانایییەك نییە ئیللا بەهۆی تۆوە نەبێ.

٨- پەنا گرتن بە خوا لە شەیتان (إستعاذة) :

وا باشە بۆ نوێژکەر دوای پاڕانەوەی سەرەتای نوێژو پێش خوێندنی سورەتی فاتیحە بڵێت: (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) واتە: پەنا ئەگرم بەخوا لە شەیتانی دەرکراو لە ڕەحمەتی خوا. بەپێی فەرموودەی خوای گەورە کە فەرموویەتی: ﴿فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾ (النحل/٩٨). واتە: ئەگەر ویستت قورئان بخوێنی پەنا بگرە بەخوا لەشەیتانی بەدوور لە ڕەحمەتی خوا.

لە (حدیث)ەکەی نافیعی کوڕی جوبەیردا کە لە پێشەوە باس کرا هاتووە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (اللهمَّ إني أعوذ بك من الشيطان الرجيم).

ئیبنو مونذیر دەفەرمووێت: لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتووە کە بەر لە قورئان خوێندن ئەیفەرموو: (أعوذ بالله من الشیطان الرجیم)[1].

٤- ووتنی بەنهێنی:

سوننەتە بەنهێنی نوێژکەر بڵێت: (أعوذ بالله من الشیطان الرجیم) لە کتێبـی (المغني) دا دەفەرمووێت: ووتنی (أعوذ بالله من الشیطان الرجیم) بەنهێنیەو نابێت نوێژکەر ئاشکرای بکات. وە لەنێوان زانایاندا جیاوازی نیە لەسەر ئەوە· تەواو بوو·

بەڵام شافیعی ڕای وایە نوێژکەر لەو نوێژانەدا کەبەدەنگی بەرز ئەخوێنرێن ئارەزووی خۆیەتی ئاشکرای ئەکات یاهەر بەنهێنی ئەیخوێنێت. وە خوێندنی بەئاشکرا لە ئەبوهورەیرەوە ریوایەت کراوە بەڵام لە ڕێگایەکی زەعیفەوە.

شەرعیەتی (إستعاذة) لە ڕکاتەکانی یەکەمدا بێ لە ڕکاتەکانی تر:

ووتنی (أعوذ بالله من الشیطان الرجیم) تەنها لە ڕکاتی یەکەمدا شەرعیە[2]. لە ئەبوهورەیرەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ هەڵئەستایەوە بۆ ڕکاتی دووەم یەکسەر (الحمد لله رب العالمین)ی ئەخوێند، وە پێش ووتنی هیچ بێدەنگ نەئەبوو. موسلیم گێڕاویەتیەوە.

ئیبنو قەییم دەفەرمووێت: زانایان جیاوازیان هەیە لەسەر ئەوەی کە ئایا ئەوە – واتە: ڕکاتی دووەم – شوێنی ووتنی (أعوذ بالله من الشیطان الرجیم)ە یان نا؟ دوای ئەوەی پێك هاتوون لەسەر ئەوەی کە ئەوە شوێنی خوێندنی دوعای (إستفتاح) سەرەتای نوێژ نیە، لەمەدا دوو قسە هەیە لە ئەحمەدەوە، هەندێ لە هاوەڵەکانی ئەو دوو قسەیەیان داناوە لەسەر ئەوەی کە ئایا خوێندنی

---

(١) لەهیچ کتێبێکی سوننەتە ناسراوەکاندا نەم بینیوە جگە لە (مراسیل أبي داود) نەبێت لە حەسەنەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ پەنای دەگرت، حەدیسەکەی گێڕایەوە.

ئەمە لەگەڵ (ضعیف)ی حەدیسەکە لەبەر ئەوەی لە مەراسیلی حەسەنی بەصریەوە ئەوەی تیا نیە کە ئەم صیغەیە لە نوێژدا بوو، جا چاك وایە پەنا بگیەدرێت ـ (استعاذة) بکرێت ـ بەو شێوەیەی کە لە حەدیسی جوبەیری کوڕی (مطعم)ە (أعوذ بالله من الشیطان الرجیم من همزه ونفخه ونفثه) وە هەندێ جار ئەمەی بۆ زیاد کات: (أعوذ بالله السمیع العلیم من الشیطان الرجیم) هەروەك لە هەندێك حەدیسدا هاتووە وەك حەدیسی ئەبو سەعیدی خودری لەلای ئەبو داود و (ترمذي) و جگە لەوانیش بە سەنەدێکی حەسەن(وە هەردووکیان تەخریج کراون لە (الإرواء ٣٤٢) وە بەیهەقی لەم بابەدا جگە لە هەردووکیان هیچی تری باس نەکردووە (تمام المنة ١٧٦).

(٢) ئەو سوننەتەی ئیشارەتی بۆ کراوە صەریح نیە بەڵام واباشە لەهەموو ڕکاتەکاندا بووترێت.(تمام المنة)·

قورئان لە نوێژدا یەك خوێندنە تاوەکو یەکجار (أعوذ...) ی بەس بێ ؟ یان خوێندنی هەر ڕکاتێك بۆخۆی سەربەخۆیە ؟ وە لەنێوان زانایاندا کێشە نی‌یە لەسەر ئەوەی کە دوعای (إستفتاح) کە لە سەرەتادا ئەخوێنرێ ئەوە بۆ هەموو نوێژەکەیە، وە ئەوەی دیارە خوێندنی (أعوذ...) یەکجار بەسە بەپێی (حدیث) ی صەحیح. جا ئیبنو قەییم باسی (حدیث)ەکەی ئەبو هورەیرەی کرد، پاشان فەرمووی: یەکجار دوعای (إستفتاح) بەسە چونکە بێدەنگی نەکەوتۆتە نێوان دوو قیڕائەتەکەوە، بەڵکو زیکر کەوتۆتە نێوانیان، کەواتە ئەو قیڕائەتە وەك تەنها قیڕائەتێك وایە کە (الحمد لله، یا سبحان الله، یا لا إله إلا الله) یا صەڵات و سەلام دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ و وێنەی ئەوانە کەوتۆتە نێوانی.

شەوکانی دەفەرموورێت: ئیحتیات لەوەدایە تەنها بەو شێوەیە بێت کە سوننەت هێناویەتی: ئەویش یەکجار ووتنی‌یەتی پێش ڕکاتی یەکەم وبەس.

٥- ووتنی (آمین):

سوننەتە بۆ هەموو نوێژکەرێك ئیمام بێت یا مەئموم یا بەتەنها دوای تەواو کردنی سوڕەتی فاتیحە بڵێت: (آمین) واتە: خوایە نزاو پاڕانەوەکانم لێ وەربگریت، جا لەنوێژە ئاشکراکاندا بەئاشکرا بووترێت، وە لە نوێژە نهێنی‌یەکاندا بەنهێنی.

لە نوعەیمی موجەممیرەوە هاتوە دەفەرموورێت: لەدوای ئەبی هورەیرەوە نوێژم کرد ووتی: (بسم الله الرحمن الرحيم) لەپاشاندا سوڕەتی فاتیحەی خوێند هەتا گەیشتە (ولا الضالين) ئینجا ووتی: (آمین)، خەڵکەکەش ووتیان: (آمین) لەپاشاندا کە سڵاوی دایەوە فەرمووی: بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە نوێژی من لەهەمووتان زیاتر لەنوێژی پێغەمبەر ﷺ دەچێت. بوخاری بە موعەللەقی گێڕاویەتی‌یەوە، واتە بێ باسکردنی سەنەد[1] هەروەها نەسائی و ئیبنو خوزەیمەو ئیبنوحیببانو ئیبنوسەرراجیش گێڕاویانەتەوە. وە لەبوخاری دا هاتووە کە ئیبنو شیهاب دەفەرموورێت: پێغەمبەر ﷺ ئەی فەرموو: (آمین). (عطاء) دەفەرموورێت: (آمین) دوعا و پاڕانەوەیە.

---

(١) منیش دەڵێم باس لە حەدیسەکە کرا دەربارەی (بسم الله) هەروەك لەوێدا ووتمان کە بە ڕاشکاوی ناڵێت بە ئاشکرا (بسم الله) بڵێن، هەروەها لێرەش دەڵێین باسی ووتنی (آمین) ی تێدا نی‌یە کە بە ئاشکرا بووترێت، جا ئەمە بەڵگەیە لەسەر (مطلق)ی ئامین کردن نەك بە ئاشکرا ووتن (تمام المنة).

ئیبنو زوبەیر کە ئەی ووت: (آمین) لەگەڵ ئەوانەی دوواوە لە مزگەوتدا دەنگێکی بەرز دروست ئەبوو مزگەوتەکە ئەلەرییەوە[1].

نافیع دەفەرمووێت: ئیبنو عومەر تەرکی ووتنی (آمین)ی نەئەکرد، وە هانی خەڵکی ئەدا بۆ ووتنی، وەلەو بارەیەوە حەدیسێکم لێ بیستووە.

لە ئەبوهورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ (غير المغضوب عليهم ولاالضالين) ی ئەخوێند ئەی فەرموو: (آمین) هەتا ئەوانەی لەدوایەوە بوون لەریزی یەکەم ئەیان بیست. ئەبو داودو ئیبنو ماجە گێڕاویانەتەوە، وە ئیبنو ماجە دەفەرمووێت: ئەوەندە دەنگی بەرز ئەکردەوە هەتا کۆمەڵی ریزی یەکەم ئەیان بیست وهەتا ناو مزگەوتەکە دەنگی ئەدایەوە پێی. هەروەها حاکمیش گێڕاویەتییەوەو دەفەرمووێت: صەحیحە لەسەر مەرجی هەردوو شێخ، وە بەیهەقیش گێڕاویەتییەوەو دەفەرمووێت: (حسنٌ صحيح)ە، وە (دارقطني)یش گێڕاویەتییەوەو دەفەرمووێت: (إسناده حسن).

لەوائیلی کوڕی حیجرەوە هاتوە دەفەرمووێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەر ﷺ کاتێ (غير المغضوب عليهم ولاالضالين) ی ئەخوێند دوایی ئەیفەرموو: (آمین) بەدەنگی بەرزو دەنگەکەی بۆ درێژ ئەکردەوە، ئەحمەدو ئەبوداود گێڕاویانەتەوە. (ترمذي) بە حەسەنی داناوەو دەفەرمووێت: چەند

---

(١) شێخ ئەلبانی رەحمەتی خوای لێ بێت لەسەرەتای تەعلیق دانەکەی لەسەر ئەم ئەسەرە دەفەرمووێت: لەبارەی ئامین کردن بە دوای ئیمامەوە بە دەنگی بەرز و ئاشکرا هیچ نەهاتووە جگە لەم ئەسەرە نەبێت، وە ئەمەش ناکرێتە بەڵگە، بەڵام دوواتر دەفەرمووێت: پاشان ئەسەرەکەی ئیبنوزوبەیرم تەخریج کرد، وە صەحیحیەتیم ئاشکرا کردووە لەژێر حەدیسی (٩٥٢) لە (الضعيفة)دا، وە بە دوایدا ئەسەرێکی ترم بە صەحیحی هێناوە لە ئەبو هورەیرەوە کە ئەو بە ئاشکرا ئامینی دەکرد لە دوای ئیمامەوە و دەنگی پێ درێژ دەکرد، جا مەیلم چوو بۆ ئەوەی بەدوویان بکەوم. لەپاش ئەوەی ووتەی چەند پێشەوا و زانایەکی هێنایەوە دەفەرمووێت: منیش دەڵێم جا پێویستە بایەخی پێ بدرێت وفەرامۆشی تێدا نەکرێت، وە لە تەواوی جێ بەجێ کردنی ئەم سوننەتە ئەوەیە کە ووتنی لەگەڵ ووتنی ئیمامدا یەك بێت و بە ووتنی پێش نەکەوێت بەڵام ئەم کارە سەرجەم کۆمەڵانی موسڵمانان فەرامۆشیان کردووە لە گشت ئەو وڵاتانەی کە زیارەت کردنیانم بۆ رەخسابوو ، بە ئاشکرا ئامین دەکەن بەڵام پێش ئیمام دەکەون دەست بە ووتنی دەکەن بەر لە ئیمام، وە ئەم سەرپێچی کردنە روونە هۆیەکەی دەگەرێتەوە بۆ زاڵ بوونی نەفامی بەسەریانەوە، وە بە هۆی کەمتەرخەمی پێش نوێژەکانی مزگەوتەکان و غەیری ئەوانیش لە مامۆستایان و وەعز خوێنان بە هەڵنەسان بە فێرکردنیان و ئاگادار کردنەوەیان، تاوەکو ووتەی پێغەمبەر ﷺ (إِذَا أَمَّنَ الإِمَامُ فَأَمِّنُوا..) ئەگەر ئیمام ئامینی کرد ئێوەش ئامین بکەن، بوو بە شتێکی لەبیر چۆوە لە لایان، ئیللا مەگەر کەسێك خوا پاراستبێتی، وە ئەوانیش کەمن. والله المستعان (تمام المنة).

کەس لە زانایانی صەحابەو تابعین و دوای ئەوانیش لەسەر ئەوەن و ڕایان وایە کە ئەبێت پیاو بەدەنگی بەرز بڵێت (آمین) ونەیشارێتەوە. (حافظ) دەفەرمووێت: سەنەدی ئەم (حدیث)ە صەحیحە.

(عطاء) دەفەرمووێت: گەیشتووم بە صەد صەحابی لەم مزگەوتەدا کاتێ ئیمام ئەی ووت: (ولا الضالین) دەنگی (آمین) مزگەوتەکەی ئەلەرزاندەوە[1]. وە لە عائیشەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَا حَسَدَتكُمُ اليَهُودُ على شَيئٍ مَا حَسَدَتكُمُ اليَومَ على السَّلامِ وَالتَّأمِينِ خَلفَ الإمَامِ) رواه أحمد وابن ماجة. واتە: جوولەکە لەهیچ شتێکدا ئەوەندەی سڵاوکردن و ووتنی (آمین) لەدوای ئیمامەوە حەسوودیان پێ نەبردوون.

وا موستەحەببە (ئامین) لەگەڵ ئیمامدا بووترێت:

موستەحەببە بۆ ئەوانەی لەدوای ئیمامەوە نوێژ ئەکەن کە لەگەڵ ئیمامدا بڵێن: (آمین) نە پێشی بکەون نەدووا، لە ئەبی هورەیرەوە هاتووە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذَا قَالَ الإمَامُ غَيرِ المَغضُوبِ عَلَيهِم وَلا الضَّالِّينَ، فَقُولُوا آمِينَ، فَإنَّ مَن وَافَقَ قَولُهُ قَولَ المَلائِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِهِ) رواه البخاري. واتە: کاتێ ئیمام ووتی: ﴿غَيرِ المَغضُوبِ عَلَيهِم وَلا الضَّالِّين﴾ ئێوە بڵێن: (آمین) چونکە هەرکەس ووتنەکەی لەگەڵ ووتنی فریشتەکاندا ڕێك بکەوێت خوا لە گوناهی ڕابوردووی خۆش دەبێت.

وە هەر لە ئەبی هورەیرەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذَا قَالَ الإمَامُ: غَيرِ المَغضُوبِ عَلَيهِم وَلا الضَّالِّينَ، فَقُولُوا آمِينَ، فَإنَّ المَلائِكَةَ يَقُولُونَ آمِين، وَإنَّ الإمَامَ يَقُولُ آمِين، فَمَن وَافَقَ تَأمِينُهُ تَأمِينَ المَلائِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِهِ) رواه البخاري. واتە: کاتێ ئیمام ووتی: ﴿غَيرِ المَغضُوبِ عَلَيهِم وَلا الضَّالِّينَ﴾ ئێوە بڵێن: (آمین) (واتە: لەگەڵ (آمین) ی ئیمامدا)، چونکە لەوکاتەدا فریشتەکان ئەڵێن: (آمین) وە ئیمامیش ئەڵێت: (آمین) جا هەرکەس (آمین) ەکەی لەگەڵ (آمین) کردنی فریشتەکاندا ڕێك بکەوێت خوا لەگوناهی ڕابوردووی ئەبوورێت.

وە هەر لە ئەبی هورەیرەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذَا أمَّنَ الإمَامُ فَأمِّنُوا فَإنَّ مَن وَافَقَ تَأمِينُهُ تَأمِينَ المَلائِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِن

(١) بەم زاراوەیە لاوازە، بەیهەقی (٢/٥٩) دەی گێرێتەوە لە ڕێگای خالیدی کوڕی ئەبو ئەنوەف لە (عطاء)ەوە، وە خالد لە ژمارەی مەجهولینە لەبەر ئەوەی جگە لە ئیبنوحیببان کەسی تر تەوسیقیان نەکردووە، وە تۆ قیمەتی تەوسیقەکەشی دەزانی! بەڵام وەك باس کرا لەوە پێش لە ئیبنو زوبەیرەوە بە کورتی بە صەحیحی هاتووە، (تمام المنة).

ذَنبِهِ) رواه الجماعة. واته: کاتێ ئیمام ووتی: (آمین) ئێوەش لەگەڵیا بڵێن: (آمین)، چونکە هەرکەس (آمین) کردنەکەی لەگەڵ (آمین) کردنەکەی فریشتەکاندا ڕێك بکەوێت خوا لە گوناهی ڕابوردووی ئەبوورێت.

(آمین) واتاکەی چی‌یە؟:

ووشەی (آمین) ئەلفەکەی بەکورت و درێژی ئەخوێندرێتەوە . وە میمەکەی بەسووکی بێ گرتن ئەووترێت، ووشەی (آمین) لەسوورەتی فاتیحە نی‌یە، بەڵکو دوعایەکە واتاکەی ئەمەیە: خوایە پاڕانەوەکەم لێ وەربگرە . (چونکە سوورەتی فاتیحە پاڕانەوەیە لەخوای گەورە).

٦- خوێندنی قوڕئان لە دوای فاتیحە:

سوننەتە بۆ نوێژکەر دوای خوێندنی سوورەتی فاتیحە سورەتێکی تر یاچەند ئایەتێك لەقوڕئان بخوێنێ لە دوو ڕکاتی بەیانی و نوێژی هەینی و دوو ڕکاتی یەکەمی نوێژی نیوەڕۆو عەسرو ئێوارەو خەوتنان، وە لە هەموو ڕکاتەکانی نوێژی (نافلة) سوننەت.

لە ئەبی قەتادەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ لە دوو ڕکاتی یەکەمی نوێژی نیوەڕۆدا سورەتی فاتیحەو دوو سورەتی تری دەخوێند، وە لە دوو ڕکاتەکەی تردا تەنها سورەتی فاتیحەی ئەخوێند، جاری وا هەبوو ئایەتی ئەدا بەگوێماندا، وە ڕکاتی یەکەمی ئەوەندە درێژ ئەکردەوە کە دووەمی ئەوەندە درێژ نەئەکردەوە، وە عەسرو بەیانیش هەربەو شێوەیە بوو. بوخاری و موسلیم و ئەبوداود گێڕاویانەتەوە. ئەبو داود ئەمەشی بۆ زیاد کردووە: گومانمان وابوو کە بەو درێژکردنەوەیە ئەیەوێ خەڵك فریای ڕکاتی یەکەم بکەوێ.

جابیری کوڕی سەمورە دەفەرموێت: خەڵکی کوفە سکاڵایان کرد لە سەعد لەلای عومەر، هەتا عومەر لای بردو عەممارى کردە والی بەسەریانەوە، جا سکاڵایان کرد، هەتا ئەوەیان باس ئەکرد کە سەعد نازانێ نوێژ بکات، عومەریش ناردی بەشوێنی‌دا پێی فەرموو: ئەی ئەبا ئیسحاق ئەمانە ئەڵێن: گوایە نازانی نوێژیان پێ بکەیت ؟ ئەبو ئیسحاقیش ووتی: بەخوا من پێغەمبەر ﷺ چۆن نوێژی کردووە بەو شێوەیە نوێژم پێ کردوون بێ ئەوەی هیچی لێ کەم بکەمەوە، کاتێ نوێژی خەوتنانم پێ ئەکردن، دوو ڕکاتی یەکەمم درێژ ئەکردەوەو دووانەکەی تر کورت، عومەریش فەرمووی: من هەر بەوشێوەیە گومانم پێ ئەبردی، پاشان پیاوێك یا چەند پیاوێکی لەگەڵا نارد بۆ کوفە، گەڕان بەناو کوفەداو لەبارەی ئەوەوە پرسیاریان لەخەڵکی ئەکرد، وە مزگەوت نەما نەگەڕێن، هەموو ڕازی بوون لە سەعد و باسی چاکێتی‌یان ئەکرد، هەتا گەیشتنە مزگەوتێکی بەنی عەبس، دەربارەی سەعد پرسیاریان لەخەڵك کرد، کابرایەك کەناوی ئوسامەی کوڕی قەتادە بوو پێ‌یان ئەووت: ئەبا سەعدە، ووتی: لەبەر ئەوەی بە خوا سوێندمان ئەدەن من ڕاستیتان پێ ئەڵێم:

بەڕاستی سەعد غەزاکەر نیيە، وە لەکاروباردا دادپەروەر نییەو بەیەکسانی شت دابەش ناکات، سەعدیش فەرمووی: سوێند بە خوا منیش سێ دوعا ئەکەم، ئەڵێم: خوایە ئەگەر ئەو بەندەیەی تۆ درۆ ئەکات و بۆ ڕیاو ناوو شۆرەت ئەوقسەیە ئەکات تەمەنی درێژ بکەو بەردەوام هەژاری بکەو تووشی فیتنەی بکە، کابرا دوعاکەی سەعدی لێ گیرابووبوو، ئەگەرا ئەی ووت: پیرێکی گرفتارم دوعاکەی سەعدم لێ‌گیرا بووە، (عبد الملك) دەفەرمووێت: من لەدواییدا بەچاوی خۆم ئەمبینی برۆکانی شۆڕ بوبوونەوە بەسەر چاوەکانیا ئەوەندە پیر بووبوو، کەچی بەلای کچۆڵانا بڕۆیشتایە لەڕێگاوبان چاوی لێ دائەگرتن، بوخاری گێڕاویەتی‌یەوە.

ئەبوهورەیرە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ لە هەموو نوێژێکدا قورئانی خوێندوە، جا هەرچی لە قورئاندا درابێ بەگوێماندا ئێمەش داومانە بەگوێی ئێوەدا، وە هەرچی بەبێ‌دەنگی خوێندووە ئێمەش بەبێ‌دەنگی خوێندوومانە بۆتان، وە ئەگەر لە فاتیحە زیاتریش نەخوێنێ دروستە، وە ئەگەر لە فاتیحە زیاتر بخوێنێ ئەوە چاکترە. بوخاری گێڕاویەتی‌یەوە.

چۆنی‌یەتی قورئان خوێندن لە دوای سوورەتی فاتیحە:

دوای سورەتی فاتیحە دروستە بەهەرشێوەیەك قورئان بخوێنرێت، حوسەین دەفەرمووێت: کاتێ فەتحی خوراسانمان کرد سێ‌صەد صەحابەمان لەگەڵدا بوو، هەیان بوو کاتێ نوێژی بۆ ئەکردین دوای خوێندنی سورەتی فاتیحە چەند ئایەتێکی لە سورەتێك ئەخوێندو ئەچووە رکوعەوە. وە لە ئیبنو عەبباسەوە هاتوە: (جاری وابووە دوای سورەتی فاتیحە یەك ئایەتی لە سورەتی بەقەرە خوێندووە لە هەموو ڕکاتێکدا). (دارقطني) بە ئیسنادێکی بەهێز گێڕاویەتی‌یەوە[1].

بوخاری باسێکی بەم شێوەیە ناونیشان کردوە دەفەرمووێت: «باسی کۆکردنەوەی دووسورەت لەیەك ڕکاتدا، وە خوێندنەوەی کۆتایی سورەت، وەخوێندنەوەی سورەتێك لەپێش سورەتێکدا، وە خوێندنەوەی سەرەتای سورەتێك».

---

(١) منیش دەڵێم: هێزی لە کوێ بوو، کە لە لای (دارقطني) لە سونەنەکەی (١/٣٣٨) سەهلی کوری عاملی بوجەلی تێدایە کە ئەمیش زۆر لاوازە (ضعيف جداً) بوخاری لە (التأريخ الصغير) دا (٢٢٦) دەفەرمووێت: (منكر الحديث لا يكتب حديثه) ئیبنو ئەبی حاتەم (٢/١/٢٠٢) لە باوکی‌یەوە دەفەرمووێت: (ضعيف الحديث روي أحاديث أباطيل، أدركته بالكوفة، وكان يفتعل الحديث) وە (ذهبـي) لە (الضعفاء) دا هێناویەتی دەفەرمووێت: (رماه ابو حاتم بالكذب) ئەبو حاتەم بە درۆزنی زانیوە.

وە حاڵەتی لە ئیبنو حیببان شاراوە بووە بۆیە لە (الثقات ٨/٢٩٠) دا باسی کردووە. (تمام المنة).

له عبدالله ی کوڕی سائیبەوە هاتوە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ دوای خوێندنی سوڕەتی فاتیحە لەنوێژی بەیانی دا سوڕەتی (المؤمنون) ی خوێندەوە هەتا گەیشتە باسی موساو هارون، یان عیسا، کۆکەیەك گرتی و ڕکوعی برد».

وە عومەر لە ڕکاتی یەکەمدا صەدو بیست ئایەتی لەسوڕەتی (البقرة) خوێند، وە لەدووەم ڕکاتدا سوڕەتێکی لە (المثاني) خوێند.

ئەحنەف لەڕکاتی یەکەمدا سوڕەتی (الکهف)ی خوێند، وە لە ڕکاتی دووەمدا سوڕەتی یونس یاسوڕەتی یوسفی خوێند، وە باسی ئەوەی کردووە کە عومەر بە یەکێ لەو دووانە نوێژی بەیانی پێ کردووین.

ئیبنو مەسعود لە ڕکاتی یەکەمدا چل ئایەتی لەسوڕەتی (الأنفال) خوێندووە، وە لە دووەمدا سوڕەتێکی لە (المفصل) واتە: لە سوڕەتە کورتەکان، خوێندووە.

قەتادە دەربارەی ئەوانەی سوڕەتێك لە دوو ڕکاتدا ئەخوێنن یا سوڕەتێك لەهەردوو ڕکاتەکەدا دووبارە ئەکەنەوە دەفەرمووێت: هەمووی هەر کیتابی خوایە.

وە عبیدالله ی کوڕی (ثابت) لەئەنەسەوە ئەگێڕێتەوە کە پیاوێکی ئەنصاری لەمزگەوتی قوبا بەرنوێژی بۆئەکردین، هەمووجارێك لەنوێژەکەدا دوای سوڕەتی فاتیحە سوڕەتی ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ ی ئەخوێند، لەپاشاندا سوڕەتێکی تری ئەخوێند، وە هەموو ڕکاتەکانی بەو شێوەیە ئەکرد، لەوبارەیەوە هاوەڵەکانی پێیان ووت: تۆ ئەڵێی بەخوێندنی ئەم سوڕەتە نوێژەکەت بەدروست نازانی هەتا سوڕەتێکی تر لەگەڵیا نەخوێنی؟ جا یا هەرئەو بخوێنە بەتەنها، یا سوڕەتێکی تر بەتەنها بخوێنە، ئەویش فەرمووی: من واز لەخوێندنی ئەو سوڕەتە ناهێنم، جا ئەگەر حەزئەکەن بەرنوێژیتان بەوشێوەیە بۆئەکەم، ئەگینا وازتان لێدێنم، بەڵام ئەوان ئەویان لەناوخۆیاندا بەچاکترین کەسیان دائەنا وەحەزیان نەئەکرد جگە لەو کەسێکی تر بەرنوێژیان بۆبکات، جا کاتێ پێغەمبەر ﷺ هات بۆلایان پێیان ووت، ئەویش فەرمووی: (يَا فُلان! مَا يَمنَعُكَ أن تَفعَلَ مَا يَأمُرُكَ بِهِ أصحَابُكَ وَمَا يَحمِلُكَ على لُزُومِ هَذِهِ السُّورَةِ فِي كُلِّ رَكعَةٍ؟) واتە: ئەی فلانەکەس چی دەبێتە بەربەست لەوەی کە بە قسەی هاوەڵەکانت بکەیت، وە چی پاڵت پێوە ئەنێت هەموو جارێك لەهەموو ڕکاتەکاندا ئەوسوڕەتە بخوێنی؟ ئەویش ووتی: ئەو سوڕەتەم خۆش ئەوێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (حُبُّكَ إِيَّاهَا أدخلَكَ الجنَّة) ئەو خۆشەویستیەت بۆی ئەتخاتە بەهەشتەوە.

وه لەپیاوێکی هۆزی جوهەینەوه هاتوه که دەفەرموێت: خۆم گوێم لەپێغەمبەر بووه ﷺ لەنوێژی بەیانیدا ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ﴾ ی خوێندووه لەهەردوو ڕکاتەکەدا، دەفەرموێت: جا نازانم پێغەمبەر ﷺ لەبیری چوبوو یا بەقەستی ئەوەی کرد، ئەبوداود گێڕاویەتی‌یەوه، وه لەئیسنادەکەیدا کەسێك نی‌یە تانەی لێ درابێت.

دەستووری پێغەمبەر ﷺ لەخوێندنی قورئان دوای فاتیحە:

لێرەدا ئەوەی ئیبنو قەییم نوسیویەتی دەربارەی شێوەی قورئان خوێندنی پێغەمبەر ﷺ دوای سوڕەتی فاتیحە لەنوێژدا باس ئەکەین کە دەفەرموێت : کاتێ لەخوێندنی سوڕەتی فاتیحە ئەبووەوه دەستی ئەکرد بەخوێندنی سوڕەتی تر، جاری وابووه سوڕەتێکی درێژی خوێندووه، جاری وابووه سوڕەتێکی کورتی خوێندووه لەبەر ڕووداوێك یاسەفەرێك یاشتێکی تر کەهاتۆته پێش، وه زۆر جار سوڕەتێکی ناوەندی خوێندووه.

ئەو سوڕەتانەی لەنوێژی بەیانیاندا ئەخوێندرێن:

پێغەمبەر ﷺ لەنوێژی بەیانیاندا دوای خوێندنی سوڕەتی فاتیحە نزیکەی شەست هەتا صەد ئایەتی ئەخوێند، جاری وابووه سوڕەتی (ق)ی خوێندووه، وه جاری وابووه سوڕەتی (الروم)[1]، وەجاری وابووه بە ﴿إِذَا ٱلشَّمْسُ كُوِّرَتْ﴾ نوێژی ئەکرد، وه ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ﴾ی خوێندووه

---

(١) ئەمەی لە (زاد المعاد)ەوە نەقڵ کردووه، هەروەك لەسەرەتای فەصلەکەدا ئاماژەی بۆ کردووه، وه منیش لەوێ تەعلیقم لەسەر داوه ئەمەش دەقەکەیەتی: منیش دەڵێم ئەمە سابت نەبووه، نسائی (١/١٥١) و ئەحمەد (٥/٣٦٣و٣٦٤) گێڕاویانەتەوه لە ڕێگای (عبد الملك) ی عومەیر لە شەبیبی ئەبی ڕەوح لە پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کە ئەو نوێژی بەیانی بۆ کردوون جا سوڕەتی روم ی خوێند و لێی تێك چوو، کاتێك لە نوێژ بۆوه فەرمووی: ئەوه چی‌یە کەسانێك لەگەڵم نوێژ ئەکەن و دەست نوێژیان بە جووانی نەگرتووه؟! بەهۆی ئەوانەوه قورئانمان لێ تێك چووه.

جا ئەم شەبیبە کوڕی ئەبو نەعیمە، پێی ئەوترێت (ابن أبي روح)، وه (كنية) کەی: (أبو روح الحمصي) یە، ئیبنوحیببان لە (الثقات) دا باسی کردووه، وه ئیبنو (قطان) دەفەرموێت: (لاتعرف عدالته)، وه عیللەتێکی تری تێدایە. بڕوانە (المشكاة٢٩٥). بەمە تۆ دەزانی کە ئەوانەی لە کۆن و تازە سەنەدەکەی تەحسین دەکەن چاکیان نەکردووه، لەگەڵ موخالەفە کردنی مەتنەکەی بۆ زاهیری ئەم ئایەتە ﴿وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا﴾ ـ واتە: هەرکەس خراپە بکات بە زیانی خۆیەتی ـ والله اعلم.

لەهەردوو ڕکاتەکەدا، وە ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ﴾ و ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾ی خوێندووە لەسەفەردا، وەجارێك سوڕەتی (المؤمنون)ی خوێند گەیشتە باسی موساو هارون لەڕکاتی یەکەمدا کۆکەیەك گرتی تەواوی نەکرد چووە ڕکوعەوە، وەڕۆژی هەینی ﴿الٓمٓ ۝ تَنزِيلُ﴾ (السجدة)و ﴿هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ﴾ ی بەتەواوی خوێندووە، وە ئەوەی ئەمڕۆ لەلایەن موسڵمانانەوە ئەکرێت کەهەندێ لەم سوڕەتەو هەندێ لەو سوڕەت ئەخوێنن، پێغەمبەر ﷺ نەی‌کردووە، ئەمما ئەوگومانەی کە زۆر لە جاهیلەکان ئەیبەن کەگوایە نوێژی بەیانی ڕۆژی هەینی (فضیلة)و گەورەیی هەیە بەهۆی خوێندنی سوڕەتی (السجدة) تێیدا، ئەوە جەهلێکی گەورەیە، هەربۆیە هەندێك لە ئیمامەکان لەبەر ئەوگومانە حەزیان نەکردوە بە خوێندنەوەی ئەوسوڕەتە تێیدا، وە کە پێغەمبەر ﷺ ئەو دووسوڕەتەی (السجدة) و ﴿هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ﴾ ی تێدا ئەخوێند تەنها لەبەر ئەوەبوو کە باسی دروست بوون و گەڕانەوە بۆلای خوای تێدایە، وە هەروەها باسی دروست بوونی ئادەم‌و چونەناو بەهەشت و دۆزەخ و گەلێ شتی تر کە لەڕۆژی جومعەدا بوون و ئەبن. جا لە نوێژی بەیانی‌یەکدا ئەوشتانەی ئەخوێند کە لەوڕۆژەدا بوون‌و ئەبن، بۆ ئەوەی موسڵمانان بیری ئەو ڕووداوانەیان بکەوێتەوە کە لەو ڕۆژەدا بوون، وەك چۆن لەکاتی کۆبوونەوە گەورەکاندا وەك جەژنەکان و هەینی‌یەکان سوڕەتی (ق) و (إقتربت) و (سبح) ـ واتە: سوڕەتی (الأعلى) ـ و (الغاشیە)ی خوێندووە.

قورئان خوێندن لە نوێژی نیوەڕۆدا:

بەڵام لە نوێژی نیوەڕۆدا جاری وابوو سوڕەتی ئەوەندە درێژی ئەخوێندەوە، هەتا ئەبو سەعید دەفەرموێت: نوێژی نیوەڕۆ دائەبەسترا کەسێك ئەیتوانی بچێتە بەقیع و سەرپێشاو بکات و بچێتە ماڵەوە دەست نوێژ بگرێت و بگەڕێتەوە فریای ڕکاتی یەکەم بکەوێت، ئەوەندەی درێژ ئەکردەوە. موسلیم گێڕاویەتی‌یەوە. وە جاری وابووە بەئەندازەی سوڕەتی ﴿الٓمٓ ۝ تَنزِيلُ﴾ (السجدة)ی تێدا خوێندووە وە جاری وابووە ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى﴾ی خوێندووە، وە هەروەها ﴿وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰ﴾، وە جاری وابووە ﴿وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلۡبُرُوجِ﴾ و ﴿وَٱلسَّمَآءِ وَٱلطَّارِقِ﴾ی خوێندووە.

**قورئان خوێندن لەنوێژی عەسردا:**

**بەڵام لەنوێژی عەسردا بە ئەندازەی نیوەی نوێژی نیوەڕۆی خوێندووە، ئەگەر خوێندنەوەی نوێژی نیوەڕۆی درێژ بکردایەتەوە، وەئەگەر کورتی بکردایەتەوە ئەوە هەر بەئەندازەی نیوەڕۆی دەخوێند.**

**قورئان خوێندن لەنوێژی ئێوارەدا (مغرب):**

**پێغەمبەر ﷺ لەنوێژی ئێوارەدا خوێندنەکەی جیاوازی هەبووە لەگەڵ ئەو نوێژانەدا کە بەرۆژ خوێندویەتی. لە هەردوو ڕکاتەکەدا سوڕەتی (الأعراف)ی خوێندووە، یا سوڕەتی (الطور)، یا (المرسلات).**

**ئەبو عومەری کوڕی (عبد البر) دەفەرموێت: ریوایەت کراوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە لە نوێژی ئێوارەدا سوڕەتی (المص الأعراف)ی خوێندووە، یا سوڕەتی (الصافات)، یا (حم الدخان)ی خوێندووە، وە جاری وابووە ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى﴾ ی خوێندووە، یا ﴿وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيْتُونِ﴾، یا سوڕەتی (الفلق) و (الناس)ی خوێندووە، یا (المرسلات) وە سوڕەتە کورتەکانیشی تێدا خوێندووە، وە دەفەرموێت: ئەمانە هەمووی (آثار)ی صەحیح و مەشهورن. قسەی (ابن عبدالبر) تەواو بو.**

**بەڵام ئەوەی بەردەوام سوڕەتە کورتەکان ئەخوێنێ ئەوە لەسەر کاری مەڕوانی کوڕی حەکەمە، چونکە ئەو سوڕەتە کورتەکانی ئەخوێند، هەربۆیە زەیدی کوڕی (ثابت) ئینکاری لێکرد وە مالیك پێی فەرموو: چی‌یە تۆ تەنها ئەو سوڕەتە کورتانە ئەخوێنی لەنوێژی ئێواراندا، من پێغەمبەرم ﷺ بینیوە لەنوێژی ئێواراندا یەکێ لەدوو سوڕەتە هەرەدرێژەکەی خوێندووە، ئەویش ووتی: یەکێ لەدوو سوڕەتە هەرە درێژەکە چی‌یە؟ فەرمووی: (الأعراف). ئەمە (حدیث)ێکی صەحیحە خاوەن سونەنەکان گێڕاویانەتەوە.**

**نەسائی لە عائیشەوە ئەگێڕێتەوە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ لە دووڕکاتەکەی نوێژی ئێواراندا سوڕەتی (الأعراف) ی خوێندووە، بەشێکی لە ڕکاتی یەکەمداو بەشەکەی تری لە ڕکاتی دووەمدا.**

**کەواتە بە بەردەوامی خوێندنی ئایەتێ یا سوڕەتێ لە سوڕەتە کورتەکان لە نوێژی ئێوارەدا پێچەوانەی سوننەتە، وە کاری مەڕوانی کوڕی حەکەمە.**

**قورئان خوێندن لەنوێژی خەوتناندا (العشاء):**

بەڵام نوێژی خەوتنان پێغەمبەر ﷺ ﴿وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيْتُونِ﴾ ی تێدا خوێندووە، وە بۆ (معاذ)ی دانا، یا ﴿وَٱلشَّمْسِ وَضُحَىٰهَا﴾ یا ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى﴾ یا ﴿وَٱلَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰ﴾ و وێنەی ئەوانەی تێدا بخوێنێ، وە ئینکاری خوێندنی سورەتی (البقرة)ی لێ کردووە، ئەوکاتەی کە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژی کردو گەڕایەوە بۆناو هۆزەکەی کە بەنی عەمری کوڕی عەوف بوو، نوێژی خەوتنانی دووبارە لەگەڵدا کردنەوە و دوای ئەوەی ئەندازەیەك کە خوا بیەوێ لەشەو ڕۆیشتبو، چوو سورەتی (البقرة) ی خوێند، وە بۆیە پێی فەرموو: (أفتَّانٌ أنتَ يَا مُعَاذُ؟) واتە: ئایا تۆ خەڵك لە ئایین هەڵئەگێڕیتەوە ئەی (معاذ)؟.

جا ڕەخنەگران خۆیان بەو وشەیەوە هەڵواسیوەو ئاوڕ نادەنەوە پێش ئەو ووشەیە و دوای ئەو ووشەیە.

قورئان خوێندن لەنوێژی جومعەدا:

بەڵام لەنوێژی جومعەدا سورەتی (الجمعة) و (المنافقين) یا (الغاشية) ی بەتەواوی دەخوێنێ.

بەڵام ئەوەی تەنها کۆتایی دوو سورەتەکە لە ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟﴾ەوە هەتا کۆتایی ئەخوێنێتەوە، ئەوە پێغەمبەر ﷺ هەرگیز بەو شێوەی نەکردووە و پێچەوانەی ئەو ڕەفتارەی بووە کە بەردەوام بووە لەسەری.

قورئان خوێندن لەنوێژی هەردوو جەژنەکاندا:

بەڵام لەنوێژە جەژنەکاندا جاری وابووە سورەتی ﴿ق﴾ و ﴿إقتربت﴾ ی بەتەواوی دەخوێند، وە جاری وابووە سورەتی ﴿سبح﴾ و ﴿الغاشية﴾ ی دەخوێند.

ئەوانەی باس کران ڕەفتاری پێغەمبەر بوون ﷺ کە هەتا بە خوا گەیشت بەو شێوەیە لەسەری بووە، وە هیچی لێ نسخ نەکراوە، هەربۆیە خەلیفەکانی دوای خۆی لەسەری ڕۆیشتوون، هەتا جارێکیان ئەبوبەکر لەنوێژی بەیانی‌یەکدا سورەتی (البقرة)ی خوێند، کاتێ سڵاوی دایەوە خەریك بوو ڕۆژ هەڵئەهات پێیان ووت: ئەی جێنشینی پێغەمبەر ﷺ خەریك بوو ڕۆژ هەڵبێ، ئەویش فەرمووی: ئەگەر هەڵبهاتایە ئێمەی بەغافڵی نەئەبینی، وە عومەر سورەتی (يوسف) و (النحل) و (هود) و (بني إسرائيل)ی دەخوێند، یا هەر سورەتێ لەو شێوانە، جا ئەگەر درێژکردنەوەکانی نوێژی پێغەمبەر ﷺ نسخ بوونایەوە ئەوە لە خەلیفەکانی نەئەشاررایەوە، تا خەڵکی تر پێیان زانیبایە.

ئەمما ئەو (حدیث)ەی موسلیم لەصەحیحی خۆیدا لەجابیری کوڕی سەمورەوە گێڕاویەتی‌یەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی بەیانیدا ﴿قٓ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ﴾ی ئەخوێند، ئیتر دوای ئەوە ئەوەندە نوێژەکانی درێژ نەئەکردەوە . مەبەست لە ووشەی دوای ئەوە، ئەو نوێژانە بووە کە دوای نوێژی بەیانی کردوونی، واتە: نوێژی بەیانی لەهەموو نوێژەکانی تری زیاتر درێژ ئەکردەوە، وە نوێژەکانی دوای نوێژی بەیانی کورت ئەکردەوە. بەڵگەش لەسەر ئەوە قسەی (أم الفضل)ە کاتێ گوێی لەئیبنو عەبباس ئەبێت ﴿وَٱلۡمُرۡسَلَٰتِ عُرۡفٗا﴾ ئەخوێنێ، پێی دەفەرموێت: کوڕم بە خوێندنەوەی ئەم سوڕەتە ئەوەت بیر هێنامەوە کەئەمە ئاخر سوڕەت بوو گوێم لێ بوو پێغەمبەر ﷺ لەنوێژی ئێوارەدا ئەیخوێند، جا ئەمە لەئاخریدا بوو، تا ئەو شوێنەی دەفەرمووێ:

ئەمما ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أَيُّكُم أَمَّ بِالنَّاسِ فَلْيُخَفِّف) واتە: هەرکەستان بەرنوێژیتان بۆ خەڵك کرد بانوێژەکەی کورت کاتەوە. وەئەوەی ئەنەس دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ لە هەمو کەس زیاتر نوێژەکانی کورت و تەواو بوون. لێرەدا ئەو کورتی‌یە شتێکی نیسبی‌یە ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوکارەی پێغەمبەر ﷺ کردوویەتی ولەسەری بەردەوام بووە، نەك بۆ ئارەزووی نوێژکەرەکان، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی نەئەکرد بەکردنی شتێك و خۆی پێچەوانەی ئەو کاری کردبێت، وە ئەو زانیوێتی ئەوانەی لەدوایەوە نوێژ ئەکەن پیرو لاوازو خاوەن کاری تێدایە، کەواتە ئەوەی کردوویەتی ئەو کورت کردنەوەیە کە فەرمانی داوە بکرێت، چونکە ئەیتوانی لەوە درێژتری بکاتەوە چەندین ئەوەندە، جا ئەو کورتی‌یە بە نیسبەت نوێژە درێژەکانی‌یەوە بووە. وە ئەو ڕەفتارەی کە بەردەوام بوو لەسەری، هەر ئەوە حاکمە بەسەر هەموو ئەوشتانەدا کە خەڵکی کێشەی تێدا ئەکەن، بەڵگەش لەسەر ئەوە ئەو (حدیث)ەیە کە نەسائی گێڕاویەتی‌یەوە لەئیبنو عومەرەوە کە دەفەرمووێت : پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ ئەکردین نوێژ درێژە پێنەدەین و کاتێ بەرنوێژی بۆ ئەکردین سوڕەتی (الصافات) ی ئەخوێند، کەواتە خوێندنی سوڕەی (الصافات) لەو کورتی‌یەیە کە فەرمانی پێ ئەکرد.

**خوێندنی سوڕەتێکی دیاری کراو بە هەمیشەیی:**

پێغەمبەر ﷺ خۆی سوڕەتێکی دیاری نەکردووە کەهەمیشە هەرئەو سوڕەتە لە نوێژا بخوێنێت. جگە لە نوێژی هەینی و جەژنەکان، بەڵام لە نوێژەکانی تردا ئەبو داود ئەگێڕێتەوە لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لەباوکی‌یەوە لەباپیری‌یەوە دەفەرمووێت: لەسوڕەتە کورتەکاندا (المفصل) سوڕەت نەماوە لە پێغەمبەرم ﷺ نەبیستبێت ئیمامەتی پێ نەکردبێت لە نوێژە فەرزەکاندا بۆ خەڵکی، وە پێغەمبەر ﷺ ڕەفتاری وابووە سوڕەتێکی بەتەواوی خوێندووە لەرکاتێکدا، وە هەندێ جار لە دوو

ڕکاتدا، وە جاری وابووە سەرەتای سوڕەتەکەی خوێندووە، بەڵام خوێندنی کۆتایی سوڕەت یا ناوەڕاستی سوڕەت لەپێغەمبەرەوە ﷺ نەبیستراوە، بەڵام خوێندنی دوو سوڕەت لەرکاتێکدا ئەوە لە نوێژە سوننەتەکاندا کردوویەتی، بەڵام لەنوێژە فەرزەکاندا نەبیستراوە کە کردبێتی[1].

وە ئەوەی ئیبنو مەسعود دەفەرمووێت من ئەو (نظائر)ە - سوڕەتە هاوێنەکان لەمەعنادا - ئەزانم کامانەن کە پێغەمبەر ﷺ دووانی پێکەوە لەرکاتێکدا ئەخوێند، سوڕەتی (الرحمن) و (النجم) لەرکاتێکدا، وە سوڕەتی (إقتربت) و (الحاقة) لەرکاتێکدا، وە (الطور) و (الذاريات) لە ڕکاتێکدا، وە (إذا وقعت) و (نون) لە ڕکاتێکدا، جا ئەم (حديث)ە باسی کارێك ئەکات کە جێگەکەی دیاری نەکردووە. ئایا لەنوێژی فەرزدا بووە یا لە نوێژی سوننەت؟ کە ئەویش ئیحتیمالی هەیە.

بەڵام کەم جار تەنها یەك سوڕەتی لەسەریەك لە دوو ڕکاتدا خوێندووە، وە ئەبو داود لەپیاوێکی جوهەنییەوە ئەگێڕێتەوە ئەو پیاوە خۆی گوێی لێبووە پێغەمبەر ﷺ لەنوێژی بەیانییەکدا لەهەردوو ڕکاتەکەدا سوڕەتی (إذا زلزلت) ی خوێندووە، وە دەفەرمووێت: نازانم پێغەمبەر ﷺ لەبیری چوو یا بەقەست ئەو دوو جارە خوێندی.

درێژکردنەوەی ڕکاتی یەکەمی نوێژی بەیانیان:

پێغەمبەر ﷺ ڕکاتی یەکەمی نوێژی بەیانیانی زیاتر لەرکاتی دووەم درێژ ئەکردەوە، هەروەها لە هەموو نوێژێکدا ئەوە ڕەفتاری بووە، وەجاری وابووە ئەوەندەی درێژە پێئەدا دەنگی پێی نەئەبیست[2] وە نوێژی بەیانیانی لەهەموو نوێژەکانی تر زیاتر درێژ کردۆتەوە. ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە خوێندنی قورئانی بەیانیان خواو فرشتەکان شاهیدی ئەبن. وە ووتراوە: فریشتەی شەوو ڕۆژ شاهیدی دەبن[3] وە ئەودوو ووتەیەیە لەسەر ئەوە دانراون کە ئایا هاتنە خوارەوەیەی خوایی بەردەوام

---

(١) ئەوە بەگوێرەی ناوەڕاستی سوڕەتەکانە بەڵام کۆتاییەیان نەء (تمام المنة).

(٢) ئەمە ریوایەت نەکراوە بە تایبەت بۆ ڕکاتی نوێژی بەیانی، وە نە بۆ هەموو نوێژێك، بەڵکو ئەمە تەنها بۆ نوێژی نیوەڕۆیە. ئەبو داود و ئیمام ئەحمەد دەگێڕنەوە لە عبد الله ی کوڕی ئەبو ئەوفا کە پێغەمبەر ﷺ هەڵدەستا لە ركعاتی یەکەمدا لە نوێژی نیوەڕۆ، پاشان ئەم حەدیسە زەعیفە لەبەر جەهالەتی ئەو پیاوەی کە ناوی نەهاتووە، بڕوانە (نيل الأوطار ٣/١١٧) (الإرواء ٥١٢ و ضعيف أبي داود ١٢٣).

(٣) شایەتی دانی فریشتەکان سابتە لە پێغەمبەرەوە ﷺ بەڵام لەبارەی شایەتی دانی خوا لەسەری (حديث) نەهاتووە جگە لە (حديث) ێکی ئەبی دەرداء بە مەرفوعی لەسەنەدەکەیدا (زيادة) هەیەو (حديث)ەکانی مونکەرە.

نەبێت هەتا نوێژی بەیانیان کۆتایی دێت، یا هەتا فەجر هەڵدێ[1]، وە لەهەردوو بارەکەوە دەلیل هاتووە.

هەروەها لەبەر ئەوەی نوێژی بەیانیان ڕکاتەکانی کەمن ئەو درێژکردنەوەیە ئەکەوێتە بری کەمی ڕکاتەکانی، وە لەبەر ئەوەی دوای تێرخەو بوونەو خەڵك حەواونەتەوە، وە لەبەر ئەوەی هێشتا خەڵك بەرەو کاری دنیایی نەڕۆیشتوون، وە لەبەر ئەوەی لەکاتێکدایە گوێ و زمان و دڵی ئادەمیزاد یەك ئەگرن، و سەر ئەو نوێژە ئەپەرژێن و جەنجاڵی کاری دنیایی نەبوون، تا لە قوڕئان تێبگات و بیری لێ بکاتەوە، هەروەها لەبەر ئەوەی نوێژی بەیانی بنەمای کارو سەرتایەتی، بۆیە (فضل)ی پێدراوە کە گرنگی پێ بدرێت و درێژ بکرێتەوە، وە ئەمانە نهێنییەکن تەنها ئەوکەسانە شارەزان پێی کە نهێنییەکانی شەریعەت و مەبەست و حوکمەکانی ئەزانن.

شێوەی قورئان خوێندنی پێغەمبەر ﷺ:

خوێندنەکەی بەشێوەیەك بوو ئایەتەکانی درێژ دەکردەوە و لەسەر هەر ئایەتێك دەوەستاو دەنگی پێ درێژ دەکردەوە. قسەکەی ئیبنوقەییم تەواو بوو.

ئەوەی موستەحەبە بکرێت لەکاتی قورئان خوێندن:

سوننەتە کاتی قورئان خوێندن دەنگ خۆش بکرێت و بڕازێنرێتەوە، وە هاتووە لە (حدیث)دا کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (زَيِّنُوا أصوَاتَكُم بِالقُرآنِ) واتە دەنگتان بەقوڕئان بڕازێننەوە، وە فەرموویەتی: (لَيسَ مِنَّا مَن لَم يَتغَنَّ بِالقُرآن) واتە: هەرکەس دەنگی بۆ قوڕئان خوێندن خۆش نەکات لەئێمە نییە، وە فەرموویەتی: (إنَّ أحسَنَ النَّاسِ بِالقُرآنِ الّذِي إذَا سَمِعتُمُوهُ حَسِبتُمُوهُ يخشى الله) واتە: چاکترین دەنگ بۆ قوڕئان خوێندن دەنگی ئەو کەسەیە کاتێك گوێتان لێ بو هەست بکەن ئەوکەسە لە خوا دەترسێت.

---

(١) مەبەستی هاتنە خوارەوەی خوایی حەدیسەکەیە کە دەفەرموێت: (يَنزِلُ اللهُ كُلَّ لَيلَةٍ إلى سَمَاءِ الدُّنيَا حِينَ يبقى ثُلُثُ اللَّيلِ الآخِرِ، فَيَقُولُ: مَن يَدعُونِي فَأَستَجِيبَ لَهُ ، مَن يَسأَلُنِي فَأُعطِيَهُ، مَن يَستَغفِرُنِي فَأَغفِرَ لَهُ) واتە : خوای گەورە لەپاش ڕۆیشتنی دوسێیەکی شەو لە هەمو شەوێکدا دێتە خوارەوە ـ هاتنە خوارەوەیەك کە شیاوی خۆیەتی ـ بۆ ئاسمانی دونیاو دەفەرموێ: کێ لێم دەپارێتەوە تاوەکو پاڕانەوەکەی گیرا بکەم، کێ داوام لێ ئەکات تاوەکو داواکارییەکەی بەجێ بێنم، کێ داوای لێخۆشبونم لێ ئەکات تاوەکو لێی خۆش ببم. جا ئەم حەدیسە صەحیح و موتەواتیرە.

پاشان شێخ ئەلبانی چەند ڕیوایەتێك دێنێت لە باسی تەواو بونی کاتی ئەو هاتنە خوارەوەیە لە پاشاندا دەفەرموێت: مانەوەی هەتا بەرەبەیان (ثابت) ە بەڵام هەتا ڕۆژهەڵاتن (حدیث)ی صەحیح نەهاتووە لەو بارەیەوە. بۆ ڕون کردنەوەی زیاتر بڕوانە (تمام المنة).

وە فەرمویەتی: (وَمَا أذِنَ اللهُ لِشَيئٍ مَا أذِنَ لِنَبِـي حَسَنِ الصَّوتِ يتغنى بِالقُرآن) واتە: خوا ئەوەندەی ڕێی داوە بەپێغەمبەرێکی دەنگ خۆش بەدەنگەوە قورئان بخوێنێ بەهیچ شتێك ئەوەندە ڕێی نەداوە.

ئەوەوی دەفەرمووێت: سوننەتە بۆ هەرکەسێك قورئان ئەخوێنێ لەنوێژدا بێت یان جگە لە نوێژدا کاتێك بەسەر ئایەتێکی ڕەحمەتدا تێئەپەڕێ داوا بکات لە فەزڵی خوا، وەکاتێ بەسەر ئایەتێکی سزادا تێپەڕێت پەنا بگرێت بەخوا لە ئاگر، یا لە سزا، یا لە شەڕ، یا لە خراپە، یا بڵێت: خوایە داوات لێ ئەکەم لەش ساغم بکەیت، یا بە هەرشێوەیەك بپارێتەوە، وە ئەگەر بەسەر ئایەتێکدا تێپەڕی باسی پاکو بێگەردی پەروەردگاری ئەکرد بڵێت: (سبحان الله) یا (تبارك الله رب العالمين) یا (جلت عظمة ربنا) یا وێنەی ئەمە[1].

لە حوزەیفەی کوڕی یەمانەوە هاتوە خوای لێ ڕازی بێت بۆمان ئەگێڕێتەوە دەفەرمووێت: شەوێك لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژم ئەکرد، دوای خوێندنی سوڕەتی فاتیحە دەستی کرد بەخوێندنی سوڕەتی (البقرة) (لە دڵی خۆمدا) ووتم: سەد ئایەت ئەخوێنێت و ئەچێتە ڕکوعەوە، بەڵام هەر بەردەوام بوو، ووتم: ئەو سوڕەتە لە ڕکاتی یەکەمدا تەواو ئەکات، بینیم کاتێ ئەو سوڕەتەی تەواو کرد دەستی کرد بەخوێندنی سوڕتی (آل عمران)، ئەویشی تەواو کردو دەستی کرد بەخوێندنی سوڕەتی (النساء) ئەویشی تەواو کرد هەر لەو ڕکاتەدا، لەسەرخۆ ئەیخوێند، کاتێ بەسەر ئایەتێکدا تێئەپەڕی باسی پاکو بێگەردی پەروەردگاری ئەکرد ئەی فەرموو: (سبحان الله)، کاتێ بەسەر ئایەتێکی پاڕانەوەدا تێئەپەڕی ئەویش لەخوا ئەپاڕایەوە، کاتێ بەسەر ئایەتێکی پەناگرتندا تێئەپەڕی پەنای بەخوا ئەگرت. موسلیم گێڕاویەتیەوە.

هاوەڵانمان ووتوویانە: ئەمە موستەحەببە، وە (سبحان الله) و دوعاو پەناگرتن بۆ قورئان خوێن هەم لەنوێژدایەو هەم لە غەیری نوێژدایە، وە هەم بۆ ئیمامەو هەم بۆ مەئموم، وە هەم بۆ ئەو کەسەی بە تەنها نوێژ بکا، چونکی دوعایە، هەر بۆیە هەموویان تێیدا یەکسانن هەروەك (آمين) ووتن، وە موستەحەببە هەرکەس ﴿أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَحْكَمِ ٱلْحَٰكِمِينَ﴾ بخوێنێ، بڵێت: (بلى وَأنَا على ذٰلكَ مِنَ الشَّاهِدِين)، وە کەسێ ﴿أَلَيْسَ ذَٰلِكَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْـِۧىَ ٱلْمَوْتَىٰ﴾ بخوێنێت، بڵێت: (بلى أشهَدُ)، وە ئەگەر گەیشتە ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى﴾

(١) ئەمە لەبارەی شەونوێژە وە هەروەك لە حەدیسی حوزەیفەدا باس کرا لە کیتابەکەیدا.

بلێت: (سُبحَانَ رَبِّيَ الأعلى)، وە ئەگەر ﴿فَبِأَيِّ حَدِيثٍۭ بَعۡدَهُۥ يُؤۡمِنُونَ﴾ ی خوێندەوە بلێت: (آمَنتُ بِالله)، ئەمانە لە نوێژو دەرەوەی نوێژدا ئەوترێن لە کاتی خوێندنی قورئان[1].

**شوێنی ئاشکرا خوێندن و بە سرکە خوێندنی قورئان:**

سوننەتە نوێژکەر لەدوو ڕکاتەکەی نوێژی بەیانیان و هەینیدا بەدەنگی بەرز بیخوێنێ، هەروەها لەهەردوو ڕکاتی نوێژی ئێوارەو خەوتناندا، وە لەنوێژی هەردوو جەژن و نوێژی مانگ گیان و خۆرگیران و نوێژی داوای باران بارین کردن، بەڵام لەنوێژی نیوەڕۆو عەسردا بەبێ‌دەنگی ئەخوێنرێت، وە هەروەها لە ڕکاتی سێ‌یەمی ئێوارەو دوو ڕکاتی دوایی نوێژی خەوتناندا، بەڵام نوێژە سوننەتەکان هەموو ئەوانەی لەرۆژدا ئەکرێن بەبێ دەنگی قورئانیان تێدا ئەخوێنرێت، وە ئەو نوێژە سوننەتانەی لەشەودا ئەکرێن نوێژکەر ئارەزووی خۆیەتی دەنگیان تێدا بەرز ئەکاتەوە یا بە بێ‌دەنگی نوێژەکە ئەکات، وە چاکتر وایە دەنگ تێ‌یاندا (وسط) ناوەند بێت: پێغەمبەر ﷺ شەوێك بەلای ئەبوبەکردا تێئەپەڕێت نوێژ ئەکات و دەنگی نزم ئەکاتەوە، وە کاتێ بەلای عومەردا تێ ئەپەڕێت سەیر ئەکات دەنگی بەرز کردۆتەوە، کاتێ هەردووکیان هاتنە لای فەرمووی: ئەی ئەبا بەکر بەلاتا تێپەڕیم نوێژت ئەکرد دەنگت نزم کردبۆوە؟ فەرمووی: ئەی نێرراوی خوا ویستم تەنها ئەو زاتە بیبیستێ کە هاواری بۆ ئەکەم، وە بەعومەری فەرموو: بەلاتا تێ پەڕیم نوێژت ئەکرد

---

(١) ئەوەی ڕوون نەکردۆتەوە ئایا ئەمە وارده یان نا، وە ئایا سابتە یان نا، بۆیە دەڵێم کۆی تەسبیح کردنەکە صەحیحە و سابتە بە حەدیسی ئیبنو عەبباس و جگە لەمیش، وە ئەویش تەخریج کراوە لە صەحیحی ئەبو داود (٨٢٦) دا ، ئەمما ئەوەی پێش تر لە حەدیسی ئەبو هورەیرەوە هاتووە بە مەرفوعی بە لەفزی: هەرکەسێك ﴿وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيۡتُونِ﴾ ی خوێند و دوایی پێ هێنا تاوەکو ﴿أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِأَحۡكَمِ ٱلۡحَٰكِمِينَ﴾ با بلێت (بلى وأنا على ذلك من الشاهدين) ئەبوداود و جگە لەمیش گێراویانەتەوە، وە سەنەدەکەی پیاوێکی تێدایە ناوی نەبراوە، وە ڕوون کردنەوەکەی لەسەر (ضعيف أبي داود ١٥٦ و المشكاة ٨٦٠) ە.

بەڵام ووتەی (بلى) لە سورەتی قیامەتدا صەحیحە، موسای کوڕی عائیشە گێراویەتی‌یەوە دەفەرموێت: پیاوێك بوو لەسەر سەربانی ماڵەکەی خۆی نوێژی دەکرد، کاتێك (أليس ذلك بقادر على أن يحيي الموتى) ی بخوێندایە، دەیووت: (سبحانك فبلى) پرسیاریان لێ کرد لەبارەیەوە، فەرمووی گوێم لە پێغەمبەری خوا بووە ﷺ کە خوێندوویەتی.

ئەبو داود دەیگێڕێتەوە بە سەنەدێکی صەحیح لەو پیاوەوە، ئەویش صەحابی‌یە، وە نەناسراوی صەحابی زیانی نی‌یە هەروەك شتێکی ئاشکرایە لەلای زانایان، هەربۆیە لە صەحیحی ئەبوداودا تەخریجم کردووە بە ژمارە (٨٢٧)، (تمام المنه).

دەنگت لێ هەڵبڕیبوو؟ فەرموی: ئەی نێرراوی خوا خەوتووەکانم بەئاگا ئەهێناو شەیتانم پێ ڕائەفڕاند، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی ئەبا بەکر نەختێ دەنگت هەڵبڕە، وە بە عومەری فەرموو نەختێك لەدەنگت کەم بکەرەوە. ئەحمەدو ئەبوداود گێڕاویانەتەوە.

وە ئەگەر کەسێك لە یادی نەبوو ئەو ڕکاتانەی ئەبێ دەنگی بەرز بکاتەوە دەنگی نزم کردەوە، یا دەنگی بەرز کردەوە لەو ڕکاتانەی ئەبو دەنگ نزم بکاتەوە، دروستەو هیچی نایاتە سەر، وە ئەگەر لەناو نوێژەکەدا هاتەوە بیری لەوکاتەوە ئەگەڕێتەوە سەر ڕەوشتی ڕاستی و نوێژەکانی تەواو ئەکات.

**خوێندن لەدوای ئیمامەوە:**

ئەصڵ ئەوەیە نوێژ بەبێ خوێندنی سورەتی فاتیحە دروست نیە لەهەموو ڕکاتێك لەڕکاتەکانی نوێژی فەرزو سوننەتدا، وەك لەپێشەوە لەباسی ئەوشتانەی فەرزن لەنوێژدا باس کرا، بەڵام ئەوانەی نوێژی جەماعەت ئەکەن ئەو خوێندنەیان لەسەر ئەکەوێت، وە واجبە لەسەریان بێدەنگ بن و گوێ بگرن لەو نوێژانەدا کە ئەبێ ئیمام بەدەنگی بەرز بخوێنێ، بەپێی فەرموودەی خوای گەورە کە فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُواْ لَهُۥ وَأَنصِتُواْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ (الأعراف/٢٠٤). واتە: کاتێ قورئان خوێندرا گوێی لێ بگرن و بێدەنگ بن بە ئومێدی ئەوەی خوا ڕوحم و بەزەیی خۆی برێژێ بەسەرتانا.

وە بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: (إذَا كَبَّرَ الإمَامُ فَكَبِّرُوا وَإذَا قَرَأَ فَأنصِتُوا) مسلم بە صەحیحی داناوە. واتە: کاتێ ئیمام ووتی: (الله أكبر) ئێوەش بڵێن: (الله أكبر)، کاتێ دەستی کرد بە قورئان خوێندن بێدەنگ بن و گوێ بگرن.

وە ئەو (حدیث)ەش کە ئەفەرموێ: (مَن كَانَ لَهُ إمَامٌ فَقِرَاءَةُ الإمَامِ لَهُ قِرَاءَةٌ) واتە: هەرکەس بەجەماعەت نوێژ بکات قورئان خوێندنەکەی ئیمام بۆ ئەویش قورئان خوێندنە، لەسەر ئەو مانایە دائەنرێ، واتە خوێندنی ئیمام بۆئەو خوێندنە لەنوێژە ئاشکراکاندا. بەڵام لەنوێژە نهێنیەکاندا لەسەر مەئمومەکانیش واجبە فاتیحە بخوێنن، وە هەروەها لەو نوێژە ئاشکرایانەشدا واجبە لەسەریان فاتیحە بخوێنن ئەگەر خوێندنی ئیمامەکەیان نەئەبیست.

ئەبوبەکری (ابن العربی) دەفەرموێت: ئەوەی ئێمە هەڵی ئەبژێرین و تەرجیحی ئەدەین ئەوەیە کە لە نوێژە نهێنیەکاندا خوێندن واجبە لەبەر گشتێتی خەبەرەکان، بەڵام نوێژە ئاشکراکان ڕێگای خوێندنی تێدا نیە لە سێ ڕووەوە:

یەکەمیان: نەخوێندن لەدوای ئیمامەوە کاری خەڵکی مەدینە بووە.

دووەمیان: ئەوکارە حوکمی قورئانە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُواْ لَهُۥ وَأَنصِتُواْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ (الأعراف/٢٠٤). واتە: کاتێ قورئان خوێندرا گوێی لێ بگرن و بێ دەنگ بن.

ئەو لێکدانەوەش دوو فەرموودە بەهێزی ئەکات: یەکەمیان (حدیث)ەکەی عیمرانی کوڕی حوصەینە کە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (قَد عَلِمتُ أنَّ بَعضَكُم خَالَجَنِيها) واتە: بۆم دەرکەوتووە هەندێکتان ئەبنە بەربەستم، ئەمەی فەرمو کاتێك گوێی لێبوو پیاوێك لەدوایەوە ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى﴾ ی ئەخوێند.

دوەمیان پێغەمبەر ﷺ کە ئەفەرموێت: (وإذا قُرِأ فَأنصِتُوا).

سێیەم: تەرجیح دراو ئەوە کە ڕێگا نییە بۆ خوێندن لەدوای ئیمامەوە، پاشان کەی بیخوێنێت؟ چونکە ئەگەر ووترا لەکاتی بێ دەنگ بوونی ئیمام (لە دوای تەواو بوونی فاتیحە) بخوێندرێت؟ ئەڵێین: ئیمام لەسەری نییە بێدەنگ بێت، کەواتە چۆن فەرزێك لەسەر شتێك دائەنرێ کە فەرز نییە، بەتایبەتی کەرویەکمان دۆزییەوە بۆخوێندن لەنوێژە ئاشکراکاندا ئەویش خوێندنە بەدڵو بەهۆش و بیر لێ کردنەوە[1].

ئەمەیە یاسای قورئان و (حدیث)و پارێزگاری کردنی عیبادەتو ئاگاداری کردنی سوننەت، هەروەها عەمەل کردنە بە تەرجیح. تەواو.

---

(١) ئەم تەعبیرە وا گومان دروست دەکات کە بێ دەنگ بوونی ئیمام لە دوای تەواو بوونی فاتیحە بە ئەندازەی ئەوەی ئەوانەی دوواوەی بیخوێنن شەرعییە، چونکە ئەمە کە ئیمام لەسەری نییە بوەستێت، ئەوە ناگەیەنێت کە وەستان نادروست بێت بە (مطلق) ی هەروەك شاراوە نییە، وە بۆ ڕەواندنەوەی ئەو گومانە دەڵێم:
ئەو سەکتە باس کراوە بیدعەیە لەدینا لەبەر ئەوەی بە (مطلق) ی لە پێغەمبەرەوە نەهاتووە، بەڵکو ئەو دوو سەکتەی لێ وارد بوو یەکێکیان لەدوای (الله أكبر) ی چوونە ناو نوێژەوە (تكبيرة الإحرام) لەبەر خوێندنی دوعای دەست پێ کردن (الإستفتاح) وە باس کرا لەوە پێش، وە بێ دەنگ بوونی دووەم: ڕیوایەت کراوە لە سەمورەی کوڕی جوندوبەوە وە ڕاویەکان لە دیاری کردنی شوێنەکەی خیلافیان هەیە، هەندێکیان دەڵێن: ئەوە لەپاش تەواو بوونە لە فاتیحە، وە زۆرینە دەڵێن: لەپاش تەواو بوون لەسەرجەم خوێندنەکەیە، وە ئەمەش ڕاستە، هەروەك ڕوونم کردۆتەوە لە (التعليقات الجياد)، جگە لەمیش بگەڕێوە بۆ (رسالة الصلاة)ی ئیبنوقەییم. (تمام المنه).

ئەمەش هەڵبژاردەی زوهری و ئیبنو موبارەکو قسەیەکی مالیکو ئەحمەدو ئیسحاقە، وە ئیبنوتەیمی‌یەش ئەم ڕایەی بە باشتر زانیوە.

٧- (الله أكبر)ی نێوان هەڵسوکەوتەکان:

لە هەموو سەر بەرزکردنەوەیەك و داهاتنەوەیەك و هەستان و دانیشتنێکدا (الله أكبر) ئەکرێت، جگە لەبەرزبوونەوە لە ڕکوع کەتێیدا ئەوترێت: (سمع الله لمن حمده)[1].

ئیبنومەسعود خوای لێ ڕازی بێت دەفەرمووێت: پێغەمبەرم ﷺ بینیوە لەهەموو داهاتنەوەو بەرزبوونەوەیەکو هەڵسانێکو دانیشتنێکدا (الله أكبر)ی ئەکرد. ئەحمەدو نسائی و (ترمذي) کەبەصەحیحی داناوە گێڕاویانەتەوە.

لەپاشاندا (ترمذي) دەفەرمووێت: صەحابەکان لەوانە ئەبو بەکرو عومەرو (عثمان)و عەلی‌و جگە لەوان خوا لێیان ڕازی بێت کاریان لەسەر ئەوە بووە، وە ئەوانەی لەدووای ئەوانیشەوە هاتوون لە تابیعین، هەروەها هەمو زانایانی (حديث) و شەریعەت ڕایان لەسەر ئەوەیە، تەواو.

لە ئەبوبەکری کوڕی عبدالرحمنی کوڕی (حارث)ەوە هاتووە کە دەفەرمووێت: خۆم لە ئەبی‌هورەیرەم بیستووە دەیفەرموو: پێغەمبەر ﷺ کاتێ هەڵئەسا بۆ نوێژ لەسەرەتاوە (الله أكبر)ی ئەکرد، ئینجا کە ڕکوعی ئەبرد (الله أكبر)ی ئەکردەوە، وە کە پشتی بەرز ئەکردەوە ئەیفەرموو: (سمع الله لمن حمده)، وە کە ڕێك ئەبۆوە بەپێوە ئەیفەرموو: (ربنا لك الحمد)، پێش ئەوەی بچێتە سەجدەوە، ئینجا ئەیفەرموو: (الله أكبر) کاتێ دائەنەوی‌یەوە بۆ سەجدە، لەپاشاندا ئەیفەرمووەوە: (الله أكبر)، کاتێ سەری بەرز ئەکردەوە لەسەجدە، لەپاشاندا کاتێ هەڵئەسایەوە لەهەردوو سەجدەکە ئەیفەرمووەوە (الله أكبر)، بەوشێوەیە لەهەموو ڕکاتێکدا ئەیکرد هەتا لەنوێژ ئەبووەوە، ئەبوهورەیرە ئەفەرمووێت: هەتا دونیای بەجێ هێشت بەو شێوە نوێژی ئەکرد. ئەحمەدو بوخاری‌و موسلیم‌و ئەبوداود گێڕاویانەتەوە. وە لەعیکریمەوە هاتووە دەفەرمووێت: بە ئیبنوعەبباسم ووت: نیوەڕو لە (بطحاء) لەدوای پیرێکی بێ‌عەقڵەوە نوێژم کرد بیستو دوو (الله أكبر) ی کرد، کاتێ سوجدەی ئەبرد (الله أكبر) ی ئەکرد، وەهەروەها کاتێ سەری بەرز ئەکردەوە، ئیبنو عەبباسیش فەرمووی: ئەوە شێوەی نوێژی (أبو القاسم) بووە ﷺ. ئەحمەدو بوخاری گێڕاویانەتەوە. وە موستەحەببە سەرەتای (الله أكبر) لەوکاتەوە بێ کە دەست ئەکا بەهەڵسو کەوتەکان.

٨- شێوەی ڕکوع:

---

(١) ئەو (الله أكبر)انە سوننەت نین، بەڵکو واجبن. (تمام المنة).

ئەوەی واجبە لە چوونە ڕکوعدا تەنها چەمانەوەیە بەجۆرێ هەردوو دەست بگاتە سەر هەردوو ئەژنۆ[1]، بەڵام ئەوەی سوننەت بێت تێیدا ئەوەیە سەر ڕێکی پشت بکرێتو خۆ بدرێت بەسەر دەستەکاندا لەسەر هەردوو ئەژنۆ، لەگەڵ بەدوور خستنی باسك و قۆڵ لە لاتەنیشت و کردنەوەی پەنجەکانی دەست لەسەر هەردوو ئەژنۆو تەخت کردنی پشت، لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە هاتوە کاتێ کە ئەچوە ڕکوعەوە دەستی لە لەشی دوور ئەخستەوەو هەردوو لەپی دەستی لەسەر هەردوو ئەژنوی دائەناو پەنجەکانی لەسەر ئەژنۆکانی لەیەك بڵاو ئەکردەوە، لەپاشاندا ئەیفەرمو: بەو شێوەیە پێغەمبەرم ﷺ بینیوە نوێژی کردووە. ئەحمەدو ئەبوداودو نەسائی گێڕاویانەتەوە[2].

لە ئەبو حومەیدەوە هاتووە خوای لێ ڕازی بێت دەفەرموورێت: کاتێ پێغەمبەر ﷺ ئەچووە ڕکوعەوە خۆی ڕێك ئەکرد، نە سەری بەرز ئەکردەوە نە خواری ئەکردەوە، وە هەردو دەستی لەسەر هەردوو ئەژنۆی دائەنا وەکو ئەوە کە بەدەست بیان گرێت، نەسائی گێڕاویەتی‌یەوە.

لە عەلی‌یەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ ئەچووە ڕکوعەوە ئەگەر پەرداخە ئاوێکت لەسەر پشتی دابنایە نەئەڕژا، ئەحمەد گێڕاویەتی‌یەوەو ئەبوداود لە مەراسیلەکانیدا.

لە موصعەبی کوڕی سەعدەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: لەتەنیشت باوکمەوە نوێژم ئەکرد هەردوو لەپی دەستم نایەسەر یەك و خستمە نێوان ڕانمەوە، ئەویش فەرمووی: وامەکە

---

(١) ئەوە بەس نی‌یە بەڵکو ئەبێت دڵنیایی تەواوی تێدا بێت، وە دڵنیابوون بەمانە دێتە جێ :

١- دەست خستنە سەرئەژنۆ.

٢- کردنەوەی پەنجەکان.

٣- پشت ڕێك کردن.

٤- مانەوە لە ڕکوعدا هەتا هەموو جومگەکان جێی خۆیان ئەگرنەوە.

وە هەموو ئەمانە سابتە لە چەند ریوایەتێکەوە لە حەدیسی ئەو کابرایەی نوێژەکەی بە خراپی کرد، وە ئەمیش تەخریج کراوە لە (صفة الصلاة ص ١٣٣-١٣٤)، (تمام المنه).

(٢) خولگەی ئەم حەدیسە لەسەر (عطاء) ی کوڕی سائیبە، وە ئەم (إختلاط)ی تووش بووە، وە کەسێکم نەبینی لێی بگێڕێتەوە بەر لە (إختلاط)ەکەی، وە لەم بابەدا حەدیسمان هەیە کە پێویستمان بە حەدیسی وەها نەبێت، وێنەی حەدیسی ئەبی حومەید، کە دانەر دووا بە دوای ئەم حەدیسە هێناویەتی، لەلای ئەبوداود و (ترمذي) کە بە صەحیحی گێڕاوە تیایدا بە لەفزی: جا هەردوو دەستی خستە سەر ئەژنۆی وەك بڵێیت چنگی پیا کردووە... وە پەنجە بڵاو کردنەوە سابت بووە لە کردار و فەرمانی پێغەمبەر ﷺ وەك باسمان کرد لە (صفة صلاة النبـي)دا. (تمام المنة).

ئێمە لەسەرەتاوە بەو شێوەیە نوێژمان ئەکرد بەڵام فەرمانمان پێدرا دەستمان بخەینە سەرئەژنۆمان (رواه الجماعة).

٩- (ذکر) و یادکردن لە ڕکوعدا:

ئەو (ذکر)ە موستەحەببە لە ڕکوعدا بووترێت (سُبحَانَ رَبِّيَ العَظِيم)ە، لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: کاتێ ﴿فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ﴾ هاتە خوارەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە ڕکوعەکانتانا بیڵێن، ئەحمەدو ئەبوداودو غەیری ئەوان گێڕاویانەتەوە بەئیسنادێکی (جید) [1].

لە حوزەیفەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: لەدوای پێغەمبەرەوە ﷺ نوێژم کرد لەرکوعەکانیدا ئەیفەرموو: (سُبحَانَ رَبِّيَ العَظِيم) موسلیم و خاوەن سوننەکان گێڕاویانەتەوە.

بەڵام ووتنی: (سبحان ربي العظيم وبحمده) لە چەند ڕێگایەکەوە هاتووە هەموویان زەعیفن. شەوکانی دەفەرمووێت: بەڵام ڕێگاکان یەکتر بەهێز ئەکەن، وە دروستە نوێژکەر تەنها تەسبیح بکات، یا یەکێك لەو یادانەی لای خوارەوەی لەگەڵدا بکات:

(١) لە عەلیەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ ئەچووە ڕکوعەوە ئەیفەرموو: (اللهمَّ لَكَ رَكَعتُ، وَبِكَ آمَنتُ، وَلَكَ أسلَمتُ، أنتَ رَبِّي خَشَعَ سَمعِي وَبَصَرِي وَمُخِّي وَعَظمِي وَعَصَبِـي وَمَا استَقَلَّت بِهِ قَدَمِي لله رَبِّ العَالَمِين) رواه أحمد ومسلم وأبوداود وغيرهم. واتە: خوایە ڕکوعم بۆتۆ بردو ئیمانم بەتۆ هێناو تەسلیمی تۆبووم، تۆ پەروەردگارمی، ملکەچ بوو گوێم و چاوم و مێشکم و ئێسکەکانم و دەمارەکانم، وە ئەوەی قاچم هەڵی گرتووە بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان.

(٢) لە عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە کە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ لە ڕکوع و سجودەکەیدا ئەیفەرموو: (سُبُّوحٌ قُدُّوسٌ رَبُّ المَلائِكَةِ وَالرُّوح) واتە: پاکو بێگەردە لەکەم و کوڕی پەروەردگاری فریشتەکان و جبریل.

---

(١) بە هەمان شێوە نەوەوی لە (المجموع) دا (٣/٤١٣) دەفەرمووێت: (رواه أبو داود وابن ماجة باسناد حسن) وە (حافظ) لە (التلخيص) دا بێ دەنگ بووە لەسەری (١/٢٤٢)، وە لە سەنەدی هەرهەموویان مامی موسای کوڕی ئەییوبی تێدایە، ناوی (إياس بن عامر الغافقي)یە، وە ئەمە ناسراو نیيە، هەروەك لێی کۆڵاوەمەتەوە لە (ضعيف أبي داود ١٥٢-١٥٣) دا، پاشان لە (إرواء الغليل ٣٣٤)دا، وە ئەگەر ئەم حەدیسە صحیح بووایە بەڵگە بوو لەسەر واجب بوونی (التسبيح)، ئەمەش پێچەوانەی ئەوەیە کە دانەر ووتوویەتی: موستەحەببە، وە حەدیسەکە تەواوکەری هەیە، دانەر لە (السجود) دا باسی لێ دەکات.

(٣) له عەوفی کوڕی مالیکی ئەشجەعی یەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: شەوێکیان لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ شەونوێژم ئەکرد له ڕکوعەکەیدا ئەیفەرموو: (سُبحَانَ ذِي الجَبَرُوتِ وَالمَلَكُوتِ وَالكِبرِيَاءِ وَالعَظَمَة) رواه أبوداود والترمذي والنسائي[1]. واته: بێگەرده خوای خاوەن هێزو موڵك و کبریا و گەورەیی.

(٤) عائیشه دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ له ڕکوع و سجودەکەیدا ئەیفەرموو: (سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمدِكَ اللَّهُمَّ اغفِر لِي) واته: خوایه، پەروەردگارمان، پاك و بێگەردی و ستایش بۆ تۆ خوایه لێم خۆشبه، عائیشه دەفەرمووێت: ئەو ووتنەی بەپێی قورئان بوو که ئەفەرمووێت: ﴿فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَٱسْتَغْفِرْهُ﴾ ئەحمەدو بوخاری و موسلیم و جگه لەمانیش گێڕاویانەتەوە.

(ذکر)و یادی هەڵسانەوە له ڕکوع و به پێوە وەستان:

موستەحەببە بۆ نوێژکەر ئیمام بێ یا مەئموم یا تاك، کاتێ بەرز ئەبێتەوە له ڕکوع بڵێت: (سَمِعَ اللهُ لِمَن حَمِدَهُ) واته: خوا وەڵامی ئەو کەسەی دایەوە که ستایشی کرد، وەکاتێ ڕاوەستا بڵێت: (رَبَّنَا وَلَكَ الحَمدُ) یا بڵێت: (اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَلَكَ الحَمدُ). بەپێی ئەوەی له (أبو هريرة)وە ڕەزای خوای لەسەر بێت هاتوە که پێغەمبەر ﷺ ئەو دو زیکرەی خوێندوە لەکاتی هەڵسانەوە له ڕکوع و ڕاوەستاندا. ئەحمەدو (شیخين) گێڕاویانەتەوە.

له لای بوخاری له ئەنەسەوە هاتوە که دەفەرمووێت: ئەگەر ئیمام ووتی: (سَمِعَ اللهُ لِمَن حَمِدَهُ) ئێوه بڵێن: (اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَلَكَ الحَمد).

هەندێ لەزانایان ڕایان وایه مەئموم نابێ بڵێ (سَمِعَ اللهُ لِمَن حَمِدَهُ)، بەڵام کاتێ بیستیان ئیمام ئەمە ئەڵێ ئەوان بڵێن: (اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَلَكَ الحَمدُ) بەپێی ئەم (حديث)ە.

وه بەپێی حەدیسی ئەبوهورەیره که ئەحمەد و جگه لەو دەیگێڕێتەوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إِذَا قَالَ الإِمَامُ: سَمِعَ اللهُ لِمَن حَمِدَهُ، فَقُولُوا اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَلَكَ الحَمدُ فَإِنَّ مَن وَافَقَ قَولُهُ قَولَ المَلائِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِهِ)، واته: کاتێ ئیمام ووتی: (سَمِعَ اللهُ لِمَن حَمِدَهُ) ئێوه بڵێن: (اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَلَكَ الحَمدُ) چونکه هەرکەس ووتنەکەی لەگەڵ ووتنەکەی فریشتەکاندا یەك بکەوێت خوا لەگوناحی لەوه پێشی ئەبوورێت.

---

[1] سەنەدەکەی صەحیحه وەك شێخ ئەلبانی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت له (صفة الصلاة ص١٠٠) دا، وه پێغەمبەر ﷺ ئەمەی له شەونوێژدا دەوتەوە، وەك شێخ له (صفة الصلاة) دا ئاماژەی بۆ کردووە.

بەڵام ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ کە ئەفەرمووێت: (صَلُّوا كَمَا رَأَيتُمُونِي أُصَلِّي) واتە: من چۆن ئەبینن نوێژ ئەکەم ئێوەش بەو شێوە نوێژ بکەن، ئەوە ئەگەیەنێت کە هەموو نوێژکەرێ (تسبیح و تحمید) کۆ بکاتەوەو بیلێت (واتە بلێت: سَمِعَ اللهُ لِمَن حَمِدَهُ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَلَكَ الحَمدُ) با مەئمومیش بێت، وە ئەو بەڵگەیەی کە ئەهێنرێتەوە لەسەر ئەوەی کە مەئموم ئەو دووانە نەڵێت، بەڵکو هەر (تحمید) بکات، وەڵامی ئەو بەڵگەیە ئەو قسەیەیە کە نەوەوی باسی ئەکاو ئەفەرمووێت: هاوەڵانی ئێمە فەرموویانە: واتای ئەوەیە بڵێن: (رَبَّنَا وَلَكَ الحَمدُ) لەگەڵ ئەوەشدا کە فێری بوون ئەویش (سَمِعَ اللهُ لِمَن حَمِدَهُ) یە، وە پێغەمبەر ﷺ بۆیە تەنها (رَبَّنَا وَلَكَ الحَمدُ) ی باس کردووە چونکە (سَمِعَ اللهُ لِمَن حَمِدَهُ) بە دەنگی بەرز لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەبیستن، چونکە سوننەت وایە دەنگی پێبەرز بکرێتەوە، بەڵام (رَبَّنا لَكَ الحَمدُ) یان نەئەبیست چونکی بە نهێنی ئەخوێنند. وە ئەو قسەی پێغەمبەریان ﷺ ﷺ ئەزانی کە فەرموویەتی: (من چۆن ئەبینن نوێژ ئەکەم بەو شێوەیە نوێژبکەن) لەگەڵ ئەوەدا بەشێوەیەکی گشتی چاویان لە پێغەمبەر ﷺ ئەکرد، وە ئیتر ئەوانیش (سَمِعَ اللهُ لِمَن حَمِدَهُ) کەیان ووتووە، ئیتر پێویستی نەکردووە فەرمانیان پێ بکات بە ووتنی، بەڵام (رَبَّنَا لَكَ الحَمدُ) چونکە بەنهێنی ووتوویەتی نەیان زانیوە، هەربۆیە فەرمانی پێ کردوون کە بیلێن، ئەو یادەش کەمترین یادە لەوکاتەدا ئەکرێت، کەسوپاس گوزاری خوای گەورەیە لەکاتی بەپێوە وەستاندا، وە موستەحەببە لەوە زیاتریش بووترێت بەوەی لەم (حدیث) انەی خوارەوەدا هاتووە:

(١) لە ڕیفاعەی کوڕی ڕافیعەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: ڕۆژێك لەدوای پێغەمبەرەوە ﷺ نوێژمان کرد کاتێ سەری بەرز کردەوە لە ڕکوع، فەرمووی: (سَمِعَ اللهُ لِمَن حَمِدَه) پیاوێك لەدوایەوە ووتی: (رَبَّنَا لَكَ الحَمدُ حَمداً كَثِيراً طَيِّباً مُبَارَكاً فِيهِ) واتە: پەروەردگارمان، ستایش هەر بۆتۆیە، ستایشێکی زۆرو پاکو پیرۆز، کە پێغەمبەر ﷺ سڵاوی دایەوە فەرمووی: ئەوە کێ بوو ئەوەی ووت؟ پیاوەکە ووتی: من بووم ئەی نێرراوی خوا! فەرمووی: بینیم سیوئەوەندە فریشتە پێش برکێیان دەکرد بۆ ئەوەی هەرکامیان فریا بکەوێت زوو بینوسێت. رواه أحمد والبخاري ومالك وأبو داود.

(٢) لە عەلییەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ سەری لە ڕکوع بەرز ئەکردەوە ئەیفەرموو: (سَمِعَ اللهُ لِمَن حَمِدَهُ رَبَّنَا وَلَكَ الحَمدُ مِلءَ السَّمٰوَاتِ وَالأرضِ وَمَا بَينَهُمَا، وَمِلءَ مَا شِئتَ مِن شَيئٍ بَعدُ) رواه أحمد ومسلم وأبوداود والترمذي. واتە: خوا وەڵامی کەسێکی دایەوە کە ستایشی کرد، پەروەردگارمان، ستایش هەر بۆ تۆیە، پڕی ئاسمانەکان و زەوی، وە پڕ بەنێوانیان، دوای ئەوە پڕ بەوەشی کە ئەتەوێ.

(٣) لە عبد الله ی کوڕی ئەبی ئەوفاوە هاتوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە کاتێ سەری بەرز ئەکردەوە لە ڕکوع ئەیفەرموو (وە لە لەفزێکدا دوعای ئەکرد) : (اللّٰهُمَّ لَكَ الحَمدُ مِلءَ السَّمَاءِ وَمِلءَ الأرضِ وَمِلءَ مَا شِئتَ مِن شَيئٍ بَعدُ، اللّٰهُمَّ طَهِّرنِي بِالثَّلجِ وَالبَرَدِ وَالمَاءِ البَارِدِ، اللّٰهُمَّ طَهِّرنِي مِنَ الذُّنُوبِ وَنَقِّنِي مِنهَا كَمَا ينقى الثَّوبُ الأبيَضُ مِنَ الوَسَخِ). رواه أحمد ومسلم وأبوداود وابن ماجة[1]. واتە خوایە پڕ بە ئاسمانەکان و زەوی، پاشان پڕ بە هەموو ئەو شتانەی خۆت ئەتەوێ سوپاسو ستایش بۆتۆ. خوایە پاکم بکەرەوە لەتاوانەکانم و بمشۆرە بەبەفرو تەرزەو ئاوی سارد، خوایە لەتاوانەکانم پاکم بکەرەوە هەروەك چۆن جلوبەرگی سپی لە چڵك و پۆخڵی پاك ئەکرێتەوە.

(٤) لە ئەبو سەعیدی خودریەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرموێت: کاتێ پێغەمبەر ﷺ ئەیفەرموو: (سمع الله لمن حمده) هەرکەس ستایشی خوا بکا خوا وەڵامی ئەداتەوە، ئەیفەرموو: (اللّٰهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الحَمدُ مِلءَ السَّمَوات وَمِلءَ الأرضِ وَمِلءَ مَا شِئتَ مِن شَيئٍ بَعدُ أهلَ الثَّنَاءِ وَالمَجدِ، أحَقُّ مَا قَالَ العَبدُ وَكُلُّنَا لَكَ عَبدٌ، لا مَانِعَ لِمَا أعطَيتَ، وَلا مُعطِيَ لِمَا مَنَعتَ، وَلا يَنفَعُ ذَا الجَدِّ، مِنكَ الجَدُّ) رواه مسلم وأحمد وأبو داود. واتە: خوایە پەروەردگاری ئێمە پڕ ئاسمانەکان و پڕ بەزەوی، دوایی پڕ بە هەرشتێك ویست و ئارەزووی خۆتی لەسەرە سوپاس و ستایش بۆتۆ: ئەی ئەو زاتەی شایستەی سوپاسو ستایشو بەرزیت، ئەمە ڕاسترین ووشەیە کە بەندەیەکت ئەیڵێت، وە هەموو بەندەی تۆین، خوایە هەرچی تۆ بیدەیت کەس بۆی ناگێڕرێتەوە، وە هەرچی تۆ نەیدەیت

---

(١) دوو تێبینی لەسەرە:

یەکەم: لە لای ئەبو داود و ئیبنو ماجە ووتەی (اللهم طهرني) تێدا نییە بەڵکو ئەمە زیادەیەکە لە هەندێ ڕێگاکان لەلای ئەوانی تر.

دووەم: ئەم زیادەیە لە هیچکام لە ڕێگاکان بە ڕاشکاوی پێغەمبەر ﷺ نافەرموێت: ئەمە لەکاتی هەستانەوەیە لە ڕکوع، بەڵکو ئەمە (مطلق)ە. وە لەفزەکەی لەلای موسلیم و ئەحمەد دەیفەرموو: (اللّٰهُمَّ لَكَ الحَمدُ... اللّٰهُمَّ طَهِّرنِي...) هەروەها (ترمذي ٤/٢٧٢) ئەم زیادەیەی گێڕاوەتەوە بەم شێوەیەو تەصحیحی کردووە جا بەستنەوەی بەوەی کە دوای هەستانەوەیە لە ڕکوع پێویستی بە بەڵگەیە، وە ڕستەی یەکەمی ئەم حەدیسە هاتووە لە کۆمەڵێك لە هاوەڵان بە چەند ڕێگایەکی صەحیح، لە هیچ کامیانا ئەم زیادەیەی تێدا نییە، بۆیە ئەوە تەرجیح و پارسەنگ دەکەین کە ئەمە لەو زیکرانە نییە کە لە دوای هەستانەوە لە ڕکوع دەخوێندرێت، بە پێچەوانەی ئەوەی پێشی، بەڵکو ئەمە دوعایەکی (مطلق)ە هەر بۆیە ئەم هێناوەتەوە لە زیکرەکانی ڕکوع لە کیتابەکەی خۆم (صفة صلاة النبي ﷺ) لە ترسی ئەوەی نەبادا شتێکی بۆ زیاد بکەم کە تێیدا نەبێت، هەرچەندە ئیبنوقەییم وای کردووە، وە ئەو دو کەسەش کە تەعلیقیان داوە لەسەر (زاد)ەکەی ئیبنوقەییم (١/٢٢١) ئاگاداری ئەمە نەبون، وەکو دانەرەکەی، جا وورد بەرەوە. (تمام المنة).

کەس بۆی نادرێت، هەوڵ و تێکۆشانی کەس سودی نی‌یە، چونکە ئەوانە بەبێ یاریدەی تۆ ناکرێن وەلای تۆوە دێن.

(٥) وە بە صەحیحی هاتووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە دوای ئەوەی ئەیفەرموو: (سَمِعَ اللهُ لِمَن حَمِدَهُ) ئەیفەرموو: (لِرَبِّيَ الحَمدُ، لِرَبِّيَ الحَمدُ) ستایش بۆ پەروەردگارمە ستایش بۆ پەروەردگارمە، هەتا وەستانەکەی ئەوەندەی ڕکوعەکەی لێ‌ئەهات.

١١- چۆنی‌یەتی دانەوینەوە بۆ سەجدەو بەرز بوونەوە لێی:

جومهوری زانایان بۆ ئەوە چوون کە دانانی هەردوو ئەژنۆ لەپێش هەردوو دەستا موستەحەبە، (ابن المنذر) ئەوە ئەگێڕێتەوە لە نەخەعی‌و موسلیمی کوڕی یەسارو سوفیانی (ثوري)و ئەحمەدو ئیسحاق‌و خاوەنانی ڕەئی، وە خۆی ووتوویەتی منیش فەتوا بەوە ئەدەم. تەواو.

وە (ابو الطيب) ئەڵێ لە تێکڕای زاناکانەوە ئەگێڕێتەوە. وە ئیبنو قەییم دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ هەردوو ئەژنۆی لە پێش هەردوو دەستیا دائەنا، لەپاشاندا ناوچاوانی‌و لووتی، ئەوە ئەو ڕاستی‌یەیە کە شورەیك لە عاصمی کوڕی کولەیب لەباوکی‌یەوە گێڕاویەتی‌یەوە لە وائیلی کوڕی حیجرەوە کە دەفەرمووێت: پێغەمبەرم ﷺ بینیوە کاتێ چۆتە سەجدە هەردوو ئەژنۆی لەپێش هەردوو دەستیا ئەنایە سەر زەوی، وەکاتێ هەڵئەستا دەستەکانی پێش ئەژنۆکانی بەرز ئەکردەوە، وە لەو بارەیەوە شتێك نەهاتووە پێچەوانەی ئەوە بێت. تەواو[1].

بەڵام مالیك و ئەوزاعی و ئیبنو حەزم بۆ موستەحەببێتی دانانی هەردوو دەست پێش هەردوو ئەژنۆ چوون، ئەمەش ڕیوایەتێکە لە ئەحمەدەوە، ئەوزاعی دەفەرمووێت : گەیشتوومە خەڵکی دەستیان پێش ئەژنۆیان ئەنایە سەر زەوی، ئیبنو ئەبی داود دەفەرمووێت: ئەمە قسەی ئەهلی (حدیث)ە[2].

بەڵام چۆنی‌یەتی بەرز بوونەوە لەرکاتی دووەم و هەڵسانەوە، زانایان هەرجیاوازیان هەیە لەسەری، جا ئەوەی لای جومهور موستەحەب بێت ئەوەیە دەست پێش ئەژنۆ بەرز بکرێتەوە، بەڵام لای جگە لەوان لەپێشدا ئەژنۆ بەرز بکرێتەوە لەپاشاندا دەست[3].

١٢- شێوەی سەجدە بردن:

---

(١) ئەو نەفی کردنە لە وەهمەکانی دانەرە ڕەحمەتی خوای لێ بێت، وە هەر بۆ خۆی لە دووای نزیکەی دوو لاپەڕە حەدیسەکەی ئیبنوعومەر ئەهێنێ، بۆ زیاتر ڕوون کردنەوە بڕوانە (تمام المنة ١٩٣-٢٠٧).

(٢) هەرئەوە ڕاستە، چونکە بەکردەوەو فەرمان (ثابت) بووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ.

(٣) دووەمیان هەق‌و ڕاستە بەپێی (حدیث) ەکەی مالیکی کوڕی (حويرث).

ئەو نوێژکەرەی ئەیەوێ بچێتە سەجدەوە موستەحەببە ڕەچاوی ئەمانەی خوارەوە بکات:

أ- هەردوو دەست و لووت و ناوچاوان لەزەوی جێگیر بکاتەو باڵەکانی لەخۆی دوور بخاتەوە، لەوائیلی کوڕی حیجرەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ سەجدەی ئەبرد نێوچاوانی لەنێوان هەردوو دەستیا ئەنایەسەر زەوی و قۆڵەکانی لەخۆی دوور ئەخستەوە. ئەبوداود گێڕاویەتی‌یەوە.

لە ئەبو حومەیدەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ سەجدەی ئەبرد لوتەو نێوچەوانی لەزەوی داگیر ئەکرد، وە هەردووباڵی دوور ئەخستەوە لەخۆی، وە هەردوو لەپی دەستی لەڕێکی شانیا دائەنا. ئیبنو خوزەیمەو (ترمذي) گێڕاویانەتەوە، وە (ترمذي) دەفەرموێت (حسنٌ صحيح)ە.

ب- دانانی هەردوو دەست لەڕێکی هەردوو گوێ، یان لە ڕێکی هەردوو شاندا لەسەر زەوی، چونکە هەردوو شێوەکە هاتووە لەپێغەمبەرەوە ﷺ وە هەندێ لەزانایان ئەو دوو ریوایەتەیان یەك خستووە بەوەی سەری هەردوو پەنجە گەورە لەڕێکی گوێکانیداو لەپی دەست لە ڕێکی شانەکاندا دابنێت.

ج - پەنجەکان جووت بکاتەو لەسەر زەوی ڕایان بخات، لای حاکیمو ئیبنوحیببان هاتووە: پێغەمبەر ﷺ کاتێ ئەچووە ڕکوعەوە پەنجەکانی بڵاو ئەکردەوە، وە کاتێ‌سەجدەی ئەبرد پەنجەکانی جووت ئەکرد.

د- سەری پەنجەکان بەرەو قیبلە بکات، لەلای بوخاری لە حەدیسی ئەبو حومەیدەوە هاتوە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ سەجدەی ئەبرد دەستەکانی بەشێوەیەك دائەنا نە ڕای ئەخستن نە ئەی نووقاندن، وەسەری پەنجەکانی هەردوو پێی بەرەو قیبلە ئەکرد.

**١٣- ماوەی سەجدە بردن و زیکرەکانی:**

کاتێ کەسێ لەنوێژدا سەجدە ئەبات موستەحەببە لەسەجدەکەیدا بڵێت: (سُبحَانَ رَبِّيَ الأعلى)، لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرموێت: کاتێ ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى﴾ هاتەخوار پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (إجعَلُوهَا فِي سُجُودِكُم) رواه أحمد وأبوداود وابن ماجة والحاكم وسنده جيد. واتە: لە سەجدەکانتاندا بیڵێن[1].

---

(١) ئەمە تەواوکەری (حديث)ەکەی پێشووە، وە لەوێ ڕوونمان کردەوە کە سەنەدەکەی زەعیفە جا بیهێنەوە بیر (تمام المنة).

له (حذيفة) ەوە هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ لەسەجدەدا ئەیفەرموو: (سُبحَانَ رَبِّيَ الأعلى) ئەحمەدو موسلیمو خاوەن سونەنەكان گێڕاویانەتەوە، (ترمذي) دەفەرمووێت: (حسنٌ صحيح).

وە پێویستە ئەو زیکرانە لە ڕكوع و سجوددا سێ جار كەمتر نەبێت. (ترمذي) دەفەرمووێت: زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوە كاریان كردووە و بە موستەحەبیان داناوە پیاو لەسێ جار كەمتر تەسبیح نەڵێت. تەواو.

بەڵام جومهوری زانایان دایان ناوە لایەنی كەمی ئەو زیكرانە لە ڕكوع و سجوددا یەكجار بێت، وە لەپێشەوە ووتمان: ئارامی (طمأنينة) فەرزەو ماوەكەی یەكجار ووتنی (سبحان الله) یە، بەڵام لایەنی تەواوەتی ئەو زیکرانە زانایان ئەڵێن دە جار بووترێ. بەپێی ئەوەی سەعیدی كوڕی جوبەیر لە ئەنەسەوە ئەگێڕێتەوە دەفەرمووێت: كەسم نەبینیوە ئەوەندەی ئەو غولامە لە نوێژەكانیدا لەپێغەمبەر ﷺ بچێت، مەبەستی عومەری كوڕی عبدالعزیز بووە، ڕكوع و سجودەكەیمان ئەندازەگرت دە تەسبیحات بوو، ئەحمەدو ئەبوداوودو نەسائی بە ئیسنادێكی (جيد) گێڕاویانەتەوە[1].

شەوكانی دەفەرمووێت: ئەڵێن ئەو (حديث)ە بەڵگەیە بۆ ئەوانەی ئەڵێن: تەسبیحاتی تەواوەتی لە ڕكوع و سجوددا دەجار ووتنی‌یەتی، وە ڕاست ئەوەیە نوێژكەری تەنها بەئارەزووی خۆی ئەتوانێ بەزیادەوە بیانڵێت، وە هەتا زیاد بیانڵێت باشترە، وە (حديث)ە صەحیحەكان كە لەبارەی درێژكردنەوەی نوێژی پێغەمبەرەوە هاتوون ﷺ دان بەمەدا ئەنێن. وە هەروەها ئیمام بۆی هەیە درێژیان بكاتەوە، ئەگەر بزانێت ئەوانەی لەدوایەوە نوێژ ئەكەن بەو درێژكردنەوەیە ئازاریان پێ ناگات، تەواو.

(ابن عبد البر) دەفەرمووێت: پێویستە لەسەر هەموو ئیمامێك نوێژەكانی كورت بكاتەوەو زۆر درێژەی پێ نەدات، لەبەر فەرمانەكەی پێغەمبەر ﷺ بابشزانێ كە مەئمومەكانی هێزو توانایی‌یان چەندە، چونكە ئەو نازانێ چ ڕووداوێكیان بەسەرا دێت، یا چ كار و پێویستی‌یەك و شتی تر كە ڕێگرە دێتە پێشەوە.

ئیبنو موبارەك دەفەرمووێت: موستەحەبە بۆ ئیمام پێنج جار ئەو تەسبیحاتە بكات بۆ ئەوەی ئەوانەی دوایەوە فریای سێ تەسبیحات بكەون، وە موستەحەبە نوێژكەر تەنها تەسبیحات نەكات

---

(١) ئەو (حديث)ە چاو پیاخشاندنەوەی ئەوێ چونكە خولگەی (حديث)ەكە لەسەر وەهەبی كوڕی مانوسە جگە لە ئیبنوحیببان كەس بەجێی بڕوای دانەناوە، هەربۆیە (ابن القطان) دەفەرمووێت: (مجهول الحال) وە (حافظ) ئیبنو حەجەر دەفەرمووێت: (مستور)ە. (تمام المنة).

بەڵکو پاڕانەوەشی بخاتە پاڵ، لە (حدیث)ی صەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أقرَبُ مَا يَكُونُ أحَدُكُم مِن رَبِّهِ وَهُوَ سَاجِدٌ، فَأكثِرُوا فِيهِ مِنَ الدُّعَاءِ) واتە: هیچ کاتێك کەستان وەك کاتی سەجدە بردن لەخواوە نزیك نییە، جالەوکاتەدا زۆر لەخوا بپاڕێنەوە، هەروەها فەرموویەتی: (ألا إنِّي نُهِيتُ أن أقرَأ رَاكِعاً أو سَاجِداً. فَأمَّا الرُّكُوعُ فَعَظِّمُوا فِيهِ الرَّبَّ، وَأمَّا السُّجُودُ فَاجتَهِدُوا فِي الدُّعَاءِ فقَمِنٌ أن يُستَجَابَ لَكُم) رواه أحمد ومسلم. واتە: ئاگاداربن من لێم قەدەغە کراوە لە ڕکوع و سجوددا قوڕئان بخوێنم، جا بۆیە لە ڕکوعدا خوا بەگەورە بزانن ـ واتە: بڵێن (سبحان ربي العظيم) ـ وە لەسجوددا زۆر بپاڕێنەوە چونکە بەوشێوەیە شایستەیە پاڕانەوەکەتان وەربگیرێت.

وە لەو بارەیەوە (حدیث)ی زۆر هاتووە وا لەخوارەوە باسیان ئەکەین:

أ- لە عەلی‌یەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ لە سجوددا ئەیفەرموو: (اللَّهُمَّ لَكَ سَجَدتُ، وَبِكَ آمَنتُ، وَلَكَ أسلَمتُ، سَجَدَ وَجهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ فَصَوَّرَهُ فَأحسَنَ صُوَرَهُ، فَشَقَّ سَمعَهُ وَبَصَرَهُ، فَتَبَارَكَ اللهُ أحسَنُ الخَالِقِين) رواه أحمد ومسلم. واتە: خوایە بۆ تۆ سەجدەم بردووە، وە بەتۆ باوەڕم هێناوە، وە خۆم سپاردووە بەتۆ، من ڕووم بۆ ئەوە زاتە ناوەتە زەوی کە دروستی کردووەو وێنەی کێشاوە بەجوانترین شێوە، وە گوێو چاوی لێ دەرهێناوە، زۆرە خێرو بەرەکەتی خوا، کە چاکترین بەدیهێنەرە.

ب- ئیبنو عەبباس باسی شێوەی شەونوێژی پێغەمبەری ﷺ کردووە دەفەرمووێت: لەپاشاندا چووەتە دەر بۆ نوێژو دەستی کردووە بەنوێژ کردن، لە نوێژەکەیدا لە سجودیدا ئەیفەرموو: (اللَّهُمَّ اجعَل فِي قَلبِـي نُوراً، وَفِي سَمعِي نُوراً، وَفِي بَصَرِي نُوراً، وَعن يَمِينِي نُوراً، وَعَن يَسَارِي نُوراً، وَأمَامِي نُوراً، وَخَلفِي نُوراً، وَفَوقِي نُوراً، وَتَحتِي نُوراً، وَاجعَلنِي نُوراً) قَالَ شُعبَةُ: أو قَالَ: (اجعَل لِي نُوراً) رواه مسلم وأحمد وغيرهما. واتە: خوایە ڕۆشنایی بخەیتە ناو دڵو گوێو چاوو لای ڕاستو چەپمەوە، وەلای پێشو پاشم، وەلای سەرووم‌و خوارووم، خوایە بمکە بە ڕۆشنایی‌یە، شوعبە ئەڵێ: یا فەرموویەتی: خوایە ڕۆشنایی‌یەکم بۆ بگێڕە. ئیمام نەوەوی دەفەرمووێت: زانایان فەرموویانە: پێغەمبەر ﷺ داوای ڕوشنایی کردووە بۆ هەموو ئەندامەکانی لەشی‌و هەڵسو کەوتی‌و شێوەی و گشت شتێکی، وە بۆ هەرشەش لای هەتا هیچ شتێك لەولایانەوە نادیار نەبێت لێی‌و تووشی خواری نەبێت.

ج - لە عائیشەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: شەوێك لەجێگادا پێغەمبەرم ﷺ لێ وون بوو، تاریك بوو دەستم بۆ کوتا دەستم بەری کەوت لەسەجدەدا بوو ئەیفەرموو: (رَبِّ أعطِ نَفسِي تَقوَاهَا وَزَكِّهَا أنتَ خَيرُ مَن زَكَّاهَا، أنتَ وَلِيُّهَا وَمَولاهَا) رواه أحمد. واتە: خوایە تەقوا

ببەخشە بەدەروونەو پاکی بکەرەوە، تۆ چاکترین پاك کەرەوەی بۆ پاك کردنەوەی دەروونم، هەرتۆ سەرپەرشتیکەرو گەورەی دەروونی منی[1].

د- لە ئەبوهورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ لەسجوددا ئەیفەرموو: (اللَّهُمَّ اغفِر لِي ذَنبِي كُلَّهُ، دِقَّهُ وَجُلَّهُ وَأوَّلَهُ وَآخِرَهُ، وَعَلانِيَّتَهُ وَسِرَّهُ) رواه مسلم وأبوداود والحاكم. واتە خوایە لەهەموو تاوانەکانم ببوورە، لەبچووكو گەورەیان، لە ئەووەڵو ئاخریان، لە ئاشکراو نهێنیریان.

ه – لە عائیشەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: شەوێکیان پێغەمبەرم ﷺ لێ وون بوبو دەستم بۆ کوتا سەیرم کرد لە مزگەوت نوێژی ئەکرد و لە سجوددا بوو، هەردوو پێی هەڵنابوو ئەیفەرموو: (اللَّهُمَّ إنِّي أعُوذُ بِرِضَاكَ مِن سَخَطِكَ، وَأعُوذُ بِمُعَافَاتِكَ مِن عُقُوبَتِكَ، وَأعُوذُ بِكَ مِنكَ لا أُحصِي ثَنَاءً عَلَيكَ أنتَ كَمَا أثنَيتَ على نَفسِكَ) رواه مسلم وأصحاب السنن. واتە: خوایە پەنا ئەگرم بەڕەزامەندیت لەخەشمو قینت، وەپەنا ئەگرم بە لێبوردنەکانت لە تۆڵەو سزاکانت، وە پەنا ئەگرم بە تۆ لە خۆت، تۆ چۆن ستایشی خۆتت کردووە هەر وای ، من هەرگیز ناتوانم بەو شێوەیە ستایشی تۆ بکەم.

و – هەر لەعائیشەوە هاتووە: کە شەوێك پێغەمبەری ﷺ لێ وون ئەبێت لەجێگەدا، وائەزانێ بەجێی هێشتووەو چووە بۆلای یەکێ لە خێزانەکانی تری، گوێی بۆ هەڵئەخا کاتێ ئەیدۆزێتەوە لە ڕکوعدا یا لە سجوددا ئەبێت ئەفەرمووێت: (سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ لا إلَهَ إلا أنتَ) رواه أحمد ومسلم والنسائي. واتە: خوایە پاکو بێگەردی بۆ تۆیە سوپاس و ستایشیش شایستەی تۆیە، هیچ مەعبودێکی حەق نییە شایستەی عیبادەت بێ جگە لەتۆ، جا عائیشە پێی ووت: دایکمو باوکم فیدات بێ، بەڕاستی من لەحاڵێکدام و تۆش لەحاڵێکی تر.

ز – پێغەمبەر ﷺ لەسجوددا فەرموویەتی: (اللَّهُمَّ اغفِر لِي خَطِيئَتِي وَجَهلِي، وَإسرَافِي فِي أمرِي، وَمَا أنتَ أعلَمُ بِهِ مِنِّي، اللَّهُمَّ اغفِر لِي جَدِّي وَهَزلِي، وَخَطَئِي وَعَمدِي، وَكُلُّ ذَلِكَ عِندِي، اللَّهُمَّ اغفِر لِي مَا قَدَّمتُ وَمَا أخَّرتُ، وَمَا أسرَرتُ وَمَا أعلَنتُ، أنتَ إلَهِي لا إلَهَ إلا أنتَ)[2] واتە:

---

(١) ئیسنادەکەی زەعیفە چونکە صالحی کوری سەعیدی تێدایە جگە لە نافیع کەس ریوایەتی لێ نەکردووە کەس نای ناسێت. هەرچەندە ئیبنوحیببان بەجێگەی بڕوای داناوە، وە ئەوەی لەم بارەیەوە ڕاستە جۆری (ه ـ و)ە کە لەم کتێبەدا هاتووە، دانەر شوێن ئیبنو قەییم کەوتووە بەوشێوەیە هێناونی بێ ئەوەی بیان داتە پاڵ کەس، وە بەشی کۆتایی (حدیث)ەکە لاوازە چونکە لای بوخاری و موسلیم بەشێوەیەکی تر هاتووە (تمام المنة).

(٢) بەم شێوەیە دانەر هێناویەتی بێ ئەوەی بیداتە پاڵ هیچ کەسێك، هەروەك بڵێیت دووای ابن القیم کەوتووە لەمەدا، چونکە ئاوها لە (زاد المعاد) دا هێناویەتی وە بڕوا ناکەم کەس بەم شێوەیە دوعای سجودی هێنابێ، وە کەسم نەدیووە هێنابێتی جگە لە ئیبنو قەییم، وە باوەڕم وایە ئەمە لە ئەوهامەکانی ئیبنو قەییمە، حەدیسەکە

خوایه له هەڵەو نەزانی و زیادەڕەوی کارم ببووره، هەروەها لەوانەش کە تۆ زاناتری پێیان لە من، خوایە لە تاوانەکانم ببوورە لە ڕاستیەو لە گاڵتەم، لە هەڵەم و لە قەستم، وە من ئەوانەم هەموو کردووە، خوایە لەو تاوانانەی پێشم خستوەو دوام خستوە وە ئەوەی بە نهێنیو ئاشکرام کردومە، خوایە تۆ مەعبودی منی، هیچ مەعبودێکی حەق نی‌یە جگە لەتۆ.

١٤- شێوەی دانیشتنی نێوان دوو سەجدەکە:

سوننەت لەدانیشتنی نێوان دوو سەجدەکەدا ئەوەیە قاچی چەپ ڕابخرێتو لەسەری دابنیشرێتو قاچی ڕاست هەڵبنرێت بەشێوەیەك سەری پەنجەکانی ئەو پێ‌یە بەرەو قیبلە بکرێن.

لە عائیشەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ قاچی چەپی دائەناو قاچی ڕاستی هەڵئەنا، بوخاری[1] و موسلیم گێڕاویانەتەوە.

لە ئیبنو عومەرەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: قاچی ڕاست هەڵنانو پەنجەکان کردنە قیبلەو قاچی چەپ دانانو لەسەری دانیشتن لە سوننەتەکانی نوێژن. نەسائی گێڕاویەتی‌یەوە.

نافیع دەفەرمووێت: کاتێ ئیبنو عومەر نوێژی ئەکرد هەموو شتێکی ئەکردە قیبلە هەتا نەعلەکانیشی. (أثرم) گێڕاویەتی‌یەوە.

وە لە (حدیث)ەکەی ئەبو حومەیدا هاتووە دەربارەی شێوەی نوێژی پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: لەپاشاندا پێی چەپی لار کردۆتەوەو لەسەری دانیشتووە، دوای ئەوە ڕێك بۆتەوە هەتا

---

شەیخەین گێڕاویانەتەوە لە صەحیحەکەی خۆیاندا، لە حەدیسی ئەبو موسای ئەشعەری‌یەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ بەم دوعایە دوعای دەکرد، جا حەدیسەکەی بە درێژی باس کرد، بەڵام ئەمەی فەرموو: (أنتَ المُقَدِّمُ وَأنتَ المُؤَخِّرُ وَأنتَ على كُلِّ شيئٍ قَدِير) لە جیاتی (أنتَ إلَهي لا إله إلا أنتَ) بەم شێوەیە تەخریجی کردووە بە (مطلق) ی بەبێ بەستنەوە بە سجودەوە، وە (حافظ) لە شەرحەکەیدا (١١/١٦٤) دەفەرمووێت: لە هیچ کام ڕێگاکانی شێوەی دووعا کردن بەم شێوەیەم نەبینیوە.

وە بەشی تەخیری حەدیسەکە هاتووە بە (مقید) ی لە دوای سەلام دانەوە، وە لە ریوایەتێکدا: نێوان تحییات و سەلام دانەوە، وە دانەر لە شوێنی خۆی باسی لێوە کردووە.

وە لەم بارەوە چەند زیکر و دوعایەك دەبینی لە (صفة صلاة النبـي ١٥٣-١٥٦) دا. (تمام المنة).

(١) گێڕانەوەی بۆلای بوخاری شتێکی هەڵەیە لەبەر ئەوەی ئەم ریوایەتە لە تاکە ریوایەتەکانی موسلیمە وە تەخریج کراوە لە (الإرواء٣١٦)دا و (صحیح أبي داود ٧٥٢) و عیللەتێکی تێدایە لەوێدا وەڵامم داوەتەوە و ڕوونم کردۆتەوە. (تمام المنة).

هەموو جومگەکانی لە جوڵە وەستاوون ئینجا چۆتە سەجدەوە. ئەحمەدو ئەبوداود و (ترمذي) گێڕاویانەتەوە، وە (ترمذي) بەصەحیحی داناوە.

وە شێوەیەکی تریش هاتووەو موستەحەببە کە پێی ئەڵێن: (الإقعاء) ئەویش هەڵنانی هەردوو پێیەو دانیشتنە لەسەر پاژنەکانیان، ئەبو عوبەیدە دەفەرموێت: ئەوە قسەی ئەهلی (حديث)ە.

لە ئەبو زوبەیرەوە هاتووە کە خۆی گوێی لە (طاوس) بووە فەرموویەتی: لە ئیبنوعەبباسمان پرسی دەربارەی (إقعاء) فەرمووی: ئەوە سوننەتە، ئێمەش وتمان: ئێمە وائەزانین کە (إقعاء) خۆ ماندوکردنی تێدایە، فەرمووی: ئەوە سوننەتی پێغەمبەرتە ﷺ، موسلیم گێڕاویەتیەوە.

لە ئیبنوعومەرەوە ڕەزای خوایان لەسەر بێت هاتوە کە: کاتێك سەری بەرز ئەکردەوە لە سەجدەی یەکەم لەسەر ئەم لاو ئەولای پەنجەکانی دائەنیشت و ئەیفەرموو: ئەوە سوننەتە.

وە هەر لە (طاوس)ەوە هاتوە کە فەرمویەتی: لە (عبدالله)کانم بینی ـ مەبەستی عبدالله ی کوڕی عەبباس و عبدالله ی کوڕی عومەر و عبدالله ی کوڕی زوبەیرە ـ (إقعاء) یان کردووە، قاچیان هەڵناوەو لەسەر پاژنەکانی پێیان دانیشتوون لەنوێژدا. بەیهەقی ریوایەتی کردووە. (حافظ) دەفەرموێت: ئیسنادەکەی ئەم دووانە صەحیحە.

بەڵام (الإقعاء) ـ بە واتای دانانی هەردوو سمت لەسەر زەوی و بەرز کردنەوەی هەردوو ڕان لەسەر زەوی ـ ئەوە مەکروهە، کەراهەتی هەیە بەرای هەموو زانایان. لە ئەبو هورەیرەوە هاتوە کە دەفەرموێت: «پێغەمبەر ﷺ سێ شتی لێ قەدەغە کردووم لە نوێژدا، دەنوك دان بەزەویدا وەك کەڵەشێرو، چیچکەکردنی سەگ، و ئاوڕدانەوە وەك ئاوڕدانەوەی ڕێوی»، ئەحمەدو بەیهەقیو (طبراني) و ئەبو یەعلا گێڕاویانەتەوە وە سەنەدەکەشی حەسەنە.

وە موستەحەببە کاتی دانیشتنی نێوان دوو سەجدەکە، دەستی ڕاست لەسەر ڕانی ڕاستو دەستی چەپ لەسەر ڕانی چەپ دابنرێت، بەشێوەیەك کەراخرابنو پەنجەکان کەمێك لێك جیا بن، وە سەری پەنجەکان ڕێکی سەری ئەژنۆکان بن بەرەو قیبلە.

دوعا کردن لەنێوان دوو سەجدەکەدا:

موستەحەببە لەنێوان دووسەجدەکەدا بەیەکێ لەم شێوانەی خوارەوە دوعا بکرێو چەندجار دووبارە بکرێتەوە ئەگەر کەسێك بیەوێ، نەسائیو ئیبنو ماجە لە حوزەیفەوە ئەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ لەدانیشتنی نێوان دوو سەجدەکەدا ئەیفەرموو: (رَبِّ اغفِر لِي، رَبِّ اغفِر لِي) واتە: پەروەردگارم لێم خۆشبە.

ئەبو داود لەئیبنو عەبباسەوە ئەگێڕێتەوە خوا لێیان ڕازی بێت دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ لەدانیشتنی نێوان دووسەجدەکەیدا ئەیفەرموو: (اللَّهُمَّ اغفِر لِي وَارحَمنِي وَعَافِنِي وَاهدِنِي وَارزُقنِي) واتە: خوایە! لێم خۆشبەو ڕەحم پێ بکەو سەلامەتم بکەو هیدایەتم بدەو ڕۆزیم بدە. (ترمذي) ریوایەتی کردووە، وە لەباتی (وعافني) (واجبرني) هاتووە واتە پاداشم بدەرەوە.

**١٥- دانیشتنی ئیستراحەت:**

دانیشتنێکی سووك و کەمە نوێژکەر ئەنجامی دەدات لەدوای لێبوونەوەی لە سەجدەی دووەم، لە ڕکاتی یەکەمدا، بەر لە هەڵسانەوە بۆ ڕکاتی دووەم، وە لە دوای لێ بوونەوە لە سەجدەی دووەم، لە ڕکاتی سێهەمدا، بەر لە هەڵسانەوە بۆ ڕکاتی چوارەم.

زانایان لەسەر حوکمی ئەم دانیشتنە جیاوازی ڕایان هەیە، بەپێی جیاوازی ئەو (حدیث)انەی لەوبارەیەوە هاتوون، وە ئێمە ئەو قسەیە ئەهێنین کە ئیبنو قەییم لەوبارەوە هێناویەتی، ئەفەرمووێت: زانایان لەم بارەیەوە جیاوازیان هەیە کە ئایا ئەو دانیشتنە لە سوننەتەکانی نوێژەو بۆ هەموو کەس موستەحەببە بیکات، یا لە سوننەتەکانی نوێژ نیەو تەنها ئەوانە بیکەن کە پێویستیان پێی هەیە؟[1] ئەمەش لەسەر دوو قەولە کە لە ئیمام ئەحمەدەوە هاتووە، خەللال دەفەرمووێت: ئەحمەد گەڕاوەتەوە سەر (حدیث)ەکەی مالیکی کوڕی (حویرث) لەبارەی دانیشتنی ئیستراحەتەوە وە دەفەرمووێت : یوسفی کوڕی موسا پێی ڕاگەیاندم، پرسیار لە ئەبوئومامە کرا

(١) ئەمە ئەوە دەرئەخات لەم بەشەدا چەند (حدیث) ی (معارض) بەیەك هاتووە، بەڵام وا نیەیە هەموویان ئەوە (ثابت) دەکەن، وە بە (مطلق) ی هیچ حەدیسێك نەهاتووە نفی کات، تەنها ئەوەندەیە کە لە هەندێ حەدیس باسی لێوە نەکراوە، وە ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە ئەو ئیختیلافە هەبێت، ئەگینا دروست دەبوو کە ئەوە دەرحەق بە هەموو سوننەتێك بووترێت کە حەدیسەکان لەسەری پێك نەهاتوون، وە ئەمە هیچ کەسێك نایڵێت (تمام المنة).

دەربارەی هەڵسانەوە بۆ ڕکاتی دووەم؟ فەرمووی: لەسەر سنگی هەردوو پێ[1] هەڵدەستێتەوە بەپێی (حدیث)ەکەی ریفاعە[2].

له (حدیث)ەکەی ئیبنو عەجلاندا بەڵگەی ئەوە هەیە کە هەڵسانەوە لەسەر سنگی پێ ئەبێت[3]. وە چەند کەس لەیارەکانی پێغەمبەر ﷺ وەصفی نوێژەکانی پێغەمبەریان گێڕاوەتەوە، وە هەروەها هەموو ئەوکەسانەی کە وەصفی نوێژی ئەویان کردووە کەسیان باسی ئەو دانیشتنەیان نەکردووە،

(١) ظاهری سیاق ی ئەم ووتەیە لە (الزاد)دا مەبەست بە ئەبو ئومامە ئیمامی ئەحمەدە، ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت وە لە هیچ کامێك لە کیتابەکانی (تراجم)دا نەم بینی کە ئیمامی ئەحمەد پێی بووترێت ئەبو ئومامە، یان منداڵێکی هەبێت پێی بووترێت ئومامە.

پاشان لە پەراوێزی نوسخەی هیندی لە (الزاد) دا بینیم نووسرابوو: (لە نوسخەیەکدا ئەبا عبد الله جا ڕەنگ بێت ئەمە ڕاست بێت).

(٢) مەبەستی حەدیسی ریفاعەی کوڕی رافیع، عبد الله ی کوڕی ئیمام ئەحمەدەکە لە مەسائیلەکانی (٨١/٢٨٦) دا دەفەرمووێت: گوێم لە باوکم بوو دەیفەرموو: ئەگەر پیاوێك بۆچوونی بۆ حەدیسی مالیکی کوڕی (حویرث) بێت ـ واتە بە لاوازی ئەزانێت ـ تکام وایە هیچ شتێکی تێدا نەبێت.

پاشان باسی دانیشتنی ئیستراحەتی کردو فەرمووی: حەممادی کوڕی زەید دەیکرد و دەفەرمووێت: منیش بۆچوونم بۆ حەدیسی ریفاعەی کوڕی رافیع لە ڕێگای ئیبنو عەجلانە: پاشان سەجدە بەرە تاوەکو دڵنیا دەبێت سەجدەت بردووە، پاشان هەڵسە، تا دڵنیا ئەبیت کە دانیشتوی، پاشان سەجدە بەرەوە تاوەکو دڵنیا ئەبیت کە سەجدەت بردوە، پاشان هەڵسە، منیش دەڵێم: ئەمە هیچ بەڵگەیەکی تێدا نییە لە نەفی کردنی ئەوەی سابت بووە لە حەدیسی (ابن الحویرث) و جگە لەم، چونکە ئەوپەڕی شتێك کە تێیدایە ئەوەیە دانیشتنی تێدا باس نەکراوە، وە ئەمە سوننەتە نەك واجب، ئیتر چۆن باس دەکرێت لە حەدیسی ئەو کابرایەی کە نوێژەکەی بە خراپی کرد، کە پێغەمبەر ﷺ لەوێدا فێری واجبەکانی کردووە نەك سوننەتەکان و موستەحەببەکان، بگەڕێوە بۆ مجموع (٣/٤٤٣)، جا وەك بڵێی لەبەر لاوازی ئەم بەڵگەیە ئیمامی ئەحمەد گەڕاوەتەوە بۆ حەدیسی (ابن الحویرث) کە ئەمە حەقەو گومانی تێدا نییە. (تمام المنة).

(٣) ئەگەر مەبەستی (حدیث)ەکەی ئیبنو عەجلان لە ریفاعەوە بێت کە باس کرا، لە ریوایەتی عبدالله لە ئەحمەدەوە کە لە پێشەوە هات، ئەو باسی هەڵسانەوەی تێدا نییە، پاشان ئەو لە فێر کردنی پێغەمبەرەوە ﷺ بۆ ئەو کابرایەی کە نوێژەکەی بە هەڵە کرد، نەك لە کرداری، وەك باس کرا، وە ئەگەر مەبەستی جگە لەمە بێت ئەوە من نایزانم، وە لەسەر ووتەی یەکەم عیبارەتەکە (مشکل)ە لەبەر ئەوەی ئەوە دەگەیەنێت کە حەدیسی ریفاعە غەیری حەدیسی ئیبنو عەجلانە، لەگەڵ ئەوەی کە هەردووکیان یەك حەدیسە، جا وورد بەرەوە.

بەڵکو تەنها لە (حدیث)ەکەی ئەبو حومەیدو مالیکی کوڕی (حویرث) دا باس کراوە[1] جا ئەگەر ئەوکارە ڕەفتاری هەمیشەیی پێغەمبەر ﷺ بووایە هەموو ئەوانەی وەصفی چۆنیەتی نوێژەکەیان کردووە باسیان ئەکرد[2].

وە تەنها بە کردنی ئەوکارە لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ نابێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە یەکێکە لەسوننەتەکانی نوێژ، هەتا نەزانرێت ئەو کارەی بەسوننەت کردووە بۆ ئەوەی چاوی لێ بکرێت، بەڵام ئەگەر وادانرێ لەبەر پێویستیەک کردبێتی ئەوە نابێتە سوننەتێك لەسوننەتەکانی نوێژ[3].

---

(١) (حدیث)ەکەی ئەبو حومەید کە وەصفی نوێژی پێغەمبەر ﷺ ئەکات -بەو دانیشتنەشەوە- بە ئامادە بوونی دە صەحابە بووە، لە ئاخری حەدیسەکە هەموویان ووتوویانە ڕاست ئەکەی.

(٢) ئەو قسەیە لە ئیمامێکی واوە غەریبە چونکە ئەوە ئاسان گرتنی هەموو سوننەتەکان ئەگەیەنێت، لەبەر ئەوە سوننەتێك نیە بتوانرێت بووترێت: هەموو ئەوانەی چۆنیەتی نوێژی پێغەمبەریان باس کردووە پێك هاتوون لە باس کردنی، وە ئەوەی کە ڕەچاو کردنێکی تایبەتی هەبێت بە شوێن کەوتنی سوننەتەکان و ڕێگاکانی، ئەمە ئەزانێ، وە من سوێند بە خوا نازانم چۆن دانەر ووتەیەکی ئاوا باس دەکات و بەسەریدا دەڕوات بەبێ ئەوەی تەعلیقێکی لەسەر بدات، کە دەلالەت بکاتە ئەوەی هەڵەی تێدایە، کە ئەمە دەلالەت دەکاتە سەر ڕازی بوونی، جا بڕوانە چۆن ئاسان گرتنی سوننەتەکان ئەگەیەنێت، کە دانەر لە کتێبەکەیدا باسی کردووە، بۆ نمونە دانانی دەستی ڕاست لەسەر چەپ و دوعای دەست پێ کردن و پەنا بردن و ئامین کردن و خوێندن و زیکر کردن لە سجود و صەلاوەت دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ و سەرجەم ئەم نۆ سوننەتە، ئەبو حومەید و ئەوانەی کە لەگەڵێن لە هاوەڵان باسیان نەکردووە لە چۆنیەتی نوێژی پێغەمبەر ﷺ دا، هەروەها جگە لەمانیش باسیان نەکردووە، ئایا ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو سوننەتانە ڕەد بکرێتەوە؟ خوایە ئاگاداربە نەخێر، بۆیە (حافظ) لە فەتحدا ئەم ووتەیەی ئیبنو قەییمی ڕەد داوەتەوە بە ووتەی:

ئەمە تێڕووانینی لەسەرە چونکە ئەو سوننەتانەی کە پێك هاتنی لەسەرە هەموو یەکێك لەوانە وەریان نەگرتووە، بەڵکو کۆمەڵێکیان لە کۆمەڵێکی وەرگرتووە، وە وێنەی ئەمە شەوکانی (٢/٢٢٦) باسی لێوە کردووە کە ئەمە حەقە و گومانی تێدا نیە (تمام المنة).

(٣) ئێمە ئەوەمان زانی کە کردنی لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ بۆ تەشریع و سوننەت بوو لە چەند ڕوویەکەوە:

یەکەم: یەکەم ئەصل و بنەما ئەبوونی عیللەتە، جا هەرکەسێك پاگەندەی بۆ دەکات دەبێ بیسەلمێنێ.

دووەم: یەکێ لە ڕاوی ئەم سوننەتە مالیکی کوڕی (حویرث)ە، کە ئەو ڕاوی (حدیث)ی (صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي) یە جا گێڕاوەنەوەی بۆ چۆنیەتی نوێژی پێغەمبەر ﷺ دەچێتە ژێر ئەم فەرمانە، بڕوانە فەتح و (نیل الأوطار).

سێیەم: هەروەها کۆمەڵێك لە صەحابە گێڕاویانەتەوە، هەروەك باس کرا لە حەدیسی ئەبو حومەیددا، وە ئەمە مەحاڵە کە شاراوە بێت لەوان، کە ئەو بۆ مەبەستی پێویست بەجێی هێنابێت، وە ئەگەر بڵێین ڕەنگە شتی وەها

١٦- شێوەی دانیشتن بۆ تەحییات:

لە دانیشتنی تەحییات خوێندندا ئەبێ ڕەچاوی ئەم سوننەتانەی خوارەوە بکرێت:

أ- پێویستە دەستەکان بەو شێوەیە دابنرێت کە لەم (حدیث)انەی خوارەوەدا هاتوون:

(١) لە ئیبنو عومەرەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ دائەنیشت بۆ خوێندنی تەحییات دەستی چەپی ئەخستە سەر ئەژنۆی چەپی‌و دەستی ڕاستی ئەخستە سەر ئەژنۆی ڕاستی‌و دەستی ڕاستی بەشێوەی پەنجاوسێ دائەناو بەپەنجەی دەستی ئیشارەتی ئەکرد، موسلیم گێڕاویەتی‌یەوە.

(٢) لە وائیلی کوڕی حیجرەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ دەستی چەپی ئەنایە سەر ڕانو ئەژنۆی چەپی، وە دەستی ڕاستی بەشێوەیەك دائەنا ئەنیشکی لەسەر ڕانی ڕاستی بێتو لەپاشاندا پەنجەکانی ئەنوشتانەوەو بازنەیەکی دروست ئەکرد، وە لە ریوایەتێکی تردا دەفەرمووێت: بە پەنجە گەورەی و پەنجەی ناوەڕاست بازنەیەکی دروست ئەکردو بەپەنجەی شایەتی ئیشارەتی ئەکرد، لەپاشاندا ئەو پەنجەیەی بەرز ئەکردەوەو بینیومە جولاندویەتی‌و دوعای پێ کردووە. ئەحمەد گێڕاویەتی‌یەوە[1].

بەیهەقی دەفەرمووێت: لەوانەیە مەبەستی بەو جوولاندنە ئیشارەت پێ کردن بێت نەك جوولاندنی بەبەردەوامی، بۆ ئەوەی لەگەڵ ریوایەتەکەی ئیبنو زوبەیردا ڕێك بکەوێت کە

بوویێت، خۆ ئەگەر لەمان شاراوە بوویێت، ئەوە لە پێغەمبەری خوا شاراوە نەبوە، وە ئەوکاتەش ئەوانی ئاگادار ئەکردەوە، جا ئەگەر شتێك لەمانە نەبوویێت کە باسمان کرد، ئەوە بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرایە لەسەر ئەوەی کە بۆ عیبادەت کردویەتی نەك بۆ پێویستی‌یەك، وە خواش یارمەتی دەرە (تمام المنة).

(١) ئەمە کەم و کوڕی‌یەکی زۆر ناپەسەندە، ئەوە دەگەیەنێت کە کەسێکی تر ئەی گێڕاوەتەوە لە ئەهلی سوننەن و ئەهلی صیحاح‌و ئەوانەی کە صیحەتی حەدیسیان کردۆتە پێویست بۆ نووسراوەکانیان، بەڵام ئەمە وا نی‌یە، ئەم حەدیسە ئەبو داود و نەسائی و ئیبنولجارود لە (المنتقی) و ابن خزیمە و ئیبنوحیببان لە صەحیحەکەی خۆیاندا بە صەحیحیان داناوە، هەروەك تەخریجی دەبینیت لە (صفة الصلاة١٦٩)دا، هەروەها (ابن الملقن) و نەوەوی و ئیبنوقەییم بە صەحیحیان داناوە، هەروەك لە صەحیحی ئەبو داود (٧١٧) دا تەخریج کراوە.

ووریا کردنەوەیەك: هەندێ خەڵکم بینی پەنجەی لە نێوان دوو سەجدەکە دەجووڵاند و پشتیوانی لەم کارە ئەوەیە کە ئیبنو قەییم لە (زاد المعاد) دا باسی کردووە هەروەك چۆن باسی جوولاندنی کردووە لە تەحییاتدا، وەمن پشتیوانێکی تر نازانم بۆ ئەمە جگە ئەو ریوایەتە شازە نەبێت لەم حەدیسەی وائیلدا، جا پێویستی بە لێکۆڵینەوە هەیە. وە بۆ زیاتر درێژەدان بەم باسە بگەڕێوە بۆ ئەصلی (تمام المنة).

دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ بە پەنجەی ئاماژەی ئەکرد کاتێ دوعای ئەکرد، وە نەی ئەجوڵاند. ئەبو داود بەئیسنادێکی صەحیح گێراویەتیەوە. نەوەوی باسی ئەمەی کردووە[1].

(٣) لە زوبەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ دائەنیشت بۆ تەحییات خوێندن، دەستی ڕاستی ئەنایە سەر ڕانی ڕاستیو دەستی چەپی ئەنایە سەر ڕانی چەپیو بەپەنجەی شایەتی ئیشارەتی ئەکردو چاوی لە ئیشارەتەکەی تێ نەئەپەڕاند. ئەحمەدو موسلیمو نەسائی گێراویانەتەوە.

لەم (حديث)ەدا دەرئەکەوێت تەنها دەستی ڕاست لەسەر ڕان دائەنرێت بەبێ نوشتاندنەوەی پەنجەکان و ئیشارەتیش بەپەنجەی شایەتی دەستی ڕاست ئەکرێت، وە ئەوەشی تێدایە چاوبڕینە ئیشارەتەکە سوننەتە. ئەمە سێ جۆر دەست دانانە بەهەرکامیان کار بکرێت دروستە.

ب- بە پەنجەی دەستی ڕاست ئیشارەت بکرێت لەگەڵ کەمێك چەمانەوە هەتا سڵاو ئەدرێتەوە، لە نومەیری خوزاعیەوە هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەرم ﷺ بینیوە دانیشتبوو بۆ تەحییات لەنوێژدا باسکی ڕاستی خستبووە سەرڕانی ڕاستی و پەنجەی شایەتی بەرز کردبۆوە و کەمێك چەمانبوویەوە و دوعای ئەکرد. ئەحمەدو ئەبوداود و نەسائی و ئیبنو ماجەو ئیبنو خوزەیمە بە ئیسنادێکی (جيد) گێراویانەتەوە[2].

---

(١) بەڵکو سەنەدەکەی صەحیح نیە، وە ئەو ئەگەرەی باسی لێوە کراوە پێچەوانەی زاهیری حەدیسەکەیە، وە ئەگەر سابت بووایە ئەوە ڕەنگە کاری پێ بکرایە لەگەڵ مانەوە لەسەر زاهیری حەدیسەکەی وائیل، وە جەمع و کۆ دەکرێت لە نێوانیان بەوەی هەندێ جار دەجوڵا و هەندێ جاریش نەخێر، یان دەوترێت (مثبت) دەخرێتە پێش (نافي)، وە ئیبنو قەییم لە (زاد)دا حەدیسەکەی (تضعيف) کردووە وە منیش لێکۆڵینەوەم لێ کردووە لە (تخريج صفة صلاة النبـي ﷺ) وە لە (ضعيف)ی ئەبوداود (١٧٥) دا کە بە هیچ شێوەیەك دەرفەتی بۆ گومان نەهێشتۆتەوە لە زەعیفی حەدیسەکەدا.

لە دوای ووتووێژێکی زۆر و بەربەرچدانەوەیەکی زۆر شێخ ئەلبانی دەفەرمووێت: بە کورتی ئاماژە کردن بە پەنجەی شایەتومان نەفی جوڵاندن ناکات، چونکە زاندراوە لە بەکارهێنانی لوغەویدا کە زۆرجار ئیشارە کردن جوڵاندنی لەگەڵدایە، بۆ زیاتر بگەڕێوە بۆ (تمام المنة).

(٢) نەخێر بەڵکو ئیسنادەکەی لاوازە چونکە مالیکی کوڕی نومەیری خوزاعی تێدایە، ئیبنوقەطانو (ذهبـي) دەربارەی ئەڵێن: حاڵی مالیك نەزانراوە جگە لەخۆی کەسیش لەباوکیەوە (حديث) ی نەگێڕاوەتەوە، وە (حافظ) لە (التقريب)دا ئاماژەی کردووە بەوەی کە (لين الحديث)ە، وە من چەماندنەوەی پەنجەم نەبینیوە جگە لەم حەدیسە نەبێت، وە دروست نیە کاری پێ بکرێت لەپاش ئەوەی ئاشکرا بوو )ضعيف(ە، والله أعلم. (تمام المنة).

له ئەنەسی کوڕی مالیکەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوه دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ بەلای سەعدا ڕۆیشت بە دوو پەنجە دوعای ئەکرد فەرمووی: ئەی سەعد بەیەك پەنجە ئیشارەت بکە. (ئەحمەدو ئەبوداودو نەسائیو حاکم گێڕاویانەتەوە).

وە دەربارەی پیاوێك کە بە پەنجە ئیشارەت بکاتو بپاڕێتەوە پرسیان لە ئیبنو عەبباس؟ فەرمووی: ئەوە نیشانەی ئیخلاصیە.

ئەنەسی کوڕی مالیك دەفەرمووێت: ئەوە نیشانەی لەخوا ترسانە. وە موجاهید دەفەرمووێت: دەمی شەیتانی پێ ئەبەسترێت.

شافیعیی‌یەکان ڕەئیان وایە یەکجار پەنجە بجوڵێت ئەویش کاتی ووتنی (إلا الله) یە لە شایەتوماندا.

لای حەنەفیی‌یەکان وایە پەنجەی شایەتی کاتی ووتنی (لا إله) بەرز ئەکرێتەوەو کاتی ووتنی (إلا الله) دائەنرێتەوە، وەلای مالیکیی‌یەکان هاتووە پەنجە بەلای ڕاستو چەپدا بجوڵێنرێت هەتا کۆتایی نوێژ. وە مەزهەبی حەنبەلیی‌یەکان ئەوەیە هەرکاتێك ناوی الله برا بە پەنجە ئیشارەت بکات، ئیشارەت بۆ یەکتایی خوا بکات و نەیجوڵێنێ[1].

---

(١) ئەم دیاری کردن و چۆنیی‌یەتیی‌یە لە سوننەتدا هیچ کامێکیان بنەمایان نیی‌یە، وە نزیکترینیان لەڕاستیی‌یەوە مەزهەبی حەنبەلیی‌یەکانە ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە جولاندنەکەیان بەستۆتەوە بە زیکری لەفزی جەلالەوە، وە ئەمە وادیارە لە ئیمام ئەحمەد خۆیەوە نەبێت، ئیبنو هانی لە مەسائیلەکانیدا (ل٨٠) باسی ئەوە دەکات: پرسیار لە ئیمام کرا، ئایا پیاو لەناو نوێژدا لەکاتی تەحییاتدا ئاماژە بە پەنجەی بکات؟ فەرمووی: بەڵێ، بە توندی.

وە ڕووەکەشی حەدیسەکەی وائیلی پێشوو بەردەوام جووڵاندنە تا ئاخری تەحییات بەبێ قەید و چۆنیی‌یەتی، وە (طحاوي) ئاماژەی بۆ شتێکی وا کردووە لە (شرح المعاني ص١/١٥٣) دا.

فایدەیەك: دانەر باسی ئەوەی نەکردووە نوێژکەر چۆن دانیشێ لە نوێژە دوو ڕکاتیی‌یەکان وەك نوێژی بەیانی، ئایا ئیفتیراش بکات وەك ئەحمەد دەفەرمووێت، یان تەوەڕوك بکات وەك شافعی دەفەرمووێت: ووتەی صحیح لای من یەکەمە، لەبەر حەدیسی وائیلی کوڕی حیجر کە دەفەرمووێت: هاتمە لای پێغەمبەری خوا ﷺ بینیم کاتێ دەستی بە نوێژ کرد دەستی بەرز کردەوە... و کاتێك دا بنیشتایە لە دوو ڕکاتەکەدا پێی چەپی ڕائەخست، و ڕاستی بەرز دەکردەوە، و دەستی ڕاستی دەخستە سەر ڕانی ڕاستی، و پەنجەی بەرز دەکردەوە بۆ دوعا، و دەستی چەپی دەخستە سەر ڕانی چەپی، أخرجه النسائي (١/١٧٣) بسند صحیح.

وە ئەمە ئاشکرایە ئەو نوێژەی کە وەصفی دەکات دوو ڕکاتیی‌یە، وە هەردوو حەدیسی عائیشەو ئیبنوعومەر بەهێزی دەکات، کە هەردووکیان لەلای دانەر باسیان لێوە کراوە لە (چۆنیی‌یەتی دانیشتن لە نێوان دوو سەجدەکە)دا، جا ئەوەی ووتمان سابت بوو والحمد لله. (تمام المنة ).

ج - ئەوکەسە ئیفتراش بکات لە تەحییاتی یەکەمدا، واتە قاچی چەپ ڕابخاتو قاچی ڕاست هەڵبنێت وە لەسەر قاچی چەپ دابنیشێت، وە لە تەحییاتی کۆتایی دا (تَوَرُك) بکات واتە قاچی ڕاست هەڵبنێت و قاچی چەپ بخاتە ژێری و لەسەر سمت لەسەر زەوی دابنیشێت، لە (حدیث)ەکەی ئەبو حومەیدا هاتووە دەربارەی شێوەی نوێژەکانی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (کاتێ بۆ تەحییاتی یەکەم دائەنیشت لەسەر پێی چەپی دائەنیشت و پێی ڕاستی هەڵئەنا، بەڵام ئەگەر بۆ تەحییاتی کۆتایی دابنیشتایە قاچی چەپی ئەبردە پێشەوە بۆ ژێر ڕاستی و ئەوی تریانی هەڵئەنا و لەسەر سمتی دائەنیشت) (بوخاری گێڕاویەتیەوە).

١٧ – تەحییاتی یەکەم:.

بەڕای جەماوەری زانایان تەحییاتی یەکەم سوننەتە، بەپێی ئەوەی عبداللەی کوڕی بوجەینە ئەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی نیوەڕۆی ئەکرد لەرکاتی دووەمدا بێ تەحییات خوێندن هەڵسایەوە، کاتێ نوێژەکەی تەواوکرد پێش ئەوەی سلاو بداتەوە هەربەدانیشتنەوە دووسەجدەی برد لە هەرسەجدەیەکدا بەدانیشتنەوە (الله أکبر)ی ئەکرد، خەلکەکەش لەگەڵیا هەردوو جارەکە سەجدەیان برد، لەبەر ئەوەی لەیادی چوو لەرکاتی دووەمدا دابنیشێتو تەحییات بخوێنێت (رواه الجماعة).

لە کتێبی (سبل السلام) دا هاتووە کە ئەگەر بە نەزانی تەحییاتی یەکەم نەخوێنرا سەجدەی سەهو جێی ئەگرێتەوە.

وە ئەوەی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێت: (من چۆن ئەبینن نوێژ ئەکەم ئێوەش بەو شێوە نوێژ بکەن) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە تەحییاتی یەکەم واجبە، وە پڕکردنەوەی ئەو تەحییاتە بەسەجدەی سەهو بەڵگەیە لەسەر ئەوەی باواجبیش بێ بەو سەجدە سەهوە پڕ ئەکرێتەوە، وە بەڵگە هێنانەوە لەسەر ئەوەی کە واجب نىیە وەرناگیرێ تاوەکو دەلیلێك بەدەس نەکەوێ لەسەر ئەوەی کە هەموو واجبێك سەجدەی سەهو بری ناکەوێ ئەگەر بە هەڵە ئەو واجبە تەرك کرابێ.

(حافظ) لە (الفتح) دا دەفەرموێت: (ابن بطال) دەفەرموێت: بەڵگەی ئەوەی سەجدەی سەهو جێی واجب ناگرێتەوە، ئەوەیە ئەگەر کەسێك نوێژی دابەستو لەبیری نەبوو (الله أکبر) بکات بەسەجدەی سەهو پڕناکرێتەوە، وە هەروەها تەحییاتیش بەو شێوەیە، وە لەبەر ئەوەی تەحییات یادێکە دەنگی تێدا بەرز ناکرێتەوە، وەك پاڕانەوەی سەرەتای نوێژ وایە کەواتە واجب نىیە، وە غەیری (ابن بطال) بەڵگەیان بەوە هێناوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ ئیقراری کردووە کە خەڵکەکە شوێنی بکەون دوای ئەوەی بۆ خۆی زانیتی کە بەئەنقەست تەرکیان کردووە، ئەم قسەیەش چاو پیاخشاندنەوەیەکی ئەوێ.

وە ئەوانەی ئەڵێن: تەحییاتی یەکەم واجبە (لیث)ی کوڕی سەعدو ئیسحاق و ئەحمەدە لەفەتوایەکی مەشهوریدا، وە ئەمە قسەی شافیعی‌یە لە ریوایەتێکیش لەلای حەنەفی‌یەکان، (طبري) بەڵگەی واجب بوونی هێناوەتەوە بەوەی کاتێ نوێژ فەرز کرا یەکەم جار، دوو ڕکات دووڕکات بوو، وە تەحییات تێیدا واجب بوو، وە کاتێکیش نوێژ زیادکرا ئەو زیادکردنە واجب بوونەکەی لانەبرد.

کورتی تەحییاتی یەکەم موستەحەببە:

موستەحەببە لەتەحییاتی یەکەمدا شتێکی کەم بووترێت، لە ئیبنو مەسعودەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرموورێت: (پێغەمبەر ﷺ کاتێ بۆ تەحییاتی یەکەم دادەنیشت، ئەت ووت لەسەر چەوو بەردی سورکراوە دانیشتووە) - واتە: زوو هەڵەستا - (ئەحمەدو خاوەن سونەنەکان گێڕاویانەتەوە، (ترمذي) دەفەرموورێت: حەسەنە، بەڵام ئەوەی هەیە عوبەیدەی کوڕی عبدالله ی کوڕی مەسعود کە حەدیسەکەی ریوایەت کردوە لە باوکی‌یەوە نەیبیستووە).

(ترمذي) دەفەرموورێت: زانایان کار بەوە دەکەن، وە ئەوەیان هەڵبژاردووە کە پیاو نابێت درێژە بە دانیشتنی ڕکاتی دووەم بدات و لە تەحییات بەولاوە هیچی تر بخوێنێت.

ئیبنو قەییم دەفەرموورێت: نەقل نەکراوە کە پێغەمبەر ﷺ لەتەحییاتی یەکەمدا صلاواتی دابێ لەسەر خۆی و کەسو کاری، وە پەنای نەبردوە لە سزای گۆڕو سزای ئاگرو فیتنەی ژیانو فیتنەی مردنو فیتنەی مەسیحی دەججال[1]، وە هەرکەس ووتنی ئەوانە بەپەسەند بزانێت

(١) شتێك نی‌یە بکرێتە بەڵگە بۆ بەستنەوە و تەقیید کردنی ئەو (عمومات و مطلقات)انەی باس کراوە سەبارەت بە تەحییاتی یەکەمەوە، کەواتە ئەوان بە عومومی و گشتی‌یەتی ماونەتەوە، وە بەهێزترین بەڵگە کە موخالیفەکان دەیکەنە بەڵگە حەدیسەکەی ئیبنومەسعودە کە لە کیتابەکەدا باس کرا، وئەوەش ئیسنادەکەی صەحیح نی‌یە لەبەر پچڕاندن (إنقطاع)ی، هەروەك دانەر باسی لێوە کردووە، وە ئیبنو قەییم ڕەحمەتی خوای لێ بێت بە تەواوەتی و بە جوانی بەڵگەی هەردوو لای هێناوەتەوە، وە هەر ووتەیەکی لەوبارەوە هەبێت لە (جلاء الأفهام في الصلاة على خير الأنام) ڕوونی کردۆتەوە، جا بگەڕێوە بۆی، ڕاستی‌یەتی ئەوەی کە تەرجیحمان کرد دەبینی.

پاشان بەڵگەیەکی ترم بینی کە بە (مطلق) ی نەفی ووتەکەی ئیبنو قەییم دەکات: (لم ينقل أنه ﷺ صلى عليه وعلى آله في التشهد الأول) واتە: نەقڵ نەکراوە کە پێغەمبەر ﷺ سەڵاواتی دابێ لەسەر خۆی و خاندانی لە تەحییاتی یەکەمدا، وە ئەو بەڵگەیەش ووتەی عائیشەیە خوای لێ ڕازی بێت لە باسی چۆنی‌یەتی نوێژی پێغەمبەر ﷺ لە شەونوێژدا:

«ئێمە سیواك و شتومەکی دەست نوێژ هەڵگرتنمان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئامادە دەکرد، جا ئەوەندەی خوا ویستی لێ بووایە شەوی بەسەردا بهێنایە، هەڵدەستا و سیواکی دەکرد و دەست نوێژی دەگرت، پاشان نۆ ڕکاتی دەکرد و لە هیچ ڕکاتێکیاندا دانەدەنیشت لە هەشتەم نەبێت، جا دەپاڕایەوە لە پەروەردگاری و سەڵەواتی دەدا

تێگەیشتنەکەی لە (عمومات) و (مطلقات)ەوەیە، کە بە صەحیحی هاتووە ووتنی ئەوانە جێگاکەی تەحییاتی دوایی‌یە.

١٨- سڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ:

موستەحەببە بۆ نوێژکەر لەتەحییاتی دواییدا سڵاوات بدات لەسەر پێغەمبەر ﷺ بەیەکێك لەم شێوانەی خوارەوە:

أ - لە ئەبو مەسعودی بەدری‌یەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: (بەشیری کوڕی سەعد بەپێغەمبەری ﷺ ووت: ئەی نێرراوی خوا، خوا فەرمانی پێداوین صلاوات لەسەر تۆ بدەین، چۆن چۆنی سڵاواتت لەسەر بدەین ؟ پێغەمبەر ﷺ بێدەنگ بوو لەپاشاندا فەرمووی: بلێن: (اللَّهُمَّ صَلِّ على مُحَمَّدٍ وعلى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيتَ على آلِ إبرَاهِيمَ، وَبَارِكَ على مُحَمَّدٍ وعلى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكتَ على آلِ إبرَاهِيمَ فِي العَالَمِينَ إنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيد) پاشان فەرمووی: وە سەلامیش هەر بەو شێوەیە کەزانیوتانە) (رواه مسلم وأحمد).

ب- لە کەعبی کوڕی عەمرەوە هاتوە دەفەرمووێت: ووتمان: ئەی نێرراوی خوا وا زانیمان چۆن سلاوت لی‌بکەین ئەی چۆن سڵاواتت لەسەر بدەین ؟ ئەویش فەرمووی: بلێن: (اللَّهُمَّ صَلِّ على مُحَمَّدٍ وعلى آلِ مُحَمَّد، كَمَا صَلَّيتَ على آلِ إبرَاهِيمَ إنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيد، اللَّهُمَّ بَارِك على مُحَمَّدٍ وعلى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكتَ على آلِ إبرَاهِيمَ إنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيد). (رواه الجماعة).

سڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ لە تەحییاتدا مەندووبە نەك واجب، بەپێی ئەوەی (ترمذي) گێراویەتی‌یەوەو بە صەحیحی داناوە، هەروەها ئەحمەدو ئەبوداود، لە (فضالة)ی کوڕی عوبەیدەوە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ گوێی لەپیاوێك بوو لەنوێژدا ئەپاڕایەوە بێ ئەوەی سلاوات لەسەر

---

لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ، پاشان هەڵدەستا و سەلامی نەئەدایەوە، پاشان ڕکاتی نۆیەمی دەکرد ئەجا دائەنیشت، پاشان حەمدی پەروەردگاری دەکرد و سەڵەواتی لەسەر پێغەمبەرەکەی دەدا و دوعای دەکرد، پاشان سڵاوی دەدایەوە سڵاودانەوەیەك کە گوێبیستی دەبووین»... حەدیسەکە. (أخرجه أبوعوانة في صحيحه (٢/٣٢٤) وهو في صحيح مسلم (٢/١٧٠) لكنه لم يسق لفظه)، جا ئەمە بەڵگەیەکی ڕاشکاوی تێدایە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ خۆی سەڵەواتی دەدا لەسەر زاتی خۆی، لە تەحییاتی یەکەمدا هەروەك چۆن سەڵەواتی داوە لە تەحییاتی ئەخیردا، وە ئەمە سود و فائیدەیەکی دەگمەنە سوودی لێ وەرگرە، و بە دانت قەپی پیا بکە، و ناش ووترێت: ئەمە لە شەونوێژدا بووە لەبەر ئەوەی ئێمە دەڵێین: ئەصل ئەوەیە هەرشتێك لە نوێژێکدا کرابێت لەوانی تریش دەکرێت بەبێ جیاوازی لە نێوان فەرزو سوننەتدا، وە هەرکەسێکیش جیاوازی دەخاتە نێوانیان، دەبێت بەڵگە بێنێ (تمام المنة).

پێغەمبەر ﷺ بدات، فەرمووی: (عجَّلَ هَذَا) ئەمە بەپەلە بوو لەپاڕانەوەکەیدا، لەپاشاندا بانگی کردو بەو پیاوە یا بەغەیری ئەوی فەرموو: (إذَا صلى أحَدُكُم فَلْيَبدَأ بِتَحمِيدِ اللهِ وَالثَّنَاءِ عَلَيهِ ثُمَّ لِيُصَلِّ على النَّبِـيِّ ﷺ ثُمَّ لِيَدعُ بِمَا شَاءَ الله) واتە: هەرکەس لەئێوە نوێژی کرد با بە سوپاس و ستایشی خوا دەست پێ بکات، لەپاشاندا سڵاوات بدات لەسەر پێغەمبەر ﷺ، لەپاشاندا ئەوەندەی خوا بیەوێ بپاڕێتەوە.

خاوەنی کتێبـی (المنتقى) دەفەرمووێت: ئەم (حديث)ە بەڵگەی ئەوانەی تێدایە کەڕایان وایە سڵاوات دان لەنوێژدا فەرز نىیە، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی نەکرد بەو پیاوە نوێژەکەی بکاتەوە، وە هەروەها خەبەرەکەی ئیبنو مەسعود ئەو ڕایە بەهێز دەکات کاتێ باسی تەحییاتی کردو فەرمووی: (لەپاشاندا هەر دوعاو پاڕانەوەیەکی ویست با بیکا).

شەوکانی دەفەرمووێت: لای من شتێك سابت نەبوە کە بەڵگە بێت لەسەر قسەی ئەوانەی سلاوات دان لەنوێژدا بەواجب دائەنێن.

١٩- دوعا کردن دوای تەحییاتی دوایی و پێش سلاودانەوە:

موستەحەببە نوێژکەر لەخوا بپاڕێتەوە بۆ خێری دنیاو ڕۆژی دوایی، دوای تەحییاتی کۆتایی و پێش سلاودانەوە، لە عبداللە ی کوڕی مەسعودەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فێری تەحییاتی ئەکردین، پاشان لەدواییدا فەرمووی: (ثُمَّ لِتَخْتَر مِنَ المَسألَةِ مَا تَشَاءُ) رواه مسلم. واتە: لەپاشاندا بەئارەزووی خۆت بۆچی ئەپاڕێیتەوە بپاڕێرەوە.

وە پاڕانەوە بەشێوەیەکی ڕەها (مطلق) موستەحەببە، چ بە دوعای (مأثور) یا (غیر مأثور) بەڵام ئەوەی هەیە دوعای (مأثور) ئەوەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتوە چاکترە، ئێمەش لێرەدا هەندێ لەو دوعاو پاڕانەوانە باس ئەکەین کەلەو بارەیەوە هاتوون:

١- لە ئەبی هورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ ئەی فەرموو: هەرکەسێکتان لە تەحییاتی دوایی بووەوە با پەنا بگرێت بە خوا لە چوار شت، بڵێت: (اللَّهُمَّ إنِّي أعُوذُ بِكَ مِن عَذَابِ جَهَنَّمَ، وَمِن عَذَابِ القَبرِ، وَمِن فِتنَةِ المَحيَا وَالمَمَاتِ، وَمِن شَرِّ فِتنَةِ المَسِيحِ الدَّجَّالِ) (رواه مسلم). واتە: خوایە من پەنا ئەگرم بەتۆ لەسزای دۆزەخو سزای ناوگۆڕ، وە پەنا ئەگرم بەتۆ لە فیتنەی ژیانو مردنو فیتنەی شەڕی مەسیحی دەجاڵ.

٢- لە عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ لە نوێژدا ئەپاڕایەوەو ئەیفەرموو: (اللَّهُمَّ إنِّي أعُوذُ بِكَ مِن عَذَابِ القَبرِ، وَأعُوذُ بِكَ مِن فِتنَةِ الدَّجَّالِ، وَأعُوذُ بِكَ مِن فِتنَةِ المَحيَا وَالمَمَاتِ، اللَّهُمَّ إنِّي أعُوذُ بِكَ مِنَ المَأثَمِ وَالمَغرَمِ) (متفق عليه). واتە: خوایە من پەنا

ئەگرم بەتۆ لەسزای گۆڕ، وە پەنا ئەگرم بەتۆ لەفیتنەی دەجاڵ، وە پەنا ئەگرم بەتۆ لە فیتنەی ژیانو مردن، خوایە من پەنا ئەگرم بە تۆ لەتاوانو قەرزداری.

٣- لە عەلی‌یەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە کە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ هەڵئەستا بۆ نوێژکردن دووا ووتەی لەنێوان تەحییاتو سلاّودانەوەدا ئەوە بوو ئەیفەرموو: (اللَّهُمَّ اغفر لِي مَا قَدَّمتُ وَمَا أخَّرتُ، وَمَا أسررتُ وَمَا أعلَنتُ وَمَا أسرَفتُ وَمَا أنتَ أعلَمُ بِهِ مِنِّي، أنتَ المُقَدِّمُ وَأنتَ المُؤَخِّرُ، لا إلَهَ إلا أنتَ) (رواه مسلم). واتە: خوایە لەتاوانی بەرو دووام ببوورە، خوایە لەو تاوانانەم ببوورە کە بە نهێنی و ئاشکرا کردومە، خوایە لەوتاوانانەم ببوورە کە بەزیادەڕەوی کردوومە، وە لەوتاوانانەش کە تۆ زیاتر لەمن شارەزای پێیان، خوایە هەرتۆ پێشخەرو دوواخەری هەموو شتێکی، هیچ مەعبودێکی حەق نی‌یە شایستەی عیبادەت بێت جگە لە تۆ.

٤- لە عبدالله ی کوڕی عەمرەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرموێت: ئەبو بەکر خوا لێی ڕازی بێت بە پێغەمبەری ﷺ ووت: فێری پاڕانەوەیەکم بکە لەنوێژدا پێی بپاڕێمەوە؟ فەرمووی: بڵێ: (اللَّهُمَّ إنِّي ظَلَمتُ نَفسِي ظُلماً كَثيرا، وَلا يَغفِرُ الذُّنوبَ إلا أنتَ، فَاغفِر لِي مَغفِرَةً مِن عِندِكَ وَارحَمنِي، إنَّكَ أنتَ الغَفُورُ الرَّحِيم) (متفق عليه). واتە: خوایە من ستەمم لە خۆم کردووە ستەمێکی زۆر، جگە لە تۆش کەس لە تاوان نابوورێ، خوایە لێم بوورە بە لێبوردنێك لەلایەن خۆت و ڕەحمم پێ بکە، تۆ لێبوردە و بە ڕەحمیت.

٥- حەنزەڵەی کوڕی عەلی کە میحجەنی کوڕی (أذرع) بۆی گێڕاوەتەوە دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ چووە ناو مزگەوت و تەماشای کرد پیاوێك نزیك بوو نوێژەکەی تەواو بکات لە تەحییاتدا بوو دەیفەرموو: خوایە من داوات لێ دەکەم، ئەی خوای تاك و تەنیای بێ نیاز، کە کەسی لێ نەبووەو کەسی لێ نابێ و هاوشێوەی نی‌یە، کە لە گوناهەکانم ببووریت، چونکە بە ڕاستی هەر تۆ لێبوردە و بە ڕەحمیت.

پێغەمبەر ﷺ کە ئەمەی بیست فەرمووی: «خوا بوورا، خوا بوورا، خوا بوورا» رواه أحمد وأبوداود.

٦- لە شەددادی کوڕی ئەوسەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ لەنوێژەکەیدا ئەیفەرموو: (اللَّهُمَّ إنِّي أسألُكَ الثَّبَاتَ فِي الأمرِ، وَالعَزِيمَةَ على الرُّشدِ، وَأسألُكَ شُكرَ نِعمَتِكَ، وَحُسنَ عِبَادَتِكَ، وَأسألُكَ قَلباً سَلِيماً، وَلِساناً صَادِقاً، وَأسألُكَ مِن خَيرِ مَا تَعلَمُ، وَأعُوذُ بِكَ

مِن شَرِّ مَا تَعلَمُ، وَأَستَغفِرُكَ لِمَا تَعلَمُ) (رواه النسائي)[1]. واته: خوایه داوات لێ ئەکەم کە بەردەوامم کەی لە ئیش و کارمدا، وە توانام بدەیتێ لەسەر ژیری و ڕێی ڕاست، خوایه داوات لێ ئەکەم وام لێ بکە سوپاس گوزاری نیعمەتەکانت بم، وە بەچاکی بت پەرستم، خوایه داوای دڵێکی ساغو زمانێکی ڕاستگۆت لێ ئەکەم، خوایه داوای خێری ئەو شتانەت لێ ئەکەم کەتۆ ئەزانی خێریان تێدایە، وە پەنا بەتۆ ئەگرم لەشەڕی ئەوشتانەی کەتۆئەزانی شەڕیان تێدایە، وە داوای لێبووردنی ئەو تاوانانەت لێ ئەکەم کە خۆت ئەیان زانیتو ئاگات لێیانە.

٧- لە ئەبو میجلەزەوە هاتوە دەفەرموێت: عەمماری کوڕی یاسر خوا لێیان ڕازی بێت بەرنوێژی‌یەکی بۆ کردین، بەڵام زوو لێبووەوە، خەڵکەکەش ئینکاری ئەوەیان لێکرد، فەرمووی: ئایا ڕکوع و سجودەکەم تەواو نەبوو؟ ووتیان: بەڵێ تەواو بوو، فەرمووی: دەمن بەو پاڕانەوەیەش پاڕاومەتەوە تێیدا کە پێغەمبەر ﷺ پێی ئەپاڕایەوەو ئەیفەرموو: (اللّٰهُمَّ بِعِلمِكَ الغَيبَ وَقُدرَتِكَ على الخَلقِ، أحيِنِي مَا عَلِمتَ الحَيَاةَ خَيراً لِي، وَتَوَفَّنِي إذَا كَانَتِ الوَفَاةُ خَيراً لِي، أسأَلُكَ خَشيَتَكَ فِي الغَيبِ وَالشَّهَادَةِ، وَكَلِمَةَ الحَقِّ فِي الغَضَبِ وَالرِّضَا، وَالقَصدَ فِي الفَقرِ وَالغِنى، وَلَذَّةَ النَّظَرِ إلى وَجهِكَ، وَالشَّوقَ إلى لِقَائِكَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِن ضَرَّاءِ مُضِرَّةٍ، وَمِن فِتنَةٍ مُضِلَّةٍ، اللّٰهُمَّ زَيِّنَّا بِزِينَةِ الإِيمَانِ، وَاجعَلنَا هُدَاةً مُهتَدِين) (رواه أحمد والنسائي بأسنادٍ جيد). واته: خوایه بە عیلمی غەیبت و توانات بەسەر مەخلوقاتدا لە تۆ ئەپاڕێمەوە کە بمژێینی هەرکاتێك زانیت ژیان خێری تێدایە بۆم، وە بمرێنی هەرکاتێك زانیت مردن باشترە بۆم، خوایه داوات لێ ئەکەم وام لێ بکەی بەنهێنی و ئاشکرا لە تۆ بترسم، خوایه وام لێ بکەی ووشەی هەق بڵێم لەکاتی تووڕەییو هێمنی دا، خوایه وام لێ بکەی لەهەژاریو دەستداریدا (وسگ) بم، خوایه خۆشی چاوپێکەوتنتم پێ ببەخشە، خوایه وام لێ بکەیت بەپەرۆش بم بۆ گەیشتن بە تۆ، خوایه پەنا ئەگرم بەتۆ لەزیانی زەرەردەرو فیتنەی گومڕاکەر، خوایه بە خشڵو زێڕی باوەڕ بمان ڕازێنەرەوە، خوایه ڕێنماییمان بکە بۆ ڕێی ڕاست، وە وامان لێ بکە ڕێگای ڕاست بگرین.

٨- لە ئەبو صالحەوە لە پیاوێك لە صەحابەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ بە پیاوێکی فەرموو: لە نوێژدا چی ئەڵێی؟ کابرا ووتی: تەحییات ئەخوێنم پاشان ئەڵێم: (اللّٰهُمَّ إنِّي أسأَلُكَ الجَنَّةَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ النَّار). ـ واته: خوایه من داوات لێ ئەکەم بەهەشتم

---

(١) شێخ ئەلبانی ڕەحمەتی خوای لێ بێت لە (تمام المنة ص٢٢٥) دا ئەم حەدیسەی (تضعیف) کردووە بەهۆی ئەو پیاوەی لە (بني حنظلة) یە کە ناوی نەبراوە، بەڵام شێخ ڕەحمەتی خوای لێ بێت لەو (تضعیف) کردنە پاشگەز بۆتەوە وەك شێخ علی حەلەبی لە تەحقیقی (باعث الحثیث) دا (١/١٦٤-١٦٥) ئاماژەی بەوە کردووە و دەفەرموێت: بە کۆی ڕێگاکان کەمترین حوکم ئەوەیە (حسن لغیره) یە.

پێ ببەخشیتو پەنات پێ ئەگرم لەئاگری دۆزەخ ـ بەڵام من وورتە وورتەکەی تۆ ـ واتە پێغەمبەر ـ و (معاذ) نازانم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئێمەش هەر لەو بارەیەوە وورتە وورت ئەکەین). (رواه أحمد وأبوداود).

٩- لە ئیبنو مەسعودەوە هاتوە دەفەرموویت: پێغەمبەر ﷺ فێری کردووم بەم شێوەیە بپاڕێمەوە بڵێم: (اللَّهُمَّ ألِّف بَينَ قُلُوبِنَا، وَأصلِح ذَاتَ بَينِنَا، وَاهدِنَا سُبُلَ السَّلامِ، وَنَجِّنَا مِنَ الظُّلُمَاتِ إلى النُّورِ، وَجَنِّبنَا الفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنهَا وَمَا بَطَنَ، وَبَارِك لَنَا فِي أسمَاعِنَا، وَأبصَارِنَا، وَقُلُوبِنَا، وَأزوَاجِنَا، وَذُرِّيَّاتِنَا، وَتُب عَلَينَا إنَّكَ أنتَ التَّوَّابُ الرَّحِيم وَاجعَلنَا شَاكِرِينَ لِنعمَتِكَ، مُثنِينَ بِهَا، وَقَابِلِيهَا وَأتِمَّهَا عَلَينَا) (رواه أحمد وأبوداود)[1]. واتە: خوایە دڵەکانمان یەك بخەو نێوانمان چاك بکە، خوایە ڕێنماییمان بکە بۆ ڕێگاکانی ئاشتی، خوایە لە تاریکی ڕزگارمان بکەو بمان خەرە ڕووناکی، وە بەدوورمان خە لە هەموو خراپەکاری‌یەکی نهێنی و ئاشکرا، خوایە بەرەکەت بخەرە گوێ و چاوو دڵ و خێزان و نەوەکانمان، خوایە لێمان خۆش ببە، چونکە بە ڕاستی تەنها تۆ لێبوردە و بەرەحمی، خوایە لەوکەسانەمان بگێرە کە سوپاس گوزاری نیعمەتەکانی تۆن، خوایە وامان لێ بکە ڕازی بین پێ‌یان، وە ئەوەندەی تریشمان بدەیتێ و نیعمەتەکانت تەواو بکە لەسەرمان.

١٠- لە ئەنەسەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرموویت: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دانیشتبووین، لەولاوە پیاوێك ڕاوەستابوو نوێژی ئەکرد کاتێك ڕکوعی بردو تەحییاتی خوێند پاڕایەوە ووتی: (اللَّهُمَّ إنِّي أسألُكَ بِأنَّ لَكَ الحَمدُ لا إلَهَ إلا أنتَ المَنَّانُ، بَدِيعَ السَّمَوات وَالأرضِ، يَا ذَا الجَلالِ وَالإكرَامِ، يَا حَيُّ يَا قَيُّوم، إنِّي أسألُك). واتە: خوایە لەتۆ ئەپاڕێمەوە بەوەی سوپاسو ستایش هەر بۆ تۆیە، هیچ مەعبودێکی حەق شایستەی عیبادەت نی‌یە جگە لەتۆی خاوەن فەزڵ و بەخشش نەبێت، ئەی بەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەوی، ئەی خاوەن شکۆو پڕڕێز، ئەی هەمیشە زیندووی بەتوانا، من ئەپاڕێمەوە لێتو داوا ئەکەم. پێغەمبەر ﷺ بە هاوەڵەکانی فەرموو: ئەزانن ئەو کابرایە بەچی پاڕایەوە؟ ووتیان: خواو پێغەمبەرەکەی ئەزانێت، فەرمووی: (بەو زاتەی گیانی موحەممەدی بەدەستە بەناوە گەورەکەی خوا پاڕایەوە ئەو ناوەی هەرکەس پێ‌ی بپاڕێتەوە پاڕانەوەکەی گیرا ئەبێت، وە داوای هەرچی پێ بکرێت خوا ئەیداتێ) (رواه النسائي).

---

(١) گێڕانەوەی ئەم حەدیسە بۆ ئەبوداود هەڵەیە، چونکە لە سونەنەکەیدا نی‌یە.

١١- له عومەری کوڕی سەعدەوە[1] هاتوە ئەڵێت: ئیبنو مسعود فێری تەحییاتی نوێژی ئەکردین لەپاشاندا ئەیفەرموو: هەرکەس له تەحییات بووەوە با بڵێت: (اللَّهُمَّ إنِّي أسألُكَ مِنَ الخَيرِ كُلِّه مَا عَلِمتُ مِنهُ وَمَا لَم أعلَم، وَأعُوذُ بِكَ مِنَ الشَّرِّ كُلِّه مَا عَلِمتُ مِنهُ وَمَا لَم أعلَم، اللَّهُمَّ إنِّي أسألُكَ مِن خَيرِ مَا سَألَكَ مِنهُ عِبَادُكَ الصَّالِحُون، وَأعُوذُ بِكَ مِن شَرِّ مَا استَعَاذَكَ مِنهُ عِبَادُكَ الصَّالِحُونَ، رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنيَا حَسَنَةً، وَفِي الآخِرَة حَسَنَةً، وَقِنَا عَذَابَ النَّار). واته: خوایه من داوای خێری هەموو ئەو شتانەت لێ ئەکەم کەئەیان زانم وە ئەوانەش کەنایان زانم، وە پەنا ئەگرم بەتۆ لەشەڕی هەموو ئەوشتانەی ئەیان زانم‌و ئەوانەشی کە نایان زانم، خوایه داوای خێری ئەوشتانەت لێ ئەکەم کە بەندە پیاوچاکەکانت داوات لێ ئەکەن، وە پەنات پێ ئەگرم لەشەڕی ئەوشتانەی بەندە پیاوچاکەکانت پەنات پێ ئەگرن لێی، پەروەردگارمان لەدنیاو ئاخیرەتدا چی چاکە ئەوەمان بدەرێ، وە لەئاگری دۆزەخ بمان پارێزە. ئەڵێ دوایی فەرمووی: هیچ دوعایەك نیە پێغەمبەرێك یان پیاوچاکێك پێی پاڕابێتەوە ئیللا لەم دوعایەدا دەی بینیتەوە (رواه ابن أبي شيبة وسعيد ابن منصور).

٢٠- یادەکان‌و دوعاکانی دوای پاڕانەوە:

له پێغەمبەرەوە ﷺ کۆمەڵێك زیکری خواو دوعا دوای سلاودانەوەی نوێژ هاتووە، سوننەتە بۆ نوێژکەر بیانڵێت، وە ئێمەش لەخوارەوە باسیان ئەکەین:

(١) له (ثوبان)ەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ سلاوی ئەدایەوە ئەیفەرموو: (أستغفرُ الله) سێجار، لەپاشاندا ئەیفەرموو: (اللَّهُمَّ أنتَ السَّلامُ وَمِنكَ السَّلامُ تَبَارَكتَ يَا ذَا الجَلالِ وَالإكرَام) (رواه الجماعة إلا البخاري). واته: داوای لێخۆشبوون لەخوا ئەکەم، خوایه تۆ سەلامیت‌و ئاشتی و ئاسایشیش له تۆوەیە، خێرو بەرەکەتت زۆر بوو ئەی خاوەن شکۆو ڕێز.

(٢) له موعاذی کوڕی جەبەلەوە خوای لێ ڕازی بێت دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێك دەستی گرتم‌و فەرمووی: (ئەی (معاذ) من تۆم خۆش ئەوێت)، منیش ووتم: دایك‌و باوکم فیدات بێ

---

[1] له هەموو (طبعة)کاندا نووسراوە عومەیری کوڕی سەعد، بەڵام ئەمە هەڵەیە، ڕاستی عومەیری کوڕی سەعیدە وەك له کتێبەکانی (رجال) دا هاتووە وە له (المصنف) ی (ابن أبي شيبة ١/٢٩٦-٢٩٧) دا ناوی تەواوی (عمير بن سعد النخعي الصبهاني) یە، ئەمما عومەیری کوڕی سەعد ئەوە ئەنصارییە، و ئەم صەحابییە ئەو نییە، پاشان عومەیری کوڕی سەعید سیقەیە له پیاوەکانی شەیخەینە، هەروەها لەم بەرەو خواریش له پیاوانی سەنەدەکە هەر سیقەیە، جا سەنەدەکە صەحیحە بڕوانە (تمام المنة).

ئەی نێرراوی خوا، منیش تۆم خۆش ئەوێت، فەرمووی: (ئەی (معاذ) وەسیەتت بۆ ئەکەم بەوەی، دوای هەموو نوێژێك بڵێی: (اللَّهُمَّ أعِنِّي على ذِكرِكَ وَشُكرِكَ وَحُسنِ عِبَادَتِكَ) (رواه أحمد وأبوداود والنسائي وابن خزيمة وابن حبان والحاكم، وقال: صحيح على شرط الشيخين). واتە: خوایە یارمەتیم بدە هەمیشە یادت بکەمو ستایشت بکەمو بەچاکی بت پەرستم.

لە ئەبو هورەیرەوە هاتوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: (أتُحِبُّونَ أن تَجتَهِدُوا فِي الدُّعَاءِ؟ قُولُوا اللَّهُمَّ أعِنَّا على ذِكرِكَ وَشُكرِكَ وَحُسنِ عِبَادَتِكَ) (رواه أحمد بسندٍ جيد). واتە: حەزئەکەن زۆر بەپەرۆشەوە بپاڕێنەوە؟ بڵێن: خوایە یارمەتیمان بدە لەسەرئەوەی هەمیشە یادی تۆو سوپاس گوزاری تۆ بکەینو بەچاکی تۆ بپەرستین.

(٣) لە عبدالله ی کوڕی زوبەیرەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ هەرکاتێك سلاوی ئەدایەوە ئەیفەرموو: (لا إلَهَ إلا اللهُ وَحدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ المُلكُ وَلَهُ الحَمدُ، وَهُوَ على كُلِّ شَيئٍ قَدِير، لا حَولَ وَلا قُوَّةَ إلا بِاللهِ، وَلا نَعبُدُ إلا إيَّاهُ، أهلُ النِّعمَةِ وَالفَضلِ وَالثَّنَاءِ الحَسَنِ، لا إلَهَ إلا اللهُ مُخلِصِينَ لَهُ الدِّينَ وَلَو كَرِهَ الكَافِرُون) (رواه أحمد ومسلم وأبوداود والنسائي). واتە: هیچ مەعبودێکی حەق نی یە کە شایستەی عیبادەت بێ جگە لە الله نەبێت، تاك و تەنها و بێ هاوبەشە، موڵکو ستایش هەربۆ ئەوە، وە هەرئەو توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، هیچ هێز و توانا و گۆڕانێك نی یە لەلای خواوە نەبێت، وە ئێمەش لەو زیاتر کەسی تر ناپەرستین، خاوەنی نیعمەت و چاکەو ستایشی چاك، هیچ مەعبودێکی حەق نی یە کە شایستەی عیبادەت بێ جگە لە الله نەبێت، وە پەرستنیش بە دڵو بەپاکی هەربۆ ئەوە، هەرچەندە بێباوەڕەکان لایان ناخۆشە.

(٤) لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ دوای هەموو نوێژە فەرزەکان ئەیفەرموو: (لا إلَهَ إلا اللهُ وَحدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ المُلكُ وَلَهُ الحَمدُ وَهُوَ على كُلِّ شَيئٍ قَدِير، اللَّهُمَّ لا مَانِعَ لِمَا أعطَيتَ وَلا مُعطِيَ لِمَا مَنَعتَ وَلا يَنفَعُ ذَا الجَدِّ مِنكَ الجَدُّ) (رواه أحمد والبخاري ومسلم). واتە: هیچ مەعبودێکی حەق نی یە کەشایستەی عیبادەت بێ، جگە لەخوا نەبێت، تەنها و بێ شەریکە، موڵك و ستایش هەر بۆ ئەوە، هەر ئەوە دەسەلاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، خودایە ئەوەی تۆ بیدەیت کەس ناتوانێ ڕێی لێ بگرێ، وە ئەوەش کە تۆ نەتدا کەس توانای دانی نی یە، خاوەن دەسەلاتەکان بێکەڵکن و ناتوانن سوود بەکەس بگەیەنن، چونکە دەسەلات هەر لای تۆوەیە.

(٥) لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کردووم لەدوای هەموو نوێژێك دو سوڕەتی (فلق و ناس) بخوێنم؟ (ئەحمەدو بوخاری و

موسلیم گێڕاویانەتەوە) وە لای ئەحمەد: (معوذات) بخوێنم، وە سورەتی (إخلاص)یش لە (معوذات)ە.

(٦) لە ئەبو ئومامەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس (آية الكرسي) لەدوای هەموو نوێژی فەرزێکەوە بخوێنێت تەنها مردن ڕێی چوونە بەهەشتی لێ ئەگرێ. (رواه النسائي والطبراني).

لە عەلی‌یەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس (آية الكرسي) دوای هەموو نوێژێکی فەرز بخوێنێ لەژێر سایەی پاراستنی خوادایە، لەونوێژەوە هەتا نوێژێکی تر. (رواه الطبراني بإسنادٍ حسن)[1].

(٧) لە ئەبوهورەیرەوە هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (هەرکەس دوای هەموو نوێژێك سی‌وسێ جار (سبحان الله) و سی‌وسێ جار (الحمد لله) و سی‌وسێ جار (الله أكبر) بکات ئەوە نەوەدونۆ جار، لە سەری سەدەمین بڵێت: (لا إلَه إلا اللهُ وَحدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلكُ وَلَهُ الحَمدُ وَهُوَ على كُلِّ شَيئٍ قَدِير) خوا لەتاوانەکانی ئەبوورێ، ئەگەر وەك کەفی دەریاش زۆر بن). (ئەحمەدو بوخاری‌و موسلیم‌و ئەبو داود گێڕاویانەتەوە).

(٨) لە کەعبی کوڕی عوجرەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتوە فەرموویەتی: کۆمەڵێ شت هەن هەرکەس بیان ڵێت یا بیان کات دوای هەموونوێژێك نائومێد نابێت، ئەویش وتنی: سی‌وسێ جار (سبحان الله)و سی‌وسێ جار (الحمد لله) و سی‌وچوار جار (الله أكبر)ە. (موسلیم گێڕاویەتی‌یەوە).

(٩) لە (سمیّ)ەوە لە ئەبوصالحەوە لە ئەبو هورەیرەوە هاتوە دەفەرمووێت: هەژارە موهاجیرەکان هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ وەتیان: دەوڵەمەندەکان بۆ خۆیان پلەی بەرزو شوێنی خۆشی بەهەشتیان بردو ڕۆیشتن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چۆن چۆنی؟ وتیان: وەك ئێمە نوێژەکەن‌و ڕۆژوو ئەگرن، وە خێرو صەدەقەش ئەکەن و بەندەو کۆیلەش ئازاد ئەکەن، ئێمەش نیمانە ئەوانە بکەین، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئایا شتێکتان فێر بکەم پێی بگەنە ئەوانەی پێشتان کەوتوون‌و پێش ئەوانە بکەون کە لەدوواتانەوە دێن، وە کەسیش لە ئێوە چاکتر نەبێت ئیللا کەسێك نەبێت کە وەك ئێوە بکات؟) وتیان: بەڵێ ئەی نێرراوی خوا فێرمان بکە، فەرمووی: دوای هەموو نوێژێك سی‌وسێ جار (سبحان الله) و (الله أكبر) و (الحمد لله) بکەن، پاش ماوەیەك هاتنەوە لای پێغەمبەر ﷺ و وتیان: برا دەسەلاتدارەکانمان کاتێ ئەوەیان بیست وەك ئێمە دەستیان پێ کرد، پێغەمبەر ﷺ

---

(١) لەمەدا لاسایی (منذري و هيثمي) کردۆتەوە ئەگینا (حافظ) لە (نتائج الأفكار)دا ئەڵێت: فەرموودەیەکی غەریبەو لەسەنەدەکەیدا لاوازی هەیە.

فەرمووی: (ئەوە فەزلی خوایە کێی ئارەزوو کرد ئەیداتێ)، (سمیٌّ) دەفەرمووێت: کاتێ ئەم (حدیث)ەم بۆ هەندێ کەس و کارم گێڕاوە ووتیان: لێت تێك چووە بەڵکو پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووی: سی‌وسێ جار (سبحان الله) و سی‌وسێ جار (الحمد لله)و سی‌وسێ جار (الله أكبر) بکەیت، جا منیش گەڕامەوە بۆلای ئەبو صالح و ئەوەم بۆ گێڕایەوە، ئەویش دەستی گرتم و فەرمووی: (الله أكبر، وسبحان الله، والحمد لله، والله أكبر) (وسبحان الله، والحمد لله) هەتا کۆیان ئەگاتە سی‌وسێ جار (بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە).

(١٠) هەروەها بە صەحیحی هاتووە: بیستو پێنج جار ووتنی (سبحان الله)، وە بیستو پێنج جار (الحمد لله)، وە بیستو پێنج جار (الله أكبر)، وە بیستوپێنج جار ووتنی: (لا إلَهَ إلا اللهُ وَحدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ المُلكُ وَلَهُ الحَمدُ، وَهُوَ على كُلِّ شَيئٍ قَدِير)[1].

(١١) لە عبدالله ی کوڕی عەمرەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (خِصلَتَانِ مَن حَافَظَ عَلَيهِمَا، أدخَلَتَاهُ الجَنَّةَ، وَهُمَا يَسِيرٌ وَمَن يَعمَلُ بِهِمَا قَلِيلٌ)، قَالُوا: وَمَا هُمَا يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: (أن تَحمَدَ اللهَ وَتُكَبِّرَهُ وَتُسَبِّحَهُ دُبُرَ كُلِّ صَلاةٍ مَكتُوبَةٍ عَشراً عَشراً، وَإذَا أتَيتَ إلى مَضجِعِكَ، تُسَبِّحُ اللهَ وَتُكَبِّرُهُ وَتَحمَدُهُ مِئَةً، فَتِلكَ خَمسُونَ وَمِأتَانِ بِاللِّسَانِ، وَألفَانِ وَخَمسَمِائَة فِي المِيزَانِ، فَأيُّكُم يَعمَلُ فِي اليَومِ وَاللَّيلَةِ ألفَينِ وَخَمسَمائَةِ سيئة؟) قَالُوا: كَيفَ

---

(١) ئەم شێوەو چۆنێتی‌یەی لە (زاد المعاد) ەوە وەرگرتووە و ئەی داوەتە پاڵ کەس، وە ئەو بەوە ئاماژە دەکات بۆ حەدیسی زەیدی کوڕی (ثابت) کە دەفەرمووێت: فەرمانیان پێ کرا بەوەی لەدوای هەموو نوێژێك سی‌وسێ جار سبحان الله و سی‌وسێ جار (الحمد لله) و سی‌وسێ جار (الله أكبر) بکەن، جا پیاوێك لە ئەنصاری‌یەکان خەوی بینی پێی ووترا: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردوون بەوەی (سبحان الله) بکەن و...؟ (حەدیسەکە)، فەرموی بەڵێ، فەرمووی جا بیکەن بە بیستوپێنج جار، وە ووتنی (لا إله إلا الله) ی تێ بکەن، کاتێك بەخەبەر هاتەوە هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ و بۆی گێڕایەوە، فەرمووی: ئاوەهای لێ بکەن.

نسائی (١/١٩٨) دەی گێڕێتەوە لە ئیبنو عومەرەوە بەو شێوەیە بە دوو سەنەدی صەحیح، یەکەمیان (ترمذي ٣٤١٠) تەخریجی کردووە هەروەها ئیبنو خوزەیمە (٧٥٢) و حاکم (١/٢٥٣) و (ذهبي).

ووتەی: (التهليل) کە لە حەدیسەکەدا هاتووە هیچ نایەت بە مێشکا جگە ووتنی (لا إله إلا الله) نەبێت، ئەوە مەبەستە پێی لە زمانەوانیدا هەروەك لە (لسان العرب) دایە، وە زیاد کردن لەسەر ئەو زیکرە لێرە پێویستی بە دەقە، وە دەق لێرەدا نی‌یە و ئەمە شتێکە کە تەعلیق دەر لەسەر (زاد المعاد) ئاگادار نەبووە لێی، تەنها حەدیسەکە و تەخریجەکەی هێناوە و بەس.

زاهیری‌یەکەی مەبەست لەو حەدیسە ئەوەیە بیست و پێنج جار بڵێت: (سبحان الله، والحمد لله، ولا إله إلا الله، والله أكبر)، زیانیشی نی‌یە بە هەرکامێکیان دەست پێ بکات (تمام المنة).

مَن يَعمَلُ بِهَا قَلِيل؟ قَالَ: (يَجِيئ أَحَدَكُمُ الشَّيطَانُ فِي صَلاتِهِ فَيُذَكِّرُهُ حَاجَةَ كَذَا وَكَذَا، فَلا يَقُولُها، وَيأتِيهِ عِندَ مَنَامِهِ فَيُنَوِّمُهُ فَلا يَقُولُها) قَالَ: وَرَأيتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَعقِدُهُنَّ بِيَدِهِ) (رواه أبوداود والترمذي وقال: حسن صحيح). واته: دوو شت هەن هەرکەس لەسەریان بڕواتەو بەردەوام بێت ئەچێتە بەهەشتەوە، هەرچەندە ئاسانن، بەڵام کەم کەس ئەیانکات، ووتیان: ئەی نێرراوی خوا ئەو دوو شتە چییە؟ فەرمووی: دوای هەموو نوێژێك دە، دە، ووتنی (الحمد لله و الله اکبر و سبحان الله)یە، وە کاتی نوستنیشی سەد جار (سبحان الله و الله اکبر و الحمد لله) بکە، ئەوە دوسەدو پەنجا بە زبانەو دوو هەزارو پێنج‌سەد بە تەرازوو، جا کامتان دوو هەزارو پێنج سەد گوناح ئەکات لە شەوو ڕۆژێکدا؟ ووتیان: چۆن، کەم کەس ئەیکات؟ فەرمووی: شەیتان لەنوێژەکەیدا دێتەلای کەسێکتان گەلێ پێویستی وەبیر ئەهێنێتەوە ئیتر ئەویش نایانلێت، وە لەکاتی خەوتندا دێتەوە بۆلای و ئەیخەوێنێ ئیتر نایلێت، عبد الله دەفەرموێت: بەچاوی خۆم پێغەمبەرم ﷺ بینیوە بە پەنجەکانی ئەی ژماردن.

(١٢) لە عەلییەوە هاتوە کاتێك کە ئەوو (فاطمة) داوای خزمەتکارێکیان کرد بۆ ئەوەی نەختێ یارمەتیان بدات، پێغەمبەر ﷺ پشتگیری داواکەیانی نەکرد، و فەرمووی: (ئایا شتێکتان پێ ڕانەگەیەنم کە باشتر بێت لەوەی داوای ئەکەن؟) ووتیان: با ، چۆن؟ پاشان فەرمووی: (چەند ووشەیەك جبریل ـ علیه السلام ـ فێری کردووم، لەدوای هەموو نوێژێکەوە دە جار (سبحان الله) و دەجار (الحمد لله) و دەجار (الله أکبر) بکەن، وکاتێ ویستتان بخەون سی‌وسێ جار (سبحان الله) و سی‌وسێ جار (الحمد لله) و سی‌وسێ جار (الله اکبر) بکەن، عەلی خوا لێی رازی بێت دەفەرموێت: سوێند بەخوا لەوکاتەوە پێغەمبەر ﷺ فێری کردووم وازم لێ نەهێناوە.

(١٣) لە عبدالرحمنی کوڕی غەنمەوە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن قَالَ قَبلَ أن يَنصَرِفَ وَيُثنِيَ رِجلَهُ مِن صَلاةِ المَغرِبِ وَالصُّبحِ: لا إِلَهَ إلا اللهُ وَحدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ المُلكُ وَلَهُ الحَمدُ بِيَدِهِ الخَيرُ يُحيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ على كُلِّ شَيئٍ قَدِير، عَشرَ مَرَّاتٍ، كُتِبَ لَهُ بِكُلِّ وَاحِدَةٍ عَشرَ حَسَنَاتٍ وَمُحِيَت عَنهُ عَشرَ سَيِّئَاتٍ وَرُفِعَ لَهُ عَشرُ دَرَجَاتٍ، وَكَانَت حِرزاً مِن كُلِّ مَكرُوهٍ، وَحِرزاً مِنَ الشَّيطَانِ الرَّجِيم، وَلَم يَحِلَّ لِذَنبٍ يُدرِكُهُ إلا الشرك، فَكَانَ مِن أفضَلِ النَّاسِ عَمَلاً، إلا رَجُلاً يَفضُلُه، يَقُولُ أفضَلَ مِمَّا قَالَ) رواه أحمد[1]. واتە: هەرکەس لە نوێژی ئێوارەو بەیانی بۆوەو لە پێش

(١) (ترمذي) دەفەرموێت: حەدیسەکە (حسن غريب صحيح) ،، وە لەم بە صەحیح دانانەی تێڕوانینی تێدایە، لەبەر ئەوەی لە ریوایەتی (شهر بن حوشبة)، لە (عبد الرحمن بن غنم)ەوە، بە دانانی فەتحە لەسەر غەینەکە لەسەر قەولی صەحیح هەروەك باس کرا لە لەلایەن (حافظ)ەوە (ص٥٩)، جا لە سەنەد و مەتنەکەیدا (اضطراب) ی لەسەر (ابن غنم) کردووە..

ئەوەدا کە قاچی لا بدات و بڕوات، دە جار بڵێت: (لا إله إلا الله وحده لاشريك له، له الملك وله الحمد بيده الخير يحيي ويميت وهو علي كل شئ قدير) بە هەر جارێك دە چاکەی بۆ ئەنووسرێتو دە خراپەی لەسەر لائەبرێت، و دە پلە بەرز ئەکرێتەوە، وە بۆی ئەبێتە پەرژینێکو ڕێگرێك لە هەمو ناخۆشی‌یەك، وە لە شەیتانی ڕەجم کراو، وە هیچ تاوانێك نایفەوتێنێ جگە لە هاوبەش پەیدا کردن بۆ خوا، پاشان لە هەمموو کەس چاکترە، مەگەر کەسێك چاکتر لەوەی کە ئەو دەیڵێت ، بیڵێ ، پیشی بکەوێ لە چاکیدا. (ترمذي)یش ئەمەی ڕیوایەت کردووە بەڵام (بيده الخير) ی تێدا نی‌یە.

(١٤) لە موسلیمی کوڕی (حارث)ەوە هاتوە کە لە باوکی‌یەوە دەگێڕێتەوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: کاتێ نوێژی بەیانیت کرد پێش ئەوەی قسە لەگەڵ کەس بکەیت حەوت جار بڵێ: (اللَّهُمَّ أجِرنِي مِنَ النَّار) واتە: خوایە پەنام بدە لەئاگری دۆزەخ. جا ئەگەر ئەو ڕۆژە مردیت خوا پەنات لەئاگر بۆ ئەنووسێت، وە کاتێ نوێژی ئێوارەت کرد پێش ئەوەی قسە لەگەڵ کەسدا بکەیت حەوت جار بڵێ: (اللَّهُمَّ إنِّي أسألُكَ الجَنَّةَ، اللَّهُمَّ أجِرنِي مِنَ النَّار) واتە: خوایە من داوای بەهەشتت لێ ئەکەم، خوایە پەنام بدە لە ئاگری دۆزەخ، جا ئەگەر ئەو شەوە مردیت خوای گەورە پەنات بۆ ئەنووسێت لە ئاگر. (ئەحمەدو ئەبو داود گێڕاویانەتەوە).

(١٥) ئەبو حاتم ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ لەنوێژ ئەبووەوە ئەیفەرموو: (اللَّهُمَّ أصلِح لِي دِينِي الَّذي هُوَ عِصمَةُ أمرِي، وَأصلِح لِي دُنيَايَ الَّتِي جُعِلَت فِيهَا مَعَاشِي، اللَّهُمَّ إنِّي أعُوذُ بِرِضَاكَ مِن سَخَطِكَ، وَأعُوذُ بِعَفوِكَ مِن نِقمَتِكَ، وَأعُوذُ بِكَ مِنكَ، لا مَانِعَ لِمَا أعطَيتَ، وَلا مُعطِيَ لِمَا مَنَعتَ، وَلا يَنفَعُ ذَا الجَدِّ مِنكَ الجَدُّ)[1] . واتە: خوایە ئایینەکەم کە هێزو پارێزەری کارو فەرمانمە

---

وە بە شێوەیەکی گشتی ئەم (اضطراب) ە لەم سەنەدو مەتنەدا ئەگەر لە سیقە پێ کراوێکەوە بووەشێتەوە دڵت زۆر پێی مورتاح نابێت بۆ حەدیسەکەی، چ جای لە کەسێکی وەك (شهر) کە بە (ضعف) ناوی دەر کردووە؟!

لەگەڵ هەموو ئەمەدا بۆ ئەم حەدیسەی (ابن غنم) شەواهیدم بۆ دۆزیوەتەوە تا بەهێزی بکات لەگەڵ ئەو هەموو زیادانەی باسم لێوە کردووە، کە لە چەند حەدیسێکی جیا جیادا هاتووە، لە (صحيح الترغيب والترهيب)١/٢٦٢/٤٦٩-٤٧٢ دا هێناومەتەوە (چاپی مكتبة المعارف، الرياض) وە هەندێکیم تەخریج کردووە لە (الصحيحة ٢٥٦٣)دا، خواش پشتیوان و یارمەتی دەر بێت. (تمام المنة).

(١) نازانم دانەر ئەم تەخریجەی لە کوێوە هێناوە، من بەم بەشەوە نەم بینیوە: (دبر كل صلاة) لەلای ئەو دووانەی کە باس کراون، وە هەروەها بەو تەواوەتی‌یە لەلای حاکمیش نەمینێتەوە، جا بفەرموو بۆت ڕوون بکەمەوە:

یەکەم: أبود داود لە (الأدب) دا (٥٠٩٠) لە ڕێگای جەعفەری کوڕی (ميمونة) وە دەفەرمووێت: کە عبدالرحمنی کوڕی ئەبی بەکرە بۆی گێڕامەوە کە بە باوکی فەرموو: بابە! من هەموو بەیانی‌یەك دەبینم کە تۆ دوعا دەکەیت: (اللهم عافني في بدني، اللهم عافني في سمعي، اللهم عافني في بصري، لا إله إلا أنت) سێ جار دوو بارەی

بۆم چاك بكە، وە ئەو دنیایەی تێیدا ئەژیم بۆم چاك بكە، خوایە من پەنا ئەگرم بە ڕەزا بوونت لە خەشمو قینت، وە پەنا ئەگرم بە لێبووردنت لە توڕەبوونت، وە پەنا ئەگرم بە تۆ لەخۆت، خوایە هەرچی تۆ دات، كەس ناتوانێ ڕێی لێ بگرێت، وە هەرچی تۆ نەتدا كەس ناتوانێ بیدات، خوایە دەسەلاَت داران هەوڵیان بێ سوودە، چونكە هەوڵ و تێكۆشان لای تۆوە دێت.

(١٦) بوخاری و (ترمذي) ئەگێڕنەوە كە سەعدی كوڕی ئەبی وەققاص منداڵەكانی فێری ئەم ووشانە ئەكرد: وەك چۆن ماموٚستا منداڵ فێری نووسین ئەكات، وە ئەیفەرمو: پێغەمبەری خوا ﷺ دوای نوێژ پەنای بەمانە ئەگرت: (اللَّهُمَّ إنِّي أعُوذُ بِكَ مِنَ البُخلِ، وَأعُوذُ بِكَ مِنَ الجُبنِ، وَأعُوذُ بِكَ أن أُرَدَّ إلى أرذَلِ العُمُرِ، وَأعُوذُ بِكَ مِن فِتنَةِ الدُّنيا، وَأعُوذُ بِكَ مِن عَذابِ القَبرِ). واته:

---

دەكەیتەوە كە ئەكەویتە بەیانی‌یەوە، وە سێ‌جاریش كە ئەكەویە ئێوارەوە؟ فەرمووی: من گوێم لە پێغەمبەری خوا بووە ﷺ بەمانە دەپاڕایەوە، و منیش پێم خۆش بووە بە سوننەتەكەی ئەو بكەم جا، وە ئەفەرمووێت: (اللهم إني أعوذ بك من الكفر والفقر، اللهم إني أعوذ بك من عذاب القبر، لا إله إلا أنت) سێ جار بیڵێ كاتێك ڕۆژ بۆوە، و سێ جار بیڵێ كە شەو داهات، وە بەمانە دەپاڕێیتەوە، منیش پێم خۆشە بە سوننەتەكەی بكەم.

وە لەو ڕووەوە نەسائی لە (عمل اليوم والليلة) دەیگێڕێتەوە بە ژمارە (٥٧٢,٢٢) وە هەروەها (ابن السني ٦٧) و ئەحمەد (٥/٤٢). نەسائی دەفەرمووێت: (جعفر بن ميمون ليس بالقوي) منیش دەڵێم: ئەوە ئیختیلاقی لەسەرە، (حافظ) دەفەرمووێت: (صدوق يخطئ).

منیش دەڵێم: سەنەدەكەی حەسەنە یان نزیكە لە حەسەنەوە.

دووەم: حاكم زۆر بەكورتی دەیگێڕێتەوە (١/٣٥) لە ڕێگایەكی ترەوە: هەر لە (أبي بكرة)ەوە دەفەرمووێت: گوێم لە پێغەمبەر بوو ﷺ دەیفەرموو: (اللهم إني أعوذ بك من الكفر والفقر وعذاب القبر)، حاكم دەفەرمووێت: صەحیحە لەسەر مەرجی موسلیم، و (ذهبي)ش موافەقەی كردووە، وە هەرواشە كە دەفەرموون.

نەسائی (١/١٩٨و٢/٣١٥)، تەخریجی كردوەو (ابن السني)ش لەوەوە لە (عمل اليوم والليلة ١٠٩)، وە دووبارە حاكم (١/٢٥٢-٢٥٣)، و ئەحمەد (٥/٤٤و٣٦) بە تەواتر لەوەوە لە موسلیمی كوڕی ئەبی بەكرەوە هاتوە دەفەرمووێت: باوكم لە دوای هەموو نوێژێكی فەرزەوە دەیفەرموو: (حەدیسەكەی گێڕایەوە)، و منیش دەم ووتەوە، باوكم فەرمووی: كوڕم ئەمەت لە كێ وەرگرتووە؟ ووتم: لەخۆتەوە، فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوای نوێژ دەیانی ووتەوە.

منیش دەڵێم: بەم تەخریج و لێكۆڵینەوەیە ڕوون بۆوە كە لەلای حاكم لەم حەدیسە بێجگە لە پەنا گرتن لە كوفرو هەژاری و سزای ناوگۆڕ نەبێت هیچی تر نی‌یە، جا پەنا گرتن بەم سیانە بوو پێغەمبەر ﷺ دەیانی ووتەوە لە دوای نوێژ، بە پێچەوانەی دوعا كردن بە (معافاة) لەش ساغی كە لەلای ئەبو داود و جگە لەویش هەیە، ئەوە پەیوەست نی‌یە بە نوێژەوە، والله أعلم. (تمام المنة).

خوایه پەنا ئەگرم بەتۆ لەبەخیلی و ڕەزیلی، خوایە پەنا ئەگرم بە تۆ لەترسنۆکی، وە پەنا ئەگرم بەتۆ لەوەی کە بهێڵیتەوە تا کۆتایی تەمەن لە حاڵەتی پیری و بێ توانایی و خەڵەفاویدا، وە پەنا ئەگرم بە تۆ لە فیتنەی دنیا، وە پەنا ئەگرم بە تۆ لەسزای ناوگۆڕ.

(١٧) ئەبو داود و حاكم ئەگێڕنەوە كە پێغەمبەر ﷺ دوای هەموو نوێژێك فەرموویەتی: (اللَّهُمَّ عَافِنِي فِي بَدَنِي، اللَّهُمَّ عَافِنِي فِي سَمعِي، اللَّهُمَّ عَافِنِي فِي بَصَرِي، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الكُفرِ وَالفَقرِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِن عَذَابِ القَبرِ، لا إِلَهَ إِلا أَنتَ). واتە: خوایە لاشەو گوێو چاوم ساغ و تەندروست بكە، دووریان كە لە خراپەكاری، خوایە من پەنا ئەگرم بەتۆ لە كوفرو هەژاری، خوایە پەنا ئەگرم بە تۆ لەسزای ناوگۆڕ، جگە لە تۆ هیچ مەعبودێكی حەق نییە كە شایستەی عیبادەت بێ[1].

(١٨) ئیمام ئەحمەدو ئەبو داودو نسائی ئەگێڕنەوە بە سەنەدێك كە (داود)ی (طفاوي) تێدایە كە ئەویش زەعیفە[2] لە زەیدی كوڕی ئەرقەمەوە، كە پێغەمبەر ﷺ لە دوای نوێژەوە ئەیفەرموو: (اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَرَبَّ كُلِّ شَيءٍ، أَنَا شَهِيدٌ أَنَّكَ الرَّبُّ وَحدَكَ لا شَرِيكَ لَكَ، اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَرَبَّ كُلِّ شَيءٍ، أَنَا شَهِيدٌ أَنَّ مُحَمَّداً عَبدُكَ وَرَسُولُكَ، اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَرَبَّ كُلِّ شَيءٍ أَنَا شَهِيد أَنَّ العِبَادَ كُلَّهُم إِخوَةٌ، اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَرَبَّ كُلِّ شَيءٍ، اجعَلنِي مُخلصاً لَكَ وَأَهلِي فِي كُلِّ سَاعَةٍ مِنَ الدُّنيَا وَالآخِرَةِ، يَا ذَا الجَلالِ وَالإِكرَامِ، اسمَع وَاستَجِب، اللهُ الأَكبَرُ الأَكبَرُ، نُورُ السَّمَوَاتِ وَالأَرضِ، اللهُ الأَكبَرُ الأَكبَرُ، حَسبِيَ اللهُ وَنِعمَ الوَكِيلِ، اللهُ الأَكبَرُ الأَكبَرُ). واتە: خوایە تۆ پەروەردگاری ئێمەو پەروەردگاری هەموو شتێكی، من شایەتم كەتۆ پەروەردگارێكی تەنهاو بێ شەریكی، خوایە پەروەردگاری ئێمەو پەروەردگاری هەموو شت، من شایەتم كە موحەممەد بەندەو نێرراوی تۆیە، خوایە پەروەردگاری ئێمەو پەروەردگاری هەموو شت، من شایەتم كە هەموو بەندەكانت برای یەكن، خوایە پەروەردگاری ئێمەو پەروەردگاری هەموو شت خۆم و كەسوكارم وا لێبكە تەنها تۆ بپەرستن بەدڵی پاكەوە لەهەموو كاتێكی دنیاو ئاخیرەتدا، ئەی بەشكۆو بەرێز ببیستە لێمو وەڵامم بدەرەوە، خوا گەورەترین گەورەیە،

(١) داوێتییە پاڵ ئەبوحاتم وە ئەم (كنية)ە هەركاتێك بە (مطلق)ی هات مەبەست پێی ئەبو حاتەمی رازییە و ناوی موحەممەدی كوڕی ئیدریسە، باوكی عبدالرحمنە خاوەنی (الجرح والتعديل). وە ئەم تەخریجكەری حەدیسەكە نییە، بەڵكو (أبو حاتم ابن حبان البستي)ە، بۆیە پێویست بوو لەسەر دانەر بە شتێك وەسفی بكات تا ئەو تێكەڵ بوونە نەمێنێ، بە تایبەت كە ئەو ئەمەی لە (زاد المعاد) نەقل كردووە، دەفەرموورێت: (وقد ذكر أبو حاتم في صحيحه...) جا ووتەی (في صحيحه) دانەر كورتی كردۆتەوە بۆیە تێكەڵ بوونەكە دروست بوو (تمام المنة).

(٢) ئاماژە بۆ لاوازی حەدیسەكە دەكات.

ڕۆشنایی ئاسمانەکانو زەوی‌یە، خوا گەورەترین گەورەیە، خوام بەسەو ئەو چاکترین وەکیلە، خوا گەورەترین گەورەیە.

(١٩) ئەحمەدو ئیبنو ئەبی شەیبەو ئیبنو ماجە بە سەنەدێك کە مەجهولێکی تێدایە[1] لە ئوموسەلەمەوە ئەگێڕنەوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ سلاوی نوێژی بەیانی ئەدایەوە ئەیفەرموو: (اللَّهُمَّ إنِّي أسأَلُكَ عِلماً نَافِعاً، وَرِزقاً وَاسِعاً، وَعَمَلاً مُتَقَبَّلاً). واتە: خوایە داوای زانستی‌یەکی بەسوود و ڕۆزی‌یەکی فراوان و کردەوەیەکی وەرگیراوت لێ ئەکەم.

## نوێژی سوننەت (تطوع)

### ١- مەشروعی‌یەتی:

نوێژە سوننەتەکان دانراون بۆ ئەوەی ئەگەر کەموکوڕی‌یەك هەبێت لەنوێژە فەرزەکاندا پێ‌ی پڕبکرێتەوە، وە لەبەر ئەوەی فەزڵ و گەورەیی‌یەك کە لەنوێژدا هەیە لە هیچ عیبادەتێکی تردا نی‌یە.

لە ئەبو هورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إنَّ أوَّلَ مَا يُحَاسَبُ النَّاسُ بِهِ يَومَ القِيامَةِ مِن أعمَالِهِمُ الصَّلاةُ، يَقُولُ رَبُّنَا لِمَلائِكَتِهِ، وَهُوَ أعلَمُ: أُنظُرُوا فِي صَلاةِ عَبدِي أتَمَّهَا أم نَقَصَهَا؟ فَإن كَانَت تَامَّةً كُتِبَت لَهُ تَامَّةً، وَإن كَانَ انتَقَصَ مِنهَا شَيئاً قَالَ: أُنظُرُوا هَل لِعَبدِي مِن تَطَوُّعٍ؟ فَإن كَانَ لَهُ تَطَوُّعٌ قَالَ: أتِمُّوا لِعَبدِي فَرِيضَتَهُ مِن تَطَوُّعِهِ ثُمَّ تُؤخَذُ الأعمَالُ عَلى ذَلِكَ) (رواه أبو داود). واتە: یەکەم کردەوە کە خەڵکی لەسەر موحاسەبە بکرێت، لە ڕۆژی دواییدا نوێژە، پەروەردگارمان بە فریشتەکانی ئەفەرمووێت: هەرچەندە خۆی ئەزانێ، سەیری نوێژەکانی ئەو بەندەیەم بکەن ئایا بەتەواوی بەجێ‌ی هێناوون یا کەموکوڕی هەیە؟ جا ئەگەر تەواو بوون بۆی ئەنووسرێت تەواون، بەڵام ئەگەر شتێکیان کەمو کوڕی هەبوو ئەفەرمووێ: سەیرکەن بزانن بەندەکەم نوێژی سوننەتی هەیە؟ جا ئەگەر هەیبوو ئەفەرمووێت: نوێژە فەرزەکانی بەندەکەم بەنوێژە سوننەتەکان تەواو بکەن، لەپاشاندا لەسەر ئەوەوە کردەوەکانی تری وەرئەگیرێت.

---

(١) بەڵام (طبراني) لە (المعجم الصغير) دا گێڕاویەتی‌یەوە بە سەنەدێکی جەیید و ئەو مەجهولەی تێدا نی‌یە، هەروەك ڕوونم کردۆتەوە لە (الروض النضير١١٩٩).

ئاگاداری: لە چاپەکانی کتێبەکەدا ئەداتی (كنية)کە کەوتووە کە (أبي)ە، وە لە (مصنف ابن أبي شيبة ١٠/٢٣٤)دا لە ڕێگای ئەو مەجهولەوەیە. (تمام المنة).

له ئەبو ئومامەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَا أذِنَ اللهُ لِعَبدٍ فِي شَيئٍ أفضَلَ مِن رَكعَتَينِ يُصَلِّيهِمَا، وَإنَّ البِرَّ لَيُذَرُّ فَوقَ رَأسِ العَبدِ مَا دَامَ فِي صَلاتِه) (رواه أحمد والترمذي وصححه السيوطي)[1]. واتە: خوا ڕێی هیچ شتێکی نەداوە بە بەندەکەی کە بیکات چاکتر بێت لە دوو ڕکات نوێژ کە بەجێی بهێنێ، بەڕاستی چاکە ئەبارێت بەسەر ئەوبەندەیەدا هەتا لەنوێژدا بێت.

مالیك لە (الموطأ)دا دەفەرمووێت: پێم گەیشتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (اسْتَقِيمُوا وَلَن تُحصُوا، وَاعلَمُوا أنَّ خَيرَ أعمَالِكُمُ الصَّلاةُ، وَلَن يُحَافِظَ على الوُضُوءِ إلا مُؤمِنٌ)[2]. واتە: لە هەموو شتێکدا ڕاست بن تاوەکو لانەدەن، هەرچەندە ناشتوانن بەرێك و پێکی ڕاست بن، وە بزانن چاکترین کردەوەتان نوێژە، وە باوەڕدار نەبێت کەس پارێزگاری دەست نوێژ ناکات.

موسلیم ئەگێڕێتەوە لەڕەبیعەی کوڕی مالیکی ئەسلەمی یەوە کە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (داوا بکە) ووتم: ئەمەوێ لەبەهەشتا هاوەڵت بم، فەرمووی: (جگە لەوە) ووتم: هەر ئەوەم ئەوێت، فەرمووی: (دە یارمەتیم بدە لەسەر بۆ خۆت بە سوجدە بردنی زۆر).

٢- موستەحەببە نوێژی سوننەت لەماڵەوە بکرێ:

أ- ئەحمەدو موسلیم لەجابیرەوە ئەگێڕنەوە کە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذَا صلى أحَدُكُمُ الصَّلاةَ فِي مَسجِدِهِ فَليَجعَل لِبَيتِهِ نَصِيباً مِن صَلاتِهِ، فَإنَّ اللهَ عزَّ وَجلَّ جَاعِلٌ فِي بَيتِهِ مِن صَلاتِهِ خَيراً). واتە: ئەگەر کەسێکتان لە مزگەوتدا نوێژی کرد بەشی ماڵەوەش بهێڵێتەوە، چونکە ئەو نوێژەی لەماڵەوە ئەیکات خوای گەورە خێری تیا داناوە بۆی.

---

(١) (سيوطي) ئەم حەدیسەی تەصحیح کردووە لە (الجامع الصغير) دا بە هێما، و لە پێشەکی یەکەی باسی ئەوەم کردووە کە پشت نابەسترێت بە هێماکانی، وە هۆیەکەیم لەوێدا ڕوون کردۆتەوە جا بگەڕێوە بۆی.

وە ئەم حەدیسە شایەتە لەسەر ئەوەی کە باسم کرد چونکە سەنەدەکەی (ضعيف)ە، لەبەر ئەوەی لە ریوایەتی بەکری کوڕی خونەیسە، وە ئەم (ضعيف)ی تێدایە، لە (ليث ابن سليم) ەوە هاتووە، تەخریجکەرەکەشی کە (ترمذي) یە (تضعيف) ی کردووە، پاشان درێژەی ووتەم پێ داوە لە (سلسلة الأحاديث الصحيحة ١٩٥٧)دا.

(٢) دانەر کارێکی باشی نەکردووە بەوەی کە گێڕاویەتی یەوە بۆلای مالیك بە (بلاغ) ی بەبێ سەنەد، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ بە مێشکدا کە حەدیسەکە زەعیفە و سەنەدی نی یە، لەگەڵ ئەوەشدا کە حەدیسێکی صەحیحە بە موسنەدی هاتووە لە (ثوبان) ەوە خوا لێی ڕازی بێت، ئیمامی ئەحمەد لە سێ ڕێگاوە تەخریجی کردووە، و ئەگەر بیدایەتە پاڵ ئەم باشتر دەبوو، پاشان تەخریجی ئەم ڕێگایانەم کردووە لەگەڵ شەواهیدەکانی حەدیسەکە لە (إرواء الغليل ٤١٢) دا. (تمام المنة).

ب- وە لای ئەحمەد لە عومەرەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (صَلاةُ الرَّجُلِ فِي بَيتِهِ تَطَوُّعاً نُورٌ، فَمَن شَاءَ نَوَّرَ بَيتَهُ)[1]. واتە: نوێژی سوننەتی پیاو لەماڵەوە ڕۆشنایییە، جا هەرکەس ئەیەوێت ماڵەکەی ڕۆشن بکاتەوە با بیکا.

ج - لە عبداللە ی کوڕی عومەرەوە خوایان لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إجعَلُوا مِن صَلاتِكُم فِي بُيُوتِكُم، وَلا تَتَّخِذُوهَا قُبُوراً) (رواه أحمد وأبو داود)[2]. واتە: هەندێ لەنوێژەکانتان لەماڵەوە بکەن ماڵەکانتان مەکەنە گۆڕستان. ـ چونکە: گۆڕستان نوێژی لێ ناکرێ ـ .

د ـ ئەبو داود بە ئیسنادێکی صەحیح لە زەیدی کوڕی (ثابت)ەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (صَلاةُ المَرءِ فِي بَيتِهِ أفضَلُ مِن صَلاتِهِ فِي مَسجِدِي هَذَا إلا المَكتُوبَةَ) واتە: ئەو نوێژەی پیاو لەماڵەوە ئەیکات چاکترە لەو نوێژەی لەم مزگەوتەمدا ئەیکات، جگە لەنوێژە فەرزەکان.

لەم (حديث)انەدا بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە نوێژی سوننەت موستەحەببە لەماڵەوە بکرێ، وەکردنی لەماڵەوە باشترە وەك لە مزگەوت.

ئەوەی دەفەرمووێت: بۆیە پێغەمبەر ﷺ خەڵکی هانداوە بۆ کردنی نوێژی سوننەت لەماڵەوە لەبەر ئەوەی بەنهێنییەو دوورە لەڕیاو پارێزراوە لەهەڵوەشێنەرەوەکانی کردەوەکان، وە لەبەر ئەوەی ماڵەوەش تووشی بەرەکەت بێت و ڕەحمەتو مەلائیکەی بۆ بێتە خوارێو شەیتانیش ڕابکا لێی.

٣- لەنوێژی سوننەتدا زۆر بەپێوە وەستان چاکترە لەزۆر مانەوە لەسەجدەدا:

(جماعة) جگە لە ئەبو داود لەموغیرەی کوڕی شوعبەوە ئەگێڕنەوە کە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە بەپێوە ڕائەوەستا لەنوێژدا هەتا پێکانی یا قاچەکانی هەڵئەئاوسان، لەوبارەیەوە پێیان ووت: ئەویش فەرمووی: (أفَلا أكُونُ عَبداً شَكُوراً) واتە: ئەی نابێت بەندەیەکی سوپاسگوزاری خوابم؟

ئەبو داود لە عبداللە ی کوڕی (حُبشي خثعمي) یەوە ئەگێڕێتەوە دەفەرمووێت: لەپێغەمبەریان ﷺ پرسی، کام کردەوە چاکترین کردەوەیە؟ فەرمووی: (زۆر بەپێوە وەستان لەنوێژدا) ووتیان: ئەی

---

(١) ئیسنادی (حديث)ەکە لاوازە (مجهول) نادیارێکی تێدایە، و من ئەمەم ڕوون کردۆتەوە لە (التعليق الرغيب ١/١٥٩) دا پاشان لە (تخريج أحاديث المختارة ٢٤٨-٢٤٩)دا (تمام المنة).

(٢) دانەر زۆر دوور کەوتەوە، حەدیسەکە لە هەردوو صەحیحیشدا هەیە لە ئیبنوعومەرەوە! وە تەخریج کراوە لە (صحيح أبي داود ١٠٢٧)دا.

کام صەدەقە باشترین صەدەقەیە؟ فەرمووی: (ئەوەی لەسەر دەست کورتی‌یەوە بکرێت) ووتیان: ئەی کام کۆچ کردن باشترین کۆچ کردنە؟ فەرموی: (کۆچ کردن لەو شتانەی خوا حەرامی کردوون) ووتیان: ئەی کام جیهاد چاکترینی جیهادە؟ فەرمووی: (جیهادێك دژی موشریکان بەماڵ و بەگیان بکرێت) ووتیان: ئەی کام کوژران شەریفترین کوژرانە؟ فەرمووی: (کەسێك خوێنی بڕژێت و وورگی ئەسپەکەی بدڕێت.

٤- دروستی نوێژی سوننەت بەدانیشتنەوە:

دروستە نوێژی سوننەت بە دانیشتنەوە بکرێت بۆکەسێك توانای بەپێوە وەستانیشی هەبێت، وەك چۆن دروستە هەندێکی ئەو سوننەتە بەدانیشتنەوەو هەندێکی تری بەپێوە بکرێت، ئەگەر لە یەك ڕکاتیشدا بێت ئەتوانرێت هەندێکی بەڕاوەستاوی‌و هەندەکەی تری بەدانیشتنەوە بەجێ بگەیەنرێت، چ بەپێوە وەستانەکە پێش خات چ دوای خات، هەردووکیان دروستە بێ‌ئەوەی کەراهەتی هەبێت، وە دانیشتنەکەش بەئارەزووی خۆیەتی چۆن دائەنیشێ، بەڵام دانیشتنی چوارمشقی باشترە.

موسلیم لە عەلقەمەوە دەگێڕێتەوە دەفەرموورێت: لە عائیشەم پرسی: پێغەمبەر ﷺ چۆن چۆنی ئەکرد کاتێ لە هەردوو ڕکاتەکەدا بەدانیشتنەوە نوێژی ئەکرد؟ ئەویش فەرمووی: لە هەردوو ڕکاتەکەدا قورئانی ئەخوێند، کاتێ بیویستایە بچێتە ڕکوعەوە هەڵئەساو ئەچووە ڕکوعەوە.

ئەحمەدو خاوەن سوننەکان لەعائیشەوە ئەگێڕنەوە کە فەرمویەتی: هەرگیز نەم بینیوە پێغەمبەر ﷺ لە هیچ کام لە شەونوێژەکانیدا بەدانیشتنەوە قورئان بخوێنێ هەتا بەساڵدا چوو، ئەوکاتە دائەنیشتو قورئانی تێدا ئەخوێند، هەتا سی چل ئایەتی ئەما، لەپاشاندا هەڵئەسا بەپێوە تەواوی ئەکرد، لەپاشاندا سەجدەی دەبرد.

٥- بەشەکانی نوێژی سوننەت:

نوێژی سوننەت دەبێتە دوو بەشەوە، سوننەتی (مطلق)، سوننەتی بەستراوە (مقید).

نوێژی ڕەها (مطلق) تەنها نییەتی نوێژکردنی بەسە، بێ ئەوەی ڕکاتەکانی دیاری بکرێت، ئیمام نەوەوی دەفەرموورێت: ئەگەر کەسێك دەستی کرد بە نوێژ کردن و نییەتی ژمارەکەی نەهێنابوو بۆی هەیە بە ڕکاتێك سلاو بداتەوە، وە بۆی هەیە بەزیادەوە بیکات، دوو ڕکات، یا سێ ڕکات، یا سەد ڕکات، یا هەزار یا زیاتر، وە ئەگەر کەسێك ژمارەیەك ڕکات نوێژی کرد نەیزانی چەند ڕکاتی کردووە و سلاوی دایەوە ئەوە ئەو نوێژە دروستە بەڕای هەموو زانایان بێ (خلاف) و جیایی، هاوەڵانی ئێمەش لەسەر ئەو ڕەئی‌یە ڕێك کەوتوون، وشافیعی دانی پێدا ناوە لە (الإملاء)دا.

بەیهەقی بە ئیسنادی خۆی ئەگێڕێتەوە دەفەرمووێت: جارێك (أبوذر) ژمارەیەکی زۆر نوێژی کرد، کاتێ سلاوی دایەوە ئەحنەفی کوڕی قەیس ڕەحمەتی خوای لێ بێ لێی پرسی: ئایا ئەزانی سلاوەدانەوەکەت لەسەر جووت بوو یا تاك ؟ ئەویش فەرمووی: با خۆم نەزانم خوا ئەزانێ، من خۆم گوێم لە خۆشەویستم (أبو القاسم) ﷺ بوو ئەیفەرموو، پاشان (أبوذر) گریاو ووتی‌یەوە من خۆم گوێم لە ئەبوقاسم بووە ئەیفەرموو: (مَا مِن عَبدٍ يَسجُدُ للهِ سَجدَةً إلا رَفَعَهُ اللهُ بِهَا دَرَجَةً، وَحَطَّ عَنهُ بِهَا خَطِيئَةً). (رواه الدارمي في مسنده بسندٍ صحيح إلاّ رجلاً اختلفوا في عدالته)[1]. واتە: هەرکەس سەجدەیەك بەرێت بۆ خوا پلەیەکی پێ بەرز ئەبێتەوەو گوناهێکی لەسەر لائەبرێ پێی.

بەڵام نوێژی سوننەتی بەستراو (مقید) بەپێی پاشو پێشیان لەنوێژە فەرزەکاندا بەش ئەکرێن و پێی ئەڵێن: سوننەتی ڕاتیبە، وە سوننەتی بەیانی و نیوەڕۆ و عەسرو ئێوارە و خەوتنان ئەگرێتەوە، و جگە لەمانیش، وا لەخوارەوە باسی ئەو سوننەتانە ئەکەین:

## سوننەتی (فجر) بەیان

١- (فضل)ی سوننەتی بەرە بەیان:

دەربارەی (فضل)ی بەردەوام بوون لەسەر بەجێ هێنانی سوننەتی بەرە بەیان چەند حەدیسێك هاتووە.وا لەخوارەوە باسیان ئەکەین:

أ- لە عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ دەربارەی سوننەتی بەرە بەیان فەرموویەتی: (هُمَا أَحَبُّ إليَّ مِنَ الدُّنيَا جَمِيعاً). (رواه أحمد ومسلم والترمذي). واتە: ئەو دوو ڕکاتەم لە هەموو دنیا لا خۆشەویست ترە.

ب- لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا تَدَعُوا رَكعَتَي الفَجرِ وَإن طَرَدَتكُمُ الخَيلُ) (رواه أحمد وأبوداود والبيهقي والطحاوي)[2]. واتە: دوو ڕکاتی سوننەتی بەیانی لەدەست مەدەن، هەرچەندە تووشی ڕاو نانیش بوون لە لایەن سوارانی دوژمنەوە.

---

(١) خۆزگە دانەر ڕەحمەتی خوای لێبێت بێدەنگ بووایە لەسەنەدەکەی دارمی لەپاش ئەوەی گێڕایەوە بۆلای بەیهەقی، چونکە سەنەدەکەی صەحیحە، ئەو پیاوەی تێدا نی‌یە کە ئیختیلافی تێدایە ! هەروەها ئەحمەدیش تەخریجی کردوە، پاشان من تەخریجم کردووە لەگەڵ شەواهیدەکانی لە (الإرواء ٤٥٧) دا (تمام المنة).

(٢) دوو شتی لێ ئەگیرێ: یەکەمیان: بێ دەنگ بووە لەسەر حەدیسەکە لەکاتێکدا سەنەدەکەی (ضعیف)ە وەك (عبد الحق الإشبيلي) بە ڕاشکاوی باسی کردووە، بە دوایدا (ابن القطان)، و بەیهەقی ئاماژەی بۆ دەکات و باسی کردووە لە (السنن الكبرى) دا بە (تعليق) ی بەبێ سەنەد، و دەفەرمووێت (٢/٤٧١): (وروي عن أبي هريرة...)

ج- وە هەر لە عائیشەوە هاتووە دەفەرموورێت: پێغەمبەر ﷺ ئەوەندەی لەسەر دوو ڕکاتی پێش نوێژی بەیانی بەردەوام بووە ئەوەندە لەسەر هیچ نوێژێکی سوننەت بەردەوام نەبووە. (بوخاری و موسلیمو ئەحمەدو ئەبو داود گێڕاویانەتەوە).

د- وە هەر لە عائیشەوە هاتوە دەفەرموورێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (رَكعَتَا الفَجرِ خَيرٌ مِنَ الدُّنيَا وَمَا فِيهَا) (رواه أحمد ومسلم والترمذي والنسائي). واتە: دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی بەیان بکەیت، چاکترە لەوەی دنیاو ئەوەی تیایەتی بەدەست بهێنێت.

هـ- وە لای ئەحمەدو موسلیم هاتووە هەر لە عائیشەوە کە دەفەرموورێت: نەم ئەبینی پێغەمبەر ﷺ بۆ هیچ خێرێك ئەوەندە بەپەلە بووایە وەك بەپەلە بوو بۆ دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی بەیانی.

**٢- بەجێ هێنانی بەشێوەیەکی کورت:**

ئەوەی لە ڕەفتاری پێغەمبەرەوە ﷺ زانرابێت ئەوەیە، دوو ڕکاتی پێش نوێژی بەیانی بەکورتی ئەکردو کەمی تێدا ئەخوێند.

أ- لە حەفصەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرموورێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ ئەهاتە ماڵەکەی من، ئەم بینی زۆر بەکورتی دوو ڕکاتی پێش نوێژە فەرزەکەی بەیانی ئەکرد، نافیع دەفەرموورێت: عبداللە ـ واتە ئیبنو عومەر ـ ئەویش هەر بەکورتی ئەو دوو ڕکاتەی ئەکرد. (ئەحمەدو شەیخەین گێڕاویانەتەوە).

ب- عائیشە دەفەرموورێت: پێغەمبەر ﷺ دوو ڕکاتی پێش نوێژی بەیانی ئەکرد، ئەوەندە بە کورتی ئەیکرد گومانم هەبوو فاتیحەی تێدا ئەخوێند یان نا. (ئەحمەدو غەیری ئەو گێڕاویانەتەوە)[1].

---

جا حەدیسەکەی باس کرد، و ئەگەر ئەم حەدیسە صەحیح بووایە ئەوە ڕووەکەی بەڵگە بوو بۆ ئەوانەی کە دەڵێن: سوننەتی فەجر واجبە.

دووەمیان: بە (مطلق)ی داویەتیە پاڵ بەیهەقی، جا وەهمی ئەوە دروست دەکات کە گەیەندراو (موصول)ە، و ئەمە وا نییە، بەڵام لەلای ئەو بەبێ سەنەدە، هەروەك تۆزێك لەمەوپێش زانیت، جا پێویستە بۆ وتنەی ئەمەش بووترێت: (والبيهقي تعليقاً) پاشان مافی ئەوەیە کە دروا بخرێت لە (طحاوي)، لەبەر ئەوەی ئەم (طبقة) یەك لەو بەرزترە. پاشان قسەم کردووە لەسەر حەدیسەکە، و عیللەتەکەیم ڕوون کردۆتەوە لە (الإرواء ٤٣٨ و الضعيفة ١٥٣٣)دا.

(١) ئەم (غەیری ئەوە) کێیە ؟ بوخاری و موسلیمە لە صەحیحەکەیاندا، جا ئەگەر دانەر بیدایەتە پاڵ هەردووکیان پاشان ئاماژەی بە ڕیوایەتی غەیری ئەوان بکردایە ئەوە ئەی پێکا، وە حەدیسەکە تەخریج کراوە لە (صحيح أبي داود١١٤١)دا (تمام المنة).

ج- هەر لە عائیشەوە هاتوە دەفەرمووێت: وەستانی پێغەمبەر ﷺ لە دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی بەیانیدا ئەوەندەی خوێندنی سورەتی فاتیحە ئەبوو. (ئەحمەدو نسائی و بەیهەقی و مالیکو (طحاوي) گێڕاویانەتەوە)[1].

**٣- قورئان خوێندن لەو دوو ڕکاتەدا:**

موستەحەببە ئەوە بخوێنرێت کە پێغەمبەر ﷺ خوێندویەتی لەو دوو ڕکاتەدا. وە لەبارەی قورئان خوێندن لەو دوو ڕکاتەدا ئەم حەدیسانە هاتوون:

١- لە عائیشەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ لەو دوو ڕکاتەدا سورەتی ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ و ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ ی ئەخوێند، وە بەنهێنی ئەیخوێند. ئەحمەدو (طحاوي) گێڕاویانەتەوە[2]. وە دوای سورەتی فاتیحە ئەوانەی ئەخوێند، چونکە بێ سورەتی فاتیحە نوێژ دروست نییە وەك لەپێشەوە باس کرا.

٢- وە هەر لە عائیشەوە هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: چاکترین سورەت کە دەخوێندرێ لە دوو ڕکاتی سوننەتی بەیانیدا ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ و ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾[3].

---

(١) چەند شتێکی لەسەرە:

یەکەم: بەم لەفزە لەلای نسائی و بەیهەقی و مالیك نییە، بەڵکو بەو لەفزەی: پێشەوەیە!

دووەم: بەم لەفزە (ضعیف)ە لەبەر پچڕاندن (إنقطاع)، وە بەمەش تەخریجکەری (طحاوي) (ضعیف) ی کردووە، لەبەر ئەوەی لە ریوایەتی موحەممەدی کوڕی سیرین، لە عائیشەوەیە، وە ئەو گوێی لە عائیشە نەبووە هەروەك ئەبو حاتم دەفەرمووێت.

سێیەم: هێنانی مالیك لە دوای نسائی و بەیهەقی هەڵەیەکی ئاشکراترە لەوەی پێشوو، لەبەر گەورەیی و شکۆیی مالیك و ناسراویەتی، وە بەرزی (طبقة)ەکەی، و وێنەی ئەم کەمتەرخەمییە زۆرەو ئەگەر بە دوایدا بگەڕێیت گرانە.

(٢) سەنەدەکەی (ضعیف)ە، لەبەر ئەوەی پچڕاندن (قطع)ی تێدایە وەك ئەوەی پێشەوە، وە ئەمە لە موسلیم دایە لە حەدیسی ئەبی هورەیرە بەبێ وتەی: «وە بە نهێنی ئەیخوێندن» هەروەها لە (صحیح أبي داود ١١٤٢)دا تەخریج کراوە. (تمام المنة).

(٣) لە هەمو چاپەکاندا بەوجۆرەیە: (کان یقرأ...)، وە ئەمە هەڵەیەو ئەبا وشەی (کان) لابرێت، چونکە ئەوەی دواوەی لە تەواوی فەرمودەکەیە، وە فەرمودەکە هەر بەوجۆرەیە لەلای (ابن ماجة) (١/٣٥١ التازیة) و أحمد

٣- له جابیرەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرموێت: پیاوێك هەستا دوو ڕكات نوێژی پێش نوێژی بەیانی كرد، لەیەكەمیاندا ﴿قُلۡ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَـٰفِرُونَ﴾ی خوێند هەتا تەواو بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (هَذَا عَبدٌ عَرَفَ رَبَّهُ) واتە: ئەمە بەندەیەكە پەروەردگاری خۆی ناسیوە. وە لەڕكاتی دووەمدا ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَـدٌ﴾ ی خوێند هەتا سوڕەتەكە تەواو بوو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (هَذَا عَبدٌ آمَنَ بِرَبِّهِ) واتە: ئەمە بەندەیەكە باوەڕی بەپەروەردگاری هێناوە. (طلحة) دەفەرموێت: من حەز ئەكەم ئەو دوو سوڕەتە لەودوو ڕكاتەدا بخوێنم (ئیبنو حببان و (طحاوي) گێڕاویانەتەوە).

٤- له ئیبنو عەبباسەوە هاتوە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ له دوو ڕكاتی سوننەتی بەیانیدا ﴿قُولُوٓاْ ءَامَنَّـا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا﴾ (البقرە/١٣٦). و ئەوەی له سوڕەتی (آل عمران)دا هەیە ﴿قُلۡ يَـٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَـٰبِ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءِۭ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمۡ﴾ (آل عمران/٦٤)ی ئەخوێند. (موسلیم گێڕاویەتیەوە). واتە لەڕكاتی یەكەمدا دوای سوڕەتی فاتیحە ئەم ئایەتەی ئەخوێند كە ئەفەرموێت: ﴿قُولُوٓاْ ءَامَنَّـا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَـٰعِيلَ وَإِسۡحَـٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَآ أُوتِيَ ٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمۡ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ﴾ وە لەڕكاتی دووەمدا ﴿قُلۡ يَـٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَـٰبِ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ كَلِمَةٖ سَوَآءِۭ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمۡ أَلَّا نَعۡبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشۡرِكَ بِهِۦ شَيۡـٔٗا وَلَا يَتَّخِذَ بَعۡضُنَا بَعۡضًا أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِۚ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَقُولُواْ ٱشۡهَدُواْ بِأَنَّا مُسۡلِمُونَ﴾ی ئەخوێند.

---

(٦/٢٣٩) و هەروەها لای ئیبنو خوزەیمەش له صەحیحەكەی (١١١٤) و لای ئیبنوحیببان له (موارد ٦١٠)دا. (تمام المنة).

٥- وە هەر لە ئیبنوعەبباسەوە لەریوایەتی ئەبوداوددا هاتووە کە لە ڕکاتی یەکەمدا: ﴿قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ﴾ ی خوێندوە، وە لە ڕکاتی دوەمدا: ﴿فَلَمَّآ أَحَسَّ عِيسَىٰ مِنۡهُمُ ٱلۡكُفۡرَ قَالَ مَنۡ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِۖ قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ نَحۡنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَٱشۡهَدۡ بِأَنَّا مُسۡلِمُونَ﴾.

٦- وە دروستیشە کە تەنها فاتیحە بخوێنرێت بەپێی ئەوەی لەپێشەوە باس کرا کە عائیشە دەفەرمووێت: وەستانی پێغەمبەر ﷺ بە ئەندازەی خوێندنی سورەتی فاتیحە ئەبوو.

**٤- دوعا کردن دوای ئەو دوو ڕکاتە:**

نەوەوی لە کتێبی (الأذكار) دا دەفەرمووێت: لە کتێبی (ابن السني) دا ریوایەتمان کردووە لە ئەبو مەلیحەوە کە ناوی عامیری کوڕی ئوسامەیە لەباوکی یەوە کە جارێك دوو ڕکات سوننەتی بەیانی ئەکرد، پێغەمبەر ﷺ لەنزیکیەوە دوو ڕکاتی کورتی کردو گوێی لێ بوو کاتێ لێبۆوە ئەیفەرموو: (اللَّهُمَّ رَبَّ جِبرِيلَ وَإسرَافِيلَ وَمِيكَائِيلَ وَمُحَمَّدٍ النَّبِيِّ، أعُوذُ بِكَ مِنَ النَّار) واتە: خوایە پەروەردگاری جوبرائیلو ئسرافیلو میکائیلو موحەممەدی نێرراو ﷺ پەنا ئەگرم بەتۆ لەئاگر، سێ جار.

هەر لەوێدا: ریوایەتمان کردووە لەئەنەسەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس بەیانی ڕۆژی جومعە پێش نوێژی بەیانی سێ جار بڵێت: (أستَغفِرُ اللهَ الَّذِي لا إلَهَ إلا هُوَ الحَيُّ القَيُّوم وَأتُوبُ إلَيه) خوا لەگوناهی ئەبوورێ ئەگەرچی وەك کەفی دەریاش بن[1].

**٥- ڕاکشان دوای نوێژی سوننەتی فەجر:**

عائیشە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی فەجری ئەکرد لەسەر لای ڕاست ڕائەکشا (رواه الجماعة).

---

(١) هەردووکیان زۆر لاوازن دروست نیە کاریان پێ بکرێت، تەنانەت لای ئەوانەش کە ئەڵێن: دروستە کار بە حەدیسی (ضعیف) بکرێت لە (فضائل الأعمال)دا، لەبەر بەتینی لاوازیەکەی، جا ئەمە لەسەر نەوەوی ئەگیرێت، وە هەروەها دانەریش کە هێناویەتی و بێدەنگ بووە لەسەری، کە وا دێتە خەیاڵ دروست بێت کار پێ کردنی بروانە (تمام المنة).

هەروها لەوەوە هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ دوو ڕکاتەکەی سوننەتی بەیانی ئەکرد ئەگەر من لەخەودا بوومایە ڕائەکشا، وە ئەگەر بەئاگا بوومایە قسەی بۆ ئەکردم.

وە دەربارەی حوکمی ئەو ڕاکشانە جیاوازی‌یەکی زۆر لەنێوان زانایاندا هەیە، ئەوەی ئاشکرا بێت ئەوەیە حوکمەکەی موستەحەببە بۆ ئەو کسانەی لەماڵەکانی خۆیاندا ئەو نوێژە ئەکەن نەك لە مزگەوت.

(حافظ) لە (الفتح)دا دەفەرمووێت: هەندێ لەزانایانی سەلەف بۆ ئەوە چوون کە موستەحەببە ڕاکشان دوای ئەو دوو ڕکاتە بۆ ئەوکسانەی لەماڵەکانی خۆیاندا بەجێی ئەهێنن نەك لە مزگەوت، وەئەمە لە ئیبنو عومەرەوە ئەگێڕنەوە، کە بەردوچکەی ئەهاویشتە ئەوکسەی ئەو کارەی بکردایە لە مزگەوت، (ئیبنوئەبی شەیبە ئەیگێڕێتەوە) تەواو. وە دەربارەی ئەو ڕاکشانە پرسیار لە ئیمام ئەحمەد کرا فەرمووی: من خۆم نایکەم ئەگەر کەسێکیش بیکا چاکە.

**٦- گێڕانەوەی ئەو دوو ڕکاتە:**

لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن لَم يُصَلِّ رَكعَتَي الفَجرِ حتى تَطلُعَ الشَّمسُ فَلِيُصَلِّهَا). (رواه البيهقي، قال النووي: اسناده جيد). واتە: هەرکەس دوو ڕکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانی نەکرد هەتا خۆر دەرکەوت، با دوایی بیکات.

لە قەیسی کوڕی عومەرەوە هاتووە: کاتێ چووە بۆ نوێژی بەیانی پێغەمبەری بینی ﷺ نوێژی بەیانی ئەکات، ئەم دوو ڕکاتە سوننەتەکەی نەکردبوو، لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژی بەیانی کرد و پاشان کە لە نوێژە فەرزەکە بۆوە هەستا دوو ڕکاتە سوننەتەکەی بەیانی کرد، پێغەمبەر ﷺ بەلایدا ڕەت بوو فەرمووی: (ئەم نوێژە چی‌یە؟) ئەویش بۆی گێڕایەوە، پێغەمبەر ﷺ بێدەنگ بوو و هیچی نەفەرموو. (ئەحمەدو ئیبنو خوزەیمە و ئیبنوحیببان و خاوەن سوننەنەکان جگە لەنەسائی گێڕاویانەتەوە. عیراقیش دەفەرمووێت: ئیسنادەکەی حەسەنە).

ئەحمەدو (شیخین) لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ لەسەفەرێکدا بو خەویان لێ‌کەوت بەسەر نوێژی بەیانیدا، وە بە تینی گەرمی خۆرەکە بەئاگا بوونەوە، جا شوێنەکەی خۆیان گۆڕی و دوور کەوتنەوە تا کەمێك خۆرەکە بەرز بۆوە، لەپاشاندا فەرمانی کرد بە بانگ بێژێ بانگ بدات، لەپێشدا دوو ڕکاتەکەی سوننەتی فەجری کرد، پاشان قامەتی کرد و هەستان بۆ نوێژی بەیانی.

به ظاهری حەدیسەکان دەرئەکەوێت ئەو دوو ڕکاتە پێش خۆرکەوتنو دوای خۆرکەوتن بەقەزا نەکرێت، بەمەعزەرەت نەکرابێ یا بێ مەعزەرەت، چ بەتەنها چووبێت یا لەگەڵ نوێژی بەیانیدا چووبن.

## سوننەتی نیوەڕۆ

لەبارەی سوننەتی نیوەڕۆ، چوار ڕکات، یا شەش، یا هەشت ڕکات هاتووە، وا لە خوارەوە بەدرێژی ڕوونی ئەکەینەوە:

**ئەوەی هاتووە کە سوننەتی نیوەڕۆ چوار ڕکات بێت:**

١- لە ئیبنو عومەرەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: من لە پێغەمبەرەوە ﷺ دە ڕکات نوێژم لەبەر کردووە: دوو ڕکات پێش نیوەڕۆ، دوو ڕکات دوای نیوەڕۆ، دوو ڕکات دوای (مغرب) ئێوارە لەماڵەوە، وە دوو ڕکات دوای خەوتنان هەر لەماڵەوە، وە دوو ڕکات پێش نوێژی بەیانی. (بوخاری گێڕاویەتیەوە).

٢- لە موغیرەی کوڕی سولەیمانەوە هاتووە دەفەرمووێت: گوێم لە ئیبنو عومەر بوو دەیفەرموو: پێغەمبەر ﷺ وازی لە دوو ڕکات نوێژی پێش نیوەڕۆ و دوای نیوەڕۆو و دوو ڕکات دوای ئێوارە و دوو ڕکات دوای نوێژی خەوتنان و دوو ڕکات پێش نوێژی بەیانی نەئەهێنا. (ئەحمەد بەسەنەدێکی (جید) گێڕاویەتیەوە).

**ئەوەی هاتووە کە شەش ڕکات بێت:**

١- لە عبدالله ی کوڕی شەقیقەوە هاتوە دەفەرمووێت: دەربارەی نوێژی پێغەمبەر ﷺ لە عائیشەم پرسی فەرمووی: پێغەمبەر ﷺ لەپێش نوێژی نیوەڕۆدا چوار ڕکاتی ئەکردو دوو ڕکاتیش دوای نوێژ. (ئەحمەدو موسلیمو غەیری ئەوان گێڕاویانەتەوە).

٢- لە ئوممو حەبیبەی کچی ئەبو سوفیانەوە هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن صلى فِي يَومٍ وَلَيلَةٍ إثنَتَي عَشرَةَ رَكعَةً، بُنِيَ لَهُ بَيتٌ فِي الجَنَّةِ ؛ أربَعاً قَبلَ الظُّهرِ، وَرَكعَتَينِ بَعدَهَا، وَرَكعَتَينِ بَعدَ المَغرِبِ، وَرَكعَتَينِ بَعدَ العِشَاءِ، وَرَكعَتَينِ قَبلَ صَلاةِ الفَجرِ). (رواه الترمذي وقال حسن صحيح، ورواه مسلم مختصراً). واتە: هەرکەس لەشەوو ڕۆژێکدا دووانزە ڕکات نوێژ بکات خانویەکی لەبەهەشتدا بۆ دروست ئەکرێت: چوار ڕکات پێش نوێژی نیوەڕۆو دوو ڕکات دوای، دوو ڕکات دوای نوێژی ئێوارەو دوو ڕکات دوای نوێژی خەوتنان، وە دوو ڕکات پێش نوێژی بەیانی.

**ئەوەی هاتووە کە هەشت ڕکات بێت:**

لە ئوموحەبیبەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن صلى أربَعاً قَبلَ الظُّهرِ وَأربَعاً بَعدَهَا حَرَّمَ اللهُ لَحمَهُ على النَّار). (رواه أحمد وأصحاب السنن وصححه الترمذي). واتە: هەرکەس چوار ڕکات پێش نوێژی نیوەڕۆو چوار ڕکات دوای نوێژی نیوەڕۆ بکات خوا گۆشتەکەی حەرام ئەکات لەسەر ئاگر.

**فەزڵ و گەورەیی چوار ڕکات نوێژ لە دوای نوێژی نێوەڕۆ:**

١- لەئەبو ئەییوبی ئەنصاری‌یەوە هاتووە کە پێش نوێژی نیوەڕۆ چوار ڕکاتی ئەکرد، پێ‌یان ووت: تۆ بەردەوام ئەم نوێژە ئەکەیت ؟ فەرمووی: پێغەمبەرم ﷺ بینیوە کردویەتی، دەربارەی پرسیارم لێ کرد فەرمووی: (إنَّهَا سَاعَةٌ تُفتَحُ فِيهَا أبوَابُ السَّمَاءِ فَأحبَبتُ أن يُرفَعَ لِي فِيهَا عَمَلٌ صَالِح) (رواه أحمد وسنده جيد). واتە: ئەوکاتە کاتێکە دەرگاکانی ئاسمانی تێدا ئەکرێتەوە، جا من حەزم کرد کردەوەی چاکم لەو دەرگایانەوە بۆ بەرز بکرێتەوە.

٢- لە عائیشەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ بەهیچ جۆرێك وازی لە کردنی چوار ڕکات پێش نوێژی نیوەڕۆو دوو ڕکات پێش نوێژی بەیانی نەئەهێنا. (ئەحمەدو بوخاری گێڕاویانەتەوە)، وە هەر لە عائیشەوە ریوایەت کراوە کە: پێغەمبەر ﷺ چوار ڕکات پێش نوێژی نیوەڕۆی ئەکرد زۆر بەپێوە ئەوەستا تیایانداو بەچاکی ڕکوعو سجودەکەی ئەبرد.

وە هیچ موعارەزەو پێکدادانێك نی‌یە لەنێوان حەدیسەکەی ئیبنو عومەر کە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ پێش نوێژی نیوەڕۆ دوو ڕکاتی کردووە، وە لەنێوان حەدیسەکانی تردا کە چوار ڕکاتی کردووە.

(حافظ) لە (الفتح) دا دەفەرمووێت: باشتر وایە لەسەر هەردوو شێوەکە (حمل) بکرێت: جاری وابووە دوو ڕکاتی کردووەو جاری وابووە چوار ڕکات، وە ووتراوە: لەسەر ئەوە (حمل) ئەکرێت ئەگەر لە مزگەوتا کردبێتی دوو ڕکاتی کردووە، وە ئەگەر لەماڵەوە کردبێتی چوار ڕکاتی کردووە، وە لەوانەیە لەماڵەوە دوو ڕکاتی کردبێت، جا کاتێ چۆتە مزگەوت دوو ڕکات، وە ئیبنو عومەر ئەوەی مزگەوتی بینیوە و ئەوەی ماڵی نەبینیوە، بەڵام عائیشە هەردووکیانی زانیوە.

وە ئەوەی یەکەم بەهێز ئەبێت بەوەی ئەحمەدو ئەبو داود گێڕاویانەتەوە لە عائیشەوە کە پێغەمبەر ﷺ چوار ڕکات نوێژی پێش نوێژی نیوەڕۆی ئەکرد لەپاشاندا ئەچووە دەر، ئەبو جەعفەری (طبري) دەفەرمووێت: بەزۆری چوار ڕکاتەکەی کردووەو بەکەمی دوو ڕکاتەکە.

وە ئەگەر کەسێك چوار ڕکاتی لەپێشدا یا لەپاشدا کرد، چاکتر وایە دوو ڕکات بکاتو سلاو بداتەوە، لەپاشاندا دوو ڕکاتەکەی تر بکات، وە دروستیشە بەسەر یەکەوە هەر چوار ڕکاتەکە بکات، وە یەکجار سلاو بداتەوە، بەپێی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (صَلاةُ اللَّيلِ وَالنَّهَارِ مَثْنَى مَثْنَى). (رواه أبوداود بسند صحيح)[1]. واتە: نوێژی شەوو ڕۆژ دوو ڕکات دوو ڕکاتە.

**گێڕانەوەی دوو سوننەتەکەی نیوەڕۆ:**

لە عائیشەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: ئەگەر پێغەمبەر ﷺ چوار ڕکاتی لەپێش نوێژی نیوەڕۆدا نەکردایە لەدواییدا ئەیکرد، (ترمژی) گێڕاویەتیەوە و دەفەرمووێت: (حديث حسن غريب).

ئیبنو ماجە لە عائیشەوە ئەگێڕێتەوە دەفەرمووێت: کاتێ پێغەمبەر ﷺ چوار ڕکاتەکەی پێش نوێژی نیوەڕۆی لەدەست بچووایە، دوای دوو ڕکاتە سوننەتەکەی دوای نوێژی نیوەڕۆ ئەیکردن[2].

ئەوانە دەربارەی سوننەتەکانی پێش نوێژە فەرزەکەیە، بەڵام دەربارەی گێڕانەوەی سوننەتەکانی دوای نوێژە فەرزەکە هاتووە کە ئەحمەد لە ئومو سەلەمەوە ئەگێڕێتەوە کە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ جارێك نوێژە فەرزەکەی نیوەڕۆی کرد لەوکاتەدا ماڵێکیان هێنا، دانیشت دەستی کرد بە دابەش کردنی هەتا بانگی عەسر درا، هەڵسا ﷺ نوێژی عەسری کرد و هات بەرەو ماڵی من، وە ئەو ڕۆژە نۆبە ڕۆژی من بوو، جا نوێژێکی سوکەڵەی کرد، وتمان: ئەی نێرراوی خوا ئەو دوو ڕکاتە چی بوو ئایا فەرمانت پێ کراوە بیان کەیت ؟ فەرمووی: نەخێر ئەوە ئەو دوو ڕکاتە بوو کە لەدوای نوێژی نیوەڕۆ ئەمکرد، بەڵام دابەش کردنی ئەم ماڵە مەشغوڵی کردم، هەتا بانگی عەسری دا، جا پێم ناخۆش بوو نەیان کەم. (بوخاری و موسلیمو ئەبو داود بە لەفزێکی تر گێڕاویانەتەوە).

**سوننەتی ئێوارە ـ مەغریب ـ :**

سوننەتە دوو ڕکات نوێژ دوای نوێژی ئێوارە بکرێت بەپێی ئەوەی ئیبنو عومەر گێڕاویەتیەوە کە ئەم دوو ڕکاتەش لەو نوێژانە بوو کە پێغەمبەر ﷺ وازی لە کردنیان نەئەهێنا.

**ئەوەی موستەحەببە تێیدا بخوێنرێت:**

---

(١) یەکێ لە مەرجەکانی فەرموودەی ڕاست ئەوەیە کە نابێت گێڕەرەوەکەی بەشازی بیهێنێت، ئەو مەرجە لەم فەرموودەیەدا ونە چونکە وشەی (النهار) لەوانی تردا نیە.

(٢) بێ دەنگەی کردووە لەسەری وادەرئەخات ڕاست بێت، بەڵام وانیە ڕاست نیە ئەو قسەیە چونکە لە ریوایەتەکانی قەیسی کوڕی ڕەبیعە.

ئەوەی موستەحەببە لە سوننەتی ئێوارەدا بخوێنرێت دوای خوێندنی سورەتی فاتیحە خوێندنی ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ و ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ ە. لە ئیبنو مەسعودەوە هاتوە دەفەرمووێت: لە ژمارە نایە کە گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە لەسوننەتی دوای نوێژی ئێوارەو سوننەتی پێش نوێژی بەیانی ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ و ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ ی خوێندووە. (ئیبنو ماجەو (ترمذي) گێڕاویانەتەوە، وە (ترمذي) بەحەسەنی داناوە).

هەروەها موستەحەببە ئەو سوننەتە لە ماڵەوە بکرێت، لە مەحمودی کوڕی لەبیدەوە هاتوە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ هاتە ناو هۆزی (بني عبد الأشهل) نوێژی ئێوارەی بە جەماعەت بۆ کردین، کاتێ سڵاوی دایەوە فەرمووی: (إركَعُوا هَاتَينِ الرَّكعَتَينِ فِي بُيُوتِكُم) (رواه أحمد وأبو داود والترمذي والنسائي). واتە: ئەم دوو ڕکاتە سوننەتە لەماڵەکانی خۆتانا بیان کەن.

وە لەپێشەوە باس کرا کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ ئەچووە ماڵەوە ئەیکرد.

**سوننەتی خەوتنان (العشاء) :**

لە حەدیسەکانی پێشەوە ئەوە دەرئەکەوێت کە دوو ڕکات نوێژ دوای نوێژی خەوتنان سوننەتە.

**سوننەتە جەخت نەکراوەکان (غیر مؤکدة)**

ئەوانەی لەپێشەوە باس کران سوننەتە جەخت کراوەکان (مؤکدە) بوون، هەندێ سوننەت ماون باشە بکرێن، بێ ئەوەی (تأکید) جەختی لەسەر بێت، وا لەخوارەوە باسیان ئەکەین:

**١- دوو ڕکات یا چوار پێش نوێژی عەسر:**

چەند حەدیس لەم بارەیەوە هاتووە قسەیان لەسەرە، بەڵام لەبەر زۆری ڕێگاکانیان ئەبنە پاڵ پشتی یەك لەوانە حەدیسەکەی ئیبنو عومەرە کە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (رَحِمَ اللهُ امرَأً صلى قَبلَ العَصرِ أربَعاً). (رواه أحمد وأبو داود والترمذي وحسنه وابن حبان وكذا صححه ابن خزيمة). واتە: ڕەحمەتی خوا لەوکەسە بێ، پێش نوێژی عەسر چوار ڕکات نوێژی سوننەت دەکات.

وە لەوانە حەدیسەکەی عەلی‌یە کە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ چوار ڕکات نوێژی پێش نوێژی عەسر ئەکرد، دوو دوو لە یەکی جیا ئەکردنەوە، بە سڵاودانەوە لەسەر فریشتە نزیکەکانی و پێغەمبەران و شوێن کەوتووەکانیان لەباوەڕدارانو موسڵمانان. (ئەحمەدو نسائی و ئیبنو ماجەو (ترمذي) کە بەحەسەنی داناوە گێڕاویانەتەوە).

بەڵام کردنی تەنها دوو ڕکات بەڵگەکەی گشتێتی فەرموودەکەی پێغەمبەرە ﷺ کە فەرموویەتی: (بَينَ كُلِّ أذانَينِ صَلاةٌ). واتە لەنێوان هەموو بانگو قامەتێکدا نوێژی سوننەت هەیە[1].

**٢- دوو ڕکات پێش نوێژی ئێوارە:**

بوخاری لە عبدالله ی کوڕی موغەففەلەوە ئەگێڕێتەوە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ ئەیفەرموو: (صَلُّوا قَبلَ المَغرِبِ، صَلُّوا قَبلَ المَغرِبِ) ثُمَّ قَالَ فِي الثَّالِثَةِ: (لِمَن شاءَ) كَرَاهِيَّةَ أن يَتَّخِذَها النَّاسُ سُنَّةً). واتە: پێش نوێژی ئێوارە نوێژ بکەن، پێش نوێژی ئێوارە نوێژ بکەن، لە سێیەم جاردا فەرمووی: (هەرکەس ئارەزوو ئەکات)، نەبادا خەڵك بیکەنە سوننەتێکی جەخت کراو، وە لە ڕیوایەتێکدا لای ئیبنو حیببان هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ دوو ڕکات نوێژی ئەکرد پێش نوێژی ئێوارە[2].

لە صەحیحی موسلیمدا هاتووە لە ئیبنوعەبباسەوە کە دەفەرمووێت: پێش خۆر ئاوابوون دوو ڕکات نوێژمان ئەکرد، پێغەمبەر ﷺ ئەیبینین نە فەرمانی پێ ئەکردین، و نە لێی قەدەغە دەکردین.

(حافظ) لە (الفتح) دا دەفەرمووێت: تێکڕای بەڵگەکان ئەوە نیشان ئەدەن کە موستەحەببە کردنی ئەو دوو ڕکاتە بەکورتی، وەك کورتی دوو ڕکاتە سوننەتەکەی فەجر.

**٣- دوو ڕکات پێش نوێژی خەوتنان:**

---

(١) منیش دەڵێم: لەدانەر شاراوەیە ئەوەی ئەبو داود لە (باب الصلاة قبل العصر) دا دەیگێڕێتەوە و لەڕێگای ئەمیشەوە (الضياء المقدسي) لە (المختارة ١/١٧٨ من نسخة الظاهرية الخطية) دا لە عەلی‌یەوە خوای لێ ڕازی بێت کە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ بەر لە نوێژی عەسر دوو ڕکات نوێژی سوننەتی دەکرد. ئەوەی دەفەرمووێت: (إسناده صحيح) منیش دەڵێم: بەڵێ وایە سەنەدەکەی صەحیحە ئەگەر (شاذ) نەبووایە بەم لەفزە، و ئەوەی پارێزراو (محفوظ)ە بە لەفزی: (أربع ركعات) وە ڕوون کردنەوەکەی لە (ضعيف أبي داود) دایە (٢٣٥) و (الروض النضير ٦٩١). (تمام المنة).

(٢) ئەم ڕیوایەتە سەنەدەکەیدا (منقطع)ە و مەتنەکەی مونکەرە، وە ئەوەی (محفوظ)ە ڕیوایەتی یەکەمە کە لەپێش ئەمەوەیە لە حەدیسی بوخاری بە لەفزی (صلوا قبل المغرب..)، بۆیە ئیبنو قەییم و ئیبنو حەجەر لە (فتح الباري) جەزمیان بەوە کردووە کە نەقڵ نەکراوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە بەر لە نوێژی مەغریب دوو ڕکاتی کردبێت..... وە من لەوێدا ئاماژەم بۆ ئەوە کردبوو کە حەدیسەکە ڕیوایەتەکەی (شاذ)ە، لەگەڵ ئەوەش بۆم ئاشکرا بوو کە سەنەدەکەی (منقطع)ە، بڕوانە (الصحيحة ٥٦٦٢). (تمام المنة).

بەپێی ئەوەی (جماعة) لە حەدیسی عبداللە ی کوڕی موغەففەلەوە گێڕاویانەتەوە کە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (بَينَ كُلِّ أذَانَينِ صَلاةٌ) واتە: لەنێوان هەموو بانگو قامەتێکدا نوێژی سوننەت هەیە، دو جار ئەمەی فەرموو. سەری سێیەم جار فەرمووی: (لِمَن شَاءَ) واتە: هەرکەس ئارەزووی لێ بێ.

وە لای ئیبنو حیببان لە حەدیسی ئیبنو زوبەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَا مِن صَلاةٍ مَفروضَةٍ إلا وَبَينَ يَدَيهَا رَكعَتَانِ). واتە: هیچ نوێژێکی فەرز نیە ئیللا دوو ڕکات نوێژی سوننەتی لەپێشەوە ئەکرێت.

موستەحەببە نێوانی نوێژی فەرزو سوننەت ئەوەندەی تەواوکردنی نوێژێك بێت:

لە پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە ﷺ هاتوە کە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ نوێژی عەسری کرد، پیاوێك هەڵسا نوێژ بکات عومەر چاوی لێی بوو پێی ووت: دانیشە، ئەهلی کیتاب - یەهودو نەصارا - بۆیە لەناوچوون چونکە نوێژەکانیان لەیەك جیا نەئەکردەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أحسَنَ ابنُ الخَطَّابِ) (رواه أحمد بسندٍ صحيح) واتە: کوڕەکەی (خطاب) چاکی کرد.

## سوننەتی وەتر

١- فەزڵی سوننەتی وەترو حوکمەکەی:

وەتر سوننەتێکی (مۆکدە) جەخت کراوە، پێغەمبەر ﷺ هانی خەڵکی داوە بۆ کردنی و لای خۆشەویست کردوون، لە عەلی‌یەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: سوننەتی وەتر وەك نوێژە فەرزەکان پێویست نی‌یە لەسەرتان، بەڵام پێغەمبەر ﷺ نوێژی وەتری کردووەو لەپاشاندا فەرموویەتی: (يَا أهلَ القُرآنِ أوتِرُوا فَإنَّ اللهَ وَترٌ يُحِبُّ الوَترَ). (رواه أحمد وأصحاب السنن وحسنه الترمذي ورواه الحاكم وصححه). واتە: ئەی ئەهلی قورئان نوێژی وەتر (تاك) بکەن، چونکە خوا وەترەو وەتری خۆش ئەوێت.

وە ئەوەی ئەبو حەنیفە بۆی چووە کە دەفەرمووێت: نوێژی وەتر واجبە، بۆچوونێکی لاوازە. (ابن المنذر) دەفەرمووێت: نازانم کەسێك هەبێت لەو بارەیەوە ڕای لەگەڵ ڕای ئەبو حەنیفە بێت.

وە لای ئەحمەدو ئەبوداودو نەسائی و ئیبنوماجە هاتووە: مەخدیجی (کە پیاوێکە لە بەنی کینانە) پیاوێك لە ئەنصاری‌یەکان کە پێی دەووترا: (أبو محمد) پێی ڕاگەیاند کە: نوێژی وەتر واجبە، ئەویش چوو بۆلای عوبادەی کوڕی صامیت و بۆی گێڕایەوە ووتی: ئەبوموحەممەد ئەڵێت: وەتر واجبە، عوبادەش فەرمووی: ئەبوموحەممەد درۆ ئەکات، خۆم لە پێغەمبەرم ﷺ بیستووە فەرموویەتی: (خَمسُ صَلَوَاتٍ كَتَبَهُنَّ اللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالى على العِبَادِ، مَن أتى بِهِنَّ لَم يُضَيِّع مِنهُنَّ

شَيناً إستِخفَافاً بِحَقِّهِنَّ، كَانَ لَهُ عِندَ اللهِ تَبَارَكَ وَتَعَالى عَهدٌ أن يُدخِلَهُ الجَنَّةَ، وَمَن لَم يَأتِ بِهِنَّ فَلَيسَ لَهُ عِندَ اللهِ عَهدٌ، إن شَاءَ عَذَّبَهُ وَإن شَاءَ غَفَر لَهُ). واته: له شەووڕۆژێکدا خوا پێنج نوێژی لەسەر بەندەکانی نوسیوە، هەرکەس بە جێیان بگەیەنێتو هیچیان لێ نەچێنێو بەکەمیان نەزانێ، لای خوا پەیمانی دراوەتێ بیخاتە بەهەشتەوە، وە هەرکەس بەجێی نەگەیاندن، ئەوە لای خوا پەیمانی نەدراوەتێ جا نارەزووی خۆیەتی سزای ئەدات یا لێی ئەبوورێت.

وە لای بوخاریو موسلیم هاتووە لە (طلحة)ی کوڕی (عبدالله)وە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (خَمسُ صَلَوَاتٍ كَتَبَهُنَّ اللهُ فِي اليَومِ وَاللَّيلَةِ، فَقَالَ أعرَابِيٌّ: هَل عَلَيَّ غَيرُهَا ؟ قَالَ: لا إلا أن تَطَّوَّعَ). واته: خوا لە شەوو ڕۆژێکدا پێنج نوێژی لەسەر فەرز کردوون، پیاوێکی عەرەبی دەشتەکی ووتی: جگە لەوە هیچی ترم لەسەر فەرزە؟ فەرمووی: نەخێر مەگەر بە ئارەزووی خۆت بیکەی.

**٢- کاتی نوێژی وەتر:**

زانایان هەموو لەسەر ئەوە پێك هاتوون کە کاتی نوێژی وەتر نایات هەتا دوای نوێژی خەوتنانەو درێژ ئەبێتەوە هەتا (فەجر) بەرەبەیان.

لە ئەبوتەمیمی جەیشانیيەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەموورێت: عەمری کوڕی عاص ڕۆژێکی هەینی ووتاری ئەدا ئەیفەرموو: ئەبوبەصرە بۆی گێڕاومەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إنَّ اللهَ زَادَكُم صَلاةً، وَهِيَ الوَترُ، فَصَلُّوهَا فِيمَا بَينَ صَلاةِ العِشَاءِ إلى صَلاةِ الفَجرِ). واته: خوا نوێژێکی بۆ زیاد کردوون، ئەویش نوێژی وەترە، ئێوەش لەنێوان نوێژی خەوتنانو نوێژی بەیانیدا بیکەن، ئەبوتەمیم دەفەرمورێت: دوای ئەوە (أبو ذر) دەستی گرتم و بردمی بۆ مزگەوت بۆلای ئەبوبەصرە خوا لێی ڕازی بێ پێی ووت: تۆ گوێت لە پێغەمبەر ﷺ بووە ئەو قسەیە بفەرمووێ کە عەمر ووتی ؟ ئەبوبەصرەش فەرمووی: بەڵێ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا بووە ﷺ . (ئەحمەد بەئیسنادێکی صەحیح گێڕاویەتیيەوە).

لە ئەبومەسعودی ئەنصاریيەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتوە دەفەرمورێت: پێغەمبەر ﷺ نوێژی وەتری لەسەرەتای شەوو ناوەڕاستو کۆتایی شەودا دەکرد. (ئەحمەد بەسەنەدێکی صەحیح گێڕاویەتیيەوە).

وە لە عبدالله ی کوڕی ئەبوقەیسەوە هاتوە دەفەرمورێت: دەربارەی نوێژی وەتری پێغەمبەر ﷺ پرسیم لە عائیشە؟ فەرمووی: جاری وائەبوو لەسەرەتای شەوەوە ئەیکرد، وە جاری واهەبوو لەکۆتایی شەودا ئەیکرد، ووتم: ئەی خوێندنی چۆن بوو دەنگی بەرز ئەکردەوە یا نزم ؟ فەرمووی: بەهەردوو شێوەکە دەیکرد، جاری وابوو بەبێ دەنگی ئەیخوێند، وە جاری وابوو دەنگی بەرز ئەکردەوە

تێیدا، وە جاری واهەبوو خۆی ئەشۆری، وە جاری واش هەبوو دەست نوێژی دەگرت و ئەخەوت (مەبەستی پێی بە لەش گرانی‌یەوە ئەخەوت).

**٣- پێش خستنی وەتر موستەحەببە بۆ ئەکەسەی کە ئەزانێت کۆتایی شەو بەئاگا نایەت، وە دووا خستنی بۆ ئەوکەسەی کە ئەزانێ بەئاگادێت:**

موستەحەببە بۆ ئەوکەسەی کە ترسی هەیە کاتێ خەوت ئاخری شەو بەئاگا نایەت، زوو نوێژە وەترەکەی بکات، هەروەها موستەحەببە بۆ ئەوکەسەی کە ئەزانێت بەئاگا دێت دوای بخات بۆ کۆتایی شەو، لە جابیرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (مَن ظَنَّ مِنكُم أن لا يَستَيقِظَ آخِرَهُ (أي اللَّيلِ) فَلِيُوتِر أوَّلَهُ. وَمَن ظَنَّ مِنكُم أنَّهُ يَستَيقِظُ آخِرَهُ فَليُوتِر آخِرَهُ فَإنَّ صَلاةَ آخِرِ اللَّيلِ مَحضُورَةٌ وَهِيَ أفضَلُ)، واتە هەرکەس لەئێوە ئەیزانی لە دووا کاتەکانی شەودا بەئاگا نایەت با لەسەرەتای شەوەوە نوێژە وەترکەی بکات، وە هەرکەس لەئێوە ئەیزانی لە دوواکاتەکانی شەودا بەئاگا دێت، با لەدووا کاتەکانی شەودا نوێژە وەترەکەی بکات، چونکە نوێژی ئەوکاتانە فریشتەکان ئامادەی ئەبن و چاکتریشە. (ئەحمەدو موسلیم و (ترمذی)و ئیبنوماجە گێڕاویانەتەوە).

هەروەها لە جابیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ بەئەبوبەکری فەرموو: (تۆ کەی نوێژی وەتر ئەکەیت؟) فەرمووی: لەسەرەتای شەوەوە دوای نوێژی خەوتنان، فەرمووی: (ئەی تۆ عومەر؟) فەرمووی: لەکۆتایی شەودا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئەما تۆ ئەی ئەبوبەکر! لایەنی ئیحتیات و توندوتۆڵێت گرتووە، بەڵام عومەر! تۆ لایەنی توانایت گرتووە. (ئەحمەدو ئەبوداودو حاکم گێڕاویانەتەوە، حاکم دەفەرموێت: صەحیحە لەسەر مەرجی موسلیم).

پێغەمبەر ﷺ لە دووا کاتەکانی ژیانیدا هەر کاتی پارشێو نوێژی وەتری ئەکرد چونکە ئەوکاتە چاکترین کاتە بۆ ئەو نوێژە، وەك لەپێشەوە باس کرا، عائیشە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ هەمو کاتێکی شەو، سەرەتای، ناوەڕاستی، دوواکاتی شەو نوێژی وەتری کردووە، هەتا لەم دوایی‌یانەدا لە پارشێودا ئەیکرد. (رواه الجماعة).

وە لەگەڵ ئەوەشدا بەهەندێ لەهاوەڵەکانی ئەفەرموو: مەخەون هەتا نوێژی وەتر نەکەن، لەبەر ئیحتیات، نەوەك بەئاگا نەیەنەوە، وە سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص نوێژی خەوتنانی لەمزگەوتەکەی پێغەمبەردا ﷺ ئەکرد، لەپاشاندا یەك ڕکات نوێژی وەتری ئەکردو زیاتری نەئەکرد، پێیان ووت: ئەوە تۆ یەك ڕکات ئەکەیت و زیاتر ناکەیت ئەی ئەبا ئیسحاق!؟ فەرمووی: بەڵێ... چونکە خۆم گوێم لەپێغەمبەر بووە ﷺ ئەیفەرموو: (الَّذِي لا يَنَامُ حتى يُوتِرَ حَازِمٌ) (رواه أحمد ورجاله ثقات) واتە: ئەوکەسەی ناخەوێت هەتا نوێژی وەتر ئەکات کار توندو تۆڵە.

**٤- ژمارەی ڕکاتەکانی نوێژی وەتر:**

(ترمذي) دەفەرمووێت: لەپێغەمبەرەوە ﷺ ریوایەت کراوە کە سیانزە ڕکاتو یانزە ڕکاتو نۆ ڕکاتو حەوت ڕکات و پێنج ڕکاتو سێ ڕکاتو یەك ڕکات نوێژی وەتری کردووە.

ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم دەفەرمووێت: واتای ئەوەی ریوایەت کراوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە ئەڵێن: پێغەمبەر ﷺ بە سیانزە ڕکات وەتری کردووە ئەوەیە کە لەشەودا سیانزە ڕکات نوێژی کردووە بەوەترەوە، واتە: وەترەکەشی لەگەڵدا بووە هەربۆیە شەونوێژەکەشی نیسبەت دراوە بۆلای وەتر.

وە دروستە نوێژی وەتر دوو ڕکات دوو ڕکات بکرێتو سلاو بدرێتەوە لە هەردوو ڕکاتدا، لەپاشاندا نوێژێکی یەك ڕکاتی بکرێت و تەحییاتی تێدا بخوێنرێت و سلاوی تێدا بدرێتەوە. وەك چۆن دروستیشە هەمو نوێژەکە بە دوو تەحییاتو سلاوێك تەواو بکرێت، ئەویش بەوەی نوێژەکە هەموو ڕکاتەکانی بەسەر یەکەوە بکرێت، بێ ئەوەی تەحییاتی تێدا بخوێنرێت هەتا ڕکاتی پێش کۆتایی، ئینجا لەڕکاتی پێش کۆتایی تەحییات ئەخوێنرێت، و لە ڕکاتی کۆتاییدا تەحییاتێکی تر ئەخوێنرێتو سلاو ئەدرێتەوە. وە دروستیشە هەموو ڕکاتەکان بکرێت و بە تەحییاتێك کۆتایی بێتو سلاو بدرێتەوە لە ڕکاتی کۆتاییدا، ئەمانە هەموو دروستن و لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتوون.

ئیبنوقەییم دەفەرمووێت: سوننەتی ڕاستو ڕێك و مەحکەم هاتووە لەبارەی وەترەوە کە یا پێنج ڕکاتی بەسەر یەکەوەیە یا حەوتی بەسەر یەکەوەیە. وەك حەدیسەکەی ئومموسەلەمە کە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ وەتری بە حەوت یا بە پێنج ڕکات ئەکرد بەسەر یەکەوە نە بەسلاودانەوە نە بەقسە لەیەکی دانەئەبڕین. (ئەحمەدو نەسائی و ئیبنو ماجە بەسەنەدێکی (جید) گێڕاویانەتەوە).

وە وەك وتەی عائیشە کە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ بەشەو سیانزە ڕکات نوێژی ئەکرد، بە پێنج ڕکاتیان وەتری ئەکرد لەدووا ڕکاتدا نەبێت دانەئەنیشت بۆ تەحییات. (بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە).

وە وەك حەدیسەکەی عائیشە کە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ لەشەودا نۆ ڕکات نوێژی ئەکرد هەتا هەشتەم ڕکات دانەئەنیشت بۆ تەحییات، کاتێ دائەنیشت یادی خوای ئەکردو حەمدی خوای ئەکردو ئەپاڕایەوە، لەپاشاندا سلاوی نەئەدایەوە هەڵئەسایەوە ڕکاتی نۆیەمیشی ئەکرد، ئینجا دائەنیشت و تەحییاتی ئەخوێندو لەپاشاندا سلاوی ئەدایەوە، دەنگی ئەوەندە بەرز ئەکردەوە ئێمە ئەمان بیست، لەپاشاندا بەدانیشتنەوە دوو ڕکاتی ئەکرد لەپاشاندا سلاوی ئەدایەوە، ئەوە یانزە ڕکات، وەکاتێ قورس بوو چوو بەساڵدا بە حەوت ڕکات وەتری ئەکرد، لەدووا ڕکاتدا نەبووایە دانەئەنیشت. (جەماعەت گێڕاویانەتەوە).

ئەم حەدیسانە هەموویان صەحیح و ئاشکران و هیچ (معارض)یان نیەیە ئەو حەدیسە نەبێت کە ئەفەرمووێت: (شەونوێژ دوو ڕکات دوو ڕکاتە) کە حەدیسێکی صەحیحە، بەڵام ئەو کەسەی ئەوەی فەرمووە هەرخۆی بە حەوت ڕکات و پێنج ڕکات وەتری کردووە، وە سوننەتەکانی هەموویان ڕاستن و یەکتر ئەسملێنن. چونکی پێغەمبەر ﷺ وەڵامی ئەوکەسەی دایەوە کاتێ دەربارەی شەونوێژ پرسیاری لێ کردووە بەوەی فەرموویەتی: شەونوێژ دوو ڕکات دوو ڕکاتە، خۆ دەربارەی وەتر پرسیاری لێ نەکردووە هەتا بۆی ڕوون بکاتەوە، ئەمما ئەو حەوت ڕکاتەو پێنج ڕکات و نۆ ڕکات و یەك ڕکاتە ئەوە نوێژی وەترە، وە وەتر ناوێکە بۆ ئەو یەك ڕکاتەی کە لە ڕکاتەکانی پێش خۆی جیا ئەکرێتەوەو بەتەنها ئەکرێت، هەروەها ناویشە بۆ پێنج و حەوت و نۆ بەسەر یەکەوە، وەك نوێژی ئێوارە ناوێکە بۆ سیانی بەسەر یەکەوە، جا کاتێك پێنج و حەوتەکە بە دوو سلاّودانەوە لەیەك دابڕان وەك یانزە ڕکاتەکە، ئەوە وەتر ناوێکە بۆ ئەو یەك ڕکاتەی بەتەنها ئەکرێت، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (شەو نوێژ دوو ڕکات دوو ڕکاتە، وە ئەگەر ترسی ڕۆژ بوونەوەی هەبوو یەك ڕکات وەتر بکات، ئیتر بەوە وەتری ئەو نوێژانە ئەکات کە کراون)، بەو شێوەیە کردەوەو ووتەی پێغەمبەر ﷺ یەك ئەکەون و یەکتر ئەسملێنن.

**٥- قورئان خوێندن لەنوێژی وەتردا:**

دروستە لەنوێژی وەتردا دوای فاتیحە هەرچییەك لەقورئان بخوێنرێت، عەلی خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: لە قورئاندا شتێك نیەیە وازی لێ هێنرابێت، ئیتر ئارەزووی خۆتە لەنوێژی وەتردا چی لەقورئان ئەخوێنی بخوێنە.

بەڵام موستەحەببە ئەگەر بەسێ ڕکات وەتر کرا لەڕکاتی یەکەمدا دوای فاتیحە ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى﴾ وە لە ڕکاتی دووەمدا ﴿قُلۡ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَـٰفِرُونَ﴾، وە لە سێیەمدا ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ و ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ﴾ و ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾ بخوێنرێت ؛ بەپێی ئەوەی ئەحمەدو ئەبو داودو (ترمذي) کە بەحەسەنی داناوە گێڕاویانەتەوە، لە عائیشەوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ لەڕکاتی یەکەمدا ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى﴾ وە لە دووەمدا ﴿قُلۡ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَـٰفِرُونَ﴾ وە لە سێیەمدا سورەتی (الإخلاص و فلق و ناس) ی ئەخوێند.

**٦- قنوت خوێندن لەنوێژی وەتردا:**

قنوت خوێندن شەرعی‌یە لەنوێژی وەتردا، هەموو کاتێکی ساڵ ئەخوێنرێت. بەپێی ئەوەی ئەحمەدو خاوەن سونەنەکان و غەیری ئەوان گێڕاویانەتەوە، لە حەسەنی کوڕی عەلی‌یەوە خوا لێیان ڕازی بێت دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فێری چەند ووشەیەکی کردووم کە لەنوێژی وەتردا بیانڵێم کە ئەمانەن: (اللَّهُمَّ اهدِني فِيمَن هَدَيتَ، وَعَافِني فِيمَن عَافَيتَ، وَتَوَلَّنِي فِيمَن تَوَلَّيتَ، وَبَارِك لِي فِيمَا أعطَيتَ، وَقِنِي شَرَّ مَا قَضَيتَ، فَإنَّكَ تَقضِي وَلا يُقضَى عَلَيكَ، وَإنَّهُ لا يَذِلُّ مَن وَالَيتَ، وَلا يَعِزُّ مَن عَادَيتَ، تَبَارَكتَ رَبَّنَا وَتَعالَيتَ، وصلى اللهُ على النَّبِيِّ مُحَمَّدٍ) (قال الترمذي: هذا حديث حسن)[(١)]. واتە: خوایە ڕێنماییم بکە بۆ چاکە وەك ئەوانەی ڕێنماییت کردوون، وە لاشە ساغم بکە وەك ئەوانەی تەندروستت کردوون، وە سەرپەرشتیم بکە وەك ئەوانەی سەرپەرشتیت کردوون، خوایە ئەوەی پێت بەخشیوم لێم پیرۆز بکە، وە بە میهرەبانی خۆت لە شەڕی ئەوەی بڕیارت داوە بمپارێزە، چونکە تەنها تۆ حوکم ئەکەیت و کەس ناتوانێ بەسەر تۆدا حوکم بکات، وە ئەوکەسەی تۆ سەرپەرشتیکەری بیت زەبون نابێت، وە ئەوەی تۆ دژی بیت سەربەرز نابێت، پەروەردگارمان بەرزو پیرۆزیت، وە صەڵەوات لەسەر موحەممەدی نێردراو ﷺ بێت.

(ترمذي) دەفەرموێت: ئەم حەدیسە حەسەنە، وە لەمە باشتر دەربارەی قنوت لە پێغەمبەرەوە نەزانراوە. وە نەوەوی دەفەرموێت: ئیسنادەکەی صەحیحە بەڵام ئیبنو حەزم دەربارەی صیحەحتی ئەوە هیچی نەوتووە، بەڵام دەفەرموێت: ئەو حەدیسە هەرچەندە لەوانە نی‌یە بەڵگەی پێ بهێنرێتەوە، بەڵام ئێمە لەوە چاکترمان نەبینیوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتبێت، بەڵام لای ئێمە کارکردن بە حەدیسی زەعیف باشترە لەڕای زانایان وەك ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەفەرموێت: ئەمە مەزهەبی ئیبنومەسعود و ئەبوموساو ئیبنوعەبباسو (بەراء)و ئەنەسو حەسەنی بەصری‌و عومەری کوڕی عبدالعزیزو (ثوري)و ئیبنوموبارەك و حەنەفی‌یەکانە، وە ڕیوایەتێکە لەئەحمەدەوە. نەوەوی دەفەرموێت: ئەم ڕووە بەهێزە بۆ کردنە بەڵگە.

---

(١) دوو ڕەخنەی لێ ئەگیرێ:

یەکەم دانە پاڵی هەموو فەرمودەکە بۆ ئەوکۆمەڵە هەڵەیە، چونکە ئەوەی لەکۆتایی‌یەکەیدا هاتووە (صلی الله علی النبي محمد) تەنها نسائی هێناویەتی.

دووەم: ئەم زیادەیەی کە لە کۆتایی‌یەکەیەوەتی لاوازە و سابت نی‌یە هەروەك (حافظ ابن حجر و قسطلاني و زرقاني) فەرموویانە، وە لە سەنەدەکەیدا نەناسراوی و پچڕاندنی تێدایە، ئەگەر دەتەوێت بۆ زیاتر ڕوون کردنەوە بگەڕێوە بۆ (التلخیص، وشرح المواهب) بەڵام ئێمە هیچ بەربەستێك نابینین بۆ کار پێ‌کردن پێی، لەبەر کارکردنی سەلەف لەسەری هەروەك باسم لێوە کردووە لە (تلخیص صفة الصلاة) دا.

شافیعی و چەند کەسی تر بۆ ئەوە چوون کە قنوت لەوەتردا ناکرێت لەنیوەی کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا نەبێت، بەپێی ئەوەی ئەبو داود ئەگێڕێتەوە لە عومەری کوڕی (خطاب)ەوە خوا لێی ڕازی بێت: کاتێ ئوبەی کوڕی کەعبی کرد بە ئیمام بیست ڕۆژ نوێژی کرد بێ ئەوەی قنوت بکات لەنیوەی دوایی ڕەمەزاندا نەبێت.

موحەممەدی کوڕی نەصر ئەگێڕێتەوە: خۆی لە سەعیدی کوڕی جوبەیری پرسیوە چ کاتێك قنوت خوێندن دەست پێ ئەکات لەنوێژی وەتردا؟ فەرمووی: عومەری کوڕی (خطاب) سوپایەکی نارد بۆ جەنگ دژی بێ باوەڕان، تووشی جەنگێ بوون ترسی هەبوو لەسەر گیانیان، کاتێ نیوەی دوایی مانگی ڕەمەزان هات دەستی کرد بەقنوت کردن و بۆیان ئەپاڕایەوە.

**٧- شوێنی قنوت لەنوێژی وەتردا:**

دروستە قنوت کردن پێش چوونە ڕکوع دوای تەواو بون لە قورئان خوێندن، وە هەروەها دروستە دوای بەرز بوونەوە لە ڕکوع، لە حومەیدەوە هاتوە دەفەرمووێت: دەربارەی قنوت لەئەنەسم پرسی پێش ڕکوع ئەخوێنرێت یا دوای ڕکوع؟ فەرمووی: ئێمە دوای ڕکوع و پێش ڕکوع ئەمان خوێند، (ئیبنوماجە و موحەممەدی کوڕی نەصر گێڕاویانەتەوە). (حافظ) لە (الفتح)دا دەفەرمووێت: ئیسنادەکەی بەهێزە.

ئەگەر کەسێك پێش چوونە ڕکوع قنوتی خوێند (الله أكبر) بکات و دەست بەرز بکاتەوە کاتێ لەخوێندن بووەوە، وە هەروەها کاتێ لە قنوت کردن بووەوە (الله أكبر) بکاتەوە، ئەم کارەش لەهەندێ صەحابەوە ریوایەت کراوە، وە هەندێ لەزانایان دەست بەرز کردنەوەی کاتی قنوت بە موستەحەب دائەنێن، بەڵام هەندێکیان نا.

ئەما مەسح کردنی دەموچاو بە هەردو دەست لە دوای لێبوونەوە، ئەوە بەیهەقی دەفەرمووێت: باشتر وایە ئەو کارە نەکرێت، تەنها ئەوە بکرێت کە پێشینان (سەلەف) کردوویانە خوایان لێ ڕازی بێت، ئەوان تەنها دەستیان بەرز کردۆتەوە، بەڵام مەسحی دەم وچاویان پێ نەکردووە[1].

**٨- دوعا کردن لە دوای نوێژی وەتر:**

نوێژکەر دوای سڵاودانەوە لەنوێژی وەتر موستەحەببە بڵێت: (سُبحَانَ المَلِكِ القُدُّوس) سێ جار، وە لەسێیەمدا دەنگی بەرز بکاتەوە، لەپاشاندا بڵێت: (رَبُّ المَلائِكَةِ وَالرُّوح)، بەپێی ئەوەی ئەبوداودو نەسائی ئەگێڕنەوە لە حەدیسی ئوبەی کوڕی کەعبەوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ

---

(١) عیززی کوڕی عبد السلامی شافیعی لەبارەی مەسحی دەم و چاو دەفەرمووێت: نەفام و جاهل نەبێت مەسحی دەم و چاو ناکات (تمام المنة).

لەنوێژی وەتردا ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى﴾ و ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ و ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ ی ئەخوێند، کاتێ سڵاوی ئەدایەوە ئەیفەرموو: (سُبحَانَ المَلِكِ القُدُّوس) سێ جار، لەسێیەمدا دەنگی پێ بەرز ئەکردەوە ئەمە لەفزی نسائی‌یە.

(دارقطني) ئەمەشی زیاد کردووە کە ئەیفەرموو: (رَبُّ المَلائكَةِ وَالرُّوح) لەپاشاندا ئەپاڕایەوە، بەوەی ئەحمەدو خاوەن سونەنەکان لەعەلی‌یەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە کۆتایی وەترەکەدا ئەپاڕایەوە ئەیفەرموو: (اللَّهُمَّ إنِّي أعُوذُ بِرِضَاكَ مِن سَخَطِكَ، وَبِمُعَافَاتِكَ مِن عُقُوبَتِكَ، وَأعُوذُ بِكَ مِنكَ، لا أُحصِي ثَنَاءً عَلَيكَ أنتَ كَمَا أثنَيتَ على نَفْسِك) واتاکەی لێك دراوەتەوە لەپێشەوە.

**٩- لەشەوێکدا دوو نوێژی وەتر ناکرێت:**

هەرکەس نوێژی وەتری کرد لەپاشاندا ویستی نوێژی تر بکات دروستە بەڵام نوێژە وەترەکە دووبارە نەکاتەوە، بەپێی ئەوەی ئەبوداودو نسائی و (ترمذي) کە بەحەسەنی داناوە لە عەلی‌یەوە ئەگێڕنەوە دەفەرموێت: لە پێغەمبەرم ﷺ بیستووە فەرموویەتی: (لا وَترَانِ فِي لَيلَةٍ) واتە: لە شەوێکدا دوو وەتر نی‌یە.

لە عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ سڵاوی ئەدایەوە سڵاوەکەیمان دەبیست، لەپاشاندا بەدانیشتنەوە دوو ڕکات نوێژی ئەکرد. (موسلیم گێڕاویەتی‌یەوە).

لە ئوموو سەلەمەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ لەدوای وەترەوە بەدانیشتنەوە دوو ڕکات نوێژی ئەکرد٠ (ئەحمەدو ئەبوداود و (ترمذي) و غەیری ئەوان گێڕاویانەتەوە).

**١٠- گێڕانەوەی نوێژی وەتر:**

جومهوری زانایان بۆ ئەوە چوون کە گێڕانەوەی نوێژی وەتر شەرعی‌یە، بەپێی ئەوەی بەیهەقی و حاکم کە لەسەر مەرجی (شیخین) بە صەحیحی داناوە، لە ئەبی هورەیرەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذَا أصبَحَ أحَدُكُم وَلَم يُوتِر فَلِيُوتِر) واتە: ئەگەر کەسێکتان ڕۆژی کردەوەو وەتری نەکردبوو با بیکات.

ئەبوداود لە ئەبوسەعیدی خودری‌یەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن نَامَ عَن وَترِهِ أو نَسِيَهُ فَلِيُصَلِّهِ إذَا ذَكَرَهُ). (قال العراقي: إسناده صحيح) واتە: هەرکەس بەسەر وەترەکەیدا خەوت و نەیکرد یا لەبیری نەبوو بیکات با کاتێ بیری کەوتەوە بیکات.

لە ئەحمەدو (طبراني) یەوە بەسەنەدێکی حەسەن هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی کردۆتەوە ئینجا وەتری کردووە، بەڵام جیاوازی هەیە لەناو زانایاندا لەسەر ئەوکاتەی وەترەکەی تێدا قەزا

بکاتەوە: لای حەنەفی‌یەکان هەموو کاتێکی ڕۆژ ئەبێت، جگە لە کاتە قەدەغەکراوەکان، وەلای شافیعی‌یەکان هەرکاتێك بێت لە ڕۆژدا هەر قەزا ئەکرێتەوە، وەلای مالیکو ئەحمەد دوای (فەجر) بەرەبەیان قەزا ئەکرێتەوە، بەمەرجێك نوێژی بەیانی نەکرابێت.

## قنوت خوێندن لە هەر پێنج فەرزەکەدا

قنوت کاتی ناخۆشی و کارەسات مەشروعە بکرێت لە هەر پێنج فەرزەی نوێژدا بەئاشکرا، لە ئیبنو عەبباسەوە هاتووە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ یەك مانگ لەسەر یەك قنوتی خوێندووە لەنوێژی نیوەڕۆو عەسرو ئێوارەو خەوتنانو بەیانیدا، لە دووا ڕکاتی نوێژەکەدا دوای ئەوەی سەری بەرز ئەکردەوەو ئەیفەرموو: (سمع الله لمن حمده) دوعای لە بەنی سولەیم و ڕەعلو زەکوان و (عُصية) ئەکرد، وە ئەوانەی لەدوایەوە بوون ئامینیان ئەکرد[1]. (ئەحمەدو ئەبوداود گێڕاویانەتەوە) وە لای ئەحمەد بە زیادەی: (ناردنی بۆلایان تا بانگیان بکەن بۆلای ئیسلام، کەچی کوشتیانن). هاتوە.

عیکریمە دەفەرمووێت: ئەوکارە کلیلی قنوت بوو. وە لە ئەبو هورەیرەوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر بیویستایە دوعا لەیەکێك بکا یا بۆ کەسێك بپاڕێتەوە دوای رکوع قنوتی ئەکرد، جا زۆر جار کاتێ ئەیفەرموو: (سَمِعَ اللهُ لِمَن حَمِدَهُ، رَبَّنَا لَكَ الحَمد) فەرمویەتی: (خوایە وەلیدی کوڕی وەلید، و سەلەمەی کوڕی هیشام، و عەبباسی کوڕی ڕەبیعە، و موسڵمانە زەعیف و چەوساوەکانی مەککە ڕزگار بکە، خوایە هۆزی (مضر) بگرە بەتوندی، خوایە گرانی و برسێتی بخەرە ناویان، وەك گرانی‌یەکەی سەردەمی یوسف) ئەبو هورەیرە ئەفەرموێت: بەدەنگی بەرز لەهەندێ نوێژدا ئەوەی ئەفەرموو، وە لەنوێژی بەیانیدا ئەیفەرموو: (خوایە نەفرین بکە لەفلان و فلانەکس) کە دوو هۆزی عەرەب بوون، هەتا خوا ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە کە ئەفەرمووێت: ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ﴾ (آل عمران/١٢٨). رواه أحمد والبخاري. واتە: ئەی موحەممەد هیچ شتێك لەم

---

(١) ڕەعل و زەکوان و (عصية) هۆزی بەنی سولەیم بوون بە درۆ خۆیان دەرخست موسڵمان بوون، داوایان لەپێغەمبەر کرد ﷺ چەند کەسێکیان لەگەڵدا بنێرێت فێری کاروباری ئایینی‌یان بکەن، پێغەمبەریش ﷺ حەفتا کەسی لەگەڵ ناردن ئەوانیش هەر حەفتایان شەهید کرد بە غەدر، ئەوەش هۆی قنوت کردنەکەی پێغەمبەر ﷺ بوو لەو مانگەدا.

کاری خەڵقی خۆم بە دەستی تۆ نىيە، خوا لىێیان ببورێت یا سزایان بدات ئارەزووی خۆیەتی، چونکە بەڕاستی ئەوانە ستەمکارن.

**قنوت خوێندن لە نوێژی بەیانیاندا:**

قنوت لەنوێژی بەیانیاندا مەشروع نىيە ئیللا کاتی کارەساتو ناخۆشی نەبێت، لەو کاتانەیدا قنوتی تێدا ئەکرێت، هەروەها لە هەموو نوێژەکانی تریشدا هەر مەشروع نىيە، وەك لەپێشەوە باسمان کرد.

ئەحمەدو نسائی و ئیبنوماجەو (ترمذي) کە بەصەحیحی داناوە لە ئەبومالیکی ئەشجەعییەوە ئەگێڕنەوە دەفەرمووێت: باوکم (کە صەحابەیەك بوو) تەمەنی شانزە ساڵ بووە لەدوای پێغەمبەرەوە ﷺ نوێژی کردووە، پاش ئەو لەدوای ئەبوبەکرو عومەرو (عیمان) یشەوە نوێژی کردووە، پێم ووت: ئایا ئەوان قنوتیان ئەکرد لەنوێژی بەیانیاندا ؟ فەرمووی: نەخێر کوڕم ئەوە شتێکی تازە داهێنراوە.

ئیبنوحیببانو (خطیب)و ئیبنو خوزەیمە کە بە صەحیحی داناوە ئەگێڕنەوە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ لەنوێژی بەیانیاندا قنوتی نەئەکرد، مەگەر دوعای لەهۆزێك بکردایە، یا بۆ کۆمەڵێك بپاڕایەوە. (ئەمە (لفظ)ی ئیبنوحیببانە) بەڵام (لفظ)ی جگە لەو باسی (نوێژی بەیانیان) ی تێدا نىيە. وە زوبەیرو سێ خەلیفەکان (أبوبكرو عمرو عثمان) ریوایەتیان کردووە کە ئەوان قنوتیان نەکردووە.

ئەمەش مەزهەبی حەنەفىیەکان و حەنبەلىیەکان و ئیبنوموباڕەك و (ثوري) و ئیسحاقە، بەڵام لە مەزهەبی شافعیدا قنوت لەنوێژی بەیانیاندا دوای بەرزبوونەوە لە رکوع لەرکاتی دووەمدا سوننەتە[1]، بەپێی ئەوەی جەماعەت جگە لە (ترمذي) لە ئیبنوسیرینەوە ئەگێڕنەوە کە ئەنەسی

---

(١) ئەو دوو حەدیسەی هێناویەتی لەم بارەیەوە یەکێکیان صەحیحە، بەڵام حەملی کردووە لەسەر قنوتی نەوازیل، و ئەمەش حەق و ڕەوایە، وە ئەوەی تر بە ڕاشکاوی باس لە بەردەوامىیەتی پێغەمبەر ﷺ ئەکات لەسەر قنوتی بەیانی تا دنیای بەجێ هێشت، بەڵام ئەمیشی (تضعیف) کردووە، وە لە هەمو ئەوەدا ڕاستی پێکاوە، بەڵام وەك ئەوەی بلێی گەڕاوەتەوە لەم بۆچوونە، بەم ووتەیەی کە لە کۆتایی باسەکەدا هێناویەتی: (بەڵام هەرچی بێت ئەمە لەو جیاوازىیە ڕەوایانەیە کە کردنی و نەکردنی وەك یەکە! هەرچەندە چاکترین شت ئەوەیە لە ڕەفتاری پێغەمبەرەوە ﷺ وەرگیرابێت).

منیش دەڵێم: ئەگەر ئەمە پەشیمان بوونەوە نەبێت ـ کە ئەمە هیوامانە ـ ئەوە (إضطراب) ێکی زۆر بەتینە، چونکە لەسەرەتای باسەکەدا دان ئەنێ بە نادروستىیەتی قنوت خوێندن لە نوێژی بەیانیدا بە بەردەوامی، وە تەئکید لەسەر

**کوڕی مالیك کاتێ لێیان پرسی پێغەمبەر ﷺ لەنوێژی بەیانیاندا قنوتی ئەخوێنند؟ فەرمووی: بەڵێ، ووتیان: دوای رکوع یا پێش رکوع؟ فەرمووی: دوای رکوع، وە هەروەها بەپێی ئەوەی ئەحمەدو بەززارو (دارقطني) و بەیهەقیو حاکم کە بەصەحیحی داناوە لە ئەنەسەوە ئەگێڕنەوە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ بەردەوام هەتا دونیای بەجێ هێشت لەنوێژی بەیانیدا قنوتی خوێندووە، وە کردنی ئەمە بەبەڵگە چاوپیاخشاندنەوەی ئەوێت، چونکە ئەو قنوتەی پرسیارەکەی دەربارە کرا قنوتی کاتی (نوازل) کارەسات بوو، وەك بە ڕاشکاوی باسی هاتووە لە ریوایەتی بوخاری و موسلیمدا.**

**ئەمما حەدیسەکەی دووەم، لەسەنەدەکەیدا ئەبو جەعفەری ڕازی تێدایە کە ئەویش بەهێز نیە، وە ئەو حەدیسە کاری پێ ناکرێت، چونکە عەقڵ نایبڕێت پێغەمبەر ﷺ بەدرێژایی ژیانی قنوتی لەنوێژی بەیانیدا کردبێت و خەلیفەکانی دوای ئەو وازیان لێ هێنابێت، بەڵکو هەتا ئەنەس خۆی وەك سابت بوە لێی قنوتی نەکردووە لە نوێژی بەیانیدا، وە ئەگەر ڕاستیەتی ئەم حەدیسە بسەلمێندرێ، ئەوە قنوتەکەی حەمل ئەکرێتە سەر ئەوەی کە لە دوای ڕکوعەوە بۆ نزاو پاڕانەوە ئەوەستا، هەتا دنیای بەجێ هێشتووە، چونکە ئەمەش واتایەکە لەواتاکانی قنوت، وە لێرەدا ئەو واتایە گونجاوترە، بەڵام هەرچی بێت ئەمە لەو جیاوازیە ڕەوایانەیە کە کردنی و نەکردنی وەك یەکە، بەڵام چاکترین ڕێباز ڕێبازی پێغەمبەرە ﷺ.**

---

**ئەوە دەکات کە ڕێنمایی پێغەمبەر ﷺ واز هێنانە لەم قنوتە، جا ئیتر چۆن لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا کە ئەمەش حەقە و گومانی تێدا نیە دەڵێت: (کردن و نەکردنی یەکسانە)، خۆزگە دەمزانی چۆن یەکسانە کردنی کە ناشەرعیە، لەگەڵ نەکردنی کە شەرعیە؟!**

**وە دانەر وێنەی ئەمە ئەهێنێت لە: باسی (قورئان خوێندن بە دەنگی بەرز لە نوێژی ڕۆژگیاندا) بڕوانە (ل٢٦٣).**

**ئەمەش وام لێدەکات بڵێم: دانەر ئەوەی دەینووسێت چاوی پیا ناخشێنێتەوە، ئەمەش لە هۆکارەکانی بوونی هەڵەی زۆرە لەم کتێبەدا، چونکە کەسێك کەمترین زانیاری و ووشیاری هەبێت ئەم (تناقض) ە ڕوونەی بۆ ئاشکرا دەبێت. (تمام المنة).**

## شەونوێژ

**(١) (فضل) و گەورەیی شەونوێژ:**

١- خوای گەورە فەرمانی داوە بەپێغەمبەرەکەی ﷺ شەونوێژ بکات و ئەفەرموێت: ﴿وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَتَهَجَّدۡ بِهِۦ نَافِلَةٗ لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامٗا مَّحۡمُودٗا﴾ (الإسراء/٧٩). واتە: وە لەشەودا نوێژ بکە خوا بەزیادە بۆتی ئەنووسێ، بە ئومێدی ئەوەی پەروەردگارت کاتێ زیندووت ئەکاتەوە پلەو پایەیەکی بەرزو چاکت پێ ببەخشێت.

ئەو فەرمانە هەرچەندە تایبەتە بەپێغەمبەرەوە ﷺ بەڵام سەرجەم موسڵمانانیش ئەو حوکمە ئەیان گرێتەوە، چونکە داوایان لێ کراوە لە کردەوەکانیاندا چاو لە پێغەمبەر بکەن.

٢- خوای گەورە ڕوونی کردۆتەوە ئەوانەی بەردەوامن لەسەر شەونوێژ چاکەکەرانن و شایستەی خێرو میهرەبانی پەروەردگارن، وەك ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٍ ١٥ ءَاخِذِينَ مَآ ءَاتَىٰهُمۡ رَبُّهُمۡۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَبۡلَ ذَٰلِكَ مُحۡسِنِينَ ١٦ كَانُواْ قَلِيلٗا مِّنَ ٱلَّيۡلِ مَا يَهۡجَعُونَ ١٧ وَبِٱلۡأَسۡحَارِ هُمۡ يَسۡتَغۡفِرُونَ﴾ (الذاريات/١٥-١٨). واتە: لەخوا ترسەکان لەڕۆژی دواییدا لە بەهەشتەکانو سەرچاوەکاندان، ئەو بەهەشتو سەرچاوەیەی خوا پێیان ئەبەخشێت وەری ئەگرن، چونکە ئەمانە لە دنیادا چاکەکار بوونو کەم لەشەودا ئەخەوتنو شەونوێژیان ئەکردو لە بەرەبەیانان (سەحەر) دا داوای لێبووردنیان لەخوای خۆیان ئەکرد.

٣- ئەو کەسانەی شەونوێژ ئەکەن خوا مەدحیان ئەکات ولەڕیزی بەندەچاکەکانی خۆیدا دایان ئەنێت، ئەفەرموێت: ﴿وَعِبَادُ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمۡشُونَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ هَوۡنٗا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلۡجَٰهِلُونَ قَالُواْ سَلَٰمٗا ٦٣ وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمۡ سُجَّدٗا وَقِيَٰمٗا﴾ (الفرقان/٦٣-٦٤) واتە: بەندە چاکەکانی خوای خاوەن سیفەتی ڕەحم ئەوانەن کە بە ئارامی بەسەر زەویدا ئەڕۆن و ئەگەر نەفامان قسەی نەفامی‌یان پێ بڵێن، ئەمان

ڕوویان لێ وەردەچەرخێنن و بەجێیان دێڵن، وە هەروەها ئەوانەن کە شەو ڕۆژ ئەکەنەوە بەسەجدە بردن‌و وەستان لەشەونوێژدا.

٤- خوا بە ئایەتەکانی شایەتی‌یان بۆ ئەدات کە خاوەن باوەڕن وەك ئەفەرمووێت: ﴿إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِـَٔايَـٰتِنَا ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا۟ بِهَا خَرُّوا۟ سُجَّدًا وَسَبَّحُوا۟ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ۩ ﴿١٥﴾ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَـٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿١٦﴾ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ (السجدة/١٥-١٧). واتە: بەڕاستی تەنها کسانێ بە نیشانەکانی ئێمە بڕوا دێنن کە هەر دەمێ ئەم نیشانانەیان بخرێتەوە بیر، دەکەونە سوجدە بردن و پەروەردگاریان بە پاکی ستایش دەکەن و خۆیان بە زل دانانێن. تەنیشتەکانیان لە پێخەف بەر ئەدەن (و ڕادەپەڕن و ڕوو دەکەنە دەرگای خوا و شەونوێژ دەکەن) و بە ترس و ئومێدەوە هاوار لە پەروەردگاریان دەکەن, وە لەوەی کە کردوومانەتە رزق و ڕۆزیان ئەبەخشن. جا هیچ کەس نازانێ ئەوەی کە بۆیان شاردراوەتەوە چ پاداشی گەورەیە کە ئەبێتە هۆی ڕووناکی چاو و دڵ, ئەمە جەزای کردەوەیەکە کە ئەنجامیان داوە.

٥- ئەوان و کەسانی تر کە صیفەتی ئەوانیان نی‌یە جیا ئەکاتەوە لە یەك و ئەفەرمووێت: ﴿أَمَّنْ هُوَ قَـٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ سَاجِدًا وَقَآئِمًا يَحْذَرُ ٱلْـَٔاخِرَةَ وَيَرْجُوا۟ رَحْمَةَ رَبِّهِۦ ۗ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَـٰبِ﴾ (الزمر/٩). واتە: ئایا ئەو (موشریکە چاترە) یا کەسێ کە لەکاتەکانی شەودا لە سوجدەبردن و ڕاوەستان دایە لە عەزابی ئاخیرەت خۆ دەپارێزێ و بە هیوای ڕەحمەتی پەروەردگاریەتی؟ بڵێ: ئایا کەسانێك کە (ئەرکی خۆیان) دەزانن لەگەڵ کەسانێ کە نازانن بەرامبەر و وەك یەکن؟ بەڕاستی تەنیا ژیران ئامۆژگاری وەردەگرن.

٦- ئەمە هەندێ لەوانە بوون کە لە قوڕئاندا هاتوون دەربارەی ئەوانەی کە شەونوێژ ئەکەن، بەڵام ئەو حەدیسانەی کە لەوبارەیەوە هاتوون لە خوارەوە باسی هەندێکیان ئەکەین:

١- عبداللەی کوڕی سەلام دەفەرموێت: یەکەم جار کە پێغەمبەر ﷺ هاتە ناو مەدینە خەڵك بە پەلە چوون بەپیریەوە، منیش لەو کەسانە بووم، کاتێ باش سەرنجم لێدا بۆم دەرکەوت ئەورووخسارە ڕوخساری درۆزن نییە، جا یەکەم ووشە لێم بیست ئەوە بوو فەرمووی: (أَيُّهَا النَّاسُ، أفشُوا السَّلامَ، وَأطعِمُوا الطَّعَامَ، وَصِلُوا الأرحَامَ، وَصَلُّوا بِاللَّيلِ وَالنَّاسُ نِيَامٌ، تَدخُلُوا الجَنَّةَ بِسَلام). (رواه الحاكم وابن ماجة والترمذي وقال: حديث حسن صحيح). واتە: ئەی خەڵکینە کاتێ گەیشتن بەیەك سڵاو بکەن و دەستی هەژاران بگرن و صیلەی ڕەحم بەجێ بگەیەنن و شەونوێژ بکەن کاتێ خەڵك لەخەودان، ئەچنە بەهەشتەوە بەسەلامەتی.

٢- سەلمانی فارسی دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (عَلَيكُم بِقِيَامِ اللَّيلِ فَإنَّهُ دَأبُ الصَّالِحِينَ قَبلَكُم، وَمَقرَبَةٌ لَكَم إلى رَبِّكُم، وَمُكَفِّرَةٌ لِلسَّيِّئَاتِ، وَمَنهَاةٌ عَنِ الإثمِ، ومَطرَدَةٌ لِلدَّاءِ عَنِ الجَسَدِ)[1]. واتە: شەونوێژ بکەن چونکە شەو نوێژ پیشەی پیاوچاکانی پێش ئێوە بووە، وە بەهۆیەوە لەپەروەردگارتانەوە نزیك ئەبنەوە، و ئەبێتە کەفارەتی گوناهەکانتان و بەربەستی خراپە کردنتان و نەخۆشی لەلەشدا دەرئەکات.

٣- سەهلی کوڕی سەعد دەفەرموێت: جوبرائیل هاتە لای پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ئەی موحەممەد هەر چۆن حەز ئەکەی بژی، پاشان هەرئەمریت، وە هەر کارێك پێت خۆشە بیکە، پاشان دوایی هەر بەوە پاداش ئەدرێیتەوە، وە هەرکەس ئارەزوت لێیە خۆشت بووێ، پاشان هەر جیا

---

(١) دوو ڕەخنەی لێ دەگیرێت:

یەکەمیان: تەخریج نەکردنی و بێ دەنگ بوونی لەسەر ئاشکرا کردنی لاوازییەکەی کە ئەمە لە ریوایەتی (طبراني) یە لە (عبد الرحمن ابن سليمان بن أبي الجوف)، لە ئەعمەشەوە لە (أبي العلاء النوري)یەوە لە سەلمانەوە دەیگێرێتەوە، وە ئەم عبد الرحمن ، ئەبو حاتم دەفەرموێت: (لا يحتج به) ناکرێتە بەڵگە، و ئیبنو عەدی دەفەرموێت: سەرجەم حەدیسەکانی ڕێکە، و لە هەندێکیاندا نەکارەتی تێدایە، پاشان ئەم حەدیسەی هێناوەتەوە و ئاماژەی بە بوونی نەکارە کردووە، (ذهبي) دەفەرموێت: (أبو العلاء) ناناسم، وە (ترمذي) ئەم حەدیسەی هێناوە بە سەنەدێك ئاماژەی بە ناصەحیحی کردووە، لەبەر بوونی عیللەتێك تێیدا کە ئەویش لەبەر ریوایەتی موحەممەدی کوڕی سەعیدی (المطلوب)ە، کە ئەمەش درۆزنە، ئەحمەدی کوڕی صالح دەفەرموێت (چوار هەزار حەدیسی هەڵبەستووە).

بەڵێ ئەم حەدیسە بەبێ ڕستەی دوایین: (ومطردة للداء....) حەسەنە یان صەحیحە. بڕوانە (الإرواء ٤٥٢ و المشكاة ١٢٢٧) (تمام المنة).

نەبیتەوە لێی، وە بزانە کە شەرەفی بڕوادار شەونوێژە، وە عیززەتی سەربەخۆیی و بێ پێویستیەتی لە خەڵك[1].

٤- لە ئەبو دەردائەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ثَلاثَةٌ يُحِبُّهُم اللهُ وَيضحَكُ إلَيهِم وَيَستَبشِرُ بِهِم ؛ الَّذي إذَا انكَشَفَت فِئَةٌ قَاتَلَ وَرَائَهَا بِنَفسِهِ للهِ عَزَّوَجَل، فَإمَّا أن يُقتَلَ وَإمَّا أن يَنصُرَهُ اللهُ عَزَّوَجَل وَيَكفِيَهُ فَيَقُولُ: أنظُرُوا لِعَبدِي هَذَا كَيفَ صَبَرَ لِي بِنَفسِهِ. وَالَّذِي لَهُ امرأَةٌ حَسَنَةٌ وَفِرَاشٌ لَيِّنٌ حَسَنٌ فَيَقُومُ مِنَ اللَّيلِ فَيَقُولُ: يَذَرُ شَهوَتَهُ وَيَذكُرُنِي، وَلَو شَاءَ رَقَدَ. وَالَّذِي إذَا كَانَ فِي سَفَرٍ وَكَانَ مَعَهُ رَكبٌ فَسَهِرُوا ثُمَّ هَجَعُوا فَقَامَ فِي السَّحَرِ فِي ضَرَّاءٍ وَسَرَّاءٍ) واتە: سێ کەس خوا خۆشی ئەوێن و بەدەمیانەوە پێ ئەکەنێ وشادمان ئەبێت پێیان، کەسێك کە ئەگەر کۆمەڵێك لە جەنگاورە باوەڕدارەکان لە شەڕدا بشکێن، ئەم لەدوایانەوە بجەنگێ، بەگیان خۆی بەخت بکات بۆ خوا، جا یا ئەکوژرێ یا خوا سەری ئەخات و یارمەتیدەری ئەبێت، جا ئەفەرمووێ: سەیری ئەو بەندەیەم بکەن چۆن بەگیان ئارامی گرت بۆ من. وە کەسێك ژنێکی جوان و جێگای نەرم و گەرمی هەبێت، بەڵام شەو هەڵسێت شەونوێژ بکات، خوا ئەفەرموێت: ئەو بەندەیەم وازی لە ئارەزووەکانی هێناوە یادی من ئەکات ئەگەر ئارەزووی بووایە هەڵنەئەستاو ڕائەکشا. وە کەسێك لەسەفەردا بێت کۆمەڵێکی لەگەڵدا بێت، پاش حەوانەوە ئەوان ڕائەکشێن و ئەخەون، ئەم هەڵئەسێ شەونوێژ ئەکات لەسەحەردا لەخۆشی و ناخۆشیدا.

(٢) ئاداب و ڕەووشتەکانی شەونوێژ:

هەرکەس ویستی شەونوێژ بکات سوننەتە بۆی ئەمانەی خوارەوە بکات:

١- ئەبێ کاتێ ئەخەوێت نیازی شەونوێژی هەبێت، لە ئەبودەردائەوە هاتوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن أتَى فِرَاشَهُ وَهُوَ يَنوِي أن يَقُومَ فَيُصَلِّيَ مِنَ اللَّيلِ فَغَلَبَتهُ عَينُهُ حتى يُصبِحَ كُتِبَ لَهُ مَا نَوَى، وَكَانَ نَومُهُ صَدَقَةً عَلَيهِ مِن رَبِّه). (رواه النسائي وابن ماجة بسندٍ صحيح). واتە: هەرکەس چووە ناوجێگا بۆ خەوتن بەنیاز بوو هەڵبستێت و شەونوێژ بکات، بەڵام بەئاگا نەبووەوە هەتا بەیانی، چی نیاز بووە بۆی نووسراوەو خەوەکەشی صەدەقەیەکی خوایی بووە بۆی.

٢- خەو لە چاوەکانیدا بسڕێت کاتی هەڵسان لەخەو سیواك بکات، پاشان سەیرێکی ئاسمان بکات و لەخوا بپاڕێتەوە بەوشێوەیەی هاتووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ بڵێت: (لا إلَهَ إلا أنتَ سُبحَانَكَ، أستَغفِرُكَ لِذَنبِي وَأسألُكَ رَحمَتَكَ، اللَّهُمَّ زِدنِي عِلماً وَلا تُزِغ قَلبِي بَعدَ إذ هَدَيتَنِي،

---

(١) ئەم فەرموودەیە (حسن)ە بە پاڵپشتی حەدیسی جابیر و عەلی کوڕی (أبي طالب) وەك باسم لێوە کردووە لە (الصحيحة ٨٣١)دا. (تمام المنة).

وَهَب لِي مِن لَدُنكَ رَحمَةً إنَّكَ أنتَ الوَهَّابُ. وَالحَمدُ للهِ الَّذي أحيَانَا بَعدَ مَا أمَاتَنَا وَإلَيهِ النُّشُور)[1]. واته: خوایه هیچ مەعبودێکی حەق نییە جگە لە تۆ، داوات لێ ئەکەم لە تاوانەکانم ببووریت وە داوای ڕەحمەت و بەزەییت لێ ئەکەم، خوایه زانستم زیادبکەو دڵم لەڕێی ڕاست لامەدە دوای ئەوەی ڕێنماییت کردوم، خوایه لە لایەن خۆتەوە ڕەحمەت و میهرەبانیم پێ ببەخشە، چونکە تەنها تۆ بەخشەری ئەوانەی. سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی زیندووی کردینەوە دوای ئەوەی مراندینی، گەڕانەوەش هەربۆلای ئەوە.

لە پاش ئەو پاڕانەوەیە دە ئایەتی کۆتایی سورەتی (آل عمران) بخوێنێ لە: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ هەتا کۆتایی سورەتەکە.

لەپاش ئەو ئایەتانە بپاڕێتەوە بڵێت[2]: (اللَّهُمَّ لَكَ الحَمدُ، أنتَ نُورُ السَّمَوَاتِ وَالأرضِ وَمَن فِيهِنَّ، وَلَكَ الحَمدُ، أنتَ قَيُّومُ السَّمَوَاتِ وَالأرضِ وَمَن فِيهِنَّ، وَلَكَ الحَمدُ، أنتَ الحَقُّ، وَوَعدُكَ الحَقُّ، وَلِقَاؤُكَ حَقٌّ، وَالجَنَّةَ حَقٌّ، وَالنَّارَ حَقٌّ، وَالنَّبِيُّونَ حَقٌّ، وَمُحَمَّدٌ حَقٌّ، وَالسَّاعَةَ حَقٌّ، اللَّهُمَّ لَكَ أسلَمتُ، وَبِكَ آمَنتُ، وَعَلَيكَ تَوَكَّلتُ، وَإلَيكَ أنَبتُ، وَبِكَ خَاصَمتُ، وَإلَيكَ حَاكَمتُ، فَاغفِر لِي مَا قَدَّمتُ وَمَا أخَّرتُ، وَمَا أسرَرتُ وَمَا أعلَنتُ، أنتَ اللهُ لا إلَهَ إلا أنتَ) واته: خوایه سوپاس و ستایش هەر

---

[1] ئەوەی تێدایە کە لە هەردوو حەدیسی پێشوودا باسی لێوە کرا، وە دانەر بە ووتەکەی نەوەوی هەڵخەڵەتاوە کە لە (الأذكار)دا هەیە: (ئەو حەدیسەمان ریوایەت کردوە لە (سنن أبي داود) بە سەنەدێك کە ئەبوداود بە لاوازی دانەناوە. منیش دەڵێم: لە پێشەکی کیتابەکەدا ڕوونمان کردەوە کە نابێت بخەڵەتێیت بە بێ دەنگ بوونی ئەبو داود لەسەر حەدیسەکە، جا بگەڕێوە بۆی، جا ئەم حەدیسە یەکێکە لەو شاهیدانە، چونکە عبداللەی کوڕی وەلیدی تێدایە کە ئەمیش (لين الحديث)ە، وەك (حافظ) دەفەرمووێت لە (التقريب)دا، پاڵپشتی بۆ ئەمە (دارقطني) یە، چونکە ئەو دەفەرمووێت: (لا يعتبر بحديثه) و (تضعيف) یشی کردووە، ئەمما ئیبنو حیببان تەوسیقی کردووە، وە (حافظ) مام ناوەند بووە لە نێوانیاندا بەوەی دەفەرمووێت: (لين) ە، جا سەیر لەوەدایە چۆن لە (النتائج) دا (١/٢٤) تەحسینی کردووە. (تمام المنة).

[2] ئەم پاڕانەوەیە پاڕانەوەی سەرەتای شەونوێژە هێنانی لێرەدا هەڵەیە، وە ریوایەتی ئەبوعوانە بە ڕاشکاوی باسی لێوە کردووە لە صەحیحەکەیدا، وە هەروەها ئەبو داود، وە ئەم دوعایە لە حەدیسی ئیبنو عەبباسەو بە (مطلق)ی هاتووە لە صەحیحەیندا، دانەر ئەمەی لەوەوە هێناوە، وە ریوایەتی ئەبوداودی هێناوە بە موقەییەدی لە (التوجه ٣٧٠)دا، کە ئەمەش ڕاستە لەبەر ئەوەی (مقيد) (مطلق) لەنێو دەبات وەك بڕیاری لەسەر دراوە لە (علم الأصول)، وە کار کردن لێرە بەمە هەڵەیە، جا ڕەنگە گومانی وابێت ئەمە حەدیسێکی ترە. (تمام المنة).

بۆتۆیە، تۆ نور و ڕۆشنایی ئاسمانەکان و زەویت و ئەوەی تێیاندایە، وە سوپاس هەر بۆ تۆیە تۆ ڕاگری ئاسمانەکان و زەویت و ئەوەی تێیاندایە، وە سوپاس هەر بۆ تۆیە تۆ ڕاستیت و پەیمانەکانت ڕاستن، وە گەیشتن بەتۆ ڕاستەو بەهەشت ڕاستەو ئاگر ڕاستەو نێردراوەکانت ڕاستن و موحەممەد ڕاستە نێرراوی تۆیە، وە کۆتایی هاتنی دنیا ڕاستە، خوایە من خۆم سپاردووە بەتۆ، وە بە تۆ باوەڕم هێناوە، وە پشت بەتۆ ئەبەستم و بۆلای تۆ ئەگەڕێمەوە، وە لەبەر تۆ دوژمنایەتی بێ باوەڕان ئەکەم، وە دادم ئەهێنم بۆلای تۆ، خوایە تۆش لێم خۆشبە لەو گوناهانەی زوو کردوومەو ئەوانەی لەم دواییەدا کردوومە، ئەو گوناهانەی بەنهێنی کردوومەو ئەوانەی بە ئاشکرا کردوومن، لە هەموویان خۆشبە، خوایە هەرتۆ خوایت هیچ مەعبودێکی حەق نی یە جگە لەتۆ.

٣- لەسەرەتاوە دوو ڕکات نوێژی کورت بکات پاشان بەئارەزووی خۆی چەندی ویست نوێژ بکات، لە عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە کە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ هەڵئەسا بۆ شەونوێژ، لەسەرەتاوە دوو ڕکات نوێژی کورتی ئەکرد. (رواه مسلم).

لە ئەبو هورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذَا قَامَ أحَدُكُم مِنَ االلَّيلِ فَلِيَفتَتِح صَلاتَهُ بِرَكعَتَينِ خَفِيفَتَينِ) (رواه مسلم). واتە: ئەگەر کەسێکتان شەو هەڵسا بۆ شەونوێژ با لەسەرەتاوە دوو ڕکات نوێژی کورت بکات.

٤- خێزان و کەسوکاری ئاگا بکاتەوە، لە ئەبی هورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (رَحِمَ اللهُ امرَأً قَامَ مِنَ اللَّيلِ فصلى وَأيقَظَ امرَأتَهُ، فَإن أبَت نَضَحَ فِي وَجهِهَا المَاءَ، رَحِمَ اللهُ امرَأةً قَامَت مِنَ اللَّيلِ فَصَلَّت وَأيقَظَت زَوجَهَا، فَإن أبى نَضَحَت فِي وَجهِهِ المَاءَ). (رواه أبو داود وغيره بإسنادٍ صحيح). واتە: ڕەحمەتی خوا لەوکەسە بێت هەڵئەستێ بۆ شەونوێژو خێزانەکەشی هەڵئەستێنێ، ئەگەر ملی نەدا ئاو لەسەروچاوی بپرژێنێت، وە ڕەحمەتی خوا لەو ژنەبێت هەڵئەستێ بۆ شەونوێژو مێردەکەشی ئاگا ئەکاتەوە، ئەگەر ملی نەدا ئاو ئەپرژێنێتە سەروچاوی.

هەر لە ئەبوهورەیرەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (وَإذَا أيقَظَ الرَّجُلُ أهلَهُ مِنَ اللَّيلِ فَصَلَّيَا أو صلى رَكعَتَينِ كُتِبَ فِي الذَّاكِرِينَ وَالذَّاكِرَاتِ) (رواه أبوداود وغيره بإسنادٍ صحيح). واتە: ئەگەر پیاوێك خێزانەکەی هەڵسان بۆ شەونوێژ لەشەودا بەیەکەوە یا بەتەنها دوو ڕکات نوێژیان کرد، خوا لەڕیزی پیاوان و ژنانی یادکەر ئەیان نووسێ.

لە ئومموسەلەمەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ شەوێك هەڵسا لەخەو فەرمووی: (سُبحَانَ اللهِ، مَاذَا أُنزِلَ اللَّيلَةَ مِنَ الفِتنَةِ، مَاذَا أُنزِلَ مِنَ الخَزَائِنِ، مَن يُوقِظُ صَوَاحِبَ الحُجُرَاتِ، يَا رُبَّ كَاسِيَةٍ فِي الدُّنيَا عَارِيَةٍ يَومَ القِيَامَةِ) (رواه البخاري). واتە: پاك و بێگەردی بۆ خوا، ئەمشە و چ فتنەیەك

باریوه، وه له گەنجینەی خواوه چی باریوه، کێ ژنه ژوور نشینەکان بەئاگا ئەکاتەوه؟ ئای چەند ئافرەتی پۆشته هەیه له دنیا له ڕۆژی دواییدا ڕووتن.

له عەلی‌یەوه هاتوه که پێغەمبەر ﷺ شەوێکیان له دەرگای دان، خۆی‌و (فاطمة) بوون فەرمووی: ئەوه نوێژ ناکەن؟ (فاطمة) فەرموی: ئەی نێرراوی خوا گیانمان بەدەست خوایه ئەگەر بیەوێ ئاگامان بکاتەوه ئەیکاتەوه، کاتێ ئەوەی فەرموو پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت، لەپاشاندا گوێم لێ بوو بەدەم ڕۆیشتنەوه ئەیکێشا بەڕانیداو ئەیفەرموو: ﴿وَكَانَ الْإِنسَانُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلًا﴾ (الكهف/٥٤) (متفق عليه). واته: ئینسان زیاتر له هەمو دروست کراوەکان بەربەرەکانێ‌و دەم بەدەمە ئەکات.

٥- ئەگەر ئەوکەسە زۆر خەوی ئەهات ئەبێ واز لەنوێژ کردن بهێنێ وبخەوێت هەتا خەوەکەی ئەڕوات، له عائیشەوه هاتووه که پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذا قَامَ أحَدُكُم مِنَ اللَّيلِ فَاستَعجَمَ القُرآنُ على لِسَانِهِ فَلَم يَدرِ مَا يَقُولُ فَلْيَضطَجِع) (رواه مسلم). واته: ئەگەر کەسێکتان هەڵسا بۆ شەونوێژو زمانی تێکەڵ و پێکەڵ ئەبوو که قورئانی ئەخوێندو نەیئەزانی چی ئەڵێت با ڕاکشێتەوه.

ئەنەس دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ هاته ناو مزگەوت، پەتێك لەنێوان دوو کۆڵەکەی مزگەوتدا هەڵواسرابوو، فەرمووی: ئەمە چی‌یه؟ ووتیان: پەتی زەینەبه هەڵی واسیوه کاتێ تواناى هەڵسانی نەماو قاچی شل بوو دەستی پێوه ئەگرێت، فەرمووی: بیکەنەوه، با هەرکەس بەپێی توانا نوێژ بکات، جا کاتێ ماندوو بوو یاقاچی شل بوو ڕاکشێتەوه. (بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوه).

٦- با شەونوێژەکه لەسەر خۆی گران نەکات، بەڵکو بەپێی تواناى خۆی هەڵسێت شەونوێژ بکات، بەڵام بەردەوام بێت لەسەری و وازی لێ‌نەهێنێ، لەبەر پێویست نەبێت، له عائیشەوه خوای لێ ڕازی بێت هاتوه دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (خُذُوا مِنَ الأعمَالِ مَا تُطِيقُونَ، فَوَاللهِ مَا يَمَلُّ اللهُ حتى تَمَلُّوا) (رواه البخاري ومسلم). واته: به گوێرەی تواناى خۆتان کار بکەن، سوێند بەخوا! خوا فەزڵی خۆی نابڕێ و بێ پاداشتتان ناکات، هەتا خۆتان بێزار ئەبن له داوا کردنی.

هەر له عائیشەوه بوخاری و موسلیم ئەگێڕنەوه که پێغەمبەر ﷺ کاتێ پرسیاری لێ کرا چ کردەوەیك لای خوا خۆشەویستترین کردەوەیه ؟ فەرمووی: (أدوَمُهُ وَإن قَلَّ) واته: کاری بەردەوام هەرچەنده کەمیش بێت.

موسلیم له عائیشەوە ئەگێڕێتەوە دەفەرمووێت: کردەوەکانی پێغەمبەر ﷺ بەبەردەوامی بوو ئەگەر کارێکی بکردایە لەسەر خۆی ئەچەسپاند، وە عبداللەی کوڕی عومەر دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: (يَا عَبدَ اللهِ! لا تَكُن مِثلَ فُلانٍ كَانَ يَقُومُ مِنَ اللَّيلِ فَتَرَكَ قِيَامَ اللَّيلِ) (متفق عليه). واتە: ئەی عبدالله تۆ وەك فلانەكەس مەبە لەوەپێش شەونوێژی ئەکرد ئێستا وازی لێ هێناوە.

وە هەر بوخاری و موسلیم لە ئیبنو مەسعودەوە ئەگێڕنەوە فەرمویەتی: لای پێغەمبەر ﷺ باسی پیاوێکیان ئەکرد ئەیان ووت: هەتا بەیانی ئەخەوێ، فەرمووی: (ذَاكَ رَجُلٌ بَالَ الشَّيطَانُ فِي أُذُنَيهِ) أو قال: (فِي أُذُنِهِ) واتە: ئەوە پیاوێکە شەیتان میزاوەتە گوێکانی، یان فەرمووی: گوێی.

وە هەر بوخاری و موسلیم لە سالیمی کوڕی عبدالله ی کوڕی عومەرەوە لە باوکیەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ بەباوکی فەرمووە: (نِعمَ الرَّجُلُ عَبدُاللهِ لَوكَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيلِ) واتە: پیاوی چاك (عبدالله) یە ئەگەر شەونوێژی بکردایە، سالم دەفەرمووێت: لەوکاتەوە عبدالله لە شەودا کەمێك ئەخەوت.

**(٣) کاتەکەی:**

شەونوێژ لەسەرەتای شەوو ناوەڕاست و کۆتایی شەودا دروستە، بەمەرجێك دوای نوێژی خەوتنان بێت، ئەنەس خوا لێی ڕازی بێت دەربارەی شێوەی نوێژەکانی پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: هەرشەوێك حەزمان بکردایە بمان بینیایە شەونوێژی بکردایە ئەمان بینی، وە هەرشەوێك حەزمان بکردایە بەخەوتوویی ببینین ئەمان بینی، وە مانگی واهەبوو ئەوەندە تێیدا بەڕۆژوو ئەبوو ئەمان ووت: ئیتر هەر بەڕۆژوو ئەبێت، هیچی لێ ناخوات، وە جاری واهەبوو لەمانگدا بەڕۆژوو نەئەبوو هەتا ئەمان ووت: ئیتر بەڕۆژوو نابێت. (ئەحمەدو نەسائی و بوخاری گێڕاویانەتەوە).

(حافظ) دەفەرمووێت: شەونوێژی پێغەمبەر ﷺ کاتی دیاری کراوی نەبوو، بەڵکو هەرکاتێك بۆی بلوایە ئەیکرد.

**(٤) چاکترین کاتی شەونوێژ:**

بەڵام چاکتر وایە دووا بخرێت بۆ سێیەکی کۆتایی شەو:

أ- لە ئەبی هورەیرەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (يَنزِلُ رَبُّنَا عَزَّوَجَل كُلَّ لَيلَةٍ إلى سَمَاءِ الدُّنيَا حِينَ يبقى ثُلُثُ اللَّيلِ الآخِرِ فَيَقُولُ: مَن يَدعُونِي فَأَستَجِيبَ لَهُ، مَن يَسأَلُنِي فَأُعطِيَهُ، مَن يَستَغفِرُنِي فَأَغفِرَ لَهُ) (رواه الجماعة). واتە: پەروەردگاری بەرزو گەورە هەموو شەوێك دێتە ئاسمانی دنیا کاتێ سێیەکی دوایی شەو ئەمێنێ، ئەفەرمووێت:

کێ هاوارم لێ ئەکات وەڵامی بدەمەوە، کێ داوای شتێکم لێ ئەکات بیدەمێ، کێ داوای لێبوردنم لێ ئەکات لێی ببورم.

ب- لە عەمری کوڕی عەبسەوە هاتووە دەفەرموورێت: گوێم لەپێغەمبەر ﷺ بووە فەرمووبەتی: (أقرَبُ مَا يَكُونُ العَبدُ مِنَ الرَّبِّ فِي جَوفِ اللَّيلِ الأخِيرِ فَإنِ استَطَعتَ أن تَكُونَ مِمَّن يَذكُرُ اللهَ فِي تِلكَ السَّاعَةِ فَكُن) (رواه الحاكم وقال: علي شرط مسلم، والترمذي وقال: حسن صحيح، ورواه أيضاً النسائي وابن خزيمة). واتە: ئەوکاتەی بەندەی خوا زۆر لەپەروەردگارەوە نزیك بێت لە بەشی کۆتایی شەودایە، جا ئەگەر ئەتەوێ لەوکەسانە بیت کە لەوکاتەدا یادی خوا ئەکەن، ئەوە ببە.

ج- ئەبو موسلیم بە ئەبوزەڕی فەرموو: چ کاتێك چاکترین کاتە بۆشەونوێژ؟ فەرمووی: منیش وەك تۆ چۆن ئەو پرسیارەت لێ کردم بەوشێوەیە لەپێغەمبەرم ﷺ پرسی ؟ فەرمووی: نیوەی شەو بەڵام کەم کەس ئەیکات. (ئەحمەد بەئیسنادێکی (جید) گێڕاویەتیەوە).

د- لە عبداللە ی کوڕی عەمرەوە هاتوە دەفەرموورێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووبەتی: خۆشەویست ترین ڕۆژوو لای خوا ڕۆژووی داوودە، وە خۆشەویست ترین نوێژ لەلای خوا نوێژی داودە، نیوەی شەو ئەخەوت و سێ‌یەکی شەو نوێژی ئەکرد، وە شەش یەکی ئەخەوت، وە ڕۆژێك بەڕۆژوو ئەبوو، ڕۆژێك بەڕۆژوو نەئەبوو. (جەماعەت گێڕاویانەتەوە جگە لە (ترمذي).

**(٥) ژمارەی ڕکاتەکانی شەونوێژ:**

شەونوێژ ژمارەی تایبەتی و سنوری دیاری کراوی نی‌یە، تەنانەت بەیەك ڕکاتی وەتر دوای نوێژی خەوتنان بەجێ دێت.

أ- لە سە مورەی کوڕی جوندوبەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرموورێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ ئەکردین کەم بێت یا زۆر شەونوێژ بکەین و بەوەتر کۆتایی پێ بهێنین. (طبراني و بەززار گێڕاویانەتەوە)[1].

---

(١) دانەر هەرچەندە ئاماژەی بۆ نەکردووە بەڵام لە (مجمع الزوائد ٢/٢٥٢)وە نەقلی کردووە، بەڵام نازانم بۆچی بە تەواوەتی ووتەکەی نەقل نەکردووە کە ڕوون کەرەوەی حاڵی‌یەتی، ئەویش ووتەی: (وإسناده ضعيف)؟! یان لە (الترغيب) وە (١/٢١٧) نەقلی کردووە، کە بە ووتەی (رُوِيَ) دەستی پێ کردووە، هەست بە لاوازی دەکرێت هەروەك بە دەق لەسەرەتاکەیەوە باسی لێوە کردووە، وە لە سەنەدەکەی بەززار و (طبراني) کەسێکی تێدایە، کە تۆمەت پێ کراوە بە حەدیس هەڵبەستن، وە بەززار پاش حەدیسەکە خۆی (تضعيف)ی کردووە بەڵام من ڕێگایەکی ترم بۆ دۆزیوەتەوە لەبەر خراپی بەهێز نابێت پێی، و ئەمەم ڕوون کردۆتەوە لە (الضعيفة) دا (٥٢٨٤) (تمام المنة).

ب- لە ئەنەسەوە ڕیوایەت کراوە کە ڕەفعی ئەکات بۆ پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نوێژێك لەم مزگەوتەی مندا یەکسانە بە دە هەزار نوێژ، وە نوێژێك لە مزگەوتی حەرامدا یەکسانە بە سەدهەزار نوێژ، وە نوێژێك لەسەر زەوی جەنگ یەکسانە بەدووسەد هەزار هەزار نوێژ، وە لەوانە هەمووی زۆرتر دوو ڕکات نوێژە کە لە نیوەشەودا بکرێت. ئەبو شێخ و ئیبنوحیببان لەکتێبی (الثواب) دا گێڕاویانەتەوە، وە (منذري) لە کتێبی (الترغيب والترهيب) دا لێی بێ دەنگە[1].

ج- لە ئیاسی کوڕی موعاویەی موزەنیەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا بُدَّ مِن صَلاةٍ بِلَيلٍ وَلَو حَلبَ شَاةٍ، وَمَا كَانَ بَعدَ صَلاةِ العِشَاءِ فَهُوَ مِنَ اللَّيلِ) (رواه الطبراني ورواته ثقات إلا محمد ابن إسحاق)، واتە: ئەبێت شەونوێژ هەر بکرێت ئەگەر ئەوەندەی مەڕ دۆشینێکیش بێت، وە هەرچی لەدوای نوێژی خەوتنانەوە کرا ئەوە لەشەودایە[2].

د- لە ئیبنو عەبباسەوە خوایان لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: لای هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ باسی شەونوێژم کرد، هەندێکیان وتیان: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نیوەی شەوە، سێ یەکی شەوە، چواریەکی شەوە،ئەوەندەی دۆشینی ووشترێك، ئەوەندەی دۆشینی مەڕێك.

هـ- هەر لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەت کراوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ ئەکردین، شەونوێژ بکەین و ڕەغبەتی ئەدایە، هەتا ئەیفەرموو: (عَلَيكُم بِصَلاةِ اللَّيلِ وَلَو رَكعَةً) (رواه الطبراني في الكبير والأوسط). واتە: شەونوێژ بکەن تەنانەت یەك ڕکاتیش بێ.

وە چاکتر وایە لەسەر یانزە ڕکات یان سیانزە ڕکات بەردەوام بوون، وە ئەوکەسە ئارەزووی خۆیەتی بەسەر یەکەوە ئەیان کات یا جیا جیا.

عائیشە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ نە لە ڕەمەزانداو نە لە غەیری ڕەمەزاندا لە یانزە ڕکات زیاتری نەکردووە، چوار ڕکاتی ئەکرد مەپرسە لەجوانی و درێژی، لەپاشاندا چوار ڕکاتی تری ئەکرد مەپرسە لەجوانی و درێژی، پاشان سێ ڕکاتی ئەکرد، منیش ووتم: ئەی نێرراوی خوا ئەخەوی پێش

(١) ئەخێر (منذري) بەلاوازی داناوە چونکە بەسیغەی (رُوِيَ) هێناویەتی، وە هەروەها لە فەرموودەکەیدا شتێك هەیە کە لاوازی یەکەی دەگەیەنێت، چونکە لەوێدا ئەفەرموێت: نوێژێك لە مزگەوتی ئەودا، هاوتای دەهەزار نوێژە، کەچی لە فەرمودەی صەحیحدا هاتوە کە هاوتای هەزار نوێژ ئەکات. لەبەر ئەوە (حديث) ە کە مونکەرە. (تمام المنة).

(٢) حەدیسەکە دوو عیللەتی تێدایە: بەکارهێنانی (عنعنة) ی موحەممەدی کوڕی ئیسحاق کە ئەمیش مودەللیسە، و ئیرسالی تێدایە لەبەر ئەوەی ئیاسی کوڕی موعاویە صەحابی نیە، بەڵکو لە تابیعیە بچوکەکانە، لەساڵی (١٢٢ك) وەفاتی کردووە، جا حەدیسەکە بەم لەفزە (ضعيف)ە. (تمام المنة).

ئەوەی وەتر بکەیت ؟ فەرمووی: ئەی عائیشە چاوەکانم ئەخەون و دڵم هەر بەئاگایە. (بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە).

هەروەها بوخاری و موسلیم لە قاسمی کوڕی موحەممەدەوە ئەگێڕنەوە دەفەرموێت: لە عائیشەم بیستووە ئەیفەرموو: شەونوێژەکانی پێغەمبەر ﷺ دە ڕکات بوو بەڕکاتێکیش وەتری ئەکرد.

٦- گێڕانەوەی شەونوێژ:

موسلیم لە عائیشەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ شەونوێژەکەی بچوایە بەهۆی نەخۆشی و ئازارێکەوە یا بەهۆی شتی ترەوە بووایە،، لەڕۆژدا دووانزە ڕکاتی ئەکرد. وە جەماعەت جگە لە بوخاری لە عومەرەوە خوا لێی ڕازی بێت ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن نَامَ عَن حِزبِهِ أو عَن شيئٍ مِنهُ فَقَرَأَهُ مَابَينَ صَلاةِ الفَجرِ وَصَلاةِ الظُّهرِ كُتِبَ كَأنَّمَا قَرَأَهُ مِنَ اللَّيلِ) واتە: هەرکەس لەو بەشە قورئانەی ڕاهاتبوو لەسەری ئەیخوێند، بۆی نەخوێنراو خەوت، یا شتێك لەو بەشەی مایەوە لەنێوان نوێژی بەیانی و نیوەڕۆدا خوێندی، وەك ئەوەی بەشەو خوێندبێتی بۆی ئەنووسرێت.

هەستانی ڕەمەزان (قيام رمضان) :

١- مەشروعیەتی هەستانی ڕەمەزان و نوێژی تەراویح:

نوێژی تەراویح لەشەوەکانی مانگی ڕەمەزاندا سوننەتە بۆ پیاوان و ژنان، دوای نوێژی خەوتنان دەکرێت، پێش نوێژی وەتر دوو ڕکات دوو ڕکات ئەکرێت، وە دروستیشە دوای نوێژی وەتر بکرێت، بەڵام کردنی دوای نوێژی وەتر پێچەوانەی چاکێتی کردنیەتی لە پێش وەتردا، وە کاتەکەی هەتا کۆتایی شەو بەردەوام ئەبێت.

جەماعەت لە ئەبی هورەیرەوە ئەگێڕنەوە کە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ هانی خەڵکی ئەدا بۆ کردنی نوێژی تەراویح بێ ئەوەی فەرمانی تەواو بدات بۆ کردنی و ئەیفەرموو: (مَن قَامَ رَمَضَانَ إيمَاناً وَاحتِسَاباً غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِهِ). واتە: هەرکەس لە شەوانی ڕەمەزاندا نوێژی تەراویح بکات بە باوەڕەوەو لەبەر ڕەزامەندی خوا، خوا لە گوناهی ڕابوردووی ئەبوورێت.

هەروها جەماعەت جگە لە (ترمذي) لە عائیشەوە ئەگێڕنەوە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوتدا شەوێکی ڕەمەزان نوێژی تەراویحی کرد، خەڵکێکی زۆریش لەدوایەوە نوێژیان کرد، شەوی دووەم خەڵکەکە لەشەوی یەکەم زیاتر بوون، شەوی سێیەم خەڵکەکە کۆ بوونەوە چاوەڕوانیان کرد، بەڵام پێغەمبەر ﷺ نەچوو بۆلایان بۆ مزگەوت، کاتێ ڕۆژ بۆوە فەرمووی: (قَد رَأيتُ صَنيعَكُم فَلَم يَمنَعنِي مِنَ الخُرُوجِ إلَيكُم إلا أنِّي خَشَيتُ أن تُفرَضَ عَلَيكُم). واتە: بینیم چیتان ئەکرد، وە

هیچ شتێك نەبووە بەربەست لە دەرچوونم بۆلاتان جگە لەوە دەترسام مەبادا لەسەرتان فەرز بکرێت، وە ئەمەش لە ڕەمەزاندا بوو.

**(٢) ژمارەی ڕکاتەکانی نوێژی تەراویح:**

جەماعەت ئەگێڕنەوە لە عائیشەوە کە پێغەمبەر ﷺ نە لە ڕەمەزانداو نە لە غەیری ڕەمەزاندا لە یانزە ڕکات زیاتر شەو نوێژی نەکردووە، وە ئیبنو خوزەیمە و ئیبنوحیببان لە دوو صەحیحەکەیاندا لەجابیرەوە ئەگێڕنەوە کە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ هەشت ڕکات نوێژو وەتری بۆ کردن، لەشەوی دواتردا چاوەڕوانیان کرد، بەڵام نەهاتەدەر بۆلایان.

ئەبو یەعلاو (طبراني) بە ئیسنادێکی حەسەن لە جابیرەوە ئەگێڕنەوە کە دەفەرمووێت: ئوبەی کوڕی کەعب هاتەلای پێغەمبەر ﷺ پێی ووت: ئەی نێرراوی خوا ئەمشەو شتێکم کرد (واتە لە ڕەمەزاندا) فەرمووی: ئەو شتە چی بوو ئەی ئوبەی ؟ ووتی: کۆمەڵێك ئافرەت لەماڵی ئێمە بوون ووتیان: ئێمە ئەمشەو قورئان ناخوێنین بەڵکو لەدوواتەوە نوێژ ئەکەین منیش هەشت ڕکات نوێژم پێ کردن، لەپاشاندا وەترم کرد پێیان، جا ئەم کارە سوننەتێك بوو کە پێی ڕازی بوو وە هیچی نەفەرموو.

ئەمە ئەو سوننەتەیە کە هاتووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئیتر هیچی تر لەوە زیاتر ڕاست نیيە، وە بە صەحیحی هاتووە کە: خەڵك لەسەردەمی عومەرو (عثمان) و عەلیدا بیست ڕکاتیان ئەکرد[1]،

(١) منیش دەڵێم: ئەمە لە عوسمانەوە من نازانم کەسێك لێوەی ریوایەت کردبێت، ئەگەرچی بە سەنەدێکی زەعیف، وە ئەمە لە عومەر و عەلییەوە، ئەوە لێیان ریوایەت کراوە بە سەنەدێك هەمووی مەعلولە، بڕوانە کتێبی (صلاة التراویح)، لەوێدا جۆرەکانیم باس کردووە کە بە کەڵك ئەوە نایەت هەندێکیان هەندەکەی تری بەهێز بکات، وە ئەگەر شتێکیشی صەحیح بووبێت ئەوە لەبەر هۆیەك بووە هۆیەکەشی لەبەین چووە، لەبەر ئەوەی لە پێشەواکان کەسێك نەماوە کە نوێژەکەی بە قورئان خوێندن درێژ بکاتەوە بەو شێوەی سەلەفی صالح، تاوەکو لێی لادەن و خوێندنەکە کورت کەنەوە لە جیاتی ئەوەی ژمارەی ڕکاتەکان زیاد کەن، و ئیجماع نیيە لەسەر بیست ڕکاتەکە، وە ئەوەی بە صەحیحی هاتووە لە عومەرەوە خوای لێ ڕازی بێت (مطابق) و یەکسانە بۆ سوننەتی پێغەمبەر ﷺ کە هاتووەو باسکرا لە عائیشەوە، ئیمامی مالیك لە (الموطأ) دا لە سائیبی کوڕی یەزیدەوە خوای لێ ڕازی بێت دەگێڕێتەوە دەفەرمووێت: عومەری کوڕی (خطاب) فەرمانی کرد بە ئوبەی کوڕی کەعب و تەمیمی داری کە هەستن بە نوێژی تەراویح یانزە ڕکات بە خەڵکی بکەن، دەفەرمووێت: وە پێش نوێژخوێن دووسەد ئایەتی دەخوێند تاوەکو خۆمان بەسەر دارا دەدا لەبەر درێژی نوێژەکە، وە بڵاوەمان لێ نەدەکرد تاوەکو بەیانی دەدا.

وە ئەو بیست ڕکاتەش ڕای جومهوری زانایانە لە حەنەفی‌یەکان و حەنبەلی‌یەکان و داود (الظاهري)، (ترمذي) دەفەرموێت: بەشی زۆری زانایان لەسەر ئەوەن، کە لە عومەرو عەلی و صەحابەی ترەوە بیست ڕکات گێڕراوەتەوە. وە ئەوەش قسەی (ثوري) و ئیبنوموبارەك و شافیعی‌یە، وە شافیعی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: بەو شێوەیە لەمەککە خەلکم بینی بیست ڕکاتیان ئەکرد.

هەندێ لە زانایان ڕایان وایە یانزە ڕکاتەکە بەوەترەوە سوننەتە، لەوە زیاتر موستەحەببە، کەمالی کوڕی هومام دەفەرمووێت: بەلگە ئەوە پێویست دەکا سوننەت لە بیست ڕکاتەکەدا ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ کردویەتی لەپاشاندا وازی لێ هێناوە لەترسی ئەوەی نەوەك فەرز ببێت لەسەرمان، وەئەوەی تری موستەحەببە، وە سابتیش بوە ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ کردویەتی یانزە ڕکاتە بەوەترەکەوە، وەك لە هەردوو صەحیحدا هاتووە، کەواتە ئەوەی سوننەت بێت لەسەر ئوصولی مامۆستاکانمان هەشتە لەو بیستە، وە موستەحەببەکە دووانزە ڕکاتە.

**(٣) کردنی تەراویح بە جەماعەت:**

نوێژی تەراویح دروستە بەجەماعەت بکرێت، وەك چۆن دروستە بەتەنهاش بکرێ، بەلام کردنی لە مزگەوتا بەجەماعەت لای جەماوەری زانایان چاکترە، وە لەپێشەوە باسی ئەوەمان کرد کە پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوتدا بەجەماعەت بۆ موسلمانەکانی کردووە، بەلام بەردەوام نەبووە لەسەری لەترسی ئەوەی نەك فەرز ببێت لەسەر موسلمانان، لەپاش ئەو عومەر خوا لێی ڕازی بێت خەلکەکەی کۆ کردەوە لەدوای ئیمامێکەوە.

عبدالرحمن ی کوڕی عبدالقاری دەفەرمووێت: شەوێکی ڕەمەزان لەگەلّ عومەری کوڕی (خطاب)دا چووین بۆ مزگەوت، بینیمان خەلکەکە جیا جیا نوێژیان ئەکرد، کەسی واهەبوو بەتاك بۆ خۆی نوێژی ئەکرد، وە کەسی واهەبوو لەدوایەوە کۆمەلێك نوێژیان ئەکرد، عومەر فەرمووی: من پێم وایە ئەم خەلکە لەدوای قورئان خوێنێکەوە کۆ بکەینەوە نوێژ بکەن چاکترە، لەپاشاندا بڕیاری دا لەدوای ئوبەی کوڕی کەعبەوە کۆی کردنەوە، پاش ئەوە شەوی داهاتوو هەر لەگەلّیا چووەوە، عومەر سەیری کرد خەلکەکە بەکۆمەلّ لەدوای بەرنوێژەکەیانەوە نوێژ ئەکەن فەرمووی: (ئەمە ـ واتە: کۆ کردنەوەی ئەو خەلکە لەدوای ئیمامێکەوە ـ تازە داهاتویەکی چاکە، وە ئەو بەشەی تێیدا ئەخەون چاکترەو خێری زۆرترە لەوبەشەی نوێژی تێدا ئەکەن) مەبەستی کۆتایی شەو

---

بەوەش دەیسەلمێنم کە بەردەوامی پێغەمبەر ﷺ لەسەر یازدە ڕکاتەکە بە درێژایی تەمەنی پیرۆزی بوە، بەلگەیە لەسەر ئەوەی نوێژ لە شەودا سوننەتێکی ڕەها نی‌یە وەك زۆرینەی خەلك دەلێن. وە هیچ جیاوازی‌یەك نی‌یە لە نێوان شەونوێژ و سوننەتە راتیبەکان و نوێژی خۆرگیران لە ڕووی ئەوە کە نوێژێکی موقەییەدە (تمام المنة).

بووه، ـ واته: کردنی له کۆتایی شهودا باشتره ـ وه ئهوکاته خهڵك لهسهرهتای شهوهوه نوێژیان ئهکرد. (بوخاری و ئیبنو خوزهیمه بهیههقی و غهیری ئهوان گێڕاویانهتهوه).

**(٤) قورئان خوێندن لهنوێژی تهراویحدا:**

لهبارهی قورئان خوێندن لهنوێژی تهراویحدا سورهتێکی دیاری کراو وجودی نییه که سوننهت بێ، وه له پێشینهکانهوه هاتووه: ـ واته: سهلهف ـ که دووسهد ئایهتیان تێدا خوێندووه، وه ئهوهنده بهپێوه ئهوهستان خۆیان ئهدا بهسهر داردهستهکانیاندا، وه ههتا نزیك (فهجر) بهرهبهیان لێ نهئهبوونهوه، لهبهرئهوه پهلهیان له خزمهتکارهکانیان ئهکرد خواردنهکهیان زوو بۆ ئاماده بکهن نهك ڕۆژیان لێ ببێتهوه.

سورهتی (البقرة) یان له ههشت ڕکاتدا تهواو کردووه، وه ئهگهر لهدوانزه ڕکاتدا تهواویان بکردایه بهکورتیان دائهنا،، ئیبنو قودامه دهفهرمووێت: ئیمامی ئهحمهد دهفهرمووێت: لهشهوانی مانگی ڕهمهزاندا کام سورهته کورته ئهوه بخوێنرێت بۆ خهڵکی، بۆ ئهوهی گران نهبێت لهسهریان، بهتایبهتی لهشهوه کورتهکاندا (وهك شهوانی هاوین).

(قاضي) دهفهرمووێت: موستهحهب نییه لهخهتمێك کهمتر بخوێنرێت لهمانگی ڕهمهزاندا، بۆ ئهوهی خهڵکهکه ههموو قورئان ببیستن، وه له خهتمه زیاتر نهخوێنرێت نهك گران بێت لهسهر شانی ئهوانهی لهریزهکاندا نوێژ ئهکهن، چونکه بهپێی حاڵی خهڵکهکه بێت باشتره، وه ئهگهر کۆمهڵێك ڕێك کهوتن لهسهر خوێندنی زۆر ئهوه چاکتره. وهك (أبوذر) دهفهرمووێت: لهگهڵ پێغهمبهردا ﷺ شهونوێژمان ئهکرد ئهوهنده درێژهی پێدا ههتا ترسی ئهوهمان ههبوو پارشێومان بۆ نهکرێت و ڕۆژ ببێتهوه، ئیمام دووسهد ئایهتی ئهخوێنند.

## نوێژی چێشتهنگاو

**(١) (فضل) ی نوێژی چێشتهنگاو:**

دهربارهی (فضل) ی ئهم نوێژه حهدیسێکی زۆر هاتوه وا له خوارهوه باسیان ئهکهین:

أ- له (أبوذر)هوه خوا لێی ڕازی بێت هاتوه دهفهرمووێت: پێغهمبهر ﷺ فهرموویهتی: (يُصبِحُ على كُلِّ سُلامى مِن أَحَدِكُم صَدَقَة، فَكُلُّ تَسبِيحَةٍ صَدَقَةٌ، وَكُلُّ تَحمِيدَةٍ صَدَقَةٌ، وَكُلُّ تَهلِيلَةٍ صَدَقَةٌ، وَكُلُّ تَكبِيرَةٍ صَدَقَةٌ، وَأمرٍ بِالَمعرُوفِ صَدَقَةٌ، وَنَهيٍ عَنِ الُمنكَرِ صَدَقَةٌ، وَيُجزِيءُ مِن ذَلكَ رَكعَتَانِ يَركَعُهُمَا مِنَ الضُّحَي) (رواه مسلم وأحمد وأبوداود). واته: ههر که ڕۆژ بۆوه لهسهر ههموو جومگهکانتان خێرێکی لهسهره، جا ههموو (سبحان الله) یهك خێرێکه، وه ههموو (الحمد لله) یهك خێرێکه، وه ههموو (لا إله إلا الله) یهك خێرێکه، وه ههموو (الله أكبر)ێك خێرێکه، وه

فەرمان بە چاکەکردن خێرێکە، وە نەهی لە خراپەکردن خێرێکە، وە کردنی دوو ڕکات نوێژی چێشتەنگاو بری هەموو ئەوانە ئەکەوێت.

ب- لای ئەحمەدو ئەبوداود هاتووە لە بورەیدەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی‌ەتی: (فِي الإنسَانِ ستُّونَ وَثلاثُمِئَة مَفصِل، عَلَيهِ أن يَتَصَدَّقَ عَن كُلِّ مَفصِلٍ مِنهَا صَدَقَةٌ) قَالُوا: (فَمَنِ الَّذِي يُطِيقُ عَلى ذَلِكَ يَا رَسُولَ الله؟) قَالَ: (النُّخَامَةُ فِي المَسجِدِ يَدفِنُهَا، أوِ الشَّيئُ يُنحِيهِ عَنِ الطَّرِيقِ، فَإن لَم يَقدِر فَرَكعَتَا الضُّحَي تُجزِئُ عَنهُ) واتە: هەموو ئادەمیزادێك سێ‌سەدو شەست جومگە لەلەشیا هەیە، لەسەریەتی بۆ هەر جومگەیەك خێرێك بكات، ووتیان: جا کێ ئەوە ئەتوانێ ئەی نێرراوی خوا؟ فەرمووی: تفێك و چڵمێك لەمزگەوتا بوو بیشارێتەوە، یا شتێك زیانی هەبوو لەسەر ڕێگایەك لایبا، ئەمانە هەموو خێرن، ئەگەر توانای ئەوەشی نەبوو دوو ڕکات نوێژی چێشتەنگاو بری ئەوانە ئەکەوێت.

شەوکانی دەفەرمووێت: ئەو دوو حەدیسە بەڵگەن لەسەر گەورەیی نوێژی چێشتەنگاوو جێگاکەی لای خوا، وە هەروەها شەرعی‌یەتی تەئکید ئەکەن، و بەڵگەشە لەسەر ئەوەی ئەو دوو ڕکاتە بری خێری سێ‌سەدو شەست جومگە ئەکەوێت، جا شتێك بەم شێوەیە بێ بەڕاستی شیاوی ئەوەیە کە بەردەوام بەجێ بگەیەنرێت، وە هەروەها ئەو دوو فەرموودەیە بەڵگەشن لەسەر چاکی و شەرعی‌یەتی زۆر ووتنی (سبحان الله و الحمد لله و لاإله إلا الله) وە فەرمان بە چاکە کردن و نەهی لە خراپە کردن، و شاردنەوەی ئەو شتانەی خەڵك لەمزگەوتدا بێزی لێ ئەکەنەوەو لابردنی ئەوشتانەی لەسەر ڕێگاکان زیانیان هەیە، وە کردنی هەموو جۆرەکانی خواپەرستی و (طاعة) بۆ ئەوەی هەموو ئەم شتانە بری ئەو خێرو صەدەقانە بکەوێ کە هەموو ڕۆژێك لەسەر ئینسان پێویستە.

ج- لە نەوواسی کوڕی سەمعانەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (قَالَ اللهُ عَزَّوَجَلَّ: ابنَ آدم! لا تَعجَزَنَّ عَن أربَعِ رَكَعَاتٍ فِي أوَّلِ النَّهارِ أكفِكَ آخِرَهُ). (رواه الحاكم والطبراني ورجاله ثقات. ورواه أحمد والترمذي وأبوداود والنسائي عن نعيم الغطفاني بسندٍ جيد[1]). واتە: خوای گەورە ئەفەرمووێت: ئەی ئادەمیزاد، چوار ڕکات نوێژ لەسەرەتای ڕۆژەوە پەك

(١) ئەوە وا دەرئەخات ئەوانەی باسیانی کردووە هەموویان لەنوعەیمەوە گێڕاویانەتەوە بەڵام وانی‌یە، تەنها ئەحمەدو ئەبوداود لە نوعەیمەوە گێڕاویانەتەوە، وە سەنەدەکەی صەحیحە لەسەر مەرجی موسلیم هەروەك لە (الإرواء ٤٦٢) دا باسم کردووە، و ئیبنوحیببان بە صەحیحی داناوە (٦٣٤)، ئەما (ترمذي) تەخریجی کردووە بەو لەفزەی دانەر لە حەدیسی (أبي درداء و أبي ذر) ەوە باسی کردووە، و ئیسنادەکەی (حسن صحيح)ە، و ئەمە تەخریج کراوە لە

مەخەو بیکە، منیش لەکۆتایی ئەو ڕۆژەدا بەهاوارتەوە دێم. وە لە لەفزی (ترمذي) بەم شێوەیە هاتووە: پێغەمبەر ﷺ لەخواوە ئەگێڕێتەوە فەرموویەتی: (إنَّ اللهَ تَعَالى قَالَ: ابنَ آدم! إركَع لِي أربَعَ رَكعَاتٍ مِن أوَّلِ النَّهَارِ أكفِكَ آخِرَه) واتە: ئادەمیزاد تۆ چوار ڕکات نوێژم بۆ بکە لەسەرەتای ڕۆژەوە، منیش لەکۆتاییدا بەهاوارتەوە دێم.

د- لە عبدالله ی کوڕی عەمرەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ کۆمەڵێك جەنگاوەری نارد بەلایەکدا، ئەوانیش غەنیمەتێکیان بەدەست هێناو بەپەلە گەڕانەوە، خەڵك لەو بارەیەوە ئەدوان ئەیان ووت: کوڕا ئەو هەموو شتەیان بەدەست هێناو خێرا گەڕانەوە ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ألا أدُلُّكُم على أقرَبَ مِنهُم مَغزىً، وَأكثَرَ غَنِيمَةً وَأوشَكَ رَجعَةً؟ مَن تَوضَّأ ثُمَّ غَدا إلى المَسجِدِ لِسَبحَةِ الضُّحَي فَهُوَ أقرَبُ مَغزىً وأكثَرُ غَنِيمَةً، وَأوشَكُ رَجعَةً). (رواه أحمد والطبراني، وروي أبويعلى نحوه[1]). واتە: بۆچی شتێکی ترتان پێ نەڵێم شوێنەکەی لەوە نزیکترو دەستکەوتی زۆرترو ماوە کەمتر بێت ؟ ئەوەیە کە کەسێك دەست نوێژ بگرێت پاشان بەرەو مزگەوت بڕوات بۆ نوێژی چێشتەنگاو، ئەوە شوێنی نزیکترو دەست کەوتی زۆرترو ماوەی کەمترە.

هـ- لە ئەبی هورەیرەوە هاتووە دەفەرمووێت: خۆشەویستەکەم ﷺ وەسیەتی بۆ کردوم بە سێ شت: لە هەموو مانگێکدا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بم، دوو ڕکات نوێژی چێشتەنگاو بکەم، پێش ئەوەی بخەوم وەتر بکەم، (بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە).

و- لە ئەنەسەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەرم ﷺ بینیوە لە سەفەرێکدا هەشت ڕکات نوێژی لەچێشتەنگاودا کرد، کاتێ لێبووەوە فەرمووی: (إنِّي صَلَّيتُ صَلاةَ رَغبَةٍ وَرَهبَةٍ، سَألتُ رَبِّي ثَلاثاً فَأعطَانِي اثنَتَينِ وَمَنَعَنِي وَاحِدَةً: سَألتُهُ ألا يَبتَلِيَ أُمَّتِي بِالسِّنِين فَفَعَل، وَسَألتُهُ ألا يُظهِرَ عَلَيهِم عَدُوَّهُم فَفَعَل، وَسَألتُهُ ألا يَلبِسَهُم شِيَعاً فأبى عَلَيَّ) (رواه أحمد والنسائي والحاكم وابن خزيمة وصححاه). واتە: من نوێژی هیواو ترسم کرد، داوای سێ شتم لەپەروەردگارم کرد دووانیانی پێ بەخشیم و سێیەمی پێ نەبەخشیم، داوام لێ کرد ئۆمەتم تووشی

---

(الإرواء ٤٦٥) دا، ئەمما نسائی لە (سنن الصغرى) دا تەخریجی نەکردووە بەڵکو لە (سنن الكبرى) دایە (تمام المنة).

(١) لەو تەخریجەدا کورت کردنەوە هەیە کە تێکی داوە، ئەبو یەعلا لە حەدیسی ئەبو هورەیرە ریوایەتی کردووە، وە ئەو لە شێخەکەی کە ئیبنو ئەبی شەیبەیە، وەئەم لە (المصنف)دا ریوایەتی کردووە، وە سەنەدەکەی صەحیحە لەسەر مەرجی موسلیم، و ئەمە تەخریج کراوە لە (التعليق الرغيب) دا (١/٢٣٥)، وە بڕوانە (صحيح الترغيب ٦٦٣و٦٦٤). (تمام المنة).

گرانی نەکات و بەبرسێتی نەیان کوژێت بۆی کردم، وە داوام لێ کرد کە دوژمنان بەسەریاندا زاڵ نەکات بۆی کردم، وە داوام لێ کرد بەش بەش نەبن لەناو خۆیاندا بۆی نەکردم.

**(٢) کاتەکەی:**

کاتێ ڕۆژ ئەوەندەی ڕمێ بەرز بۆوە کاتی نوێژی چێشتەنگاو دەست پێ ئەکات، وە کاتەکەی ئەمێنێ هەتا خۆر لەناوەڕاستی ئاسمان لائەدا (زوال)، بەڵام وا موستەحەببە دووا بخرێت هەتا ڕۆژ بەرز ئەبێتەوەو گەرما تین ئەستێنێت، لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرموورێت: پێغەمبەر ﷺ سەری لە خەڵکی قوبا دا، (شوێنێکە دوو میل دوورە لە مەدینەوە)، سەیری کرد نوێژی چێشتەنگاو ئەکەن، فەرمووی: (صَلاةُ الأَوَّابِينَ إذَا رَمَضَتِ الفِصَالُ مِنَ الضُّحَي) (رواه أحمد ومسلم والترمذي). واتە: نوێژی گەڕاوەکان بۆلای خوا لەوکاتەوە دەست پێ ئەکات کە بەچکەی ووشتر هەست بەگەرما ئەکات لەچێشتەنگاودا.

**(٣) ژمارەی ڕکاتەکانی:**

لایەنی کەمی نوێژی چێشتەنگاو دوو ڕکاتە، وەك لە حەدیسەکەی (أبوذر)دا هاتووە کە لەپێشەوە باس کرا، وە لایەنی زۆری ئەوەی کە سابتە لە کرداری پێغەمبەرەوە ﷺ هەشت ڕکاتە، وە ئەوەی لە فەرمایشتی‌یەوە سابت بوە دوانزە ڕکاتە. کۆمەڵێکیش بۆ ئەوە چوون لەوانە ئەبو جەعفەری (طبري) هەروەها حەلیمی و ڕەویانی لە شافیعی‌یەکان بڕیویانەتەوە، کە لایەنی زۆری بێ سنوورەو دیاری نەکراوە.

عێڕاقی لە شەرحی (ترمذي)دا دەفەرموورێت: کەسم لەصەحابەو تابعین نەبینیوە ژمارەی ڕکاتەکانی یەکلا کردبێتەوە لە دووانزە ڕکاتا، وە (سیوطي)ش هەر ئەوە دەفەرموورێت.

سەعیدی کوڕی مەنصور لە حەسەنەوە ئەگێڕێتەوە کاتێ پرسیاری لێ کراوە ئایا هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەو نوێژەیان ئەکرد ؟ ووتویەتی: بەڵێ هەیان بوە دوو ڕکاتی کردووە، هەیان بووە چوار ڕکات، وە هەیان بووە هەتا نوێژی نیوەڕۆ نوێژی ئەکرد.

لە ئیبراهیمی نەخەعی‌یەوە هاتووە کە پیاوێك لە ئەسوەدی کوڕی یەزیدی پرسی چەند ڕکات نوێژی چێشتەنگاو بکەم؟ فەرمووی: ئارەزووی خۆتە.

لە ئومموهانیئەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ هەشت ڕکات نوێژی چێشتەنگاوی کرد، دوو ڕکات دوو ڕکات سلاوی ئەدایەوە. (ئەبوداود بەئیسنادی صەحیح گێڕاویەتی‌یەوە[1]).

---

(١) ئەوەی بەم شێوەیە دەفەرموورێت لە (المجموع ٣/٣٩) دا بە زیادەی لەسەر مەرجی بوخاری! و (حافظ ابن حجر) لە (التلخيص) دا بە دووی کەوتووە، و ئەمە یەکێکە لە هەڵەکانیان چونکە لە ئیسنادەکەیدا (عیاض بن

له عائیشەوه خوای لێ ڕازی بێت هاتوه دەفەرموویێت: پێغەمبەر ﷺ چوار ڕکات نوێژی چێشتەنگاوی ئەکرد، وه ئەوەندەی خوا ویستی لەسەر بێت زیادی دەکرد. (ئەحمەدو موسلیم و ئیبنوماجه گێڕاویانەتەوه).

**نوێژی ئیستخاره:**

سوننەته بۆ کەسێك بیەوێ کارێکی ڕەوا بکات بەڵام نەزانێت لەوکارەدا تووشی خێر ئەبێت یا شەڕ، دوو ڕکات نوێژ بکات جگه لەنوێژی فەرز، گەرچی ئەو دوو ڕکاته لەسوننەته ڕاتبەکانیش بێت، یا نوێژی دوو ڕکاتی چوونه ناو مزگەوتیش بێت (تحية المسجد) هەردروسته، وه له هەرکاتێکی شەوو ڕۆژدا بێت بیکا، دوای خوێندنی سوڕەتی فاتیحه بەئارەزووی خۆی چی ئەخوێنێ له قورئان بیخوێنێ، لەپاشاندا که لێبۆوه سوپاس و ستایشی خوا بکات و سلاوت لەسەر پێغەمبەر ﷺ بدات و پاشان بەم پاڕانەوەیه بپاڕێتەوه که بوخاری گێڕاویەتی،یەوه له جابیرەوه خوا لێی ڕازی بێت که دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فێری نوێژی ئیستخارەی ئەکردین له هەموو کارێکماندا وەك چۆن فێری سوڕەتێکی قورئانی ئەکردین، ئەیفەرموو: ئەگەر کەسێکتان هات بەدڵیا کارێکی ڕەوا بکات با لەپێشدا دوو ڕکات نوێژ بکات جگه لەنوێژی فەرز پاشان بڵێت: (اللَّهُمَّ أستَخيرُكَ بِعلمِكَ وَأستَقدرُكَ بِقُدرَتِكَ، وَأسألُكَ مِن فَضلِكَ العَظِيمِ، فَإنَّكَ تَقدِرُ وَلا أقدِرُ، وَتَعلَمُ وَلا أعلَم، وَأنتَ عَلاّمُ الغُيُوب، اللَّهُمَّ إن كُنتَ تَعلَمُ أنَّ هَذَا الأمرَ خَيرٌ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أمرِي، أو قَال: عَاجِلِ أمرِي وَآجِلِه، فَاقدُرهُ لِي وَيَسِّرهُ لِي، ثُمَّ بَارِك لِي فِيهِ، وَإن كُنتَ تَعلَمُ أنَّ هَذَا الأمرَ شَرٌّ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أمرِي، أو قَالَ: عَاجِلِ أمرِي وَآجِلِهِ فَاصرِفهُ عَنِّي وَاصرِفنِي عَنهُ وَأقدِر لِيَ الخَيرَ حَيثُ كَانَ ثُمَّ أرضِنِي بِهِ). واته: خوایه تۆ خوایەکی زانایت و ئاگات لەنهێنی‌یەکانه، بەو زانستی‌یەت داوات لێ ئەکەم خێرم نیشان بدەیت، وه به تواناو دەسەڵاتی خۆت داوات لێ‌ئەکەم دەسەڵاتم بدەیتێ، وه داوات لێ ئەکەم له فەزڵه گەورەکەت، چونکه هەرتۆ خاوەنی تواناو دەسەلاتی، من بێ دەسەلاتم، وه تۆ زاناو شارەزایت من نەزان، وەتۆ زانای هەموو نهێنی‌یەکانی، خوایه ئەگەر ئەزانی ئەم کاره (لێرەدا ناوی کارەکەی بهێنێ) خێری بۆ ئاین و ژیان و پاشەڕۆژم هەلیه، یا ئەیفەرموو: بۆ ئێستاو پاشەڕۆژم هەیه، له چارەمی بنووسه وه بۆم ئاسان بکه، پاشان لێمی پیرۆز بکه، وه ئەگەر ئەزانی ئەوکاره شەڕی بۆ ئاین و ژیان و پاشەڕۆژم هەیه، یا

---

عبدالله الفهري المدني) دانیشتووی میسری تێدایه (حافظ) خۆی دەفەرمووێت له (التقريب)دا : (فيه لين) و هێمای بەوه کردووه که له پیاوانی موسلیمه جگه له بوخاری! هەروەها (ذهبـي) ش هێمای بەوه کردووه له (الكاشف) و ئاماژەی به لاوازی کردووه، بۆ زیاتر بڕوانه (تمام المنة).

ئەیفەرموو: بۆ ئێستاو پاشەڕۆژم هەیە، لێمی دوور بخەرەوە، وە منیش لەو دوور بخەرەوە، وەخێرێکی ترم لەچارە بنوسە لەهەرکوێیەك بێت، پاشان ڕازیم بکە پێی.

وە دەربارەی خوێندنی سورەتێکی تایبەت لەو دوو ڕکاتەدا شتێکی صەحیح نەهاتووە، وەك چۆن شتێکی صەحیح نەهاتووە لەبارەی موستەحەببیی دووبارەکردنەوەی لەم نوێژەدا، (واتە: کە بۆ کارێك کردت دیسان هەربۆ ئەوکارە دووبارەی بکەیتەوە). نەوەوی دەفەرمووێت: پێویستە دوای کردنی ئیستخارەکە ئەوکارە بکات کە دڵی پێی ئەکرێتەوە، وە نابێت لەسەر ئەو دڵنیایی وسنگ کراوەیی‌یە کە هەواو ئارەزووی تێدایە بڕوات کە لە پێش کردنی ئیستخارەکەدا هەیبووە بۆ ئەوکارە، بەڵکو پێویستە لەسەر ئەوکەسەی ئیستخارە ئەکا واز لە ئارەزووی خۆی بهێنێ، جا ئەگەر بەوشێوەیە نەبوو ئەوە داوای خێر نیشان دانی نەکردووە لەخوا، بەڵکو ڕاستیشی نەکردووە لە داواکەیدا، هەروەها لە خۆبەری کردنەکەیدا لە زانایی و توانایی کە ووتویەتی نازانم و ناتوانم ڕاستی نەکردوە، هەرچەندە ئەودووانەی داوەتە پاڵ خوا، چونکە ئەگەر ڕاست بکات لەوداوایەدا ئەوە مانای وایە خۆی بەری ئەکات لە هەوڵ و توانایی و لەو هەڵبژاردنەی کە بۆخۆی داناوە.

**نوێژی تەسبیح:**

لە عیکریمەوە لە ئیبنوعەبباسەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ بە عەبباسی کوڕی (عبد المطلب) ی فەرموو: ئەی عەبباس ئەی مامە، ئایا شتێکت نەدەمێ، ئایا شتێکت پێ نەبەخشم، ئایا تۆ تایبەت نەکەم بەشتێك، ئایا شتێکت فێر نەکەم دەجۆر گوناه بسڕێتەوە، وە ئەگەر ئەو شتەت کرد خوا لەتاوانی ئەووەڵو ئاخرو کۆن و نوێت و هەڵەو قەستیت وبچوکو گەورەو نهێنی و ئاشکرات ئەبورێت، دەخەصڵەتە: ئەویش ئەوەیە چوار ڕکات نوێژ بەسەریەکەوە بکەیت لەهەموو ڕکاتەکاندا سورەتی فاتیحەو سورەتێکی تری قورئان بخوێنیت، کاتێ لەخوێندن بوویتەوە لەیەکەم ڕکاتدا کە هێشتا بەپێوەی نەچویتە ڕکوع پانزە جار بڵێ: (سبحان الله، والحمد لله، ولاإله إلا الله، والله أكبر) پاشان ڕکوع ببەو لەکاتی ڕکوعەکەدا دە جار ئەوە بڵێوە، پاشان سەرت بەرز بکەرەوە لە ڕکوع دە جار ئەوە بڵێرەوە، پاشان دابنەوێوە بۆ سجودو دە جار لەسجودەکەتدا بیڵێرەوە، پاشان سەر بەرز کەرەوە لە سجود و دە جار بیڵێوە. پاشان بچۆرەوە سجود و دە جار بیڵێرەوە، پاشان سەر بەرز بکەرەوە لەسجود (واتە: لەدانیشتنی ئیستراحەتدا پێش ئەوەی هەستی) دە جار بیڵێوە، ئەوە حەفتاوپێنج جار لەهەر ڕکاتێکدا، بەوشێوەیە هەرچوار ڕکاتەکە تەواو ئەکەیت، جا ئەگەر توانیت ڕۆژی یەکجار ئەونوێژە بکە، ئەگەر نەت کرد هەر جومعەی جارێ، ئەگەر نەت کرد ساڵی جارێك بیکە، ئەگەر بۆت نەکرا لەژیانتا یەکجار بیکە. ئەبوداودو ئیبنو ماجەو ئیبنو خوزەیمە لە صەحیحەکەیدا گێڕاویانەتەوە، هەروەها (طبراني)یش.

(حافظ) دەفەرمووێت[1]: ئەم حەدیسە لە زۆر ڕێگاوە ریوایەت کراوە، هەروەها لە کۆمەڵێك صەحابەوە، وە چاکترین ڕێگایان ئەم حەدیسەی عیکریمەیە، وە کۆمەڵێك لە زانایان بە صەحیحیان داناوە، لەوانە: (حافظ) ئەبوبەکری ئاجوری، وە مامۆستامان ئەبو موحەممەد عبدالرحیم ی میصری و مامۆستامان (حافظ) ئەبو حەسەنی مەقدیسی ڕەحمەتی خوایان لێ بێت. ئیبنوموبارەك دەفەرمووێت: نوێژی تەسبیح ڕەغبەتی پێدراوە، موستحەببە ئادەمیزاد هەموو کاتێك رابێت لەسەری و لێی بێ‌ئاگا نەبێت.

**نوێژی پێویستی:**

ئیمامی ئەحمەد بەسەنەدێکی صەحیح لە ئەبودەرداوە ئەگێڕێتەوە کەپێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن تَوَضَّأَ فَأَسبَغَ الوُضُوءَ ثُمَّ صلى رَكعَتَينِ يُتِمُّهُمَا، أعطَاهُ اللهُ مَا سَأَلَ مُعَجَّلاً أو مُؤَخَّرا)[2]. واتە: هەرکەس بەجوانی دەست نوێژێك بگرێتەو دوو ڕکات نوێژی تەواو بکات، داوای چی بکات لەخوا خوا ئەیداتێ جا ئەوکاتە بێت یا دوایی.

**نوێژی تەوبە:**

لە ئەبوبەکرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە ئەیفەرموو: (مَا مِن رَجُلٍ يُذنِبُ ذَنباً ثُمَّ يَقومُ فَيَتَطَهَّرُ ثُمَّ يُصَلِّي، ثُمَّ يَستَغفِرُ اللهَ إلا غَفَرَ لَهُ، ثُمَّ قَرَأَ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا۟ فَـٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ذَكَرُوا۟ ٱللَّهَ فَٱسْتَغْفَرُوا۟ لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا۟ عَلَىٰ مَا فَعَلُوا۟ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٣٥﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ جَزَآؤُهُم مَّغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَجَنَّـٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَا ۚ وَنِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَـٰمِلِينَ﴾ (آل

---

(١) وشەی (حافظ) ئەگەر بە (مطلق) ی بەکار بێت ئەوە مەبەست پێی ئیبنوحەجەری عەسقەلانیە بەڵام لێرەدا مەبەستی ئەو نیە بەڵکو (حافظ)ی (منذري) یە، وە ئەم وتەیە وتەی ئەوە لە (الترغيب ١/٢٣٨)دا بۆیە پێویست بوو لەسەر دانەر تەقییدی کردایە پێوەی بۆ ئەوەی ئەو وەهمە دروست نەبوایە.

(٢) صەحیحی لە کوێوەیەتی لە کاتێکدا لە سەنەدەکەی پیاوێکی نەناسراوی تێدایە؟! وە حەدیسەکە لە (المسند) دایە (٦/٤٤٢-٤٤٣) لە ڕێگای (ميمون أبي محمد المرائي التميمي) ابن معين دەفەرمووێت: ناى ناسم، ئیبنو عەدی دەفەرمووێت: (لەسەر ئەمە بە نەناسراو دەژمێردرێت) وە (ذهبي) دەفەرمووێت: (لا يعرف) ناناسرێت، وە ئەگەر دەتەوێت بگەرێوە بۆ (الميزان) و (اللسان) و (مجمع الزوائد) (٢/٢٧٨).

عمران/١٣٥و١٣٦) (رواه أبوداود والنسائي وابن ماجة والبيهقي والترمذي وقال: حديث حسن).
واتە: هەرکەسێك تاوانێکی ئەنجام دا پاشان هەڵسا دەستنوێژێکی گرت و دووڕکات نوێژی کرد و داوای لێخۆشبوونی کرد لەپەروەردگاری خوا لێی خۆش ئەبێت، پاشان ئەوئایەتەی خوێندەوە کە ئەفەرمووێت: (وە ئەوکەسانەی تاوانێکی گەورە یا ستەمێك لەخۆیان ئەکەن لەپاشاندا یادی خوا ئەکەنو داوای لێبوردنی لێ ئەکەن، وە کێ هەیە لەخوا بەولاوە گوناه ببورێت، وە لەسەر ئەوکارەی کردویانە بەردەوام نابن و ئەزانن کە خوا لە گوناه خۆش دەبێ، ئەو جۆرە کسانە پاداشتیان لەپەروەردگاریانەوە لێبوردن و بەهەشتانێکە کە بە ژێریا ڕووبار ئەڕوات، بۆ هەمیشە تێیدا ئەمێننەوە).

وە (طبراني) لە (الکبیر) دا بەسەندێکی حەسەن لە ئەبودەرداءەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن تَوَضَّأ فَأحسَنَ الوُضُوءَ، ثُمَّ قَامَ فصلى رَكعَتَينِ أو أربَعاً مَكتُوبَةً أو غَيَ مَكتُوبَةٍ يُحسِنُ فِيهِنَّ الرُّكُوعَ وَالسُّجُودَ، ثُمَّ استَغفَرَ اللهَ غَفَر لَهُ). واتە: هەرکەس جوان دەستنوێژ بگرێت، پاشان هەڵسێت دوو ڕکات یا چوار ڕکات فەرز بێت یا سوننەت نوێژ بکات، ڕکوع و سجودەکەی بەچاکی ئەنجام بدات، پاشان داوای لێبوردن لەخوا بکات خوا لێی ئەبورێت.

### نوێژی ڕۆژگیران و مانگ گیران:

زانایان لەسەر ئەوە پێك هاتوون کە نوێژی ڕۆژ گیران و مانگ گیران سوننەتێکی موئەککەدە بۆ پیاوان و ژنان[1]، وەچاکتر وایە بەجەماعەت بکرێت، هەرچەندە بە جەماعەت کردنی مەرج نیە

(١) دوو شتی تێدایە:
دەعوای ئەو ئیجماعە بەتاڵە ئەبو عوانە لە صەحیحەکەیدا (٢/٣٩٨) دەفەرمووێت: (بیان وجوب صلاة الکسوف) وە چەند حەدیسی لە ژێر ئەم بابەدا هێناوە کە دەلالەت دەکاتە سەر وجوب وەك: (فإذا رأیتموها فصلوا) ـ واتە هەرکاتێك بینیتان ڕۆژ یان مانگ گیرا ئەوە نوێژ بکەن ـ هەروەها ئیبنو خوزەیمە لە صەحیحەکەی (٢/٣٠٨) دا دەفەرمووێت: (باب الأمر بالصلاة عند کسوف الشمس والقمر) جا مەسەلەکە (خیلافی تێدایە) هەر بۆیە (حافظ ابن حجر) لە (الفتح ٢/٥٢٧) دا دەفەرمووێت: جومهور لەسەر ئەوە یەکە کە سوننەتێکی موئەککەدەیە، وە ئەبوعوانە بە ڕاشکاوی لە صەحیحەکەیدا باسی واجبی‌یەتی کردووە، وە جگە لەلای ئەو ئەمبینیوە، ئیللا ئەوەی کە لە مالیکەوە دەگێڕدرێتەوە کە حیسابی وەك نوێژی جومعەی بۆ دەکات، وە (الزین بن المنیر) لە ئەبو حەنیفەوە نەقلی دەکات کە ئەویش واجبی دەکات، هەروەها هەندێ لە کتێب دانەرەکانی مەزهەبی حەنەفی ئەوە نەقڵ دەکەن کە واجبە، منیش دەڵێم: ئەمە ڕاجحترە لە ڕووی بەڵگەوە وەك باسی دێت.

تێیدا، وە بانگەوازی بۆ بکرێتو بووترێت: (الصلاة جامعة) وە جەماوەری زانایان لەسەر ئەوەن دوو ڕکاتە، لە هەر ڕکاتێکدا دوو جار ڕکوع ئەبرێت.

لە عائیشەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ لەژیانیدا مابوو جارێك ڕۆژگیرا چووە دەرەوە بۆ مزگەوت و هەڵسا خەڵکەکەی لەدوای خۆیەوە ڕیز کردو سورەتێکی دورو درێژی خوێند، لەپاشاندا (الله أکبر) ی کرد و چووە ڕکوعەوە، ماوەیەکی زۆر لەڕکوعدا مایەوە، شتێکی کەمتر بوو لەخوێندنەکەی یەکەم، لەپاشاندا سەری بەرز کردەوە فەرمووی: (سمع الله لمن حمده، ربنا ولك الحمد) لە پاشاندا وەستاو سورەتێکی تری خوێند، بەڵام ئەوەندەی خوێندنی یەکەم دورو درێژ نەبوو، پاشان (الله أکبر) ی کردەوەو چووە ڕکوعەوە، بەڵام ئەوەندەی ڕکوعی یەکەم نەمایەوە، پاشان فەرمووی: (سمع الله لمن حمده، ربنا ولك الحمد) لەپاشاندا چووە سەجدەوە، هەر بەو شێوەیە ڕکاتەکەی تریشی تەواو کرد، هەتا چوار ڕکوعو چوار سجودی تەواو کرد ڕۆژ دەرکەوتەوە پێش ئەوەی سلاوبداتەوە، لەپاشاندا هەڵسا ووتارێکی دا بۆ خەڵکەکە لەسەرەتاوە سوپاس و ستایشی پەروەردگاری کرد بەجۆرێك هەرشیاوی ئەوبێت، ئینجا فەرمووی: (إِنَّ الشَّمسَ وَالقَمَرَ آيَتَانِ مِن آيَاتِ اللهِ عَزَّوَجَلَّ لا يَنخَسِفَانِ لِمَوتِ أَحَدٍ وَلا لِحَيَاتِهِ، فَإذَا رَأَيتُمُوهَا فَافزَعُوا إلى الصَّلاةِ) (رواه البخاري ومسلم). واتە: ڕووژو مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا، نە بۆ مردنی کەس ئەگیرێن نە بۆ لەدایك بوونی کەس، جا ئەگەر بینیتان گیران پەنا بەرنە بەر نوێژ کردن.

هەروەها بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە لە ئیبنوعەبباسەوە کە دەفەرمووێت: ڕۆژ گیاو پێغەمبەر ﷺ نوێژی کرد، لەنوێژەکەیدا وەستانێکی درێژ وەستا بەئەندازەی سورەتی بەقەرە، پاشان ڕکوعێکی درێژی برد، پاشان هەستایەوە لە ڕکوع و وەستانێکی درێژ وەستا، بەڵام لەوەستانی یەکەم کەمتر بوو، پاشان ڕکوعێکی درێژی برد، بەڵام لەڕکوعی یەکەم کەمتر بوو، پاشان سەجدەی برد، پاشان هەستایەوە پێو وەستانێکی درێژ وەستا، بەڵام لەوەستانی یەکەمجار کەمتر بوو، پاشان ڕکوعێکی درێژی برد، بەڵام لەڕکوعی یەکەم کەمتر بوو، پاشان سەجدەی برد، پاشان کەسەلامی دایەوە ڕۆژ دەرکەوت، فەرمووی: (إِنَّ الشَّمسَ وَالقَمَرَ آيَتَانِ مِن آيَاتِ اللهِ لا يَنخَسِفَانِ لِمَوتِ أَحَدٍ وَلا لِحَيَاتِهِ، فَإذَا رَأَيتُم ذَلِكَ فَاذكُرُوا اللهَ) واتە: بەڕاستی ڕۆژو مانگ دوو نیشانەن لەنیشانەکانی خوا، نە لەبەر مردنی کەسێك ئەگیرێن و نە لەبەر لەدایك بوونی، جا کاتێ بینیتان ئەو دووانە گیاوون یادی خوا بکەن.

---

ووتن بە سوننی‌یەتی ئەم نوێژە بە فیێ دەری ئەو هەموو فەرمانانەیە کە هاتووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ لەو نوێژەدا بەبێ ئەوەی یەك لادەرێك هەبێت لە واجبێتی، و شەوکانیش بەلای ئەمەدا چووە لە (السیل الجرار ١/٣٢٣) و صدیق حسن خانیش لە (الروضة الندية)، کەئەمەش حەقە (إن شاء الله). (تمام المنة).

ئیمامی شافیعی ئەو ووتاردانەی پێغەمبەری ﷺ کردۆتە بەڵگەی ئەوەی ووتار دان مەرجێکە لەمەرجەکانی ئەو نوێژە، بەڵام ئەبو حەنیفەو مالیك ئەڵێن: نوێژی مانگ گیران و ڕۆژ گیران ووتاردانی تێدا نی یە، وە پێغەمبەر ﷺ بۆیە ئەو ووتارەی دا چونکە خەڵکەکە، ئەیان ووت: لەبەر مردنی ئیبڕاهیمی کوڕی پێغەمبەر ﷺ ڕۆژ گیاوە.

(ابن عبد البر) دەفەرمووێت: ئەو دوو حەدیە صەحیحترین حەدیسن کە لەم باسەدا هاتوون، ئیبنو قەییم دەفەرمووێت: سوننەتی ڕاستو ڕێکی مەحکەم لەنوێژی مانگ گیانو ڕۆژگیاندا دووبارەکردنەوەی ڕکوعە لە هەر ڕکاتێکدا، بەپێی حەدیسەکەی عائیشەو ئیبنوعەبباس و جابیرو نوبەی کوڕی کەعبو عبداللە ی کوڕی عەمری کوڕی عاص و ئەبوموسای ئەشعەری، ئەمانە هەمووی دووبارەکردنەوەی ڕکوع لەڕکاتێکدا لە پێغەمبەرەوە ئەگێڕنەوە، وە ئەوانەی دووبارەکردنەوەی ڕکوعیان گێڕاوەتەوە ژمارەیان زۆرترەو نزیکتر بوون لە پێغەمبەر ﷺ لەوانەی باسی دووبارە کردنەوەیان نەکردووە.

ئەمەش مەزهەبی مالیك و شافیعی و ئەحمەدە، وە ئەبو حەنیفە بۆ ئەوە چووە کە نوێژی ڕۆژگیران و مانگ گیران دوو ڕکاتە لەسەر شێوەی نوێژی جەژن و جومعە ئەکرێت، بەپێی حەدیسەکەی نوعمانی کوڕی بەشیر کە دەفەرمووێت: جارێك ڕۆژ گیرا پێغەمبەر ﷺ هات بەرنوێژی بۆ کردین وەك ئەونوێژەی ئێستا ئێوە دەیکەن، دوو ڕکات دوو ڕکات ڕکوع و سەجدەی ئەبرد، وە لەخوا ئەپاڕایەوە هەتا خۆر دەرکەوتەوە[1].

لە حەدیسەکەی (قبیصة)دا هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذَا رَأيتُم ذَلِكَ فَصلُّوهَا كَأحدَثِ صَلاةٍ صَلَّيتُمُوهَا مِنَ المَكتُوبَةِ) واتە: کاتێ ڕۆژگیران و مانگ گیرانتان بینی ئێوەش نوێژ بکەن وەك تازەترین نوێژی فەرزێك کە بەجێتان هێنابێت.

وە خوێندنی سورەتی فاتیحە لەهەردوو ڕکاتەکەدا واجبە، دوای ئەوە نوێژکەر بەئارەزووی خۆی چی لەقوڕئان ئەخوێنێ بیخوێنێ، وە قورئان خوێندن تێیدا دروستە بە دەنگی بەرزو بەنهێنیش[2].

(١) ئەو بۆچونەی ئەبو حەنیفە ڕاست نی یە چونکە (حدیث)ەکە ڕاست نی یە، وە حەدیسەکە (مضطرب)ە لە ڕووی سەنەد و مەتنەوە، بڕوانە (إرواء الغليل ٣/١٣١) و ئاشکراشە لە عیلمی (مصطلح الحديث) دا کە (اضطراب) بەڵگەیە لەسەر زەعیفی حەدیسەکە، جا ئیتر چۆن بە کەڵکی ئەوە دێت کە بەربەرچی حەدیسە صەحیحەکاندا بکاتەوە، بڕوانە (تمام المنة).

(٢) ئەوەی زاندراوە کە نوێژی خۆرگیران پێغەمبەری خوا ﷺ یەك جار ئەو نوێژەی کردووە. و بە صەحیحیش هاتووە کە بە دەنگی بەرز خوێندوویەتی هەروەك لە صەحیحی بوخاری دا هاتووە، و شتێك سابت نەبووە کە بەرهەڵستی بکات، و ئەگەر سابتیش بوویێت مەرجوحە، جا ئیتر چۆن دانەر یەکسانی دەخاتە نێوان بەدەنگ بەرز

بەڵام بوخاری دەفەرمووێت: قورئان خوێندن بەدەنگی بەرز تێیدا صەحیحترە.

کاتەکەشی لەوکاتەوەیە ڕۆژ یامانگ ئەگیرێن هەتا دەرئەکەونەوە، نوێژی مانگ گیرانیش وەك نوێژی ڕۆژگیرانە بێ جیاوازی.

حەسەنی بەصری دەفەرمووێت: ئەوکاتەی ئیبنوعەبباس ئەمیر بوو لەسەر بەصرە مانگ گیرا هاتەدەر بەرنوێژی بۆ کردین دوو ڕکات لە هەر ڕکاتێکدا دووجار چووە ڕکوعەوە، کاتێ لێ بووەوە چووە سەر مینبەر فەرمووی: من بەوشێوەیە نوێژم بۆکردن وەك چۆن پێغەمبەرم بینیوە ﷺ نوێژی کردووە. (شافیعی لەموسنەددا گێڕاویەتیەوە).

وە موستەحەببە ووتنی (الله أكبر) لەوکاتەدا، وەهەروەها پاڕانەوەو خێرکردن و داوای لێبوردن لەخوا.

بەپێی ئەوەی بوخاری و موسلیم لەعائیشەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژو مانگ دوو نیشانەن لەنیشانەکانی خوای گەورە بۆمردنو ژیانی کەس ناگیرێن، کاتێ بینیتان گیران، لەخوا بپاڕێنەوەو (الله أكبر) بکەن وداوای لێبوردنی لێ بکەن.

وە هەردوکیان لەئەبوموساوە گێڕاویانەتەوە دەفەرموون: ڕۆژ گیرا، پێغەمبەر ﷺ هەستا نوێژی بۆ کردین لەپاشاندا فەرمووی: (إذَا رَأيتُم شَيئاً مِن ذٰلِكَ فَافزَعُوا إلى ذِكرِ اللهِ وَدُعَائِهِ وَاستِغفَارِهِ) واتە: ئەگەر شتێکی وەهاتان بینی هانا بەرن بۆ یادی خواکردن و لێپاڕانەوەی و داوای لێبوردن لێی.

## نوێژە بارانە (إستسقاء)

(إستسقاء) واتە: داوای پێدانی ئاو، وەلێرەدا یەعنی داواکردنی ئاو لەخوای گەورە لەکاتی ووشکەساڵی و بێ بارانیدا، وە بەیەکێك لەم شێوانەی خوارەوە داوای باران بارین ئەکرێت لە خوا:

١- بەکۆمەڵ دوو ڕکات نوێژ ئەکرێت و یەکێ ئەبێت بەبەرنوێژو نوێژەکەیان بۆ ئەکات، (بەبێ ئەوەی بانگ و قامەت بکرێ) لەهەر کاتێکدا بێت جگە لەو کاتانەی نوێژکردن تێیاندا کەراهەتی هەیە. لەرکاتی یەکەمدا سوڕەتی فاتیحە و ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى﴾ بە دەنگی بەرز ئەخوێنێ، و لە ڕکاتی دووەمدا (غاشية) لە دوای فاتیحە ئەخوێنێ، لەپاشاندا ووتارێك بخوێنرێ یا

---

خوێندنێك کە بە صەحیحی لێوەی هاتووەو لەنێوان بێ دەنگیەك کە بە صەحیحی لێوەی نەهاتووە. و وێنەی ئەمە باس کرا لە باسی قنوت لە کاتی نوێژیلدا. (تمام المنه).

لەپێش نوێژ یا لەدوای[1]. جا کاتێ ووتار کۆتایی هات هەموویان عەباکانیان هەڵئەگێڕنەوە، بەشێوەیەك لای ڕاست ئەدەن بەسەر لای چەپداو، لای چەپ بەسەر لای ڕاستداو ڕوو ئەکەنە قیبلەو دەستیان زۆر بەرز ئەکەنەوەو لە خوا ئەپاڕێنەوە بۆ باران[2].

ئیبنو عەبباس دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ هاتەدەر بە ملکەچی و لارەملی و شێوەگۆڕاو خۆی گۆڕی بوو جلی کاری لەبەرکردبوو بە زاری‌یەوە لە خوا ئەپاڕایەوە جا دوو ڕکات نوێژی بۆ کردین وەك چۆن نوێژی جەژنی بۆ ئەکردین، بەڵام ووتارەکەی وەك ئەم ووتارەی ئێوە نەبوو. (رواه الخمسة وصححه الترمذي وأبوعوانة وابن حبان).

لە عائیشەوە هاتوە دەفەرمووێت: خەڵك هاتن بۆلای پێغەمبەر ﷺ باسی بێ بارانیان کرد، ئەویش فەرمانی دا لە نوێژگادا (مصلی) مینبەرێکیان بۆ داناو بەڵێنی ڕۆژێکی بە خەڵکەکە دا کە تێیدا دەرچن، کاتێ تیشکی خۆری ئەوڕۆژە دەرکەوت چووە دەرێ و لەسەر مینبەرەکە دانیشت و

---

(١) منیش دەڵێم: ئەمما خوێندنی بە دەنگی بەرز صەحیح و سابتە لە پێغەمبەرەوە ﷺ لە حەدیسی عبداللەی کوڕی زەیدەوە کە باس کراوە لە کتێبەکەدا، وە هەروەها ئەوە لە (الإرواء ٣/١٣٣) دا تەخریج کراوە، ئەمما دیاری کردنی ئەو دوو سوڕەتە باسکراوە صەحیح نی‌یە لە پێغەمبەرەوە ﷺ، لەبەر ئەوەی لە سەنەدەکەیدا موحەممەدی کوڕی عبدالعزیزی کوڕی عومەری (الزهری) تێدایە، ئەویش زۆر (ضعیف)ە، بڕوانە (تلخیص المستدرك)ی (ذهبـي)، و (نصب الرایە)ی زەیلەعی و (إرواء الغلیل ٣/١٣٤) و (الضعیفة٥٦٣١). (تمام المنة).

(٢) لەمەدا دوو مەسئەلە هەیە دانەر بەڵگەی لەسەر نەهێناوەتەوە:

یەکەم: هەڵگێڕانەوەی عەباکانیان.

دووەمیان: دەست بەرز کردنەوەیان.

بەڵگە بۆ یەکەم، حەدیسی عبداللەی کوڕی زەیدە کە دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوام بینی ﷺ کاتێك نوێژە بارانەی بۆ کردین، دوعاکردنەکەی درێژ کردەوە و دوعای زۆر دەکرد، پاشان ڕووی وەرچەرخاند لە قیبلە و عەباکەی هەڵگێڕایەوە و خەڵکیش لەگەڵیا هەڵیان گێڕایەوە، أخرجه أحمد بسند قوي، بەڵام باس کردنی هەڵگێڕانەوەی عەباکانی خەڵکی (شاذ) ، هەروەك تەحقیقم کردووە لە (سلسلة الأحادیث الضعیفة ٥٦٢٩)دا، و بەڵگە لەسەر دووەمیان حەدیسی ئەنەس هاتووە لە کیتابەکەدا بە ژمارە (٢)، لە ریوایەتێکدا دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا ﷺ هەردوو دەستی بەرز کردەوە و دوعای دەکرد و خەڵکیش دەستیان بەرز دەکردەوە و دوعایان دەکرد، بوخاری تەخریجی کردووە بە موعەللەقی، وە بەیهەقی وەصلی کردووە وە جگە لەویش، وە ئەوەی تێدا نی‌یە کە زیادەڕەویان کردووە لە دەست بەرز کردنەوە، بەڵکو ئەوە سابت بووە لە پێغەمبەری خوا ﷺ خۆیەوە، هەروەکو لە حەدیسی عائیشەدایە لە کتێبەکەدا، و حەدیسی ئەنەس لە صەحیحەیندا، جا من زیادەڕەوی لە دەست بەرز کردنەوە بۆ ئیمام دەبینم نەك بۆ (مأموم)ەکان. (تمام المنة).

(الله أكبر) ی کردو سوپاس و ستایشی خوای کرد، لەپاشاندا فەرمووی: (إنَّكُم شَكَوتُم جَدبَ دِيَارِكُم، وَقَد أمَرَكُمُ اللهُ أن تَدعُوهُ وَوَعَدَكُم أن يَستَجِيبَ لَكُم، ثُمَّ قَالَ: الحَمدُ لله رَبِّ العَالَمِين، الرَّحمَنِ الرَّحِيمِ، مَالِكِ يَومِ الدِّينِ، لا إلَهَ إلا اللهُ يَفعَلُ مَا يُرِيدُ، اللَّهُمَّ لا إلَهَ إلا أنتَ، أنتَ الغَنِيُّ وَنَحنُ الفُقَرَاءُ، أنزِل عَلَينَا الغَيثَ وَاجعَل مَا أنزَلتَ عَلَينَا قُوَّةً وَبَلاغاً إلى حِينٍ). واتە: ئێوە بێزاری دەربەبڕن بۆ بێ بارانی و وشکە ساڵی لە ناوچەکەتاندا، وە خوای گەورە فەرمانی پێداون لێی بپاڕێنەوە، وە پەیمانی پێداون پاڕانەوەکەتان لێ وەربگرێت و وەڵامتان بداتەوە، لەپاشاندا فەرمووی: سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانیان، ئەو پەروەردگارەی سیفەتی ڕەحیم و ڕەحمانە پاشای ڕۆژی دواییە، هیچ مەعبودێکی حەق نییە جگە لە الله، چی ویست ئەیکات، خوایە جگە لەتۆ هیچ مەعبودێکی حەق نییە، تۆ بێنیاز و دەوڵەمەندی و ئێمە هەژارین، بارانمان بۆ ببارێنە، وە ئەوەی کە بۆمان ئەبارێنی، بۆمان بکە بەهێزێك بمانگەیەنێتە کاتێکی تر، لەپاشاندا دەستەکانی بەرز کردەوەو بەبەردەوامی ئەپاڕایەوە بەشێوەیەك سپێتی بن باڵی ئەبینرا، پاشان پشتی کردە خەڵکەکە و کراسەکەی هەڵگێڕایەوەو دەستی هەر بەبڵندی مابۆوە، لەپاشاندا ڕووی کردەوە خەڵکەکەو هاتە خوارەوە و دوو ڕکات نوێژی بۆ کردن، خوای گەورە پەڵە هەورێکی پێك هێنا دەستی کرد بەگرمە گرم و هەورە بروسکە، پاشان دەستی کرد بەباران بارین بەفەرمانی خوا، پێغەمبەر ﷺ نەگەڕایەوە بۆ مزگەوتەکەی هەتا لافاو هەستا، کاتێ بینی خەڵکەکە بەپەلە ئەچنەوە ماڵەکانیان پێکەنی هەتا دانەکانی دەرکەوت، فەرمووی: (من شایەتی ئەدەم خوا تواناو دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە و منیش بەندەی خواو نێرراوی ئەوم). (رواه الحاكم وصححه ابوداود وقال هذا حديثٌ غريب وإسناده جيد).

لە عەبادەی کوڕی تەمیمەوە لەمامیەوە کەناوی عبدالله ی کوڕی زەیدی مازینییە هاتوە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ خەڵکەکەی بردەدەر بۆ نوێژە بارانە، دوو ڕکات نوێژی بۆ کردن بەدەنگی بەرز تێیدا قورئانی ئەخوێند. (جەماعەت گێڕاویانەتەوە)[1].

ئەبوهورەیرە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێ چووە دەر بۆ داوای باران بارین، دوو ڕکات نوێژی بۆ کردین بێ بانگو قامەت، پاشان ووتارێکی بۆداین، ئینجا لەخوا پاڕایەوەو ڕووی لەخەڵکەکە وەرگێڕاو ڕووی کردە قیبلە، هەردوو دەستی بەرز کردەوە لەپاشاندا کراسەکەی هەڵگێڕایەوەو لای ڕاستی دا بەسەر لای چەپداو لای چەپی بەسەرلای ڕاستدا. (ئەحمەدو ئیبنوماجەو بەیهەقی گێڕاویانەتەوە).

(١) لەو تەخریجەدا چاوپۆشی هەیە چونکە خوێندن بە جەهری موسلیمو ئیبنوماجە تەخریجیان نەکردوە، وە زەیلەعی لە (نصب الراية ٢/٢٣٩) دانی بەم ڕاستییەدا ناوە، بڕوانە (إرواء الغليل٦٦٤). (تمام المنة).

٢- ئیمام لە ووتاری هەینیدا بپاڕێتەوە لەخواو مەئمومەکانیش بڵێن: (ئامین) بەپێی ئەوەی بوخاری و موسلیم لە شورەیکەوە لە ئەنەسەوە ئەگێڕنەوە: پیاوێك ڕۆژێکی جومعە ئەوکاتەی پێغەمبەر ﷺ ووتاری ئەدا خۆی کرد بەناو مزگەوتداو ووتی: ئەی نێرراوی خوا هیچمان نەما، لەبەر بێ بارانی ماڵمان تیاچوو ڕێگە بڕاو بووین، داوامان بۆ بکە لەخوا بارانمان بۆ ببارێنێ، پێغەمبەر ﷺ هەردوو دەستی بەرز کردەوەو فەرمووی: (اللَّهُمَّ أغِثنَا، اللَّهُمَّ أغِثنَا، اللَّهُمَّ أغِثنَا) واتە: خوایە فریامان بکەوەو بارانمان بۆ ببارێنە سێ جار. ئەنەس دەفەرموێت: سوێند بەخوا نە هەور نە پەڵە هەورمان بەئاسمانەوە بەدی نەئەکرد، وە لە نێوان ئێمەو کێوی سەلەعدا هیچ نەبوو نە خانوو نە ماڵ، لەدوایەوە پەڵە هەورێك ئەوەندەی قەڵغانێك دەرکەوت، کاتێ گەیشتە ناوەڕاستی ئاسمان بڵاوبۆوەو دەستی کرد بەباران بارین، سوێند بەخوا هەتا یەك هەفتە خۆرمان نەبینی، لەپاش هەفتەکە جومعە بوو هەر ئەو پیاوە لەو دەرگایەوە هاتە ژوورەوە پێغەمبەر ﷺ ووتاری ئەخوێند، وە لێی چووە پێشەوە ووتی: ئەی نێرراوی خوا ماڵمان ڕماو ڕێگامان لێ بڕا داوامان لەخوا بۆ بکە ئەم بارانە بگرێتەوە، پێغەمبەر ﷺ هەردوو دەستی بەرز کردەوەو لەپاشان فەرمووی: (اللَّهُمَّ حَوَالَينَا وَلا عَلَينَا، اللَّهُمَّ على الآكَامِ وَالظِّرَابِ، وَبُطُونِ الأودِيَةِ وَمَنَابِتِ الشَّجَرِ). واتە: خوایە لەئێمەی دوور بخەرەوەو بۆ دەورو پشتمانی بەرە ئەم بارانە، خوایە بۆسەر شاخ و گردۆلکەو دۆڵەکان و شیوەکان و بنی درەختەکانی بەرە، ئەڵێ: خۆشی کردەوە کاتێ هاتینە دەر هەتاو دەرکەوتبوو.

٣- تەنها دوعا بکا بەبێ ئەوەی لەڕۆژی جومعەدا بێت، یا نوێژە بارانەی بۆ بکا لە مزگەوت یا لەدەرەوەی مزگەوت، بەپێی ئەوەی ئیبنوماجەو ئەبوعوانە ئەگێڕنەوە لە ئیبنوعەبباسەوە کە فەرموویەتی: پیاوێکی دەشتەکی عەرەب هاتەلای پێغەمبەر ﷺ ووتی: ئەی نێرراوی خوا من لەناو هۆزێکەوە هاتووم شوانیان بێ توێشووە، و بەرانیان بێ جوڵەیە، لەبەر کەم ئاوی و کەم بارانی، پێغەمبەر ﷺ چووە سەر مینبەرو سوپاس و ستایشی خوای کردو لەپاشاندا فەرمووی: (اللَّهُمَّ اسقِنَا غَيثاً مُغِيثاً مَرِيئاً مريعاً طَبقاً غَدَقاً عَاجِلاً غَيرَ رَائِثٍ) (واتە: خوایە بارانێکی ڕزگارکەرو ئەنجام باش و پڕپیت و گشتی و زۆرو لەسەر خۆمان، بۆ ببارێنە) جا کە هاتە خوارەوە هەرکەس ئەهاتە لای ئەیووت: خوا بارانی بۆ باراندین (رواه ابن ماجه وأبوعوانة ورجاله ثقات وسكت عليه الحافظ في التلخيص)[١].

---

(١) هەروەك دەفەرموێت: پیاوانی سیقەن، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە سەنەدەکەی صەحیحە هەروەك لە پێشەکیدا باسمان کرد، لەبەر ئەوەی عیللەتێکی تێدایە دەبێتە هۆی لاوازی، ئەویش ئەوەیە کە لە ڕیوایەتی حەبیبی کوڕی ئەبی سابیتە لە ئیبنو عەبباسەوە، و ئەم حەبیبە تەدلیسی زۆرە، هەروەك (حافظ) لە (التقريب)دا دەفەرموێت، وە مودەللیسیش کار بە حەدیسەکەی ناکرێت، ئەگەر (عنعنة)ی کرد هەروەك ڕوونمان کردۆتەوە لە

له شورەحبیلی کوڕی (سمگ)ەوە هاتووە ووتویەتی: جارێك بە کەعبی کوڕی موڕڕەم ووت: هۆ کەعب! فەرموودەیەکی پێغەمبەرمان ﷺ بۆ بگێڕەوە، ئەویش فەرمووی: خۆم لەپێغەمبەرم ﷺ بیستوە ئەیفەرمو: کاتێك پیاوێك پێی ووت: ئەی نێرراوی خوا داوای باران بکە لەخوا بۆ (مضر)، ئەویش فەرمووی: (پیاوێکی چاونەترسی... تەنها بۆ (مضر)؟) کابرا ووتی: ئەی نێرراوی خوا داوای سەرکەوتنت کرد لەخوا سەری خستی، پاڕایتەوە لەخوا وەڵامی دایتەوە، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ دەستەکانی بەرز کردەوەو فەرمووی: (اللَّهُمَّ اسقِنَا غَيثاً مُغِيثاً، مَرِيعاً مَرِيئاً، طَبَقاً غَدَقاً، عَاجِلاً غَيرَ رَائِثٍ، نَافِعاً غَيرَ ضَارٍ) واتە: خوایە بارانێکی ڕزگارکەرو ئەنجام باش و پڕ پیت و گشتی و زۆرو لەسەرخۆو پڕسودو بێ زیانمان زوو بۆ ببارێنە، ئەڵێ خوا پاڕانەوەکەی لێ وەرگرتن و بارانی بۆ باراندن، ئەوەندەی پێ نەچوو هاتنەوە بێزاریان دەرئەبڕی لەدەست زۆری باران و ئەیانووت: خانووەکانمان ڕما، پێغەمبەر ﷺ دەستەکانی هەڵبڕی بۆ ئاسمان و فەرمووی: (اللَّهُمَّ حَوَالَينَا وَلَا عَلَينَا) واتە: خوایە ئەوبارانە بەرە بۆ دەورو پشتمان و لەسەر ئێمەی دوور بخەرەوە، ئەڵێ خوا هەورەکەی پارچە پارچە کردو بردی بەلای ڕاست و چەپدا. (رواه أحمد وابن ماجة والبيهقي وابن أبي شيبة والحاكم، وقال حديثٌ حسنٌ صحيح إسناده على شرط الشيخين).

له شەعبییەوە هاتوە کە دەفەرمووێت: عومەر ڕەزای خوای لێ بێ جارێك هاتەدەر داوای باران بارین بکات له خوا، تەنها ئیستغفاری ئەکرد، (واتە ئەیفەرموو: أستغفر الله، أستغفر الله) ووتیان: نەمان بینی بپاڕێیتەوە بۆ باران بارین، فەرمووی: بە ئەستێرەکانی ئاسمان داوای باران بارینم لەخوا کرد (مەبەستی ئەوە بوو (أستغفر الله) وەك ئەستێرەکانی ئاسمانن بارانیان پێ ئەبارێت). لەپاشاندا ﴿ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا ۝١٠ يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا﴾ (نوح/١٠-١١)ی خوێند لەگەڵ ﴿وَٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ﴾ (هود/٩٠). (سەعید لە سونەنەکەیدا گێڕاویەتییەوە هەروەها عبدالرزاق و بەیهەقی و ئیبنو ئەبی شەیبە).

وا لەخوارەوە هەندێ لەو پاڕانەوانە باس ئەکەین کەلەبارەی باران بارینەوە هاتوون:

---

پێشەکیدا، جا هەرکەسێك ئەم حەدیسەی صەحیح کردبێت لە عیللەتەکەی بێ ئاگایەو بە (ظاهر)ی ئیسنادەکە هەڵخەڵەتاوە، جا ئاگادار بە! (تمام المنة).

(١) شافیعی دەفەرمووێت: ریوایەت کراوە لە سالمی کوڕی عبداللە وە لەباوکیەوە کە ڕەفعی ئەکات بۆ پێغەمبەر ﷺ کاتێ داوای باران بارینی ئەکرد ئەیفەرموو: (اللَّهُمَّ أسقِنَا غَيثاً، مُغيثاً، مَريعاً غَدقاً مُجَلِّلاً عَاماً طَبقاً سُحّاً دائماً، اللَّهُمَّ أسقِنَا الغَيثَ وَلا تَجعَلنَا مِنَ القَانطِينَ، اللَّهُمَّ إنَّ بِالعِبَادِ وَالبِلادِ وَالبَهَائِمِ وَالخَلقِ مِنَ اللأوَاءِ وَالجَهد والضَّنك، ما لا نَشكُوهُ إلا إلَيكَ، اللَّهُمَّ أنبِت لَنَا الزَّرعَ، وَأدِرَّ لَنَا الضَّرعَ، وَأسقِنَا مِن بَرَكَاتِ السَّمَاءِ، وَأنبِت لَنَا مِن بَرَكَاتِ الأرضِ، اللَّهُمَّ ارفَع عَنَّا الجَهدَ، وَالجُوعَ وَالعُرِيَّ وَاكشِف عَنَّا مِنَ البَلاءِ مَا لا يَكشِفُهُ غَيرُكَ، اللَّهُمَّ إنَّا نَستَغفِرُكَ إنَّكَ كُنتَ غَفَّاراً، فَأرسِلِ السَّمَاءَ عَلَينَا مِدرَاراً). واتە: خوایە بارانێکی ڕزگارکەری پڕ پیت و زۆرو گشتی و هەمیشەییمان بۆ ببارێنە، خوایە بارانمان فریا بخە، لە نائومێدانمان مەگێڕە، خوایە بەندەکان و وولآت و ئاژەڵ و دروست کراوەکانت هەموو تووشی بێ گوزەرانی و نارەحەتی و تەنگیەك بوون، کە سکاڵاکەی هەر لەلای تۆ ئەکەین، خوایە تۆش بەباران کشتوکاڵەکانمان بۆ بڕوێنە و گوانی مەڕومالاتمان بۆ پڕ بکە لەشیر، و ئاودێریمان بکە بە بەرەکەتەکانی ئاسمان، وە دەغڵ و دانمان بۆ بڕوێنە لە بەرەکەتەکانی زەوی، خوایە ئەم ماندوێتیەو برسێتیەو ڕووتیەتیەمان لەسەر لابەرە چونکە جگە لەتۆ کەس توانای لابردنی ئەو بەڵایانەی نیە، خوایە ئێمە داوای لێبووردنت لێ ئەکەین، بەڕاستیش هەرتۆ زۆر لێبووردەی، جا لەئاسمانەوە بارانمان بۆ ببارێنە[١].

شافیعی دەفەرمووێت: من واحەز ئەکەم ئیمام ئەم دوعایە بکات.

(٢) لە سەعدەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ لەداوای باران باریندا ئەیفەرموو: (اللَّهُمَّ جَلِّلنَا سَحَاباً كَثِيفاً، قَصِيفاً، دَلُوقاً، ضَحُوكاً، تُمطِرُنَا مِنهُ رَذَاذاً، قَطقَطاً، سَجلاً يَا ذا الجَلالِ والإكرَام) (رواه أبو عوانة في صحيحه). واتە: خوایە دامانپۆشە بەهەورێکی چڕوپڕو بەهێزو پاڵنەرو دەنگاوی، بەو هەورە نم نم ڕشێنەمان بکەو زەویمان بۆ تەڕ بکە ئەی خاوەن شکۆی پڕڕێز.

(٣) لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکیەوە لە باپیریەوە هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ داوای باران بارینی ئەکرد ئەیفەرموو: (اللَّهُمَّ اسقِ عِبَادَكَ وَبَهَائِمَكَ، وَانشُر رَحمَتَكَ، وَأحيِ بَلَدَكَ الميِّت) (رواه أبوداود). واتە: خوایە بەندەکانت و ئاژەڵەکانت ئاودێر بکە و میهرەبانیت بڕژێنەو ئەم وولاتە زیندوو بکەرەوە.

---

(١) ئەوەی لە کیتابی (الأم) دایە (١/٢٢٢) ئەوەی سالم ریوایەتی کردووە: (بحذف عن)، وە دانەر سابتی کردووە کە شوێن ئیبنوقەییم کەوتوە لە (زاد)دا، وە ئیسنادەکەی (منقطع)ە وەك دەبینیت، و ئەم بینیوە کەسێك وەصلی کردبێت، جا ئێوەش بڕوانن، (تمام المنة).

موستەحەببە بۆ کاتی پاڕانەوە بۆ باران بارین پشتی دەستەکان بکرێنە ئاسمان، وە لەریوایەتێکی موسلیمدا لەئەنەسەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ داوای باران بارینی ئەکرد پشتی دەستەکانی بەرەوئاسمان ئەکرد، وە موستەحەببە ئەوکاتەی باران ئەبارێت بووترێت: (اللَّهُمَّ صَيِّباً نَافِعاً). واتە خوایە بارانێکی پڕسوود.

موستەحەببە شوێنێکی لەش ڕووت بکرێت بۆ ئەوەی تەڕبێت، وە موستەحەببە کاتێ ئاو زیادی کرد لەبەر مەترسی زۆری باران بووترێت: (اللَّهُمَّ سُقيَا رَحمَةٍ، وَلا سُقيَا عَذَابٍ وَلا بَلاءٍ وَلا هَدمٍ وَلا غَرَقٍ، اللَّهُمَّ على الظِّرَابِ وَمَنَابِتِ الشَّجَرِ، اللَّهُمَّ حَوَالَينَا وَلا عَلَينَا). واتە: خوایە بارانێکی ڕەحمەت نەك بارانێکی سزاو بەڵاو ڕووخێنەرو خنکێنەر، خوایە بەسەر دۆڵ و شوێنی درەختەکاندا ببیارێنە، خوایە بێ ئەملاولامانی بەرە نەك بۆ سەرمان.

ئەمانە هەموو صەحیخ و سابتن لە پێغەمبەرەوە ﷺ[1].

**سەجدەی (تیلاوەت) قورئان خوێندن:**

هەرکەس ئایەتێ لەئایەتەکانی سەجدەی خوێند یاگوێی لێبوو کەسێك خوێندی موستەحەببە (الله أكبر) بکات و سەجدەیەك بەرێ، لەپاشان (الله أكبر) بکاتەوەو سەر بەرز بکاتەوە لەسەجدە، ئەمەش پێی ئەووترێت سەجدەی تیلاوەت، وەئەو سەجدەیە تەحییات و سڵاودانەوەی تێدا نیە.

لە نافیعەوە هاتوە لە ئیبنوعومەرەوە کە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ قورئانی بۆ ئەخوێندین کاتێ بەسەر ئایەتی سەجدەدا تێپەڕیایە (الله أكبر) ی ئەکردو سەجدەی ئەبردو ئێمەش سەجدەمان ئەبرد (ئەبوداودو بەیهەقی و حاکم کە دەفەرموێت: صەحیحە لەسەر مەرجی شەیخەین گێڕاویانەتەوە)[2].

---

(١) منیش دەڵێم: ئەما دوعای یەکەم صەحیح نیە، لەبەر ئەوەی شافیعی بە سەنەدی خۆی دەیگێڕێتەوە بە مورسەلی، بەیهەقی تەخریجی کردووە (٣/٣٥٦) وە دەفەرموێت: (هذا مرسل) وە مەعلولی کردووە لە (المنتقى) و شەرح کەرەکەی کە شەوکانیە (٤/٩) بە دووی کەوتووە، و ئەمە عیللەتێکی زۆر کەمە، لەبەر ئەوەی ئیبراهیمی کوڕی موحەممەد کە کوڕی ئەبی یەحیای ئەسلەمی مەدەنیە -مەتروکە تاوانبارە بە درۆ کردن، ڕەنگە بۆ ئەمە بێ هەرکامێك لەوانەی نووسراویان داناوە لەبارەی (أذكار) هوە وەك نەوەوی و جزری و ئیبنو قەییم و جگە لەوانیش باسیان لێوە نەکردووە، بەڵام دوعاکەی دوای ئەمە ئەوە لە هەردوو صەحیحەکاندایە لە حەدیسی ئەنەسی باس کراودا، وە ئەمەش لە (الإرواء) دا (٢/١٤٤-١٤٥) تەخریج کراوە. بڕوانە (تمام المنة).

(٢) منیش دەڵێم: دوو تێبینی لەسەرە:

یەکەم: حەدیسەکە (ضعیف)ە لەبەر ئەوەی لە سەنەدەکەیدا: کە لای ئەبوداودە -وە لەمەوە بەیهەقی گێڕاویەتیەوە- عبداللەی کوڕی عومەری (العمري) تێدایە و ئەمیش (ضعیف)ە هەروەك (حافظ) لە (التلخیص)دا دەفەرموێت.

ئەبوداود دەفەرمووێت: عبدالرزاق دەفەرمووێت: (ثوري) ئەم حەدیسەی بەلاوە خۆش بوو وە ئەبوداود ئەیفەرمو: بۆیە لای خۆش بوو چونکە (الله أكبر) کردنی تێدایە.

عبدالله ی کوڕی مەسعود دەفەرمووێت: کاتێ ئایەتی سەجدەت خوێند (الله أكبر) بکەو سەجدە بەرە، کاتێ سەرت بەرزکردەوە لەسەجدە (الله اكبر) بکەرەوە[1].

**(١) (فضل) ی سەجدەی تیلاوەت:**

لە ئەبی هورەیرەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذَا قَرَأ ابنُ آدَمَ السَّجدَةَ، فَسَجَدَ اعتَزَلَ الشَّيطَانُ يَبكِي وَيَقُولُ: يَاوَيلَهُ أُمِرَ بِالسُّجُودِ فَسَجَدَ، فَلَهُ الجَنَّةُ، وَأُمِرتُ بِالسُّجُودِ فَعَصَيتُ فَلِيَ النَّارُ) (رواه أحمد ومسلم وابن ماجة). واتە: کاتێ ئادەمیزادێك ئایەتی سەجدە ئەخوێنێ و سەجدە ئەبات شەیتان تەریق ئەبێتەوە ئەگریو ئەڵێت: وەیل و غەمباری بۆ من! ئەو ئادەمی‌یە فەرمانی پێ کرا سەجدە بەرێت سەجدەی بردو بەهەشتی بۆ ئەبێت، منیش فەرمانم پێ کرا سەجدە بەرم سەرپێچیم کرد و ئاگرم بۆ ئەبێت.

**(٢) حوکمی سەجدەی تیلاوەت:**

جومهوری زانایان بۆ ئەوە چوون کە سەجدەی تیلاوەت سوننەتە بۆ خوێنەرو گوێگر، بەپێی ئەوەی بوخاری لە عومەرەوە ئەگێڕێتەوە کە ڕۆژێکی جومعە لەسەر مینبەر سورەتی (نحل)ی خوێند، کاتێ گەیشتە ئایەتی سەجدە هاتە خوارەوەو سەجدەی برد، خەڵکەکەش سەجدەیان برد، جومعەیەکی تریش دووبارە ئەو سورەتەی خوێندو کاتێ گەیشتە ئایەتی سەجدە ووتی: خەڵکینە ئێمە فەرمانمان پێ نەکراوە سەجدە بەرین لێرەدا، جا هەرکەس سەجدەی برد ئەوە سوننەتی پێکاوە،

---

دووەم: لە لای حاکم الله أكبر ی تێدا نی‌یە، وە ئەمەش شوێنی شاهیدە لە حەدیسەکەدا، وە حاکم ئەو ڕیوایەتی کردووە لە ڕێگای (عبيد الله بن عمر العمري) کە ئەمیش (المصغر)ە، و ئەم سیقەیە بە پێچەوانەی براکەی (عبد الله المكبر)، و ئەم (ضعيف)ە وەك باس کرا، وە حەدیسەکە لە هەردوو صەحیحدایە، و جگە لەمانیش لە ڕێگای (عبيد الله المصغر)ە نەك (المكبر). ئەمەش بەڵگەیە بۆ لاوازی بڕوانە (الإرواء ٤٧١و٤٧٢). (تمام المنة).

(١) بەم شێوەیە گێڕاویەتی‌یەوە، وە من کەسم نەبینیوە ئەمە بداتە پاڵ ئیبنو مەسعود، بەیهەقی (٣٢٥/٢) لە غەیری ئەمەوە ئەیگێڕێتەوە دەفەرمووێت: باس دەکرێت لە (ربيع بن صبيح) وە لە (الحسن البصري) کە دەفەرمووێت: (جا حەدیسەکەی باس کرد) وە ئەم ڕەبیعە (حافظ) دەفەرمووێت: (صدوق سيئ الحفظ)، وە من بنەمایەکم بۆ دۆزیوەتەوە لە ئیبنو مەسعودەوە لە کرداری خۆیەوە، هەروەها ئەو حەدیسە ڕیوایەت کراوە لە (أبي الأشهب) و (حسن)ەوە، پیاوەکانیشی سیقەن، بەڵام سەنەدەکەی (هشيم و مغيرة) ی تێدایە هەردووکیان (مدلس) ن، وە لە ئەبی قیلابە و ئیبنوسیرینەوەیە بە سەنەدی صەحیح، وە عبدالرزاق لە (المصنف٣/٣٤٩/٥٩٣٠) دا بە سەنەدێکی تری صەحیح ڕیوایەتی کردووە، (تمام المنة).

و ئەوەی سەجدەی نەبرد هیچی نایەتەسەر، وە لە زاراوەیەکی تردا هاتووە دەفەرمووێت: خوای گەورە لەسەری فەرز نەکردووین ئەو سەجدەیە ببەین، مەگەر خۆمان ئارەزوومان لێ بێت.

جەماعەت جگە لە ئیبنوماجە لە زەیدی کوڕی (ثابت)ەوە ئەگێڕنەوە دەفەرموون: سوڕەتی (والنجم) م خوێند بۆ پێغەمبەر ﷺ سەجدەی تێدا نەبرد، وە (دارقطني) یش ریوایەتی کردووە دەفەرمووێت: هیچ کام لە ئێمە سەجدەی نەبرد، وە (حافظ) لە (الفتح)دا تەرجیحی ئەمە ئەدا کە سەجدە نەبردنەکەی بۆ ئەوە بوو ڕوونی بکاتەوە کە نەکردنیشی دروستە، شافیعیش هەر ئەوەی فەرمووە.

ئەوەی بەززار و (دارقگنی) لە ئەبی هوڕەیرەوە ئەگێڕنەوە پشتگیری ئەم بۆچونە ئەکات، کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ لە سوڕەتی (والنجم) دا سەجدەی بردو ئێمەش سەجدەمان برد، (حافظ) لە (الفتح)دا دەفەرمووێت: پیاوەکانی جێی باوەڕن، وە لە ئیبنومەسعودەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ سوڕەتی (والنجم) ی خوێندو سەجدەی تێدا بردو ئەوانەی لەگەڵیا بوون سەجدەیان برد، بەڵام پیاوێکی پیری قوڕەیشی مشتێك خۆڵی هەڵگرت و نای بەناوچاوانی‌یەوەو ووتی: من ئەمەم بەسە، عبدالله دەفەرمووێت: دوایی ئەوە ئەوکابرایەم بینی بەکافری کوژرا. (بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە).

**(٣) ئەو شوێنانەی سەجدەیان تێدا ئەبرێت:**

ئەو شوێنانەی لەقوڕئاندا سەجدەیان تێدا ئەبرێت پانزە شوێنە، لە عەمری کوڕی عاصەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ پانزە شوێنی سەجدەی لەقوڕئاندا بۆ خوێندۆتەوە، ئەو شوێنانە سیانیان لەسوڕەتە کورتەکاندان (المفصل) و دووانیان لەسوڕەتی (حج) دان. (ئەبوداود□و ئیبنوماجە□و حاکم و دارقطني گێڕاویانەتەوە وە (منذري) و نەوەوی بەحەسەنیان داناوە)[1].

ئەو شوێنانەش ئەمانەن:

---

(١) ئەخێر حەسەن نیە، چونکە دوو کەسی نادیار لە سەنەدەکەیدا هەیە، وە بە شێوەیەکی گشتی ئەو حەدیسە هەرچەند ئیسنادەکەی زەعیفە، بەڵام پێك هاتەی ئومەت لەسەر کار کردنە بە زۆرینەی، وە هاتنی حەدیسە صەحیحەکان شاهیدە لەسەر باقی‌یەکەی، ئیللا سەجدەی دووەمی حەج نەبێت کە نە بەڵگە و نە پێك هاتەی لەسەرە، بەڵام کاری هەندێ صەحابە لە سەجدە بردن بۆی دڵ خۆشکەرە بۆ کار کردن پێی، بەتایبەت کە کەسی موخالیف نیە، (تمام المنة).

١- ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِۦ وَيُسَبِّحُونَهُۥ وَلَهُۥ يَسْجُدُونَ﴾ (الأعراف/٢٠٦).

٢- ﴿وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَظِلَٰلُهُم بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْأَصَالِ﴾ (الرعد /١٥).

٣- ﴿وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ مِن دَآبَّةٍ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ﴾ (النحل/٤٩).

٤- ﴿قُلْ ءَامِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوْ لَا تُؤْمِنُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهِۦٓ إِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ سُجَّدًا﴾ (الإسراء/١٠٧).

٥- ﴿إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُ ٱلرَّحْمَٰنِ خَرُّوا۟ سُجَّدًا وَبُكِيًّا﴾ (مريم/٥٨).

٦- ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَسْجُدُ لَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ وَٱلنُّجُومُ وَٱلْجِبَالُ وَٱلشَّجَرُ وَٱلدَّوَآبُّ وَكَثِيرٌ مِّنَ ٱلنَّاسِ ۖ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ ٱلْعَذَابُ ۗ وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّكْرِمٍ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ﴾ (الحج/١٨).

٧- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱرْكَعُوا۟ وَٱسْجُدُوا۟ وَٱعْبُدُوا۟ رَبَّكُمْ وَٱفْعَلُوا۟ ٱلْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ (الحج/٧٧).

٨- ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱسْجُدُواْ لِلرَّحْمَٰنِ قَالُواْ وَمَا ٱلرَّحْمَٰنُ أَنَسْجُدُ لِمَا تَأْمُرُنَا وَزَادَهُمْ نُفُورًا﴾ (الفرقان/٦٠).

٩- ﴿أَلَّا يَسْجُدُوا لِلَّهِ ٱلَّذِى يُخْرِجُ ٱلْخَبْءَ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُخْفُونَ وَمَا تُعْلِنُونَ﴾ (النمل/٢٥).

١٠- ﴿إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُواْ بِهَا خَرُّواْ سُجَّدًا وَسَبَّحُواْ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ﴾ (السجده/١٥).

١١- ﴿وَظَنَّ دَاوُۥدُ أَنَّمَا فَتَنَّٰهُ فَٱسْتَغْفَرَ رَبَّهُۥ وَخَرَّ رَاكِعًا وَأَنَابَ﴾ (ص/٢٤).

١٢- ﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِ ٱلَّيْلُ وَٱلنَّهَارُ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ لَا تَسْجُدُواْ لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَٱسْجُدُواْ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ﴾ (فصلت/٣٧).

١٣- ﴿فَٱسْجُدُواْ لِلَّهِ وَٱعْبُدُواْ﴾ (النجم/٦٢).

١٤- ﴿وَإِذَا قُرِئَ عَلَيْهِمُ ٱلْقُرْءَانُ لَا يَسْجُدُونَ﴾ (الإنشقاق/٢١).

١٥- ﴿كَلَّا لَا تُطِعْهُ وَٱسْجُدْ وَٱقْتَرِب﴾ (العلق/١٩).

**(٤) مەرجەکانی سجدەی تیلاوەت:**

**جومهوری زانایان دەڵێن: ئەوانەی مەرجن لەنوێژدا لەسجدەی تیلاوەتیشدا مەرجن، وەك دەستنوێژو ڕووکردنە قیبلەو داپۆشینی عەورەت.**

شەوکانی دەفەرموێت: لە حەدیسەکانی سەجدەی تیلاوەتدا شتێکی وا نەهاتووە کە بەڵگەبێت لەسەر ئەوەی سەجدەبەر ئەبێ دەستنوێژی هەبێت، وە پێغەمبەر ﷺ سەجدەی بردووە، وە ئەوانەی دەوروپشتی سەجدەیان بردووە بە قورئان خوێندنەکەی، وە نەهاتووە فەرمانی دابێت بەکەسێك بچێت دەستنوێژ بگرێت، وە زۆر دووریشە هەموویان دەستنوێژیان هەبوبێت، هەروەها بۆ باوەڕەکانیش سەجدەیان لەگەڵدا بردووە، هەرچەندە پیسن و دەستنوێژیان دروست نەبووە.

بوخاری لە ئیبنو عومەرەوە ئەگێڕێتەوە کە ئەو بەبێ دەستنوێژ سەجدەی بردووە، وە هەروەها ئیبنوئەبی شەیبەش لێی گێڕاوەتەوە.

بەڵام ئەوەی بەیهەقی گێڕاویەتی‌یەوە لێی بەئیسنادێك کە (حافظ) لە (الفتح) دا دەفەرمووێت: صەحیحە کە فەرموویەتی: پیاو بەپاکی نەبێت نابێت کڕنوش بەرێت[1]. ڕێك خستن لە نێوانیاندا ئەکرێت بەوەی کە (حافظ) ئەفەرموێت: مەبەست لەو پاکی‌یە پاکی گەورەیە، یان حاڵەتی ئیختیارە، وە یەکەمیشیان لەسەر زەرورەت دائەنرێت.

هەروەها لە حەدیسەکاندا شتێکی وایان تێدا نی‌یە کە بەڵگەبێت لەسەر ئەوەی خاوێنی جلوبەرگ و جێگا ئیعتباری بۆ بکرێت، بەڵام عەورەت داپۆشین و ڕوو کردنە قیبلە لەگەڵ توانادا، ووتراوە بە ڕای هەمو زانایان ئیعتباری بۆ ئەکرێت.

لە (الفتح)دا دەفەرمووێت: کەس لەگەڵ ئیبنوعومەردا ڕێك نەکەوتووە بڵێت: سەجدەی تیلاوەت بێ دەستنوێژ دروستە جگە لە شەعبی نەبێ، (ئیبنوئەبی شەیبە لێوەی ریوایەت کردووە بەسەنەدێکی صەحیح).

وە هەروەها ئەو لە أبوعبدالرحمنی سولەمی‌یەوە ریوایەتی کردووە کە ئایەتی سەجدەی خوێندووە پاشان سەجدەی بردووە بێ ئەوەی دەستنوێژی هەبووبێت؛ وە بێ ئەوەی ڕووی لەقیبلە بووبێت، وە بەپێوە ڕۆیشتووە بە ئیشارەت سەجدەی بردووە، وە لە (أهل البيت) بنەماڵەی پێغەمبەردا ﷺ هەیە لەسەر ئەوە لەگەڵ ئیبنوعومەردا پێکن هاتوون.

---

(١) لە سەنەدەکەی لەلای بەیهەقی (٢/٣٢٥)دا (داود بن حسين البيهقي) تێدایە، و ئەم داودە ژیان نامەییم لە هیچ کتێبێکدا نەبینیوە، بەڵێ باسی لە دوو سەنەددا هاتووە، جورجانی لە (تأريخ جرجان ص٣٥٥و٥٠٣ ط بيروت) دا باسی کردووە، پاشان (سير أعلام النبلاء)ی (ذهبي) چاپ کرا، لەوێدا بینیم لە (٥٧٩/١٣) دا دەفەرمووێت: (المحدث الإمام الثقة، مسند نيسابور.. توفي سنة ٢٧٣).

ئەم ئەسەرە (ذهبي) لە (المهذب) کورت کراوەی (سنن البيهقي)دا تەصحیحی نەکردووە، بەڵکو بێدەنگ بووە لەسەری. والله أعلم. (تمام المنة).

**(٥) نزاو پاڕانەوەی ناو سەجدەی تیلاوەت:**

هەرکەس سەجدەی تیلاوەتی برد بەئارەزووی خۆی چۆن ئەپاڕێتەوە بپاڕێتەوە، چونکە شتێکی ڕاست لەوبارەیەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ نەهاتووە، جگە لە حەدیسەکەی عائیشە نەبێت کە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ لە سەجدەی تیلاوەتدا ئەیفەرموو: (سَجَدَ وَجهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ وَشَقَّ سَمعَهُ وَبَصَرَهُ بِحَولِهِ وَقُوَّتِهِ فَتَبَارَكَ اللهُ أحسَنُ الخَالِقِين) (رواه الخمسة إلا ابن ماجة). واتە: ڕووم نایە زەوی بۆ ئەو بەدیهێنەرەی دروستی کردووە و گوێ و چاوی لێ پەیدا کردووە، بەهێزو توانای خۆی، جا بەرزو پیرۆزە ئەو خوایەی دروست کراوەکانی بەجوانترین شێوە دروست کردووە. حاکم گێڕاویەتی‌یەوە (ترمذي) و ئیبنو سەکەن بەصەحیحیان داناوە، وە لە کۆتایی‌یەکەیدا فەرموویەتی: (سێ جار ئەوەی دەفەرموو).

وە پێویستە ئەوکەسە بڵێت: (سبحان ربي الأعلى) کاتێ سەجدەی تیلاوەتی برد لەنوێژدا.

**(٦) سەجدەی تیلاوەت لە نوێژدا:**

دروستە بۆ ئیمام بۆ تەنها ئایەتی سەجدە بخوێنێ لەنوێژە ئاشکراکان و نهێنی‌یەکاندا، وە هەرکاتێك خوێندنی، سەجدە بەرێت، وە مەئمومەکان پێویستە لەسەریان شوێن ئیمامەکەیان بکەون لەکاتی سەجدەبردنی سەجدەی تیلاوەتدا، هەرچەندە گوێی لێ نەبێ ئیمامەکەی سەجدەی تیلاوەتی خوێندووە، وە ئەگەر ئیمام خوێندی و سەجدەی نەبرد ئەبێ ئەوانیش سەجدە نەبەن، بەڵکو شوێن ئیمام کەوتن پێویستە، هەروەها ئەگەر مەئمومەکە خۆی خوێندی یا گوێی لێی بوو خوێندرا لەلایەن کەسێکەوە کە لەگەڵیانا نوێژی نەئەکرد نابێت سەجدە بەرێت، بەڵکو کاتێ لەنوێژ بووەوە سەجدە ببات، بوخاری و موسلیم لە ئەبوڕافیعەوە ئەگێڕنەوە دەفەرموێت: لەدوای ئەبی هورەیرەوە نوێژی خەوتنانمان ئەکرد ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ﴾ ی خوێند سەجدەی تێدا برد، منیش ووتم: ئەی ئەباهورەیرە ئەو سەجدەیە چی بوو؟ فەرمووی: لەدوای ئەبولقاسمەوە ﷺ نوێژم کردووە ئەوەی خوێندووەو سەجدەی بردووە، منیش هەرکاتێ ئەگەم پێی سەجدە ئەبەم.

حاکم لەسەر مەرجی شیەیخەین ئەگێڕێتەوەو بەصەحیحیشی داناوە لە ئیبنوعومەرەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە ڕکاتی یەکەمی نوێژی نیوەڕۆدا سەجدەی برد، صەحابەش سەیریان کرد ﴿الم تنزیل﴾ (السجدة) ئەخوێنێ[١].

---

(١) ئەم (حدیث)ە صحیح نی‌یە هەرچەندە حاکم تەصحیحی کردووە و (ذهبـي) ش موافەقەی کردووە بە دووایدا (حافظ) لە فەتحدا، و (عسقلاني) و زرقانی، وە هۆیەکەی ئەوەیە ئەوان تەماشای زاهیری سەنەدەکەیان کردووە و بە صەحیحیان گێڕاوە، بەڵام سەنەدەکەی (منقطع)ە، هەرچەندە بە زاهیر صەحیحە، هەربۆیە ئیمامی ئەحمەد کاری پێ

نەوەوی دەفەرموێت: لای ئێمە کەراهەتی نییە ئیمام ئایەتی سەجدە بخوێنێ، وەك چۆن بۆ تاك کەراهەتی نییە، نوێژەکە ئاشکرا بێت یا نهێنی بێت وەك یەکە، وە هەرکاتێ خوێندی سەجدە ببات.

مالیك دەفەرموێت: کەراهەتی هەیە (مطلقاً) بە گشتی. وە ئەبوحەنیفە دەفەرموێت: لەنوێژی نهێنیدا کەراهەتی هەیەو بەس، خاوەنی (البحر) دەفەرموێت: لەسەر مەزهەبی ئێمە وا موستەحەببە سەجدەبردن دووا بخات هەتا سلاو ئەداتەوە، وە بۆ ئەوەی سەر لەنوێژکەران نەشێوێنێ.

**(٧) چەند سەجدە پێکەوە هاتن:**

ئەگەر چەند سەجدە کۆبونەوە یەك سەجدە بری‌یان ئەکەوێت، ئەگەر کەسێك ئایەتی سەجدەی خوێندو دووبارەی کردەوە، یا چەند جار گوێی لەخوێندنی بوو لەمزگەوتێکدا بەمەرجێك ئەوسەجدە بردنەی دوا بخات تا خوێندنی کۆتایی ئەوە بری ئەکەوێت، جا ئەگەر دوای خوێندنی یەکەم سەجدەی برد ئەوە ووتراوە: ئەوسەجدەیە بەسە، ـ ئەوە مەزهەبی حەنەفی‌یە ـ وە ووتویانە جارێکی تر سەجدە بەرێت لەبەر تازەبوونەوەی هۆیەکە. ـ ئەمەش لای مالیك و ئەحمەدو شافعی ـ.

**(٨) گێڕانەوەی سەجدەی تیلاوەت:**

جومهور لایان وایە موستەحەببە دوای خوێندنی یا بیستنی ئایەتی سەجدە سەجدە بەرێت، جا ئەگەر دوواخرا لەکۆڵ ناکەوێت بەمەرجێك ماوەکە زۆر نەخایەنێت، بەڵام ئەگەر زۆری خایاند نەچێت و قەزا ناکرێتەوە.

**سەجدەی شوکر:**

جەماوەری زانایان بۆ ئەوە چوون کە موستەحەببە کەسێك نیعمەتێکی بۆ تازە بووەوە و دڵی پێ خۆش بوو یاشتێکی خراپی لێ دوور کەوتەوە سەجدەی شوکر ببات، لەئەبوبەکرەتەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ شتێکی خۆشی پێ ئەگەیشت دڵی پێی خۆش بووایە یا مژدەیەکی پێ بدرایە، سەجدەی بۆ خوای گەورە ئەبرد. (ئەبوداودو ئیبنوماجەو (ترمذي) کە بە حەسەنی داناوە گێڕاویانەتەوە).

بەیهەقی بەئیسنادێك لەسەرمەرجی بوخاری گێڕاویەتی‌یەوە کە عەلی خوا لێی ڕازی بێت کاتێ نامەی نووسی بۆ پێغەمبەر ﷺ کە (همذان) ئیسلام بووە، پێغەمبەر ﷺ سەجدەی برد، پاشان

---

نەکردووە، کۆی ووتە ئەوەیە: حەدیسەکەی صحیح نی‌یە، بۆیە دروست نی‌یە بکرێتە بەڵگە لەسەر دروستێتی سەجدە بردن لە نوێژە نهێنی‌یەکاندا، وە حەق ووتەکەی ئەبو حنیفەیە کە مەکروهە و ئەمەش زاهیری ووتەکەی ئیمامی ئەحمەدە. (تمام المنة).

سەری بەرز کردەوە فەرمووی: (السَّلامُ على هَمَدَان، السَّلامُ على هَمَدَان) واتە: سڵاو لە (همذان) سڵاو لە (همذان).

لە عبدالرحمن ی کوڕی عەوفەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ جارێك چووە دەر منیش شوێنی کەوتم هەتا چووەناو باخێکی دارخورماوە، سەجدەی برد سەجدەکەی ئەوەندە درێژەی کێشا هەتا ترسی ئەوەم هەبوو کە خوا مراندبێتی، چووم سەیری بکەم، لەوکاتەدا سەری بەرز کردەوە فەرمووی: ئەوە چیتە ئەی عبدالرحمن؟ منیش بۆم گێڕایەوە، فەرمووی: جبریل سڵاوی خوای لەسەربێت پێی ووتم: مژدەیەکت نەدەمێ ئەی موحەممەد ؟ خوای گەورە پێت ئەفەرموێت: هەرکەس سڵاواتت لەسەر بدات منیش سڵاواتی لەسەر ئەدەم، وە هەرکەس سڵاوت لێ بکات منیش سڵاوی لێ‌ئەکەم، منیش سەجدەی سوپاس گوزاریم بۆ خوا برد. (ئەحمەد گێڕاویەتی‌یەوە وەهەروەها حاکمیش گێڕاویەتی‌یەوەو دەفەرموێت: صەحیحە لەسەر مەرجی شەیخەین، وە دەربارەی سەجدەی سوپاس گوزاری لەوە صەحیحتر نازانم).

بوخاری ئەگێڕێتەوە کە کەعبی کوڕی مالیك کاتێ پێی گەیشت خوا لێی خۆش بووە سەجدەی بۆ خوا برد.

ئەحمەد باسی ئەوە ئەکات کە عەلی کاتێ بینی (ذو الثدیة) (پیاوێکی خەواریج بوو) لەنێوان کوژراوەکانی خەواریجدایە سەجدەی برد. وە سەعیدی کوڕی مەنصور باس ئەکات کە کاتێ ئەبوبەکر ڕەزای خوای لێ بێت پێی گەیشت موسەیلەمە کوژراوە سەجدەی برد.

وە ئەوەی بۆ سەجدەی نوێژ پێویستە بۆ سەجدەی سوپاس گوزاریش پێویستە. وە ووتراوە: ئەوانەی بۆ مەرج نی‌یە، چونکە نوێژ نی‌یە. لەکتێبی (فتح العلام)دا هاتووە کە ئەو قسەیە نزیکترین قسەیە لەڕاستی‌یەوە.

شەوکانی دەفەرموێت: حەدیسەکانی ئەم بەشە شتێکی وای تێدا نی‌یە ببێتە بەڵگەی ئەوەی دەست نوێژو جلی خاوێن و جێگای خاوێن مەرجن بۆ سەجدەی سوپاس گوزاری. وە ئیمام یەحیاو (أبوطالب) بۆ ئەوە چوون. وە شتێکی تێدا نی‌یە کە بەڵگەبێت لەسەر ئەوەی سەجدەی شوکر (الله أكبر) ی بۆ بکرێت، وە لە کتێبی (البحر)دا هاتووە کە ئەبێت (الله أكبر) ی بۆ بکرێت. ئیمام یەحیا دەفەرموێت: هیچ قسەیەك نی‌یە لەسەر ئەوەی کە سەجدەی شوکر لەنوێژدا ببەرێت، چونکە لە نوێژ نی‌یە.

**سەجدەی سەهو (هەڵەکردن) :**

سابت بوە کە پێغەمبەر ﷺ هەڵەی کردووە، وە بە صەحیحی لەوەوە هاتووە کە فەرموویەتی: (إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ أنسى كَمَا تَنسَونَ فَإِذَا نَسِيتُ فَذَكِّرُونِي) واتە: بەڕاستی منیش ئادەمی‌یەکم، وەك چۆن ئێوە شتتان لەبیر ئەچێت منیش لەبیرم ئەچێت، جا کاتێ شتێکم لەبیر چوو بیرم بخەنەوە.

وە لەو بارەیەوە چەند حوکمێکی داناوە بۆ ئوممەتەکەی بە کورتی لەخوارەوە باسیان ئەکەین:

**١- چۆنی‌یەتی سەجدە بردن:**

سەجدەی هەڵەکردن دوو سەجدەیە، نوێژکەر یا پێش سلاٌودانەوە یا دوای سلاٌودانەوە ئەیان بات، هەموو ئەوشێوانە بە صەحیحی لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتوون.

لە صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا هاتووە لە ئەبوسەعیدی خودری‌یەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إِذَا شَكَّ أَحَدُكُم فِي الصَّلاةِ فَلَم يَدرِ كَم صلى ثلاثاً أم أربعاً، فَلْيَطرَحِ الشَّكَّ وَلِيَبنِ علـي مَا استَيقَنَ ثُمَّ لِيَسجُد سَجدَتَينِ قَبلَ أن يُسَلِّمَ) واتە: ئەگەر کەسێکتان گومانی هەبوو لەنوێژەکەی و نەیزانی چەند ڕکاتی کردووە سێ یا چوار ڕکاتی کردووە، با واز لەگومانەکە بهێنێ‌و نوێژەکەی لەسەرئەوە دابنێ کە لێی دڵنیایە، وە پێش ئەوەی سلاٌو بداتەوە دوو سەجدە بەرێت.

لەصەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتووە لە بە سەرهاتەکەی کابرای (ذوالیدین) دا کە دەفەرموورێت: پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی سلاٌوی نوێژەکەی دایەوە سەجدەی برد.

وە شوێن کەوتنی لەسەر ئەوەی هاتووە لەوبارەیەوە چاکترە، ئەویش ئەوەیە لەپێش سلاٌودانەوە سەجدە بەرێت لەوشوێنانەدا کەلەپێش سلاٌودانەوەدا سەجدەبردنی تێدا هاتووە، وە لە دوای سلاٌو دانەوە سەجدە بەرێت لەو شوێنانەدا کە لە دوای سلاٌو دانەوەدا سەجدە بردنی تێدا هاتوە، ئیتر جگە لەوانە ئارەزووی خۆیەتی لەهەرکامیاندا سەجدە ئەبات.

شەوکانی دەفەرمووێت: چاکترین شت لەم بارەیەوە کە بووترێت ئەوەیە کە کار بکرێت بەپێی فەرموودەکان‌و کردەوەکانی پێغەمبەر ﷺ لە سەجدە بردندا پێش سلاٌودانەوە یا دوای سلاٌودانەوە، جا هەرچی هۆی سەجدە بردنەکەی بەسرابێت بە پێش سلاٌودانەوە پێش سلاٌودانەوە سەجدە بەرێت، وە هەرچی هۆی سەجدەبردنی بەسرابێت بەدوای سلاٌودانەوە دوای سلاٌودانەوە سەجدە بەرێت، وە هەرچی نەبەسترابوو بەیەکێ لەوانە ئارەزووی خۆیەتی دوای سلاٌودانەوە سەجدە ئەبات یا پێش سلاٌودانەوە، بێ ئەوەی جیاوازی هەبێت لەنێوان ئەوەی ڕکاتێ زیادی کردبێت یا کەم، بەپێی ئەوەی موسلیم لەصەحیحەکەیدا لەئیبنو مەسعودەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إِذَا زَادَ الرَّجُلُ أو نَقَصَ فَلْيَسجُد سَجدَتَينِ) واتە: کاتێ کەسێك ڕکاتێك زیاد بکات یا کەم با دوو سەجدە بەرێت.

**٢- ئەو حاڵەتانەی سەجدەیان تێدا شەرعی‌یە:**

**سەجدەی سەهو لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا شەرعی‌یە ببەرێت:**

أ- ئەگەر پێش تەواو کردنی نوێژەکە سلاوبداتەوە، بەپێی ئەوەی ئیبنوسیرین ئەگێڕێتەوە لەئەبی هورەیرەوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ جارێك نوێژی نیوەڕۆ بوو یاعەسر بوو دوو ڕکات نوێژی کردو سلاوی دایەوە هەڵسا چوو بۆلای ئەو کۆڵەکەیەی لەمزگەوتدا بوو شانی خستەسەری، وەك ئەوەی تووڕەبێت وابوو، وە دەستی ڕاستی لەسەر دەستی چەپ دانابوو، پەنجەکانی خستبووە ناویەك، سەری کردبووە سەر پشتی دەستی چەپی، ئەوانەی پەلەی چوونە دەرەوەیان بوو چوونە دەرەوە لەدەرگاکانی مزگەوتەوە ووتیان: نوێژ کورت بۆتەوە؟ لەناوکۆمەڵەکەدا ئەبوبەکرو عومەری تێدا بوو نەیان وێرا لەوبارەیەوە هیچ بڵێن، پیاوێك هەبوو پێیان ئەووت: (ذواليدين) ووتی: ئەی نێرراوی خوا لەبیرت چووە یا نوێژ کورت کراوەتەوە؟ فەرمووی: نە لەبیرم چووە نە کورت کراوەتەوە، ئینجا فەرمووی: (ئایا وەك (ذواليدين) ئەڵێ وابووە؟) ئەوانیش ووتیان: بەڵێ، جا هاتە پێشەوە ئەو دووڕکاتەی لەبیری چوبوو بیکات کردی لەپاشاندا سلاوی دایەوە، پاشان (الله أكبر)ی کردو سەجدەیەکی وەك سەجدەی نوێژەکەی برد، یا لەو درێژتر بوو، پاشان سەری بەرز کردەوەو (الله أكبر) ی کرد، پاشان (الله أكبر) ی کردەوە سەجدەیەکی وەك یەکەم بگرە درێژتری بردەوە، لەپاشاندا سەری بەرز کردەوە. (بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە).

ئەمە ئەبێتە بەڵگەی ئەوەی ئەگەر کەسێك لە بیری چوو پێش ئەوەی نوێژەکەی تەواو بکات سڵاوبداتەوە، کاتێ پێی زانی، چەند ڕکاتی نەکردبوو بیکات و نوێژەکەی تەواو بکات، دوو ڕکات مابێت یا یەك ڕکات وەك یەکە، واتە: دروستە دوای سلاودانەوەکەی نوێژەکەی تەواو بکات.

لە (عطاء)ەوە هاتووە کە ئیبنوزوبەیر نوێژی ئێوارەی ئەکرد لەدووەم ڕکاتدا سلاوی دایەوە هەڵسا بەرەو ڕەشەکەی کەعبە ماچ بکات، خەڵکەکە ووتیان: (سبحان الله) فەرمووی: ئەوە چیتانە ؟ دەفەرمووێت: جا چەندی مابوو تەواوی کردو دوو سەجدەی برد. دەفەرمووێت: ئەوەیان بۆ ئیبنوعەبباس گێڕایەوە فەرمووی: لەڕەفتاری پێغەمبەرەکەی دوورنەکەوتۆتەوە. (ئەحمەدو بەززارو (طبراني) گێڕاویانەتەوە).

ب- کاتێ ڕکاتێکی زیاد لەنوێژدا بکرێت، بەپێی ئەوەی جەماعەت لەئیبنومەسعودەوە گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ جارێك پێنج ڕکات نوێژی کرد، پێیان ووت: ئایا نوێژ زیادکراوە؟ فەرمووی: (بۆچی؟) ووتیان: پێنج ڕکاتت کرد، ئەویش دوای ئەوە سلاوی دایەوە دووسەجدەی سەهووی برد.

ئەم حەدیسە بەڵگەی ئەوەیە ئەو نوێژە دروستە کە بە هەڵە ڕکاتێکی زیادی تێدا بکرێت، و لەرکاتی چوارەمدا دانەنیشێت بۆ تەحییات.

ج- کاتێ تەحییاتی یەکەم یاسوننەتێك لەسوننەتەکانی نوێژی لەبیرچوو. بەپێی ئەوەی جەماعەت لە ئیبنو بوحەینەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی کردو لە دوو ڕکاتەکەدا دانەنیشت هەڵسایەوە، خەڵکەکەش دەستیان کرد بە (سبحان الله) وتن، بەڵام ئەو هەر لەهەڵسان بەردەوام بوو، کاتێ لەنوێژەکە بووەوە دوو سەجدەی بردو لەپاشاندا سلاوی دایەوە[1].

لە حەدیسەکەدا هاتوە کە نوێژکەران ئەبێ سەجدە بەرن لەگەڵ بەرنوێژەکەیاندا کاتێ بەرنوێژەکەیان هەڵەی کردو سەجدەی برد، وەلای حەنەفی و شافیعی یەکان: مەئمومەکان لەگەڵ ئیمامدا سەجدە ئەبەن کاتێ ئیمام هەڵەی کرد، بەڵام نابێت مەئموم لەبەر هەڵەی خۆی سەجدە ببات.

وە لە (حدیث)دا هاتووە: هەرکەس لەتەحییاتی یەکەمدا هەڵە بکات و هەڵسێتەوە تەحییاتەکەی نەخوێنێ، ئەگەر هەڵسانەوەکەی تەواو نەکردبوو بۆی هەیە بگەڕێتەوە تەحییاتەکەی بخوێنێت، بەڵام ئەگەر هەڵسانەوەکەی تەواو کردبوو نابێ بگەڕێتەوە، وە ئەوەی ئەحمەدو ئەبوداودو ئیبنو ماجە لەموغیرەی کوڕی شوعبەوە گێڕاویانەتەوە پشگیری ئەمە ئەکات، کە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ

---

(١) بەڵگەی نەهێناوەتەوە لەسەر دروستی سەجدە بردن بۆ لەبیرچونی سوننەتێك لەسوننەتەکانی نوێژ، و گەیاندنی ئەم سوننەتانە بە تەحییاتی یەکەمەوە لەم حوکمەدا بە کەڵك نایەت لەبەر دوو شت:

یەکەم: تەحییات خیلاف هەیە لەسەر واجبێتی، وەك لە شوێنی خۆیدا ڕوون کراوەتەوە لە تەحییاتدا، جا دروست نی یە بگەیەنرێت بە شتێك کە ئیجماع هەیە لەسەر سوننی یەتی، جگە لە واجب بوونی.

دووەم: ڕاست و دروست ئەوەیە کە واجبە لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ. فەرمانی کرد بەو پیاوەی کە نوێژەکەی بە نارەوانی کرد پێی فەرموو: جا ئەگەر لەناوەڕاستی نوێژەکە دانیشتی ئارام بگرە، و ڕانی چەپت ڕا بخە پاشان تەحییات بخوێنە. ئەبو داود تەخریجی کردووە بە سەنەدێکی حەسەن.

جا سابت بوو بەوەی کە دروست نی یە ئەو گەیاندنەی باس کراوە، جا کەواتە پێویستە بەڵگەیەکی تر هەبێت بۆ دروستێتی سەجدە بۆ سوننەت، وە صدیق حسن خان لە (الروضة الندية)دا حەدیسی: (لكل سهو سجدتان) ی کردۆتە بەڵگە، و ئەمە لای من حەدیسێکی حەسەنە، ئەبو داود و ئەحمەد و جگە لەمانیش ریوایەتیان کردووە.

پاشان هەر لەوێدا بۆ ئەوە چووە کە جیاوازی نی یە لە نێوان (مسنون) و (مندوب) لە مەشروعی یەتدا، بڕوانە (١/١٢٩-١٣٠) و بەر لەمیش شەوکانی لە (السيل الجرار ١/٢٧٤-٢٧٥) دا بۆ ئەوە چووە بەڵام بە ڕاشکاوی جیاوازی خستۆتە نێوانیان، سەجدە بردن بۆ واجب واجبە، و سەجدە بردن بۆ سوننەت سوننەتە، جا بگەڕێوە بۆی، چونکە زۆر گرنگە. (تمام المنة).

فەرموویەتی: (إذَا قَامَ أَحَدُكُم مِنَ الرَّكعَتَينِ فَلَم يَستَتِمَّ قَائِماً فَلْيَجلِس، وإنِ استَتَمَّ قَائِماً فَلا يَجلِس وَيَسجُد سَجدَتَي السَّهوِ). واتە: ئەگەر کەسێکتان لەرکاتی دووەمدا بیری نەبوو تەحییات بخوێنێ و هەڵسایەوە، بەڵام بەتەواوی ڕاست نەبوبۆوە با دانیشێتەوە، بەڵام ئەگەر بەتەواوی ڕاست بوبۆوە با دانەنیشێتەوە، دوایی دووسەجدەی هەڵەکردن بەرێت.

د- کاتێ لەنوێژدا گومان دروست بوبو دەربارەی تەواوکردنی نوێژەکە، لە عبدالرحمن ی کوڕی عەوفەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: گوێم لەپێغەمبەر بوو ﷺ ئەیفەرموو: (إذَا شَكَّ أَحَدُكُم فِي صَلاتِهِ فَلَم يَدرِ أوَاحِدَةً صلى أمِ اثنَتَينِ فَلْيَجعَلهَا وَاحِدَةً، وَإذَا لَم يَدرِ أثنَتَينِ صلى أم ثَلاثاً فَلْيَجعَلهَا اثنَتَينِ، وَإن لَم يَدرِ ثَلاثاً صلى أم أربَعاً فَلْيَجعَلهَا ثَلاثاً، ثُمَّ يَسجُد إذَا فَرَغَ مِن صَلاتِهِ وَهُوَ جَالِس قَبلَ أن يُسَلِّم سَجدَتَينِ) (رواه أحمد وابن ماجة والترمذي وصححه). واتە: ئەگەر کەسێکتان گومانی پەیدا کرد لەنوێژەکەیدا نەیزانی ڕکاتێکی کردووە یا دووان، با بەرکاتێکی دابنێ، وەئەگەر نەیزانی دوو ڕکاتی کردووە یا سیان با بە دووڕکاتی دابنێ، وە ئەگەر نەیزانی سێ ڕکاتی کردووە یا چوار، با بە سێ ڕکاتی دابنێت، کاتێك لەنوێژەکەی بووەوە هەر بەدانیشتنەوە پێش ئەوەی سلاوبداتەوە دوو سەجدە بەرێت.

لە ریوایەتێکی تردا دەفەرمووێت: گوێم لەپێغەمبەر بووە ﷺ فەرموویەتی: (مَن صلى صَلاةً يَشُكُّ فِي النُّقصَانِ فَلْيُصَلِّ حتى يَشُكَّ فِي الزِّيَادَةِ) واتە: هەرکەس نوێژی کردو گومانی هەبوو کەمی کردووە، بائەوەندە ڕکات بکات هەتا گومان پەیدا ئەکات زیادی کردووە.

لە ئەبوسەعیدی خودریەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذَا شَكَّ أَحَدُكُم فِي صَلاتِهِ فَلَم يَدرِ كَم صلى ثَلاثاً أم أربَعاً فَلْيَطرَحِ الشَّكَّ وَلْيَبنِ على مَا استَيقَنَ ثُمَّ يَسجُد سَجدَتَينِ قَبلَ أن يُسَلِّمَ، فَإن كَانَ صلى خَمساً شَفَعنَ لَهُ صَلاتُهُ، وَإن كَانَ صلى إتْمَاماً لأربَعٍ كَانَتَا تَرغِيماً لِلشَّيطَانِ) (رواه أحمد ومسلم). واتە: کاتێ کەسێکتان گومانی هەبو لە نوێژەکەی نەیئەزانی چەند ڕکاتی کردووە ئایا سێ ڕکاتی کردووە یا چوار، با گومانەکەی فرێ بدات و لەسەر دڵنیایی دایبنێت، لەپاشاندا دوو سەجدەی هەڵەکردن بەرێت پێش ئەوەی سلاو بداتەوە، جا ئەگەر پێنج ڕکاتی کردبوو لەنوێژەکەیدا ئەوە ئەو دوو سەجدەیە پێنجەکە ئەکەنە جووتە بۆی، بەڵام ئەگەر بۆ تەواوی چوار ڕکاتەکە بوو ئەوە سەری بەشەیتان شۆڕ کردووەو لووتی ناوەتە خۆڵ.

ئەم دوو فەرموودەیە ئەبنە بەڵگەی ئەوەی جەماوەر بۆی چوون کەئەویش ئەوەیە کاتێ نوێژکەر گومانی لەرکاتەکاندا ئەبێت لەسەر لایەنە کەمەکەی دایئەنێت و لەپاشاندا سەجدەی سەهو ئەبات[1].

**نوێژی جەماعەت:**

نوێژی جەماعەت سوننەتێکی موئەککەدەیە لە نوێژە فەرزەکاندا[2]. وە دەربارەی (فضل) ی نوێژی جەماعەت (حدیث) ی زۆر هاتووە:

---

(١) منیش دەڵێم: بەڵام لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتووە کە ئەو دوو حەدیسە لەسەر (مطلق) ی نیە، بەڵکو موقەیەدن بۆ کەسێك کە بەسەر بۆچوون (ظن) یدا شتێك زاڵ نەبێت، ئەمەیان بینا لەسەر کەمەکە دەکات، ئەما ئەگەر کەسێك ڕاستی بۆ ئاشکرا بوو، و لەو زۆرینەش بوو، ئەوە بینا بەوەیان دەکات و کار بەوەیان دەکات، و ئەمەش ووتەی پێغەمبەرە ﷺ کە دەفەرمووێت:

ئەگەر کەسێك لە ئێوە گومانی بۆ دروست بوو لە نوێژەکەی با بە دووای ڕاستیدا بگەڕێت، (وە لە ریوایەتێکدا با بڕوانێتە کامەیان لە ڕاستەوە نزیکە) و لە یەکێکی تردا دەفەرموێت: (با بڕوانێت کامەیان دەبینێت ڕاستە)، و لە یەکێکی تردا دەفەرموێت: (با بە دووای ئەوەدا بگەڕێت کە ڕاستەو نزیکە) جا لەسەر ئەوە بینا بکات و نوێژەکەی تەواو بکات، پاشان سڵاو بداتەوە، پاشان دوو سەجدە بەرێت. (أخرجه الشیخان وأبو عوانة في صحاحهم)، وە ریوایەتی دووەم و سێیەم هی ئەوانە جگە لە بوخاری نەبێت، و چوارەم هی نەسائیە و ئەمە لای ئەوان لە حەدیسی ئیبنو مەسعودە خوا لێی ڕازی بێت.

ئەما لە حاڵەتی لێ تێك چوون و سەر لێشێواوی، ئەوە بینا لەسەر کەمەکە دەکرێت، و بەر لە سڵاودانەوە سەجدە دەبات، لەمەدا ئاماژەی بۆ ئەوە تێدایە جیاوازی لە نێوان هەردوو حەدیسەکە لە بوواری فیقهدایە، جا بڕوانە، وە ئەمە مەسەلەیەکە کە پێویستی زیاتر بە شیکردنەوە و شەرح کردن و لێ کۆڵینەوەیە، وە دەرفەتی نیە لێرەدا. بۆ زیاتر ڕون کردنەوە بڕوانە (تمام المنة).

(٢) منیش دەڵێم: دانەر لەم حوکمەدا زۆر نەرمی نوواندووە، چونکە واتای (سنة مؤكدة) لەلای فوقەهاکان ئەوەیە کە بکەری پاداشتی دەدرێتەوە، و بە نەکردنی سزا نادرێت، جا ئەمە چۆن ڕەوایە لە دەرحەقی ئەوانەی دووا ئەکەوون لە نوێژی جەماعەتدا، لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ هامباز بوو بۆ سووتاندنی ماڵەکانیان بەسەریاندا، هەروەك لە حەدیسی چوارەمدا هاتووە.

ئیبنو قەییم دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ سووتێنەری بکەری تاوانی بچوك نەبوو، جا واز هێنانی نوێژ بە جەماعەت لە گوناهە گەورەکانە.

بەڵکو چۆن ڕاستە ئەمە لەگەڵ ووتەی پێغەمبەر ﷺ دا کە بە کوێرەکەی فەرموو: (أجب) کە لە سەرووی ئەوەشەوە دەست گرو یارمەتی دەرێکی نیە دەستی بگرێت بۆ مزگەوت، هەروەك لە حەدیسی سێ‌هەمدایە، بەڵکو

١- له ئیبنوعومەرەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (صَلاةُ الجَمَاعَةِ أفضَلُ مِن صَلاةِ الفَذِّ بِسَبعٍ وَعِشرِينَ دَرَجَةً) (متفق عليه). واتە: نوێژی جەماعەت چاکترە لەنوێژی تاك بە بیستوحەوت پلە.

٢- له ئەبو هورەیرەوە هاتوە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (صَلاةُ الرَّجُلِ فِي جَمَاعَةٍ تَضعُفُ على صَلاتِه فِي بَيتِه وَسُوقِه خَمساً وَعِشرِينَ ضِعفاً، وَذَلكَ أنَّهُ إذَا تَوَضَّأ فَأحسَنَ الوُضُوءَ، ثُمَّ خَرَجَ إلى المَسجِدِ لايُخرِجُهُ إلا الصَّلاةُ، لَم يَخطُ خَطوَةً إلا رُفِعَت لَهُ بِهَا دَرَجَةٌ وَحُطَّ عَنهُ بِهَا خَطِيئَةٌ، فَإذَا صلى لَم تَزَلِ المَلائِكَةُ تُصَلِّي عَلَيهِ مَادَامَ فِي مُصَلَّاهُ مَا لَم يُحدِث: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَيهِ، اللَّهُمَّ ارحَمهُ، وَلا يَزَالُ فِي صَلاةٍ مَا انتَظَرَ الصَّلاةَ). (متفق عليه. وهذا لفظ البخاري). واتە: نوێژی پیاو بەجەماعەت بیستوپێنج ئەوەندەی ئەو نوێژەیە کە بەتەنها لەماڵەوە بازاڕ ئەیکات، ئەویش لەبەر ئەوەیە کە ئەو کاتێك دەستنوێژی گرت بەشێوەیەکی چاك، لەپاشاندا هاتە دەر بۆ مزگەوت تەنها لەبەر نوێژەکەی هاتبووەدەرەوە، هەنگاوێك نانێت ئیللا پلەیەکی پێ بەرز ئەبێتەوە گوناهێکی ئەسڕێتەوە، جا کاتێك نوێژەکەی کرد، هەتا لەشوێنی ئەونوێژەدا بێت فریشتەکان بۆی ئەپاڕێنەوە، تا دەستنوێژەکەی نەشکابێ، ئەڵێن: خوایە ڕەحمی پێ بکە، وە بەردەوام لە نوێژدایە مادام چاوەڕووانی نوێژە

٣- وە هەر لە ئەبو هورەیرەوە هاتوە دەفەرموێت: پیاوێکی کوێر هاتە لای پێغەمبەر ﷺ ووتی: ئەی نێرراوی خوا کەسێك نیە دەستم بگرێت بم هێنێ بۆ مزگەوت، ڕێم ئەدەی لەماڵەوە نوێژ بکەم؟ پێغەمبەر ﷺ ڕێی پێدا، کاتی پشتی هەڵکرد، پێی فەرموو: (ئایا گوێت لەبانگە؟) ووتی: بەڵێ، فەرمووی: (ئەبێ وەڵامی بەیتەوەو بێی بۆ مزگەوت). (موسلیم گێڕاویەتیەوە).

---

لە ڕێگاکەی داروبەردی لێیە وەك لە هەندێ لە ڕیوایەتەکاندایە بە صەحیحی، جا ئایا حوکمێك هەیە وێنەی ئەم (قرینة) انەی لەبارەیەوە هاتبێت جەخت لەسەر واجبێتی بکاتەوە لەگەڵ ئەوەشدا بووترێت: ئەمە واجب نیە؟!.

هەروەها حەدیسی ژمارە شەشیش بەڵگەیە لەسەر واجبیەتی، چونکە کەسێك سوننەتێکی بەجێ نەهێنا، لەگەڵ پاراستنی لەسەر واجباتەکان چۆن پێی دەووترێت (إستحوذ عليه الشيطان)، وە من گومانم وایە کە دانەر کاتێك ئەم بابەتەی نووسیوە تەفسیری ئەوەی خوێندۆتەوە کە لە (نيل الأوطار) دا لەم بابەدا بەسەریەوە بووە، چونکە ئەوە خوا لە من و ئەو خۆش بێت، وەڵامی ئەو حەدیسانەی داوەتەوە کە پەیوەستە بە واجبیەتیەوە بە چەند وەڵامێك کە بەرەو (ندب)ی بردووە، بە خەیاڵی خۆی، بەڵام کەسێك ئەگەر وورد بێتەوە لەو وەڵامانە، لاوازی و زۆر لە خۆ کردنیان تیا دەزانێت، بە تایبەت شەوکانی وەڵامی هەموو بەڵگەکانی نەداوەتەوە لەوانە حەدیسی شەشەم، وە لەوانە حەدیسی: (مَن سَمِعَ النِّدَاءَ فَلَم يُجِبهُ، فَلا صَلاةَ لَهُ إلا مِن عُذرٍ) بۆ زیاتر شارەزایی بڕوانە (تمام المنة).

٤- هەر لەوەوە هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (وَالَّذِي نَفسِي بِيَدِهِ لَقَد هَمَمتُ أن آمُرَ بِحَطَبٍ فَيُحتَطَبَ، ثُمَّ آمُرَ رَجُلاً فَيَؤُمَّ النَّاسَ ثُمَّ أُخَالِفَهُ إلى رِجَالٍ فَأُحرِقَ عَلَيهِم بُيُوتَهُم). (متفقٌ عليه). واتە: بەوزاتەی گیانی منی بەدەستە، وا هات بەدڵمدا فەرمان بکەم دار کۆبکرێتەوە لەپاشاندا بەپیاوێك بڵێم بەرنوێژی خەڵکەکە بکەو خۆم لەولاوە ئەچووم بۆ ئەو پیاوانەی لەماڵەوەن خانووەکانیان بەسەردا بسووتێنم.

٥- لە ئیبنومەسعودەوە هاتوە دەفەرمووێت: هەرکەسێ حەز ئەکات بەیانی بەموسڵمانی بگات بە خوا، با ئاگاداری ئەو نوێژانە بکات لەوشوێنەی کە بانگ ئەدرێ بۆی، چونکە بەڕاستی خوا ڕێگاکانی ڕزگاری و هیدایەتی بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ داناوە، ئەونوێژانەش لەوانەن، وە ئەگەر ئێوە لەماڵەکانتانا نوێژ بکەن وەك ئەو دوواکەوتووە، ئەوە سوننەتی پێغەمبەرەکەتان واز لێ هێناوە، جا کاتێ سوننەتی پێغەمبەرەکەتان واز لێ هێنا گومڕا ئەبن، وە ئێمە کەسمان لە جەماعەت دووا نەئەکەوتین جگە لەو مونافیقانەی نیفاقەکەیان دیار بوو، پیاو هەبوو دووکەس ئەچوونە ژێر باڵی ئەیان هێنا لەریزەکەدا ئەیان وەستان. (موسلیم گێڕاویەتی‌یەوە).

وە لە ریوایەتێکی تریدا دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ ڕێی هیدایەتی فێرئەکردین، ئەویش نوێژکردن بوو، لەومزگەوتانەی بانگی تێدا ئەدرا.

٦- لە ئەبودەرداتەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە فەرمویەتی: گوێم لە پێغەمبەر بووە ﷺ ئەیفەرموو: (مَا مِن ثَلاثَةٍ فِي قَريَةٍ وَلا بَدوٍ لاتُقَامُ فِيهِمُ الصَّلاةُ إلا قَدِ استَحوَذَ عَلَيهِمُ الشَّيطَانُ، فَعَلَيكُم بِالجَمَاعَةِ فَإنَّما يَأكُلُ الذِّئبُ مِنَ الغَنَمِ القَاصِيَةَ). (رواه أبوداود بإسنادٍ حسن) واتە: هیچ سێ کەسێك نی‌یە لەگوندێکدا بن یا لە چۆڵێکدا کە جەماعەتی تێدا نەکرێت ئیللا شەیتان بەسەریانا زاڵ ئەبێت، جا لەبەر ئەوە نوێژی جەماعەت بکەن، وەبزانن گورگ تەنها مەڕە تاك بوەوەکان ئەخوات لە ڕاندا.

## (١) ئامادەبوونی ئافرتان لەمزگەوتدا بۆ نوێژی جەماعەت، و فەزڵی کردنی نوێژەکانیان لەماڵەوەیان:

دروستە ژنان بچنە دەر بۆ مزگەوت و نوێژی جەماعەت بکەن، بەمەرجێ دووربکەونەوە لەبەکارهێنانی ئەوشتانەی ئارەزووی پیاوئەجوڵێنن و ئەبنە هۆی فیتنە، ئەوشتانەش خۆڕازاندنەوەو بەکارهێنانی بۆنی خۆشە.

لە ئیبنوعومەرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا تَمنَعُوا النِّسَاءَ أن يَخرُجنَ إلى المَسَاجِدِ، وَبُيُوتُهُنَّ خَيرٌ لَهُنَّ). واتە: ڕێ لە ئافرەتان مەگرن کە در بچن بۆ مزگەوتەکان، و لە ماڵەکانیان بمێننەوە چاکترە بۆیان.

له ئەبوهورەیرەوە هاتوه كه پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لا تَمنَعُوا إمَاءَ اللهِ مَسَاجِدَ اللهِ، وَلْيَخرُجنَ تَفِلاتٍ) (رواه أحمد وأبوداود). واته: رێ له ئافرەتان مەگرن بۆ چوون بۆ مزگەوت، وه بەبێ خۆ بۆن خۆش كردن دەر بچن.

هەر له ئەبو هورەیرەوە هاتوه دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أيُّمَا امرَأةٍ أصَابَت بُخُوراً فَلا تَشهَد مَعَنَا العِشَاءَ الآخِرَةَ). (رواه مسلم وأبوداود والنسائي بإسنادٍ حسن) واته: هەر ئافرەتێك بۆنی خۆشی دابێت لەخۆی با نوێژی خەوتنانمان لەگەڵدا نەكات.

وه باشتره بۆیان له ماڵەكانیاندا نوێژ بكەن، بەپێی ئەوەی ئەحمەدو (طبراني) له ئومو حومەیدی ساعیدی‌یەوە ئەگێڕنەوە، كه هاتووە بۆلای پێغەمبەر ﷺ ووتویەتی: ئەی نێرراوی خوا من حەز ئەكەم لەگەڵ تۆدا نوێژ بكەم، ئەویش ﷺ فەرمووی: ئەزانم، بەڵام لەژوورەكەی خۆتدا نوێژ بكەی خێرتره بۆت لەوەی نوێژ لەمزگەوتی هۆزەكەتدا بكەی، وه لەمزگەوتی هۆزەكەتدا نوێژ بكەیت خێرتره لەو نوێژەی كه له مزگەوتی جەماعەتدا بیكەیت.

**(٢) (إستحباب) پەسەندی‌یەتی نوێژكردن له دوورترین مزگەوت و قەڵەباڵغ ترین مزگەوتدا:**

نوێژ كردن لەمزگەوتێك قەڵەباڵغ بێت و دوورترین مزگەوت بێت لەشوێنی دانیشتنەوە، موستەحەببە، بەپێی ئەوەی موسلیم لەئەبوموساوە ئەگێڕێتەوە كه پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إنَّ أعظَمَ النَّاسِ فِي الصَّلاةِ أجراً أبعَدُهُم مَمشى) واته: ئەوكەسانەی گەورەترین پاداش وەرئەگرن لەسەر نوێژەكانیان ئەوانەن كه له دورترین شوێنەوە دێن بۆ مزگەوت.

وه بەپێی ئەوەی موسلیم له جابیرەوە گێراویەتی‌یەوە دەفەرمووێت: پارچه زەوی‌یەكی بەتاڵ لەدەوری مزگەوتدا هەبوو، بەنو سەلەمه ویستیان بێنه نزیك مزگەوت و خانووەكانیان لەوێ دروست بكەن، كاتێ گەیشتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (إنَّهُ بَلَغَنِي أنَّكُم تُرِيدُونَ أن تَنتَقِلُوا قُربَ المَسجِدِ؟ قَالُوا: نَعَم يَا رَسُولَ اللهِ! قَد أرَدنَا ذٰلِكَ، فَقَال: يَا بَنِي سَلِمَةَ! دِيَارَكُم تُكتَب آثَارُكُم) واته: پێم گەیشتووە ئەتانەوێت بگوێزنەوە نزیك مزگەوت؟ ئەوانیش ووتیان: بەڵێ ئەی نێرراوی خوا، نیازمان وابوو، فەرمووی: (ئەی بەنی سەلەمه لەشوێن ماڵەكانی خۆتان بن، هەنگاوەكانتان كه هەڵی ئەنێن بەرەو مزگەوت بۆتان ئەنووسرێ).

هەروەها بەپێی ئەوەی شەیخەین و غەیری ئەوان له (حدیث)ی ئەبی هورەیرەوە ئەگێڕنەوە كەباسمان كرد. وه له ئوبەی كوڕی كەعبەوە خوای لێ ڕازی بێت كه دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (صَلاةُ الرَّجُلِ مَعَ الرَّجُلِ أزكى مِن صَلاتِهِ وَحدَهُ، وَصَلاتُهُ مَعَ الرَّجُلَينِ أزكى مِن صَلاتِهِ مَعَ الرَّجُلِ، وَمَا كَانَ أكثر فَهُوَ أحَبُّ إلى اللهِ تعالى) (رواه أحمد وأبوداود والنسائي وابن ماجة وابن حبان وصححه ابن السكن والعقيلي والحاكم) واته: نوێژی پیاوێك لەگەڵ پیاوێكی تردا

پاك كەرەوەترە بۆ گوناح لەونوێژەی بەتەنها ئەیكات، وە ئەو نوێژەی لەگەڵ دوو پیاودا ئەیكات پاك كەرەوە ترە بۆ گوناح لەو نوێژەی لەگەڵ پیاوێكدا ئەیكات، وە هەتا ژمارەیان زیاتر بێت ئەوە لای خوا خۆشەویستترە.

**(٣) چون بۆ مزگەوت بە لەسەرخۆ موستەحەببە:**

وا چاكە (مەندوبە) چوون بۆ مزگەوت لەسەرخۆو پڕ ویقار بێت، بەڵام پەلەكردن و ڕاكردن كەراهەتی هەیە، چونكە ئادەمیزاد لەوكاتەوە دێتەدەر بۆنوێژ حوكمی نوێژكەری هەیە، واتە وەك لە نوێژدا بێت وەهایە.

لە ئەبوقەتادەوە هاتوە دەفەرمووێت: جارێك لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژمان ئەكرد گوێی لەتەپەتەپی پێی كۆمەڵێك بوو ئەهاتن، كاتێ لەنوێژ بووەوە فەرمووی: ئەو تەپەتەپ و ڕاكردنە چی بوو؟ ووتیان: بەپەلە هاتین بۆنوێژ، فەرمووی: (فَلا تفعَلُوا.. إذا أتَيتُمُ الصَّلاةَ فَعَلَيكُم السَّكِينة، فَمَا أدركتُم فَصَلُّوا، وَمَا فَاتَكُم فَأتِمُّوا) (رواه الشيخان). واتە: وامەكەن.. كاتێ هاتن بۆ نوێژ لەسەرخۆ بن، فریای هەرچی كەوتن لەگەڵ ئیمامدا بیكەن و ئەوەی تری دوایی تەواو بكەن.

لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذا سَمِعتُمُ الإقَامَةَ فَامشُوا إلى الصَّلاةِ وَعَلَيكُمُ السَّكِينَةُ وَالوَقَارُ، وَلا تُسرِعُوا، فَمَا أدرَكتُم فَصَلُّوا وَمَا فَاتَكُم فَأتِمُّوا). واتە: كاتێ گوێبیستی قامەت بوون بچن بۆ نوێژ بەلەسەرخۆیی و ویقارەوەو پەلەمەكەن، هەرچی فریا كەوتن بیكەن ئەوەی تری دوایی تەواو بكەن.

**(٤) موستەحەببە ئیمام نوێژەكەی درێژە پێ نەدا:**

واچاكە (مەندوبە) ئیمام نوێژەكەی زۆر درێژە پێ نەدات لەبەر ئەوانەی دوواوە، بەپێی حەدیسەكەی ئەبو هورەیرە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذا صلى أحَدُكُم بِالنَّاسِ فَلْيُخَفِّف، فَإنَّ فِيهِمُ الضَّعِيفُ وَالسَّقِيمُ وَالكَبِيرُ، فَإذا صلى لِنَفسِهِ فَلْيُطَوِّل مَا شَاءَ). (رواه الجماعة). واتە: هەركەس بەرنوێژی كۆمەڵێكی كرد، بادرێژەی پێ نەدا چونكە لەنێوانیاندا ئادەمیزادی لاوازو نەخۆش و بەساڵاچوو هەیە، بەڵام ئەگەر بۆخۆی بەتەنها نوێژی كرد با بەئارەزووی خۆی درێژەی پێ بدات.

لە ئەنەسەوە ئەگێڕنەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إنِّي لأدخُلُ فِي الصَّلاةِ وَأُرِيدُ إطَالَتَهَا فَأسْمَعُ بُكَاءَ الصَّبِيِّ فَأتَجَوَّزُ فِي صَلاتِي مِمَّا أعلَمُ مِن شِدَّةِ وَجدِ أُمِّهِ مِن بُكَائِه). واتە: جاری وا هەیە نوێژ دائەبەستم ئەمەوێ درێژەی پێبدەم، گوێم لەگریانی منداڵ ئەبێت پەلە ئەكەم لەنوێژەكەمدا، لەبەر ئەوەی ئەزانم دڵی دایكی چ سۆزێكی تێدایە بۆ گریانەكەی.

شەیخەین لە ئەنەسەوە ئەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: لەدوای هیچ ئیمامێکەوە نوێژم نەکردووە ئەوەندەی پێغەمبەر ﷺ نوێژەکانی کورت و تەواو بووبێت.

ئەبوعومەری کوڕی (عبدالبر) فەرموویەتی: درێژە پێدانی نوێژ لەلایەن هەموو بەرنوێژێکەوە زانایان کۆن لەسەری و کارێکی پەسەندکراوە، ئەو کورتییەش لایەنی کەمی ووتنی سێ جار تەسبیحات کردنە، بەڵام لابردن و کەم کردنەوە لەنوێژدا دروست نییەو نابێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە لە دەنوك دان بەزەویدا، وەك قەلەڕەش، وەجارێك پیاوێکی بینی ڕکوع و سجودەکەی تەواو نەبوو پێی فەرموو: (إرجِع فَصَلِّ فَإنَّكَ لَم تُصَلِّ) واتە: بگەڕێرەوە نوێژەکەت بکەرەوە ئەوە نوێژ نەبوو تۆ کردت. وە فەرموویەتی: (لايَنظُرُ اللهُ إلى مَن لايُقِيمُ صُلبَهُ فِي رُكُوعِهِ وَسُجُودِهِ) واتە: خوا سەیری ئەوکەسە ناکات پشتی ڕێك ناکاتەوە لەرکوع و سجوددا.

لە پاشان (ابن عبدالبر) دەفەرمووێت: هیچ جیاوازییەك نازانم لەنێوان زانایاندا هەبێت لەسەر ئەوەی درێژەندان بەنوێژ موستەحەببە بۆ هەموو ئەوانەی بەرنوێژی کۆمەڵێك ئەکەن لەسەر ئەو مەرجانەی دامان نا بۆ تەواوێتی.

ئەگێڕنەوە کە عومەر خوا لێی ڕازی بێت فەرموویەتی: ڕقی بەندەکانی خوا لەخوا هەڵمەسێنن بەوەی کەسێکتان ئەوەندە درێژە بەنوێژەکەی بدات گران بێت لەسەر ئەوانەی دوایەوە.

**(٥) درێژە پێدانی ڕکاتی یەکەم لەلایەن ئیمامەوەو چاوەڕوانی کردنی ئەوانەی هەست بەهاتنە ژوورەوەیان ئەکات بۆ ئەوەی فریای جەماعەت بکەون:**

دانراوە بۆ ئیمام ڕکاتی یەکەم درێژە پێ بدات بۆ ئەوەی ئەوانەی دێنە ژووری مزگەوت، بگەن بەفەزیلەتی نوێژی جەماعەت، وەك چۆن موستەحەببە چاوەڕوانی ئەوانە بکات کە هەست بە هاتنیان ئەکات لەکاتی ڕکوع بردندا، یا کاتی تەحییات خوێندنی دواییدا، لە (حدیث)ێکی ئەبوقەتادەدا هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ هەمیشە ڕکاتی یەکەمی درێژە پێ ئەدا، ئێمەش ئەمان زانی کە ئەیەوێت خەڵك فریای ڕکاتی یەکەم بکەون.

لە ئەبوسەعیدەوە هاتووە دەفەرمووێت: نوێژ دائەبەسترا کەسێك ئەیتوانی بچێت بۆ بەقیع و کاری پێشاو بکات پاشان دەست نوێژ بگرێت و بگەڕێتەوە، هێشتا فریای پێغەمبەر ﷺ ئەکەوت لەرکاتی یەکەمدا، ئەوەندەی درێژە ئەدا بەڕکاتی یەکەم (ئەحمەدو موسلیم و ئیبنوماجەو نەسائی گێڕاویانەتەوە).

**(٦) دوواکەوتنی ئیمام واجبەو پێشکەوتنی حەرامە:**

واجبە نوێژکەرەکان شوێن ئیمام بکەون، وە حەرامە پێشی بکەون، (زانایان هەموو لەسەر ئەوەن لەپێش ئیمامەوە نوێژ دابەستن یا سلاّودانەوە نوێژ پوچەڵ ئەکاتەوە، بەڵام جیاوازیان هەیە لەسەر پێشکەوتنی لەبەشەکانی تری نوێژدا، لای ئەحمەد ئەوانیش نوێژ پوچەڵ ئەکەنەوە، وە دەفەرمووێت: هەرکەس پێش ئیمام بکەوێت نوێژی دروست نىیە، بەڵام هاوشانی کردنی ئیمام کەراهەتی هەیە).

بەپێی ئەوەی ئەبوهورەیرە ئەگێرێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إنَّما جُعِلَ الإمَامُ لِيُؤتَمَّ بِه فَلا تَختَلِفُوا عَلَيه فَإذا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا، وَإذا رَكَعَ فَاركَعُوا، وَإذا قَالَ سَمِعَ اللهُ لِمَن حَمِدَهُ فَقُولُوا اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الحَمدُ، وَإذا سَجَدَ فَاسجُدُوا، وَإذا صلى قَاعِداً فَصَلُّوا قُعُوداً أجمَعُونَ) (رواه الشيخان). واتە: ئیمام بۆیە دانراوە چاوی لێ بکرێت، جا پێشی مەکەون، کاتێ ووتی: (الله اكبر) ئێوەش بڵێن: (الله اكبر)، کاتێ چووە رکوعەوە ئێوەش بچنە رکوعەوە، کاتێ ووتی: (سمع الله لمن حمده) ئێوەش بڵێن: (اللهم ربنا لك الحمد)، کاتێ سەجدەی برد ئێوەش سەجدە بەرن، ئەگەر بەدانیشتنەوە نوێژی کرد ئێوەش هەموو بەدانیشتنەوە لەدوایەوە نوێژ بکەن.

لە ریوایەتێکی ئەحمەدو ئەبوداوددا هاتووە فەرموویەتی: (إنَّمَا الإمَامُ لِيُؤتَمَّ بِهِ فَإذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا، وَلا تُكَبِّرُوا حتى يُكَبِّرَ، وَإذَا رَكَعَ فَاركَعُوا، وَلا تَركَعُوا حتى يَركَعَ، وَإذَا سَجَدَ فَاسجُدُوا، وَلا تَسجُدُوا حتى يَسجُدَ). واتە: ئیمام ئەبێ چاوی لێ بکرێت، کاتێ (الله أكبر) ی کرد ئێوەش بیکەن، وە (الله أكبر) مەکەن هەتا ئەو ئەیکات، وە کاتێ چووە رکوع ئێوەش بچنە رکوعەوە، هەتا ئەو نەچێتە رکوعەوە ئێوە مەچن، وەکاتێ سەجدەی برد ئێوەش سەجدە بەرن، هەتا ئەو سەجدە نەبات ئێوە سەجدە مەبەن.

لە ئەبو هورەیرەوە خوا لێی رازی بێت هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ ئەیفەرموو: (أمَا يَخشَى أحَدُكُم إذَا رَفَعَ رَأسَهُ قَبلَ الإمَامِ أن يُحَوِّلَ اللهُ رَأسَهُ رَأسَ حِمَارٍ أو يُحَوِّلَ اللهُ صُورَتَهُ صَورَةَ حِمَارٍ) (رواه الجماعة). واتە: ئەوکەسەی سەری لە پێش ئیمامەوە بەرز ئەکاتەوە، ترسی ئەوەی نىیە خوا سەری بکا بەسەری گوێ درێژ، یا شێوەی بگۆرێتە سەر شێوەی گوێ درێژ.

لە ئەنەسەوە هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أيُّها النَّاسُ! إنِّي إمَامُكُم فَلا تَسبِقُونِي بِالرُّكُوعِ وَلا بِالسُّجُودِ، وَلا بِالقِيَامِ وَلا بِالقُعُودِ، وَلا بِالإنصِرَافِ) (رواه أحمد ومسلم). واتە: ئەی خەڵکینە! من ئیمامی ئێوەم جا لە رکوع و سجودو هەڵسان و دانیشتن و سلاّودانەوەدا پێشم مەکەون.

له بەرائی کوڕی عازیبەوە هاتووە دەفەرمووێت: ئێمە لەپشت پێغەمبەرەوە ﷺ نوێژمان ئەکرد کاتێ ئەیفەرموو: (سمع الله لمن حمده) کەس لەئێمە پشتی دانەئەنەواند هەتا پێغەمبەر ﷺ نێو چەوانی ئەخستە سەر زەوی. (جەماعەت گێڕاویانەتەوە).

**(٧) پێك هاتنی نوێژی جەماعەت بەئیمام لەگەڵ تەنها کەسێك:**

نوێژی جەماعەت بەتەنها کەسێك و ئیمامەکە پێك دێت، با یەکێك لەوانە منداڵیش بێت، یا ئافرەت، لە ئیبنوعەبباسەوە هاتووە دەفەرمووێت: لای مەیمونەی پورم شەوێك مامەوە، پێغەمبەر ﷺ شەو هەستا بۆ نوێژ منیش هەستام لەگەڵیا نوێژ بکەم لای چەپی‌یەوە ڕاوەستام سەرمی گرت و خستمی‌یە لای ڕاستی‌یەوە. (رواه الجماعة). ئەم حەدیسە ئەبێتە بەڵگەی ئەوەی دروستە لەدوای کەسێکەوە نوێژ بکرێت نییەتی ئیمامەتی نەهێنابێت لەنوێژی فەرزو سوننەتدا[1].

له بوخاریدا هاتووە لەعائیشەوە کە پێغەمبەر ﷺ جارێك لەحوجرەکەیدا نوێژی ئەکرد، دیواری حوجرەکە نزم بوو خەڵك پێغەمبەریان ئەبینی، خەڵکەکە هەڵسان بەنوێژەکەی پێغەمبەر ﷺ نوێژیان کرد، کاتێ ڕۆژ بووەوە بۆیان گێڕایەوە، شەوی دووەم پێغەمبەر ﷺ هەڵسایەوە بۆ نوێژ، خەڵکەکەش هەڵسان بەنوێژەکەی نوێژیان کردەوە.

له ئەبوسەعیدو ئەبوهورەیرەوە هاتووە فەرموویانە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَنِ استَيقَظَ مِنَ اللَّيلِ فَأيقَظَ أهلَهُ، فَصَلَّيَا رَكعَتَينِ جَميعاً كُتِبَا مِنَ الذَّاكِرِينَ اللهَ كَثِيراً وَالذَّاكِرَات) (رواه أبوداود). واتە: هەرکەس شەو هەڵسا خێزانەکەشی هەڵساند و دوو رکات نوێژیان پێکەوە کرد لە زۆر یادکەرانی خوا ئەنوسرێن.

له ئەبوسەعیدەوە هاتووە کە دەفەرمووێت: پیاوێك هاتەناو مزگەوت، پێغەمبەر ﷺ لە نوێژ لێبوبۆوە لەگەڵ هاوەڵەکانیدا، فەرمووی: (مَن يَتَصَدَّقُ على ذَا فَيُصَلِّي مَعَهُ؟) واتە: کێ ئەیەوێت خێرێك بەوپیاوە بکات بچێت نوێژی لەگەڵدا بکات ؟ پیاوێك لەولاوە هەڵسا نوێژی کرد لەگەڵیدا. (ئەحمەدو ئەبوداودو (ترمذي) کە بە حەسەنی داناوە، گێڕاویانەتەوە). وە ئیبنو ئەبی شەیبە ئەگێڕێتەوە کە ئەوکەسە ئەبوبەکری صدیق بوو هەڵسا نوێژی لەگەڵ پیاوەکەدا کرد.

---

(١) بەڵام پێغەمبەر ﷺ هەموو نوێژەکانی بەتەنها کردوون، لەبەر ئەوە من ڕام وایە ئەو ڕەوایی‌یە ببەسترێت بەهەندێ کاتەوە، ئەگینا هەموو نوێژە سوننەتەکان بە جەماعەت کردنیان بیدعەیە، پێچەوانەی ڕێنومایی و هەدیی پێغەمبەرە ﷺ. وەك شێخی ئیسلام تەحقیقی کردووە لە (مجموع الفتاوى ٢/٣٠٢)دا. (تمام المنة).

(ترمذي) ئەم حەدیسەی کردۆتە بەڵگەی ئەوەی کە دروستە کۆمەڵێك نوێژی جەماعەت بکەن لەمزگەوتێکدا نوێژی جەماعەتی تێدا کرابێت[1]. وە دەفەرمووێت: ئەحمەد و ئیسحاقیش ئەوەیان فەرمووە، بەڵام کۆمەڵێکی تر لەزانایان ئەفەرموون: ئەو مزگەوتەی نوێژی جەماعەتی تێدا کرا دوای ئەوە هەرکەس هات ئەبێ بەتەنیا نوێژ بکات نەك بەکۆمەڵ، سوفیان و مالیکو ئیبنو موبارەك و شافیعی ئەمە ئەفەرموون.

بەڵام ئەوە کە چەند کۆمەڵ بەجیا جیا لەیەك کاتدا لەناو مزگەوتدا نوێژی جەماعەت بکەن زانایان هەموو لەسەر حەرامی ئەوکارەن، چونکە پێچەوانەی قەستی (شارع) یاسا دانەری ئیسلامە لە دانانی نوێژی جەماعەتدا.

**(٨) دروستە ئیمام ببێتە مەئموم:**

دروستە ئیمام لەکاتی نوێژکردنەکەدا بگەڕێتە دوواوە بۆ ناو ڕیزەکە، ئەگەر لەجیاتی ئیمامی (راتب) دامەزراو نوێژی ئەکرد، کاتێ ئیمامی دامەزراو بێتەوە. بەپێی ئەوەی هەردوو شێخ لەسەهلی کوڕی سەعدەوە گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ ئەچێت بۆبەینی عەمری کوڕی عەوف بۆ صولح کردنیان، کاتی نوێژ هات، بانگبێژ بەئەبوبەکری ووت: بەرنوێژی‌یەکەمان بۆ ئەکەی قامەت بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ، ئەبوبەکرو خەڵکەکە لەنوێژدا بوون پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە هاتەناو ڕیزەکەوە، خەڵکەکە دەستیان کرد بەچەپڵە لێدان، ئەبوبەکر لەنوێژدا ئاوڕی نەئەدایەوە کاتێ ئەوەندەیان چەپڵە لێدا ئاوڕی دایەوە، پێغەمبەری ﷺ بینی، پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بۆ کرد لەجێی خۆت بمێنەوە کاتێ فەرمانم پێ کردی، ئەبوبەکر لەخۆشیدا دەستی بەرز کردەوەو شوکری خوای کرد لەسەر فەرمانەکەی پێغەمبەر ﷺ، پاشان ئەبوبەکر هاتە دوواوە بۆناو ڕیزەکەو پێغەمبەر ﷺ چووە پێشەوە وکاتێ نوێژەکەی کردو سلاوی دایەوە فەرمووی: (يَا أبَابَكر! مَا مَنَعَكَ أن تَثبُتَ إذ أمَرتُكَ؟) واتە: ئەی ئەبابەکر چی ڕێی لێ گرتی لەجێی خۆت بمێنیتەوە کاتێ فەرمانم پێ کردی ؟، ئەبوبەکر ووتی: بۆ کوڕی ئەبوقوحافە ناگونجێت لەپێش پێغەمبەرەوە نوێژ بکات، پێغەمبەر ﷺ بەخەڵکەکەی فەرموو: (مَالِي رَأيتُكُم أكثَرتُمُ التَّصفِيقَ؟ مَن نَابَهُ شَيئٌ فِي الصَّلاةِ فَليُسَبِّح، فَإنَّهُ إذَا سَبَّحَ التَفَتَ إلَيهِ، وَإنَّمَا التَّصفِيقُ لِلنِّسَاءِ) واتە: ئەوە چی بوو ئەوەندە چەپڵەتان لێدا؟ کەسێك شتێکی بەوشێوەیە لەنوێژدا هاتەڕێ با (سبحان الله) بکات، کاتێ (سبحان الله)ی کرد بەرنوێژ ئاوڕی لێ ئەداتەوە، چونکە چەپڵەلێدان بۆ ئافرەتانە.

---

(١) حەدیسەکە لەو دەعوایە تایبەتی ترە، لەپێشەوە باسی ئەوەمان کرد. شافیعی فەرموویەتی: کەراهەتی هەیە کردنی دوو نوێژی جەماعەت لە یەك مزگەوتدا.

ئەم حەدیسە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کەڕۆیشتن لەڕیزێکەوە بۆ ڕیزی پێشەوە نوێژ بەتاڵ ناکاتەوە، وە ووتنی (الحمد لله و سبحان الله) بۆ ئاگادار کردنی بەرنوێژ دروستە، وەچوونە جێی ئیمامی (راتب) دامەزراو لەبەر عوزری شەرعی لەپێش ترە بۆ دروست بوون، وە بەڵگەشە لەسەر ئەوەی دروستە کەسێك لەبەشێکی نوێژەکەیدا ئیمام بێت و لەبەشێکی تریدا مەئموم، وە بەڵگەشە لەسەر دروستی دەست بەرزکردنەوە لەنوێژا کاتی پاڕانەوەو ستایشی خواکردن، وە لەسەر ئەوەی ئاوڕدانەوە بۆ پێویستی دروستە، وە لەسەر ئەوەی دروستە سوپاس و ستایشی خوا بکرێت لەسەر پێشەوایی لەدینداا، وە لەسەر ئەوەی دروستە نوێژکەر ئاماژە بکات، وە لەسەر ئەوەی دروستە پیاوچاکێك بەرنوێژی لەخۆی چاکتر بکات، وە لەسەر ئەوەی دروستە کردنی کاری کەم لە نوێژدا.. (شەوکانی باسی ئەمەی کردووە).

**(٩) فریاکەوتنی ئیمام:**

هەرکەس گەیشتە مزگەوت و ئیمام نوێژی دابەستبوو، ئەبێت ئەویش بەپێوە (الله أكبر) ی ئیحرام نوێژ دابەستن بکات و لەسەر ئەو شێوەی ئیمامی تێدایە نوێژ دابەستێ و لەگەڵیا بێت و بەڕکاتی دانەنێت، هەتا لەرکوعدا پێی نەگات، جا ئەو رکوعە رکوعی تەواو بێت یا هەر چەمینەوە بێت و دەستی گەیشتبێتە ئەژنۆی پێش ئەوەی ئیمام بەرز بووبێتەوە لە رکوع، بەڵام (الله أكبر) ی گوێزانەوە لەحاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی تر ئەگەر بیکات چاکە، ئەگینا (الله أكبر) ی نوێژ دابەستنی بەسە.

لە ئەبو هورەیرەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إِذَا جِئتُم إلى الصَّلاةِ وَنَحنُ سُجُودٌ فَاسجُدُوا وَلا تَعُدُّوهَا شَيئاً، وَمَن أدرَكَ الرَّكعَةَ فَقَد أدرَكَ الصَّلاةَ) (رواه أبوداود وابن خزيمة في صحيحه والحاكم في المستدرك وقال: صحيح). واتە: کاتێ هاتن بۆ نوێژ ئێمە سەجدەمان بردبوو ئێوەش سەجدە بەرن بەڵام بەڕکاتی دامەنێن، وە هەرکەس گەیشت بەرکوع ئەوە ئەو ڕکاتەی بۆ حیساب کراوە.

وە ئەوکەسەی دووا کەوتبوو ئیمام چی کرد ئەویش ئەیکات، وە لەتەحییاتی یەکەمدا لەگەڵ ئیمامدا دانیشێ بۆ تەحییات، هەڵئەسێتەوە هەتا ئیمام سلاو ئەداتەوە، کاتێ ئیمام سلاوی دایەوە ئەم (الله أكبر) ئەکات وهەڵئەسێتەوە بۆ تەواوکردنی نوێژەکەی.

**(١٠) عوزرەکانی دوواکەوتن لەنوێژی جەماعەت:**

ڕێ دراوە بە دوواکەوتن لە نوێژی جەماعەت ئەگەر حاڵەتێك لەم حاڵەتانەی خوارەوەی بەسەردا بێت:

١ ، ٢- سەرما و باران، لە ئیبنوعومەرەوە هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر شەوێك ساردو باراناوی بوایە لەسەفەردا فەرمانی ئەکرد بەبانگبێژ بانگ بدات بڵێت: (صَلُّوا فِي رِحَالِكُم) واتە: لەشوێنەکانی خۆتان نوێژبکەن (بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە).

لە جابیرەوە هاتووە دەفەرموێت: لەسەفەرێکدا بووین لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ باران ئەباری فەرمووی: (فَلْيُصَلِّ مَن شَاءَ مِنكُم فِي رَحلِهِ) (رواه أحمد ومسلم وأبوداود والترمذي). واتە: هەرکەس ئەیەوێت با لەشوێنی خۆی نوێژ بکات.

لە ئیبنو عەبباسەوە هاتووە: ئەگەر رۆژێك باران بووایە بە بانگبێژەکەی ئەفەرموو: کاتێ ووتت: (أشهَدُ أنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ الله) مەڵێ (حَيَّ على الصَّلاة) بەڵکو بڵێ: (صَلُّوا فِي بُيُوتِكُم) واتە: لەماڵەکانتان نوێژ بکەن، خەڵکەکە ئەوەیان پێ چاك نەبوو فەرمووی: ئایا ئەوەتان لا سەیرە ؟ ئەوکەسەی لەمن چاکتربوو ئەوەی کردووە کە پێغەمبەرە ﷺ. نوێژی جەماعەت واجبە بەڵام من حەزم نەکرد بیان هێنمە دەر بەناو قوڕو لیتەدا بڕۆن (بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە).

وە گەرمای بەتین و تاریکی و ترس لەستەمکار حوکمی سەرمای هەیە، (ابن بطال) دەفەرمووێت: زانایان هەموو کۆن لەسەر ئەوەی نەچوون بۆ نوێژی جەماعەت دروستە لەکاتی بارانی زۆرو تاریکی و بای بەتین و وێنەی ئەمانەدا.

٣- ئامادە بوونی خواردن. بەپێی ئەوەی ئیبنوعومەر دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذَا كَانَ أحَدُكُم على الطَّعَامِ فَلا يَعجَل حتى يَقضِيَ حَاجَتَهُ مِنهُ وَإن أُقِيمَتِ الصَّلاةُ) (رواه البخاري). واتە: ئەگەر کەسێکتان لەسەر نان خواردن بوو با پەلە نەکات هەتا تێرئەخوات با نوێژیش دابەسترابێت.

٤- تەنگەتاوی لەبەر پیسایی و میز، لەعائیشەوە هاتووە دەفەرمووێت: گوێم لەپێغەمبەر بوو ﷺ دەیفەرموو: (لاصَلاةَ بِحَضرَةِ طَعَامٍ، وَلا وَهُوَ يُدَافِعُ الأخبَثَينِ). (رواه أحمد ومسلم وأبوداود) واتە: لەکاتی ئامادەبوونی خواردن و لەکاتی تەنگاوی، نوێژکردن دروست نی یە.

٥- لە ئەبودەردائەوە هاتووە دەفەرمووێت: لە زانایی و ژیری پیاوە کەسێك پێویستی خۆی تەواو جێبەجێ بکات، پاشان بچێت بۆ نوێژ بۆ ئەوەی لەکاتی نوێژەکەیدا بیری لای هیچ نەبێ. (رواه البخاري).

### (١١) کێ لەپێشترە بۆ ئیمامەت:

کەسێك قورئانی زۆرتر لەبەر بێت لەپێشترە بۆ ئیمامەت، جا ئەگەر لە قورئان لەبەربووندا یەکسان بوون ئەوە زاناترینیان بەسوننەت لەپێشترە، ئەگەر لەوەشدا یەکسان بوون، زووترین کۆچکەریان لەپێشترە، جا ئەگەر لەوەشدا یەکسان بوون، ئەوە بەتەمەن ترینیان لەپێشترە.

١- لە ئەبوسەعیدەوە هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذا كَانُوا ثَلاثَةً فَلْيَؤُمَّهُم أحَدُهُم، وَأحَقُّهُم بِالإمَامَةِ أقرَؤُهُم) (رواه أحمد ومسلم والنسائي). واتە: ئەگەر سێ کەس لەشوێنێکدا بوون با یەکێکیان ئیمامەتیان بۆ بکات، وە لەپێش ترینیان بۆ ئیمامەت ئەوەیانە قورئانی زۆرتر بزانێت، واتە: قورئانی زۆرتر لەبەر بێت بەپێی حەدیسەکەی عەمری کوڕی سەلەمە کە تێیدا هاتووە فەرموویەتی: (لِيَؤُمَّكُم أكثَرُكُم قُرآناً) واتە با ئەوەتان ئیمامتان بێت کە قورئانی زۆرتر لەبەرە.

٢- لە ئیبنومەسعودەوە هاتووە دەفەرمووێت[١]: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (يَؤُمُّ القَومَ أقرَؤُهُم لِكِتَابِ اللهِ، فَإن كَانُوا فِي القِرَاءَةِ سَوَاءً، فَأعلَمُهُم بِالسُّنَّةِ، فَإن كَانُوا فِي السُّنَّةِ سَوَاءً فَأقدَمُهُم هِجرَةً، فَإن كَانُوا فِي الهِجرَةِ سَوَاءً فَأقدَمُهُم سِنّاً، وَلا يَؤُمَّنَّ الرَّجُلُ الرَّجُلَ فِي سُلطَانِه، وَلا يَقعُد فِي بَيتِهِ على تَكرِمَتِهِ إلا بِإذنِهِ) رواه أحمد ومسلم وفي لفظ (لا يَؤُمَّنَّ الرَّجُلُ الرَّجُلَ فِي أهلِهِ وَلا فِي سُلطَانِهِ). واتە: کێ قورئانی زورتر لەبەر بوو ئەوە ئەبێتە ئیمامی خەڵك، جا ئەگەر لەقورئاندا یەکسان بوون زاناترینیان بەسوننەت ئەبێت بە ئیمام، جا ئەگەر لەسوننەتیشدا یەکسان بوون کێ زووتر کۆچی کردبێت، ئەوە ئەبێت بە ئیمام، جا ئەگەر لەکۆچ کردنیشدا یەکسان بوون، ئەوە بەتەمەن ترینیان ئەبگێت بە ئیمام، وە کەس لەشوێنی دەسەڵاتی کەسدا ئیمامەتی نەکات (واتە: لەماڵەکەی یا مەجلیسەکەی یا ئەو مزگەوتەی کە ئیمامە تێیدا)، وە کەس لە جێگەی خاوەن ماڵدا دانەنیشێت هەتا خاوەن ماڵ ڕێی پێ نەدات، وە لە لەفزێکی تردا بەم شێوەیە هاتووە: کەس ئیمامەتی کەس نەکات لەناو ماڵ و کەسوکارەکەیدا، یا لە شوێنی دەسەڵاتەکەیدا، ئەم حەدیسە سەعیدی کوڕی مەنصوریش گێڕاویەتیەوە بەڵام ئەمەی تێدایە: تا خاوەن دەسەڵات لەشوێنی خۆی ڕێگا نەدا کەس ئیمامەتی نەکات، وە کەسیش لەشوێنی خاوەن ماڵ دانەنیشێ تاوەکو بۆخۆی ڕێی پێ نەدا. مەبەست ئەمەیە کە خاوەن ماڵ و خاوەن دەسەڵات وخاوەن کۆڕو سەرۆکی کۆڕ لەهەمووکەس لەپێشترن بۆ ئیمامەت، بەمەرجێ خۆی ڕێی نەدابێت کەسێکی تریان ببێتە ئیمام.

---

(١) ڕاست ئەبێ مەسعودە نەك ئیبنومەسعود، وە ناوی تەواوی (عقبة بن عمرو الأنصاري البدري) یە جا حەدیسەکە لە موسنەدی ئەوە لەلای سەرجەم ئەوانەی تەخریجیان کردووە.

له ئەبو هورەیرەوە هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا يَحِلُّ لِرَجُلٍ يُؤمِنُ بِاللهِ وَاليَومِ الآخِرِ أن يَؤُمَّ قَوماً إلا بِإذنِهِم وَلا يَخُصَّ نَفسَهُ بِدَعوَةٍ دُونَهُم فَإن فَعَلَ فَقَد خَانَهُم) (رواه أبوداود)[1]. واتە: ڕەوا نی یە بۆ کەسێك باوەڕی بەخواو ڕۆژی دوایی هەبێت بێتە ئیمامی کۆمەڵێك بەبێ ڕەزامەندی خۆیان، وە ئەگەر پاڕایەوە تەنها بۆخۆی نەپاڕێتەوە، ئەگەر ئەوەی کرد خیانەتی لێ کردوون.

**(١٢) کێ ئیمامەتی دروستە:**

دروستە منداڵێك کە خاوەن تەمیز بێت ئیمامەتی بکات، وە کوێر، وە کەسێکی بە پێوە وەستاو ئیمامەتی کەسێك بکات کە دانیشتووە، وە کەسێکی دانیشتوو ئیمامەتی کەسێکی بەپێوە وەستاو بکات، وە کەسێك نوێژی فەرز بکات ببێتە ئیمامی کەسێك سوننەت بکات، وە کەسێك نوێژی سوننەت بکات ببێتە ئیمامی کەسێك کە نوێژی فەرزبکات، وە کەسێك دەستنوێژی هەبێت ببێتە ئیمامی کەسێك تەیەمومی کردبێت، وە کەسێك تەیەمومی کردبێت ببێتە ئیمامی دەستنوێژگر، وە ڕێبوار ببێتە ئیمامی کەسێکی نیشتەجێ، وە نیشتەجێ ببێتە ئیمامی کەسێکی ڕێبوار، وە کەسێکی چاك ببێتە ئیمامی کەسێکی چاکتر لەو، عەمری کوڕی سەلەمە ئیمامەتی بۆ هۆزەکەی کردووە، کاتێ تەمەنی شەش یا حەوت ساڵ بووە، وە پێغەمبەر ﷺ ئیبنوئومی مەکتومی لەجێی خۆی دووجار داناوە نوێژ بۆ خەڵکی مەدینە بکات کە پیاوێکی کوێریش بوو، وە پێغەمبەر ﷺ بەدانیشتنەوە لەدوای ئەبوبەکرەوە نوێژی کردووە کاتی نەخۆشی یەکەی، وە لەماڵەکەی خۆیدا بەدانیشتنەوە ئیمامەتی کۆمەڵێکی کردووە ئەوان بەپێوە وەستاوون، جا ئاماژەی بۆ کردن دابنیشن، کاتێ لەنوێژ بووەوە فەرمووی: (ئیمام بۆ چاو لێ کردن دانراوە کاتێ چووە ڕکوعەوە ئێوەش بچن، کاتێ سەری بەرز کردەوە ئێوەش سەر بەرز بکەنەوە، ئەگەر دانیشت ئێوەش بەدانیشتنەوە نوێژ بکەن لەدوایەوە). (لەمەزهەبی ئیسحاق و ئەوزاعی و ئیبنو موندیر و (ظاهري)یەکاندا دروست نی یە کەسێك توانای بەپێوە وەستانی هەبێت نوێژ بکات لەدوای

---

(١) ئیسنادەکەی (ضعیف)ە و (مضطرب)ە، ووتراوە: لە ئەبوهورەیرەوەیە، وە ووتراوە لە (ثوبان)ەوەیە، پاشان لە سەنەدەکەیدا پیاوێکی تێدایە کە نەناسراو (مجهول)ە، وە ئەمەم ڕوون کردۆتەوە لە (ضعیف سنن أبي داود٣,٢)دا. وە ئیبنو خوزەیمە حوکمی داوە بەسەر بەشی دووەم لە حەدیسەکەدا، کە هەڵبەستراوە، هەروەها ئیبنو تەیمی یەو ئیبنو قەییمیش ئیقراریان بەمە کردووە، ئەمما بەشی یەکەم لە حەدیسەکە ئەوە واتاکەی هاتووە لە حەدیسی تردا، ئیبنو خوزەیمە خۆی هەندێکیانی صەحیح کردووە لە صەحیحەکەی (٣/١١)دا، وە (ابن المنذر) لە (الترغیب ١/١٧٠-١٧١) دا هێناویەتی، هەندێکیان لەم کیتابەدا دێت، (تمام المنة).

کەسێکەوە لەبەر مەعزەرەت بەدانیشتنەوە نوێژ ئەکات، بەڵکو واجبە لەسەری ئەویش وەکو ئەو دابنیشێ بەپێی ئەم (حدیث)ە، بەڵام ئەڵێن: مەنسوخە) (١).

(معاذ) نوێژی خەوتنانی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ ئەکرد لەپاشاندا ئەگەڕایەوە بۆناو هۆزەکەی ئەونوێژەی بۆ ئەکردن، جا نوێژەکەی خۆی نوێژی سوننەت بوو بۆی، وەبۆ ئەوانیش نوێژی فەرزی خەوتنان بوو.

لە میحجەنی کوڕی ئەدرەعەوە هاتووە دەفەرمووێت: چومە لای پێغەمبەر ﷺ لەمزگەوت کاتی نوێژ بوو، پێغەمبەر ﷺ نوێژی بۆ کردن، بەڵام من نوێژم لەگەڵدا نەکردن فەرمووی: (نەئەبوو نوێژ بکەی لەگەڵمان؟) ووتم: ئەی نێرراوی خوا! لە شوێنی خۆم نوێژم کردو پاشان هاتم، فەرمووی: (ئەگەر جارێکی تر ئاوا هاتی نوێژ بکە لەگەڵمان و بیکە بە نوێژی سوننەت).

پێغەمبەر ﷺ کابرایەکی بینی بە تەنها نوێژی ئەکرد، فەرمووی: (کەسێك نی‌یە خێر بەمە بکات و نوێژی لەگەڵدا بکات).

عەمری کوڕی عاص تەیەممومی کردو ئیمامەتی کۆمەڵێکی کرد پێغەمبەریش ﷺ بڕیاری لەسەردا.

پێغەمبەر ﷺ لە کاتی فەتحی شاری مەککە دوو ڕکات دوو ڕکات، جگە لەنوێژی ئێوارە ئیمامەتی خەڵکی ئەکردو ئەیفەرموو: (يَا أهلَ مَكَّةَ قُومُوا فَصَلُّوا رَكعَتَينِ أُخرَيَينِ فَإنَّا قَومٌ سفر) واتە: ئەی دانیشتوانی مەککە هەڵسنەوە دوو ڕکاتەکەی تر تەواو بکەن چونکە ئێمە قەومێکین لەسەفەرداین.

وە ئەگەر موسافیر لەدوای موقیمەوە نوێژی کرد ئەبێت چوار ڕکاتەکە تەواو بکات، با کاتێکیش بەئیمام بگات لەڕکاتێکیش کەمتری مابوو، لەئیبنو عەبباسیان پرسی بۆچی موسافیر ئەگەر بەتەنها نوێژی کرد دوو ڕکات ئەکات، وەئەگەر لەدوای موقیمەوە نوێژی کرد ئەبێ چوار ڕکات بکات ؟ فەرمووی: ئەوە سوننەتە. وە لەمزاراوەیەکی تردا موسای کوڕی سەلەمە پێی ووت: کاتێ لەگەڵ ئێوەدا نوێژمان ئەکرد چوار ڕکاتمان ئەکرد، وەکاتێ گەڕاینەوە دوو ڕکاتمان ئەکرد ؟ فەرمووی: ئەوە سوننەتی ئەبولقاسمە ﷺ. (ئەحمەد گێڕاویەتیەوە).

---

(١) لە مەزهەبی ئیسحاق و ئەوزاعی و ئیبنو مونذیر و (ظاهري)یەکاندا دروست نی‌یە کەسێك توانای بەپێوە وەستانی هەبێت نوێژ بکات لەدوای کەسێکەوە لەبەر مەعزەرەت بەدانیشتنەوە نوێژ ئەکات، بەڵکو واجبە لەسەری ئەویش وەکو ئەو دابنیشێ بەپێی ئەم (حدیث)ە، بەڵام ئەڵێن: مەنسوخە.

**(١٣) کێ ئیمامەتی دروست نیە:**

کەسی مەعزەرەتدار وەك: با ڕانەگر یا میز ڕانەگر یا سك چووی بەردەوام، دروست نیە ببێتە ئیمامی کەسێك کە تەندروست بێت، وە هەروەها دروست نیە ئەمانە ببنە ئیمامی کەسێکی مەعزەرەتدار، بە مەرجێك مەعزەرەتەکەیان وەك مەعزەرەتی خۆیان نەبێت، (بۆ نمونە دروست نیە میزڕانەگر ئیمامەتی با ڕانەگر بکات)، ئەمەش لەلای جەماوەری زانایان[1] بەو شێوەیە. وە مالکیەکان ئەڵێن: ئیمامەتی مەعزەرەت دار دروستە بۆ لەش ساغ بەڵام کەراهەتی هەیە.

**(١٤) موستەحەببە ئافرەت ئیمامەتی ئافرەتان بکات:**

چونکە عائیشە خوا لێی ڕازی بێت ئیمامەتی بۆ ئافرەتان ئەکردو لەناو ڕیزەکەدا ئەوەستا لەگەڵیان، وە ئوموسەلەمەش ئیمامەتی ئافرەتانی ئەکرد، وە پێغەمبەر ﷺ وەرەقەی کردبووە بانگبێژی ئوموسەلەمە بانگی بۆ ئەدا، وەفەرمانی بە ئومو سەلەمە کردبوو لەفەرزەکاندا ئیمامەتی ئەهلی ماڵەکەی بکات.

**(١٥) تەنها بۆ پیاو هەیە ببێتە ئیمامی ئافرەتان، نەك ئافرەت ئیمامەتی پیاوان بکات:**

ئەبویەعلاو (طبراني) لە (الأوسط) دا بەسەنەدی حەسەن ئەگێڕنەوە کە ئوبەی کوڕی کەعب هاتە لای پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی نێرراوی خوا ئەمشەو کارێکی سەیرم کرد، فەرمووی: (چی بوو؟) فەرموی: کۆمەڵێك ئافرەت لەماڵێ وتیان: تۆ قورئان خوێنی، ئێمە قورئان نازانین ئیمامەتیمان بۆ بکە، منیش هەشت ڕکات نوێژم بۆ کردن لەگەڵ نوێژی وەتردا، ئەڵێ: پێغەمبەر ﷺ قسەی نەکرد، بینیمان قسەنەکردنەکەی نیشانەی ڕازی بوونی بوو.

**(١٦) ئیمامەتی کردنی فاسیق و موبتەدیع کەراهەتی هەیە:**

بوخاری ئەگێڕێتەوە کە ئیبنوعومەر لەدوای حەججاجەوە نوێژی کردووە، وە موسلیم ئەگێڕێتەوە کە ئەبوسەعیدی خودری لەدوای مەروانەوە نوێژی جەژنی کردووە، هەروەها ئیبنومەسعود لەدوای

---

(١) هیچ ڕوویەك نیە بۆ کەراهەت چ جای دروست نەبوون، ئەگەر مەرجەکانی شایەنتری تێدا بێت بۆ ئیمامەت، وە ئێمە هیچ جیاوازییەك نابینین لە نێوان ئەم و کوێرێك کە ناتوانێت خۆی بپارێزێت لە میز، وەك پاراستنی چاوساغ، و دانیشتوێك کە ناتوانێ هەستێ، لەکاتێکدا هەستان ڕوکنە، لەبەر ئەوەی هەرکامێکیان کارێکیان کردووە کە لە توانایاندا نەبووە، وە ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا﴾ و ئیمامی شەوکانی باس و بەدوا چوونێکی گرنگی هەیە لە دروستی نوێژ لە دوای موسڵمانی فاسق و منداڵی بالغ نەبووەوە، و کەسێك کەم و کوڕی هەیە لە خاوێنی نوێژ و جگە لەمانەش، جا بگەڕێوە بۆ کیتابی (السیل الجرار ١/٢٤٧-٢٥٥) چونکە کیتابێکی زۆر بە نرخە.

وەلیدی کوڕی عوقبەی کوڕی (معیط)ەوە - نوێژی کردوە - وە ئەو عارەق خۆر بوو، بەیانی‌یەکیان چوار ڕکات نوێژی بۆ کردن، وە (عثمان)ی کوڕی عەففان دارکاری کرد لەسەر ئەوە.

صەحابەو تابعین لەدوای ئیبنوعوبەیدەوە نوێژیان کردووە هەرچەندە تاوانبار بوو بە ئیلحاد، وە بانگەوازی بۆ گومڕایی ئەکرد، وە ئەوبنەمایەی زانایان بۆی چوون ئەوەیە: هەرکەس بۆخۆی نوێژی دروست بێت بۆ کەسێکی تریش ئیمامەتی بکات هەردروستە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ووتویانە: نوێژ کردن کەراهەتی هەیە لەدوای فاسیق و موبتەدیعەوە، بەپێی ئەوەی ئەبوداودو ئیبنو حیببان گێڕاویانەتەوە، وە ئەبوداودو (منذري)ش بێدەنگن لەسەری[1].

لە سائیبی کوڕی خەللادەوە ئەگێڕنەوە پیاوێك ئیمامەتی کۆمەڵێکی کرد، بۆلای قیبلەوە تفێکی کرد، پێغەمبەر ﷺ سەیری ئەکرد، فەرمووی: (نابێت جارێکی تر ئیمامەتیتان بۆ بکات)، دوای ئەوە ویستی ئیمامەتی بکات نەیان هێشت و فەرمایشتەکەی پێغەمبەریان پێ ڕاگەیاند، ئەویش هات بۆ پێغەمبەری گێڕایەوە فەرمووی: (بەڵێ... تۆ ئازاری خواو پێغەمبەرەکەیت داوە).

**(١٧) دروستە جیابوونەوە لە ئیمام لەبەر مەعزەرەت:**

دروستە کەسێك لەگەڵ ئیمامدا نوێژ دابەستێ و لەنوێژەکە دەرچێ بەنییەتی جیابوونەوە لەئیمام و خۆی بەتەنها نوێژەکەی تەواو بکات، کاتێ ئیمام درێژەی زۆری بەنوێژەکەدا، وە لە چەند حاڵەتی تریشدا، وەك ڕوودانی نەخۆشی و ترسی وون بوونی ماڵ، یا لەناوچوونی، یا هاوڕێ لەدەس چوون، یا هاتنی خەوی زۆر، ئەمانەو وێنەی ئەمانە هەموو ئەخرێنە پاڵ ئەو درێژە پێدانەو وەکو ئەو وان، بەپێی ئەوەی جەماعەت لەجابیرەوە خوا لێی ڕازی بێت ئەگێڕنەوە کە دەفەرموێت: (معاذ) نوێژی خەوتنانی لەدوای پێغەمبەرەوە ﷺ ئەکرد، پاشان ئەگەڕایەوە بۆناو هۆزەکەی بەرنوێژی بۆ ئەکردن، جا پێغەمبەر ﷺ خەوتنانی دوا خست (معاذ) نوێژی لەگەڵدا کرد، پاشان گەڕایەوە بۆلای هۆزەکەی، نوێژی پێ‌کردن و سوڕەتی (البقرة)ی تێدا تەواو کرد، پیاوێك لێی جیا بۆوە بەتەنها نوێژەکەی کرد، لەبەر ئەوە پێیان ووت: تۆ مونافیقی ئەکەیت فلان کەس، ووتی: مونافیقی ناکەم، بەڵام ئەبێ بچمە لای پێغەمبەر ﷺ بۆی بگێڕمەوە. کاتێ هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و بۆی گێڕایەوە، پێغەمبەر ﷺ بە (معاذ)ی فەرموو: (ئەی (معاذ) توخەڵك لەدین هەڵئەگێڕیتەوە؟ ـ دوو جار ئەمەی فەرمو ـ سوڕەتی ئەوەو ئەوە بخوێنە).

---

(١) شێخ ئەلبانی ڕەحمەتی خوای لێ بێت لە (صحیح الترغیب والترهیب)دا دەفەرموێت صەحیحە.

**(١٨) ئەو بەڵگانەی هاتوون دەربارەی نوێژکردنەوە لەگەڵ جەماعەتدا:**

**لە یەزیدی ئەسوەدەوە هاتوە دەفەرمووێت: لە مینا لەدوای پێغەمبەرەوە ﷺ نوێژی بەیانیمان کرد دوو پیاو هاتن لای وولاغەکانیان وەستان، پێغەمبەر ﷺ ناردی بەدوایاندا هێنایانن، دەمارەکانیان لەترسا هەڵئەفری، فەرمووی: (چی رێی ئەوەی لیّ گرتن لەگەڵ خەڵکەکە نوێژ بکەن... ئایا ئێوە موسڵمان نین؟) ووتیان: بەڵێ ئەی نێرراوی خوا، بەڵام لەشوێنەکانمان نوێژمان کردبوو، ئەویش ﷺ فەرمووی: (ئەگەر لەشوێنی خۆتان نوێژتان کردو هاتن ئیمام نوێژی دابەستبوو، ئێوەش لەگەڵیا نوێژ بکەن، ئەو نوێژە بۆ ئێوە بە سوننەت ئەنووسرێ). (ئەحمەدو ئەبوداود ریوایەتیان کردووە).**

**هەروەها نسائی و (ترمذي) ش ریوایەتیان کردووە بە لەفزی: (هەرکاتێ لەشوێنەکانی خۆتان نوێژتان کرد پاشان هاتن بۆ مزگەوت جەماعەتیان ئەکرد نوێژیان لەگەڵا بکەن، چونکی ئەو نوێژە بۆتان ئەبێتە سوننەت). (ترمذي) دەفەرمووێت: حەدیسێکی حەسەن و صەحیحە، وە (ابن السکن)یش بە صەحیحی داناوە. لەم حەدیسەدا بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە دووبارە کردنەوەی نوێژ لەگەڵ جەماعەتدا بەنییەتی نوێژی سوننەت شەرعی‌یە بۆ ئەوکەسانەی ئەونوێژە فەرزەیان بەجەماعەت یا بەتاك کردووە کاتێ ئەگەن بەجەماعەتدا لەمزگەوتێکی تر.**

**وە ریوایەت کراوە کە حوزەیفە نیوەڕۆو عەسرو ئێوارەی لەگەڵ جەماعەتێکی تردا دووبارە ئەکردەوە هەرچەندە بەجەماعەت کردبووی، هەروەها لەئەنەسەوە ریوایەت کراوە کە خۆی لەگەڵ ئەبوموسادا نوێژی بەیانی کردووە لەسەر خەرمان، پاشان چوونە مزگەوت نوێژ دابەسترابوو هەردووکیان نوێژەکەیان دووبارە کردەوە، بەرنوێژەکە موغیرەی کوڕی شوعبە بوو.**

**بەڵام ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا تُصَلُّوا صَلاةً فِي يَومٍ مَرَّتَينِ) واتە: نوێژێکی فەرز لە ڕۆژێکدا دووجار مەکەن. (ابن عبدالبر) دەفەرمووێت: ئەحمەدو ئیسحاق لەسەر ئەوە رێکن کە مەبەستی لە پیاوێکە نوێژە فەرزەکان بکات پاشان هەڵسێت بچێت ئەو نوێژە هەر بەنییەتی فەرز دووبارە بکاتەوە، بەڵام کەسێك لەگەڵ جەماعەتێکی تر نوێژەکە بەنییەتی سوننەت دووبارە بکاتەوە بەپێی ئیقتدا بە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ ئەوە دووبارە کردنەوەی نوێژ نی‌یە لەڕۆژێکدا، چونکە یەکەم فەرز بووەو دووەم سوننەت، کەواتە دووبارەکردنەوە نی‌یە.**

**(١٩) موستەحەببە ئیمام دوای سلاوْدانەوە بەلای ڕاست یا بەلای چەپدا بجولێت پاشان شوێنەکەی بەجێ بهێڵێت:**

بەپێی ئەوەی (قبیصة) ی کوڕی هەلەب لەباوکی‌یەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ بەرنوێژی بۆ ئەکردین، پاشان بەلای ڕاست یاچەپدا بووایە شوێنەکەی بەجێ ئەهێشت. (ئەبوداودو ئیبنوماجەو (ترمذي) گێڕاویانەتەوە وە (ترمذي) دەفەرمووێت: حەدیسێکی حەسەنە).

وە زانایان لەسەر ئەوە ئەڕۆن کە بەرنوێژ ئارەزووی خۆیەتی بە هەر لایەکدا بڕوات، وە هەردوو لایەکە لەپێغەمبەرەوە ﷺ بەصەحیحی هاتوون.

عائیشە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ سلاوی نوێژەکەی ئەدایەوەئەوەندە دائەنیشت هەتا ئەیفەرموو: (اللَّهُمَّ أنتَ السَّلامُ وَمِنكَ السَّلامُ تَبَارَكتَ يَا ذَا الجَلالِ وَالإِكرَام) (ئەحمەدو موسلیم و (ترمذي) و ئیبنوماجە گێڕاویانەتەوە).

بەڵام دوای نوێژی ئێوارەو بەیانی ئەو شوێنە نابێت بەجێ بهێڵێت: هەتا دە جار نەڵێت: (لا إِلَهَ إلا اللهُ وَحدَهُ لاشَرِيكَ لَهُ، لَهُ المُلكُ وَلَهُ الحَمدُ يُحيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ على كُلِّ شَيءٍ قَدِير)، چونکە ئەو (فضيلة)ەی دامەزراوە لەسەر کردنی ئەوکارە، بەستراوە بە ووتنی ئەوەوە پێش ئەوەی قاچی لا ببات.

وە لای ئەحمەدو بوخاری هاتووە لە ئوموسەلەمەوە کە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ سلاوی ئەداوە ژنەکان هەڵئەسان ئەڕۆیشتن کاتێ لەسلاوْدانەوە ئەبۆوە لەجێی خۆی ئەمایەوە ماوەیەکی کەم پێش ئەوەی هەڵسێت. دەفەرمووێت: ئێمە وامان دەبینی (والله أعلم) ئەم کارە بۆ ئەوە بوو ئافرەتەکان بڵاوەی لێ بکەن بەر لەوەی پیاوان فریایان بکەون.

**(٢٠) بەرزی شوێنی ئیمام یا مەئموم:**

کەراهەتی هەیە ئیمام لەشوێنێکدا بووەستێت بەرزتربێت لەنوێژکەران، لە ئەبومەسعودی ئەنصاری‌یەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردبوو ئیمام لەسەر شتێك بێت خەلکەکەش لەدوایەوە بن، (واتە: لەو نزمتر بن). (دارقطني) گێڕاویەتی‌یەوە، و (حافظ) لە (الفتح) دا بێ‌دەنگە لێی)[١].

لە هەمامی کوڕی (حارث)ەوە هاتوە کە دەفەرمووێت: (حذيفة) لە مەدائین (کە شارێکە) لەسەر بەربەستێکی بەرز ڕاوەستابوو بەرنوێژی ئەکرد بۆ کۆمەڵێك، ئەبومەسعود کراسەکەی گرت

---

(١) منیش دەڵێم: ئیسنادەکەی حەسەنە، وە بە سەنەدێکی صەحیح هاتووە لەلای ئەبو داود و جگە لەمیش، کە لە پاش ئەم حەدیسەدا باسی هاتووە، کە ئەمیش لە (صحيح أبي داود ٦١٠) دا تەخریج کراوە، بڕوانە (المشكاة ١١١٢).

و ڕای کێشا، کاتێ لەنوێژ بووەوە فەرمووی: نازانی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ئەو شێوە وەستانەیان قەدەغە ئەکرد؟ فەرمووی: بەڵێ ئەزانم بەڵام کاتێ ڕات کێشام بیرم کەوتەوە. (ئەبوداودو بەیهەقی و شافیعی گێڕاویانەتەوە، وە حاکم و ئیبنوخوزەیمەو ئیبنو حیببان بەصەحیحیان داناوە).

بەڵام ئەگەر بەرنوێژ مەبەستێکی هەبێت لەو بەرزێتییە، کەراهەتی نییە، لەسەهلی کوڕی سەعدی ساعیدییەوە هاتوە دەفەرموێت: پێغەمبەرم ﷺ بینیوە لەسەر مینبەر، کە یەکەم ڕۆژ بوو دانرابوو، دانیشتبوو، هەڵسا لەسەر ئەو مینبەرەوە (الله أكبر) ی کردو نوێژی دابەست پاشان چووە ڕکوعەوە، لەپاشاندا دووابەدووا گەڕایەوە لەبن مینبەرەکەدا سەجدەی برد، لەپاشاندا گەڕایەوە کاتێ لەنوێژ بووەوە ڕووی کردە خەڵکەکەو فەرمووی: (أَيُّهَا النَّاس! إنَّمَا صَنَعتُ هَذَا لِتَأتَمُّوا بِي وَلِتَتَعَلَّمُوا صَلاتِي) (رواه أحمد والبخاري ومسلم). واتە: ئەی خەڵکینە من بۆیە ئەمەم کرد هەتا چاوم لێ بکەن و فێری چۆنییەتی نوێژکردنەکەم بن.

بەڵام بەرزییەتی مەئموم بەسەر ئیمامدا دروستە بەپێی ئەوەی سەعیدی کوڕی مەنصورو شافیعی و بەیهەقی ئەگێڕنەوە، وە بوخاری بە موعەللەقی لە ئەبوهورەیرەوە کەلەسەر بانی مزگەوت نوێژی کردووەو ئیمام لەخوارەوە بووە.

لە ئەنەسەوە هاتووە کە لە بەصرە لە ماڵی ئەبونافیع لەلای ڕاستی مزگەوتەکەوە لەژوورێکدا کە باڵایەك بەرز بوو، وە دەرگایەکی تێدابوو ئەیڕووانی بەسەر مزگەوتەکەدا ئەنەس لەوێدا جەماعەتی ئەکردو ئیقتیدای ئەکرد بەئیمام، وە صەحابە بێ دەنگ ئەبوون لێی. (سەعیدی کوڕی مەنصور لەسونەنەکەیدا گێڕاویەتییەوە).

شەوکانی دەفەرموێت: ئەمما بەرز بوونی مەئموم ئەگەر هاتوو زۆر بوو بەجۆرێ لەسەرووی سێسەد زیراعەوە بێ کە ئاگای لە کردەوەکانی ئیمام نەبێت، ئەوە قەدەغەیە بە کۆی هەموو زانایان، بێ ئەوەی جیاوازی هەبێ لەنێوان مزگەوت و غەیری مزگەوتدا، بەڵام ئەگەر لەوە کەمتر بوو ئەصل ئەوەیە کە دروستە، هەتا بەڵگەیەك دەرئەکەوێت بۆ قەدەغە بوونی[1].

---

(١) ئەمەی لە شەوکانییەوە نەقڵ کردووە منیش دەڵێم: چەند ئاسارێکی تر لەبەرامبەر ئەم ئاسارانە دەوەستن، لە عومەرو شەعبی و ئیبراهیمەوە هاتوە، لە لای ئیبنو ئەبی شەیبە ٢/٢٢٣) و عبد الرزاق (٣/٨١-٨٢): ئەمەی بۆ نییە ئەگەر لە نێوان خۆی و ئیمامەکەیدا ڕێگا، یان لە شێوەی ئەمانە هەبێت.

وە ڕەنگە ئەوەی لەو ئاسارانەی یەکەمدایە حەمل کرابێت لەسەر عوزر و دەست پێچ، وەك پڕ بوونی مزگەوت هەروەك هیشامی کوڕی عوروە دەفەرموێت: جارێکیان من و باوکم هاتین تەماشامان کرد مزگەوت پڕە، جا لە خانوێکدا نوێژمان کرد بە نوێژی ئیمامەکە، ڕێگایەك لە نێوان خانوو مزگەوتەکەدا بوو، عبد الرزاق ریوایەتی کردووە (٣/٨٢) بە سەنەدێکی صەحیح لەوەوە. وە لەلای (فقیە)و شارەزا شاراوە نییە کە بە (مطلق)ی ووتن بە

وە ئەوەی ئەم ئەصڵە بەهێز ئەکات کردەوەکانی ئەبوهورەیرەیە کە لەپێشەوە باسمان کرد بۆ ئەوەی کەسێك ئینکاری لێ کردبێت.

**(٢١) ئیقتیدای مەئموم بەئیمام لەگەڵ بوونی بەربەست لەنێوانیاندا:**

دروستە مەئموم ئیقتیدا بکات بە ئیمامەوە باشتێکی وەك دیواریش لەنێوانیاندا هەبێت، بەمەرجێك ئەو مەئمومە ئاگای لە هەڵسو کەوتەکانی ئیمام بێت بە بینین یا بە بیستن[١].

بوخاری دەفەرمووێت: حسەن دەفەرمووێت: ئەگەر لەنێوان خۆت و ئیمامدا ڕووبارێك هەبوو ئیقتیدا پێ کردنی خراپ نیێە، ئەبومیجلەز دەفەرمووێت: ئەگەر ڕێگا یا دیوار هەبوو لەنێوان ئیمام و مەئمودا دروستە ئیقتیدا بەو ئیمامەوە بکرێت و نوێژ بکرێت، بەمەرجێك مەئموم گوێ بیستی نوێژ دابەستنی ئیمام بێت. تەواو.

وە لە پێشەوە باسی حەدیسی نوێژی پێغەمبەر ﷺ کرا کە خەڵك لەدوای حوجرەکەوە نوێژیان بەنوێژەکەی ئەکرد[٢].

---

دروستیەتی ئەم کارە، بە پێچەوانەی ئەو حەدیسانەیە کە فەرمان بە گەیاندن و نەهێشتنی بۆشایی دەکات لە نێوان صەفەکاندا، کە دەبێت هەر مولتەزیم بی پێوەی و کاری پێ بکەیت، مەگەر لەبەر عوزرێك، هەر بۆیە شێخی ئیسلام لە (الفتاوى ٢٣/٤١٠) دا دەفەرمووێت: نابێت صف ببەسترێت لە ڕێگاو بانو دوکانەکاندا، لەگەڵ بوونی جێگا لەناو مزگەوتدا، جا هەرکەسێك ئاوای کرد دەبێت تەمێ بکرێت، وە بۆ ئەو کەسە هەیە کە دێت لە دوایەوە بەسەر ملیا بڕوات، بۆ ئەوەی صەفەکانی پێشەوە پڕ ببێتەوەو ئەم کارەش حەرامی تێدا نیێە، دەفەرمووێت: جا ئەگەر مزگەوتەکە پڕ بوو بە صەف ئەوە لە دەرەوەی مزگەوت صەف ببەستن، جا ئەگەر صەفەکان گەیاندرا بە یەکتر لە ڕێگا و بان وبازاڕەکاندا ئەوە نوێژەکەیان دروستە، وە ئەگەر صەفیان بەست و لە نێوان ئەوان و صەفەکەی پێشەوەیان ڕێگایەك بوو خەڵکی پیا دەڕۆیشت نوێژەکەیان دروست نیێە، لەسەر ئاشکرا ترین ووتەی زانایان، هەروەها ئەگەر نێوانیان و نێوان صەفەکانی تر دیوارێك هەبوو بە شێوەیەك صەفەکانی تری نەئەبینی، بەڵام بەبێ هیچ وەسیلەیەك گوێ بیستی (الله أكبر)ەکان دەبوو، ئەوە لەسەر ئاشکراترین ووتە نوێژەکە دروست نیێە، وە هەروەها هەرکەسێك نوێژی لە دوکانێکدا کرد کە بەرامبەر مزگەوتەکەیەو ڕێگا لەنێوانیاندایەو کەسی لێ نیێە و چۆڵە ئەو نوێژە دروست نیێە، هەروەها دروست نیێە هەر لەوێ بمێنێتەوەو چاوەڕێ بێت صەفەکان پێی بگەنەوە، بەڵکو پێویستە لەسەری بڕوات بۆ مزگەوت، صەفی یەکەم پڕ بکاتەوە پاشان ئەوی تر ئەنجا ئەوی تر. (تمام المنة).

(٢) زانایان فەتوایان داوە ئیقتدا کردن بە ڕادیۆ دروست نیێە.

(٢) منیش دەڵێم: ئاماژە بۆ حەدیسی عائیشەی پێشوو دەکات کە لە یەکەمی (قیام رمضان) دا هات، بەڵام باسی (الحجرة) ی تێدا نیێە و ئەمەش تەخریج کراوە لە صەحیحی ئەبی داود (١٢٤٣)دا بەڵکو ئەمە لە ڕیوایەتی بوخاریە.

**(٢٢) حوکمی نوێژ کردن لەدوای کەسێکەوە کە فەرزێك لە فەرزەکانی نوێژ واز لێ بهێنێ:**

ئیمامەتی کەسێك دروستە ئەگەر مەرجێك یا پایەیێکی نوێژەکەی تێك دا، بە مەرجێك مەئمومەکە خۆی ئەو مەرجە یا ئەو پایەیەی نوێژەکەی تەواو بەجێ هێنابێت، و نەیزانی بێت ئیمامەکەی نەیکردووە، بەپێی ئەوەی ئەبوهورەیرە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (يُصَلُّونَ بِكُم، فَإن أصَابُوا فَلَكُم وَلَهُم، وَإن أخطَأوا فَلَكُم وَعَلَيهِم) (رواه أحمد والبخاري). واتە: ئیمامەکان بەرنوێژیتان بۆ ئەکەن ئەگەر باشیان پێکا ئەوە خێری بۆ ئێوەو خۆشیان هەیە، بەڵام ئەگەر نەیان پێکاو هەڵەیان کرد، ئەوە خێرەکەی بۆ ئێوە هەر هەیە و هەڵەکەی بۆ ئەوانە.

لە سەهلەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: لەپێغەمبەرم بیستووە ﷺ فەرمویەتی: (الإمَامُ ضَامِنٌ فَإن أحسَنَ فَلَهُ وَلَهُم، وَإن أسَاءَ فَعَلَيهِ) (رواه ابن ماجة). واتە: بەرنوێژ زامنە ئەگەر بەچاکی نوێژەکەی کرد خێری بۆخۆی و ئەوانە، ئەگەر بەخراپی کردی سزاکەی هەر لەسەر خۆیەتی بێ ئەوان.

بە صەحیحی هاتووە کە جارێك عومەر خوا لێی ڕازی بێت، لەشی گران ئەبێت نوێژ بۆ خەڵکەکە ئەکات و ئاگای لەخۆی نابێت، کاتێ لەنوێژەکە ئەبێتەوە بیری ئەکەوێتە، جا نوێژەکەی دووبارە کردەوە بەڵام ئەوان نوێژەکەیان دووبارە نەکردەوە.

**(٢٣) جێ‌نشین دانانی ئیمام:**

ئەگەر ئیمام لەنوێژەکەدا مەعزەرەتێکی بۆ هاتە پێش وەك ئەوە وەبیری هاتەوە کە ڕووداوی لێ ڕوودابوو، یا ڕووداوی لێ ڕوودا، بۆی هەیە کەسێك دوای خۆی ڕابکێشێتە جێگای خۆی بۆ ئەوەی نوێژەکەیان بۆ تەواو بکات.

لە عەمری کوڕی مەیمونەوە هاتووە دەفەرمووێت: ئەو بەیانی‌یەی دەستیان لە عومەر وەشاند خوا لێی ڕازی بێت لە نێوان من و ئەودا عبداللە ی کوڕی عەبباس وەستابوو هەرئەوەندە نوێژی دابەست گوێم لێ بوو فەرمووی: سەگەکە کوشتمی یا خواردمی، کاتێك خەنجەرەکەی لێدا، پاشان عومەر خوا لێی ڕازی بێت خۆی عبدالرحمن ی کوڕی عەوفی ڕاکێشایە پێشەوە، ئەویش نوێژێکی کورتی بۆ کردن، (بوخاری گێڕاویەتی‌یەوە).

---

وە ئەوەی پێویستە ئاگاداری بۆ بکرێت مەبەست بە لەفزی (الحجرة) ئەوە نی‌یە کە دێت بە مێشکدا لە یەکەم بیستندا، کە ماڵەکەیتی ﷺ بەڵکو مەبەستی بەو حەسیرەیە کە بەشەو بەکاری ئەهێنا لە مزگەوتدا، هەروەك (حافظ) بە پشت بەستن بە هەندێ ریوایەت لەم حەدیسەدا ئەم فائیدەیەی بەخشیوە، بڕوانە لە کتێبەکەم (مختصر صحيح البخاري ٣٩٨). و تەعلیق دانەکەی کە لەسەری هەیە. (تمام المنة).

له ئەبورەزینەوە هاتووە: جارێك عەلی خوا لیێ ڕازی بێت بەرنوێژمان بوو خوێنی لووتی بەربوو دەستی پیاوێکی لەدوای خۆیەوە گرت و هێنایە جێی خۆی و خۆی ڕۆیشت. (سەعیدی کوڕی مەنصور گێڕاویەتیەوە).

ئەحمەد دەفەرمووێت: ئەگەر ئیمام جێ نشینی دانا، خۆ عومەر و عەلیش خوا لیێان ڕازی بێت ئەوەیان کردووە، وە ئەگەر دای نەناو خەڵکەکە بۆخۆیان نوێژیان کرد ئەوە موعاویە کاتێ بریندار کرا جێ نشینی دانەنا خەڵکەکە بۆخۆیان بێ بەرنوێژ نوێژەکەیان تەواو کرد.

**(٢٤) کەسێك بەرنوێژی کۆمەڵێك بکات و خۆشیان نەوێت:**

چەندین (حدیث) هاتووە قەدەغەی ئەوە ئەکات کە کەسێك بەرنوێژی کۆمەڵێك بکات و ئەوان خۆشیان نەوێت، وە ئەبێت ئەو خۆشنەویستنەیان لەبەر ئاین بێت، و هۆیەکی شەرعی بێت.

له ئیبنو عەبباسەوە خوای لیێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ثَلاثَةٌ لاتُرفَعُ صَلاتُهُم فَوقَ رُؤسِهِم شِبراً، رَجُلٌ أَمَّ قَوماً وَهُم لَهُ كَارِهون، وَامرَأَةٌ بَاتَت وَزَوجُهَا عَلَيهَا سَاخِطٌ، وَأَخَوَانِ مُتَصَارِمَانِ) (رواه ابن ماجة، قال العراقي: إسناده حسن) واتە سێ جۆر کەس نوێژەکانیان بستێك لەسەریان بەرز نابێتەوە: پیاوێك بەرنوێژی کۆمەڵێك بکات ئەوان ڕقیان لیێ بێت، ژنێك شەو ڕۆژ بکاتەوەو پیاوەکەی لیێ زویر بێت، دوو برا هەمیشە شەڕیان بێت لەگەڵ یەکدا.

له عبدالله ی کوڕی عەمرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ثَلاثَةٌ لايَقبَلُ اللهُ مِنهُم صَلاةً، مَن تَقَدَّمَ قَوماً وَهُم لَهُ كَارِهُونَ، وَرَجُلٌ أتى الصَّلاةَ دُباراً، وَرَجُلٌ اعتَبَدَ مُحَرَّرَهُ) (رواه ابوداود وابن ماجة)[1]. واتە: خوا نوێژی سێ جۆر کەس وەرناگرێت ؛ پیاوێك بەرنوێژی کۆمەڵێك بکات ئەوان ڕقیان لیێ بێت، وە پیاوێك نەچێت بەلای نوێژەکەیەوە هەتا نوێژەکەی ئەچێت، وە پیاوێك ئەو بەندەیەی کە ئازادی کردوە دووبارە بیگێڕێتەوە بۆ بەندەیی.

(ترمذي) دەفەرمووێت: کۆمەڵێك لەزانایان بەکەڕاهەتیان داناوە کە کەسێك بەرنوێژی خەڵکێك بکات ڕقیان لیێ بێ، جا ئەگەر ئەو بەرنوێژە بێ تاوان بوو ئەوە ئەوان تاوان بار ئەبن، وە گوناهەکەی لەسەر ئەوان ئەبێت.

---

(١) ئەم حەدیسە ئیسنادەکەی لاوازە نادیارێکی تێدایە. لەگەڵ لاوازێکدا، هەروەك بە ڕوون کراوەیی دەی بینی لە (المشكاة ١١٢٣) و (ضعيف أبي داود ٩٢) دا بەڵام برگەی یەکەمی صەحیحە، چەند شاهیدێکی هەیە کە تەخریجم کردووە لە (صحيح أبي داود ٦٠٧)دا لەوانە حەدیسی ئیبنو عەبباس کە لە پێشاندا باس کرا (تمام المنة).

## شوێنی وەستانی ئیمام و مەئموم

**١- موستەحەبە شوێنی وەستانی تاکەکەسێك لای ڕاستی ئیمام بێت و دووان بەرەو ژوور لەدوایەوە بێت:**

بەپێی ئەوەی جابیر دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ هەڵسا بۆ نوێژ کردن منیش هەڵسام بۆ نوێژ کردن، و لای چەپی‌یەوە ڕاوەستام، دەستی گرتم و خستمی‌یە لای ڕاستی‌یەوە، پاشان جابیری کوڕی صەخر هات لای چەپی‌یەوە وەستا پێغەمبەر ﷺ دەستی هەردووکمانی گرت و پاڵی پێوە ناین هەتا لەدوایەوە وەستاندینی. (موسلیم و ئەبوداود گێڕاویانەتەوە).

وە ئەگەر ئافرەتێك حازری نوێژی جەماعەت بوو ئەبێ بە تەنها لەدوای ڕیزی پیاوەکانەوە بووەستێت، وە نابێت لەڕیزی پیاوەکاندا بووەستێت، بەڵام ئەگەر بەپێچەوانەوە کاری کرد نوێژەکەی دروستە لای جەماوەری زانایان، ئەنەس دەفەرمووێت من و هەتیوێك لەدوای پێغەمبەرەوە ﷺ نوێژمان ئەکرد ئومو سولەیمی دایکم لەدوای ئێمەوە وەستابوو، وە لە زاراوەیەکی تردا هاتووە دەفەرمووێت: من و هەتیوەکە لەدوای پێغەمبەرەوە بەڕیز وەستابووین وە پیرەژنەکەش لەدوای ئێمەوە، (بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە).

**٢- (إستحباب) پەسەندی‌یەتی وەستانی ئیمام بەرامبەر ناوەڕاستی ڕیزەکان و نزیك بوونەوەی پیاوماقوڵەکان لە ئیمام:**

بەپێی ئەوحەدیسەی ئەبوهورەیرە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (وَسِّطُوا الإمَامَ وَسُدُّوا الخَلَلَ) (رواه أبو داود وسكت عنه هو والمنذري)[1]. واتە بەرنوێژ بخەنە ناوەڕاستی خۆتان و بۆشایی‌یەکان (لەنێوان یەکتردا) پڕ بکەنەوە.

لە ئیبنو مەسعودەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لِيَلِيَنِي مِنكُم أولُوا الأحلامِ وَالنهى، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُم، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُم، وَإيَّاكُم وَهيشاتِ الأسوَاقِ) (رواه أحمد ومسلم وأبوداود والترمذي). واتە: با خاوەن ئاوەزو بیرەکان لێم نزیك بن، پاشان ئەوانی دوواتر لەوان، پاشان ئەوانی دوواتر لەوان، وە نەکەن دەنگە دەنگتان لێ بێ وەك دەنگە دەنگی خەڵکی ناوبازاڕ.

لە ئەنەسەوە هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ حەزی ئەکرد هەمیشە موهاجیرین و ئەنصار لەنزیکی‌یەوە بن، بۆ ئەوەی شتی لێ وەربگرن. (ئەحمەدو ئەبوداود گێڕاویانەتەوە)[1].

---

(١) ئیسنادەکەی لاوازە دوو نادیاری تێدایە، و (عبد الحق الإشبيلي) (تضعيف) ی کردووە، بەڵام بەشی دووەمی (حديث)ەکە شاهیدی هەیە لە حەدیسی ئیبنوعومەردا، بڕوانە (الترغيب ١/١٧٣)، پاشان ئەم حەدیسەم تەخریج کردووە لە صەحیحی ئەبی داود (٦٧٢)دا، وە یەکێمیان لە (ضعيف أبي داود ١٠٦)دا. (تمام المنة).

وە حیکمەت لەوەدا ئەوەیە ئەوجۆرە کسانە شت لەئیمامەوە وەربگرن، ئەگەر هەڵەیەکی کرد ئاگاداری بکەنەوە، وە کاتێ پێویستی کرد یەکێ لەوانە بچێتە جێگەکەی، وە نوێژەکە تەواو بکا.

**٣- شوێنی وەستانی ئافرەتان و منداڵان لەگەڵ پیاواندا:**

پێغەمبەر ﷺ کاتێ نوێژکەرانی ڕیز ئەکرد پیاوەکانی ئەخستە پێش منداڵەکان و منداڵەکانی لەدوای پیاوەکانەوە ڕیز ئەکرد، ئافرەتەکانیشی ئەخستە دوای منداڵەکانەوە. (ئەحمەدو ئەبوداود گێڕاویانەتەوە)[٢].

جماعەت جگە لەبوخاری لەئەبی هورەیرەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (خَيْرُ صُفُوفِ الرِّجَالِ أَوَّلُهَا، وَشَرُّهَا آخِرُهَا، وَخَيْرُ صُفُوفِ النِّسَاءِ آخِرُهَا، وَشَرُّهَا أَوَّلُها) واتە: باشترین ڕیزی پیاوان ڕیزی یەکەمەو خراپترینی دواڕیزە، وە چاکترین ڕیزی ئافرەتان دووا ڕیزە و خراپترینیان ڕیزی یەکەمیانە.

بۆیە چاکترین ڕیزی ژنان دووا ڕیزە لەبەر ئەوەی لەتێکەڵ بوونی پیاوان بەدوور ئەبن، بەپێچەوانەی ئەوانەوە کە لە ڕیزی یەکەمی ژنەکاندان، چونکە ئەمان گومانی تێکەڵ بوونیان هەیە لەگەڵ پیاواندا.

وە ئەگەر منداڵێك بەتەنها بوو ئەچێتە ڕیزی پیاوانەوەو بە تەنها ناوەستێ.

**٤- نوێژی تاکەکەس لەدوای ڕیزەوە:**

هەرکەس لەدوای ڕیزەکانەوە بەتەنها نوێژی دابەست، پاشان چووە ناو ڕیزەکەوەو گەیشت بە ئیمام لە ڕکوعدا ئەوە نوێژەکەی دروستە.

لە (أبوبكرة)ەوە هاتوە دەفەرموێت: گەیشتم بە پێغەمبەر ﷺ لە ڕکوعدا بوو منیش پێش ئەوەی بگەمە ڕیزەکە ڕکوعم بردو بەرکوع بردنەوە چوومە ناو ڕیزەکەوە، ئەوەم بۆ پێغەمبەر ﷺ

---

(١) دانە پاڵ ئەبوداود هەڵەیە چونکە لە سوننەنەکەیدا ریوایەتی نەکردووە، وە دانەر حەدیسەکانی ئەم بەشەی لە (المنتقى)ەوە نەقڵ کردووە، وە دانەریش لە تەخریجەکەیدا ووتویەتی: (رواه أحمد وابن ماجة) وە ئەمە ڕاستە، نەك ئەبوداود، سەنەدی حەدیسەکەش صەحیحە. (تمام المنة).

(٢) سەنەدی هەردووکیان (ضعیف)ن، شەهری کوڕی حەوشەبی تێدایە، وە زەعیفە وەك چەند جار باس کرا، وە لەبارەی ڕیز بوونی ئافرەتان لە دوای ئیمامەوە حەدیسێکی زۆر هەن، ئەما منداڵ خستنە دوای پیاوانەوە هیچ حەدیسێکم نەبینیوە جگە لەمە نەبێت، و ئەمەش ناکرێت بە بەڵگە، و من هیچ شتێك نابینم لەوەی منداڵان لەگەڵ پیاوان لە ڕیزا بووەستن ئەگەر فراوانی هەبێت لە ڕیزدا، وە نوێژی هەتیوەکە لەگەڵ ئەنەس لە دوای پێغەمبەرەوە ﷺ بەڵگەیە بۆ ئەمە. (تمام المنة).

گێڕایەوە فەرمووی: (زَادَكَ اللهُ حِرصاً وَلا تَعُد) (رواه أحمد والبخاري والنسائي) واتە: خوا سوور بوون و پەرۆشیت زیاد بکات بۆ ئایینەکەت بەڵام دووبارەی نەکەیتەوە[1].

بەڵام کەسێك بەتەنها لەدوای ڕیزەکانەوە نوێژ بکات جەماوەری زانایان ڕایان وایە نوێژەکەی دروستە، بەڵام کەراهەتی هەیە، ئەحمەدو ئیسحاق و حەمادو ئیبنوئەبی لەیلاو وەکیع و حەسەنی کوڕی صالیح و نەخەعی و (ابن منذر) دەفەرموون: هەرکەس ڕکاتێکی تەواو لەدوای ڕیزەکانەوە بکات نوێژەکەی بەتاڵە.

لە (وابصة)ەوە هاتووە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی بینی بەتەنها لەدوای ڕیزەکانەوە نوێژی ئەکرد، فەرمانی پێدا نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە. (رواه الخمسة إلا النسائي).

وە لە زاراوەکەی ئەحمەددا دەفەرموێت: پرسیار کرا لەپێغەمبەر ﷺ دەربارەی کەسێك کە بە تەنها لەدوای ڕیزەکانەوە نوێژ بکات؟ فەرمووی: (يُعِيدُ الصَّلاةَ) واتە: ئەبێ نوێژەکەی بگێڕێتەوە. (ترمذي ئەم (حديث)ەی بە حەسەن داناوە، وە ئیسنادەکەی لای ئەحمەد (جيد)ە.

لە عەلی کوڕی شەیبانەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی بینی لەدوای ڕیزەکانەوە نوێژی ئەکرد بەتەنها، ڕاوەستا هەتا لەنوێژ بووەوە، پێی فەرموو: (إستَقبِل صَلاتَكَ فَلا صَلاةَ لِمُفرِدٍ خَلفَ الصَّفِّ) (رواه أحمد وابن ماجة والبيهقي وقال أحمد: حديثٌ حسن وقال ابن سيد الناس: رواته ثقاتٌ معروفون).

واتە: نوێژەکەت بگێڕەرەوە چونکە ئەوکەسەی بەتەنها لەدوای ڕیزەکانەوە نوێژ ئەکات نوێژەکەی دروست نییە.

جومهور حەدیسەکەی ئەبوبەکرەیان گرتووە بەدەستەوە فەرموویانە: لەبەرئەوە هەندێکی لەنوێژەکەی بەتەنها لەدوای ڕیزەکانەوە کردووەو پێغەمبەر ﷺ پێی نەفەرموو نوێژەکەت دووبارەبکەرەوە، جا کەواتە فەرمانەکەی بەکردنەوەی نوێژەکە لەسەر مەندووبی دائەنێن بۆ ئەوەی گرینگی بدرێت بەلایەنێك کە چاکترینیانە.

کەمالی کوڕی هومام دەفەرموێت: مامۆستاکانی ئێمە حەدیسەکەی (وابصة) لەسەر نەدب دائەنێن، وە حەدیسەکەی عەلی کوڕی شەیبان لەسەر (نفي الكمال) نەبوونی تەواویەتی دائەنێن.

---

(١) هەندێك ئەڵێن: واتە درەنگ هاتنت بۆ نوێژ دووبارەمەکەرەوە، هەندێکی تر ئەڵێن: هاتنە ناو ڕیزت بەرکوعەوە دووبارە مەکەرەوە، هەندێکی تر ئەڵێن: بەپەلە هاتنت بۆ نوێژ دووبارەمەکەرەوە.

بۆ ئەوەی لەگەڵ حەدیسەکەی ئەبوبەکرەدا ڕێك بکەون، کە ڕووالەتەکەی پێویست نەبوونی گێڕانەوەی نوێژەکەیە، لەبەر ئەوەی فەرمانی بەدووبارە کردنەوەی نەدابوو[1].

وە ئەگەر کەسێك هات بۆ نوێژو لە ڕیزەکاندا جێگا نەبوو، هەتا بۆشایی‌یەکیش نەبوو لێیەوەی بچێتە ناو ڕیزەکەوە، هەندێ ئەڵێن: بەتەنها بوەستێت و کەراهەتی هەیە کەس لە ڕیزەکانەوە ڕابکێشێت بۆلای خۆی.

وە هەندێ ئەڵێن: کەسێکی زانا ڕاکێشێت بۆ دوواوە بۆلای خۆی دوای نوێژ دابەستن، وە موستەحەببە بۆ ئەوکەسەی ڕائەکێشرێت بچێت بەدەم ڕاکێشەرەوە.

**٥- ڕێك کردنی ڕیزەکان و پڕ کردنەوەی بۆشایی‌یەکان:**

موستەحەببە بۆ ئیمام فەرمان بکات ڕیزەکان ڕێك بکرێن و بۆشایی‌یەکان پڕبکرێنەوە پێش ئەوەی نوێژ دابەستێت، لەئەنەسەوە هاتووە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ پێش ئەوەی نوێژ دابەستێت ڕووی تێ ئەکردین و ئەیفەرموو: (تَرَاصُّوا وَاعتَدِلُوا) (رواه البخاري و مسلم) واتە: ڕێك ڕابوەستن پاڵ بدەن بەیەکەوە.

هەروەها بوخاری و موسلیم لێی ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (سَوُّوا صُفُوفَكُم فَإنَّ تَسوِيَةَ الصَّفِّ مِن تَمَامِ الصَّلاةِ) واتە: ڕیزەکانتان ڕێك بکەن چونکە ڕێکی ڕیز لەتەواوێتی نوێژە.

لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە هاتووە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ خۆی ڕیزی ئەکردین وەك چۆن تیر ڕیز ئەکرێت، هەتا کاتێ زانی خۆمان لەوەوە فێری ڕیز بوون بووین، ڕۆژێك تاوڕی دایەوە بینی پیاوێك سنگی لەڕیزەکە دەرپەڕی بوو، فەرمووی: (لَتُسَوُّنَّ صُفُوفَكُم أو لَيُخَالِفَنَّ اللهُ بَينَ وُجُوهِكُم)

(١) (معارضة) نی‌یە لەنێوان ئەو دوو (حدیث)ە لە ڕوویەکەوە، لەنێوان حەدیسی ئەبو بەکرە لە ڕوویەکی ترەوە، لەبەر ئەوەی ئەبو بەکرە بە تەنها لە صەفەکەدا نوێژی نەکرد، جا فەرمانی پێ نەکرد بە گێڕانەوەی نوێژەکە، وە ئەو پیاوە باس کراوەی لە هەردوو حەدیسەکەدا هاتووە نوێژی بە تەنها کرد لە دوای صەفەکەوە، جا فەرمانی پێ کرد بە گێڕانەوە، کەواتە هیچ (معارضة)یەکی تێدا نی‌یە، و ئیمام ئەحمەد ڕەحمەتی خوای لێ بێت بەمە جەمعی حەدیسەکانی کردووە. ئەبو داود لە مەسائیلەکەیدا (ل٣٥) دەفەرموێت: پرسیار کرا لە بارەی ئیمام ئەحمەد لەبارەی پیاوێك ڕکوع بەرێت لە دووری صەف، پاشان بڕوات تاوەکو ئەچێتە ناو صەفەکەوە، بەر لەوەی بگاتە صەفەکە ئیمام سەری بەرز کردەوە لە ڕکووع، فەرمووی: ڕکاتێك بری دەکەوێت، وە ئەگەر لە دوای صەفەکەوە نوێژی کرد بە تەنها، نوێژەکەی ئەگێڕێتەوە. (تمام المنة).

(رواه الخمسة وصححه الترمذي) واتە: ڕیزەکانتان ڕێك ئەکەن یا خوا نێوانی ڕووەکانتان تێك ئەدا[1]، تێك دانی ڕوو واتە: پەیدابوونی ڕق و کینە.

ئەحمەدو (طبراني) بەسەنەدێك کە خراپ نیيە ئەگێڕنەوە لە ئەبوئومامەوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (سَوُّوا صُفُوفَكُم، وَحَاذُوا بَينَ مَنَاكِبِكُم، لِينُوا فِي أيدِي إخوَانِكُم، وَسُدُّوا الخَلَلَ، فَإنَّ الشَّيطَانَ يَدخُلُ فِيمَا بَينَكُم بِمَنزِلَةِ الحَذَفِ) واتە: ڕیزەکانتان ڕێك بکەن و شان بەشانی یەکەوە بنێن، بەدەستی براکانتانەوە نەرم بن (واتە: ئەگەر کەسێك هات و ویستی بێتە ناو ڕیزەوە ڕێگای بۆ بکەنەوە، یا ئەوەی بۆ کەسێك ئیشارەت ئەکا کە ڕێك ڕاوەستێ، یا دەست ئەخاتە سەر شانی با ڕێك ڕاوەستێ)، وە بۆشایی‌یەکان پڕ بکەنەوە، چونکە شەیتان لە بۆشایی نێوانتانەوە وەك بەرخۆلەی ڕەش دێتە ناوتانەوە.

ئەبوداود و نەسائی و بەیهەقی لەئەنەسەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أتِمُّوا الصَّفَّ المُقَدَّمَ، ثُمَّ الَّذِي يَلِيهِ فَمَا كَانَ مِن نَقصٍ فَليَكُن فِي الصَّفِّ المُؤَخَّرِ) واتە: ڕیزی پێشەوە لەپێشدا پڕ بکەنەوە پاشان ڕیزی دوای ئەو، جا هەر کەمی‌یەك هەبێت با لە ڕیزی هەرە دواوەبێت.

بەززار بەسەنەدێکی حەسەن لە ئیبنو عومەرەوە ئەگێڕێتەوە دەفەرمووێت: هەنگاو نیيە ئەوەندەی ئەو هەنگاوە گەورە بێت کە پیاوێك ئەینێت بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی‌یەك کە لە ڕیزدا هەبێت[2].

نەسائی و حاکم و ئیبنو خوزەیمە لە ئیبنوعومەرەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن وَصَلَ صَفّاً وَصَلَهُ اللهُ، وَمَن قَطَعَ صَفاً قَطَعَهُ اللهُ) واتە: هەرکەس ڕیزێك بگەیەنێت خوا ئەیگەیەنێت بەڕەحمی خۆی، وە هەرکەس ڕیزێك بپچڕێنێت خوا لە ڕەحمی خۆی ئەیپچڕێنێت.

جەماعەت جگە لە بوخاری و (ترمذي) لە جابیری کوڕی سەمورەوە ئەگێڕنەوە کە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ جارێك هاتە ناومان فەرمووی: (ألا تَصُفُّونَ كَمَا تَصُفُّ المَلائِكَةُ عِندَ رَبِّهَا؟ فَقُلنَا يَا رَسُولَ اللهِ كَيفَ تَصُفُّ المَلائِكَةُ عِندَ رَبِّهَا؟ قَالَ: يُتِمُّونَ الصَّفَّ الأوَّلَ وَيَتَرَاصُّونَ فِي الصَّفِّ). واتە: ئایا ناتانەوێ وەك فریشتەکان کە لای پەروەردگاریان ڕیز ئەبەن ڕیز ببن ؟ ووتمان: ئەی نێرراوی خوا

---

(١) زیادەیەکی تێدایە لەلای ئەبو داود، واباش بوو دانەر نەقڵی بکردایە، بۆ دەرخستنی سوننەتێك کە بەشی زۆری نوێژکەر بێ ئاگان لێی، ئەویش قسەی نوعمانە دوای (حدیث)ەکە دەفەرمووێت: من ئەم بینی هەر پیاوێك شانی ئەنا بەشانی ئەوی ترەوە ئەژنۆی بەئەژنۆیەوەو قولەپێی بەقولەپێی‌یەوە، و ئیسنادەکەی صەحیحە.

(٢) سێ هەڵەی تێدایە: یەکەم: (حدیث)ەکە مەرفوعە ئەو بەمەوقوفی داناوە، دووەم: داویەتی‌یە پاڵ بەززار، جگە لە (طبراني)ش کەسی تر تەخریجی نەکردوە، سێیەم: ئیسنادەکەی بە (جید) داناوە بەڵام لاوازە، بەڵام بۆ (حدیث)ەکە شاهیدم دۆزیوەتەوە کە ئەی گەیەنێتە پلەی حەسەن.

فریشتەکان چۆن لای پەروەردگاریان ڕیز ئەبن؟ فەرمووی: ڕیزی یەکەم تەواو ئەکەن و ڕێك ڕیز ئەبن و ڕێك ڕائەوەستن.

**٦- برەودان (ترغیب) بەڕیزی یەکەم و لای ڕاستی ڕیزەکان:**

لە پێشەوە ئەو فەرموودەیەمان باس کرد کەپێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لَو يَعلَمُ النَّاسُ مَا فِي النِّدَاءِ وَالصَّفِّ الأوَّلِ ثُمَّ لَمْ يَجِدُوا إلا أن يَستَهِمُوا عَلَيهِمَا لاستَهَمُوا). واتە: ئەگەر خەڵك ئەیزانی چ خێرێك لە بانگدان و ڕیزی یەکەمدا هەیە، ئەگەر هیچیان نەدۆزیایەوە ئەوە نەبێت قورعەی بۆ بکەن قورعەیان بۆ ئەکرد.

لە ئەبو سەعیدی خودریەوە هاتووە: کاتێك پێغەمبەر ﷺ صەحابەی بینیایە دووا ئەکەوون لە ڕیزی یەکەم پێی ئەفەرموون: (تَقَدَّمُوا فَأتِمُّوا بِي وَلِيَأتَمَّ بِكُم مَن وَرَائَكُم، وَلا يَزَالُ قَومٌ يَتَأخَّرُونَ حتى يُؤَخِّرَهُمُ اللهُ عَزَّوَجل) (رواه مسلم والنسائي وأبوداود وابن ماجه) واتە: وەرنە پێشەوەو ئیقتدا بە من بکەن، با ئەوانەش لەدوای ئێوەوەن ئیقتیدا بە ئێوەوە بکەن، بەردەوام کەسانێك خۆیان دووا ئەخەن لەڕیزی یەکەم هەتا خوای گەورە دوایان ئەخا لە ڕەحمی خۆی.

ئەبوداودو ئیبنو ماجە لە عائیشەوە ئەگێڕنەوە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ ئەیفەرموو: (إنَّ اللهَ وَمَلائِكَتَهُ يُصَلُّونَ على الَّذِينَ يُصَلُّونَ على مَيَامِنِ الصُّفُوفِ) واتە: خوا میهرەبانی خۆی ئەڕژێنی و فریشتەکانی ئەپاڕێنەوە بۆ ئەوکەسانەی لەلای ڕاستی ڕیزەکانەوە نوێژ ئەکەن.

لای ئەحمەدو (طبراني) بە سەنەدی صەحیح هاتووە لە ئەبوئومامەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إنَّ اللهَ وَمَلائِكَتَهُ يُصَلُّونَ على الصَّفِّ الأوَّلِ، قَالُوا: يَا رَسُولَ الله وعلى الثَّانِي[1]؟ قَالَ: إنَّ اللهَ وَمَلائِكَتَهُ يُصَلُّونَ على الصَّفِّ الأوَّلِ، قَالُوا: يَا رَسُولَ الله وعلى الثَّانِي؟ قَالَ: وعلى الثَّانِي) واتە: خوا ڕەحمەتی ئەڕژێنێ بەسەر ڕیزی یەکەمدا و فریشتەکان بۆیان ئەپاڕێنەوە، ووتیان:

---

(١) هیچ ڕوویەك نی‌یە بۆ تەصحیح کردنی ئیسنادەکەی، لەبەر ئەوەی هەروەك لە (المسند) دا هاتووە لە ڕێگای فەرەجەوە: (حدثنا لقمان عن أبي أمامة) وە فەرەج (ضعيف) ە هەروەك (حافظ) لە (التقريب) دا دەفەرموێت: بە تایبەت کە لە لوقمانەوە ریوایەتی دەکات، پرسیار کرا لە (دارقطني) لەبارەی فەرەجی کوڕی (فضالة) لە لوقمانی کوڕی عامیرەوە لە ئەبی ئومامەوە ؟ فەرمووی: ئەمە هەمووی غەریبە، هەربۆیە (منذري) تەصحیحی نەکردووە هەروەها (هيثمي) ش، (منذري) دەفەرموێت: (رواه أحمد بإسناد لا بأس به والطبراني و غيره) (هيثمي) دەفەرموێت: (رواه أحمد والطبراني في الكبير، ورجال أحمد موثوقون) لەمەدا ئاماژە هەیە بۆ ئەوە کە تەوسیق کردنی هەندێك لە پیاوانی ئەحمەد تەوسیقێکی (لين) ە، ئەویش فەرەجی کوڕی (فضالة) یە، وە حەدیسی (براء) لە هەردوو (صحيح ابن خزيمة وابن حبان)دا بەسە، بۆ دڵنیا بوون لە صیحەحەتەکەی بڕوانە (صحيح الترغيب ٤٩٠). (تمام المنة).

ئەی پێغەمبەری خوا ڕیزی دووەمیش؟ فەرمووی: خوا ڕەحمەت ئەڕژێنێ بەسەر ڕیزی یەکەمداو فریشتەکان بۆیان ئەپاڕێنەوە، ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ڕیزی دووەمیش؟ فەرمووی: ڕیزی دووەمیش.

**٧- ڕاگەیاندنی دەنگی ئیمام بە مەئمومەکان:**

موستەحەببە لەکاتی پێویستی دا دەنگی ئیمام لەدوایەوە بە مەئمومەکان ڕاگەیەندرێ، ئەگەر هات و دەنگی بە مەئمومەکان نەگەیشت، بەڵام ئەگەر دەنگی ئیمام بە جەماعەتەکە ئەگەیشت ئەو کاتە ڕاگەیاندن بیدعەتێکی مەکرووهە بەڕای هەموو زانایان.

## مزگەوتەکان

لەو تایبەتمەندی‌یانەی کە خوا بەخشیویەتی بەم ئوممەتی ئیسلامە ئەوەیە ئەم زەویەی کردووە بە پاك کەرەوەو مزگەوت بۆیان، جا هەرکەسێك لەموسڵمانان کاتی نوێژی هات لە هەر شوێنێك بێت با نوێژەکەی بکات، (أبوذر) خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموێت: ووتم: ئەی نێرراوی خوا، یەکەم مزگەوت لەسەر زەوی دروست کرا چ مزگەوتێك بوو ؟ فەرمووی: (مزگەوتی حەرام)، ووتم: پاش ئەو ؟ فەرمووی: (مزگەوتی ئەقصا)، ووتم: چەند ساڵ بوو ماوەی نێوانیان ؟ فەرمووی: (چل ساڵ)، لەپاشاندا فەرمووی: (أينَمَا أدرَكَتكَ الصَّلاةُ فَصَلِّ فَهُوَ مَسجِدٌ) وفي رواية: (فَكُلُّهَا مَسجِد) (رواه الجماعة). واتە: لە هەرشوێنێك کاتی نوێژ کردنت هات تۆ نوێژی خۆت لەوێ بکە چونکە ئەوێ مزگەوتی تۆیە، وە لە ڕیوایەتێکی تردا: زەوی هەمووی مزگەوتە.

**(٢) (فضل) ی دروست کردنی مزگەوت:**

أ- لە (عثمان)ەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن بنى للهِ مَسجِداً يَبتَغِي بِهِ وَجهَ اللهِ، بنى اللهُ لَهُ بَيتاً فِي الجَنَّةِ) (متفق عليه). واتە: هەرکەس بۆ خوا مزگەوتێکی دروست کرد خوا لە بەهەشتدا خانوویەکی بۆ دروست ئەکات.

ب- ئەحمەدو ئیبنو حیببان و بەززار بەسەنەدێکی صەحیح لە ئیبنو عەبباسەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن بنى للهِ مَسجِداً وَلَو كَمفحَصِ قَطَاةٍ لِبَيضِهَا، بنى اللهُ لَهُ بَيتاً فِي الجَنَّةِ)[1] واتە: هەرکەس بۆ خوا مزگەوتێك دروست بکات با ئەوەندەی هێلانەی (قطاة)

(١) نەخێر سەنەدەکەی صەحیح نییە، چونکە لای ئەحمەد و بەززار (جابر الجعفي) تێدایە، وە ئەمە (ضعیف)ە هەروەك لە (المجمع) دایە، ئیبنو حیببان لە (موارد ٣٠١) دا ڕیوایەتی دەکات لە حەدیسی (أبي ذر) بەمەرفوعی بەم لەفزە بەبێ ووتەی (لبيضها)، هەروەها بەززاریش تەخریجی کردووە، وە (طحاوي) لە (مشكل

تەیرێکیش بێت کە بۆ هێلکەکانی دروست ئەکات، خوا خانوویەکی لەبەهەشتدا بۆ دروست ئەکات.

**(٣) پاڕانەوە لە کاتی ڕووکردنە مزگەوت:**

سوننەتە هەرکەس بەرەو مزگەوت بچێت بە یەکێ لەم دوعایانەی خوارەوە بپاڕێتەوە.

١- ئومو سەلەمە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ لەماڵ دەرئەچوو ئەیفەرموو: (بِسمِ اللهِ تَوَكَّلتُ على اللهِ، اللَّهُمَّ إنِّي أعُوذُ بِكَ مِن أن أضِلَّ أو أُضَلَّ، أو أزِلَّ أو أُزَلَّ، أو أظلِمَ أو أُظلَم، أو أُجهَلَ أو يُجهَلَ عَلَيَّ) (رواه أصحاب السنن وصححه الترمذي) واتە: بەناوی خوا، پشت بەخوا ئەبەستم، خوایە پەنا ئەگرم بەتۆ لەوەی کەسێ گومڕا بکەم یا گومڕا بکرێم، یا کەسێك تووشی هەڵە بکەم یا تووشی هەڵە بکرێم، یا زوڵم لەکەسێك بکەم یا زوڵمم لێ بکرێ، یا نەزانی بکەم بەرابەری کەسێك یانەزانی بکرێ بەرابەرم. (ئەم دوعایە بۆ دەرچوون بەرەو مزگەوت یا غەیری مزگەوت دروستە بخوێنرێ).

٢- خاوەنی سوننەنەکان ئەگێڕنەوە و (ترمذي) بە حەسەنی داناوە لە ئەنەسەوە کە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (هەرکەس لەماڵ دەرچوو ووتی: (بِسمِ اللهِ تَوَكَّلتُ على اللهِ، وَلا حَولَ وَلا قُوَّةَ إلا بِاللهِ) پێی ئەووترێت بەستە!.. ڕێنمایی کرایت و شەڕت لەکۆڵ خرایەوەو ئەمەکدار بوویت، پاشان شەیتانی لێ دوور ئەکەوێتەوە).

٣- بوخاری و موسلیم لەئیبنوعەبباسەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بۆ نوێژو فەرمووی: (اللَّهُمَّ اجعَل فِي قَلبِـي نُوراً وَفِي بَصَرِي نُوراً، وَفِي سَمعِي نُوراً، وَعَن يَمِينِي نُوراً، وَخلفِي نُوراً، وَفِي عَصَبِـي نُوراً، وَفِي لَحمِي نُوراً، وَفِي دَمِي نُوراً، وَفِي شَعرِي نُوراً، وَفِي بَشَرِي نُوراً) واتە: خوایە ڕۆشنایی بخەرە ناو دڵ و چاوو گوێ و لای ڕاستم و پاشم و دەمارەکانم و گۆشتەکەم و خوێنەکەم و موەکانم و پێستەکەم.

لە ریوایەتەکەی موسلیمدا هاتووە دەفەرمووێت: (اللَّهُمَّ اجعَل فِي قَلبِـي نُوراً، وَفِي لِسَانِي نُوراً، وَاجعَل فِي سَمعِي نُوراً، وَفِي بَصَرِي نُوراً، وَاجعَل مِن خَلفِي نُوراً، وَمِن أمَامِي نُوراً، وَاجعَل مِن فَوقِي نُوراً، وَمِن تَحتِي نُوراً، اللَّهُمَّ أعطِنِي نُوراً) واتە: خوایە ڕۆشنایی بخەرە دڵ و زمان و

---

الآثار)دا، وە (طبراني) لە (المعجم الصغير)دا بە سەنەدێکی صەحیح، جا وادیارە یەکێ لە دوو حەدیسەکەی لێ تێك چوە بەهۆی ئەوی تریانەوە، هەروەها حەدیسەکە لە کۆمەڵێك لە هاوەڵانەوە بە ڕێنەی ئەمە هاتوە، وە من تەخریجم کردووە لە (الثمر المستطاب)دا، وە لە هیچ کامێك لەوانە ئەم زیادەیە نەهاتووە، کەواتە ئەمە (منکر)ە. (تمام المنة).

گوێ و چاووم، خوایە ڕۆشنایی بخەیتە پاش و پێشەوەم و سەرەوەم و ژێرەوەم، خوایە ڕۆشناییەکم پێ ببەخشە.

٤- ئەحمەدو ئیبنوخوزەیمەو ئیبنوماجەو (حافظ) کە بە حەسەنی داناوە لە ئەبوسەعیدەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کاتێ پیاو لەماڵ ئەچێتەدەر بۆ نوێژ بڵێت: (اللَّهُمَّ إنِّي أسأَلُكَ بِحَقِّ السَّائِلِينَ علَيكَ، وَبِحَقِّ مَمشَايَ هَذَا، فَإنِّي لَم أخرُج أشَراً ولا بَطَراً، وَلا رِيَاءً وَلا سُمعةً، خَرجتُ اتِّقَاءَ سَخَطِكَ، وَابتِغَاءَ مَرضَاتِكَ، أسأَلُكَ أن تُنقِذَنِي مِنَ النَّارِ، وَأن تَغفِرَ لِي ذُنُوبِي، إنَّهُ لايَغفِرُ الذُّنُوبَ إلا أنتَ) واتە: خوایە بەحەقی نزاکەران بەسەرتەوە، وە بەحەقی ئەم ڕێشتنەم لە تۆ ئەپاڕێمەوە، من نەهاتوومە دەر ئینکاری نیعمەتەکانت بکەم، یا بۆ ڕیاو سومعە هاتبمە دەر، بەڵکو هاتوومەتەدەر لەبەر خۆپاراستن لە تووڕە بوونت و داوای ڕەزامەندیت، داوات لێ ئەکەم لە ئاگر ڕزگارم بکەیت و لەتاوانەکانم ببوری، چونکە تەنها تۆ لەتاوان ئەبووری و کەسی تر نا، خوا هەفتا هەزار فریشتەی بۆ تەرخان ئەکات داوای لێبوردنی بۆ بکەن، وە خوا ڕووی تێ ئەکات هەتا لەنوێژەکەی ئەبێتەوە[1].

### (٤) پاڕانەوە لە کاتی چوونە ناو مزگەوت و هاتنەدەر:

سوننەتە بۆ ئەوکەسەی ئەیەوێت بچێتە ناو مزگەوت قاچی ڕاستی پێش بخات و بڵێت: (أعُوذُ بِاللهِ العَظِيمِ، وَبِوَجهِهِ الكَرِيمِ، وَسُلطَانِهِ القَدِيمِ، مِنَ الشَّيطَانِ الرَّجِيمِ، بِسمِ اللهِ، اللَّهُمَّ صَلِّ على مُحَمَّدٍ، اللَّهُمَّ اغفِر لِي ذُنُوبِي، وَافتَح لِي أبوَابَ رَحمَتِكَ) واتە: پەنا ئەگرم بەخوای گەورەو ڕووی پیرۆزی و دەسەڵاتی هەمیشەیی لە شەیتانی نەفرین کراو، بەناوی خوا، خوایە ڕەحمەت برژێنە بەسەر موحەممەددا، خوایە لەتاوانەکانم ببوورە و دەرگاکانی ڕەحمەتتم بۆ بکەرەوە.

---

(١) نەخێر ئیسنادەکەی لاوازە چونکە (عطية) ی عەوفی تێدایە، ئەمیش (ضعيف)ە، (حافظ) لە تەرجومەکەی لە (التقريب)دا دەفەرمووێت: (صدوق يخطئ كثيراً، كان مدلساً) منیش دەڵێم: (عطية) ئەم حەدیسەی بە (عنعنة) هێناوە لە ئەبی سەعیدەوە، وە دانی بەمەدا نەناوە کە لە ئەبوسەعیدەوە بیستوویەتی، جا ئەمە عیللەتێکی دووەمە، ئیتر کوا حەدیسەکەی حەسەنە؟! پاشان ڕاوەستام لەسەر عیللەتی سێهەم کە ئەویش وەقفە، ئیبنو ئەبی حاتەم لە (العلل)دا باسی ئەوەی کردووە کە هەندێکیان ڕیوایەتیان کردووە لە (عطية) وە لە ئەبی سەعیدەوە بە مەوقوفی، ئەبو حاتەم دەفەرمووێت: (إنه أشبه) واتە ڕێچوترە بە صیحەحەت، بۆیە (منذري) ئەم حەدیسەی (تضعيف) کردووە لە (الترغيب١/١٣٠)دا، وە ووتەی دانەر: (وحسنه الحافظ) وابزانم مەبەستی (أبو الحسن المقدسي) یە، بڕوانە (الترغيب) (٢/٢٦٥). (تمام المنة).

وە ئەگەر ویستی بێتەدەر لەمزگەوت قاچی چەپی پێش بخات و بڵێت: (بِسمِ اللهِ، اللَّهُمَّ صَلِّ على مُحَمَّدٍ، اللَّهُمَّ اغفِر لِي ذُنُوبِي، وافتَح لِي أبوَابَ فَضلِكَ، اللَّهُمَ اعصِمنِي مِنَ الشَّيطَانِ الرَّجِيم[1]) واتە: بەناوی خوا، خوایە بارانی درودو میهرەبانیت برژێنە بەسەر موحەممەددا، خوایە لە تاوانەکانم ببورەو دەرگاکانی فەزڵی خۆتم بۆ بکەرەوە، خوایە لە شەیتانی نەفرین لێ کراو بم پارێزە.

**(٥) فەزڵ و چاکێتی هەوڵدان بۆ چوون بۆ مزگەوت و دانیشتن تێیدا:**

أ- ئەحمەد و هەردوو شێخ لە ئەبی هورەیرەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن غَدَا إلى المَسجِدِ وَرَاحَ أعَدَّ اللهُ لَهُ الجَنَّةَ نُزُلاً كُلَّمَا غَدَا وَرَاحَ)[2]، واتە: هەرکەس بەزۆری بچێتە

---

(١) منیش دەڵێم: دوو تێبینیمان لەسەر ئەمە هەیە:

یەکەمیان: پێویستە لەگەڵ صڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ لێرەدا سەلامیشی لەسەر بدرێت، لەبەر سابت بونی ئەمەر کردن پێی لە حەدیسی ئەبو هورەیرەدا، کە دانەر ئەم دوعای پاراستنی کاتی دەرچونەی لەو حەدیسەوە وەرگرتوە، هەروەها ئەم ئەمرە سابت بووە لە حەدیسی ئەبی حومەید و ئەبی ئوسەید، لە (صحيح أبي عوانة)دا.

دووەمیان: دوعا کردن بە لێخۆشبوون لەو دوو شوێنەدا، حەدیسی صحیح نەهاتووە لەسەری، بەڵکو ریوایەت کراوە لە حەدیسی (فاطمة) خوای لێ ڕازی بێت، لەگەڵ ئەوەشدا کە (منقطع)ە هەروەك دەرهێنەرەکەی کە (ترمذي)یە ڕونی کردۆتەوە، چونکە ئەو دوعا ناوبراوە تەنها (ليث بن أبي سليم) باسی کردوەو ئەویش (ضعيف)ە، وە (إسماعيل بن علية) شوێن ئەم کەوتوە لە ریوایەتی ئەصلی حەدیسەکەدا، وە ئەو سیقەو گەورەیە بەڵام ئەو دوعایەی باس نەکردوە لە ریوایەتەکەیدا، جا ئەمانە هەموو ئەوە ئەگەیەنێت کە ئەو دوعایە صحیح نیەو مونکەرە. بۆیە من وائەبینم کە شەرعی نیە پەیوەست بکرێت بە دوعا صەحیحەکانەوەو لەگەڵ ئەواندا بهێندرێت، بە تایبەت ئەوە کە بە سوننەت دابنرێت بە (قطعي)، جا ورد بەرەوە، وە بۆ ئەمە بگەڕێوە بۆ (تخريج الكلم الطيب ٦٣-٦٦) و (المشكاة ٧٠٣و٧٣١و٧٤٩) و (صحيح أبي داود ٤٨٤).

(٢) ئەم زاراوەیە زاراوەی ئەحمەدە لە موسنەد (٢/٥٠٩)دا، پێشم وایە کە لە زاراوەیەدا کەمێك کورت کردنەوەی تێکەوتوە لە لایەن راوییەکانی موسنەدەوە کە ماناکەی گۆڕیوەو مەبەستەکەی لەدەست داوە، چونکە لەفزەکەی لای موسلیم دەفەرموێت: (مَن غَدَا إلى المَسجِدِ وَرَاحَ أعَدَّ اللهُ لَهُ فِي الجَنَّةِ نُزُلاً كُلَّمَا غَدَا وَرَاحَ) واتە: هەرکەس بەزۆری بچێتە مزگەوت و بێتەوە، خوای گەورە شوێنی حەوانەوەی لە بەهەشتدا بۆ دابین دەکات هەرکاتێ بچێت و بێتەوە. هەر بەو شێوەیەش ئەحمەد لە (كتاب الزهد) دا تەخریجی کردوە هەر بە هەمان لەفز (ل٣) کە یەکەم حەدیس بەوە دەست پێ دەکات، سەنەدەکەشی هەمان سەنەدی موسنەدە، وە ریوایەتەکەی بوخاریش هەر نزیکە لەوە.

شاراوەش نیە کە لێکدانەوەی حەدیسەکەی سەرەوە بەوەی کە دەفەرموێت: (خوای گەورە بەهەشتی بۆ ئامادە دەکات هتد...) جیاوازی هەیە لەگەڵ لێکدانەوەی ئێرەدا کە دەفەرموێت: (خوای گەورە شوێنی حەوانەوەی لە بەهەشتدا بۆ دابین دەکات...). خۆ هەردو زاراوەکە مانای ئەوە دەبەخشن کە خوای گەورە بە هەشتی بۆ دابین دەکات، بەڵام

مزگەوت و بێتەوە، خوا بەهەشتی بۆ ئامادە ئەکات کە تێیدا بحەوێتەوە هەرکاتێ ڕۆیشت و گەڕایەوە.

ب- ئەحمەدو ئیبنوماجە و ئیبنو خوزەیمەو ئیبنوحیببان‌و (ترمذي) کە بە حەسەنی داناوەو حاکم کە بە صەحیحی داناوە گێڕاویانەتەوە لە ئەبوسەعیدەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إذا رأيتُم الرَّجُلَ يَعتَادُ المَسجِدَ فَاشهَدُوا لَهُ بالإيمَانِ)[1] واتە: کاتێ بینیتان پیاوێك زۆر هاتوچۆی مزگەوتی ئەکرد شایەتی ئیمانداری بۆ بدەن، چونکە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا يَعۡمُرُ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾ واتە: بەڕاستی کەسانێك مزگەوتەکان ئاوەدان ئەکەنەوە کە باوەڕیان بەخواو ڕۆژی دوایی هەیە.

ج- موسلیم لە ئەبوهورەیرەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن تَطَهَّرَ فِي بَيتِه ثُمَّ مشى إلى بَيتٍ مِن بُيُوتِ اللهِ، لِيَقضِيَ فَرِيضةً مِن فَرَائِضِ اللهِ، كَانَت خُطُوَاتُهُ إحدَاهَا تَحطُّ خَطِيئَتَهُ، وَالأُخرَى تَرفَعُ دَرَجَتَهُ) واتە: هەرکەس لە ماڵی خۆیدا دەستنوێژی گرت، پاشان ڕۆیشت بۆ خانەیەك لە خانەکانی خوا، بۆ ئەوەی فەرزێك لە فەرزەکانی خوا بەجێ بهێنێ، یەکێ لەو هەنگاوانەی ئەینێت تاوانێکی پێ ئەسڕێتەوە، و ئەوی تریانی پلەی پێ بەرز ئەبێتەوە.

د- (طبراني) و بەززار بەسەنەدی صەحیح لە ئەبوەدەردائەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (المَسجِدُ بَيتُ كُلِّ تَقِي، وَتَكَفَّلَ اللهُ لِمَن كَانَ المَسجِدُ بَيتَهُ بِالرَّوحِ وَالرَّحمَةِ وَالجَوَازِ على الصِّرَاطِ إلى رِضوَانِ اللهِ: إلى الجَنَّةِ[2]) واتە: مزگەوت خانەی هەموو لەخواترسێکە، وە خوا

---

زاراوەکەی دوایی ئەوەی تێدایە کە بە ژمارەی ڕۆیشتن و گەڕانەوەکەی خوای گەورە شوێنی حەوانەوەی بۆ دابین دەکات، جا وورد بەرەوە!!

هەر لەبەر ئەوە پێویستە هەرکەس بەسوننەتەوە خۆی خەریك بکات پشت بە صەحیحەینەوە ببەستێ. لەبەر ئەوە ئومەت ڕێك کەوتون لەسەری و دەبێت زۆر گرینگی بەو دوانەوە بدات تا کتێبەکانی تر.

(١) نە صەحیحەو نە ئیسنادەکەشی (جید)، چونکە لە ڕێگەی دەڕاجی ئەبی سەمحەوەیە لە ئەبی (هیثم) ەوە لە ئەبی سەعیدەوە، وە ئەم دەڕڕاجە (حافظ) دەفەرموێت لە (التقريب)دا (صدوق، في حديثه عن أبي الهيثم ضعف) هەربۆیە (ذهبي) شوێن (حاکم) کەوتوە بەم وتەیە: (دراج كثير المناكير)، و منیش دەڵێم: لە مەناکیرەکانی حەدیسی: (أكثروا ذكر الله حتى يقولوا: مجنون)! ئەحمەد لەدوای ئەم حەدیسەوە تەخریجی کردوە بە سەنەدی ناوبراو.

(٢) ڕانەوەستاوم لەسەر سەنەدەکەی، تا بڕوانم لێی. و ئەم بینیوە کەس بە ڕاشکاوی بە صەحیحی دانابێت، (منذري)ش ئەم قسەیەی لە بەززارەوە کە تەخریجی حەدیسەکەی کردوە نەقڵی کردوە دەفەرموێت: (إسناده حسن) جا ئیتر صەحیحی لەکوێ بوو؟! و دانەر ڕەنگە حوکمی صەحیحی هێنابێت لە ووتەی (هیثمي) لە (المجمع)دا:

کەفیلی ئەوکەسانەیە کە مزگەوت خانەیانە، بە ڕەوحەمەت و پەڕینەوە لە پردی صیاط بۆ ڕەزامەندی خوا: بۆ بەهەشت.

هـ- لەپێشەوە باسی ئەو حەدیسە کرا کە فەرموویەتی: ئایا ڕێنماییتان نەکەم بو ئەوشتەی کە (اللە) تاوانی پێ ئەسڕێتەوە و پلەی پێ بەرز ئەکاتەوە.

**٦- نوێژی سڵاو کردن لە مزگەوت (تحیة المسجد):**

جەماعەت لەئەبو قەتادەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذَا جَاءَ أَحَدُكُمُ المَسجِدَ فَلْيُصَلِّ سَجدَتَينِ مِن قَبلِ أن يَجلِسَ) واتە: کاتێ کەسێکتان هاتە مزگەوتەوە پێش ئەوەی دانیشێ با دوو ڕکات نوێژ بکات.

**٧- چاکترین مزگەوتی سەرزەوی:**

أ- بەیهەقی گێڕاویەتیەوەو (سیوطي) بە حەسەنی داناوە لە جابیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (صَلاةٌ فِي المَسجِدِ الحَرَامِ مِئَةُ ألفِ صَلاةٍ، وَصَلاةٌ فِي مَسجِدِي ألفُ صَلاةٍ، وَفِي بَيتِ المَقدِسِ خَمسُمائةِ صَلاةٍ) واتە: نوێژێك لەمزگەوتی حەرامدا بە سەد هەزار نوێژە، وە نوێژێك لەم مزگەوتەی مندا بە هەزار نوێژە، وە نوێژێك لە (بیت المقدس)دا بە پێنج سەد نوێژە.

ب- ئەحمەد ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: (صَلاةٌ فِي مَسجِدِي هَذَا أفضَلُ مِن ألفِ صَلاةٍ فِيمَا سِوَاهُ مِنَ المَسَاجِدِ، إلا المَسجِدَ الحَرَامَ، وَصَلاةٌ فِي المَسجِدِ الحَرَامِ أفضَلُ مِن صَلاةٍ فِي مَسجِدِي بِمائةِ صَلاةٍ) واتە: نوێژێك لەم مزگەوتەی مندا بکرێت چاکترە لە هەزار نوێژی ناو مزگەوتەکانی تر جگە لە مزگەوتی حەرام، وە نوێژێك لە مزگەوتی حەرامدا چاکترە لە نوێژێك لەم مزگەوتەی مندا بکرێت بە سەد جار.

جەماعەت ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا تُشَدُّ الرِّحَالُ إلا إلى ثَلاثَةِ مَسَاجِدَ؛ المَسجِدُ الحَرَامِ، وَمَسجِدِي هَذَا، وَالمَسجِدِ الأقصى) واتە: بارگە ناپێچرێتەوە بۆ سێ مزگەوت نەبێت ئەوانیش: مزگەوتی حەرام (لەشاری مەککە) و مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ (لەشاری مەدینە) و مزگەوتی ئەقسا (لەشاری قودس).

---

(قلت: و رجال البزار کلهم رجال الصحیح) و ئەمە لازم نیە لەبەر چەند هۆیەکی زۆر کە لە پێشەکیەکەدا باسم کردووە جا بگەڕێوە بۆی، پاشان بۆم ڕوون بۆوە کاتێك وەستام لەسەر سەنەدەکەی لە (زوائد البزار٤٣٤)دا کە ئیسنادەکەی صەحیحە، بەڵام لەلای ئەو وتەی: (المسجد بیت کل تقي) تێدا نیە، بەڵکو ئەمە لەلای (طبراني) و جگە لەمیشە، و ئەمە تەخریج کراوە لە (الصحیحة) دا (٧١٦) و هێناومەتەوە لە (صحیح الترغیب ٣٢٦)دا. (تمام المنة).

**(٨) ڕازاندنەوەی مزگەوتەکان:**

أ- ئەحمەدو ئەبوداودو نەسائی و ئیبنو ماجە ئەگێڕنەوە، هەروەها ئیبنو حیببان بە صەحیحی داناوە لە ئەنەسەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا تَقُومُ السَّاعَةُ حتى يَتَبَاهى النَّاسُ بِالمَسَاجِدِ) واتە: قیامەت هەڵناسێ هەتا خەڵك شانازی بەمزگەوتەوە نەکەن.

وە لە زاراوەکەی ئیبنو خوزەیمەدا دەفەرمووێت: (يَأتِي على النَّاسِ زَمَانٌ يَتَبَاهَونَ بِالمَسَاجِدِ ثُمَّ لايُعَمِّرُونَهَا إلا قَلِيلاً)[1] واتە: سەردەمێك دێت خەڵك شانازی ئەکەن بە مزگەوتەکانەوە لەجوانیدا، بەڵام بەکەمی هاتوچۆی ئەکەن و نوێژی تێدا ئەکەن.

ب- ئەبو داود و ئیبنو حیببان کە بە صەحیحی داناوە لە ئیبنوعەبباسەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَا أُمِرتُ بِتَشييدِ المَسَاجِدِ) زاد أبوداود: قال ابن عباس: (لَتُزَخرِفُنَّهَا كَمَا زَخرَفَتِ اليَهُودُ وَالنَّصَارى). واتە فەرمانم پێ نەدراوە مزگەوتەکان زیاد لەپێویست بەرز بکەمەوە، ئەبوداود دەفەرمووێت: ئیبنوعەبباس دەفەرمووێت: بەتەئکید ئێوە ئەیان ڕازێننەوە وەك چۆن جولەکەو گاور ڕازاندیاننەوە.

ج- ئیبنو خوزەیمە کە بەصەحیحی داناوە ئەگێڕێتەوە کە: عومەر فەرمانی ئەکرد بە دروست کردنی مزگەوتەکان و ئەیفەرموو: هەر بەشێوەیەك بێت خەڵك لەباران بپارێزێت نەکەن سوورو زەردی بکەن و خەڵکی پێ بێ ئاگا بکەن. وە بوخاری بەموعەللەقی گێڕاویەتی‌یەوە (واتە: بە بێ سەنەد).

**(٩) پاك کردنەوەو بۆن خۆش کردنی مزگەوتەکان:**

أ- ئەحمەدو ئەبوداودو (ترمذي) و ئیبنوماجەو ئیبنوحیببان بەسەنەدێکی (جید) لەعائیشەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی ئەکرد مزگەوت لەناوماڵەکاندا دروست بکەن، وە فەرمانی ئەکرد بە چاکی دروست بکرێت و بە پاکی ڕابگیرێت.

زاراوەکەی ئەبوداود دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ ئەکردین مزگەوت لەناو خانووەکاندا دروست بکەین و چاکی بکەین و خاوێنی بکەین، وە عبداللە بۆنی خۆشی ئەکرد بەناو مزگەوتدا کاتێ ئەچووە سەر مینبەر.

---

(١) بەم زاراوەیەوە لاوازە هەرچەندە واتاکەی لەگەڵ ئەم سەردەمانەدا ڕێك ئەکەوێت وە عیللەتەکەی ئەبو عامیری خەرراز، کە (ضعيف) ە لەبەر زۆری ئەوهامی، بەڵام بەزاراوەکەی پێش ئەم (حديث)ە صەحیحە و تەخریج کراوە لە (صحيح أبي داود ٤٧٥)دا (تمام المنة).

ب- له ئەنەسەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ ئەیفەرموو: (عُرِضَت عَلَيَّ أُجُورُ أُمَّتِي حتى القَذَاةُ يُخرِجُهَا الرَّجُلُ مِنَ المَسجِدِ)[1] (رواه أبوداود والترمذي وصححه ابن خزيمة) واتە: پاداشی ئوممەتەکەم نیشانم درا هەتا پاداشی فڕێ دانی پوشکێك کە لە مزگەوتدا کەوتبێت.

**(١٠) پاراستنی مزگەوتەکان:**

مزگەوتەکان خانەی خواپەرستین، پێویستە بپارێزرێن لە پیسی و بۆنی ناخۆش، لای موسلیم ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إنَّ هَذِهِ المَسَاجِد لا تَصلُحُ لِشيئٍ مِن هَذَا البَولِ وَالقَذَر، إنَّمَا هِيَ لِذكرِ اللهِ وَقِرَاءَةِ القُرآن) واتە: ئەم شوێنانە مزگەوتن ناشێن بۆ شتی پیس وەك میزو پیسی بەڵکو بۆ یادی خواو قورئان خوێندن دانراوون.

وە لای ئەحمەد هاتووە بە سەنەدی صەحیح کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذَا تَنَخَّمَ أحَدُكُم فَليُغَيِّب نُخَامَتَهُ أن تُصِيبَ جِلدَ مُؤمِنٍ أو ثَوبَهُ فَتُؤذِيَهُ)[2] واتە: ئەگەر کەسێك لووتی پاك کردەوە لە مزگەوتدا باچڵمەکەی بشارێتەوە نەك بچێت لەپێست یا جلی باوەڕدارێکەوە ئازاری بدات.

ئەحمەدو بوخاری لە ئەبی هورەیرەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذَا قَامَ أحَدُكُم فِي الصَّلاةِ فَلا يَتَبَزَّقَنَّ أمَامَهُ فَإنَّهُ يُنَاجِيهِ اللهُ تَبَارَكَ وتعالى، مَادَامَ فِي مُصَلَّاهُ، وَلا عَن يَمِينِهِ فَإنَّ عَن يَمِينِهِ مَلَكاً، وَلِيَبصُق عَن يَسَارِهِ أو تَحتَ قَدَمِهِ فَيَدفِنَهَا). واتە: ئەگەر کەسێکتان هەڵسا لەنوێژدا با تف نەکاتە بەردەمی، چونکە لەوکاتەدا لەگەڵ خوادا ئەدوێ هەتا لەشوێنی نوێژەکەدا بێت، وە هەروەها نەیکاتە لای ڕاستی چونکە فریشتەیەك لەلای ڕاستیەتی، با بەلای چەپدا تف بکات یا لەبن پێیدا ئەوسا بیشارێتەوە.

وە لە حەدیسێکدا کە بوخاری و موسلیم لەسەر صیحەتی ڕێك کەوتوون لە جابیرەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن أكَلَ الثُومَ وَالبَصَلَ وَالكُرَّاثَ فَلا يَقرَبَنَّ مَسجِدَنَا فَإنَّ المَلائِكَةَ تَتَأذَّى مِمَّا يَتَأذَّى مِنهُ بَنُو آدَم) واتە: هەرکەس سیرو پیازو کەوەری خوارد، با نزیك

---

(١) ئیسنادەکەی لاوازە دوو عیللەتی تێدایە، بوخاری و (ترمذي و قرطبـي) و جگە لەمیش بە (ضعيف)یان داناوە، و ڕوون کردنەوەی ئەمە لە (ضعيف أبي داود ٧١)دایە، وە بڕوانە (المشكاة ٧٢٠). (تمام المنة).

(٢) تەنها (حافظ) بە (جيد) ی داناوە، و ئەمەش ڕاستە لەبەر ئەوەی لە سەنەدەکەیدا موحەممەدی کوڕی ئیسحاقی تێدایە، و ئەم قسەی لەسەر ووتراوە، و ئەوەی بڕیاری لەسەر دراوە ئەوەیە کە حەدیسەکەی حەسەنە ئەگەر بە ڕاشکاوی (حدثنا)ی تێدا بێت، هەروەك لێرەدا کردوویەتی، و ڕەنگە دانەر ئەم تەصحیح کردنەی لە ووتەی (هيثمي) یەوە وەرگرتبێت لەبارەیەوە (رواه أحمد وأبو يعلى، ورجاله موثوقون) وە واش نیە وەك ئاماژەم بۆ کرد لە پێشاندا. (تمام المنة).

مزگەوتەکەمان نەبێتەوە چونکە فریشتەکان بەو شتەی ئادەمیزاد ئازاری پێ ئەگا، ئەوانیش ئازاریان پێ ئەگات، (خواردنی ئەمانە دروستە، بەڵام ئەوکەسەی ئەوانە ئەخوات پێویستە لەسەری نەچێ بۆ مزگەوت و ناوکۆمەڵی خەڵکی تا بۆنەکەیان تەواو ئەبێ، وە هەر بۆنێکی ناخۆشیش هەر سەر بەمانەیە وەك: جگەرەو قرقێنەو بۆنی دەم)[1].

عومەر خوا لێی ڕازی بێت ڕۆژێکی جومعە وتاری ئەدا ئەیفەرموو: ئەی خەڵکینە ئەو دوو ڕووەکە ئەخۆن من وابزانم پیس بن، (سیر و پیاز)، خۆم پێغەمبەرم بینیوە ﷺ هەرپیاوێك بۆنی ئەو دووانەی لێ بهاتایە فەرمانی پێ ئەکرد بچێتە بەقیع و لەو ناوە نەمێنێ، جا هەرکەس ئەیان خوات با بە کولاندن بۆنەکەیان بمرێنێ. (ئەحمەدو موسلیم و نەسائی گێڕاویانەتەوە).

**(١١) بانگەواز کردن بۆ شتی وون بوو و کڕین و فرۆشتن و شیعر ووتن لەمزگەوتدا کەراهەتی هەیە:**

لە ئەبو هورەیرەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن سَمِعَ رَجُلاً يَنشُدُ ضَالَّةً فِي المَسجِدِ فَلْيَقُل لا رَدَّهَا اللهُ عَلَيكَ، فَإنَّ المَسَاجِدَ لَم تُبنَ لِهَذَا) (رواه مسلم). واتە: هەرکەس گوێی لێ بوو پیاوێك بانگەوازی ئەکرد بۆ وون بوویەك با پێی بڵێت: دەك خوا بۆتی نەگێڕێتەوە، چونکە مزگەوتەکان بۆ ئەوە دروست نەکراوون.

هەروەها لەوەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذَا رَأيتُم مَن يَبِيعُ أو يَبتَاعُ فِي المَسجِدِ فَقُولُوا: لا أربَحَ اللهُ تِجَارَتَكَ) (رواه النسائي والترمذي وحسنه). واتە: کاتێ بینیتان یەکێك کڕین و فرۆشتن لەمزگەوتا ئەکات بڵێن: خوا بازرگانییەکەت سودبەخش نەکات.

لە عبداللە ی کوڕی عومەرەوە هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردبوو کڕین و فرۆشتن لەمزگەوتدا بکرێت، وەهەروەها شیعر ووتنی تێدا قەدەغە کردبو، لەگەڵ بانگەواز کردن بۆ وون بوو، وە قەدەغەی کردبوو خەڵکی دابنیشن بەبازنەیی پێش نوێژی جومعە (رواه الخمسة وصححه الترمذي).

---

(١) باس کردنی بۆنی دەم لەگەڵ ئەمانە جێی تێڕوانینە، لەبەر ئەوەی ئەو بۆنە عیللەتێکی خوایییەو ویست و ئیرادەی ئادەمیزادی تێدا نییە، و بۆخۆی توانای لادانی نییە، جا ئیتر چۆن ئەمە لەگەڵ ئەو بۆنە ناخۆشانە باس دەکرێت کە بە ویست و ئیرادەی خۆیەتیو دەتوانێت بەکاریان نەهێنێ، وە شاریعی حەکیم بۆیە خواردنی سیری قەدەغە کردووە لەسەر کەسێك کە ئامادە دەبێت لە مزگەوت و فەزڵی جەماعەتی دەست دەکەوێت، بۆ سزادانی ئەوکەسە، لەبەر ئەو گوێ نەدانەی بە ئازاردانی ئیمانداران و فریشتە نزیکەکان، کەوابێ دروست نییە کەسێك بێ بەش بکرێت لەم فەزڵە بە هۆی ئەو عیللەتەوە، لەبەر ئەو جیاوازییەی کە باسمان لێوە کرد. (تمام المنة).

وە ئەوشیعرەی قەدەغەکراوە لە مزگەوتدا بووترێت ئەوشیعرانەیە هێرش دەکاتە سەر موسڵمانان یا مەدحی ستەمکار و شتی ناشیرین و گەلێ شتی لەوجۆرانە.

بەڵام ئەو شیعرانەی حیکمەتیان تێدایە یا مەدحی ئیسلام بکات، یا پاڵ بەخەڵکەوە بنێت بۆ کاری چاکە ئەوانە ووتنیان لەمزگەوتدا خراپ نییە.

لە ئەبی هورەیرەوە هاتووە دەفەرموێت: عومەر بەلای حەسساندا تێپەڕی لە مزگەوتدا شیعری ئەووت، بەمۆرەوە سەیرێکی کرد، حەسسانیش ووتی: لەکاتێکدا شیعرم ئەوت ئەوکەسەی تێدا بوو کە لەتۆ چاکترە، پاشان ڕووی کردە ئەبی هورەیرەو ووتی: تۆ پێم بڵێ گوێت لەپێغەمبەر ﷺ نەبووە ئەیفەرموو: لەجیاتی من وەڵام بدەرەوەو دوعای بۆ ئەکردم و ئەیفەرموو: خوایە جوبرائیل بکە بەپاڵ پشتی، ئەویش ووتی: بەڵێ گوێم لێ بووە. (متفق علیه).

**(١٢) سواڵکردن لە مزگەوتدا:**

شێخی ئیسلام ئیبنوتەیمیەیە دەفەرموێت: سواڵ کردن لەئەصڵدا حەرامە لەناو مزگەوتەکان و غەیری مزگەوتەکانیشدا، مەگەر بۆ کەسانێك نەبێت زۆر پێویستن، جا ئەگەر زۆر پێویست بوو لەمزگەوتێکدا دانیشت و کەسی ئازار نەدا وەك هەنگاونان بەسەر کەسداو درۆ نەکات لەوشتانەی ئەیانڵێت، وە ئەوەندە دەنگ بەرز نەکاتەوە خەڵك زیانی پێ بگات، وەك ئەوەی کاتی ووتاری ئیمام داوا بکات وەیا کاتێ خەڵکەکە بێ دەنگ دانیشتوون گوێیان گرتووە لە عیلمێك ئەم مەشغوڵیان بکات بە داواکردن، ئەوە دروستە.

**(١٣) دەنگ بەرز کردنەوە لەمزگەوتدا:**

حەرامە لە مزگەوتدا دەنگ بەرز بکرێتەوە بەشێوەیەك نوێژ لە نوێژخوێنەران تێك بچێت، با بە قورئان خوێندنیش بێت، بێجگە لە وانەکانی زانستی ئاینیی.

لە ئیبنو عومەرەوە هاتووە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ هاتە ناو خەڵکەکە لەکاتێکدا نوێژیان ئەکرد بەدەنگی بەرز، ئەویش فەرمووی: (إنَّ المَصَلِّيَ يُنَاجِي رَبَّهُ عَزَّوَجل فَلِيَنظُر بِمَ يُنَاجِيهِ؟ وَلا يَجهَر بَعضُكُم على بَعضٍ بِالقُرآن) (رواه أحمد بسند صحيح) واتە: بەڕاستی نوێژخوێن لەگەڵ پەروەردگاری خۆیدا ئەدوێ سەیری کەن بزانن بەچی لەگەڵیا ئەدوێن؟ با کەس دەنگی بە قورئان خوێندن بەسەر کەسی تردا بەرز نەکاتەوە.

لە ئەبوسەعیدی خودرییەوە ریوایەت کراوە کە پێغەمبەر ﷺ ئیعتیکافی کردبوو لەمزگەوتدا گوێی لێبوو بەدەنگی بەرز قورئانیان ئەخوێند، پەردەکەی لاداو فەرمووی: (ألا إنَّ كُلَّكُم مُنَاجٍ رَبَّهُ فَلا يُؤذِيَنَّ بَعضُكُم بَعضاً، وَلا يَرفَع بَعضُكُم على بَعضٍ فِي القِرَاءَةِ) (رواه أبوداود والنسائي

والبيهقي والحاكم وقال: صحيح على شرط الشيخين) واته: ئێوه هەمووتان لە نوێژدا لەگەڵ پەروەردگارتان ئەدوێن، کەستان ئازاری کەستان مەدەن و کەستان دەنگ بەرز نەکاتەوە بە قورئان خوێندن بەسەر کەسدا.

### (١٤) قسەکردن لە مزگەوتدا:

ئیمام نەوەوی دەفەرمووێت: دروستە لەمزگەوتدا قسەی ڕەوا بکرێت دەربارەی کاروباری دنیاو شتی تری ڕەوا، وە پێکەنین دروستە لەسەر شتی ڕەوا لە مزگەوتدا، بەپێی ئەوحەدیسەی جابیری کوڕی سەمورە ئەیگێڕێتەوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ لەوشوێنەی نوێژی بەیانی تێدا ئەکرد هەڵنەئەسا هەتا خۆر دەرنەکەوتایە، کاتێ خۆر دەرئەکەوت هەڵئەسا، ئەفەرمووێت: لەوماوەیەدا قسەیان ئەکرد دەربارەی سەردەمی نەزانی و پێئەکەنین، وە پێغەمبەریش زەردەخەنەی ئەکرد. (موسلیم ریوایەتی کردووە).

### (١٥) ڕەوایی خواردن و خواردنەوەو نوستن لە مزگەوتدا:

لە ئیبنو عومەرەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ کاتی لاوێمان نیوەڕۆیان لەمزگەوتدا ئەخەوتین.

نەوەوی دەفەرمووێت: (ثابت) بوە کە ئەصحابی صوففە و عورەنی‌یەکان و عەلی و صەفوانی کوڕی ئومەییە و کۆمەڵێك لە صەحابەی تر لەمزگەوتدا خەوتوون، وە (ثمامة) پێش ئیسلام بوونی شەویش لەمزگەوتا ئەمایەوە. ئەمانە هەمووی لەسەردەمی پێغەمبەردا بوون ﷺ.

شافیعی لە کتێبی (الأم)دا دەفەرمووێت: ئەگەر بێ باوەڕ مابێتەوە لە مزگەوتدا چۆن ئەبێت موسڵمان نەمێنێتەوە.

لە (المختصر)دا دەفەرمووێت: قەیناکە بێ باوەڕ شەو لەمزگەوتدا بمێنێتەوە، جگە لە مزگەوتی حەرام، وە عبدالله ی کوڕی (حارث) دەفەرمووێت: لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ نان و گۆشتمان ئەخوارد لەمزگەوتدا، (ئیبنو ماجە بەسەنەدێکی حەسەن گێڕاویەتی یەوە)[1].

### (١٦) پەنجە خستنەناو پەنجە:

---

(١) ئیسنادەکەی صەحیحە، هەروەك بلۆی دانەر لەم تەصحیح کردنە دووای خاوەنی (الزوائد) کەوتووە کە دەفەرمووێت: (إسناده حسن ورجاله حسن، ويعقوب مختلف فيه) منیش دەڵێم: ئەگەر یەعقوب بە تەنهایی بیگێڕایەتەوە ئەوە وەك ئەو دەفەرمووێت: حەسەنە، بەڵام ئیبنو ماجە لێوەی ریوایەت کردووە حەرمەلەی کوڕی یەحیاشی تێدایە، وە حەرمەلە سیقەیەو بەمە ئیسنادەکەی ئەبێ بە صەحیح. (تمام المنة).

کەراهەتی هەیە پەنجە بخرێتە ناو پەنجە لە کاتی چوونەدەر بۆ نوێژ و لەناو مزگەوتداو کاتی چاوەڕوان کردن بۆ نوێژ، جگە لەو کاتە ئیتر کەراهەتی نی‌یە، با لەناو مزگەوتیشدا بێت.

لەکەعبەوە هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذَا تَوضَّأَ أحَدُكُم فَأحسَنَ الوُضُوءَ ثُمَّ خَرَجَ عَامِداً إلى المَسجِدِ فلا يُشَبِّكَنَّ بَينَ أصَابِعِه فإنَّهُ فِي الصَّلاةِ) (رواه أحمد وأبوداود والترمذي). واتە: کاتێ کەسێکتان بەچاکی دەستنوێژ ئەگرێ و ئەچێ بەرەو مزگەوت، با پەنجە نەخاتە ناو پەنجەی (واتە پەنجەکان تێکەڵ کێش نەکات) چونکە ئەو کەسە لەنوێژدایە.

لە ئەبوسەعیدی خودری‌یەوە هاتووە دەفەرمووێت: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ چوومە ناو مزگەوت، پیاوێك دانیشتبوو پەنجەکانی خستبووە ناو پەنجەکانی و ئیحتیبائی کردبوو (واتە: لەسەر هەردوو سمتی دانیشتبوو، هەردوو قاچی هەڵنابوو بەجۆرێ هەردوو ئەژنۆکانی لەئاستی سنگی بوو، وە هەردوو دەستی بەرئەژنۆ نابوو) پێغەمبەر ﷺ ئیشارەتی بۆ کرد کابراکە تێ نەگەیشت، پێغەمبەر ﷺ تاوڕی دایەوەو فەرمووی: (إذَا كَانَ أحَدُكُم فِي المَسجِدِ فلا يُشَبِّكَنَّ فَإنَّ التشبِيكَ مِنَ الشَّيطَانِ، وَإنَّ أحَدَكُم لايَزَالُ فِي صَلاةٍ مَا كَانَ فِي المَسجِدِ حتى يَخرُجَ مِنهُ) (رواه أحمد). واتە: ئەگەر کەسێکتان لەناو مزگەوتدا دانیشتبوو پەنجە نەخاتە ناو پەنجەی، چونکە پەنجە خستنە ناو پەنجە لەشەیتانەوەیە، بەڕاستی هەتا لەمزگەوتدا بێت و نەچووبێتە دەر هەر لەنوێژدایە.

**(١٧) نوێژ کردن لەنێوان پایەکانی مزگەوتدا:**

دروستە بۆ بەرنوێژ و بۆ کەسێك کەبەتاك نوێژ بکات لەنێوان پایەکانی مزگەوتدا بیکات، بەپێی ئەوەی بوخاری و موسلیم لە ئیبنوعومەرەوە ئەگێڕنەوە کە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ چووە ناوکەعبەوە لەنێوان دوو کۆڵەکەکەدا نوێژی کرد، وە سەعیدی کوڕی جوبەیر و ئیبراهیمی تەیمی و سوەیدی کوڕی غەفلە لەنێوان دوو کۆڵەکەکەدا بەرنوێژیان ئەکرد بۆ هۆزەکەیان.

بەڵام ئەوانەی لەریزەکاندا ئەوەستن لەنوێژی کۆمەڵدا کەراهەتی هەیە بۆیان ریز ببن بۆ نوێژ لەنێوان پایەکاندا یان کۆڵەکەکاندا، بەمەرجێك جێگای تر هەبێت، و مزگەوتەکە فراوان بێت، چونکە ئەو کۆڵەکەو پایانە ریزەکان لەیەك ئەبڕن، بەڵام ئەگەر مزگەوتەکە فراوان نەبوو جێگا کەم بوو، ئەوە کەراهەتی نی‌یە.

لە ئەنەسەوە هاتووە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: لێمان قەدەغەکرابوو لەنێوان کۆڵەکەکانی مزگەوتدا نوێژ بکەین، ئەگەر لەنێوانیاندا نوێژمان بکردایە دەرئەکراین. حاکم گێڕاویەتی‌یەوە و بەصەحیحی داناوە.

لە موعاویەی کوڕی قوڕڕەوە لەباوکی‌یەوە هاتوە دەفەرمووێت: لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ نەیان ئەهێشت لەنێوان کۆڵەکەکانی مزگەوتدا ڕیز دروست بکەین، ئەگەر لەنێوانیاندا ڕیزمان دروست بکردایە بۆ نوێژ کردن دەریان ئەکردینە ئەولاتر، ئیبنوماجە گێڕاویەتی‌یەوە، بەڵام لەسەنەدەکەیدا کابرایەکی مەجهول هەیە[1].

سەعیدی کوڕی مەنصور لەسونەنەکەیدا ئەگێڕێتەوە کە ئیبنو مەسعودو ئیبنو عەبباس و (حذیفە) نەیان ئەهێشت کەس ئەوە بکات.

(ابن سیدالناس) دەفەرمووێت: کەسێك نی‌یە لە ئەصحاب بەپێچەوانەی ئەوانەوە کاری کردبێت.

**ئەوشوێنانەی نوێژ کردن قەدەغەیە تی‌یاندا:**

دەربارەی قەدەغەیی نوێژ کردن لەم شوێنانەدا ئەم حەدیسانە هاتوون:

**١- نوێژ کردن لەناو گۆڕستاندا[2]:**

لای شەیخەین و ئەحمەد و نەسائی هاتووە لە عائیشەوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لَعَنَ اللهُ اليَهُودَ والنصارى اتَّخَذُوا قُبُورَ أنبِيَائِهِم مَسَاجِدَ) واتە: نەفرینی خوا لەجوولەکە و گاور بێت گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کردووە بە مزگەوت و شوێنی نوێژ کردن.

لای ئەحمەدو موسلیم هاتووە لە (أبو مرثد)ی غەنەوی‌یەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لاتُصَلُّوا إلى القُبُورِ وَلا تَجلِسُوا عَلَيهَا) واتە: بەرەو گۆڕ نوێژ مەکەن و لەسەریان دامەنیشن.

وە هەر لای ئەودووانەوە هاتووە لە جوندوبی کوڕی عبداللەی بەجەلی‌یەوە دەفەرمووێت: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە پێنج ڕۆژ پێش ئەوەی فەوت بکات ئەی فەرموو: (إنَّ مَن كَانَ قَبلَكُم كَانُوا يَتَّخِذُونَ قُبُورَ أنبِيَائِهِم مَسَاجِدَ، ألا فَلا تَتَّخِذُوا القُبُورَ مَسَاجِدَ، إنِّي أنهَاكُم عَن ذَلِكَ)[3]. واتە:

---

(١) منیش دەڵێم (لە دوای تەخریج و لێکۆڵینەوە): ئەو نەفەرەی کە ئەڵێن مەجهولە، ناوی هارونی کوڕی موسلیمە، ناسراوە و مەجهول نی‌یە، وە ئیسنادەکەشی صەحیحە یان بە لایەنی کەمەوە حەسەنە، وە قسەش لەوەدا نی‌یە کە صەحیحە بەهۆی حەدیسەکەی ئەنەسەوە. والله أعلم. (تمام المنة).

(٢) قەدەغەکردنی گۆڕستان بەمزگەوت و نوێژ کردن لەسەریان لەبەر ئەوەیە نەوەکو زیادەڕەوی بکرێ لە بەگەورەدانانی مردو و پەیدابوونی حەرام، کەواتە ئەمە لەبەر بەربەست کردنی ڕێگایە بەرەو حەرام. (دانەر)

(٣) لێرەدا حەدیسەکەی نیسبەت داوە بۆ شەیخەین، وا نی‌یە، چونکە حەدیسەکە بە تەنهایی موسلیم گێڕاویەتی‌یەوە بێجگە لە بوخاری، وەك لە (تحفة الأشراف) و ئەوانەی تردا هاتووە وەك (نیل الأوطار ٢/١١٤)، هەروەها لە (إرواء الغليل) دا تەخریج کراوە بە ژمارە (١/٣١٨). (تمام المنة).

نەتەوەکانی پێش ئێوە گۆڕی پێغەمبەرەکانیان ئەکردە مزگەوت و شوێنی نوێژ، ئێوە نەچن گۆڕەکان بکەنە مزگەوت و شوێنی نوێژ، من ئەوەتان لێ قەدەغە ئەکەم.

لە عائیشەوە هاتووە کە ئومموسەلەمە باسی کەنیسەیەکی بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەگێڕایەوە کە بینیبووی لە حەبەشە پێیان ئەوت (ماریە)، جا باسی ئەکرد چۆن وێنەی زۆریان تێدا کێشابوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أُولَئِكَ قَومٌ إذَا مَاتَ فِيهِمُ العَبدُ الصَّالِح أوِ الرَّجُلُ الصَّالِحُ بَنَوا على قَبرِهِ مَسجِداً وَصَوَّرُوا فِيهِ تِلكَ الصُّوَرَ، أُولَئِكَ شِرَارُ الخَلقِ عِندَ اللهِ) (رواه البخاري و مسلم والنسائي) واتە: ئەوانە نەتەوەیەکن ئەگەر بەندەیەکی چاکی خوا یا پیاوچاکێك لەناویاندا بێت و بمرێت، لەسەر گۆڕەکەی نوێژگایەك (مزگەوتێك) دروست ئەکەن و ئەو وێنانەی لەسەر ئەکێشن ئەوانە خراپترین خەڵکن لای خوا.

وە هەر لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتووە کە فەرموویەتی: (لَعَنَ اللهُ زَائِرَاتِ القُبُورِ وَالْمُتَّخِذِينَ عَلَيهَا المَسَاجِدَ وَالسُّرُج)[1] واتە: نەفرینی خوا لەو ئافرەتانەی ئەچنە سەر گۆڕستان، نەفرینی خوا لەوکەسانەی نوێژگایان لەسەر دروست ئەکەن و چرایان لەسەر دائەگیرسێنن.

زۆر لە زانایان ئەو (نهي) قەدەغەییەیە لەسەر کەراهەت دائەنێن، جا ئەو گۆڕستانە لەپێش نوێژکەرەوە بێت یا لەدوایەوە بێت وەك یەکە.

وە لای (ظاهري) یەکان ئەو (نهي) قەدەغەبوونە لەسەر حەرام بوون دائەنێن، وە ئەڵێن: نوێژ کردن لەگۆڕستاندا دروست نییە و پوچەڵە[2].

لای حەنبەلییەکان نوێژەکە پوچەڵە، ئەگەر ئەو گۆرستانە سێ گۆڕ بەرەو ژووری تێدابێت، بەڵام ئەو گۆڕستانەی گۆڕێك یا دوو گۆڕی تێدابوو، نوێژ تێیدا دروستە بەکەراهەتەوە کاتێ گۆڕەکە لەپێش نوێژکەرەوە بێت، ئەگینا کەراهەتیشی نییە[1].

---

(١) ئەم فەرموودەیە لەگەڵ ئەوەشدا بەناوبانگە کەچی ئیسنادەکەی لاوازە، چونکە لە ریوایەتی ئەبو صالح لە باذامەوە لە ئیبنوعەبباسەوەیە، ئەم بازامەش جەماوەری زانایان بە زەعیفیان داناوە، بەڵکو هەندێکیان تۆمەتی درۆیان تێ گرتووە، وەك لە (أحكام الجنائز) دا باسم کردووە، هەروەها لە (التعليقات الجياد)دا باسم بۆ داناوە، جا با گەڕانەوە بۆ (تهذيب السنن) بکرێت لەگەڵ (التلخيص)دا. بەڵێ حەدیسەکە بە حەدیسێکی تر صەحیح ئەبێت کە بە زاراوەی (...زوّارات...) هاتووە، لەبەر ئەوەی ئەمەیان چەند شاهیدی هەیە، بێجگە لە ووشەی (السرج) کە ئەمە شاهیدی نییە و هەر بە لاوازی ئەمێنێتەوە. (تمام المنة).

(٣) ئەمەش ئاشکراو ڕونە کە کەس ناتوانێ لێی لابدات، چونکە ئەو (حدیث)انەی هاتوون هەموو ڕاست و ڕێکن دەربارەی حەرامی نوێژ لەگۆڕستاندا، ئەو گۆڕستانەی گۆڕێکی تێدا بێت یا زیاتر وەك یەکە .

## ٢- نوێژکردن لەکەنیسە و (بیعە) پەرستگای گاورو جولەکەدا:

ئەبوموسای ئەشعەری و عومەری کوڕی عبدالعزیز لەکەنیسەدا نوێژیان کردووە، وە شەعبی و (عطاء) و ئیبنوسیرین نوێژ کردن لەکەنیسەدا بەخراپ نازانن.

بوخاری دەفەرموێت: ئیبنوعەبباس لە (بیعە) دا نوێژی ئەکرد بەمەرجێك پەیکەری تێدا نەبووایە، وە لە نەجرانەوە نامەیەك هات بۆ عومەر تێیدا نووسرابوو لە (بیعە) مان پاکو خاوێنتر دەست ناکەوێت نوێژی تێدا بکەین، ئەویش وەڵامی نامەکەی دایەوە فەرمووی: پاك بە ئاوو سیدر

---

(١) منیش ئەڵێم: ئەمە لای حەنبەلی‌یەکان بەو شێوەیە، بەڵام شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمیەیە ئەم ڕایەی ڕەد کردۆتەوەو ڕازی نی‌یە لێی، وە لە زۆربەی یارەکانی ئەحمەدەوە ئەوە باس ئەکات، کە جیاوازی نی‌یە لە نێوان قەبرستانێك کە یەك قەبری تێدایە یان زیاتری تێدا بێت، وە لە (الإختیارات العلمیة) دا ئەڵێت: دروست نی‌یە نوێژ لەناو قەبرستاندا بکرێت، یان بەرەو ڕووی قەبرستان بکرێت، ئەو نەهی‌یەش لەبەر داخستنی دەرگای شیرکە، وە هەندێك لە هاوەڵەکانمان ئەوەیان باس کردووە کە یەك قەبر و دوو قەبر قەیناکە نوێژی تێدا بکرێ، لەبەر ئەوەی ناوی قەبرستان نایگرێتەوە، چونکە قەبرستان لە سێ قەبر بەرەو ژوورتر ئەوترێت،

جا نە لای ئەحمەد و نە لای هاوەڵەکانی ئەم جیا کردنەوەیە نی‌یە، بەڵکو قسەکەیان بە گشتی‌یە و بەڵگە هێنانەوەیان و عیللەتەکەیان ئەوە بووە کە نوێژ کردن تەنانەت لەسەر یەك قەبریش دروست نی‌یە.

ئەم قسەیەش ڕاستە و پێکاوێتی، جا قەبرستان بە هەموو شوێنێك ئەوترێ کە کەسێکی تێدا بنێژرێ نەك ئەوەی کە شوێنی چەند قەبرێك بێت، وە هاوەڵەکانمان ئەڵێن: هەموو ئەو شوێنانەی کە ناوی قەبرستانی لەسەرە، لە دەوروو پشتیشی، دروست نی‌یە نوێژی تێدا بکرێت.

وە ئەم نەهی‌یەش هەموو ئەو شوێنانە ئەگرێتەوە کە پەیوەندی بە یەك تاکە قەبرەوە هەیە.

ئامودی ووتویەتی: دروست نی‌یە لەو مزگەوتەدا نوێژ بکرێ کە قیبلەکەی قەبری تێدایە، هەتاوەکو لەنێوان مزگەوتەکە و قەبرەکەدا بەربەستێکی تر نەبێت، وە هەندێك ئەوە باس ئەکەن کە ئەو قسەیە دەقی وتەی ئەحمەدە.

منیش ئەڵێم: شێخی ئیسلام لە (الفتاوی) و جێگەی تریشدا کۆی زانایانی باس کردوە لەبارەی کەراهەتی نوێژکردن لە هەموو ئەو مزگەوتانەی کە لەسەر قەبر دروست کراون، وە مەزهەبی ئەحمەدیشی باس کرد کە ئەو نوێژەی بە باتڵ داناوە.

وە ئەمە لەو حەدیسانەوە وەرگیراوە کە نەهی ئەکات لەوەی کە قەبرستان بکرێ بە مزگەوت، یا بینای بەسەردا دروست بکرێت.

ئەمەش مەسەلەیەکی گرنگە کە زۆربەی زانایان پشت گوێیان خستووە، لەبەر ئەوە پێم خۆش بوو کە ئاگاداری لەسەر بکەم و بەجێی نەهێڵم لەم تەعلیقاتەدا، هەروەها بە شێکراوەییش باسم لێوە کردووە لە (التعلیقات الجیاد) و (أحکام الجنائز) و (تحذیر الساجد من اتخاذ القبور مساجد) دا. (تمام المنة).

بیشۆرن و نوێژی تێدا بکەن، وە حەنەفی‌یەکان و شافیعی‌یەکان ئەڵێن: بەگشتی نوێژ لە (بیعە) دا کەراهەتی هەیە.

**٣- نوێژکردن لەسەر سەرەنگوێلك و قەسابخانە و چەقی ڕێگا و ئیستراحەت گای ووشتر و حەمام و سەربانی کەعبە:**

لە زەیدی کوڕی جوبەیرەوە لەداودی کوڕی حوصەینەوە لە ئیبنوعومەرەوە گێڕاویەتی‌یەوە کە پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردبوو لەحەوت شوێن دا نوێژ بکرێت، ئەوانیش سەرسەرەنگوێلك و قەسابخانە و گۆڕستان و چەقی ڕێگا و ناوحەمام و ئیستراحەتگای ووشتر و سەربانی کەعبە بوون. ئیبنو ماجەو عبداللە ی کوڕی حومەیدو (ترمذي) گێڕاویانەتەوە، وە (ترمذي) دەفەرموێت: ئیسنادەکەی بەهێز نی‌یە)[1].

وە عیللەتی قەدەغەکردنی نوێژ لەسەر سەرەنگوێلك و قەسابخانە، پیسی ئەو شوێنانەیە لەبەر ئەوە بەبێ شتی پاك ڕاخستن لەو شوێنانەدا نوێژ کردن حەرامە، وە لەگەڵ ڕاخستنی شتی پاك کەراهەتی هەیە لای جەماوەری زانایان؛ بەڵام لای ئەحمەد و (ظاهر) ی‌یەکان حەرامە.

---

(١) منیش ئەڵێم: باسی ئەو شوێنانە ئەکات لەپاشاندا لە ترمذی‌یەوە لاوازی ئەو حەدیسە نەقل ئەکات، وە خۆشی لەمەدا لەگەڵی‌یەتی، وە ئەمە ڕاستە وەکو لە (الإرواء ل ٢٨٧)دا ڕوون کراوەتەوە، وە هەروەهایشە، پاشان دەعواکە بێ بەڵگەی ڕاست ئەمێنێتەوە، ئەبوایە دانەر فەرموودەی صەحیحی تری بهێنایە و بیکردایە بە شایەت با هەندێك لەو وشانەشی بگرتایەتەوە، لەوانە:

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الأرضُ كُلُّهَا مَسجِدٌ، إلا المَقبَرَةَ وَالحَمَّام). واتە: سەر زەوی هەمووی جێگەی نوێژە، جگە لە قەبرستان و حەمام نەبێت. ئەبوداود و ترمزی و حاکم و بەیهەقی و جگە لەوان تەخریجیان کردووە و لای هەندێکیان ئیسنادەکەی صەحیحە لەسەر مەرجی شەیخەین، وە لە سەرچاوەکەی پێشوودا تەخریج کراوە.

هەروەها فەرموویەتی: (إذَا حَضَرَتِ الصَّلَاةُ فَلَم تَجِدُوا إلا مَرَابِضَ الغَنَم وَأعطَانَ الإبِلِ فَصَلُّوا فِي مَرَابِضِ الغَنَم، وَلا تُصَلُّوا فِي أعطَانِ الإبِلِ). واتە: هەرکاتێك وەختی نوێژ هات و ئێوەش جگە لە مۆڵگەی مەڕ و مۆڵگەی ووشتر شوێنتان دەست نەکەوت نوێژی تێدا بکەن، ئەوە لە مۆڵگەی مەڕدا نوێژ بکەن، بەڵام لە مۆڵگەی ووشتردا نوێژ مەکەن. ئەحمەد و دارەمی و ئیبنو ماجە و جگە لەوان تەخریجیان کردووە بە سەنەدێکی صەحیح لەسەر مەرجی شەیخەین، لە حەدیسی ئەبو هورەیرەوە.

وە چەند حەدیسێکی تر هەن کە هەر ئەم مانایە ئەدەن لە (الثمر المستطاب) دا تەخریجم کردوون، وە من هیچ حەدسێکی صەحیح نازانم کە نەهی بکات لە نوێژ کردن لەو شوێنانەی تردا، جا نابێت قەول بە باتڵ بوونی نوێژ لەو شوێنانەدا بکرێت، مەگەر بە دەقێك لە پێغەمبەرەوە ﷺ جا با بزاندرێ. (تمام المنة).

وە عیللەتی قەدەغەکردنی نوێژ لە ئیستراحەتگای ووشتردا ئەوەیە لە جنۆکە دروست کراوون، وە شتی تریش ووتراوە لەوبارەوە، وە حوکمی نوێژ کردن لە ئیستراحەتگای ووشتردا وەك حوکمی نوێژی سەرسەرەنگوێلك و قەسابخانە وایە.

وە عیللەتی قەدەغەبوونی نوێژکردن لە چەقی ڕێگادا ئەوەیە: ڕێگا شوێنی ڕۆیشتن و قەرەباڵغی و دەنگەدەنگە، کە ئەمانە ئەبنە هۆی مەشغول بوونی نوێژکەرو وای لێ دێ ئاگای لەنوێژەکەی نامێنێ، بەڵام لەسەر سەربانی کەعبە هۆیەکەی ئەوەیە نوێژکەر ئەبێت ڕوو بکاتە کەعبە نەك لەسەری نوێژ بکات، کە ئەویش پێچەوانەیی ئەو فرمانەیە کە ئەفەرمووێ: بەرەو کەعبە نوێژ بکەن، هەربۆیە زۆر لەزانایان ڕەئیان وایە نوێژکردن دروست نی‌یە لەسەربانی کەعبە، بە پێچەوانەی حەنەفی‌یەکانەوە کە ئەڵێن: نوێژکردن لەسەر سەربانی کەعبە دروستە، بەڵام کەراهەتی هەیە، چونکە بەوشێوەیە ڕێزی تەواوی لێ ناگیرێت.

بەڵام لەناو حەمامدا لەبەر ئەوەیە کە گەرماو شوێنی پیسی لێ کردنەوەیە، وە ئەوەی ئەڵێت: کەراهەتی هەیە جەماوەری زانایانە کاتێ حەمامەکە خاوێن بێت، بەڵام ئەحمەد و (ظاهري) یەکان و (أبوثور) ئەڵێن: نوێژ کردن لەناو حەمامدا دروست نی‌یە.

**نوێژکردن لە کەعبەدا:**

نوێژی فەرز یا نوێژی سوننەت لەناو کەعبەدا دروستە کردنی. لە ئیبنو عومەرەوە هاتووە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ چووە ناو کەعبەوە ئوسامەی کوڕی زەید و بیلال و (عثمان)ی کوڕی (طلحة)ی لەگەڵدا بوو، دەرگایان لەسەر خۆیان داخست کاتێ قاپی‌یەکەیان کردەوە من یەکەم کەس بووم چوومە ناوی، گەیشتم بە بیلال لێم پرسی ئایا پێغەمبەر ﷺ نوێژی تێدا کرد؟ ئەویش فەرمووی: بەڵێ لەنێوان دوو پایەکانی لای ڕاستەوە. (ئەحمەدو هەردوو شێخ گێڕاویانەتەوە).

## (سوترە) بەربەستی بەردەم نوێژکەر

**١- حوکمی (سوترە) بەربەست:**

موستەحەببە بۆ نوێژکەر لەبەردەم خۆیدا سوترەیەك دابنێت بۆ ئەوەی کەس بەبەردەم نوێژەکەیدا نەڕوات و خۆیشی لەوە بەولاوە نەڕوانێت[1].

---

(١) ووتنی پەسەندی نەفی ئەو (حديث)انە ئەکات کە دانەریش یەکیانی هێناوەو فەرمان بەدانانی بەربەست ئەکەن، هەتا لە هەندێکیاندا قەدەغەی نوێژکردن بەبێ بەربەست ئەکات، هەر بەو شێوەیە ئیبنو خوزەیمە لە صەحیحەکەیدا باسی کردووە، جا ئەوو موسلیم لە ئەبو هورەیرەوە بە مەرفوعی ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا

بەپێی ئەوەی ئەبو سەعید ئەگێڕێتەوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذا صلى أحَدُكم فَلْيُصَلِّ إلى سُتْرَةٍ وَلْيَدنُ مِنهَا) (رواه أبوداود وابن ماجة). واتە کاتێ کەسێکتان ویستی نوێژ بکات با ڕووبەڕووی (سوترەیەك) بەربەستێك نوێژ بکات و لێی نزیك بێ.

لە ئیبنوعومەرەوە هاتووە پێغەمبەر ﷺ کاتێ ڕۆژی جەژن ئەچووە دەر بۆ نوێژی جەژن، فەرمانی ئەدا حەربەیەکیان ئەهێنا ئەیان نایە بەردەمیو ڕووبەڕووی نوێژەکەی ئەکرد، خەڵکەکەش لەدوایەوە بوون، جا ئەمەی لەسەفەردا ئەکرد، دوایی ئەمیرەکانیش ئەوکارەیان ئەکرد، (بوخاری و موسلیم و ئەبوداود گێڕاویانەتەوە).

حەنەفیەکان و مالیکی‌یەکان ڕایان وایە بەربەست بۆ نوێژکەر کاتێ موستەحەببە کە ترسی ئەوەی هەبێت کەسێك بەبەردەمی نوێژەکەیدا بڕوات، بەڵام ئەگەر ئەوترسەی نەبوو موستەحەب نی‌یە، بەپێی ئەوەی ئیبنوعەبباس ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە چۆڵەوانی‌یەکدا نوێژی ئەکردو هیچی لەبەردەمدا نەبوو، (ئەحمەدو ئەبوداود و بەیهەقی گێڕاویانەتەوە، وە بەیهەقی دەفەرمووێت: شاهیدێکی هەیە بە ئیسنادێکی ڕاستتر لەمە، لە فەزڵی کوڕی عەبباسەوە) [1].

---

تُصَلِّ إلا إلى سُتْرَةٍ) واتە: نوێژ مەکە بەرەو سوترە نەبێت، جا ئەو بەڵگەیەی کە پاڵپشتە بۆ واجب بوونی سوترە، ئەوەیە کە هۆیەکی شەرعی‌یە بۆ باتڵ نەبوونەوەی نوێژ بە تێپەڕبونی ژنی بالغ، و کەر، و سەگی ڕەش، بە بەردەمیدا -ئەگەر سوترەی دانابوو- وەك لە حەدیسە صەحیحەکەدا هاتووە.

وسوترە بۆ ئەوەیە کە نەهێڵێ کەس بەبەردەمیا بڕوات، لەگەڵ چەند حوکمی تردا کە پەیوەندیان بە سوترەوە هەیە.

وە شەوکانی قەول بە واجب بوونی ئەکات لە (نیل الأوطار ٣/٢) و لە (السیل الجرار ١/١٧٦)دا، وە لە ڕووالەتی قسەی ئیبنوحەزمیشەوە هەروا دەرئەکەوێت لە (المحلى ٤/٨-١٥)دا. (تمام المنة).

(١) ئەمە چەند ڕەخنەیەکی لێ ئەگیرێت:

یەکەم: ئەو عیللەتەی کە باسی کردووە تەنها ڕئی‌یە و هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نی‌یە وە هەروەها لەناو بردن وفەوتاندنی ئەو دەقانەی تێدایە کە لەبارەی واجبێتی سوترەوە هاتووە، کە هەندێکیان باس کران، تەنها بە ڕەئی، وە ئەمەش دروست نی‌یە، بەتایبەت لەوانەیە ئەوکەسەی بەبەردەم نوێژەکەدا ئەڕوات ئادەمیزاد نەبێت بەڵکو لە جنۆکە بێت کە ئادەمیزاد نایبینێ، ئەویش شەیتانە، جا ئەم قسەیە بە صەراحەت لە ووتە و کردەوەی پێغەمبەرەوە ﷺ هاتووە کە فەرموویەتی: (إذا صلى أحَدُكم إلى سُتْرَةٍ فَلْيَدنُ مِنهَا، لا يَقطَع الشَّيطَانُ عَلَيهِ صَلاتَهُ) واتە ئەگەر یەکێك لە ئێوە بەرامبەر بە سوترەیەك نوێژی کرد، با لێی نزیك بێتەوە بۆ ئەوەی شەیتان نوێژەکەی پێ نەبڕێت. ئەم حەدیسەش لە (الصحیحة) دا تەخریج کراوە بە ژمارە (١٣٧٢).

جا مانای کردنەوەی شەیتان بە ئادەمیزادێك کە بە بەردەمیدا بڕوات هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نی‌یە، جگە لە لاوازی باوەڕبوون بەو شتانەی کە نادیارن و غەیبین.

**٢- سوترە بەچی دێتە جێ:**

سوترە بە هەرشتێك كە نوێژكەر لەبەردەمیا دای بنێت بەجێ دێت، هەتا ئەگەر سەری ئەو بەرماڵەش بێت كە ڕای خستووە نوێژی لەسەر ئەكات. لە صەبورەی كوڕی مەعبەدەوە هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذا صلى أحَدُكُم فَلِيَستَتِر لِصَلاتِهِ وَلَو بِسَهمٍ) (رواه أحمد والحاكم وقال: صحيح على شرط مسلم، وقال الهيثمي: رجال أحمد رجال الصحيح). واتە: كاتێ كەسێكتان ویستی نوێژ بكات با شتێك لەبەردەمیا دابنێت، ئەگەر تیرێكیش بوو هەر دایبنێت.

لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە دەفەرموێت: ئەبولقاسم ﷺ فەرموویەتی: (إذا صلى أحَدُكُم فَليَجعَل تلقَاءَ وَجهِهِ شَيئاً، فَإن لَم يَجِد شَيئاً فَليَنصِب عَصاً، فَإن لَم يَكُن لَهُ عَصاً، فَليَخُطَّ خَطاً وَلا يَضُرُّهُ مَا مَرَّ بَينَ يَدَيهِ) (رواه أحمد وأبو داود وابن حبان وصححه، كما صححه أحمد وابن المديني)[1]. واتە كاتێك كەسێكتان ویستی نوێژ بكات با شتێك لەبەر دەمیا دابنێت، ئەگەر هیچی دەست نەكەوت داردەستەكەی بچەقێنێت، ئەگەر داردەستی پێ نەبوو، با هێڵێك لەبەردەمیا

---

وە بە صەحیحی هاتووە كە شەیتان ویستی نوێژەكەی پێغەمبەر ﷺ تێك بدات، تاوەكو خوا زاڵی كرد بەسەریدا و خنكاندی، هەتا تەڕی لیكەكەی هەست پێ كرد لەنێوان پەنجەكانی‌یەوە و فەرمووی: (واللهِ لَولا دَعوَةُ أخِينَا سُلَيمَانَ لأصبَحَ مُوثَقاً يَلعَبُ بِهِ أهلُ المَدِينَةِ) واتە: سوێند بە خوا ئەگەر لەبەر دوعاكەی سولەیمانی برام نەبووایە، ئەوە بە كۆڵەكەی مزگەوتەكەوە ئەبەسترایەوە، تاوەكو خەڵكی مەدینە یاری پێ بكەن. بۆ زیاتر بڕوانە (تمام المنة).

(١) منیش ئەڵێم: ئەم حەدیسە ئیسنادەكەی زەعیفە و صەحیح نی‌یە، با ئەو كەسانەش كە دانەر ناوی هێناون بە صەحیحیان دانابێ، چونكە كەسانی تر جگە لەوان بە زەعیفیان داناوە و ژمارەشیان لەوان زۆرترە، و بەڵگەشیان بەهێزترە، بە تایبەتی كە ئەحمەد ریوایەتی جیاواز لێ‌یەوە هاتوو.

(حافظ) لە (التهذيب)دا لێوەی نەقل كردووە ووتویەتی: خەت كێشانەكە زەعیفە، و لە (التلخيص)دا باسی ئەوەی كردووە كە ئەحمەد بە صەحیحی داناوە و لە (الإستذكار)ی (ابن عبدالبر)ەوە نەقلی كردووە.

وە سوفیانی كوڕی عویەینە و شافیعی و بەغەوی و جگە لەوانیش ناماژەیان بۆ لاوازی كردووە.

هەروەها لە (التهذيب) دا هاتووە: (دارقطني) ووتویەتی: صەحیح نی‌یە و سابت نی‌یە، وە شافیعی لە سونەنی حەرمەلەدا ووتویەتی: نوێژكەر نابێت خەت بكێشێت لەبەر دەمی خۆیدا، مەگەر حەدیسێكی سابت هەبێت و شوێنی كەوێت.

منیش ئەڵێم: مالیك لە (المدونة)دا ووتویەتی: خەتەكە باتڵە. وە لە زانا دوایینەكان ئیبنوصەلاح و نەوەوی و عیراقی و جگە لەوان بە لاوازیان داناوە، وە ئەمە ڕاستە، چونكە دو عیللەتی تێدایە كە ڕێ گرن لەوەی كە بە حەسەن دابنرێت، چ جای صیحەحەت، وە ئەوش كە ڕێ لە حەسەن بوونی ئەگرێ سەرەڕای ئەو دو عیللەتەش (إضطراب و جهالة)ە، بۆ زیاتر بڕوانە (تمام المنة).

بکێشێت، ئەوکاتە هەرچی بەبەردەم نوێژەکەیدا تێپەڕێت زیانی لێ نادات. (بەیهەقی ئەڵێت: ئەو فەرموودەیە لەم حوکمەدا خراپ نیە إن شاء الله).

وە هەر لە پێغەمبەرەوە ﷺ ریوایەت کراوە کە پێغەمبەر ﷺ بەرامبەر ئەو کۆڵەکەیەی لە مزگەوتەکەیدا بوو نوێژی کردووە، وە بەرامبەر درەخت نوێژی کردووە، وە هەروەها بەرامبەر پێخەفەکەی عائیشە نوێژی کردووە، کاتێ عائیشە ڕاکشاوە تێیدا، (ئەمە بەڵگەی ئەوەیە دروستە نوێژ بکرێ بەرامبەر نوستوو، - گەرچی هاتووە کە دروست نیە نوێژ بەرامبەری نوستوو قسەکەر بکرێ، بەڵام صەحیح نیە - )، وە بەرامبەر کۆپانی وەڵاغەکەی لەسەفەردا نوێژی کردووە، هەروەها بەرامبەر لای دوواوەی کۆپانەکە نوێژی کردووە.

لە (طلحة)وە هاتووە دەفەرموێت: کاتێ نوێژمان ئەکرد ئاژەڵ تێئەپەڕی بەبەردەماندا بۆ پێغەمبەرمان ﷺ گێڕایەوە فەرمووی: (مُؤَخِّرَةُ الرَّحلِ تَكونُ بَينَ يَدَي أحَدِكُم ثُمَّ لايَضُرُّهُ مَا مَرَّ عَلَيهِ) (رواه أحمد ومسلم وأبوداود وابن ماجة والترمذي وقال: حسن صحيح) واتە: تەختەی دوای کۆپانی وڵاغ بەسە لەبەردەمتاندا بێت، ئیتر هەرچی بەبەردەم نوێژەکەتاندا تێپەڕێ زیانی نیە بۆتان.

**٣- سوترەی پێش ئیمام سوترەیە بۆ مەئمومەکان:**

ئەو سوترەیەی لەبەردەم بەرنوێژدا دائەنرێت ئەبێتە بەربەست بۆ نوێژکەرەکانی دوایەوەی، لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکیەوە لە باپیریەوە هاتووە دەفەرموێت: لە بەرزایی ئەزاخیەوە - جێگایەکی نزیکی مەککە - ئەهاتینە خوارەوە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ کاتی نوێژ هات، پێغەمبەر ﷺ بەرەو دیوارێك نوێژی دابەست، ئێمەش لەدوایەوە نوێژمان دابەست، بەرخۆلەیەك هاتە بەردەمی ئەوەندەی پاڵ بەبەرخۆلەکەوە نا هەتا سکی لکاند بەدیوارەکەوە، ئینجا بەرخۆلەکە هات لەدوایەوە تێ پەڕی. (ئەحمەدو ئەبوداود گێڕاویانەتەوە).

لە ئیبنو عەبباسەوە هاتووە دەفەرموێت: سوواری ماکەرێك بوبووم تەمەنم نزیکی باڵغ بوون ئەبوو، پێغەمبەر ﷺ لە مینا نوێژی ئەکردو خەڵکیش لەدوایەوە، بەبەردەم چەند ریزێکدا بە وڵاغەکەوە تێ پەڕیم پاشان گوێ درێژەکەم بەرەڵا کرد بلەوەڕێ و خۆم هاتم نوێژم دابەست لەگەڵیاندا، کەس ئینکاری ئەوکارەی نەکردم (رواه الجماعة).

ئەم حەدیسانە ئەبنە بەڵگەی دروست بوونی تێپەڕ بوون بەبەردەم مەئمومدا، وە هەروەها بەڵگەی ئەوەی کە سوترە بۆ ئیمام و تاکەکەس شەرعیە.

**٤- نزیك بوونەوە لە سوترە موستەحەببە:**

بەغەوی دەفەرمووێت: زانایان لایان موستەحەببە نزیك بوونەوە لەبەربەست ئەوەندەی کە ئەو نوێژکەرە بتوانێ سەجدەی تێدا ببات، وە هەروەها ڕیزەکانی نوێژی جەماعەت ئەوەندە لەیەك نزیك ببنەوە تەنها جێی سەجدە بردن بمێنێتەوەو بەس، وە لە حەدیسەکەی پێشوودا کە باسمان کرد دەفەرمووێت: با لە بەربەست نزیك ببێتەوە.

لە بیلالەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ سێ (ذراع) لە دیوارێکەوە دوور بوو نوێژی ئەکرد، (ئەحمەدو نەسائی گێڕاویانەتەوە) وە واتاکەی لە بوخاریەوە هاتووە.

لە سەهلی کوڕی سەعدەوە هاتووە دەفەرمووێت: لەنێوان شوێنی سەجدەی پێغەمبەر ﷺ و بەربەستەکەی پێشی بەئەندازەی ڕاڕەوی مەڕێك هەبوو. (بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە).

**٥- حەرامی ڕۆیشتن لەنێوان نوێژکەرو بەربەستەکەیدا:**

حەدیسەکان ئەبنە بەڵگەی حەرامی ڕۆیشتن لەنێوان نوێژکەرو بەربەستەکەیدا، وە بە گوناهی گەورە دائەنرێت، لە بوسری کوڕی سەعیدەوە هاتووە دەفەرمووێت: زەیدی کوڕی خالد ناردمی بۆلای ئەبو جوهەیم لێی بپرسم چی بیستووە دەربارەی تێپەڕ بوون بەبەردەم نوێژکەردا لە پێغەمبەرەوە ﷺ؟ ئەبو جوهەیمیش فەرمووی: پێغەمبەر ﷺ ئەیفەرموو: (لَو يَعلَمُ المَارُّ بَينَ يَدَي المُصَلِّي مَاذَا عَلَيهِ لَكَانَ أن يَقِفَ أربَعِينَ خَيرٌ لَهُ مِن أن يَمُرَّ بَينَ يَدَيهِ) (رواه الجماعة). واتە: ئەگەر تێپەڕ بوو بەبەردەمی نوێژکەردا ئەیزانی چ تاوانێك ئەکات، چل بووەستایە بەپێوە چاکتر بوو بۆی لەك بەبەردەمیا تێپەڕێ[1].

لە زەیدی کوڕی خالیدەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لَو يَعلَمُ المَارُّ بَينَ يَدَي المُصَلِّي مَاذَا عَلَيهِ، كَانَ لأن يَقُومَ أربَعِينَ خَرِيفاً خَيرٌ لَهُ مِن أن يَمُرَّ بَينَ يَدَيهِ) (رواه البزار بسندٍ صحيح[2]). واتە: ئەگەر تێپەڕ بوو بەبەردەمی نوێژکەردا ئەیزانی چ گوناحێکی بۆ ئەبێ، ئەوە باشتر وایە بۆی چل پاییز ڕاوەستێ لەوەی بەبەردەمی نوێژەکەیدا بڕوا.

(١) ئەبو نەصر لە بوسرەوە ئەگێڕێتەوە ئەڵێ: نازانم ئایا فەرمووی چل ڕۆژ یا چل مانگ یا چل ساڵ، وە لە (الفتح) دا هاتووە کە (ظاهر)ی (حديث)ەکە ئەوە ئەگەیەنێت کە قەدەغەیە تێپەڕ بوون بەشێوەیەکی گشتی بەبەردەم نوێژدا، تەنانەت ئەگەر ڕێگایەکی تریشی دەست نەکەوت، بەڵکو ڕاوەستێ تاوەکو نوێژکەر لەنوێژەکەی ئەبێتەوە، وە بەسەرهاتەکەی ئەبو سەعید کە لەمەودووا دێت، ئەمە بەهێز ئەکات، واتای ئەم (حديث)ەش ئەوەیە: ئەگەر تێپەڕبوو ئەندازەی ئەو گوناحەی ئەزانی کە تووشی ئەبێ بەهۆی تێپەڕبوونیەوە بەبەردەمی نوێژکەردا، ئەوە ئەو ماوە باسکراوەی هەڵئەبژارد، تاوەکو ئەو گوناحەی تووش نەبێ. (تمام المنة).

(٢) سەنەدەکەی صەحیح نیە، چونکە مەرجەکانی صەحیح بوونی تێدا تەواو نەبووە. (تمام المنة).

ئیبنو قەییم دەفەرمووێت: ئیبنو حیببان و زانایانی تریش ووتویانە: ئەو حەرامی‌یەتەی باس کراوە لە حەدیسەکەدا بۆ ئەوکەسانەیە بۆ نوێژەکەیان بەربەستیان دانابێت، بەڵام ئەگەر بەربەستی دانەنابوو حەرام نی‌یە ڕۆیشتن بەبەردەمیا[1].

ئەبو حاتیم کە (ابن حبان)ە بۆ ئەو حەرام نەبونە ئەوەی کردۆتە بەڵگە کە لە صەحیحەکەی خۆیدا گێراویەتی‌یەوە لە (مطلب) ی کوڕی ئەبووەداعەوە کە دەفەرمووێت: پێغەمبەرم ﷺ بینیوە کاتێ لەتەواف بۆوە، هاتە قەراغی شوێنی تەوافەکە دوو ڕکات نوێژی کرد، کەس لەنێوان خۆی و تەواف کەرەکاندا نەبوو، (واتە خەڵکەکە بەبەردەم نوێژەکەیدا تێ ئەپەڕین)، ئەبو حاتیم دەفەرمووێت: ئەو خەبەرە بەڵگەیە لەسەر ڕەوایی ڕۆیشتن بەبەردەم نوێژکەردا ئەگەر ئەو نوێژکەرە بەربەستی دانەنابوو، وە هەروەها بەڵگەی ئاشکراشە لەسەر ئەوەی ئەو توندوتیژی‌یەی دەربارەی تێپەڕ بوون هەیە بەبەردەم نوێژکەردا، مەبەستی ئەو نوێژکەرانەیە کە بەربەستیان بۆخۆیان داناوە، نەك ئەوانەی بەربەستیان دانەناوە.

ئەبوحاتیم دەفەرمووێت: ڕوون کردنەوەی ئەوەش ئەوەیە: ئەو نوێژەی پێغەمبەر ﷺ کردوویەتی بەربەست لەنێوان پێغەمبەرو تەواف کەرەکاندا نەبووە.

پاشان حەدیسەکەی (مطلب) دێنێ کە دەفەرمووێت: پێغەمبەرم ﷺ بینیوە بەرامبەر بەردەڕەشەکە نوێژی کردووە و پیاو و ژن بەبەردەمیا ئەڕۆیشتن و بەربەست لەنێوان پێغەمبەرو لەنێوان ئەواندا نەبوو.

لە (الروضة) دا هاتووە: ئەگەر کەسێك بێ بەربەست نوێژی کرد، یا بەربەستی هەبوو بەڵام لێوەی دوور بوو، ئەوەی ڕاستی بێت بۆی نی‌یە پاڵ بەکەسەوە بنێت لەبەر ئەوەی بۆخۆی موقەسیرە، وە لەوکاتەدا ڕۆیشتن بەبەردەمیا حەرام نی‌یە، بەڵام چاکتر وایە ئەوکارە نەکرێت.

**٦- دروستە پاڵ نان بە تێپەڕبووەوە:**

ئەگەر نوێژکەر بەربەستی دانابوو کەسێك یا ئاژەڵێك بەبەردەمیا لەم دیو بەربەستەکەوە ویستی تێپەڕ بێت، ئەو نوێژکەرە بۆی هەیە پاڵ بەو کەسەوە یا ئەو ئاژەڵەوە بنێت و نەیەڵێت تێپەڕ بێت.

---

(١) ئەو حەدیسەی باسی کردووە لاوازە، چونکە لە ریوایەتی کەسێکی کوڕی کەسێکی کوڕی موتەللیبە، کە ئەویش ئیختیلاف و جیاوازی لەسەرە، پاشان ئەگەر حەدیسەکە صەحیحیش بووایە نەئەبووە نەص بۆ بەڵگەهێنانەوەکەی ئیبنوحیبان، لەبەرئەوەی لەوانەیە دروست بونی ڕۆیشتن بەبەردەمی نوێژکەرێکدا کە سوترەی لەبەردەما نەبێت، تایبەت بێت بە مسجد الحرام ەوە، هەروەك هەندێك لە زانایانیش ئەم حەدیسەیان کردۆتە بەڵگەی ئەوە، (تمام المنة).

بەڵام ئەگەر لەودیو بەربەستەکەوە تێپەڕی بۆی نی‌یە پاڵی پێوە بنێت، چونکە ئەو تێپەڕ بوونە زیانی بۆ نوێژکەر نی‌یە.

لە حومەیدی کوڕی هیلالەوە هاتووە دەفەرمووێت: من و هاوەڵێکم حەدیسێکی (پێغەمبەرمان بۆ یەکتر باس ئەکرد، لەوکاتەدا ئەبو صالحی سەممان هات فەرمووی: من ئەو حەدیسەتان بۆ ئەگێڕمەوە کە لە ئەبوسەعیدم بیستووە و لە خۆیشیم بینیوە: ڕۆژێکی هەینی لەگەڵ ئەبو سەعیدا نوێژمان ئەکرد بەربەستێکمان دانابوو بۆ ئەوەی کەس بە بەر نوێژەکەمانا تێنەپەڕێت، لەوکاتەدا لاوێکی (بنو معيط) خۆی کرد بە ژووردا ویستی لەبەردەم ئەبو سەعیدەوە تێپەڕێت، ئەویش دەستی نا بە سنگی‌یەوە لاوەکەش سەیری کرد هیچ ڕێگایەکی تر نەبوو لەبەردەم ئەبو سەعیدەوە نەبێت، بۆیە گەڕایەوە بۆ ئەوەی تێپەڕبێت، ئەمجارە ئەبو سەعید لە جاری یەکەم توندتر دەستی نا بە سنگی لاوەکەوە، ئەویش وەستاوەو دەستی کرد بە جوێندان بە ئەبو سەعید، خەڵك كۆبوونەوە، لاوەکە چوو بۆلای مەڕوان شکاتی لە ئەبوسەعید کرد لەسەر ئەوەی کەلێوەی بینیوە، ئەبو سەعیدیش چوو بۆلای مەڕوان، مەڕوان پێی ووت: ئەوە چیتە لەگەڵ ئەو برازایەتدا، وا شکاتت لێ ئەکات؟ ئەبو سەعیدیش فەرمووی: من خۆم گوێم لە پێغەمبەر بووە ﷺ فەرموویەتی: (إذا صلى أحَدُكُم إلى شَيئٍ يَستُرُهُ مِنَ النَّاسِ فَأرَادَ أحَدٌ أن يَجتَازَ بَينَ يَدَيهِ فَليَدفعهُ فَإن أبى فَليُقَاتِلهُ فَإنَّما هُوَ شَيطانٌ) (رواه البخاري ومسلم). واتە: ئەگەر کەسێکتان نوێژی ئەکردو بەربەستی دانابوو بۆ ئەوەی لە خەڵك بیپارێزێت، کەسێکیش ویستی بەبەرنوێژەکەیدا تێپەڕ بێت، با ئەو نەیەڵێت و پاڵی پێوە بنێت، ئەگەر وازی نەهێنا و نەگەڕایەوە شەڕی لەگەڵدا بکات، چونکە ئەوە شەیتانە.

### ٧- هیچ شتێك نوێژ نابڕێت[1]:

(١) ئەو حەدیسە زەعیفەو ناکرێتە بەڵگە، چونکە لە ریوایەتی موجالیدی کوڕی سەعیدە لە ئەبو وەدداکەوە، موجالیدیش لاوازەو (إضطراب)ی کردوە لە گێڕانەوەی ئەم حەدیسەدا، جارێك ئەم ڕستەیەی (إن الصلاة لايقطعها شئ)ی وەقف کردوەو ڕەفعی نەکردوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ وە جارێکی تر بەرزی کردۆتەوە، وەکو لە ریوایەتێکی تری ئەبوداوددا هەیە، هەروەها ئەم بەسەرهاتەی ئەبوسەعیدو لاوەکە لە چەند ڕێگایەکی تریشەوە هاتوە لە صەحیحەیندا.

هەرچەندە لە چەند صەحابەی تریشەوە گێڕاوەتەوە بەڵام هەموویان زەعیفن، بە پێچەوانەی قسەی هەندێك (محدث) ی هاوچەرخ، وە ئەوەشم لە (ضعيف سنن أبي داود) دا باس کردووە بە ژمارەی (١١٦و١١٧) و لە (الضعيفة) دا بە ژمارە (٥٦٦١).

و حەدیسی صەحیح هاتووە کە بەرهەڵستی ئەم حەدیسە زەعیفانە ئەکات، ئەویش فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ: (يقطع صلاة الرجل -إذا لم يكن بين يديه قيد آخرة الرحل- الحمار والكلب و المرأة) واتە: ئەگەر کەسێك بە ئەندازەی

عەلی و (عثمان) و ئیبنو موسەییب و شەعبی و مالیك و شافیعی و سوفیانی ثەوری و حەنەفیەکان بۆ ئەوە چوون کە هیچ شتێك نوێژ نابڕێت، بەپێی ئەوەی ئەبوداود لە ئەبو وەدداکەوە ئەگێڕێتەوە دەفەرموێت: لاوێکی قوڕەیش بەبەردەم ئەبوسەعیدا ڕۆیشت نوێژی ئەکرد، ئەویش پالێکی پێوە نا نەیهێشت بڕوات، دووبارە هاتەوە ئەویش دووبارە پالی پێوە نایەوە، دیسان هاتەوە ئەویش پالی پێوە نایەوە، هەتا سێ جار کاتێ سلاوی دایەوە فەرمووی: تێ پەڕ بوونی هیچ شتێك بەبەردەمی نوێژکەردا نوێژەکەی نابڕێت، بەڵام پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إدرَؤُوا مَا استَطَعتُم فَإِنَّهُ شَيطانٌ) واتە: هەتا ئەتوانن مەیەڵن و دووری بخەنەوە چونکە ئەوە شەیتانە.

## ئەو شتانەی کردنیان ڕەوایە لەنوێژدا

لە نوێژدا ئەمانەی خوارەوە ڕەوایە بکرێن:

**(١) گریان و نکە نك و ناڵاندن:**

جا لە ترسی خوا یا بۆ شتی تر، وەك ناڵاندن لەبەر موصیبەت و ئازار، بەمەرجێك ئەوکەسە خۆی پێ ڕانەگیرێت و نەتوانێ ئەوە نەکات، بەپێی فەرمودەی خوای گەورە کە ئەفەرموێت: ﴿إِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُ ٱلرَّحۡمَٰنِ خَرُّواْ سُجَّدٗا وَبُكِيّٗا﴾ (مريم/٥٨) واتە: کاتێ ئایەتەکانی پەروەردگار ئەخوێنرێتەوە بۆیان سەجدە ئەبەن بەگریانەوە.

ئەو ئایەتە نوێژکەرو غەیری نوێژکەر ئەگرێتەوە. لە عبداللەی کوڕی (شخير)ەوە هاتووە دەفەرموێت: پێغەمبەرم ﷺ بینیوە نوێژی کردووە سنگی قوڵپەی لێوە ئەهات لەبەر گریان، هەروەك قوڵپەی مەنجەڵ کە ئەکوڵێ. (رواه أحمد وأبوداود والترمذي وصححه).

---

کۆیانی ووشترێکی لەبەر دەستدا نەبێت، سێ شت نوێژەکەی ئەبڕێت: گوێ درێژ، و سەگی ڕەش، و ئافرەت. موسلیم و جگە لەو تەخریجیان کردووە لە حەدیسی ئەبو زەڕەوە، وە لە کتێبەکەمدا (صحيح سنن أبي داود) بە ژمارە (٦٩٩) باس کراوە.

جا ئەگەر ئەو حەدیسانەی پێشوو صەحیح بونایە، ئەوە ئەمان توانی تەوافوق بکەین لە نێوان ئەم حەدیسە و ئەوانەی پێشووەوە، بە شێوەیەك ڕێگایەك نەمێنێ بۆ (تعارض) و پێك دادان، یان بۆ دەعوای نسخ بونەوە، بۆ زیاتر بڕوانە (تمام المنة).

عەلی خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: لە جەنگی بەدردا تەنها میقدادی کوڕی ئەسوەد سووارەبوو لەناوماندا، وە من ئەمبینی کەسمان بەپێوە نەبوو جگە لە پێغەمبەر ﷺ لەژێر درەختێکدا بەپێوە وەستابوو نوێژی ئەکرد و ئەگریا هەتا بەیانی، (ئیبنو حیببان گێڕاویەتی‌یەوە).

عائیشە لە باسی نەخۆشی‌یەکەی پێغەمبەر ﷺ دا کە تێیدا وەفاتی کردووە، ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (مُرُوا أبَابَكرٍ أن يُصَلِّيَ بِالنَّاسِ) واتە: بە ئەبوبەکر بڵێن با بەرنوێژی خەڵکەکە بکات ئەڵێ ووتم: ئەی نێرراوی خوا ئەبوبەکر پیاوێکی دڵ نەرمە، فرمێسکی خۆی پێ ناگیرێت، کاتێ قورئان ئەخوێنێت ئەگری، دەفەرمووێت: ئەوەم بۆیە ووت نەك خەڵك بەوە لە ئەبوبەکر دوور بکەونەوە و بە شوومی بزانن، بەوەی کە یەکەم کەس بێ جێی پێغەمبەر ﷺ بگرێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دووبارە فەرموویەوە: (مُرُوا أبَابَكرٍ فَلِيُصَلِّ بِالنَّاسِ، إنَّكُنَّ صَوَاحِبُ يُوسُفَ) (رواه أحمد وأبوداود وابن حبان والترمذي وصححه) واتە: بە ئەبوبەکر بڵێن بەرنوێژی بۆ خەڵکەکە بکات، ئێوە هەر هاوەڵەکانی یوسفن[1].

ئەو پێ داگرتنەی پێغەمبەر ﷺ بۆ پێش نوێژی کردنی ئەبوبەکر لەگەڵ ئەوەدا پێی ڕاگەیاندرا کە خۆی پێ ڕاناگیرێو ئەگری، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی گریان لەنوێژدا ڕەوایە.

وە عومەر نوێژی بەیانی ئەکرد سوڕەتی یوسفی ئەخوێند کاتێ گەیشتە ﴿قَالَ إِنَّمَآ أَشۡكُواْ بَثِّي وَحُزۡنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾ خەڵکەکە گوێیان لەدەنگی گریانی بوو. (بوخاری و سەعیدی کوڕی مەنصورو ئیبنو مونذیر ئەی گێڕنەوە. وە ئەو دەنگ بەرز کردنەوەی عومەر بە گریان لەنوێژدا بەرپەرچی ئەوانەی تێدایە کە ئەڵێن: گریان لە نوێژدا نوێژەکە پوچەڵ ئەکاتەوە ئەگەر ئەو گریانە دوو پیتی لێ دەربکەوێت، لەترسی خوا بێت یا لەبەر شتی تر، وە ئەوەی کە ئەڵێن: ئەگەر گریان دوو پیتی تێدا دەرکەوت ئەبێتە قسە وانی‌یە، چونکە گریان شتێکەو قسەکردن شتێکی تر.

---

(١) واتە: عائیشە هەروەك هاوەڵەکەی یوسف وایە (زولەیخا) لەمەدا دەعوەتی ئافرەتانی کردو وای نیشان دا کە تەنها لەبەر میوانداری دەعوەتیان ئەکا، بەڵام لەژێرەوە مەبەستی ئەوە بوو چاویان بەجوانی یوسف بکەوێ و ئیتر گلەیی لێ نەکەن لەسەر ئەوەی کە عاشقی‌یەتی، عائیشەش وای نیشان دا کە ئەبوبەکر پێش نوێژی نەکا لەبەر ئەوەی ئەگری، بەڵام لەژێرەوە مەبەستی ئەوە بوو خەڵکی بەشوومی نەزانن، چونکە یەکەم کەسە لەدوای پێغەمبەر ﷺ پێش نوێژی بۆ خەڵك بکات (دانەر).

**(٢) ئاوڕدانەوە کاتی پێویست:**

لەئیبنو عەبباسەوە (خوا لێیان ڕازی بێت) هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ نوێژی ئەکرد بەلای ڕاست و چەپدا ئاوڕی ئەدایەوە بەڵام ئاوڕی بۆ دوواوە نەئەداوە، (ئەحمەد گێڕاویەتی‌یەوە).

ئەبو داود گێڕاویەتی‌یەوە کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی ئەکردو ئاوڕی ئەدایەوە بەرەو دۆڵەکە، وە ئەبوداود دەفەرمووێت: ئەوکاتە سوارێکی ناردبوو بۆ دۆڵەکە بۆ ئەوەی شەوانە پاسەوانی بکا.

وە لە ئەنەسی کوڕی سیرینەوە هاتووە دەفەرمووێت: ئەنەسی کوڕی مالیکم بینیوە چاوی بەرز ئەکردەوە لە نوێژدا بۆ شت و سەیری ئەکرد.

بەڵام ئاوڕدانەوە بۆ شتێکی پێویست نەبێت کەراهەتی هەیە، کەراهەتی تەنزیهی، چونکە لەگەڵ ملکەچی و ڕووکردنە خوا لەنوێژدا یەك نایەتەوە.

لە عائیشەوە هاتووە دەفەرمووێت: دەربارەی ئاوڕدانەوە لەناو نوێژدا پرسیارم لە پێغەمبەر کرد ﷺ فەرمووی: (إختِلاسٌ يَختَلِسُهُ الشَّيطَانُ مِن صَلاةِ العَبدِ) (رواه أحمد والبخاري والنسائي وأبوداود). واتە: دزین و ڕفاندنێکە کە شەیتان لەنوێژی بەندەکانی خوای ئەدزێت.

وە لە ئەبودەردائەوە هاتووە بە مەرفوعی دەفەرمووێت: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ إيَّاكُم وَالإلتِفَاتَ فَإنَّهُ لا صَلاةَ لِلمُلتَفِتِ، فَإن غُلِبتُم فِي التَّطَوُّعِ فَلا تُغلَبُنَّ فُي الفَرَائِض) (رواه أحمد)[1]. واتە: ئەی خەڵکینە نەکەن لەنوێژدا ئاوڕ بدەنەوە چونکە هەرکەس ئاوڕ بداتەوە نوێژەکەی دروست نی‌یە، ئەگەر لەنوێژی سوننەتدا خۆتان بۆ ڕانەگیرا با لە فەرزەکاندا زاڵ نەبێت بەسەرتانا.

لە ئەنەسەوە هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: (إيَّاكَ والإلتِفَاتَ فِي الصَّلاةِ فَإنَّ الإلتِفَاتَ فِي الصَّلاةِ هَلَكَةٌ، فَإن كَانَ وَلا بُدَّ فَفِي التَّطَوُّعِ لا فِي الفَرِيضَةِ) (رواه الترمذي وصححه)[2]. واتە: نەکەی لەنوێژدا ئاوڕ بدەیتەوە چونکە ئاوڕدانەوە لەنوێژدا بە لەناو چوونە، جا ئەگەر هەر ئەبوو ئاوڕ بدەیتەوە با لەنوێژی سوننەتدا بێت نەك لە نوێژە فەرزەکاندا.

---

(١) ئەوە دوو شتی لەسەرە، یەکەم (حديث)ەکەی لای ئەحمەد مەوقوفە نەك مەرفوع.

دووەم: سەنەدەکەی لاوازە و نەناسراوی تێدایە، بە ڕێکەوتنی زانایان، وە باسی قسەی زانایانم کردووە لەسەر ئەو حەدیسەی کە باس کراوە، بەڵێ حەدیسەکە مونذری و هەیثەمی لە ریوایەتەکەی (طبراني)یەوە هێناویانە، لە ئەبودەردائەوە بە مەرفوعی، بەڵام هەردوکیان بە لاوازیان داناوە.

(٢) ئەمەش دوو شتی لەسەرە یەکەم (ترمذي) بە صەحیحی نەگێڕاوە.

دووەم: حەدیسەکە خۆی نە صەحیحە و نە حەسەنە چونکە لە ریوایەتی عەلی کوڕی زەیدی کوڕی جەدعانە.

وە لە حەدیسەکەی (حارث)ی ئەشعەریدا هاتووە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إنَّ اللهَ أمَرَ يحيى ابنَ زَكريَّا بخَمسِ كَلِمَاتٍ أن يَعمَلَ بِهَا وَيَأمُرَ بَنِي إسرَائِيلَ أن يَعمَلُوا بِهَا؛ فِيهِ: ... وَإنَّ اللهَ أمَرَكُم بِالصَّلاةِ فَإذا صَلَّيتُم فَلا تَلتَفِتُوا فَإنَّ اللهَ يَنصِبُ وَجهَهُ لِوَجهِ عَبدِهِ فِي صَلاتِهِ مَا لَم يَلتَفِت) (رواه أحمد والنسائي) واتە: خوا فەرمانی دا بە یەحیای کوڕی زەکەریا بە پێنج شت کاریان پێ بکات و فەرمان بدات بە بەنی ئیسرائیل کاری پێ بکەن، لەوانە خوا فەرمانی پێداوون نوێژ بکەن و ئاوڕی تێدا مەدەنەوە، چونکە خوا ڕووی دائەنێ لە ڕووی ئەو بەندەیەی لەنوێژدایە، بە مەرجێ ئاوڕی نەدابێتەوە.

وە لە (أبوذر)ەوە هاتووە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا يَزَالُ اللهُ مُقبِلاً على العَبدِ وَهُوَ فِي صَلاتِهِ مَا لَم يَلتَفِت، فَإذَا التَفَتَ انصَرَفَ عَنهُ) (رواه أحمد وأبوداود وقال: صحيح الإسناد[1]). واتە: بەندەی خوا هەتا لەنوێژدا بێت خوا بەرامبەری‌یەتی بەمەرجێ ئاوڕی نەدابێتەوە، کاتێ ئاوڕی دایەوە خوا ڕووی لێ وەرئەگێڕێ.

ئەوانەی باسمان کردن هەموی ئاوڕدانەوەیە بە ڕوو، بەڵام ئاوڕ دانەوە بە هەموو لاشەو لە قیبلە وەرگێڕانی نوێژ پوچەڵ ئەکاتەوە بەڕای هەموو زانایان، چونکە ڕوو کردنە قیبلەکە واجبە و ئاوڕدانەوە تێکی ئەدات.

**(٣) کوشتنی مارو دوپشك و زەردەواڵەو ئەوشتانەی زیان بەخشن هەرچەندە کوشتنی کارێکی زۆریشی بوێت:**

لە ئەبی هورەیرەوە هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أُقتُلُوا الأسوَدَينِ فِي الصَّلاةِ الحَيَّةَ والعَقرَبَ) (رواه أحمد وأصحاب السنن ـ الحديث حسن صحيح). واتە: لە نوێژدا دوو شتی ڕەش هەیە ئەگەر بینیتانن بیان کوژن، ئەوانیش مارو دوپشکن.

**(٤) ڕۆیشتنی کەم لەکاتی پێویست:**

لە عائیشەوە هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ لەماڵەوە نوێژی ئەکرد دەرگاکە داخرابوو لە دەرگام دا هات دەرگاکەی کردەوە، پاشان گەڕایەوە جێگای خۆی، وە دەفەرمووێت: دەرگاکە لای

---

(١) دوو سەرنجی لەسەر هەیە: یەکەم: فەرموودەکە ئەبوداود بە صەحیحی نەگێڕاوە، ئەمەش عادەتی ئەبو داود نیە، بەڵکو بە صەحیح دانانەکە هی حاکمە، کە لە المستدرکدا تەخریجی کردوەو ووتویەتی: ئیسنادەکەی صەحیحە. بەڵام لەوە ئەچێ کە هەڵەی چاپی بێت.

دووەم: ئیسنادی (حدیث) ەکەش صەحیح نیە، چونکە ئەبو ئەحوەصی تێدایە، کە ئەویش نەناسراوی تێدایە، وەك ئەوەوی لە مجموع دا باسی کردووە، و حەدیسەکەشی بە مەعلول داناوە، (تمام المنة).

قیبلەوە بوو، (ئەحمەدو ئەبوداود و نەسائی و (ترمذي) کە بەحەسەنی داناوە، گێڕاویانەتەوە)؛ واتە: دەرگاکە لای قیبلەوە بوو، جا پێغەمبەر ﷺ ڕووی لەقیبلە وەرنەگێڕاوە کاتێ هاتووە بۆ کردنەوەی دەرگاکە، وەکاتێ گەڕاوەتەوە جێی خۆی.

وە ئەوەی پشتگیری ئەو قسەیە ئەکات ئەوەیە کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتووە: کە لەکاتی نوێژدا ئەگەر کەسێك لەدەرگای بدایە دەرگاکەی بۆ ئەکردەوە ئەگەر دەرگاکە لە قیبلەدا بووایە یا لای ڕاست بووایە یا لای چەپ، وە پشتی نەئەکردە قیبلە. (دارقطني) گێڕاویەتی‌یەوە[1].

لە ئەزرەقی کوڕی قەیسەوە هاتووە دەفەرمووێت: ئەبو بەرزەی ئەسلەمی لەقەراغ ڕووبارێك لە ئەهواز نوێژی ئەکردو لغاوی ئەسپەکەی گرتبوو بەدەستی‌یەوە، کاتێ وولاغەکە پاشەو پاش ئەگەڕایەوە بەدەمی‌یەوە ئەچوو پاشەوپاش، پیاوێکی خەواریجی ووتی: خوایە ئەو پیرە زەلیل بکەی، چۆن نوێژ ئەکات ؟ دەفەرمووێت: کاتێ نوێژەکەی تەواو کرد فەرمووی: گوێم لە قسەکانت بوو، لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ شەش یا حەوت یا هەشت غەزام کردووە بەچاوی خۆم فەرمانەکانی و ئاسانکاری‌یەکەیم بینیوە، ئەو گەڕانەوەیەم بەسەر وولاغەکەمەوە ئاسان تر بوو لەسەرم لەوەی بەرەڵای بکەم و بگەڕێتەوە ئەو شوێنەی لی‌ی ڕام بووە، ئەوکاتە هێنانەوەی گران بوو لەسەرم. وە ئەبو بەرەزە لەبەر ئەوەی لەسەفەردا بوو دوو ڕکات نوێژی کرد لە عەسرا، (ئەحمەد و بوخاری و بەیهەقی گێڕاویانەتەوە).

بەڵام ڕۆیشتنی زۆر (حافظ) لە (الفتح) دا دەربارەی ئەوە دەفەرمووێت: زانایان هەموو لەسەر ئەوە کۆن کە ڕۆیشتنی زۆر نوێژی فەرز بەتاڵ ئەکاتەوە، جا بۆیە حەدیسەکەی ئەبوبەرەزە لەسەر ڕۆیشتنی کەم دائەنرێت.

**(٥) هەڵگرتنی منداڵ و خۆ هەڵواسینی بەنوێژکەرەوە:**

لە ئەبو قەتادەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی ئەکرد ئومامەی کچی زەینەبی کچی لەسەر ملی دانابوو، کاتێ ئەچووە ڕکوع دایئەنا، کاتێ لە سجودەکەی بەرز ئەبۆوە، هەڵی ئەگرتەوەو ئەیخستە سەر ملی، عامیر دەفەرمووێت: لێم نەپرسی چ نوێژێك بوو؟.

ئیبنوجورەیج دەفەرمووێت لە زەیدی کوڕی ئەبوعیتابەوە لە عەمری کوڕی سولەیمەوە بۆیان گێڕاوەتەوە،ئەو نوێژە نوێژی بەیانی بوو، (أبو عبدالرحمن ـ عبداللهی کوڕی ئیمام ئەحمەد)

---

(١) ئەم زاراوەیە زۆر لاوازە بەڵام لای نەسائی و جگە لەویش بەزاراوەیەکی تری صەحیح هاتووە، وە ئەو ڕۆیشتنەی تێیدایە کە دانەر بەڵگەی بەو حەدیسە لاوازە هێناوەتەوە، ئەوەش لە (الصحیحة) دا بە ژمارە (٢٧١٦) هاتووە، جا ئەگەر دانەر تەنها ئەم حەدیسە صەحیحەی بهێنایە باشتربوو.

دەفەرمووێت: ئیبنو جورەیج ئیسنادی ئەو حەدیسەی بە (جید) داناوە کە دەفەرمووێت: نوێژی بەیانی بووە، (ئەحمەد و نەسائی و غەیری ئەوان گێڕاویانەتەوە).

(فاکهانی) دەفەرمووێت: لەوە ئەچێت نهێنی هەڵگرتنی ئومامە لەنوێژدا لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ بۆ نەهێشتنی ئەو خوو ڕەوشتە بووبێت کە عەرەب لەسەری ڕاهاتبوون کە ڕقیان لە کچ و هەڵگرتنی و باوەش گرتنی بوو، جا بەوکارە پێغەمبەر ﷺ پێچەوانەی ئەوانی کردووە هەتا لەنوێژیشدا بۆیە هەڵی گرتووە، بۆ موبالەغەو بەرپەرچ دانەوەیان، وە جاری وا هەیە ڕوون کردنەوە بە کردەوە بەهێزترە لە قسە.

لە عبداللەی کوڕی شەددادەوە لە باوکی یەوە هاتووە: جارێك پێغەمبەر ﷺ هاتە ناومان کاتی نوێژی نیوەڕۆ بوو، یا عەسر بوو، حەسەن بوو یا حوسەینی بەباوەشەوە بوو، هاتە پێشەوە بۆ بەرنوێژی کردن، دایناو نوێژی دابەست و خوێندنی تەواو کردو چووە سەجدەوە . لەیەکێك لە سەجدەکانیدا زۆر مایەوە منیش سەرم هەڵبڕی سەیرم کرد منداڵەکە لەسەر پشتی بوو، سەرم بردەوە سەجدە، کاتێ نوێژەکەی تەواو کرد خەڵکەکە ووتیان: ئەی نێرراوی خوا یەکێك لە سەجدەکانت زۆر درێژەی کێشا هەتا وامان ئەزانی شتێك ڕووی داوە، یا وەحیت بۆ هاتووە ؟ فەرمووی: هۆی درێژەکێشانی ئەوانە نەبوو کە ئێوە ئەڵێن: بەڵکو ئەم کوڕەم هاتبووە سەر پشتم حەزم نەکرد پەلەی لێ بکەم هەتا خۆی تێر ئەبێ، (ئەحمەدو نەسائی و حاکم گێڕاویانەتەوە).

نەوەوی دەفەرمووێت: بەپێی مەزهەبی شافیعی و ئەوانەی لەگەڵیا ڕێك کەوتوون ئەو حەدیسە نەبێتە بەڵگەی ئەوەی کە دروستە هەڵگرتنی منداڵی نێرو مێ و ئاژەڵی خاوێنی تر، لە نوێژی فەرزو سوننەتدا، وە ئەوکارە دروستە بۆ ئیمام و مەئموم. وە هاوەڵانی مالیك تەنها لەنوێژی سوننەتدا بە دروستیان داناوە، وە حەدیسەکەیان حەمل کردۆتە سەرئەوە، وە لەنوێژە فەرزەکاندا قەدەغەیان کردووە، بەڵام ئەم لێکدانەوەی هاوەڵانی مالیك هەڵەیە چونکە کاتێك دەفەرمووێت: بەرنوێژی ئەکرد بە صەریحی یا نیمە صەریحی دەری ئەخات ئەو نوێژە نوێژی فەرز بووە، وە لە پێشەوە هاتووە کە ئەوە لەنوێژی بەیانیدا بووە، وە دەفەرمووێت: هەندێ لە مالیکی یەکان ئەڵێن: ئەوکارە مەنسوخە ـ واتە سڕاوەتەوە ـ سڕاوەتەوە، وە هەندێکیان تایبەتی ئەکەن بەپێغەمبەرەوە ﷺ وە هەندێکیان ئەڵێن: بۆ کاتی پێویست دروستە، وە هەموو ئەوانەی ووتران پوچەڵ و بەرپەرچ دراوەن، چونکی بەڵگەیان لەسەر نی یە و پێویست نین، بەڵکو حەدیسەکە بە صەحیحەو صەریحە لەسەر دروستی ئەوە، وە شتێکی تێدا نی یە بەپێچەوانەی یاسای ئیسلام بێت، چونکە ئادەمیزاد خۆی خاوێنەو ئەوەی لەناو سکیایەتی قەڵەمی عەفوی لێ دراوە، چونکە لەناو گەدەو ڕیخۆڵەکانیدایە، وە جل و بەرگی منداڵیش بەخاوێن دائەنرێت، چونکە بەڵگە شەرعی یەکان ئەوە

دەرنەخەن. وە جوڵە لەنوێژدا نوێژ بەتاڵ ناکاتەوە ئەگەر کەم بێت، یا بەسەریەکەوە نەبێت، وە کردەوەکەی پێغەمبەر ﷺ دروستی ئەوکارە ڕوون ئەکاتەوە، وە ئاگادار کەرەوەیەکە لەسەر ئەوبنەمایانەی باسم کردن، وە ئەوە بەرپەرچی ئیددعاکەی ئیمام ئەبو سولەیمانی (خطابي) ئەداتەوە کە دەفەرمووێت: ئەوکارە لەوە ئەچێت بەقەست نەبووبێت، وە ئەو هەڵگرتنەی لەبەر ئەوە بووە منداڵەکە خۆی خۆی پێدا هەڵواسیوە، جا پێغەمبەر ﷺ بەرزی نەکردۆتەوە بەرزبۆتەوە بەوشێوەیە ماوەتەوە. دەفەرمووێت: نابێ کەس وا تێ بگات جارێکی تر هەڵی گرتوتەوە بەقەستی، چونکە ئەوکارە کارێکی زۆرە لەنوێژدا دڵ و مێشك پێوەی خەریك ئەبێت، وە ئەگەر وێنەی ناوکراسەکەی مەشغوڵی کردبێت چۆن ئەو هەڵگرتنە مەشغوڵی ناکات ؟ ئەوە قسەی (خطابي) بوو ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت، کە پوچەڵە و ئیددعایەکی ڕووتە لەبەڵگە، وە ئەوەی بەرپەرچی ئەو قسەیە ئەداتەوە ئەوەیە کە لە صەحیحی موسلیمدا هاتووە دەفەرمووێت: کاتێ پێغەمبەر ﷺ هەڵئەسایەوە هەڵی ئەگرتەوە، وە هەروەها ئەوەی ئەفەرمووێت: کاتێ لە سەجدە سەری بەرز ئەکردەوە هەڵی ئەگرتەوە ... وە لە ریوایەتێکی تردا کە لای موسلیم نیە هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ هاتە ناومان ئومامەی هەڵگرتبوو، نوێژی کرد جا حەدیسەکەی باس کرد، بەڵام مەسەلەی وێنەکانی ناو کراسەکە ئەوەیە بێ سوود دڵ و مێشك خەریك ئەکات، بەڵام هەڵگرتنی ئومامە ئێمە نایسەلمێنین کە دڵ و مێشك خەریك ئەکەن، وە ئەگەر خەریکیشی بکەن، ئەوە سوودی لێ ئەکەوێتەوە و چەند بنەمایەك دەرئەخات لەوانەی باسمان کرد، جا بنەمای ئەو خەریك کردنە بۆ ئەو کەڵك و سوودانەیە، بەپێچەوانەی وێنەی ناوکراسەکە، کەواتە ئەو ڕاستیەی گەرانەوە نیە لێی ئەوەیە: ئەو حەدیسە دروستی ئەوکارە ئاشکرا ئەکات، و لەو سودو کەڵکانەیمان ئاگادار ئەکاتەوە، ئیتر ئەوکارە دروستە بۆ ئێمەو یاسایەکی بەردەوامە بۆ موسڵمانان هەتا ڕۆژی دوایی، ئیتر خواش ئەزانێ.

**(٦) سڵاو کردن و قسەکردن لەگەڵ نوێژکەردا، وە ئەگەر یەکێك سڵاوی کرد یا قسەی لەگەڵ نوێژکەر کرد، دروستە بە ئیشارەت وەڵام بداتەوە:**

لە جابیری کوڕی عبداللەوە هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ ئەچوو بۆ (بني المصطلق) ناردمی بۆ کارێك، کە گەڕامەوە بۆلای نوێژی ئەکرد بەسەر ووشترەکەیەوە، قسەم لەگەڵ کرد بەدەستی ئیشارەتی بۆ کردم، پاشان قسەم لەگەڵ کرد بەدەست ئیشارەتی بۆ ئەکردم، وەگوێم لێ بوو هەر قورئانیشی ئەخوێند و بەسەر ئیشارەتی ئەکرد، کاتێ لە نوێژەکە بووەوە فەرمووی:

(ها! چیت کرد لەبارەی ئەوەی کە بۆم ناردبووی؟ ئەوە بۆیە من وەڵامم نەدایتەوە چونکە نوێژم ئەکرد). (ئەحمەد و موسلیم گێڕاویانەتەوە)[1].

لە عبداللەی کوڕی عومەرەوە لە صوهەیبەوە هاتووە کە فەرمویەتی: بەلای پێغەمبەردا ﷺ تێپەڕیم نوێژی ئەکرد سڵاوم لێ کرد بە ئیشارەت وەڵامی دامەوە. دەفەرمووێت: وابزانم فەرموی بە ئیشارەت بە پەنجە. ئەحمەدو (ترمذي) ریوایەتیان کردووەو (ترمذي) بە صەحیحی داناوە.

وە هەرلەوەوە هاتووە فەرموویەتی: بە بیلالم ووت: ئەی چۆن پێغەمبەر ﷺ وەڵامی ئەدانەوە لەنوێژدا کاتێ سلاویان لێ ئەکرد؟ فەرمویەتی: بەدەستی ئیشارەتی بۆ ئەکردین، (ئەحمەدو خاوەن سونەنەکان گێڕاویانەتەوە (ترمذي) یش بەصەحیحی داناوە).

لە ئەنەسەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ لەنوێژا ئیشارەتی ئەکرد. (رواه أحمد وأبوداود وابن خزيمة وهو صحيح الإسناد). وە ئەو ئیشارەتە بەدەست بێت یا بەپەنجە یا بەسەر وەك یەکەو هەموو ئەوانە هاتوون لەپێغەمبەرەوە ﷺ.

**(٧) ووتنی (سبحان الله) و چەپلە لێدان:**

ئەگەر شتێك ڕووی دا دروستە پیاوەکان بڵێن: (سبحان الله)، وە ئافرەتەکان چەپلە لێبدەن بۆ ئەوەی ئیمام ئاگادار بکرێتەوە ئەگەر هەڵەی کرد، وە هەروەها بۆ ڕێدان بۆ هاتنە ژوورێ ئەگەر کەسێك بیەوێ بچێتە ژوورەوە، یا بۆ ڕێنمایی کردنی کوێرو ئەوجۆرە شتانە. لە سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدیەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن نَابَهُ شَيئٌ فِي صَلاتِهِ فَلْيَقُل سُبحَانَ اللهِ، إنَّما التَصفِيقُ للنِّسَاءِ وَالتَّسبِيحُ لِلرِّجَالِ) واتە: ئەگەر کەسێك لەنوێژدا شتێکی هاتە پێش با بڵێت: (سبحان الله) چونکە چەپلە لێدان بۆ ئافرەتانە و (سبحان الله) ووتن بۆ پیاوانە. (ئەحمەد و ئەبوداود و نەسائی گێڕاویانەتەوە)[2].

**(٨) سەری ئایەت دەرخستن بۆ بەرنوێژ:**

ئەگەر بەرنوێژ ئایەتێکی لەبیر چووەوە لە نوێژەکەیدا، سەری ئایەتەکەی بۆ دەرئەخرێت لەلایەن یەکێ لە مەئمومەکانەوە و ئەو ئایەتەی بیر ئەخرێتەوە، جا چ ئەوەندەی پێویستی خوێندبێ یا نا.

---

(١) وە لە ریوایەتێکی موسلیمدا کە ئەو صەریح تر بوو بۆ بەڵگەیەتی، وە باشتر بوو، تێیدا هاتووە: سەلامم لێ کرد ئەویش بە دەستی ئاماژەی بۆ کردم.

(٢) فەرموودەکە لە صەحیحەینیشدا هەیە، لە حەدیسێکی درێژدا لە سەهلەوە، وەك لە باسی نوێژی جەماعەتدا ڕابورد لە بەشی (دروستی شوێن گۆڕینەوەی ئیمام و مەئموم) بەڵام لەوە ئەچێت دانەر لەبیری چووبێت.

لە ئیبنوعومەرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ جارێك کاتی خوێندن لەنوێژەکەیدا ئایەتەکەی لێ تێك چوو، کاتێ لێ بۆوە بە باوکمی فەرموو: (ئەوە تۆمان لەگەڵدا بووی؟) فەرمووی: بەڵێ فەرمووی: (ئەی بۆچی سەری ئایەتەکەت بۆ دەرنەخستم؟). (ئەبوداود و غەیری ئەو گێڕاویانەتەوەو پیاوەکانی جێی باوەڕن).

**(٩) ووتنی: (الحمد لله) کاتی پشمین یا کاتی هاتنە پێشەوەی نیعمەتێك:**

لە ریفاعەی کوڕی ڕافیعەوە هاتووە دەفەرموورێت: لەدوای پێغەمبەرەوە ﷺ نوێژم ئەکرد لە پڕ پشمیتم ووتم: (الحَمدُ للهِ حَمداً كَثيراً طَيِّباً مُبارَكاً فِيهِ كَمَا يُحِبُّ رَبُّنَا وَيَرضَى) جا کاتێ لەنوێژ بووینەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئەوە کێ بوو ئەو قسەیەی کرد لەنوێژەکەیدا؟) کەس قسەی نەکرد، جاری دووەم فەرمووی: (ئەوە کێ بوو ئەو قسەیەی کرد؟) کەس وەڵامی نەدایەوە، بۆ جاری سێیەم پرسیاری کردەوە؟ ووتم: ئەی نێرراوی خوا من بووم، فەرمووی: (وَالَّذِي نَفسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَقَد ابتَدَرَهَا بِضعٌ وَثَلاثُونَ مَلَكاً أَيُّهُم يَصعَدُ بِهَا) (رواه النسائي والترمذي ورواه البخاري بلفظٍ آخر). واتە: سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی بەدەستە سی و ئەوەندە فریشتە دەست پێشکەریان ئەکرد کە کامیان بەرزی ئەکاتەوە بۆ ئاسمان[1].

**(١٠) سەجدەبردن لەسەر کراسی نوێژکەر یا مێزەرەکەی بەهۆی مەعزەرەتێکەوە:**

لە ئیبنو عەبباسەوە هاتووە دەفەرموورێت: پێغەمبەر ﷺ بەکراسێکەوە نوێژی ئەکرد بە زیادەکەی خۆی لەگەرمی و ساردی زەوی ئەپاراست، (ئەحمەد بەسەنەدێکی صەحیح گێڕاویەتیەوە)[2].

بەڵام ئەگەر لەبەر مەعزەرەت نەبوو کەراهەتی هەیە.

---

(١) بەڵام باوێشك نەهێشتنی موستەحەببە لە بوخاریدا هاتووە ئەبو هورەیرە دەفەرموورێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کاتێ کەسێکتان لەنوێژا باوێشکیدا با تا ئەتوانێ باوێشکەکەی بخواتەوە و نەڵێت: (ها) چونکە باوێشك لەشەیتانەوەیەو پێی پێ ئەکەنێ (دانەر).

(٢) نە صەحیحەو نە حەسەنە، چونکە ڕێگاکانی ئەگەڕێتەوە بۆ سەر حوسەینی کوڕی عبداللەی کوڕی عبیداللەی کوڕی عەبباس، ئەویش لاوازە، وەك لە التقريب دا هەیە، بگەڕێرەوە بۆ موسنەد (٢٣٢٠و٢٣٨٥و ٢٧٦٠و ٢٩٤٠و ٣٣٢٧) وە وا دەر ئەکەوێت دانەر صەحیحەتەکەی ـ وەکو عادەتیەتی ـ لە قسەی هەیسەمیەوە وەرگرتووە، لە تەخریجەکەیدا (٢/٤٨) کە ووتویەتی: ئەحمەدو ئەبویەعلاو (طبراني) لە (الكبير)و لە (الأوسط)دا ریوایەتیان کردووە، و پیاوەکانی ئەحمەد پیاوانی صەحیحن، وە ئەمەش مەرج نییە وابێت، چونکە وەك باسم کرد حوسەینی تێدایە کە ئەویش لە پیاوانی بوخاری و موسلیم نییە و لە پیاوانی صەحیح نییە. (تمام المنة).

### (١١) کورتەی ئەوکارانەی کە دروستە بکرێن لەنوێژدا:

ئیبنوقەییم ئەوکارانەی هێناوەتەوە بەکورتی کە دروستە (موباحە) بکرێن لەنوێژا و کە پێغەمبەر ﷺ کردوونی لەنوێژدا، دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ نوێژی کردووە و عائیشە لەبەر دەمیا ڕاکشاوە، کاتێ سەجدەی بردووە دەستی کوتاوە لە قاچیەوە، و عائیشەش قاچی لابردووە، کاتێ هەڵنەساوە قاچی وەك خوی لێ ئەکردەوە.

پێغەمبەر ﷺ نوێژی کردووە شەیتان هاتووە نوێژەکەی پێ ببڕێت، ئەویش دەستی خستوتە بینی هەتا لیکەکەی بەدەسیا هاتۆتە خوارەوە.

وە لەسەر مینبەر نوێژی کردووەو رکوعی بردووە کاتێ گەیشتۆتە سەجدە بردن پاشەو پاش گەڕاوەتەوەو لەسەر زەوی سەجدەی بردووە، پاشان چۆتەوە سەر مینبەرەکە[١].

وە بەرامبەر دیوارێك نوێژی کردووە بەرخۆلەیەك هاتووە بەبەردەمیا بڕوات، ئەویش ﷺ پاڵی پێوە ناوە هەتا سکی نووساندووە بەدیوارەکەوە، پاشان بەرخۆلەکە لەدوایەوە تێپەڕیوە.

وە نوێژی کردووە دوو کیژۆڵەی (بني عبدالمطلب) لەبەردەمیا شەڕیان کردووە، هەر لەنوێژەکەیدا بەدەستی پیرۆزی جیای کردونەوە.

وە لەفزی لای ئەحمەد ئەمەی تێدایە: دەستیان گرتووە بە ئەژنۆی پێغەمبەرەوە ﷺ ئەویش لەیەکی جیا کردنەوەو نوێژەکەی نەبڕیوە.

وە نوێژی کردووە منداڵێك بەبەردەمیا ویستوویەتی تێپەڕێ بە دەستی ئیشارەتی بۆ کردووە کە بگەڕێتەوە ئەویش گەڕاوەتەوە.

وە جارێکی تر نوێژی کردووە کیژۆڵەیەك بەبەردەمیا تێ پەڕیوە بەدەستی ئیشارەتی بۆ کردووە بگەڕێتەوە بەڵام هەر تێپەڕیوە کاتێ لەنوێژ بۆتەوە فەرموویەتی: ئەوان زاڵترن، (ئیمام ئەحمەد باسی کردووەو لەسونەنەکاندا هەیە[٢]). وە لەنوێژدا فووی کردووە. وە ئەو حەدیسەی ئەڵێت: فوو

(١) مینبەرەکەی پێغەمبەر ﷺ سێ پلەی بووە، ئەچووە سەری و ئەوەی ئەکرد بۆ ئەوەی نوێژکەرەکان چاویان لێی بێت و فێری نوێژ بن لێوەی (دانەر).

(٢) ئیبنو قەییم بەو شێوەیە تەخریجی کردووە لە (الزاد)دا، و دانەریش هەرلەوەوە هێناویەتی، منیش دوو شتم لەسەریان هەیە:

یەکەم: بەوەی کە ووتویەتی لە سونەندا هەیە، وا دەری خستووە کە لە هەرچوار سونەنەکاندا هەبێت، بەڵام تەنها لە سونەنی ئیبنوماجەدا هەیە.

کردن لەنوێژدا قسەکردنە، ئەصلی نییە لەپێغەمبەرەوە ﷺ هاتبێت، بەڵکو ـ ئەگەر صەحیح بێت ـ سەعید لەسونەنەکەیدا لە ئیبنو عەبباسەوە گێڕاویەتیەوە، وە لە نوێژدا گریاوەو فمی کردوە.

عەلی کوڕی ئەبو (طالب) خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: کاتێکی تایبەتیم هەبوو ئەچووم بۆلای پێغەمبەر ﷺ، ئەگەر بچوومایە بۆلای ئیزنم ئەخواست، جا ئەگەر بمبینیایە نوێژی ئەکرد کۆکەیەکی ئەکرد و ئەچوومە ژوورەوە، بەڵام ئەگەر نوێژی نەکردایە ڕێی ئەدام و ئەچوومە ژوورەوە (ئەحمەدو نەسائی گێڕاویانەتەوە)[1].

وە زاراوەکەی لای ئەحمەد دەفەرمووێت: کاتێکی تایبەتیم لە شەو ڕۆژدا هەبوو ئەچووم بۆلای پێغەمبەر ﷺ، ئەگەر بچوومایە نوێژی بکردایە کۆکەیەکی ئەکرد، (ئەحمەد گێڕاویەتیەوە، وە خۆی کاری پێ کردووە، وە خۆی کۆکەی کردووە، وە کۆکەکردنی بە پوچەڵ کەرەوەی نوێژ دانەناوە).

وە جاری وابووە بەپای پەتی نوێژی کردووەو جاری وابووە بەنەعلەوە نوێژی کردووە. عبداللە ی کوڕی عومەر وای فەرموە، وە فەرمانی کردووە بەنەعلەوە نوێژ بکرێت بەپێچەوانەی جولەکەوە.

جاری وابووە بەکراسێکەوە نوێژی کردووە، وەجاری وابووە بەدوو کراسەوە، بەڵام بەزۆری بە دوو کراسەوە کردوویەتی.

**(١٢) قورئان خوێندن لەڕووی قورئانەوە:**

ذەکوانی خزمەتکاری عائیشە لە ڕەمەزاندا بەرنوێژی عائیشەی ئەکردو لەڕووی قورئان قورئانی ئەخوێندەوە، مالیك گێڕاویەتیەوە. وە ئەمەش مەزهەبی شافیعیەکانە.

نەوەوی دەفەرمووێت: ئەگەر جاروبار لاپەڕەی قورئانەکە لەنوێژەکەدا هەڵبداتەوە نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە، وە ئەگەر سەیری نووسراوێك بکریت قورئان نەبێت لەدڵدا بخوێنرێتەوە نوێژ بەتاڵ نابێتەوە، هەرچەندە خوێندنەوەکە زۆریش بێت، بەڵام کەراهەتی هەیە، شافیعی لە (الإملاء) دا دانی بەوەدا ناوە.

**(١٣) بیر ڕۆیشتن بۆ شتی تر لەنوێژدا:**

---

دووەم: ئیسنادەکەی لاوازە، کەسێکی وای تێدایە کە ناسراو نییە، لەبەر ئەوە (إبن القطان) و (بوصیری) بە زەعیفیان داناوە.

(١) ئەو (حدیث)ە لاوازەو بەڵگەی پێ نایەتەوە، چونکە سێ عیللەتی تێدایە، وە من ئەم باسەم ڕوون کردۆتەوە لەسەر کتێبی تاج، وە بگەڕێرەوە بۆ تەلخیص (١١٦/٤) وە هەروەها لە لێکۆڵینەوەکەمدا لەسەر ئیبنو خوزەیمە (٥٤/٢) (تمام المنة).

لە ئەبی هورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذا نُودِيَ للصَّلاةِ أدبَرَ الشَّيطَانُ وَلَه ضُرَاطٌ حتى لايَسمَعَ الأذانَ، فَإذا قُضِيَ الأذانُ أقبَلَ، فَإذا ثُوِّبَ بِهَا أدبَرَ، فَإذا قُضِيَ التَّثوِيبَ أقبَلَ، حتى يَخطُرَ بَينَ المَرءِ وَنَفسِه، يَقُولُ أُذكُر كَذَا أُذكُر كَذَا لِمَا لَم يَكُن يَذكُرُ، حتى يَظَلَّ الرَّجُلُ لايَدرِي كَم صلى، فَإن لَم يَدرِ أَحَدُكُم ثلاثاً صلى أم أربَعاً فَلِيَسجُد سَجدَتَينِ وَهُوَ جَالِسٌ) (رواه البخاري ومسلم). واتە: کاتێ بانگ ئەدرێت شەیتان پشت هەڵئەکات و دەست ئەکات بە تڕ بەردان بۆ ئەوەی گوێی لەبانگەکە نەبێت، کاتێ بانگ تەواو بوو دێتەوە، وە کاتێ قامەت ئەکرێت پشت هەڵئەکات، کاتێ قامەت تەواو ئەبێت دێتەوە بۆ ئەوەی خەتەرە بخاتە دڵی نوێژکەرەوە، پێی ئەڵێت: یادی ئەوەو ئەوە بکەرەوە ئەو شتانەی کە لە بیری نییە، هەتا پیاو وای لێ دێت نازانێت چەند ڕکاتی کردووە، جا ئەگەر کەسێك لە ئێوە نەیزانی سێ ڕکاتی کردووە یا چوار با دوای تەحییات بەدانیشتنەوە دوو سەجدە بەرێت.

بوخاری دەفەرمووێت: عومەر فەرموویەتی: من لەناو نوێژەکەمدا لە دڵما لەشکر ئامادە ئەکەم، لەگەڵ ئەوەشدا کە نوێژ لەم حاڵەتەدا دروستە و بری ئەکەوێ[1]، بەڵام پێویستە لەسەر نوێژکەر بەدڵ ڕوو بکاتە پەروەردگاری خۆی و شتی لاوەکی وەلابنێت، وە بیر لەواتای ئایەتەکان بکاتەوە و لە حیکمەتی کردەوەکانی ناو نوێژ بگات، چونکە ئادەمیزاد لەنوێژەکەی ئەندازەی چەنێك ئاگای لێ بێ هەر ئەو ئەندازەی بۆ ئەنووسرێ، و پاداش ئەدرێتەوە.

لای ئەبو داود و نەسائی و ئیبنو حیببان هاتووە لەعەمماری کوڕی یاسرەوە دەفەرمووێت: گوێم لە پێغەمبەر بووە ﷺ ئەیفەرموو: (إنَّ الرَّجُلَ يَنصِرفُ وَمَا كُتِبَ لَهُ إلا عُشرُ صَلاتِه، تُسعَهَا، ثُمنُهَا، سُبعُهَا، سُدسُهَا، خُمسُهَا، رُبعُهَا، ثُلُثُهَا، نِصفُهَا). واتە پیاوی وا هەیە کاتێ لەنوێژ ئەبێتەوە یا دەیەکی یا نۆیەکی یا هەشت یەکی یا حەوت یەکی یا شەش یەکی یا پێنج یەکی یا چوار یەکی یا سێ یەکی یا نیوەی نوێژی بۆ نووسراوە.

بەززار لە ئیبنوعەبباسەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوای گەورەفەرموویەتی: (إنَّمَا أتَقَبَّلُ الصَّلاةَ، مِمَّن تَواضَعَ بِهَا لِعَظَمَتِي، وَلَم يَستَطِل بِهَا على خَلقِي، وَلَم يَبِت مُصِراً على مَعصِيَتِي، وَقَطَعَ النَّهَارَ فِي ذِكرِي، وَرَحِمَ المِسكِينَ وَابنَ السَّبِيلِ، وَالأرمَلَةَ، وَرَحِمَ المُصَابَ، ذَلِكَ نُورُهُ كَنُورِ الشَّمسِ، أكلَؤُهُ بِعِزَّتِي، وَأستَحفِظُهُ مَلائِكَتِي، أجعَلُ لَهُ فِي الظُّلمَةِ نُوراً، وَفِي الجَهَالَةِ حِلماً، وَمَثَلُهُ فِي خَلقِي كَمَثَلِ الفِردَوسِ فِي الجَنَّةِ)[2] واتە: بەڕاستی من نوێژ

(١) وە پاداشیش بە ئەندازەی خوشوعە

(٢) دانەر بێ دەنگەی کردووە لێی وای دەرئەخات صحیح بێت، بەڵام صحیح نییە، بەڵکو زۆر (ضعيف)ە.

لەکەسێك وەردەگرم کە لەنوێژەکەدا ملی کەچ بێت لەترسی گەورەیی من، و خۆی بەونوێژەوە هەڵنەکێشێ بەسەر بەندەکانمدا، وە شەو هەتا بەیانی بەتاوانەوە نەمێنێتەوە، وە رۆژگار بەرێت بەیادی منەوە، وە بەزەیی بەهەژاران و رێبواران و بێوەژناندا بێتەوە، وە رەحم بە دەردەدارو توش بووان بکات، ئەوکەسە رۆشنایی وەك رۆشنایی رۆژە، بەگەورەیی خوم ئەیپارێزم ەوە داوا لە فریشتەکانم ئەکەم بیپارێزن، وە لە تاریکیدا رۆشنایی بۆ ئەنێرم، وە لەکاتی نەزانی کردنیا ئارامی پێ ئەبەخشم، وە نمونەی ئەوکەسە لەناو بەندەکانمدا وەك فیردەوس وایە لە بەهەشتدا.

ئەبوداود لە زەیدی کوڕی خالیدەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن تَوَضَّأَ فَأحسَنَ وُضُوءَهُ، ثُمَّ صلى رَكعَتَينِ لا يَسهُو فِيهِمَا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِهِ) واتە: هەرکەس بەرێك و پێکی دەست نوێژ بگرێ و پاشان دوو رکات نوێژی بێ سەهوی کرد خوا لەتاوانەکانی لەوەپێشی ئەبوورێت.

موسلیم لە (عثمان) ی کوڕی ئەبولعاصەوە ئەگێڕێتەوە دەفەرموورێت: ووتم: ئەی نێرراوی خوا، شەیتان ئەکەوێتە نێوانم و نوێژەکەمەوە و خوێندنەکەم لێ تێك ئەدات پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ذاكَ شَيطَانٌ يُقَالُ لَهُ خُنزَب فَإذا أحسَستَهُ، فَتَعَوَّذ بِاللهِ مِنهُ، وَاتفُل عَن يَسَارِكَ ثَلاثاً) واتە: ئەوە شەیتانێکە: ناوی خونزوبە، کاتێ هەستت پێ کرد بڵێ: (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) وە سێ جار بەلای چەپدا تو بکە (تو کردن فوکردنە هاوشان لەگەڵ کەمێك پرژەی تفدا)، دەفەرموورێت: منیش وام کرد خوا لێی دوور خستمەوە.

لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەت کراوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (قَالَ اللهُ عَزَّوَجل: قَسَمتُ الصَّلاةَ بَينِي وَبَينَ عَبدِي نِصفَينِ، وَلِعَبدِي مَا سَألَ، فَإذا قَالَ: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾، قَالَ اللهُ عَزَّوَجل: حَمِدَنِي عَبدِي، وَإذا قَالَ: ﴿ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾، قَالَ عَزَّوَجل: أثنَي عَلَيَّ عَبدِي، وَإذا قَالَ: ﴿مَـٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ﴾، قَالَ: مَجَّدني عَبدِي وَفَوَّضَ إلَيَّ عَبدِي، وَإذا قَالَ: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾، قَالَ: هَذا بَينِي وَبَينَ عَبدِي وَلِعَبدِي مَا سَألَ، فَإذا قَالَ: ﴿ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ۝٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾، قَالَ: هَذا لِعَبدِي وَلِعَبدِي مَا سَألَ). واتە: خوای گەورە فەرموویەتی: سورەتی فاتیحەم لەنێوان خۆم و بەندەکانمدا

کردووه به دووبەشەوە، بەندەکەم داوای چیم لێ بکات ئەیدەمێ، کاتێك ئەڵێت: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ خوای گەورە ئەفەرموورێت: بەندەکەم سوپاسی کردم، وە کاتێك ووتی: ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ ئەفەرموورێت: بەندەکەم مەدح و ستایشی کردم. وە کاتێك ئەڵێت: ﴿مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ﴾ خوای گەورە ئەفەرموورێت: بەندەکەم گەورەی کردم، وە کاری خۆی دایە دەستم، وە کاتێ ووتی: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ ئەفەرموورێت: ئەمە لەنێوانی من و بەندەکەمدایە و چی بوورێت پێی ئەبەخشم، وە کاتێ بلێت: ﴿ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ۝٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ ئەفەرموورێت: ئەوە بۆ بەندەکەم، وە هەرچی داوا بکات ئەیدەمێ.

## ئەو شتانەی کەڕاهەتیان هەیە لەنوێژدا بکرێن

کەڕاهەتی هەیە (واتە خراپە) نوێژکەر یەکێك لە سوننەتەکانی نوێژ واز لێ بهێنێت، ئەو سوننەتانەی کەلەپێشەوە باسمان کردووە، وە کەڕاهەتی هەیە یەکێ لەمانەی خوارەوە بکات:

**١- یاری کردن بە جلوبەرگ و بەدەن بێ ئەوەی پێویست بێت، بەڵام ئەگەر لەبەر پێویستییەك بوو کەڕاهەتی نییە:**

لە موعەیقیبەوە هاتووە دەفەرموورێت: دەربارەی سڕینی چەوو بەرد لەنوێژدا پرسیم لە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لاتَمسَح الحصى وَأنتَ تُصَلِّي، فَإن كُنتَ لابُدَّ فَاعِلاً فَوَاحِدَةً: تَسوِيَةَ الحصى) (رواه الجماعة). واتە چەووبەردی بەردەمت مەسڕە کاتێ نوێژ ئەکەیت، ئەگەر پێویست بوو یەکجار دەستی پێدا بهێنە بۆ تەخت کردنی.

لە (أبوذر)ەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذَا قَامَ أحَدُكُم إلى الصَّلاةِ فَإنَّ الرَّحْمَةَ تُوَاجِهُهُ فَلا يَمسَحِ الحصى) (أخرجه أحمد وأصحاب السنن)[1]. واتە: کاتێ کەسێکتان هەڵسا بۆ نوێژ میهرەبانی خوا ڕووی تێئەکات جا با چەوو بەردی بەردەمی نەسڕێت.

لە ئومو سەلەمەوە هاتووە دەفەرمووێت: کوڕێك ناوی یەسار بوو فووی ئەکرد بەو چەوو بەردەی کە لەبەردەمیدا بوو کاتی نوێژ، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (ترِّب وَجهَكَ للهِ) (رواه أحمد بإسنادٍ جيد[2]). واتە: ڕووت خۆڵاوی بکە بۆ خوا.

## ٢- دەست خستنە بەر کەلەکە لەنوێژدا:

لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ لەنوێژدا دەست خستنە بەر کەلەکەی قەدەغە کردبوو، (ئەبوداود گێڕایوەتی‌یەوە).

## ٣- چاو بەرز کردنەوە بۆ ئاسمان:

لە ئەبی هورەیرەوە هاتووە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لَيَنتَهِيَنَّ أقوَامٌ يَرفَعُونَ أبصَارَهُم إلى السَّمَاءِ، أو لَتُخْطَفَنَّ أبصَارُهُم) (رواه أحمد ومسلم والنسائي). واتە: ئەوانەی چاو بەرز ئەکەنەوە لەنوێژا بۆ ئاسمان دەستبەردار ئەبن باشە، وەگەر نا ڕۆشنایی چاویان لێ ئەسێنرێت.

## ٤- تەماشای شتێ کە ئادەمیزاد مەشغوڵ بکات:

لە عائیشەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ بە عەبایەکەوە نوێژی ئەکرد خەت خەت بوو فەرمووی: (شَغَلَتنِي أعلامُ هَذِهِ، إذهَبُوا بِهَا إلى أبِي جَهمٍ وَأْتُونِي بِأنبِجَانِيَّتِهِ) (رواه البخاري ومسلم). واتە:

---

(١) وە لای خاوەن سونەنەکان ئەبو ئەحوەصی تێدایە کە ئەویش لاوازە، وە (طیالیسی) لە موسنەدەکەیدا لە (أبي ذر)ەوە بە کورتتر تەخریجی کردووە و ئەفەرمووێت: پرسیاری هەموو شتێکم کرد لە پێغەمبەرەوە ﷺ تەنانەت لەبارەی سڕینەوەی بەردوچکەشەوە پرسیارم کرد، ئەویش فەرمووی: بە یەکجار بیسڕە. وە سەنەدەکەشی صەحیحە، و ئەمەش لە موسنەددا بە ژمارە (٤٧٠) هاتووە.

بەڵام ئەوکەسەی تەرتیبی کردووە کە عبدالرحمن ساعاتی بووە لە باسەکەیدا لە (منحة المعبود)دا ئەو حەدیسە صەحیحەی نەهێناوە، بەڵکو تەنها حەدیسە زەعیفەکەی هێناوە لە (١/١٠٨) دا، و لەوە ئەچێت کە لەبیری چووبێت، یان هەر بەو حەدیسە لاوازە بەسەی لێ کردبێت، ئەگەر واش بێت ئەوە ئەنگێکی گەورەیە لە کتێبەکەدا، چونکە ئەم کارە ئەم ئایەتە ئەیگرێتەوە: ﴿أَتَسْتَبْدِلُونَ ٱلَّذِى هُوَ أَدْنَىٰ بِٱلَّذِى هُوَ خَيْرٌ﴾ واتە: ئایا ئەوەی کە باشترە بەشتێکی خراپتر و بێ‌سوودتر ئەگۆڕنەوە.

(٢) ئەخێر ئیسنادەکەی (جید) نی‌یە چونکە ئەبو صالیحی تێدایە، کەس نایناسێ.

وێنەکانی ناو ئەم عەبایە مەشغوڵی کردم بیبەن بۆ ئەبو جوهەم (عامیری کوڕی حذیفة) و ئەنبیجانی‌یەکەیم بۆ بێنن[1].

بوخاری لەئەنەسەوە ئەگێڕێتەوە دەفەرموێت: عائیشە پەردەیەکی تەنکی هەبوو بەدیواری لایەکی ژوورەکەیدا هەڵی واسیبوو پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (أمِيطِي قِرَامَكِ؛ فَإنَّهُ لاتَزَالُ تَصَاوِيرُهُ تعرِضُ لِي فِي صَلاتِي). واتە: ئەو پەردەیە لابەرە چونکە وێنەکانی ناوی بەردەوام دێنە پێش چاوم، لەم حەدیسەدا بەڵگەی ئەوە هەیە کە سەیری شتی نووسراو لەنوێژدا نوێژەکە تێك نادات.

**٥- چاو نووقاندن:**

هەندێ لە زانایان چاو نووقاندن لەنوێژدا بەکەراهەت دائەنێن، وە هەندێ بەدروستی ئەزانن بێ ئەوەی کەراهەتی هەبێ، وە ئەو حەدیسەی لەوبارەیەوە هاتووە کە چاو نوقاندن لەنوێژدا کەراهەتی هەیە صەحیح نی‌یە.

ئیبنوقەییم دەفەرموێت: ڕاست ئەوەیە کە بووترێت: ئەگەر چاوکردنەوە خوشوعی ناو نوێژ تێك نەدات، ئەوە چاوکردنەوە چاکترە، بەڵام ئەگەر چاوکردنەوە بوە هۆی تێکدانی ملکەچی بەوەی وێنەو زەخرەفە لەبەردەم نوێژکەردا هەبوو سەیری ئەکردن و دڵی مەشغوڵ ئەکرد، ئەوە چاو نوقاندن چاکترەو پەسەندە لەم شێوەیەدا، و دان نان بە پەسەندێتی‌یەوە نزیکترە لەبنەمای یاساکانی ئیسلام و مەبەستەکانی، لەوەی بووترێت: کەراهەتی هەیە.

**٦- ئیشارەت کردن بە هەردو دەست لەکاتی سەلام دانەوەدا:**

لە جابیری کوڕی سەمورەوە هاتووە دەفەرموێت: لەدوای پێغەمبەرەوە ﷺ نوێژمان ئەکرد فەرمووی: (مَا بَالُ هَؤلاءِ يُسَلِّمُونَ بَأيدِيهِم كَأنَّهَا أذنَابُ خَيلِ شَمسٍ، إنَّما يَكفِي أحَدَكُم أن يَضَعَ يَدَهُ على فَخِذِهِ ثُمَّ يَقُولُ: السَّلامُ عَلَيكُم، السَّلامُ عَلَيكُم) (رواه النسائي وغيره وهذا لفظه). واتە: ئەوانە چی‌یانە وا بەدەست سڵاو ئەکەن دەستیان بەرز ئەکەنەوە وەك کلکی ئەسپی سەرکێش، هەرکام لەئێوە ئەوەندەی بەسە دەستی بخاتە سەر ڕانی پاشان بڵێت: (السلام علیکم، السلام علیکم).

**٧- دەم هەڵبەستن و جل بەردانەوە:**

---

(٢) (ئەبو جەهم عەباکەی خۆی دابوو بە پێغەمبەر ﷺ بەڵام کە بینی خەت خەتە بۆی ناردەوەو فەرمووی: ئەنبیجانی‌یەکەیم بۆ بێنن، تاوەکو دڵی نەشکێ، ئەنبیجانی‌یەش کەوایەکی ئەستوری کوڵکنە، کە خەت و وێنەی تێدا نی‌یە.

له ئهبی هورهیرهوه هاتووه دهفهرموێت: پێغهمبهر ﷺ (سدل) جل بهردانهوهی لهنوێژدا قهدهغه كردبوو، وه ههروهها قهدهغهی كردبوو دهم ههڵبهستن لهنوێژدا. (رواه الخمسة والحاكم وقال: صحيح على شرط مسلم).

(خطابي) دهفهرموێت: (سدل) جل بهردانهوهیه ههتا ئهگاته زهوی. كهمالی كوڕی ههمام دهفهرموێت: وه كهوا دانیش بهسهر شاندا ئهگرێتهوه كه قۆڵی تێ ههڵنهكێشێ.

**٨- نوێژكردن كاتی ئاماده بوونی خواردن:**

له عائیشهوه هاتووه كه پێغهمبهر ﷺ فهرموویهتی: (إِذَا وُضِعَ العَشَاءُ وَأُقِيمَتِ الصَّلَاةُ فَابدَؤوا بِالعَشَاءِ) (رواه أحمد ومسلم). واته: ئهگهر خواردنی ئێواره هێنرایه پێشهوه و قامهت كرا بۆ نوێژ، لهپێشا دهست بكهن بهنان خواردن.

له نافیعهوه هاتووه كه ئیبنوعومهر خواردنی بۆ دائهنراو قامهت ئهكرا بۆ نوێژ، نهئهچوو بۆ نوێژهكه ههتا له خواردنهكه نهبووایهوه، وه لهوكاتهدا گوێی لهخوێندنی ئیمام ئهبو. بوخاری گێڕاویهتیهوه[1].

(خطابي) دهفهرموێت: پێغهمبهر ﷺ بۆیه فهرمانی داوه دهست به خواردنهكه بكرێت، بۆ ئهوهی نهفس پێویستی خۆی جێبهجێ هێنابێت، وه كاتێ دهست بكات بهنوێژ دڵ خاڵی بێت و نهفس ئارهزووی خواردنی نهبێ، بۆ ئهوهی پهله نهكات، وركوع و سجودهكانی بهتهواوی بهجێ بگهێنێت.

**(٩) نوێژ كردن لهگهڵ تهنگاوبوون به مێزو پیسایی:**

وه ئهو شتانهی مێشك و دڵ مهشغوڵ ئهكهن:

بهپێی ئهوهی ئهحمهدو ئهبوداودو (ترمذي) كه به حهسهنی داناوه له (ثوبان)هوه ئهگێڕنهوه كه پێغهمبهر ﷺ فهرموویهتی: (ثَلاثٌ لايَحِلُّ لأحَدٍ أن يَفعَلَهُنَّ؛ لايَؤُمُّ رَجُلٌ قَوماً فَيَخُصَّ نَفسَهُ بِالدُّعَاءِ دُونَهُم، فَإن فَعَلَ فَقَد خَانَهُم، وَلَا يَنظُرُ فِي قَعرِ بَيتٍ قَبلَ أن يَستَأذِنَ، فَإن فَعَلَ فَقَد دَخَلَ،

(١) جومهوری زانایان بهباشی دائهنێن خواردنهكه پێش نوێژهكه بخرێت ئهگهر ماوهی مابوو نوێژهكه بچێت، بهڵام ئهگهر كاتهكهی كهم بوو ئهبێ نوێژهكه پێش بخرێت، ئیبنوحهزم و ههندێ له شافیعیهكان ئهڵێن: پێویسته خواردنهكه پێش بخرێت ههرچهنده كاتی نوێژهكه كهمیشی مابێت.

وَلا يُصَلِّي وَهُوَ حَاقِنٌ حتى يَتَخَفَّفَ)[1]. واته سێ شت ڕەوا نیيە بکرێت لەلایەن کەسەوە: پیاوێك نابێت بەرنوێژی کۆمەڵێك بکات و تەنها بۆ خۆی بپاڕێتەوە، ئەگەر کردی ئەوە خیانەتی لێ کردوون، وە نابێت کەس سەیری ناومالێك بکات پێش ئەوەی داوای ڕێپێدان بکات، ئەگەر کردی ئەوە بێ پرس چۆتە مالەوە، وە نابێت کەسێك میزی بێ و نوێژ بکات تا خۆی خالی نەکاتەوە.

وە لای ئەحمەد و موسلیم و ئەبوداود هاتووە لە عائیشەوە دەفەرمووێت: لە پێغەمبەرم بیستووە ﷺ ئەیفەرموو: (لايُصَلِّي أحَدٌ بِحَضرَةِ الطَّعَامِ، وَلا هُوَ يَدافِعُهُ الأخبَثَانِ) واتە: کەس کاتی ئامادەبوونی خواردن نوێژ نەکات، وەکاتێك تەنگاوە بەمیزو پیسایی.

**(١٠) نوێژ لەکاتی خەوهاتنی زۆر:**

لە عائیشەوە هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذَا نَعَسَ أحَدُكُم فَليَرقُد حتى يَذهَبَ عَنهُ النَّومُ، فَإنَّهُ إذَا صلى وَهُوَ نَاعِسٌ لَعَلَّهُ يَذهَبُ يَستَغفِرُ فَيَسُبُّ نَفسَهُ) (رواه الجماعة). واتە: ئەگەر کەسێکتان خەو گرتی با ڕاکشێ هەتا خەوەکەی ئەڕەوێ، چونکە ئەگەر خەوی ئەهات و نوێژی ئەکرد لەوانەیە بچێت لەجیاتی ئەوەی داوای لێبوردن بکات جوێن بەخۆی بدات.

لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذَا قَامَ أحَدُكُم مِنَ اللَّيلِ فَاستَعجَمَ القُرآنُ على لِسَانِهِ فَلَم يَدرِ مَا يَقُولُ فَليَضطَجِع) (رواه أحمد ومسلم). واتە: ئەگەر کەسێکتان هەڵسا وویستی شەونوێژ بکات لەبەر خەو نەیتوانی بەرێك و پێکی سوورەتەکانی بخوێنێ و نەیئەزانی چی ئەڵێت، با ڕاکشێتەوە.

**(١١) تایبەت کردنی نوێژەکان تەنها بەشوێنێکی تایبەتی لەناو مزگەوتدا جگە لە ئیمام:**

لە عبدالرحمن ی کوڕی شیبلەوە هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردبوو دەنووك بەزەویدا بدرێ لەنوێژدا وەك قەلەڕەش، وە پاڵ کەوتن وەك دڕندە، (واتە: نوێژکەر لەسەجدەدا ئەنیشکی ڕاخا لەسەر زەوی وەك دڕندە)، وە ئەوەی پیاوێك وەکو ووشتر شوێنێك بۆ خۆی دیاری بکات هەرلەو شوێنەدا نەبێت پاڵ نەکەوێت (ئەحمەد و ئیبنو خوزەیمە و ئیبنو حیببان و حاکم کە بە صەحیحی داناوە گێڕاویانەتەوە).

---

(١) حەدیسەکە حسن نیيە چونکە ئیسنادەکەی لاوازەو (مضطرب) تێکەڵ و پێکەڵە وە باسی ئەوەش ڕابورد، بەڵام ڕستەکەی دوایی چەند شایەتی هەیە، کە لە (ضعیف أبي داود) دا بە ژمارە (١١و١٢) باسم کردووە، و هەندێکیان لە (سنن ابن ماجه ٦١٦-٦١٨) دا هەیە.

## ئەو شتانەی نوێژ پوچەڵ ئەکەنەوە

بە کردنی یەکێك لەم کردەوانەی خوارەوە نوێژ پوچەڵ ئەبێتەوە:

**(٢،١) خواردن و خواردنەوەی بەقەستی:**

(ابن منذر) دەفەرموێت: زانایان هەموو کۆن لەسەر ئەوەی ئەگەر کەسێك خواردنی خوارد یا شتێکی خواردەوە لەنوێژی فەرزدا بەقەست[١] ئەبێ ئەو نوێژە دووبارە بکاتەوە، وە هەروەها نوێژی سوننەتیش وایە لەلای جمهور، چونکە ئەوەی نوێژی فەرز پوچەڵ ئەکاتەوە نوێژی سوننەتیش پوچەڵ ئەکاتەوە[٢].

**(٣) قسەکردنی قستی کەلەبەر بەرژەوەندی نوێژ نەبێت:**

لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە هاتووە دەفەرموێت: ئێمە لەپێشەوە لەنوێژدا قسەمان ئەکرد لەگەڵ یەکدا هەتا ئایەتی: ﴿وَقُومُواْ لِلَّهِ قَـٰنِتِينَ﴾ (البقرة:٢٣٨). واتە: بە ملکەچیەوە نوێژ بکەن، هاتە خوارەوە ئیتر فەرمانمان پێدرا قسە لەگەڵ یەکدا نەکەین و بێ دەنگ بین (رواه الجماعة).

وە لە ئیبنومەسعودەوە هاتووە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ نوێژی ئەکرد سڵاومان لێ‌ئەکرد ئەویش وەڵامی سڵاوەکەی ئەداوە، بەڵام کاتێ لەلای نەجاشی گەڕاینەوە، سڵاومان لێ کرد وەڵامی نەداینەوە ئێمەش وتمان: ئەی نێرراوی خوا لەوەپێش کاتێ سڵاومان لێ ئەکردی وەڵامت ئەداینەوە بۆچی ئێستا وەڵامان نادەیتەوە؟ فەرمووی: (إِنَّ فِي الصَّلاَةِ لَشُغلاً) (رواه البخاري ومسلم). واتە: بەڕاستی نوێژ ڕێ لە قسەگرتن ئەگرێت.

جا ئەگەر کەسێك حوکمێ قسەکردنی لەنوێژدا نەئەزانی یا لەبیری نەبوو قسەی کرد، نوێژەکەی دروستە، لە موعاویەی کوڕی حەکەمی سولەمیەوە هاتووە دەفەرموێت: جارێك نوێژم ئەکرد لەدوای پێغەمبەرەوە ﷺ پیاوێك لەولاوە پشمی منیش وتم: (یرحمك الله) هەموو چاویان تێ بڕیم مۆڕەیان لێ ئەکردم، وتم: وای لەدەست دایکم بچم ئەوە بۆ وا سەیرم ئەکەن، هەموو کێشایان بەڕانیاندا، بۆم دەرکەوت ئەیانەوێ بێ دەنگ بم و قسەنەکەم، منیش بێ دەنگ بووم، کاتێ

(١) شافیعیەکان و حەنبەلیەکان وتویانە: ئەگەر بەنەزانی یا لەبەر لەبیر چوون خواردن خورا، یا شتێك خورایەوە نوێژ بەتاڵ نابێتەوە، وە هەروەها ئەگەر شتێك لەدانەکاندا هەبوو ئەگەر لە دەنکە نۆك بچووکتر بوو قووت بدرێ نوێژەکە بەتاڵ ناکاتەوە (دانەر).

(٢) وە لە (طاوس) و ئیسحاقەوە هاتووە کە ووتویانە: ئاوخواردنەوە قەیناکا لەبەر ئەوەی کارێکی کەمە. وە لە سەعیدی کوڕی جوبەیر و (ابن الزبیر) ەوە هاتووە: کە ئەودووانە لەنوێژی سوننەتدا ئاویان خواردۆتەوە (دانەر).

پێغەمبەر ﷺ سلاوی داوە دایك و باوکم بە قوربانی بن، مامۆستای ئەوەندە چاکم نەبینیوە بەو شێوەیە خەڵك فێر بکات، نە پێش خۆی و نە دوای خۆی مامۆستای وا نەبووە و نابێت، سوێند بەخوا ڕووی لێ گرژ نەکردم و لێی نەدام و قسەی پێ نەوتم و فەرمووی: (إنَّ هَذِهِ الصَّلاةُ لایَصلُحُ فِيهَا شَيئٌ مِن كَلامِ النَّاسِ، وَإِنَّمَا هِيَ التَّسبِيحُ وَالتَّكبِيرُ وَقِرَاءَةُ القُرآن) (رواه أحمد ومسلم وأبوداود والنسائي). واتە: ئەم نوێژە ناشێت کەس قسەی دەرەکی تێدا بکات، بەڵکو تەنها بریتی‌یە لە تەسبیح کردن و تەکبیر و قورئان خوێندن.

ئەوەتا موعاویەی کوڕی حەکەم بەنەزانی لەنوێژەکەیدا قسەی کردو پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێنەدا نوێژەکەی بکاتەوە.

ئەمما پوچەڵ نەبوونەوەی نوێژ بەقسەی خەڵك ئەوە بەپێی ئەوەیە ئەبی هورەیرە ئەگێڕێتەوە، جارێك پێغەمبەر ﷺ نوێژی نیوەڕۆ یا عەسری بۆ کردین سەلامی دایەوە (ذوالیدین)[1] پێی ووت: ئایا نوێژ کورت کراوەتەوە یا لەبیرت چوو ئەی نێرراوی خوا؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (نە کورت کراوەو نە لەبیرم چوو)، ئەویش ووتی: بەڵکو لەبیرت چوو ئەی نێرراوی خوا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئایا (ذو الیدین) ڕاست ئەکات؟) ووتیان: بەڵێ، پێغەمبەر ﷺ دوو ڕکاتەکەی تری لەسەر ئەو دوو ڕکاتەوە تەواو کرد، پاشان دوو سەجدەی سەهوی برد، (بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە).

مالیکی‌یەکان بۆ چاك کردنی نوێژ لەلایەن نوێژکەرەوە قسەکردنیان بەدروست داناوە، بەمەرجێك ئەو قسەکردنە بەپێی عورف زۆر نەبێ و ئەو شتەی کە ئەووترێت بە ووتنی (سبحان الله) تێ نەگەیەنرێت.

ئەوزاعی دەفەرمووێت: هەرکەس لەنوێژەکەیدا بەقەستی قسەی کرد ویستی نوێژی پێ چاك بکرێت نوێژەکەی پوچەڵ نابێتەوە، وەك ئەوەی پیاوێك لەنوێژی عەسردا بەدەنگی بەرز نوێژ بکات و بخوێنێ، پیاوێکیش لەدوایەوە بڵێت: ئەمە نوێژی عەسرە، نوێژەکەی پوچەڵ نابێتەوە.

(٤) کردنی کاری زۆر بەقەست:

زانایان لە دانانی قاعیدەی کەمی و زۆری جیاوازیان هەیە، ووتراوە: کردەوەی زۆر ئەوەیە ئەگەر کەسێك لە دوورەوە بیبینێ ئەجوڵێتەوە بە یەقین وابزانێ کە لەنوێژدا نی‌یە، وە جگە لەوە بەکەم دائەنرێت. وە ووتراوە زۆر ئەوەیە کە هەرکەسێ بیبینێ وا خەیاڵ بکا کە لەنوێژا نی‌یە.

---

(١) صەحابی‌یە، بۆیە ناو نراوە (ذو الیدین) چونکە هەردوو دەستی درێژ بوو. (دانەر).

ئەوەی دەفەرمووێت: کردەوەیەك کە لە جینسی نوێژ نەبێت ئەگەر زۆر بوو نوێژ پوچەڵ ئەکاتەوە بەڕای هەمووان، وە ئەگەر کەم بوو پوچەڵی ناکاتەوە بەڕای هەمووان، ئەمەی کە باسمان کرد قاعیدەیە.

پاشان دەربارەی قاعیدەدانان بۆ کەمی و زۆری ئەو کردەوەیە زانایان جیاوازیان هەیە لەسەر چوار شێوە پاشان ئەوەی ڕووی چوارەمی هەڵبژاردووە و دەفەرمووێت: ئەوەیان ڕاستە و بەناوبانگە، وە بەو ڕایە دانەرو جەماوەر بڕاندوویانەتەوە کە گەڕانەوە تێیدا بۆ عادەتە، وە ئەوەی خەڵك بەکەمی دائەنێن زەرەری نییە بۆ نوێژ وەك وەڵامدانەوەی بەئیشارەت، وە هەروەها داکەندنی نەعل و بەرزکردنەوەی مێزەرو لابردن و لەبەرکردنی کراسێکی سوکەڵەو هەڵگرتن و دانانی منداڵ و پاڵ نان بەتێپەڕبوو بەبەردەم نوێژا و سڕینی تف و بەڵغەم بە بەرگەوەو وێنەی ئەمانە[(١)]، بەڵام ئەوەی خەڵك بەزۆری دائەنێن، وەك هەنگاونانی زۆری لەسەریەك و کاری لەسەریەك نوێژ بەتاڵ ئەکەنەوە: دەفەرمووێت: (واتە ئەوەوی) پاشان هاوەڵان ڕێك کەتوون لەسەر ئەوەی کاری زۆر کە نوێژ بەتاڵ بکا ئەوەیە ئەگەر لەسەریەك بێت، بەڵام ئەگەر بەسەریەکەوە نەبوو، وەك ئەوەی هەنگاوێك بنێت و ماوەیەك بووەستێت، پاشان هەنگاوێکی تر بنێت یا دوو هەنگاوی تر بنێت، پاشان ماوەیەکی تر وەستاو دوو هەنگاوی تری نا، ئەوە ئەگەر ووتمان دوو هەنگاو نان زیانی نییە، وە ئەو دوو هەنگاوەی چەند جار دوبارە کردەوە، بەوشێوەیە هەتا گەیشتە سەد هەنگاوو زیاتر، زیانی نییە بۆ نوێژ بەبێ جیاوازی.

دەفەرمووێت: بەڵام جوڵەی سوکەڵە وەك پەنجە جوڵاندن بۆ تەسبیحات یا خۆ خوراندن یا قۆپچە کردنەوە یا گرێ کردنەوە، ئەوەی ڕاست و بەناوبانگ بێت ئەوانە نوێژ بەتاڵ ناکەنەوە با زۆرو لەسەر یەکیش بن، بەڵام کەراهەتی هەیە. وە شافیعی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: ئەگەر نوێژکەر ئایەتەکان بەپەنجە بژمێرێت نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە، بەڵام باشتر وایە نەیکات.

**(٥) نەکردنی پایەیێك یا مەرجێکی نوێژ بەئەنقەستی و بێ مەعزەرەت:**

بەپێی ئەوەی بوخاری و موسلیم ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ بەپیاوە دەشتەکی‌یەکەی فەرموو کە بەباشی نوێژەکەی نەکرد: (بگەڕێرەوە نوێژ بکە ئەوە نوێژ نەبوو کردت). (وە لە پێشەوە باس کرا).

---

(١) لە پێشەوە لەباسی نوێژدا باسی ئەوەمان کرد کە پێغەمبەر ﷺ کردویەتی لە نوێژەکەیدا، وە ئەمری بەکردنی چی کردووە، لە کوشتنی مارو دووپشك و وێنەی ئەمانە.

ئیبنورۆشد دەفەرموویێت: زانایان هەموو لەسەر ئەوە ڕێکن ئەگەر کەسێك بەبێ دەست نوێژ نوێژی کرد، پێویستە لەسەری دەست نوێژ بگرێت و نوێژەکەی بکاتەوە؛ بەقەستی بوو بێت یا لەبیری چووبێت.

وە هەروەها کەسێك بە قەستی یا لە بیری نەبووبێت ڕووی نەکردبێتە قیبلە.

بەگشتی هەرکەس مەرجێك لە مەرجەکانی دروستی نوێژی تێکدا، پێویستە لەسەری ئەو نوێژە دووبارە بکاتەوە.[١]

**(٦) زەردەخەنەو پێکەنین لەنوێژدا:**

(ابن منذر) کۆی زانایان لەسەر پوچەڵ بوونەوەی نوێژ بەپێکەنین نەقڵ ئەکات.

نەوەوی دەفەرمووێت: ئەو پوچەڵ بوونەوەیە کاتێك ئەبێت کە بە پێکەنینەکەی دوو پیت دەربخات، وە بەشی زۆری زانایان ووتویانە: قەیناکا زەردەخەنە، بەڵام ئەگەر پێکەنین زۆری بۆ هێناو توانای دوور خستنەوەی نەبوو نوێژەکەی پوچەڵ نابێتەوە، ئەگەر کەم بێت، بەڵام نوێژ بەپێکەنینی زۆر پوچەڵ ئەبێتەوە، وە قاعیدەی زۆری و کەمی پێکەنین بەپێی عورف دائەنرێت.

## نوێژ گێڕانەوە

زانایان لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون نوێژ گێڕانەوە واجبە لەسەر لەبیر چوو نوستوو، بەپێی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ کە لەپێشەوە باسمان کرد کە فەرموویەتی: (إِنَّهُ لَيسَ فِي النَّومِ تَفرِيطٌ إنَّما التَّفرِيطُ فِي اليَقَظَةِ، فَإذا نَسِيَ أحَدٌ صَلاةً أو نَامَ عَنهَا فَلْيُصَلِّهَا إذَا ذَكَرَهَا). واتە: بەڕاستی کەمتەرخەمی لە نوستندا نی یە، بەڵکو کەمتەرخەمی لە بەئاگابووندایە، جا ئەگەر کەسێك لەبیری چوو نوێژەکەی بکات با ئەوکاتەی بیری کەوتەوە بیکات.

وە ئادەمیزادی بووراوە گێڕانەوەی لەسەر نی یە، مەگەر کاتێ هۆشی هاتەوە و ئەوەندەی کات مابێت فریای دەست نوێژ بکەوێت و نوێژەکەی دابەستێت.

---

(١) سوودێك: حەرامە لەسەر نوێژکەر بەبێ بەهانە کارێك بکات نوێژەکەی پێ بەتاڵ بکاتەوە، بەڵام ئەگەر هۆیەك هاتە پێش، وەك یارمەتیدانی لێقەوماوێك یا ڕزگارکردنی خنکاوێك و ئەو جۆرەشتانە، پێویستە لەسەری نوێژەکەی بپڕێت. وە حەنەفی یەکان و حەنبەلی یەکان ڕایان وایە ڕەوایە بۆ ئەوکەسانە نوێژەکەیان بپڕن کە ترسی ماڵ لەدەس چوونیان هەبوو، با کەمیش بێت، با ماڵەکە ماڵی کەسێکی تریش بێت، یا ژنێك ترسی ئەوەی هەبێت منداڵەکەی بەگریان تووشی ئازار ببێت، یا مەنجەڵەکەی هەڵچووبێت، یا وولاغەکەی ڕای کردبێت، و وێنەی ئەو جۆرەشتانە بۆیان هەیە نوێژەکەیان بپڕن (دانەر).

(عبدالرزاق) لە نافیعەوە ئەگێڕێتەوە دەفەرمووێت: جارێك ئیبنوعومەر تووشی نەخۆشییەك بوو بێهۆشی کرد، نوێژەکەی چوو، کاتێ هۆشی هاتەوە نوێژەکەی نەگێڕاوە.

لە ئیبنو جورەیجەوە لە ئیبنو (طاوس)ەوە لە باوکییەوە هاتووە دەفەرمووێت: ئەگەر نەخۆشێك لەکاتی نوێژێکیدا بوورایەوەو هۆشی نەهاتەوە هەتا کاتی ئەو نوێژە بەسەر چوو پاشان هۆشی هاتەوە ئەو نوێژە ناگێڕێتەوە. وە مەعمەر دەفەرمووێت: دەربارەی کەسێکی بووراوە لەکاتی نوێژدا لە زوهریم پرسی فەرمووی: گێڕانەوەی لەسەر نییە·

وە لە حەممادی کوڕی سەلەمەوە لە یونسی کوڕی عوبەیدەوە لە حەسەنی بەصری و موحەممەدی کوڕی سیرینەوە هاتووە کە هەردووکیان ڕایان وابووە ئادەمیزادی بووراوە ئەو نوێژانە ناگێڕێتەوە کە لەکاتەکەیاندا بێ هۆش بووە، بەڵام کەسێك بە قەستی و بەبێ هۆ نوێژەکە نەکات، بۆچوونی جەماوەر ئەوەیە تاوانبار ئەبێت و لەسەری واجبە نوێژەکەشی بگێڕێتەوە·

وە ئیبنو تەیمییە دەفەرمووێت: کەسێك بەقەست نوێژەکەی لەکاتی خۆیدا نەکات دوایی بۆی نییە قەزای بکاتەوە، وە ئەگەر قەزای کردەوە لێی وەرناگیرێت؛ بەڵکو لەسەری پێویستە نوێژی سوننەت زۆر بکات.

وە ئیبنو حەزم بەتەواوەتی مافی خۆی داوە بەم مەسەلەیە بە باسێکی دوورودرێژ، وا ئێمەش بەکورتی باسی ئەکەین:

دەفەرمووێت: کەسێك بەقەستی نوێژەکەی نەکات هەتا کاتەکەی بەسەر ئەچێت، ناتوانێت هەرگیز ئەو نوێژە بگێڕێتەوە، بەڵام با ئەوکەسە کاری خێر و نوێژی سوننەت زۆر بکات، بۆ ئەوەی لەڕۆژی دواییدا تا تەرازووی خێرەکانی قورس بکات، وە با تۆبە بکات و داوای لێخۆشبوون لەخوای گەورە بکات.

ئەبو حەنیفەو مالیك و شافیعی ئەڵێن: هەرکەس بەقەستی نوێژێك تەرك بکات بیگێڕێتەوە لەدوای دەرچوونی کاتەکەی، تەنانەت مالیك و ئەبوحەنیفە وتویانە: هەرکەسێ بەقەستی نوێژێك یا چەند نوێژێك تەرك بکات، ئەوە پێش ئەو نوێژەی تێیدایە بیان گێڕێتەوە، ئەگەر لە پێنج نوێژ کەمتر بێت با ئەو نوێژە تازەشی بچێت، بەڵام ئەگەر پێنج نوێژ زیاتر بوو ئەوە نوێژە حازرەکەی بکات.

ئیبنوحەزم دەفەرمووێت: بەڵگەی ڕاستی قسەکەی ئێمە لەسەر نەگێڕانەوەی نوێژی فەوتاو بەقەستی، فەرموودەی خوای گەورەیە کە ئەفەرمووێت: ﴿فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ۝٤ الَّذِينَ

هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ﴾ (الماعون/٤-٥). واته: سزای توند بۆ ئەوکەسانەی تەمەڵی ئەکەن لەنوێژەکانیاندا. هەروەها ئەوەی کە ئەفەرمووێت: ﴿فَخَلَفَ مِنۢ بَعْدِهِمْ خَلْفٌ أَضَاعُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُواْ ٱلشَّهَوَٰتِ فَسَوْفَ يَلْقَوْنَ غَيًّا﴾ (مريم/٥٩) واته: پاش ئەوانە نەتەوەیەك هاتن نوێژەکانیان چواندن و شوێن ئارەزووەکانیان کەوتن، پاشەڕۆژ ئەوانە توندترین سزا ئەدرێن.

جا ئەگەر ئەوکەسەی بەقەستی نوێژەکەی ناکات هەتا ئەچێت بتوانێت کاتێکی تر بیگێڕێتەوە، نە (ویل) ی بۆ ئەبو وە نە توشی (غي) ئەبوو لەسەر ئەو چوواندنە، وەك چۆن ئەوکەسانەی دوای ئەخەن وەیل و سزایان بۆ نی‌یە، کاتێ بەو نوێژەدا بگەن و بیکەن بە حازری.

هەروەها خوای گەورە بۆ هەرنوێژێکی فەرز کاتێکی دیاری کراوی داناوە، ئەم سەرو ئەوسەری دیاری کردووە، لەسەرێکیانەوە دەست پێ ئەکات و لەسەرەکەی ترەوە کۆتایی دێت، جا ئەوکەسەی پێش ئەوکاتە دیاری کراوە بیکات، جیاوازی نی‌یە لەگەڵ ئەوکەسەدا کە لە دوای ئەو کاتە ئەیکات، چونکی هەردووکیان لەغەیری کاتی خۆیدا نوێژیان کردووە.

وە ئەمەی کە ئەیلێین قیاسی هیچیان نی‌یە بۆسەر هیچیان، بەڵکو هەردوکیان وەك یەکن لەوەدا کە دەست درێژی سنووری خوای گەورەیان کردووە، وە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥ﴾ (طلاق/١) واته: هەرکەس دەست درێژی بکاتە سەر ئەو سنوورانەی کە خوا دایناون ستەمی لەخۆی کردووە.

دیسانەوە نوێژ گێڕانەوە دانانی شەرعە کە بۆ کەس دروست نی‌یە بێجگە لە خوا ئەویش لەسەر زبانی پێغەمبەرەکەیەوە ئەبێت ﷺ.

پاشان ئێمە پرسیار لەوکەسانە ئەکەین کە نوێژگێڕانەوە لەسەر کەسێك پێویست ئەکەن کە بەقەستی نوێژەکەی نەکردبێت، ئایا ئەو نوێژەی ئێوە فەرمانی پێ ئەکەن بیکات ئەو نوێژەیە کە خوا فەرمانی پێ داوە یا نوێژێکی ترە، جا ئەگەر ووتیان: ئەو نوێژەیە کە خوا فەرمانی پێ داوە، پێیان ئەڵێین: کەواتە ئەوکەسەی بەقەستی نوێژەکەی ناکات هەتا ئەچێت تاوانبار نی‌یە و سەرپێچی فەرمانی خوای نەکردووە، چونکە ئەوکارە ئەکات کە خوا فەرمانی پێ داوە و گوناهبار نابێت

بەپێی قسەکەی ئێوە، وە لۆمە لەسەر ئەوکەسە نییە کەبەقەستی لەکاتی خۆیدا نوێژەکانی ناکات هەتا ئەچێت، کە ئەمەش هیچ موسڵمانێك نایڵێت.

وە ئەگەر وتیان: ئەونوێژە، ئەونوێژە نییە کە خوا فەرمانی پێداوە بکرێت، پێیان ئەڵێین: ڕاست ئەکەن ئەوە بەسە کە بڕیارتان دا کە خۆتان فەرمانتان داوە بەشتێك کە خوا فەرمانی نەداوە بە کردنی.

پاشان لێیان ئەپرسین: ئایا ئەوکەسەی بەقەستی لەکاتی خۆیدا نوێژەکەی ناکات هەتا بەسەرئەچێت سەرپێچی خوای کردووە یا فرمانی خوای بەجێ هێناوە؟ ئەگەر وتیان: فەرمانی خوای بەجێ هێناوە، ئەوە پێچەوانەی ئیجماعی هەموو ئەهلی ئیسلامیان کردووە کە یەقینی و بێ‌گومانە، وە پێچەوانەی قورئان و سوننەتی (ثابت) یان کردووە. وە ئەگەر وتیان: سەرپێچی کردووە ڕاست ئەکەن، وە شتێکی بەتاڵە بووترێت: سەرپێچی کردن جێگەی گوێ ڕایەڵی ئەگرێتەوە.

هەروەها خوای گەورە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ سنووری بۆ کاتەکانی نوێژ داناوە، وە بۆ هەرکاتی نوێژێك سەرەتایەکی داناوە، کەنابێ لەپێش ئەو سەرەتایەوە بکرێ، وە کۆتایی‌یەکیشی داناوە کە نابێ لەدوای ئەوکۆتایی‌یەوە بکرێ. وە لەنەتەوەی ئیسلامدا کەسێك نییە پێچەوانەی ئەوە بێت.

جا ئەگەر دروست بووایە ئەونوێژە بکرایە لەدوای کاتەکەی ئەوکاتە دەستنیشانی ئاخری کاتی نوێژ لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ هیچ مەعنایەکی نەئەبوو قسەیەکی پوچ ئەبوو، وە حاشا پێغەمبەر قسەی پوچ ناکا.

دیسانەوە هەرکارێك کە بەسترابێت بەکاتێکی دیاری کراوەوە ئەوە ئەو کارە دروست نابێت لەوکاتەی خۆیدا نەبێت، وەئەگەر دروست بێت، لە غەیری کاتی خۆیدا، کەواتە ئەو کاتەی کە بۆی دیاری کراوە کات نییە بۆ ئەوکارەو بێ مانایە، وە ئەمە شتێکی دیارو ئاشکرایە، خوا یارمەتی دەرمان بێت.

هەروەها لەپاش وتەیەکی دوورو درێژ دەفەرموێت: ئەگەر نوێژ گێڕانەوە واجب بووایە لەسەر ئەوکەسانەی بەعەمدی نوێژ لەکاتی خۆیدا ناکەن، خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ لێی بێ دەنگ نەئەبوون و لەبیریان نەئەچووەوەو بەقەستی وازیان لە ڕوون کردنەوەی نەئەهێنا بۆمان، تاوەکو ئێمە ماندوو بکەن؛ ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا﴾ (مريم/٦٤) واتە: پەروەردگارت لەبیرچوونەوەی نییە، وە هەرچی شەریعەتێك قورئان و سوننەت نەیهێنابێت پوچەڵە.

وە بەصەحیحی لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتووە فەرموویەتی: (مَن فَاتَتهُ صَلاةُ العَصرِ فَكَأَنَّما وُتِرَ أهلَهُ وَمَالُهُ) واتە: هەرکەس نوێژی عەسری چوو وەك ئەوە وایە ماڵو کەسوکاری لەدەست چووبێت.

کەواتە ڕاستە ئەوەی فەوتا ئیتر ڕێگا نییە بۆ پیاگەیشتنەوەی، جا ئەگەر بتوانێت پێی بگاتەوە یا پێی گەیشتەوە ئەوە لەدەستی نەچووە، وەك چۆن نوێژی لەبیرچوو هەرگیز لەدەس ناچێت، ئەمەش ئیشکالی تێدا نییە، وە هەروەها نەتەوەی ئیسلام هەموو کۆن لەسەر ئەوەی کە ئەڵێن و حوکم ئەدەن کە نوێژ ئەگەر لەوکاتەی بۆی دیاری کراوە لایدا ئەفەوتێ، کەواتە بە ئیجماعێکی یەقینی نوێژ فەوتان هەیە، جا ئەگەر بتوانرێت بگێڕرێتەوە ئەوە ووتن بەچوونی درۆیە و پوچەڵە، کەواتە بەتەواوی سابتە کە ناتوانرێت بگێڕرێتەوە هەرگیز.

لەو کەسانەی کە ئەو ڕەئییەی ئێمەیان هەیە لەمەدا، عومەری کوڕی (خطاب) و عبداللە ی کوڕیەتی و سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص و سەلمانی فارسی و ئیبنو مسعود و قاسمی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر و بودەیلی عوقەیلیو موحەممەدی کوڕی سیرین و (مطرف)ی کوڕی عبداللە و عومەری کوڕی عبدالعزیز و غەیری ئەوانە.

هەروەها ئیبنوحەزم دەفەرموورێت: خوای گەورە هیچ مەعزەرەتێکی نەهێشتۆتەوە بۆ ئەوکەسانەی داوای نوێژکردنیان لێ ئەکرێت بۆ دووا خستنی لەکاتی خۆی بەهیچ شێوەیەك تەنانەت لەکاتی جەنگ و پێکدادان و ترس و نەخۆشی زۆر و سەفەریش، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا كُنتَ فِيهِمۡ فَأَقَمۡتَ لَهُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَلۡتَقُمۡ طَآئِفَةٞ مِّنۡهُم مَّعَكَ﴾ (النساء/١٠٢).
واتە: کاتێ لە مەیدانی جەنگی نێوان موسڵمانان و بێ باوەڕاندا لەگەڵیان بووی وە بەرنوێژیت بۆ کردن، با کۆمەڵێکیان لەگەڵ تۆدا بەپێوە بووەستن بۆ نوێژ کردن.

هەروەها ئەفەرموورێت: ﴿فَإِنۡ خِفۡتُمۡ فَرِجَالًا أَوۡ رُكۡبَانٗا﴾ (البقرة/٢٣٩). واتە: ئەگەر ترسی دوشمنێکتان هەبوو ئەوە بە پیادەیی یا بەسوواری نوێژەکانتان ـ نوێژی ترس ـ بکەن.

خوای گەورە ڕێی نەداوە بەنەخۆشێکی پەك کەوتە نوێژ لەکاتی خۆی دووا بخات، بەڵکو فەرمانی پێداوە ئەگەر توانای نەبوو بەڕاوەستانەوە بیکات، بەدانیشتنەوە بیکات، وئەگەر توانای دانیشتنیشی نەبوو لەسەرلا، وە تەیەمموم بکات ئەگەر توانای بەکارهێنانی ئاوی نەبوو، وە بێ تەیەممم بیکات ئەگەر توانای خۆڵ بەکارهێنانیشی نەبوو، ئیتر لەکوێ ئیجازەی داوە بەوکەسەی کە ڕێی چووانی نوێژی داوە بەقەستی تا کاتەکەی نامێنێ پاشان فەرمانی پێ کردوە کە نوێژەکەی

بکات لەدوای کاتەکەی، وە پێشی ڕاگەیاندوە کە بەو شێوەیە بری ئەکەوێ، هەر ئاوا بەبێ ئەوەی قورئان یا سوننەتی صەحیح یا غەیرە صەحیح یا قسەی صەحابە یا قیاسێك هەبێت؟.

پاشان دەفەرموێت: ئەمما قەولی ئێمە ئەوەیە کە ئەوکەسەی بەقەستی نوێژ ناکات هەتا کاتەکەی بەسەر ئەچێت لەجیاتی گێڕانەوەی نوێژەکە تۆبە بکات و داوای لێبوردن لەخوا بکات و نوێژی سوننەت زۆر بکات، بەپێی فەرموودەی خوای گەورە کەئەفەرموێت: ﴿فَخَلَفَ مِنۢ بَعْدِهِمْ خَلْفٌ أَضَاعُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُوا۟ ٱلشَّهَوَٰتِ ۖ فَسَوْفَ يَلْقَوْنَ غَيًّا ۝ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَـٰلِحًا فَأُو۟لَـٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ شَيْـًٔا﴾ (مریم/٥٩-٦٠). واتە: پاشان دوای ئەوان نەوەیەك هاتن کە نوێژەکانیان بەتەواوی و لەکاتی خۆیدا نەئەکرد، وشوێن ئارەزووەکانیان کەوتن، ئەوانە ڕۆژی دوایی توشی سزای سەختی خوا ئەبن، تەنها کەسێك نەبێت کە تۆبە بکات و باوەڕی هەبێت و کردەوەی چاك بکات، ئەوانە ـ خوا تۆبەکانیان قەبوڵ ئەکات و ـ ئەچنە بەهەشتەوە بێ ئەوەی هیچ ستەمێکیان لێ بکرێت.

وە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا۟ فَـٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ذَكَرُوا۟ ٱللَّهَ فَٱسْتَغْفَرُوا۟ لِذُنُوبِهِمْ﴾ (آل عمران/١٣٥). واتە: ئەوکەسانەی کاتێ توشی گوناهێکی گەورە بێن یا ستەمێك لەخۆیان بکەن، خوایان بیر ئەکەوێتەوەو داوای لێبوردنی لێ ئەکەن.

وە ئەفەرموێت: ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ۝ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ﴾ (زلزلة/٧-٨). واتە: هەرکەس مسقاڵە زەڕڕەیەك چاکە بکات لە ڕۆژی دواییدا پاداشەکەی ئەبینێ، وە هەرکەس مسقاڵە زەڕڕەیەك خراپە لە ڕۆژی دواییدا سزاکەی ئەبینێتەوە.

هەروەها ئەفەرموێت: ﴿وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا﴾ (الأنبياء/٤٧). واتە: وە لە ڕۆژی دواییدا تەرازووی ڕاست و دادپەروەر دائەنێین بۆ حیساب کردن، بێ ئەوەی کەس هیچ ستەمێکی لێ بکرێت.

ئوممەتی ئیسلامی هەموو لەسەر ئەوە کۆن و دەقەکانیش لەسەر ئەوە هاتوون کە نوێژە سوننەتەکان بەشێك لەخێریان تێدایە، کە خوا ئەزانێ ئەو بەشە چەندەیە، وە هەروەها نوێژە فەرزەکانیش بەشێکیان لە خێر تێدایە، کە هەر خوا ئەزانێ ئەو بەشە چەندەیە، وە حەتمەن ئەبێت چەند بەشێك لە بەشەکانی نوێژە سوننەتەکان بخرێتە سەریەك کاتێ زۆربوون ئەوەندە کە بەشی فەرزەکەش یەکسان بکاو زیادی بکا، وە خوای گەورە ڕای گەیاندووە کە کاری هیچ کەس وون نابێت و کردەوە چاکەکان کردەوە خراپەکان ئەسڕنەوە.

## نوێژی نەخۆش (صلاة المريض)

هەرکەسێك مەعزەرەتێکی بۆ هاتە پێش لە نەخۆشی و شتی تر کە نەیتووانی بەپێوە بووەستێت لەنوێژە فەرزەکاندا، دروستە بۆی بەدانیشتنەوە نوێژ بکات، وە ئەگەر توانای دانیشتنی نەبوو لەسەر تەنیشت ڕکوع و سجوودەکەی بەئیشارەت بکات، وە سەجدەکەی زیاتر نزم بکاتەوە لە ڕکوعەکەی، بەپێی فەرموودەی خوای گەورە کە فەرموویەتی: ﴿فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ قِيَـٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِكُمْ﴾ (النساء/١٠٣). واتە: جا ئەوکاتە یادی خوا بکەن بەپێوە و بەدانیشتنەوە و لەسەر تەنیشت.

لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە هاتووە دەفەرموێت: تووشی مایەسیری بووبوم، جا لە پێغەمبەرم ﷺ پرسی چۆن نوێژ بکەم؟ فەرمووی: (صَلِّ قَائِماً فَإِن لَم تَستَطِع فَقَاعِداً، فَإِن لَم تَستَطِع فعلى جَنبِكَ) (رواه الجماعة إلا مسلماً). واتە: بەپێوە نوێژ بکە، ئەگەر نەتتوانی بەدانیشتنەوە، ئەگەر هەر نەتتوانی لەسەر تەنیشت نوێژەکەت بکە، وە نسائی ئەمەی زیاد کردووە کە فەرموویەتی: (فَإِن لَم تَستَطِع فَمُستَلقِياً، لا يُكَلِّفُ اللهُ نَفساً إلا وُسعَهَا) واتە: ئەگەر بەوشێوەش بۆت نەکرا لەسەر پشت ڕاکشێ، چونکە خوا تەکلیف لە کەس ناکات بەپێی توانا نەبێت.

له جابیرەوه هاتووه دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ سەردانی نەخۆشێکی کرد، بینی لەسەر پشتی‌یەك نوێژ ئەکات، پێغەمبەر ﷺ پشتی‌یەکەی لابردو فەرمووی: (صَلِّ على الأرضِ إنِ استَطَعتَ، وَإلا فَأومِئ إيمَاءً، وَاجعَل سُجُودَكَ أخفَضَ مِن رُكُوعِكَ) (رواه البيهقي وصحح أبوحاتم وقفه)[1]. واته: ئەگەر توانیت لەسەر زەوی نوێژ بکە، ئەگینا بەئیشارەت نوێژەکەت بکە، وە پشت دانەواندنەکەت (سەجدەکەت) زیاتر بێت لە ڕکوعەکەت.

وە ئەوەی ئیعتیباری پێ ئەکرێت لە نەتوانیندا ئەوەیە گران بێت لەسەر نەخۆشەکە، یا ترسی زیادبوونی نەخۆشی‌یەکەی هەبێت، یا چاك بوونەوەی دووا بخات، یا ترسی گێژبوونی هەبێت، وە شێوەی دانیشتن، کە لەباتی بەپێوە وەستانە ئەوەیە چوار مشقی دابنیشێ.

لە عائیشەوە هاتووە کە دەفەرمووێت: پێغەمبەرم ﷺ بینیوە چوارمشقی دانیشتووە نوێژی کردووە، (نەسائی گێڕاویەتی‌یەوە، وە حاکم بە صەحیحی داناوە).

وە دروستە چۆن بۆ تەحییات دائەنیشێ، ئاوا دابنیشێ.

ئەمما شێوەی ئەو نوێژەی توانای بەپێوە وەستان و دانیشتنی نی‌یە تێیدا ئەوە ووتراوە لەسەر تەنیشت نوێژ بکات، ئەگەر هەر نەیتوانی لەسەر پشت ڕاکشێت، بەڵام قاچەکانی بەرەو قیبلە بن بەپێی توانا، وە ئیبنو مونذیر ئەوەی هەڵبژاردووە.

وە لەوبارەیەوە حەدیسێکی زەعیف هاتووە لە عەلی‌یەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: (يُصَلِّي المَرِيضُ قَائِماً إنِ استَطَاعَ، فَإن لَم يَستَطِع صلى قَاعِداً، فَإن لَم يَستَطِع أن يَسجُدَ، أومَأَ بِرأسِهِ، وَجَعَلَ سُجُودَهُ أخفَضَ مِن رُكُوعِهِ، فَإن لَم يَستَطِع أن يُصَلِّيَ قَاعِداً صلى على جَنبِهِ الأيمَن مُستَقبِلاً القِبلَةَ، فَإن لَم يَستَطِع أن يُصَلِّيَ على جَنبِهِ الأيمن، صلى مُستَلقِياً رِجلاهُ مِمَّا يَلِي القِبلَةَ) (رواه الدارقطني). واته: نەخۆش ئەگەر توانی ئەبێ بەپێوە نوێژ بکات، ئەگەر توانای نەبوو بەدانیشتنەوە نوێژ بکات، ئەگەر توانای نەبوو سەجدە بەرێ بەسەر ئیشارەت بکاو با سەجدەکەی نزم تر بێ لە رکوعەکەی، ئەگەر نەیتوانی بەدانیشتنەوە نوێژ بکات لەسەر لای ڕاست بەرەو قیبلە نوێژ

---

[1] (حافظ) لەدوای ئەبوحاتیمەوە لە (التلخيص)دا ووتویەتی: سێ کەس لە سیقەکان بە مەرفوعی ریوایەتیان کردووە، جا بۆ ئەوە ئاماژە ئەکات کە حەدیسەکە مەرفوعە، وە هەرواشە، بەڵام ئەم حەدیسە عیللەتێکی تری هەیە کە ئەویش تەدلیس کردنی ئەبوزوبەیرە لە جابیرەوە، وەکو لە تەخریجی (صفة صلاة النبي ﷺ)دا باسم کردوە، بەڵام چەند ڕێگایەکی تری هەیە، وە شایەتێکی هەیە بە سەنەدێکی صەحیح لە ئیبنوعومەرەوە، وە گومان لەوەدا نی‌یە کە مەرفوعە بۆلای پێغەمبەر ﷺ وەك لەوێدا ڕونم کردۆتەوە، پاشان لە (الصحيحة)دا تەخریجم کردووە بە ژمارە (٣٢٣) (تمام المنة).

بکات، ئەگەر توانای نەبوو لەسەر لای ڕاست بیکات با لەسەر پشت ڕاکشێت و قاچەکانی بەرەو قیبلە بکات، واتە: قاچەکانی لای قیبلەوە بێت.

وە کۆمەڵێك لە زانایان وتویانە: چۆن بۆی ئاسان بوو ئاوها نوێژ بکات، وە ڕواڵەتی حەدیسەکان وادەرئەخەن کە ئەگەر توانای ئیشارەت کردنیشی نەبوو بەڕاکشانەوە، ئەوە لەدوای ئەوە هیچی لەسەر نی‌یە.

## نوێژی ترس (صلاة الخوف)

زانایان لەسەر مەشروعی‌یەتی نوێژی ترس ڕێك کەوتوون[1]، بەپێی فەرموودەی خوای گەورە کە فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلَوٰةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُوٓا۟ أَسْلِحَتَهُمْ فَإِذَا سَجَدُوا۟ فَلْيَكُونُوا۟ مِن وَرَآئِكُمْ وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَىٰ لَمْ يُصَلُّوا۟ فَلْيُصَلُّوا۟ مَعَكَ وَلْيَأْخُذُوا۟ حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ ۗ وَدَّ الَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَٰحِدَةً ۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَن تَضَعُوٓا۟ أَسْلِحَتَكُمْ ۖ وَخُذُوا۟ حِذْرَكُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ أَعَدَّ لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا﴾ (النساء/١٠٢). واتە: ئەگەر کاتی جەنگ دژی بێ بڕواکان ترس لەناودا بوو، ئەگەر تۆ لەناو کۆمەڵەکەتدا بوویت ـ لە گۆڕەپانی جەنگدا ـ ویستت نوێژیان بەجەماعەت پێ بکەی بیان کە بە دوو دەستەوە، جا دەستەیەکیان لەگەڵتا بن جا چەکەکانیشیان هەڵگرن، وە کاتێ سەجدەیان برد لەگەڵتا با دەستەی دووەم لەدوواتانەوە بن بۆ پاسەوانی کردنتان، وە دەستەی یەکەم ڕکاتی تەواو نەکەن و سەلام نەدەنەوە، پاشان ئەو دەستەی دووەمە کە نوێژیان نەکردووە با بێن لەگەڵتا نوێژ بکەن، وە با ووریا بن و چەکەکانیشیان هەڵگرن. کافرەکان ئاواتیان وایە کە بێ ئاگا بن لە چەك و شتومەکەکانتان بۆ ئەوەی لەپڕتاو هێرشێك بکەنە سەرتان و لەناوتان بەرن، وە گوناح نی‌یە و قەیناکا ئەگەر ئازارتان تووش بوو لە بارانێکەوە،

[1] ترسەکە لە دوژمن بێت یا لە سوتاندن یا لە وینەی ئەو دووانە، لە سەفەردا بێت یا لە ئاوەدانیدا (دانەر).

یا نەخۆش بوون چەکەکانتان دابنێن، بەڵام وشیاری خۆتان وەرگرن، بەڕاستیش خوا بۆ کافران سزایەکی ڕیسواکەری ئامادە کردووە[1].

ئیمام ئەحمەد دەفەرمووێت: دەربارەی نوێژی ترس شەش یا حەوت حەدیس هاتووە، پیاو هەرکامیان بکات دروستە.

ئیبنو قەییم دەفەرمووێت: شێوەی نوێژ کردنەکە شەشە لەئەصلدا، بەڵام هەندێ لەوە زیاتریان داناوە، چونکە ئەوانە هەرکاتێك جیاوازییەکیان بینیبێت لەگێڕەوەکاندا لەبارەی بەسەرهاتێکدا کردویانەتە شێوەیەکی سەربەخۆ هەتا گەیشتۆتە حەڤدە شێوە، بەڵام ئەکرێ کردەوەکانی پێغەمبەر ﷺ بچنە ناو یەك، وە ئەوە جیاوازییە هەر لە جیاوازی ڕاوییەکانەوەیە.

(حافظ) دەفەرمووێت: ئەوەیە پشتی پێ بەستراوە، وە وا لەخوارەوە ڕوونی ئەکەینەوە:

١- کاتێ دوشمن لای قیبلەوە نەبوو ئیمام لەم شێوەیەدا لە نوێژی دوو ڕکاتیدا، کۆمەڵەکە ئەکات بە دوو بەشەوە، ڕکاتێك بەکۆمەڵێکیان ئەکات و چاوەڕوانی ئەکات هەتا خۆیان ڕکاتەکەی تر تەواو ئەکەن و هەڵئەسن ئەچنەوە بۆ بەرامبەر دوژمن، پاشان کۆمەڵەکەی تر دێن لەگەڵیا ڕکاتی دووەم ئەکەن، ئینجا چاوەڕوان ئەبێت هەتا خۆیان ڕکاتەکەی تر تەواو ئەکەن، پاشان سلاو ئەداتەوە لەگەڵ ئەواندا.

لە صالحی کوڕی خەوواتەوە لە سەهلی کوڕی ئەبو (خیثمة)وە هاتووە دەفەرمووێت: کۆمەڵێك هاتن لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ڕیز بوون و کۆمەڵەکەی تر بەرامبەر دوژمن ڕاوەستان، بەو کۆمەڵەی لەگەڵیا بوون ڕکاتێکی کردو ڕاوەستا، هەتا ڕکاتەکەی تریان بۆخۆیان تەواو کردو ڕۆیشتن بۆ بەرامبەر دوژمن، پاشان کۆمەڵەکەی تر هاتن لەگەڵیا ئەوڕکاتەی تری مابوو تەواویان کرد، پاشان دانیشت هەتا ئەوان بۆخۆیان ڕکاتەکەی تریان تەواو کرد، پاشان سلاوی پێ دانەوە، (رواه الجماعة إلا ابن ماجة).

٢- کاتێ دوژمن لەلای قیبلەوە نەبێت، دووبارە ئیمام سوپاکە ئەکات بەدووبەشەوە، بەرنوێژی کۆمەڵێکیان ئەکات و یەك ڕکات نوێژیان پێ ئەکات، وە کۆمەڵەکەی تر بەرامبەر دوشمن ڕائەوەستن، پاشان ئەو کۆمەڵەی یەك ڕکاتەکەیان لەگەڵا کردووە ئەڕۆن و بەرامبەر دوشمن ڕائەوەستن، و کۆمەڵەکەی تر دێن ڕکاتێکی لەگەڵا ئەکەن، پاشان هەرکۆمەڵە بۆ خۆی ڕکاتەکەی تەواو ئەکات.

---

(١) جومهور لەسەر ئەوەن کە هەڵگرتنی چەك لەکاتی نوێژەکەدا موستەحەببە، بەڵام هەندێك ئەڵێن: واجبە (دانەر).

له ئیبنو عومەرەوە هاتووە کە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ نوێژی بەکۆمەڵێکیان کردو کۆمەڵەکەی تر بەرامبەر دوشمن ڕاوەستابوون، ئەو کۆمەڵە کاتێك ڕکاتێکیان تەواو کرد چوون لەشوێنی هاوڕێکانیان بۆ بەرامبەر دوشمن ڕاوەستانەوە، پاشان کۆمەڵەکەی تر هاتن پێغەمبەر ﷺ ڕکاتێکی پێ کردن، ئینجا سلاوی دایەوە، پاشان هەرکۆمەڵە بۆخۆی ڕکاتەکەی تریان بۆخۆیان تەواو کرد (ئەحمەدو هەردوو شێخ گێڕاویانەتەوە).

(ظاهر)ی حەدیسەکە وادەرئەخات کە کۆمەڵەی دووەم دوای سلاودانەوەی ئیمام هەڵئەسنەوە نوێژەکەیان تەواو ئەکەن بێ ئەوەی بەپاسەوانیەکە نوێژەکەیان پچڕاندبێت، بەو پێیە ئەمانە هەردوو ڕکاتەکەیان بەسەریەکەوە بووە، وە کۆمەڵی یەکەم ڕکاتی دووەم ناکەن هەتا کۆمەڵی دووەم لەنوێژ ئەبنەوەو ئەگەڕێنەوە بۆ بەرامبەر دوشمن.

له ئیبنو مەسعودەوە هاتووە دەفەرمووێت: پاشان سلاوی داوە و ئەو کۆمەڵە (واتە: کۆمەڵەی دووەم) بۆخۆیان ڕکاتەکەی تریان تەواو کرد، ئینجا سلاویان داوە[1].

٣- لەم شێوەیەدا ئیمام بە هەرکۆمەڵێکیان دوو ڕکات ئەکات بەو پێیە دوو ڕکاتی یەکەم بۆ ئیمام فەرزەو دوو ڕکاتی دووەم سوننەتە، وە ئەوکەسەی نوێژی فەرز ئەکات دروستە لەدوای کەسێکەوە نوێژ بکات کە نوێژی سوننەت بکات، لە جابیرەوە هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ دوو ڕکاتی بۆ کۆمەڵێکیان کردو پاشان بە کۆمەڵەکەی تریش دوو ڕکات ئینجا سلاوی دایەوە، (شافعی و نەسائی گێڕاویانەتەوە).

وە لە ریوایەتێکی ئەحمەد و ئەبوداود و نەسائی دا هاتووە جابیر دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ نوێژی ترسی بۆ کردین، بەکۆمەڵێك لە هاوڕێکانی دوو ڕکاتی کرد، پاشان سلاوی داوە، ئەوان چوونە دوواوەو کۆمەڵەکەی تر کە لە شوێنی ئەوان بوون هاتن و چوونە شوێنیان، پێغەمبەر ﷺ دوو ڕکاتی بەم کۆمەڵەیش کرد لەپاشاندا سلاوی دایەوە، بەو پێیە پێغەمبەر ﷺ چوار ڕکاتی کردو ئەوان دوو ڕکات[2].

لە ریوایەتێکی ئەحمەدو هەردوو شێخدا هاتووە: لە جابیرەوە دەفەرمووێت: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بووین لە جەنگی (ذات الرقاع) دا کاتی نوێژ هات قامەت کرا، پێغەمبەر ﷺ

---

(١) دانەر حەدیسەکەی تەخریج نەکردووە، لە ریوایەتی ئەبی داود و ئەحمەد، ئیسنادەکەشی لاوازە، چونکە لەڕێگای خەصیفەیە، وە لە (الإرواء)دا تەخریج کراوە بە ژمارە (٣/٤٩) و (ضعیف أبي داود ٢٢٩-٢٣٠)، (تمام المنة).

(٢) لە ریوایەتی جابیر نیە بەڵکو لە ریوایەتی (ئەبوبەکرە)وەیە.

بەکۆمەڵێکیان دوو ڕکاتی کردو لەپاشاندا چوونە دواوەو کۆمەڵەکەی تریش هات دوو ڕکاتی پێ کردن، بەو پێیە پێغەمبەر ﷺ چوار ڕکاتی کردو ئەوان دوو ڕکات.

٤- دوژمن کەوتبێتە لای قیبلەوە، لەم شێوەیەدا ئیمام هەموویان لەدوای خۆیەوە ڕیز ئەکات نوێژیان بۆ ئەکات، وە هەموویان بەشداری پاسەوانی بکەن و بەدوای ئیمامەوە بن لە هەموو پایەکانی نوێژەکەدا هەتا ئەگەنە سەجدەبردن، ئەوکاتە کۆمەڵێکیان سەجدە ئەبەن لەگەڵ ئیمام و کۆمەڵێکیان چاوەڕوان ئەکەن هەتا کۆمەڵەی یەکەم سەجدەکەیان تەواو ئەکەن و سەر بەرز ئەکەنەوە، ئینجا ئەمان سەجدە ئەبەن، وە کاتێ لە ڕکاتی یەکەم بوونەوە کۆمەڵەی دواوە دێنە پێشەوەو بۆ شوێنی کۆمەڵەی پێشەوە، وە کۆمەڵەی پێشەوە ئەکشێنەوە دواوە.

لە جابیرەوە هاتووە دەفەرمووێت: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژی ترسمان کردووە، پێغەمبەر ﷺ کردینی بە دوو ڕیز لەدوای خۆیەوە، دوشمن لەنێوان ئێمەو قیبلەدا بوو، پێغەمبەر ﷺ نوێژی دابەست و ئێمەش هەموومان نوێژمان دابەست، پاشان چووە ڕکوعەوە ئێمەش هەموومان چوینە ڕکوعەوە، لەپاشاندا سەری لە ڕکوع بەرز کردەوە ئێمەش هەموومان سەرمان بەرز کردەوە، کاتێ دانەویەوە بۆ سەجدە بردن ئەو ڕیزەی لەدوایەوە بوو لەگەڵیا چوونە سەجدەوە، و ڕیزەکەی تر بەپێوە وەستا بەرامبەر دوژمن، کاتێ پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ڕیزەکەی دوای خۆی سەجدەبردنیان تەواو کرد، ڕیزەکەی دووەم دانەوینەوە بۆ سەجدە بردن، ئینجا ئەوانیش هەڵسانەوە، پاشان ڕیزەکەی دواوە چووە پێشەوەو ئەوانی پێشەوە هاتنە دواوە، پاشان پێغەمبەر ﷺ چووە ڕکوع و ئێمەش هەموومان چووینە ڕکوع، لەپاشاندا سەری بەرز کردەوە لە ڕکوع و ئێمەش هەموومان سەرمان بەرزکردەوە، لەپاشاندا دانەوییەوە بۆ سەجدە، لەگەڵ ئەو ڕیزەی جاری یەکەم لە ڕکاتی یەکەمدا لە دواوە بوون و ڕیزەکەی دواوە وەستانەوە بەرامبەر دوشمن، کاتێ پێغەمبەر ﷺ سەجدەکەی تەواو کرد لەگەڵ ئەو ڕیزەدا کە لە دواوەی بوون ڕیزەکەی دواوەیان دانەوینەوە و سەجدەیان برد، لەپاشاندا پێغەمبەر ﷺ سلاوی دایەوە ئێمەش هەموو سلاومان دایەوە. (ئەحمەد و موسلیم و نەسائی و ئیبنو ماجەو بەیهەقی گێڕاویانەتەوە).

٥- لەم شێوەیەدا هەردوو کۆمەڵەکە لەگەڵ ئیمامدا نوێژ دائەبەستن، لەپاشاندا یەکێ لەو دوو کۆمەڵەیە بەرامبەر دوژمن ئەوەستن و کۆمەڵەکەی تریان ڕکاتێك لەگەڵ ئیمامدا تەواو ئەکەن، پاشان ئەڕۆن بەرامبەر دوژمن ئەوەستن، لەپاشان کۆمەڵەکەی تر دێت بۆ خۆی ڕکاتێك ئەکات و ئیمام هەر بەپێوە ڕاوەستاوە، پاشان ڕکاتی دووەم بەمان دەکات، لەپاشاندا ئەو کۆمەڵەی بەرامبەر دوژمن وەستاون دێن بۆ خۆیان ڕکاتێك ئەکەن، لەو کاتەدا کۆمەڵەی دووەم لەگەڵ ئیمامدا دانیشتوون چاوەڕوانی ئەوانن، لەپاشاندا ئیمام سلاو ئەداتەوەو هەموو سلاو ئەدەنەوە.

لە ئەبی هورەیرەوە هاتووە دەفەرموێت: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژی ترسم کردووە، ساڵی جەنگی نەجد کاتێ هەڵسا بۆ نوێژی عەسر کۆمەڵێ لەگەڵیا هەڵسان، وە کۆمەڵەکەی تر بەرامبەر دوژمن وەستان، و پشتیان لە قیبلە بوو، پێغەمبەر ﷺ نوێژی دابەست هەموو لەدوایەوە نوێژیان دابەست، (ئەو کۆمەڵەی بەرەو قیبلە بوون و ئەوانەی بەرەو دوژمن)، لەپاشاندا چووە رکوعەوە لەگەڵ ئەوانەی لەگەڵیا بوون، لەپاشاندا دانەوی‌یەوە بۆ سەجدە لەگەڵ ئەو کۆمەڵەیەدا کە لە دوواوەی بوون، وە ئەوانی تر هەر بەپێوە وەستابوون بەرامبەر دوشمن، لەپاشاندا هەڵسایەوەو ئەوانەی لەگەڵیا بوون هەڵسانەوەو چوون بەرامبەر دوژمن وەستان، وە ئەو کۆمەڵەیەی بەرامبەر دوژمن وەستابوون هاتن رکوعیان بردو سەجدەیان برد، پێغەمبەر ﷺ هەر بەپێوە وەستابوو، لەپاشاندا هەڵسانەوە، پێغەمبەر ﷺ رکوعێکی تری بردو ئەوانیش لەگەڵیا رکوعیان برد، وە پێغەمبەر ﷺ سەجدەی برد ئەوانیش سەجدەیان برد، پاشان ئەو کۆمەڵەیەی بەرامبەر دوژمن وەستابوون هاتن رکوع و سجودیان تەواو کرد، لەوکاتەدا پێغەمبەرو کۆمەڵەکەی دانیشتبوون چاوەڕووانی ئەوانیان ئەکرد، ئینجا تەحییاتیان خوێندو پێغەمبەر ﷺ سلاوی دایەوە و هەموویان لەدوایەوە سلاویان دایەوە، بەوپێیە پێغەمبەر ﷺ دوو ڕکاتی کردو هەردوو کۆمەڵەکەش هەریەکەیان دوو ڕکات، (ئەحمەدو ئەبوداود و نەسائی گێڕاویانەتەوە).

٦- لەم شێوەیەدا هەرکۆمەڵێك تەنها یەك ڕکات بکات لەگەڵ ئیمامدا، بەم پێیە ئیمام دوو ڕکات ئەکات و هەریەك لەدوو کۆمەڵەکە ڕکاتێ، لەئیبنو عەبباسەوە هاتووە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ لە (ذي قرد) نوێژی ترسی کرد، خەڵکەکەی کرد بە دوو ڕیز، ڕیزێ لەدوای خۆیەوە و ڕیزێ بەرامبەر دوژمن، ئەو ڕیزەی لەدوایەوە بوون لەگەڵیا ڕکاتێکیان کرد، لەپاشاندا ڕۆیشتن بۆ جێگەی کۆمەڵەکەی‌تر، پاشان کۆمەڵەکەی تر هاتن ڕکاتەکەی تری لەگەڵ کردن، بەڵام هیچ لایەکیان ڕکاتەکەی تریان نەکرد، (نەسائی و ئیبنو حیببان کە بەصەحیحی داناوە گێڕاویانەتەوە).

وە هەر لەوەوە هاتووە دەفەرموێت: خوا نوێژی لەگەڵ پێغەمبەرەکەتاندا ﷺ فەرز کردووە لە ئاوەدانیدا چوار ڕکات، وە لە سەفەردا دوو ڕکات، وە لەکاتی ترسدا یەك ڕکات، (ئەحمەدو موسلیم و ئەبوداود و نەسائی گێڕاویانەتەوە).

لە ثەعلەبەی کوڕی زەهدەوە کە دەفەرموێت: لە طەبەرستان لەگەڵ سەعیدی کوڕی عاصدا بووین، ووتی: کێ لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژی ترسی کردووە؟ حوزەیفە ووتی: من، جا نوێژی بە هەردوو دەستەکە کرد ئەمیان یەك رکات و ئەویان یەك رکات، و هیچیان رکاتەکەی تریان نەکرد. ئەبو داود و نەسائی گێڕاویانەتەوە.

**چۆنیەتی بەجێهێنانی نوێژی ئێوارە کاتی ترس:**

نوێژی ئێوارە (مغرب) کورت ناکرێتەوە، وە لە هیچ حەدیسێکدا چۆنیەتی بەجێهێنانی نوێژی ئێوارە لەکاتی ترسدا نەهاتووە، هەر لەبەر ئەوە زانایان جیاوازیان هەیە لەسەر چۆنیەتی بەجێ هێنانی، لای حەنەفیەکان و مالیکیەکان ئیمام دوو ڕکات بەکۆمەڵی یەکەم ئەکات و ڕکاتێك بەکۆمەڵی دووەم، وە شافیعی و ئەحمەد ڕێیان داوە ئیمام یەك ڕکات بەکۆمەڵەی یەکەم بکات و دوو ڕکات بەکۆمەڵەی دووەم، بەپێی ئەوەی لە عەلیەوە ریوایەت کراوە کە ئەو بەو شێوەیە نوێژی ئێوارەی کردووە لەکاتی ترسدا.

**نوێژ لە کاتی ترسی زۆردا:**

کاتێ ترس زۆر بوو، و ڕیزەکان بەرەنگاری یەك بونەوە، هەردوولا دایان بەیەکدا، هەرکەس بۆخۆی بەپێی توانا نوێژ ئەکات، بەپێوە بێت یا بەسواری، بەرەو قیبلە یا بەرەولایەکی تر، وە ڕکوع و سجودەکەی بەئیشارەت ئەبێت هەرچۆنێك توانی بەجێیان بهێنێ، وە سەجدەکەی نزم تربێت لە ڕکوعەکەی، وە هەرچی بۆ نەکرا لەپایەکانی نوێژ لەسەری لائەچێت.

ئیبنوعومەر دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ وەصفی نوێژی ترسی ئەکرد ئەیفەرموو: (فَإن كَانَ خَوفٌ أشَدَّ مِن ذَلِكَ فَرِجَالاً ورُكبَاناً) واتە: ئەگەر ترس لەمە زیاتر بوو بەپێوەو بەسواریەوە نوێژ بکەن.

ئەم حەدیسە لای بوخاری بەم لەفزە هاتووە: (فَإن كَانَ خَوفٌ أشَدَّ مِن ذَلِكَ، صَلُّوا رِجالاً قِيَاماً على أقدَامِهِم أو رُكبَاناً مُستقبِلِي القِبلَةِ وَغَيرَ مُستَقبِلِيهَا). واتە: ئەگەر ترس لەوە زیاتر بوو بە پیادەیی بەپێوە نوێژ بکەن، یا بەسواری بەرەو قیبلە بێت یان نا.

وە لە ریوایەتەکەی لای موسلیم هاتووە کە ئیبنوعومەر دەفەرموێت: ئەگەر ترس لەوە زیاتر بوو بەسوواری بێت یا بەپێوە بەئیشارەت نوێژ بکەن.

**نوێژی ویستەرو ویستراو (طالب و مطلوب)**

ئەگەر کەسێك بەدوای دوژمنەوە بوو ئەیویست پێی بگات و ترسی ئەوەی هەبوو کە ئەگەر نوێژەکەی بکات دوژمنەکەی لەدەست بچێت، ئەوکەسە بە ئیشارەت نوێژ بکات با بە ڕۆیشتنیشەوە بێت و بەرەو قیبلەش نەبێت.

وە ویستراویش هەر بەوشێوەیە ئەبێ نوێژ بکات، وە هەرکەس کە دوژمن ڕێ لە ڕکوع و سجودی بگرێت ئەچێتە پاڵ ئەودووانە، وە هەروەها کەسێك ترسی گیانی خۆی هەبێت، یا ترسی گیانی

کەس‌وکاری، یا ترسی لەدەست چوونی ماڵی ببێ بەهۆی دوژمنەوە، یا دزەوە، یا دڕندەیەکەوە، ئەمانەش هەر بەئیشارەتەوە نوێژ بکەن بەرەو قیبلە بێت یا لایەکی تر.

عیراقی دەفەرموێت: ئەو شێوە نوێژ کردنە دروستە بۆ هەموو ئەوانەی بەرەوا هەڵدێن لەترسی لافاو بێت، یا ئاگر، ئەگەر بەوشێوەیە نەبێت نەتوانێ خۆی لێبپارێزێ، وە هەروەها قەرزارێك کە توانای دانەوەی قەرزەکەی نەبوو، وە نەیتوانی نەبونی‌یەکەی ڕوون بکاتەوە، وە ئەگەر خاوەن قەرز پێی بگات، بەندی بکات و باوەڕ بە قسەکانی نەکات کە نی‌یەتی.

هەروەها ئەگەر کەسێك تۆڵەیەکی لەسەر بوو (قصاص) بەهیوای ئەوە بوو خاوەن ماف ڕق و قینەکەی بنیشێتەوە، بە خۆشاردنەوەی بۆ ماوەیەك.

لە عبداللە ی کوڕی ئونەیسەوە هاتووە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ ناردمی بەدوای خالیدی کوڕی سوفیانی هوزەلی کە بەرەو عەرەفات ئەڕۆیشت فەرمووی: بڕۆ بیکوژە، کاتێ بەدیم کرد کاتی نوێژی عەسر بوو، لەبەرخۆمەوە ووتم: ئەترسم ئەگەر دابەزم نوێژەکەم بکەم لێم دوور بکەوێتەوەو بەردەستم نەکەوێت، لەبەر ئەوە بەرێوە ئەڕۆیشتم بەرەو ئەوو نوێژم ئەکرد بەئیشارەت، کاتێ نزیك بوومەوە لێی ووتی: تۆ کێی ؟ ووتم: پیاوێکی عەرەبم، بیستوومە تۆ خەڵك کۆ ئەکەیتەوە دژی ئەوکابرایە، منیش بۆ ئەوە هاتووم بۆلات، ووتی: بەڵێ خەریکی ئەوەم، ساتێك لەگەڵیا ڕۆیشتم هەتا بۆم ڕێکەوت بە شمشێرەکەم لێم دا هەتا گیانی دەرچوو، (ئەحمەد و ئەبو داود گێڕاویانەتەوە، وە (حافظ) ئیسنادەکەی بەحەسەن داناوە)[1].

## نوێژی سەفەر

نوێژی سەفەر چەند حوکمێکی هەیە وا لەخوارەوە ڕوونیان ئەکەینەوە:

**(١) کورت کردنەوەی نوێژە چوار ڕکاتی‌یەکان:**

(١) لە بە حەسەن دانانیدا چاو پیاخشاندنەوەی ئەوێت، چونکە لە ریوایەتی کوڕی عبداللە ی کوڕی ئونەیسە ئەو عبداللە یە چەند کوڕێکی هەیە، هەیانە جێی باوەڕن و هەیانە لاوازن، ئەمیش ناوی نەهێناوە کامیانە، وە مونذیری باسی ئەوەی کردووە کە عبد اللە ی کوڕی عبد اللە ی کوڕی ئونەیسە جا ئەگەر ئەوە ڕاست بێت ئەوە لە ژمارەی نەناسراوەکانە، وەك لە (ضعیف أبي داود)دا باسم کردووە بە ژمارە (٢٣٢) وە شایەتیشم بۆ نەدۆزراوەتەوە کە حەدیسەکە قەوی بکات، تەماشای (إرواء الغليل ٥٨٩) بکە: ئیتر خوای گەورە بۆخۆشی زاناترە.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي ٱلْأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُواْ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ﴾ (النساء/١٠١).

واتە: کاتێ سەفەرتان کرد تاوانبار نابن ئەگەر نوێژە چوار ڕکاتی‌یەکان کورت بکەنەوە و بیکەن بە دوو ڕکات ئەگەر ترسان کە بێ باوەڕەکان ئازارتان بدەن.

وە بەستنەوەی کورت کردنەوە بە مەترسی وە کاری پێ ناکرێت. لە یەعلای کوڕی ئومەییەوە هاتووە دەفەرمووێت: بە عومەری کوڕی (خطاب)م ووت: ئەم نوێژ کورت کردنەوە چی‌یە ئەم خەڵکە ئەیکەن ؟ خوای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ﴾

واتە: ئەگەر ترسی ئەوەتان هەبوو بێ باوەڕەکان ئازارتان بدەن، خۆ ئەو ڕۆژە ڕۆیشت ترسمان هەبێت؟ عومەر فەرمووی: منیش وەك تۆ ئەو کارەم لا سەیر بوو، بۆیە لەوبارەیەوە پرسیم لە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (صَدَقَةٌ تَصَدَّقَ اللهُ بِهَا عَلَيكُم فَاقبَلُوا صَدَقَتَهُ) (رواه الجماعة)[1]. واتە: ئەوە صەدەقەیەکە خوا بۆی داناون، ئێوەش صەدەقەکەی وەربگرن.

ئیبنو جەریر ئەگێڕێتەوە لە ئەبومونیبی جورەشی‌یەوە دەفەرمووێت: بە ئیبنو عومەریان ووت: خوای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي ٱلْأَرْضِ. . .﴾ ئایەتەکە، خۆ ئێستا ئێمە ئاسودەین و بێ ترسین ئایا نوێژ کورت بکەینەوە؟ فەرمووی: ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾ پێغەمبەر ﷺ چاکترین پێشەوایە بۆ ئێوە چاوی لێ بکەن.

لە عائیشەوە هاتووە دەفەرمووێت: لە مەککە بوو نوێژ فەرز کرا، لەپێشەوە دوو ڕکات دوو ڕکات بوو، جا کاتێ پێغەمبەر ﷺ هات بۆ مەدینە بۆ هەردوو ڕکاتێك دوو ڕکاتی تری زیاد کرد، جگە لەنوێژی ئێوارە کە وەتری ڕۆژە، وە نوێژی بەیانی لەبەر قورئان خوێندنی زۆر تێیدا، وە پێغەمبەر ﷺ کاتێ ئەچوو بۆ سەفەر وەك یەکەم جار نوێژی ئەکرد (واتە دوو ڕکات

(١) ئەو کۆمەڵە بوخاری تێدا نی‌یە واتە بوخاری نەیگێڕاوەتەوە، ئیتر چۆن ئەڵێت: کۆمەڵ گێڕاویانەتەوە، خاوەنی (المنتقی) بە ڕاشکاوی ئەڵێت: (رواه الجماعة إلا البخاري) وە لەوانەیە ئەو جیا کردنەوەی بوخاری لە نوسینەوەکەدا کەوتبێ.

نەیکرد). (ئەحمەدو بەیهەقی و ئیبنو حیببان و ئیبنو خوزەیمە گێڕاویانەتەوە وە پیاوەکانی جێی باوەڕن[1]).

ئیبنو قەییم دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ ئەچوو بۆ سەفەر نوێژە چوار ڕکاتی‌یەکانی کورت ئەکردەوە و ئەیکردن بە دوو ڕکات هەتا ئەگەڕایەوە بۆ مەدینە، وە سابت نەبووە لە سەفەردا ئەو نوێژە چوار ڕکاتی‌یانەی بەتەواوی کردبێت، وە کەس لەزانایان جیاوازی نەبووە لەسەر ئەوە، هەرچەندە لە حوکمی کورت کردنەوەدا جیاوازیان هەیە، عومەر و عەلی و ئیبنومەسعود و ئیبنوعومەر و جابیر و ئیبنو عەبباس فەرمویانە: کورت کردنەوە واجبە، وە ئەمە مەزهەبی حەنەفی‌یەکانە.

مالیکی‌یەکان وتویانە: کورت کردنەوە سوننەتێکی موئەککەدەیە لە جەماعەت موئەککەدترە، جا ئەگەر ئەو موسافیرە موسافیرێکی تری دەست نەکەوت بیکاتە بەرنوێژ بەتەنها نوێژەکە ئەکات بە کورت کراوەیی، وە کەراهەتی هەیە لەدوای موقیمەوە نوێژ بکات[2]، وە لای

---

(١) لە (تمام المنة) دا لێکۆڵینەوەی لەسەرە، بەڵام شێخ ڕەحمەتی خوای لێ بێت سەرئەنجام دەفەرموێت: لە (الصحيحة) دا بە ژمارە (٢٨١٤) تەخریجم کردووە.

(٢) منیش ئەڵێم ئەم کەراهەتەی کە مالیکی‌یەکان وتویانە: ڕووتە لە بەڵگە، و پێچەوانەی ئەم سوننەتەیە کە زانای ئەم ئومەتە عبداللە ی کوڕی عەبباس گێڕاویەتی‌یەوە ڕەزای خوای لێ بێت، موسای کوڕی سەلەمە ئەڵێت: لەگەڵ ئیبنوعەبباسدا لە مەککە بووین، منیش وتم: ئەگەر لەگەڵ ئێوەدا بین چوار ڕکات نوێژ ئەکەین، بەڵام ئەگەر بگەڕێینەوە ناو چادرەکانمان ئەوە دوو ڕکات نوێژ ئەکەین؟

ئەویش فەرمووی: ئەوە سوننەتی ئەبولقاسمە. ئەحمەد بە سەندێکی صەحیح تەخریجی کردووە، وە موسلیم و ئەبو عوانە و جگە لەوانیش بە کورتی ریوایەتیان کردووە، وە لە (الإرواء) یش دا تەخریج کراوە بە ژمارە (٥٧١).

پاشان دانەر وتەی بەهێزی ڕوون نەکردۆتەوە لەناو ئەو قەولانەدا، هەروەك ئەمە پیشەی بووە لە زۆر لە کتێبەکاندا.

جا ئەوەی من بە تەئکید ئەیڵێم ئەوەیە: کە نوێژ کورت کردنەوە واجبە و قسەی ئەوانەش تەرجیح ئەدەم کە وائەڵێن، لەبەر چەند بەڵگەیەکی زۆر کە هیچ بەربەرچ دەرەوەی بۆ نی‌یە، و شەوکانی لە (السيل الجرار ١/٣٠٦-٣٠٧) دا باسی کردووە، لەوانە حەدیسەکەی عائیشەیە کە بەم نزیکانە باسم کرد (فُرِضَتِ الصَّلَاةُ رَكعَتَينِ رَكعَتَينِ...) حەدیسەکە.

جا هەرکەسێك لەسەفەردا نوێژ لە دوو ڕکات زیاتر بکات، ئەوە وەك ئەوە وایە کە لە نوێژی چوار ڕکاتی زیادی کردبێت لەکاتی نیشتەجێ‌بووندا، وە نابێت ئادەمیزاد خۆی بەوەوە هەڵواسێت کە ریوایەت کراوە عائیشە بۆخۆی لەسەفەردا نوێژی بە چوار ڕکاتی کردووە، چونکە ئەوە نابێتە بەڵگە.

بەڵکو بەڵگە لە ریوایەتەکەیدا هەیە لە پێغەمبەرەوە ﷺ نەك لە ڕای خۆیدا.

حەنبەلی‌یەکان کورت کردنەوە دروستە، وە چاکتریشە لەتەواوکردن، وە هەروەها لای شافیعی‌یەکان بەمەرجێك ئەوکەسە ئەوماوەیە ببڕێت کە نوێژی تێدا کورت ئەکرێتەوە.

**(٢) ماوەی کورت کردنەوە:**

ئەوەی لە ئایەتەکەوە بە دەست دێت ئەوەیە کە هەرسەفەرێك پێی بووترێ سەفەر کورت یا درێژ نوێژی تێدا کورت ئەکرێتەوە و کۆ ئەکرێتەوە و ڕۆژو شکاندن تێیدا ڕەوایە، وە شتێکی وا نەهاتووە لە سوننەتەوە ئەو گشتی‌یەتی‌یەی ئایەتەکە ببەستێتەوە، وە ئیبنو مونذیر وکەسانی تریش لەم مەسەلەیەدا زیاتر لە بیست قەولیان نەقلّ کردووە، ئێمەش لێرەدا ڕاست ترینیان باس ئەکەین:

ئەحمەد و موسلیم وە ئەبوداود و بەیهەقی لە یەحیای کوڕی زەیدەوە ئەگێڕنەوە دەفەرموێت: دەربارەی کورت کردنەوەی نوێژ لە ئەنەسی کوڕی مالیکم پرسی، لەوەلاّمدا فەرمووی: پێغەمبەر ﷺ سێ میل یا سێ فەرسەخ دوور بکەوتایەوە نوێژی کورت ئەکردەوەو دوو ڕکاتی ئەکرد.

(حافظ) ئیبنوحەجەر لە فەتحدا دەفەرمووێت: ئەمە صەحیحترین و صەریحترین حەدیسە هاتووە دەربارەی ڕوون کردنەوەی ماوەی کورت کردنەوەی نوێژ، وە ئەو ڕاڕایی‌یەی نێوان میل و فەرسەخەکە، قسەی ئەبو سەعیدی خودری لای ئەبات کاتێ دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر یەك فەرسەخ سەفەری بکردایە نوێژێ کورت ئەکردەوە. سەعیدی کوڕی مەنصور گێڕاویەتی‌یەوە (حافظ) لە (التلخیص)دا باسی کردووە وە دانی بە صیححەتی حەدیسەکەدا ناوە بەوەی بێ دەنگەی کردووە لێی[1].

---

حافظ لە التلخیص دا (٢/٤٤) دا ئەڵێت: عوروە باسی ئەوەی کردووە کە عائیشە تەئویلی کردووە هەروەك عوسمان تەئویلی کردووە، هەروەك لە صەحیحدا سابت بووە، جا ئەگەر عائیشە لە پێغەمبەرەوە ریوایەتێکی ببوایە، عوروە نەیدەووت کە تەئویلی کردووە، وە نەیدەوت لە صەحیحدا پێچەوانەی ئەوە سابت بووە.

منیش ئەڵێم: (حافظ) ئاماژە بۆ لاوازی حەدیسەکەی عائیشە ئەکات بە زاراوەی: (قَصَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي السَّفَرِ وَأَتَمَّ) واتە پێغەمبەر ﷺ لە سەفەردا نوێژی کورت کردۆتەوە و بە چواریش خوێندویەتی.

جا ئەم حەدیسە لەگەڵ ئەوەشدا کە سەنەدەکەی زەعیفە، پێچەوانەی ئەو حەدیسە صەحیحانەیە کە ڕاست لەبارەی کورت کردنەوەی نوێژی پێغەمبەرەوە ﷺ هاتوە لە سەفەردا، کە هەندێکیانم باس کردوەو ڕونم کردۆتەوە لە (الإرواء) دا (٣/٣-٩). هەرکەس ئەیەوێت با بگەڕێتەوە بۆ ئەوێ، (تمام المنة).

(١) منیش دەڵێم: دانەر بەوە هەڵخەڵەتاوە کە حافظ بێ دەنگەی کردووە لێی، و صەنعانیش لە پێش ئەوەوە هەر بێ دەنگەی لێ کردووە لە (سبل السلام) وهەروەها شەوکانی لە (السیل الجرار ١/٣٠٧) دا بەڵام لە (نیل الأوطار) دا گومانی هەبووە لە صەحیح بوونی دا، جا لەپاش ئەوە لە (٣/١٧٦) دا ووتویەتی:

وەك زانراویشە فەرسەخێك سێ میلە، جا بەوپێیە حەدیسەکەی ئەبوسەعید ئەو گومانە لائەبات کە لە حەدیسەکەی ئەنەسدا هاتووە، وە ڕوونی ئەکاتەوە کە کەمترین ماوە پێغەمبەر ﷺ لەسەفەردا نوێژی تێدا کورت کردبێتەوە سێ میلە، وە فەرسەخێك (٥٥٤١) مەترە، وە میلێك (١٧٤٨) مەترە، وە کەمترین ماوە کە هاتبێت بۆ کورت کردنەوەی نوێژ تێیدا یەك میلە، ئیبنوئەبی شەیبە گێڕاویەتی‌یەوە بەئیسنادێکی صەحیح لە ئیبنوعومەرەوە، وە ئیبنوحەزم لەسەر ئەوە ڕۆیشتووە، وە بەڵگە ئەهێنێتەوە دەربارەی کورت کردنەوەی نوێژ لەماوەی میلێك کەمتر دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ چووە بۆ بەقیع بۆ ناشتنی مردوو، وە چۆتەدەر بۆ پێویستی بەجێ هێنان و نوێژی کورت نەکردۆتەوە.

ئەمما ئەوەی زانایان بۆی چوون کە ئەڵێن: مەرجە سەفەرەکە درێژ بێت، بەلای کەمەوە دوو قۆناغ بێت لای هەندێکیان، وە سێ قۆناغ بێت لای هەندێکی تریان بۆ کورت کردنەوەی نوێژ، ئەوە ئیمام ئەبوقاسمی خەرقی لەجیاتی ئێمە لە (المغنی)دا ڕەددی داوەتەوەو فەرمویەتی: دانەر دەفەرمووێت: ئەوەی زانایان بۆی چوون هیچ بەڵگە نابینم لەسەری، چونکە قسەی صەحابە لەوبارەوە جیاواز و پێچەوانەی یەکن، وە بەهۆی ئەو جیاوازی‌یەوە نابنە بەڵگە، وە لە ئیبنوعومەرو ئیبنو عەبباسەوە پێچەوانەی ئەوە ریوایەت کراوە کە هاوەڵانمان کردویانەتە بەڵگە، پاشان ئەگەر ئەو جیاوازی‌یەش نەبوایە قسەکەیان هەر بەڵگە نەئەبوو، چونکە فەرمودە و کردەوەی پێغەمبەر ﷺ هەیە لەوبارەیەوە، وە ئەگەر قسەکانیان سابت نەبو ناتوانین بچین بۆ ئەو ماوە دانانەی باسیان کردووە، لەبەر دوو ڕوو.

---

(حافظ) لە (التلخیص)دا هێناویەتی و قسەی لەسەر نەکردووە، جا ئەگەر صەحیح بێت ئەوە ئەندازەی فەرسەخەکە گومانی تێدا نا بێت، وە لە فەرسەخ کەمتر نابێت نوێژی تێدا کورت بکرێتەوە ئەگەر بە سەفەر ناوبرێت، لە شەرعدا یان لە لوغەتدا.

منیش ئەڵێم: لە کوێ صەحیحە، کە ئەبو هارونی عەبدی تێدایە، حافظ لە (التقریب)دا لەبارەیەوە ئەڵێت: تەرك کراوە، وە هەندێك لە زانایان بە درۆزنیان داناوە.

و من ئەو حەدیسەم لە (الإرواء) دا تەخریج کردووە (٣/١٥) لە ریوایەتی کۆمەڵێك موصەننیفەوە لە (حافظ)ەوە، جا هەرکەس پێی خۆشە با بگەڕێتەوە بۆی.

لەمەوە تەئکید ئەبێتەوە کە دروست نی‌یە) فریوخواردن بە بێ دەنگ بوونی حافظ، وە ئەم بێ دەنگ بوونەی لەسەری مانای ئەوە نی‌یە کە سابتە لای.

با ئەو بێ‌دەنگ بوونە لە (الفتح)یشدا بێت، هەرچەندە (فتح الباري) پاکترین دانراوەکانی‌یەتی لە حەدیسی زەعیف؛ وە لەوانەشە هەر لەبەر ئەوە ئەو حەدیسەی نەهێنابێت لە فەتحدا، ئیتر خواش زاناترە، (تمام المنة).

یەکەمیان: ئەوە پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ کە ریوایەتمان کردووە، وەهەروەها پێچەوانەی (ظاهر)ی قورئانیشە، چونکی بەپێی (ظاهر)ی ئایەتەکە کورت کردنەوەی نوێژ ڕەوایە بۆ کەسێك بەسەفەر بڕوات ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي ٱلْأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُواْ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ﴾ (النساء/١٠١). واتە: وە ئەگەر چوون بۆ سەفەر تاوان نی‌یە لەسەرتان لە نوێژەکانتان کورت بکەنەوە. وە مەرجی ترسیش لاچوو بەو خەبەرەی باس کرا کە لە یەعلای کوڕی ئومەییەوە هاتووە، کەواتە ظاهری ئایەتەکە ئەمێنێتەوە کە هەموو جۆرە سەفەرێك ئەگرێتەوە.

وە ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (يمسح المسَافر ثلاثة أيام) واتە: موسافیر سێ ڕۆژ بۆی هەیە مەسح بکات، دەربارەی ماوەی مەسح کردن هاتووە، وەلێرەدا ناکرێتە بەڵگە.

وە لەگەڵ ئەوەشدا ئەتوانرێ ماوەی ڕێ ڕۆیشتنی کورت بەسێ ڕۆژ بپرێت، وە پێغەمبەر ﷺ ناوی ناوە سەفەر و ئەفەرمووێت: (لايَحِلُّ لِامرَأةٍ تُؤمِنُ بِاللهِ وَاليَومِ الآخِرِ أن تُسَافِرَ مَسِيرَةَ يَومٍ إلا مَعَ ذِي مَحرَم) واتە: ڕەوا نی‌یە بۆ ئافرەتێك کە باوەڕی بەخوا و ڕۆژی دوایی بێت، ماوەی ڕۆژێك بەرێدا بڕوات لەگەڵ مەحرەم نەبێت.

دووەم: تەقدیر کردن و ماوەدانان بابەکەی (التوقيف) واتە: وەستانە لەسەری کەواتە دروست نی‌یە کەس بە ڕای پەتی بۆی بچێت، بەتایبەتی لێرەدا کە ئەو تەقدیر کردنی ماوەی سەفەرە هیچ ئەصلێکی نی‌یە کە گەڕانەوە بکرێ بۆلای، وە هیچ هاوێنەیەك نی‌یە قیاس بکرێ لەسەری، وە بەڵگە لەگەڵ ئەوانەیە کە کورت کردنەوەی نوێژیان بۆ هەموو موسافیرێك بەڕەوا داناوە، مەگەر ئیجماع پێك بێت لەسەر پێچەوانەی ئەوکارە، جا سەفەرەکە بە فڕۆکە بێت یا بەشەمەندەفەر وەك یەکە، هەروەها سەفەرەکە بۆ خوا پەرستی بێت یاشتی تر وەك یەکە.

وە هەرکەس کارەکەی لەسەری پێویست بکات هەمیشە لەسەفەردا بێت وەك: کەشتی‌یەوان و خاوەن سەیارەی کرێ ئەوە ڕێی پێ دراوە نوێژ کورت بکاتەوە و بەڕۆژوویش نەبێت، چونکە ئەوانە موسافیرن لە ڕاستیدا.

**(٣) ئەو شوێنەی کورت کردنەوەی لێوە دەست پێ دەکات:**

جومهوری زانایان بۆ ئەوە چوون کە کورت کردنەوەی نوێژ بە جیابوونەوە لەشوێنی دانیشتنەوە دەست پێ دەکات، وە بە دەرچوون لەشارەوە، وە ئەمە مەرجە، وە دەست بەردار نابێ لە کورت کردنەوە تاوەکو ئەگەڕێتەوە و ئەگاتە ئەوەڵی ماڵەکانی شارەکەی، ئیبنو مونذیر دەفەرمووێت:

ئەوەندەی من بزانم پێغەمبەر ﷺ لە هیچ کام لەسەفەرەکانیدا نوێژی کورت نەکردۆتەوە تاوەکو لەمەدینە دەرنەچووبێت.

ئەنەس دەفەرمووێت: نیوەڕۆ لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ لەناو مەدینەدا چوار ڕکاتمان کردووە کاتێ گەیشتینە (ذي الحليفة) دوو ڕکاتمان کردووە. (رواه الجماعة).

وە هەندێ لە (سلف) ڕایان وایە هەرکەس نیازی سەفەرکردنی هەبوو بۆی هەیە نوێژ کورت بکاتەوە با هێشتا لە خانووەکەی خۆیشیدا بێت.

**(٤) چ کاتێك موسافیر نوێژەکانی بەتەواوی ئەکات:**

موسافیر نوێژ بەکورتی ئەکات هەتا لەسەفەردا بێت، جا ئەگەر چووە ناو شارێك و مایەوە بۆ جێبەجێ کردنی پێویستی خۆی، نوێژەکانی هەر بە کورت کراوەیی ئەکات، چونکە هەر بە موسافیر دائەنرێت ئەگەر لەوشارەدا چەند ساڵێکیش بمێنێتەوە، وە ئەگەر بەنیاز بێت ماوەیەکی دیاری کراو لەوشارەدا بمێنێتەوە، ئەوەی ئیبنو قەییم هەڵی بژاردووە ئەوەیە، کە ئەو مانەوەیە ئەوکەسە لەحوکمی موسافیر دەرناکات، زۆر بمێنێتەوە یا کەم، بەمەرجێك نیازی مانەوەی هەمیشەیی نەبێت لەوشوێنەدا کە ماوەتەوە.

زانایان لەم بارەیەوە ڕای زۆریان هەیە کە ئیبنو قەییم بەکورتی هێناونی، وە ڕای خۆی سەرخستووە و دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ بیست ڕۆژ لە تەبووك مایەوە نوێژەکانی هەر بەکورتی ئەکرد، وە وەیفەرموو بە ئوممەتی ئیسلامی: ئەگەر پیاوێك لەوە زیاتر بمێنێتەوە نابێت نوێژ کورت بکاتەوە، بەڵام وارێك کەوت ئەو ماوەیە مایەوە لەوشوێنەدا. وە ئەو مانەوەیە لە حاڵەتی سەفەردا لە حوکمی سەفەر دەرناچێت، زۆر بمێنێتەوە یا کەم، بەمەرجێك بەتەواوی جێگیر نەبێت، وە بەنیازی مانەوەش نەبێت لەو شوێنەدا، وە (سلف) و (خلف) لەو بارەیەوە جیاوازی‌یەکی زۆریان هەیە.

چونکە لە صەحیحی بوخاریدا لە ئیبنوعەبباسەوە هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ لە هەندێ سەفەردا نۆزدە ڕۆژ ماوەتەوە، لەو ماوەیەدا نوێژی کورت ئەکردەوەو دوو ڕکاتی ئەکرد، وە ئێمەش ئەگەر هەتا نۆزدە ڕۆژ بمێنینەوە دوو ڕکات نوێژ ئەکەین، ئەگەر لەوە زیاتر بمێنینەوە ئەوکاتە نوێژەکان بەتەواوی ئەکەین.

وە (ظاهر)ی قسەی ئەحمەد ئەوە دەرئەخات کە ئیبنوعەبباس مەبەستی مانەوەکەی مەککەیەتی کاتی فەتح کردنی، چونکە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ هەژدە ڕۆژ لە مەککە مایەوە کاتی فەتح کردنی، چونکە ئەیویست بەرەو حونەین بچێت، بەڵام بۆی نەکرا لەپاشاندا هەر لەوێ مایەوە، جا ئەوە ئەو مانەوەیەتی کە ئیبنوعەبباس گێڕاویەتی‌یەوە.

وه کەسانی تر ئەڵێن: ئیبنوعەبباس مەبەستی مانەوەکەی تەبوکی بووە، وەك جابیری کوڕی عبدالله دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ بیست ڕۆژ لە تەبوك مایەوە بە کورت کراوەیی نوێژی ئەکرد. (ئیمام ئەحمەد لە موسنەدەکەیدا گێڕاویەتی‌یەوە).

میسوەری کوڕی مەخرەمە دەفەرمووێت: لەگەڵ سەعددا لە گوندەکانی شام چل ڕۆژ ماینەوە، سەعد هەر نوێژی کورت ئەکردەوە، بەڵام ئێمە بەتەواوی ئەمان کرد.

نافیع دەفەرمووێت: ئیبنوعومەر شەش مانگ لە ئەزەربایجان مایەوە، دوو ڕکات نوێژی ئەکرد، چونکە بەفر ڕێی گرتبوو نەیتوانی بچێتەناوی.

حەفصی کوڕی (عبیدالله) دەفەرمووێت: ئەنەسی کوڕی مالیك دوو ساڵ لە شام مایەوە هەر نوێژی موسافیری ئەکرد.

ئەنەس دەفەرمووێت: هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ لە ڕام هورمز حەوت مانگ مانەوە نوێژیان کورت ئەکردەوە.

حەسەن دەفەرمووێت: لەگەڵ عبدالرحمن ی کوڕی سەمورە لەکابول دوو ساڵ ماینەوە نوێژی کورت ئەکردەوە، بەڵام کۆی نەئەکردەوە.

ئیبراهیم دەفەرمووێت: لە (ڕەی) ساڵێك و زیاتر لەوەو لە سەجستان دوو ساڵ ئەمانەوە.

ئەوە ڕێ و ڕەووشتی پێغەمبەرە ﷺ لەگەڵ هاوەڵەکانی وەك ئەبینی، وە ئەوەش ڕاستە.

بەڵام مەزهەبی خەڵك، ئەوە ئیمام ئەحمەد دەفەرمووێت: ئەگەر نیازی هەبوو چوار ڕۆژ بمێنێتەوە ئەوە نوێژ بەتەواوی بکات، وئەگەر نیازی کەمتری هەبوو کورتی بکاتەوە، وە ئەو (أثر) انە لەسەر ئەوە دائەنێت کە صەحابەکان هەرگیز مەبەستیان مانەوە نەبووە، بەڵکو ئەیان ووت: ئەمڕۆ یا سبەی دەرئەچین.

وەك دیارە ئەم قسەیە چاوپیاخشاندنەوەی ئەوێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ مەککەی فەتح کرد و بەوحاڵەوە تێیدا مایەوە، بنەماکانی ئیسلامی تێدا دائەمەزراندو بنەماکانی بێ باوەڕی تێدا ئەڕمان، وە کاروباری دەوروبەریشی ئامادە ئەکرد، وە گومانی تێدا نیە ئەوکارانە پێویستی بەمانەوەی چەندین ڕۆژ هەیە، وە بە ڕۆژێ یا دوو ڕۆژ ناکرێت.

هەروەها مانەوەکەی لە تەبوك کە چاوەڕوانی هاتنی دوشمن بوو، گومانی تێدا نیە دوشمن چەن قۆناغێك دوور بوو لێوەی کە پێویستی بەچەندین ڕۆژ هەبوو بۆ گەیشتن، وە پێغەمبەر ﷺ ئەیزانی کە بەچوار ڕۆژ ناگەن.

هەروەها مانەوەی ئیبنوعومەر شەش مانگ لە ئازەربیجان کە لەبەر بەفر هەر نوێژی کورت نەکردەوە، ئاشکراشە کە بەفری ئاوها بە چوار ڕۆژ ناتوێتەوە و نابێت بە ئاو، بەشێوەیەك ئەو ڕێگایە بکرێتەوە، وە هەروەها مانەوەی ئەنەس لەشام بۆ ماوەی دوو ساڵ کە نوێژی تێدا کورت ئەکردەوە، هەروەها مانەوەی صەحابەکان لە (ڕام هورمز) حەوت مانگ کە نوێژیان کورت ئەکردەوە، ئاشکرایە کە ئەو گەمارۆ دان و جیهادە بە چوار ڕۆژ کۆتایی نایات.

هاوەڵەکانی ئەحمەد ووتویانە: ئەگەر ئەوکەسە بۆ جیهاد مایەوە لەگەڵ دوژمندا، یا حاکم بەندی کردبوو، یا نەخۆش بوو، ئەوە نوێژ کورت بکاتەوە، جا چ لێی ڕوون بێت زۆر ئەمێنێتەوە یا کەم، ئەوەش ڕاستە، بەڵام مەرجێکیان تێدا داناوە لە قورئان و سوننەت و ئیجماع و کاری صەحابەدا بەڵگەی لەسەر نی‌یە. جا ووتویانە: مەرجەکەی ئەوەیە ئیحتیمالی هەبێ لەو ماوەیدا کە حوکمی سەفەری لەسەر لانەچێت پێویستی‌یەکەی جێبەجێ بکات کە ئەو ماوەیەش لە چوار ڕۆژ کەمترە.

جا ئیبنو قەییم دەفەرمووێت: ئێوە ئەم مەرجەتان لەکوێ هێناوە لەحاڵێکدا پێغەمبەر ﷺ خۆی لە چوار ڕۆژ زیاتر ماوەتەوەو نوێژی کورت کردۆتەوە لەمەککە و تەبوك و هیچی بە هاوەڵەکانی نەفەرموەو بۆی ڕوون نەکردوونەوە کە نیازی نەبوو لە چوا ڕۆژ زیاتر بمێنێتەوە، وە ئەشیزانی کە هاوەڵەکانی چاوی لێ ئەکەن لە نوێژەکانیدا، وە وەك ئەو لەماوەی مانەوەیدا نوێژ کورت ئەکەنەوە، کەچی بە یەك ووشەش پێی نەفەرموون: لە چوار ڕۆژ زیاتر نوێژ کورت مەکەنەوە وە ڕوون کردنەوەی ئەوەش گرنگترین شتە لە شتە گرینگەکاندا، وە هەروەها لەدوای ئەو صەحابەکان بەوشێوەیە چاویان لێی کردووە، وە هیچ شتێ لەوشتانەیان نەووتووە بەو کەسانەی کە نوێژیان لەگەڵدا کردون.

مالیك و شافیعی ووتویانە: ئەگەر نیازی چوار ڕۆژ زیاتر مانەوەی هەبوو نوێژ بەتەواوی ئەکات، وە ئەگەر نیازی کەمتری هەبوو نوێژ کورت بکاتەوە.

وە ئەبو حەنیفە ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت دەفەرمووێت: ئەگەر نیازی پانزە ڕۆژ مانەوەی هەبوو نوێژ بەتەواوی بکات، وە ئەگەر نیازی مانەوەی لەوە کەمتری بوو نوێژ کورت بکاتەوە، ئەوەش بۆچوونی (لیث)ی کوڕی سەعدە. وە هەر ئەو بۆچونەش لەسێ صەحابەوە ریوایەت کراوە کە ئەوانیش عومەرو کوڕەکەی و ئیبنوعەبباسن.

سەعیدی کوڕی موسەییب دەفەرمووێت: ئەگەر چوار ڕۆژ مایتەوە بەتەواوی نوێژ بکە، وە وەك قسەکەی ئەبوحەنیفەیشی لێ ئەگێڕنەوە.

عەلی کوڕی ئەبو (طالب) خوای لێ ڕازی بێ دەفەرمووێت: ئەگەر دە ڕۆژ مایەوە بەتەواوی نوێژ ئەکات، وە ئەوەش لە ئیبنوعەبباسەوە بە ریوایەت هاتووە، وە حەسەن دەفەرمووێت: هەتا نەیەوێت

لەو شوێنە بمێنێتەوە نوێژ کورت بکاتەوە، وە عائیشە دەفەرمووێت: ئەوەندە نوێژ کورت بکاتەوە هەتا توێشەو باروبنە دائەنێت.

چوار ئیمامەکان ڕەحمەتی خوایان لێبێت لەسەر ئەوە ڕێکن کە ئەگەر کەسێك بۆ پێویستیەك مایەوە کە چاوەڕێی بەجێ هێنانی ئەکرد ئەیووت ئەمڕۆ یا سبەی دەرئەچم، بەڵام بۆی ڕێك نەئەکەوت، ئەوە ئەوکەسە هەتا بەوشێوەیە بێت نوێژ کورت بکاتەوە، جگە لە شافیعی کە لە یەکێ لە قسەکانیدا دەفەرمووێت: ئەوکەسە هەتا حەڤدە هەژدە ڕۆژ نوێژ کورت بکاتەوە، ئیتر دوای ئەوە بەتەواوی نوێژ بکات. وە (ابن المنذر) لە (إشراف)ەکەی خۆیدا دەفەرمووێت: گشت زانایان کۆن لەسەر ئەوەی کە موسافیر مادام نیازی نیشتەجێ بوونی نەبێ بۆی هەیە نوێژ کورت بکاتەوە گەرچی چەند ساڵیش بمێنێتەوە.

**(٥) نوێژی سوننەت لەسەفەردا:**

جومهوری زانایان بۆ ئەوە چوون کە کردنی نوێژی سوننەت کەراهەتی نیە بۆ ئەوکەسانەی نوێژ کورت ئەکەنەوە لەسەفەردا، چ نوێژی سوننەتی ڕاتبە بێ یا نوێژی وەتر.

لای بوخاری و موسلیم هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی فەتحی مەککە لەماڵی (أم هانئ) خۆی شۆردووەو هەشت ڕکات نوێژی کردووە، وە لە ئیبنوعومەرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ لەسەر پشتی ووڵاغەکەی نوێژی ئەکردو ووڵاغەکەی بۆ هەرکوێ ڕووی بکردایە بەسەر ئیشارەتی ئەکرد.

حەسەن دەفەرمووێت: هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لەسەفەریاندا نوێژی سوننەتیان ئەکرد لەپێش نوێژی فەرزو لەدوایەوە.

ئیبنو عومەرو غەیری ئەو ڕایان وایە کە نوێژی سوننەت لەسەفەردا شەرعی نیە نە لە پێش فەرزو نە لەدوای، تەنها شەونوێژ نەبێ دروستە، وە کۆمەڵێکی بینی نوێژی سوننەتیان ئەکرد دوای نوێژی فەرز، پێی فەرموون: ئەگەر نوێژی سوننەتم بکردایە نوێژە فەرزەکانم بەتەواوی ئەکرد و کورتم نەئەکردنەوە، برازا، هاوڕێیی پێغەمبەرم ﷺ کردووە لە دوو ڕکات زیاتری نەئەکرد هەتا کۆچی دوایی کرد، وە هاوڕێیی ئەبوبەکرم کردووە، لە دوو ڕکات زیاتری نەکردووە، وە باسی عومەرو (عثمان)یشی کرد، وە فەرمووی: ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾ (بوخاری گێڕاویەتیەوە). واتە پێغەمبەر ﷺ باشترین پێشەوایە بۆ ئێوە کە چاوی لێ بکەن.

ئیبنوقودامە حەدیسەکەی حەسەن و ئیبنوعومەری کۆ کردۆتەوە، وە ڕوونی کردۆتەوە کە حەدیسەکەی حەسەن بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کردنی خراپ نی‌یە، وە حەدیسەکەی ئیبنوعومەر بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە نەکردنی خراپ نی‌یە.

**(٦) سەفەرکردن لەڕۆژی هەینیدا:**

ڕۆژی هەینی سەفەرکردن تێیدا خراپ نی‌یە، بەمەرجێك کاتی نوێژ نەبێت عومەر جارێك گوێی لە کابرایەك بوو ئەیووت: ئەگەر ئەمڕۆ ڕۆژی هەینی نەبووایە ئەچوومە سەفەر، عومەر فەرمووی: بڕۆ هەینی ڕێ لەکەس ناگرێ بۆ سەفەر کردن[١].

ئەبو عوبەیدە ڕۆژی هەینی چاوەڕوانی نوێژی نەکردووە چووە بۆسەفەر، وە زوهری چێشتەنگاوێکی هەینی ئەیویست بچێتە سەفەر، ووتیان: بەم هەینی‌یە سەفەر ئەکەیت؟ فەرمووی: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی هەینی سەفەری کردووە.

## کۆکردنەوەی دوو نوێژ

دروستە بۆ نوێژکەر نوێژی نیوەڕۆ و عەسر بەسەریەکەوە بکات، بەپێش خستن یا بەدووا خستن[٢].

هەروەها نوێژی ئێوارە و خەوتنانیش بەوشێوەیە، ئەگەر حاڵەتێك لەم حاڵەتانەی لای خوارەوە هاتە پێش:

**١- کۆکردنەوەی نوێژ لەعەرەفە و موزدەلیفەدا:**

زانایان هەموو لەسەر ئەوە ڕێکن کە نوێژی نیوەڕۆو عەسر کۆئەکرێتەوە لەکاتی نوێژی نیوەڕۆدا ئەکرێت لەعەرەفە، وە نوێژی ئێوارە و خەوتنان کۆ ئەکرێتەوە لەکاتی نوێژی خەوتناندا ئەکرێت لە موزدەلیفە، وە کردنی بەو شێوەیە سوننەتە، چونکە پێغەمبەر ﷺ کردوویەتی.

**٢- کۆ کردنەوە لەسەفەردا:**

---

(١) ئەم ئەسەرانە هەمویان ئیبنوئەبی شەیبە تەخریجی کردوون (٢/١٠٥-١٠٦) و عبد الرزاق (٣/٢٥٠-٢٥١) وە ئەسەرەکەی عومەر دوو ڕێگای هەیە یەکێکیان ڕاستە، وە لە (السلسلة الضعیفة) دا تەخریج کراوە لە ژێر حەدیسی ژمارە (٢١٩)، و ئەسەرەکەی ئەبوعوبەیدە (منقطع)ە، وە حەدیسەکەی زوهری مورسەلە، و ماناکەی صەحیحە بەمەرجێك ئەو کەسەی سەفەرەکە ئەکات گوێی لە بانگی جومعە نەبێت، جا کاتێك گوێی لێبوو ئەوە واجبە بچێت بۆ جومعە، ئیتر خوای گەورەش بۆخۆی زاناترە.

(٢) پێش خستن ئەوەیە هەردووکیان لەکاتی یەکەمدا بکات، وە دووا خستن ئەوەیە هەردووکیان لەکاتی دووەمدا بکات (دانەر).

کۆ کردنەوەی دوو نوێژ لە سەفەردا، وە کردنیان لەکاتی یەکێکیاندا دروستە بەپێی قسەی بەشی زۆری زانایان، وە فەرقی نىیە لای دابێت بۆ حەوانەوە یا بەڕێوە بێت.

لە موعاذەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ لەغەزوەی تەبووکدا ئەگەر ڕۆژ لەناوەڕاستی ئاسمان لایبدایە پێش بارکردن نوێژی نیوەڕۆ و عەسری بەسەریەکەوە ئەکرد کاتی نوێژی نیوەڕۆ، وە ئەگەر باری بکردایە پێش ئەوەی ڕۆژ لابدات نوێژی نیوەڕۆی دوائەخست هەتا کاتی نوێژی عەسر ئەهات، وە لە ئێوارەشدا بەهەمان شێوە، وەئەگەر خۆر ئاوا بووایە پێش ئەوەی بار بکات نوێژی ئێوارە و خەوتنانی بەسەریەکەوە ئەکرد، وە ئەگەر باری بکردایە پێش ئەوەی خۆر ئاوا بێت نوێژی ئێوارەی دووا ئەخست هەتا کاتی خەوتنان ئەهات، ئینجا لای ئەدا هەردووکیانی بەسەریەکەوە ئەکرد. (ئەبوداود و (ترمذي) گێڕاویانەتەوە وە (ترمذي) دەفەرموێت: ئەمە حەدیسێکی حەسەنە).

لە کوڕەیبەوە لە ئیبنوعەبباسەوە هاتووە دەفەرموێت: ئایا چۆنیەتی نوێژکردنی سەفەری پێغەمبەرتان ﷺ پێ نەڵێم ؟ ووتمان: بەڵێ پێمان بڵێ، فەرمووی: ئەگەر ڕۆژ بیدایە لەناوەڕاستی ئاسمان پێش ئەوەی سوار ببێت، لەشوێنی حەوانەوەدا نوێژی نیوەڕۆو عەسری بەسەریەکەوە ئەکرد، وە ئەگەر ڕۆژ نەیدایە لەناوەڕاستی ئاسمان ئەوە سووار ئەبو و ئەڕۆیشت هەتا کاتی نوێژی عەسر ئەهات، ئەوکاتە لای ئەدا و نوێژی نیوەڕۆ و عەسری بەیەکەوە ئەکرد، وە ئەگەر کاتی نوێژی ئێوارە بهاتایە و لەشوێنی حەوانەوەدا بووایە سووار نەئەبوو هەتا نوێژی ئێوارە و خەوتنانی نەکردایە بەسەریەکەوە، وە ئەگەر پێش نوێژی ئێوارە سووار بووایە بەڕێوە ئەڕۆیشت هەتاکاتی خەوتنان ئەهات، دائەبەزی هەردووکیانی بەسەریەکەوە ئەکرد، (ئەحمەد گێڕاویەتیەوە، وە شافعی لە موسنەدەکەیدا شتێکی وەك ئەوەی گێڕاوەتەوە)، وە تێیدا دەفەرموێت: ئەگەر بڕۆیشتایە پێش زەوال نوێژی نیوەڕۆی دووائەخست هەتا کۆی ئەکردنەوە لەکاتی عەسردا بەسەریەکەوە ئەیکردن، (بەیهەقی بەئیسنادێکی (جید) گێڕاویەتیەوە) وە دەفەرموێت: کۆ کردنەوەی دوو نوێژ و بەسەریەکەوە کردنی، لەبەر مەعزەرەتی سەفەر، لەوکارە بەناوبانگانەیە کە بەکارهاتووە لەنێوان صەحابەو تابعین دا.

مالك لە (الموطأ)دا لە موعاذەوە ئەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێك لە غەزوەی تەبووکدا نوێژەکەی دوواخست لەپاشاندا هاتەدەر نوێژی نیوەڕۆو عەسری بەسەریەکەوە کرد، پاشان گەڕایەوە جێگاکەی خۆی، پاشان هاتەوە نوێژی ئێوارە و خەوتنانی بەسەریەکەوە کرد.

شافیعی دەفەرموێت: کە دەفەرموێت: (هاتە دەرو ڕۆیشتەوە) ئەو شێوە کاتێك ئەکرێت کە دابەزین بۆ حەوانەوە . وە ئیبنوقودامە دوای ئەوەی باسی ئەو حەدیسە ئەکات لە (المغنی)دا دەفەرموێت: (ابن عبدالبر) دەفەرموێت: ئەو حەدیسە صەحیحەو ئیسنادەکەی سابتە.

زانایانی سیرەو بەسەرهات ووتویانە: غەزوەی تەبووك لەساڵی نۆیەمی كۆچیدا بووە، وە لەم حەدیسەدا ڕوون ترین بەڵگە هەیەو بەهێزترین حوججەیە بۆ ڕەد دانەوەی ئەو كەسەی ئەڵێت: دوو نوێژ بەسەر یەكەوە لەكاتی یەكێكیاندا ناكرێت مەگەر لە حاڵەتی ڕۆیشتندا نەبێ، چونكە پێغەمبەر ﷺ كاتی لادان بۆحەوانەوەو مانەوە لەناو چادردا نوێژی بەسەریەكەوە كردووە، جا لەو شوێنی حەوانەوەیدا هاتوتەدەر بۆ نوێژ كردن و دوو نوێژی بەسەریەكەوە كردووە، كاتێ لێبۆتەوە گەڕاوەتەوە ناو چادرەكەی.

موسلیم ئەو حەدیسەی لە صەحیحەكەیدا گێڕاوەتەوە و دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ نوێژی نیوەڕۆو عەسری بەسەریەكەوە كردووە، وە هەروەها نوێژی ئێوارە و خەوتنانی بەسەریەكەوە كردووە، وە هەر ئەبێ كار بەو حەدیسە بكرێ، چونكە سابتەو حوكمی ئاشكرایەو هیچ موعاریزێكی نی‌یە، وە لەبەر ئەوەی كۆكردنەوەی نوێژ ڕوخصەتێكە لە ڕوخصەتەكانی سەفەر، وەك كورت كردنەوەی نوێژو مەسح كردنی خوف وایە و تایبەت نەكراوە بە حاڵەتی ڕۆیشتنەوە، بەڵام باشتر وایە ئەو دوو نوێژە بەسەریەكەوە بكرێت و دووا بخرێت بۆ كاتی نوێژەكەی دوایی. قسەكانی ئیبنوقەییم تەواو بوو.

وە نی‌یەت هێنان مەرج نی‌یە بۆ كۆكردنەوەو كورت كردنەوەی نوێژ. ئیبنوتەیمی‌یە دەفەرمووێت: ئەوە قسەی جومهوری زانایانە.

وە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ كاتێ بەرنوێژی بۆ هاوەڵەكانی ئەكرد بە كۆ كردنەوە و كورت كردنەوەی فەرمانی بەكەس نەئەكرد نی‌یەتی كۆ كردنەوە و كورت كردنەوە بهێنن، بەڵكو لە مەدینەوە بەرەو مەككە ڕۆیشتووە دوو ڕكات نوێژی كردووە بێ ئەوەی نوێژ كۆبكاتەوە، لەپاشاندا لە عەرەفە نوێژی نیوەڕۆی بۆ كردوون، وە پێی نەفەرموون: كە ئەیەوێ نوێژی عەسریش بكات، پاشان نوێژی عەسریشی بۆ كردوون، وە نییەتیان نەهێنابوو بەسەریەكەوە هەردوو نوێژەكە بكەن، وە ئەو نوێژەی لەعەرەفە كردی نوێژی كۆ كردنەوەی پێش خراو بوو (جمع تقديم).

هەروەها كاتێ لە مەدینە هاتە دەر لە (ذي الحليفة) نوێژی عەسری بە دوو ڕكات بۆكردن، وە فەرمانی پێ نەدان نییەتی نوێژ كورت كردنەوە بهێنن.

ئەمما لەبارەی (موالاة) یەك لەدووای یەكدا كردنی نوێژ، ـ واتە لەپێشدا نوێژی نیوەڕۆ پاشان نوێژی عەسر، وە نوێژی ئێوارە پاشان نوێژی خەوتنان بكرێت ـ دەفەرمووێت: ئەوەی ڕاست بێت ئەوە هیچ شێوەیەك مەرج نی‌یە، نە لەكاتی یەكەمدا، وە نە لەكاتی دووەمدا، چونكە ئەو (موالاة)ە لە شەرعدا سنووری بۆ دانەنراوە، وە لەبەر ئەوەی ڕیعایەت كردنی ئەو بەدوای یەكدا هاتنە مەبەستی ڕوخسەتەكە لائەبات.

شافیعی دەفەرمووێت: ئەگەر لە مەنزڵەکەی خۆیدا بەنیازی کۆکردنەوە نوێژی ئێوارەی کرد، پاشان هاتە مزگەوت نوێژی خەوتنانی کرد، دروستە، وە وێنەی ئەوقسەیە لە ئەحمەدیشەوە ریوایەت کراوە.

**٣- کۆ کردنەوەی نوێژ لەکاتی باران باریندا:**

(أثرم) لە سوننەنەکەیدا لە ئەبوسەلەمەی کوڕی عبدالرحمن ەوە ئەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: سوننەتە ئەگەر ڕۆژێك باران بوو نوێژی ئێوارەو خەوتنان بەسەریەکەوە کۆ بکرێتەوە.

بوخاری ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ شەوێکی باراناوی نوێژی ئێوارە و خەوتنانی بەسەریەکەوە کرد[1].

---

(١) منیش دەڵێم: نیسبەت دانی ئەو قسەیە بۆلای بوخاری هەڵەیەکە گومانی تێدا نی یە، بەڵکو من گومانم هەیە کە شتی وا لە سوننەنەکانیشدا هەبێت کە ئەمڕۆ لەبەر دەستدا هەن، چونکی من لەبیرم نایات تا ئێستا حەدیسێکم بەم مەعنایە بینیبێت، وە ئێستاش بۆ ئەو شوێنانەی کە گومانم ئەکرد تێیدا هەبێت گەڕامەوە بەڵام هیچم نەبینی. وە ئەگەر ئەصڵێ و بنەمایەکی هەبووایە ئەوە زانایانی حەدیس لە بەشی کورت کردنەوەی نوێژ بۆ دانیشتوو لەناو شاردا دەیان هێنا، و پەنایان بۆ ریوایەتی تر نەئەبرد کە بە صەراحەت دانی پێدا نانێ.
هەروەك حەدیسەکەی ئیبنوعەبباس کە لەمەو دووا لەم کتێبەدا دێت لە بەشی (کۆ کردنەوەی نوێژ بۆ پێویست) وە هەرگیز گومان بۆ ئەوە ناچێت کە زانایان بەم حەدیسەیان نەزانیبێت ئەگەر بنەمایەکی هەبووایە.
جا من نازانم ئەم هەڵەیە چۆن لە دانەرەوە دروست بووە، وە ئەوەی من بیزانم لەوانەیە لە هەندێ کتێبی فیقهی وەری گرتبێت کە زانستیان نی یە بە حەدیس و ریوایەتی حەدیس.
لە بارەیەوە نمونەم زۆر لایە نزیکترینیان بۆ ئەم کێشەیەی ئێمە قسەی رافعی یە لە شەرحی (الوجیز)دا کە ئەڵێت: لە ئیبنوعومەرەوە ریوایەت کراوە کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی نیوەڕۆ و عەسری لەبەر باران کۆ کردۆتەوە.
جا حافظ ڕەددی داوەتەوە لە تەخریجەکەیدا کە ئەڵێت لە (٤/٤٧١) دا: هیچ ئەصلێکی نی یە، بەڵام تەنها بەیهەقی لە ئیبنوعومەرەوە بە مەوقوفی لەسەر ئیبنوعومەر ئەیگێڕێتەوە لە یەحیای کوڕی (واضح) لە موسای کوڕی عوقبە لە نافیعەوە بە مەرفوعی.
جا ئەمەش ئەوە ئەسەلمێنێ کە ئەم حەدیسە بە هیچ شێوەیەك لە پێغەمبەرەوە ﷺ باس نەکراوە، جا چۆن ئەصلی هەیە لە بوخاریدا، وە ئەمەش لە شاریحەکەی کە عەسقەلانی و جگە لەوانە شاراوە ئەبێت؟!. شتی واش هەرگیز نابێت، داوا لە خوای گەورە ئەکەین لە هەڵە بمان پارێزێ.
لەپاشان من ئیحتیمالێکی ترم بۆ دەرکەوت ئەویش ئەوەیە کە حەدیسەکە لە بوخاریدا هەیە بەڵام بەبێ ئەو قسەیەی کە ئەڵێت: (لە شەوێکی باراناویدا)، بەڵام لە دواییەکەیدا هاتووە: (جا ئەییوب ووتویەتی: لەوانەیە ئەو کۆکردنەوەیە لە شەوێکی باراناویدا بووبێت، ئەویش لەوەڵامدا ووتی: لەوانەیە)، وە ئەوەی کە ووتی لەوانەیە

کورتەی مەزهەبەکان لەم بارەیەوە ئەوەیە: شافیعی‌یەکان ڕێیان داوە بە دانیشتوو (مقیم) نوێژی نیوەڕۆو عەسر بسەریەکەوە بکات، وە هەروەها نوێژی ئێوارەو خەوتنانیش تەنها بە (جمع تقدیم) کۆکردنەوەی پێش خراو، بەمەرجێك ئەوکاتەی نوێژی یەکەم دائەبەستێ و کۆتایی دێت و نوێژی دووەم دەست پێ ئەکات باران ببارێت.

وە لای مالیك دروستە (جمع تقدیم) لە مزگەوتدا لەنێوان نوێژی ئێوارەو خەوتنان لەکاتی باراندا کە لەو کاتەدا ببارێت، یا گومان بکرێت کە ببارێت، وە هەروەها لەبەر قوڕو تاریکی بسەریەکەوە بەمەرجێك قوڕەکە ئەوەندە زۆر بێت خەڵکی مام ناوەندی نەتوانێ بەنەعلەوە بەناویا بڕوات، وە بە کەراهەتی داناوە نوێژی نیوەڕۆو عەسر کۆ بکرێتەوە لەبەر باران بارین.

لای حەنبەلی‌یەکان تەنها نوێژی ئێوارەو خەوتنان بسەریەکەوە کۆبکرێتەوە دروستە بە (جمع تقدیم) و بە (جمع تأخیر)، بەهۆی بەفرو سەهۆڵو قوڕو لیتەو سەرمای زۆرەوە، و ئەو بارانەی جل و بەرگ تەڕ بکات، وە ئەم ڕوخصەتەش تایبەتە بەوکەسانەی کە بەجەماعەت لە مزگەوتدا نوێژ ئەکەن و شوێنەکەیان لەمزگەوتەوە دوورەو بەوبارانە لە ڕێگا تووشی ئازار بن، بەڵام ئەو کەسەی لەناو مزگەوتدا بێت، یا لە ماڵی خۆیدا بە جەماعەت نوێژ بکات، یا بتوانێت بچێت بۆ مزگەوت و خۆی بە شتێك داپۆشێت، یا مزگەوتەکە لەبەر ماڵەکەیدا بێت، ئەوکاتە دروست نی‌یە بۆی نوێژ بسەریەکەوە بکات.

**٤- کۆ کردنەوە بەهۆی نەخۆشی یا مەعزەرەت:**

ئیمام ئەحمەد و (قاضي حسین) و (خطابي) و موتەوەللی لە شافیعی‌یەکان، بۆ ئەوە چوون کە کۆکردنەوەی نوێژ بە پێش خراوی یا دووا خراوی بەهۆی نەخۆشی‌یەوە دروستە، چونکە ناڕەحەتی تێیدا زۆرترە لە باران.

---

(أبوشعثاء)ە گێڕەرەوەی حەدیسەکە لە ئیبنوعەبباسەوە، ئەمەش هەروەك ئەبینیت (أبو شعثاء) هەر بە ئیحتیمال وەڵامی دایەوە.

وە لەوانەشە دانەر حەدیسەکەی هەر لەبەر نووسیبێت بێ ئەوەی بۆ کتێبێك بگەڕێتەوە، جا لەبەر ئەوە کەوتۆتە هەڵەوە ئەم قسەیەی لەناو حەدیسەکەدا نووسیوە، ئەمەش لەزاراوەی زانایانی حەدیسدا پێی ئەوترێت (مدرج) وە لەوانەشە ئەو ئیحتیماڵەی کە ئەییوب ووتویەتی لای ئەم بەهێزتر بووبێت، هەر لەبەر ئەوە بووە ئەو زیادەیەی نووسیوە، ئەم کارەش هەرچەند ڕێی پێ نەدراوە لای زانایانی حەدیس، ئەوەش پوچەڵ ئەکاتەوە کە دانەر ئەم ریوایەتەی موسلیمی بەلاوە بەهێزتر بێت کە بە زاراوەی (من غیر خوف ولا مطر) لە ئیبنوعەبباسەوە گێڕابێتی‌یەوە.

حافظ دەڵێت: پێم وانی‌یە کە ئەو کۆ کردنەوەیە لەبەر ترس یان سەفەر یان باران بووبێت (تمام المنة).

نەوەوی دەفەرمووێت: ئەو بۆچوونە لە ڕووی بەڵگەوە بەهێزە.

لە (المغني) دا هاتووە: ئەو نەخۆشی‌یەی کۆکردنەوەی نوێژ ڕەوا ئەکات ئەوەیە کە ئەگەر نەخۆش هەموو نوێژەکان لەکاتی خۆیدا بکات تووشی لاوازی و ئازار بێت.

وە حەنبەلی‌یەکان ئەوەیان فراوان کردووە، وە ڕێیان داوە نوێژ کۆ بکرێتەوە بەپێش خراوەیی یا دووا خراوەیی بۆ ئەوانەی مەعزەرەتیان هەیە یا ترسیان هەیە، وە ڕێیان داوە بۆ دایکی منداڵی شیرەخۆر ئەگەر گران بێت لەسەری جلوبەرگەکەی بشوات بۆ هەموو نوێژەکان لەکاتی خۆیدا، وە بۆ ئەوکەسانەی بەردەوام لە حەیزدان، وە بۆ ئەوکەسانەش میزەچرکێیان هەبێت، وە بۆ ئەو کەسانەی توانای دەستنوێژ گرتنیان نەبێت، وە ئەوکەسانەش ترسی گیان و ماڵ و ناموسی‌یان هەبێت.

هەروەها بۆ ئەوکەسانەی کە ترسی زیانیان هەبێت ئەگەر ئەو کۆ کردنەوەیە نەکەن.

ئیبنوتەیمی‌یە دەفەرمووێت: فراوانترین مەزهەب لەناو مەزهەبەکاندا دەربارەی کۆ کردنەوەی نوێژ مەزهەبی ئەحمەدە، چونکە ئەو ڕێی داوە نوێژ کۆ بکرێتەوە لەلایەن کەسێکەوە کە کاری هەبێ، وەك چۆن نسائی ئەوەی بە مەرفوعی گێڕاوەتەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ هەتا ئەوەی دەفەرمووێت: هەروەها دروستە نوێژ کۆکردنەوە بۆ چێشت لێنەر و نانەوا و وێنەی ئەم دووانە، لەوانەی ترسی خراپ بوونی ماڵەکانیان هەبێت.

**٥- کۆ کردنەوە کاتی پێویست:**

نەوەوی لە شەرحی موسلیمدا دەفەرمووێت: کۆمەڵێك لەپێشەواکان ڕێیان داوە بە کۆکردنەوەی نوێژ کاتی نیشتەجێ بوون، لەناو شارو ئاوەدانیدا بۆ پێویستی بۆ ئەوکەسانەی ئەو کۆکردنەوەیە نەکەن بەعادەت، ئەمەش قسەی ئیبنوسیرین و ئەشهەبە لەهاوەڵەکانی مالیك، وە (خطابي) لە قەففال و شاشی گەورە لە هاوەڵانی شافیعی‌یەوە ئەگێڕێتەوە، وە هەروەها لە ئەبو ئیسحاقی میروەزی‌و کۆمەڵێك لەزانایانی حەدیسەوە ئەگێڕێتەوە، وە ئیبنو مونذیر ئەم ڕایەی هەڵبژاردوە. وە (ظاهر) ی قسەی ئیبنوعەبباس پشتگیری ئەکات کە ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ ویستویەتی ئوممەتەکەی ئیحراج نەکات، بۆیە بە نەخۆشی و شتی تر بیانوی بۆ نەهێناوەتەوە. (قسەکە تەواو بوو).

وە حەدیسەکەی ئیبنوعەبباس کە ئاماژەی بۆ ئەکات ئەوەیە کە موسلیم گێڕاویەتی‌یەوە لە ئیبنوعەبباسەوە کە فەرموویەتی: پێغەمبەر ﷺ نوێژی نیوەڕۆ و عەسر و ئێوارە و خەوتنانی بەیەکەوە کردووە بەبێ ترس و بەبێ باران، بە ئیبنوعەبباسیان ووت: مەبەستی چی بووە؟ فەرمووی: ویستویەتی ئوممەتەکەی ئیحراج نەکات.

وە بوخاری و موسلیم هەر لەوەوە ئەگێڕنەوە: کە پێغەمبەر ﷺ لەناو مەدینەدا حەوت هەشت جار نوێژی نیوەڕۆو عەسرو ئێوارەو خەوتنانی کۆ کردۆتەوە.

وە لای موسلیم لە عبداللە ی کوڕی شەقیقەوە هاتووە دەفەرمووێت: ئیبنوعەبباس ڕۆژێك دوای نوێژی عەسر ووتاری بۆ داین هەتا ڕۆژ ئاوا بوو ئەستێرە هەڵهات، وە خەڵکەکە هاواریان لێ هەڵسا ووتیان: نوێژ نوێژ، دەفەرمووێت: پیاوێکی بەنوتەیمی هات بێ ئەوەی سڵە بکات و کۆیکا ووتی: نوێژ نوێژ، ئیبنوعەبباسیش فەرمووی: فێری سوننەتم ئەکەیت دایکت نەمێنێ! پاشان فەرمووی: پێغەمبەرم ﷺ بینیوە نوێژی نیوەڕۆو عەسرو ئێوارەو خەوتنانی کۆ کردۆتەوە، عبداللە ی کوڕی شەقیق دەفەرمووێت: لەو قسەیە شتێك هات بەدڵما، بۆیە چووم بۆلای ئەبوهورەیرە لەوبارەیەوە پرسیارم لێکرد ؟ فەرمووی: ڕاست ئەکات.

## سودێك

لە کتێبی (المغنی)دا هاتووە: ئەگەر کەسێك هەردوو نوێژەکەی لەکاتی نوێژی یەکەمدا بەجێ گەیاند، پاشان مەعزەرەتی کۆ کردنەوەکە لاچوو کاتێ لە هەردوو نوێژەکە بووەوە پێش ئەوەی کاتی نوێژی دووەم بێت، نوێژەکەی دروستە، و پێویست ناکا نوێژی دووەمیان لەکاتەکەی خۆیدا بکاتەوە، چونکە ئەو نوێژەی بەدروستی کردووەو بری ئەوە کەوتووە کە لە ملیدا بوە، وە لەبەر ئەوەی ئەو فەرزەکەی بەجێ هێناوە لەحاڵەتی مەعزەرەتەکەیدا، ئیتر ئەو نوێژە بەنەمانی مەعزەرەتەکەی پوچەڵ نابێتەوە، وەك کەسێکی تەیەممومم کردوو وایە کاتێ لەنوێژ بووەوە ئاوی دەست بکەوێت.

## نوێژ لەناو کەشتی و شەمەندەفەرو فڕۆکەدا

لەناو کەشتی و شەمەندەفەر و فڕۆکەدا نوێژکردن دروستە بەبێ کەراهەت هەرچۆنێك لواو ئاسان بوو بۆ نوێژکەر، لە ئیبنوعومەرەوە هاتووە دەفەرمووێت: دەربارەی نوێژ کردن لەناو کەشتیدا پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا؟ فەرمووی: (صَلِّ فِيهَا قَائِماً إلا أن تَخَافَ الغَرَقَ) (رواه الدارقطني والحاكم على شرط الشيخين). واتە: بەپێوە نوێژ بکە تێیدا، مەگەر ترسی نوقوم بوونیت هەبێت.

وە لە عبداللەی کوڕی ئەبی عوتبەوە هاتووە دەفەرمووێت: هاوڕێیەتی جابیری کوڕی عبداللە و ئەبوسەعیدی خودری و ئەبوهورەیرەم کردووە، بەپێوە لەناو کەشتییەکدا بەجەماعەت نوێژیان

کردووه، یەکێکیان بۆته ئیمامیان لەکاتێکدا ئەیان توانی لەکەنار دەریاکە نوێژ بکەن، (سەعیدی کوڕی مەنصور گێڕاویەتی‌یەوە[1]).

## دوعای سەفەر

موستەحەببە بۆ کەسێك بیەوێ بچێ بۆ سەفەر ئەوکاتەی لەماڵ دەرئەچێت بڵێت: (بِسم اللهِ تَوَكَّلتُ على اللهِ وَلا حَولَ وَلا قُوَّةَ إلا بِالله، اللَّهُمَّ إنِّي أعُوذُ بِكَ أن أضِلَّ أو أُضَلَّ، أو أزِلَّ أو أُزَلَّ، أو أظلِمَ أو أُظلَمَ، أو أجهَلَ أو يُجهَلَ عَلَيَّ) واتە: بەناوی خوا، پشت بەخوا هێزو تواناو گۆڕان بەدەست کەس نی‌یە جگە لەخوا، خوایە من پەنا ئەگرم بەتۆ لەوەی کەسێك گومڕا بکەم یا گومڕا بکرێم، یا کەسێك تووشی هەڵە بکەم یا تووشی هەڵە بکرێم، یا ستەم لەکەسێك بکەم یا ستەمێکم لێ‌بکرێت، یا نەزانی‌یەك بکەم یا نەزانی‌یەکم بەرامبەر بکرێت.

پاشان لەو دوعایانەی کە (مأثور) گێڕدراوەتەوە بە ئارەزووی خۆی چی ئەڵێت بیڵێت، وا لەخوارەوە هەندێکیان باس ئەکەین:

(١) لە عەلی کوڕی ڕەبیعەوە هاتووە دەفەرمووێت: ئاگام لێ بو وولاغێکیان هێنا بۆ عەلی سووار ببێت، کاتێ قاچی خستەناو ئاوزەنگەکەوە فەرمووی: (بسم الله) بەناوی خوا، کاتێ گەیشتە سەر پشتی و خۆی ڕێك کردەوە فەرمووی: (الحمد لله) سوپاس بۆ خوا، ﴿سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقۡرِنِينَ ۝١٣ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ﴾ (الزخرف/١٤). واتە: پاکو بێ گەردی بۆ ئەوخوایەی ئەمەی بۆ ئێمە ڕام کرد، وە ئێمە توانای دابین کردنی ئەمەمان نەبوو، وە ئێمە دوای مردنمان هەر بۆلای پەروەردگارمان ئەگەڕێنەوە، پاشان سێ جار فەرمووی: (الحمد لله) و (الله أكبر) ئینجا فەرمووی: (سُبحَانَكَ لا إلَهَ إلا أنتَ قَد ظَلَمتُ نَفسِي فَاغفِر لِي إنَّهُ لا يَغفِرُ الذُّنُوبَ إلا أنتَ) واتە: خوایە پاکو بێ گەردی بۆ تۆ، مەعبودی حەق نی‌یە جگە لە تۆ، من ستەمم لەخۆم کردووە لێم بووره، بەڕاستی تۆ نەبیت کەس ناتوانێ لەتاوان ببوورێت، لەپاشاندا پێ کەنی ووتم: بەچی پێ ئەکەنیت ئەی (أمير المؤمنين) فەرمووی: من چیم کرد، پێغەمبەرم ﷺ بینیوە کردوویەتی لەپاشان پێکەنیوە، منیش پێم ووت: بەچی پێ‌ئەکەنی ئەی نێرراوی خوا ؟ فەرمووی: (يَعجَبُ الرَّبُّ مِن عَبدِهِ، إذ قَالَ: رَبِّ اغفِر لِي، وَيَقُولُ: عَلِمَ عَبدِي

---

(١) وە جگە لەوان عبدالرزاق (٥/٥٨٢) و ئیبنوئەبی شەیبە (٢/٢٦٦) گێڕاویانەتەوە، وە ئیسنادەکەی صەحیحە.

أَنَّهُ لايَغفِرُ الذُّنوبَ غَيرِي) (رواه أحمد وابن حبان والحاكم وقال: صحيح على شرط مسلم). واتە: کاتێ بەندەیەك ئەڵێت: خوایە لێم ببورە خوا تەعەججوب ئەکا و ئەفەرمووێت: ئەو بەندەیەم ئەزانێت جگە لە من کەس لەتاوان نابوورێت.

٢- لە ئەزدیەوە هاتووە دەفەرمووێت: ئیبنو عومەر فێری کردم کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ ئەچوو بۆ سەفەرو لەسەر پشتی ووشترەکە جێگیر ئەبوو سێ جار ئەیفەرموو: (الله أكبر) پاشان ئەیفەرموو: (﴿سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقۡرِنِينَ ۝١٣ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ﴾ اللَّهُمَّ إنَّا نَسألُكَ فِي سَفَرِنَا هَذَا البِرَّ وَالتَّقوَى، وَمِنَ العَمَلِ مَا تَرضَى، اللَّهُمَّ هَوِّن عَلَينَا سَفَرَنَا هَذَا وَاطوِ عَنَّا بُعدَهُ، اللَّهُمَّ أنتَ الصَّاحِبُ فِي السَّفَرِ، وَالخَلِيفَةُ فِي الأهلِ، اللَّهُمَّ إنِّي أعُوذُ بِكَ مِن وَعثَاءِ السَّفَرِ وَكَآبَةِ المُنقَلَبِ، وَسُوءِ المَنظَرِ فِي الأهلِ وَالمَالِ). واتە: پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی ئەمەی بۆ ڕام کردین، وە ئێمە توانای داین کردنیمان نەبوو، وە ئێمە هەر بۆلای پەروەردگار ئەگەڕێینەوە، خوایە ئێمە داوات لێ ئەکەین لەم سەفەرەماندا چاکەمان بکەیتە بەش و لە تۆ بترسین . وە کارێك بکەین تۆ پێی ڕازی بیت، خوایە ئەم سەفەرەمان بۆ ئاسان بکەیت و ڕێگای دوورمان بۆ نزیك بکەیتەوە، خوایە تۆی هاوەڵی سەفەرمان و جێنشینمان لەناو کەسوکاردا، خوایە پەنا ئەگرم بەتۆ لە ماندوبەتی سەفەرو دڵتەنگی گەڕانەوەو دیمەنی ناشیرینی ناو ماڵ و منداڵ، وە کاتێ ئەگەڕایەوە ئەوانەی دووبارە ئەکردەوە، پاشان ئەیفەرموو: (آيِبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ لِرَبِّنَا حَامِدُون) واتە: گەڕاوەین، تۆبەکارین، پەرستیارین، سوپاس گوزاری پەروەردگارین، (أخرجه أحمد ومسلم).

٣- لە ئیبنوعەبباسەوە هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ نیازی سەفەرێکی بووایە ئەیفەرموو: (اللَّهُمَّ أنتَ الصَّاحِبُ فِي السَّفَرِ وَالخَلِيفَةُ فِي الأهلِ، اللَّهُمَّ إنِّي أعُوذُ بِكَ مِنَ الضَّبنَةِ فِي السَّفَرِ، وَالكَآبَةِ فِي المُنقَلَبِ، اللَّهُمَّ اطوِ لَنَا الأرضَ، وَهَوِّن عَلَينَا السَّفَرَ). واتە: خوایە تۆ هاوەڵی سەفەرمان و جێ نشینی ناو کەسوکارمانی، خوایە پەنا ئەگرم بەتۆ لە هاوڕێی خراپ لەم سەفەرەماندا، وە پەنا ئەگرم بەتۆ لەغەم و پەژارەی گەڕانەوە، خوایە زەویمان بۆ بپێچەوە و ئەم سەفەرەمان لەسەر ئاسان بکە، وە کاتێ نیازی گەڕانەوەی بووایە ئەیفەرموو: (آيِبُونَ، تَائِبُونَ، عَابِدُونَ، لِرَبِّنَا حَامِدُونَ)، گەڕاوەین، تۆبەکارین، پەرستیارین، سوپاس گوزاری پەروەردگارین، وە کاتێ ئەگەیشتە ناو کەسوکاری ئەیفەرموو: (تَوباً تَوباً، لِرَبِّنَا أوباً لايُغَادِرُ عَلَينَا حَوباً). (ئەحمەدو

(طبراني) و بەززار گێڕاویانەتەوە بسەنەدێك كە پیاوەكانی پیاوانی صەحیحن[1]). واتە: تۆبە تۆبە و گەڕانەوە بۆلای پەروەردگارمان بەجۆری كە هیچ گوناحێ بەجێ نەهێڵێ.

(٤) لە عبدالله ی كوڕی سەرجسەوە هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ كاتێ بچوایەتە دەر بۆ سەفەر ئەیفەرموو: (اللَّهُمَّ إنِّي أعُوذُ بِكَ مِن وَعثَاءِ السَّفَرِ وَكَآبَةِ المُنقَلَبِ وَالحَورِ بَعدَ الكَورِ، وَدَعوَةِ المَظلُومِ، وَسُوءِ المَنظَرِ فِي المَالِ والأهلِ). واتە: خوایە پەنا ئەگرم بەتۆ لە نا خۆشی سەفەرو غەم و پەژارەی كاتی گەڕانەوە، و خراپەكاری دوای چاكەكاری، خوایە پەنا ئەگرم بەتۆلە دوعای ستەم لێكراو، وە بینینی دیمەنی خراپ لە ماڵ و منداڵ. وە كاتێ ئەگەڕایەوە ئەوانەی دووبارە ئەكردەوە بەڵام ئەمجارەیان ئەیفەرموو: (وَسُوءِ المَنظَرِ فِي الأهلِ وَالمَالِ) واتە: لەگەڕانەوەدا (أهل) ی پێش (مال) ی ئەخست. (ئەحمەدو موسلیم گێڕاویانەتەوە).

(٥) لە ئیبنوعومەرەوە هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ كاتێ ئەچووبۆ غەزا یا ئەچووە سەفەرو شەوی بسەردا ئەهات ئەیفەرموو: (يَا أرضُ رَبِّي وَرَبُّكِ اللهُ، أعُوذُ بِاللهِ مِن شَرِّكِ وَشَرِّ مَا فِيكِ، وَشَرِّ مَا خُلِقَ فِيكِ، وَشَرِّ مَا دَبَّ عَلَيكِ، أعُوذُ بِاللهِ مِن شَرِّ كُلِّ أسد وأسود، وَحَيَّةٍ وَعقرَبٍ، وَمِن شَرِّ سَاكِنِ البَلَدِ، وَمِن شَرِّ وَالِدٍ وَمَا وَلَدَ) (رواه أحمد وأبوداود[2]). واتە: ئەی زەوییەكە پەروەردگاری من و تۆ خوایە، پەنا ئەگرم بە خوا لە شەڕی خۆت و شەڕی ئەوەی لەسەرتۆیە، و شەڕی ئەوەی لەتۆدا دروست كراوە، وە شەڕی ئەوشتانەی لەسەر تۆ ئەجولێن، پەنا ئەگرم بەخوا لەشەڕی دڕندەیەك و ئەژدیها، و مارو دووپشكێك، وە لە شەڕی نیشتەجێی ناوشار، وە لەشەڕی باوك و ئەوەی لێی بووە.

(٦) لە خەولەی كچی حەكیمی سولەیمییەوە هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن نَزَلَ مَنزِلاً ثُمَّ قَالَ: أعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّاتِ كُلِّهَا مِن شَرِّ مَا خَلَقَ، لَم يَضُرَّهُ شَيئٌ حتى يَرتَحِلَ مِن مَنزِلِهِ ذَلِكَ) (رواه الجماعة إلا البخاري وأبوداود). واتە: هەركەس لەشوێنێكدا لای دا پاشان وتی: پەنا ئەگرم بە هەموو وشە تەواوەكانی خوا لەشەڕی ئەو شتانەی دروستی كردوون، هەتا لەو شوێنەدا بار ئەكات هیچ شتێك زیانی پێ ناگەیەنێت.

(٧) لە (عطاء) ی كوڕی ئەبیمەڕوانەوە هاتوە لە باوكییەوە كە كەعب سوێندی بۆ خواردوە بەو زاتەی دەریاكەی كردە دوو بەش بۆ موسا، صوهەیب بۆی گێڕاوەتەوە كە پێغەمبەر هەركاتێ

(١) ئیسنادی ئەم (حدیث)ە زەعیفە بەڵام زۆربەی صەحیحە بەهۆی حەدیسەكەی پێشەوەی (تمام المنة).

(٢) حەدیسێكی لاوازە، چونكە لەسەنەدەكەیدا كەسێكی نەناسراوی تێدایە، ئیتر پارێزراویش ئەو كەسەیە كە خوا پاراستبێتی لە گوناه (تمام المنة).

گوندێ یا شارێکی ئەبینی و ئەیویست بچێتە ناوی ئەیفەرموو: (اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمَواتِ السَّبعِ وَمَا أظلَلنَ، وَرَبَّ الأرَضِينَ السَّبعِ وَمَا أقلَلنَ، وَرَبَّ الشَّيَاطِينِ وَمَا أضلَلنَ، وَرَبَّ الرِّيَاحِ وَمَا ذَرَينَ، أسألُكَ خَيرَ هَذِهِ القَريَةِ، وَخَيرَ أهلِها، وَخَيرَ مَا فِيهَا، وَنُعوذُ بِكَ مِن شَرِّهَا وَشَرِّ أهلِهَا وَشَرِّ مَا فِيهَا) (رواه النسائي وابن حبان والحاكم وصححاه[1]). واتە: خوایە پەروەردگاری ئاسمانەکان و ئەو شتەی دایان پۆشیوە، وە پەروەردگاری حەوت زەوی و ئەوشتانەی هەر حەوتیان هەڵیان گرتووە، و ئەوانەی لەسەرین، وە پەروەردگاری شەیتانەکان و ئەوانەی گومڕایان کردووە، وە پەروەردگاری باکان و ئەوانەی ئەو بایانە بڵاوی ئەکەنەوە، داوات لێ ئەکەم خێری ئەم ئاوەدانی یەو خەڵکەکەی و چی تێدایە بکەیتە بەشمان، وە پەنا ئەگرم بەتۆ لەشەڕی ئەم ئاوەدانی یە و خەڵکەکەی و چی تێدایە.

(٨) لە ئیبنو عومەرەوە هاتووە دەفەرمووێت: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ئەچووین بۆ سەفەر کاتێك گوندێك یا شارێکی ئەدی، ئەگەر بیویستایە بچێتە ناوی ئەیفەرموو: (اللَّهُمَّ بَارِك لَنَا فِيهَا) سێ جار، (اللَّهُمَّ ارزُقنَا جَنَاهَا، وَحَبِّبنَا إلى أهلِهَا، وَحَبِّب صَالِحِي أهلِهَا إلَينَا) (رواه الطبراني في الأوسط بسندٍ جيد). واتە: خوایە چوونە ناوەمان لێ پیرۆز بکە، سێ جار، خوایە بەروبومەکەیمان پێ ببەخشە، وە لەلای دانیشتوانەکەی خۆشەویستمان بکە، وە پیاوچاکەکانیمان لا خۆشەویست بکە.

(٩) لە عائیشەوە هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر بچوایا بەسەر ئاوەدانی یەکدا و بیویستایە بچێتە ناوی ئەیفەرموو: (اللَّهُمَّ إنِّي أسألُكَ خَيرَ هَذِهِ وَخَيرَ مَا جَمَعتَ فِيهَا، اللَّهُمَّ ارزُقنَا جَنَاهَا، وَأعِذنَا مِن وَبَاهَا، وَحَبِّبنَا إلى أهلِهَا، وَحَبِّب صَالِحي أهلِها إلَينَا) (رواه ابن السني)[2]. واتە: خوایە: من داوای خێری ئەم ئاوەدانی یەو خێری ئەوانەی تێیدا کۆت کردوونەوە لێ ئەکەم، خوایە بەروبوومەکەیمان پێ ببەخشەو لە دەردەکانی بمان پارێزە، وە لای دانیشتووانەکەی خۆشەویستمان بکە، وە پیاوچاکەکانیمان لا خۆشەویست بکە.

(١٠) لە ئەبوهورەیرەوە هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر لەسەفەرێکدا بکەوتایەتە سەحەرەوە ئەیفەرموو: (سَمِعَ سَامِعٌ بِحَمدِ اللهِ وَحُسنِ بَلائِهِ عَلَينَا، رَبَّنَا صَاحِبنَا وَأفضِل عَلَينَا، عَائِذاً بِاللهِ مِنَ النَّار) (رواه مسلم) واتە: شایەتێك شایەتی دا کە ئێمە سوپاس گوزاری خواو

---

(١) حەدیسەکەصەحیحە بەڵام لەم ڕێگایەوە نا، چونکە ئەبو مەروان نەناسراوە (تمام المنة).

(٢) ئیسنادەکەی زەعیفە، عیسای کوڕی مەیمونی تێدایە کە بەندەی قاسمی کوڕی موحەممەدە، (حافظ) لەبارەیەوە ئەڵێت: زەعیفە، بەڵام ئەو بە حەدیسەکەی ئیبنوعومەر کە لەمەو پێش باس کرا، بەهێزی کردووە لە تەخریجی (الأذكار) دا، لە دوو ڕێگاوە هێناویەتی: یەکێکیان لە ڕێگای (الأوسط)ەوە کە دانەر سەنەدەکەی بە جید داناوە، ئەمیش قسەی هەیسەمی یە لە (مجمع) دا (١٠/١٣٤) و سەیری ئیبنوعەللان بکە (٥/١٥٨-١٥٩) و (الصحيحة) بە ژمارە (٢٧٥٩) (تمام المنة).

سوپاس گوزاری نیعمەتەکانیمان کردووە، پەروەردگاری ئێمە هاوڕێمان بەو چاکمان لەگەڵدا بکە، وە بمان پارێزە لە ئاگر و ئەو هۆیانەی ئەمان خاتە ناو ئاگر.

## هەینی (الجمعة)

### ١- (فضل) ی ڕۆژی هەینی:

هاتووە کە ڕۆژی هەینی چاکترین ڕۆژە لە ڕۆژەکانی هەفتەدا، لە ئەبی هورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (خيرُ يَومٍ طَلَعَت عَلَيهِ الشَّمسُ يَومُ الجُمعَةِ؛ فِيهِ خُلِقَ آدَمُ (عليه السلام) وَفِيهِ أُدخِلَ الجَنَّةَ، وَفِيهِ أُخرِجَ مِنهَا، وَلا تَقُومُ السَّاعَةُ إلا فِي يَومِ الجُمُعَةِ) (رواه مسلم وأبوداود والنسائي والترمذي وصححه). واتە: چاکترین ڕۆژێك خۆری لێ هەڵهاتبێ ڕۆژی هەینی‌یە، ئادەم سڵاوی خوای لێ بێت لە ڕۆژی هەینیدا دروست کراوە، وە هەر لە ڕۆژی هەینیدا خراوەتە بەهەشت، وە هەر لە ڕۆژی هەینیدا لێی دەرکراوە، وە لە ڕۆژی هەینیدا نەبێت دونیا کۆتایی نایات.

لە ئەبو لوبابەی بەدری‌یەوە خوا لێی ڕاز بێت هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (سَيِّدُ الأيَّامِ يَومُ الجُمُعَةِ، وَأعظَمُهَا عِندَ اللهِ تعالى، وَأعظَمُ عِندَ اللهِ تعالى مِن يَومِ الفِطرِ وَيَومِ الأضحَي، وَفِيهِ خَمسُ خِلالٍ: خَلَقَ اللهُ عَزَّوَجَلَّ فِيهِ آدَمَ (عليه السلام)، وَأهبَطَ اللهُ تعالى فِيهِ آدَمَ إلى الأرضِ، وَفِيهِ توفى اللهُ تَعَالى آدَمَ، وَفِيهِ سَاعَةٌ لا يَسألُ العَبدُ فِيهَا شَيئاً إلا آتَاهُ اللهُ تعالى إيَّاهُ مَا لَم يَسأل حَرَاماً، وَفِيهِ تَقُومُ السَّاعَةُ، مَا مِن مَلَكٍ مُقَرَّبٍ، ولا سَمَاءٍ ولا أرضٍ، ولا رِيَاحٍ، وَلا جِبَالٍ، وَلا بَحرٍ، إلا هُنَّ يُشفِقنَ مِن يَومِ الجُمُعَةِ) (رواه أحمد وابن ماجة. قال العراقي: إسناده حسن). واتە: گەورەی ڕۆژەکان ڕۆژی هەینی‌یە و لای خوا لە هەموویان گەورەترە، وە لای خوا گەورەترە لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربان، وە پێنج خەسڵەتی هەیە: خوای گەورە ئادەمی (عليه السلام) تێدا دروست کردووە، وە خوا ئادەمی تێدا دابەزاندۆتە سەر زەوی، وە خوا لە ڕۆژی هەینیدا گیانی ئادەمی کێشاوە، وە ساتێکی تێدایە بەندە نی‌یە لەوساتەدا داوای شتێك بکات لە خوا کە خوا نەیداتێ، بەمەرجێك داوای شتی حەرام نەکات، وە ڕۆژی دوایی لەهەینیدا ڕوو ئەدات، وە هەرچی فریشتەی نزیکی خواو زەوی و باو شاخ و دەریا نی‌یە کە لە ڕۆژی هەینی نەترسێت.

### ٢- پاڕانەوە لە ڕۆژی هەینیدا:

پاڕانەوە لە دوواکاتەکانی ڕۆژی هەینیدا پێویستە زۆر بەپەرۆشەوە بکرێت، لە عبداللەی کوڕی سەلامەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە دەفەرمووێت: جارێك پێغەمبەر ﷺ دانیشتبوو، من ووتم: ئێمە لە کتێبەکەی خوادا ئەبینین ساتێ لە ڕۆژی هەینیدا هەیە باوەڕدارێك نیە ڕێك بکەوێت بۆی لەوساتەدا نوێژ بکات و داوای شتێك بکات لە خوا ئیللا بۆی جێ بەجێ ئەکات، عبد الله ووتی: پێغەمبەر ﷺ ئیشارەتی بۆ کردم، یان هەندێکی ساتێك، ووتم: ڕاست ئەفەرموویت: هەندێکی ساتێك، ووتم: چ ساتێکە ئەو ساتە؟ فەرمووی: دووا ساتە لە ساتەکانی ڕۆژ، ووتم: ئەو ساتە کاتی نوێژکردن نیە؟ فەرمووی: بەڵێ، بە ڕاستی باوەڕدار کاتێ نوێژی کرد، پاشان تەنها بۆ نوێژ دانیشتەوە و چاوەڕووانی کرد، هەر لەنوێژدا ئەبێت، (ئیبنوماجە گێڕاویەتی یەوە).

لە ئەبو سەعید و ئەبوهورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إنَّ فِي الجُمُعَةِ سَاعَةً، لا يُوَافِقُهَا عَبدٌ مُسلِمٌ يَسأَلُ اللهَ عَزَّوَجَل فِيهَا خَيراً إلا أعطَاهُ إيَّاهُ، وَهِيَ بَعدَ العَصرِ) (رواه أحمد. قال العراقي: صحيح) واتە: لە ڕۆژی هەینیدا ساتێك هەیە کە هەربەندەیەکی موسڵمان بۆی ڕێك بکەوێ لەو ساتەدا داوای شتێك لە خوای گەورە بکات کە خێری تێدابێت ئیللا خوای گەورە ئەیداتێ، ئەو ساتەش لە دوای عەسرەوەیە.

لە جابیرەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: (يَومُ الجُمُعَةِ إثنَتَا عَشرَةَ سَاعَة، مِنهَا سَاعَةٌ لايُوجَدُ عَبدٌ مُسلِمٌ يَسأَلُ اللهَ تعالى شَيئاً إلا آتَاهُ إيَّاهُ، وَالتَمِسُوهَا آخِرَ سَاعَةٍ بَعدَ العَصرِ) (رواه النسائي وأبوداود والحاكم في المستدرك وقال: صحيح على شرط مسلم، وَحَسَّنَ الحافظ إسناده في الفتح). واتە: ڕۆژی هەینی دوانزە ساتە، ساتێکی تێدایە بەندەی موسڵمان نیە لەو ساتەدا داوای شتێك بکات لە خوا ئیللا ئەیداتێ، ئێوەش لە دووا ساتەکانی دوای عەسر بۆی بگەڕێن.

لە ئەبوسەلەمەی کوڕی عبدالرحمنەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە دەفەرمووێت: کۆمەڵێك لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ کۆ بوونەوە باسی ئەو ساتەی ڕۆژی هەینیان ئەکرد، پاشان جیابوونەوەو جیاوازیان نەبوو کە ئەو ساتە دووا ساتی ڕۆژی هەینیە. (سەعید لە سونەنەکەیدا گێڕاویەتی یەوە وە (حافظ) لە فەتحدا بەصەحیحی داناوە).

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەفەرمووێت: زۆربەی ئەو حەدیسانەی هاتوون دەربارەی ئەو ساتە کە هیوای گیابوونی پاڕانەوەی تێدا ئەکرێت، دەری ئەخەن کە ئەوساتە لەدوای نوێژی عەسرەوەیە، وە نومێدی لێ ئەکرێ کە دوای لادانی ڕۆژ بێ لە ناوەڕاستی ئاسمان.

ئەمما ئەو حەدیسەی کە موسلیم و ئەبوداود لە ئەبوموساوە گێڕاویانەتەوە دەفەرمووێت: خۆی گوێی لە پێغەمبەر بووە ﷺ دەربارەی ساتەکەی ڕۆژی هەینی فەرموویەتی: (هِيَ مَا بَينَ أن

يَجلِسَ الإمَامُ إلى أن تُقضَي الصَّلاةَ) واته: ئەوکاته لەنێوان ئەوکاتەدایە کە ئیمام لەسەر مینبەر دائەنیشێ هەتا نوێژ کۆتایی دێت، ئەم حەدیسە بە عیللەتدار دانراوە بەوەی کە (مضطرب) و (منقطع)ە.

**٣- سڵاوات دانی زۆر لەسەر پێغەمبەر ﷺ شەوی هەینی و ڕۆژەکەی:**

لە ئەوسی کوڕی ئەوسەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مِن أفضَلِ أيَّامِكُم يَومُ الجُمُعَةِ: فِيهِ خُلِقَ آدَمُ، وَفِيهِ قُبِضَ، وَفِيهِ النَّفخَةُ، وَفِيهِ الصَّعقَةُ، فَأكثِرُوا عَلَيَّ مِنَ الصَّلاةِ فِيهِ، فَإِنَّ صَلاتَكُم مَعرُوضَةٌ عَلَيَّ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ! وَكَيفَ تُعرَضُ عَلَيكَ صَلاتُنَا وَقَد أرِمتَ؟ فَقَالَ: إنَّ اللهَ عَزَّوَجَل حَرَّمَ على الأرضِ أن تَأكُلَ أجسَادَ الأنبِيَاءِ) (رواه الخمسة إلا الترمذي). واته: لە چاکترین ڕۆژەکانتان ڕۆژی هەینییە، ئادەمی تێدا دروست کراوە، وە تێیدا گیانی کێشراوە، وە تێیدا فوو بە صوردا ئەکرێت، وە تێیدا گشت گیانداران ئەمرن، جا ئێوە زۆر سڵاواتم لەسەر لێ بدەن لەم ڕۆژدا، چونکە سڵاوەتەکانتانم نیشان ئەدرێ، وتیان: ئەی نێرراوی خوا چۆن نیشانت ئەدرێ؟ لەحاڵێکدا تۆ لە گۆڕدا ڕزیویت؟ فەرمووی: خوای گەورە حەرامی کردووە لەسەر زەوی لاشەی پێغەمبەران بخوات.

ئیبنو قەییم دەفەرمووێت: موستەحەببە لە شەو ڕۆژی هەینیدا زۆر سڵاوات بدرێ لەسەر پێغەمبەر ﷺ. بەپێی فەرموودەکەی کە فەرموویەتی: (أكثِرُوا مِنَ الصَّلاةِ عَلَيَّ يَومَ الجُمُعَهِ وَلَيلَةَ الجُمُعَةِ)[1]. واته: شەوو ڕۆژی هەینی زۆر سڵاواتم لەسەر بدەن. وە پێغەمبەر ﷺ سەرداری ئادەمیزادە، و ڕۆژی هەینی سەرداری ڕۆژەکانە، پاشان سڵاوات دان لەسەری لەم ڕۆژەدا تایبەت بەوە نەك بەکەسی ترەوە، لەگەڵ حیکمەتێکی تریش ئەویش ئەوەیە ئوممەتەکەی هەرچی خێرێکی بەدەس هێناوە لە دنیاو قیامەتدا لەسەر دەستی پیرۆزی ئەوە، کەواته خوا خێری دنیاو قیامەتی بۆ کۆکردونەتەوە، وە گەورەترین کەرامەتێ کە دەستیان بکەوێت، لە ڕۆژی هەینیدا ئەبێت، چونکە لەو ڕۆژەدا زیندوو ئەکرێنەوەو ڕەوانە ئەکرێن بۆ خانەو کۆشکەکانی بەهەشتیان، وە ئەو ڕۆژە بۆ ئەوان (یوم المزید)ە واته: ڕۆژی پاداش دانی زیاتر لە کاتی چونە بەهەشتدا، وە ئەو ڕۆژە جەژنە بۆ باوەڕداران لە دنیادا، وە ئەو ڕۆژەیە خوا داواو پێویستییەکانیان جێبەجێ ئەکات و داواکانیان ناگێڕێتەوە، وە موسڵمانان هەموو ئەمانەیان زانیوەو دەستیان کەوتوە ئەوەوەو لەسەر دەستی ئەو،

(١) پلەی حەدیسەکەی دیاری نەکردووە و تەخریجی نەکردووە، وە (حدیث)ەکە پلەی (حسن) ی هەیە سەیری (الصحیحة) ژمارە (١٤٠٧) بکە، وە ئەگەر زاراوەی شەوی جومعەی لەگەڵدا نەبێت ئەوە حەسەنە، لەبەر ئەو حەدیسەی (أوس) کە لەپێش ئەمەوە هەیە و لە (الصحیحة) شدا بە ژمارە (١٥٢٧) هەیە.

کەواتە لە سوپاس و پێ زانین و بەجێ هێنانی کەمێکە لە مافی ئەو پێغەمبەرە ﷺ کە زۆر سڵاوات بدرێت لەسەری لەشەوو ڕۆژی ئەم ڕۆژەدا.

**٤- (إستحباب) پەسەندیەتی خوێندنی سورەتی (کهف) لە شەو ڕۆژی هەینیندا:**

لە ئەبو سەعیدی خودریەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن قَرأ سُورَةَ الكَهفِ فِي يَومِ الجُمُعَةِ أضَاءَ لَهُ النُّورُ مَا بَينَ الجُمعَتَينِ) (رواه النسائي والبيهقي والحاكم). واتە: هەرکەس ڕۆژی هەینی سورەتی کەهف بخوێنێ خوا نێوان ئەو هەینیە و هەینی داهاتووی بۆ ڕۆشن ئەکاتەوە.

لە ئیبنوعومەرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن قَرَأ سُورَةَ الكَهفِ فِي يَومِ الجُمُعَةِ سَطَعَ لَهُ نُورٌ مِن تَحتِ قَدَمِه إلى عَنَانِ السَّمَاءِ يُضِيئُ لَهُ يَومَ القِيَامَةِ وَغُفِرَ لَهُ مَا بَينَ الجُمعَتَينِ) (رواه ابن مردويه بسندٍ لابأس به[1]). واتە: هەرکەس سورەتی کەهف لەڕۆژی هەیینیدا بخوێنێ لەژێر پێیەوە ڕۆشنایییەك پەیدا ئەبێت هەتا لای ئاسمانی بۆ ڕوناك ئەکاتەوەو لە لەتاوانی نێوان ئەو دوو هەینییەی ئەبوررێ.

**خوێندنی سورەتی کەهف بەدەنگی بەرز لە مزگەوتا کەراهەتی هەیە:**

شێخ (محمد عبده) فەتوایەکی دەرکردووە تێیدا هاتووە: خوێندنی سورەتی کەهف لەڕۆژی هەینیدا لە کتێبی (عبارة الأشباه عند تعداد المكروهات) هاتوە کە ئەمە دەقەکەیەتی: ئەگەر ڕۆژی هەینی تایبەت بکرێت بۆ بەڕۆژوو بوون و شەوەکەی بۆ شەونوێژ کەراهەتی هەیە، وە هەروەها خوێندنی سورتی کەهف بەتایبەتی کە بە ئاوازەوە ئەخوێنرێ و خەڵکەکە سەریان قاڵە بە قسەکردنەوەو گوێ نادەن بە خوێندنەکە، پاشان خوێنەرەکە بە دەنگەکەی سەر لە نوێژکەرەکان تێك ئەدات، لەبەر ئەوە خوێندنی ئەو سورەتە بەدەنگەوە بەو شێوەیە قەدەغەیە.

**٥- خۆ شۆردن و خۆ جوان کردن و سیواك کردن و بۆن لەخۆدان بۆ کۆبونەوەکان بەتایبەت هەینی:**

موستەحەببە بۆ هەموو ئەوکەسانەی ئەیانەوێ ئامادەی نوێژی هەینی بن[2] یا هەر کۆبونەوەیەك لە کۆبونەوەکانی خەڵك، ژن بێت یا پیاو، گەورە بێت یا بچووك، نیشتەجێ بێت یا ڕێبوار، کە

---

(١) بە نەقد کردنی من ئەم حەدیسە مونکەرە، لەبەر ئەوەی موخالەفەی حەدیسەکەی ئەبو سەعید ئەکات کە لەپێش ئەمەوەیە، و ئیسنادی ئەویان صەحیحە بڕوانە (الصحيحة ٢٦٥١) (تمام المنة).

(٢) بەڵام کەسێك کە نەیەوێت بچێتە نوێژی هەینی سوننەت نیە بۆی خۆی بشوات، بەپێی ئەوەی ئیبنوعومەر ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن أتى الجُمُعَةَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ فَلِيَغتَسِل، وَمَن لَم يَأتِهَا فَلَيسَ عَلَيهِ غُسلٌ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ) (قال النووي: رواه البيهقي بهذا اللفظ بإسنادٍ صحيح) واتە: هەر ژن و پیاوێك

لەسەر جوانترین شێوە بێت و خۆی پاك و خاوێن بكات و خۆی برازێنێتەوە، بەمە كە خۆی بشوات و چاكترین پۆشاكی لەبەر بكات و بۆنی خوش لە خۆی بدات و دەمو ددانی پاك بكاتەوە بەسیواك.

لەو بارەیەوە ئەمانەی خوارەوە هاتووە:

أ- لە ئەبوسەعیدەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (على كُلِّ مُسلِمٍ الغُسلُ يَومَ الجُمُعَةِ وَيَلبَسَ مِن صَالِحِ ثِيَابِهِ، وَإن كَانَ لَهُ طِيبٌ مَسَّ مِنهُ) (رواه أحمد والشيخان). واتە لەسەر هەموو موسڵمانێك پێویستە ڕۆژی هەینی خۆی بشۆرێت و جوانترین جلی لەبەربكات و ئەگەر بۆنی خۆشی هەبوو لەخۆی بدات.

ب- لە ئیبنوسەلامەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە دەفەرمووێت: گوێم لێبووە پێغەمبەر ﷺ لەسەر مینبەر ڕۆژی هەینی ئەی فەرموو: (مَا على أحَدِكُم لَوِ اشتَرَى ثَوبَينِ لِيَومِ الجُمُعَةِ، سِوَى ثَوبَي مِهنَتِهِ) (رواه أبوداود وابن ماجة). واتە: لەسەر هەریەكێ لەئێوە واچاكە دەستێ جل بكرێت بۆ ڕۆژی هەینی، جگە لە جلی ئیش‌وكاری[1].

ج- لە سەلمانی فارسی‌یەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا يَغتَسِلُ رَجُلٌ يَومَ الجُمُعَةِ وَيَتَطَهَّرُ بِمَا استَطَاعَ مِن طُهرٍ، وَيَدَّهِنُ مِن دُهنِهِ، أو يَمَسُّ مِن طِيبِ بَيتِهِ، ثُمَّ يَرُوحُ إلى المَسجِدِ وَلا يُفَرِّقُ بَينَ اثنَينِ، ثُمَّ يُصَلِّي مَا كُتِبَ لَهُ، ثُمَّ يُنصِتُ لِلإمَامِ إذَا تَكَلَّمَ، إلا غُفِرَ لَهُ مِنَ الجُمُعَةِ إلى الجُمُعَةِ الأخرى) (رواه أحمد والبخاري) واتە: پیاو نی‌یە ڕۆژی هەینی خۆی بشوات و بەجوانی سەرو لاشەی پاك بكاتەوەو بەو ڕۆنەی كە هەیەتی سەروڕیشی چەور بكات یان عەتری خێزانی بەكار بهێنێ‌و پاشان بچێت بۆ مزگەوت و دوو كەس لەیەك جیا نەكاتەوە بەهەنگاونان بەسەریاندا، پاشان ئەوەندەی كە بۆی دانراوە نوێژ بكات و پاشان گوێ لە قسەی ئیمام بگرێ، ئیللا خوا لەو گوناهانەی خۆش ئەبێ كە لەنێوانی ئەم جومعەیە و جومعەكەی پێشوودا هەیبووە، وە ئەبو هورەیرە ئەیفەرموو: نێوان ئەو هەفتەیەو سێ ڕۆژیشی لەسەر بێت، چونكە خوا هەر چاكەیەكی بە دەئەوەندە بۆ ئەنووسێت. وە ئەو لێبوردنە بۆ گوناهە بچوكەكانە،

---

بچێت بۆ نوێژی هەینی با خۆی بشۆرێت پێش ئەوەی بچێت، وە هەركەس نەچێت خۆشۆردنی لەسەر نی‌یە ژن بێت یا پیاو (دانەر).

(١) بەیهەقی ئەگێرێتەوە لە جابیرەوە كە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ پۆشاكێكی هەبوو لە دوو جەژنەو لەڕۆژی هەینیدا لەبەری ئەكرد، جا لەم حەدیسەدا بەڵگەی ئەوە هەیە كە موستەحەببە ڕۆژی هەینی تایبەت بكرێ بە پۆشاكێكەوە جگە لە پۆشاكی ڕۆژەكانی تر. (دانەر).

بەپێی ئەوەی ئیبنوماجە لە ئەبیهورەیرەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَا لَم يَغشَ الكَبَائِرَ) واتە: بەمەرجێك تاوانە گەورەکانی نەکردبێت.

د- لای ئەحمەد هاتووە بەسەنەدی صەحیح کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (حَقٌّ على كُلِّ مُسلِمٍ الغُسلُ وَالطِّيبُ وَالسِّوَاكُ يَومَ الجُمُعَةِ) واتە: خۆشۆردن و بۆنی خۆش لەخۆ دان و سیواك کردن لەسەر هەرموسڵمانێك پێویستە.

ھ- وە لای (طبراني) لە (الأوسط) و لە (الكبير) دا بەسەنەدێك کە پیاوەکانی سیقەن، هاتووە لە ئەبوهورەیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە هەینییەك لە هەینییەکاندا فەرموویەتی: (يَا مَعشَرَ المُسلِمِينَ هَذَا يَومٌ جَعَلَهُ اللهُ لَكُم عِيداً فَاغتَسِلُوا وَعَلَيكُم بِالسِّوَاكِ) واتە: ئەی جەماوەری موسڵمانان ئەمە ڕۆژێکە خوا بۆی کردوونە جەژن، کەواتە خۆتانی تێدا بشۆن و سیواکی تێدا بکەن.

### ٦- زوو چوون بۆ نوێژی هەینی:

زوو چوون بۆ نوێژی هەینی بۆ کەسێك کە ئیمام نەبێت کارێکی باشە، عەلقەمە دەفەرموێت: لەگەڵ عبدالله ی کوڕی مەسعودا چووین بۆ نوێژی هەینی سێ کەسی بینی لەمزگەوت کەلەپێش ئەودا چوبوون، فەرمووی: منیش چوارەمم، چوارەمیش لەخواوە دوور نییە، خۆم لە پێغەمبەرم ﷺ بیستووە فەرموویەتی: (إنَّ النَّاسَ يَجلِسُونَ يَومَ القِيَامَةِ على قَدرِ تَرَاوُحِهِم إلى الجُمُعَاتِ الأوَّلَ، ثُمَّ الثَّانِي، ثُمَّ الثَّالِثَ، ثُمَّ الرَّابِعَ، وَمَا رَابِعُ أربَعَةٍ مِنَ اللهِ بِبَعِيدٍ) (رواه ابن ماجة والمنذري[1]). واتە: ڕۆژی دوای دوورو نزیکی دانیشتنی خەڵکی لەخواوە بەپێی زوو چوون و درەنگ چوونیانە بۆ جومعە، یەکەم، پاشان دووەم، پاشان سێیەم، پاشان چوارەم، وە چوارەمیش لەخواوە دوور نییە.

---

(١) کورتەی قسەی شێخ ئەلبانی ئەمەیە: لەم چاپە و لە چاپەکانی تردا هەروەها هاتووە کە: ئیبنوماجە و مونزری گێڕاویانەتەوە، ئەمە لەوانەیە هەڵەیەکی تێدا بێت و ئەصلەکەی ئەوە بێت کە مونزری بە حەسەنی داناوە، چونکە لە الترغيب (١/٢٥٥) دا ووتویەتی: ئیبنوماجە و ئیبنوئەبی عاصم گێڕاویانەتەوەو ئیسنادەکەشیان حەسەنە.

بەڵام لای من حەسەن نییە، چونکە خولگەکەی لەسەر عبدالمجیدی کوڕی عبدالعزیزی کوڕی ئەبوداودە، وە ئەویش لاوازی تێدایە لەلایەن (حفظ)ییەوە.

لە دواییدا ئەفەرموێت: ئەم حەدیسەم تەخریج کردووە و بە درێژی قسەم لەسەر کردووە لە (الضعيفة) دا بە ژمارە (٢٨١٠)، وە بە کورتی هێناومە لە (ظلال الجنة في تخريج السنة لابن أبي عاصم ٦٣٠) (تمام المنة).

له ئەبو هورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَنِ اغتَسَلَ يَومَ الجُمُعَةِ غُسلَ الجَنَابَةِ ثُمَّ رَاحَ فَكَأنَّما قَرَّبَ بَدَنَةً، وَمَن رَاحَ فِي السَّاعَةِ الثَّانِيَةِ فَكَأنَّمَا قَرَّب بَقَرَةً، وَمَن رَاحَ فِي السَّاعَةِ الثَّالِثَةِ فَكَأنَّمَا قَرَّبَ كَبشاً أقرَنَ، وَمَن رَاحَ فِي السَّاعَةِ الرَّابِعَةِ فَكَأنَّمَا قَرَّبَ دَجَاجَةً، وَمَن رَاحَ فِي السَّاعَةِ الخَامِسَةِ فَكَأنَّمَا قَرَّبَ بَيضَةً. فَإذَا خَرَجَ الإمَامُ حَضَرَتِ المَلائِكَةُ يَستَمِعُونَ الذِّكرَ) (رواه الجماعة إلا ابن ماجة). واتە: هەرکەس ڕۆژی هەینی خۆی شت هەروەك خۆشتنی لەشگرانی، پاشان لەساتی یەکەمدا بەرەوە مزگەوت کەوتەڕێ وەك ئەوە وایە ووشترێکی کردبێتە قوربانی، وە هەرکەس لەساتی دووەمدا ڕۆیشت وەك ئەوە وایە مانگایەکی کردبێتە قوربانی، وە هەرکەس لەساتی سێیەمدا ڕۆیشت وەك ئەوە وایە بەرانێکی شاخداری کردبێتە قوربانی، وە هەرکەس لەساتی چوارەمدا ڕۆیشت وەك ئەوە وایە مریشکێکی کردبێتە قوربانی، وە هەرکەس لەساتی پێنجەمدا ڕۆیشت، وەك ئەوە وایە هێلکەیەکی کردبێتە قوربانی، جا کاتێ ئیمام هات فریشتەکان ئامادە ئەبن گوێ لە ووتارەکەی ئەگرن.

شافیعی و کۆمەڵێك بۆ ئەوە چوون کە ئەم ساتانە ساتەکەنی ڕۆژن، جا چوون بۆ مزگەوتیان لە بەرە بەیانەوە بەباش داناوە.

مالیك بۆ ئەوە چووە کە ئەو ساتانە بەشەکانی ساتێکن پێش لادانی خۆر لەناوەڕاستی ئاسماندا و دوای لادانی.

هەندێك ووتویانە: بەشەکانی ساتێکن پێش لادانی خۆر (زوال).

ئیبنو ڕوشد دەفەرموێت: ئەم بۆچوونە ڕاسترینیانە، لەبەر ئەوەی چوون بۆ جومعە لەدوای (زەوال) لادانی خۆر، واجبە.

**٧- هەنگاونان بەسەر نوێژکەراندا:**

(ترمذي) لە زانایانەوە ئەگێڕێتەوە کە هەنگاونانیان بەکەراهەت داناوە بەسەر خەڵکدا لە ڕۆژی هەینی، وە لەوبارەیەوە توند و تیژ بوون، لە عبدالله ی کوڕی بوسرەوە هاتووە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێکی هەینی ووتاری ئەدا، کابرایەك هات هەنگاوی ئەنا بەسەر خەڵکدا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (إجلِس فَقَد آذَيتَ وَآنَيتَ) (رواه أبوداود والنسائي وأحمد وصححه ابن خزيمة وغيره). واتە: دانیشە، دووا ئەکەویت و ئازاری خەڵکیش ئەدەیت.

بەڵام ئیمام جیا ئەکرێتەوە لەوە، ئەگەر هەنگاویش بنێ بەسەر خەڵکیدا قەیناکە، وە هەروەها کەسێك بۆشاییەك ببینێ لەبەردەم خۆیەوە بەو هەنگاونانە نەبێت نەیگاتێ، وە هەروەها

ئەوکەسانەی لەبەر پێویستی جێگاکەی خۆیان بەجێ هێشتووەو ئەیانەوێ بگەڕێنەوە شوێنی خۆیان بەمەرجێك ئازاری کەس نەدەن.

لە عوقبەی کوڕی (حارث)ەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە دەفەرمووێت: لەشاری مەدینە لەدوای پێغەمبەرەوە ﷺ نوێژی عەسرم ئەکرد، پێغەمبەر ﷺ بەپەلە هەستا هەنگاوی نا بەسەر خەڵکدا و چوو بۆ ماڵەوە، خەڵکەکە ترسیان لێ هات وتیان: ئەو پەلە پەلە چی بوو؟ کاتێ هاتەوە، بینی ئەو پەلەپەلەیان لا سەیر بوو، فەرمووی: (ذَكَرتُ شَيئاً مِن تِبرٍ كَانَ عِندَنَا، فَكَرِهتُ أن يَحبِسَنِي فَأمَرتُ بِقِسمَتِهِ) (رواه البخاري والنسائي). واتە: وەبیرم هاتەوە، هەندێ زێڕی دانەڕێژراومان لایە حەزم نەکرد بەندم بکات بۆیە فەرمانم دا بەدابەش کردنی.

**٨- لەپێش نوێژی هەینییەوە نوێژی سوننەت شەرعییە:**

نوێژی سوننەت پێش نوێژی هەینی سوننەتە هەتا ئەوکاتەی ئیمام دێتە سەر مینبەر، جا کاتێ گەیشتە سەر مینبەر واز لەنوێژکردن بهێنرێت، نوێژی سڵاوی مزگەوت (تحية المسجد) نەبێت، بۆ ئەوکەسانەی تازە دێنە ناو مزگەوت، وە ئەم نوێژە کاتی (خطبه) ش ئەکرێت، بەڵام کاتی (خطبة) بەکورتی بکرێت، بەڵام ئەگەر کەسێك ئەوەند درەنگ بچێت بۆ مزگەوت کە دووا کاتەکانی ووتار بێت بەشێوەیەك ماوە نەمێنێ دوو ڕکات نوێژی تێدا بکرێت، ئەوکاتە ناکرێت.

أ- لە ئیبنوعومەرەوە هاتووە کە ئەو پێش نوێژی هەینی نوێژی زۆر ئەکرد، بەڵام دوای نوێژی هەینی دوو ڕکاتی ئەکرد، وە ئەیفەرموو: پێغەمبەر ﷺ بەوشێوەیە بووە (ئەبوداود گێراویەتییەوە[١]).

ب- لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَنِ اغتَسَلَ يَومَ الجُمُعَةِ ثُمَّ أتى الجُمُعَةَ فصلى مَا قُدِّرَ لَهُ، ثُمَّ أنصَتَ حتى يَفرُغَ الإمَامُ مِن خُطبَتِهِ، ثُم يُصَلِّيَ مَعَهُ،

(١) منیش ئەڵێم ئیسنادەکەی صحیحە، بەڵام لەلای ئەبو داود لەدوای ئەوە کە ئەفەرمووێت: لە دوای نوێژی جومعە دوو ڕکات ئەکات، ئەوەی تێدایە کە لەماڵەوە ئەیکرد، وە لە مزگەوتدا نوێژی نەئەکرد، وە هەر ئەوەش لە پێغەمبەرەوە ﷺ سابت بووە، هەروەك چەند ریوایەتێکی تر لەمەودووا لە کتێبەکەدا ئەوە ئەگەیەنن.

بەڵام نوێژەکەی ئیبنوعومەر کە لە پێش نوێژی جومعەدا ئەیکرد، ئەوە هەر لەسەر خۆی مەوقوفە (واتە پێغەمبەر ﷺ بۆخۆی نەیکردووە) هەروەك ئەبو شامە لە کتێبی (الباعث على إنكار البدع والحوادث)دا ڕونی کردۆتەوە، وە هەروەها ئیبنوقەییم لە (زاد المعاد) دا و جگە لەو دووانەش باسیان کردووە، وە لە کتێبەکەدا قسەی ئیبنوتەیمییەش دێت کە پێش نوێژی جومعە سوننەتی نییە، جا سەیری بکە، وەهەروەها بگەڕێوە بۆ نامیلکەکەی من (الأجوبة النافعة). (تمام المنة).

غُفِرَ لَهُ مَا بَينَهُ وَبَينَ الجُمُعَةِ الأُخرى، وَفَضلَ ثَلاثَةِ أيَّامٍ) (رواه مسلم). واته: هەرکەس ڕۆژی هەینی خۆی شۆری و چوو بۆ نوێژی هەینی، بەپێی توانای ئەوەندەی خوا بۆی دانابوو نوێژی کرد، لەپاشاندا گوێی لەئیمام گرت هەتا لەووتارەکەی ئەبێتەوە، لەپاشاندا نوێژەکەی لەگەڵ کرد، خوا لەگوناهی ئەو هەینی‌یە هەتا هەینی‌یەکی ترو سێ ڕۆژیش زیادەی ئەبووری.

ج- لە جابیرەوە هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێکی هەینی ووتاری ئەدا لەوکاتەدا کابرایەك خۆی کرد بەناو مزگەوتدا، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (نوێژت کرد؟) ووتی: نا، فەرمووی: (هەڵسە دوو ڕکات نوێژ بکە). (رواه الجماعة).

لە ریوایەتێکی تردا هاتووە فەرموویەتی: (إذَا جَاءَ أحَدُكُم يَومَ الجُمُعَةِ وَالإمَامُ يَخطُبُ، فَليَركَع رَكعَتَينِ وَليَتَجَوَّز فِيهِمَا) (رواه أحمد ومسلم وأبوداود). واته: کاتێ کەسێکتان هات بۆ مزگەوت و ئیمام ووتاری ئەدا، با دوو ڕکات نوێژ بکات پێش ئەوەی دابنیشێت بەڵام بە کورتی بیکات.

وە لە ریوایەتێکی تردا هاتووە: (إذَا جَاءَ أحَدُكُم يَومَ الجُمُعَةِ وَقَد خَرَجَ الإمَامُ فَليُصَلِّ رَكعَتَينِ) (متفقٌ عليه). واته: کاتێ کەسێکتان ڕۆژی هەینی دێتە مزگەوت و ئیمام هاتبووە مزگەوت با دوو ڕکات نوێژ بکات.

**٩- جێگە گۆڕین لە کاتی خەو هاتندا:**

هەرکەس خەو زۆری بۆ هێنا واباشە لەشوێنەکەی خۆیەوە بچێت بۆ شوێنێکی تر، چونکە جولاندن خەو ئەزڕێنێ، وە ئەبێتە هۆی بەئاگابوون، جا ڕۆژی هەینی بێت یا ڕۆژێکی تر.

لە ئیبنوعومەرەوە هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذَا نَعَسَ أحَدُكُم وَهُوَ فِي المَسجِدِ فَليَتَحَوَّل مِن مَجلِسِهِ ذَلِكَ إلى غَيرِهِ) (رواه أحمد وأبوداود والبيهقي والترمذي وقال: حديثٌ حسن صحيح). واته: کاتێ کەسێکتان لەمزگەوتدا دانیشتبوو، و خەو زۆری بۆ هێنا با لەو شوێنەی دانیشتووە بچێتە شوێنێکی تر.

## واجبیتی نوێژی هەینی

زانایان هەموو ئیجماعیان هەیە لەسەر ئەوی کە نوێژی هەینی فەرزی عەینە، وە دوو ڕکاتیشە بەپێی فەرموودەی خوای گەورە کە فەرموویەتی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِىَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلۡبَيۡعَۚ ذَٰلِكُمۡ

﴿خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ (الجمعة/٩). واتە: ئەی ئەوكەسانەی كە باوەڕتان هێناوە كاتێ ڕۆژی هەینی بانگەواز ئەكرێت بۆ نوێژ، بەرەوپادی خوا ـ گوێ گرتن لە خوتبە ـ بڕۆن و واز لەكڕین و فرۆشتن بهێنن، چونكی ئەوە خێری تێدایە بۆتان ئەگەر بزانن.

١- وە بەپێی ئەوەی بوخاری و موسلیم لە ئەبو هورەیرەوە ئەگێڕنەوە دەفەرموێت: خۆم لە پێغەمبەرم ﷺ بیستووە فەرموویەتی: (نَحنُ الآخِرُونَ السَّابِقُونَ يَومَ القِيَامَةِ، بَيدَ أنَّهُم أوتوا الكِتَابَ مِن قَبلِنَا وَأوتِينَاهُ مِن بَعدِهِم، ثُمَّ هَذا يَومُهُمُ الَّذي فُرِضَ عَلَيهِم، فَاختَلَفُوا فِيهِ فَهَدَانَا اللهُ، فَالنَّاسُ لَنَا فِيهِ تَبَعٌ؛ اليَهُودُ غَداً وَالنَّصَارى بَعدَ غَدٍ). واتە: ئێمە لەزەماندا لەدوا ئەوانیشەوە هاتووین، كەچی ڕۆژی دوایی لەپێش خەڵكەوە قەزاوەت ئەكرێ لەبەینماندا، هەرچەندە ئەوان پێش ئێمە كتێبی خواییان (كە تەوڕات و ئینجیلە) بۆ هاتووە، وە ئێمە دوای ئەوان (قورئانمان) بۆ هاتووە، پاشان ئەوە (واتە: ڕۆژی هەینی) ئەو ڕۆژەیە كە بە گەورە گرتنەكەی لەسەر ئەوانە فەرز بووە بەڵام نەیان كردووە، وە چەند بەرەكێ بوون تێیدا، جا خوا ڕێنمایی ئێمەی كرد بۆی، كەواتە خەڵك شوێنكەوتەی ئێمەن لەوەدا؛ جولەكە بەیانی و گاور دوو بەیانی (واتە: جولەكە شەممە بەگەورە ئەزانن و گاور یەك شەممە).

٢- لە ئیبنومەسعودەوە هاتووە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ بەوانەی لەنوێژی هەینی دووا ئەكەوتن فەرمووی: (لَقَد هَمَمتُ أن آمُرَ رَجُلاً يُصَلِّي بِالنَّاسِ، ثُمَّ أُحرِقَ على رِجَالٍ يَتَخَلَّفُونَ عَنِ الجُمُعَةِ بُيُوتَهُم) (رواه أحمد ومسلم). واتە: وا بەدڵما هات بەپیاوێك بڵێم: بەرنوێژی خەڵكەكە بكا، و خۆشم بچم ماڵەكان بەسەر ئەو پیاوانەدا بسوتێنم كە لە نوێژی جومعە دووا ئەكەون.

لە ئەبو هورەیرەو ئیبنوعومەرەوە هاتووە كە خۆیان بیستویانە لە پێغەمبەر ﷺ كاتێ لەسەر كۆڵەكەكانی مینبەرەكەی بووە فەرموویەتی: (لَيَنتَهِيَنَّ أقوَامٌ عَن وَدَعِهِمُ الجُمُعَاتِ أو لَيَختِمَنَّ اللهُ على قُلُوبِهِم، ثُمَّ لَيَكُونُنَّ مِنَ الغَافِلِين) (رواه مسلم ورواه أحمد والنسائي من حديث ابن عمر وابن عباس). واتە: ئەوانەی وازیان لەنوێژی هەینی هێناوە كۆتایی دێنن بەوكارەیان، یا خوا مۆر ئەنێ بە دڵیاندا، پاشان لە بێ ئاگایان ئەبن.

٤- لە ئەبوجەعدی (ضمري)یەوە كە هاوەڵایەتی پێغەمبەری كردووە ﷺ هاتوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن تَرَكَ ثَلاثَ جُمَعٍ تَهَاوُناً طَبَعَ اللهُ على قَلبِهِ) (رواه الخمسة). واتە: هەركەس بەتەمەڵی و گوێ نەدان سێ هەینی نەچێت بۆ نوێژ خوا دڵی مۆر ئەكات.

ئەحمەدو ئیبنوماجە لە جابیرەوە حەدیسێكی لەو شێوەیە ئەگێڕنەوە وە ئیبنو سەكەن بەصەحیحی داناوە.

## کێ نوێژی هەینی لەسەرەو کێ لەسەری نی‌یە

نوێژی هەینی واجبە لەسەر موسڵمانی ئازادی عاقڵی پێ گەیشتووی نیشتەجێی بەتوانا بۆ چوون بۆ نوێژ، کە مەعزەرەتێکی وەهای نەبێت نەچوون بۆ نوێژی هەینی ڕەوا بکات.

بەڵام ئەوانەی نوێژی هەینیان لەسەر نی‌یە ئەمانەن:

**(١و٢) ئافرەت و منداڵ:**

ئەمانە زانایان لەسەری ڕێك کەوتوون.

**(٣) نەخۆش:**

ئەو نەخۆشەی چوون بۆ نوێژی هەینی لەسەر گران بێت، یا ترسی ئەوەی هەبێت بەچوون بۆ نوێژ نەخۆشی‌یەکەی زیاد بکات، یا چاك بوونەوەی دووا بخات، وە هەروەها ئەو کەسەش کە خزمەتی ئەکات و ئەچێتە پاڵ نەخۆشەکە بە مەرجێك ئەو نەخۆشە نیازی بەوکەسە ببێت.

لە (طارق) ی کوڕی شیهابەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الجُمُعَةُ حَقٌ وَاجِبٌ على كُلِّ مُسلِمٍ فِي جَمَاعَةٍ، إلا أربَعَةً: عَبدٌ مَملُوكٌ، أو امرَأةٌ أو صَبِيٌّ أو مَرِيضٌ) (قال النووي: إسناده صحيح على شرط البخاري ومسلم وقال الحافظ: صححه غير واحد) واتە: نوێژی هەینی هەق و واجبە لەسەر هەموو موسڵمانێکی پیاو بەجەماعەت بیکا جگە لە چوارکەس: بەندەی خاوەندار و ئافرەت و منداڵ و نەخوش.

**(٤) موسافیر:**

وە ئەگەر کاتی دەست پێ کردنی جومعە ئەو دابەزیبێت بۆ حەوانەوە بەشی زۆری زانایان ڕایان وایە کە جومعەی لەسەر نی‌یە، چونکە پێغەمبەر ﷺ سەفەری ئەکرد لە ڕۆژی جومعەدا و نوێژی جومعەی نەئەکرد، بەڵکو نوێژی نیوەڕۆو عەسری بەسەریەکەوە ئەکرد، لەکاتی نوێژی نیوەڕۆدا بەپێش خستن (جمع تقديم)، وە نوێژی هەینی‌یەکەی نەئەکرد، وە هەروەها خەلیفەکان و جگە لەوانیش بەوشێوە کاریان کردووە.

**(٥و٦) قەرزداری کەم دەست کاتێ ترسی بەند کردنی هەبێت لەسەر قەرزەکە، وە کەسێك کە لە حاکمی ستەمکار خۆی شاردبێتەوە:**

لە ئیبنو عەبباسەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتووە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن سَمِعَ النِّدَاءَ فَلَم يُجِبهُ فَلا صَلاةَ لَهُ إلا مِن عُذرٍ، قَالُوا: يَا رَسُولَ الله وَمَا العُذرُ؟ قَالَ: خَوفٌ

**أو مَرَضٌ) (رواه أبوداود بإسنادٍ صحيح[1]). واته: هەرکەس گوێ بیستی بانگ بوو نەچوو بە دەمیەوە نوێژی دروست نیەیە، مەگەر کەسێك نەبێت کە مەعزەرەتی هەبێت، ووتیان: ئەی نێرراوی خوا مەعزەرەت چیەیە ؟ فەرمووی: ترس یا نەخۆشی.**

---

(١) منیش ئەڵێم: دوو هەڵەی تێدایە، یەکەم ئیسنادەکەی ئەبیداود ڕاست نیەیە چونکە ئەبا جەنابی تێدایە کە لاوازەو (مدلس)ە، وە ریوایەتەکەی بە موعەنعەنی هێناوە هەروەك (حافظ) لە التلخیص دا وادەڵێت، وەهەروەها مونزریش لە (مختصر السنن)دا بەلاوازی داناوە.

دووەم: ئەو زاراوەیە هی ئەبوداود نیەیە، بەڵکو لە دوو ریوایەت تێکەڵ کراوە یەکێکیان ئەوەیە: (مَن سَمِعَ المُنَادِيَ فَلَم يَمنَعهُ مِن اتِّبَاعِهِ عُذرٌ - قالُوا: وَمَا العُذرُ قَالَ: خَوفٌ أو مَرَضٌ - لَم تُقبَل مِنهُ الصَّلاَةُ الَّتِي صلى) واتە: هەرکەس گوێی لە بانگ بوو وە هیچ بەهانەیەکی نەبوو بۆ نەچوون -ووتیان: بەهانە چیەیە؟ فەرمووی ترس یان نەخۆشی- ئەوە ئەو نوێژەی کە کردوویەتی لیێ وەرناگیرێ، وە هەر بەو زاراوەیە و سەنەدە (دارقطني) تەخریجی کردووە، وە هەروەها حاکم لە ریوایەتێکدا.

و ریوایەتەکەی تر زاراوەکەی ئەمەیە: (مَن سَمِعَ النِّدَاءَ فَلَم يُجِبهُ، فَلا صَلاَةَ لَهُ إلا مِن عُذرٍ) واتە هەرکەس گوێی لە بانگ بێت و بەدەنگیەوە نەچێت بەبێ هیچ بەهانەیەك، ئەوە نوێژەکەی وەرناگیرێت، ئیبنوماجە و جگە لەوتەخریجیان کردووە، وەهەروەها حاکمیش تەخریجی کردووە و ووتویەتی: صەحیحە لەسەر مەرجی شەیخەین.

وە من پێم وایە دانەر ئەم تێکەڵ کردنەی لا پەسەند نیەیە لە نێوان دوو ریوایەتدا، بەتایبەتی یەکیان صەحیحە و ئەوی تریان زەعیف، و ئەوەی پاڵی پێوە نابێت بۆ ئەوکارە شوێن کەوتن و نەگەڕانەوەیە بۆ ئەو ئەصڵانەی کە حەدیسەکەی لێ وەرگیراوە.

**ئاگاداری!**

ئەم حەدیسە دانەر تەنها لە بابی جومعەدا باسی کردووە، وە ئەبووایە لە باسی نوێژی جەماعەتیشدا بیهێنایە، لەبەر ئەوەی زاراوەی بانگ دان -کە لە حەدیسەکەدا هاتووە- جومعە و جەماعەت بەیەکەوە ئەگرێتەوە، جا هەر لەسەر ئەوە ئەڵێین:

حەدیسەکە هەروەك دەلالەت ئەکاتە سەر واجبێتی نوێژی جومعە، وە ئەوەی کە دروست نیەیە لیێ دوا بکەون، هەر بەو شێوەیەش دەلالەت ئەکاتە سەر واجبێتی نوێژی جەماعەت، وە ئەوەی کە دروست نیەیە بە بێ بەهانە دووا بخرێت، جا ئەمەش بەڵگەیە بەسەر دانەرەوە چونکە لەوێدا باسی کردووە کە نوێژی جەماعەت سوننەتێکی موئەککەدەیە، ئەویش لەبەر ئەوەی کە حەدیسەکە بە صەراحەت بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە نوێژی جەماعەت دروست نیەیە بچوێنرێت، بەبێ هیچ مەعزەرەتێك، وە ئەم حوکمە بۆ سوننەت نیەیە، چونکە سوننەت بەبێ مەعزەرەتیش دروستە تەرك بکرێت، و تەنها ئیکیتیفا بە بەجێهێنانی نوێژە فەرزەکان بکرێت.

هەروەك چۆن ئیقرار کردنەکەی پێغەمبەر ﷺ لەسەر کابرای بیابان نشینێن ئەو قسەیەی ئێمە ئەگەیەنێت، کە ووتی: سوێند بە خوا نە لیێیان زیاد ئەکەم و نە لیێیان کەم ئەکەم، پێغەمبەریش ﷺ ئیقراری لەسەر کرد و

فەرمووی: چۆتە بەهەشتەوە ئەگەر ڕاست بکات، جا بەوە سابت ئەبێت کە نوێژی جەماعەت واجبە و دروست نىیە تەرك بکرێت.

وە ئەما لێکدانەوەی هەندێك لە زانایان بۆ ئەم بەشەی حەدیسەکە، کە ئەفەرموێت: (فلا صلاة له) واتە: نوێژەکەی وەرناگیرێ، کە ئەڵێن: مانای ئەوەیە نوێژەکەی بەتەواوی لێ وەرناگیرێ، ئەوە ئەگەر مەبەستیان ئەوە بێت کە بڵێن: واجب نىیە هەروەك واش دەرئەکەوێت، ئەوە ئەو مانا کردنەوەیە لە دوو ڕووەوە باتڵە:

یەکەم: پێغەمبەر ﷺ لە دوای ئەو قسەیە فەرموویەتی: مەگەر لەبەر مەعزەرەتێك نەبێت، ئەوەش بۆ غەیری واجب ناوترێ، هەروەك لەپێشەوە باس کرا.

دووەم: ئەم لێکدانەوەیە لە شەرعدا نەناسراوە بەوشێوەیە، هەروەکو شێخی ئیسلام ئیبنوتەیمیەیە ڕەحمەتی خوای لێ بێت لەوبارەیەوە کۆڵاوەتەوە، و قەیناکە ئەگەر قسەکەی نەقڵ بکەم لەبەر گرنگی ئەو باسە. جا لە کتێبی (القواعد النورانية ص٢٦) دا ئەفەرموێت:

ئەما ئەوەی کە خەڵك دەیڵێن کە مەبەستی پێغەمبەر ﷺ ئەوە بووە تەواوی نوێژەکەی بۆ نىیە ئەوە وەك ئەوە وایە کە فەرموویەتی: دراوسێی مزگەوت نوێژی دروست نىیە لە مزگەوتدا نەبێت —هەرچەندە ئەم حەدیسە ئیسنادێکی سابتی نىیە- لە وەڵامدا ئەڵێین: بەڵێ مەبەست نەمانی تەواوی نوێژەکەیە، بەڵام ئایا مەبەستی نەمانی تەواوی واجبەکانە یا مەبەستی نەمانی تەواوی پەسەند کراوەکانە کە لەو نوێژەدا هەیە؟ جا قسەی یەکەم ڕاستە، بەڵام قسەی دووەم باتڵە، و هەرگیز شتی ئاوها نە لە فەرموودەی خوای گەورەدا هەیە، و نە لە فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ، وە قسەی واش حەق نىیە، چونکە ئەگەر شتێك واجباتەکانی تەواو بێ چۆن نەبێت بووترێت کە تەواو نىیە؟ وە هەروەها ئەگەر ئەو قسەیە وابووایە، ئەوە دروست بوو نوێژی هەموو پێشکەوتوو و دووا کەوتووەکان لابچێت و نەمێنێ، لەبەر ئەوەی تەواویێتی پەسەند کراوەکان لە دەگمەنترین شتە.

جا لەبەر ئەوەی هەرچی لە کیتاب و سوننەتداهاتووە لە نەفی ونەمانی کردەوەکان ئەوە مەبەست پێی نەمانی هەندێك لە واجبەکانییەتی.

هەروەك فەرمودەی خوای گەورە: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ﴾ واتە سوێند بەپەروەردگارت ئەوانە ئیمان دەرنابەن هەتاوەکو تۆ نەکەنە داوەر لە نێوان ناکۆکی نێوان خۆیاندا.

هەروەها کە فەرموویەتی: ﴿وَيَقُولُونَ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ﴾ واتە: ئەوانە ئەڵێن بڕوامان بە خوا و بە پێغەمبەر هێناوە لەپاشان پشت هەڵ ئەکەن لە دوای ئەو قسەیە، وە ئەوانە باوەڕدار نین. وە نموونەی ئەو دووانەش زۆرن.

وە وەك ئەو نمونانە فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ: (لا إِيمَانَ لِمَن لا أَمَانَةَ لَهُ) واتە ئەوکەسەی ئەمانەتی نەبێت ئیمانی نىیە.

وەهەروەها: (لا صَلاةَ إلا بِفَاتِحَةِ الكِتَاب) واتە: نوێژ بەبێ فاتیحە دروست نىیە.

**(٧) هەموو خاوەن عوزرێك رێی پێ دراوە واز لە نوێژی جەماعەت بهێنێت.**

وەك مەعزەرەتی باران و قوڕو لیتەو سەرماو وێنەی ئەمانە:

لە ئیبنوعەبباسەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە کە لە ڕۆژێکی بارانیدا بەبانگ بێژەکەی ئەفەرموو: کاتێ ووتت: (أشهَدُ أنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ الله) مەڵێ: (حَيَّ على الصَّلاة) بەڵکو بڵێ: (صَلُّوا فِي بُيُوتِكُم) لە ماڵەکانتان نوێژ بکەن، جا وەك ئەوەی خەڵکەکە بەدڵیان نەبوبێت، بۆیە فەرموی: ئەوکەسەی لە من چاکترە ئەوەی کردووە، بەڕاستی نوێژی هەینی فەرزێکە وە من لام ناخۆشە بتانهێنمە دەرو بەناو قوڕو لیتەدا بڕۆن.

لە ئەبو مولەیحەوە لە باوکیەوە هاتووە دەفەرموویت: خۆم پێغەمبەرم ﷺ بینیوە ڕۆژی هەینی باران ئەباری ژێری نەعلی تەڕ نەئەکرد فەرمانی ئەکرد خەڵك لەشوێنی خۆیاندا نوێژ بکەن، (ئەبوداود و ئیبنوماجە گێڕاویانەتەوە)[1].

هەموو ئەوانەی باسمان کردن نوێژی جومعەیان لەسەر نیە، بەڵکو لەسەریانە نوێژی نیوەڕۆ بکەن، وە هەرکەس لەوانە نوێژی هەینی بکات دروستە، وە نوێژی نیوەڕۆی لەکۆڵ ئەکەوێت. وە ئافرەتان ئامادەی مزگەوت ئەبوون و لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ نوێژی جومعەیان ئەکرد[1].

---

وە هەروەها (مَن سَمِعَ النِّدَاءَ ثُمَّ لَم يُجِب مِن غَيرِ عُذرٍ فَلا صَلاةَ لَهُ) واتە هەرکەس گوێی لە بانگ بێت لەپاشان بەبێ مەعزەرەت بە دەنگیەوە نەچێت نوێژەکەی دروست نیە.

ئەوش گومانی تێدا نیە کە جواب دانەوەی بانگەوازی بانگبێژ کە بۆ نوێژ بانگ ئەدات لە واجبەکانە.

بەڵام ئایا ئەگەر ئەو واجبە تەرك بکات سزا ئەدرێت لەسەری، وە ئەگەر ئەنجامی بدات ئایا پاداشتی بۆ هەیە.

یان ئەوەترێت: نوێژەکەی باتڵە و ئەبێت بیگێڕێتەوە هەروەك ئەوەی نەیکردبێت وایە.

ئەمەش کێشەی لەسەرە لەنێوان زانایاندا- تەواو بوو.

منیش ئەڵێم: شێخی ئیسلام لە کتێبی تردا ئەوەی هەڵبژاردووە کە نوێژەکەی باتڵە بەڵام ئێمە ئەڵێین: باتڵ نیە. بەپێی ئەو حەدیسەی کە باسی فەزڵی جەماعەت ئەکات، هەروەك لە باسی نوێژی جەماعەتدا ڕوونمان کردۆتەوە، وە لەبەر ئەوەی شێخی ئیسلام دروستێتی تەرك کردنی تەنها بە مەعزەرەت داناوە. ـ لەبەر ئەوە ئەگەر کەسێك نوێژی جەماعەت بەبێ مەعزەرەت تەرك بکات ئەوە لای شێخی ئیسلام نوێژەکەی باتڵە ـ ئەم بۆچوونەش لای من نەسەلمێنراوە (تمام المنة).

(١) ئەو سیاقە لای ئەبوداودە بەڵام ئەم زیادەیەی لەسەرە کە ئەڵێت: (ڕۆژی حودەیبیەیە) وە ئەمە لای ئیبنوماجەش هەیە، ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێت بەسەرهاتەکە لەسەفەردا بووە، هەروەکو بەیهەقی لە ریوایەتێکی دا باسی کردووە. وەك ئاشکرایە سەفەر نوێژی هەینی تێدا ناکرێت، کەواتە (حدیث)ەکە بەڵگەیە کە باران بەهانە نیە بۆ نەچوون بۆ نوێژی جومعە بەڵکو بۆ جەماعەت (تمام المنة).

## کاتی نوێژی هەینی

جومهوری صەحابەو تابعین بۆ ئەوە چوون کە کاتی نوێژی هەینی ئەوکاتەیە، کە نوێژی نیوەڕۆی لێوە دەست پێ ئەکات.

بەپێی ئەوەی ئەحمەدو بوخاری و ئەبوداود و (ترمذي) و بەیهەقی لەئەنەسەوە خوای لێ ڕازی بێت ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ ئەوکاتەی خۆر لەناوەڕاستی ئاسمان لای ئەدا نوێژی هەینی ئەکرد.

وە لای ئەحمەد و موسلیم هاتووە کە سەلەمەی کوڕی ئەکوەع فەرمویەتی: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ئەوکاتەی خۆر لای ئەدا لەناوەڕاستی ئاسمان نوێژی هەینیمان ئەکرد، کاتێ لەنوێژ ئەبووینەوە و ئەگەڕاینەوە بە بن سێبەری خانووەکاندا ئەڕۆیشتینەوە.

بوخاری فەرمویەتی: کاتی نوێژی هەینی ئەوکاتەیە خۆر لەناوەڕاستی ئاسمان لائەدا، وە هەروەها ئەوە ریوایەت کراوە لە عومەرو عەلی و نوعمانی کوڕی بەشیر و عومەری کوڕی (حريث)یشەوە خوایان لێ ڕازی بێت.

شافیعی دەفەرموێت: پێغەمبەر و ئەبوبەکر و عومەر و (عثمان) و پێشەواکانی دوای ئەوانیش هەموو نوێژێکی هەینی‌یان دوای لادانی خۆر لەناوەڕاستی ئاسمان کردووە.

حەنبەلی‌یەکان و ئیسحاق بۆ ئەوە چوون کە کاتی نوێژی هەینی لەسەرەتای نوێژی جەژنەوە دەست پێ ئەکات هەتا دوواکاتی نوێژی نیوەڕۆ، بەڵگەشیان ئەوەیە کە ئەحمەد و موسلیم و نەسائی لەجابیرەوە گێڕاویانەتەوە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ نوێژی هەینی بۆ ئەکردین لەپاشاندا ئەڕۆیشتین ووشترەکانمان پاڵ ئەخست، ئەوکاتەی ڕۆژ لەناوەڕاستی ئاسمان لای ئەدا، ئەمەش ئەوە دەرئەخات پێش لادانی خۆر (زوال) نوێژی هەینی‌یان کردووە.

هەروەها بەڵگەیان حەدیسەکەی عبدالله ی کوڕی (سیدان)ی سولەمی‌یە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموێت: ئامادەی نوێژی هەینی بووم لەگەڵ ئەبوبەکردا، ووتارو نوێژەکەی پێش نیوەڕۆ بوو لەپاشاندا لەگەڵ عومەردا ئامادە بووم، ووتار و نوێژەکەی من ئەڵێم: کاتێ بوو ڕۆژ دوولەت بوبو، پاشان لەگەڵ (عثمان)دا ئامادەی بووم ووتارو نوێژەکەی من ئەڵێم: کاتێ بوو ڕۆژ لەناوەڕاستی

---

(١) دروست نی‌یە کەسێك نوێژی جومعە بکات دوایی نوێژی نیوەڕۆش بکات بەڕای هەموو زانایان، چونکە نوێژی هەینی لەشوێنی نوێژی نیوەڕۆیەو جێی ئەگرێتەوە، وە خوا شەش نوێژی فەرزی بۆ دانەناوین، جا هەرکەس ڕێی ئەوە بدات پاڵپشتی نی‌یە نە بەعەقڵ نەبەنەقڵ نە لەکیتاب نە لەسوننەت، نە لەڕای کەسێك لەپێشەواکان (دانەر).

ئاسمان لای دابوو، کەسیشم نەئەبینی ئینکاری کردبێت، یا عەیبی لیّ گرتبێت. (دارقطني) گێراویەتی‌یەوە.

ئیمام ئەحمەدیش لە ریوایەتەکەی عبدالله ی کوڕیدا، کردویەتی‌یە بەڵگەو فەرمویەتی: هەروەها ریوایەت کراوە لە ئیبنومەسعودو جابیر و سەعیدو موعاویەوە کە هەموویان پێش لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان نوێژی هەینی‌یان کردووە و کەسیش ئینکاری نەئەکرد لەو کارەیان، ئیتر وەك ئیجماع وابووە.

جومهوری زانایان حەدیسەکەی جابیر دائەنێن لەسەر زیادەڕەوی‌و پەلەکردن لەنوێژ دوای (زوال) لادانی خۆر، بیّ ئەوەی فێنکی دابێت، واتە: چاوەڕوانی بکرێت هەتا گەرما تینی نامێنیّ، وە ووتویانە: نوێژەکە و پاڵ خستنی ووشترەکانی لەدووای لادانی خۆر بوو، هەروەها وەڵامی ئەسەرەکەی عبدالله ی کوڕی سیدانیان داوەتەوە بەمە کە زەعیفە، (حافظ) ئیبنوحەجەر دەفەرمووێت: عبدالله ی کوڕی سیدان تابیعی‌یەکی گەورەیە عەدالەتی نەزانراوە. وە ئیبنوعەدی دەفەرمووێت: لە نادیار ئەچێت. وە بوخاری دەفەرمووێت: حەدیسەکەی کاری پیّ ناکرێت، چونکە لەو بەهێزتر بەرەنگاری وەستاوە، چونکە ئیبنو ئەبی شەیبە لە سوەیدی کوڕی غەفلەوە ئەگێڕێتەوە، کەخۆی لەگەڵ ئەبوبەکرو عومەردا کاتێك خۆر لای‌داوە نوێژیان کردووە، وە ئیسنادەکەی (قوي)ە[1].

---

(١) سوەید ڕاست ئەکات ڕەحمەتی خوای لەسەربێت، بەڵام حافظ و ئەوکەسانەی بە شوێنیدا ڕۆیشتوون وەك دانەر وە کەسانی پێش دانەر وەك شەوکانی (٣/٢٢١) بەهەڵەدا چوون لەوەدا کە بەڵگەیان بەم ئەسەرە هێناوەتەوە لەم باسەدا، چونکە لەم ئەسەرەدا هیچ باسێکی نوێژی هەینی تێدا نی‌یە نە بە ئاماژە کردن نە بە صەراحەت؟، ئەم باس کردنەش هەر لە باس کردنی حافظ بووەو لەوەوە هێناویانە وەك لە فەتحدا هەیە (٢/٣٨٧)، ئەمەش لەو هەڵە سەیرانەیە کە (حافظ) کردویەتی، وە من ناتوانم بیر بکەمەوە کە ئەم هەڵەیە لە یەکێکی وەك (حافظ) ەوە دەوەشێتەوە، چونکە ئەم ئەسەرە هیچ پەیوەندی‌یەکی بێرەوە نی‌یە بەڵکو پەیوەندی بە نوێژی نیوەڕۆوە هەیە، هەر بەو شێوەیەش ئیبنوئەبی شەیبە باسی کردووە، کە بە سەنەدێکی صەحیح لە مەیمونی کوڕی میهرانەوە تەخریجی کردووە کە: سوەیدی کوڕی غەفلە نوێژی نیوەڕۆی لە کاتی لادانی خۆر لەناوەڕاستی ئاسماندا ئەکرد، جا حەججاج بۆی ڕاسپارد کە نوێژەکانمان پێش مەخە، سوەیدیش ووتی: من لەگەڵ ئەبوبەکر و عومەردا هەر بەو شێوەیە نوێژم کردووە، وە مردن بۆ من نزیکترە لەوەی کە دەستی لیّ هەڵبگرم.

ئیبنوئەبی شەیبە لە بەشی: (هەرکەسێك نوێژی نیوەڕۆ بکات لەوکاتە کە خۆر لەناوەڕاستی ئاسمان لائەدات و چاوەڕووانی فێنك بوون نەکات) هێناویەتی (١/٣٢٢-٣٢٣).

## ژمارەی ئەوکەسانەی نوێژی هەینی‌یان پێ پێك دێت:

جیاوازی نی‌یە لەنێوان زانایاندا لەسەر ئەوەی کە جەماعەت کردنی نوێژی هەینی مەرجێکە لە مەرجەکانی دروستی نوێژی هەینی، بەپێی ئەوەی (طارق)ی کوڕی شیهاب ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الجُمُعَةُ حَقٌّ وَاجِبٌ على كُلِّ مُسلِمٍ فِي جَمَاعَةٍ) واتە: نوێژی هەینی ڕاستەو واجبە لەسەر هەموو پیاوێکی موسڵمان بە جەماعەت.

بەڵام جیاوازن لەسەر ئەو ژمارەیەی نوێژی هەینی پێ پێك دێت، هەتا پانزە بۆچوون هەیە لەسەری، (حافظ) لە (الفتح) دا باسی کردوون.

بەڵام ڕای هەڵبژێردراو (راجح) ئەوەیە کە بە دووکەس و بەرەو ژوور پێك دێت، بەپێی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الإثنَانِ فَمَا فَوقَهُمَا جَمَاعَةٌ) واتە: لە دووان و بەرەوژوور جەماعەتن[1].

---

جا کاتێك ئەوەت زانی، کەواتە ئەو بەرەنگاری‌یە ڕاست نی‌یە کە ئیدعا کراوە، بەڵام (حافظ) لە دوای ئەوە چەند ئەسەرێکی تری هەر بەو مەعنایە باس کردووە، لە عومەر و جگە لەوەوە لە صەحابەکان، بەڵام ئەوەی ڕاست بێت ئەوەیە کە هیچ (تعارض) بەرەنگاری‌یەك نی‌یە لە نێوان ئەم ئەسەرانە و ئەسەرەکەی ئیبنوسیدان، هەروەکو چۆن (تعارض) نی‌یە لە نێوان ئەو حەدیسانەی کە موافقی ئەم ئەسەرەن، چونکە هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ هەردوو فەرمانەکەیان لە پێغەمبەرەوە ﷺ وەرگرتووە، جا لەسەر ئەو شێوەیە بوون کە پێغەمبەر ﷺ لەسەری بووە، جارێك ئەمیان ئەنجام ئەدا و جارێکیش ئەویان، هەروەك باسم کردووە لە نامیلکەکەمدا (الأجوبة النافعة) و ئەو حەدیسە مەرفوعانەم تێدا تەخریج کردووە، وە هەروەها ئەو ئەسارانەی کە لەسەر صەحابەکان مەوقوف بوون لە هەردوو باسەکەدا، و ئەم نامیلکەیەش چاپ بووە جا هەرکەس پێی خۆش بێت با بگەڕێتەوە بۆی.

یەك شت ماوە باسی بکەین ئەویش ئەوەیە دانەر جەزمی بەوە کردووە کە ئەسەرەکەی ئیبنوسیدان زەعیفە و بە قسەی ئیبنوحەجەریش تەنبیهی کردووە.

منیش لە نامیلکەی باس کراودا ڕەدم داوەتەوە، بەڵام کورتەکەی ئەوەیە کە چوار کەسی سیقە لێیان گێڕاوەتەوە، وە ئیبنوحیببانیش لەناوەندی سیقەکاندا باسی کردووە (٥/٣١) و من لێرەدا ئەمەشی پێ زیاد ئەکەم: عیجلیش هەروەها لەناوەندی سیقەکاندا باسی کردووە (٢٥٨/٨٢٠).

لەپاشاندا ئەڵێم:

ئیبنوسەیدان حەدیسەکانی حەسەنە لەلای هەندێك لە زانایان، وەکو ئیبنورەجەب و کەسانی تر.

هەروەها (حافظ) یش هەروا ئەڵێت هەروەك باس کرا لە (ل٢٠٤-٢٠٧) والله أعلم.

(١) بەڵگەی پێ نایەتەوە لەبەر ئەوەی نەچەسپاوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ وەکو لە (الإرواء ٤٨٩) دا ڕوونم کردۆتەوە، وە هەروەها لە (المشكاة ١٠٨١) دا، و ئەوەی پشتی پێ ببەسترێ ئەوەیە کە دانەر باسی کردووە لە شەوکانی‌یەوە، جا

شەوكانی دەفەرمووێت: هەموو نوێژەكان بەپێی ئیجماع بەدووكەس پێك دێت، جا هەینیش هەر نوێژە، حوكمێكی تایبەتی نییە پێچەوانەی نوێژەكانی تر بێت، بەبوونی بەڵگە نەبێت لەسەری، وە بەڵگەش نییە كە ژمارەی كەسەكانی نوێژی هەینی زیاتر دانابێت لەنوێژەكانی تر.

(عبدالحق) دەفەرمووێت: لەسەر ژمارەی كەسەكانی نوێژی هەینی حەدیسی سابت نییە، هەروەها (سیوطي) دەفەرمووێت: لە هیچ كام لە حەدیسەكاندا سابت نییە ژمارەی دیاری كراو تایبەت كرابێت بەنوێژی هەینییەوە. تەواو.

وە لەوكەسانەی بۆ ئەوە چوون (طبري) و داود و نەخەعی و ئیبنوحەزمن.

## شوێنی نوێژی هەینی:

نوێژی هەینی لەشارو گوند و مزگەوت و ناوخانووی شارو ئەو دەشتاییەیەش كە سەر بەو شوێنانەن دروستە بكرێت، هەروەها دروستە لەشارێكدا جومعە لەچەندین شوێندا بكرێت، عومەر خوا لێی ڕازی بێت بۆ خەڵكی بەحرەینی نووسی لە هەرشوێنێك بوون لەوێ جومعە بكەن، (ئیبنوئەبی شەیبە گێڕاویەتییەوە) ئەحمەد دەفەرمووێت ئیسنادەكەی (جید)ە، ئەمەش شارو دێهات ئەگرێتەوە[1].

ئیبنوعەبباس دەفەرمووێت: یەكەم نوێژی هەینی كە لە ئیسلامدا كرا دوای ئەو نوێژی هەینییەی كە لە مزگەوتەكەی پێغەمبەردا لەشاری مەدینە كرا ئەو نوێژی هەینییە بوو كە لە گوندی (جواثی) لە بەحرەین كرا، (بوخاری و ئەبوداود گێڕاویانەتەوە).

---

بگەڕێوە بۆی لە (السیل الجرار ١/٢٩٧-٢٩٨) دا، چونكە باسێكی گرنگە لە شوێنی تردا دەستت ناكەوێت (تمام المنة).

(١) منیش ئەڵێم: (حافظیش) هەروەهای ووتووە لە فەتحدا (٤/٣٨٠) و شەوكانی بەدوای ئەودا هەرووای ووتووە (٣/١٩٨) وە ئەوەی شەوكانی گشتی ترە، چونكە خەڵكی سەر ئاوو كانیاوەكانیش ئەگرێتەوە، لەبەر ئەوەی ئیبنوئەبی شەیبەش ئەگێڕێتەوە لە دوای ئەم ئەسەرەی عومەرەوە ووتویەتی:

ئیبنوئیدریس لە مالیكەوە پێی ڕاگەیاندووم كە ووتویەتی: یارەكانی پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئەو ئاوانەی نێوان مەككە و مەدینە جومعەیان كردووە، و ئەسەرەكەی ئیبنوعومەریش پاڵ پشتی ئەكات كە لە كۆتایی ئەم بەشەدا دێت، وە لەو بارەیەوە ووتویەتی: عبد الرزاق بە سەنەدێكی صەحیح گێڕاویەتییەوە، بۆ زانستی زیاتر بگەڕێرەوە بۆ (تمام المنة).

له (لیث)ی کوڕی سەعدەوە هاتووە: خەڵکی میسرو کەنارەکانی لەسەردەمی عومەرو (عثمان)دا، بە فەرمانی ئەوان نوێژی هەینی‌یان کردووە و صەحابەشی تێدابووە.

له ئیبنوعومەرەوە هاتووە کە ئەو دانیشتووەکانی سەرئاوەکانی نێوان مەککە و مەدینەی ئەبینی نوێژی هەینی‌یان ئەکردو لۆمەی نەئەکردن، (عبدالرزاق بەسەنەدی صەحیح گێڕاویەتی‌یەوە).

## لێکۆڵینەوەی ئەو مەرجانەی زانایان دایان ناوە

لە پێشەوە باسمان کرد مەرجی واجب بوونی نوێژی هەینی بریتی‌یە لە نێرینەیی و ئازادی و تەندروستی و (إقامة) جێگیری و نەبوونی مەعزەرەتی ڕەواکەری نەچوون بۆ نوێژی هەینی، وە هەروەك باس کرا کە جەماعەت مەرجە بۆ دروستی نوێژی هەینی.

ئەمەیە ئەو ئەندازەیە کە لە سوننەتدا هاتووە و خواش داوای لێ کردووین، بەڵام ئەو مەرجانەی تر کە هەندێ لە زانایان دایان ناوە ئەوە هیچ ئەصڵێکیان نی‌یە کە گەڕانەوە بکرێ بۆ سەری و پشتی پێ ببەسترێ، وە لێرەدا تەنها ئەوە نەقڵ ئەکەین کە خاوەنی کتێبی (الروضة الندية) فەرمویەتی:

نوێژی هەینیش نوێژێکە وەك هەموو نوێژەکانی تر، هیچ جیاوازی نی‌یە لەگەڵیان، لەبەر ئەوەی شتێکی وا نەهاتووە جیای بکاتەوە.

لەم قسەیەدا ئاماژەیە بۆ ڕەددانەوەی ئەوەی کە ووتراوە: مەرجی واجب بوونی نوێژی هەینی بوونی پێشەوایەکی گەورە و شاری گەورە و ژمارەی تایبەتە، جا ئەم مەرجانە بەڵگەیەکی وایان لەسەر نی‌یە کە وا بگەیەنێ کە موستەحەب بن، سەرەڕای ئەوە واجب بن، وە سەرەڕای ئەوە کە هەر بەمەرج حیساب بکرێن، بەڵکو ئەگەر دووکەس نوێژی هەینی‌یان لەشوێنێکدا بەجێ هێنا، و ئەو شوێنە جگە لەوان کەسی تری تێدا نەبوو، ئەوە ئەودووانە کارێکیان کردووە کە واجب بووە لەسەریان بیکەن، جا ئەگەر یەکێکیان ووتاری خوێند ئەوە بە سوننەت کاریان کردووە، وە ئەگەر ووتاریشیان نەخوێند هەر سوننەتەو بەس، وە ئەگەر حەدیسەکەی (طارق) ی کوڕی شیهاب نەبووایە کە پێویست بوونی نوێژی هەینی لەسەر هەموو موسڵمانێك بەستۆتەوە بەوەی کە بە جەماعەت بکرێت، وە ئەگەر کردنی ئەو نوێژە لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ هەر بە جەماعەت نەبووایە، ئەوە کردنی بەتاکە کەسێك هەر دروست ئەبوو وەك نوێژەکانی تر.

ئەمما ئەوەی ئەگێڕنەوە کە گوایە پێغەمبەر ﷺ فەرموویێتی: (من أربعة إلى الولاة) واتە: بە چوارکەس و والی ئەکرێت، ئەوە زانایانی حەدیس بە صەراحەت ئەڵێن: ئەمە نە فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ و نە قسەی کەسێکە لە صەحابە، هەتا پێویست بێت واتاکەی ڕون بکرێتەوە، یا تەئویل بکرێت، بەڵکو ئەمە تەنها لە قسەکانی حەسەنی بەصریيە، وە هەرکەسێ سەرنجی ئەو قسەپوچ و ئەو بۆچوونە خوارە و ئەو ئیجتیهادە باتڵانە بدا کە کراوە لەبەرامبەر ئەم عیبادەتە بەرزەی کە خوا فەرزی کردووە لەسەر خەڵکی و لە گشت حەفتەیەکدا و کردوویەتی‌یە دروشمێ لە دروشمەکانی ئیسلام، ئەوە بەڕاستی سەری سوڕ ئەمێنێ.

کەسێك ئەڵێت: ووتارەکە لەجێی دوو ڕکاتە هەرکەس گوێی لە ووتارەکە نەبوو جومعەکەی دروست نی‌یە، کەئەڵێی ئەو حەدیسەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتووە پێی نەگەیشتووە، کە لە چەند ڕێگایەکەوە هاتووەو یەکتر بەهێز ئەکەن کە فەرموویەتی: (إنَّ مَن فَاتَتهُ رَكعَةٌ مِن رَكعَتَي الجُمعَةِ فَليُضِف إلَيهَا أُخرَى وَقَد تَمَّت صَلَاتُهُ) واتە هەرکەس فریای ڕکاتێکی جومعە نەکەوت، با ڕکاتێکی تر بکات، ئەوکاتە نوێژەکەی تەواوە. یان هیچ بەڵگەیەکی لەوبارەیەوە پێ نەگەیشتووە.

کەسێکی تر ئەڵێت: نوێژی هەینی بە سێ کەس و ئیمام نەبێت پێك نایەت، وە کەسێکی تر ئەڵێت: چوارو ئیمام، کەسێکی تر ئەڵێت: حەوت و ئیمام، وە ووتراوە بەنۆو ئیمام، وە کەسێکی تر ئەڵێت: دوانزەو ئیمام، وە کەسێکی تر ئەڵێت: بە بیست کەس، کەسێکی تر ئەڵێت: بە سی، وە کەسێکی تر ئەڵێت: بە چل کەس نەبێت پێك نایەت، وە ووتراوە بەپەنجا، وە کەسێکی تر ئەڵێت: بە حەفتا کەس نەبێت پێك نایەت، وە هەیە ئەڵێت: لەنێوان ئەو ژمارەیەدا، وە کەسێکی تر ئەڵێت: بەکۆمەڵێکی زۆر، بێ ئەوەی ژمارە دیاری بکات، وە هەیە دەفەرموێت: نوێژی هەینی لەشاری گەورەدا نەبێت دروست نی‌یە، وە هەیە سنوری داناوە بۆ ژمارەی دانیشتووان بە ئەوەندەو ئەوەندە هەزار کەس، وە کەسێکی تر ئەڵێت: ئەبێ ئەوشارە مزگەوتی گەورەو گەرماوێکی تێدا بێت، وە کەسێکی تر ئەڵێت: ئەبێ ئەوەو ئەوەی تێدا بێت، وە کەسێکی تر ئەڵێت: لەدوای پێشەوای گەورەوە (الإمام الأعظم) نەبێت دروست نابێت، جا ئەگەر ئەو ئیمامە نەبوو یا دادپەروەری‌یەکەی تێك چووبوو لە ڕوویەك لە ڕووەکانی‌یەوە، ئەوکاتە نوێژی هەینی واجب نی‌یە، وە وێنەی ئەم قسانە ئەڵێن کە هیچ بەڵگەیەکی عیلمی لەسەر نی‌یە، وە نە لە قورئان و نە لە سوننەتدا پیتێکیان تێدا نی‌یە بەڵگە بێت لەسەر ئیددعاکەیان، کە گوایە ئەمانەی باسیان کرد مەرجن بۆ دروستی نوێژی هەینی، یا فەرزێك بێت لە فەرزەکانی، یا پایەیێك بێت لە پایەکانی، ئەی خوایە ڕەئی چی کردووە بەم خەڵکە!! وە چ قسەی پوچ و بێ بایەخ لەمێشکیان دەردێنێ، کە لەو قسانە ئەچێ کە خەڵکی لە

کۆڕو مەجلیسەکانیاندا باسی ئەکەن، وە لە چیرۆك و داستانە هەڵبەستراوەکانیاندا ئەی گێڕنەوە، لەحاڵێکدا کە ئەوقسانە هەموویان لە شەریعەتی پاکەوە دوورن.

وە هەموو ئەوانەی شارەزان بە شەریعەتی قورئان و سوننەت ئەوە باش ئەزانن، هەروەها ئەوانەش کە ئینصافیان هەیەو ئەوانەش کە بەهۆی (قیل و قال) ووتی، ووتی، پیڕیان هەڵئەخلیسکاوە لەسەر ڕێگای هەق، وە هەرکەس شتی ناڕاستی هێنا ئەدرێتەوە بەڕوویدا، وە حوکمی نێوان خەڵك تەنها بە قورئان و سوننەت ئەکرێت، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ﴾ (النساء/٥٩). واتە: ئەگەر خیلاف و جیاوازیتان بو لە شتێکدا بیگێڕنەوە بۆلای خواو پێغەمبەر ﷺ.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا كَانَ قَوۡلَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحۡكُمَ بَيۡنَهُمۡ أَن يَقُولُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۚ﴾ (النور/٥١). واتە ئەوانەی بەڕاستی ئیمان دارن ڕەوشتیان وایە ئەگەر لە کێشەکانیاندا بانگ بکرێن بۆ ئەوەی خواو پێغەمبەر حوکم بکات لەنێوانیاندا ئەڵێن: بیستمان و گوێ ڕایەڵین.

هەروەها ئەفەرموێت: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيۡنَهُمۡ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَرَجٗا مِّمَّا قَضَيۡتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسۡلِيمٗا﴾ (النساء/٦٥). واتە: سوێند بەپەروەردگارت باوەڕدار نابن هەتا تۆ نەکەنە ناوبژیوان بۆ ئەو کێشانەی ڕوی داوە لە نێوانیاندا، و حوکم نەکەن بە حوکمی تۆ، پاشان هەرچۆنێك بڕانتەوە لەدڵیانا هیچ گرێوگۆڵێك دروست نەبێت، وە خۆیان بەتەواوی تەسلیم بکەن.

ئەم ئایەتانە و وێنەی ئەم ئایەتانە بە تەواوەتی بەڵگەی ئەوەن کە گەڕانەوە لە کاتی نێوان تێك چوون بۆ حوکمی خواو پێغەمبەرە ﷺ، وە حوکمی خوا کتێبەکەیەتی و حوکمی پێغەمبەر ﷺ پاش مردنی سوننەتەکانیەتی و هیچی تر، وە خوای گەورە بۆ هیچ بەندەیەکی تری دانەناوە هەرچەندە پلەی بەرزی هەبێت لە زانستی دا و ئەندازەیەکی وەهای لەزانیاری کۆ کردبێتەوە کە غەیری ئەو نەیتوانیبێ ئەو ئەندازەیە کۆ بکاتەوە، بۆی دانەناوە لەم شەریعەتەدا شتێك بڵێ کە بەڵگەی لەسەر نەبێ نە لە قورئان و نە لەسوننەت، وە موجتەهیدیش هەرچەندە ڕێی پێدراوە بەڕای

خۆی کار بکات، کاتی نەبوونی بەڵگە، بەڵام کەسی تر جگە لەو بۆی نی‌یە ئەو ڕایە وەر بگرێت و کاری پێ بکات هەرکەسێ بێت.

وە من خوا ئەزانێ زۆر لام سەیرە شتی وەها ڕوو ئەدات لەلایەن نووسەرانەوە و بلاوکردنەوەی لە کتێبەکانی هیدایەت دا، وە فەرمان کردن بە عەوام و نەخوێندەوار کە باوەڕیان پێی بێت و کاری پێ بکەن، لە حاڵێکدا کە ئەو ڕایە بە لێواری کەندەلانێکی ڕوخاوەوەیە، وە ئەوە تایبەت نی‌یە بە هیچ مەزهەبێك لە مەزهەبەکانەوە بە وولاتێك لە وولاتەکاندا و بە سەردەمێك لە سەردەمەکاندا، بەڵکو هەر لە خۆڕا تاخر دوای ئەووەڵ کەووتوە، وەك ئەوەی لە قوڕئانەوە وەری گرتبێ، کەچی قسەیەکی پوچ و باتڵیشە. وە دەربارەی ئەم عیبادەتە (نوێژی جومعە) زۆر شت دانراوە وەك لەپێشەوە دەستنیشانمان کرد بێ ئەوەی بەڵگەیان هەبێت نە لە قوڕئان نە لەشەرع نە بەعەقڵ.

## ووتاری هەینی

**حوکمەکەی:**

جەماوەری زانایان بۆ ئەوە چوون کە ووتاری هەینی واجبە، وە بەڵگەشیان لەسەر واجب بوونی ئەوەیە کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ سابت بوە بە چەند حەدیسێکی صەحیح بە شێوەیەکی بەردەوام، کە پێغەمبەر ﷺ هەموو هەینی‌یەك ووتاری خوێندۆتەوە، وە هەروەها بەڵگەیان بەو فەرموودەیە هێناوەتەوە کە ئەفەرمووێت: (صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي) واتە: چۆن من ئەبینن نوێژ ئەکەم ئێوەش بەو شێوەیە نوێژەکانتان بکەن. هەروەها فەرموودەی خوای گەورە کە ئەفەرمووێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا نُودِىَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوْمِ ٱلْجُمُعَةِ فَٱسْعَوْا۟ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ﴾ واتە: ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە کاتێ بانگەواز ئەکرێت بۆ نوێژی ڕۆژی هەینی بچن بۆ یادی خوا کردن.

وە ئەم فەرمانەی خوا بە ڕۆیشتن بۆ یادی خوا ئەبێتە واجب بوون، چونکە شتێك واجب نەبێ ڕۆیشتنی بۆ ناکرێت، وەئەو یادی خوا کردنەی کە لە ئایەتەکەدا هاتووە بە ووتار خوێندنەوە لێکیان داوەتەوە، چونکە ئەویش ئەگرێتەوە.

شەوکانی لەو بەڵگانە کۆڵاوەتەوەو دەربارەی بەڵگەی یەکەم دەفەرمووێت: تەنها کردەوە نابێتە بەڵگەی واجب بوون، وە دەربارەی بەڵگەی دووەم دەفەرمووێت: لەوە زیاتری تێدا نی‌یە کە فەرمانی داوە بەبەجێ هێنانی نوێژ بەو شێوەیەی خۆی بەجێی ئەهێنێ، وە ووتاریش نوێژ نی‌یە، وەدەربارەی

بەڵگەی سێیەم دەفەرمووێت: ئەو یادەی کە فەرمانی پێ دراوە بەرەو پەی بڕۆیشتنی نوێژە، ئەوپەڕەکەی ئەوەیە فەرمانەکە لەنێوان ووتارەکەو نوێژەکەدایە، وە نازانرێت مەبەست لە ووتارەکەیە یا نوێژەکەیە، بەڵام زانایان لەسەر واجب بوونی نوێژەکە ڕێك کەوتوون، تەنها کێشە لەسەر واجب بوونی ووتارەکەیە، کەواتە ئەو بەڵگەیە واجب بوون ناگەیەنێ. پاشان دەفەرمووێت: (ظاهر) ئەوەیە کە حەسەنی بەصری و داودی (ظاهري) و جوەینی بۆی چوون، ئەویش ئەوەیە کە ووتاری هەینی مەندوبەو بەس [(١)]، [(٢)].

**سڵاو کردنی ئیمام کاتێ سەر ئەکەوێتە سەر مینبەر و بانگ دان کاتێ دائەنیشێ لەسەر مینبەر و ڕوو تێ‌کردنی خەڵکەکە موستەحەببە:**

لە جابیرەوە خوای لێ ڕازی بێ هاتوە دەفەرمووێت: کاتێ پێغەمبەر ﷺ ئەچووە سەر مینبەر سڵاوی ئەکرد، (ئیبنوماجە گێڕاویەتی‌یەوەو لە ئیسنادەکەیدا (ابن لهيعة) هەیە[(٣)]).

وە لای (أثرم) لە سونەنەکەیدا لە شەعبی‌یەوە هاتووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ بە مورسەلی، وە لە مەراسیلەکانی (عطاء)و بێجگە لەویش هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ ئەچووە سەر مینبەر بەرەو ڕووی خەڵکەکە ئەوەستا و ئەیفەرموو: (السلام عليكم).

شەعبی دەفەرمووێت: ئەبوبەکر و عومەر بەوشێوە کاریان ئەکرد، وە لە سائیبی کوڕی یەزیدەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە دەفەرمووێت: بانگی ڕۆژی هەینی سەرەتاکەی ئەوکاتەیە ئیمام لەسەر مینبەر دائەنیشێ، چونکە لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ و ئەبوبەکرو عومەردا بەوشێوەیە بوو، بەڵام کاتێ سەردەمی (عثمان) هات خەڵك زۆر بوو (عثمان) فەرمانی دا بانگی سێیەم زیاد کرا، لەسەر (زوراء)ەوە، وە پێغەمبەر ﷺ بانگبیژێك زیاتری نەبوو (بوخاری و نەسائی و ئەبوداود گێڕاویانەتەوە).

---

(١) لە ڕاستی دا ووتاری ڕۆژی هەینی پێویستە (واجبە) وە ئەوەی شەوکانی ووتویەتی ڕەد دراوەتەوە و صدیق حسن خانیش بۆچوونی هەروەك ئەو وابووە لە (الروضة الندية) و لە (الموعظة الحسنة)دا، منیش لە نامیلکەکەمدا (الأجوبة النافعة) وەڵامم داوەتەوە، کە هیچ گرێوگۆڵێك ناهێڵێتەوە لەوەی کە بووترێت واجبە، جا بگەڕێوە بۆی چونکە زۆر گرنگە (تمام المنة).

(٢) وە هەروەها (عبدالملك)ی کوڕی حەبیب و (ابن الماجشون) یش لە مەزهەبی مالیکدا هەر ئەم ڕەئی‌یەیان هەیە (دانەر).

(٣) منیش ئەڵێم ئەم دوو مورسەلە ئیبنوئەبی شەیبە و عبد الرزاق تەخریجیان کردووە، و ئەم دووانەش حەدیسەکەی جابیر بەهێز ئەکەن، بە تایبەت کە خەلیفەکان کاریان لەسەر کردووە، وەك لە (الصحيحة) لێی کۆڵاوەمەتەوە بە ژمارە (٢٠٧٦) کە لەوانەیە لە شوێنی تردا بەو شێوەیە تووشی نەبیت.

له ریوایەتێکی تریاندا هاتووه کاتێ (عثمان) بووه خەلیفه و خەڵك زۆر بوو (عثمان) فەرمانی دا بانگی سێیەم زیاد بکرێت، لەسەر (زوراء) بانگ بدرێت، ئیتر کار لەسەر ئەوه جێگیر بوو.

لای ئەحمەد و نەسائی هاتووه: کاتێ پێغەمبەر ﷺ ئەچووه سەر مینبەر بیلال بانگی ئەداو کاتێ ئەهاته خوارەوه قامەتی ئەکرد.

له عەدی کوڕی (ثابت) ەوه له باوکی‌یەوه له باپیری‌یەوه هاتووه دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ ئەچووه سەر مینبەر صەحابەکان ڕوویان تێ ئەکرد (ئیبنوماجه گێڕاویەتی‌یەوه). ئەم حەدیسه هەرچەنده قسەی لەسەره بەڵام (ترمذي) دەفەرمووێت: زانایان لەسەر ئەوه کاریان کردووه له صەحابەو غەیری صەحابه، وه به موستەحەبیان داناوه کاتێ ئیمام ووتار ئەدات ڕووی تێ بکرێت[1].

**موستەحەببه ووتار سوپاس و ستایشی خوای تێدا بکرێت و سلاواتی تێدا بدرێت لەسەر پێغەمبەر ﷺ وه ئامۆژگاری و ئایەتی تێدا بخوێنرێت:**

له ئەبوهورەیرەوه خوا لێی ڕازی بێت هاتووه که پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (كُلُّ كَلامٍ لايُبدَأُ فِيهِ بِالحَمدُ للهِ فَهُوَ أجذَم) واته: هەرووتەیەك به (الحمد لله) دەست پێ نەکات گەڕه (ئەبوداود و ئەحمەد بەم مەعنایه گێڕاویانەتەوه)[2].

---

(۱) ئەڵێم حەدیسەکه صەحیحه چونکه چەند شایەتی تری هەیه به مەوقوفی و به مەرفوعی، که له (الصحیحة) دا تەخریجم کردووه به ژماره (۲۰۸۰) وه یەکێکیان له صەحیحەیندا هەیه له ئەبی سەعیدی خودری‌یەوه که: پێغەمبەر ﷺ لەسەر مینبەر دانیشت و ئێمەش بەدەوری‌یەوه دانیشتین.

ئەمەش لەو سوننەتانەیه که تەرك کراوه و وازی لێ هێنراوه، جا ئەو کەسانەی سوننەتیان خۆش ئەوێت با بیژیێننەوه، خوای گەوره بیان ژیێنێت و بەهەشتیش بکاته بەشی ئێمەو ئەوان به فەزڵو گەورەیی خۆی (تمام المنة)٠

(۲) (حدیث)ەکه لاوازه کەسێك له ئەبو هورەیرەوه هێناویەتی که سیقه به (حفظ)ەکەی ناکرێ، وه هەندێکیش له پیاوه سیقەکان پێچەوانەیان کردووه و به مورسەلیان داناوه، بەڵکو به (معضل) یان دانار، وه خودی ئەبوداودیش به مەعلولی داناوه.

و ئەبووایه دانەر لەبەر ئەمانەتی عیلمی ئەمەی باس بکردایه.

بەڵام ئەمه له شومی چاولێکەری‌یه، و نەگەڕانەوەیه بۆ ئەصلەکان، بەڵام که نەگەڕاوەتەوه بۆ ئەصل بۆچی ئەوەی که شەوکانی باسی کردووه له (نیل الأوطار)دا نەیهێناوه له (۳/۲۲٤) دا که نسائی و (دارقطني)ش به مەعلولیان داناوه بەوەی که ئیرسالی هەیه، چونکه ئەو حەدیسەی له شەوکانی‌یەوه نەقل کردووه یا له مەتنەکەیەوه.

و من تەخریجی ئەم حەدیسەم کردووه و قسەم لەسەر کردووه، لەسەرتای (الإرواء) دا به ژماره (۲) وباسی عیللەتێکی تریشم کردووه ئەویش (إضطراب) ی ئەو زەعیفەیه له مەتنەکەیدا، له چەند ڕوویەکەوه که ڕوونم کردۆتەوه، وه ئەگەر پێت خۆشه زیاتر لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەیت بۆی بگەڕێرەوه(تمام المنة).

وە لە ڕیوایەتێکدا هاتووە دەفەرمووێت: (الخُطبَةُ الَّتي لَيسَ فِيهَا شَهَادَةٌ كَاليَدِ الجَذمَاءِ) (رواه أحمد وأبوداود والترمذي). وە (ترمذي) بە زاراوەی (تشهد) هێناویەتی بەجێی (شهادة)، واتە: ئەو ووتارەی شایەتومانی تێدا نەبوو وەك دەستی گەڕ وایە[1].

لە ئیبنومەسعودەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ تەشەهودی ئەدا ئەیفەرموو: (الحَمدُ للهِ نَحمَدُهُ وَنَستَعِينُهُ وَنَستَغفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللهِ مِن شُرُورِ أنفُسِنَا، مَن يَهدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَن يُضلِل فَلا هَادِيَ لَهُ، وَأَشهَدُ أن لا إلَهَ إلا اللهُ وأشهَدُ أنَّ مُحَمَّداً

(١) ئەڵێم: ڕیوایەتەکەی ئەبو داود (٤٨٤١) هەروەك ڕیوایەتەکەی ترمذی وایە، بەڵکو صحیح ترە لەو، وە ووتویەتی: (حديث حسن صحيح غريب) و سەنەدەکەشی صەحیحە، و لە موسنەدی ئەحمەدیشدا هەیە (٢/٣٠٢و٣٤٣).

من پێم خۆش بوو دانەر کتێبەکەی خاڵی نەبێت لە (خوطبە)ی حاجە کە پێغەمبەر ﷺ فێری هاوەڵەکانی ئەکرد، بەتایبەتی کە دەقی ئەو شەهادەتەی تێدایە کە ئاماژەی بۆ کراوە لە حەدیسەکەدا، و جگە لەو حەدیسەشدا وەکو حەدیسەکەی جابیر خوا لێی ڕازی بێت فەرموویەتی: (خوطبە)ی پێغەمبەر کاتێك ووتاری ئەدا حەمد و سەنای خوای ئەکرد لەپاشان ئەیفەرموو:... موسلیم گێڕاویەتیەوە (٣/١١).

دەقی خوطبەکەش وەك لە چەند حەدیسدا هاتووە لە یەك نامیلکەی تایبەتدا کۆم کردۆتەوە کە لە دواییدا ئاماژە بۆ ئەو نامیلکەیە ئەکرێت (إن شاء الله):

(إنَّ الحَمدَ للهِ، نَحمَدُهُ وَنَستَعِينُهُ وَنَستَغفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللهِ مِن شُرُورِ أنفُسِنَا وَسَيِّئَاتِ أعمَالِنَا، مَن يَهدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَن يُضلِل فَلا هَادِيَ لَهُ، وَأشهَدُ أن لا إلَهَ إلا اللهُ وَحدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، وَأشهَدُ أنَّ مُحَمَّداً عَبدُهُ وَرَسُولُهُ.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ﴾.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبًا﴾.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلًا سَدِيدًا ۝ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَـٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا﴾.

أما بعد:

وە جاری وابووە ئەو سێ ئایەتەی دوایی نەخوێندۆتەوە، وە ئەبێت هەندێ جار لە دوای (أما بعد) ئەمەش بڵێت:

(فَإنَّ خَيرَ الحَدِيثِ كِتَابُ اللهِ، وَخَيرَ الهَديِ هَديُ مُحَمَّدٍ، وَشَرَّ الأمُورِ مُحدَثَاتُهَا، وَكُلَّ مُحدَثَةٍ بِدعة، وَكُلَّ بِدعَةٍ ضَلالَة، وَكُلَّ ضَلالَةٍ فِي النَّار).

موسلیم و جگە لەویش ڕیوایەتیان کردووە، وە لە (الإرواء)یشدا تەخریج کراوە بە ژمارە (٦٠٨) (تمام المنة).

عَبدُهُ وَرَسُولُهُ، أرسَلَهُ بِالحَقِّ بَشِيراً بَينَ يَدَي السَّاعَةِ، مَن يُطِعِ اللهَ تعالى وَرَسُولَهُ فَقَد رَشَدَ، وَمَن يَعصِهِمَا فَإنَّهُ لايَضُرُّ إلا نَفسَهُ، وَلا يَضُرُّ اللهَ تعالى شَيئاً) واتە: سوپاس و ستایش بۆ خوا، ئێمە داوای یارمەتی و لێبوردن هەر لە خوا ئەكەین، وە ئێمە پەنا ئەگرین بە خوا لە خراپیەكانی نەفسی خۆمان، هەركەس خوا ڕێنمایی بكات كەس نی‌یە گومڕای بكات، وە هەركەس خوا گومڕای بكات كەس نی‌یە ڕێنمایی بكات. وە شایەتی ئەدەم هیچ مەعبودێكی بەحەق نی‌یە كە شایستەی عیبادەت بێ جگە لە (الله)، وە شایەتی ئەدەم كە موحەممەد ﷺ نێرراوو عەبدی خوایە، بەهەقەوە ڕەوانەی كرد پێش هاتنی قیامەت، تاوەكو مژدەدەر بێ. هەركەس گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر بێ ﷺ ئەوە ڕێی دۆزیوەتەوە، وە هەركەس سەرپێچی‌یان بكات جگە لە خۆی زیان لەكەسی تر نادات و بەهیچ شێوەیەك زیان بەخوا ناگەیەنێ.

لە ئیبنوشیهابەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە كە پرسیاری لێ كراوە دەربارەی شایەتمان ووتنی پێغەمبەر ﷺ لەرۆژی هەینی دا ؟ ئەویش لەوەڵامدا وەك حەدیسەكەی سەرەوەی باس كرد، بەڵام لە كۆتایی‌یەكەیدا ووتی: (وَمَن يَعصِهِمَا فَقَد غَوَى) (ئەبوداود هەردووكیانی گێڕاوەتەوە[1]).

لە جابیری كوڕی سەمورەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ هەمیشە ووتاری داوە و لەنێوان هەردوو ووتارەكەدا دائەنیشت و چەند ئایەتێكی قورئانی ئەخوێند، و خەڵكەكەی وەبیر ئەهێناوە، (جەماعەت جگە لە بوخاری و (ترمذي) گێڕاویانەتەوە).

---

(١) هەردوو سەنەدەكەیان زەعیفە لەپاشان شێخ دەفەرمووێت:

بەڵام لەو دوو حەدیسەدا ڕستەیەك هەیە كە صەحیحە لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەویش ئەوەی كە فەرموویەتی: (ومن يعصهما...) موسلیم و جگە لەو لە عەدی كوڕی حاتەمە وە ئەگێڕنەوە، كە پیاوێك لای پێغەمبەر ﷺ ووتاری ئەدا و ئەیووت: (مَن يُطِعِ اللهَ وَرَسُولَهُ فَقَد رَشَد، وَمَن يَعصِهِمَا فَقَد غَوى، فَقَالَ ﷺ: بِئسَ الخَطِيبُ أنتَ، قُل: وَمَن يَعصِ اللهَ وَرَسُولَهُ) واتە هەركەس ملكەچی خوا و پێغەمبەرەكەی بكات ئەوە ڕێنموون بووە، وە هەركەس سەركێشی فەرمانیان بكات ئەوە گومڕابووە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ووتاربێژێكی خراپی تۆ، بڵێ: وەهەركەس سەرپێچی لە فەرمانی خوا و پێغەمبەرەكەی بكات ئەوە گومڕا بووە، (واتە: ناوی خوا و پێغەمبەر بەیەكەوە نەڵێت).

وحەدیسەكەی ئیبنومەسعود لە سێ ڕێگای ترەوە هاتووە و هیچیان ئەم ڕستەیەی تێدا نی‌یە كە باس كرا، جا لەبەر ئەوە ئەم ڕستەیە مونكەرە، وە لە شی كردنەوەی ئەم باسەدا نامیلكەیەكم هەیە بەناوی (خطبة الحاجة التي كان رسول الله ﷺ يعلمها أصحابه) دەقی صەحیحی تەواوم لەم نامیلكەیەدا هێناوە كە لەم (خوطبة) مووبارەكەدا ئەووترێ، و حەدیسەكانیشیم تەخریج كردووە لەگەڵ چەند سوودێكی تردا كە گونجاوە لەگەڵیدا، و ئەم نامیلكەیەش سوپاس بۆ خوا چەند جارێك چاپ بووە، (تمام المنة).

هەر لەوەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاری‌یەکانی درێژ نەئەکردەوە ڕۆژی هەینی، بەڵکو چەند وشەیەکی سوکەڵەو ئاسان بوو. (ئەبوداود گێڕاویەتی‌یەوە).

لە ئومموهیشامی کچی (حارث)ەی کوڕی نوعمانەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتووە دەفەرموێت: ﴿قٓ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ﴾، لە زمانی پێغەمبەرەوە نەبێت لە کەسم وەرنەگرتووە کەلەسەر مینبەر هەموو هەینی‌یەك لەکاتی ووتارداندا بۆ خەڵکەکەی ئەخوێند. (ئەحمەد و موسلیم و ئەبوداود گێڕاویانەتەوە).

لە یەعلای کوڕی ئومەییەوە هاتووە دەفەرموێت: گوێم لێبووە پێغەمبەر ﷺ لەسەر مینبەر ﴿وَنَادَوۡاْ يَٰمَٰلِكُ﴾ (الزخرف/٧٧)ی خوێندووە. (بوخاری موسلیم گێڕاویانەتەوە).

لە ئیبنوماجەوە لە ئوبەییەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی هەینی ﴿تَبَٰرَكَ﴾ ی خوێندووە و بەپێوە وەستابوو ڕۆژەکانی خوای ئەخستەوە یادی خەڵك.

لە کتێبی (الروضة الندية)دا هاتووە: لەپاشاندا بزانە ووتاری شەرعی ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ لەسەری ڕاهاتبوو، کە پێك هاتبوو لە هاندانی خەڵکی و ترساندنیان، وە لەڕاستیدا ڕۆحی ووتاریش هەر لەبەر خاتری ئەوە دانراوە، ئەمما بەمەرج کردنی ووتنی (الحمد لله) یا سلاوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ، یا خوێندنی شتێك لە قوڕئان، ئەمانە هەموویان لە زۆربەی ئەو مەبەستە بەدەرن کە ووتاری بۆ دانراوە، وە ئەوەی کە ڕێك کەوتووە پێغەمبەر ﷺ لە ووتارەکانیدا وێنەی ئەوانەی ووتوە نابێتە بەڵگەی ئەوەی کە مەبەست لە ووتارەکە هەر ئەبێ ئەوە بێت، یا مەرجێکی پێویست بێت، وە ئەوەی ئینسافی هەبێت گومانی لەوەدا نی‌یە کە بەشی گەورەی ووتار ئامۆژگاری‌یە، نەك ئەو (الحمد لله) و سەلات دانەی پێشەوەیەتی، وە داب و نەریتی بەردەوامی عەرەب وابووە ئەگەر کەسێکیان بیویستایە لە شوێنێك ڕاوەستایە و قسەی بکردایە لەپێشدا سوپاس و ستایشی خوای ئەکرد و سلاواتی ئەدا لەسەر پێغەمبەر ﷺ ئای ئەمە چەندە شتێکی جوان و چاکە، بەڵام ووتنی ئەوە مەبەست نی‌یە بەڵکو مەبەست ئەوانەی دوای ئەوەیە.

ئەگەر ووترا: ئەوکەسەی هەستا ویستی لەناو کۆمەڵێکدا ووتار بدات تەنها مەبەستی ئەوەیە کە حەمدی خوا بکات و سلاوات لەسەر پێغەمبەر بدات ﷺ ئەوە وەرناگیرێت، بەڵکو هەموو تەبیعەتێکی سالم ئەمە ڕەت ئەکاتەوە، جا مادام ئەمە سابت بوو ئەزانیت کە ئەوەی مەبەستە ئامۆژگاری کردنە لە ووتاری هەینی دا، جا کە ووتاربێژ ئەوەی کرد فەرمانە شەرعی‌یەکەی بەجێ

هێناوە، بەڵام ئەگەر لە پێشدا سوپاس و ستایشی خوای کردو سڵاواتی لەسەر پێغەمبەر دا ﷺ با چەند ئایەتێکی قورئانی خوێند کە دڵ بلەرزێنێ ئەوە ووتارەکەی تەواوترو چاکترە.

**بەپێوە وەستان بۆ هەردوو ووتارەکەو دانیشتنێکی کەم لەنێوانیاندا مەشروعە:**

لە ئیبنوعومەرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە فەرمویەتی پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی هەینی کە ووتاری ئەدا، بەپێوە ئەوەستا لەپاشاندا دائەنیشت، پاشان هەڵئەساوە وەك چۆن ئەمڕۆ ووتاربێژەکان ئەیکەن. (جەماعەت گێڕاویانەتەوە).

لە جابیری کوڕی سەمورەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ بەپێوە ڕائەوەستا ووتاری ئەدا، لەپاشاندا دائەنیشت، لەپاشاندا هەڵئەسایەوە بەپێوە ووتاری ئەدایەوە، جا هەرکەس ووتی: بەدانیشتنەوە ووتاری داوە درۆی کردووە، سوێند بە خوا زیاتر لە دوو هەزار نوێژم لەگەڵدا کردووە[1]، (ئەحمەدو موسلیم و ئەبوداود گێڕاویانەتەوە).

ئیبنوئەبی شەیبە لە (طاووس)ەوە ئەگێڕێتەوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ بەپێوە ووتاری داوە، ئەبوبەکرو عومەرو (عثمان) یش دوای ئەو هەربەپێوە ووتاریان داوە، وە یەکەم کەس لەسەر مینبەر دانیشت و ووتاری دا موعاویە بوو.

هەروەها لە شەعبی‌یەوە ریوایەت کراوە دەفەرمووێت: موعاویە کاتێ چەوری سکی زیادی کردو گۆشتی گرت بەدانیشتنەوە ووتاری ئەدا.

هەندێ لە پێشەواکان بەپێوە وەستان لە کاتی ووتاردان بەواجب دائەنێن، وە دانیشتن لەنێوان هەردوو ووتارەکەدا هەر بەواجب دائەنێن، بەپێی کردەوەی پێغەمبەر ﷺ و صەحابەکانی.

بەڵام کردەوەی پەتی بەتەنها نابێتە هۆی واجب بوون.

**موستەحەبە ووتارەکە بەدەنگی بەرز بێت و کورت بێت و باش داڕشترێ:**

لە عەمماری کوڕی یاسرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە دەفەرمووێت: لەپێغەمبەرم ﷺ بیستووە فەرمووەیەتی: (إِنَّ طُولَ صَلاةِ الرَّجُلِ وَقِصَرَ خُطبَتِهِ، مَئِنَّةٌ مِن فِقهِهِ، فَأَطِيلُوا الصَّلاةَ وَأَقصِرُوا الخُطبَةَ) (رواه أحمد ومسلم). واتە: درێژی نوێژی پیاوو کورتی ووتارەکەی نیشانەی زانایی‌یەتی، جا نوێژ درێژ بکەنەوەو ووتاریش کورت[2].

(١) مەبەستی نوێژە فەرزەکانە (دانەر).

(٢) وە فەرمان کردن بە درێژ کردنەوەی نوێژ بەگوێرەی ووتارەکە ئەبێت نەك درێژ کردنەوەیەکی وەها کە گران بێت لەسەر نوێژکەران (دانەر).

وە بۆیە کورتی ووتار و درێژکردنەوەی نوێژ بەڵگەیە لەسەر زانایی ئەوکسە، چونکە ئادەمیزادی زانا ئەزانێ کە قسەی پڕمەعنا (جوامع الكلم) بکا هەربۆیە بەچەند ووشەیەکی پڕمانا کۆتایی بەووتارەکەی ئەهێنێ.

لە جابیری کوڕی سەمورەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە دەفەرمووێت: ووتارو نوێژەکانی پێغەمبەر ﷺ (وسط) بوون (جەماعەت جگە لە بوخاری و ئەبوداود گێڕاویانەتەوە[1]).

لە عبدالله ی کوڕی ئەبیئەوفاوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ نوێژەکەی درێژ ئەکردەوە و ووتارەکەی کورت (نسائی بە ئیسنادێکی صەحیح گێڕاویەتیەوە).

لە جابیرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ ووتاری ئەدا چاوەکانی سوور هەڵئەگەڕاو دەنگی بەرز ئەبۆوەو ڕق و قینی هەڵئەسا ئەتگوت ووریاکەرەوەی سوپایە کە دەفەرمووێت: بەیانی یا ئێوارە دوژمن ئەدا بەسەرتانا. (موسلیم و ئیبنوماجە گێڕاویانەتەوە).

نەوەوی دەفەرمووێت: موستەحەببە ووتار پاراوو ڕێکوپێك و ڕون کراوە بێت بەبێ درێژ کردنەوەو قوڵ کردنەوە، وە نابێت زاراوەکانی تێکەڵ و پێکەڵ بێت، چونکە ئەوانە بەجووانی ناچنە دڵەوە.

وە نابێت ووشەکان غەریب بن و کەس لێیان تێ نەگات، چونکە مەبەستی ووتار نایەتە دی، بەڵکو ئەبێ زاراوەی ڕەوان و تێگەیەنەر بەکار بهێنێ.

ئیبنوقەییم دەفەرمووێت: ووتارەکانی پێغەمبەر ﷺ دیاری کردنی بنەماکانی باوەڕی تێدا بوو، هەروەك باوەڕ بەخوا و فریشتەکانی و کتێبەکانی و نێرراوەکانی و زیندوو بوونەوە.

هەروەها باسی بەهەشت و دۆزەخ و ئەوشتانەی خوا ئامادەی کردووە بۆ دۆستەکانی و ئەوانەی گوێ ڕایەڵی ئەون، وە هەروەها ئەوشتانەی ئامادەی کردوون بۆ دوژمنەکانی و ئەوانەی سەرپێچی ئەکەن، وە بە ووتارەکەی دڵەکان پڕ ئەبوون لە باوەڕو یەکتاپەرستی و ناسینی خواو ڕۆژەکانی، نەك وەك ووتاری کەسانی تر کە تەنها باسی کاروبارێك ئەکا کە هاوبەشە لەنێوان هەموو چینەکانی خەڵکیدا، کە شیوەنە بۆ ژیان و ترساندنە بە مردن، چونکە ئەو جۆرە قسانە نە باوەڕ بوون بە خوا دروست ئەکا لە دڵداو نە (توحيد) یەکتاپەرستی ئەوو نە خواناسینێکی تایبەتی و نە وەبیرخستنەوەی ڕۆژانی خوا و نە هاندانی دەروون بۆ خۆشەویستی خواو پەروش بوون بۆ دیداری، وە

---

(١) جیا کردنەوەی ئەبو داود لە ریوایەتەکەدا هەڵەیە، لێرەشدا دانەر چاوی لە خاوەنی کتێبی المنتقى کردووە، و شەوکانیش تێبینی لەسەر نەداوە (٣/٢٢٨)، چونکە لە سونەنەکەیدا بە ژمارە (١١٠١) تەخریجی کردووە، وە لە صەحیحی ئەبو داودا تەخریج کراوە بە ژمارە (١٠٠٩) (تمام المنة).

گوێ گرەکان ئەچنەدەرەوە بێ ئەوەی هیچ سوودیان وەرگرتبێ، جگە لەوەی کە ئەمرن و ماڵەکانیان دابەش ئەکرێت و گڵ لاشەکانیان دائەرژێنێ، خۆزگە ئەم زانی چ باوەڕێك بەوە پێك دێت، وە چ تەوحید و زانستێکی بەکەڵك بەوە دێتە دی؟

هەرکەس باش سەرنج بدات لە ووتارەکانی پێغەمبەر ﷺ و ووتاری صەحابەکانی ئەبینێ کە کەفیلن بۆ ڕوون کردنەوەی ڕێی ڕاستی و تەوحید، هەروەها ڕوون کردنەوەی سیفەتەکانی پەروەردگارو بنەما سەرەکی‌یەکانی باوەڕ و بانگەواز کردن بۆلای خوا و باسی نیعمەتەکانی کە بە هۆی ئەو نیعمەتانەیەوە خۆشەویست ئەبێ لەلای خەڵکی، وە باسی ڕۆژەکانی کە بەهۆی ئەو ڕۆژانەیەوە، ئەترسن لە سزای خوا، وە فەرمان دان بە یادکردنی خواو سوپاس کردنی کە بەهۆی ئەودووانەوە خۆشەویست ئەبن لەلای، هەروەها ئەوەندە باسی گەورەیی خواو سیفەتەکانی و ناوەکانیان ئەکرد کە خوا خۆشەویست کا لەلای خەڵکی، وە ئەوەندەش باسی گوێ ڕایەڵی لەخوا و سوپاس کردنی و یادکردنیان ئەکرد کە خۆشەویستیان کا لەلای خوا، ئیتر کاتێ گوێ گرەکان دوای ووتارەکە ئەڕۆیشتن هەم خوایان خۆش ئەویست و هەم خواش ئەوانی خۆش ئەویست.

لەپاشاندا سەردەم دوور کەوتەوەو ڕۆشنایی پێغەمبەرایەتی وون بوو، وای لێ هات شەریعەت و فەرمانەکانی بوون بە چەند نیشانەو شوێنەوارێك جێ بەجێ ئەبون بە بێ پارێزگاری لە حەقیقەت و مەبستەکانی شەریعەت، بەوشێوەیە گرینگی ئەدرا بەو نیشانەو شوێنەوارانەو ئەڕازێندرانەوە، ئیتر ئەوانەیان کرد بە سوننەتێك کە نابێ وازیان لێ بهێنرێ، بەڵام وازیان لەو مەبستانە هێنا کە نەئەبو وازیان لێ بهێندرێ، وە ووتارەکانیان بە شیعر و زانستی ڕەوانبێژی ڕازاندەوە، ئیتر لەو ووتارانەدا بەشی دڵ کەم بووەوە، بەڵکو هەر تێیدا نەما، وە ووتارەکان مەبستی خۆیان لەدەست دا.

**ووتار بڕین لەلایەن ئیمامەوە ئەگەر شتێك ڕووی دا:**

لە ئەبوبورەیدەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە کە دەفەرموێت: جارێك پێغەمبەر ﷺ ووتاری بۆ ئەداین حەسەن و حوسەین هاتن هەریەکە و کراسێکی سووریان لەبەرا بوو، و ئەڕۆیشتن و ئەکەوتن، پێغەمبەر ﷺ هاتە خوارەوە لەسەر مینبەرو هەردووکیانی گرت و بردنی‌یە بەردەمی، لەپاشاندا فەرمووی: (صَدَقَ اللهُ وَرَسُولُهُ، إنَّمَا أموَالُكُم وَأولادُكُم فِتنَةٌ، نَظَرتُ هَذَينِ الصَّبِيَّينِ يَمشِيَانِ وَيَعثُرانِ، فَلَم أصبِر حتى قَطَعتُ حَدِيثِي وَرَفعتُهُمَا) (رواه الخمسة[1]). واتە: خواو پێغەمبەرەکەی

---

(١) لەبارەیەوە ئەڵێم:

ڕاستیان ووتووه كه ووتویانه: بەڕاستی ماڵ و منداڵەكانتان فیتنەن، كاتێ ئەو دوو منداڵەم بینی ئەڕۆیشتن و ئەكەوتن خۆم پێ نەگیرا قسەكەم بڕی وهێنامنە سەرەوە.

له ئەبوریفاعەی عەدەوی‌یەوه خوا لێی ڕازی بێت هاتووه دەفەرمووێت: گەیشتمە لای پێغەمبەر ﷺ ووتاری ئەدا، ووتم: ئەی نێرراوی خوا من پیاوێكی غەریبم، هاتووم دەربارەی ئایینەكەم ئەپرسم، چونكه نازانم ئایینەكەم چی‌یه ؟ ئەویش وازی له ووتارەكەی هێناو ڕووی تێ كردم و هات بۆلام، هەتا گەیشتە لام، كورسی‌یەكی تەختەی قاچ ئاسنی هێناو لەسەری دانیشت وه فێری ئەكردم لەوەی كه خوا فێری كردبوو، پاشان گەڕایەوه سەر ووتارەكەی و تەواوی كرد. (موسلیم و نەسائی گێڕاویانەتەوە).

ئیبنوقەییم دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ بۆ شتی پێویست ووتاری بڕیوه، وه هەروەها بۆ ئەوكەسانەی پرسیاریان لێ كردووه وەڵامی داونەوە، جاری وابووه بۆ پێویستی هاتۆتە خوارەوەو گەڕاوەتەوە ووتارەكەی تەواو كردووە، وەك چۆن بۆ بردنی حەسەن و حوسەین هاتۆتە خوارەوە و هەڵی گرتوون و بردونی‌یە سەر مینبەرەكه و ووتارەكەی تەواو كردووە، وه لەكاتی ووتاردا پیاوی بانگ كردووه فەرموویەتی: وەرە فلانەكەس دانیشە، فلانەكەس نوێژ بكە، وه هەرچی پێویست بووایه لەكاتی ووتارەكەیدا بەخەڵكەكەی ئەفەرموو: بیكەن.

**حەرامی قسەكردن لەكاتی ووتاردا:**

زانایان هەموو بۆ واجبێتی بێ دەنگی و حەرامی قسەكردن لەكاتی ووتاردا چوون، با قسه كردنەكه فەرمان بەچاكه و نەهی لەخراپەش بێت، نوێژكەر گوێی له ووتارەكه بێت یا گوێی لێ نەبێت.

---

یەكەم ئەوەی كه ووتویەتی ئەبوبورەیدە، هەڵەیەكە كه دووبارە بۆتەوە لەم چاپەدا و له چاپە تازەكەشدا، وه ڕاستیش بورەیدە بەبێ ووشەی ئەبوەكە ئەویش بورەیدەی كوڕی حەصیبە ڕەزای خوای لەسەر بێت.

دووەم: مەبەست بە پێنجەكان كه ریوایەتیان كردووه ئیمام ئەحمەد و خاوەنی چوار سوننەنەكانن كه ترمذیش لەوانەو له دوای ئەم حەدیسە ووتویەتی: (حسن غريب) هەروەها ووتویەتی ئێمە وائەزانین كه له حەدیسی حوسەینی كوڕی واقید بێت، وه ئەم حوسەینە، شەوكانی لەبارەیەوه له (نيل الأوطار)دا (٣/٢٣٣) دەڵێت: ئەو ئەبوعەلی‌یە كه قازی مەرو بووە، موسلیم بەڵگەی پێ هێناوەتەوە له صەحیحەكەیدا، و مونذریش ووتویەتی: سیقەیە.

منیش ئەڵێم: ئەبووایە دانەر ئەوەی نەقل بكردایە كه بەڵگە بێت لەسەر صەحیحی حەدیسەكە.

و تەنها بە تەخریج وازی نەهێنایە، چونكه تەخریج سەبارەت بە پلەی حەدیسەكە وەك وەسیلە وایە بۆ مەبەست، جا ئیتر هێنانی وەسیلە بەبێ مەبەست چ قازانجێكی هەیە؟ ئەمەش موصیبەتێكە كه زۆربەی دانەرەكان لە كۆن و تازە ڕزگاریان نەبووە لەدەستی، وه هەر خوا یارمەتی‌دەرە. (تمام المنة).

له ئیبنوعهبباسهوه هاتووه که پێغهمبهر ﷺ فهرموویهتی: (مَن تَكَلَّمَ يَومَ الْجُمُعَةِ وَالإِمَامُ يَخطُبُ فَهُوَ كَالحِمَارِ يَحمِلُ أسفَاراً، وَالَّذِي يَقُولُ لَهُ أنصِت لا جُمُعَةَ لَهُ) (رواه أحمد وابن أبي شيبة والبزار والطبراني) واته: ههرکهس لهڕۆژی ههینی قسه بکات کاتێ ئیمام ووتار ئهدات، وهك کهرێکی بارکراو له کتێب وایه، وه ئهوکهسهی پێی بڵێت: بێ دهنگبه نوێژه ههینییهکهی بۆ نانوسرێ.

(حافظ) له (بلوغ المرام) دا ووتویهتی: ئیسنادی ئهو حهدیسه خراپ نییه[1].

له عبدالله ی کوڕی عهمرهوه هاتووه دهفهرموێت: پێغهمبهر ﷺ فهرموویهتی: (يَحضُرُ الْجُمُعَةَ ثَلاثَةُ نَفَرٍ: فَرَجُلٌ حَضَرَهَا يَلغُو فَهُوَ حَظُّهُ مِنهَا، وَرَجُلٌ حَضَرَهَا يَدعُو، فَهُوَ رَجُلٌ دَعَا اللهَ، إن شَاءَ أعطَاهُ وإن شَاءَ مَنَعَهُ، وَرَجُلٌ حَضَرَهَا بَإنصَاتٍ وَسُكُوتٍ وَلَم يَتَخَطَّ رَقَبَةَ مُسلِمٍ، وَلَم يُؤذِ أحَداً فَهِيَ كَفَّارَةٌ إلى الْجُمُعَةِ الَّتِي تَلِيهَا، وَزِيَادَةُ ثَلاثَةِ أيَّامٍ، وَذَلِكَ أنَّ اللهَ عَزَّوَجَلَّ يَقُولُ: ﴿مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشْرُ أَمْثَالِهَا﴾ (الأنعام/١٦٠). (رواه أحمد وأبوداود بإسنادٍ جيد).

واته: سێ جۆر پیاو ئامادهی نوێژی ههینی دهبن: پیاوێك لهکاتی ئامادهبووندا لهغو (قسه یا کرداری پوچ) ئهکات، ئهوه ههر ئهوهندهی لهغوهکهی خێر پێ ئهبڕێت، وه پیاوێك ئاماده دهبێت لهخوا ئهپاڕێتهوه، ئهویش پیاوێکه لهخوا پاڕاوهتهوه خوا بهویستی خۆیهتی یا ئهو شتهی ئهداتێ یا لێی قهدهغه ئهکات، وه پیاوێك ئامادهی ئهبێت بههێمنی و لهسهرخۆییو بێ دهنگی، وه ههنگاو نانێت بهسهر ملی هیچ موسڵمانێکدا، وه کهس ئازار نادات ئهوه ئهو ههینییه ئهبێته کهفارهتی گوناحهکانی ئهو ههفتهیهی ههتا ههفتهیهکی تر و سێ ڕۆژیش زیادهی ئهبێت، ئهویش لهبهر ئهوهیه که خوای گهوره ئهفهرموێت: ﴿مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشْرُ أَمْثَالِهَا﴾ واته: ههرکهس چاکهیهك بکات خوا به دهئهوهنده بۆی ئهنووسێت (ئهحمهد و ئهبوداود بهئیسنادێکی جید گێڕاویانهتهوه).

---

(١) چۆن ئیسنادهکهی خراپ نییه لهحاڵهتێکدا لای ههموویان موجالیدی کوڕی سهعیدی تێدایه که ههتا (حافظ) بۆ خۆی به لاوازی داناوهو ووتویهتی: سیقه نییه و له کۆتایی ژیانیدا گۆڕاوه.

له دواییدا شێخ دهفهرموێت: مهعنای ئهم حهدیسه به مهوقوفی لهسهر ئیبنوعومهر صحیحه ههروهك لهلای ئیبنوئهبی شهیبه ههیه (٢/١٢٥) وه لهوانهشه (حافظ) ههر لهبهر ئهوه ئهو حهدیسهی به قهوی دانابێت، لهبهر ئهو شاهیدهی که له جامیعی حهممادی کوڕی سهلهمهوه به مهوقوفی لهسهر ئیبنوعومهر ههیه، بهڵام من ڕام وایه که ڕیوایهتی مهوقوف بهکاری شاهید نایهت بۆ بههێزکردنی ڕیوایهتی مهرفوع، ئیتر خواش زاناتره. (تمام المنة).

لە ئەبوهورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذا قُلتَ لِصَاحِبِكَ يَومَ الجُمُعَةِ والإمَامُ يَخطُبُ أنصِت فَقَد لَغَوتَ) (رواه الجماعة إلا ابن ماجة). واتە: ڕۆژی هەینی ئەوکاتەی ئیمام ووتار ئەدات بە هاوەڵەکەت بڵێیت: بێ دەنگبە ئەوە لەغوت کردووە.

لە ئەبودەرداوە هاتووە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ لەسەر مینبەر ووتاری بۆ خەڵك ئەدا ئایەتێکی ئەخوێند، ئوبەی کوڕی کەعب لامەوە دانیشتبوو پێم ووت: ئەی ئوبەی ئەم ئایەتە کەی هاتە خوارەوە ؟ وەڵامی نەدامەوە دووبارە پرسیارم لێ کردەوە، هەروەڵامی نەدامەوە، هەتا پێغەمبەر ﷺ لە ووتار بۆوە و لەسەر مینبەرەکە هاتە خوارەوە، ئینجا ئوبەی پێی ووتم: ئەوەندەی لەغوەکەت پاداشتی هەینیت دەست کەوت، کاتێ پێغەمبەر ﷺ لەنوێژ بووەوە چووم بۆلای پێم ووت: فەرمووی: ئوبەی ڕاست ئەکات، کاتێ گوێت لێ بوو ئیمام ووتاری ئەدا بێ دەنگبە هەتا لێ ئەبێتەوە. (ئەحمەدو (طبراني) گێڕاویانەتەوە[1]).

لە شافیعی و ئەحمەدەوە ریوایەت کراوە کە جیاوازیان کردووە لەنێوان ئەوکەسەی توانایی بیستنی ووتاری هەیە و ئەوکەسەی توانایی بیستنی نیەیە، جا وایان داناوە قسەکردن حەرامە لەسەر یەکەم، وە لەسەر دووەم حەرام نیەیە، هەرچەندە ئەمیش هەر بێ دەنگ بێت باشە.

(ترمذي) لە ئەحمەدو ئیسحاقەوە ئەگێڕێتەوە کە ڕێیان داوە وەڵامی سەلام و وەڵامی کەسێك بدرێتەوە کە ئەپشمێ لەوکاتەی ئیمام ووتار ئەدات.

شافیعی دەفەرموێت: ئەگەر کەسێك (لەکاتی ووتارەکەدا) پشمی ووتی: (الحمد لله) پیاوێکی تر پێی ووت: (يرحمك الله) هیوادارم ڕێی ئەوەی هەبێت، چونکە وەڵام دانەوەی پشمە (تشميت) سوننەتە، وە ئەگەر پیاوێك سڵاو لە پیاوێکی تر بکات بەکەراهەتی دائەنێم و ڕام وایە وەڵامی سڵاوەکەی بداتەوە، چونکە سڵاو کردن سوننەتە بەڵام وەڵامدانەوەی فەرزە[2].

---

(١) منیش ئەڵێم: پیاوەکانی جێی سیقەن هەروەکو هەیسەمی ووتویەتی، بەڵام مونزری و عەسقەلانی بە (إنقطاع) وە مەعلولیان کردووە هەروەك لە (التعليق الرهيب ١/٢٥٨) دا ڕوونم کردۆتەوە، بەڵام حەدیسەکە صەحیحە، چونکە ئیبنوماجە ریوایەتی کردووە هەر لە ئوبەیەوە بە ئیسنادێکی (جيد) وە لەوێدا ئەبوذەر بوو قسەی لەگەڵ ئوبەی کرد. وە هەروەها (طحاوي) (١/٢١٠) و (طيالسي) لە ئەبوهورەیرەوە ئەیگێڕنەوە و ئیسنادەکەشی حەسەنە هەروەك لە (الإرواء) دا هەیە (٢/٨٠) و ئیبنوخوزەیمە لە صەحیحەکەیدا لە خودی ئەبوزەرەوە.

(٢) منیش ئەڵێم: شەوکانی باسی کردووە لە (نيل الأوطار ٣/٢٣٢) لە موختەصەری (بويطي) وە لە (الأم) شافعیشدا (١/١٧٥) هەیە، وە هەروەها لە (مختصر المزني (١/١٣٨)دا، وە جیاوازی کردن لە نێوان جوابدانەوەی پشمین (تشميت) و جواب دانەوەی سڵاو لای من سەلمێندراو نیەیە.

ئەمما قسەکردن لەغەیری کاتی ووتاردا دروستە، لە (ثعلبة)ی کوڕی ئەبومالیکەوە هاتووە دەفەرمووێت: صەحابە کاتی هەینی قسەیان ئەکرد، عومەریش لەسەر مینبەر دانیشتبوو، کاتێ بانگ بێژ لێ ئەبووەوە عومەر هەڵئەسا ئیتر کەس قسەی نەئەکرد هەتا هەردوو ووتارەکەی تەواو ئەکرد، کاتێ قامەت ئەکراو عومەر ئەهاتە خوارەوە ئەوان قسەیان ئەکرد (شافیعی لە موسنەدەکەیدا گێڕاویەتی‌یەوە)[1].

ئەحمەد بە ئیسنادێکی صەحیح ئەگێڕێتەوە کە (عثمان) ی کوڕی عەففان لەسەر مینبەر بوو، لە کاتێکدا بانگبێژ قامەتی ئەکرد، لەخەڵکەکە پرسیاری دەنگوباسیان و پرسیاری نرخی شتومەکیانی ئەکرد.

**فریاکەوتنی ڕکاتێك یا کەمتر لەنوێژی هەینی:**

بەشی زۆری زانایان ڕایان وایە هەرکەس فریای یەك ڕکات نوێژی هەینی بکەوێت بەجەماعەت ئەوە فریای نوێژی هەینی کەوتووە، وە پێویستە ڕکاتەکەی تریشی بخاتە سەر.

لە ئیبنوعومەرەوە هاتووە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن أدرَكَ رَكعَةً مِن صَلاةِ الجُمُعَةِ فَليُضِف إلَيهَا أُخرى وَقَد تَمَّت صَلاتُهُ) (رواه النسائي وابن ماجة والترمذي). واتە: هەرکەس فریای

چونکە حوکمی هەردووکیان لە ئەصڵدا یەکێکە، یان وەڵامدانەوەی سوننەتە وەك لە قسەی شافعی‌دا هەیە، یان واجبە وەك هەڵبژێردراوە لای زۆربەی زانایان.

جا کەواتە پێویستە جیاوازی نەکرێت لە نێوانیاندا لە قەدەغە کردن و دروست بوون.

لەم بارەشەوە لای شافیعی‌یەکان سێ ڕوو هەیە، کە نەوەوی لە (المجموع) دا باسی کردووە (٤/٥٢٤) و فەرموویەتی:

نەوەی ڕاست بێت و دەق لەبارەیەوە هاتبێت ئەوەیە کە حەرامە لە کاتی جومعەدا وەڵامی پشمین بدرێتەوە، وەك وەڵامدانەوەی سەلام

منیش ئەڵێم ئەوە نزیکترە لەوەوە کە من باسم کردووە لە (الضعیفة)دا، لەژێر حەدیسی ژمارە (٥٦٦٥) (تمام المنة).

(١) لە دوای لێ کۆڵینەوە شێخ ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت:

سوودێك:

لەم ئەسەرەدا بەڵگەی ئەوە هەیە کە جوابدانەوەی بانگبێژ بە ووتنەوەی ووشەکانی، واجب نی‌یە، لەبەر ئەوەی لەسەر ئەوە کار کراوە لەسەردەمی عومەردا لەکاتی بانگدا، و عومەریش ئیقراری پێ کردووە، وە زۆر جار پرسیارم لێ‌کراوە لەبارەی لابردنی واجبیتی وەڵامدانەوەی بانگبێژ، منیش بەم حەدیسە جوابم داوەتەوە. والله أعلم. (تمام المنة).

ڕکاتێکی نوێژی هەینی کەوت با ڕکاتەکەی تریشی بخاتە سەر، و فریای هەینی کەوتووە و نوێژەکەی تەواوە، (حافظ) لە (بلوغ المرام) دا دەفەرموێت: ئیسنادەکەی صەحیحە، بەڵام ئەبو حاتیم ئیرسالی ئەو حەدیسەی بە قەوی داناوە.

لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن أدرَكَ مِنَ الصَّلاةِ رَكعَةً فَقَد أدرَكَهَا كُلَّهَا) (رواه الجماعة). واتە: هەرکەس گەیشت بەڕکاتێکی نوێژدا ئەوە گەیشتووە بەهەموو نوێژەکەدا.

بەڵام کەسێك فریای کەمتر لە ڕکاتێك بکەوێت ئەوە نەگەیشتووە بە نوێژی هەینیدا، ئەبێ چوار ڕکات نوێژی نیوەڕۆ بکات بەقسەی بەشی زۆری زانایان[1].

ئیبنومەسعود دەفەرموێت: کەسێك فریای ڕکاتێکی نوێژی هەینی کەوت ڕکاتەکەی تریش تەواو بکا، بەڵام ئەگەر کەسێك فریای هەردوو ڕکاتەکە نەکەوت، با چوار ڕکات بکات، (رواه الطبراني بإسناد حسن)[2].

ئیبنوعومەر دەفەرموێت: ئەگەر فریای ڕکاتێ لە نوێژی هەینی کەوتی ڕکاتەکەی تریش تەواو بکە، بەڵام ئەگەر گەیشتی بەجەماعەت دانیشتبوون بۆ تەحییات چوار ڕکات بکە (بەیهەقی گێراویەتی‌یەوە).

ئەمەش مەزهەبی شافیعی‌یەکان و مالیکی‌یەکان و حەنبەلی‌یەکان و موحەممەدی کوڕی حەسەنە.

ئەبوحەنیفەو ئەبو یوسف ووتویانە: هەرکەس گەیشت بە ئیمام لە تەحییاتدا بوو ئەوە فریای نوێژی هەینی کەوتووە، کاتێ ئیمام سلاوی داوە هەڵسێتەوە دوو ڕکات بکات و هەینی‌یەکەی تەواوە.

**نوێژ لە شوێنی قەرەباڵغدا:**

ئەحمەد و بەیهەقی لە سەییارەوە ئەگێڕنەوە دەفەرموێت: گوێم لە عومەر بووە ووتاری ئەدا ئەیفەرموو: پێغەمبەر ﷺ ئەم مزگەوتەی دروست کردووە ئێمەشی لەگەڵ بووین موهاجیرین و

---

(١) وە نیریەتی جومعەی لێ بێتێ (دانەر).

(٢) منیش ئەڵێم: لە (مجمع الهيثمي ٢/١٩٢)وە هێناویەتی بەڵام ئەبووایە تەصحیحی بکردایە، لەبەر ئەوەی (طبراني) لە (الكبير)دا لە چەند ڕێگایەکەوە تەخریجی کردووە لە ئەبو ئیسحاقەوە لە ئەبو ئەحوەصەوە لە ئیبنومەسعودەوە (٣٥٨/٩-٣٥٩/٩٥٤٥/٩٥٤٩) و جگە لەویش تەخریجیان کردووە جا بگەڕێرەوە بۆ (الإرواء ٦٢١) و (الأجوبة النافعة) بەڵام ئەو ئەسەرەی ئیبنوعومەر کە لەمەودووا باسەکەی دێت، لە ریوایەتی بەیهەقی ئەوە بەهێزە وەکو لەویێ ڕوونم کردۆتەوە. (تمام المنة).

ئەنصار، جا کاتێ زۆر قەرەباڵغ بوو باهەریەکێکیان لەسەر پشتی براکەی سەجدە بەرێت[1]، وە کۆمەڵێکی بینی لەسەر ڕێگاکە نوێژیان ئەکرد پێی فەرموون: لەناو مزگەوتەکەدا نوێژ بکەن.

**نوێژی سوننەت پێش جومعە و دوای جومعە:**

سوننە چوار ڕکات یا دوو ڕکات نوێژ دوای نوێژی هەینی بکرێت، لە ئەبوهورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن كَانَ مُصَلِّياً بَعدَ الجُمُعَةِ فَلِيُصَلِّ أربَعاً) (رواه مسلم و أبوداود والترمذي). واتە: هەرکەس دوای نوێژی هەینی نوێژ ئەکات با چوار ڕکات بکات.

لە ئیبنوعومەرەوە هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ دوای هەینی دوو ڕکاتی ئەکرد لەماڵەوە. (جەماعەت گێڕاویانەتەوە).

ئیبنوقەییم دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ نوێژی هەینی ئەکرد ئەچووە ماڵەوە دوو ڕکات نوێژی ئەکرد، وە فەرمانی ئەدا بەوکەسانەی نوێژی هەینی ئەکەن دوای نوێژەکە چوار ڕکات بکەن.

ئیبنوتەیمیەی مامۆستامان دەفەرمووێت: ئەگەر نوێژە سوننەتەکە لە مزگەوتا بکا چوار ڕکات بکا، وە ئەگەر لەماڵەوە بیکا دوو ڕکات بکا[2].

منیش ئەڵێم: حەدیسەکانیش ئیشارەت بۆ ئەمە ئەکەن.

ئەبوداود لە ئیبنوعومەرەوە ئەگێڕێتەوە کە ئەو کاتێ نوێژی سووننەتی لە مزگەوت بکردایە چوار ڕکاتی ئەکرد، وە ئەگەر لەماڵەوە بیکردایە دوو ڕکاتی ئەکرد[3]، وە لە صەحیحی بوخاری و

---

(١) کورتەی قسەی شێخ ئەلبانی ئەمەیە: هەندێك لە زانایان ئەم سەیارەیان مەعلول کردووە، بەڵام ئەم بەشەی قسەکەی عومەر عبدالرزاق تەخریجی کردووە (٥٤٦٥/٥٤٦٩) لە دوو ڕێگەی ترەوە کە یەکەمیان صەحیحە و ئەوی تریان پچڕ پچڕە، بەڵام بەیهەقی بە مەوصولی داناوە، و سەنەدەکەی صەحیحە (تمام المنة).

(٢) ئەڵێم: بەم شی کردنەوەیە نازانم کە ئەصلێکی هەبووبێت لە سوننەتدا. مەگەر ئەوەی باسی ئەکات لە حەدیسی ئیبنوعومەر، و بەم نزیکانەش ڕوون کردنەوەکەی دێت، وە ئەوەی لە حەدیسە صەحیحەکەی پێشەوەدا هاتووە کە هەرکەسێك نوێژی سوننەت بکات لە دوای جومعەدا چوار ڕکات بکات. کە موسلیم وجگە لەویش گێڕاویانەتەوە، و لە (الإرواء) یشدا هەیە (٦٢٥) بەڵگەی ئەوەی تێدا نیە کە ئەو چوار ڕکاتە ئەبێ لە مزگەوت بکرێت. وە حەدیسە صەحیحەکەش ناسراوە کە: (باشترین نوێژی پیاو کە بیکات لە ماڵەوەیە جگە لە نوێژە واجبەکان) جا ئەگەر لە دوای جومعەکەی دوو ڕکات بکات یان چوار ڕکات بکات لە مزگەوتدا ئەوە دروستە، یان لە ماڵەوە بیکات هەر دروستە بەڵام لە ماڵەوە باشترە، لەبەر ئەو حەدیسە صەحیحەی کە باسمان کرد (تمام المنة).

(٣) منیش ئەڵێم: ڕستەی یەکەم ئیبنوقەییم بە شێوەیەك کورتی کردۆتەوە کە ماناکەی ناتەواو بووە، ئەمەش لە دانەر شاراوە بووە، شتی ئاوهاش سەیر نیە، چونکە دانەر پیشەیەتی کە ناگەڕێتەوە بۆ ئەصلەکان، بەڵام سەیر

موسلیمدا هاتووه له ئیبنوعومەرەوه که پێغەمبەر ﷺ دوای نوێژی هەینی دوو ڕکات نوێژی سوننەتی ئەکرد لەماڵەوه. تەواو.

ئەگەر کەسێك چوار ڕکات بکات ووتراوه بەسەریەکەوه بیکات، وه ووتراوه دوو ڕکات دوو ڕکات بیکات، بەڵام چاکتر وایه لەماڵەوه بکرێت، وه ئەگەر لەمزگەوتدا کردی ئەبێ لەوشوێنەدا نەیکات که نوێژه فەرزەکەی تێدا کردووه بەڵکو ئەبێت شوێنەکەی بگۆڕێت.

بەڵام نوێژی سوننەتی پێش نوێژی هەینی ئیبنو تەیمیەیه دەربارەی دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ له نوێژی هەینیدا دوای بانگ هیچ نوێژێکی نەکردووه، وه کەسیش نەقڵی نەکردووه لێوەی که کردبێتی، چونکه پێغەمبەر ﷺ لەسەردەمی خۆیدا بانگ نەئەدرا هەتا لەسەر مینبەر

---

ئەوەیه که شتی ئاوها له لێکۆڵەرەوەی زاد المعاد شاراوه بووه که ئیدعای ئەوه ئەکات له دەقەکان کۆڵاوەتەوه و حەدیسەکانی تەخریج کردووه، چونکه ئەویش له تەخریجی ئەم حەدیسەدا هەر بەو شێوەی ووتووه لەگەڵ ئەوەشدا ناوی سەرچاوەکانی نوسیوه که لێوەی وەرگرتووه، ئەویش ئەبوداوده (١١٣٠) له بەشی نوێژی دوای جومعه ئەوەی که لەوێدایه ئەفەرموێت: له (عطاء) هوه له ئیبنوعومەرەوه، کاتێ له مەککه بووایه پێش ئەکەوت و دوو ڕکاتی ئەکرد، پاشان چواری تری ئەکرد. وه ئەگەر له مەدینه بووایه، نوێژی جومعەی ئەکرد لەپاشان ئەچووه ماڵەوه دوو ڕکاتی ئەکرد، و له مزگەوتدا ئەو دوو ڕکاتەی نەدەکرد، جا پرسیاریان لێ کرد، ئەویش فەرمووی: پێغەمبەر ﷺ ئاوهای ئەکرد.

بەیهەقیش هەر بەو شێوەیه گێڕاویەتیەوه (٣/٢٤٠-٢٤١) که له صەحیحی ئەبو داودیشدا تەخریج کراوه (١٠٣٥).

جا تۆ ئەبینی که ڕیوایەتەکەی ئەبو داود جیاوازه لەگەڵ ئەوەدا که ئیبنوقەییم داویەتیه پاڵی له دوو ڕووەوه:

یەکەم: ئەو ئەڵێ چوار ڕکاتی کردووه که له ئەصلدا شەشه.

دووەم: ئەڵێ له مەککه وای کردووه که مەبەستی (مسجد الحرام) ه بەڵام ئیبنوقەییم ئەڵێت: له مزگەوتدا کردوویەتی که مەبەستی مزگەوتی پێغەمبەره ﷺ لەمەدینه، بەبەڵگەی ئەوەی دوایی که ووتویەتی: ئەگەر له ماڵیشەوه بیکردایه واته له مەدینه، چونکه وەك زانراوه ئیبنوعومەر مەدینەییه.

جا ئەگەر ئەوەت زانی کەواته ڕیوایەتەکەی ئەبوداود نابێته بەڵگەی ئەو شی کردنەوەیەی که ئیبنوتەیمیه ئیدعای کردووه، و ئیبنوقەیمیش ئیدعای ئەوەی کردووه که حەدیسەکه بەڵگەیه لەسەر ئەو قسەیه، لەبەر سێ شت:

ئیدعای ئەوەی کردووه که چوار ڕکاتی کردووه، ئیبنوعومەریش شەشی کردووه.

ئەمە تایبەت بوو به (مسجد الحرام) بەڵام ئیدعاکەی ئەم گشتیه.

ئەم حەدیسه مەوقوفه کەواته نابێته بەڵگه، وه لەوانەشه ئاوهای کردبێ لەبەر شتێك که پەیوەندی به خۆیەوەیەتی، یا چەند هۆیەك بێجگه لەمه، که شەوکانی باسیان ئەکات له (نیل الأوطار ٣/٢٣٩) (تمام المنة).

دانەنیشتایە، ئیتر بیلال بانگی ئەداو پێغەمبەر ﷺ دوو وتاری ئەدا، لەپاش دوو ووتارەکە بیلال قامەتی ئەکرد، ئینجا پێغەمبەر ﷺ بەرنوێژی‌یەکەی ئەکرد، ئیتر کەس مەجالی نەئەبوو دوای بانگ سوننەت بکات، نە خودی پێغەمبەر ﷺ نە ئەو موسڵمانانەی لەگەڵیا نوێژیان ئەکرد، وە کەسیش نەقڵی نەکردووە کە پێش هاتنی بۆ هەینی لەماڵەوە نوێژی کردبێت، وە کاتێکیشی دیاری نەکردووە بۆکردنی نوێژی سوننەت لەپێش نوێژی هەینیدا، بەڵکو فەرموودەکانی هاندانی تێدایە بۆ نوێژکردن کاتێ کەسێك بچێت بۆ مزگەوت لە ڕۆژی هەینی بێ ئەوەی کاتی بۆ دانابێت، وەك ئەوەی فەرموویەتی: (مَن بَكَّرَ وَابتَكَرَ ومشى وَلَم يَركَب وصلى مَا كُتِبَ لَهُ) واتە: کەسێك زوو خۆی ئامادەبکات و بڕوات و سواری هیچ نەبێت و بەپێ بڕوات، وە ئەوەندەی خوا لەچارەی نوسیبێت نوێژی کرد. وە هەر ئەوەش لە صەحابەکانەوە پێمان گەیشتووە کە کاتێ ئەهاتن بۆ مزگەوت لە ڕوژی هەینی‌دا، لەوکاتەوە ئەهاتنە ناو مزگەوت نوێژیان ئەکرد هەرچەندە بیان توانیایە، جا هەبوو دە ڕکاتی ئەکرد، هەبوو دووانزە، وە هەبوو هەشت، وە هەبوو لەوە کەمتری ئەکرد، هەر لەبەر ئەوە جەماوەری پێشەواکان لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون پێش نوێژی هەینی سوننەتێك نی‌یە کاتی بۆ دیاری کرابێت، یا ژمارەی بۆ دانرابێت، چونکە ئەوشتانە تەنها بە قسە یا بەکردەوەی پێغەمبەر ﷺ سابت ئەبێ، خۆ ئەویش سوننەتێکی وەهای لەوبارەوە دانەناوە نە بە قسە نە بەکردەوە.

## ڕێك کەوتنی هەینی و جەژن لەڕۆژێکدا

ئەگەر جەژن و هەینی کەوتنە یەك ڕۆژەوە ئەوکەسانەی نوێژی جەژن ئەکەن نوێژی هەینی‌یان لەکۆڵ ئەکەوێت، لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ نوێژی جەژنی بۆ کردین لەپاشاندا ڕێی پێدا‌ین نوێژی هەینی نەکەین، فەرمووی: هەرکەس ئەیەوێ نوێژی هەینی بکات با بیکات. (رواه الخمسة وصححه ابن خزيمة والحاكم[1]).

---

(١) دوو هەڵەی تێدایە:

یەکەم: لەو پێنجانەی کە ئەو ئەڵێت ریوایەتیان کردووە (ترمذي)یە، بەڵام (ترمذي) ریوایەتی نەکردووە، هەر لەبەر ئەوە (حافظ) لە (بلوغ المرام)دا (ترمذي) جیا کردۆتەوە لە ریوایەت کردنی ئەم حەدیسەدا. وە هەروەها لە (التلخيص) یشدا نەیگێڕاوەتەوە بۆ (ترمذي) ئەم حەدیسەم لە (صحيح أبي داود)دا تەخریج کردووە بە ژمارە (٩٨٢).

دووەم: کە ووتویەتی ئیبنوخوزەیمە بە صەحیحی داناوە کە چاوی لە صەنعانی کردووە لە سبل السلام دا، لەبەر ئەوەش تووشی ئەم هەڵەیە بووە، چونکە لە صەحیحی ئیبنوخوزەیمەدا بینیویەتی وە وای زانیوە کە هەرچی لەو

له ئەبوهورەیرەوە هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی‌ەتی: (قَدِ اجتَمَعَ فِي يَومِكُم هَذَا عِيدَانِ، فَمَن شَاءَ أجزَأهُ مِنَ الجُمُعَةِ وَإنَّا مُجَمِّعُونَ) (رواه أبوداود). واتە: لەم ڕۆژەدا بۆ ئێوە دوو جەژن یەك كەوتوون، هەركەس ئەیەوێت بە نوێژە جەژنەكە نوێژی هەینی لەكۆڵ كەوتووە، بەڵام ئێمە نوێژی هەینی ئەكەین.

موستەحەببە بۆ ئیمام نوێژی هەینی پێك بهێنێ بۆ ئەوەی ئەوانەی ئەیانەوێت ئامادەی بن ئامادەی بن، وە هەروەها بۆ ئەوكەسانەی ئامادەی نوێژی جەژن نەبوون، بەپێی ئەو فەرمودەیەی كە فەرمویەتی: (ئێمە نوێژی هەینی ئەكەین)، وە لای حەنبەلی‌یەكان كردنی نوێژی نیوەڕۆ واجبە، لەسەر ئەوانەی ناچن بۆ هەینی لەبەر ئەوەی ئامادەی نوێژی جەژن بوون، بەڵام (ظاهر) ئەوەیە واجب نی‌یە لەسەریان، بەپێی ئەوەی ئەبوداود لە ئیبنوزوبەیرەوە ئەگێڕێتەوە دەفەرمووێت: دوو جەژن لەڕۆژێكدا كۆ بوونەوە ئیتر هەردووكیانی بەسەر یەكەوە بە دوو ڕكات لە كاتی نوێژی جەژندا كردو لەوە زیاتر نوێژێكی تری نەكرد تا ئەوكاتەی نوێژی عەسری كرد.

## نوێژی هەردوو جەژنەكان

نوێژی هەردوو جەژن لەساڵی یەكەمی كۆچی‌یەوە دانراوە، ئەم دوو نوێژەش سوننەتێكی موئەككەدەیە، پێغەمبەر ﷺ لەسەری بەردەوام بووە، وە فەرمانی داوە بە پیاوان و ژنان بچنە دەر بۆی[1]، وە ئەم نوێژەش چەند باسێكی لەسەرە ئێمەش لێرەدا بەكورتی باسیان ئەكەین:

**١- خۆشۆردن و بۆنی خۆش لەخۆدان و لەبەركردنی جوانترین پۆشاك موستەحەببە:**

---

صەحیحەدا بنوسرێت صەحیحە، وە ئەوەش وا نی‌یە، چونكە زۆر جار حەدیس تەخریج ئەكات لەو بەشەدا ودواییش باسی عیللەتەكەی ئەكات و گومانی هەیەلە صیحەتی‌دا، جا لەم حەدیسەشدا هەروای كردووە، بەڵام حەدیسەكە صەحیحە لەبەر ئەو شایەتانەی كە لەسەرەوەوا لە كتێبەكەدا دێت، وە ئیبنومەدینی و حاكم و (ذهبي) بە صەحیحیان داناوە، وە لە صەحیحی ئەبوداودیشدا تەخریج كراوە بە ژمارە (٩٨٣-٩٨٤) (تمام المنة).

(١) ئەو فەرمان كردنەی پێغەمبەر ﷺ بەڵگەیە لەسەر واجب بوون، جا كاتێك چوون بۆ نوێژی جومعە واجب بێت ئەوە نوێژەكەی نزیكترە بۆ واجب بوون، هەروەك شاراوە نی‌یە.

جا ئەوەی هەق بێت ئەوەیە كە واجب بێت، نەك تەنها سوننەت بێت و هیچی تر، و لەو بەڵگانەی كە واجبێتی ئەگەیەنێ ئەوەیە كە نوێژی جومعە لەكۆڵ ئەخات ئەگەر هەردووكیان لە یەك ڕۆژدا كۆبوونەوە، هەروەك كەمێك لەمەو پێش باس كرا.

جا هەروەكو صدیق حسن خان ووتویەتی: ئەوەی واجب نەبێت واجب لە كۆڵ ناخات، جا بۆ باشتر لێكۆڵینەوە بگەڕێرەوە بۆ (الروضة الندية و السيل الجرار ١/٣١٥). (تمام المنة).

لە جەعفەری کوڕی موحەممەدەوە لە باوکی یەوە لە باپیری یەوە هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ جۆرە پۆشاکێکی یەمەنی لەبەرئەکرد لە هەموو جەژنێکدا. (شافیعی و بەغەوی گێڕاویانەتەوە)[1].

لە حەسەنی کوڕی (سبط)ەوە هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ ئەکردین لە هەردوو جەژندا جوانترین پۆشاك کە هەمان بوو لەبەری بکەین، وە خۆشترین بۆنێك کە هەمان بوو لە خۆمانی بدەین، وە بە نرخترین شتێك کە هەمان بێت بیکەن بە قوربانی. (حاکم گێڕاویەتی یەوە وە لە ئیسنادەکەیدا ئیسحاقی کوڕی (بزرج) ی تێدایە، کە ئەزدی بە (ضعیف) ی داناوە وە ئیبنو حبان بە (ثقة).

ئیبنوقەییم دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ بۆ هەردوو جەژنەکە جوانترین پۆشاکێ کە هەیبوو لەبەری ئەکرد، وە حوللەیەکی هەبوو بۆ هەردوو جەژن و ڕۆژانی هەینی لەبەری ئەکرد.

**٢- خواردن پێش چوون بۆ نوێژ لە جەژنی ڕەمەزاندا نەك لە جەژنی قوربان:**

سوننەتە چەند دەنکە خورمایەکی تاك بخورێت پێش چوون بۆ نوێژ لە جەژنی ڕەمەزاندا، و دووا خستنی ئەو خواردنە لە جەژنی قورباندا بۆ دوای گەڕانەوە لە شوێنی نوێژ، جا کاتێ گەڕایەوە لە قوربانی یەکەی بخوات ئەگەر قوربانی کردبوو.

ئەنەس دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ بۆ نوێژی جەژنی ڕەمەزان نەئەچووە دەر هەتا چەند دەنکە خورمایەکی تاکی نەخواردایە. (ئەحمەد و بوخاری گێڕاویانەتەوە).

لە بورەیدەوە هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ نەئەچووە دەر بۆ نوێژی جەژنی ڕەمەزان هەتا شتێکی نەخواردایە. وە لە جەژنی قورباندا هیچی نەئەخوارد هەتا نەئەگەڕایەوە. (ترمذی و ئیبنوماجەو ئەحمەد گێڕاویانەتەوە). وە لای ئەحمەد ئەمەی زیاد کردووە کە دەفەرمووێت: لە قوربانی یەکەی ئەخوارد.

لە (الموطأ) دا هاتووە: سەعیدی کوڕی موسەییب دەفەرمووێت: خەڵك فەرمانیان پێ ئەکرا خواردن بخۆن پێش چوونە دەر بۆ نوێژی جەژنی ڕەمەزان.

---

(١) ئەمە چەند شتێکی لەسەرە:

یەکەم: (حدیث)ەکە دوو عیللەتی تێدایە ئیرسال و لاوازی تێدایە.

دووەم: بەغەوی بە ئیسنادی خۆی ریوایەتی نەکردووە بەڵکو بە موعەللەقی هیناویەتی، بۆ زیاتر لێکۆڵینەوەش بگەڕێرەوە بۆ (تمام المنة).

له ئیبنوقودامەوە دەفەرمووێت: نەمان بیستووە كە لەنێوان زانایاندا ئیختلافێك هەبێ دەربارەی پەسەندیەتی پێش خستنی خواردن لەجەژنی ڕەمەزاندا.

**٣- چوونەدەر بۆ (مصلی) نوێژگا:**

نوێژی جەژن بەجێ هێنانی لە مزگەوتا دروستە، بەڵام بەجێ هێنانی لە دەرەوەی شار لە (مصلی) شوێنی نوێژی جەژن چاكترە[١]، بە مەرجێك عوزرێكی شەرعی نەبێت، وەك باران و شتی تر، چونكە پێغەمبەر ﷺ هەردوو نوێژی جەژنی لە (مصلی) ئەكرد[٢]، جارێك نەبێت بەهۆی بارانەوە لە مزگەوتدا نوێژی كردووە، ئەگینا لە مزگەوتەكەی خۆیدا نوێژی جەژنی نەكردووە جگە لەوجارە.

له ئەبوهورەیرەوە هاتووە دەفەرمووێت: ڕۆژێكی جەژن باران ئەباری پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوتا نوێژی جەژنی بۆ كردین، (ئەبوداود و ئیبنو ماجە و حاكم گێڕاویانەتەوە، وە لە ئیسنادەكەیدا كەسێكی مەجهول هەیە، (حافظ) لە (التلخيص)دا دەفەرمووێت: ئیسنادەكەی (ضعيف)ە (ذهبـي) دەفەرمووێت: ئەو حەدیسە مونكەرە).

**٤- چوونەدەری ئافرەتان و مندالان:**

شەرعی‌یە ئافرەتان و مندالان بچنە دەر بۆ شوێنی نوێژی جەژن، بێ ئەوەی جیاوازی هەبێت لەنێوان ئافرەتانی كچ و ژن و گەنج و پیرەژن و حەیزداردا، بەپێی ئەوەی (أم عطية) دەفەرمووێت: فەرمانمان پێ درا كچی عازەب و حەیزدار لە هەردوو جەژنەكەدا ڕەوانە بكەین بۆ نوێژگا بۆ ئەوەی حازری خێر و دوعای موسڵمانان بن، بەڵام ئەبێ حەیزدارەكان لە شوێنی نوێژەكە بەدوور بن. (بوخاری موسلیم گێڕاویانەتەوە).

له ئیبنوعەبباسەوە هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ خێزانەكانی و كچەكانی ئەبردە دەر لە هەردوو جەژنەكەدا. (ئیبنوماجەو بەیهەقی گێڕاویانەتەوە)[٣].

هەر لە ئیبنوعەبباسەوە هاتووە كە دەفەرمووێت: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ چووینە دەر ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان، یا قوربان، لەپێشدا نوێژی بۆ كردین، پاشان ووتاری خوێندەوە لەپاشاندا هات بۆلای ژنەكان و ئامۆژگاری كردن و یادی خوای خستنەوەبیر و فەرمانی پێدان كە خێر بكەن. (بوخاری گێڕاویەتی‌یەوە).

---

(١) جگە لە مەككە چونكە كردنی نوێژی جەژن لە مزگەوتی حەرامدا چاكترە (دانەر).

(٢) كە لەلای دەرگای ڕۆژهەلاتی مەدینە بوو (دانەر).

(٣) ئیسنادەكەی لاوازە بۆ زیاتر بڕوانە (تمام المنة).

### ٥- گۆڕینی ڕێگا:

بەشی زوری زانایان بۆ ئەوە چوون کە موستەحەببە چوون بۆ نوێژی جەژن لە ڕێگایەکەوە و گەڕانەوە لەڕێگایەکی ترەوە، ئیمام بێت یا مەئموم وەك یەکە.

لە جابیرەوە خوا لێی ڕازی بێ هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی جەژندا لە چوون و هاتنەوەدا ڕێگاکەی ئەگۆڕی. (بوخاری گێڕاویەتی‌یەوە).

لە ئەبو هورەیرەوە هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ کە ئەچوو بۆ نوێژی جەژن لەو ڕێگایەوە نەئەهاتەوە کە پێیدا چووبوو. (ئەحمەدو موسلیم و (ترمذي) گێڕاویانەتەوە).

هەروەها هاتنەوە لەو ڕێگایەوە کە لێوەی ڕۆیشتووە دروستە. لای ئەبوداود و حاکم و بوخاری هاتووە لە بەشی مێژوودا لە بەکری کوڕی موبەششیرەوە دەفەرمووێت: لەگەڵ هاوەڵەکانی پێغەمبەردا ﷺ بەیانی ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربان ئەچووین بۆ شوێنی نوێژ، (مصلی) لە دۆڵی (بطحان)ەوە ئەڕۆشتین هەتا ئەگەیشتینە (مصلی)، جا لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژمان ئەکردو پاشان لە دۆڵی (بطحان)ەوە بۆ ماڵەوە ئەگەڕاینەوە (ئیبنوسەکەن دەفەرمووێت: ئیسنادەکەی صالحە)[1]. (بطحان: دۆڵێکە لە مەدینە).

### ٦- کاتی نوێژی جەژن :

کاتی نوێژی جەژن لە بەرزبوونەوەی خۆرەوە ئەوەندەی سێ مەتر دەست پێ ئەکات هەتا (زوال) لادانی خۆر لەناوەڕاستی ئاسمان.

بەپێی ئەوەی ئەحمەدی کوڕی حەسەنی بەننا ڕیوایەتی کردووە لە حەدیسی جوندوبەوە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ کاتێ نوێژی جەژنی ڕەمەزانی بۆ ئەکردین خۆر ئەوەندەی دوو ڕم بەرز بوو، وە کاتێ نوێژی جەژنی قوربانی بۆ ئەکردین خۆر ئەوەندەی یەك ڕم بەرز بوو.

شەوکانی دەفەرمووێت: ئەم حەدیسە چاکترین حەدیسە کە هاتووە دەربارەی دیاری کردنی کاتی نوێژی هەردوو جەژن[2].

---

(١) نەخێر ئسنادەکەی صالح نیە بۆ زیاتر بڕوانە (تمام المنة).

(٢) ئەو قسەیە ڕاستە ئەگەر حەدیسەکە صەحیح بووایە، بەڵام ئیسنادەکەی ئەحمەدی کوڕی حەسەن نیە بەڵکو حەسەنی کوڕی ئەحمەدە، لە دوایی‌دا شێخ ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: بەڵام لەم بەشەدا حەدیسێکی صەحیح هەیە لە عەبدوڵڵای کوڕی بوسرەوە کە لە جەژنێکی قورباندا یان لە جەژنێکی ڕەمەزاندا لەگەڵ خەڵکەکە چووە دەر و ئینکاری درەنگ کردنی ئیمامی کرد و ووتی: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ئەم کاتانە نوێژمان کردبوو، ئەویش لەکاتی چێشتەنگاودا بووە. (تمام المنة).

له حه‌دیسه‌كه‌دا ده‌رئه‌كه‌وێت كه موسته‌حه‌ببه نوێژی جه‌ژنی قوربان پێش بخرێت و نوێژی جه‌ژنی ڕه‌مه‌زان دووا بخرێت. ئیبنو قودامه ده‌فه‌رموێت: سوننه‌ته نوێژی جه‌ژنی قوربان پێش بخرێت، بۆ ئه‌وه‌ی ماوه هه‌بێت قوربانی سه‌ر ببڕێت، وه سوننه‌ته نوێژی جه‌ژنی ڕه‌مه‌زان دووا بخرێت بۆ ئه‌وه‌ی ماوه‌ی ده‌ركردنی (زكاة الفطر) سه‌رفیتره فراوان تر بێت، وه جیاوازی نێوان زانایان نازانم له‌سه‌ر ئه‌وه.

**٧- بانگ دان و قامه‌ت كردن بۆ نوێژی جه‌ژن:**

ئیبنو قه‌ییم ده‌فه‌رموێت: پێغه‌مبه‌ر ﷺ كاتێ ئه‌گه‌یشته (مصلى) شوێنی نوێژی جه‌ژن، یه‌كسه‌ر ده‌ستی ئه‌كرد به نوێژ كردن، بێ ئه‌وه‌ی بانگ بدرێت یا قامه‌ت بكرێت بۆی، وه نه‌شیان ئه‌ووت: (الصلاة جامعة) نوێژ دابه‌ستړا به جه‌ماعه‌ت، وه سوننه‌ته هیچ كام له‌وانه نه‌كرێن. ته‌واو.

له ئیبنوعه‌بباس و جابیره‌وه هاتووه فه‌رمویانه: بۆ نوێژی جه‌ژنی قوربان و بۆ نوێژی جه‌ژنی ڕه‌مه‌زان نه بانگ ئه‌درا نه قامه‌ت ئه‌كرا. (بوخاری و موسلیم گێڕاویانه‌ته‌وه).

لای موسلیم له (عطاء)ه‌وه هاتوه ده‌فه‌رموێت: جابیر پێی ڕاگه‌یاندم كه بۆ نوێژی جه‌ژنی قوربان نه بانگدان هه‌یه نه قامه‌ت كردن كاتێ ئیمام دێت یا دوای هاتنی، وه نه بانگه‌واز كردنی تێدایه له‌وكاته‌دا و نه قامه‌ت كردن.

له سه‌عدی كوڕی ئه‌بو وه‌ققاصه‌وه هاتووه كه پێغه‌مبه‌ر ﷺ نوێژی جه‌ژنی بێ بانگ و قامه‌ت كرد، وه دوو ووتاری ئه‌دا به‌پێوه له‌نێوانیاندا دائه‌نیشت. (به‌ززار گێڕاویه‌تیه‌وه)[1].

**٨- ووتنی (الله أكبر) له نوێژی هه‌ردوو جه‌ژندا:**

نوێژی جه‌ژن دوو ركاته سوننه‌ته بۆ نوێژكه‌ر پێش فاتیحه خوێندن له ڕكاتی یه‌كه‌مدا حه‌وت جار (الله أكبر) بكات دوای (الله أكبر) ی نوێژ دابه‌ستن، وه له ڕكاتی دووه‌مدا پێنج (الله أكبر) بكات جگه له (الله أكبر) ی هه‌ڵسانه‌وه، له‌گه‌ڵ ده‌ست به‌رز كردنه‌وه بۆ هه‌موو (الله أكبر)[2]ێك[3].

(١) دانه‌ر بێ ده‌نگه له‌سه‌ری ئه‌وه ده‌رئه‌خات صه‌حیح بێت، به‌ڵام صه‌حیح نی‌یه ته‌نانه‌ت حه‌سه‌نیش نی‌یه، بۆ زیاتر بڕوانه (تمام المنة).

(٢) ده‌ست به‌رز كردنه‌وه له عومه‌رو عبدالله ی كوڕی‌یه‌وه ریوایه‌ت كراوه (دانه‌ر).

(٣) ڕاستی ئه‌وه‌یه بووترێ سوننه‌ت نی‌یه. له‌به‌ر ئه‌وه‌ی شتی وا له پێغه‌مبه‌ره‌وه ﷺ سابت نه‌بووه، وه ئه‌گه‌ر له عومه‌ر و كوڕه‌كه‌یه‌وه ریوایه‌ت كرابێت ئه‌وه نابێته به‌ڵگه، ئایا نابینیت كه دانه‌ر له ووتنی الله أكبر ی سه‌ر جه‌نازه هه‌روه‌ك ئێمه‌ی ووتووه، وه هه‌روه‌كو ئێمه به‌ڵگه‌ی هێناوه‌ته‌وه، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا كه به صه‌حیحی هاتووه ئیبنوعومه‌ر ده‌ستی له ته‌كبیره‌كانی نوێژی جه‌نازه‌دا به‌رز ئه‌كرده‌وه، جا ئه‌گه‌ر ئه‌و كاره‌ی ئیبنوعومه‌ر ته‌كبیر كردنه‌كه ئه‌كات به

لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکی یەوە لە باپیری‌یەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ دووانزە جار (الله أكبر) ی ئەکرد لە نوێژی جەژندا، حەوتیان لە ڕکاتی یەکەمدا و پێنج لە ڕکاتی دووەمدا، نە لەپێش ئەو نوێژەدا نوێژی ئەکرد نە لە دوای. (ئەحمەدو ئیبنو ماجە گێڕاویانەتەوە، وە ئەحمەد دەفەرموێت: من ئەو بۆچوونەم هەیە).

وە لە ریوایەتەکەی ئەبوداود و (دارقطني) دا هاتووە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لە نوێژی جەژنی ڕەمەزاندا لەڕکاتی یەکەمدا حەوت جار (الله أكبر)ە و لە ڕکاتی دووەمدا پێنج جارە، وە دوای هەردوو جارەکە خوێندنی فاتیحە هەیە)، ئەم قسەیەش (أرجح) بەهێزترین قسەیە لەو بارەوە. وە بەشی زۆری زانایان لە صەحابەو تابعین و پێشەواکان بو ئەوە چوون.

(ابن عبد البر) دەفەرمووێت: ریوایەت کراوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ لە چەند ڕێگای حەسەنەوە کە لە هەردوو نوێژی جەژنەکاندا حەوت (الله اكبر) ی کردووە لە ڕکاتی یەکەم و پێنج لە ڕکاتی دووەم، کە لە حەدیسی عبدالله ی کوڕی عەمر و ئیبنو عومەر و جابیر و عائیشە و ئەبوواقید و عەمری کوڕی عەوفی موزەنی‌یەوە ریوایەت کراوە.

وە نە لە ڕێگای بەهێزەوە و نە لەڕێگای بێ هێزەوە پێچەوانەی ئەوە نەگێڕراوەتەوە، وە ئەوە یەکەم شتە کاری پێ کرابێت لەوبارەیەوە. تەواو[1].

پێغەمبەر ﷺ نەختێ بێ دەنگ ئەبوو لەنێوان هەردوو (الله اكبر) ووتنێکەوە، بەڵام زکرێکی دیاری کراوی لێوە نەگێڕراوەتەوە لەو نێوانەدا.

بەڵام (طبراني) و بەیهەقی بەسەندێکی بەهێز ئەگێڕنەوە لە ئیبنومەسعودەوە لە ووتەو کردەوەیەوە، کە ئەو (الحمد لله) و ستایشی خوای کردووە و سڵاواتی داوە لەسەر پێغەمبەر ﷺ لەنێوان ووتنی (الله اكبر)ەکاندا[2].

---

سوننەت ئەوە با بلێت سوننەتە، وەگەرنە، با دان بە نادروستی‌یەکەیدا بنێت، لە هەردوو شوێنەکەدا، کە هەقیش هەر ئەوەیە، بە تایبەت کە ریوایەتەکەی عومەر و کوڕەکەی لێرەدا صەحیح نی‌ی، چونکە ئەوەکەی عومەر بەیهەقی بە زەعیفی گێڕاویەتی‌یەوە، وە ئەوەی ئیبنوقەییم تا ئێستا لی‌ی نەکۆڵاوەتەوە، وە مالیك ووتویەتی هیچم لەبارەیەوە نەبیستووە، سەیری (الإرواء) بکە ژمارە (٦٤٠). (تمام المنة).

(١) بەڵام لەلای حەنەفی‌یەکان لەیەکەمدا سێ (الله اكبر) هەیە لەدوای (الله اكبر) ی دابەستن، وە پێش قیرائەت، وە لە دووەمدا سێ (الله اكبر) هەیە دوای قیرائەت (دانەر)٠

(٢) شێخ ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: دانەر سەنەدەکەی بە بەهێز داناوە بە چاولێکەری لە (حافظ) لە (التلخيص) دا، ومن تێڕوانینم هەیە لەسەری پاشان دەفەرمووێت:

وە ئەمە لە حوزەیفە و ئەبو موساشەوە ریوایەت کراوە[1].

وە ووتنی: ئەو (الله أكبر)انە سوننەتن، وە بە نەووتنیان بەقەستی یا بەهەڵە نوێژ پوچەڵ نابێتەوە.

ئیبنو قودامە دەفەرمووێت: لەوبارەیەوە نازانم کە خیلاف هەبێ، وە شەوکانی پارسەنگی ئەوەی داوەتەوە ئەگەر کەسێك بەهەڵە نەیووتن سەجدەی سەهو نەبات.

**٩- نوێژ کردن پێش و پاشی نوێژی جەژن:**

سابت نەبوە لە پێش نوێژی جەژندا یا دوای نوێژی جەژن سوننەت هەبێت، نە پێغەمبەر ﷺ خۆی و نە هاوەڵەکانی دوای خۆی نوێژیان نەکردووە پێش نوێژی جەژن کاتێ گەیشتوونە (مصلی)، وە لە دوای نوێژی جەژنیش نوێژیان نەکردووە.

ئیبنوعەبباس دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ چوو بۆ نوێژی جەژن تەنها دوو ڕکات نوێژی کرد، ئیتر نە لە دوایانەوە نە لەپێشیانەوە نوێژی تری نەکرد، (جەماعەت گێڕاویانەتەوە).

وە لە ئیبنوعومەرەوە هاتووە: کە ڕۆژی جەژن چووە بۆ نوێژی جەژن نە لەپێش نوێژی جەژنەوە نە لەدوای نوێژی جەژنەوە هیچ نوێژی نەکردووە، ئەیفەرمو: پێغەمبەر ﷺ بەوشێوەی کردووە.

---

بەیهەقی لە بەشی پێش ئەم بەشەدا لە چەند ڕێگایەکەوە قسەی ئیبنومەسعودی نەقڵ کردووە، وە ئیبنوئەبی شەیبە لە چەند ڕێگایەکی زۆرتر لە ڕێگاکانی بەیهەقی هێناویەتی، وجگە لەوانیش باسیان کردووە، بەڵام لە هیچ کامیاندا باسی زکری نێوان ئەو تەکبیرانەی نەکردووە، وە لە هیچ حەدیسێکی خاوەن سەنەدەوە لە هیچ کام لە سەلەف وەك ئێمە بزانین باسی ئاوها نەهاتووە، مەگەر لەم ڕێگا لاوازەوە، و لە حەدیسەکەی جابیردا کە لەمەو دووا باس ئەکرێت چەند کەسانێك هەیە لە سەنەدەکەیدا کە پێویستی بە ڕوون کردنەوەی حاڵیان هەیە (هەروەها لە سەنەدەکەیدا عەلی کوڕی ئەبو عاصم هەیە، کە یەزیدی کوڕی هارون لەبارەیەوە ئەڵێت: ئێمە هەروای ئەناسین کە درۆ بکات... دوای ئەوە ووتویەتی: ئەگەر شتی وا دروست بووایە ئەوە بۆ ئێمەیان ریوایەت ئەکرد، وە سەلەفیش پشت گوێیان نەدەخست.

پاشان لە ڕێگایەکی ترەوە وەستام لەسەر ئەم ئەسەرەی ئیبنومەسعود وەختێك کە لێکۆڵینەوەم لە کتێبی (فضل الصلاة على النبي ﷺ) کردووە کە دانەرەکەی ئیمام ئیسماعیلی قازیە.

و لەوێدا ئەوەم باس کردووە کە سەنەدەکەی حەسەنە، هەروەها (حافظ) سەخاوی بە صەحیحی داناوە لە کتێبی (القول البديع في الصلاة على الحبيب الشفيع) (ل١٥١ ی چاپی هیندی)، جا سەیری کتێبی (فضل الصلاة) بکە (ل٣٧-٣٨) چاپی (المكتب الإسلامي) وە هەروەها (الإرواء ٦٤٢). (تمام المنة).

(١)ئەحمەد و شافیعی بە موستەحەبیان داناوە لەنێوان (الله اكبر) ەکاندا زیکری خوا بکرێ بۆ نموونە بووترێ: (سبحان الله، والحمد لله، ولا إله إلا الله، والله اكبر) ، وە ئەبو حەنیفە و مالیك ووتویانە: (الله اكبر) ەکان لەسەر یەك بکرێن بێ ئەوەی نێوانیان تێ بکرێ بە زیکر کردن. (دانەر).

بوخاری باسی ئەوە ئەکات کە ئیبنو عەبباس لای خراپ بوو نوێژی سوننەت بکرێت لەپێش نوێژی جەژنەوە.

بەڵام لەبارەی نوێژی سوننەتی (مطلق)ەوە، (حافظ) ئیبنوحەجەر لە (الفتح)دا دەفەرموورێت: قەدەغەکردنی سابت نەبوە بە بەڵگەیەکی تایبەت، مەگەر لەکاتی کەراهەتدا بێت لە هەموو رۆژەکاندا.

**١٠- نوێژی جەژنی کێ دروستە؟:**

کردنی نوێژی جەژن لەلایەن پیاو و ژن و منداڵەوە دروستە، موسافیر بن یا دانیشتوو، بە جەماعەت بیکەن یا بەتاك، لەناو ماڵدا بێت یا لە مزگەوتدا یا لە (مصلی)دا، وە هەرکەس بە جەماعەت بۆی نەکرا با بەتەنها دوو رکات نوێژی جەژن بکات، بوخاری دەفەرموورێت: (بابٌ) ئەگەر کەسێك بەجەماعەت نوێژی جەژنی بۆ نەکرا دوو رکات بەتەنها بکات، وە هەروەها ئافرەت و ئەوکەسانەی لەماڵن یا لە گوندن).

بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: (هَذَا عِيدُنَا أهلَ الإسلامِ) واتە: ئەمە جەژنی ئێمەی موسڵمانانە.

وە ئەنەسی کوڕی مالیك فەرمانی دا بە ئیبنوئەبی عوتبەی مەولای لە (زاوية) کەسوکاری و کورەکانی کۆ کردەوەو وەك چۆن لەشاردا نوێژی جەژن و (الله أكبر) ئەکرێت، بەو شێوەیە نوێژی بۆ کردن.

عیکریمە دەفەرموورێت: عامەی خەڵکی ئەبێ کۆ ببنەوە دوو رکات نوێژ بکەن هەروەکو ئیمام.

(عطاء) دەفەرموورێت: ئەگەر کەسێك نوێژی جەژنی بەجەماعەت بۆ نەکرا دوو رکات بۆ خۆی بەتەنها بکات.

**١١- ووتاری جەژن:**

ووتار دوای نوێژی جەژن سوننەتە وە گوێ لێ گرتنی هەر سوننەتە، لە ئەبو سەعیدەوە هاتووە دەفەرموورێت: پێغەمبەر ﷺ جەژنی رەمەزان و قوربان ئەچوو بۆ (مصلی) شوێنی نوێژ[1]. یەکەم کار ئەیکرد نوێژ بوو، لەپاش سلاودانەوە بەرامبەر خەڵکەکە بەپێوە ئەوەستا و خەڵکەکەش لەرێزەکانی خۆیاندا دانیشتبوون، ئامۆژگاری ئەکردن و فێری ئەکردن و فەرمانی بە چاکە پێ

(١) لە نێوان (مصلی) و مزگەوتەکە هەزار زیراع بوو. (دانەر).

ئەکردن، وە ئەگەر بیویستایە کۆمەڵێك لە سوپا بەلایەکدا بنێرێ ئەینارد، یا فەرمانێکی دەربکردایە فەرمانی ئەدا، پاشان ئەڕۆیشت.

ئەبو سەعید ئەڵێ: خەڵك هەر لەسەر ئەوە مابوونەوە هەتا جەژنێك لەگەڵ مەڕواندا چووم بۆ نوێژی جەژنی ڕەمەزان یا قوربان، ئەوکاتەی ئەمیری مەدینە بوو، کاتێ گەیشتینە شوێنی نوێژ لەوێدا (کثیر)ی کوڕی (صلت)، مینبەرێکی دروست کردبوو، مەڕوانیش ویستی پێش ئەوەی نوێژ بکا بچێتە سەری و ووتار بدات، منیش لیباسەکەیم ڕاکێشا، خۆی بەردا لەدەستم و چووە سەر مینبەرەکەو پێش ئەوەی نوێژی جەژن بکات ووتاری دا. منیش پێم ووت: سوێند بەخوا گۆڕیتان. ئەویش ووتی: ئەبوسەعید! ئەوەی تۆ ئەتزانی ڕۆیشت. منیش ووتم: وەڵڵاهی ئەوەی من ئەیزانم خێرترە لەوەی نایزانم، ئەویش ووتی: خەڵکەکە بۆ ئێمە دانانیشن گوێ لە ووتارەکەمان بگرن، لەبەر ئەوە ووتارەکەم پێش نوێژەکە خست. (بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە).

لە عبداللە ی کوڕی سائیبەوە هاتووە دەفەرموێت: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ئامادەی نوێژی جەژن بووم، کاتێ لەنوێژ بووەوە فەرمووی: (ئێمە ئێستا ووتار ئەخوێنین، هەرکەس حەز ئەکات دابنیشێ گوێ لە ووتارەکە بگرێت با دابنیشێت، هەرکسیش ئەڕوات با بڕوات). (نسائی و ئەبوداود و ئیبنوماجە گێڕاویانەتەوە)[1].

وە هەرچی هاتووە دەربارەی ئەوەی ووتاری جەژن دوو ووتارەو ئیمام لەنێوانیاندا دائەنیشێ ئەوە زەعیفە، نەوەوی دەفەرموێت: دەربارەی دووبارەکردنەوەی ووتار هیچ سابت نیە.

وە موستەحەببە سەرەتای ووتار بە (الحمد لله) دەست پێ بکرێت، وە لەوە زیاتر هیچی تر لە پێغەمبەرەوە ﷺ نەهاتووە.

ئیبنو قەییم دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ هەموو ووتارەکانی بە (الحمد لله) دەست پێ ئەکرد، وە لەوەوە نەهاتووە هەتا یەك حەدیسیش کە دوو ووتاری جەژنەکەی بە (الله أكبر) دەست پێ کردبێت.

(١) کورتەی قسەی شێخ ئەلبانی ئەوەیە کە (حدیث)ەکە صەحیحە.

بەڵکو ئیبنوماجە لە سونەنەکەیدا لە سەعیدەوە ئەگێڕێتەوە کە بانگدەری پێغەمبەر بوو ﷺ، کە لە نێوان ووتارەکەدا (الله أکبر) ی ئەکرد، وە زیاد (الله أکبر) ی ئەکرد لە ووتاری دوو جەژنەکەدا، ئەمەش بەڵگەی ئەوە نیە کە ووتارەکەی بە (الله أکبر) دەست پێ کردبێت[١].

وە خەڵك جیاوازیان هەیە دەربارەی ووتاری (إستسقاء) نوێژی باران و نوێژی هەردو جەژن، ئەڵێن: هەردووکیان بە (الله أکبر) دەست پێ بکرێ، وە ئەڵێن: ووتاری نوێژی باران بە (أستغفر الله) دەست پێ بکرێ، وە ئەڵێن: هەردووکیان بە (الحمد لله) دەست پێ بکرێ.

شێخی ئیسلام (تقي الدین) دەفەرمووێت: ئەمە ڕاستە، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (كُلُّ أمرٍ ذِي بَالٍ لايُبدَأُ فِيهِ بِالحَمدُ لله فَهُوَ أجذَمُ) واتە: هەرکارێك بە (الحمد لله) دەست پێ نەکات ناتەواوە، وە پێغەمبەر ﷺ هەموو ووتارەکانی بە (الحمد لله) دەست پێ کردووە، ئەما قسەی بەشی زوری زانایان کە ئەڵێن: ووتاری نوێژە بارانە بە (أستغفر الله) دەست پێ بکاتو ووتاری جەژنەکان بە (الله أکبر) ووتن، ئەوە سوننەتی پێغەمبەریان ﷺ بە هیچ شێوەیەك لەگەڵدا نیە، بەڵکو سوننەت پێچەوانەی ئەویە، کە ئەویش ئەوەیە هەموو ووتارێك بە (الحمد لله) دەست پێ بکرێ.

## ١٢- گێڕانەوەی نوێژی جەژن:

ئەبو عومەیری کوڕی ئەنەس دەفەرمووێت: مامەکانم لە ئەنصار کە لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ بوون بۆیان گێڕامەوە ووتویانە: لە کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا ئاسمان هەور بوو، مانگی شەووالمان بۆ ئاشکرا نەبوو، ئەو ڕۆژە ڕۆژ بووەوە بەڕۆژوو بووین لە دوای عەسر کۆمەڵێك سووار هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ شایەتیان دا کە ئەوان دوێنێ مانگیان بینیوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کردن ڕۆژووەکانیان بشکێنن، وە بەیانی بچن بۆ نوێژی جەژن. (ئەحمەدو نەسائی و ئیبنوماجە بەسەنەدی صەحیح گێڕاویانەتەوە).

جا لەم حەدیسەدا بەڵگەی ئەوانە هەیە کە ئەڵێن: ئەگەر کۆمەڵێك نوێژی جەژنیان بۆ نەکرا بەهۆی مەعزەرەتێکەوە ڕۆژی دوایی بۆیان هەیە بچنەدەر بۆ نوێژی جەژن.

---

(١) هەرچەندە بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی دەست پێ کردنی ووتار بە (الله اکبر) بێت، ئیسنادەکەشی لاوازە، کەواتە دروست نیە بکرێت بۆ بەڵگە بۆ سوننیەتی تەکبیر کردن لە پێش (خطبة)دا (تمام المنة).

**١٣- یاری و خۆشی و گۆرانی و خواردن لە ڕۆژی جەژنەکاندا:**

یاری ڕەواو ڕابواردنی بێ تاوان و گۆرانی چاك، ئەمانە لە دروشمە ئایینی‌یەکانن کە خوا داینناوە بۆ ڕۆژی جەژن، بۆ ئەوەی وەك وەرزشێك وابێ بۆ لەش و پشوودانێك بودەروون.

ئەنەس دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ هاتە مەدینە خەڵکی مەدینە دوو ڕۆژیان هەبوو یاریان تێدا ئەکرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (قَد أبدلَكُمُ اللهُ تعالى بِهِمَا خيراً مِنهُمَا، يَومَ الفِطرِ والأضحَى) (رواه النسائي وابن حبان بسندٍ صحيح). واتە: خوای گەورە ئەو دوو ڕۆژەی بۆ گۆڕیون بە دوو ڕۆژ لەوان چاکتر، کە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربانە.

عائیشە دەفەرمووێت: حەبەشەیی‌یەکان لەڕۆژێکی جەژندا لای پێغەمبەر ﷺ یاریان ئەکرد، منیش لەسەر شانی‌یەوە سەیرم کردن، ئەویش شانی بۆ دانەواندم سەیرم کردن، هەتا تێر بووم لە سەیر کردن پاشان ڕۆیشتم. (ئەحمەدو هەردوو شێخ گێڕاویانەتەوە).

وە هەرئەوان لە عائیشەوە گێڕاویانەتەوە فەرمویەتی: ڕۆژێکی جەژن ئەبوبەکر هات بۆ ماڵمان، دوو کیژۆڵەمان لابوو (جارية) بەدەنگەوە ڕۆژی (بعاث)[1]یان ئەلاواندەوە کە چەند لە کەڵە پیاوانی ئەوس و خەزرج تێیدا کوژرابون، جا ئەبوبەکر کاتێ بینی فەرموی: بەندەکانی خوا تایا لای پێغەمبەر و جوزەڵەی شەیتان؟! سێ جار ئەمەی فەرمو؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (يَا أبَابَكرٍ إنَّ لُكُلِّ قَومٍ عِيداً وَإنَّ اليَومَ عِيدُنَا). واتە: ئەی ئەبوبەکر هەموو گەلێك جەژنێکی هەیە، ئەمڕۆش جەژنی ئێمەیە.

وە لای بوخاری هاتووە کە عائیشە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ هاتە ماڵەوە دوو جاریەم لابوو گۆرانی ڕۆژی (بعاث) یان ئەووت، ئەویش لەسەر جێگاکە ڕاکشاو پشتی تێ کردین، پاشان ئەبوبەکر هات ئەوەی بینی لێم توورە بوو، فەرموی: جوزەڵەی شەیتان لای پێغەمبەر ﷺ ؟ پێغەمبەر ﷺ ڕووی تێ کردو فەرمووی: وازیان لێبهێنە، کاتێ پێغەمبەر ﷺ غافڵ بوو ئیشارەتم بۆ جاریەکان کرد، چوونە دەرەوە، وە ئەو ڕۆژە جەژن بوو سودانی هاتبوون بە حەربەو قەڵغان یاری‌یان ئەکرد، جا یا من داوام لە پێغەمبەر ﷺ کرد یا خۆی فەرمووی: (حەز ئەکەیت سەیریان بکەیت؟) ووتم: بەڵێ، ئەویش لەدوای خۆی وەستاندمی ڕوومەتم نا بە ڕوومەتی‌یەوە،

(١) (بعاث)، ناوی قەڵایەکی ئەوسە. وە ڕۆژی (بعاث) ڕۆژێکە لە ڕۆژە بەناوبانگەکانی عەرەب، کە کوشتارێکی زۆری تێدا بوو لەلایەن ئەوسەوە بەسەر خەزرەجدا. (دانەر).

تەیفەرموو: (دُونَكُم يَا بَنِي أرفدة) واتە: ئادەی هۆ بەنی ئەرفەدە. هەتا بێ تاقەت بووم، فەرمووی: (بەستە؟) ووتم: بەڵێ، فەرمووی: (دە بڕۆ).

(حافظ) لە (فتح)دا دەفەرمووێت: (ابن السراج) لە ڕێگای (أبو الزناد)ەوە ئەگێڕێتەوە لە عوروەوە لە عائیشەوە کە پێغەمبەر ﷺ ئەوکاتە فەرمووی: (لِتَعلَمَ يَهُودُ المَدِينَةِ أنَّ فِي دِينِنَا فُسحَةً، إنِّي بُعِثتُ بِحَنِيفِيَّةٍ سَمحَةٍ). واتە: با جولەکەی مەدینە بزانن ئایینەکەمان چەند فراوانە، وە من بە حەنیفی‌یەی سەمحەوە نێردراووم[1]. (واتە ئایینێکی لادەرە لە بەتاڵ و ئایینی لێبوردەیی‌یە).

لای ئەحمەدو موسلیم هاتووە لە نوبەیشەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أيَّامُ التَّشرِيقِ أيَّامُ أكلٍ وَشُربٍ وَذِكرِ اللهِ عَزَّوَجَل). واتە: ڕۆژانی تەشریق (کە جەژنی قوربانە) ڕۆژانی خواردن و خواردنەوە و یادی خوای گەورەن.

### ١٤- (فضل) ی کردەوەی چاکە لە دە ڕۆژەی مانگی (ذي الحجة):

لە ئیبنو عەبباسەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَا مِن أيَّامٍ العَمَلُ الصَّالِحُ أحَبُّ إلى اللهِ عَزَّوَجَلَّ مِن هَذِهِ الأيَّامِ (يعني أيَّامَ العَشرِ) قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ! وَلا الجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللهِ؟ قَالَ: وَلا الجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللهِ، إلا رَجُلٌ خَرَجَ بِنَفسِهِ وَمَالِهِ ثُمَّ لَم يَرجِع بِشَيئٍ مِن ذَلِكَ). (رواه الجماعة إلا مسلماً والنسائي). واتە: هیچ ڕۆژانێك نی‌یە کردەوەی چاکە کردن تێیاندا لای خوا خۆشەویست تر بێت لەم ڕۆژانە، (واتە: ئەو دەڕۆژە) ووتیان: ئەی نێرراوی خوا هەتا جیهادیش لەڕێگای خوادا؟ فەرمووی: هەتا جیهادیش لەڕێگەی خوادا، بێجگە لە پیاوێك نەبێت کە بەگیان و ماڵەوە چووبێتە دەر و هیچیانی بۆ نەگەڕابێتەوە.

---

(١) کورتەی قسەی شێخ ئەلبانی لەم بارەیەوە ئەوەیە: (دوای بەڵگە هێنانەوە لەسەر زەعیفی ئەو ریوایەتە) ڕێگایەکی ترم بۆ دۆزیوەتەوە لە ریوایەتی یەعقوبی کوڕی زەیدی تەیمی لە عائیشەوە کە حومەیدی تەخریجی کردووە و پیاوەکانی سیقەن، وە ئەگەر (إنقطاع)ی تێدا نەبێت لەنێوان عائیشە و تەیمی‌دا ئەوە صەحیحە، وەگەر نە، بەڵگەیەکی بەهێزە.

بەڵام بۆ ڕستەکەی دوایی (ئایینی حەنیفی سەمحە) چەند شایەتێکی تری هەیە وەك لە (الصحيحة) دا بەم مانایە تەخریجم کردووە بە ژمارە (٢٩٢٤)

وە ڕێگاکانی هەر پێنج حەدیسەکەم هێناوە و باسی زاراوەکانیم کردووە و باسی ئەو زاراوانەیشیم کردووە کە لە هەندێ ڕێگادا هاتووە. لە (كتاب المساجد) و لە (الثمر المستطاب)دا پاشان لە (آداب الزفاف ١٦٣-١٦٩).

لای ئەحمەدو (طبراني) لە ئیبنوعومەرەوە هاتووە[1] کە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَا مِن يَومٍ أعظَمُ عِندَ اللهِ سُبحَانَهُ، وَلا أحَبُّ إلى اللهِ العَمَلُ فِيهِنَّ مِن هَذهِ الأيَّامِ العَشرِ، فَأكثِرُوا فِيهِنَّ مِنَ التَّهلِيلِ وَالتَّكبِيرِ وَالتَّحمِيدِ). واتە: هیچ ڕۆژێك نی‌یە گەورەتر بێ لای خوای گەورە لەم دە ڕۆژە، و ڕۆژانێك نی‌یە کردەوەی چاکە ئەوەندە خۆشەویست تر بێت تێیاندا لەم دە ڕۆژە، دە کەواتە (لا إله إلا الله) و (الله أكبر) و (الحمد لله) یان زۆر تێدا بکەن.

ئیبنو عەبباس دەربارەی فەرمودەی خوا ﴿وَيَذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ فِيٓ أَيَّامٖ مَّعۡلُومَٰتٍ﴾ (الحج/٢٧) واتە: وە یادی خوا بکەن لە چەند ڕۆژێکی دیاری کراودا، دەفەرموێت: ئەو چەند ڕۆژە ئەو دە ڕۆژەیە.

ئیبنو عومەرو ئەبو هورەیرە لەو دە ڕۆژەدا کاتێ ئەچوون بۆ بازاڕ بە دەنگی بەرز (الله أكبر) یان ئەکرد، و خەڵکەکەش لە دوایانەوە ئەیان ووتەوە. (بوخاری گێڕاویەتی‌یەوە).

سەعیدی کوڕی جوبەیر کاتێ بگەیشتایە ئەو دە ڕۆژە ئەوەندە خوا پەرستی ئەکرد هەتا خەریك ئەبوو پەکی بکەوێت.

ئەوزاعی دەفەرموێت: پێم گەیشتووە کە کردەوەی چاکە لەم دە ڕۆژەدا ئەوەندەی غەزایەك لەڕێگەی خوادا خێرە، کە لەو غەزایەدا ڕۆژەکەی بەڕۆژوو بێت و شەوەکەی پاسەوانی بکات، ئیللا مەگەر شەهید بێ، (واتە بە ئەندازەی شەهید بوون خێری نی‌یە). ئەوزاعی دەفەرموێت: پیاوێکی بەنی مەخزومی ئەم حەدیسەی بۆ گێڕامەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ.

لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەت کراوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَا مِن أيَّامٍ أحَبُّ إلى اللهِ أن يَتَعَبَّدَ لَهُ فِيهَا مِن عَشرِ ذِي الحِجَّةِ، يَعدِلُ صِيَامَ كُلِّ يَومٍ مِنهَا بِصِيَامِ سَنَةٍ، وَقِيَامُ كُلِّ لَيلَةٍ مِنهَا بِقِيَامِ لَيلَةِ القَدرِ). (رواه ابن ماجة والترمذي والبيهقي)[2]. واتە: هیچ ڕۆژانێك نی‌یە ئەوەندە لای

---

(١) (طبراني) لە ئیبنوعومەرەوە ریوایەتی نەکردووە بەڵکو لە ئیبنوعەبباسەوە، وە شێخ ئەلبانی لێکۆڵینەوەیەکی هەیە لەسەر ئەم حەدیسە، جا ئەگەر پێت خۆشە گەڕانەوەی بۆ بکە.

(٢) دانەر لە مونذری‌یەوە باسی کردووە (١٢٥/٢) هەرچەندە لە پێشەوە بە (رُوِيَ) واتە: ریوایەت کراوە هێناویەتی (کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی زەعیفە) وەکو بۆخۆی لە پێشەکی‌یەکەیدا باسی کردووە، بەڵام –خوا پاداشتی بداتەوە– ئەبووایە عیللەتەکەشی ڕوون بکردایەتەوە، –لەپاشان شێخ ئەلبانی فەرمویەتی–

خوا خۆشەویست بێت عیبادەتی بۆ بکرێ تێیدا بەئەندازەی دە ڕۆژەکەی مانگی (ذي الحجة)، بەڕۆژوو بوونی ڕۆژێکی هاوتای ڕۆژووی ساڵێکە، وە شەونوێژی هەر شەوێکی هاوتای شەونوێژی شەوی قەدرە.

**١٥- جەژنە پیرۆزە کردن موستەحەببە:**

لە جوبەیری کوڕی نەفیرەوە هاتووە کە فەرمویەتی: هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ کاتێ لە ڕۆژی جەژندا ئەگەیشتن بە یەك بەیەکیان ئەووت: (تَقَبَّلَ اللهُ مِنَّا وَمِنكَ) واتە: خوا لە ئێمەو ئێوەشی قەبول بکات. (حافظ، دەفەرمووێت: ئیسنادەکەی حەسەنە)[1].

**١٦- ووتنی (الله أکبر) لە ڕۆژەکانی دوو جەژندا:**

ووتنی (الله اکبر) لە ڕۆژەکانی دوو جەژندا سوننەتە، دەربارەی جەژنی ڕەمەزان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلِتُكْمِلُوا۟ ٱلْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُوا۟ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ (البقرة/١٨٥). واتە: بۆ ئەوەی ژمارەی ڕۆژوەکان تەواو بکەن و بە (الله أکبر) بکەن لەسەر ئەوەی ڕێنمایی کردوون، بە ئومێدی ئەوەی سوپاس و ستایشی خوا بکەن.

وە دەربارەی جەژنی قوربان فەرمویەتی: ﴿وَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ فِىٓ أَيَّامٍ مَّعْدُودَٰتٍ﴾ واتە: لە چەند ڕۆژێکی دیاری کراو (ی ڕۆژانی جەژن)دا یادی خوا بکەن.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿كَذَٰلِكَ سَخَّرَهَا لَكُمْ لِتُكَبِّرُوا۟ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ﴾ (الحج/٣٧). واتە: بەو شێوەیە ئەو ووشترانەی بۆ ڕام کردوون بۆ ئەوەی حوا بە گەورە بگرن ـ بە ووتنی (الله أکبر) ـ و سوپاسی بکەن لەسەر ئەوەی ڕێنمایی کردوون.

---

پێم خۆش بوو دانەر هەمو قسەکەی مونزری بهێنایە لەبەر بەجێهێنانی ئەمانەتی عیلمی و بە صەراحت باسی بکردایە کە ئەم حەدیسە زەعیفە، چونکە ئاگاداری ئەو زاراوەی نەکردووە کە بۆخۆی ووتویەتی (واتە هەر حەدیسێك لاواز بێت بە (رُوِيَ) بیهێنێ) هەروەکو لە پێشەکی (تمام المنة) باسمان کرد و لەبەر ئەوەی زۆربەی ئەوکەسانەی کە ئەم کتێبە ئەخوێننەوە ئاگایان نیە لە زانستی حەدیس، لەپاش ئەوە. ئەم حەدیسە من قسەم لەسەر کردووە بە شیکراوەیی لە (الضعیفة) دا بە ژمارە (٥١٤٢).

(١) شێخ ئەلبانی بە کورتی دەفەرمووێت: مەبەست بەو (حافظ)ە (سیوطي)یە و لەپاش لێدووان لەسەری سابتی ئەکات کە ئەو ریوایەتە صەحیحە.

جومهوری زانایان لەسەر ئەوەن کە ووتنی (الله أكبر) لە جەژنی ڕەمەزاندا لەوکاتەوە دەست پێ ئەکات کە ئەچن بۆ نوێژ هەتا ووتار دەست پێ ئەکات، وە لەو بارەیەوە چەند حەدیسێکی زەعیف هاتووە، هەرچەندە ریوایەتی صەحیحیش هەیە لەوبارەوە لە ئیبنو عومەرو بێجگە لەو لە صەحابە.

حاکم دەفەرمووێت: ئەوە سوننەتەو ئەهلی (حدیپ) وەریان گرتووە، وە مالیکو ئەحمەدو ئیسحاق و (أبو پور)یش وایان فەرموە.

کۆمەڵێك ئەڵێن: ووتنی (الله اکبر) لەشەوی جەژنی ڕەمەزانەوە دەست پێ ئەکات ئەوکاتەی مانگ ئەبینرێت هەتا کاتی چوون بۆ شوێنی نوێژ و هەتا ئیمام دێت.

وە کاتی ووتنی (الله أكبر) لە جەژنی قورباندا لە ڕۆژی عەرەفەوەیە هەتا عەسری ڕۆژانی (تشریق) کە یانزە و دووانزە و سیانزەی (ژی الحجه)یە(١).

(حافڤ) لە (فتح) دا دەفەرمووێت: لەوبارەیەوە حەدیسێکسابت نەبوە کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتبێ، وە ڕاستترین شتێك هاتبێ لە صەحابەوە ئەوەیە کە عەلی و ئیبنومەسعود فەرمویانە کە کاتەکەی لەبەیانی ڕۆژی عەرەفەوە دەست پێئەکات هەتا عەسری دوواڕۆژەکانی مینا (ابن منذر) و غەیری ئەو تەخریجیان کردووە) و شافیعی و ئەحمەد و ئەبویوسف و موحەممەدیش هەر ئەمە ئەڵێن، وە ئەوە مەزهەبی عومەرو ئیبنوعەبباسە.

ووتنی (الله أكبر) لە (أيام التشريق)دا موستەحەب نیيە لەکاتێکی تایبەتی دا بێجگە لەکاتێکی تر، بەڵکو لە هەموو کاتەکانی ئەو ڕۆژانەدا موستەحەبە.

بوخاری دەفەرمووێت: عومەر خوا لێی ڕازی بێت لەچادرەکەیدا لە مینا بەدەنگی بەرز (الله اکبر) ی ئەکردو لەناو مزگەوتەوە خەڵکی ئەیان بیست ئەوانیش دەستیان پێ ئەکرد، وە ئەوانەش کە لە بازاڕ بوون بەجارێك ئەیان ووت: (الله أكبر)، بەشێوەیەك مینا ئەلەرزیەوە بە (الله أكبر).

ئیبنوعومەر ئەو چەند ڕۆژە لە مینا (الله أكبر) ئەکرد، وە دوای نوێژەکانیش، وە لەناو جێگای نوستنیشدا، و لە چادرەکەیاو لە شوێنی دانیشتن و بەرێگاشەوە، ئەو چەند ڕۆژە هەر ئەیکرد.

(١) ئەوە لە عەلی و ئیبنوعەبباسەوە هاتووە بەصەحیحی، و لە (الإرواء) دا تەخریجم کردووە (٣/١٢٥) و حاکمیش لە ئیبنومەسعودەوە گێڕاویەتیەوە.

مەیمونە خوا لێی ڕازی بێت ڕۆژی قوربانی کردن (الله اکبر) ی ئەکرد.

وە ئافرەتان لەدوای ئیببانی کوڕی (عثمان) و عومەری کوڕی عبدالعزیزەوە شەوانی (تشریق) (ليالي التشريق) لەگەڵ پیاواندا لە مزگەوت، (الله أكبر) یان ئەکرد.

(حافظ) دەفەرموێت: ئەم ئەسەرانە ئەوەی تێدایە کە وتنی (الله أكبر) لەو ڕۆژانەدا لە دوای نوێژە فەرزەکان و کاتەکانی تریشەوە هەیە، وە لە چەند شوێنێکدا جیاوازی هەیە لەنێوان زانایاندا، جا هەیانە تەنها وتنی (الله أكبر) ئەبەستێ بەدوای نوێژەکانەوە، وە هەیانە ئەیبەستێ بەدوای هەموو نوێژێکی فەرزەوە بێجگە لە سوننەت، وە هەیە ئەیبەستێ تەنها بەپیاوەوەو بە جەماعەتەوە نەك بە تاکەوە، وە بە نوێژی حازرەوە نەك بە قەرزەوە، وە بە نیشتەجێوە نەك موسافیرەوە، وە بە دانیشتووی شارەوە نەك گوندەوە.

ئەوەی بوخاری هەڵی بژاردووە (ظاهراً) هەموو ئەوانە ئەگرێتەوە، وە ئەو ئەسەرانەی کە هێناویەتی‌یەوە یارمەتی ئەو بۆچوونەی ئەدا.

ئەمما شێوەی وتنی (الله أكبر) فراوانە وە ڕاسترینیشی کە لەوبارەوە هاتبێ ئەوەیە عبد الرزاق لە سەلمانەوە بەسەنەدێکی صەحیح ئەگێڕێتەوە کە وتویەتی: بەو شێوەیە بڵێن: **(اللهُ أكبَرُ، اللهُ أكبَرُ، اللهُ أكبَرُ كَبِيراً).**

وە لە عومەرو ئیبنومەسعودەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتووە کە وتویانە: **(اللهُ أكبَرُ، اللهُ أكبَرُ، لا إلَهَ إلا اللهُ، وَاللهُ أكبَرُ، اللهُ أكبَرُ، وَللهِ الحَمد)**[1]

(١) هەر بەو شێوەیە ئیبنوئەبی شەیبە ریوایەتی کردووە کە الله أكبر دووان دووان ئەووترێ، وە لە ریوایەتێکی تردا بە سیان سیان هێناویەتی، بەڵام هەر دووانی‌یەکە ناسراوە. سەیری (الإرواء) (٣/١٢٥-١٢٦) بکە. (تمام المنة).

# زەکات

**(١) پێناسەکەی:**

زەکات ناوە بۆ ئەو شتەی کە ئینسان دەری ئەکات لە ماڵی خۆی، ئەو شتەش مافی خوای گەورەیە بۆهەژاران، وە ناونراوە بە زەکات لەبەر بوونی هیوای بەرەکەت و پاك کردنەوەی دەروون و گەشەپێکردنی بە خێرو خێرات، چونکی وشەی زەکات لە (زكاة)ەوە هاتووە کە مانای گەشەکردن و خاوێنی و بەرەکەتە، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا﴾ (التوبة/١٠٣). واتە: وەربگرە لە دارایی و ماڵیان بەشێك لە خێرو صەدەقە بۆ ئەوەی پاکیان بکەیتەوە پێی لە تاوان و گەشەیان پێ بدەی.

زەکات یەکێکە لە پێنج پایەکانی ئیسلام، و شان بەشانی نوێژ هاتووە لە هەشتاو دوو ئایەتی قورئاندا، وە خوای گەورە بە کیتاب و سوننەتی پێغەمبەر و ئیجماعی ئوممەتی ئیسلام فەرزی کردووە.

١- جەماعەت لە ئیبنوعەبباسەوە خوا لێیان ڕازی بێت ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ موعاذی کوڕی جەبەلی ڕەوانەی یەمەن کرد[1]، پێی فەرموو: تۆ ئەچیە ناو کۆمەڵێکەوە خاوەن کیتابن، لە پێشەوە بانگیان بکە بۆ ئەوەی شایەتی بدەن (لا إله إلا الله محمد رسول الله) جا ئەگەر ملکەچی ئەوە بوون، پێیان ڕاگەیەنە کە خوای گەورە لە شەوو ڕۆژێکدا پێنج نوێژی لەسەر فەرز کردوون، ئەگەر ملکەچی ئەوەش بوون و ڕازی بوون بە کردنی، پێیان ڕابگەیەنە کە خوای گەورە فەرزی کردووە لەسەریان خێر لەدارایی و سامانیان بکەن، کە لە دەوڵەمەندەکانیان وەرئەگیرێ و ئەدرێتەوە بەهەژارەکانیان، جا ئەگەر ملکەچی ئەوەش بوون نەکەی دەست بخەیتە سامانە بەنرخەکانیان، وە بترسە لە نزاو پاڕانەوەی ستەم لێکراو، چونکە لەنێوان نزای ستەم لێکراوو خوادا پەردە نیە.

٢- (طبراني) لە (الأوسط) و (الصغير)دا لە عەلیەوە (خوای لێ ڕازی بێت) ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إِنَّ اللهَ فَرَضَ على أغنِيَاءِ المُسلِمِينَ فِي أموَالِهِم بِقَدرِ الَّذِي يَسَعُ فُقَرَائَهُم، وَلَن يَجهَدَ الفُقَرَاءُ إذَا جَاعُوا أو عَرُوا إلا بِمَا يَصنَعُ أغنِيَائُهُم، ألا وَإنَّ اللهَ يُحَاسِبُهُم حِسَاباً شَدِيداً، وَيُعَذِّبُهُم عَذَاباً أَلِيماً). واتە: خوا فەرزی کردووە لەسەر دەوڵەمەندە موسڵمانەکان کە لە ماڵەکانیان ئەوەندە دەربکەن بەشی هەژارەکانیان بکات، وە بەهۆی بەخیلی دەوڵەمەندەکانیانەوە نەبێت هەژارەکان ماندووی دەستی برسێتی و بێ بەرگی نابن، جا با بزانن خوای گەورە بە توندو تیژی لێیان ئەپرسێتەوەو سزای توندو تیژیان ئەدات. (طبراني) دەفەرموێت: (ثابت)ی کوڕی موحەممەدی زاهید بەتەنها

(١) بە والیەتی یا بە قازیەتی لە ساڵی دەیەمی کۆچیدا. (دانەر).

گێڕاوەتیەوە. (حافظ) دەفەرمووێت: (ثابت)و سیقەیەو ڕاستگۆیە، بوخاری و غەیری بوخاری حەدیسیان حەدیسیان لیێ گێڕاوەتەوە، وە ڕاویەکانی تریشی خراپ نین)[1].

فەریزەی زەکات لە مەککە لەسەرەتای ئیسلامەوە گشتی بوو، ڕادەی دیاری کراو بۆ ئەو ماڵە دانەنرابوو کە زەکاتی لێ دەرئەکرێت، وە هەروەها ئەو بەشەی بە زەکات لێی دەردێ، بەڵکو وازی لێهێنرابوو بۆ هەست و کەرەمی موسڵمانان.

لە ساڵی دووەمی کۆچیدا (لەسەر بەناوبانگترین ڕا) چەندێتی زەکات فەرز کرا لە هەمو جۆرێك لە جۆرکانی ماڵ، وە بە شێوەیەکی دوورو درێژ ڕوون کرایەوە.

**(٢) هاندان بۆ بەخشینی زەکات:**

أ- خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿خُذۡ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ صَدَقَةٗ تُطَهِّرُهُمۡ وَتُزَكِّيهِم بِهَا﴾ (التوبة/١٠٣).

واتە: ئەی پێغەمبەر! تۆ لە ماڵی ئیمانداران صەدەقەیەکی دیاری کراو لە زەکاتی فەرز، یا دیاری نەکراو لە صەدەقەی (تطوع) سوننەت، بۆئەوەی بەو صەدەقەیە پاکیان بکەیتەوە لە پیسی و چەپەڵی بەخیلی و تەماع و دڵ ڕەقی بەرامبەر فەقیر و لێ قەوماوان، هەروەها بۆ ئەوەی دەروونیان بەو صەدەقەیە گەشە پێ بدەیت و بەرزی بکەیتەوە بۆ پلەو پایەی چاکان، تاوەکو شایستەی بەختەوەری دنیا و قیامەت بن.

ب- خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٍ ۝ ءَاخِذِينَ مَآ ءَاتَىٰهُمۡ رَبُّهُمۡۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَبۡلَ ذَٰلِكَ مُحۡسِنِينَ ۝ كَانُواْ قَلِيلٗا مِّنَ ٱلَّيۡلِ مَا يَهۡجَعُونَ ۝ وَبِٱلۡأَسۡحَارِ هُمۡ يَسۡتَغۡفِرُونَ

---

(١) کورتەی قسەی شێخ ئەلبانی ئەوەیە: کە چەند ڕەخنەی لێ ئەگیدرێ:

١- قسەی (حافظ) ی بە (مطلق) ی باس کردووە، کە وای نیشان داوە ئیبنوحەجەر بێت، چونکە ئەگەر بلێی (حافظ) هەر ئەو مەبەستە، بەڵام مەبەستی (منذري)یە چونکە ئەوە قسەی خودی مونزرییە لە (الترغیب ١/٢٦٨) : وە وێنەی ئەم هەڵەیە ڕابورد لە دانەرەوە، لە باسی (صلاة التسبیح)دا.

٢- ئەوەی کە لە (منذري)یەوە باسی ئەکات وا نیشانی ئەدات کە (منذري) حەدیسەکەی بە قەوی و مەرفوع داناوە، کە واش نییە، چونکە لە هەموو قسەکانیدا بە لاوازی دائەنێت، ئەڵێم: هەر ئەوەش ڕاستە چونکە لە چەند ڕێگایەکەوە بە مەوقوفی گێردراوەتەوە، هەروەك (طبراني) و ئەبوعوبەید ووتویانە وە لەسەر دووا لە کۆتایی باسەکەدا دێت.

٣- حاریسی کوڕی سورەیجی تێدایە کە بە ووتەی زۆربەی زانایان، سیقە نییە، جا قسە لەسەر کردنی زانایان کارێك دەکات کە حەدیسەکە (ساقط) بێت و لاواز بێت، بەتایبەت کە جگە لەویشەوە بە مەوقوفی هاتووە.

٤- سابیتی کوڕی موحەممەدی زاهیدی هەرچەندە بوخاری لێوەی گێڕاوەتەوە بەڵام بۆ خۆی لە میانەی لاوازەکاندا باسی کردووە، و جگە لەویش بە لاوازیان داناوە. (تمام المنة).

﴿وَفِيٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ حَقّٞ لِّلسَّآئِلِ وَٱلۡمَحۡرُومِ﴾ (ذاريات/١٥-١٩). واتە بەڕاستی لەخوا ترسەکان لەبەهەشتن و لەسەر کانیاون، ئەو بەخششانەی پەروەردگاریان پێیان ئەدا وەری ئەگرن، چونکی ئەوانە لە دنیادا چاکەکار بوون، لەبەر خواپەرستی شەوان کەم ئەخەوتن، وە لە پارشێواندا داوای لێخۆشبوونیان لە خوا ئەکرد، وە لە ماڵ و سامانیان بەخششیان ئەدا بە هەژارو دەست کورت.

خوای گەورە بەخشش و چاکەکردنی داناوە بە باشترین سیفاتی پیاوچاکان، وە دیمەنی ئەو چاکیەشیان لە شەونوێژو (إستغفار) داوای لێبوردنی پارشێواندا دەرئەکەوێ، کە عیبادەتو خۆ نزیك کردنەوەیەکە لە خواوە، هەروەها دیمەنی ئەو چاکیە لەوەدا دەر ئەکەوێ کە مافی هەژاران بدەن، لەبەر بەزەیی و میهرەبانی بۆیان.

ج- خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ سَيَرۡحَمُهُمُ ٱللَّهُۗ﴾ (التوبة/٧١). واتە: پیاوان و ژنانی بڕوادار دۆست و یاریدەدەری یەکترن، فەرمان ئەکەن بەچاکەو قەدەغەی خراپە ئەکەن و نوێژ ئەکەن و زەکات ئەدەن و ملکەچی فەرمانەکانی خواو پێغەمبەر ﷺ ئەکەن، ئەوانە خوا لە پاشەڕۆژدا ڕەحمیان پێ ئەکات.

واتە: ئەو کۆمەڵەی خوا پیرۆزیان ئەکات و بەمیهرەبانی خۆی دایان ئەپۆشێ ئەو کۆمەڵەن کە باوەڕیان بە خوا هەیە و یارمەتیدەری یەکترن بۆ سەرکەوتن و خۆشەویستی، وە فەرمان بە چاکە ئەکەن و قەدەغەی خراپە ئەکەن، وە نێوان خۆیان و خوا ئەگەیەنن بەیەك بەهۆی نوێژ کردن، وە پەیوەندی نێوان خۆیان بەهێز ئەکەن بە زەکات.

د- خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُواْ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَنَهَوۡاْ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۗ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلۡأُمُورِ﴾ (الحج/٤١) واتە: ئەوکەسانەی کاتێ دەسەلات و توانامان دانێ لەسەر زەوی نوێژ ئەکەن و زەکات ئەدەن و فەرمان بەچاکە ئەکەن و قەدەغەی خراپە ئەکەن، وە سەرەنجامی کارو بار هەمووی تەنها بۆلای خوا ئەگەڕێتەوە.

ئەبینین خوای گەورە زەکات دانی کردۆتە مەبەستێك لە مەبستەکانی دەسەلات پەیدا کردن، لە زەوی دا.

أ- (ترمذي) لە ئەبو کەبشەی ئەنماریەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ثلاثةٌ أُقسِمُ عَلَيهِنَّ وَأُحَدِّثُكُم حَدِيثاً فَاحفظُوهُ: مَا نَقَصَ مَالٌ مِن صَدَقَةٍ، وَلا ظُلِمَ عَبدٌ مَظلَمَةً فَصَبَرَ عَلَيهَا إلا زَادَهُ اللهُ بِهَا عِزاً، وَلا فَتَحَ عَبدٌ بَابَ مَسألةٍ، إلا فَتَحَ اللهُ عَلَيهِ بَابَ فَقرٍ). واتە: سێ شت سوێندیان لەسەر ئەخۆم،

وە قسەیەكتان پێ ئەڵێم لەبەریان بكەن و لەیادی مەكەن، ماڵ بە لێ دەركردنی زەكات كەم ناكات، وە كەسێك نی‌یە ستەمی لێ بكرێت و ئارامی لەسەر بگرێت خوا عیززەتی پێ زیاد نەكات، وە كەس نی‌یە دەرگای سواڵ بكاتەوە لە خۆی، خوا دەرگای هەژاری بۆ نەكاتەوە.

ب- ئەحمەد و (ترمذي) گێڕاویانەتەوە، وە (ترمذي) بە صەحیحی داناوە لە ئەبوهورەیرەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إنَّ اللهَ عَزَّوَجل يَقبَلُ الصَّدَقَاتِ وَيأخُذُهَا بِيَمِينِهِ فَيُرَبِّيهَا لأحَدِكُم، كَمَا يُرَبِّي أحَدُكُم مُهرَهُ، أو فُلُوَّهُ، أو فَصِيلَهُ، حتى إنَّ اللُّقمَةَ لَتَصِيرُ مِثلَ جَبَلِ أُحُد). واتە: بەڕاستی خوای گەورە زەكات و صەدەقە قەبوڵ ئەكات و بەدەستی ڕاستی وەری ئەگرێت، و پەروەردەی ئەكات وەك چۆن ئێوە بێچوە ئەسپ پەروەردە ئەكەن، هەتا پارویەك ئەوەندەی كێوی ئوحودی لێ دێت.

وەكیع دەفەرمووێت: تەصدیقی ئەم حەدیسە لە قورئاندا هاتووە كە ئەفەرمووێت: ﴿أَلَمۡ يَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ يَقۡبَلُ ٱلتَّوۡبَةَ عَنۡ عِبَادِهِۦ وَيَأۡخُذُ ٱلصَّدَقَٰتِ﴾ (التوبة/١٠٤). واتە: ئایا نازانن كە هەر خوایە تۆبەو پەشیمانی لە عەبدەكانی قەبوڵ ئەكات، و خێرو صەدەقەش وەرئەگرێت و پاداشتی لەسەر ئەداتەوە.

هەروەها ئەفەرمووێت: ﴿يَمۡحَقُ ٱللَّهُ ٱلرِّبَوٰاْ وَيُرۡبِي ٱلصَّدَقَٰتِۗ﴾ (البقرة/٢٧٦). واتە: خوا بەرەكەتی ڕیبا كەم ئەكات و پاداشی صەدەقە زیاد.

ج- ئەحمەد بەسەنەدێكی صەحیح لە ئەنەسەوە ڕەزای خوا لێ بێ ئەگێڕێتەوە دەفەرمووێت: پیاوێكی تەمیمی هاتە لای پێغەمبەر ﷺ ووتی: ئەی نێرراوی خوا من ماڵێكی زۆرم هەیە و خاوەنی خێزان و میواندارم، پێم بفەرمو چی بكەم و چۆن ئەو ماڵە سەرف بكەم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (تُخرِجُ الزَّكَاةَ مِن مَالِكَ فَإنَّهَا طُهرَةٌ تُطَهِّرُكَ، وَتَصِلُ أقرِبَائَكَ وَتَعرِفُ حَقَّ المِسكِينِ وَالجَارِ وَالسَّائِلِ). واتە: زەكات لە ماڵەكەت دەربكە چونكە زەكات پاك كەرەوەیە پاكت ئەكاتەوە، وە سیلەی ڕەحم لەگەڵ خزمەكانتا بەجێ بگەیەنە و مافی هەژاران و دراوسێ و لێقەوماو بزانە[1].

د- هەروەها لە عائیشەوە ریوایەت كراوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (ثَلاثٌ أحلِفُ عَلَيهِنَّ؛ لا يَجعَلُ اللهُ مَن لَهُ سَهمٌ فِي الإسلامِ كَمَن لا سَهمَ لَهُ، وَأسهُمُ الإسلامِ ثَلاثَةٌ: الصَّلاةُ، وَالصَّومُ، وَالزَّكَاتُ، وَلا

---

(١) كورتەی قسەی شێخ ئەمەیە: كەسم نەبینیوە بە ڕاشكاوی بە صەحیحی دانابێت، و دانەریش لەسەر قسەی مونزری بە صەحیحی داناوە، هەروەها هەیسەمیش ووتویەتی صەحیحە، و مەرج نی‌یە كە صەحیح بێت، چونكە لەوانەیە مەرجێك لە مەرجەكانی تری صیحەتی تێدا نەبێت، هەروەكو لە پێشەكیدا باسم كرد.
ولە ڕاستیشدا هەروایە چونكە مەرجی (إتصال)ی تێدا نی‌یە كەواتە (منقطع) ، وەئەوەی (منقطع) بێت لە حەدیسدا ئەوە لاوازە.

يَتَولى اللهُ عَبداً فِي الدُّنيَا فَيُولِّيهُ غَيرَهُ يومَ القِيَامَةِ، وَلا يُحِبُّ رَجُلٌ قَوماً إلا جَعَلَهُ اللهُ مَعَهُم، وَالرَّابِعَةُ لَو حَلَفتُ عَلَيهَا رَجَوتُ ألا آثَمَ، لا يَستُرُ اللهُ عَبداً فِي الدُّنيَا إلا سَتَرَهُ اللهُ يَومَ القِيَامَةِ). واتە: سێ شت سوێندیان لەسەر ئەخۆم، خوا ئەوكەسەی بەشی هەیە لە ئیسلامدا وەك ئەوكەسەی لێ ناكات كە بەشی نییە، وە بەشەكانی ئیسلامیش سیانن: نوێژو، ڕۆژوو، زەكات، وە هەركەس خوا لەدنیادا سەرپەرشتی كرد لە ڕۆژی دوایی دا نایداتە دەست جگە لە خۆی، وە هیچ پیاوێك نییە كۆمەڵێكی خۆش بوێت خوا نەیكا بەیەكێ لەوان، چوارەم ئەگەر سوێندم لەسەر خوارد ئومێدم وایە گوناهبار نەبم لەسەری، كەسێك نییە خوا لەدنیادا نهێنی داپۆشێت و لەو دنیا نهێنی هەڵماڵێ.

هـ- (طبراني) لە (الأوسط) دا ئەگێڕێتەوە لە جابیرەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموێت: پیاوێك ووتی: ئەی نێرراوی خوا چی دەفەرموویت ئەگەر پیاوێك زەكاتی ماڵەكەی دەركرد؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (مَن أدى زَكَاتَ مَالِهِ ذَهَبَ عَنهُ شَرُّهُ) واتە: هەركەس زەكاتی ماڵەكەی دەركرد شەڕی ئەو ماڵەی لەكۆڵ ئەكەوێت.

و- بوخاری و موسلیم لە جابیری كوڕی عبدالله وە ئەگێڕنەوە فەرمویەتی: بەیعەتم دا بە پێغەمبەر ﷺ كە نوێژ بكەم و زەكات بدەم و ئامۆژگاری هەموو موسڵمانێك بكەم.

**(٣) هەڕەشە لە نەدانی زەكات:**

أ- خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ يَكۡنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلۡفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرۡهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٖ ۝ يَوۡمَ يُحۡمَىٰ عَلَيۡهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكۡوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمۡ وَجُنُوبُهُمۡ وَظُهُورُهُمۡۖ هَٰذَا مَا كَنَزۡتُمۡ لِأَنفُسِكُمۡ فَذُوقُواْ مَا كُنتُمۡ تَكۡنِزُونَ﴾ (التوبة/٣٤-٣٥). واتە: ئەوكەسانەی سامان و دارایی لەزێڕو زیو كۆ ئەكەنەوە زەكاتی لێ نادەن، مژدەی سزایەكی ئێشێنەریان پێ بدە، كاتێ ئەو زێڕو زیوە (پارە) لە ئاگری دۆزەخدا سوور ئەكرێتەوە و نێوچاوان و تەنیشتیان و پشتیانی پێ داغ ئەكرێ و ـ لە ڕووی سەرزەنشتەوە ـ پێیان ئەوترێ: ئەوە ئەو ماڵەیە كە لە دنیا بۆ خۆتانتان كۆ كردبۆوە، دەی بچەژن سزای ئەوەی كۆتان ئەكردەوە.

ب- هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَلَا يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ هُوَ خَيۡرٗا لَّهُمۖ بَلۡ هُوَ شَرّٞ لَّهُمۡۖ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُواْ بِهِۦ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ﴾ (آل عمران/١٨٠). واتە: با وا نەزانن ئەوكەسانەی خوا سامان و ماڵی داونێ بە فەزڵی خۆی و بەخیلی تێدا ئەكەن و یارمەتی هەژارانی پێ نادەن كە ئەو بەخیلییە خێر بێت بۆیان، بەڵكو ئەو

بەخیلییە شەڕە بۆیان، چونكە ئەوماڵەی كۆیان كردۆتەوەو بەخیلییان تێدا كردووە ئەبێتە تەوقێكی ئاگرین و ئەكرێتە ملیان لە ڕۆژی قیامەتدا.

أ- ئەحمەد و شەیخەین لە ئەبوهورەیرەوە ئەگێڕنەوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَا مِن صَاحِبِ كَنزٍ لايُؤَدِّي زَكَاتَهُ، إلا أُحمِيَ عَلَيهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَيُجعَلُ صَفَائِحَ، فَتُكوى بِهَا جَنبَاهُ وَجَبهَتُهُ، حتى يَحكُمَ اللهُ بَينَ عِبَادِهِ فِي يَومٍ كَانَ مِقدَارُهُ خَمسِينَ ألفَ سَنَةٍ، ثُمَّ يُرى سَبِيلُهُ، إمَّا إلى الجَنَّةِ، وإمَّا إلى النَّارِ، وَمَا مِن صَاحِبِ إبِلٍ لايُؤَدِّي زَكَاتَهَا، إلا بُطِحَ لَهَا بِقَاعٍ قَرقَرٍ كَأوفرِ مَا كَانَت تَسن عَلَيهِ، كُلَّمَا مَضَي عَلَيهِ أُخرَاهَا رُدَّت عَلَيهِ أُولاهَا، حتى يَحكُمَ اللهُ بَينَ عِبَادِهِ، فِي يَومٍ كَانَ مِقدَارُهُ خَمسِينَ ألفَ سَنَةٍ، ثُمَّ يُرى سَبِيلَهُ إمَّا إلى الجَنَّةِ وإمَّا إلى النَّارِ، وَمَا مِن صَاحِبِ غَنَمٍ لا يُؤَدِّي زَكَاتَهَا إلا بُطِحَ لَها بِقَاعٍ قَرقَرٍ، كَأوفرِ مَا كَانَت فَتَطَؤُهُ بِأظلافِهَا وَتَنطَحُهُ بِقُرُونِهَا، لَيسَ فِيهَا عَقصَاءُ وَلا جَلحَاءُ كُلَّمَا مَضَي عَلَيهِ أُخرَاهَا رُدَّت عَلَيهِ أُولاهَا، حتى يَحكُمَ اللهُ بَينَ عِبَادِهِ فِي يَومٍ كَانَ مِقدَارُهُ خَمسِينَ ألفَ سَنَةٍ مِمَّا تَعُدُّونَ، ثُمَّ يرى سَبِيلُهُ إمَّا إلى الجَنَّةِ وَإمَّا إلى النَّارِ، قَالُوا: فَالخَيلُ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: الخَيلُ فِي نَوَاصِيهَا، أو قَالَ: الخَيلُ مَعقُودٌ فِي نَوَاصِيهَا الخَيرُ إلى يَومِ القِيَامَةِ، الخَيل ثَلاثَةٌ: هِيَ لِرَجُلٍ أجرٌ، وَلِرَجُلٍ سِترٌ، وَلِرَجُلٍ وِزرٌ، فَأمَّا الَّتِي هِيَ لَهُ أجرٌ فَالرَّجُلُ يَتَّخِذُهَا فِي سَبِيلِ اللهِ وَيُعِدُّهَا لَهُ، فَلا تغيبُ شَيئاً فِي بُطُونِهَا إلا كَتَبَ اللهُ لَهُ أجراً، وَلَو رَعَاهَا فِي مَرجٍ، فَمَا أكَلَت مِن شَيئٍ إلا كَتَبَ اللهُ لَهُ بِهَا أجراً، وَلَو سَقَاهَا مِن نَهرٍ كَانَ لَهُ بِكُلِّ قَطرَةٍ تغيبها فِي بُطُونِهَا أجرٌ، حتى ذكَرَ الأجرَ فِي أبوَالِهَا وَأروَاثِهَا، وَلَو استَنَّت شَرَفاً أو شَرَفَينِ كُتِبَ لَهُ بِكُلِّ خُطوَةٍ يَخطُوهَا أجرٌ، وَأمَّا الَّتِي هِيَ لَهُ سِتر، فَالرَّجُلُ يَتَّخِذُهَا تَكَرُّماً وَتَجَمُّلاً، لاينسى حَقَّ ظُهُورِهَا وَبُطُونِهَا، فِي عُسرِهَا وَيُسرِهَا، وَأمَّا الَّتِي هِيَ عَلَيهِ وِزرٌ، فَالَّذِي يَتَّخِذُهَا أشَراً وَبَطَراً وَبَذَخاً وَرِئَاءَ النَّاسِ فَذَلِكَ الَّذِي عَلَيهِ الوِزرُ، قَالُوا: فَالحُمُرُ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: مَا أنزَلَ اللهُ عَلَيَّ فِيهَا شَيئاً إلا هَذِهِ الآيَةَ الجَامِعَةَ الفَاذَّةَ: ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ۝ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ﴾ (الزلزلة/٧-٨)). واتە: هەر خاوەن كەنزێك زەكاتی كەنزەكەی دەرنەكات لە ڕۆژی قیامەت ئەو كەنزەی لە ئاگری جەهەنەمدا سوور ئەكرێتەوە و ئەكرێ بە چەند تەختە ئاسنێك و هەردوو تەنیشت و ناوچەوانی پێ داغ ئەكرێ، هەتا ئەوكاتەی خوا ئەپرسێتەوە لە بەندەكانی لە ڕۆژێكدا ئەوەندەی پەنجا هەزار ساڵی ئێوەیە، پاشان ڕێی نیشان ئەدرێ یابۆ بەهەشتە یا بۆ دۆزەخە، وە هەر خاوەن ووشترێ زەكات لە ووشترەكانی دەرنەكات (لە ڕۆژی قیامەتدا) لە شوێنێكی تەخت و بەریندا ڕائەكێشرێ و ووشترەكانی گەورەتر ئەبێ لەوەی دنیاو بەسەریا ئەڕۆن و پێی لێ ئەنێن، جا هەركاتێ ئاخری ئەو ووشتارنە بەسەریا تێ پەڕین ئەووەڵەكەیان ئەگێڕنەوەو بەسەریا تێ ئەپەڕنەوە، هەتا ئەو ڕۆژەی خوا لە بەندەكانی ئەپرسێتەوە لە ڕۆژێكدا كە پەنجا هەزار ساڵی ئێوەیە، پاشان ڕێی نیشان ئەدرێت یا بۆ بەهەشتە یا بۆ دۆزەخ، وە هەر

خاوەن مەڕێك زەكات لە مەڕەكانی نەدات (لە ڕۆژی قیامەتدا) لە شوێنێكی تەخت و بەرینداڕادەكێشرێ و مەڕەكانی گەورەتر ئەبێ لەوەی دنیاو بە سمیان ئەڕۆن بەسەریا و بە شاخەكانیان قۆچی لێ ئەدەن، وە شاخ خوارو بێ شاخیان تێدا نابێت، وە هەركاتێ ئاخری ئەو مەڕانە بەسەریا تێپەڕ بن ئەوەڵەكەیان ئەگێڕدرێتەوە و بەسەریا تێ ئەپەڕنەوە، هەتا ئەو ڕۆژەی خوا لە بەندەكانی ئەپرسێتەوە لە ڕۆژێكدا ئەوەندەی پەنجا هەزار ساڵی ئێوەیە، پاشان ڕێی نیشان ئەدرێت، یا بۆ بەهەشت یا بۆ دۆزەخ، ووتیان: ئەی نێرراوی خوا ئەسپ چۆنە ؟ فەرمووی: ئەسپ خێر بەناچەوانی خۆیەوەیەتی یان فەرمووی: ئەسپ خێر بەنێوچاوانی‌یەوە بەسراوە، هەتا ڕۆژی دوایی، ئەسپیش سێ جۆرە: هەیانە بۆ خاوەنی پاداشتە، وە هەیانە بۆ خاوەنی داپۆشەرە، وە هەیانە بۆ خاوەنی تاوانە، ئەمما ئەوەی بۆ خاوەنی پاداشە، ئەو ئەسپەیە خاوەنەكەی ئامادەی ئەكات و بەكاری ئەهێنێ لەڕێی خوادا، ئەم جۆرە هەرچی بخوات خوا بە پاداش بۆ خاوەنی ئەنووسێت، وە ئەگەر لە لەوەڕگادا بیلەوەڕێنێ هەرچی خوارد هەر بە پاداش ئەنووسرێ بۆ خاوەنی، وە ئەگەر لە چەمێك ئاوی بدات چەند دڵۆپ ئاو ئەخواتەوە ئەوەندە پاداشت بۆ خاوەنی ئەنووسرێت، هەتا باسی ئەوەی كرد كە پاداشت لە میزو تەرسەكەشیدا هەیە، وە ئەگەر بەسەر تەپۆڵكەیەك یا دوو تەپۆڵكەدا بڕوات بە هەر هەنگاوێكی پاداشێك بۆ خاوەنی ئەنووسرێت، ئەمما ئەوەی داپۆشەرە، خاوەنی بۆ ڕێز لە خۆگرتن و جوان كردنی پەروەردەی ئەكات، وە مافی پشت و زگی لەبیر ناكات لەخۆشی و ناخۆشیدا، ئەمما ئەوەی بۆ خاوەنی تاوانە: ئەوەیە خاوەنی بۆ فیزو تەكەببورو ڕابواردن و بۆ ڕیای خەڵكی ڕای ئەگرێ ئەوە بۆ خاوەنی تاوانە، ووتیان: ئەی نێردراوی خوا بۆ گوێدرێژ چی ئەفەرموویت؟ فەرمووی: دەربارەی گوێدرێژ خوا هیچی بۆ نەناردوومە خوارەوە ئەم ئایەتە نەبێ كە هەموو خێرێك ئەگرێتە خۆی و لەچاكیدا وێنەی كەمە ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ۝ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ﴾ واتە: هەركەس ئەوەندەی تۆزقاڵێك خێر بكات ـ لە ڕۆژی دواییدا ـ پاداشتەكەی ئەبینێ، وە هەركەس ئەوەندەی تۆزقاڵێك شەڕ بكات سزاكەی ئەبینێ.

ب- شەیخەین لە ئەبو هورەیرەوە ئەگێڕنەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن آتَاهُ اللهُ مَالاً فَلَم يُؤَدِّ زَكَاتَهُ مُثِّلَ لَهُ يَومَ القِيَامَةِ شُجَاعاً أقرَعَ لَهُ زَبِيبَتَانِ يُطَوَّقُهُ يَومَ القِيَامَةِ ثُمَّ يَأخُذُ بِلِهزِمَتَيهِ (يَعنِي شِدقَيهِ) ثُمَّ يَقُولُ أنَا كَنزُكَ أنَا مَالُكَ ثُمَّ تَلا هَذِهِ الآيَةَ: ﴿وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ هُوَ خَيْرًا لَّهُم﴾). واتە: هەركەس خوا ماڵ و سامانێكی پێ بەخشی و زەكاتی لێ دەرنەكرد ڕۆژی دوایی ئەو ماڵەی لێ ئەبێتە نێرە مارێكی كەچەڵ دوو خاڵی ڕەش بەسەر چاوەكانی‌یەوە هەن، خۆی لێ ئەهاڵێنێ و پاشان هەردوو شەویلكەی ئەگرێ و ئەڵێت: من كەنزەكەتم من ماڵەكەتم. پاشان پێغەمبەر ﷺ ئەم

نایەتەی خوێندەوە: ﴿وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ هُوَ خَيْرًا لَّهُم﴾. واتە: با ئەو کەسانەی بەخیلی ئەکەن لەو شتانەدا کە خوا لە فەزلّی خۆیەوە پێی داوون و زەکاتی لێ دەرناکەن، وا گومان نەکەن کە ئەوە بۆ ئەوان خێرە.

ج- ئیبنو ماجەو بەززار و بەیهەقی — وە لەفزەکە هی بەیهەقی‌یە- ئەگێڕنەوە لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (يَا مَعشَرَ المُهَاجِرِينَ خِصالٌ خَمسٌ — إنِ ابتُلِيتُم بِهِنَّ وَنَزَلنَ بِكُم، أعُوذُ بِاللهِ أن تُدرِكُوهُنَّ — : لَم تَظهَرِ الفَاحِشَةُ فِي قَومٍ قَطُّ حتى يُعلِنُوا بِهَا إلا فَشَا فِيهِمُ الأوجَاعُ الَّتِي لَم تَكُن فِي أسلافِهِم. وَلَم يَنقُصُوا المِكيَالَ وَالمِيزَانَ إلا أُخِذُوا بِالسِّنِينَ وَشِدَّةِ المُؤنَةِ وَجَورِ السُّلطَانِ. وَلَم يُمنَعُوا زَكَاتَ أموَالِهِم، إلا مُنِعُوا القَطرَ مِنَ السَّمَاءِ، وَلَولا البَهَائِمُ لَم يُمطَرُوا. وَلَم يَنقُضُوا عَهدَ اللهِ وَعَهدَ رَسُولِهِ، إلا سُلِّطَ عَلَيهِم عَدُوٌّ مِن غَيرِهِم فَيَأخُذُ بَعضَ مَا فِي أيدِيهِم. وَمَا لَم تَحكُم أئِمَّتُهم بِكِتَابِ اللهِ، إلا جُعِلَ بَأسُهُم بَينَهم). واتە: ئەی کۆمەڵی موهاجیرین، پێنج شت هەیە داوا لە خوا ئەکەم تێوە تووشی نەبن و نەیەتە ناوتان: داوێن پیسی بەئاشکرا لەناو هەر کۆمەڵێکدا بلاّو بێتەوە ئیللا خوا چەندین دەرد و نەخۆشی‌یان بۆ ئەنێرێ کە هەرگیز لەناو باوو باپیرانیانا نەبووە. وە هەرکۆمەڵێك لە کێشان و پێواندا دزی‌یان کرد ئیللا خوا ئەیان گرێ بە گرانی و نەبونی و زوڵم و ستەمی حاکمو فەرمانڕەوا، وە هەر کۆمەڵێك زەکاتی ماڵی دەرنەکرد خوابارانی‌یان لێ ئەگرێتەوە، وە لەبەر خاتری گیان لەبەرانی تر نەبوایە خوا هەر بارانی بۆ نەئەباراندن. وە هەر کۆمەڵێك ئەو پەیمانەی داویانە بەخواو پێغەمبەرەکەی شکاندیان ئیللا خوا دوژمنێکیان لەغەیری خۆیان بەسەردا زاڵ ئەکات و هەندێ لەو سامانەی کە لە دەستیاندایە لێیان ئەسەنێ، وە هەر کۆمەڵێك کاربەدەستەکانی فەرمانیان بە قورئان نەکرد خوا شەڕو ئاژاوە ئەخاتە ناویانەوە لەلایەنی خۆیانەوە.

د- شەیخەین ـ بوخاری و موسلیم ـ لە ئەحنەفی کوڕی قەیسەوە ئەگێڕنەوە کە فەرمویەتی: لای کۆمەڵێك لەسەرانی قوڕەیش دانیشتبووم، پیاوێکی موزبرو جل زبرو ڕواڵەت زبر (واتە گرینگی بە مووی سەرو ریشی و جلوبەرگی و ڕواڵەتی نەدابوو[1])، هات و بەسەریانەوە وەستاو سەلامی لێ کردین، پاشان فەرمووی: مژدە بدە بەوکەسانەی کە سامان کۆ ئەکەنەوە بە بەردی سورکراوە کە بە ئاگری دۆزەخ سوور ئەکرێتەوە، پاشان ئەخرێتە سەر گۆی مەمکی هەرکەسێکیان تا لەسەر شانی‌یەوە دەرئەچێتەوە، و ئەخرێتە سەر شانی هەرکەسێکیان تا لە گۆی مەمکی‌یەوە دەرئەچێت و ئەلەرێتەوە، پاشان (پیاوەکە) ڕۆیشت لای کۆڵەکەیەکەوە دانیشت، منیش شوێنی کەوتم و لای دانیشتم، ئەشم ئەزانی کێ‌یە، ووتم: وابزانم ئەوکۆمەڵە قسەکەتیان لاناخۆش بوو، فەرمووی: ئەوانە لە هیچ تێ ناگەن، خۆشەویستەکەم ئەوەی پێ فەرموم، ووتم:

---

(١) ئەو پیاوەش (أبوذر) بوو. (دانەر).

خۆشەویستەکەت کێیە؟ فەرمووی: پێغەمبەرە ﷺ. فەرمووی: ئایا کەسێ ئەبینی؟ ئەڵێ (واتە: أبوذر) منیش سەیری خۆرم کرد بزانم چەندەی ڕۆژ ماوە، ئەمزانی کە پێغەمبەر ﷺ بۆ پێویستی‌یەکی خۆی ئەمنێرێ، ووتم: بەڵێ، فەرمووی: حەز ناکەم ئەوەندەی کێوی ئوحود زێرم هەبێ سەرفی بکەم سێ دینار نەبێت، وە ئەوانە لە هیچ تێ ناگەن، تەنها دنیا کۆ ئەکەنەوە، نا وەڵلاهی نە داوای دنیایان لێ ئەکەم و نە پرسیاری دینیان لێ ئەکەم . تا ئەمرم و ئەگەم بەخوای گەورە.

**(٤) حوکمی زەکات نەدەر:**

زەکات دان لەو فەرزانەیە کە ئوممەتی ئیسلام هەموو کۆن لەسەر فەرز بوونی، وە بەشێوەیەك ناوبانگی دەرکردووە بۆتە پێویستی‌یەکانی دین (ضروريات الدين)، بەجۆرێك هەرکەس ئینکاری لێ بکات لە ئیسلام دەرئەچێت، وە بە کافری ئەکوژرێت، مەگەر کەسێك تازە ئیسلام بێت ئەوە لێی ئەبوورێت، لەبەر ئەوەی بێ ئاگایە لە حوکمەکانی ئیسلام.

بەڵام ئەگەر کەسێك نەیداو باوەڕیشی بە واجب بوونی هەبێ ئەوکەسە تاوانبارە لەسەر نەدانی، بێ ئەوەی لە ئیسلام دەربچێت بەونەدانە، وە لەسەر حاکم واجبە بەزۆر لێی بستێنێ وە تەنبێشی بکات، وە نابێت لە زەکاتەکە زیاتری لێ بستێنێ، ئیللا لای ئەحمەد نەبێت و لای شافیعی لە قەولی قەدیمدا، لای ئەوان ئەبێ زەکاتەکەو نیوەی ماڵەکەشی لێ بستێنێت، بە سزای نەدانەکەی[1].

بەپێی ئەوەی ئەحمەد و نەسائی و ئەبوداودو حاکم و بەیهەقی ئەگێڕنەوە لە بەهزی کوڕی حەکیمەوە لە باوکی‌یەوە لە باپیری‌یەوە دەفەرمووێت: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە ئەیفەرموو: (فِي كُلِّ إِبِلٍ سَائِمَةٍ، فِي كُلِّ أربَعِينَ إبنَةُ لَبُونٍ، لايُفرَّقُ إبلٌ عَن حِسَابِهَا، مَن أعطَاهَا مُؤتَجِراً فَلَهُ أجرُهَا، وَمَن مَنَعَهَا فَإنَّا آخِذُوهَا وَشَطرَ مَالِهِ عَزمَةٌ مِن عَزَمَاتِ رَبِّنَا تَبَارَكَ وتعالى لا يَحِلُّ لِآلِ مُحَمَّدٍ مِنهَا شيئٌ). واتە: هەموو ئەو ووشترانەی خۆیان ئەلەوەڕێن لە چل سەر (إبنة لبون) ـ مێیەك دوو ساڵی تەواو کردبێت و پێی نابێتە سێ ساڵ ـ ئەدرێ لە زەکاتدا، ئەگەر هاتوو ووشترەکان هی دوو نەفەر بوون و تێکەڵ بوون، نابێ لەیەکتر جیا بکرێنەوە، جا هەرکەسێ زەکاتەکەی بۆ پاداش بدات ئەوە پاداشەکەی بۆ ئەنووسرێ، وە هەرکەسیش نەیدا ئەوە لێی ئەسێنین لەگەڵ بەشێك لەماڵەکەی، چونکە مافێکە لە مافەکانی پەروەردگاری گەورەمان. هیچی بۆ ئالی موحەممەد حەلاڵ نی‌یە.

---

(١) هەروەها ئەوکەسەش کە ماڵەکەی ئەشارێتەوە و زەکاتی لێ نادا و پاشان حەقیقەتی لای حاکم ئاشکرا بوو (دانەر).

لە ئەحمەدیان پرسی ئیسنادی ئەم حەدیسە چۆنە؟ فەرمووی: (صالح الإسناد)ە، و حاكم دەربارەی بەهز دەفەرمووێت: حەدیسەكەی صەحیحە[1].

ئەگەر قەومێك زەكاتیان نەدا لەگەڵ ئەوەشدا كە باوەڕیان بە واجب بوونی هەبوو، وە هێزو دەسەڵاتی شەڕیان هەبوو، ئەوە جەنگیان لەگەڵ دەكرێت هەتا زەكات ئەدەن.

بەپێی ئەوحەدیسەی بوخاری و موسلیم لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ ئەگێڕنەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (أُمِرتُ أن أُقَاتِلَ النَّاسَ حتى يَشهَدُوا أن لا إِلَهَ إلا اللهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ، وَيُقِيمُوا الصَّلاَةَ، وَيُؤتُوا الزَّكَاةَ، فَإِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ عَصَمُوا مِنِّي دِمَائَهُم وَأَموَالَهُم إلا بِحَقِّ الإِسلامِ وَحِسَابُهُم على اللهِ). واتە: فەرمانم پێ كراوە هەتا خەڵك شایەتی نەدەن (لا إله إلا الله محمد رسول الله) و نوێژ نەكەن و زەكات نەدەن بجەنگم دژیان، جا كاتێ ئەوەیان كرد خوێن و ماڵیان لەمن ئەپارێزن بەمافی ئیسلام نەبێت، وە لێپرسینەوەشیان لەسەر خوایە.

وە بەپێی ئەوەی جەماعەت لە ئەبوهورەیرەوە ئەگێڕنەوە دەفەرمووێت: كاتێ پێغەمبەر ﷺ دنیای بەجێ هێشت دوای ئەو ئەبوبەكر بوو بە جێ نشین كۆمەڵێك عەرەبی دەشتەكی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە، عومەر خوا لێی ڕازی بێت پێی فەرموو: چۆن ئەجەنگی دژی ئەوخەڵكە؟ خۆ پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: فەرمانم پێ دراوە دژی خەڵكی بجەنگم هەتا ئەڵێن: (لا إله إلا الله) جا هەركەس ئەوەی ووت ماڵ و گیانی لەمن ئەپارێزێ بە مافی ئیسلام نەبێت و دوای ئەوە حیسابی لەسەر خوایە؟ ئەبوبەكر خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی: سوێند بە خوا دژی ئەوانە ئەجەنگم نوێژو زەكات لە یەك جیا ئەكەنەوە، چونكە زەكات مافی سامانە، وەڵڵاهی ئەگەر كاژیلەیەكیان نەدا كە لەوەپێش ئەیاندا بە پێغەمبەر ﷺ، ئەجەنگم لە دژیاندا، عومەر خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی: وەڵڵاهی هەر كە خوا سنگی ئەبوبەكری فراوان كرد بۆ جەنگین ئیتر منیش زانیم كە حەقە دژیان بجەنگین.

وە لەفزی لای موسلیم و ئەبوداودو (ترمذي) لەجیاتی ووشەی (كاژیلە) (ئەو پەتەی ووشتری پێ ئەبەسترێتەوە) هاتوە.

**(٥) زەكات لەسەر كێ واجبە؟:**

زەكات لەسەر موسڵمانی ئازاد و ساماندار واجبە كە سامانەكەی بگاتە ڕادەی زەكات (نصاب) جا ئەو سامانە لە هەر جۆرێك لەوجۆرانە بێت كە واجبە زەكاتی لێ دەربكرێت.

وە بە مەرج گیراوە لە نیصابدا كە ئەم مەرجانەی تێدا هەبێ:

---

(١) بەیهەقی ئەگێڕێتەوە كە شافیعی فەرمویەتی: ئەم حەدیسە زانایانی حەدیس بە سابتی نازانن، وە ئەگەر سابت بوە لەسەری ئەڕۆیشتین. (دانەر).

**١- ئەبێ ئەوسامانە زیاد بێت لەپێویستی‌یەكانی خۆی:**

ئەو پێویستی‌یانەی كە هیچ كەس ناتوانێت بێ نیاز بێ لێیان، وەك خواردن و جلو بەرگ و شوێنی دانیشتن و شتی سواری و ئامێری پیشەیی.

**٢- ئەبێ ساڵێكی هیجری بەسەردا تێپەڕێت:**

سەرەتای ساڵەكەش لەوكاتەوە دەست پێ ئەكات كە ئەبێتە خاوەنی، وە پێویستە ڕادەی ئەو سامانە لە ماوەی ساڵەكەدا نەقصی بەسەردا نەیات، بەڵام ئەگەر ڕادەكەی كەمی كردو پاشان وەك خۆی لێ هاتەوە ئەوە سەرەتای ساڵەكە لەوكاتەوە دەست پێ ئەكا كە سامانەكە نەقصەكەی پڕبۆتەوە (نەك لەیەكەم جاری پێش نەقص).

ئەوەی دەفەرموێت: مەزهەبی ئیمەو مەزهەبی مالیك و ئەحمەدو مەزهەبی جمهور ئەوەیە: ئەو ماڵەی كە زەكات لە عەینی ماڵەكەدا واجبەو ئەشبێ ساڵی بەسەردا تێپەڕێ (وەك ئاڵتون و زیوو ئاژەڵ) بەمەرج گیاوە لە هەموو ساڵەكەدا ڕادەی زەكاتەكەی (واتە: نیصابەكەی) كەم نەكات، جا ئەگەر لە ساتێكیشدا لە میانی ساڵەكەدا كەمی كرد ئەوە ساڵەكە ئەپچڕێ، وە هەركاتێكیش كەمی‌یەكەی پڕبۆوە ساڵەكە لەوەوەختەوە حیساب ئەكرێ كە (نصاب) ڕادەی زەكاتەكە هاتۆتە جێ.

ئەبوحەنیفەش ئەفەرموێ: ئەوەی كە گرنگەو ئیعتباری بۆ ئەكرێ بوونی (نصاب) ڕادەی زەكاتەكەیە لە ئەووەڵ و ئاخری ساڵەكەوە، وە لە میانەی ساڵەكەدا قەیناكە ئەوماڵە كەمی بەسەرا بێ (واتە: بۆ زەكات دانەكە زەرەری نی‌یە)، هەتا ئەگەر دووسەد درهەمی هەبوو لەوماوەی ساڵەدا هەمووی لەدەس چوو بێجگە لە درهەمێكی، یا چل سەر مەڕی هەبوو لەماوەی ئەوساڵەدا هەمووی لەناو چوو جگە لە سەرێكیان، بەڵام لە كۆتایی ساڵەكەدا دیرهەمەكانی بوونەوە بە دووسەد درهەم و مەڕەكانی بوونەوە بە چل سەر، ئەبێت زەكات لە هەموویان بدات. بەڵام ئەگەر لەماوەی ئەو ساڵەدا ڕادەی زەكاتەكەی فرۆشت یا گۆڕی‌یەوە بە جینسێكی تر ئەوە ساڵەكە پچڕانی بەسەردا دێ و ئەبێ ساڵێكی تر دەست پێ بكاتەوە[1]. وە ئەو مەرجە

(١) ئەڵێم: ئەبێ ئەو مەرجە بەوە ببەسترێتەوە كە ڕێكەوت بێت، نەك بە مەبەستی لەكۆڵ خستنەوەی زەكاتەكە بیكات، وەك لە هەندێك لە حەنەفی‌یەوە ئەگێڕنەوە كە ئەڵێن: وەختێك كاتی دەركردنی زەكاتەكەی ئەهات ماڵەكەی ئەبەخشی بە ژنەكەی، جا هەركاتێ وەختی ساڵەكە تەواو ئەبوو دیسان ماڵەكەی لە ژنەكەی ئەسەندەوە لەبەر ئەوەی بەخشش سەندنەوە لای ئەوان دروستە بە هەندێك شی‌كردنەوەوە، جا هەركەس ئەو فێڵە بكات ـ كە پێی ئەڵێن فێڵی شەرعی ـ من پێم وایە زەكات لەو جۆرە كەسانە بسەندرێ، لەگەڵ بەشێك لە ماڵەكەیان، لەبەر حەدیسەكەی بەهزی كوڕی حەكیم كە لەم كتێبەدا باس كرا، چونكە فێڵباز نزیكترە لەوەی كە سزا بدرێت تا ئەو كەسەی كە نایدات —بە ئاشكرا- بێ فروفێڵ، جا وورد بەرەوە.

زەكاتی بەروبومی و كشتوكاڵی و میوەهات ناگرێتەوە، چونكە ئەم جۆرە شتانە لە ڕۆژی دروێنەو چنینەدا زەكاتی لەسەرە، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَءَاتُواْ حَقَّهُۥ يَوْمَ حَصَادِهِۦ﴾ (الأنعام/١٤١). واتە: كاتی دروونەوەی زەكاتی لێ دەربكەن.

(عبدري) دەفەرموێت: ماڵی زەكات دوو جۆرە، یەكەمیان ئەوەیە زیادبوون لەخۆیدایە وەك دانەوێڵە و میوەهات، ئەمانە زەكات لەخۆیدا واجبە كاتی بوونی، دووەمیان ئەوەیە هەوڵ بۆ زیاد بوونی ئەدرێت، وەك دینارو درهەم و ماڵی بازرگانی و ئاژەڵ، ئەمانە ئەبێت ساڵی بەسەردا تێپەڕ ببێت، وە زەكات لە ڕادەكەیان (نصاب) دەرناكرێت هەتا ساڵێكی بەسەردا تێ نەپەڕێ، وە ئەمە قسەی هەموو زانایانە. لە (المجموع) ی نەوەویدا هاتووە.

**(٦) زەكات لە سامانی منداڵ و شێتدا:**

لەسەر سەرپەرشتی كەری منداڵ و شێت واجبە زەكات لە جیاتی ئەوان لە ماڵەكەیان دەربكات كاتێ گەیشتە ڕادەی زەكات.

لە عەمری كوڕی شوعەیبەوە لە باوكی‌یەوە لە باپیری‌یەوە لە عبداللەی كوڕی عەمرەوە هاتوە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن وَلِيَ يَتِيماً لَهُ مَالٌ فَلْيَتَّجِر لَهُ وَلا يَتْرُكهُ حتى تَأْكُلَهُ الصَّدَقَةُ). واتە: هەركەس سەرپەرشتی ماڵی هەتیوێكی كرد با بازرگانی پێوە بكات لێی و وازی لێ نەهێنێ تا زەكات بیخوات، ئیسنادی ئەم حەدیسە (ضعیف)ە، (حافظ) دەفەرموێت: شاهیدێكی مورسەلی هەیە لای شافیعی، شافیعیش تەئكیدی ئەم حەدیسەی كردووە بە عمومی ئەو حەدیسانەی كە بە (مطلق) ی هاتووە لەبارەی واجب بوونی زەكاتەوە.

عائیشە خوا لێی ڕازی بێت زەكاتی ماڵی ئەو هەتیوانەی دەرئەكرد كە لەژێر سەرپەرشتی ئەودابوون.

(ترمذي) دەفەرموێت: زانایان لەمەدا ئیختیلافیان هەیە، چەند كەسێك لە صەحابە ڕایان وایە كە ئەبێ زەكات لە ماڵی هەتیویش دەربكرێت، لەوانە عومەر و عەلی و عائیشەو ئیبنوعومەر خوایان لێ ڕازی بێت، وە مالیك و شافیعی و ئەحمەدو ئیسحاقیش هەر لەسەر ئەو ڕایەن.

كۆمەڵێك ئەڵێن: ماڵی هەتیو زەكاتی لەسەر نی‌یە، سوفیان و ئیبنوموبارەك لەسەر ئەو ڕایەن.

**(٧) خاوەن ماڵێك كە قەرزدار بێ:**

ئەگەر كەسێك ماڵێكی هەبوو زەكاتی تێدا واجب بوو، وە قەرزداریش بوو ئەبێ قەرزەكەی لێ بداتەوە، پاشان لە ماوەكەی زەكات دەربكات بەمەرجێك بگاتە ڕادەی زەكات (نصاب)، بەڵام ئەگەر ئەو ماڵەی مابۆوە لەپاش قەرز دانەوەكە نەگەیشتە ڕادەی زەكات، زەكاتی لێ دەرناكرێ چونكە لەم شێوەیەدا ئەوكەسە

---

وە بگەڕێرەوە بۆ ئەو باسەی كە لەمەودووا دێت لەژێر سەردێری ڕاكردن لەدەست زەكات (تمام المنة).

هەژارە، وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لاصَدَقَةَ إلا عَن ظَهرِ غنى) (رواه أحمد وذكره البخاري معلقاً). واتە لەسەر دەوڵەمەندی نەبێت زەكات دەرناكرێت.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (تُؤخَذُ مِن أغنيَائِهِم وَتُرَدُّ على فُقَرَائِهِم). واتە: لە دەوڵەمەندەكانی موسڵمانەكان وەرئەگیرێت و دابەش ئەكرێتەوە بەسەر هەژاركانیاندا.

وە ئەو قەرزارییەی باسمان كرد فەرقی نییە چ قەرزاری خوا بێت یا قەرزاری بەندە، چونكە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (فَدَينُ اللهِ أحَقُّ بِالقَضَاءِ) واتە: قەرزی خوا لەپێشترە بدرێتەوە، وە ئەمە دوایی باسی ئەكەین.

**(٨) كەسێك بمرێت و زەكاتی لەسەر بووبێت:**

كەسێك بمرێت و زەكاتی لەسەر بێت واجبە ئەوزەكاتە لە ماڵە بەجێ ماوەكەی بدرێت[١] وە پێش قەرزی خەڵك بخرێت، وە هەروەها پێش وەصیەت و بەشی میرات گرەكانیش بخرێت، ئەمە مەزهەبی شافیعی و ئەحمەدو ئیسحاق و (أبوثور)ە، بەپێی فەرموودەی خوای بەرز كە دەربارەی میرات فەرموویەتی: ﴿مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصِي بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍۗ﴾ (النساء/١٢). واتە: پاش بەجێ هێنانی وەصیەتی مردووەكە یا دوای دانەوەی قەرزەكانی.

وە زەكات قەرزی خوای گەورەیە، لە ئیبنوعەبباسەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتووە دەفەرمووێت: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ ووتی: دایكم فەوتی كردووەو مانگێ ڕۆژوی لەسەرە، ئایا بۆی بگرمەوە ؟ فەرمووی: ئەگەر دایكت قەرزاری كەسێك بووایە بۆت ئەداوە؟ ووتی: بەڵێ بۆم ئەداوە، فەرمووی: دە قەرزی خوا لەپێش ترە بدرێتەوە (شەیخەین گێڕاویانەتەوە).

**(٩) نییەت مەرجە لە دانی زەكاتدا:**

زەكات عیبادەتێكە، جا بۆ ئەوەی دروست بێت نییەت هێنان بەمەرج گیراوە بۆی، ئەویش بەمە كە زەكات دەر لەكاتی دەركردنی زەكاتەكەدا مەبەستی بەخشینی بێ لەڕێی خوادا، وە داوای پاداشتەكەی هەر لە خوا بكات و لە دڵی خۆیدا وای یەكلا بكاتەوە كە ئەمە ئەو زەكاتە فەرزەیە كە لەسەریەتی، خوای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ﴾ (البينة/٥). واتە: وە ئەوان تەنها فەرمانی ئەوەیان پێ كراوە كە بە ئیخلاصەوە عیبادەت بو خوا بكەن.

---

(١) ئەمە مەزهەبی شافیعی و ئەحمەدو ئیسحاق و (أبوثور)ە. (دانەر).

وە لە حەدیسی صەحیحدا هاتووە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إنَّمَا الأعمَالُ بِالنِّيَّاتِ وَإنَّمَا لِكُلِّ امرِئٍ مَا نوى). واتە: ڕاستی و دروستی کردەوەکان تەنها بە پێی نیازەکانە، ئەگەر بۆ خوا بوو دروستە ئەگەر بۆ شتێکی تر بوو ئەوە هەر ئەوەی بۆ ئەبێت کە بە نیازی‌یەتی.

مالیك و شافیعی بەمەرجیان داناوە کاتی دانی زەکاتەکە نی‌یەت بهێنرێت، وەلای ئەبوحەنیفە نی‌یەت کاتی دانی زەکاتەکە یا کاتی جیاکردنەوەی واجبە، وە ئەحمەد ڕێی داوە پێش دانی زەکات بە ماوەیەکی کەم نی‌یەت بهێنرێت.

**(١٠) کاتی واجب بوونی زەکات ئەبێ زەکات بدرێت:**

هەرکاتێ زەکات واجب بوو یەکسەر ئەبێ بدرێت، وە حەرامە دووا بخرێت لەکاتی خۆی، بەڵام ئەگەر نەیتوانی لەکاتی خۆیدا زەکاتەکە بدات دروستە دوای بخات هەتا ئەوکاتەی توانای دانی ئەبێت.

بەپێی ئەوەی ئەحمەد و بوخاری لە عوقبەی کوڕی (حارث)ەوە ئەگێڕنەوە دەفەرموێت: نوێژی عەسرم لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ کرد، کاتێ نوێژەکەی تەواو کرد بەپەلە هەڵسا چووە ماڵەوە، پاشان هاتە دەرەوە، هەستی کرد خەڵکەکە پەلەکردنەکەیان لا سەیر بوو فەرمووی: (ذَكَرتُ وأنا فِي الصَّلاةِ تِبراً عِندَنَا فَكَرِهتُ أن يُمسِيَ أو يَبِيتَ عِندَنَا، فَأمرتُ بِقِسمَتِهِ). واتە: لە نوێژەکەمدا بەبیرم هاتەوە پارچە زێڕێکمان هەیە، حەزم نەکرد هەتا ئێوارە یا هەتا بەیانی لامان بمێنێتەوە هەر بۆیە فەرمانم دا بە دابەش کردنی.

شافیعی ئەگێڕێتەوە هەروەها بوخاری لە (تأريخ)دا لە عائیشەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَا خَالَطَتِ الصَّدَقَةُ مَالاً قَطُّ إلا أهلَكَتهُ). واتە: ماڵ نی‌یە زەکاتی تێکەڵ بێت و لەناوی نەبات[1].

حومەیدی ئەم حەدیسەی گێڕاوەتەوە وە ئەمەشی زیاد کردووە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (يَكُونُ قَد وَجَبَ عَلَيكَ فِي مَالِكَ صَدَقَةٌ فلا تُخرِجُهَا ؛ فَيُهلِكُ الحَرامُ الحَلالَ). واتە: ماڵێکت هەیە واجبە لەسەرت زەکاتی لێبدەی، بەڵام نایدەی، ئەوسا ماڵە حەرامەکە حەڵاڵەکە لەناو ئەبات.

**(١١) پەلەکردن لە دەرکردنی زەکات:**

دروستە پەلە بکرێت لە زەکاتدا و پێش ئەوەی ساڵەکە تەواو بێت بدرێت، هەتا دروستە دوو ساڵ لەوەو پێش بدرێت، لە زوهری‌یەوە هاتووە کە ئەو بە خراپی نەئەزانی پێش ئەوەی ساڵەکە تەواو بێت زەکات بدرێت، وە لە حەسەنیان پرسی لەبارەی پیاوێکەوە کە زەکاتی سێ ساڵی داهاتووی دەرکردووە ئایا دروستە ؟ فەرمووی: بەڵێ دروستە.

---

(١) شێخ ئەلبانی ئاماژە بۆ ئەوە ئەکات کە حەدیسەکە زەعیفە، لەپاشان فەرموویەتی: ئەگەر ئەتەوێ زیاتریش لێکۆڵینەوە بکەیت ئەوە بگەڕێرەوە بۆ (تخريج الأحاديث المشكلة ٦٣) پاشان (سلسلة الأحاديث الضعيفة ٥٠٦٩).

شەوکانی ئەڵێ: شافیعیو ئەحمەدو ئەبوحەنیفەش هەر ئەو ڕەئیەیان هەیە، وە هەروەها هادی و قاسمیش هەر ئەوە ئەڵێن، وە (مؤيد بالله) ئەڵێ: ئەوە چاکترە.

مالیکو ڕەبیعەو سوفیانی (ثوري) و داوودو ئەبوعوبەیدی کوڕی (حارث) وە لە ئەهلی بەیتیش (ناصر)، گشت ئەوانە ئەڵێن: دروست نیە هەتا ساڵێکی تەواوی بەسەردا تێ نەپەڕێت, بەڵگەشیان ئەو حەدیسانەیە کە واجب بوونی زەکاتی بەستۆتەوە بەبەسەردا هاتنی ساڵێك، کە لەمەوپێش باس کرا، وە سەلماندنی زەرەر بە ڕەئی ئەوکەسە ناگەیەنێت کە ئەڵێ: دروستە پێش کاتی خۆی زەکات بدرێت، لەبەر ئەوەی واجب بوونی پەیوەستە بە سوڕانەوەی ساڵەوە، کە ئەمەش هیچ کێشەیەکی تێدا نیە، بەڵکو کێشە لەوەدایە ئایا دروستە پێش ساڵەکە بدرێت یان نا. تەواو.

ئیبنو ڕوشد ئەڵێ: هۆی ئەم خیلافەش ئەوەیە کە ئایا زەکات عیبادەتە یا مافێکی واجبی هەژارانە؟ جاهەرکەس بڵێت: زەکات دان عیبادەتەو بیشوبهێنێ بە نوێژەوە، ئەوەبەدروستی نازانێ پێش کاتی خۆی بدرێت، وە ئەوەشی ئەیشوبهێنێ بە مافە واجبە موئەجەلەکانەوە بەدروستی ئەزانێ پێش ماوەکەی خۆی بدرێت لەجیهەتی (تطوع)ەوە، وە شافعی بەڵگە بۆ قسەکەی ئەهێنێتەوە بەو حەدیسەی عەلی ڕەزای خوای لێ بێ کە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ پێش کات زەکاتی لە عەبباسی مامی وەرگرتووە. تەواو.

**(١٢) دوعا کردن بۆ زەکات دەر:**

وا موستەحەببە بۆ زەکات دەر دوعای خێر بکرێت کاتی وەرگرتنی زەکاتەکە، بەپێی فەرموودەی خوای گەورە کە فەرموویەتی: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ﴾ (التوبة/١٠٣) واتە: لە ماڵەکانیان زەکات وەربگرە بۆ ئەوەی پاکیان بکەیتەوە پێی، وە دوعاشیان بۆ بکە، چونکە دوعاکەت دڵنیایی و ئارامییە بۆیان.

لە عەبدالله ی کوڕی ئەبی ئەوفاوە هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ زەکاتی بۆ ئەهات ئەیفەرموو: (اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَيهِم) خوایە میهرەبانی خوت بڕژێنە بەسەریاندا، وە باوکم جارێك زەکاتی بۆ هێنا پێی فەرموو: (اللَّهُمَّ صَلِّ على آلِ أَبِي أوفى) خوایە میهرەبانی خۆت بڕژێنە بەسەر بنەماڵەی ئەبی ئەوفادا. (ئەحمەد و غەیری ئەو ڕیوایەتیان کردووە)[1].

---

(١) ئەڵێم دانەر زۆر دوور کەوتۆتەوە، چونکە حەدیسەکە لە صەحیحەیندا هەیە، هەروەك لە (المنتقى) و جگە لەودا هاتووە، وە دروست نیە کاتێك حەدیس لە صەحیحەیندا هەبێت یا لە یەکێکیاندا هەبێت بیداتە پاڵ شوێنێکی تر، مەگەر لە دوای ئەوانەوە باس بکرێت یا زیادەکی تێدا بێت کە لەو دووانەدا نەبێت، چونکە گومان بۆ ئەوە ئەچێت کە صەحیح نەبێت. ئەم حەدیسەش لە (إرواء الغليل) دا تەخریج کراوە بە ژمارە (٨٥٣) و (صحيح أبي داود ١٤١٥). (تمام المنة).

نەسائی ئەگێڕێتەوە لە وائیلی کوڕی حیجرەوە کە پیاوێك ووشترێکی چاکی بەزەکات ناردبوو، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (اللَّهُمَّ بَارِك فِيهِ وَفِي إِبِلِهِ). واتە: خوایە بەسەر خۆی و ووشترەکانیدا بەرەکەت برِژێنە.

شافیعی دەفەرمووێت: سوننەتە پێشەوای وولات کاتێ زەکاتی سەند بپاڕێتەوە بۆ زەکات دەرو بڵێت: (آجَرَكَ اللهُ فِيمَا أعطَيتَ، وَبَارَكَ لَكَ فِيمَا أبقَيتَ). واتە: خوا پاداشی ئەوەت بداتەوە کە داوتە، وە بەرەکەت بخاتە ئەوەوە کە هێشتوتەوە.

## ئەوشتانەی زەکاتیان تێدا واجبە

ئیسلام زەکاتی لەم شتانەدا واجب کردووە، زێڕ، زیو، دانەوێڵە، بەروبووم، کەلوپەلی بازرگانی، ئاژەڵی خۆ لەوەڕ، کانزا و گەنجی دۆزراوەی ژێر زەوی.

## زەکاتی زێڕو زیو

**واجب بوونی:**

بۆ واجب بوونی زەکات لەسەر زێڕ و زیو ئەم فەرمودەی خوای گەورە هاتووە کە ئەفەرمووێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يَكۡنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلۡفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرۡهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٖ ۝ يَوۡمَ يُحۡمَىٰ عَلَيۡهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكۡوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمۡ وَجُنُوبُهُمۡ وَظُهُورُهُمۡۖ هَٰذَا مَا كَنَزۡتُمۡ لِأَنفُسِكُمۡ فَذُوقُواْ مَا كُنتُمۡ تَكۡنِزُونَ﴾ (التوبة/٣٤-٣٥). واتە: وە ئەوکەسانەی سامان و دارایی لە زێڕو زیو کۆ ئەکەنەوەو لە ڕێی خوادا نایبەخشن مژدەی سزایەکی ئێشێنەریان پێ بدە، کاتێ لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو زێڕو زیوە لە ئاگری دۆزەخدا سوور ئەکرێتەوە و نێوچاوان و تەنیشتیان و پشتیانی پێ داغ ئەکرێ و پێیان ئەوترێ: ئەمە ئەو ماڵەیە کە لە دنیا بۆ خۆتانتان کۆ کردبۆوە، دەی بچەژن سزای ئەوەی کۆتان ئەکردەوە.

زەکات لە زێڕو زیودا واجبە چ ئەودووانە لە قاڵبی پارەدا بن یا داڕێژراو بن، یا کەرەسەی خاو بن (واتە: داڕێژراو نەبن) جا هەرکاتێك (ئەو دووانە) بە موڵکی لای کەسێك بوون و بەوڕادەیە گەیشتن کە ئەبێ زەکاتی لێ دەربکرێ، وە ساڵێکیان بەسەرا تێپەڕێ، وە قەرزی کەسیان تێدا نەبێ وە خاوەنەکەی پێویستی سەرەکی خۆی پێ‌ی نەبێ، ئەوە زەکات لێ دانی واجبە.

**لە زێڕدا لە چ ڕادەیەك زەکات ئەدرێ و ئەندازەی واجب چەندێکە:**

زێڕ هیچی زەکات لێ نادرێت هەتا ئەگاتە بیست دینار (دینارێك =٤،٢٥ غرام. بیست دینار = ٨٥ غرام) کاتێ گەیشتە بیست دینار و ساڵێکی بەسەر دانانیدا تێپەڕی، ئەوە چارەکی دەیەکی (واتە: لە چل

بەش یەك بەشی) زەكات لەسەرە، كەواتە لە بیست دینارەكە نیودینار، وە ئەگەر لە بیست دینار زیاتر بوو هەر بەو شێوەیە چارەكی دەیەكی لێ دەرئەكرێت.

لە عەلیەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لَيسَ عَلَيكَ شيئٌ ـ يَعنِي فِي الذَّهَبِ ـ حتى يَكُونَ لَكَ عِشرُونَ دِيناراً، فَإذَا كَانَت لَكَ عِشرُونَ دِيناراً وَحَالَ عَلَيهَا الحَولُ فَفِيهَا نِصفُ دِينَارٍ، فَمَا زَادَ فَبِحِسَابِ ذَلِكَ، وَلَيسَ فِي مَالٍ زَكَاةٌ حتى يَحُولُ عَلَيهَا الحَولُ). (رواه أحمد وأبوداود والبيهقي وصححه البخاري وحسنه الحافظ). واتە: هیچ زەكاتێكت لەسەر نیە (یەعنی لە زێڕدا) هەتا بیست دیناری دانراوت نەبێت، جا ئەگەر بیست دیناری دانراووت هەبوو وە ساڵێك بەسەریدا تێ پەڕی، ئەبێ نیودینار زەكاتی لێ بدرێت، پاشان هەرچی لە بیست دینارەكە زیاد بوو هەر بەوپێیە زەكاتی لێ دەرئەكرێت، وە هیچ ماڵێك زەكاتی لەسەر نابێت هەتا ساڵێك بەسەر دانرانیا نەڕوات.

وە لە زوڕەیقی مەولای بەنی فەزارەوە هاتووە دەفەرمووێت: عومەری كوڕی عبدالعزیز خوا لێی ڕازی بێت نامەیەكی بۆ ناردم (كاتێ بوو بە خەلیفە) تیایدا هاتبوو: زەكات وەربگرە لەو بازرگانە موسڵمانانەی بەلاتا تێپەڕ ئەكەن، (لەو ماڵەی ئاڵ و وێڵی پێ ئەكەن) لە هەر چل دینار دینارێك، وەئەگەر لە چل دینار كەمتر بوو ئەوە بەپێی كەمیەكەی، هەتا ئەگاتە بیست دینار، جا ئەگەر لە بیست دینار سێ‌یەكی دینارێكی كەم بوو وازی لێ بهێنە و هیچی لێ وەرمەگرە، و پسوڵەی بەڕائەت بدە بەوكەسانەی لێیان وەرئەگریت هەتا ساڵێكی تر، (ئیبنوئەبی شەیبە گێڕاویەتیەوە).

مالیك لە (الموطأ) دا دەفەرمووێت: ئەو سوننەتەی كە لای ئێمە ئیختیلافی تێدا نیە ئەوەیە كە زەكات لە بیست دیناری زێڕدا واجبە، وە لە دووسەد دیرهەمیشدا واجبە.

وە بیست دینار یەكسانە بە (٢٨) درهەم بە دیرهەمی میسری.

**لە زیودا لە چ ڕادەیەك زەكات ئەدرێ و ئەندازەی واجب چەندێكە:**

زیویش هیچ زەكاتی لێ نادرێت هەتا نەگاتە دووسەد دیرهەم، جا كاتێك گەیشتە دووسەد دیرهەم و ساڵێك بەسەر دانانیا ڕۆیشت ئەوە چارەكی دەیەكی زەكات لێ ئەكەوێت (واتە: لە چل بەش یەك بەش) وە ئەگەر لە دووصەد دیرهەم زیاتر بوو زۆر یا كەم هەر بەو پێیە زەكاتی لێ دەرئەكرێ (واتە: چل یەك) چونكە لە زەكاتی نەقددا پاش گەیشتن بە ڕادەی زەكات لێبوردن نیە.

لە عەلیەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (قَد عَفَوتُ لَكُم عَنِ الخَيلِ وَالرَّقِيقِ، فَهَاتُوا صَدَقَةَ الرِّقَّةِ (الفضة) مِن كُلِّ أربَعِينَ دِرهَماً دِرهَمٌ، وَلَيسَ فِي تِسعِينَ وَمائة شيئٌ، فَإذَا بَلَغَت مائتَينِ فَفِيهَا خَمسَةُ دَرَاهِمَ) (رواه أصحاب السنن). واتە: لە زەكاتی ئەسپ و بەندەكانتان بووورام، ئێوەش زەكاتی زیو بدەن لە چل درهەم درهەمێك، وە لە سەدو نەوەد درهەمدا هیچ زەكات نیە، جا كاتێ گەیشتە دووسەد دیرهەم پێنج دیرهەم زەكاتی لێ دەردەكرێت.

(ترمذي) ئەفەرموێ: دەربارەی ئەم حەدیسە لە بوخاریم پرسی فەرمووی: صەحیحە، ئەڵێ عەمەلی زانایانیش بەم شێوەیە کە لە پێنج (أوقية) کەمتر زەکاتی لێ دەرناکرێ، یەك (أوقية) ش چل دیرهەمە، پێنج (أوقية) ش دووصەد دیرهەمە، وە دووصەد دیرهەم (٢٧) ریال =(٥٥٥) قیڕشی میسری‌یە. (درهەمێك = ٢,٩٧٥ غرام، دووصەد دیرهەم = ٥٩٥ غرام زیوە).

**تێکەڵ کردنی زێڕو زیو:**

هەرکەسێك خاوەنی زێڕێك بێت کە نەگاتە ڕادەی زەکات (نصاب)، وە خاوەنی زیوێکیش بێت نەگاتە ڕادەی زەکات، نابێ تێکەڵ یەکتریان بکات تاوەکو بەهەردووکیان ڕادەی زەکات تەواو بکەن، چونکی ئەودووانە دوو جینسی جیاوازن، نابێ تێکەڵ بەیەکتر بکرێن، هەروەك مانگاو مەڕ کە نابێ تێکەڵ بکرێن، کەواتە ئەگەر کەسێك (١٩٩) دیرهەم و (١٩) دیناری هەبوو زەکاتی لەسەر نی‌یە[1].

**زەکاتی ماڵێك کە درابێت بە قەرز:**

قەرز دوو حاڵەتی هەیە:

**١- یا ئەو قەرزە لەسەر یەکێکە دانی پێدا ئەنێت و ئەتوانێت بیداتەوە:**

ئەم حاڵەتە زانایان چەند ڕایەکیان لەبارەیەوە هەیە.

(ڕای یەکەم) زەکاتەکەی لەسەر خاوەنی‌یەتی دەری بکات، بەڵام واجب نی‌یە لەسەری بیدات هەتا دەستی نەکەوێتەوە، جا هەرکاتێ کەوتەوە دەستی زەکاتی لەوەپێشی لێ دەربکات، ئەمەش مەزهەبی عەلی و (أبو ثور) و حەنەفی‌یەکان و حەنبەلی‌یەکانە.

(ڕای دووەم) ئەبێ خاوەنی دەم و دەست زەکاتی دەربکات، با وەریشی نەگرتبێتەوە، چونکە توانای وەرگرتنەوە و تەسەڕڕوف تێدا کردنی هەیە، لەبەر ئەوە ئەبێ زەکاتەکەی دەربکات، هەروەك چۆن زەکاتی

(١) بەڵگە هێنانەوە لێرەدا بە حەدیس باشترە لە قیاس، ئیبنوحەزم لە دوای ئەوەی قسەی ئەوکەسانەی ڕەد داوەتەوە کە تێکەڵ کردن بە دروست دائەنێن. ووتویەتی:

بەڵگەی ئێمە لەسەر ئەوەی نابێت تێکەڵ کردن بکرێت لە زەکاتدا فەرمودەی پێغەمبەرە ﷺ: (لَيسَ فِيمَا دُونَ خَمسَةِ أوَاقٍ مِنَ الوَرِقِ صَدَقَةٌ). واتە لە پێنج ئوقیە کەمتر زەکاتی لێ دەرناکرێ.

جا ئەوەی زێڕ و زیوی تێکەڵ کرد بۆ زەکات، ئەوە زەکاتی لە زیوێکدا داناوە کە لە پێنج ئوقیە کەمتر بووە، ئەمەش پێچەوانەی ڕوتە بۆ فەرمانی پێغەمبەر ﷺ، و شەرع دانانێکە کە خوا ڕێی پێ نەداوە، ئەوانەش کە ڕایان وایە زێڕو زیو تێکەڵ بکەن ئەو حەدیسە بە صەحیح ئەزانن کە لە بیست دینار کەمتر زەکاتی تێدا نی‌یە، کەچی لە کەمتر لە بیست دیناردا بە واجبی دائەنێن، ئەمەش کردەوەیەکی زۆر گەورە و گرانە. (تمام المنة).

سپێردراو (ماڵێك كە بەيەكێ ئەسپێردرێ) دەر ئەكات، ئەمەش مەزهەبی (عثمان) و ئیبنوعومەرو جابیرو (طاووس)و نەخەعی و حەسەن و زوهری و قەتادە و شافیعی‌یە.

(ڕای سێیەم) ئەو ماڵە قەرزە زەکاتی لەسەر نی‌یە چونکە ماڵێك نی‌یە زیاد بکات و گەشە بکات، هەتا زەکاتی لەسەر بێت وەك ئەو ماڵە وایە خاوەنەكەی داینابێت بۆ پێویستی خۆی، نەك بۆ بازرگانی ئەمەش مەزهەبی عیکریمەیە، وە لە عائیشەو ئیبنوعومەریشەوە ریوایەت کراوە.

(ڕای چوارەم) ئەگەر وەری گرتەوە تەنها زەکاتی ساڵێکی لێ دەرئەکات، ئەمەش مەزهەبی سەعیدی کوڕی موسەییب و (عطاء) ی کوڕی ئەبوڕەباحە.

**٢- یا قەرزەکە لای یەکێکە دەستی کورتە:**

یا حاشای لێ‌ئەکات، یا قەرز کوێرە، جا کاتێ ئەو قەرزە بەوشێوەیە بوو ئەڵێن: زەکاتی لەسەر نابێت، ئەمەش قسەی قەتادە و ئیسحاق و (أبوثور) و حەنەفی‌یەکانە، چونکە ئەم جۆرە ماڵانە ناتوانرێت کەڵکیان لێ وەربگیرێت.

وە ئەڵێن: ئەگەر وەری گرتەوە زەکاتی ڕابوردووی لێ دەربکات، ئەمەش قسەی (ثوري) و ئەبوعوبەیدە، چونکە لەم شێوەیەدا ئەبێتەوە خاوەنی و ئەتوانێ تەسەڕروفی تێدا بکا، لەبەر ئەوە واجبە هەرچی زەکاتی پێشویەتی لێی دەربکات، وەك قەرزێك وایە لەسەر دەوڵەمەندێك، وە لە شافیعی‌یەوە ئەم دوو ڕەئی‌یە هەردووکیان ریوایەت کراوە.

لە عومەری کوڕی عبدالعزیز و حەسەن و (لیث) و ئەوزاعی و مالیکەوە هاتووە: کاتێ قەرزەکەی دەست کەوتەوە زەکاتی یەك ساڵی لێ دەربکات.

**زەکاتی کاغەز و سەنەدە بانکی‌یەکان:**

کاغەزو سەنەدە بانکی‌یەکان نووسراوو بەڵگەنامەن لەباتی پارەیەکی قەرزی زامن کراو، واجبە زەکاتیان لێ بدرێت ئەگەر گەیشتنە ئەوەڵ ڕادەی زەکات (نصاب) کە (٢٧) ریالی میسری‌یە، چونکی ئەتوانرێت یەکسەر نرخی ئەو کاغەزانە بە زیو بدرێت.

**زەکاتی خشڵ:**

زانایان لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون کە زەکات نادرێ لەئەڵماس و دوڕو یاقوت و لۆلۆ و مەرجان و زەبەرجەدو وێنەی ئەمانە کە لەبەردی گران بەهان، مەگەر لە بازرگانیدا بەکار بێن، جا کاتێ لە بازرگانیدا بەکارهاتن زەکاتیان لەسەرە.

وە زانایان لەبارەی خشڵی زێڕ و زیوی ئافرەتاندا ئیختیلافیان هەیە، ئەبوحەنیفەو ئیبنوحەزم ڕەئیان وایە کە زەکاتی تێدا واجبە مادام بگاتە ڕادەی زەکات (نصاب)[1]، بەڵگەشیان ئەوەیە کە عەمری کوڕی شوعەیب ئەگێڕێتەوە لە باوکی‌یەوە لە باپیری‌یەوە دەفەرمووێت: دوو ژن هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ دەستیان بازنەی ئاڵتوونی تێدا بوو، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون: (أَتُحِبَّانِ أن يُسَوِّرَكُمَا اللهُ يَومَ القِيَامَةِ أَسَاوِرَ مِن نَارٍ؟ قَالَتَا: لا، قَالَ: فَأَدِّيَا حَقَّ هَذا الَّذِي فِي أَيدِيكُمَا). واتە: حەز ئەکەن لە ڕۆژی دوایی دا خوا بازنی ئاگرتان لەدەست بکات ؟ ووتیان: نا، فەرمووی: دەی کەواتە مافی (واتە: زەکاتی) ئەوەی لەدەستاندایە بدەن.

لە ئەسمائی کچی یەزیدەوە هاتووە دەفەرمووێت: من و پورم چووین بۆلای پێغەمبەر ﷺ بازنەی زێڕمان لە مەچەك کردبوو فەرمووی: (أَتُعطِيَانِ زَكَاتَهُ؟ فَقُلنَا: لا، قَالَ: أَمَا تَخَافَانِ أن يُسَوِّرَكُمَا اللهُ أَسوِرَةً مِن نَارٍ؟ أَدِّيَا زَكَاتَهُ). (قال الهيثمي: رواه أحمد وإسناده حسن) واتە: ئایا زەکاتی ئەو بازنانە ئەدەن، ووتمان: نا، فەرمووی: ئەی ناترسن خوا بازنی ئاگرتان لەدەست بکات؟ دە زەکاتەکەی بدەن[2].

---

(١) ئیبنوحەزم بۆ ئەو بۆچوونەی بەڵگەی بەم حەدیسە نەهێناوەتەوە لەبەر ئەوەی لای ئەو زەعیفە وەك لە (المحلى) دا باسی کردووە (٦/٧٨-٧٩) بەڵکو ئەو بە عمومات بەڵگەی هێناوەتەوە چونکە لە لاپەڕە (٨٠) دا ووتویەتی: ئەگەر تەنها ئەم ئەسەرانەمان بەدەستەوە بووایە ئەوە ئەمان ئەووت زەکات لە خشڵیشدا هەر واجبە، بەڵام کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ سابت بووبێت لە زیودا چڵیەك هەبێ، وە لە چل ئوقیە کەمتر زەکاتی لێ نەکەوێ، وە ئەگەر بگاتە دووسەد درهەم ئەوە پێنج درهەمی زەکات بێت و ئەو خشڵەش زیو بێت ئەوە زەکات لێدانی تێدا واجبە لەبەر گشتی‌یەتی ئەو دوو حەدیسە صەحیحەی کە باسمان کرد.

وە لەبارەی ئاڵتونیشەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ سابت بووە کە فەرموویەتی: هەر خاوەن زێڕێك زەکاتەکەی نەدات ئەوە لە ڕۆژی دوایی‌دا ئەکرێت بە چەند پارچە ئاگرێك و پێی داغ ئەکرێت، کەواتە زەکات بەپێی ئەم دەقە لە هەموو زێڕێکدا واجبە.

منیش بۆیە ئەمەم باس کرد بۆ ڕوون کردنەوەی ڕاستی، وە بۆ ئەوەی هیچ کەس کە قسەیەکی نەکردبێت نەیدرێتە پاڵ، وەگەرنە من لەگەڵ ئیبنوحەزمدا ڕێك ناکەوم لە لاواز کردنی عەمری کوڕی شوعەیبدا، بەڵکو عەمری کوڕی شوعەیب ئەگەر ئیسنادەکە هی ئەوبێت ئەوە حەدیسەکەی صەحیحە، و ئەم ئیسنادەش هەر هی ئەوە، و ئەو عموماتەش کە ئیبنوحەزم باسی کرد پاڵ پشتە بۆ ئەم حەدیسە (تمام المنة).

(٢) نەخێر حەسەن نی‌یە، بەڵکو حەدیسەکە زەعیفە. (لەپاشان دەفەرمووێ) لەگەڵ ئەوەشدا کە حەدیسەکە زەعیفە دانەر هەڵەی کردوەو ووشەی زەکات دانیشی پێ زیاد کردووە، چونکە حەدیسەکە ئەحمەدیش هەر تەخریجی کردووە هەر لەو ڕێگایەوە بەڵام باسی زەکات دانی تێدا نی‌یە، چونکە حەدیسەکە لەبارەی حەرامی ئاڵتونە لەسەر ئافرەتان، نەك لەسەر واجبی زەکات دان لە ئاڵتون بێت. جا وورد بەرەوە.

لە عائیشەوە هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ هات بۆلام سەیری كرد چەند ئەنگوستیلەیەكی زیوم لەدەستایە، فەرمووی: ئەوە چی‌یە عائیشە؟ ووتم: دروستم كردوون بۆ ئەوەی بۆ تۆ خۆم برازێنمەوە ئەی نێرراوی خوا، فەرمووی: زەكاتەكەیان ئەدەیت ؟ ووتم: نا یا هەر شتێكی ترم ووت كە خوا ویستی لەسەر بوو، فەرمووی: تەنها سزای ئەوەت بەسە لە دۆزەخدا، (ئەبوداود و (دارقطني) و بەیهەقی گێراویانەتەوە).

بەڵام سێ ئیمامەكەی تر بۆ ئەوە چوون كە خشڵی ئافرەت هەرچەند بێت زەكاتی ناكەوێت، چونكە بەیهەقی ریوایەتی كردوە كە جابیری كوڕی عبداللە لەبارەی خشڵەوە پرسیاری لێ كرا ئایا زەكاتی لێ بدرێ؟ جابیر فەرمووی: نا، ووتیان: ئەگەر بگاتە هەزار دیناریش ؟ فەرمووی: ئەگەر لەوەش زیاتر بێت.

بەیهەقی ئەگێڕێتەوە كە ئەسمائی كچی ئەبوبەكر نزیكەی پەنجا هەزار خشڵی زێڕی ئەدا لە كچەكانی وزەكاتیشی دەرنەئەكرد.

لە (الموطأ) دا هاتووە لە عبدالرحمن ی كوڕی قاسمەوە لە باوكی‌یەوە كە عائیشە چەند كچێكی برازای هەتیوی هەبوو سەرپەرشتی ئەكردن لای خۆی، خشڵیان هەبوو زەكاتیشی لێ دەرنەئەكرد.

هەر لە (الموطأ) دا هاتووە كە عبداللە ی كوڕی عومەر خشڵی زێڕی ئەدا لە كچەكانی و جاری‌یەكانی، وە زەكاتی ئەوخشڵانەی دەرنەئەكرد.

(خطابي) ئەڵێت: (ظاهر) ی قورئان شایەتە بۆ قسەی ئەوكەسانەی كە ئەڵێن: خشڵی ژنانیش زەكاتی لەسەر واجبە، وە (أثر) یش تەئیدی ئەو قسەیە ئەكا، وە ئەوەی كە ئەڵێ: واجب نی‌یە، بە عەقڵ وائەڵێ، وە گۆشەیەكی (أثر) یشی بەدەستەوەیە، بەڵام بۆ ئیحتیات بدرێ باشترە.

وە ئەم خیلافەش كە هەیە لەبارەی خشڵەوە، لەبارەی خشڵێكەوەیە كە ڕەوا بێت ئافرەت بەكاری بهێنێ، بەڵام ئەگەر خشڵێك بوو ڕەوا نەبوو بەكاری بێنێ، بۆ نموونە ئەگەر خشڵێك بەكاربێنێ كە تایبەت بێ بە پیاوەوە وەك خشڵی شمشێر، ئەوە حەرامە، وە واجبە لەسەری زەكاتی لێ بدا، وە قاپ و قاپاغی زێڕو زیویش هەر ئەو حوكمەی هەیە (لە حەرامێتی بەكارهێنانیدا و زەكات لێدانی).

**زەكاتی مارەیی ژنان:**

ئەبو حەنیفە بۆ ئەوە چووە كە مارەیی ژنان زەكاتی لەسەر نی‌یە، هەتا وەری نەگرێت، چونكە ئەو مارەیی‌یە لە جیاتی شتێكە كە ماڵ نی‌یە، لەبەر ئەوە زەكاتی تێدا نی‌یە پێش وەرگرتنی، وەك قەرزی

---

حەرامی زێڕیش لەسەر ئافرەتان شایەتی زۆرە، منیش لە بەشێكی تایبەتدا كۆم كردونەوە كە تێیدا چاوم لە هەندێك سەلەف كردووە لە جیاكردنەوەی هەندێك لە زێڕی بازنەیی كراو لە گشتی‌یەتی حەڵاڵ بونی ئاڵتون بۆ ژنان، وە لە ناميلكەكەمدا دام ناوە (آداب الزفاف في السنة المطهرة) وە لەوێشدا وەڵامی ئەو گومانانەم داوەتەوە كە بەرهەڵستی پێ كراوە لەلایەن مقلدین و مخالفین جا بگەڕێرەوە بۆی چونكە زۆر گرینگە (ل١٣٢-١٦٨) (تمام المنة).

نوسراو وايە، وە لەدواى وەرگرتنى ئەو مارەيىيە بەمەرج دانراوە ئەبێ بگاتە ڕادەى زەكات (نصاب)، وە سالێكيشى بەسەرا تێپەڕێت، ئەوكاتە زەكاتى لێ دەرنەكرێ، ئيللا مەگەر ئەو ژنە بێجگە لە مارەيىيەكەى ماڵێكى ترى هەبێ گەيشتبێتە ڕادەى زەكات، لەم حاڵەتەدا ئەگەر شتێكى لە مارەيىيەكەى وەرگرت بيخاتە سەر ئەوماڵە و لەگەڵ ماڵەكەدا زەكاتەكەى لێ دەركا بە سووڕانەوەى ساڵ بەسەر ماڵەكەدا.

شافيعى بۆ ئەوە چووە كە ژن ئەبێت زەكاتى مارەيىيەكەى بدات، كاتێ ساڵى بەسەردا تێپەڕێ، وە ئەبێ لە كۆتايى ساڵەكەدا زەكاتى هەمووى دەربكات، با لەپێش گواستنەوەشيدا بێت، وە ئەوەى كە ئەو مارەيىيە هەمووى موعەررەزى نەمانە بەهۆى فەسخى نيكاحەوە، يا بەهۆى مورتەد بوونەوە، يا بەهۆى غەيرى ئەم دووانە، يا نيوەى موعەرڕەزى نەمان بێت بەهۆى تەلاق دانى پێش گواستنەوەوە ئەمە هيچ تەئسيرێكى نىيە بۆ دەركردنى زەكات لێى.

وە لاى حەنبەلىيەكان ئەو مارەيىيە لە ئەستۆى پياودا قەرزى ژنە، وە لاى ئەوان حوكمەكەى حوكمى قەرزەكانە، جا ئەگەر ئەو مارەيىيە بەسەر دەوڵەمەندێكەوە بوو ئەوە زەكات واجبە لێى، وە هەركاتێ وەرى گرت ئەبێ زەكاتى لەوەو پێشى لێ بدات، بەڵام ئەگەر لەسەر دەست كورتێك بێت يا لاى كەسێك بێت كە نينكارى لێ بكات، خەرقى دەفەرمووێت: زەكات واجبە لێى، وە لەمەدا فەرقى نىيە ئەو ئافرەتە گوێزرابێتەوە يا نەگوێزرابێتەوە، وە ئەگەر نيوەى مارەيىيەكەى نەما بەهۆى تەلاقدانى لەپێش گواستنەوەى، وە نيوەكەى ترى وەرگرت، ئەبێ زەكاتى ئەو نيوەيە بدا كە وەرى گرتووە، بێجگە لەوەى كەوەرى نەگرتووە، هەروەها ئەگەر گشت مارەيىيەكە نەمێنێ پێش ئەوەى وەرى بگرێ، بەهۆى فەسخى نيكاحەكەوە لەلايەن ژنەكەوە، ئەوكاتە زەكاتى لەسەر نىيە.

**زەكاتى كرێ خانوو:**

ئەبوحەنيفە و ماليك بۆ ئەوە چوون كە كرێ وەرگر (مُؤَجِّر) موستەحەققى كرێ نابێ بە دامەزراندنى عەقد، بەڵكو كاتێ موستەحەققى ئەبێ كە ماوەى كرێكەى تەواو بوو، كەواتە بەم پێيە هەركەسێك خانوويەك بدا بە كرێ زەكاتى لەسەر واجب نابێت هەتا كرێكە وەرنەگرێ[1] و ساڵيشى بەسەردا تێنەپەڕێت وە نەگاتە ڕادەى زەكات.

حەنبەلىيەكان بۆ ئەوە چوون كە كرێ وەرگر (مُؤَجِّر) لەو ڕۆژەوەى كە عەقدەكە دامەزراوە ئەبێتە خاوەنى كرێ، كەواتە بەم پێيە هەركەس خانويەكى دا بەكرێ ئەبێ زەكات لە كرێكەى بدات بەمەرجێك بگاتە ڕادەى زەكات و ساڵى بەسەردا بڕوات، چونكە كرێ وەرگر (مُؤَجِّر) بە هەموو جۆرێ ئەبێتە خاوەنى

(١) واتە: كاتى وەرگرتن زەكاتى پێشووى ئەدا ئەگەر ساڵێ يا زياتر بەسەر دامەزراندنى عەقدەكەدا تێ پەڕێ (دانەر).

تەسەڕڕوف بەسەر ئەو كرێیەدا، وە ئەگەر بە كرێ دانەكە موعەڕڕەزی فسخ و هەڵوەشانەوەش بێ ئەمە نابێتە ڕێگری واجیبیەتی زەكات، چونكە وەك مارەیی پێش گواستنەوە وایە، پاشان ئەگەر كرێكەی وەرگرت ئەبێ زەكاتی دەربكات، وە ئەگەر كرێكە قەرز بوو ئەو كاتە حوكمەكەی حوكمی قەرزە، قەرزی حازر (معجل) یا دواخراو (مؤجل) بێت.

لە (المجموع) دا هاتووە: ئەگەر كەسێك خانووەكەی یا شتێكی تری دا بە كرێی دەم و دەست و وەریشی گرت، ئەبێ زەكاتەكەی دەربكات، وە زانایان جیاوازیان نی‌یە لەسەر ئەوە.

## زەكاتی ماڵی بازرگانی

### حوكمی زەكاتی ماڵی بازرگانی:

جەماوەری زانایان لە صەحابە و تابعین و زانایانی دوای ئەوان بۆ ئەوە چوون كە زەكات لە ماڵی بازرگانیدا واجبە، بەپێی ئەوەی ئەبوداود و بەیهەقی لە سەمورەی كوڕی جوندوبەوە ئەگێڕنەوە دەفەرمووێت: لەدوای ئەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ ئەداین زەكاتی ئەوەش دەربكەین كە ئامادەی ئەكەین بۆ فرۆشتن.

(دارقطني) و بەیهەقی لە (أبوذر)ەوە ئەگێڕنەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (فِي الإِبِلِ صَدَقَتُهَا، وَفِي الغَنَمِ صَدَقَتُهَا، وَفِي البَقَرِ صَدَقَتُهَا، وَفِي البَزِّ صَدَقَتُهُ). واتە: ووشتر زەكاتی خۆی هەیەو مەڕ زەكاتی خۆی هەیەو مانگا زەكاتی خۆی هەیەو (بز) زەكاتی خۆی هەیە[1]، (بەزز، بە شتومەكی ماڵ ئەڵێن).

---

(١) ئەڵێم: لە قاموسدا ووشەی (بز) بە مانای جلوبەرگە، یا خود كەلوپەلی ناوماڵ لە جلوبەرگ و شێوەكانی، جا مانا كردنەوەی بە جلوبەرگ گونجاو ترە لەم شوێنەدا، وەگەر نا كەلوپەلی ناوماڵ هیچ زەكاتی لەسەر نی‌یە بە ڕێكەوتنی هەموو زانایان.

پاشان بزانە كە ئەم حەدیسە و حەدیسەكەی پێشەوە كە هی سەمورەیە هەردووكیان زەعیفن. و سەنەدێكی سابتیان نی‌یە، وە (حافظ) هەندێ لە ڕێگاكانی حەدیسی دووەمی بە حەسەن داناوە، وە ڕواڵەتەكەشی هەروایە، و من ماوەیەك بەشوێنی كەوتم تاوەكو بۆم دەركەوت كە موسای كوڕی عوبەیدەی تێدایە كە زەعیفە هەروەكو ریوایەتەكەی (دارقطني)و (مخلص) دەریان خستووە، هەرچەندە ئەمە هەڵەیەكە لە ئیسنادی حاكم دا، جا (دارقطني) بە صەحیحی داناوە و (حافظ) بە حەسەن، بەڵام هەردووكیان مەعزەرەتیان هەیە لەم دانانەدا.

لەپاش ئەوەش حەدیسەكە ووشەیەكی تێدایە كە جیاوازی هەیە لەگەڵ نوسخەكانی تردا، ئەویش ووشەی (بز) ە كە موسای كوڕی عوبەیدە بەو شێوەیە باسی كردووە و دەركەوت كە ز ەعیفە، وە لای هەندێك لە نوسخەكان بە شوێنی (بَر) (بُر) هاتووە، وە نە بۆ ئێمە و نە بۆ كەس لە پێش ئێمەوە ڕوون نەبۆتەوە كە كامیانە.

ئەمەش هەروەك صدیق حسن خان ئەڵێت: گومان و دوو واتا هەڵنەگرێ لەبەر ئەوە نابێتە بەڵگە.

منیش ئەڵێم: ئەوە ئەگەر حەدیسەكە صەحیح بێت، جا ئەی ئەگەر لە بنەمادا حەدیسەكە صەحیحیش نەبێت چی؟!
ئەوەی كە حەقیش بێت ئەوەیە، كە ووتن بە واجبێتی زەكات لە كەلوپەلی بازرگانیدا هیچ بەڵگەیەكی لەسەر نی‌یە نە لە قورئاندا نە لە سوننەتدا، لەگەڵ ئەوەشدا كە لەگەڵ ئەو قاعیدەیەش نایەتەوە كە ئەبێ لەماندا بەرائەتی ئەصلی بۆ دابنرێ، واتە قەدەغە بكرێت و حەرام بێت كە لە خەڵك بسەندرێت، بە دەق نەبێت، ئەوەش فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ پاڵپشتی ئەكات كە لە حەجی ماڵ ئاواییدا فەرموویەتی: (إنَّ دِمَاءَكُم، وَأموَالَكُم، وَأعرَاضَكُم، وَأبشَارَكُم، عَلَيكُم حَرَامٌ، كَحُرمَةِ يَومِكُم هَذَا، فِي شَهرِكُم هَذَا، فِي بَلَدِكُم هَذَا، ألا هَل بَلَّغتُ؟! اللَّهُمَّ فَاشهَد... الحديث). رواه الشيخان وغيرهما، وهو مخرج في الإرواء (١٤٥٨).

واتە: بەڕاستی هەدەر كردنی خوێن و ماڵ و سامان و ناموسی ئێوە لەسەر ئێوە حەرامە، هەروەك حەرامێتی ئەم ڕۆژەتان، لەم مانگەتاندا، لەم شارەتاندا، كە مەككە بوو، ئاگادار بن ئایا پێم ڕاگەیاندن، دە خوایە بە شایەت بە كە پێم ڕاگەیاندوون.

جا قاعیدەی ئاوها هەڵوەشاندنەوەی ئاسان نی‌یە. یان تایبەت كردنی ئەم فەرموودەیە بە هەندێك ئاسار با صەحیحیش بێت ئاسان نی‌یە، وەكو قسەی عبد الله ی كوڕی عومەر خوایان لێ ڕازی بێت كە ووتویەتی: لە كەلوپەلدا زەكات نی‌یە، مەگەر ئەو كەلوپەلەی كە بۆ بازرگانی بێت. ئیمام شافیعی لە ئوم دا بە سەنەدێكی صەحیح تەخریجی كردووە.

هەرچەندە ئەم ریوایەتە لەسەر ئیبنوعومەر وەستاوەتەوە و نیسبەت نەدراوە بۆ پێغەمبەر ﷺ، لەگەڵ ئەوەشدا باسی (نصاب) ی زەكات ناكات، وە هەروەها باسی ئەو شتەش ناكات كە واجبە لێی بدرێت، جا ئەكرێت كە حەمل بكرێت بۆ سەر زەكاتی موطلەق، و نەبەسترێتەوە بە ئەندازە و كاتەوە، بەڵكو خاوەنەكەی چەندەی پێ خۆش بوو ئەوەندە بدات، ئەوكاتە ئەچێتە ژێر ئەو دەقانەوە كە فەرمان ئەكەن بە ماڵ بەخشین وەكو فەرموودەی خوای گەورە: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِمَّا رَزَقْنَـٰكُم...﴾ واتە: ئەی ئەو كەسانەی باوەڕتان هێناوە لەو رزق و ڕۆزی‌یەی پێمان داوون ببەخشن.

وە هەروەها فەرموودەی خوای گەورە: ﴿وَءَاتُواْ حَقَّهُۥ يَوْمَ حَصَادِهِۦ﴾ واتە: مافەكەی و زەكاتەكەی لە ڕۆژی چنینیدا بدەن.

هەروەها وەك فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: (مَا مِن يَومٍ يُصبِحُ العِبَادُ فِيهِ، إلا مَلَكَانِ يَنزِلانِ، فَيَقُولُ أحَدُهُمَا: اللَّهُمَّ أعطِ مُنفِقاً خَلَفاً، وَيَقُولُ الآخَرُ: اللَّهُمَّ أعطِ مُمسِكاً تَلَفاً). رواه الشيخان وغيرهما، وهو مخرج في السلسلة الصحيحه برقم (٩٢٠).

واتە: هەموو ڕۆژێك كە بەندەكانی خوا بەیانی ئەكەنەوە، دوو فریشتە دێنە خوارەوە، یەكێكیان ئەڵێت: خوایە ئەوەی صەدەقە ئەدات شوێنەكەی بۆ پڕ بكەیتەوە، وە ئەوەی تریان ئەڵێت: خوایە ئەوەی دەست ئەگرێت و چروكی ئەكات ماڵەكەی بۆ لەناوبەرێت.

وە هەندێك ریوایەتی صەحیح هەیە كە باسم كردووە لە سەرەوە:
ئیبنوجورەیج ئەڵێت: (عطاء) بە منی ووت: زەكات لە لۆلۆ و زەبەرجەد و یاقوت و مورووی ئەنگوستیلە و كەل و پەل و هەموو شتێكدا كە بازرگانی پێوە نەكرێت واجب نی‌یە، وە ئەگەر شتێك لەوانە بازرگانی پێوە بكرێت، ئەوە زەكات لە نرخەكەیدا ئەبێت ئەو كاتە كە ئەفرۆشرێت. (عبدالرزاق) تەخریجی كردووە (٤/٨٤/٧٠٦١) و ئیبنوئەبی شەیبە (٣/١٤٤) وە سەنەدەكەی زۆر صەحیحە.
شایەت لەسەر ئەم ریوایەتە ئەوەیە كە فەرموویەتی: زەكات لە نرخەكەی دەرئەكرێت ئەو كاتەی كە ئەفرۆشرێت.
جا (عطاء) باسی خەمڵاندن و نصاب و ساڵی نەكردووە، ئەمەش ئیدعاكەی بەغەوی بەتاڵ ئەكاتەوە كە لە (شرح السنة) (٦/٥٣) دا كردوویەتی، كە ئیدعای ئیجماعی كردووە لەسەر زەكات دەركردنی نرخی كەلوپەلی بازرگانی. هەركاتێك بە نصاب بگات و ماوەی یەك ساڵی بەسەردا تێپەڕێ! وە هەروەها ئیدعای ئەوەی كردووە كە هیچ كەس جیاوازی لەگەڵ ئەم ئیجماعەدا نەكردووە جگە لە داودی (ظاهري) نەبێت!.
وە ئەوەی كە ئەم ئیدعایە بەتاڵ ئەكاتەوە ئەوەیە كە ئەبوعوبەید رەحمەتی خوای لێ بێت لە كتێبەكەیدا (الأموال) (٤٢٧/١١٩٣) لە هەندێك زانایانەوە باسی كردووە كە زەكات لە ماڵی بازرگانیدا نی‌یە.
ئەمەش زۆر دوورە كە مەبەستی بەو هەندە تەنها داود بێت. چونكە كاتێك ئیمام ئەبو عوبەید كۆچی دوایی كرد داود تەمەنی ٢٤ ساڵ بووە، یان كەمتر لە ٢٤ ساڵ، كەسێكیش لەم تەمەندا بووبێت، دوورە ئەوەندە ناوبانگی زانستی بووبێت، بە شێوەیەك كە خودی ئیمام ئەبو عوبەید پێچەوانەیی كردنەكەی باس بكات، چونكە ئەبو عوبەید ساڵی (٢٢٤) كۆچی دوایی كردووە، وە داوود ساڵی (٢٠٠یا٢٠٢) لە دایك بوە، جا وورد بەرەوە.
وە لەوانەیە مەبەستی ئەبو عوبەید بەو هەندە (عطاء)ی كوڕی ئەبو رەباح بووبێت، چونكە ئیبراهیمی صائغ ئەڵێت: پرسیاریان كرد دەربارەی بازرگانێك كە ماڵێكی زۆری هەیە لە چەند جۆری جیا جیا، ئێستاش كاتی زەكات دانی هاتووە، ئایا نرخەكەی بەو جۆرە بخەمڵێنێ كە پێی وایە ئەو ئەندازەیە نرخی‌یەتی پاشان زەكاتەكەی لێ دەربكات؟ ووتی نا، بەڵام ئەوەی ئاڵتون وزیو بێت ئەوە واجبە زەكاتەكەی لێ دەربكات، وە ئەوەش كە شتی كڕین و فرۆشتن بێت، كە فرۆشتی زەكاتی لێ دەربكات، ئیبنوزەنجەویەی لە كتێبی (الأموال)دا (٣/٩٤٦/١٧٠٣) بە سەنەدێكی حەسەن تەخریجی كردووە.
هەروەها لێكۆڵەرەوەكەی ئەو كتێبە كە دكتور (شاكر ذیب فیاضي)یە ووتویەتی: ئەمە شایەتێكی قەوی‌یە بۆ ریوایەتەكەی ئیبنوجورەج كەوا لەمەوبەر باس كرا.
كورتەی باس ئەوەیە كە: ئەم مەسەلەیە نابێت ئیدعای ئیجماعی لەسەر بكرێت، لەبەر ئەم ئەسەرانەی كە باس كران و چەند ئەسەرێكی تر كە ئیبنوحەزم لە (محلی) دا باسی كردوون، ئەوەش كە بیری قسەی ئیمام ئەحمەدمان ئەخاتەوە كە فەرموویەتی: هەركەس ئیدعای ئیجماع بكات ئەوە درۆزنە و درۆ ئەكات، ئەو چۆن ئەزانێ بەڵكو جیاوازیان كردبێت.

وە ڕاستیشی کردووە ڕەحمەتی خوای لیّ بیّت، چونکە چەندین مەسەلە بووە کە ئیدعای ئیجماعی تیّدا کراوە بەڵام لە دوای ئەوە دەرکەوتووە کە لەو مەسەلانەیە جیاوازی تیّدا هەیە، کە ئیّمە هەندیّکیمان باس کردووە لە (أحكام الجنائز) و (آداب الزفاف) و جگە لەواندا.

ئیبنوحەزمیش بە تیّر وتەسەلی لەم باسە دوواوە، وە بۆ ئەوە چووە کە زەکات لە کەلوپەلی بازرگانیدا نییە و ڕەدی بەڵگەی ئەو کەسانەی داوەتەوە کە ئەڵیّن: زەکات تیّیدا واجبە، و باسی دژایەتی کردنی قسەکانیانی کردووە لەو بارەیەوە، و ڕەخنەی لە هەموو ئەو بەڵگانە گرتووە بە ڕەخنەیەکی زانستی وورد بین. جا بگەڕیّرەوە بۆی چونکە زۆر گرنگە، لە کتیّبەکەیدا (المحلى ٦/٢٣٣-٢٤٠).

وە شەوکانی لەو بۆچوونەیدا بە دوای کەوتووە، لە (الدرر البهية)دا، وە هەروەها صديق حسن خان لە شەرحی (الروضة الندية (١/١٩٢-١٩٣) دا، وە شەوکانی ڕەدی خاوەنی کتیّبی (حدائق الأزهار)ی داوەتەوە کە ئەڵیّ واجبە، ئەویش لە کتیّبەکەی (السيل الجرار ٢/٢٦-٢٧) دا، جا هەرکەس پیّی خۆشە با بۆی بگەڕیّتەوە.

وە هەروەها ڕەدی ئەو ئیدعایەشی داوەتەوە کە زەکاتی ئەو ماڵ و ئاژەڵانەی بە واجب داناوە کە بە کریّ ئەدریّ، کە هەندیّك لە نووسەرانی ئەمڕۆش هەر بە واجبیان داناوە، جا شەوکانی ڕەحمەتی خوای لیّ بیّت فەرموویەتی (٢/٢٧):

ئەمە مەسەلەیە کە کە تا ئیّستا بە گوێچکەی زەماندا نەدراوە. و ئەهلی قەرنی یەکەمیش نەیان بیستووە، ئەوانەی کە باشترینی قەرنەکانن، و هەروەها ئەو قەرنەش کە بە دوای قەرنی یەکەمدا دیّت. وە هەروەها ئەوەی دوای ئەوانیش، بەڵکو ئەو مەسەلەیە لە مەسەلە تازە پەیدابووەکانە، و لەو مەسەلانەیە کە ئەهلی مەزهەبە ئیسلامییەکان لەگەڵ ئەو جیاوازییەیان و دووری وڵاتیان نەیان بیستووە، و ئەم مەسەلەیە هیچ بەڵگەیەکی زانستی نییە، وە هەروەها بەڵگەی نە لە کیتاب و نە لە سوننەت و نە لە قیاسدا نییە، و ئیّمە پیّشمان ووتی: کە ماڵ و سامانی موسڵمان پارێزراوە بە پاراستنی ئیسلام، و سەندنی دروست نییە بە مافی خۆی نەبیّت، وەگەرنە ئەبیّتە خواردنی ماڵی خەڵکی بە بەتاڵ و بیّهودە.

ئەم ئەندازە بەڵگە هیّنانەوەت بەسە لەم مەسەلەیەدا، جا بگەڕیّرەوە بۆ (الروضة الندية ١٩٤١) تا تیّگەیشتن و زانستت زیاد بیّت.

**سوودیّکی گرینگ:**

لەوانەیە هەندیّك پڕوپاکەندە بکەن کە بە واجب دانەنانی زەکات لە کەلوپەلی بازرگانی مافی هەژاران و لیّ قەوماوان ئەفەوتیّ لەماڵی دەوڵەمەندەکان و دەسەڵاتدارەکاندا.

وەڵامی ئەم قسەیەش لە دوو ڕووەوە هەیە:

یەکەم: کاروبار هەمموو بەدەستی خوای گەورەیە، وە بۆ هیچ کەس نییە کە شتیّك بە شەرع بزانیّت لەلایەن خۆیەوە بەبیّ ڕیّدانی خوای گەورە نەبیّت.

خوای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ وَيَخْتَارُ مَا كَانَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ واتە پەروەردگارت ئەوەی بیەوێ دروستی ئەکات و ئاین و ڕێگا بۆ دروست کراوەکانی دائەنێت، وە بۆ دروست کراوەکانی ڕێگای ئاین دانیانیان نی‌یە، جا پاك و بەرزی بۆ خوا لەو هاوتادانانەی کە بەندەکانی و دروست کراوەکانی بۆی دائەنێن.

جا ئایا نابینیت کە زانایان کۆن لەسەر ئەوەی کە زەکات لە سەوزەواتا نی‌یە، هەروەها لە قامیش و پوش و تەختەدا نی‌یە هەرچەندێك نرخیان بێت. جا هەرچی لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا بدەنەوە، ئەوە ئەبێتە وەڵام بۆ ئەو ئیدعایە!.

لەگەڵ ئەوەشدا دانەر بۆ خۆی دانی بەوەدا ناوە کە زەکات لە سەوزە و جگە لە سەوزە لە میوەجاتا نی‌یە، تەنها ترێ و ڕوتەب نەبێ.

منیش ئەڵێم: حەق هەر ئەوەیە، بەو حەقەش ئەو ئیدعایە لە بنەڕەتەوە پوچەڵ ئەبێتەوە.

وە وەڵامی دووەم: ئەوەیە کە ئەو ئیدعایە لەسەر کورت بینی لە حیکمەتی واجب بوونی زەکاتدا وەستاوە، کەوا دەزانێ زەکات تەنها بۆ سودی فەقیرو هەژارەو هیچی تر، لەگەڵ ئەوەشدا وانی‌یە.

خوای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلْفُقَرَآءِ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱلْعَٰمِلِينَ عَلَيْهَا وَٱلْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ...﴾ ئایەتەکە. واتە: بەڕاستی صەدەقە بۆ هەژاران و لێقەوماوان و ئەو کەسانەی کە کاری لەسەر ئەکەن و بۆ دڵ نەرم کردنی کافرانە بەرامبەر بە ئیسلام.

جا مادام بەو شێوەیە بێت، وە هەندێك لە حیکمەتی ئەم زەکات دانە وورد بینەوە، ئەبینین ئەو ئیدعایە باتڵە لەبەر ئەوەی مانەوەی ماڵ و سامانی دەوڵەمەندەکان و بازرگانی پێوە کردنیان بە سوودترە بۆ کۆمەڵگە -کە هەژارانیشی تێدایە- لەوەی کە قایم بکرێ، بازەکاتیشی لێ بدرێت، و لەوانەشە ئەم کارە پسپۆڕە ئابووری‌یەکان باشتر بیزانن تا کەسانی تر. ئیتر یارمەتی و سەرکەوتن بەدەست خوای گەورەیە.

وە ئەو ئەسەرەش کە دانەر هێناویەتی لە (حوکمی زەکاتی ماڵی بازرگانی) لە عومەرەوە زەعیفە، لەبەر ئەوەی ئەبوعەمری کوڕی حەماس و باوکی نەناسراوون، هەروەکو ئیبنوحەزم ووتویەتی: بەوەش هەڵناخەڵەتێین کە ئیبنوحیببان باوکی بە سیقە داناوە، لەبەر ئەوەی کە لەمەوپێش ڕوونمان کردەوە تەوسیق کردنی ئیبنوحیببان پشتی پێ نابەسترێ، لەبەر کەمتەرخەمی کردنی تێیدا، هەر لەبەر ئەوەشە کە (حافظ)، بە صەحیحی دانەناوە و ئاماژەی کردووە کە ئیسنادەکەی (لین)ە.

وە ئەوەی کە دانەر هێناویەتی لە دوای ئەوە لە (مغني)یەوە کە ووتویەتی: ئەمە بەسەر هاتێکە کە بەسەرهاتی ئاوها بەناوبانگن، وئینکاری لێ نەکراوە، جا بەوە ئەبێتە ئیجماع!.

شافیعی و ئەحمەد و ئەبوعوبەید و (دارقطني) و بەیهەقی و (عبدالرزاق) ئەگێڕنەوە لە ئەبوعەمری کوڕی حەماسەوە لە باوکیەوە کە دەفەرمووێت: پێستەو مەنجەڵم ئەفرۆشت عومەری کوڕی (خطاب) خوا لێی ڕازی بێ بەلامدا تێپەڕی، فەرمووی: زەکاتی ئەو ماڵەت بدە، ووتم: ئەی پێشەوای موسڵمانان ئەوانە پێستەن، فەرمووی: بیخەمڵێنە پاشان زەکاتەکەی لێ دەربکە.

لە (المغني) دا ئەڵێ: ئەم بەسەرهاتە بەسەرهاتێکی مەشهورە و ئینکاری نەکراوە، کەواتە ئەبێتە ئیجماع لەسەر ئەم مەسەلەیە، وە (ظاهري)یەکان ئەڵێن: ماڵی بازرگانی زەکاتی لەسەر نییە، ئیبنوڕوشد دەفەرمووێت: هۆی جیاوازی زانایان لەبارەی واجب بوونی زەکات بە قیاس لەبەر ئەوەیە ئیختلافیان هەیە لە صیحەتی حەدیسەکەی سەمورە و حەدیسەکەی (أبوذر)، ئەمما ئەو قیاسەی کە جمهور پشتیان پێ بەستووە ئەوەیە ئەوماڵەی کە دائەنرێ بۆ بازرگانی ماڵێکە کە بە مەبەستی زیادکردن دائەنرێ، هەر بۆیە لەو سێ جینسە ئەچێت کە بە ئیتتیفاقی زانایان زەکاتی تێدا واجبە، مەبەستم لەزەرع و ئاژەڵ و زێڕ و زیوە.

لە (المنار)دا هاتوە: جەماوەری زانایانی ئوممەتی ئیسلام ئەڵێن: واجبە زەکات بدرێت لە ماڵی بازرگانی، هەرچەندە لەوبارەوە نەصصێکی (قطعي) نەهاتووە، نە لە کیتاب و نە لە سوننەت، بەڵکو لەو بارەوە چەند ریوایەتێك هاتووە، کە یەکتر بەهێز ئەکەن، لەگەڵ گرنگی دان بەوەی کە پشت ئەبەستێ بە دەقەکان، ئەویش ئەوەیە: ماڵی بازرگانی کە دەست بەدەستی پێ ئەکرێ بۆ زۆر بوون حیسابی پارەی بۆ ئەکرێ، وە لە نێوان ئەو ماڵەو لەنێوان دیرهەم و دینارەکاندا کە نرخی ئەو ماڵەیە، هیچ فەرق و جیاوازی نییە، ئیللا ئەوە نەبێ کە ڕادەی زەکاتەکە (نصاب) ئەمسەرو ئەوسەر ئەکا لەنێوان نرخەکەدا کە پارەکەیە و لەنێوان نرخ بۆ دانراوەکەدا کە ماڵەکەیە، وە ئەگەر زەکات واجب نەبێ لە ماڵی بازرگانیدا ئەوکاتە هەموو دەوڵەمەندەکان یا زۆربەیان ئەیان توانی بازرگانی بکەن بە پارەکانیانەوە و هەوڵی ئەوە بدەن کە هەرگیز ساڵ تێ نەپەڕێ بەسەر ڕادەی زەکاتی زێڕ و زیودا، بەم شێوەیەش زەکات باتڵ ئەبێ لەپارەکانیاندا.

---

لە وەڵامدا ئەووترێ: لەپێشەوە قسەکەت بسەلمێنە ئینجا گفتوگۆی لەسەر بکە، لەبەر ئەوەی ئەگەر ئەم بەسەرهاتە سابتیش بێت هەرگیز بەڵگەی ئیجماعی تێدا نییە، و قسەی ئیبنوڕوشد ئەمە ڕوون ئەکاتەوە ئەوکاتەی ئاماژە بۆ ئەم بەسەرهاتە ئەکات و ئاماژە بۆ بەسەرهاتەکەی ئیبنوعومەر ئەکات کە لەمەو پێش باس کرا. جا ئەڵێت: ئەمانە هیچ کەس جیاوازی نەکردوون لە صەحابە، وە هەندێك ڕایان وایە کە شتی ئاوها ئەبێتە ئیجماع لەلایەن صەحابەوە، مەبەستم ئەوەیە کە ئەگەر قسەیەك لە یەکێك لە صەحابەوە هاتبوو، وە لە لایەن کەسیشەوە پێچەوانەی ئەوە، یا بە ئاواز دانانی نەبوو، ئەوە ئەبێتە ئیجماع، وە لەم ریوایەتەشدا ئاوازی هەیە.

منیش ئەڵێم: ئەوە جیاوازییە هەیە کە لەمەوبەر باسم کرد (تمام المنة).

وە سەری ئیعتیبار لەم مەسەلەیەدا ئەوەیە خوای گەورە کە زەکاتی فەرز کردووە لەسەر ماڵی دەوڵەمەندەکان بۆ دڵنەوایی کردن و یارمەتی دانی هەژاران و هاوشێوەیانە، وە بۆ ڕاگرتنی بەرژەوەندە گشتی‌یەکانە، وە بۆ دەوڵەمەندەکانیش سوودی هەیە بەوە کە دەروونیان پاك ئەکاتەوە لە ناهەمواری بەخیلی، وە وایان لێ ئەکا کە بەڕوحم و بەبەزەیی بن لە ئاست هەژاران و ئەوانەی شایستەی دەست گرتنن، وە هەروەها یارمەتی دانی دەوڵەت و میللەتە لە پایەدار کردنی بەرژەوەندە گشتی‌یەکاندا، وە سوودی بۆ هەژاران و غەیری هەژارانیش ئەوەیە کە لە ناڕەحەتی‌یەکانی ڕۆژگار یارمەتی‌یان ئەدا، بێجگە لەوەش کە بەرگری کردنێکە لە هۆیەکانی خراپەکاری، بەوە کە (تضخم) زۆربوونی پارەو کەم نرخی‌یەتی لە بەرامبەر کەلوپەلدا دروست نەبێت، و نەکەوێتە دەست کەسانێکی دیاری کراوەوە، کە خوای گەورە ئیشارەتی بۆ کردووە لەباسی حیکمەتی دابەش کردنی غەنیمەدا ئەفەرموێت: ﴿كَيۡ لَا يَكُونَ دُولَةَۢ بَيۡنَ ٱلۡأَغۡنِيَآءِ مِنكُمۡۚ﴾ (الحشر/٧). واتە: بۆ ئەوەی ئەوسامانە هەر بەدەستی دەوڵەمەندەکانەوە نەبێت ئاڵوگۆڕی پێ بکەن.

جا ئایا مەعقولە ئەو بازرگانانە لە هەموو ئەو مەبەستە شەرعی‌یانە جیا بکرێنەوە کە لەوانەیە زۆربەی سەروەت و دارایی میللەت لەدەستی ئەواندا بێت؟.

**چ کاتێك کەلوپەل ئەبێت بە ماڵی بازرگانی:**

خاوەنی کتێبی (المغني) دەڵێت[1]: ماڵ نابێ بە ماڵی بازرگانی بە دوو مەرج نەبێت:

یەکەم: ئەوکەسە بەهۆی کاری خۆی ببێتە خاوەنی، وەك کڕین و فرۆشتن، و نیکاح، و خولع و قەبوڵ کردنی (هبة) بەخشش، و وەصی‌یەت، و غەنیمەت، هەروەها کەسب کردنی شتی ڕەوا، چونکە ئەگەر شت بەهۆی خاوەنی‌یەتی‌یەوە حوکمی زەکاتی بۆ سابت نەبێ، بەهۆی تەنها نی‌یەتەوە بۆی سابت نابێت، وەك ڕۆژوو، جا فەرقی نی‌یە چ لە باتی شتێکی تردا ببێتە خاوەنی ئەو شتە یا بەبێ هیچ، چونکە بەهۆی کاری خۆی بۆتە خاوەنی، هەربۆیە وەکو میراتی لێهاتووە بۆی.

دووەم: کاتێ بوو بە خاوەنی نی‌یەتی ئەوەی لێ بێنێ کە بۆ بازرگانی‌یەتی، جا ئەگەر لەوکاتەدا کە بۆتە خاوەنی نی‌یەتی بازرگانی‌یەتی لێ نەهێنێ نابێ بە ماڵی بازرگانی، با لە دووای ئەوەش نی‌یەتی لێ بێنێ، تازە هەر نابێتە ماڵی بازرگانی، وە ئەگەر بە میرات بووە خاوەنی و نی‌یەتی ئەوەی لێ هێنا کە بۆ بازرگانی‌یە، ئەوکاتەش هەر نابێ بەماڵی بازرگانی، چونکە ئەصل ئەوەیە کە ماڵێکە تایبەتە بەخۆی‌یەوە، وە بازرگانی حاڵەتێکی (عارضة) پەیدابوە، هەر بۆیە تەنها بە نی‌یەت نابێتە ماڵی بازرگانی، هەروەك

(١) وە لە (المهذب) یشدا هەر مەعنای ئەو ووتەیە هەیە. (دانەر).

چۆن كەسێكی نیشتەجێ (مقیم) نیەتی سەفەر بێنێ، حوكمی سەفەری بۆ دادەنرێ بەبێ كاری سەفەر، وە ئەگەر ماڵێكی كڕی بۆ بازرگانی، پاشان نیەتی ئەوەی لێ بێنێ كە بۆ ماڵی تایبەتی خۆی كڕیوە، ئەبێتە ماڵی تایبەتی خۆی و زەكاتی لێ نادرێ.

**چۆن ماڵی بازرگانی زەكاتی لێ دەرئەكرێت:**

هەركەس (نصاب) ڕادەی زەكاتی ماڵی بازرگانی هەبێت و ساڵێكی بەسەردا تێپەڕیبێت، لە كۆتایی ساڵەكەدا بیخەملێنێ و زەكاتەكەی لێ دەربكات كە چل یەكە، بەم شێوەیە هەموو بازرگانێك هەموو ساڵێك ئەوكارە بكات، وە ئەگەر ئەو ئەندازە ماڵەی كە هەیەتی نەگەیشتە ڕادەی زەكات، ئەوە ساڵی لەسەر دانامەزرێت، جا ئەگەر هات و یەكێك بوو بە خاوەنی ماڵێك نرخەكەی لە ڕادەی زەكات كەمتر بوو، وە بەشێ لەساڵیش بڕوا هەر بەوشێوەیە بێ، پاشان ماڵەكە گەشەی كرد، یا نرخی شت گۆڕاو ماڵەكەی گەیشتە ڕادەی زەكات، یا ماڵەكەی فرۆشت بەماڵێك كە گەیشتۆتە ڕادەی زەكات، یا لە ناوەڕاستی ساڵا ماڵێكی تری یا نرخێكی دەست كەوت ڕادەی زەكاتی پێ تەواو بوو، لەم حاڵەتەدا ساڵ لەسەر ئەووەڵ جار دانامەزرێ بەڵكو لەسەر دووەم جار.

ئەمەش قسەی (ثوري) و حەنەفیەكان و شافیعی و ئیسحاق و ئەبوعوبەیدو (أبوثور) و (ابن منذر)ە.

پاشان ئەگەر هات و ڕادەی ئەوزەكاتە لەناوەڕاستی ساڵەكەدا كەمی كرد، بەڵام لەمەسەرو لەوسەری ساڵ تەواو بوو (واتە: لەڕادەی زەكاتا بوو)، ڕەئی ئەبو حەنیفە ئەوەیە كە ساڵەكە نەپچڕاوە، چونكە ئەگەر وانەبێ ئەبێ خاوەن ماڵەكە هەموو كاتێك ئاگای لە نرخی ماڵەكەی بێت بۆ ئەوەی بزانێت ئاخۆ گەیشتۆتە ڕادەی زەكات یان نا، ئەمەش شتێكی سەخت و گرانە.

بەڵام ڕەئی حەنبەلیەكان ئەوەیە ئەگەر ئەوماڵە لە ناوەڕاستی ساڵا كەمی كرد، پاشان زیادی كرد تاگەیشتە ڕادەی زەكات، لەم حاڵەتەدا ساڵ لەوەوە دەست پێ ئەكا كەزیادی كردووە، چونكی بە كەم بوونەكەی لەناوەڕاستی ساڵدا پچڕاوە.

## زەكاتی دانەوێڵە و بەروبوم

**واجب بوونی:**

خوای گەورە زەكاتی دانەوێڵە و بەروبوومی واجب كردووە، ئەفەرمووێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَنفِقُوا۟ مِن طَيِّبَـٰتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّآ أَخْرَجْنَا لَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ﴾ (البقرة/٢٦٧). واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە زەكاتی ئەو شتە پوختانەی بەدەستتان هێناوەو ئەوانەی ئێمە لە زەوی بۆمان دەركردوون بدەن.

هەروەها فەرمویەتی: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَ جَنَّٰتٍ مَّعۡرُوشَٰتٍ وَغَيۡرَ مَعۡرُوشَٰتٍ وَٱلنَّخۡلَ وَٱلزَّرۡعَ مُخۡتَلِفًا أُكُلُهُۥ وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُتَشَٰبِهًا وَغَيۡرَ مُتَشَٰبِهٖۚ كُلُواْ مِن ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثۡمَرَ وَءَاتُواْ حَقَّهُۥ يَوۡمَ حَصَادِهِۦۖ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ﴾ (الأنعام/١٤١). واتە: پەروەردگاری ئێوە ئەو خوایەیە باغ و باغاتی بۆ پێك هێناوون لە دەرەختی خشۆك و بەرز، وە دارخورما و زەرعی بۆ پێك هێناون کە هەریەکەیان تام و بۆن و شکڵی جیاوازە، وە هەروەها زەیتون و هەناری بۆ پێك هێناون کە لە لایەنێکەوە لەیەکتر ئەچن و لە لایەنێکی ترەوە لە یەك ناچن، جا لەو بەروبومانە بخۆن کاتێ بەری دا، وە ڕۆژی چنینەوەی مافەکەی بدەن.

ئیبنوعەبباس دەفەرموێت: مافەکەی ئەو زەکاتەیە کە فەرز کراوە، وە دەفەرموێت: دەیەك و نیو دەیەکە.

**ئەو جۆرانەی لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ زەکاتیان لێ ئەدرا:**

زەکات لەسەردەمی پێغەمبەرا ﷺ لە گەنم و جۆ و خورما و مێوژ وەرئەگیرا؛ ئەبوبورِدەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ ئەبوموساو (معاذ) ی نارد بۆ یەمەن خوا لێیان ڕازی بێت، بۆ ئەوەی خەڵك فێری کاروباری ئایینەکەیان بکەن، وە فەرمانی پێ دان زەکات لەم چوار شتە زیاتر وەرنەگرن: گەنم، جۆ، خورما، مێوژ. (دارقطني و حاکم و (طبراني) و بەیهەقی گێڕاویانەتەوە، وە بەیهەقی دەفەرموێت: ڕاویەکانی ئەم حەدیسە (ثقة)ن و حەدیسەکەش (متصل)ە.

(ابن منذر و ابن عبدالبر) ووتویانە: زانایان لەسەر ئەوە کۆن کە زەکات لە گەنم و جۆو خورماو مێوژدا واجبە.

وە لە ڕیوایەتەکەی ئیبنوماجەدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ وای داناوە کە زەکات لە گەنم و جۆو خورماو مێوژ و گەنمەشامی دەربکرێت (وە لە ئیسنادی ئەم ڕیوایەتەدا موحەممەدی کوڕی عبدالله ی عەرزەمی هەیە کە ئەویش مەتروکە).

**ئەو جۆرانەی کە زەکاتیان لێ نەئەدرا:**

زەکات لە سەوزیجات وەرنەئەگیرا، وە جگە لە ترێ و خورما لە هیچ میوەیەکی تر وەرنەئەگیرا.

لە (عطاء) ی کوڕی سائیبەوە هاتووە کە: موغیرە ویستی زەکات لەسەوزیجاتی زەوی موسای کوڕی (طلحة) وەربگرێت، موسای کوڕی (طلحة) پێی ووت: بۆت نی یە زەکاتی ئەوە وەربگریت، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لَيسَ فِي ذٰلِكَ صَدَقَةٌ). واتە: ئەمانە زەکاتیان لێنادرێت (دارقطني و حاکم و أثرم) لە سونەنەکەیدا گێڕاویەتی یەوە وە ئەم حەدیسە مورسەلێکی (قوي)ە.

موسای کوڕی (طلحة) دەفەرموویێت: ئەسەر لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتووە کە پێنج شت (زەکاتیان لێ دەرنەکرێت) ئەوانیش: گەنم، و جۆو، (سلت) جۆرێکە لە جۆو، مێوژ، و خورمان، وە هەرچی لە زەوی دەرچوور جگە لەوانە دەیەکی لێ دەرناکرێت، وە دەفەرموویێت: (معاذ) لە سەوزە زەکاتی وەرنەئەگرت.

بەیهەقی دەفەرموویێت: ئەم حەدیسانە هەموویان مورسەلن، بەڵام لە چەند ڕێگایەکی جیاوازەوە هاتوون، هەربۆیە هەندێکیان پشتگیری هەندێکیان ئەکەن، وە لەگەڵیاندا چەند قسەیەکی صەحابەشی لەسەرە، وەك عومەر و عەلی و عائیشە خوایان لێ ڕازی بێ.

(أثرم) ئەگێڕێتەوە کە کارگوزارەکەی عومەر نامەیەکی نووسی لەبارەی چەند ڕەزە ترێیەکەوە کە لەناویدا ئەوەندەی کۆخ و هەنار تێدایە کە بەرهەمەکەی چەند بەرابەر زیاترە لەبەرهەمی ترێکە، ئایا زەکاتی ئەو دووانەش وەربگرم ؟ عومەریش لە وەڵامدا بۆی نووسی: ئەوانە دەیەکیان تێدا نی یە، ئەوانە لە جۆری درەختی دڕك دارن.

(ترمذي) دەفەرموویێت: لای بەشی زۆری زانایان سەوزیجات زەکاتی تێدا نی یە.

(قرطبـي) دەفەرموویێت: زەکات لەوشتانە ئەدرێ کە قوتن جگە لە سەوزیجات، وە لە (طائف) دا هەنارو نوتروج (جۆرە لیمۆیەکە) و کۆخ هەبوو، وە سابت نەبوە نە پێغەمبەر ﷺ و نە یەکێ لە خەلیفەکانی زەکاتیان تێدا وەرگرتبێ.

ئیبنو قەییم دەفەرموویێت: پێغەمبەر ﷺ دەستوری ئەوە نەبوو کە زەکاتی بەندە و ئەسپ و ئێسترو کەر و سەوزیجات و کاڵەك و خەیارو ئەو میوەجاتەی کە پێوانە ناکرێن و زەخیرە ناکرێن وەربگرێ، جگە لە ترێ و خورما کە زەکاتیان بە گشتی لێ وەرئەگیرێ، وە جیاوازی نەکراوە لە بەینی ئەوەدا کە ووشکەو لەبەینی ئەوەدا کە تەڕە.

**ڕای زانایان:**

لەناو زانایاندا جیاوازی نی یە لەسەر ئەوەی کە زەکات واجبە لە کشتوکاڵی بەروبومدا، بەڵام جیاوازیان هەبووە لەسەر ئەو جۆرانەی زەکاتیان تێدا واجبە، وا لە خوارەوە چەند ڕایەك بە کورتی ڕوون ئەکەینەوە:

**١- ڕای حەسەنی بەصری و (ثوري) و شەعبـی:**

ئەمانە ڕایان وایە زەکات تەنها لەوشتانەدایە کە دەقی قورئان و حەدیسیان لەبارەوە هاتووە، کە ئەویش گەنم و جۆو گەنمەشامی و خورماو مێوژن، وە زەکات لەغەیری ئەمانەدا نی یە چونکە دەقیان لەبارەوە نەهاتووە، شەوکانیش ئەم مەزهەبە بە ڕاست دائەنێ[1].

---

(١) منیش ئەڵێم: وە هەردەبێت ڕاوەستان لەسەر ئەم ڕایە بکرێت لەبەر فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە بە ئەبو موسا و موعازی فەرموو کاتێك ناردنی بۆ یەمەن:

لەزەكاتدا زیاتر لەم چوار بەشە وەرمەگرن: جۆ، و گەنم، و میوژ، و خورما. بەیهەقی و حاكم تەخریجیان كردووە و حاكم بە صەحیحی داناوە، وە هەر قسەی ئەوانیشە و صەحیحە، وەك لە (إرواء الغلیل ٨٠١) دا ڕوونم كردۆتەوە، و هەروەها ئەمە هەڵبژاردەی ئەبو ڕەبیعەیە لە كتێبی (الأموال) دا جا بگەڕێرەوە بۆ قسەكەی لەم بارەیە (١٣٨١-١٤٠٩) و موسڵمانیش هەر بەم بۆچونە دڵنیا ئەبێت و پەی ئەحسێتەوە تا ئەو ڕاو بۆچوونە جیاوازانەی كە بەسەر یەكدا دراوە و دانەریش باسی كردووە، و ئەوانە بەڵگەشیان نی‌یە جگە لە ڕاو بۆچوونی خۆیان نەبێت.

بەڵام لێرەدا چەند خاڵێكی جێی سەرنج هەیە كە پێویستە ئاگاداری لەسەر بكرێت ئەوانیش ئەمانەن:

١- لە حەدیسەكەی موعازدا كە ئەفەرمووێت: لەم چوار بەشە زیاتر وەرمەگرە، دانەر حەدیسەكەی هێناوە بەڵام باسی گەنمەشامی تێدا نی‌یە، بەو پێ‌یەش چوار جۆرەكە ئەبێت بە پێنج، ئەوەش لای من مونكەرە لەبەر ئەوەی كە لەگەڵ ئەوەشدا جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەم حەدیسە صەحیحەدا، ڕێگایەكی وەهاشی نی‌یە كە بكرێت بە بەڵگە، ڕێگاكانیشی ئەمانەن:

یەكەمیان ریوایەتەكەی ئیبنوماجە كە دانەر كەمێك لەمەوپێش باسی كردوو، وە بۆخۆشی ئاماژەی بۆ ئەوە كرد كە عەمزەمی مەتروكی تێدایە.

دووەمیان: ریوایەتەكەی بەیهەقی (١٢٩/٤) لە ڕێگای عەتتابی جەزەری‌یەوە لە خەصیفەوە لە موجاهیدەوە ئەفەرمووێت: صەدەقە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ لە پێنج جۆر زیاتر نەبووە، جا چوار جۆرەكەی باس كردووەو لەپاشان باسی گەنمەشامیشی كردووە. جا ئەو ریوایەتە لەگەڵ ئەوەشدا كە مورسەلە، زەعیفیشە، چونكە عەتتابیش و خەصیفیش لاوازن.

سێ‌یەمیان: ریوایەتەكەی بەیهەقی‌یە لە سوفیانی كوڕی عویەینە لە عەمری كوڕی عوبەیدەوە لە حەسەنەوە، جا هەروەكو حەدیسەكەی موجاهیدی باس كردووە، بەڵام ئیبنوعویەینە ئەڵێت: لام وابێت باسی گەنمەشامیشی كرد.

جا ئەمە لەگەڵ ئەوەشدا كە ئەو زیادەیە گومانی تێدا هەیە، دوو شتی لەسەرە:

یەكەم: شێخەكەی ئیبنوعویەینە كە عەمری كوڕی عوبەیدە، ذەهەبی لە (الضعفاء)دا لەبارەیەوە ئەڵێ: حەسەن گوێی لێ بوە ئەیوب و یونس بە درۆزنیان داناوە، وە نەسائی تەركی كردووە.

جا ڕێنەی ئەو بە هیچ شێوەیەك ناكرێتە بەڵگە، ئەوە ئەگەر سابت بێت، جا ئەگەر ئەم ڕەخنانەی خوارەوەشی تێدا بێت چی؟:

دووەم: سوفیان لەسەر ئەم گومانەی نەماوەتەوە چونكە لە ریوایەتێكی تری بەیهەقی دا هاتووە كە لە جیاتی (ذُرة) گەنمەشامی باسی سەلتی كردووە.

سەلتیش جۆرێك لە جۆی سپی‌یە و توێكڵی نی‌یە هەروەك لە (نهایة) دا هاتووە.

جا ئەوكاتە ئەبێت بە جۆرێك لە چوار جۆرەكان، كەواتە هیچ جیاوازی‌یەك نی‌یە لەنێوان ئەم ریوایەتەو حەدیسە صەحیحەكەدا، هەروەك شاراوە نی‌یە.

وە لە دواییدا شێخ ئەلبانی ڕەحمەتی خوای لێ بێت، ئاماژە بۆ ئەوە ئەکات کە شەوکانی بە عیللەتی ئەم حەدیسەی نەزانیوە و شوێن بەیهەقی کەوتووە لەوەدا کە ووتویەتی: ئەم حەدیسانە هەمویان موڕسەلن بەڵام لە چەند ڕێگایەکی جیاوازەوەن، جا هەندێکیان ئەوانی تر تەئکید ئەکەن کە لەناویانا ریوایەتی ئەبوبوڕدەی تێدایە لە ئەبوموساوە، هەروەها ووتەی هەندێك صەحابەشی تێدایە.

جا بەیهەقی مەبەستی ئەو ریوایەتانە بوە کە یەکن لەگەڵ ریوایەتەکەی ئەبوبوڕدە، کە ئەو صەحیحە وەکو باس کرا، نەك مەبەستیٚ بە گشتی ئەو ریوایەتانە نەبوە کە بە تەنها هەندێك لاوازو تەرك کراو هێناویانە، جا ئاگاداربە.

جا لە هەڵەی بە صەحیح زانینی ئەم زیادە مونکەرەوە هەڵەیەکی تری فیقهی دروست بوە، ئەویش ئەوەیە کە: شەوکانی گەنمەشامیشی هەر لەگەڵ ئەو چوار جورەدا ناو بردووە کە زەکاتیان تێدا واجبە، وە هەروەها صدیق حسن خانیش بە شوێنی کەوتووە:

٢- کۆ کردنەوەی گەنمەشامی لەگەڵ ئەو چوار جۆرە و نیسبەت دانی ئەو بۆچوونە بۆ مەزهەبی حەسەنی بەصری هەڵەیە، چونکە بە صەحیحی لە چەند ڕێگایەکەوە هاتووە لێوەی کە پێی وابووە زەکات لەو چوار جۆرە زیاتر واجب نیە.

ئەبو عوبەید تەخریجی کردووە (٤٦٩/١٣٧٩-١٣٨٠) وە هەروەها ئیبنوزەنجەویە (١٠٣٠/١٨٩٩) بە چەند سەنەدێکی صەحیح لە حەسەنی بەصریەوە.

٣- دانەر باسی ئەو پێنج بەشەی کردووە و ووتویەتی لەم پێنج بەشە زیاتر دەق لەبارەیانەوە نەهاتووە، وای دەرخستوە بەشی پێنجەمیش کە گەنمە شامیە دەقی وا هاتووە لەبارەیەوە کە ئیعتیباری بۆ بکرێ، ئەوە بوو خۆت زانیت لەبارەی ئەوەوە چی هەیە!

جا بۆ سوود گەیاندنی زیاتر ئەڵێم:

قسەی حەسەنی بەصری بۆ ئەوە نەبێت کە پشتی پێ ببەسترێ لەگەڵ یەك هاتنەوەی لەگەڵ حەدیسە صەحیحەکەدا.

وە من ئومێدم بە دانەر بوو کە سەرنج بۆ ئەم قسەیە ڕابکێشێ، بۆ ئەوەی خوێنەر لەناو ئەو هەموو قسە جیاوازانەدا وون نەبێت و سەری لێ نەشێوێت کە لەم بەشەدا هێناویەتی، هەروەکو پێم خۆش بوو کە قسەی عبد الله ی کوڕی عومەریان بۆ بگێڕێتەوە، کە ئەبو عوبەید بە صەحیحی هێناویەتی لە بەشی بەروبوم و کشتوکاڵدا (٤٦٩-١٣٧٨) کە دەفەرموێت:

زەکات لە خورما و ترێ و گەنم و جۆ ئەدرێت.

لەبەر ئەوەی ئادەمیزاد ئەو کاتە زیاتر بە قسەی دانەر دڵنیا ئەبوو (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، هەر لەبەر ئەوە ئەبوعوبەید و ئیبنوزەنجەویهی لە کتێبەکەیاندا ئەڵێن:

ئەوەی کە ئێمە هەڵی ئەبژێرین لەم بارەیەوە شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ و دەست پێوە گرتنیەتی: ئەویش ئەوەیە کە هیچ دانەوێڵەیەك زەکاتی تێدا نیە جگە لە گەنم و جۆ نەبێت، وە هیچ بەروبومێك زەکاتی تێدا نیە جگە لە ترێ و خورما، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ تەنها ئەو جۆرانەی ناوبردووە. و صەحابە و تابیعینیش

**٢- ڕای ئەبو حەنیفە:**

ئەبو حەنیفە ڕەئی وایە كە زەكات لە هەموو ئەو شتانەدا واجبە كە لە زەوی ئەڕوێ، وە فەرق نی‌یە لە بەینی سەوزیجات و غەیری سەوزیجاتا، وە بە مەرجی داناوە كە مەبەست لە چاندنەكە عادەتەن ئەوە بێت كە لە زەوی بەرهەم بەدەست بێت، جگە لە دار و تەختە و قامیشی فارسی و گژوگیا و دەرەختی بێبەر، كە زەكاتیان تێدا نی‌یە، وە بۆ ئەم ڕەئی‌یەش بەڵگەی بە عمومی ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ هێناوەتەوە كە فەرموویەتی: (فِيمَا سَقَتِ السَّمَاءُ العُشر) واتە:هەرچی ئاسمان ئاوی دا دەیەكی لەسەرە.

ئەمەش فەرموودەیەكی گشت گیرە، هەموو ئەوجۆرانە ئەگرێتەوە كە ئاسمان ئاوی ئەدا، وە لەبەر ئەوەی مەبەست لە چاندنەكە بەرهەم هێنانە لە زەوی، كە ئەمەش وەك دانەوێڵە وایە.

**٣- مەزهەبی ئەبویوسف و موحەممەد:**

ئەمان ڕایان وایە زەكات لەوشتانەدا واجبە كە لە زەوی ئەڕوێ، بەمەرجێك ساڵێك بمێنێتەوە، بێ ئەوەی تێك بچێ وە بۆ تێك نەچوونی كارێكی وەها زۆری تێدا نەكرێ، جا چ لەوشتانە بێ كە پێوانە ئەكرێ، وەك دانەوێڵە، یا لەوشتانە بێ كە ئەكێشرێ وەك لۆكەو شەكر. جا ئەگەر ساڵێك نەمانەوە وەك ترۆزی و خەیار و كاڵەك و شمامە و وێنەی ئەمانە لە سەوزیجات و میوەجات ئەوە زەكاتیان تێدا واجب نی‌یە.

**٤- مەزهەبی مالیك:**

مالیك ڕای وایە ئەوەی لە زەوی ئەڕوێ (و زەكاتی تێدا واجبە) بەمەرج گیراوە لەو شتانە بێ كە بمێنێتەوە و ووشك بكرێ و ئادەمیزاد بۆ خوی بەرهەمی بێنێ، جا ئەو شتانە چ قوت بن وەك گەنم و جۆ، یا قووت نەبن وەك كونجی و (قرطم: زەرتك، ڕووەكێكە گوڵێكی زەردی مەیلەو پرتەقاڵی ئەگرێت ڕەنگێكی

---

هەر وایان ووتووە، لە دوای ئەوەش ئیبنوئەبی لەیلا و سوفیانیش هەر ئەو بۆچونەیان هەڵبژاردووە، لەبەر ئەوەی ئەو كاتەی پێغەمبەر ﷺ ئەو جۆرانەی هەڵبژارد و ڕووی لەوانەی تر وەرگێڕا، ئەیزانی كە خەڵك هەیە لە بەروبومی زەوی جگە لەو جۆرانە ماڵ و قوتی تریان هەیە، جا دەست هەڵگرتنی لەو ماڵانە و ڕوو لێ وەرگێڕانی، لێبوردنێك بوو لێوەی، هەروەك لە زەكاتی بەردە و ئەسپ بووراوە.

منیش ئەڵێم: ئەم بەڵگەیەی دوایی بەڵگەیە لە كەلوپەلی بازرگانیشدا، چونكە ئەو كەلوپەلە بازرگانی‌یە لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ زاندراو بووە، و چەندین جار لە قورئان و لە حەدیسەكاندا باس كراوە، بە چەندین بۆنەو هۆوە، جا بێدەنگ بوونی پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئەو كەل و پەلانە وقسە نەكردنی لەبارەیەوە كە چەندەی زەكات تێدایە، كە هەندێك بە واجبیان داناوە، ئەوەش هەر لێبوردنێكە لێوەی لەبەر حیكمەتێكی بالیغە، كە لەمەو پێش سەرنج بۆ هەندێكی ڕاكێشراوە، ئیتر خوای گەورەش بۆ خۆی زاناترە. (تمام المنة).

زەردی لێ دەرئەهێنرێت بۆ ڕەنگ كردن، وە دەنكێكی هەیە لە ماش ئەچێت)، وە لای ئەم لە سەوزیجات و میوەجاتا وەك: هەنجیرو هەنارو سێو زەكات نی‌یە.

**٥- مەزهەبی شافیعی:**

شافیعی ڕەئی وایە هەرچی لە زەوی دەرهات بەمەرجێ لەوانە بێت كە قوت بن و زەخیرە بكرێن و ئادەمیزاد بەرهەمیان بێنێ، وەك گەنم و جۆ، ئەوە زەكاتیان تێدا واجبە.

**نەوەوی دەفەرمووێت:** مەزهەبی ئێمە ئەوەیە: زەكات لەبەری درەختا نی‌یە بێجگە لە خورماو ترێ نەبێ، وە زەكات لە هیچ دانەوێڵەیەكدا نی‌یە جگە لەوانەی كە قووتن و زەخیرە ئەكرێن، وە سەوزیجاتیش زەكاتی تێدا نی‌یە.

**٦- مەزهەبی ئەحمەد:**

ئەحمەد ڕەئی وایە: هەرچی خوا لە زەوی بیڕوێنێ زەكاتی تێدا واجبە، وەك دانەوێڵە و بەروبوم، لەوانەی ووشك ئەكرێنەوە و ئەمێننەوە وە ئەپێورێن و ئادەمیزاد ئەیان چێنن لەناو زەوی‌یەكانیاندا، جا ئەو شتانە چ قوت بن وەك گەنم جۆ، یا لەجۆری (قطنیات)[1] بن، یا لە جۆری (أبازیر) بن، (واتە: بەهارات كە بەكاردێ بۆ بۆنخۆش كردنی خواردن) وەكو گژنیژە (كە جۆرە گیایەكە لە ڕازیانە ئەچێت بەشێوەی بەهارات بەكاردێت گوڵەكەی وەكو چەتر وایە بۆ مەبەستی پزیشكی بەكاردێت) و كرۆیا (كە جۆرە دەنكی ڕووەكێكە لە پەلپینە ئەچێت)، یا لە جۆری تۆو بێ وەك تۆوی كەتان و ترۆزی و خیار، یا لە جۆری پاقلەیی بێ وەك: كونجی و (قرطم).

هەروەها لای ئەو زەكات واجبە لە هەمو ئەو شتانەدا كە ئەو صیفەتانەی تێدایە لە بەروبومی ووشك. وەك خورما، مێوژ، قەیسی، هەنجیر، بادام، (فنق: جۆرە چەرەسێكە)، فستق، وە لەلای ئەوزەكات نی‌یە لە میوەجاتا، وەك: كۆخ، هەرمێ، سێو، قەیسی، هەنجیر، بەشەرتێ كە ئەم دووانەی ئەخیر نەتووانرێ ووشك بكرێ، هەروەها لە سەوزیجاتیشا زەكات نی‌یە، وەك: ترۆزی و خەیار و كاڵەك، باینجان و گێزەر و شێلم.

**زەكاتی زەیتوون:**

**نەوەوی دەفەرمووێت:** بۆچوونی صەحیح لای ئێمە ئەوەیە: زەیتون زەكاتی تێدا واجب نی‌یە، وە ئەمە ڕەئی حەسەنی كوڕی صالح و ئیبنو ئەبی لەیلاو ئەبو عوبەیدە.

---

(١) واتە: ئەوانەی لەماڵا زەخیرە ئەكرێن، بێجگە لە گەنم و جۆ وەك نیسك، نۆك، پۆلكە (ڕووەكێكە بەرو دەنكەكەی وەكو پاقلە ئەكرێت بەچێشت)، هەرزن، تاڵیش (ڕووەكێكی پاقلەیی‌یە گەڵێك جۆری هەیە، قەدەكەی قیت و قایمە گوڵی وەنەوشەیی گەورە ئەگرێت، دەنكەكەی تاڵە خۆش ئەكرێت)، لۆبیا، پاقلە (دانەر).

زوهری و ئەوزاعی و (لیث) و مالیك و (ثوري) و ئەبوحەنیفە و (أبوثور) فەرموویانە: زەیتون زەكاتی تێدا واجبە؛ جا زوهری و (لیث)و ئەوزاعی فەرموویانە: تەخمین ئەكرێت، (واتە: ئەقەبلێندرێ) پاشان لە زەیتەكەی زەكات دەرئەكرێ، وە مالیك دەفەرموێت: تەخمین نەكرێت، بەڵكو دوای ئەوەی گوشراو گەیشتە پێنج وەسەق دەیەكی زەكات لێ بدرێت. تەواو.

**هۆی ئیختلافی زانایان و سەرچاوەكەی:**

ئیبنوروشد دەفەرموێت: هۆی ئیختیلافەكە ئەمانەیە:

ئەمما لەنێوان ئەو زانایانەدا كە زەكات تەنها لەو شتانەدا بە واجب ئەزانن كە ئیجماع هەیە لەسەری، و لەنێوان ئەو زانایانەدا كە بێجگە لەو شتانەی كە ئیجماع هەیە لەسەری لە هەموو قوتێكی تردا كە زەخیرە بكرێ بە واجبی ئەزانن، هۆی ئیختلافەكەیان ئەوەیە: ئایا زەكات كە پەیوەندی بە چوار جۆر شتەوە (گەنم و جۆو خورماو مێوژ) هەیە لەبەر عەینی ئەو شتانەیە، یا لەبەر عیللەتێكە كە تێیاندایە، كە ئەویش ئەوەیە قوتن؟

جا ئەو زانایانەی كە ئەڵێن: لەبەر عەینی ئەو شتانەیە ڕەئیان وایە كە زەكات تەنها لەو شتانەدا واجبە.

وە ئەوانەش كە ئەڵێن: لەبەر عیللەتی ئەوەیە كە قووتن، ڕەئیان وایە كە زەكات لە هەموو قوتێكدا واجبە.

وە هۆی ئیختیلاف لەنێوان ئەو زانایانەدا كە ڕەئیان وایە زەكات تەنها لەو شتانەدا واجبە كە قوت بن، وە لەنێوان ئەو زانایانەدا كە ڕەئیان وایە زەكات واجبە لەهەموو ئەو شتانەی كە لە زەوی ئەڕوێت (جگە لەوشتانەی كە ئیجماعیان لەسەر هەیە كە زەكات تێیاندا واجب نییە وەك: پوش و پەلاش و تەختەو دارو قامیش) ئەوەیە كە قیاس (معارض)ە بۆ عمومی لەفزەكە.

ئەمما ئەو لەفزەی كە عموم ئەگەیەنێت ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەرە ﷺ كە ئەفەرموێت: (فِيمَا سَقَتِ السَّمَاءُ العُشرُ، وَفِيمَا سُقِيَ بِالنَّضحِ نِصفُ العُشرِ). واتە: ئەوەی ئاسمان ئاوی بدا دەیەكی زەكات تێدایە (واتە: لە دەبەش یەك بەش) وە ئەوەی بەهۆی ئاوكێشەوە ئاو ئەدرێ چ لەبیر یا لەچەم و كانی نیوە دەیەكی زەكات تێدایە (واتە: لە بیست بەش یەك بەش) وە (ما) كە لە حەدیسەكەدا هاتووە بە مانای (الذي)یە، وە (الذي) یش لە ئەلفازی عمومە، وە هەروەها ئەو فەرمایشتەی خوایە كە ئەفەرمووێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَ جَنَّٰتٍ مَّعۡرُوشَٰتٍ وَغَيۡرَ مَعۡرُوشَٰتٍ﴾

ئەمما قیاس ئەوەیە: كە مەبەست لە زەكات دەفعی پێویستی و فەقیرییە، كە ئەوەش ئەغلەب وایە تەنها بەقوت ئەكرێ، جا هەركەسێ بەم قیاسە (عموم) (خاص) بكا، ئەوە زەكات بە واجب نازانێ لە غەیری

قوتدا، وە هەرکەسێ (عموم) غالب بکا، زەکات لە غەیری قوتیشا بەواجب ئەزانێ، مەگەر ئەوشتانە نەبێ کە بە ئیجماع زەکاتیان تێدا نیە.

وە ئەوکەسانەی کە ئیتفاقیان هەیە لەسەر ئەوەی کە زەکات ئەبێ لە قوتا بدرێ لەبەینی خۆیاندا لەبارەی چەند شتێکەوە ئیختیلافیان پەیدا کردووە: ئاخۆ ئەو شتانە قوتن، یا قوت نین، وە ئایا قیاس ئەکرێنە سەر ئەو شتانەی کە ئیتتفاق هەیە لەسەریان یا قیاس ناکرێن؟ وەك جیاوازی ئیختیلافی مالیك و شافیعی لەبارەی زەیتونەوە، چونکە مالیك ڕەئی وایە کە زەکات تێیدا واجبە، بەڵام شافیعی لە قەولی ئەخیری لە میصر بە واجبی نازانێ، وە هۆی ئیختلافەکەشیان لەوەدایە ئایا زەیتون قوتە یا قوت نیە.

## لە چ ڕادەیەکدا زەکات لە بەروبومی کشتوکاڵی و میوەهات ئەدرێ:

بەشی زوری زانایان ڕایان وایە کە بەروبومی کشتوکاڵی و میوە زەکاتی تێدا واجب نیە هەتا نەگاتە پێنج وەسق، پاش پاك کردنەوەی لە کاو توێکڵ، بەڵام ئەگەر پاك نەکراوەو بەتوێکڵەوە هەڵگیرا وەك چەڵتوك، ئەوە ئەبێ بگاتە دە وەسق (یەك وەسق = ٦٠ صاع، یە: صاعیش ٤ (مد)، یەك (مد) ٥٤٤ غرام جۆ. کەواتە یەك وەسق = ٦٠×٤×٥٤٤ = ١٣٠٥٦٠ غرام = ٥٦، ١٣٠ کیلو غرام. وە پێنج وەسق = ٥٦ .١٣٠ × ٥ = ٦٥٢,٨ کیلو گرم.

١- لە ئەبوهورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لَيسَ فِيمَا دُونَ خَمسَةِ أوسُقٍ صَدَقَةٌ) (رواه أحمد والبيهقي بسند جيد). واتە: لە پێنج وەسق کەمتر زەکاتی تێدا نیە.

٢- لە ئەبوسەعیدی خودریەوە ﷺ هاتووە: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لَيسَ فِيمَا دُونَ خَمسَةِ أوسُقٍ مِن تَمرٍ وَلا حَبٍ صَدَقَةٌ) واتە: خورما ودانەوێڵە ئەگەر لە پێنج وەسق کەمتر بوون زەکاتیان تێدا نیە.

یەك وەسەقیش (٦٠) صاعە بە ئیجماعی زانایان، ئەمەش لە حەدیسەکەی ئەبوسەعیددا هاتووە، بەڵام حەدیسەکە (منقطع)ە.

ئەبوحەنیفە وموجاهید بۆ ئەوە چوون کە زەکات لە کەم وزۆردا واجبە، لەبەر عموم وگشتیەتی فەرمودەکەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرمویەتی: (فِيمَا سَقَتِ السَّمَاءُ العُشرُ) واتە: ئەوەی ئاسمان ئاوی بدا دە یەکی زەکات لێ ئەدرێ.

وە لەبەر ئەوەی بۆ زەکاتی ئەم جۆرە شتانە سووڕانەوەی ساڵ ئیعتیباری نیە، کەواتە (نصاب) ڕادەی زەکاتیش ئیعتیباری نیە.

ابن القیم لەم ڕایە ئەکۆڵێتەوەو ئەفەرموێ: سوننەتی صەحیح وصەریح وموحکەم هاتووە کە تیایدا ڕادەی زەکاتی داناوە بە پێنج وەسق لەو شتانەدا کە دەیەکی لێ ئەدرێت، بەڵام بەرەنگاری ئەم حەدیسە موحکەمە کراوە بە حەدیسێکی موتەشابیە کە ئەفەرموێ: (فِيمَا سَقَتِ السَّمَاءُ العُشرُ وَمَا سُقِيَ بِنَضحٍ أو

غُرِّبَ فَنِصفُ العُشرِ) واتە: ئەوەی ئاسمان ئاوی بدا دە یەکی زەکات تێدایە، وە ئەوەی بە هۆی ئاوکێشەوە ئاو بدرێ لە بیر یا لە چەم وکانی، یا بە هۆی دۆلچەوە ئاو بدرێ نیوە دە یەکی زەکات تێدایە.

جا ئەو کەسانەی بەرەنگاری لە نێوانی ئەم دوو حەدیسەدا ئەکەن ئەڵێن: ئەم حەدیسە: (فِيمَا سَقَتِ السَّمَاءُ العُشرُ) شتی کەم وزۆر ئەگرێتەوە کە زەکاتی تێدایە، واتە: حەدیسەکە عامە، وە حەدیسێکی خاص بەرەنگاری ئەم حەدیسە عامەی کردووە، وە دەلالەتی عامیش هەروەك خاص قەطعیە، وە هەر کاتێکیش عام وخاص بەرەنگاری یەك بوون نیحتیات لەکامەیان دایە ئەوە پێش ئەخرێ، کە ئەویش واجب بوونی زەکاتە لە کەم وزۆردا.

جا لە وەڵامدانەوەی ئەم قسەیەدا ئەوترێ: واجبە کار بە هەر دوو حەدیسەکە بکرێت، وە دروست نىيە هیچ کامیان بە هیچ کامیان بەرەنگاری بکرێتەوە ویەکێکیان (إلغاء) پشت گوێ بخرێ، چونکە گوێ رایەڵی و ئیتاعەتی پێغەمبەر ﷺ لە مەش و لەوەشدا (واتە: لە هەر دوو حەدیسەکەدا) واجبە، وە سوپاس بۆ خوا کە لە بەینی ئەم دوو حەدیسەدا هیچ دژایەتی نىيە، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ کە ئەفەرموێ: (فِيمَا سَقَتِ السَّمَاءُ العُشرُ).

مەبەستی لەوەیە ئەو شتانەی واجبە دە یەکی تێدا بدرێ، جیا بێتەوە لەو شتانەی کە واجبە نیوە دەیەکی تێدا بدرێ.هەر بۆیە هەر دوو جۆرەکەی باس کردوە، تا وەکو ئەندازەی زەکاتی واجب لە هەر دوو جۆرەکە جیا بکاتەوە. ئەمما ئەندازەی رادەی زەکاتەکە (نصاب) لەم حەدیسە عامەدا بێدەنگ بووە لێی وباسی نەکردووە، بەڵام بە تەواوەتی لە حەدیسە خاصەکەی تردا بە دەق رونی کردۆتەوە، کەواتە چۆن دروستە لە نەصصێکی صەریح وموحکەم کە غەیری ئەو مەعنایەی لێی وەرئەگیرێ هیچی تر ناگەیەنێ واز بهێنرێ، بۆلای نەصصێکی موجمەل وموتەشابیە کە ئەو پەڕی مەبەستی ئەوەیە لێی بدوێ بە شێوەیەکی گشتی، هەوڵ نەدەن بەیانی کەن بە نەصصێکی خاص وموحکەم و رون کەرەوە، هەروەك چۆن باقی نەصصە عامەکان رون ئەکرێنەوە. -تەواو-.

ئیبنوقودامە ئەڵێ: فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ کە ئەفەرموێ: (لَيسَ فِيمَا دُونَ خَمسَةِ أوسُقٍ صَدَقَةٌ) (متفق علیه). واتە: لە پێنج وەسق کەمتر زەکاتی تێدا نىيە. ئەم فەرمایشتە خاصە، و واجبە پێش بخرێ وعمومی ئەو حەدیسەی کە ریوایەتیان کردووە لەو بارەوە پێی خاص بکرێت. هەروەك چۆن ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ کە ئەفەرموێ: (فِي كُلِّ سَائِمَةٍ مِنَ الإبِلِ الزَّكَاةُ) واتە: لە گشت ئەو وشترانەدا کە بۆ خۆیان ئەلەوەڕێن زەکات هەیە. تایبەتمان کرد بەم فەرمایشەی کە ئەفەرموێت: (لَيسَ فِيمَا دُونَ خَمسِ ذَودٍ صَدَقَةٌ) واتە: لە پێنج (ذود) کەمتر زەکاتی تێدانىيە(ذود: بە کۆمەڵە وشترێك ئەڵێن: ژمارەیان لە سێوە تا دە بێ).

هەروەها ئەم فەرمايشتەى پێغەمبەر ﷺ كە ئەفەرمووێ: (فِي الرِّقَّةِ رُبعُ العُشْرِ) واتە: لە زیودا زەكاتەكەى چل يەكە. خاصمان كرد بەم فەرمايشتەى كە ئەفەرموێ: (لَيسَ فِيمَا دُونَ خَمسِ أواقٍ صَدَقَةٌ) واتە: لە پێنج ئوقيیە كەمتر زەكاتى تێدا نىيە. چونكە بەروبومى كشتوكاڵى و ميوەجاتيش ماڵێو زەكاتى تێدا واجبە، كەواتە لەكەميدا واجب نابێ هەروەكو هەموو ماڵە زەكاتىيەكانى تر[1].

وە ئەو بەروبوومە بۆيە سوڕانەوەى ساڵ بە سەريدا ئيعتيبارى نىيە چونكە تەواو بوونى نەشونماى ئەو رۆژەيە كە ئەڕنىدرێ يا درووێنە ئەكرێ، نەك بەوەى بهێلرێتەوە تا وەكو ساڵى بەرسەردا تێ ئەپەڕێ. وە غەيرى بەروبومى كشت وكاڵى وميوەجات بۆيە سوڕانەوەى ساڵ بە سەريدا ئيعتيبارى هەيە، چونكە ئەو ساڵە جێى گومانە بۆ تەواوبونى گەشە كردن تێيدا، وە نصابيشى تێدا ئيعتيبار كراوە تاوەكو بگاتە ڕادەيەك كە كەڵكى ئەوە بێ بەشى فەقيرى لێ دەربكرێ لەبەر ئەوەيە نصاب تىێدا ئيعتيبارى هەيە.

لە دواى ئەوە لێكۆڵينەوە ئەكات: كە زەكات تەنها لەسەر دەوڵەمەندان واجبە، وە دەوڵەمەنديش بەبێ (نصاب) ڕادەى زەكات نايەتەدى، وە نصابيش ئەبێ ڕەچاو بكرێ لە گشت ئەو ماڵانەدا كە زەكاتيان تێدا واجبە.

ئەمە ئەو، صاعيش پەرداخێك وسێيەكە پەرداخێكە، كەواتە (نصاب) پەنجا پێوانەيە، وە ئەگەر دەرهاتووەكە لە زەوى لەو جۆرە شتانە نەبوو كە پێوانە ئەكرێ، ئەوە ئيبنوقودامە لەو بارەوە ووتويەتى: زەعفەران ولۆكە وهەر شتێك كە وەك ئەم دووانە بكێشرێن نصابەكەيان هەزار وشەش صەد (رطل)ى عێراقىيە، كەواتە ئەم دووانەو وێنەى ئەم دووانە بە كێشانە حيساب ئەكرێن[2].

ئەبويوسف ئەڵێ: ئەگەر دەرهاتوو لە زەوى لەو جۆرە شتانە بوو كە پێوانە ناكرێ زەكاتى تێدا واجب نىيە، هەتا نرخەكەى ئەگاتە نرخى نصابى نزمترين جۆركە پێوانە ئەكرێ، كەواتە زەكات لە لۆكەدا واجب نىيە تا وەكو نرخەكەى ئەگاتە نرخى پێنج وەسەق لە نزمترين جۆركە پێوانە ئەكرێ، وەكو جۆو وێنەى جۆ، چونكە ناكرێ لۆكە ئيعتيبار بكرێ بە خۆى، بەڵكو ئەبێ بە غەيرى خۆى ئيعتيبار بكرێ، وەك ماڵى بازرگانى كە ئەبێ بقەبلێ بە كەمترين نرخى دوو نصاب لە زێڕ وزيوە.

محمد ئەڵێ: ئەبێ بگاتە پێنج بەرابەرى بەرزترين شت كە ئەو نوعەى پێ تەقدير ئەكرێ، جا بۆ نموونە لۆكە ئەگەر بگاتە پێنج (قنطار)[3]يش زەكاتى تێدا نىيە، لەبەر ئەوەى تەقدير كردن بە وەسەق لەو

---

(١) يەك ئوقيیە=٤٠ ديرهەمە. يەك ديرهەميش=٢،٩٧٠گرام.

(٢) پێنج وەسەق يەكسانە بە هەزار وشەش صەد (رطل)ى عێراقى، (رطل)ى عێراقيش تەقريبەن (١٣٠ ديرهەمە) (دانەر).

(٣) (قنطار) واتە ماڵێكى زۆر.

نەوعانەدا کە پێوانە ئەکرێ بە ئیعتیباری ئەوەیە کە وەسەق بەرزترین شتەکە ئەو جۆرە شتانەی پێ تەقدیر ئەکرێ.

**بڕی زەکاتی واجب:**

بڕی ئەو زەکاتەی دەرئەکرێت لە وانەی لە زەوی دەردێن ئەگۆڕێت بەپێی ئاو دێری کردنی: جا ئەوانەی بە بێ ئامێری ئاودان ئاو ئەدرێن دە یەکی زەکات لێ دەرئەکرێت، بەڵام ئەگەر بە ئامێری ئاودان ئاودێر کرابن یا بە ئاوی کڕدراو، ئەوە نیو دە یەکی لێ دەرئەکرێت.

١- لە موعاذەوە هاتووە ﷺ کە: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (فِيمَا سَقَتِ السَّمَاءُ والبَعلُ وَالسَّيلُ العُشرُ وَفِيمَا سُقِيَ بِالنضح نِصفُ العُشرِ) (رواه البيهقي والحاكم وصححه). واتە: هەرچی ئاسمان ئاوی‌داو هەرچی بە ڕەگەوڕشاڵە ئاوی لە زەوی وەرئەگرت وهەرچی لافاو ئاوی ئەدا دە یەکی زەکات لێ ئەدرێ، وە هەرچی بە ووشتر یا ئاو بدرێ نیوە دە یەکی زەکات لێ ئەدرێ.

٢- لە ئیبنوعومەرەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (فِيمَا سَقَتِ السَّمَاءُ وَالعُيُونُ أو كَانَ عَثرِياً العُشرُ، وَفِيمَا سُقِيَ بِالنَّضح نِصفُ العُشرِ) (رواه البخاري وغيره). واتە: هەرچی بە ئاسمان وکانی ئاودێر بکرێت یا بە ڕیشەی خۆی ئاو بخواتەوە دە یەکی ئەکەوێت، وە هەرچی بە ووشتری ئاو هەڵکێش ئاو بدرێ نیوەی دەیەك.

بەڵام ئەگەر هەندێ کات بە ئامێر ئاو دێربکرێت وهەندێ جار بێ ئامێر، ئەوە ئەگەر وەك یەك بوون لە ماوەدا، ئەوە سێ چواریەکی دە یەکی لێ دەرئەکرێت. (واتە: لە صەدا حەوت ونیو).

ئیبنوقودامە ووتویەتی: ئەمان زانیوە هیچ ئیختیلافێك لەو مەسەلەیەدا هەبێ، بەڵام ئەگەر ماوەی یەکێکیان لەوەی تریان زۆرتر بێت ئەوە ماوە کەمترەکە حوکمی ماوە زۆرەکەی هەیە، لای ئەبوحەنیفە وئەحمەد و (ثوري) و یەکێ لە دوو قەولەی شافیعی.

وە هەرچی لەو زەرعە خەرج بکرێت وەك خەرجی چنینو دروێنەو کێشەو گێرەو شەنەو پاسەوانی کردنو ئەو جۆرە شتانە گشتی لەسەر حیسابی خاوەنەکەیەتی، ولە ماڵی زەکاتەکە هیچی لێ نادرێ.

مەزهەبی ئیبنوعەبباس وئیبنوعومەر خوایان لێ ڕازی بێت ئەوەیە کە هەرچی قەرز بکرێت بۆ ئەو دەغڵە بۆ چاندن وشین بوون و بەرهێنانی لەسەر حیسابی ماڵە زەکاتەکەیە.

لە جابیری کوڕی زەیدەوە هاتووە: کە ئیبنوعەبباس وئیبنوعومەر ڕەزای خوایان لێ بێت دەربارەی کەسێك کە قەرز بکاتو سەرفی بکات بۆ خاوو خێزانیو پێگەیاندنی زەرعەکەی پرسیاریان لێ کرا، جابیر ئەڵێ: ئیبنوعومەر فەرموی: لە پێشدا قەرزەکەی لێ بداتەوە، وە ئەوەی مایەوە زەکاتی لێ دەربکات.

ئیبنوعەبباسیش فەرمووی: خاوەن ماڵ هەرچی قەرز كردووە بۆ بەرهەم هێنانی جارێ ئەوەی لێ بداتەوە، پاشان ئەوەی مایەوە زەكاتی لێ دەربكات. ئەم (أثر)ە یەحیای كوڕی ئادەم لە باسی مەسەلەی خەراجدا گێڕاویەتی‌یەوە).

ئیبنوحەزم لە (عطاء)ەوە ئەگێڕێتەوە كە ووتویەتی: هەر خەرجیەكی لێ كراوە لێی دەرئەكرێت پاشان ئەوەی مایەوە ئەگەر گەیشتە ڕادەی زەكات زەكاتی لێ دەرئەكرێت، ئەگینا نا.

**زەكاتی زەوی خەراجی - سەرانەیی - :**

زەوی ئەكرێت بە دو بەشەوە:

١- (عشریە) دە یەكی: ئەمە ئەو زەوی یانە ئەگرێتەوە كە خاوەنەكانیان بە ویستی خۆیان موسوڵمان بوون، یان بە زۆر فەتح كراوەو لە نێوان ئەو موسوڵمانانەدا كە فەتحیان كردووە دابەش كراوە، یان ئەو زەوی‌یانەن كە مسوڵمانان بە دەستی خۆیان بوژاندویانەتەوە.

٢- خەراجی: ئەمەش ئەو زەوی‌یانە ئەگرێتەوەكە موسوڵمانان بە زۆر فەتحیان كردووە و پاشان لە ژێر دەستی خاوەنەكانیاندا هێشتویانەتەوە لە موقابیلی خەراجێكی دیاری كراودا كە بیدەن.

وە وەك چۆن زەكات واجبە لە زەوی‌یە دە یەكیەكاندا، هەروەها واجبیشە لە زەوی‌یە خەراجی‌یەكانیشدا ئەگەر خاوەنی ئەو زەوی‌یە (خەراجی‌یانە) موسوڵمان بن، یان موسوڵمان كڕیبێتی، جا لەم حاڵەتەدا هەم حوكمی زەوی دە یەكی بۆ ئەكرێ وە هەم حوكمی زەوی خەراجی بۆ ئەكرێ، وە واجب بوونی زەكاتی هیچ لایەنێكیان مەنعی واجب بوونی زەكاتی لایەنەكەی تریان ناكات.

(ابن منذر) ئەڵێت: ئەمە ووتەی بەشی زۆری زانایانە.

وە ئەوانەی ئەمەیان ووتووە: عومەری كوڕی عبدالعزیز، ڕەبیعە، زوهری، یەحیای ئەنصاری، مالك، أوزاعی، (ثوري)، حەسەنی كوڕی صالح، ئیبنو ئەبی لەیلا، (لیث)، ئیبنوموبارەك، أحمد، إسحاق، ئەبوعوبەید وداوودن. بەڵگەشیان لەسەر ئەمە هێناوەتەوە بە قورئان وحەدیس وقیاس.

ئەما قورئان ئەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِن طَيِّبَـٰتِ مَا كَسَبۡتُمۡ وَمِمَّآ أَخۡرَجۡنَا لَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِۖ﴾ (البقرة/٢٦٧). واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە زەكاتی ئەو شتە پوختانەی بە دەستتان هێناوە لەوانەی ئێمە لە زەویدا بۆمان دەركردون، بدەن.

جا ئەم ئایەتە بەخشین لە زەوی واجب كردووە بە گشتی، ئیتر هەر زەویەك بێت، خەراجی یا دە یەكی.

ئەما سوننەت: فەرمودەی پێغەمبەرە ﷺ كە فەرمویەتی: (فِيمَا سَقَتِ السَّمَاءُ العُشرُ) واتە: ئەوەی ئاسمان ئاوی بدات دە یەكی زەكات لێ ئەدرێ. ئەمەش گشتی‌یە و زەوی خەراجی ودە یەكی ئەگرێتەوە.

ئەمما قیاس: لەبەر ئەوەی زەکات وخەراج دوو مافن بە دوو هۆی جیا جیا پێویست کراون، کەواتە هیچیان ئەوی تریان لانابات.

هەروەك ئەوە وایە موحریمێك ـ کەسێك کە ئیحرامی بەستبێت ـ نێچیرێك بکوژێ ماڵی کەسی تر بێت، ئەبێ دوو ماف بدات، وە لەبەر ئەوەی زەکات بە دەقی ئایەت و حەدیس واجب کراوە، وە خەراج کە بە ئیجتیهاد واجب کراوە ناتوانێ مەنعی بکات.

ئەبوحەنیفە بۆ ئەوە چووە کە دەیەك لە زەوی خەراجیدا نییە، بەڵکو ئەوەی پێویست بێ تێیدا تەنها خەراجەکەیە وە مەرجی پێویست بوونی دە یەك ئەوەیە زەوییەکە زەوی خەراجی نەبێت.

**بەڵگەی ئەبوحەنیفە و لێ کۆڵینەوەی:**

ئیمام ئەبوحەنیفە ﷺ بۆ بۆچوونەکەی ئەمانەی خوارەوەی کردوە بە بەڵگە:

١- ئیبنومەسعود دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لا يَجتَمِعُ عُشرٌ وَخَراجٌ فِي أرضِ مُسلِمٍ) واتە: دە یەك وخەراج کۆنابنەوە لەسەر زەوی موسوڵمان.

ئەم حەدیسەش، زانایانی حەدیس هەموو لەسەر ئەوە کۆن کە حەدیسێکی زەعیفە، تەنها یەحیای کوڕی عەنبەسە هێناویەتی لە ئەبوحەنیفەوە، لە حەمادەوە، لە ئیبراهیمی نەخەعییەوە، لە عەلقەمەوە، لە ئیبنومەسعودەوە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ. بەیهەقی لە (معرفة السنن والآثار) دا ووتویەتی: ئەو حەدیسە باسکراوە ئەبوحەنیفە ئەیگێڕێتەوە لە حەمادەوە لە ئیبراهیمەوە، وە ئەمەش قسەی خۆیەتی، جا یەحیاش بە مەرفوعی ئەی گێڕێتەوە، وە یەحیای کوڕی عەنبەسە حاڵی ئاشکرایە، چونکی لە (ثقات)ە وە (موضوعات) ریوایەت ئەکا، ئەمەش ئەبوئەحمەدی کوڕی عەدی حافظ ووتویەتی، لەوەدا کە ئەبوسەعیدی مالینی بۆی گێڕاوینەوە دەربارەی ئەو.

هەروەها کەمالی کوڕی (هەمام) کە یەکێکە لە ئیمامەکانی مەزهەبی حەنەفی بە زەعیفی داناوە.

٢- ئەحمەد وموسلیم وئەبوداود لە ئەبوهورەیرەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَنَعَتِ العِراقُ قَفِيزَهَا، وَدِرهَمَهَا، وَمَنَعَتِ الشَّامُ مديهَا وَدِينَارَهَا، وَمَنَعَت مِصرُ إردَبَّهَا وَدِينَارَهَا، وَعُدتُم مِن حَيثُ بَدَأتُم ـ قالها ثلاثا ـ شَهِدَ على ذٰلِكَ لَحمُ أبي هُرَيرَةَ وَدَمُهُ). واتە: عێراق ئەو پەیمانەو ئەو درهەمەی کە لەسەری بوو نەیدا، شامیش دوو موددەکەی و دینارەکەی نەدا، میسریش ئەو پەیمانە و دینارەی کە لەسەری بوو نەیدا، و ئێوە چۆن هاتن ئاوهاش گەڕانەوە، سێ جار ئەمەی فەرموو، گۆشت وخوێنی ئەبوهورەیرە شایەتە لەسەر ئەوە.

بەڵام لەم حەدیسەدا بەڵگەی ئەوە نییە کە زەکات لە زەوی خەراجی وەرناگیرێت، زانایان ئەم حەدیسەیان والێك داوەتەوە کە ئەوانە موسوڵمان ئەبن وسەرانەیان لەسەر لائەبرێت، یا ئیشارەتە بۆ کەوتنەوەی فیتنە

لە ئاخر زەماندا کە ئەبێتە هۆی ڕێگرتن لە دانی ئەو مافە خواییانەی کە واجبە لەسەریان، وەك زەکات و سەرانە و شتی تر.

ئیمام نەوەوی دوای ئەو دوو لێکدانەوەیە ئەفەرموێ: ئەگەر حەدیسەکە مانای ئەوە بووایە کە ئەڵێن، ئەوە پێویست ئەبوو زەکات لەسەر درهەم ودینار و بازرگانی لابچوایە، ئەمەش هیچ کەس نایڵێت.

٣- ئەگێڕنەوە کاتێ دیهقانی دەسەڵاتداری پاشا، موسوڵمان بوو عومەری کوڕی (خطاب) خوای لێ ڕازی بێت فەرمووی: (زەوی‌یەکانی بدەنەوە و سەرانەی لێ وەربگرن). ئەمەش بە صەراحەت فەرمانە، کە خەراجی لێ وەربگیرێ بەڵام فەرمان بە وەرگرتنی دە یەك نی‌یە. وە ئەم بە سەرهاتە مەبەست لێی ئەوەیە کە خەراج بە موسوڵمان بوون لاناچێ، وە ئەوە ناگەیەنێ کە دە یەکی لابچێ، وە لێرەدا بۆیە تەنها باسی خەراج ئەکات، چونکە لەوانەیە واگومان بکرێت کە خەراج بە موسوڵمان بوون لائەچێت وەك سەرانە، ئەمما دە یەك وەك ئاشکرایە لەسەر موسوڵمانی ئازاد پێویستە، کەواتە پێویست ناکات باس بکرێت. وەك چۆن باسی وەرگرتنی زەکاتی ئاژەڵی نەکرد کە لێی وەربگیردرێ، هەروەها زەکاتی زێڕو زیو، یان لەبەر ئەوەی دیهقان ئەوەندەی نەبووە دە یەکی لەسەر پێویست بێت.

٤- وە لەبەر ئەوەی والی‌یەکان وە پێشەوا موسوڵمانەکان کاریان لەسەر ئەوە نەبووە دە یەك وخەراج لەسەر یەك زەوی کۆ بکەنەوە ولێی دەر بکەن. بەڵام ئەمەوا نی‌یە چونکە (ابن منذر) ئەگێڕێتەوە کە عومەری کوڕی عبدالعزیز هەردووکیانی کۆکردۆتەوە وسەندویەتی.

٥- خەراج جیاوازە لە گەڵ دە یەکدا چونکە خەراج وەك سزا پێویست بووە، بەڵام دە یەك وەك عیبادەتێك پێویست بووە، و ناکرێت هەردووکیان لەسەر یەك کەس کۆ بکرێتەوە و هەردووکیان پێویست بێت لەسەری.

ئەمە ڕاستە لە حاڵەتی سەرەتادا، بەڵام لە حاڵەتی مانەوەدا وا نی‌یە وە هەموو شێوەکانی خەراج ئەساسەکانیان زۆرو سزایی نی‌یە، بەڵکو لە هێندێ شێوەیدا زۆری لەگەڵدا نی‌یە، وەك لەو زەویانەی نزیکن لە زەوی خەراجەوە، یا ئەو زەویانەی بە ئاوی ڕوبارە بچوکەکان ژیاونەوە و ئاودێری کراون.

٦- هۆی خەراج و دە یەك، یەك شتە ئەویش ئەوەیە کە ئەو زەوی‌یە قازانج ئەدا چ لە حەقیقەتدا یا لە حوکمدا، بە بەڵگەی ئەوەی ئەگەر ئەو زەوی‌یە شۆر و بێ‌کەڵك بێ، نە خەراج و نە دەیەکی لەسەر نی‌یە، جا مادام هۆیەکە یەك بێت، هەر دووکیان لە زەویەکدا کۆ نابنەوە، لەبەر ئەوەی یەك هۆ دوومافی کە هەردووکیان لە یەك جۆربن پێوەی نا بەسرێتەوە، وەك ئەوەی کەسێك (نصاب) ڕادەی زەکاتی هەبێ لە ئاژەڵی خۆلەوەڕدا ساڵێك لەلای بێ بۆ بازرگانی، لەم حاڵەتەدا دوو زەکاتی ناچێتە سەر شان.

وەڵام بۆ ئەمەش: ئەوە بەو شێوەیە نی‌یە، چونکە هۆی دە یەك ئەو بەروبوومەیە کە لە زەوی دێتە دەر، بەڵام خەراج لەسەر زەوی‌یەکەیە، جا ئەو زەوی‌یە بچێنرێت یا نەچێنرێت وەك یەکە، وە ئەگەر واش فەرز

كەين هۆكار يەكێكە، خۆ لەم حاڵەتەشدا هيچ ڕێگرێك نىيە لەوەى كە دوو وەزيفە هەڵواسرێ بە يەك هۆوە، كە ئەويش زەوييە، وەك چۆن كەمالى كوڕى (هەمام) ئەمەى ووتووە.

**زەكاتى ئەو بەروبوومەى كە لە زەوى ئيجارەت پەيدا ئەبێت:**

جومهورى زانايان ڕايان وايە هەر كەس زەويەكى بە ئيجارەت گرت وچاندى زەكات لەسەر ئەو كەسەيە نەك خاوەن زەويەكە.

ئەبوحەنيفە ئەڵێت: زەكات لەسەر خاوەن زەويەكەيە. ئيبنوڕوشد ئەڵێ: هۆى جياوازى زانايان لەو بارەوە ئەوەيە: ئايا دە يەك مافێكە لەسەر زەويەكەيە يان لەسەر زەرعەكەيە؟

جا كاتێ لە لاى ئەمان مافێكە لەسەر يەكێ لەو دووانە، جياوازيان لەوەدا پەيدا كردووە كە كاميان لە پێشترە كە نيسبەت بدرێ بۆ جێى زەكات دانەكە، كە ئەويش ئەوەيە هەم زەرعەكە وە هەم زەويەكە هى خاوەنێكە.

جا جەماوەر ڕەئى وايە: ئەوەى زەكاتەكەى تێدا واجبە دانەوێڵەكەيە.

وە ئەبوحەنيفە ڕەئى وايە: ئەوەى زەكاتەكەى تێدا واجبە ئەوەيە كە ئەصڵى واجب بوونەكەيە، ئەويش زەوييەكەيە.

بەڵام ئيبنوقودامە ڕەئى جەماوەرهەڵئەبژێرێ و ئەڵێ: زەكات لە زەرعەكەدا واجبە، هەر بۆيە دەبێ خاوەنى ئەو زەرعە زەكاتەكەى بدات. وەك چۆن زەكات لە نرخى ئەرزێك ئەدات كە بۆ بازرگانى داى ناوە، وە وەك چۆن دە يەك لە زەرعێكى خۆى ئەدات كە لە موڵكى خۆى دايە، وە ئەو قسەيە ڕاست نىيە كە ئەڵێن: زەكاتەكە لە خەرجىو هەزينەى خودى زەوييەكەيە، چونكى ئەگەر لە خەرجى وهەزينەى خودى زەوييەكە بووايە، ئەو كاتە زەكات لەو زەوييەدا واجب ئەبوو ئەگەر داشنەچێنرايە — وەك چۆن خەراج پەيوەندى بە خودى زەوييەوە هەيە-وە هەروەها ئەوكاتە ئەبووايە زەكات لەسەر(ذمي)يش واجب بووايە وەك چۆن خەراجى لەسەر واجبە، وە ئەبوايە زەكات بە ئەندازەى زەوييەكە تەقدير بكرايە نەك بە ئەندازەى زەرعەكە، وە واجب ئەبوو صەرف بكرايە بۆ مصاريفى(فيء) نەك بۆ مەصرەفى زەكات.

**دانانى ڕادەى زەكات لە خورماوترێدا بە خەمڵاندن نەك بە پێوانە:**

كاتێ خورما و ترێ پێ ئەگەن و چاكىيان ئاشكرا ئەبێ، بە خەمڵاندن ڕادەى زەكاتيان بۆ دا دەنرێت نەك بە پێوان، ئەويش ئەبێ كەسێكى شارەزاى ئەمين تەماشاى ئەو ترێ وخورمايە بكات كە بە ڕەز و دارخورماكەوەيە پاشان بە خورماو مێوژ دايان بنێت، بۆ ئەوەى بزانێ چەندە زەكاتيان تێدايە، جا هەركاتێ ئەو بەروبوومە ووشك بوو ئەو زەكاتەى لێ وەرئەگرێت كە لە پێشەوە دايناوە.

لە ئەبوحومەيدى ساعيدىيەوە هاتووە فەرمويەتى: لە گەڵ پێغەمبەر ﷺ غەزاى تەبوكمان كرد،كاتێ هاتەوە (وادي القرى) ژنێك لەناو باخێكدا بوو خۆى خاوەنى ئەو باخە بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووى:

بيخەملێنن، وە پێغەمبەر ﷺ خەملاندى بە دە وەسەق، ئەنجا پێى فەرموو: دايبنێ بزانە چەند زەكاتى لێ دەرنەكرێت. (رواه البخاري).

ئەمەش سوننەتى پێغەمبەرە ﷺ وكارى هاوەڵەكانى‌يەتى دواى خۆى، وە زۆربەى زانايانيش هەر ئەمە ئەڵێن[١].

بەڵام حەنەفى‌يەكان رەئيان وا نى‌يە ئەڵێن: خەملاندن گومان وتەخمينە وحوكمى پێ ناكرێت.

وە سوننەتى پێغەمبەر ﷺ چاكترە، چونكە خەملاندن بە هيچ جۆرێ گومان نى‌يە، بەڵكو ئيجتيهادێكە بۆ زانينى ئەندازەى بەروبووم، وەك ئەو ئيجتيهادەى ئەكرێ بۆ زانينى ئەندازەى شتى زەرەر لێدراو.

وە هۆى ئەو خەملاندنەش لێرەدا ئەوەيە ميوە وەك عادەتە بە تەڕى ئەخورێت، لەبەر ئەوە زۆر پێويستە بەشى زەكاتەكەى بۆ دابنرێت پێش ئەوەى لێ كردنەوەو خواردنى، وە بۆ ئەوەى خاوەنى دواى ئەو خەملاندنە چۆن بيەوێ ئاوا تەصەروفى تێدا بكات و (ضامني) ئەندازەى زەكاتەكەشى بێت.

وە لەسەر خەملێنەر پێويستە سێ‌يەكى يا چواريەكى واز لێ بهێنێ بۆ خاوەنى، چونكە بۆ خواردنى خۆيانو ميوانو دەرو دراوسێ پێويستيان پێى هەيە، وە ئەو بەروبوومە كەم بوون تووشى ئەبێ بە لێ خواردنى باڵندەو كەسانێك كە بە لايدا تێ ئەپەڕن وە هەروەها ڕەشە باش لێى هەڵئەوەرێنێ، جا ئەگەر ئەو بەروبوومە هەمووى بخەملێنرێت وحيساب بكرێت بێ ئەوەى سێ‌يەكى يا چواريەكى لێ دەربكرێت، خاوەنى زيانى لێ ئەدرێت.

لە سەهلى كوڕى ئەبو (حثمة)ەوە هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمويەتى: (إِذَا خَرَصتُم فَخُذُوا وَدَعُوا الثُّلُثَ، فَإِن لَم تَدَعُوا الثُّلُثَ فَدَعُوا الرُّبعَ). (رواه أحمد وأصحاب السنن إلا ابن ماجه. ورواه الحاكم وابن حبان وصححاه)[٢]. واتە: هەركاتێ ماڵێكتان خەملاند بۆ زەكات واز لە سێيەكى بهێنن، ئەگەر وازتان لە سێيەكى نەهێنا، چواريەكى واز لێ بهێنن پاشان زەكاتەكەى وەربگرن.

---

(١) ماليك ئەمە بە واجب ئەزانێ، وە لاى شافيعى وئەحمەد سوننەتە. (دانەر).

(٢) سەنەدەكەى زەعيفە، وە لاى زەهەبى‌و بێجگە لەو كەسانێكى تێدايە كە نەناسراون، و هيچ ئيعتيبارێك بۆ ئەو كەسانە دانانرێت كە دانەر باسى كردووە لەوەدا كە بە صەحيحيان داناوە، لەبەر ئەوەى ئەوان لەوكەسانەن كە كەمتەرخەمى تێدا ئەكەن، و ئەوەندەش بەسە بۆ بەڵگە كە (ترمذي) لەگەڵ ئەوەشدا كە كەمتەرخەمە كاتێك تەخريجى ئەكات بێ‌دەنگ ئەبێت لەسەرى و بەحەسەنى دانەناوە، هەر لەبەر ئەوەيە لە (الضعيفة) دا بە ژمارە (٢٥٥٦) و (ضعيف أبي داود ٢٨١) دا تەخريجم كردووە.

(ترمذي) ووتويەتى: كارلەسەرحەديسەكەى سەهلە لاى بەشى زۆرى زانايان.

لە بەشيرى كورى يەسارەوە هاتووە كە ووتويەتى: عومەرى كورى (خطاب) خواى لىٚ رازى بيٚت ئەبو (حثمة)ى ئەنصارى نارد بۆ خەملاندنى مالّى موسولّمانان و پىٚى فەرموو: (كاتىٚ پايز بوو خەلّكەكەت بينى لەناو دار خورماكانياندا، بەشى خواردنيان بۆ لىٚ دەربكەو مەيخەملێنە).

لە مەكحولەوە هاتووە ووتويەتى: پيٚغەمبەر ﷺ كاتىٚ خەملێنەرى ئەنارد پێى ئەفەرموو: (خَفِّفُوا على النَّاسِ فَإنَّ فِي المَالِ العَرِيَّةُ وَالوَاطِئَةُ وَالآكِلَةُ). (رواه أبوعبيد). واته: لەسەر خەلّك ئاسان بكەن چونكە ئەو مالّە بەشى بەخشين ورِيٚبوار وبخۆرى تيٚدا هەيە.

**لە دەغلّودان خواردن:**

دروستە خاوەنى دەغلّ ودان لە دەغلّ ودانەكەى بخوات، وە ئەوەى لە پيٚش درويٚنە ئەيخوات لەسەرى حيساب ناكرىٚ، چونكە عادەت هەروەها بووە، وە ئەوەى لىٚ‌ى ئەخوريٚت بەشيٚكى كەمە، وەك چۆن خاوەن بەروبومەكان پيٚش لىٚ كردنەوە لىٚ‌يان ئەخۆن، جا كاتيٚك دەغلّ ودانەكە درويٚنەكراو دانەكەى لىٚ جيا كراوە هەرچى مابۆوە زەكاتى لىٚ دەرئەكريٚت.

لە ئەحمەديان پرسى دەربارەى ئەوەى خاوەن زەرع بە فەريكى ئەيخوات؟ ووتى: قەيناكە ئەگەر خاوەنى بەپيٚ‌ى پيٚويست ليٚى بخوات. وە شافيعى و (ليث) و ئيبنوحەزم هەر ئەوەيان ووتوە[1].

**تيٚكەلّ كردنى جۆرەكانى دانەويٚلّە وميوەجات بۆ تەواو كردنى رِادەى زەكات:**

زانايان لەسەر ئەوە رِيٚك كەوتون كە دروستە جۆرەكانى ميوەيەك يا جۆرەكانى دانەويٚلّەيەك تيٚكەلّاو يەكتر بكريٚن گەرچى لە جوانى وناشيرينى وچاكى وخراپى و رِەنگەگەيدا فەرقيشى هەبىٚ، كەواتە دروستە جۆرەكانى ميٚوژ تيٚكەلّاو يەكتر بكريٚت، هەروەها جۆرەكانى گەنم، هەروەها جۆرەكانى تريش.

وە لەسەر ئەوەش رِيٚك كەوتوون كە مالّى بازرگانى بخريٚتە سەر نرخەكەى وهەر دووكيان پيٚكەوە حيساب بكريٚن وە پاشان لە مەجموعى ئەو دووانە زەكات بدريٚت، بەلّام لاى شافيعى دروست نىيە نرخ بخريٚتە سەر

---

وئەو ئەسەرەش كە دانەر لە دواى ئەوە باسى كردووە لە بەشيرى كورى يەسارەوە ئەوە پچر پچرە لە نيٚوان بەشير و عومەردا، چونكە ريوايەتيان لە بەشيرەوە باس نەكردووە مەگەر لەو صەحابەناوە كە تەمەنيان كەم بووە وەك ئەنەس و ئەوانى تر.

هەروەها ئەو ئەسەرەش كە لە دواى ئەوە هاتووە دووبارە مورسەلە، ئەبو عوبەيد ريوايەتى كردووە (١٤٥٣) و پياوەكانى سيقەن.

(١) بەلّام ماليك وئەبوحەنيفە ئەلّيٚن: ئەگەر لە پيٚش درويٚنە كردنى زەرعەكە خاوەنەكەى ليٚى بخوات لە رِادەى زەكاتەكەيدا لەسەرى حيساب ئەكرىٚ (دانەر).

غەیری ئەو جینسەی کە کڕدراوە، چونکە (نصاب)ی ئەو نرخە لەسەر جینسەکەی خۆی ئیعتیباری بۆ نەکرێ.

وە لەسەر ئەوەش ڕێکن کە جۆرێك وجۆرێکی تری ناخرێنە سەریەك بۆ ئەوەی ڕادەی زەکاتی پێ تەواو بکرێت، جگە لە دانەوێڵە وبەروبوم.

جا ئاژەڵەکان جۆرێك ناخرێتە سەر جۆرێکی تر، بۆ نموونە ووشتر ناخرێتە سەر ڕەشە ووڵاغ بۆ ئەوەی ڕادەی زەکاتی پی تەواو بکرێت. وە میوەهاتیش ناخرێنە سەر غەیری جینسی خۆیان، کەواتە خورما ناخرێتە سەر مێوژ. وە جیاوازیان هەیە لە خستنە سەریەکی دانەوێڵەی جیاواز لە یەك، وە لەپێشترین و حەقترین ڕا ئەوەیە: هیچ جۆرێك ناخرێتە سەر جۆرێکی تری جیاواز بۆ ئەوەی ڕادەی زەکاتی پێ تەواو بێت، چونکە ڕادەی هەر جینسێك بە خۆیەوە بەستراوە، لەبەر ئەوەی جینسەکان لە یەك جیاوازن وجۆری زۆریان هەیە بەپێی ناوەکانیان، کەواتە جۆ ناخرێتە سەرگەنم وگەنم ناخرێتە سەر جۆ، و خورما ناخرێتە سەر مێوژ ومێوژ ناخرێتە سەر خورما، هەروەك نۆك ناخرێتە سەر نیسك ونیسك ناخرێتە سەر نۆك.

ئەمەش مەزهەبی ئەبوحەنیفەو شافیعی ویەکێك لەو ڕیوایەتانەیە کە لە ئەحمەدەوە هاتووە، وە زۆریش لە زانا پێشینەکانی سەلەف بۆ ئەوە چوون.

(ابن منذر) ووتویەتی: زانایان کۆن لەسەر ئەوەی کە ووشتر ناخرێتە سەر ڕەشە ووڵاغ، وە ناخرێتە سەر مەڕ، وە ڕەشە ووڵاغ ناخرێتە سەر مەڕ، وە خورما ناخرێتە سەر مێوژ، بەوشێوەیە تێکەڵ کردن نیە لە هیچ جۆرێکی تری جیاوازدا، وە بۆ ئەوانەی ئەڵێن: جورە جیاوازەکان (جینسەکان) ئەخرێنە سەریەك بەڵگەی ڕاست ودروست نیە لەسەر قسەکەیان.

**ج کاتێك زەکات واجب ئەبێت لە دانەوێڵە ومیوەدا:**

دەغڵ ودان کاتێ گوڵەکەی دانی بە هێز بوو و بوو بە فەریکە، زەکاتی لەسەر پێویست ئەبێ، وە هەروەها لە میوە کاتێ واجب دەبێت کە چاکیەتی‌یەکەی ئاشکرا بوو، جا لە خورمادا ئەو چاکیەتیە بەوە دەرئەکەوێ کە دەنکەکەی سووربێت، وە لە ترێدا کە شیرین ببێت[1]، وە دانەوێڵە هەتا دانەکەی جیا نەکرێتەوە زەکاتەکەی دەرناکرێت، وە میوەش کاتێك ووشك کرایەوە ئەوسا زەکاتەکەی لێ دەرئەکرێت.

جا ئەگەر کاتێ دەغڵەکە دانی بەهێز بوو، یان میوەکە چاکیەتیەکەی ئاشکرا بوو، وە خاوەنی فرۆشتی زەکاتەکەی لەسەر خاوەنی‌یەتی نەك لەسەر کڕیارەکەی، چونکە هۆی واجب بوونی ئەو زەکاتە عەقدەکەیەتی، کە ئەویش بە دەست خاوەنەکەیەتی.

---

(١) ئەمە مەزهەبی جەماوەرە، بەڵام لای ئەبوحەنیفە هۆی واجب بوونی زەکاتەکە هاتنەدەرەوەی دانەوێڵەکە دەرکەوتنی میوەکەیە (دانەر).

**دانانی باشترین جۆر بۆ زەکات:**

خوای گەورە فەرمانی داوە بە زەکات دەران کە چاك ترین جۆری ماڵەکە بدەن بە زەکات، وە قەدەغەی کردووە کە جۆری خراپ بدرێ بە زەکات وە ئەفەرموویێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِن طَيِّبَـٰتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّآ أَخْرَجْنَا لَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ وَلَسْتُم بِـَٔاخِذِيهِ إِلَّآ أَن تُغْمِضُواْ فِيهِ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ حَمِيدٌ﴾ (البقرة: ٢٦٧). واتە: ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە لە باشترین وجوان ترین جۆر لەو شتانەی بە دەستی دەهێنن وە ئەو شتانەی خوا لە زەوی بۆی دەرکردوون بدەن بە زەکات، وە جۆری قەڵب وخراپەکەی مەدەن بە زەکات لە حاڵێکدا ئەگەر بە خۆتانی بدەن وەری ناگرن مەگەر چاوپۆشی بکەن لە خراپی‌یەکەی، وە بزانن کە خوا بێ نیازو ستایش کراوە.

ئەبوداود ونسائی وغەیری ئەوان ئەگێڕنەوە: لە سەهلی کوڕی حونەیفەوە لە باوکیەوە کە ووتویەتی: پێغەمبەر ﷺ دوو جۆر خورمای خراپی قەدەغە کردبوو کە بە زەکات بدرێ (جعرور) و (حبیق)، وە خەڵك ئەچوون میوە خراپەکانیان دا ئەنا بۆ زەکات، جا ئەوەیان لێ قەدەغە کرا، وە لەو بارەیەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿ولا تیمموا الخبیث منه تنفقون﴾ واتە: وە جۆری قەڵب وخراپەکەی مەدەن بە زەکات.

(براء) ئەڵێ: ئایەتی: ﴿وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ﴾ لە بارەی ئێمەی هۆزی ئەنصار هاتە خوارەوە، ئێمە خاوەن خورما بووین، هەر کەس بەپێی کەم و زۆری خورماکەی خورمای ئەهێنا بۆ زەکات، پیاوی وا هەبوو دوو هێشوی ئەهێنا، هەبوو یەك هێشو، هەڵی ئەواسی لە مزگەوتدا، لەبەرئەوەی ئەهلی صوففە خواردنیان نەبوو بیخۆن، جا کاتێك کەسێکیان برسی ببوایە ئەهاتە بەرهێشوەکە و دارێکی پێدا ئەکێشا، دەنکەکانی ئەکەوتە خوارەوە و ئەیخوارد، وە ئەو کەسانەی ئارەزوی خێرکردنیان نەبوو ئەچوون هێشوی خراپیان ئەهێنا هەڵیان ئەواسی هێشوی واهەبوو (شیص) و (حشف)ی کە دوو جۆرە خورمای خراپن تێدا بوو، وە هێشوی واهەبوو شکاو بوو بۆیە خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ وَلَسْتُم بِـَٔاخِذِيهِ إِلَّآ أَن تُغْمِضُواْ فِيهِ﴾ جا (براء) ئەفەرموێ: ئەگەر کەسێکتان لەوەی بدەنێ کە خۆی بەخشیویەتی وەری ناگرێت مەگەر بە شەرم و چاونوقانەوە. وە ئەفەرموێ: دوای ئەوە هەرکەس باشترین جۆرێ کە هەبوایە ئەوەی ئەهێنا، (ترمذي) گێڕاویەتی‌یەوەو فەرمویەتی: (حسن صحیح غریب).

شەوکانی ووتویەتی: ئەم حەدیسە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە نابێت خاوەن ماڵ دەست ببات لە خراپەکە زەکات دەربکات، نەك لە چاکەکەی کە زەکاتی تێدا پێویستە، ئەمەش بە دەق هاتووە لەم حەدیسەدا

دەربارەی خورما، وە هەموو جۆرەکانی تریش کە زەکاتیان تێدا پێویست بێت لەسەرئەمە قیاس ئەکرێن، وە هەروەها دروستیش نییە لەسەر زەکات وەرگر ئەو جۆرە خراپە وەربگرێت.

**زەکاتی هەنگوین:**

جەماوەری زانایان بۆ ئەوە چوون کە هەنگوین زەکاتی لەسەر نییە. بوخاری فەرمویەتی: دەربارەی زەکاتی هەنگوین هیچ حەدیسێکی صەحیح نەهاتووە[1].

---

(١) ئەم قسەیە بە گشتی وا نییە لەبەر ئەوەی چەند حەدیسێك لەوبارەیەوە هاتووە کە حەسەنترینیان حەدیسەکەی عەمری کوڕی شوعەیبە لە باوکیەوە لە باپیریەوە، وە صەحیحترین ڕێگاش ڕێگای عەمری کوڕی حاریسی میصرییە لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە... بەم زاراوەیە:

(هیلال کە یەکێك بوو لە هۆزی موتعان، زەکاتی چەند هەنگێکی هێنا بۆ پێغەمبەر ﷺ و داوای لە پێغەمبەر ﷺ کرد کە دۆڵێك هەیە بەناوی (سلبة) بۆی قەدەغە بکات لە خەلکی، پێغەمبەریش ﷺ ئەو دۆڵەی بۆ قەدەغە کرد، جا کاتێك عومەری کوڕی (خطاب) بوو بە جێنشین، سوفیانی کوڕی وەهەب (کەکاربەدەستی عومەر بوو) نامەی بۆ عومەر نووسی و لەو بارەوە پرسیاری لێکرد.

عومەریش بۆی نوسیەوە: ئەگەر ئەو زەکاتەی کە ئەیدا بە پێغەمبەر ﷺ بە تۆشی دا ئەوە ئەو دۆڵەی بۆ قەدەغە بکەرەوە، وە ئەگەر وای نەکرد ئەوە کۆمەڵە مێشێکن هەرکەس بۆی هەیە لێیان بخوات). ئەمەش ئیسنادەکەی (جید) ە و لە (الإرواء) یشدا بە ژمارە (٨١٠) تەخریج کراوە، هەروەها (حافظ) یش لە فەتحدا بە قەوی داناوە، و دوای ئەوە ئەفەرمووێت: سەنەدەکەی هەتا ئەگاتە سەر عەمر صەحیحە، وەرای هەڵبژێردراویش لەبارەی عەمرەوە ئەوەیە کە قەوی بێت، بەڵام ئەمە بە مەرجێك ئەبێت کە بەرهەڵستی و جیاوازی تێدا نەبێت، هەرچەندە ئەوەش بۆ سەر ئەوە حەمل ئەکرێت کە ئەو زەکات دانە لە موقابیلی پاراستنی ئەو زەویەدا بووە، هەروەك وەڵامی نامەکەی عومەری کوڕی (خطاب) بەڵگەیە لەسەری.

و لە پێش (حافظ) دا ئیبنو زەنجەویە لە (الأموال) دا (١٠٩٥-١٠٩٦) پاشان (خطابي) لە (معالم السنن) (١/٢٠٨) دا بۆ ئەوە چوون، و لەڕواڵەتیشدا هەروایە، ئیتر خوای گەورەش بۆ خۆی زاناترە.

وە لەبەر ووردی ئەم مەسەلەیە لە لایەنی فیقهی و حەدیسیەوە ڕای شەوکانی تێیدا تووشی تێکەڵ و پێکەڵی بووە، جا لە (نیل الأوطار) دا (٤/١٢٥) بۆ ئەوە چووە کە زەکات لە هەنگویندا واجب نییە، و هەموو حەدیسەکانیشی بە موعتەل داناوە.

بەڵام لە (الدرر البهية) دا دانی بە واجبیتیدا ناوە، و شیکەرەوەکەشی صدیق حسن خان بە شوێنیدا ڕۆیشتووە لە (الروضة الندية ١/٢٠٠) دا.

شەوکانی پاڵپشتی ئەم قسەیەی خۆی کردۆتەوە لە (السيل الجرار) دا (ل٤٦-٤٨) و فەرموویەتی: حەدیسەکانی ئەم بەشە بەکتر بەهێز ئەکەن.

شافیعی ووتویەتی: ئەوەی من هەڵم بژاردووە ئەوەیە كە هەنگوین زەكاتی لێدەرناكرێت، چونكە (أحادیث) و (آثار) سابتێ لەو شتانەدا كە زەكاتیان لێ دەرئەكرێت، وە لە هەنگوین دا سابت نی‌یە، كەواتە چاوپۆشی لێ كراوە.

(ابن منذر) ووتویەتی: دەربارەی پێویست بوونی زەكاتی هەنگوین نە خەبەرێكی ثابت، وە نە (إجماع) نەهاتووە، لەبەر ئەوە زەكاتی لێ دەرناكرێت. ئەمەش رای جەماوەرە.

بەڵام حەنەفی‌یەكان وئەحمەد بۆ ئەوە چوون كە هەنگوین زەكاتی تێدایە، هەر چەندە حەدیسی صەحیح نەهاتووە دەربارەی پێویست بوونی، بەڵام چەند ئەسەرێك هاتووە كە یەكتر بەهێز ئەكەن، چونكە لە شیلەی درەخت وگوڵ پەیدا ئەبێت، وە پێوانەش ئەكرێ و زەخیرە ئەكرێ، لەبەر ئەوە زەكاتی تێدا پێویستە، وەك دانەوێڵە و خورما، وە لەبەر ئەوەی لە كشتوكاڵ ومیوە كەمتریش خەرجی تێ ئەچێت.

ئەبوحەنیفە بۆ پێویست بوونی زەكاتی هەنگوین مەرجی ئەوەی داناوە كە ئەبێت لە زەوی دەیەكی دا پەروەردە كرابێت، بەڵام (نصاب) رادەی زەكاتی بۆ دانەناوە، وە ئەڵێت: لە زەوی دەیەكیدا لە كەم و زۆری وەرئەگیرێت.

بەڵام ئیمام ئەحمەد بە پێچەوانەی ئەوەیە و ئەفەرموێت: مەرجە ئەویش بگاتە (نصاب) رادەی زەكات، ئەویش دە (فرق)ە كە هەر فەرقێك ١٦رِتڵی عێراقی‌یە[1]، وە لای ئەو ئەو هەنگانە لە زەوی خەراجیدا بووبن یا لەو زەوی‌یانەدا بن كە دەیەكین یەكسانە.

وە ئەبویوسف ووتویەتی: رادەی زەكاتی هەنگوین دە رِتڵە.

وە محمد ووتویەتی: رادەی زەكاتی هەنگوین پێنج فەرقە، هەر فەرقێك= ٣٦رِتڵە.

---

جا ئاگای لەو جیاوازی‌یە نەبووەو ئاگای لە جیاوازی بەڵگەهێنانەوەكانیان نەبووە، چونكە ئەوڕێگا صەحیحە وەك ئەزانیت بەڵگەكەی بە قەدەغە كردنی ئەو دۆڵەوە بەستراوەتەوە -واتە بۆیە زەكاتی لێ سەنراوە لەبەر ئەوەی دۆڵەكەی بۆ قەدەغە كراوە لە خەڵكی- وە ریوایەتەكەی تر بە (مطلق)ی هاتووە، بەڵام زەعیفە، و بۆ بەڵگە هێنانەوە نابێت هەروەكو لە (النیل)دا بۆخۆی دانی بەوەدا ناوە، وە لە دواییدا لەو دوو سەرچاوەدا كە باس كران بۆخۆی ئەو بۆچوونەی داناوە و بە پێچەوانەی كردووە.

ئیتر قاعیدەی حەمل كردنی (موطلق) بۆ سەر موقەییەدی لەبیر چۆتەوە كە لە زۆر مەسەلەدا باسی دەكات، ئەو مەسەلانەی كە بەڵگەكانیان بەرابەری یەك ئەبنەوە، ئیتر بەو قاعیدەیە ئەو بەڵگانە یەك ئەخات.

جا بەوەوە بۆمان دەرئەكەوێت كە ئەو هەنگانەی ئەمڕۆ لە هەندێك كێڵگە و باغچەدا هەن زەكاتیان لەسەر نی‌یە، مەگەر ئەو زەكاتە (مطلق)ەی كە ئادەمیزاد بە خۆشی خۆی ئەیدات، هەر بەو شێوەیەی كە لەباسی كەلوپەلی بازرگانیدا باس كراوە، ئیتر خوای گەورەش بۆخۆی زاناترە. (تمام المنة).

(١) رتڵی عێراقی=١٣٠ درهەمە، ئەمەش(ظاهر)ی قسەی ئەحمەدە. (دانەر).

## زەکاتی ئاژەڵ

چەند حەدیسێکی صەحیح هاتووە دان بەوەدا ئەنێ کە زەکات پێویستە لە ووشتر و ڕەشەووڵاغ و مەڕ و بزن دا، وە نەتەوەی ئیسلامیش یەکن لەسەرکارکردن بەو حەدیسانە.

**وە چەند مەرجێك هەیە بۆ پێویست بوونی زەکات لە ئاژەڵدا کە ئەمانەن:**

١- بگاتە ڕادەی زەکات (نصاب).

٢-ساڵی بە سەردا تێ پەڕێت.

٣-خۆلەوەڕ بێت، واتە: بەشی زۆری ساڵ بۆ خۆی لە پوشی دەشتایی‌یەکان کە قەدەغە نی‌یە بلەوەڕێ[1].

جومهوری زانایان لەسەر ئەو مەرجەن وکەس جیاوازی نی‌یە لەسەری، جگە لە مالیك و (لیث) کە ئەڵێن: زەکات لەسەرئاژەڵ بە شێوەیەکی گشتی واجبە، چ خۆلەوەڕبێ یا ئالف پێدراوبێ یا بۆ بار و ئیش بێ، یان نە، بەڵام حەدیسەکان بە ئاشکرا ئەوە ئەگەیەنن کە خۆلەوەڕین، ئەمەش فائیدەی ئەوە ئەدا کە ئەو ئاژەڵانەی بە ئالف پێدان بەخێو ئەکرێن زەکاتیان لەسەر نی‌یە، چونکە قسە هەر ئەبێ فائیدەیەکی وەها بدا بە دەستەوە کە ئیحتیمالاتی خراپ ڕووی تێ نەکا.

(ابن عبدالبر) ووتویەتی: من نازانم لە زانایانی ووڵاتدا کەسێك هەبێت قسەکەی مالیك ولەیسیان کردبێت.

**زەکاتی ووشتر:**

ووشتر هەتا ژمارەی نەگاتە پێنج سەر هیچی زەکات لەسەرنابێت، ئەگەر گەیشتە پێنج سەر و خۆلەوەڕبوونو ساڵیان بە سەردا تێپەڕی، ئەوە یا کاوڕە مەڕێکی یەك ساڵە یا چوێشتیرکێکی دوو ساڵە زەکاتیان دەکەوێت، وە کاتێ گەیشتنە دە سەر دوو کاوڕی یەکساڵە یا دوو چوێشتیرکی دوو ساڵە، ئیتر بەو پێ‌یە هەر پێنج سەری زیاد کرد، کاوڕێك یا چوێشتیرکێك زیاد ئەکات. وە ئەگەر گەیشتنە بیستو پێنج ئەوە مێ‌یە ووشترێکی ئەکەوێت کە ساڵێکی تەواو کردبێو پێی نابێتە دووەم ساڵەوە (کە پێی ئەوترێ بنت مخاض)، یان نێرە ووشترێکی ئەکەوێت کە دوو ساڵی تەواو کردبێ وپێی نابێتە سێ‌یەمەوە (کە پێی ئەوترێ

(١) ئەمە ڕەئی ئەبوحەنیفە و ئەحمەدە، وە ڕەئی شافیعی ئەوەیە: ئەگەر بەشی کەمتری ساڵەکە ئالفی پێ ئەدرا ئەوە لەم حاڵەتەدا سەیری ئەو ئالفە ئەکەیت، ئەگەر ئەو ئالفە ئەندازەیەکی وەها بێ لەو ماوەیەدا نەشێخوا زەرەرێکی ئاشکرای توش نەبێ ئەوە زەکاتی تێدا واجبە، بەڵام ئەگەر لەو ماوەیەدا بە بێ ئەو ئالفە نەی ئەتوانی بژی، وە ئەگەر بشژی زەرەرێکی ئاشکرای توش ببێت، ئەوە زەکاتی تێدا واجب نی‌یە، وە ئاژەڵیش تەنها دوو ڕۆژ بە بێ ئالف ئەتوانێ بژی کە زیاتر بوو ناتوانێ. (دانەر).

ابن لبون)، وە ئەگەر گەیشتە سی‌وشەش سەر، ئەوە مێیە ووشترێکی ئەکەوێت کە دوو ساڵی تەواو کردبێ وپێی نابێتە سێیەمەوە (کە پێی ئەوترێ ابنة لبون).

وە ئەگەر گەیشتە چل وشەش سەر ئەوە مێیە ووشترێکی ئەکەوێت کە سێ ساڵی تەواو کردبێو پێی نابێتە چوارەمەوە (کە پێی ئەوترێ حقة).

وە لە شەصت ویەك سەردا ئەوە مێیە ووشترێکی ئەکەوێت کە چوار ساڵی تەواو کردبێ و کەوتبێتە پێنجەمەوە(کە پێی ئەوترێ جذعة).

وە لە حەفتاوشەش سەر دوو (ابنة لبون)ی ئەکەوێت.

وە لە نەوەدویەك سەر هەتا صەدوبیست سەر دوو (حقة)ی ئەکەوێ.

وە ئەگەر لەوە زیادی کرد لە هەر چل سەر (ابنة لبون)ێکی ئەکەوێت، وە لە هەر پەنجا سەر(حقة)ێکی ئەکەوێ

وە بۆ زیادتر تێ گەیشتن لەم باسە تماشای ئەم جەدوەلەی خوارەوە بکە:

| ڕادەی زەکاتی ووشتر | | ئەو ئەندازەیەی کە واجبە بدرێت |
|---|---|---|
| لە | تا | |
| ٥ | ٩ | یاکاوڕێکی یەك ساڵە یاچوێشتیرێکی دووساڵە |
| ١٠ | ١٤ | یا دووکاوڕی یەك ساڵە یا دووچوێشتیری دووساڵە |
| ١٥ | ١٩ | یاسێ کاوڕی یەك ساڵە یاسێ چوێشتیری دوو ساڵە |
| ٢٠ | ٢٤ | یاچوارکاوڕی یەك ساڵە یا چوار چوێشتیری دوو ساڵە |
| ٢٥ | ٣٥ | ١ (بنت مخاض) |
| ٣٦ | ٤٥ | ١ (ابنة لبون) |
| ٤٦ | ٦٠ | ١ (حقة) |
| ٦١ | ٧٥ | ١ (جذعة) |
| ٧٦ | ٩٠ | ٢ (ابنة لبون) |
| ٩١ | ١٢٠ | ٢ (حقة) |
| ١٢١ | ١٢٩ | ٣ (ابنة لبون) |
| ١٣٠ | ١٣٩ | ١ (حقة) +٢ (ابنة لبون) |

| | | |
|---|---|---|
| ١٤٠ | ١٤٩ | ٢ (حقة) +١ (ابنة لبون) |
| ١٥٠ | ١٥٩ | ٣ (حقة) |
| ١٦٠ | ١٦٩ | ٤ (ابنة لبون) |
| ١٧٠ | ١٧٩ | ٣ (ابنة لبون) +١ (حقة) |
| ١٨٠ | ١٨٩ | ٢ (ابنة لبون) +٢ (حقة) |
| ١٩٠ | ١٩٩ | ٣ (حقة) +١ (ابنة لبون) |
| ٢٠٠ | ٢٠٩ | ٤ (حقة) يان (ابنة لبون) |

بەڵام ئەگەر تەمەنی ئەو وشترانەی کە واجبە بدرێت بە پێی (نص) جۆراوجۆر بوو، لەم حاڵەتەدا بەم شێوەیەی خوارەوە کار ئەکرێ:

ئەگەر کەسێك وشترەکانی گەیشتە ئەو ئەندازەیەی کە ئەبێ(جذعة)ی لەسەر بدات، بەڵام ئەی بوو، بەڵکو (حقة)ی هەبوو، ئەوە (حقة)ی لێ وەرئەگیرێت، وە ئەگەر بۆی کرا لەگەڵیا بیست دیرهەم بدات، یا دوو کاوڕی یەك ساڵە یا دوو چوێشتیری دوو ساڵە.

وە ئەگەر وشترەکانی گەیشتنە ئەو ئەندازەیەی کە ئەبێ (حقة)ی لەسەر بدات بەڵام نەیبوو بەڵکو (ابنة لبون)ی هەبوو، ئەوە(إبنةلبون)ی لێ وەرئەگیرێ، وە ئەگەر بۆی کرا لە گەڵیا دوو کاوڕی یەك ساڵە یا دوو چوێشتیرکی دوو ساڵە بدات، یا بیست دیرهەم.

وە ئەگەر وشترەکانی گەیشتنە ئەو ئەندازەی کە ئەبێ (ابنة لبون)ی لەسەر بدات، بەڵام تەنها (حقە)ی هەبوو، ئەوە (حقة)ی لێ وەرئەگیرێ، وە ئەبێ زەکات وەرگرەکە بیست درهەمی بداتێ، یا دوو کاوڕی یەك ساڵە یا دوو چوێشتیرکی دوو ساڵە.

وە ئەگەر وشترەکانی گەیشتنە ئەو ئەندازەیەی کە ئەبێ (إبنة لبون) ی لەسەر بدات، بەڵام (بنت مخاض)ی هەبوو، ئەوە (بنت مخاض) بدات، ئەگەر بۆی کرا لەگەڵیا دوو کاوڕی یەك ساڵە یا دوو چوێشتیرکی دوو ساڵە بدات،یا بیست دیرهەم.

وە ئەگەر وشترەکانی گەیشتنە ئەو ئەندازەیەی کە ئەبێ (بنت مخاض)ی لەسەر بدات، بەڵام تەنها (ابن لبون)ی هەبوو، ئەوە لێی وەرئەگیرێ بە بێ هیچ شتێکی تر لەگەڵیا.

وە ئەگەر کەسێك ئەندازەی ووشترەکانی تەنها چوار سەر بوو، ئەوە هیچ زەکاتی لەسەر نی‌یە مەگەر بۆ خۆی پێی خۆش بێ[1].

ئەوەی باسمان کرد زەکاتی ووشترە، کە ئەبوبەکر ﷺ ئیشی پێ کردووە بە ئامادە بوونی صەحابە و کەسێك لاری لێی نەبووە.

لە زوهری‌یەوە هاتوە لە سالمەوە لە باوکیەوە کە پێغەمبەر ﷺ زەکاتی نووسی بوو، بەڵام نەی ناردبوو بۆ کارمەندەکانی هەتا وەفاتی کرد، پاشان ئەبوبەکر ﷺ دەری هێنا و لەسەری ڕۆیشت هەتا وەفاتی کرد، لە دوای ئەو عمر ﷺ لەسەری ڕۆیشت، ووتی: بەڕاستی ئەو ڕۆژەی عمر ﷺ مرد ئەوەش لەگەڵ وەسیەتەکەیدا بوو کە کردبووی.

## زەکاتی ڕەشە ووڵاغ[2]:

هەتا ژمارەیان نەگاتە سی سەری خۆلەوەڕ و ساڵی بە سەردا تێ نە پەڕی بێت هیچی لەسەر نی‌یە.

جا کاتێ گەیشتە سی سەری خۆلەوەڕ و ساڵی بە سەردا تێ پەڕی، گوێرەکەیەکی یەك ساڵەی نێر یا مێی ئەکەوێت، ئیتر لەوە زیاتری لەسەر نابێت هەتا نەگاتە چل سەر، جا کاتێ گەیشتە چل سەر نوێنگینێکی دوو ساڵی ئەکەوێت، وە لەوە زیاتری لەسەر نابێت هەتا نەگاتە شەست سەر،کاتێ گەیشتە شەست سەر دوو گوێرەکەی یەك ساڵەی ئەکەوێت.

وە لە حەفتا سەر نوێنگینێکی دوو ساڵە و گوێرەکەیەکی یەك ساڵە.

وە لە هەشتا سەر دوو نوێنگینی دوو ساڵە.

وە لە نەوەد سەر سێ گوێرەکەی یەك ساڵە.

وە لە سەد سەر نوێنگینێکی دوو ساڵە و دوو گوێرەکەی یەك ساڵە.

وە لە سەد و دە سەر دوو نوێنگینێکی دوو ساڵە و گوێرەکەیەکی یەك ساڵە.

وە لە سەد و بیست سەر سێ نوێنگینی دوو ساڵە یا چوار گوێرەکەی یەك ساڵە، ئیتر بەو پێیە هەرچی زیادی کرد، لە سی سەر،گوێرەکەیەکی یەك ساڵەی هەیە، ولە چل سەر نوێنگینێکی دوو ساڵە.

بۆ زیاتر تێ گەیشتن تەماشای ئەم جەدوەلەی خوارەوە بکە:

(١) شەوکانی ئەڵێت: ئەمە و وێنەی ئەمە دەلالەت ئەکا لەسەر ئەوەی زەکات لە عەینی ئەو شتەدا واجبە، نەك لە قیمەتەکەیدا، وە ئەگەر زەکات لە قیمەتەکەیدا واجب بووایە مەعنای وایە باس کردنی ئەو دەستوراتە بێ هوودەیە، چونکی قیمەت بە پێی زروف و شوێن گۆڕانکاری بە سەردا دێت (دانەر).

(٢) ڕەشەووڵاغ مانگا و گامێش ئەگرێتەوە (دانەر).

| ڕادەی زەكاتی ڕەشەوڵاغ | | ئەو ئەندازەیەی كە واجبە بدرێت |
|---|---|---|
| لە | تا | |
| ٣٠ | ٣٩ | گوێرەكەیەكی یەك ساڵە نێر یا مێ |
| ٤٠ | ٥٩ | نوێنگینێكی دوو ساڵە |
| ٦٠ | ٦٩ | دوو گوێرەكەی یەك ساڵە |
| ٧٠ | ٧٩ | نوێنگینێكی دوو ساڵە و گوێرەكەیەكی یەك ساڵە |
| ٨٠ | ٨٩ | دوو نوێنگینی دوو ساڵە |
| ٩٠ | ٩٩ | سێ گوێرەكەی یەك ساڵە |
| ١٠٠ | ١٠٩ | نوێنگینێكی دوو ساڵە و دوو گوێرەكەی یەك ساڵە |
| ١١٠ | ١١٩ | دوو نوێنگینی دوو ساڵە و گوێرەكەیەكی یەك ساڵە |
| ١٢٠ | ١٢٩ | سێ نوێنگینی دوو ساڵە، یان چوار گوێرەكەی یەك ساڵە |

**زەكاتی مەڕوبزن:**

مەڕ و بزن هەتا نەگاتە چل سەر هیچیان لەسەر نابێت،جا كاتێ گەیشتنە چل سەری خۆلەوەڕە وە ساڵێكی بەسەردا تێ پەڕی، ئەوە كاوڕێكی یەك ساڵە یا چوێشتیرێكی دوو ساڵەی دەكەوێت هەتا سەد و بیست سەر.

كاتێ گەیشتە سەد و بیست ویەك سەر دوو كاوڕی یەك ساڵە یا دوو چوێشتیری دوو ساڵەی ئەكەوێت هەتا دوو سەد سەر.

كاتێ گەیشتە دوو سەد و یەك سەر، سێ كاوڕیان ئەكەوێت هەتا سێ سەد سەر.

وە ئەگەر لە سێ سەد سەر زیاتر بوو، هەر لە سەد سەر كاوڕێك یا چوێشتیرێكیان زەكات لێ دەكەوێت.

لە مەڕدا، كاوڕی یەك ساڵە وەرئەگیرێ و لە بزن چوێشتیری دوو ساڵە.

بە ئیجماعی زانایان دروستە نێرە دەربكرێت بۆ زەكات ئەگەر هەموویان نێر بوون، وە ئەگەر هەموویان مێ بوون یا نێر و مێ تێكەڵ بوون ئەوە لای حەنەفی یەكان دروستە نێر دابنرێت بۆ زەكات، بەڵام لای غەیری حەنەفی‌یەكان ئەبێ هەر مێ بێت.

بۆ زیاتر تێ گەیشتن سەیری ئەم جەدوەلەی خوارەوە بکە:

| ڕادەی زەکاتی مەڕ و بزن | | ئەو ئەندازەیەی کە واجیبە بدرێ |
|---|---|---|
| لە | تا | |
| ١ | ٣٩ | هیچ زەکاتی نییە |
| ٤٠ | ١٢٠ | کاوڕێکی یەك ساڵە یا چوێشتیرێکی دوو ساڵە |
| ١٢١ | ٢٠٠ | دوو کاوڕ یا دوو چوێشتیرك |
| ٢٠١ | ٣٩٩ | سێ کاوڕ یا سێ چوێشتیرك |
| ٤٠٠ | ٤٩٩ | چوار کاوڕ یا چوار چوێشتیرك |
| ٥٠٠ | ٥٩٩ | پێنج کاوڕ یا پێنج چوێشتیرك |

**حوکمی ئەو زیادانەی لە نێوان دوو فەرزە زەکاتدا هەیە (الأوقاص):**

(الأوقاص) کۆی (وقص)ە ئەویش ئەوانەن کە لە نێوان دوو فەرزە زەکاتدا هەن،(بۆ نموونە: وەك ئەو مەڕانەی لە نێوان(٤٠) و (١٢٠)دا هەیە)، بە ڕای زانایان ئەوانە عەفون و زەکاتیان لەسەر نییە. چونکە سابت بووە لە حەدیسی پێغەمبەر ﷺ کە دەربارەی زەکاتی ووشتر ئەفەرمووێ: (کاتێ ووشترەکان گەیشتنە بیست وپێنج سەر) ئەوە (بنت مخاض)ێکی مێی ئەکەوێت، وە ئەگەر گەیشتنە سی وشەش سەر هەتا چل وپێنج سەر (ابنة لبون)ێکی مێی ئەکەوێت).

وە دەربارەی زەکاتی ڕەشەووڵاغ ئەفەرمووێت:(کاتێ گەیشتە سی سەر گوێرەکەیەکی یەك ساڵە (نێر یا مێ)، وە کاتێ گەیشتە چل سەر نوێنگینێکی دو ساڵە).

وە دەربارەی زەکاتی مەڕ و بزن ئەفەرموێت:(لە مەڕ و بزنی خۆلەوەڕدا ئەگەر گەیشتنە چل سەر کاوڕێك یا چوێشتیرێکی تێدایە هەتا ئەگەنە سەد و بیست سەر).

جا لە ووشتردا ئەوانەی لەنێوان بیستوپێنج وسیوشەش دان پێیان ئەڵێن: (وقص) و زەکاتیان لەسەر نییە، وە لە ڕەشەووڵاغدا نێوان سیوچل (وقص)ە، وە هەر بەوپێیەیە لە مەڕ و بزنیشدا.

**ئەوانەی بە زەکات وەر ناگیرێن:**

پێویستە زەکات وەرگر ئاگای لە خاوەن ماڵەکە بێت، کاتی دەرکردنی زەکات نابێ باشترینیان هەڵبژێرێ بۆ زەکات، مەگەر خاوەن ماڵەکە خۆی ڕازی بێت بەوە، وە هەروەها نەبێ ئاگاداری مافی هەژارانیش بکرێت، نابێت ئاژەڵی عەیب دار وەربگیرێت، عەیبێك کە بە کەم وکوڕی دابنرێت لە لای شارەزا بە سەر ئاژەڵدا، مەگەر هەموو ماڵەکە عەیب دار بێ، چونکە زەکات لە مام ناوەندی ماڵ ئەگیرێت.

١- لە نامەکەی ئەبوبەکردا ﷺ هاتووە: کە(پیری دان کەوتو وکوێر و سابرین وەرمەگرە).

٢- لە سوفیانی کوڕی عبداللە ی سەقەفیەوە هاتووە کە عمر ﷺ قەدەغەی کردبوو زەکات وەرگر نەزۆك و ئەو ئاژەڵانەی لە ماڵدا بۆ شیر بەخێو دەکرێن، وئاژەڵی ئاوس و لە مەڕ و بزندا، و نێرەیەك کە بۆ سواربوونی مێیە ڕاگیراوە، وەربگیردرێت.

٣- لە عبداللە ی کوڕی موعاویەی (غاضري)یەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (ثَلاثٌ مَن فَعَلَهُنَّ فَقَد طَعِمَ طَعمَ الإيمَانِ: مَن عَبَدَ اللهَ وَحدَهُ، وأن لا إلَهَ إلا هُوَ، وَأعطَي زَكَاةَ مَالِه، طَيِّبَةً بِهَا نَفسُهُ، رَافِدَةً عَلَيهِ كُلَّ عامٍ، وَلا يُعطِي الهَرِمَةَ، وَلا الدَّرِنَةَ، وَلا المَرِيضَةَ، وَلا الشُّرطَ، وَلا اللَّئِيمَةَ، وَلَكِن مِن وَسَطِ أموَالِكُم، فَإنَّ اللهَ لَم يَسألكُم خَيرَهُ، وَلَم يَأمُركُم بِشَرِّهِ) (رواه أبوداود والطبراني بسندٍ جيد). واتە: سێ شت هەرکەس بیان کات تامی ئیمانی چێشتووە: کەسێك بە تەنها خوا بپەرستێت، وە شاهیدی بدات جگە لە ئەو هیچ پەرستراوی بە حەقی تر نیە، وە زەکاتی ماڵەکەی بە دڵێکی فراوانەوە بدات، و هەموو ساڵێ یارمەتی بەخشینەکەی بدا، وە ئاژەڵی پیر و گرۆڵ و نەخۆش و هیچ و پوچ و شیرنەدەر نەدات بە زەکات، بەڵکو مام ناوەندی ماڵەکانتان بدەن، چونکە خوای گەورە فەرمانی پێ نەداون کە چاکترینی ماڵەکەتان بدەن بە زەکات، وفەرمانیشی پێ نەکردون کە خراپ ترین بدەن.

**زەکاتی ئاژەڵەکانی تر جگە لە ووشتر و ڕەشەووڵاغ و مەڕ و بزن:**

ئاژەڵ جگە لە ووشتر و ڕەشەوڵاغ و مەڕ و بزن زەکاتیان لەسەر نیە.

جا ئەسپ و هێستر و گوێ درێژ زەکاتیان لەسەر نیە، مەگەر بۆ بازرگانی بن، لە عەلیەوە ﷺ هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (قَد عَفَوتُ لَكُم عَنِ الخَيلِ وَالرَّقِيقِ، وَلا صَدَقَةَ فِيهِمَا) (رواه أحمد وأبوداود بسندٍ جيد) واتە: بۆ ئێوە چاوپۆشیم کرد لە زەکاتی ئەسپ وبەندەدا، وە ئەو دووانە زەکاتیان تێدا نیە.

وە لە ئەبوهورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێ کرا ئایا گوێ درێژ زەکاتی لێ ئەدرێ؟ فەرمووی: (مَا جَاءَ فِيهَا شَيءٌ إلا هَذِهِ الآيَةَ الفَاذَّةَ ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ۝ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ﴾ (رواه أحمد). واتە: هیچ ئایەتێك لەو بارەوە نەهاتووە بێجگە لەم ئایەتە نەبێ کە تاکە لە ماناکەیدا: ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ۝ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ﴾ (الزلزلة/٧-٨). واتە: هەر کەسێك مسقاڵە زەڕڕەیەك خێر بکا پاداشتەکەی ئەبینێ - لە ڕۆژی دواییدا -، وە هەرکەسێك مسقاڵە زەڕڕەیەك شەڕ بکا سزاکەی ئەبینێ.

وە هەموو ئەم باسەمان لە پێشەوە باس کرد.

لە (حارثة)ی کوڕی (مُضَرِّب)ەوە هاتووە ووتویەتی: لەگەڵ عمردا ﷺ حەجم کرد، پیاو ماقوڵانی شام هاتن بۆ لای و پێیان ووت: ئەی (أمير المؤمنين) ئێمە خاوەن بەندە و وڵاغین، لە ماڵەکانمان صەدەقەیەك وەربگرە بۆ ئەوەی پاکمان بکەیتەوە پێی، وە بۆ ئەوەی ببێتە زەکات بۆمان، عمر ﷺ فەرمووی: ئەمە شتێکە کە دوو کەسەکەی پێش من نەیان کردووە (مەبەستی پێغەمبەر ﷺ و ئەبوبەکرە)، بەڵام چاوەڕوان بن تا پرسیار لە موسوڵمانان ئەکەم. (ئەمە (هیثمي) هێناویەتی و ووتویەتی: ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە، هەروەها (طبراني)یش لە(الكبير)دا، وە پیاوەکانی سیقەن).

وە هەروەها زوهریش لە سەلمانی کوڕی یەسارەوە ڕیوایەتی کردووە کە خەڵکی شام بە ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕڕاحیان ووت: لە ئەسپ و بەندەکانمان زەکات وەربگرە، ئەویش وەری نەگرت، پاشان نووسی بۆ عمر ﷺ ئەویش ڕازی نەبوو، دووبارە داوایان لێ کردەوە، ئەویش نامەی نووسیەوە بۆ عمر ﷺ، عمریش بۆی نووسی: ئەگەر خۆیان حەزئەکەن لێیان بگرە و بیدەرەوە بە هەژارەکانیان، وە خواردن بدە بە بەندەکانیان. (مالیك و بەیهەقی گێڕاویانەتەوە).

**زەکاتی ئەو گوێرەکە و کاژیلە و بەرخۆلانەی کەساڵێکیان تەواو نەکردووە:**

هەرکەس ووشتر و ڕەشەوڵاغ و مەڕ و بزنی گەیشتە ڕادەی زەکات، وە لە ماوەی ئەو ساڵەدا زان، ئەوە زەکاتی هەموویان پێویستە دەربکرێ کاتی ساڵ تەواو بوون بە سەرگەورەکاندا، وە زەکاتی گەورەکانی و بێچووەکانی وەرئەگیرێ بەبێ ئەوەی بێچووەکانیان لێ جیا بکرێتەوە، ئەمەش بۆچوونی بەشی زۆری زانایانە.

بەپێی ئەوەی مالیك و شافیعی ئەگێڕنەوە لە سوفیانی کوڕی عبداللهی سەقەفیەوە کە ووتویەتی: عمری کوڕی (خطاب) ﷺ ئەی فەرموو: کاژیلەو بەرخۆلە ساڵیان لەسەر بژمێرن ئەوانەی کە هێشتا بە دەست شوانەکانەوەن، بەڵام خۆیان لە جیاتی زەکات وەریان مەگرن، وە ئەو مەڕ و بزنانەی کە نەزۆکن و ئەوانەی لە ماڵا بۆ شیر ڕائەگیرێن و ئەوانەی ئاوسن و نێرەی مەڕ و بزن کە بۆ سواربوونی مێیە ڕاگیراون هیچ کام لەوانە وەرمەگرن، بەڵکو کاوڕە مێ و چوێشتێکە مێ وەربگرن، کە ئەمەش مام ناوەندیە لە بەینی چاك وخراپی ماڵەکەدا.

ئەبوحەنیفە و شافیعی و (أبو ثور) ڕایان وایە: کە بێچو حیسابی بۆ ناکرێت ئیللا مەگەر گەورەکان بگەنە (نصاب). وە دووبارە ئەبوحەنیفە ووتویەتی: بێچووەکان ئەخرێنە سەر (نصاب)و بە تەواوبوونی ساڵ بە سەرگەورەکاندا زەکاتیان لێ ئەدرێ، جا ئەو بێچوانە چ لە عەینی ئەو گەورانە لە دایك بووبێتن یا کڕابن.

وە شافیعی بە مەرجی داناوە کە ئەبێ ئەو بێچوانە لە کۆمەڵە ئاژەڵێك لە دایك بووبێتن کە گەیشتبنە (نصاب) لە ناو ملکی خاوەنەکەیدا و پێش ئەوەی ساڵەکە تەواو بێت لە دایك بووبێتن، بەڵام ئەگەر کەسێك

خاوەنی (نصاب)ێك بێت كە لە بێچوو پێك هاتبێت، ئەوە زەكات لەو بێچوانە ناكەوێت لە لای ئەبوحەنیفەو محمد و داودو شەعبیو ڕیوایەتێك لە ئەحمەد. بە پێی ئەوەی ئەحمەد و ئەبوداود و نەسائیو (دارقطني)و بەیهەقی ئەگێڕنەوە لە سوەیدی كوڕی غەفەلەوە كە ووتویەتی: زەكات كۆكەرەوەكەی پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لامان گوێم لێ بوو ئەی فەرموو: (لە پەیمانماندایە كە لە ئاژەڵی شیرە خۆر زەكات وەرنەگرین) بەڵام ئەم حەدیسە لە سەنەدەكەی دا هیلالی كوڕی حوباب هەیە، هەرچەندە چەند كەسێك ئەڵێن: سیقەیە، بەڵام هەندێكیان قسەی لەسەر ئەكەن.

وە لە لای مالیك و ڕیوایەتێكی ئەحمەد هاتووە: زەكات لەسەر بێچوش پێویستە، وەك گەورەكان. چونكە بێچو لە گەڵ گەورەدا حیساب ئەكرێت بۆ زەكات،كەواتە ئەگەر بە تەنهاش بێت ئەبێ حیساب بكرێ.

وە لای شافیعی و ئەبویوسف: بێچوەكان كاتێ گەیشتنە ڕادەی زەكات بێچوێك پێویستە بدرێت

**ئەو حەدیسانەی كە لە بارەی خستنە سەر یەك و جیاكردنەوەوە هاتووە:**

١- لە سوەیدی كوڕی غەفەلەوە هاتووە كە ووتویەتی: زەكات كۆكەرەوەی پێغەمبەر ﷺ هاتە ناومان گوێم لێ بوو ئەیفەرمو: (ئێمە زەكات لە ئاژەڵی شیرەخۆر وەرناگرین، وە ئەوانەی بە سەر یەكەوەن جیایان ناكەینەوە، وە ئەوانەی جیان، نایان خەینە سەر یەك)پیاوێك ووشترێكی تەپڵە پشت ئەستوری هێنا وەری نەگرت -چونكە چاكترینی ئاژەڵەكان بوو- (ئەحمەد و ئەبوداود و نەسائی گێڕاویانەتەوە).

٢- ئەنەس ئەگێڕێتەوە كە ئەبوبەكر ﷺ بۆی نوسیوە: (ئەمە ئەو زەكاتە فەرزەیە كە پێغەمبەر ﷺ فەرزی كردووە لەسەر موسوڵمانان) وە لە نامەكەیدا نوسرابوو (جیاكراوەكان نابێ بخرێنە سەر یەك، وە كۆكراوەكان نابێ لە یەك جیابكرێنەوە، لە ترسی زەكات، وە دوو بەشیش كە تێكەڵاوی یەكتر كرابوون خاوەنەكەیان لە بەینی خۆیاندا زەكاتەكە ئەكەن بە دوو بەشەوە) (رواه البخاري)[1].

هەروەها (مالك) لە (الموطاء) دا لە بارەی ئەم قسەیەی ئەبوبەكرەوە ﷺ ئەفەرمووێ: مەعنای ئەمە ئەوەیە سێ نەفەر هەر یەك لەوان چل سەر مەڕ و بزنی هەبێ كە زەكاتی تێدا واجبە، جا ئەم سیانە هەموو مەڕ و بزنەكانیان تێكەڵاو یەكتر بكەن، لەبەر خاتری ئەوەی لەسەر هەموویان زەكاتی كاوڕێك یا

(١) (خطابي) لە بارەی مەعنای جوملەی ئەخیری ئەم قسەوە ئەڵێ: مەعناكەی ئەوەیە بۆ نموونە دوو نەفەر بە شەریكی چل سەر مەڕ و بزنیان هەیە، یەكی بیست سەر، وە هەر كام لەوان عەینی مەڕ و بزنەكانی خۆی ئەناسێ، جا زەكات وەرگر كاوڕێك یا چوێشتێرێك لە بەشی یەكێكیان وەرئەگرێ، وە ئەوەی تریان قیمەتی نیوە كاوڕ یا چوێشتركێك ئەداتەوە بە شەریكەكەی. (دانەر).

چوێشتیرێك بکەوێت[1]، یان دوو شەریك دوو سەد سەر مەڕ و بزنیان هەیە کە زەکاتەکەیان سێ کاوڕە یا سێ چوێشتیرە، جا مەڕ و بزنەکان لە یەکتر جیا بکەنەوە لەبەر خاتری ئەوەی یەکی یەك کاوڕ یا یەك چوێشتیر بدا[2].

شافیعی ئەڵێت: ئەوە (واتە: ئەو ئەسەرەی ئەبوبەکر) قسەیەکە ڕووی دەمی لە خاوەن ماڵە لە لایەکەوە، وە لە کۆکەرەوەی زەکاتە لە لایەکی ترەوە، کە فەرمان بە هەرکام لەو دووانە ئەکات کە نە کۆکردنەوە بکەن و نە جیا کردنەوە لە ترسی زەکات. جا خاوەن ماڵ بترسێ لەوەی کە زەکاتەکە زۆر بێ، لەبەر خاتری ئەوە ئاژەڵەکان کۆبکاتەوە، یان جیایان بکاتەوە تاوەکو زەکاتەکەی کەم بێ، وە زەکات کۆکەرەوەش لە ترسی ئەوەی کە زەکاتەکە کەم بێ ئاژەڵەکان کۆبکاتەوە یان جیایان بکاتەوە تاوەکوو زەکاتەکەی زۆربێ[3].

جا مەعنای قسەکەی کە ئەفەرموێ: (لە ترسی زەکات). یەعنی لە ترسی ئەوەی کە زۆر بێ یا کەم بێ، وە لەبەر ئەوەی بۆ هەر دوو لایەنەکە ئیحتیمالی هەیە، دانانی لەسەر لایەنێکیان لەپێشتر نییە بەسەر ئەوەی تریاندا، هەر بۆیە حەمل کرایە سەر هەر دوو لایەنەکە پێکەوە.

لە لای حەنەفییەکان: ڕووی دەمی ئەو قسەیە لە زەکات کۆکەرەوەکانە، کە نابێ ماڵی تەنها کەسێك جیا بکەنەوە، بە شێوەیەك زەکاتی پێ زۆر بێت لەسەر شانی ئەو کەسە، وەك ئەوەی کابرایەك سەد و بیست سەر مەڕ و بزنی هەبێت، جا زەکات وەرگرەکە بیکات بە سێ چل سەرییەوە، بۆ ئەوەی سێ سەر وەربگرێ، یا بێت ماڵی کەسێك وکەسێکی تر تێکەڵ بکات، تێکەڵ کردنێك ببێتە هۆی پێویست بوونی زەکاتی زۆر، وە وەك ئەوەی تەنها کابرایەك سەدویەك سەری مەڕ و بزن هەبێت و کەسێکی تریش هەر ئەوەندەی هەبێت، جا زەکات کۆکەرەوە تێکەڵیان بکات بۆ ئەوەی سێ سەر زەکاتی لێ وەربگرێت، لە پاش ئەوەی کە واجبەکەی تەنها دوو سەرە.

---

(١) ئەمە نموونەی کۆکردنەوەی ئەوانەن کە لە یەك جیان (دانەر).

(٢) ئەمەش نموونەی جیاکردنەوەی ئەوانەن کە بە سەر یەکەوەن (دانەر).

(٣) نموونەی ئەمەش ئەوەیە: دوو شەریك هەرکام لەوان چل سەر مەڕ و بزنی هەبێ، جا زەکات کۆکەرەوە مەڕ و بزنەکان لە یەك جیابکاتەوە بۆ ئەوەی لەو دووانە دوو سەر وەربگرێ، لە حاڵێکدا کە هەر یەك سەری زەکات ئەکەوێ، یان نەفەرێك بیست سەری مەڕ و بزن هەبێ و نەفەرێکی تریش بە هەمان شێوە، جا زەکات کۆکەرەوە ئەم دوو کۆمەڵە مەڕ و بزنانە تێکەڵ یەکتر بکا بۆ ئەوەی یەك سەری زەکات لێ بکەوێ، لە حاڵێکدا کە هیچ کامیان زەکاتیان لەسەر نییە (دانەر).

**ئایا تێکەڵ کردن تەئسیری هەیە؟**

حەنەفیەکان بۆ ئەوە چوون کە تێکەڵ کردن هیچ تەئسیر ناکاتە سەر زەکات، جا ئەو تێکەڵ بوونە (شیوع)[1] بێت، یان تێکەڵ بوونی(جوار)[2] بێت.

جا زەکات لەسەر ماڵی موشتەرەك واجب نابێت هەتا بەشی هەریەکەیان بە تەنها نەگاتە ڕادەی زەکات (نصاب)، چونکە ئەصلی (ثابت) کە ئیجماعی لەسەر کراوە ئەوەیە زەکات تەنها بە موڵکی یەك نەفەرە ئیعتیباری هەیە.

مالیکیەکان ئەڵێن: کەسانێك کە تێکەڵ کەری کۆمەڵێك ئاژەڵن حیسابی یەك خاوەنیان بۆ ئەکرێت، وە ئەو تێکەڵ کردنە، هیچ تەئسیری نیە، مەگەر هەر یەکێك لە تێکەڵ کەرەکان خاوەنی(نصاب)ی خۆی بێ، بە مەرجێك یەك بن لە شواندا و لەو ئاژەڵە نێرەی کە بۆ جوت بوونی مێیە ئامادە کراوە، و لە شوێنی حەوانەوەی ئاژەڵەکاندا، و نیەتی تێکەڵاویش هەبێت، وە هەروەها مەرجیشە ماڵی هەریەکەیان جیا بێت و دیاری بێت لەوەی تریان، وە ئەگەر ئەم مەرجانە نەبن بە شەریك حیساب ئەکرێن، هەروەها بە مەرجیش کراوە کە هەرکام لەوان ئەهلی زەکات بێت. وە تێکەڵ کردن تەنها لە ئاژەڵدا تەئسیری هەیە لە لایەنی حوکمی زەکاتەوە. وە هەر زەکاتێك لەو ماڵە وەربگیرێت بەسەر شەریکەکاندا دابەش ئەکرێت، هەرکەسە و بە پێی بەشی خۆی، وە ئەگەر یەکێك لە شەریکەکان ماڵێکی هەبوو تێکەڵاوی نەکردبوو ئەو ماڵەش هەر حوکمی تێکەڵاو کراوی هەیە.

لە لای شافیعیەکان: هەر دوو جورە تێکەڵ بوونەکە -تێکەڵ بوونی (شیوع) و (جوار)- تەئسیری هەیە لە زەکاتدا، وە ماڵی ئەو دوو کەسە یا ئەو دوو کۆمەڵە کەسە وەك ماڵی تاقە کەسێکی لێ دێت، پاشان ئەو تەئسیرە جاری وایە لە لایەن واجب بوونی زەکاتەکەوەیە، وە جاری وایە لە لایەنی زۆرکردنیەوەیەتی، وە جاری وایە لە لایەنی کەم کردنیەوەیەتی.

**نموونەی تەئسیر کردنی تێکەڵ بوون بۆ واجب بونی زەکات ئەوەیە:**

دوو پیاو یەکی بیست سەر مەڕ و بزنیان هەیە، ئەگەر تێکەڵ یەکتریان بکەن واجبە کاوڕێك یا چوێشتێرێك بدەن، وە ئەگەر جیابن هیچ زەکاتی تێدا واجب نابێ.

---

(١) تێکەڵ بوونی (شیوع) ئەوەیە: ماڵێك تێکەڵ و پێکەڵ بێ لە بەینی چەند شەریکێك دا بە جۆرێك کە هەر کام لەو شەریکانە بەشەکەی دەست نیشان کراوو جیا کراوە نەبێت (دانەر).

(٢) تێکەڵ بوونی (جوار) ئەوەیە: ماڵێك تێکەڵاو کرابێت و هی چەند کەسێك بێت، بەڵام هەر کام لەوان بەشەکەی جیا بێت و دەست نیشان کراو بێت، وە تێکەڵ بوونەکەشی هەر لە لەوەڕگاوشوێنی حەوانەوەیدا بێت. (دانەر).

وە نموونەی تەئسیرکردنی تێکەڵ بوون لە زۆرکردنی زەکاتەکەدا ئەوەیە: دوو کەس هەریە کە صەد سەر مەڕ و بزنی هەیە، جا ئەگەر تێکەڵاویان بکەن هەر یەکە لەو دوو کەسە واجبە کاوڕێك و نیو یا چوێشتیرێك و نیوبدات، وە ئەگەر جیابن لەسەر هەر یەکەیان کاوڕێك یا چوێشتیرێك واجبە.

نموونەی تەئسیرکردنی تێکەڵ بوون لە لایەنی کەم کردنی زەکاتەوە ئەوەیە: سێ کەس هەر یەکەیان چل سەر مەڕ و بزنی هەیە، ئەگەر تێکەڵیان بکەن لەسەر هەموویان کاوڕێك یا چوێشتیرێك واجبە، واتە: یەکی سێ‌یەکە کاوڕێك یا سێ‌یەکە چوێشتیرێکیان ئەکەوێ، بەڵام ئەگەر جیا بن، یەکی کاوڕێکی تەواو یان چوێشتیرێکی تەواویان ئەکەوێت.

وە بۆ ئەوەش شافیعی‌یەکان چەند مەرجێکیان داناوە:

١- ئەبێ شەریکەکان هەموویان لەو کەسانەبن کە زەکاتیان لەسەر پێویستە.

٢- ئەبێ ماڵە تێکەڵ کراوەکە بگاتە ڕادەی زەکات (نصاب).

٣- ئەبێ ساڵێکی تەواوی بەسەردا تێپەڕێت.

٤- نابێت هیچیان شوان و شوێنی حەوانەوەی ئاژەڵەکان و شوێنی لەوەڕ و شوێنی ئاوخواردنەوە و شوێنی دۆشینیان جیابێت.

٥- ئەبێ نێرەکانیان بۆ هەموویان یەك جۆر بێت، ئەگەرئاژەڵەکان یەك جۆربن.

وە ئەوەی شافیعی‌یەکان ووتویانە ئەحمەدیش هەر بۆی چووە، بەڵام ئەڵێت: تێکەڵ کردن تەنها لە ئاژەڵدا تەئسیری هەیە جگە لە ماڵی تر.

## زەکاتی(رکاز) و (معدن)

مەعنای (رکاز) : رکاز لە کەلیمەی (رکز)ەوە وەرگیراوە، (رکز)، یەعنی: پەنهان بوو، هەروەها لەم فەرمایشتەی خواشدا ئەم کەلیمەیە بە مەعنای پەنهان بوون هاتووە، کە ئەفەرمووێ: ﴿أَوْ تَسْمَعُ لَهُمْ رِكْزًا﴾ (مريم/٩٨). واتە: یان گوێت لە دەنگێکی پەنهانیان هەیە.

بەڵام ریکاز لێرەدا بەو گەنجینە ئەووترێت کە لەسەردەمی(جاهلية) پێش ئیسلامدا لە ژێر زەویدا دفن کرابێت[1].

---

(١) ئەوەش بەوەدا ئەزانرێت کە ئەگەر ناوی خۆیانیان لەسەر نوسی بێت، یا وێنەکانیان لەسەر کێشرابێت، یا هەر نیشانەیەکی تری پێوە بێت، بەڵام ئەگەر نیشانەی ئیسلامی پێوە بوو پێی ناووترێ (رکاز) بەڵکو پێی ئەووترێ: (اللقطة) ـ کە ئەمەش حوکمی تری هەیە ـ هەروەها ریکازی پێ ناوترێ ئەگەر نەیزانی ئایا هی پێش ئیسلامە یا دوای ئیسلامە. (دانەر).

مالیك ئەڵێت: ئەوەی کە لای ئێمە جێی ئیختیلاف نی‌یە و لە ئەهلی عیلمم بیستووە ئەوەیە کە وتویانە: ریکاز گەنجینەیەکی دەفن کراوە لە شتە دەفن کراوەکانی سەردەمی جاهلیەت، کە بۆ دەست کەوتنی، پارەی تێدا سەرف ناکرێ، وە هاوکاری و زەحمەتێکی وەهای ناوێت، بەڵام ئەوەی کە بەپارە بەدەست بێت، یان کاری زۆری بوێت، جا جاری واهەبێت بیپێکێ و جاری واش هەبێت کە نەیپێکێ، ئەوە پێی ناوترێ ریکاز.

ئەبوحەنیفە ئەڵێ: ریکاز ناوێکە بۆ ئەو گەنجینەیەی خالق یان مەخلوق پەنهانی کردبێت[1].

---

(١) ئەڵێم: ڕاست وایە کە بووترێ حەنەفی‌یەکانی دوایین وایان وتووە، چونکە ئەبو حەنیفە و هاوەڵە پێشینەکانی، زەکات تەنها لەو شتانەدا دیاری ئەکەن کە خوای گەورە لە زەوی دروستی کردووە، وەك زێڕ و زیو و هیچی تر.

ئەبو یوسف لەبارەی خەراجەوە دەفەرمووێت (٢٦):

ئەما ریکاز ئەو ئاڵتون و زیوەیە کە خوای گەورە لە زەوی دروستی کردووە، وە ئیمام موحەممەدیش لە (الموطأ ص١٧٤) دا هەروەکو ئەوەی باس کردووە، پاشان لەوبارەیەوە دەفەرمووێت: پێنج یەکی زەکاتی تێدایە، ئەمەش قسەی ئەبو حەنیفە و گشت زانایانی مەزهەبەکەمانە.

ئیمام موحەممەد و جگە لەویش بە حەدیسەکەی ئەبو هورەیرە بەڵگەیان هێناوەتەوە کە فەرموویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (فِي الرِّكَازِ الخُمسُ) واتە: لە رکازدا پێنج یەك هەیە، وەتیان: ئەی نێرراوی خوا ریکاز چی‌یە؟ فەرمووی: (الذَّهَبُ وَالفِضَّةُ الَّذِي خَلَقَهَا اللهُ فِي الأَرضِ يَومَ خُلِقَت) واتە: ئەو زێڕ و زیوەیە کە هەر لەسەرەتای دروست کردنی زەویدا خوای گەورە دروستی کردوون تێیدا.

بەیهەقی تەخریجی کردووە و زۆر بە لاوازی داناوە، وە ئەو لاواز کردنەشی لە شافیعی‌یەوە هێناوە، وە هەروەها زەیلەعی حەنەفیش بە لاوازی داناوە لە (نصب الراية) دا، جا بگەڕێوە بۆی (٢/٣٨٠).

و عیللەتی لاوازی‌یەکەشی ئەوەیە کە عبداللەی کوڕی سەعیدی کوڕی ئەبو سەعیدی مەقبوری تێدایە، کە ئەمیش بە ڕای هەمووان لاوازە.

بەڵام صدیق حسن خان وای زانیوە باوکی‌یەتی، کە سەعیدی کوڕی ئەبی سەعیدە، جا لەبەر ئەوە ووتویەتی سیقەیە و لە صەحیحەیندا کراوە بە بەڵگە، هەر لەبەر ئەوە بەڵگەی پێ هێناوەتەوە، جا منیش قسەکەیم هێناوە و ڕەددیشیم داوەتەوە لە نامیلکەی (أحكام الركاز) دا جا هەرکەس دەیەوێ با بگەڕێتەوە بۆ ئەوێ ئەگەر حاڵی ئەم حەدیسەی لا ئاشکرا نی‌یە.

جا لەم نامیلکەیەدا لەوە کۆڵاوەمەتەوە کە ریکاز لە لۆغەتا بە کانگا و ماڵی دفن کراو ئەوترێ بە یەکەوە، وە لە شەرعیشدا بەو ماڵە ئەوترێ کە لەسەردەمی نەفامیدا دەفن کرابێت، و بەڵگە و شایەتیشم لەسەر ئەوە هێناوەتەوە، و هەر ئەوەش مەبەستە لە حەدیسەکەی ئەبو هورەیرەدا کە لەم کتێبەدا باس کراوە (...وَفِي الرِّكَازِ الخُمسُ) جا ئەم حەدیسەش لە (الإرواء) دا بە ژمارە (٨١٢) تەخریج کراوە لە چەند ڕێگایەکەوە. (تمام المنة).

**مەعنای (معدن) چییە، وە زانایان چ مەرجێكیان داناوە لە زەكاتەكەیدا:**

(معدن) لە كەلیمەی (عدن) وەرگیراوە، (عدن)یش یەعنی: نیشتەجێ بوون، وە هەروەها لەم فەرمایشتەی خواشدا هەر ئەم مەعنایە ئەگەیەنێ كە ئەفەرمووێ: ﴿جَنَّتِ عَدْنٍ﴾ (التوبة/٧٢). واتە: بەهەشتانی عەدن. وە بۆیە ئەفەرموێ: (عدن) چونكە مەنزڵی نیشتەجێ بوون و مانەوەی ئەبەدییە.

وە زانایان ئیختیلافی بۆچونیان هەیە لە بارەی ئەو مەعدەنەوە كە زەكاتی تێدا واجبە:

ئەحمەد ئەڵێ: ئەو مەعدەنەی زەكاتی تێدا واجبە هەموو ئەو شتە بە نرخانە ئەگرێتەوە كە لە زەویدا دروست بووە و ئەهێنرێتە دەرەوە، وەك: ئاڵتون، زیو، ئاسن، مس، قورقوشم، یاقوت، زەبەرجەد، زومورڕود، فەیرووزەج، بیللەور، عەقیق، كل، زەرنیخ، قیر، نەوت، كبریت، زاج، و وێنەی ئەم شتانە. بە مەرجیشی داناوە كە ئەم شتە دەرهاتووانە لە زەوی بۆ خۆیان یا نرخەكەیان بە(نصاب) بگات.

ئەبوحەنیفە بۆ ئەوە چووە كە: ئەو مەعدەنەی زەكاتی تێدا واجبە ئەو شتانەن كە بتوانرێ نەقشی لەسەر دروست بكرێ و بە ئاگر بتوێتەوە، وەك: ئاڵتون، زیو، ئاسن، مس. ئەمما ئەو شتانەی كە شلن: وەك قیر، یان جامیدن و بە ئاگر ناتوێنەوە وەك: یاقوت ئەوە زەكاتی تێدا واجب نییە. وە بە مەرجیشی دانەناوە لەو مەعدەنەدا كە زەكاتی تێدا واجبە بگاتە (نصاب)، بەڵكو (خمس) واتە: پێنج یەكی تێدا بە واجب داناوە چ زۆر بێ یا كەم بێ.

مالیك و شافیعی ئەڵێن: ئەو مەعدەنەی كە لە ئەرز دەردێ و زەكاتی تێدا واجبە تەنها: ئاڵتون وزیوە، وە -وەك ئەحمەد- بە مەرجیان داناوە تێیدا كە ئاڵتونەكە بگاتە بیست مسقاڵ وزیوەكەش بگاتە دووصەد دیرهەم. وە هەروەها ڕایان وایە كە سوڕانەوەی ساڵ بەسەریدا ئیعتیباری نییە، بەڵكو كاتێ وجود و پەیدابوونی زەكاتی تێدا واجبە، وەك زەرع.

هەروەها لای ئەم سیانە واجبە چل یەكی لێ دەربكرێ بۆ زەكات، وە ئەڵێن: ئەوانەی كە زەكاتی مەعدەنیان پێ ئەدرێ هەر ئەوانەن كە موستەحەقی زەكاتن.

بەڵام ئەبوحەنیفە ئەڵێ: زەكاتی مەعدەن بەوانە ئەدرێ كە موستەحەقی غەنیمەتن.

**بەڵگەی واجب بوونی زەكات لە (ركاز) و (معدن) دا:**

ئەصل لە واجب بوونی زەكات لە ڕیكاز ومەعدەندا ئەو حەدیسەیە كە جەماعەت لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان كردووە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (العَجمَاءُ جُرحُهَا جُبار، وَالبِئرُ جُبار، وَالمَعدَنُ جُبَار، وَفِي الرِّكَازِ الخُمس). واتە: ئەگەر حەیوانێك بەرەڵا بێت وكەسێك بریندار بكات یان شتێك خراپ بكات ئەو كەسە یان ئەو شتە بە فیڕۆ ئەڕوات و خاوەنی ئەو حەیوانە نابێتە (ضامني)، ئەگەر ئینسانێك بیرێك هەڵكەنێت وكەسێكی تێبكەوێت ئەو كەسە بە فیڕۆ ئەڕوات وخاوەنی بیرەكە نابێتە (ضامني)، ئەگەر

نیـنسـانێك كەسێك بە كرێ بگرێت بۆ ئەوەی كە مەعدەنێكی بۆ هەڵكەنێت وە مەعدەنەكەی بە سەردا بروخێ، ئەوە ئەو كەسە بە فیڕۆ ئەڕوات وخاوەن مەعدەن نابێتە(ضامني)، ڕیكازیش پێنج یەك زەكاتی لێ ئەكەوێ.

(ابن منذر) ووتویەتی: كەسێك نازانین موخالیفی ئەم حەدیسە بێت جگە لە حەسەن كە زەوی عەرەب و زەوی جەنگی لە یەك جیا كردۆتەوە، وە ووتویەتی: ئەوەی لە زەوی جەنگیدا بدۆزرێتەوە پێنج یەكی ئەكەوێ، وە ئەوەی لە زەوی عەرەبدا بدۆزرێتەوە زەكاتی ئەكەوێ.

ئیبنوقەییم ووتویەتی: دەربارەی ئەوەی كە فەرمویەتی: (المَعدَنُ جُبَار) لە مەعناكەیدا دوو قەول هەیە:

یەكەمیان: ئەوەیە كە ئەگەر كەسێك كرێكارێك بگرێت مەعدەنێكی بۆ هەڵكەنێت ومەعدەنەكە بروخێ بە سەریا و بیكوژێت ئەوە (جبار)ە واتە: خوێنی بە فیڕۆ ئەڕوات. وە ئەوەی پشت گیری ئەم قەولە ئەكات ئەوەیە كە لەگەڵ ئەمانەدا باسی كردووە كە فەرمویەتی: (البِئرُ جُبَار، وَالعَجمَاءُ جُبَار).

دووەمیان: ئەوەیە كە مەعدەن زەكاتی لەسەر نیەیە، وە ئەوەی پشتگیری ئەمەشیان ئەكات ئەوەیە كە لە دوای (والمعدن جبار) ئەفەرموێت: (وَفِي الرِّكَازِ خُمسٌ) لێرەدا مەعدەن وڕیكازی لە یەك جیا كردۆتەوە، پاشان پێنج یەكی لەسەر پێویست كردووە، چونكە ڕیكاز ماڵێكی كۆكراوەیەو بەبێ ماندوو بوون وخەرجی تێ چوون بە دەست دێت، وە بۆیەشە لە مەعدەنی جیا كردۆتەوە چونكە مەعدەن پێویستی بە پارە خەرج كردن و ماندوو بوون هەیە لە دەرهێنانیدا.

**صیفەتی ئەو ڕیكازەی كە زەكاتی تێدا واجبە:**

ئەو ڕیكازەی پێنج یەكی تێدا واجبە، ئەوەیە ماڵ بێت، وەك زێڕ و زیو وئاسن وقورقشم و زەردە وقاپ وقاجاخ وئەو جۆرە شتانە. ئەمەش مەزهەبی حەنەفیەكان وحەنبەلیەكان وئیسحاق و (ابن منذر) وڕیوایەتێكی مالیك ویەكێك لە دوو قەولی شافیعیە.

شافیعی قەولێكی تریشی هەیە كە ئەڵێ: پێنج یەك پێویست نابێت لەو شتانەدا نەبێت كە نرخن بۆ شتی تر وەك زێڕ وزیو[1].

---

(١) ئەوە دەربڕینێنی صەنعانیە كە ووتویەتی:

ڕیكاز لە زاهیرترین قەولدا: ئاڵتون وزیوە.

ئەمەش هەڵەیەكە كە جیاوازی زمانی عەرەبی ئەكات، چونكە لە زمانی عەرەبیدا ڕیكاز بە ماڵی دفن كراو ئەووترێ لەناو زەویدا، وەك لەمەوبەر باس كرا، ماڵیش لە لوغەتا بەو شتە ئەووترێت كە ئەبێتە خاوەنی، جا بەم دوو پێناسەیە بۆمان دەر ئەكەوێت كە ڕیكاز بە هەموو ماڵێك ئەووترێت كە دفن ئەكرێ، و تایبەت نیە بە دوو نەقدەكەوە، ئەمەش مەزهەبی جەماوەری زانایانە، وە ئیبنوحەزمیش هەر ئەم بۆچونەی هەڵبژاردووە، هەروەها

**شوێنی دۆزینەوەی ریكاز لەم شوێنانەی خوارەوە بەدەر نی‌یە:**

١- بیدۆزێتەوە لە زەوی (موات) بایەردا، یان لە زەوی‌یەكدا نەناسراو بێت، یا لەسەر ڕوی زەوی‌یەكەش بێت، یان لەسەر ڕێگایەكدا بێت كەس هاتوو چۆی لێوە نەكات، یان لە گوندێكی وێرانەدا بێت، ئەمانە پێنج یەكیان لەسەرە، بێ جیاوازی لە نێوان زانایاندا، وە چوار بەشەكەی تریشی بۆ خۆیەتی.

بەپێی ئەوەی نەسائی لە عەمری كوڕی شوعەیبەوە لە باوكی‌یەوە لە باپیری‌یەوە ئەگێرێتەوە ووتویەتی: دەربارەی شتی دۆزراوە پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ كرا فەرموی: (مَا كَانَ فِي طَرِيقِ مَأتِيٍ، أو قَرْيَةٍ عَامِرَةٍ، فَعَرِّفْهَا سَنَةً، فَإِن جَاءَ صَاحِبُهَا، وَإلا فَلَكَ، وَمَا لَم يَكُن فِي طَرِيقِ مَأتِيٍ، وَلا قَرْيَةٍ عَامِرَةٍ، فَفِيهِ وَفِي الرِّكَازِ الخُمسُ). واتە: ئەوەی لە ڕێگا وگوندی ئاوەداندا دۆزرایەوە ساڵێك بانگەوازی بۆ ئەكرێت، جا ئەگەر خاوەنی نەبوو ئەبێتە هی دۆزەرەوەكەی، وە ئەوەی لە ڕێگا وگوندی ویرانەدا، دۆزرایەوە هەم لەوەدا وهەم لە ریكازدا پێنج یەكی زەكات لەسەرە.

٢- لە زەوی‌یەكدا بیدۆزێتەوە كە موڵكی‌یەتی و بۆ ئەو ئینتقال كرابێت (بە كڕین یا بەخشین یا شتی تر) لەم حاڵەتەدا ریكازەكە هی خۆیەتی، چونكە ریكازەكە لەو زەوی‌یەدا دفن كراوە، وە تەنها بە موڵكی‌یەتی زەوی‌یەكە كەس نابێتە خاوەنی ئەو ریكازەی ناوی، بەڵكو بە دۆزینەوەی ئەبێ بە خاوەنی، ئەمەش وەكو هەموو شتە ڕەواكانی تری لێ دێ كە لە زەویدا پەیدا ئەبن، وەك گژوگیا و دار، وە وەك ئەو نێچیرەی لە زەوی كەسێكی تردا ئەیدۆزێتەوە، هەر بۆیە ئەو ریكازە بۆ خاوەنی حازری شایستەترە، مەگەر خاوەنەكەی پێشووی كە ئەوزەوی‌یەی لێوە ئینتقال بووە بڵێت: ئەو ریكازە هی خۆمە، ئیتر لەم حاڵەتەدا ئەبێ بە هی ئەو، چونكە لە ژێر دەستی خۆیدا بووە، بەڵام ئەگەر خاوەنەكەی پێشوی ئەوەی نەووت، ئەوە بۆ ئەو كەسە ئەبێت كە ئەیدۆزێتەوە، ئەمەش ڕای ئەبویوسفە، وە ڕاسترین ڕایە لای حەنبەڵی‌یەكان.

شافیعی ووتویەتی: ئەو ریكازە ماڵی خاوەنی پێشوی زەوی‌یەكەیە، ئەگەر ئیددیعای بكات، وە گەرنا هی پێش ئەوە هەتا ئەگاتە خاوەنی یەكەم جاری.

وە ئەگەر خانوویەك بە میراتی وەرگیرا بوو وە ریكازی تێدا بوو ئەوە ئەویش حوكمی میراتی هەیە، بەڵام ئەگەر میرات گرەكان ڕێك كەوتن لەسەر ئەوەی كە هی میرات بەجێ‌هێڵەرەكەیان نی‌یە، ئەو كاتە ئەگێڕرێتەوە بۆ خاوەنی‌یەكەمی خانووەكە، وە ئەگەر خاوەنی یەكەمی نەزانرا، ئەوە حوكمی ئەو ماڵە وون بووەی ئەبێت كە خاوەنی ناناسرێت.

---

ئیبنودەقیق ی عیدیش بەلای ئەم بۆچونەدا چووە، و مالیك لەمەدا دوو دڵ بووە، بەڵام لە دوایدا ڕایەكەی لەسەر ئەم قەولە هەڵبژێردراوە وەستاوە، وەك لە (المدونة الكبرى) دا هاتووە، منیش دەقی قسەكەیم باس كردووە لەو نامیلكەیەدا كە لەمەوبەر باسم كرد، واتە (أحكام الركاز) ، (تمام المنة).

ئەبوحەنیفە ومحمد ئەڵێن: ئەگەڕێتەوە بۆ خاوەنی یەکەمی زەوییەکە، یا بۆ میرات گرەکانی ئەگەر ناسراو بوون، وە گەرنە ئەخرێتە(بیت المال)ی موسوڵمانان.

٣-لە مولکی موسوڵمانێکدا یا (ذمي)یەکدا بیدۆزێتەوە، لەم حاڵەتەدا بۆ خاوەنی مولکەکە ئەبێت، لای ئەبوحەنیفە ومحمد وریوایەتێکیش لە ئەحمەدەوە.

وە لە ئەحمەدەوە نەقڵ کراوە ووتویەتی: ئەبێتەماڵی دۆزەرەوەکەی.

ئەمەش قەولی حەسەنی کوڕی صالح و (أبو ثور)ە، وە ئەبویوسفیش پەسەندی کردووە، بەپێی ئەوەی لە پێشەوە ڕوون کرایەوە کە کەس بە خاوەنێتی زەوی نابێتە خاوەنی ریکاز، مەگەر خاوەنەکەی خۆی ئیددیعای بکات ئەوکاتە قسەی ئەو وەرئەگیرێت، چونکە دەستی بە سەریا هەیە هەروەك چۆن دەستی بە سەر زەوییەکەشدا هەیە، بەڵام ئەگەر خاوەنەکەی ئیددیعای نەکرد، ئەوە بۆ دۆزەرەوەکەیەتی.

شافیعی ووتویەتی: ئەگەڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی ئەگەر ئیددیعای کرد، وەگەرنا، ئەگەڕێتەوە بۆ یەکەم خاوەنی زەوییەکە.

**ئەندازەی زەکاتی واجب لە ریکازدا:**

لە پێشەوە ڕون کرایەوە کە ریکاز ئەو شتەیە کە لەسەردەمی پێش ئیسلامدا دفن کراوە، وە ئەو زەکاتەی کە پێویستە لێی دەربکرێت پێنج یەکە، وە چوار بەشەکەی تری ئەگێڕرێتەوە بۆ خاوەنی یەکەمی زەوییەکە ئەگەر زانرا کێ بووە، وە ئەگەر ئەو کەسە مردبوو ئەگێڕرێتەوە بۆ میرات گرەکانی ئەگەر زانیان کێن، وەگەرنا، ئەبێ بخرێتە (بيت المال)ی موسوڵمانان (خانەی دارایی) ئەمەش مەزهەبی ئەبوحەنیفە و مالیك و شافیعی و موحەممەدە.

بەڵام ئەحمەد و ئەبویوسف ووتویانە: ریکازەکە ئەبێتە ماڵی ئەو کەسەی کە دۆزیویەتییەوە، ئەگەر خاوەنی زەوییەکە ئیددعای نەئەکرد، بەڵام ئەگەر ئیددعای کرد لەم حاڵەتەدا هی ئەوە بە ڕای هەموو زانایان، وە واجبە پێنج یەك زەکاتی لێ بدا، جا چ ریکازەکە کەم بێ یا زۆر بێ، وە (نصاب) تێیدا ئیعتیباری نییە، ئەمەش لای ئەبوحەنیفە وئەحمەد، وە ڕاست ترینی دوو ڕیوایەتی مالیکە، وە لای شافیعی لە قەولی تازەیدا(نصاب)لە ریکازدا ئیعتیباری بۆ ئەکرێ[1]، بەڵام سوڕانەوەی ساڵ بە سەریدا بە مەرج نەگیراوە بۆی، بێ ئەوەی زانایان ئیختیلافیان هەبێ لەوەدا.

---

(١) ئەڵێم: زاهیر لە (إطلاق) کردنی حەدیسەکەدا کە دەفەرموێت: لە ریکازدا پێنج یەك هەیە، ئەوە دەرئەکەوێت کە نصاب مەرج نییە تێیدا، ئەمەش بۆچوونی جەماوەری زانایانە، و ئیبنومونزیر و شەوکانی و صەنعانی و جگە

**پێنج یەکەکە لەسەر کێ پێویستە بیدات؟**

جومهوری زانایان ئەڵێن: پێنج یەکەکە ئەبێ ئەو کەسە بیدات کە دۆزیویەتی‌یەوە، جا ئەو کەسە موسوڵمان بێت، یا (ذمي)، گەورە بێت یا بچوك، عاقڵ بێت یا شێت، بەڵام سەرپەرستی‌یاری منداڵ و شێت هەڵ ئەستێت بە دەرکردنی پێنج یەکەکە لەباتیان.

(ابن منذر) ووتویەتی: هەموو ئەو زانایانەی کە ئێمە زانیاریمان لێ وەرگرتون لەسەر ئەوەن کە (ذمي) کاتێ ریکازێکی دۆزیەوە ئەبێ پێنج یەکی بدات. ئەمەش مالیك و ئەهلی مەدینە و (ثوري) و ئەوزاعی و ئەهلی عێراق و خاوەنانی ڕەئی و غەیری ئەمانەش ووتویانە.

شافیعی ووتویەتی: پێنج یەك پێویست نابێت لەسەر ئەو کەسانە نەبێت کە زەکاتیان لەسەر پێویستە، چونکە ئەمەش هەر زەکاتە.

**پێنج یەك بە چ کەسانێك ئەدرێت:**

لای شافیعی زەکات بە کێ ئەشێت پێنج یەکیش ئەدرێت بەوکەسانە، بەپێی ئەوەی ئەحمەد وبەیهەقی ئەگێڕنەوە لە بەشیری (خثعمي)یەوە لە پیاوێك لە هۆزەکەیەوە کە ئەو پیاوە ووتویەتی: کوپەڵەیەك لە ماڵی قەدیمی ڕوهبانەکانمان لە کوفە دۆزی‌یەوە، لەکاتی باج گرتنی بیشردا، چوار هەزار دیرهەمی تێدا بوو، بردم بۆ لای عەلی ﷺ فەرمووی: بیکە بە پێنج بەشی وەکو یەکەوە، منیش بەو شێوەیە بەشم کرد، ئەویش بەشێك لەو پێنج بەشەی هەڵگرت و چوار بەشەکەی تری دایەوە دەستم، کاتێك پشتم هەڵکرد ڕۆیشتم بانگی کردم فەرمووی: دراوسێکانت هەژار و کەم دەستن؟ ووتم: بەڵێ، فەرمووی: ئەم بەشە بەرە و دابەشی بکە بەسەریاندا.

ئەبوحەنیفەو مالیك وئەحمەد ڕایان وایە پێنج یەك ئەدرێ بەو کەسانە کە شایستەی غەنیمەتن، بەپێی ئەوەی شەعبی ئەگێڕێتەوە ئەڵێت: پیاوێك هەزار دیناری شاراوەی دۆزیەوە لە دەرەوەی شاری مەدینە، هێنای بۆ لای عومەری کوڕی (خطاب ﷺ)، ئەویش پێنج یەکی لێ هەڵگرت کە دووصەد دیناربوو، وە ئەوەی کە مابۆوە دای بە پیاوەکە، عمر ﷺ ئەو دوو صەد دینارەی دابەش کرد بە سەر ئەو موسوڵمانانەدا کە لەوێ بوون، هەتا هەندێکی لێ ماوە فەرمووی: خاوەن پارەکە کوا؟ ئەویش هەستا بۆ لای، عمر ﷺ پێی فەرموو: ئەو دینارانەش هەڵبگرە بۆ خۆت.

---

لەوانیش ئەم بۆچوونەیان هەڵبژاردووە، وە شافیعی لە قەولە تازەکەیدا بەڵگەیەکی نەقلی لاوازی هێناوە، کە لە نامیلکە باس کراوەکەدا واتە: (أحكام الركاز) ڕوونم کردۆتەوەو باسی لاوازی‌یەکەشیم کردووە. (تمام المنة).

لە کتێبی (المغنی) دا هاتووە ئەڵێت: ئەگەر ئەو پێنج یەکە زەکات بوایە هەر ئەیدا بەو کەسانەی زەکاتیان پێ ئەشێت، وە ئەو چەند دینارە زیادەیەی، ئەئەگێڕاوە بۆ دۆزەرەوەکەی، وە لەبەر ئەوەی لەسەر (ذمي)یش واجبە پێنج یەك بدات، لەحاڵێکدا کە زەکات واجب نی‌یە لەسەری[1].

**زەکاتی ئەو شتانەی لە دەریا دەرئەهێنرێن:**

جومهوری زانایان لەسەر ئەوەن کە زەکات لەسەر ئەو شتانە نی‌یە کە لە دەریا دەرئەهێنرێن، وەك لوئلوئو مەرجان و زەبەرجەد و عەنبەر و ماسی و شتی تر مەگەر لە یەکێ لە ڕیوایەتەکانی ئەحمەددا نەبێت کە ئەڵێت: ئەگەر ئەو شتەی دەرئەهێنرێت بگاتە (نصاب) ڕادەی زەکات، ئەوە زەکاتی لەسەرە. ئەبویوسفیش لە لوئلوئو عەنبەردا هەر ئەو ڕایەی ئەحمەدی هەیە.

ئیبنوعەبباس خوا لێیان ڕازی بێت فەرمویەتی: عەنبەر زەکاتی لەسەر نی‌یە چونکە شتێکە دەریا دەری ئەداتەدەر.

جابیر وتویەتی: عەنبەر زەکاتی لەسەر نی‌یە بەڵکو غەنیمەتە بۆ ئەو کەسەی بە دەستی ئەهێنێ.

## ئەو ماڵەی بە قازانج بە دەست دێت

هەر کەس ماڵێکی قازانج کرد لەو ماڵانەی ماوەی ساڵی تێدا ئیعتیبار ئەکرێت بۆ زەکات -وە لەوە زیاتر ماڵی نەبوو- وە گەیشتیشە (نصاب)، یا لە جینسی ئەو ماڵە ماڵێکی تری هەبوو نە ئەگەیشتە (نصاب)، بەڵام لەگەڵ ئەو ماڵە قازانجەدا ئەگەیشتە (نصاب)، لەوکاتەوەی کە ئەو ماڵە قازانجە پەیدا ئەبێت ماوەکەی حیساب ئەکرێت، جا کاتێ ساڵەکەی تەواو کرد زەکاتی لەسەر پێویست ئەبێت.

بەڵام ئەگەر ئەو کەسە بێجگە لەو ماڵە قازانجە ماڵێکی تری هەبوو گەیشتبووە (نصاب) ئەوە ماڵە قازانجەکە لەم سێ جۆرەی خوارەوە بەدەر نی‌یە:

---

(١) دوو قەولی مەشهوری باس کردووە:

یەکەمیان ئەوەیە کە: کێ شیاوی زەکاتە ئەوکەسانەش شیاوی ریکاز ئەبن.

دووەم: هەروەکو غەنیمەت دابەش ئەکرێت.

جا لە سوننەتیشدا شتێك نی‌یە کە یەکێك لەم دوو قەولە بەسەر یەکێکیاندا هەڵبژێرێت، هەر لەبەر ئەوە لە (أحکام الرکاز)دا ئەو ڕایەم هەڵبژاردووە، کە ئەو پێنج یەکە ئەدرێتە دەست پێشەوای موسڵمانان، لە هەرجێگەیەك کە بەرژەوەندی وڵاتی تێدا بێت لەوێدا دایئەنێت. ئەبو عوبەیدیش لە (الأموال) دا هەر ئەو ڕایەی هەڵبژاردووە.

وە ئەڵێی ئەم بۆچوونەش بۆچوونی حەنبەلی‌یەکانە، لەبەر ئەوەی لەبارەی پێنج یەکی ریکازەوە وتویانە: هەروەکو غەنیمەتی (مطلق) دابەش ئەکرێت بۆ هەموو بەرژەوەندی‌یەکان. (تمام المنة).

١-ئەو ماڵە قازانجە ئەنجامی گەشەی ماڵەكەی تری بێت، وەك قازانج لە بازرگانی یا لە بێچوی ئاژەڵ، لەم حاڵەتەدا ماڵە قازانجەكە شوێن ئەصڵەكەی ئەكەوێت لەبارەی ماوەی ساڵ و زەكاتەكەیەوە.

جا كەسێك ماڵێكی بازرگانی هەبێت یا ئاژەڵی هەبێت بگاتە (نصاب)، پاشان ئەو ماڵە بازرگانی‌یە قازانج بكات و ئاژەڵەكان زاووزێ بكەن لە ماوەی ساڵەكەدا، پێویستە زەكاتی هەموویان بە سەر یەكەوە دەربكرێن، هەم ماڵە ئەصڵەكە و هەم قازانجەكەشی، وە ئەمە هیچ ئیختیلافی ڕەئی زانایانی تێدا نی‌یە[1].

٢- ئەو ماڵە قازانجە جینسی (نصاب)ەكە بێت، نەك لقێك بێ لێی یا پەیدا بوویەك بێ لێی، وەك ئەوەی بە فرۆشتن، یا بەخشین، یا میرات ئەو قازانجەی كرد بێت، لەم حاڵەتەدا ئەبوحەنیفە ئەڵێت: ماڵە قازانجەكە ئەخرێتە سەر (نصاب)ەكە، وە لە ساڵ تەواوكردنەكەشدا شوێن (نصاب)ەكە ئەكەوێت، وە هەروەها لە زەكاتەكەشدا، ئەو كاتە زەكاتی ماڵە قازانجەكە بە یەكەوە لە گەڵ ئەصڵەكەدا ئەدرێت.

وە شافیعی وئەحمەد ئەڵێن: ماڵە قازانجەكە شوێن ئەصڵەكە ئەكەوێت تەنها لە(نصاب)ەكەدا، ئەمما لە ساڵدا شوێن ئەو ناكەوێت، بەڵكو ساڵی خۆی لەسەرەتای پەیدا بوونی ئەو قازانجەوە دەست پێ ئەكات، جا ماڵە ئەصڵی‌یەكە چ نەقد بێ — وەك زێڕ وزیو- یان ئاژەڵ بێت، وەك ئەوەی دوو صەد دیرهەمی هەبێت، پاشان لە ماوەی ساڵەكەدا دوو صەد دیرهەمی تری قازانج كرد، ئەوسا هەر كام لەو دووانە -ئەصڵ وقازانج- ساڵی خۆی بۆ حیساب ئەكرێ، وە هەر كاتێ ساڵی هەر كامیان تەواو بوو زەكاتەكەی ئەدرێ.

وەڕای مالیك وەك ڕای ئەبو حەنیفەیە لە ئاژەڵدا، وە وەك ڕای شافیعی وئەحمەدە لە هەر دوو نەقدەكاندا.

٣-ماڵە قازانجەكە لە جینسی ئەو ماڵە نەبێت كە هەیەتی. لەم حاڵەتەدا ئەو ماڵە قازانجە ناخرێتە سەر ئەوەی كە هەیەتی نە لە ساڵدا وە نەلە(نصاب)دا، بەڵام ئەگەر ئەو قازانجە هەر بۆ خۆی گەیشتبووە (نصاب)، ئەوە سەرەتای ساڵی لێوە حیساب ئەكرێت، جا كە ساڵەكە تەواو بوو زەكاتەكەی ئەدرێت، ئەمما ئەگەر خۆی نەگەیشتبووە(نصاب)ئەوە هیچ زەكاتی تێدا واجب نی‌یە، ئەمەش ووتەی جەماوەری زانایانە.

---

(١) لەوانەیە مەبەستی ئەوە بێت كە لە چوار مەزهەبەكەدا خیلاف نی‌یە، وەگەرنە ئیبنوحەزم بەرهەڵستی ئەم ڕایەی كردووەو ووتویەتی:

هەموو قازانجێك لە دوای ساڵ بەسەردا هاتنی خۆی زەكاتی لێ دەرئەكرێ، نەك بە تەواو كردنی ساڵی ئەو شتەی كە لە دەوری‌یەتی‌و لە جینسی خۆیەتی، با ساڵەكەشی لێ تێك چووبێت.

سەیری قسەكەی بكە بە شی‌كراوەیی لە (المحلى) دا (٦/٨٣-٨٦) ئەم بۆچوونەش نزیكترە لە زاهیری قەولی پێغەمبەرەوە ﷺ كە فەرموویەتی: لە هیچ ماڵێكدا زەكات نی‌یە هەتا ساڵ بەسەریدا تێ نەپەڕێ، هەرچەند لە هەندێك كاتدا ناخۆشی و حەرەجی تێدایە، جا نزیكترین كار لە حەقەوە لەم حاڵەتەدا ئەوەیە كە شوێن ئەصڵەكەی بخرێت و زەكاتی لێ دەربكرێت، وە بگەڕێرەوە بۆ (الأموال) ی ئەبو عوبەید (تمام المنة).

**زەكات لەسەر ئەستۆی خاوەن ماڵ واجبە نەك لەسەر ماڵەكە خۆی:**

مەزهەبی حەنەفی‌یەكان و مالیك و ڕیوایەتێكی شافیعی وئەحمەد ئەوەیە كە زەكات لەسەر خودی ماڵ واجبە نەك لەسەر ئەستۆی خاوەنەكەی.

قەولی دووەمی شافیعی وئەحمەد ئەوەیە كە زەكات لەسەر ئەستۆی خاوەن ماڵەكەیە نەك لەسەر ماڵەكە خۆی.

سودی ئەم خیلافەش لەوەدا دەرئەكەوێت كاتێ كەسێك -بۆ نموونە- دوو صەد دیرهەمی هەبێت ودوو ساڵی بە سەردا تێ پەڕ بووبێت و زەكاتی لێ دەرنەكرابێت. جا ئەوەی ئەڵێت: زەكات لەسەر ماڵەكە خۆیەتی ئەڵێت: زەكاتی‌یەك ساڵی لێ دەربكرێت وهیچی تر، چونكە دوای ساڵی‌یەكەم (نصاب)ەكە كەمی كردووە لەبەر ئەوەی پێنج درهەمی بە زەكات لێ دەركراوە، وە ئەوەی ماوەتەوە -صەد ونەوەد وپێنج درهەم- (نصاب) نی‌یە، تا وەكو بۆ دووەم ساڵ زەكاتی لێ دەر بكا. وە ئەوەی ئەڵێ: زەكات لەسەر ئەستۆی خاوەن ماڵەكەیە ئەڵێت: ئەبێ زەكاتی دوو ساڵەكەی لێ دەربكرێت، بۆ هەر ساڵە زەكاتی خۆی، چونكە زەكات لەسەر ئەستۆی خاوەن ماڵ واجبە، هەر بۆیە بە كەم كردنی تەئسیر ناكاتە سەر (نصاب)ەكە.

ئیبنوحەزم ئەو ڕایە پەشند ئەكات كە زەكات لەسەر ئەستۆی خاوەن ماڵەكەیەو ئەڵێت: ئیختیلاف نی‌یە لە نێوان كەسدا لە نەتەوەی ئیسلام لەسەردەمی پێغەمبەرەوە ﷺ هەتا ئێستا، كە ئەو كەسەی زەكاتی گەنم یا جۆ یا خورما یا زێڕ یا زیو یا ووشتر یا ڕەشەووڵاغ یا مەڕ وبزنی لەسەر پێویست بێت، وە ئەو زەكاتە پێویستی‌یەی لە شتێكی تردا، بێجگە لەو كشت وكاڵە یا لەو خورمایە یا لەو زێڕە یا لەو زیوە، یا لەو ووشترە یا لەو ڕەشە ووڵاغە یا لەو مەڕ وبزنە، ئەوە ڕێی ئەوەی لێ ناگیرێت، وە كەراهەتیشی نی‌یە بۆی، جا زەكاتەكە لەو ماڵە بدا كە زەكاتی تێدا پێویستە یا لە جۆرێكی تر كە هەیبێت یا كڕیبێتی یا پێی بەخشرابێ یا قەرزی كردبێت وەك یەكە. كەواتە بەمە (ثابت) ڕوون بووەوە كە زەكات لە ئەستۆی خاوەن ماڵەكەدایە، نەك لەسەر خودی ماڵەكە، چونكە ئەگەر لەسەر ئەو شتانە خۆیان بوایە هەرگیز دروست نەئەبوو شتێكی تر بدرێت بە زەكات لە جیاتی ئەوان، وە پێویست ئەبوو لێی قەدەغە بكرێت، وەك چۆن كەسێك شەریكێكی هەبێت لە شتێك لەو شتانەدا كە باسمان كرد لێی قەبوڵ ناكرێ شتێكی تر بدات بە شەریكەكەی لە جیاتی ئەو شتەی كە خۆیان تێیدا شەریكن، مەگەر هەر دوو لا ڕازی بن لەسەری، وە بەپێی حوكمی كڕین وفرۆشتن بێت.

هەروەها ئەگەر زەكات لەسەر شتەكە خۆی بوایە، لە دوو حاڵەت دەرنەئەچوو كە حاڵەتی سێیەمی نی‌یە:

ئەویش ئەوەیە یا زەكاتەكە لە هەموو بەشەكانی ئەو ماڵەدا بێت، یا هەر لە بەشێكی دەست نیشان نەكراوی ئەو ماڵەدا بێ، جا ئەگەر لەسەر هەموو بەشەكانی بێت ئەوە حەرامە لەسەر خاوەنی هیچی لێ

بفرۆشێت، تەنانەت ئەگەر یەك سەر ئاژەڵیش بێت یا یەك دەنك دانەوێڵەش بێت، چونكە ئەوانەی زەكاتیان ئەدرێتێ لەو بەشەدا شەریكن، بەو پێیە حەرامە خۆی شتێكی لێ بخوات، ئەمەش (باطل)ە بێ ئەوەی ئیختیلافی زانایان هەبێ تێیدا، وە هەروەها ئەگەر بەو پێیە بێت ئەبێ ئەو سەرە ئاژەڵەی كە ئەیدا بە زەكات بەپێی نرخی سەرە ساغەكانی تر بێت، وەك چۆن لە شەریكایەتیدا بە زەرووری ئەمە ئەكرێت.

وە ئەگەر زەكات لە هەر بەشێكی دەست نیشان نەكراوی ئەو ماڵەدا بێت ئەوە شتێكی (باطل)ە، وە دیسان ڕێك وەك ئەوەی پێشوو ڕوو ئەداتەوە، چونكە نازانێت ئایا ئەوەی ئەی فرۆشێت یا ئەی خوات حەقی ئەوانەیە كە زەكاتیان پێ ئەدرێت یانە؟ كەواتە تەنها ئەوەی ووتمان ڕاستە بە بێ گومان.

**لەناو چونی ماڵەكە دوای پێویست بوونی زەكات و پێش دەركردنی زەكات:**

ئەگەر زەكات پێویست بوو لەسەر ماڵێك بەوەی ماوەی ساڵێكی بە سەردا ڕۆیشت، یا كاتی چنین و دروێنەو دەسكەنەی هات، پاشان ماڵەكە پێش ئەوەی زەكاتی لێ دەربكرێت لەناو چوو یا بەشێكی لەناو چوو، ئەوە ئەو زەكاتە پێویستە بدرێت ولە ئەستۆی خاوەن ماڵەكەیە، جا ئەو لەناو چوونە چ بە هۆی كەمتەرخەمی خاوەنەكەیەوە بێت یان نا. ئەمەش لەسەر ئەو ئەساسەیە كە زەكات لە ئەستۆی خاوەن ماڵەكەدایە نەك لە خودی ماڵەكەدا، كە ئەمەش ڕای ئیبنوحەزم ووڕای مەشهووری مەزهەبی ئەحمەدە.

بەڵام ئەبوحەنیفە ڕای وایە كە ئەگەر ئەو ماڵە لەناو چوو، بێ ئەوەی دەستی خاوەنەكەی تێدا بێت زەكاتی لەسەر خاوەنەكەی لا ئەچێت، وە ئەگەر هەندێكی لێ لەناو چوو بوو بەپێی ئەندازەی لەناوچووەكە زەكاتی لەسەر لائەچێت، بینا لەسەر ئەوەی زەكات لەسەر خودی ماڵە نەك لەسەر گەردنی خاوەنی.

بەڵام ئەگەر ئەو ماڵە لەناو چوو، وە لە لەناوچوونەكەیدا دەستی خاوەنەكەی تێدا بوو، ئەوكاتە زەكاتەكەی لەسەر لاناچێت.

وە شافیعی وحەسەنی كوڕی صالح و ئیسحاق و (أبو ثور) و (ابن منذر) ئەڵێن[1]: ئەگەر پێش ئەوەی بتوانێ زەكاتەكەی لێ دەر بكات(نصاب)ی ماڵەكە لەناو چوو زەكاتەكەی لەسەر لائەچێت، بەڵام ئەگەر دوای ئەوەی توانای زەكات لێ دەركردنی هەبێت و زەكاتەكەی دەرنەكرد هەتا ماڵەكە لەناو چوو زەكاتەكەی لەسەر لا ناچێت.

وە ئیبنوقودامە ئەم ڕایە پارسەنگ ئەداتەوە و ئەڵێت: قەولی صەحیح -إن شاء الله- ئەوەیە كە زەكات لائەچێ بە لەناو چوونی ماڵەكە ئەگەر خۆی كەمتەرخەمی نەكردبێت لە دەركردنی زەكاتەكەدا، چونكە

---

(١) ئەم بۆچوونە هەڵبژاردەی كۆمەڵێك لە هاوەڵەكانی ئیمام ئەحمەدە، و لەو كۆمەڵەشدا شێخی ئیسلام ئیبنوتەیمیەیشیان تێدایە، هەروەك لە (الإختیارات العلمیة) دا (ل ٥٨) هاتووە (تمام المنة).

زەكات لەبەر دڵدانەوەی موسوڵمانان واجب بووە، وە واجب نابێ لەسەر ئینسان كاتێ ماڵی نەبوو یان فەقیر بوو.

مانای كەمتەرخەمی ئەوەیە كە ئەو كەسە توانای دەركردنی زەكاتەكەی هەبێت بەڵام دەری نەكات.

بەڵام ئەگەر توانای دەركردنی نەبوو كەمتەرخەم نییە، جا ئەو توانای دەرنەكردنە چ لەبەر ئەوە بێ كە كەسێكی دەست ناكەوێ شایستەی زەكات پێدان بێت، یا لەبەر ئەوەی بێت كە ماڵەكەی لێوەی دوورە و دەستی پێی ناگا زەكاتەكەی لێ دەر بكا، یا لەبەر ئەوە بێت ئەو زەكاتە فەرزەی كە ئەبێ بیدا لە خودی ماڵەكەی دەست ناكەوێ، وە پێویستی بەوە هەیە بیكڕێت، بەڵام ماڵی دەست نەكەوتووە كە پێی بكڕێت، یان لە هەوڵی كڕینیدا بووە، یا لەبەر هەر شتێكی تر بۆی نەكراوە زەكاتەكە بدات.

بەڵام ئەگەر وتمان پێویستە دوای لەناو چوونی ماڵەكەش زەكاتەكەی هەر بدات لەم حاڵەتەدا ئەگەر توانای دانی هەبوو با بیدات، وە گەرنا ئەبێ چاوەڕوانی لێ بكرێت تا ئەو كاتەی وەزعی ماددی باش ئەبێت وتوانای دانی زەكاتەكەی هەیە، بە بێ ئەوەی زەرەر و زیانێكی توش ببێ، لەبەر ئەوەی پێویستە بۆ قەرزی نادەمی مۆڵەتی پێ بدرێت، كەواتە بۆ زەكاتێك كە مافی خوایە ئەبێ چاكتر مۆڵەتی پێ بدرێت.

**لەناو چوونی بڕی زەكاتەكە پاش جیا كردنەوەی:**

ئەگەر زەكاتەكە جیا كرایەوە بۆ ئەوەی بدرێ بەوانەی زەكاتیان پێ ئەشێت، بەڵام هەمووی یان هەندێكی لەناو چوو، ئەبێ ئەو كەسە زەكاتی تر دەر بكاتەوە، چونكە لەسەری پێویستە ئەو زەكاتە بگەیەنێتە دەستی ئەوكەسەی كە خوای گەورە فەرمانی پێ داوە.

ئیبنوحەزم ئەڵێت: بۆیان گێڕاوینەوە لە ڕێگای ئیبنوئەبی شەیبەوە، لە حەفصی كوڕی (غیاث)، جەریر، موعتەمیری كوڕی سولەیمانی تەیمی، زەیدی كوڕی حوباب و عبدالوهاب ی كوڕی (عطاء) كە حەفص ووتویەتی: لە هیشامی كوڕی حەسسانەوە لە حەسەنی بەصرییەوە. وە جەریر ووتویەتی: لە موغیرەوە لە هاوڕێكانییەوە. وە موعتەمیر ووتویەتی: لە مەعمەرەوە لە حەممادەوە. وە زەید ووتویەتی: لە شوعبەوە لە حەكەمەوە. وە عبدالوهاب ووتویەتی: لە ئیبنوئەبی عوروبەوە لە حەممادەوە لە ئیبراهیمی نەخەعییەوە:

ئەمانە هەموویان ڕێك كەوتون لەسەر ئەوەی ئەگەر كەسێك زەكاتی ماڵەكەی دەركرد و لەناو چوو زەكاتەكە لەسەری لا ناچێت، وە پێویستە لەسەری جارێكی تر زەكاتەكە دەربكاتەوە.

ئیبنوحەزم ئەڵێت: لە (عطاء)ەوە بۆیان گێڕاوینەتەوە ووتویەتی: ئەگەر زەكاتەكە فەوتا تازە لەسەری لا ئەچێت.

**زەكات بە دواخستن لەكۆڵ ناكەوێت:**

هەركەس چەند ساڵێکی بە سەردا تێ پەڕی و زەكاتی نەدا، ئەبێ زەكاتی هەموو ئەو ساڵانە دەربكات و بیدات، جا ئەو كەسە زانیبێتی زەكات واجبە یان نا، وە چ لە(دار الإسلام)دا بێت یان لە (دارالحرب)دا بێت[1].

وە (ابن منذر) ووتویەتی: ئەگەر ستەمكاران دەستیان گرت بە سەر شارێكدا، وە خەڵكی ئەو شارە چەند ساڵێك زەكاتیان نەدا، پاشان پێشەوایەكی موسوڵمان دەستی بەسەردا گرتەوە، ئەبێ زەكاتی ڕابوردووشیان لێ وەر بگیرێت ئەمە بەپێی قەولی شافیعی و مالیك و (أبو ثور)ە.

**ئایا دروستە لە جیاتی شت نرخەكەی بدرێت بە زەكات؟**

دروست نی‌یە نرخی ئەو شتە بدرێت كە خۆی دەقی لەسەر هاتووە بدرێت بە زەكات، مەگەر ئەو شتە خۆی نەبێت یا جینسەكەی نەبێت، چونكە زەكات عیبادەتێكە و بەجێ هێنانی عیبادەتیش دروست نی‌یە لەسەر ئەو شێوەیە نەبێت كە فەرمانی پێ دراوە لە لایەنی شەرعەوە. وە بۆ ئەوەی هەم هەژار وەهەم دەوڵەمەند لە عەینی ئەو ماڵانەدا هاوبەش بن.

وە لە حەدیسەكەی (معاذ)دا هاتووە: پێغەمبەر ﷺ كاتێ ناردی بۆ یەمەن پێی فەرموو: (خُذِ الحَبَّ مِنَ الحَبِّ وَالشَّاةَ مِنَ الغَنَمِ، وَالبَعيرَ مِنَ الإبِلِ، وَالبَقَرَةَ مِنَ البَقَرِ) . (رواه أبوداود وابن ماجه والبيهقي والحاكم) واتە: گەنم وجۆ لە گەنم وجۆ وەربگرە، وە بزن ومەڕ لە بزن ومەڕ وەربگرە، وە ووشتر لە ووشتر وەربگرە، وە ڕەشە ووڵاغ لە ڕەشە ووڵاغ وەربگرە.

ئەم حەدیسە ئینقیتاعێك لە سەنەدەكەیدا هەیە، چونكە (عطاء) لە (معاذ)ی نەبیستووە.

شەوكانی ووتویەتی: لە ڕاستی دا زەكات لەسەر عەینی شت واجبە، وە نابێ لەجیاتی شتەكە نرخەكەی وەربگیرێت بە زەكات، مەگەر لەبەر عوزرێك.

وە ئەبوحەنیفە ڕێی داوە نرخەكەی بدرێت، چ بتوانێ عەینی ئەو شتە بدات یا نەتوانێ، چونكە زەكات مافی هەژارانە و لای هەژاران چ عەینی شتەكە بدرێت یا نرخەكەی بدرێت فەرقی نی‌یە.

بوخاری -بە موعەللەقی بە عیبارەتی جەزم-[2] ئەگێڕێتەوە كە: (معاذ) بە خەڵكی یەمەنی ووتوە: پۆشاكی (خميص) یان (لبس)م بۆ بهێنن لە جێی زەكاتی جۆ وگەنمەشامی بۆ ئێوە ئاسانترە و بۆ هاوەڵەكانی پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە باشترە ـ (خميص) پۆشاكێكە لە ئاوریشم ـ .

---

(١) ئەمە مەزهەبی شافیعی‌یە. (دانەر).

(٢) لەم قسەیدا وا دەرئەخات كە ئەو ئەسەرەی لە موعەززەوە باس كراوە صەحیحە، ئەو ئەسەرەش صەحیح نی‌یە بەڵكو بوخاری بەو شێوەیە بە موعەللەقی هێناویەتی: (قال طاوس: قال معاذ:...)، وە ئەسەرەكە لە نێوان (طاوس) و موعاذدا (منقطع)ە، (حافظ) لە شەرحەكەیدا ئەفەرمووێت:

**زەكات لە ماڵی شەریكایەتی دا:**

ئەگەر دوو كەس یا زیاتر ماڵێكیان بە شەریكایەتی هەبوو، زەكات لەسەر هیچ كامیان واجب نابێت هەتا هەریەكەیان ئەوەندەیان نەبێت كە بگاتە (نصاب)ێكی تەواو.

بەپێی قسەی بەشی زۆری زانایان، ئەمە جگە لە تێكەڵ كردن لە ئاژەڵدا كە لە پێشەوە باس كرا و ئیختیلافی زانایانیشی لەسەر ڕوون كرایەوە.

**ڕاكردن لە زەكات:**

مالیك و ئەحمەد و ئەوزاعی و ئیسحاق و ئەبوعوبەید بۆ ئەوە چوون كە ئەگەر كەسێك (نصاب) ڕادەی زەكاتی هەبوو لە هەر جۆرە ماڵێك بێت، پاشان فرۆشتی پێش ئەوەی ساڵەكە تەواو ببێت، یا بەخشی یا بەشێكی لێ لەناو برد بە مەبەستی ڕاكردن لە زەكات، ئەوە ئەو زەكاتەی لە كۆڵ ناكەوێت، وە ئەبێ لە كۆتایی ساڵدا لێی بسێنرێت ئەگەر ئەو تەصەڕڕوفەی لەكاتی نزیك بوونەوەی كاتی زەكات دەركردنەكە بێت، بەڵام ئەگەر لەسەرەتای ساڵەوە بێت ئەوە زەكاتی لەسەر نابێت، چونكە ئەو تەصەڕڕوفەی گومانی ئەوەی لێ ناكرێت كە لە زەكات ڕای كردبێت.

---

وە ئەم تەعلیق كردنەی بوخاری سەنەدەكەی صەحیحە، بەڵام (طاوس) گوێی لە موعاز نەبووە جا لەبەر ئەوە پچڕ پچڕە، كەواتە بە قسەی ئەوكەسەی كە ئەڵێت بوخاری بە تەعلیقی جازم باسی كردووەو ئەسەرەكە لای بوخاری صەحیحە، نابێت ئادەمیزاد بەو قسەیە هەڵبخەڵەتێت، چونكە ئەو صەحیحیەیە تەنها لەسەر ئەوكەسەیە كە تەعلیقەكەی لەسەر كراوە، بەڵام ئیسنادەكەی تری نا، ئەوەندە هەیە كە هێنانی لەم شوێنەدا بۆ بەڵگە هێنانەوە بەهێزی ئەكات.

ئینجا ئەگەر ئەم ئەسەرە صەحیحیش بێت نابێتە بەڵگە بۆ ئەبو حەنیفە لەوەدا كە لە نێوان نرخ و شتەكەدا هیچ جیاوازی نییە، بەڵكو ئەبێتە بەڵگەی ئەو كەسەی كە ئەڵێت دروستە نرخی شتەكە بدرێت لەبەر چاودێری كردنی بەرژەوەندی هەژاران، و ئاسان كاری لەسەر دەوڵەمەندەكان، ئەم ڕایش هەڵبژاردەی ئیبنوتەیمیەیە. لە (الإختیارت) دا دەفەرمووێت:

دروستە نرخی شت بدرێت لە زەكاتدا لەبەر پێویستی و بەرژەوەندی، وەك ئەوە كابرایەك بەرهەمی كێڵگەكەی یان باخەكەی بفرۆشێت، جا لێرەدا دانی زەكات لە نرخی فرۆشراوەكە بری ئەكەوێ، و پێویست ناكات تەكلیفی لەسەر بكرێت كە خورما یان دانەوێڵەكە بكڕێتەوە، چونكە لێرەدا لەگەڵ هەژارەكەدا یەكسان بووە، و ئەحمەد دانی بەوەدا ناوە و بە دروستی داناوە، و نموونەی بەوە هێناوەتەوە كە ئەگەر كابرایەك زەكاتی ووشتری لەسەر واجب ببێت و زەكاتەكەش مەڕێك بێت، جا لێرەدا دانی نرخەكە بری ئەكەوێت، و پێویست ناكات تەكلیف لە كابرا بكرێت كە سەفەر بكات بۆ كڕینی مەڕێك. یان ئەو كەسانەی زەكاتەكەیان ئەدرێتێ بۆخۆیان داوای نرخەكەی بكەن لەبەر ئەوەی نرخەكەی سوودی زۆرتر بێت بۆیان، جا ئەمەش دروستە (تمام المنة).

ئەبوحەنیفەو شافیعی وتویانە: بەو تەصەڕڕوفەی زەکاتەکەی لە کۆڵ ئەکەوێت، چونکە(نصاب)ەکە پێش ئەوەی ساڵ کۆتایی بێت کەمی کردووە، بەڵام بەو تەصەڕڕوفە گوناهبار ئەبێت و سەرپێچی کردووە لە فەرمانی خوا لەبەر ئەوەی لە زەکات ڕای کردووە.

کۆمەڵێ یەکەم لە بۆ چوونەکەیاندا ئەم فەرمودەیەی خوای گەورەیان کردۆتە بەڵگە کە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّا بَلَوْنَـٰهُمْ كَمَا بَلَوْنَآ أَصْحَـٰبَ ٱلْجَنَّةِ إِذْ أَقْسَمُوا۟ لَيَصْرِمُنَّهَا مُصْبِحِينَ ﴿١٧﴾ وَلَا يَسْتَثْنُونَ ﴿١٨﴾ فَطَافَ عَلَيْهَا طَآئِفٌ مِّن رَّبِّكَ وَهُمْ نَآئِمُونَ ﴿١٩﴾ فَأَصْبَحَتْ كَٱلصَّرِيمِ﴾ (القلم/١٧-٢٠) واتە: ئێمە ـ بێ باوەڕەکانی مەککەمان ـ تاقی کردەوە وەك چۆن خاوەنانی باخەکەمان تاقی کردەوە، کاتێ سوێندیان خوارد بەیانی زوو بچن باخەکەیان بڕنن، وە بەشی هەژارانی لێ جیا نەکەنەوە، بەڵام ئەمان لە خەو دابوون بەڵایەك لە لایەن پەروەردگارتەوە هاتە خواری بۆیان و باخەکەیانی لەناو برد، وە وەك شەوە زەنگی لێ کرد.

جا خاوەنانی ئەو باخە لەبەر ئەوەی ویستیان لە زەکات ڕابکەن خوا بەو شێوەیە سزای دان.

وە لەبەر ئەوەی ئەو کەسە مەبەستی لابردنی بەشی کەسێکە کە هۆی موستەحەق بوونی پەیدا بووە، هەر بۆیە ئەو بەشە بەو مەبەستەی لا ناچێت، وەکو چۆن کەسێك لەسەرە مەرگدا ژنەکەی تەڵاق بدات بۆ ئەوەی لە میرات بێ بەشی بکات، جا لەبەر ئەوەی ئەو مەبەستەی هەیە لە میرات بێبەش نابێت. وە هەروەها لەبەر ئەوەی مەبەستێکی فاسیدی هەیە حیکمەت وا داوا کارە کە سزا بدرێت بە پێچەوانەی مەبەستەکەی، وەك ئەوەی کەسێك میرات دەرەکەی بکوژێت بۆ ئەوەی زوو میراتەکەی وەربگرێت، شەرع بەوە سزای ئەدات کە بێ بەشی بکات لەو میراتە.

**ئەو کەسانەی زەکاتیان پێ ئەشێت:**

ئەوانەی زەکاتیان پێ ئەشێت هەشت جۆرن، خوای گەورە لەم فەرمودەیەدا باسی کردوون کە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَـٰتُ لِلْفُقَرَآءِ وَٱلْمَسَـٰكِينِ وَٱلْعَـٰمِلِينَ عَلَيْهَا وَٱلْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَٱلْغَـٰرِمِينَ وَفِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ فَرِيضَةً مِّنَ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ (التوبة:٦٠). واتە: زەکاتەکان ئەدرێن بەو فەقیران و مسکین و ئەوانەی لەسەر کۆکردنەوەی زەکات کار دەکەن و ئەوانەی بە هۆی ئەو زەکاتەوە دڵیان بۆ لای خوا ڕائەکێشرێت، وە بەو بەندانەی ئەیان هەوێت ئازاد بن، وە بەوانەی قەرزدارن، وە لە ڕێی خوادا، و بە ڕێبوارێك کە پارەو سامانی لە سەفەرەکەیدا لە دەست بڕا بێت، ئەم بەش کردنەش فەرزێکە لە لایەن خواوە دانراوە، وە خوا عەلیم و حەکیمە.

لە زیادی کوڕی حاریسی صودائیەوە هاتووە کە ووتویەتی: هاتمە لای پێغەمبەر ﷺ وبەیعەتم پێ دا، پیاوێك هات ووتی: لە زەکات بەشم بدە، فەرمووی: (إِنَّ اللهَ لَم يَرضَ بِحُكمِ نَبِـي وَلا غَيرِهِ فِي الصَّدَقَاتِ

حتى حَكَمَ فِيهَا هُوَ، فَجَزَّأَهَا ثَمَانِيَةَ أجزاءٍ، فَإن كُنتَ مِن تِلكَ الأجزاءِ أعطَيتُكَ). (رواه أبوداود). واتە: خوا نە بە حوكمی پێغەمبەرێك وە نە بە حوكمی كەسێكی تر لە زەكاتدا ڕازی نەبووە هەتا بۆ خۆی حوكمی تێدا كردووە وكردویەتی بەهەشت بەشەوە، جا ئەگەر تۆش یەكێك بیت لەو بەشانە بەشت ئەدەم.

وە ئەم حەدیسە لە سەنەدەكەیدا عبدالرحمن ی ئەفریقی تێدایە كە قسەی لەسەرە.

**وا لە خوارەوە ئەم هەشت جۆرە ڕوون ئەكەینەوە كە لە ئایەتەكەدا باس كراون:**

(٢،١)- فەقیران و مەساكین.

ئەمانەش ئەوموحتاجانەن كە ئەوەندەیان نی یە بەشیان بكات، وە بەرامبەر ئەمانەش دەوڵەمەندان وخاوەن دەسەڵات هەن كە ئەوەندەی ئەمان ئیحتیاجی یان پێی هەبێت هەیانە.

لە پێشەوە باس كرا بە چ ئەندازەیەك مرۆڤ ئەبێتە دەوڵەمەند، ئەویش ئەو ئەندازەیە كە لە پێویستی یە سەرەكی یەكانی خۆی زیادە بێت، هەم لە خۆی وهەم لە منداڵەكانی، لە خواردنو خواردنەوەو جل و بەرگ و خانوو شتی سواری و ئامێری ئیش و ئەو جۆرە شتانەی كە كەس ناتوانێ بێ نیاز بێ لێیان. جا هەركەس ئەو ئەندازەیەی نەبوو ئەوە موحتاجە وشایستەی زەكاتە.

لە حەدیسەكەی موعازدا هاتووە ئەفەرموێت: (لە دەوڵەمەندەكانیان وەرئەگیرێت وئەدرێتەوە بە فەقیرەكانیان) جا ئەو كەسەی لێی وەرئەگیرێت ئەو دەوڵەمەندەیە كە خاوەنی ڕادەی دانراو بێت.

وە ئەوەی بۆی ئەگیرێتەوە ئەو بەرامبەرەیەتی كە فەقیرو موحتاجە وئەوەندەی نی یە كە دەوڵەمەند هەیەتی، وە لێرەدا جیاوازی نی یە لە نێوان فەقیرەكان و مەسكینەكاندا لە لایەنی نەبوونی و موحتاجی یەوە، وە لە لایەنی موستەحەق بوونیان بۆ زەكات. وە لە لایەنی كۆ كردنەوەی ئایەتەكە بۆ (فەقیران و مسكینان) بەسەر یەكەوە -هەر چەندە واوە (عطف)ەكە داواكاری جیاوازی یە لەبەینیاندا- بەڵام دژی ئەو قسەیە نی یە كە ووتمان، چونكە -مەسكینەكان كە بەشێكن لە فەقیران- صیفەتێكی تایبەتی یان هەیە بە خۆیانەوە كە ئەوەش بەسە بۆ جیاوازی، چونكە لە حەدیسدا بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی مسكینان ئەو فەقیرانەن كە دوورە پەرێزی ئەكەن لە سواڵ كردن، وە خەڵكیش ئاگایان لە حاڵیان نی یە، جا ئایەتەكە باسی كردون بۆ ئەوەی نەبادا خەڵك ئاگایان لە حاڵیان نەبێت، چونكە واخۆیان دەرناخەن، حەدیسەكەش ئەوەیە كە ئەبوهورەیرە ڕیوایەتی كردووە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لَيسَ المِسكِينُ الَّذِي تَرِدُهُ االتَّمرَةُ وَالتَّمرَتَانِ، وَلا اللُّقمَةُ وَاللُّقمَتَانِ، إنَّما المِسْكِينُ الَّذِي يَتَعَفَّفُ، اِقرَئُوا إن شِئتُم: ﴿لَا يَسْـَٔلُونَ ٱلنَّاسَ إِلْحَافًا﴾ (البقرة:٢٧٣). واتە: مسكین ئەوە نی یە كە خورمایەك یا دوو خورما ئەیگێڕێتەوە یا لوقمەیەك یا دوو لوقمە ئەیگێڕێتەوە بەڵكو مسكین ئەوەیە كە دوورە پەرێزی ئەكات لە سواڵ كردن، ئەگەر حەز ئەكەن ئەو ئایەتە بخوێننەوە كە ئەفەرموێت: (بەزۆر داوا لە خەڵك ناكەن).

وە لە(لفظ)ێكی تردا هاتووە: (لَيسَ المِسكِينُ الَّذِي يَطُوفُ على النَّاسِ تَرُدُّهُ اللُّقمَةُ وَاللُّقمَتَانِ، وَالتَّمرَةُ وَالتَّمرَتَانِ، وَلَكِنَّ المِسكِين الَّذِي لايَجِدُ غنى يُغنِيهِ، وَلا يُفطَنُ لَهُ، فَيُتَصَدَّقُ عَلَيه، وَلا يَقُومُ فَيَسأَلُ النَّاسَ). (رواه البخاري و مسلم) واتە: مسكين ئەو كەسە نىيە بە ناو خەڵكدا بگەڕێت و پارويەك يا دوو پارو بیگێڕێتەوە، یان دەنكە خورمایەك یان دوو دەنكە خورما، بەڵكو مسكین ئەو كەسەیە ئەوەندەی نىيە بێ نیحتیاجی بكات وكەسیش پێی نازانێت هەتا خێری پێ بكات، وە خۆشی هەڵناسێ داوا لە خەڵك بكات.

**ئەندازەی ئەو زەكاتەی ئەدرێت بە هەژار:**

لە مەبەستەكانی زەكات ئەوەیە نیحتیاجی فەقیرانی پێ دەفع بكرێت، هەربۆیە لە زەكات ئەو ئەندازەیان پێ ئەدرێت كە لە فەقیری دەریان بێنێ بۆ دەوڵەمەندی، وە لە موحتاجییەوە بۆ بێ نیحتیاجییەكی بەردەوام، ئەمەش بەپێی حاڵات و نەفەرەكان فەرق ئەكات.

عمر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر زەكاتتان دا بە فەقیر ئەوەندەی بدەنێ كە لە فەقیری ڕزگاری بكەن.

(قاضي) عبدالوهاب ووتویەتی: مالیك سنوری دانەناوە بۆ ئەو ئەندازەیەی كە پێی ئەدرێت چونكی ئەدرێ بە كەسێك كە: خانوو خزمەتكارو ئەو ووڵاغەش كە بێ نیاز نىيە لێی، هەیەتی.

لە حەدیسدا بەڵگەی ئەوە هاتووە كە ڕەوایە بۆ هەژار داوا بكات هەتا ئەوەندەی ئەدرێتێ ژیانی پێی ڕاست ببێتەوەو بێنیازی بكات بە درێژایی ژیانی. حەدیسەكەش ئەوەیە كە لە (قبیصە)ی كوڕی (مخارق الهلالی)ییەوە هاتووە ووتویەتی: بۆ یەك خستنەوەی دوولایەن خۆم توشی قەرزاری كرد، پاشان هاتمە لای پێغەمبەر ﷺ داوای یارمەتیم لێ كرد فەرمووی: (أقِم حتى تَأتِينَا الصَّدَقَةُ فَنَأمُرَ لَكَ بِهَا، ثُمَّ قَالَ: يَا قُبِيصَةُ! إنَّ المَسأَلَةَ لا تَحِلُّ إلا لأحَدِ ثلاثَةٍ: رَجلٍ تَحَمَّلَ حُمَالَةً فَحَلَّت لَهُ المَسأَلَةُ حتى يُصِيبَهَا ثُمَّ يُمسِك، وَرَجُلٍ أصَابَتهُ جَائِحَةٌ اجتَاحَت مَالَهُ، فَحَلَّت لَهُ المَسأَلَةُ حتى يُصِيبَ قَوَاماً مِن عَيشٍ، أو قَالَ: سَدَاداً مِن عَيشٍ، وَرَجُلٍ أصَابَتهُ فَاقَةٌ حتى يَقُولَ ثَلاثَةٌ مِن ذَوِي الحِجَا مِن قَومِهِ: لَقَد أصَابَت فُلاناً فَاقة، فَحَلَّت لَهُ المَسأَلَةُ حتى يُصِيبَ قَوَاماً مِن عَيشٍ، أو قَالَ: سَدَاداً مِن عَيشٍ، فَمَا سِوَاهُنَّ مِنَ المَسأَلَةِ -يَاقُبَيصَةُ- فَسُحتٌ، يَأكُلُهَا صَاحِبُهَا سُحتاً). (رواه أحمد ومسلم وأبوداود والنسائي). واتە: بمێنەرەوە هەتا زەكاتمان بۆ دێت فەرمان ئەدەین بەشت بدەن. پاشان فەرمووی: ئەی قوبەیصە سواڵ كردن بۆ سێ كەس نەبێ دروست نىيە: پیاوێك بۆ یەك خستنی دوو لایەن خۆی تووشی قەرزاری بكات، جا داوا كردنی بۆ ڕەوایە هەتا قەرزەكەی لە كۆڵ ئەكەوێت، ئیتر ئەبێ واز بهێنێ، وە پیاوێك وەیشومەیەك بدات لە ماڵو سامانی و لەناویان ببات، جا داوا كردنی بۆ دروستە هەتا ژیانی پێ ڕێك ئەبێتەوە، وە پیاوێك تووشی هەژارییەك ببێت و سێ كەسی ژیر لە كەسوكارەكەی بڵێن: فڵان كەس تووشی هەژاری بووە، ئەوە داواكردنی بۆ ڕەوایە هەتا ژیانی پێ ڕێك ئەبێتەوە، جگە لەمانە حەرامە و هەركەس داوا بكات بەحەرامی ئەیخوات.

**ئايا كەسێك توانای كاسبی كردنی بێت زەكاتی ئەدرێتێ؟:**

ئەوكەسەی توانای كاسبی كردنی هەبێت زەكاتی نادرێتێ و هەروەك دەوڵەمەند وایە.

١- لە (عبیداللە)ی كوڕی عەدی كوڕی خیارەوە هاتووە كە ووتویەتی: دوو كەس پێیان ڕاگەیاندم كە چوونە لای پێغەمبەر ﷺ لەكاتی حەجی ماڵ ئاواییدا كاتێك زەكاتی دابەش ئەكرد، داوایان كرد بەشی ئەوانیش بدات، پێغەمبەر ﷺ سەیرێكی كردین بینی توانای كاركردنمان هەیە فەرمووی: (إن شئتُمَا أعطَيتُكُمَا وَلا حَظَّ فِيهَا لِغَنِيٍ، وَلا لِقَوِي مُكتَسِب). (رواه أبوداود والنسائي) واتە: ئەگەر حەز ئەكەن بەشتان ئەدەم، بەڵام دەوڵەمەند وبە توانا بۆ كاسبی كردن بەشی لەمەدا نییە.

(خطابي) ووتویەتی: ئەم حەدیسە بنەمایەكە بۆ ئەوەی ئەگەر كەسێك نەزانرا ماڵی هەیە وەك ئەو كەسە دائەنرێت كە ماڵی نەبێت، وە هەروەها بەڵگەیە لەسەر ئەوە كە بۆ زەكات توانای ڕواڵەتی ئیعتیباری بۆ ناكرێت هەتا توانای كاسبی كردنیشی نەخرێتە پاڵ، چونكە كەسی وا هەیە لە لاشەدا بە هێزە، بەڵام دەستەكانی بێ توانا وكارنەكەرن، جا هەر كەس ئەوە حاڵی بێت بەر گری زەكاتی لێ ناكرێت بەپێی حەدیسەكە.

٢-لە ڕەیحانی كوڕی یەزیدەوە لە عبداللە ی كوڕی عەمرەوە هاتووە كە ووتویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لاتَحِلُّ الصَّدَقَةُ لِغَنِي ولا لِذِي مِرَّةٍ سَوِي). (رواه أبوداود والترمذي وصححه). واتە: زەكات ناشێ بە دەوڵەمەند ولەش ساغی بە توانا.

ئەمەش مەزهەبی شافیعی وئیسحاق وئەبوعوبەید وئەحمەدە.

حەنەفییەكان ئەڵێن: دروستە مرۆڤی بە تواناش زەكات وەربگرێت بە مەرجێك دوو صەد درهەمی یا زیاتری نەبێت.

نەوەوی ئەڵێت: پرسیار لە غەزالی كرا دەربارەی ئەوانەی لە ماڵ دائەنیشن وعادەتیان نەگرتووە كە كار بكەن، ئایا بۆیان هەیە زەكات وەربگرن لەگەڵ فەقیراندا؟ ووتی بەڵێ. وە ئەم قسەیەی ڕاستەو قەبووڵە لەسەر ئەساسی ئەوەی كە ئەو كەسانە ئەگەر كاری شیاوی خۆیانیان دەست نەكەوێت[1].

(١) هەرچەندێك ئەو پیشەیە نزم بێت ئەوە باشترە و بەشەرافەت ترە بۆ موسڵمان وە لە بێ ئیشی و گەلۆری باشترە، وە لەوە باشترە كە دەست لە خەڵك پان بكاتەوە، یان بیدەنێ یان نەیدەنێ، وە ئەو ئیعتیبارەی باس كرا نابێت فەرموودەی پێغەمبەری ﷺ پێ تایبەت و خاص بكرێت كە فەرموویەتی: زەكات بە خاوەن دەسەڵات و ساغ ناشێت، جا وورد بەرەوە. (تمام المنة).

**کەسێك خاوەنی (نصاب) بێت بەڵام ئەوەندەی نیە بەشی خۆی بکات:**

هەرکەس خاوەنی (نصاب) بێت لە هەر جۆرە ماڵێك، بەڵام لەبەر زۆری خێزان بەشی خۆی ناکات، یا لەبەر گرانی نرخی شتومەك، جا ئەو جۆرە کەسانە بە دەوڵەمەند حیساب ئەکرێن لەو لایەنەوە کە (نصاب) یان هەیە، بۆیە زەکات لە ماڵەکەیان واجب ئەبێت، وە بە فەقیریش حیساب ئەکرێن لەولایەنەوە کە ئەوەی هەیانە بەشیان ناکات، هەر بۆیە ئەبێ لە زەکات بەشیان بدرێت وەك فەقیران.

ئەوەی ووتویەتی: هەر کەس خانووی هەبێت بەڵام ئەوەندەی ماڵ نەبێ بەشی بکات، ئەوە فەقیرە زەکاتی پێ ئەشێت، بۆ ئەوەی پێویستی خۆی پێ جێ بە جێ بکات، وە زۆری لێ ناکرێت خانووەکەی بفرۆشێت.

لە (المغني) دا هاتووە کە مەیموونی ووتویەتی: گفتوگۆم کرد لەگەڵ ئەبو عبداللە -ئەحمەدی کوڕی حەنبەل- و ووتم: جاری وا هەیە کابرایەك مەڕ وبزن و ووشترێکی وەهای هەیە کە زەکاتی تێدا واجبە، لەگەڵ ئەوەشدا فەقیرە، مەڕ وبزنەکەی چل سەر ئەبێت، وە زەوی‌و زاری کشت وکاڵیشی هەیە، بەڵام بەشی ناکات، ئایا زەکاتی پێ ئەشێت؟

ووتی: بەڵێ، چونکە ئەوەندەی نیە دەوڵەمەندی بکات وە توانای ئەوەشی نیە ئەوەندە پەیدا بکات، لەبەر ئەوە دروستە زەکات وەربگرێت، وە وەك ئەوە وایە ئەو ماڵەی کە هەیەتی زەکاتی لەسەر پێویست نەبێت.

**٣- ئەوانەی لەسەر کۆکردنەوەی زەکاتدا کار ئەکەن (العاملین علیها):**

ئەمانەش ئەو کەسانەن کە پێشەوای موسوڵمانان یا جێگرەکەی دایان ئەنێن کاربکەن بۆ کۆکردنەوەی زەکات لە دەوڵەمەندەکان. وە ئەوانەش کە دانراون بە پاسەوانی ئەو زەکاتە هەر لەوانەن، وە هەروەها شوانی ئاژەڵەکانی ئەو زەکاتە ونووسەرەکانیشی هەر لەوانەن. وە پێویستە ئەمانە موسوڵمان بن و لەو کەسانە نەبن کە زەکاتیان پێ حەرامە، لە کەس وکاری پێغەمبەر ﷺ کە بەنی هاشم و بەنی (عبد المطلب) ئەگرێتەوە.

لە (مطلب)ی کوڕی ڕەبیعەی کوڕی(حارث) ی کوڕی (عبدالمطلب)ەوە هاتووە کە ووتویەتی: من و فەزڵی کوڕی عەبباس چووین بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وە یەکێکمان قسەی کرد و ووتی: ئەی ڕەسولی خوا هاتوین دامان بنێیت لەسەر ئەم زەکات کۆکردنەوەیە بۆ ئەوەی شتێکمان دەست کەوێت وەك ئەم خەڵکە، وە ئەوەی خەڵك ئەتدەنێ بتدەینێ، ئەویش فەرمووی: (إنَّ الصَّدَقَةَ لا تَنبَغِي لِمُحَمَّدٍ، وَلا لآلِ مُحَمَّد، إنَّمَا هِيَ أوسَاخُ النَّاسِ). (رواه أحمد ومسلم) واته: بە ڕاستی زەکات بە محمد وئالی محمد ناشێت چونکە زەکات چڵکی خەڵکە.

وە لە (لفظ)ێکی تردا هاتووە فەرمویەتی: (لا تَحِلُّ لِمُحَمَّدٍ ولا لآلِ مُحَمَّدٍ) واته: بە محمد و ئالی محمد ناشێ.

ئەوکەسانەی کە لە زەکاتدا کار دەکەن ئەگەر دەوڵەمەندیش بن هەر پێیان ئەشێ. لە ئەبوسەعیدەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لا تَحِلُّ الصَّدَقَةُ لِغَنِيٍ إلا لِخَمسَةٍ: لِعَامِلٍ عَلَيهَا، أو رَجُلٍ اشتَرَاهَا بِمَالِهِ، أو غَارِمٍ، أو غَازٍ فِي سَبِيلِ اللهِ، أو مَسكِينٍ تُصِدِّقَ عَلَيهِ مِنهَا، فَأهدَى مِنهَا لِغَنِيٍ). (رواه أحمد، وأبوداود، وابن ماجه، والحاكم، وقال: صحيح على شرط الشيخين). واتە: زەکات بە دەوڵەمەند ناشێت بە پێنج جۆر نەبێت: ئەو کەسەی کە کاری تێدا ئەکات، یا کەسێك بە پارەی خۆی بیکڕێتەوە، یا قەرزدار، یا غەزاکەر لە ڕێی خوادا، یا مسکینێك کە زەکاتی درابێتێ ئەویش بەخشیبێتی بە دەوڵەمەندێك.

وە ئەو کەسانەی کە لە زەکاتدا کار ئەکەن وە زەکاتیان پێ ئەدرێت ئەو زەکاتە کرێی کارەکەیانە.

لە عبداللەی کوڕی سەعدیەوە هاتووە کە ووتویەتی: لە شام هاتمەوە چوومە لای عومەری کوڕی (خطاب) خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی: خەبەرم پێ دراوە کە تۆ کار ئەکەی لەسەر کاری موسوڵمانان وکەچی کرێشی لەسەر وەرناگریت ڕاستە؟ عبداللە ووتی: بەڵێ، چەند ئەسپێك و چەند بەندەیەکم هەیە وحاڵم باشە ئەمەوێ ئەم کارەم خێرێك بێت بۆ موسوڵمانان، عومەریش ﷺ فەرمووی: تۆ چیت ئەوێ منیش ئەوەم ئەویست، پێغەمبەریش ﷺ ماڵی بەشی من ئەدا منیش ئەم ووت: بیدە بە کەسێك لە من فەقیرتر بێت، هەتا جارێك هەندێ ماڵی دامێ منیش ووتم: بیدە بە کەسێك کە لە من زیاتر پێویستی پێیەتی، ئەویش ﷺ فەرموی: (مَا آتَاكَ اللهُ عَزَّوَجَل مِن هَذَا المَالِ، مِن غَيرِ مَسألَةٍ، وَلا إشرَافٍ فَخُذهُ فَتَمَوَّلهُ أو تَصَدَّق بِهِ، وَمَالاً، فَلا تتبِعهُ نَفسَكَ). (رواه البخاري والنسائي). واتە: خوای گەورە هەرچی لەم ماڵە دایتێ بێ ئەوەی داوای بکەیت یا بە دڵ چاوەڕوانی بکەیت وەری بگرە وبە کاری بهێنە یا بیکە بە خێر، جا ئەگەر ئاوها بۆت ڕێ نەکەوت بە دوای دا مەچۆ.

وە پێویستە ئەو کرێیەی پێیان ئەدرێ ئەوەندە بێت کە بەشیان بکات. چونکە لە موستەوریدی کوڕی شەددادەوە هاتووە کە ووتویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن وَلِيَ لَنَا عَمَلاً وَلَيسَ لَهُ مَنزِلٌ فَلْيَتَّخِذ مَنزِلاً، أو لَيسَت لَهُ زَوجَةٌ فَلْيَتَزَوَّج، أو لَيسَ لَهُ خَادِمٌ، فَلْيَتَّخِذ خَادِماً، أو لَيسَت لَهُ دَابَّةٌ فَلْيَتَّخِذ دَابَّةً، وَمَن أصَابَ شَيئاً سوى ذَلِكَ فَهُوَ غَالٍ). (رواه أحمد وأبوداود وسنده صالح). واتە: هەرکەسێك کرایە سەرپەرستی کارێك بۆمان ئەگەر خانووی نەبوو خانووی پێ بگرێت، وە ئەگەر ژنی نەبوو ژنی پێ بهێنێت، وە ئەگەر خزمەتکاری نەبوو خزمەتکار بگرێت، وە ئەگەر ووڵاغی سواری نەبوو ووڵاغ بگرێت، جا هەرکەس لە وانە زیاتر شتێکی لێ ببات ئەوە دزە.

(خطابي) ووتویەتی: ئەم حەدیسە بە دوو ڕوو لێك ئەدرێتەوە:

یەکەم: بە دروستی داناوە بە دەست هێنانی خزمەتکارو خانوو بەو کرێیەی کە لەسەرکارکردنی لەسەر زەکاتەکە وەری ئەگرێ، کە ئەو کرێیەش کرێیەکە کە ئەمەسالی ئەو وەری ئەگرن، وە بۆی نی‌یە لەوە زیاتر بکرێت.

دووەم: ئەبێ کار گوزاری زەکات خانوو خزمەتکاری هەبێت، بەڵام ئەگەر خانووی نەبوو خانووی بۆ بە کرێ بگیرێ هەتا لەسەر ئەو کارە بێت، وە ئەگەر خزمەتکاری نەبوو کەسێکی بۆ بگیرێت خزمەتی بکات وبەسی بێت بۆ کارەکانی.

٤- دڵ ڕاهێنراوەکان (المؤلفة قلوبهم) :

ئەمانە کەسانێکن کە مەبەست لێیان ئەوەیە دڵیان دەستەمۆ بکرێ و لەسەر ئیسلام ڕاهێنرێ و سابت بکرێت، چونکە باوەڕیان لاوازە، یا بۆ ئەوەی موسوڵمانان لە شەڕیان بە دوور بخرێن، یا سوود وکەڵکیان لێ وەربگیرێت بۆ پارێزگاری کردنی موسڵمانان.

زانایان ئەم کۆمەڵە ئەکەن بە دوو بەشەوە: موسوڵمان وبێ باوەڕ.

موسوڵمانەکانیان چوار جۆرن:

١- کۆمەڵێك لە گەورە پیاوانی ئیسلام و سەرۆکەکانیان، کە هاوشانیان هەیە لە بێ باوەڕەکاندا، ئەگەر زەکاتیان پێ بدرێ نومێدی موسڵمان بونی ئەوانیش ئەکرێ، وەك چۆن ئەبوبەکر ﷺ بەشی عەدی کوڕی حاتەم و (زبرقان)ی کوڕی بەدری ئەدا هەرچەندە موسوڵمانی چاکیش بوون، بەڵام بۆیە زەکاتی پێیان ئەدا چونکە پلەو شوێنی تایبەتی خۆیان هەبوو لەناو هۆزەکانیان دا.

٢-گەورە پیاوانێکی ئیتاعەت کراو لەناو قەومەکانی خۆیاندا کە موسوڵمان بوون بەڵام باوەڕیان لاوازە، ئەمانە زەکاتیان پێ ئەدرێ بەو نومێدەی لەسەر ئیسلام سابت بن و باوەڕیان بە هێزبێت ولە جیهادو هەرکارێکی تری ئیسلام دا ئامۆژگاری بکرێن، وەك ئەوانەی پێغەمبەر ﷺ بەشێکی زۆری پێدان لە غەنیمەتی هەوازین. کە هەندێ لە ئازاد کراوەکانی مەککە بوون کە ئیسلام بوو بوون بەڵام دووڕوو و باوەڕداری لاوازیان تێدا بوو، جا دوای ئەوە زۆریان باوەڕیان چەسپا وئیسلامەتی‌یان چاك کرد.

٣-کۆمەڵێ لەو موسوڵمانانەی لەسەر سنورن وە بەرامبەر وڵاتی بێ باوەڕن، ئەمانەش ئەیان درێتێ بە هیوای ئەوەی پارێزگاری سنورەکان بکەن بۆ پاراستنی موسوڵمانەکان لەناوەوەی دەوڵەتی ئیسلامی کاتێ دوژمن هێرشیان بکاتە سەر.

خاوەنی تەفسیری (المنار) ووتویەتی: منیش ئەڵێم ئەم جۆرە کارانە، پاسەوانی‌یە لە ڕێی خوادا، وە زانایان بەشی ئەمانە ئەخەنە ناو بەشی ڕێگەی خوا، وەك غەزا کردن کە مەبەست لێی پارێزگاری کردنە، وە لەمانیش لەپێشتر بۆ دڵ ڕاهێنانیان لەم زەمانەیەدا، کۆمەڵێك لە موسوڵمانانن کە کافرەکان ئەیانەوێ ڕایان بهێنن بۆ ئەوەی بچنە پاڵیان، یا بچنە ناو ئاینەکەیان. جا ئێمە ئێستا ئەبینین دەوڵەتە

ئیستیعماری‌یەكان چۆن هەوڵ ئەدەن موسوڵمانەكان بخەنە ژێر دەستیان و هەوڵ ئەدەن لە ئاینەكەیان پاشگەزیان بكەنەوە، بە وەی پارەو ماڵ تایبەت ئەكەن بۆ موسوڵمانەكان ئەوانەی خۆیان ئەیانەوێت دڵیان رابهێنن، جا هەیانە دڵیان رائەهێنن بۆ ئەوەی بیانكەن بە نەصرانی و لە چوار چێوەی ئیسلام دەریان بكەن، وە هەیانە دڵیان رائەهێنن بۆ ئەوەی بچنە پاڵیان و پارێزگاریان لێ بكەن و دوشمنایەتیان پێ بكەن دژی دەوڵەتە ئیسلامی‌یەكان و دژی یەكیەتی موسوڵمانان، جا ئایا موسوڵمانەكان لە پێش تر نین كە بە زەكات دڵیان رابهێنرێت تا ئەوانە؟

٤- كۆمەڵێك لە موسوڵمانان كە پێویستن بۆ كۆكردنەوەی زەكات وە وەرگرتنی لەو كەسانەی كە زەكات نادەن بە دەسەڵات و تەئسیری ئەمان نەبێت ـ مەگەر شەڕیان لە گەڵدا بكرێت ـ جا ئەمانە هەڵئەبژێررێن و دڵیان رائەهێنرێت بە زەكات بۆ ئەوەی هەڵسن بەو كارە بۆ یارمەتی حوكومەت، چونكە ئەوە سوكترین زیانە لە دوو زیانەكە، وە باشترینیانە.

ئەمما ئەو بێ باوەڕانەی كە زەكاتیان پێ ئەدرێت بۆ دڵ راهێنانیان دوو بەشن:

١- بێباوەڕێك ئومیدی ئەوەی لێ بكرێت ئەگەر زەكاتی بدرێتێ ودڵنەوایی بكرێت باوەر بهێنێت، وەك صەفوانی كوڕی ئومەییە كە پێغەمبەر ﷺ رۆژی فەتحی مەككە پەنایدا، وە چوار مانگ مۆڵەتی دا پێی بۆ ئەوەی بە خۆیدا بچێتەوەو رێی راست هەڵبژێرێت، وە ئەو كاتە غائیب بوو، ئەوە بوو هاتەوەو لەگەڵ موسوڵمانەكان لە جەنگی حونەیندا دژی بێ باوەڕەكان جەنگا بێ ئەوەی موسوڵمان بێت، وە پێغەمبەر ﷺ چەكەكەی بە ئەمانەت لێ وەرگرت كاتێ چوو بۆ جەنگی حونەین، جا پێغەمبەر ﷺ ووشترە ناوسێكی زۆری پێ بەخشی كە لە دۆڵێكدا بوو، صەفوان ووتی: ئەمە بەخششی كەسێكە ترسی لە هەژاری نیەیە، وە ووتی: سوێند بە خوا پێغەمبەر ﷺ ئەو ووشترانەی پێ بەخشیم كەس نەبوو ئەوەندە رقم لێی بێت، پاشان ئەوەندەی بەخشش دامێ تا وای لێ هات بوو بە خۆشەویسترین كەس لام.

٢- بێ باوەڕێك كە موسوڵمانان مەترسی زەرەر و زیانی لێ بكەن، جا ئەمە زەكاتی ئەدرێتێ بە ئومیدی ئەوەی زەرەر و زیانی دوور بخاتەوە لە موسوڵمانان، ئیبنوعەبباس فەرمویەتی: كۆمەڵێك ئەهاتنە لای پێغەمبەر ﷺ ئەگەر زەكاتی بدانایەو دڵنەوایی بكردنایە مەدحی ئاینی ئیسلامیان ئەكردو ئەیان ووت: ئاینی چاكە، وە ئەگەر نەیاندانایە زەمی ئیسلامیان ئەكرد وعەیبداریان ئەكرد. لە وانە ئەبوسوفیانی كوڕی حەرب و ئەقرەعی كوڕی حابیس و عویەینەی كوڕی (حصن) بوون. جا پێغەمبەر ﷺ صەد ووشتری دا بە هەریەكێك لەوانە.

حەنەفی‌یەكان بۆ ئەوە چوون كە بەشی دڵ راهێنراوەكان لاچووە بەوەی كە خوا عیززەتی داوە بە ئیسلام و دەسەڵاتی پەیدا كردووە. چونكە عویەینەی كوڕی حصن وە ئەقرەعی كوڕی حابیس و عەبباسی كوڕی میرداس هاتن بۆلای ئەبوبەكر ﷛ و داوای بەشەكانیان كرد، ئەبوبەكریش ﷛ نووسی كە بیان دەنێ،

کاتێ هاتن بۆ لای عمر ﷺ نوسراوەکەیان دا پێی، دڕاندی و نەیدانێ، وە فەرمووی: ئەوە شتێك بوو کە پێغەمبەر ﷺ پێی ئەبەخشین، تا ڕاتان بهێنێ لەسەر ئیسلام، ئێستا خوا عیززەت و دەسەڵاتی داوە بە ئیسلام و پێویستی بە ئێوە نییە، جا ئەگەر لەسەر ئیسلام ئەچەسپن ئەوە باشە، ئەگینا شمشێر ئەکەوێتە نێوانمان ﴿وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ۚ﴾ (الکهف/٢٩). واتە: حەق وڕاستی لای پەروەردگارتانەوەیە، جا هەرکەس ئارەزوو ئەکات باوەڕ بهێنێت و هەرکەس ئارەزوو ئەکات با بێ باوەڕ بێت. ئەوانیش گەڕانەوە بۆ لای ئەبوبەکر ﷺ پێیان ووت: تۆ خەلیفەیت یا عومەر؟ تۆ بۆت نوسین کەچی عومەر ﷺ، دڕاندی، فەرمووی: ئەو خەلیفەیە ئەگەر بیویستایە.

ووتیان: ئەبوبەکریش ﷺ چووە سەر قسەکەی عمر ﷺ، وە ئەوە بوو کەس لە یارەکانی پێغەمبەر ﷺ ئینکاری ئەوەیان نەکرد، وە هەروەها نەقڵ نەکراوە لە (عثمان)و عەلیەوە ﷺ کە بەشی کەسێك لەو جۆرە کەسانەیان دابێت.

وەڵامی ئەوەش بەمە ئەدرێتەوە کە ئەوە ئیجتیهادی عمر بوە ﷺ، وە وا تێ گەیشتووە بەرژەوەندی نییە بەشی ئەوانە بدرێت پاش ئەوەی ئیسلام لە قەومەکانیان دا عیززەتی پەیدا کرد و چەسپا، وە لە هەڵگەڕانەوەی ئەوانە زیانێکیان پێ ناگات.

وە ئەوەی کە (عثمان) ﷺ و علی ﷺ بەشی کەسیان لەو جۆرە نەداوە، بەڵگەی ئەوە نییە کە ئەوانیش ئەو جۆرە بۆ چوونەیان هەبووە لە لابردنی بەشی دڵنەوایی کراوەکان، بەڵکو لەوانەیە لەبەر ئەوە بووبێ، کە ئیحتیاجییان بەوە نەبوە دڵی کافر بە زەکات ڕابهێنرێت، ئەوەش ئەوە ناگەیەنێت کە ئیتر دروست نەبێت پێشەوایەکی تر ئەگەر پێویستی پێی بوو بەکاری بهێنێت.

ئینجا ئەوەی پشتی پێ ئەبەسترێت لە بەڵگە هێنانەوەدا کیتاب و سوننەتە، چونکە ئەو دووانە تاقە مەرجەعێکن کە بە هیچ شێوەیەك دروست نییە لادانیان لێ بکرێت. ئەوەتانێ ئەحمەدو موسلیم لە ئەنەسەوە ئەگێڕنەوە کە کەسێك نەبووە لەسەر ئیسلام داوای شتێکی لە پێغەمبەر ﷺ کردبێت و ئەی دابێتێ، هەتا جارێك پیاوێك هاتە لای داوای شتێکی لێ کرد، فەرمانی دا مەڕو بزنێکی زۆریان پێ دا، لە بەینی دووکێودا لەو مەڕو بزنانەی بە زەکات هاتبون، کابراش گەڕایەوە ناو هۆزەکەی و وتی: ئەی هۆزەکەم موسوڵمان بن، بەڕاستی محمد ﷺ بەخششی کەسێك ئەبەخشێ کە لە فەقیری و نەبوونی ناترسێت.

شەوکانی ووتویەتی: عیترەو جبائی و بەلخی و ئیبنومونەششیر ڕەئیان وایە کە دروستە بۆ دڵ ڕاهێنان زەکات بدرێت[1].

---

(١) وە هەروەها مالیك و ئەحمەدو ڕیوایەتێکی شافیعیش هەر لەسەر ئەوەن (دانەر).

شافیعی ووتویەتی: دڵ ڕاهێنانی بێ باوەر نابێ بكرێت -واتە: نابێ زەكاتیان پێ بدرێت- بەڵام فاسق دروستە لە بەشی دڵ ڕاهێنان پێی بدرێت.

ئەبوحەنیفەو هاوەڵەكانی ووتویانە: زەكات دان بە دڵ ڕاهێنراوەكان لاچووە بە هۆی بڵاو بوونەوەی ئیسلام و سەركەوتنی‌یەوە. وە بەڵگەشیان بۆ ئەوە نەدانەكەی ئەبوبەكر ﷺ بووە كە بەشی ئەبوسوفیان و عویەینە و ئەقرەع وعەبباسی كوڕی میرداسی نەدا.

بەڵام ڕاهیەن دروستە لەكاتی پێویستیدا بۆ دڵ ڕاهێنان زەكات بدرێت، بۆ نموونە ئەگەر لەسەردەمی پێشەوایەكدا كەسانێك هەبن لەبەر خاتری دونیا نەبێ بە قسەی نەكەن، وە ئەو پێشەوایە تا وەكو توندو تیژی نیشان نەدات بە قسەی نەكەن، لەم حاڵەتەدا ئەو پێشەوایە بۆی هەیە بە زەكات دان پێ‌یان دڵیان ڕابهێنێ، وە بڵاو بوونەوەی ئیسلام تێ‌یاندا بۆ ئەم حاڵەتە تایبەتی‌یە تەئسیری نی‌یە، لەبەر ئەوەی لەم ڕووداوەدا قازانجی بۆیان نەبووە.

لە (المنار)دا هاتووە: ئەم قسەیە حەقە ـ واتە: زەكات پێ دان بەو كەسانە ـ بەڵام ئیجتیهاد لە وردی‌یاتی ئەو زەكات پێدانەدا دێتە پێشەوە ئاخۆ بە كێ ئەشێت، وە ئەو ئەندازەی كە ئەدرێت ئەبێ چەندە بێت، وە لە ئەموالی غەنیمەتدا بدرێ ئەگەر هەبوو یا نا، وە ئایا لە غەیری ئەمانە بدرێت لە (أموال المصالح)، جا واجبە لەمانەدا بە ڕەئی ئەهلی شورا بێت، وەك چۆن خولەفا لە كاروبارە ئیجتیهادی‌یەكاندا ئەمەیان ئەكرد. وە ئەو قسەیەی كە ئەڵێت: بەمەرجێك دروستە بۆ دڵ ڕاهێنان زەكات بدرێت كە پێشەوا بە زۆر نەبێ نەتوانێ بیانخاتە ژێر گوێ ڕایەڵی خۆیەوە. ئەو قسەیە چاو پیاخشانێكی ئەوێت، چونكە ئەمە قاعیدەیەكی سەرتاپایی نی‌یە، بەڵكو ئەصڵ لە مەدا ئەوەیە كە هێواشترین زەرەرو چاكترین بەرژەوەندی پێش بخرێت.

**٥- زەكات دان بۆ كڕینەوەی بەندە (الرقاب) :**

ئەو بەندانە ئەگرێتەوە كە نووسراوێك ئەنووسن لە بەینی خۆیان و خاوەنەكانیاندا بۆ خۆكڕینەوەیان لێیان، جا ئەمانە ئەبێ بە ماڵی زەكات یارمەتی بدرێن بۆ گەردن ئازاد كردنیان لە كۆیلایەتی، وە هەروەها بەندەی تریش ئەگرێتەوە، كە بكڕدرێت و ئازاد بكرێت.

لە (براء)ەوە هاتووە كە ووتویەتی: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ ووتی: كردەوەیەكم پێ بڵێ ئەگەر بیكەم لە بەهەشتم نزیك بخاتەوەو لە ئاگری دۆزەخ بە دوورم كات، فەرمووی: (أعتِقِ النَّسمَةَ وَفُكَّ الرَّقَبَةَ. فَقَالَ: يَا رَسُولَ الله، أولَيسَا وَاحِداً؟ قَالَ: لا، عِتقُ الرَّقَبَةِ أن تَنفَرِدَ بِعِتقِهَا، وَفَكُّ الرَّقَبَةِ أن تُعِينَ بِثَمَنِهَا). (رواه أحمد والدارقطني ورجاله ثقات). واتە: گیان ئازاد بكە و گەردنی كۆیلە ئازاد بكە، كابراش ووتی: ئایا هەریەكێك نین؟ فەرمووی: نا گیان ئازاد كردن ئەوەیە بە تەنها خۆت بەندەكە ئازاد بكەیت، وە گەردن ئازاد كردن ئەوەیە لە نرخەكەیدا یارمەتی بدەیت خۆی پێ ئازاد بكات.

لە ئەبوهورەیرەوە هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (ثَلاثَةٌ كُلُّهُم حَقٌّ على اللهِ عَونُهُ: الغَازِي فِي سَبِيلِ اللهِ، وَالمُكَاتَبُ الَّذِي يُرِيدُ الأدَاءَ، وَالنَّاكِحُ المُتَعَفِّفُ). (رواه أحمد وأصحاب السنن، وقال الترمذي: حسن صحيح). واتە: سێ كەس لەسەر خوایە یارمەتی یان بدات: كەسێ لە ڕێی خوادا بجەنگێت دژی بێ باوەڕ، وە كەسێك نووسین بكات بۆ ئەوەی خۆی بكڕێتەوە وە نیەتی پارەدانەكەشی هەبێت بە خاوەنەكەی، وە كەسێك لەبەر داوێن پاكی ژن بهێنێت.

شەوكانی ووتویەتی: زانایان ئیختیلافیان هەیە لە مەبەستی فەرمایشتی خوا: ﴿وَفِي ٱلرِّقَابِ﴾، جا لە عەلی كوڕی (أبوطالب) و سەعیدی كوڕی جوبەیر و (لیث) و (ثوري) و عیترە و حەنەفی‌یەكان و شافیعی‌یەكان و بەشی زۆری زانایان هاتووە ووتویانە: خوا مەبەستی لەو بەندانەیە كە بۆیان نووسراوە مەبلەغێ پارە پەیدا بكەن و بیدەن بە خاوەنەكەیان بۆ ئەوەی ئازادیان بكەن، ئەوانە لە زەكات بەشیان ئەدرێت بۆ ئەوەی ئەو مەبلەغەی پێ تەواو بكەن و ڕزگاریان بێت.

لە ئیبنوعەبباس و حەسەنی بەصری و مالیك و ئەحمەدی كوڕی حەنبەل وئەبوثەورو ئەبوعوبەید -كە ئەمە ڕەئی بوخاری وئیبنومونزیریشە- ڕیوایەت كراوە كە مەبەست لە (وفي الرقاب) ئەوەیە بە پارەی زەكات بەندە وكۆیلەی پێ بكرێت و ئازاد بكرێت. وە بەڵگەیان ئەوەیە كە ئەڵێن: ئەگەر ئەمە بۆ ئەو بەندانە بووایە كە نووسین هەیە لە بەینی خۆیان و خاوەنەكانیاندا، ئەوكاتە ئەو بەندانە ئەچوونە حوكمی (الغارمین) واتە: قەرزداران، چونكە ئەمانەش هەر قەرزدارن، وە هەروەها كڕینەوەی گەردنی بەندە بۆ ئەوەی ئازاد بكرێ باشترە لە یارمەتی دانی بەندەی نووسەر، چونكە لەوانەیە بەندە یارمەتیش بدرێت بەڵام ئازاد نەكرێت، لەبەر ئەوە بەندەی نووسەر هەر بەندەیە مادام دیرهەمێكی لەسەر مابێت بیدا بە خاوەنەكەی، وە چونكە كڕین لە هەموو كاتێكدا دەست ئەدا بەڵام نوسین وا نی‌یە.

زوهری ووتویەتی: ووشەی (وفي الرقاب) هەر دووكیان ئەگرێتەوە. دانەری كتێبی (منتقى الأخبار)یش هەر بۆ ئەوە ئیشارەتی كردووە، وە زاهیرەن هەر ئەمەشە چونكە ئایەتەكە هەردوو لا ئەگرێتەوە.

وە حەدیسەكەی (براء) كە باس كرا: بەڵگەی ئەوەی تێدایە كە ئازاد كردنی گەردنی كۆیلە فەرقی هەیە لەگەڵ ئازاد كردنی گیانی كۆیلە، وە هەم ئازاد كردنی گیانەكەو هەم یارمەتی دانی بەندەی نووسەر لەو ماڵەی كە نووسراوە لەو كارانەن كە نزیك خەرەوەن لە بەهەشت و دوور خەرەوەن لە ئاگر.

٦-قەرزاران (الغارمون):

ئەوانەی كە توشی قەرز بوون و ناتوانن بیدەنەوە.

قەرزدارانیش چەند بەشێكن: هەیانە بە هۆی سوڵحەوە قەرزدار بووە، یا بۆتە زامنی قەرزێك وكەوتووە بە سەریا جا هەرچی هەبووە داوێتی لە ڕێیدا، یا قەرزی كردووە بۆ پێویستی خۆی، یا لە كردنی خراپەدا

ـەرفی كردووە و دوایی تۆبەی كردووە و پەشێمان بۆتەوە، ئەمانە هەموویان زەكات وەرئەگرن هەتا قەرزیان لەسەر بمێنێ.

١- ئەحمەدو ئەبوداودو ئیبنوماجەو (ترمذي) (كە بە حەسەنی داناوە) لە ئەنەسەوە ﷺ ئەگێڕنەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لا تَحِلُّ المَسألَةُ إلا لِثلاثٍ: لِذِي فَقرٍ مُدقِعٍ، أو لِذِي غُرمٍ مُفظِعٍ، أو لِذِي دَمٍ مُوجِعٍ). واتە: سواڵ كردن بۆ سێ كەس نەبێ ناشێت: هەژارێكی تەواو داماو، یا قەرزدارێكی زۆر گرانو لە رادە بەدەر، یا خاوەن خوێنێكی بە ئازار -واتە: ئەو كەسەی دیەی خزمێكی یا ڕەفیقێكی قاتڵی گرتۆتە ئەستۆی خۆی- .

٢-موسلیم لە ئەبوسەعیدی خودریەوە ئەگێڕێتەوە ﷺ فەرمویەتی: پیاوێك لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ میوەیەكی زۆری كڕی بوو بەو هۆیەوە تووشی قەرزارییەكی زۆر بوو، (چونكە میوەكە خراپ بوو)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (تَصَدَّقُوا عَلَيهِ) واتە: زەكاتی بدەنێ. خەڵكەكەش زەكاتیان بۆ هێنا بەڵام ئەوەندە نەبوو قەرزەكەی پێ تەواو بێت، پێغەمبەر ﷺ بە خاوەنی قەرزەكانی فەرموو: (خُذُوا مَا وَجَدتُم، وَلَيسَ لَكُم إلا ذَلِكَ). واتە: هەرچی بۆ كۆبۆتەوە ئەوە وەربگرن و لەوە زیاترتان بۆ نییە[١].

٣- لە پێشەوە حەدیسەكەی (قبيصة)ی كوڕی (مخارق) باس كرا كە ووتی: بۆ ڕێك خستنی نێوان دوو لایەن تووشی (حمالة) بووم، واتە: خۆم قەرزار كرد، هاتمە لای پێغەمبەر ﷺ داوای یارمەتیم لێ كرد فەرمووی: لێرە بمێنەوە هەتا زەكاتمان پێ ئەگات فەرمان ئەكەم بەشت بدەن.

زانایان ئەڵێن: (حمالة) ئەو مەسئولییەتەیە كە ئینسان ئەیخاتە سەر ئەستۆی خۆی و قەرزی بۆ ئەكات بۆ ئەوەی بیدات لە پێناو صوڵحی دوو لایەن، وە عەرەب عادەتیان وابوو كاتێك لەناویاندا فیتنەیەك بقەومایە پێویستی بە غەرامەو پێ بژاردن بكردایە لەسەر دیە یا لەسەر هەر شتێكی تر، یەكێكیان هەڵئەستاو ئەو مەسئولییەتەی ئەگرتە ئەستۆی خۆی بۆ ئەوەی ئاگری ئەو فیتنەیە بكوژێتەوە، وە بێ گومان ئەمەش لە ڕەوشتە جوانەكانە، وە ئەگەر بیان زانیایە كەسێك ئەوەی كردووە خێرا ئەچوون بە دەمیەوەو یارمەتیان ئەدا، وە ئەوەندەیان ئەدایە لەو قەرزە ڕزگاری ببوایە، وە ئەگەر بچوایە سواڵیشی بۆ بكردایە بە كەم وكوڕی لە پلەو پایەیدا دانەئەندرا، بەڵكو شانازی بوو.

بۆ زەكات دان بەمانە مەرج نییە نەتوانێ هەرگیز قەرزەكە بداتەوە، بەڵكو هەیە ئەتوانێ بە ماڵەكەی خۆی قەرزەكەش بداتەوە، بەڵام مادام لەسەر ئەوە قەرزار بووە بۆی هەیە ئەو زەكاتە وەربگرێ.

---

(١) ئەمە مانای ئەوە نییە ئەو قەرزەی لای ماوەتەوە لەسەری لاچوو بێت و حەقی خاوەن قەرزەكان بفەوتێ، بەڵكو مانی ئەوەیە جارێ چی پێیە وەری بگرن، وە لەسەر ئەوەی كە نییەتی زیندانی مەكەن (دانەر).

**٧-لە ڕێگای خوادا (في سبيل الله) :**

ڕێگای خوا، ئەو ڕێگایەیە کە مرۆڤ بگەیەنێت بە ڕەزامەندی خوا، جا فێر بوونی زانستی بێت، یا کارێك بێت، وە جەماوەری زانایان ڕایان وایە کە مەبەست لە ڕێگای خوا لێرەدا غەزا کردنە، وە بەشی (سبيل الله) ئەدرێت بەو جەنگاوەرانەی کە خۆ بەخشن بۆ غەزا کردن و مووچەیان نییە لە دەوڵەتەوە، جا ئەمانە بەشیان لە زەکاتدا هەیە و ئەیاندرێتێ، دەوڵەمەند بن یا هەژار وەك یەکە.

لەپێشەوە باسی ئەوەمان کرد کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (زەکات بە دەوڵەمەند ناشێت پێنج دەوڵەمەند نەبێت: یەکێ لە وانە ئەو دەوڵەمەندەیە کە لە ڕێی خوادا ئەجەنگێ دژی بێ باوەڕ ... هتد).

وە حەج کردن لە بەشی (سبيل الله) نییە کە زەکاتی تێدا سەرف بکرێت، چونکە حەج فەرزە لەسەر ئەوانەی توانایان هەیە، نە ئەوەی توانای نییە[1].

---

(١) بۆچی نا حەجیش هەر بە (في سبيل الله) ئەژمێردرێ، لەبەر ئەو دەقەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتووە. ئیبنو عەبباس ڕەزای خوای لێبێت ئەفەرمووێت:

پێغەمبەر ﷺ ویستی حەج بکات، ژنێکیش بە مێردەکەی ووت: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ حەجم پێ بکە، ئەویش ووتی: هیچم نییە کە حەجی پێ بکەیت و پێی بچیت، ژنەکە ووتی: بە ووشترە فلانییەکەت بم نێرە، ئەویش ووتی: ئاخر ئەو ووشترە لە ڕێگای خوادا بەندە، کابرا هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و ووتی: خێزانم سەلام و ڕەحمەتی خوات پێ ئەگەیەنێ، وە داواشی لە من کردووە کە لەگەڵ تۆدا بۆ حەج بینێرم، ئیتر کابرا قسەکانی بۆ گێڕایەوە، و باسی ئەوەی کرد کە داوای لێ کردووە کە بە فلانە ووشتر بینێرێت ئەویش ووتویەتی ئاخر ئەو ووشترە لە ڕێگای خوادا بەندە، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أما إنك لو أحججتها عليه، كان في سبيل الله) واتە: ئەگەر بەو ووشترە بت ناردایە بۆ حەج ئەوە هەر بە ڕێگای خوا ئەژمێردرا.

ئەبوداود بە سەنەدێکی حەسەن تەخریجی کردووە و (طبراني) لە (الكبير) دا، هەروەها حاکم و بە صەحیحیشی داناوە، هەروەها ئیبنوخوزەیمەش لە صەحیحەکەیدا، و شایەتێکیشی هەیە لە حەدیسی (أبو طلق) کە دولابی لە (الكنى) دا بە سەنەدێکی صەحیح تەخریجی کردووە، و مونزری و (حافظ)یش بە صەحیحیان داناوە، هەر لەبەر ئەوە ئیبنوکەسیر لە تەفسیری ئایەتەکەدا ووتویەتی:

لەلای ئیمام ئەحمەدو حەسەنو ئیسحاق، حەجیش هەر لە ڕێی خوا حیساب ئەکرێت، لەبەر ئەو حەدیسە -کە ئێمە باسمان کرد-

ئەمەش هەڵبژرادەی شيخ الإسلام ئیبنوتەیمییەیە کە لە (الإختيارات العلمية)دا دەفەرمووێت:

هەرکەس حەجی واجبی نەکرد و فەقیریش بوو، ئەوە ئەو پارەیەی ئەدرێتێ کە بتوانێ حەجی پێوە بکات، ئەمەش یەکێك لە ریوایەتەکانی ئەحمەدە.

لە تەفسیری (المنار)دا هاتووە: دروستە لەو بەشە سەرف بكرێت بۆ تەئمین كردنی ڕێگای حەج ودابین كردنی ئاو و خۆراك وهۆیەكانی تەندروستی بۆ حاجی‌یەكان، ئەگەر لەوە زیاتر هیچ نەبوو سەرف بكرێت بۆ ئەوانە. وە هەر لەو تەفسیرەدا هاتووە: (لە ڕێگای خوادا) هەموو بەرژەوەندی‌یە گشتی‌یەكان ئەگرێتەوە، ئەوانەی سوودی ئاین ودەوڵەتی تێ دابێت.

---

وە ئەبو عوبەید لە (الأموال) دا بە ژمارە (١٩٧٦) ریوایەتی كردووە كە لە ئیبنو عومەریان پرسی دەربارەی ئافرەتێك وەسی‌یەتی كردووە سی درهەمی بۆ خەرج بكرێت لە ڕێگای خوادا، جا پێیان ووت: ئایا لە حەجیشدا خەرجی ئەكەیت؟ ئەویش فەرمووی حەجیش هەر لە ڕێگای خوادایە. ئیسنادی ئەم ریوایەتەش صەحیحە هەروەك (حافظ) لە فەتحدا گێڕاویەتی‌یەوە (٣/٢٥٨).

وە ئەبو عوبەید بە سەنەدێكی صحیح لە ئیبنوعەبباسەوە ئەگێڕێتەوە، بە ژمارە (١٧٨٤و١٩٦٥) كە:
ئیبنوعەبباس پێی وابوو قەیناكا پیاو زەكاتی خۆی بدات لە ڕێگای حەجدا یان گەردنی كۆیلەی پێ ئازاد بكات.
و ئەو عیللەت دار كردنەی كە ئەبو عوبەید كردوویەتی ئیعتیباری بۆ نی‌یە.
-جا لە دوای پوچەڵ كردنی ئەو عیللەتە شێخ ئەلبانی دەفەرمووێت:- كەواتە ئەو عیللەتە نەماوە، وە سەیری (إرواء الغليل) بكە (٣/٣٧٦-٣٧٧).

وە یەكێك لەو شتە سەیرانە ئەوەیە كە دانەری بەڕێز ئینكاری ئەو نەصصە ئەكات كە لەوبارەیە هاتووە، پاشان هەر خۆی بەوە ئەیسەلمێنێ كە (سید رشید رضا) لە (المنار)دا باسی كردووە كە خەستەخانەی خێری گشتی و ئامادە كردنی بانگەواز كەران بۆ ئایینی ئیسلام، و نەفەقە كێشانی مەدرەسەی شەرعی‌و... هتد، هەموو لە ڕێگای خوادا ئەژمێرێت، لەگەڵ ئەوەدا كە تەفسیر كردنی ئەم ئایەتە بەو شێوە گشتی‌یە لە هیچ كام لە سەلەفەوە سابت نەبووە، وەك من بزانم، هەرچەندە صدیق حسن خانیش هەر بۆ ئەو ڕایە چووە، لە (الروضة الندية)دا بەڵام ڕەددی ئەم قسەیەی ئەدرێتەوە، وە ئەگەر بەو شێوەیە بووایە كە ئەو ئەڵێت:، ئەوە سوودێكی وا لە كۆ كردنەوەی زەكات لەو هەشت دەستەیەدا نەئەبوو كە لە ئایەتەكەدا هاتووە، وە موكین بوو كە (في سبيل الله) هەموو كارێكی خێر بگرێتەوە. وەكو مزگەوت دروست كردن و شتی تر.

هەرچەندە هیچ كەس لە موسڵمانان شتی وا ناڵێت، بەڵكو ئەبو عوبەید لە (الأموال) دا لە بڕگەی (١٩٧٩) دا ئەفەرمووێت:

قەرز دانەوە لە جیاتی مردوو، وە كفن بۆ كڕینی، و مزگەوت دروست كردن، و بیرهەڵكەندن، و ئەو جۆرە چاكانەی تر، ئەوە لەوبارەیەوە سوفیان و ئەهلی عیراق و جگە لەوان لە زانایان ئیجماعیان لەسەر ئەوە هەیە كە ئەو جۆرە كارانە بری زەكات ناكەون، لەبەر ئەوەی لەو هەشت بەشە نین كە قورئان باسیان دەكات.

وە لەمەو دووا دانەر وێنەی ئەمە باس ئەكاتەوە. (تمام المنة محمد ناصر الدين الألباني).

وە ئەووەڵی ئەو شتانەو لەپێشترینیان، خۆ ئامادە کردنە بۆ جەنگ دژی بێ باوەڕەکان بە کڕینی چەك وکەرەسەی جەنگی وخواردەمەنی جەنگاوەرەکان و ئامێری گواستنەوەو پڕچەك کردنی جەنگاوەر، بەڵام ئەو شتانەی بۆ ئامادە کردنی جەنگاوەرە لە دوای شەڕەکە ئەگەر مایەوە، ئەبێ بخرێتە (بیت المال)ەوە، ئەگەر لەو شتانە بوو کە ئەمێنێتەوە-تێك ناچێ-وەك چەك وولاغ و شتی تر، چونکە ئەم جۆرە شتانە هەمیشە بەو صیفەتەی کە غەزاکەی پێ کراوە جەنگاوەر ناتوانێ بە کاریان بێنێ، بەڵکو کاتی جەنگەکە بە کاریان دێنێ لە ڕێی خوادا، وە ئەوەی ئەمێنێتەوە ئەگێڕرێتەوە بۆ ئەوەی جارێکی تر بەکار بێتەوە لە ڕێی خوادا، بە پێچەوانەی هەژاران وکارگوزارانی زەکات و قەرزار ودڵنەوایی کراوەکان و ڕێبوار، ئەمانە هەرچی‌یان وەرگرتووە نای گێڕنەوە دوای لا چوونی ئەو صیفەتەی کە بە هۆیەوە وەریان گرتووە، بەڵام جەنگاوەران کاتێ صیفەتی لە ڕێی خوادا لەسەریان نەما، ئەبێ کەل وپەلە جەنگی‌یەکان بگێڕنەوە.

وە دروست کردنی خەستەخانەی سەربازی و خەستەخانەی گشتی خێری تریش ئەچێتە ناو مانا گشتی‌یەکەی (في سبيل الله)، وە هەروەها ڕێگا کردنەوەو قیرتاو کردنو دامەزراندنی ڕێگای ئاسنینی سەربازیش (نەك بازرگانی) وە هەروەها دروست کردنی کەشتی زرێ پۆش و بالۆن و فڕۆکەی جەنگی وقەڵاو سەنگەر.

لەو شتانە گرینگتر کە ئەمڕۆ (لە ڕێگای خوادا) زەکاتی تێدا صەرف بکرێت ئەوەیە کە بانگەوازکەرانی ئیسلام ئامادە بکرێن و ڕەوانە بکرێن بۆ وڵاتانی بێ باوەڕان لە لایەن کۆمەڵە و ڕێکخراوەکانەوە کە پارەی تەواویان بدەنێ، وەك چۆن بێ‌باوەڕەکان بەم شێوە کارئەکەن بۆ بڵاو کردنەوەی ئاینەکەیان.

هەروەها نەفەقەی قوتابخانەو زانیاری‌یە شەرعی‌یەکان و شتی تریش کە بەرژەوەندی گشتی تێدا بێت هەر ئەچێتە ناو ئەو مانا گشتی‌یەوە.

هەروەها ئەو قوتابخانانەش ئەگرێتەوە کە دەرسی شەرعی و شتی تری تێدا ئەوترێتەوە کە بەرژەوەندی گشتی تێدایە بۆ کۆمەڵ، وە ئەدرێت بە مامۆستایانی ئەو قوتابخانانە، بە مەرجێ کاری ناو قوتابخانەیان دایان ببڕێت لە ئیشی تر، وە بەشی زانای دەوڵەمەند نادرێت لەبەر زانستەکەی هەرچەند بەو زانستەی سوود بە خەڵکیش بگەیەنێت. تەواو. لە تەفسیری (المنار)دا دەرهاتوە.

**٨-ڕێبوارێك کە نەفەقەی لێ بڕابێت (ابن السبيل).**

زانایان هەموو لەسەر ئەوەن کە ئەو ڕێبوارەی لە وڵاتی خۆی دابڕابێت زەکاتی ئەدرێتێ، وە ئەوەندەی ئەدرێتێ یارمەتی بدات بۆ بەجێ هێنانی مەبەستەکانی کاتێ هیچی بەدەستەوە نەمابێو هەژار کەوت.

ئەوەشیان بە مەرج داناوە کە ئەبێت ئەو سەفەرەی لە تاعەتی خوادا کرد بێت، یان لە ڕێی شتێکدا نەبێ کە سەرپێچی کردن بێت لە فەرمانی خوا. بەڵام زانایان ئیختیلافیان هەیە لەسەر سەفەری موباح، وە

ئەوەی شافیعی یەکان هەڵیان بژاردووە ئەوەیە کە ئەو جۆرە ڕێبوارانەش لە زەکات وەرئەگرن، با سەفەرەکەشی بۆ خۆشی وگەشت وگوزار بێت.

**وە ڕێبوار (ابن السبیل) لای شافیعی یەکان دوو جۆرن:**

١-کەسێك سەفەرەکەی هەر لەناو وولاتی خۆی دا دەست پێ بکات.

٢-کەسێك لە وولاتی خۆی دەرچێت و دوور بکەوێتەوە بە سەفەر.

ئەم دوو جۆرە هەر دووکیان مافیان هەیە لە زەکات وەربگرن، با کەسێکیش هەبێت ئەوەندەیان قەرز پێ بدات کە بەشی سەفەرەکەیان بکات، وە لە شوێنەکەی خۆشی یاندا ئەوەندەیان هەبێت کاتێ گەڕانەوە ئەو قەرزەی پێ بدەنەوە.

وە لای مالیك و ئەحمەد: ئەو ڕێبوارەی مافی وەرگرتنی زەکاتی هەبێت ئەو ڕێبوارەیە کە لە وولاتی خۆی دوور کەوتبێتەوە، نەك سەفەرەکەی لەناو وولاتەکەی خۆیدا دەست پێ بکات، وە ئەگەر کەسێکی دەست بکەوێت قەرزی بداتێ وکاتێ گەڕایەوە ئەوەندەی هەبێت ئەو قەرزەی پێ بداتەوە زەکاتی نادرێتێ. بەڵام ئەگەر کەسی وای دەست نەکەوت قەرزی بداتێ، یا ئەوەندەی نەبێت لە شوێنی خۆی قەرزەکەی پێ بداتەوە زەکاتی ئەدرێتێ .

**دابەش کردنی زەکات بەسەر هەموو ئەو کەسانەدا کە پێیان ئەشێت، یا بەسەر هەندێکیاندا:**

ئەو هەشت جۆرەی مافی وەرگرتنی زەکاتیان هەیە بەپێی ئایەتەکە ئەمانەن: فەقیرەکان و مسکینەکان، کارگوزارانی زەکات، دڵنەوایی کراوەکان، بەندە وکۆیلە، قەرزارەکان، ڕێبواران، موجاهیدەکان.

**زانایان ئیختیلافیان هەیە لە دابەش کردنی زەکات بە سەر ئەماندا:**

شافیعی وهاوەڵەکانی ووتویانە: ئەگەر زەکات دەرکەر خاوەن ماڵەکە خۆی بوو یا وەکیلەکەی بوو ئەوکاتە بەشی کارگوزار نادرێت، وە پێویستە دابەش بکرێ بە سەرحەوت جۆرەکەی تردا ئەگەر هەر حەوتیان ئامادە بوون و بە دەست هاتن، ئەگینا ئەدرێ بەو جۆرانەی ئامادە بوون، وە دروست نی یە هیچ جۆرێکیان بێ بەش بکرێت ئەگەر ئامادە بوو، جا ئەگەر ئەو ئامادە بووە بەشی نەدرا ئەبێ ضامنی بەشەکەی بێت.

ئیبراهیمی نەخعی ووتویەتی: ئەگەر ماڵەکە زۆر بوو بەشی هەموو جۆرەکانی ئەکرد ئەوە ئەبێ دابەش بکرێت بە سەریاندا، بەڵام ئەگەر کەم بوو دروستە تەنها بدرێ بە جۆرێکیان.

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ووتویەتی: دابەش کردنی بە سەر هەموویاندا باشترە، وە دروستە بۆی بیدات بە یەك جۆریان.

مـاليك ووتويەتى: ئەبىّ هەولّ بدات و بگەرِیّ بزانێت كامەيان زۆر پێويستە، ئەوسا بيدا بە ئەوەيان كە لە پێش تر بێت لە نەبونى و هەژاريدا، جا ئەگەر ساڵێك نەبونى لەناو هەژارەكاندا زۆر بوو ئەوە هەژارەكان پێش بخات، بەڵام ئەگەر ساڵێكى تر بينى نەبونى لەناو رِێبوارانددا زۆر بوو بيدا بە مـان.

حەنەفىيەكان وسوفيانى ثوري ووتويانە: خاوەن زەكات سەرپشكە ئەيدات بە كىّ با بيدات.

ئەمەش لە حوزەيفەو ئيبنوعەبباسەوە ريوايەت كراوە، وە هەروەها قسەى حەسەنى بەصرى و(عطاء)ى كورِى ئەبو رِەباحيشە.

ئەبوحەنيفە ووتويەتى: بۆى هەيە بيدات بە يەك نەفەر لە يەكێك لە جۆرەكان.

**هۆى ئيختيلافى نێوان زانايان وسەرچاوەكەى:**

ئيبنورِوشد ووتويەتى: هۆى ئيختيلافى زانايان بەرەنگارى و موعارەضە كردنى (لفظ)ە لەگەڵ مەعنادا، چونكە (لفظ)ەكە وا ئەگەيەنێت كە دابەش كردنەكە لەنێوان هەموو جۆرەكاندا بكرێت، بەڵام مەعنا واى ئەگەيەنێت كەكىّ زۆر موحتاجە بدرێت بەو كەسە، چونكە مەبەست لە زەكات دەفعى ئيحتياجىيە، هەربۆيە بە لاى ئەو جۆرە زانايانەوە ژماردنى ئەو هەشت جۆرە لە ئايەتەكەدا مەبەستى ئەوەيە كە جينسى زەكات پىّ دراوەكان لە يەك جيا ببێتەوە نەك هەموويان بكرێن بە شەريك لە زەكات پىّ دانياندا. جا يەكەميان لە لايەنى (لفظ)ەوە ظاهيرترە، وە ئەمەيان لەلايەنى مەعناوە (ظاهير)ترە.

وە لە بەڵگەكانى شافيعى ئەوەيە، كە ئەبوداود ئەگێرِێتەوە لە(صدائى)يەوە كە ووتويەتى: پياوێك داواى لە پێغەمبەر ﷺ كرد زەكاتى پىّ بدات، پێغەمبەريش ﷺ پێى فەرموو: (خواى گەورە رِازى نەبووە، نە پێغەمبەر ونە كەسى تر حوكم بكەن لە زەكاتدا، خۆى زەكاتى كردووە بە هەشت بەشەوە، جا ئەگەر تۆش لە يەكىّ لەو بەشانەى، مافى خۆتت ئەدەمىّ).

**پارسەنگ دانەوەى رِاى جەماوەر بە سەر رِاى شافيعى دا:**

خاوەنى (الروضة الندية) ووتويەتى: سەرف كردنى زەكات هەمووى بۆ جۆرێكيان لىّ كۆڵينەوەى ئەوێت. سەرئەنجام: خواى گەورە زەكاتى تايبەت كردووە بە هەشت جۆرەوە، كە جگە لەو هەشتە بۆ كەسى تر نابێت، وە ئەو تايبەت كردنە ئەوە ناگەيەنێت كە هەر ئەبىّ بە يەكسانى لەناوياندا دابەش بكرێت، يا ئەگەر زەكاتەكە كەميش بێت يا زۆر بێت هەر ئەبىّ بەش بەش بكرىّ بە سەرياندا، بەڵكو مەعناى ئەوەيە كە جۆرى زەكات بۆ ئەو هەشت جۆرە ئەشێت.

جا هەركەس شتێك لەو زەكاتەى لەسەر پێويست بوو، دەرى كردو بەخشى بە يەكىّ لەو هەشت جۆرە ئەوە ئەوەى كە خوا فەرمانى پێداوە بيكات كردويەتى، وە ئەوەى خوا واجبى كردووە لەسەرى لاچووە.

بەڵام ئەگەر ووترا: پێويستە لەسەر خاوەن ماڵ -ئەگەر ماڵێكى بە دەست هێناو زەكاتى لەسەر بوو- زەكاتەكەى بەش بەش بكات بە سەر هەموو هەشت جۆرەكاندا، ئەمە ئەگەر وا فەرز بكرێت هەموو ئەو

جۆرانە هەبن ئەو کاتە ئەم کارە -جگە لەوەی ئەزیەت و ناڕاحەتی تێدایە- موخالیفی ئەوە ئەبوو کە موسوڵمانان بە سەلەف و خەلەفیانەوە کردوویانە، وە جاری وایە ئەو زەکاتەی کە هەیە شتێکی کەمە، ئەگەر دابەش بکرێت بەسەر هەمموو جۆرەکاندا کەسیان ئەو سوودەی لێ وەرناگرێ، تەنانەت ئەگەر تەنها بدرێت بە یەك جۆرو بە یەك نەفەریش بێت لەوانەیە سوودێکی وەهای لێ وەرنەگیرێ، جا ئەگەر زیاتربن لە نەفەرێك ئەوە هەر هیچ.

جا مادام ئەمەت بۆ ثابت بوو ئەو کاتە بۆت دەرئەکەوێ ئەو حەدیسەی پێغەمبەر ﷺ کە تێیدا فەرمان بە سەلەمەی کوڕی صەخر ئەکات -کاتێ کەفارەتێکی کەوتە سەر شانی وئەیبو- کە بچێ لەکارگوزاری زەکاتی بەنی زورەیق وەربگرێت، بۆ ئەوەی کەفارەتەکەی پێ بدا، بۆت دەرئەکەوێ کە ئەو حەدیسە بە کەڵك نایەت لێرەدا بەڵگەی پێ بهێنرێتەوە.

هەروەها بەڵگەیەکی وەهاش دەست ناکەوێت کە واجب بێ هەمموو زەکات بە سەرهەمموو هەشت جۆرەکەدا دابەش بکرێت.

هەروەها ئەو حەدیسەش کە پێغەمبەر ﷺ تیایدا ئەمر بە (معاذ) ئەکات زەکات لە دەوڵەمەندەکانی یەمەن وەربگرێ وبیدا بە فەقیرەکانی، ئەو حەدیسەش لێرەدا بە کەڵکی بەڵگە پێ‌هێنانەوە نایەت، چونکە ئەوەش دیسان زەکاتی کۆمەڵێك لە موسوڵمانان بوو، کە لە جینسی ئەم جۆرانەدا صەرف کرا.

هەروەها حەدیسەکەی زیادی کوڕی (حارث)ی صودائیش ـ وە ئیبنوڕوشد حەدیسەکەی پێشووی باس کرد- دیسان بە کەڵکی بەڵگە هێنانەوە نایەت.

پاشان ووتی: چونکە لە سەنەدی ئەو حەدیسەدا عبدالرحمن ی کوڕی زیادی ئیفریقی هەیە، وە لە بارەیەوە زیاتر لە یەکێك قسەیان کردووە. وە ئەگەر گریمان ئەو حەدیسە بە کەڵکی بەڵگە پێ‌هێنانەوە دێت، خۆ مەبەست لە بەش بەش کردنی زەکات بەش بەش کردنی ئەو کەسانەیە کە زەکاتیان پێ ئەشێت، هەروەك چۆن ظاهیری ئایەتەکەش ئەوە ئەگەیەنێ.

وە هەروەها ئەگەر مەبەستی ئەو حەدیسە بەش بەش کردنی خودی زەکاتەکەش بێت، وە دروست نەبێت هیچ بەشێك بدرێت بە غەیری جۆری موقابیلی، ئەوکاتە دروست نەئەبوو بەشی ئەو جۆرەی کە وجودی نی‌یە بدرێ بە جۆرێکی تر لەو جۆرانە، کە ئەمەش پێچەوانەی ئیجماعی موسوڵمانانە. وە ئەگەر ئەمە واش بێ ئەوە بە ئیعتیباری تێکڕای ئەو زەکاتانەیە کە لە لای ئیمام کۆ ئەبێتەوە، نەك بە ئیعتباری زەکاتی هەمموو تاکە فەردێکە.

کەواتە هیچ بەڵگەیەك وجودی نی‌یە کە زەکات بەش بەش کردن واجب بکات، بەڵکو دروستە هەندێك زەکات بدرێ بە هەندێك زەکات پێ شیاو، وە هەندێکی تر بدرێ بە هەندێکی تر.

بەڵێ ئەگەر ئیمام زەکاتی شوێنێکی کۆکردەوە، وە هەر هەشت جۆرەکە هەبوون لەو شوێنەدا، هەر جۆرە مافی ئەوەی هەیە داوای ئەو بەشە بکات کە خوا بۆی داناوە، بەڵام لەسەری نی‌یە وەك یەك یەك دابەشی بکات بە سەریاندا و بەشی هەموویان بدات، بەڵکو بۆی هەیە بەشی هەندێکیان زۆر و بەشی هەندێکیان کەم بدات، وە بۆی هەیە بەشی هەندێکیان بدات و بەشی هەندێکیان نەدات، ئەگەر بزانێت ئەو جۆرە دابەش کردنە بەرژەوەندی ئیسلام و موسوڵمانانی تێدایە.

بۆ نموونە ئەگەر زەکاتی هاتە لاو لەو کاتەدا جیهاد هاتە پێشەوە، وە بەرگری کردن لە موسوڵمانان و وڵاتی ئیسلام لە جەنگی کافران یا زاڵمان پێویست بوو، لەم کاتەدا بۆی هەیە ئەوانەی لە ڕێی خوادا تێ ئەکۆشن و ئەجەنگن لە پێش تر دابنێت و زەکاتیان بداتێ، با هەموو زەکاتەکەش لەواندا صەرف بکرێ، وە هەروەها هەر کاتێ بەرژەوەندی کۆمەڵێك وای پێویست کرد کە لە پێشتر بن لە جەنگاوەران ئەوە ئەدرێت بەوان[1].

**ئەوانەی زەکاتیان پێ ناشێت:**

لە پێشەوە باس کرا کە چۆن زەکات سەرف ئەکرێت و ئەوانەی زەکاتیان پێ ئەشێت کێن، ماوەتەوە باسی ئەو کەسانە بکرێت کە زەکاتیان پێ ناشێ و پێیان حەرامە، ئەوانیش ئەمانەن:

١- بێ باوەر و موڵحید: ئەمانە قسەی زانایان لەسەریان ڕێکە، چونکە لە حەدیسدا هاتووە: (زەکات لەدەوڵەمەندەکانیان وەرئەگیرێت و ئەدرێتەوە بە هەژارەکانیان) مەبەست دەوڵەمەندە موسوڵمانەکان و هەژارە موسوڵمانەکانە، جگە لەوان کەسی تر نا.

(ابن منذر) ووتویەتی: ئەو زانایانەی کە زانیاریم لێ وەرگرتوون هەموو لەسەر ئەوەن کە (ذمي) هیچ لە زەکاتی نادرێتێ، جگە لەوانەی دڵنەوایی ئەکرێن هەروەك لە پێشەوە باس کرا، بەڵام دروستە کە لە صەدەقەی سوننەت بە (ذمي) بدرێ، چونکە لە قورئاندا هاتووە کە ئەفەرمووێت: ﴿وَيُطْعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا﴾ (الإنسان/٨). واتە: هەر چەندە خواردنیان خۆش ئەوێ و پێویستیان پێیەتی، بەڵام ئەیدەن بە مسکین و هەتیو و ئەسیر.

وە لە حەدیسدا هاتووە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (صِلِي أُمَّكِ) واتە: سیلەی رەحم بگەیەنە لە گەڵ دایکت دا. ئەو دایکەش بێ باوەڕ بوو.

٢- بەنی هاشم: مەبەست لە بەنی هاشم کەس وکاری عەلی، عەقیل، جەعفەر، عەبباس و (حارث)ە، ئیبنوقودامە ووتویەتی: هیچ ئیختیلافێك نازانین هەبێ لە نێوان زانایاندا لەسەرئەوەی بەنی هاشم

---

(١) ئەمەی کە ئیبنوڕوشد باسی کرد لەناو ڕەئی‌یەکاندا پەسەندترینیانە. (دانەر).

زەكاتیان پیّ ناشیّت، چونكە پیّغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إنَّ الصَّدَقَةَ لا تَنبَغِي لآلِ مُحَمَّدٍ، إنَّمَا هِيَ أوسَاخُ النَّاسِ). (رواه مسلم) واتە: زەكات ناشیّت بە ئالی محمد چونكە چلك و پیسی خەلكە.

لە ئەبوهورەیرەوە هاتووە كە فەرمویەتی: حەسەنی كوڕی عەلی ڕەزای خوایان لیّ بیّت دەنكە خورمایەكی لە خورمای زەكات هەلگرت، پیّغەمبەر ﷺ فەرمویّ: (كخ، كخ) -بۆ ئەوەی فڕیّ ی بدات- ئەی نەت زانیوە ئیّمە نابیّت لە زەكات بخۆین. (متفق علیه)

زانایان ئیختیلافیان هەیە لەسەر (بني مطلب)، شافیعی بۆ ئەوە چووە ئەمانیش وەك بەنی هاشم بۆیان نیە زەكات وەربگرن. بەپیّی ئەوەی شافیعی و ئەحمەد و بوخاری ئەگیّڕنەوە لە جوبەیری كوڕی(مطعم)ەوە ووتویەتی: ڕۆژی گرتنی خەیبەر بوو، پیّغەمبەر ﷺ بەشی (ذوي القربی)-خزمانی خۆی- دا لە بەنی هاشم و لە(بني مطلب)، وە بەشی بەنی نەوفەل و بەنی عەبدوشەمسی نەدا، من و عسمانی كوڕی عەففان ﷺ هاتینە لای پیّغەمبەر ﷺ ووتمان: ئەی ڕەسولی خوا، ئەوانە بەنی هاشمن ئینكاری لە چاكەیان ناكەین كە خوا تۆی لەناویاندا هەلّبژاردووە، ئەی براكانمان لە بەنی (مطلب) بۆچی بەشی ئەوانت داوە و وازت لە ئیّمە هیّناوە، هەرچەندە لە خزمایەتیدا وەك یەكین بۆ تۆ؟ پیّغەمبەر ﷺ فەرمووی: (إنَّا وَبَنِي المُطَّلِبِ لانَفتَرِقُ فِي جَاهِلِيَّةٍ ولا إسلامٍ،وإنَّمَا نَحنُ وَهُم شَيءٌ وَاحِدٌ، وَشَبَّكَ بَينَ أصَابِعِهِ). واتە: ئیّمە و (بني مطلب) لە یەك جیا نابینەوە، نە لە پیّش ئیسلام و نە لە ئیسلامدا، بەلّكو ئیّمە و ئەوان یەك شتین. جا پەنجەكانی خستە ناو یەك، لە كاتیّكدا كە ئەوەی فەرموو.

ئیبنوحەزم ووتویەتی: كەواتە دەركەوت كە دروست نیە جیاوازی بخریّتە نیّوان حوكمی بەنی (مطلب)ەوە لە هیچ شتیّكدا لە بنەڕەتدا، لەبەر ئەوەی ئەوان لەگەلّ پیّغەمبەردا ﷺ یەك شتن بە دەقی قسەی خودی پیّغەمبەر ﷺ، كەواتە دەركەوت كە ئەوانیش ئالی موحەممەدن، جا كاتیّ ئالی موحەممەد بن ئەوە زەكاتیان پیّ حەرامە.

لە ئەبو حەنیفەوە هاتووە كە (بني مطلب) بۆیان هەیە زەكات وەربگرن، وە ئەم دوو ڕایە-ڕای ئیبنوحەزم و ئەبوحەنیفە-دوو ڕیوایەتن لە ئەحمەدەوە.

پیّغەمبەر ﷺ چۆن زەكاتی حەرام كردووە لەسەر بەنی هاشم بەو شیّوەیەش حەرامی كردووە لەسەر مەوالیەكانی بەنی هاشم (ئەوانەی بەندە بوون و ئازادیان كردون).

چونكە لە ئەبوڕافیعەوە كە مەولای پیّغەمبەر ﷺ بووە هاتووە كە ووتویەتی: پیّغەمبەر ﷺ پیاوێكی بەنی مەخزومی نارد بۆ زەكات كۆكردنەوە، پیاوەكەش بە منی ووت: وەرە لە گەلّما بۆ ئەوەی شتیّكت دەست بكەویّت، ووتم: نایەم هەتا نەچمە لای پیّغەمبەر ﷺ پرسیاری لیّ نەكەم، ئەلیّ: چووم بۆ لای. فەرمووی: (إنَّ الصَّدَقَةَ لا تَحِلُّ لَنَا، وَإنَّ مَوَالِي القَومِ مِن أنفُسِهِم). (رواه أحمد و أبوداود و الترمذي

وقال حسن صحيح). واتە: ئێمە زەكاتمان پێ ناشێت، وە تۆش لە ئێمەی چونكە مەوالی قەومێك هەروەك خۆیانن.

بەڵام زانایان ئیختیلافیان هەیە لە صەدەقەی سوننەتدا، ئایا ئەو خێرەشیان پێ حەرامە یان نا؟

شەوكانی ئەو رایانەی كورت كردۆتەوەو ووتویەتی: بزانە ظاهیری ئەو فەرموودەیەی كە فەرموویەتی: (لا تَحِلُّ لَنَا الصَّدَقَةُ) واتە: صەدەقەمان پێ ناشێت. ئەوەیە كە صەدەقەی فەرز و صەدەقەی سوننەتیان پێ ناشێت، وە كۆمەڵێك لە زانایان –كە (خطابي)ش لەوانە- ئیجماعی هەموو زانایانی لەسەر حەرامی هەر دوو جۆرە صەدەقەكە لەسەر پێغەمبەر ﷺ نەقڵ كردوە.

دوای ئەمە شەوكانی ئەڵێ: چەندەها كەس لە بارەی صەدەقەی سوننەتەوە لە شافیعی‌یەوە یەك قەول ئەگێڕنەوە، وە هەروەها لە ڕیوایەتێكی ئەحمەدیشدا.

ئیبنوقودامە ووتویەتی: ئەوەی لێی نەقڵ كراوە لەوبارەوە دەلالەتەكەی ئاشكرا نی‌یە. ئەمما ئالی محمد ﷺ زۆر لە حەنەفی‌یەكان ئەڵێن: دروستە صەدەقەی سوننەت بدرێ بەوان نەك صەدەقەی فەرز، ئەمەش قەولی صەحیحە لای شافیعی‌یەكان و حەنبەلی‌یەكان و زۆرێ لە زەیدی‌یەكان، وە ووتویانە: ئەوەی حەرامە لەسەریان چڵك و پیسی خەڵكە،كە ئەویش زەكاتە نەك صەدەقەی سوننەت.

لە (البحر)دا هاتووە ووتویەتی: ئەوەی صەدەقەی سوننەتی تایبەت كردوە قیاس كردنە لەسەر بەخشش و هەدیە و وەقف.

ئەبویوسف و ئەبوعەبباس ووتویانە: صەدەقەی سوننەتیشیان هەر پێ حەرامە وەك صەدەقەی واجب، چونكە بەڵگەكە ئەم باسەی شی نەكردۆتەوە[1].

**(٣و٤) نەوەكان و باو و باپیران:**

زانایان لەسەر ئەوە ڕێك كەوتون كە نابێ زەكات بدرێ بە باو و باپیرەكان، وە هەروەها دایكەكان و داپیرەكان، وە نەوەكان، و نەوەی نەوەكان، و كچەكان و ڕۆڵەكانیان، چونكە لەسەر زەكات دەر پێویستە نەفەقەی باوك و بەرەو ژوور و ڕۆڵەكانی و بەرەوخوار بكێشێت، وە ئەگەر ئەمانە هەژاریش بن بە دەوڵەمەندی ئەم دەوڵەمەندن، جا ئەگەر ئەو كەسە زەكات بدات بەمانە سوودێكی بۆ خۆی هێناوە بەوەی كە نەفەقە كێشانێكی واجبی لەسەر خۆی لاداوە.

بەڵام ئیمام مالیك باپیر و نەنك و نەوەی نەوەی جیا كردۆتەوە لەم حوكمە، وە بە دروستی ئەزانێ زەكاتیان پێ بدرێت، چونكە نەفەقەكێشانی ئەمانە لەسەر ئەو نی‌یە[1].

---

(١) ئەم ڕایە پەسەندترە. (دانەر).

جا ئەمە لە حاڵەتێکدایە کە ئەمانە فەقیر بن، ئەما ئەگەر دەوڵەمەند بوون و خۆیان بەخشی لە ڕێی خوادا بۆ غەزا لەم حاڵەتەدا بۆی هەیە لە بەشە زەکاتی (في سبيل الله) بەشیان بدات، وە هەروەها بۆی هەیە لە بەشی قەرزارەکانیش (الغارمين) بەشیان بدات، چونکە لەسەر ئەم پێویست نیە قەرزەکانیان بۆ بداتەوە، وە هەروەها لە بەشی کارگوزارانی زەکات ئەتوانێ بەشیان بدات، ئەگەر لە زەکات کۆکردنەوەدا کاریان ئەکرد.

**٥-هاوسەر (الزوجة):**

(ابن منذر) ووتویەتی: زانایان لەسەر ئەوە کۆن کە پیاو نابێت زەکاتەکەی بدات بە ژنی خۆی، وە هۆکەشی ئەوەیە نەفەقەی ژن لەسەر پیاوەکەی پێویستە، جا بە نەفەقە کێشانی ئیتر پێویستی بە زەکات نابێت، هەروەکو دایك و باوك، بەڵام ئەگەر کەسێك ژنەکەی قەرزدار بوو لە بەشی (الغارمين) بەشی بدات بۆ ئەوەی قەرزەکەی بداتەوە.

**سەرف کردنی زەکات لەو ڕووانەی نزیك بوونەوەیە لە خوا:**

نابێت زەکات لە ڕوویەکی تری نزیك بوونەوە لە خوا سەرف بکرێت، جگە لەوانەی خوا خۆی لە ئایەتی ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَـٰتُ لِلْفُقَرَآءِ وَٱلْمَسَـٰكِينِ...﴾ باسی کردوون، بۆ نمونە زەکات سەرف ناکرێت بۆ دروست کردنی مزگەوت و چاك کردنی ڕێگا و خزمەت کردنی میوان و کفن کردنی مردو و وێنەی ئەمانە.

ئەبوداود ووتویەتی: گوێم لە ئەحمەد بووە کاتێ پرسیاریان لێ کردووە ئایا لە زەکات کفن ئەکرێ بۆ مردوو؟ ئەیفەرموو: نا، وە لە زەکات قەرزی مردووش نادرێتەوە-وە ئەیفەرموو: لە زەکات قەرزی زیندو ئەدرێتەوە، بەڵام قەرزی مردووی لێ نادرێتەوە، چونکە مردوو بە (الغارم) قەرزار ناژمێرێت، ووتیان: ئەی ئەدرێ بە کەس وکاری؟ ووتی: ئەگەر قەرزەکە لەسەر کەس وکارەکەی بوو بیداتەوە بەڵێ.

**کێ هەڵئەسێت بە دابەش کردنی زەکات:**

پێغەمبەر ﷺ لە جیاتی خۆی کەسانی تری لە یارەکانی ئەنارد بۆ ئەوەی زەکات کۆبکەنەوە و دابەشی بکەنەوە بە سەر زەکات پێ شیاواندا، وە ئەبوبەکر و عومەریش ڕەزای خویان لێ بێت هەر بەم شێوە بوون، وە جیاوازی نیە لەنێوان (الأموال الظاهرة) دانەوێڵە و میوەجات و ئاژەڵ و مەعدەن، وە لە نێوان (الأموال الباطنة) کەلوپەلی بازرگانی و زێڕو زیودا، وە کاتێ عوسمان بووە جێ نشین ماوەیەك لەسەر ئەو شێوەیە ئەڕۆیشت، بەڵام کاتێ بینی کە (الأموال الباطنة) زۆر بوو سەیری کرد کۆکردنەوەی گرانە، وە لە

---

(١) ئیبنوتەیمیەیش ڕەئی وایە کە دروستە زەکات بدات بە دایك و باوکی، ئەگەر توانای نەفەقە کێشانی ئەو دووانەی نەبوو، وە هەر دوو کیشیان موحتاج بوون. (دانەر).

پشكنینی ئەو جۆرە ماڵانە زەرەر بە خاوەن ماڵەكە ئەگات، لەبەر ئەوە دابەش كردنەكەی سپارد بە خاوەن ماڵەكان[1].

زانایان لەسەر ئەوە ڕێكن كە خاوەن ماڵ خۆیان سەرپەرشتی دابەش كردنی زەكات بكەن ئەگەر هاتوو زەكاتەكە زەكاتی (الأموال الباطنة) بوو. بەپێی ئەوەی سائیبی كوڕی یەزید ووتویەتی: گوێم لە عوسمانی كوڕی عەففان ﷺ بووە لەسەر مینبەری پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەم مانگە مانگی زەكات دانتانە،

---

(١) چەند سەرنجێكی لەسەرە:

یەكەم: ئەم بینیوە لە سوننەتدا كە پێغەمبەر ﷺ كەسێكی ناردبێت بۆ كۆكردنەوەی ماڵە (باطني)یەكان ئەوانەش هەروەك دانەر بۆ خۆی باسی كردن كەلوپەلی بازرگانی و زێڕو زیوو ڕیكازە، و لە هیچ كەسم نەبینیوە لە (محدثین) كە شتی وەها بڵێن، بەڵكو ئیبنوقەییم وای نیشان داوە كە شتی وەها نەبووە، هەتا ئەو ئەڵێت ئەو ناردنە بۆ ماڵە (ظاهري) یەكانیش نەبووە بە گشتی، چونكە لە زاددا ئەڵێت:

پێغەمبەر ﷺ كارمەندەكانی ئەنارد بۆلای بیابان نشینەكان نەك بۆ دێهات و شارەكان، و پێغەمبەر ﷺ وە لە ڕەوشتی ئەو نەبوە كە كارمەندەكانی بۆلای بێجگە لە خاوەن ماڵە (ظاهري)یەكان بنێرێت، ئەوانەی كە ئاژەڵ و كشت وكاڵ و بەروبوومیان هەبووە.

وە ئەگەر ئەم قسەیەی دانەر ڕاست بووایە ئەوە ئەبووە بەڵگەی ئەوەی كە زەكات لە كەلوپەلی بازرگانیشدا هەر واجب بووە، جا وورد بەرەوە.

ئەبو عوبەید ئەفەرمووێت (١٦٤٤):

لەم مەسەلەیدا ئەگەر كەسێك بێدەنگ بوو و باسی هیچی نەكرد كە هەیبێت بۆ زەكات دان ئەوە ڕێی پێ ناگیرێت بەتایبەت ئەگەر خەڵك بە ئەمینی دابنێن.

دووەم: لە خەلیفە ڕاشیدەكانیشەوە شتی وەهام نەبینیوە كە لێوەیان ریوایەت كرابێت، بەڵكو ئەبوعوبەید بە ژمارە (١٨٠٥) و بەیهەقی (٤/١١٤) ئەگێڕنەوە لە ئەبو سەعیدی مەقبوریەوە كە فەرموویەتی:

چووم بۆلای عومەری كوڕی (خطاب) و دووسەد درهەمم بۆ برد و ووتم: ئەی ئەمیری موسڵمانان ئەمە زەكاتی ماڵەكەمە، ئەویش فەرمووی: ئەی زیرەك ئەوە گردنی خۆتت ئازاد كرد؟ منیش ووتم: بەڵێ، فەرمووی: بیبە بۆ خۆت دابەشی بكە.

سێیەم ئەوەی كە ئەڵێت: عوسمان لەسەر ئەو ڕێ و ڕەوشتە ڕۆیشتووە..هتد. من هیچ بنەمایەكم لە هیچ كتێبێكی ئاساردا بۆ نەدۆزراوەتەوە، وە وەك من بزانم هیچ پێشەوایەكی حەدیس باسی نەكردووە.

وە وا دەرئەكەوێت دانەر ئەم قسەیە و ئەوانەی پێشەوەی لە هەندێك كتێبی فیقهیەوە وەرگرتووە كە بە شوێن ریوایەتی سابت ناكەون. والله أعلم (تمام المنة).

جا هەرکەس قەرزارە با قەرزەکەی بداتەوە بۆ ئەوەی سامانەکانتان جیا بێتەوە لە قەرز و زەکاتەکەی لێ بدەن. (بەیهەقی بە ئیسنادێکی صەحیح گێڕاویەتی‌یەوە).

ئەوەی ووتویەتی: ئەمە ئیختیلافی تێدا نی‌یە، وە هاوەڵەکانمان ئیجماعی هەموو زانایانی لەسەر ئەگێڕنەوە.

ئەگەر بۆ خاوەن ماڵ رێگا هەبێت زەکاتی ماڵە (باطني)یەکانیان دابەش بکەن، ئایا ئەمە باشترە؟ یان بیدەن بە ئیمام دابەشی بکات؟

ئەوەی شافیعی‌یەکان هەڵیان بژاردووە ئەوەیە: ئەگەر ئیمامەکە دادپەروەر بێت بدرێت بەو دابەشی بکات باشترە.

وە لای حەنبەلی‌یەکان: خۆیان دابەشی بکەن باشترە، وە ئەگەر بیشی دەن بە سوڵتان دروستە.

بەڵام ئەگەر ماڵی (ظاهر) بوو لای مالیك و حەنەفی‌یەکان پێشەوای موسوڵمانان یا جێگرەکانی بۆیان هەیە داوای بکەن و وەری بگرن.

ڕای شافیعی‌یەکان و حەنبەلی‌یەکان: بۆ ماڵە (ظاهري)یەکان وەك ماڵە (باطني)یەکانە.

لە کۆڵ بوونەوەی زەکات لە ئەستۆی خاوەن ماڵەکە بە دانی زەکاتەکە بە پێشەوا، دادپەروەر بێت یان نا:

ئەگەر موسوڵمانان پێشەوایەکی موسوڵمانیان هەبوو دروستە زەکات بدرێت بەو پێشەوایە دادپەروەر بێت یا ستەمکار، وە ئەو زەکاتە لە ئەستۆی خاوەن ماڵ لا ئەچێ ئەگەر بیدا بەو پێشەوایە، بەڵام ئەگەر ئەو پێشەوایە وەك چۆن پێویستە زەکاتەکە دابەش نەکات، ئەوە باشتر وایە خاوەن زەکات خۆی دابەشی بکات بەسەر ئەوانەدا کە زەکاتیان پێ ئەشێ و مافیان لە زەکاتدا هەیە، مەگەر ئەو پێشەوایە یا کارگوزارانی زەکات داوای بکەن[1].

١- لە ئەنەسەوە هاتووە فەرمویەتی: پیاوێکی بەنی تەمیمی هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ووتی: کاتێ زەکاتەکەمم دا بە نێرراوەکەت لی‌ی پاك ئەبمەوە ئەی رەسولی خوا؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (نَعَم، إذَا أدَّيتَهَا إلى رَسُولِي فَقَد بَرِئتَ مِنهَا، فَلَكَ أجرُهَا، وَإثمُهَا على مَن بَدَّلَهَا). (رواه أحمد)[2] واتە: ئەگەر

---

(١) لەگەڵ ئەمانەشدا مەرج نی‌یە خاوەن زەکات یا پێشەوا بە هەژارەکە بڵێت: ئەوە زەکاتە، بەڵکو هەر بیداتێ بەسە (دانەر).

(٢) ئەم فەرموودەیەمان لەسەرەتای بابەتی زەکاتدا ڕوون کردەوە کە پچڕ پچڕە (مـنـقـطـع ). وە دانەر بە قسەی ئەو کەسانەدا بە هەڵە چووە کە ووتویانە پیاوەکانی پیاوانی صەحیحن (تمام المنة/الباني).

زەکاتەکەت بە نێرراوەکەم تۆ لێی پاك ئەبێتەوە و پاداشتەکەیت بۆ ئەنوسرێت، وە تاوان بۆ ئەو کەسەیە ئەی گۆڕێت.

٢- لە ئیبنومەسعودەوە ﷺ هاتووە کە ووتویەتی: پێغەمبەر ﷺ ئەیفەرموو: (إنَّها ستَكُونُ بَعدِي أثَرَةٌ، وَأُمُورٌ تُنكِرُونَهَا، قَالُوا: يَا رَسُولَ الله فَمَا تَأمُرُنَا؟ قَالَ: تُؤَدُّونَ الحَقَّ الَّذِي عَلَيكُم، وَتَسأَلُونَ اللهَ الَّذِي لَكُم) (رواه البخاري ومسلم). واتە: پاش من خۆ ویستی و هەندێ کاری نابەجێ دروست ئەبێت کە ئێوە لاتان ناخۆش ئەبێت. ووتیان: ئەی ئێمە چی بکەین وبە چی فەرمانمان پێ ئەفەرموویت؟ فەرمووی: چ مافێکی خوایی‌تان لەسەرە بیدەن، وە داوای مافی خۆتان لە خوا بکەن.

٣- لە وائیلی کوڕی حیجرەوە هاتووە فەرمویەتی: گوێم لەپێغەمبەر ﷺ بووکاتێ پیاوێك پرسیاری لێ کرد، چی ئەفەرموویت ئەگەرسەرۆکەکانمان مافەکانمان زەوت بکەن و داوای مافی خۆیان بکەن لێمان؟ فەرمووی: (إسْمَعُوا وَأطِيعُوا، فَإنَّمَا عَلَيهِم مَا حُمِّلُوا، وَعَلَيكُم مَا حُمِّلتُم) (رواه مسلم) واتە: گوێ ڕایەڵ وملکەچ بن، ئەوان کۆڵی سەرشانی خۆیان هەڵئەگرن و ئێوەش کۆڵی سەرشانی خۆتان.

شەوکانی ووتویەتی: ئەوحەدیسانەی لەم بارەوە باس کراون، جومهور کردویانە بە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە دروستە زەکات بدرێتە دەست فەرمانڕەوای ستەمکاریش. وە ئەوکەسە زەکاتەکەی لەکۆڵ ئەکەوێت.

ئەمە بەنیسبەت پێشەوای موسوڵمانان لەووڵاتی ئیسلامیدا، ئەما بەنیسبەت دانی زەکات بەم حوکومەتانەی ئەم سەردەمە، (شیخ رشید رضا) دەربارەی ووتویەتی: (بەڵام بەشی زۆری موسوڵمانان لەم سەردەمەدا حکومەتی ئیسلامی‌یان نی‌یە ئیسلامەتی ڕابگرێ و بانگەوازی بۆ بکات و پارێزگاری لێ بکات و جیهادی پێویست و عەین یاجیهادی کیفایەت بکات، وەیاساکانی خوا بەجێ بگەیەنێت لە حەددی شەرعی وتۆڵە و بەشەکانی تری، وەزەکاتی موسوڵمانان وەربگرێت وەك خوا پێویستی کردووە و دابەشی بکاتەوە بەپێی فەرموودەی خوای گەورە، بەڵکوبەشی زۆریان لەژێر سوڵتە و دەسەڵاتی بێگانەدان، وە هەندێکیان ژێردەستەی حکومەتێکی هەڵگەڕاوە لە ئاینن یامولحیدن، وە هەندێ لەو ووڵاتانەی کە ژێردەستەی دەوڵەتە ڕۆژئاوایی‌یەکانن کۆمەڵە سەرکردەیەکیان هەیە لەو موسوڵمانانەی کە هەر لەڕووی جوغرافیاوە موسوڵمانن، ئەو دەوڵەتە ڕۆژئاوایی‌یانە ئەو سەرکردانەیان کردووە بەئامێری دەستی خۆیان بۆملکەچ کردنی میللەتان، ئەویش بەناوی ئیسلامەوە، تاوەکو ئیسلامیان پێ بڕوخێنن، وە بەحوکمی ئەودەسەڵات و سەروەتەی کە هەیانە تەسەڕوف ئەکەن لە هەرشتێکدا کە صیفەتێکی دینی پێوەیە، وەك ماڵی زەکات و ئەوقاف و وێنەی ئەمانە).

ئەم جۆرەحوکومەتانە دروست نی‌یە هیچ لە زەکاتیان بدرێتە دەست، نازناوی ئەو سەرۆکە هەرچی بێت، وە ئاینی ڕەسمیشی هەرچی بێت، بەڵام پاش ماوە حکومەتە ئیسلامی‌یەکان، ئەوانەی کە سەرۆکەکانیان و پێشەواکانیان لەسەر ئاینی ئیسلامن و بێگانە دەستی نی‌یە بەسەریاندا لە ماڵی موسوڵماناندا ئەمانەن

کە پێویستە زەکاتی (ظاهرة) و (باطنة)یان بدرێتە دەست ئەگەر خۆیان ویستیان، با لەهەندێ فەرمان ڕەواییشیاندا ستەمکاربن، وەك زانایان وتویانە -تەواو-.

**پەسەندیەتی زەکات دان بە پیاوچاکان:**

زەکات خۆی ئەدرێت بەموسوڵمان، ئەگەر لەوانە بوو کەبەشی لەزەکاتدا هەیە و شیاوی زەکاتن، جا ئەو موسوڵمانە چ فاسق بێت یا پیاوچاك، بەڵام ئەگەر زانرا پیاوخراپەکە زەکاتەکە ئەبێتە یارمەتی دەری بۆ ئەنجام دانی ئەوەی کە خوا حەرامی کردوە، ئەوە ئەبێ زەکاتەکەی نەدرێتێ بۆ ئەوەی ڕێی خراپەی لێ بگیرێت. بەڵام ئەگەر هیچ دەربارەی نەئەزانرا، یا ئەزانرا کە سوودی لێ وەرئەگرێت، زەکاتەکەی ئەدرێتێ. وە پێویستە زەکات دەر زەکاتەکەی تایبەت بکات بۆپیاوچاکان و زانایان و چاکەکاران.

لە ئەبوسەعیدی خودریەوە ﷺ هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَثَلُ المُؤمِنِ، وَمَثَلُ الإِيمَانِ، كَمَثَلِ الفَرَسِ فِي آخِيَتِهِ، يَجُولُ، ثُمَّ يَرجِعُ إلى آخِيَتِهِ، وإنَّ المُؤمِنَ يَسهُو ثُمَّ يَرجِعُ إلى الإِيمَانِ، فَأَطعِمُوا طَعَامَكُم الأتقِيَاءَ، وَأَولُوا مَعرُوفَكُم المُؤمِنِينَ) (رواه أحمد بسند جيد و حسنه السيوطي) واتە: ئیماندار و ئیمان وەك ئەو ئەسپەو ئەوسنگە وایە کە پێوەی بەستراوەتەوە، کە چۆن لەسنگەکە دوور ئەکەوێتەوە و پاشان ئەگەڕێتەوە بۆلای. وە ئیمانداریش خەتا ئەکات و پاشان ئەگەڕێتەوە بۆلای ئیمانەکەی، جا ئێوە نان بدەن بە لەخواترسەکان و چاکەکانیشتان پێشکەش بە ئیمانداران بکەن.

ئیبنو تەیمیەیە وتویەتی: هەرکەس لەوانەی موحتاجن نوێژ نەکات، هیچی نادرێتێ تاوەکو تۆبە نەکا و نەچێتە سەر نوێژ کردن.

ئەمە ڕاستە چونکی تەرکی نوێژ تاوانێکی گەورەیە، وەدروست نیە ئەوکەسەی ئەو تاوانە ئەکات یارمەتی بدرێت، تاوەکو تۆبە نەکات.

وەهەر لە تیپی نوێژنەکەران حیساب ئەکرێ ئەو گاڵتەجاڕ و ڕێز نەگرانەی کە لە خراپە کۆتا ناکەن و لەحەرام دەست بەردار نابن، ئەوانەی ویژدانیان مردووە و فیترەتیان کوێر بۆتەوە و ئامرازی هەست کردن بەخێر تیایاندا لە کار کەوتووە، جائەم جۆرە کەسانەش نابێت زەکاتیان پێ بدرێت، مەگەر ئەو زەکات پێدانە بەرەو لایەکی چاکەیان بەرێ، و یارمەتی خۆ چاك کردنیان بدات بەمە کە هێزی پاڵنەریان بەرەو خێر تێدا زیندوو بکاتەوە و هەست و سۆزی دینداریان تێدا بهاووژێنێ.

**نابێ صەدەقەدەر صەدەقەکەی بکڕێتەوە:**

پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە خاوەن زەکات زەکاتەکەی خۆی بکڕێتەوە، بۆ ئەوەی پەشیمان نەبێتەوە لەوەی کە بۆ خوا وازی هێناوە لیی، وەك چۆن قەدەغەی کردبوو کۆچ کردووەکان بگەڕێنەوە بۆمەککە پاش ئەوەی بە کۆچ کردن بەجێیان هێشتبوو.

لە عەبدالله ی کوڕی عومەرەوە خوایان لێ ڕازی بێت هاتووە کە فەرمویەتی: عمر ﷺ ئەسپێکی دا بە کابرایەك لەرێی خوادا، پاش ماوەیەك بینیەوە ئەفرۆشرێت، عمر ﷺ ویستی بیکڕێتەوە، لەوبارەیەوە پرسیاری لەپێغەمبەر ﷺ کرد؟ ئەویش فەرموی: (لا تَبتَعهُ، وَلا تَعُد فِي صَدَقَتِكَ). (رواه الشيخان وأبوداود والنسائي). واتە: مەی کڕەرەوە، و لە صەدەقەکەت پەشێمان مەبەرەوە.

ئەوەی ووتویەتی: ئەم نەهی‌یە نەهی تەنزیهە نەك تەحریم، چونکە کەراهەتی هەیە کەسێك صەدەقەیەك بکات یا زەکاتێك بدات، یا کەفارەتی ئەزرێك بدات، یا هەرشتێك بدات لەرێی خواداو بیکڕێتەوە لەوکەسەی شتەکەی پێ داوە، یا پێی بەخشیوە، یا بە ئارەزوی خۆی کردوویەتی‌یە خاوەنی، بەڵام ئەگەر بە میرات دەستی کەوتەوە ئەوە قەیناکە.

(ابن بطال) ووتویەتی: بەشی زۆری زانایان بەکەراهەتی دائەنێن کەسێك ئەوصەدەقەی داوێتی بیکڕێتەوە بەپێی ئەوحەدیسەی عمر ﷺ.

(ابن منذر) ووتویەتی: حەسەن و عیکریمە و رەبیعە و ئەوزاعی ڕێیان داوە صەدەقە بکڕێتەوە.

ئیبنوحەزمیش ئەو ڕایەی پێش خستوە، بەڵگەشی حەدیسەکەی ئەبوسەعیدی خودری‌یە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لا تَحلُّ الصَّدَقَةُ لِغَنِي إلا لِخَمسَةٍ: لِغَازٍ فِي سَبِيلِ الله، أو لِعَامِلٍ عَلَيهَا، أو لِغَارِمٍ، أو رَجُلٍ اشتَرَاهَا بِمَالِهِ، أو لِرَجُلٍ كَانَ لَهُ جَارٌ مِسكِينٌ فَتَصَدَّقَ على المِسكِينِ، فَأهدَاهَا المِسكِينُ لِلغَنِي). واتە: زەکات ناشێت بە دەوڵەمەند مەگەر پێنج جۆر نەبێت: دەوڵەمەندێك لەرێی خوادا بجەنگێت، یا کارگوزارێك لە زەکاتدا کاربکات، یا قەرزارێك توشی قەرزای‌یەکی زۆر بێت، یا کەسێك بەپارەی خۆی بیکڕێتەوە، یاکەسێك دراوسێ‌یەکی هەژاری هەبێت و زەکاتی پێ بدات، ئەویش بیبەخشێ بە دەوڵەمەندێك[1].

**پەسەندی زەکات دان بەمێرد و خزم:**

(١) ئەوەی کە لە حەدیسەکەوە بۆم دەرئەکەوێت ئەوەیە کە مەبەست پێی، ئەو صەدەقەیە پیاوێك ئەیدات بە فەقیرێك، لە دوایی‌دا کەسێك ئەیکڕێتەوە، غەیری ئەوەی کە صەدەقەی داوە، جا ئەگەر ئێمە سەلماندمان کە مەبەستی ئەو کەسەشە کە زەکاتەکە ئەدات، ئەوە بە حەدیسەکەی عومەر تایبەت ئەکرێت، کە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو:

مەی‌کڕەرەوە. کەواتە بۆی ڕەوا نی‌یە. وە ئەوەی کە پاڵپشتی ئەم یەکخستنەی ئێمەیە فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ لە کۆتایی حەدیسەکەدا: (لە صەدەقەکەت پەشێمان مەبەرەوە) چونکە حەدیسەکەی ئەبو سەعید ئەگەر بەوشێوەیە شی بکرێتەوە کە من باسم کردووە، ئەوە باسی پەشێمان بوونەوەی لە صەدەقە تێدا نی‌یە، جا وورد بەرەوە. (تمام المنة).

ئەگەر ژنێك ماڵی هەبوو زەكاتی لەسەر واجب بوو بۆی هەیە زەكاتەكەی بدات بە مێردەكەی خۆی ئەگەر پێویستی پێی هەبوو، وە ئەگەر لەوانە بوو زەكاتیان پێ ئەشێت، چونكە لەسەر ئەوژنە نی‌یە نەفەقەی مێردەكەی بكێشێت، وە پاداشتەكەشی لای خواچاكترە لەوەی بیدات بە بێگانەیەك.

لە ئەبوسەعیدی خودری‌یەوە ﷺ هاتووە فەرموویەتی: زەینەبی ژنی ئیبنومەسعود ووتی: ئەی نێرراوی خوا تۆ ئەمرۆ فەرمانت كرد بە صەدەقە كردن، منیش خشڵم هەیە ئەمەوێت بیكەم بە صەدەقە، بەڵام ئیبنومەسعودی مێردم ئەڵێت، خۆم و كوڕەكەم لەپێشترین لە هەركەسێكی تر كە صەدەقەیان پێ بدەی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (صَدَقَ ابنُ مَسعُودٍ، زَوجُكِ وَوَلَدُكِ أحَقُّ مَن تَصَدَّقتِ بِهِ عَلَيهِم). (رواه البخاري) واتە: ئیبنومەسعود ڕاست ئەكات، مێردەكەت و كوڕەكەت لەپێش ترن ئەو صەدەقەیان پێ بدەیت.

ئەوەش مەزهەبی شافیعی‌و (ابن منذر) و ئەبویوسف ومحمد و (ظاهري)یەكان و ڕیوایەتێكی ئەحمەدە.

وە ئەبوحەنیفە و كەسانی تر بۆ ئەوە چوون: دروست نی‌یە ژن زەكاتی خۆی بدات بەمێردەكەی، وە ووتویانە: حەدیسەكەی زەینەب لەبارەی صەدەقەی سوننەتەوە بووە نەك واجب.

مالیك ووتویەتی: ئەگەر ئەوەی لە ژنەكەی وەرئەگرێت یارمەتی دەربێت لەسەر ئەوەی كە نەفەقەی ئەوژنە بكێشێت دروست نی‌یە ئەوزەكاتەی بدرێتێ، بەڵام ئەگەر بۆ نەفەقەی ئەوی صەرف نەكرد دروستە.

ئەما تێكرای خزمانی تر وەك برا و خوشك و خاڵ و مام و پور ئەمانە دروستە زەكاتیان بدرێتێ ئەگەر شایەنی زەكات بوون، لە ووتەی زۆری زانایان. بەپێی ئەوەی كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الصَّدَقَةُ علی المِسكِينِ صَدَقَةٌ، وعلی ذِي القَرَابَةِ اثنَتَانِ: صِلَةٌ وَصَدَقَةٌ). (رواه أحمد والنسائي والترمذي وحسنه) واتە: صەدەقە دان بە مسكین یەك صەدەقەیە، بەڵام بە خزم دووانە: هەم سیلەی ڕەحم و هەم صەدەقە.

## دانی زەكات بە قوتابیانی ئاینی نەك بە خوا پەرستان (العُبَّاد):

ئەوەی ووتویەتی: ئەگەر هاتوو قوتابی ئاینی توانای ئیشێكی هەبوو ئەو ئیشەش شیاوی خۆی بوو، بەڵام بە هەندێ زانستی شەرعی‌یەوە خەریك بوو، بە شێوەیەك ئەگەر ئیش بكات ئەو زانستی‌یەی لە دەست بچێت، ئەوە دروستە ئیشەكە نەكات و زەكاتی بدرێتێ، چونكە فێربوونی زانست فەرزی كیفایەتە.

ئەگەر كەسێك ئەو زانستی‌یەی بۆ بە دەست نەئەهات و توانای كاری هەبوو، ئەوە زەكاتی پێ ناشێت با لە قوتابخانەكەشدا دانیشتبێت، ئەوەی باسمان كرد ڕاست و مەشهورە.

وە ووتویەتی: بەڵام ئەگەر كەسێك خۆی بە خوا پەرستی سوننەتەوە خەریك بكات بە شێوەیەك ئەگەر ئیش بكات ئەو خوا پەرستی‌یەی پێ نەكرێت، یا نەتوانێ هەموو وەختەكەی بدات بەو خوا پەرستی‌یە زەكاتی پێ ناشێت بە ڕێكەوتنی زانایان، چونكە بەرژەوەندی ئەو خوا پەرستی‌یە، ئەوە تەنها بۆ خۆیەتی، بە پێچەوانەی ئەوانەوە كە خەریكی زانستی شەرعین .

**قەرز لە کۆڵ کەوتن بە زەکات:**

نەوەوی لە (المجموع)دا ووتویەتی: ئەگەر کابرایەکی دەست کورت قەرزدار بوو، وە زەکاتیشی کەوتە سەر، جا ویستی قەرزەکەی بخاتە بری زەکاتەکەی، وە بە قەرزارەکەی بڵێ: ئەوا قەرزەکەتم خستە بری زەکاتەکەم. ئایا بری ئەکەوێ یان نا؟ دوو قەول هەیە:

یەکەم و راستترینیان: دروست نی یە بۆی، کە ئەمیش مەزهەبی ئەحمەد و ئەبوحەنیفەیە، چونکە زەکات لە ئەستۆی دایە وە لە کۆڵی ناکەوێت تاوەکوو نەیگەیەنێتە دەستی موستەحەققی زەکات.

دووەم: دروستە، ئەمەش مەزهەبی حەسەنی بەصری و (عطاء)ە، لەبەر ئەوەی ئەگەر قەرزارەکە قەرزەکە بداتەوە بە خاوەن قەرز، وە خاوەن قەرز بە نی یەتی زەکات بیداتەوە دەستی دروستە، کەواتە ئەگەر هەر یەکەم جار قەرزەکەی لێ وەرنەگرێتەوە و لە باتی زەکاتەکە داینێ ئەویش دروستە، وەك ئەوەی مەبلەغێك پارەی لای کەسێك بە سپاردن دانابوو، پاشان بیخاتە بریتی زەکات دروستە، چ وەری بگرێتەوە و ئینجا بیداتێ، یان تازە هەروەری نەگرێتەوە.

بەڵام ئەگەر زەکاتەکەی دا بە کەسێك بەو مەرجەی لە جیاتی قەرزەکەی بۆی بگێڕێتەوە، ئەو زەکات دانە دروست نی یە و زەکاتەکەی لەکۆڵ ناکەوێت، بە ڕای هەموو زانایان.

وە قەرزدانەوە بەو شێوەیە ڕاست نی یە بە ڕای هەموو زانایان. بەڵام ئەگەر هەردووکیان ئەو نی یەتەیان هەبێت بەڵام نەیکەنە مەرج، ئەوە دروستە بەڕای هەموو زانایان و زەکاتەکەی لەکۆڵ ئەکەوێت، وە هەروەها ئەگەر ئەو قەرزارە زەکاتەکەی کە وەری گرتووە لەباتی قەرزەکە بۆ زەکات دەری بگێڕێتەوە دروستە، (وەکو ووتمان: مادام نەیکەنە مەرج).

**بردنی زەکات بۆ شوێنێکی تر:**

زانایان هەموو لەسەر ئەوەن کە دروستە زەکات ببرێت بۆ زەکات پێ شیاو لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر، ئەگەر هاتوو لەو شارەدا کە زەکاتەکەی لێ دەرکراوە کەسی موستەحەققی تێدا نەبێت.

بەڵام ئەگەر لەناو خۆیاندا کەسێك هەبوو پێویستی بەو زەکاتە هەبوو، ئەوە چەند فەرمودەیەك هاتووە کە دان بەوەدا ئەنێت کە زەکاتی هەر شارە ئەدرێت بە هەژارانی خۆی، وە نابردرێ بۆ شارێکی تر، چونکە مەبەست لە زەکات دەوڵەمەندکردنی هەژاری هەموو شارەکانە، وە ئەگەر ڕەوا بێ ئەو زەکاتە ببرێت بۆ شارێکی تر، شارەکەی خۆشی هەژاری تێدا بێت، ئەبێتە هۆی ئەوەی هەژارەکانی ئەم شارە هەر بە موحتاجی بمێننەوە.

لە حەدیسەکەی معاذ دا کە لە پێشەوە باسمان کرد هاتووە فەرموویەتی: (پێیان ڕابگەیەنە زەکاتیان لەسەر پێویستە کە لە دەوڵەمەندەکانیان وەرئەگیرێت و ئەدرێتەوە بە هەژارەکانیان).

لە ئەبوجوحەیفەوە هاتووە ووتویەتی: (زەکات وەرگری پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لامان و زەکاتی لە دەوڵەمەندەکانمان وەرگرت و دایەوە بە هەژارەکانمان، من منداڵێکی هەتیو بووم ووشترێکی گەنجی پێ دام) (رواه الترمذي وحسنه)[1].

لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە هاتووە ووتویەتی: (کردمیان بە سەرپەرشتی زەکات کۆکردنەوە، کاتێ گەرامەوە پێیان ووتم: کوا زەکاتەکە؟ منیش ووتم: بۆچی بۆ ماڵی زەکات منتان ناردووە؟ وەرمان گرت، وەك چۆن لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ دا وەرمان ئەگرت وە دامانەوە بەوکەسانەی کە ئەوکاتە ئەمان دانێ). (ئەبوداود و ئیبنوماجە گێڕاویانەتەوە).

وە لە طاووسەوە هاتووە ووتویەتی: (لە نامەکەی موعازدا هاتووە: کەسێك لە شارێکەوە بچێت بۆ شارێکی تر ئەوە زەکاتەکەی و دەیەکەکەی بۆ شاری هۆزەکەیەتی). (أثرم) لە سوننەتەکەیدا گێڕاویانەتەوە[2].

زانایان ئەم حەدیسانەیان کردۆتە بەڵگەی ئەوەی کە وا بە شەرع دانراوە کە زەکاتی هەر شارە بۆ هەژارەکانی خۆی بێت. وە زانایان جیاوازیان هەیە لە گواستنەوەی زەکات لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر لە دوای ئەوەی کە هەموو ڕایان لەسەر ئەوەیە کە دروستە بگوێزرێتەوە بۆ شوێنێکی تر، بە مەرجێك خەڵکی ئەو شارە خۆی کەسی موستەحەققی تێدا نەبێت، وەك لە پێشەوە باس کرا.

جا حەنەفی‌یەکان ووتویانە: گواستنەوەی کەراهەتی هەیە، مەگەر گواستنەوەکە بۆ خزم وکەس وکارێکی موحتاج بێت، چونکە لەمەیاندا سیلەی رەحم و بەسەرکردنەوەش بەجێ دێت، یا ببرێت بۆ کۆمەڵێك کە موحتاج ترن لە هەژارەکانی شارەکەی خۆی، یا ئەو گواستنەوەیە زیاتر مەسڵەحەتی موسوڵمانانی تێدا بێ، یا لە ووڵاتی جەنگەوە ببرێت بۆ ووڵاتی ئیسلام، یا ببرێت بۆ قوتابیانی ئاینی، یا ئەو زەکاتە لە پێش تەواو بوونی ساڵ بەسەریدا بدرێت، لە هەموو ئەم حاڵانەدا گواستنەوەی کەراهەتی نی‌یە.

شافیعی‌یەکان ووتویانە: دروست نی‌یە زەکات بگوێزرێتەوە، وە پێویستە لەو شارەدا سەرف بکرێت کە زەکاتەکەی تێدا پێویست بووە، مەگەر ئەو شوێنە کەسی تێدا نەبێت زەکاتی پێ بشێت، چونکە لە عەمری

---

(١) ئیسنادەکەی (ترمذي) ئەشعەث ی تێدایە لە عەونی کوڕی ئەبی جوحەیفەوە کە حافظ لە (التقریب)دا ئەڵێت: لاوازە، لەوانەیە بە حەسەن دانانی (ترمذي) لەبەر شاهیدەکانی بووبێت وەکو حەدیسەکەی موعاز کە دانەر لەپێش ئەمەدا باسی کرد.

(٢) ئەوە مونقەطیعە (پچڕاوە) لە نێوان طاوس وموعازدا. چونکە (طاوس) لە موعازی نەبیستوە، هەروەك (حافظ) لە دەقێکی پێشوودا باسی کردووە لەژێر ناونیشانی: نرخ دان لەجیاتی شتەکە، وە ئیبنوزەنجەویە وەك ئەوەی تەخریج کردووە. (تمام المنة/ألباني).

کوڕی شوعەیبەوە هاتووە کە موعاذی کوڕی جەبەل لەوکاتەوە کە پێغەمبەر ﷺ ناردبووی بۆ یەمەن هەر لەناو سوپادا ماوەتەوە، هەتا پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کرد، پاشان هات بۆلای (عمر) ﷺ (عمر)یش لە شوێنی خۆی هێشتی‌یەوە، پاش ماوەیەك سێ‌یەکی زەکاتی ئەو شوێنەی نارد بۆ عمر ﷺ، عمر ئەو کارەی لا ناخۆش بوو پێی فەرموو: من تۆم بە جابی نەناردووە، یا بە سەرانەوەرگر، بەڵکو بۆ ئەوەی زەکات لە دەوڵەمەندەکانیان وەربگریت و بیدەیتەوە بە هەژارەکانیان. موعازیش ووتی: من شتێکم بۆ نەناردووی کەس لەوێ پێویستی پێی هەبێت ولێم وەربگرێت. جا کاتێ ساڵی داهاتوو هات نیوەی زەکاتی ئەو شوێنەی بۆ نارد، دووبارە وەك ساڵی پێشوو ئەو قسەیە لە بەینیاندا ڕووی دا، ساڵی سێ‌یەم هەموو زەکاتەکەی بۆ نارد، عمریش ﷺ وەك ساڵانی پێشوو پێی ووتەوە، موعازیش ووتی‌یەوە: کەسم دەست نەکەوت هیچم لێوەربگرێت. (ئەبوعوبەید گێراویەتی‌یەوە)[1].

مالیك ئەڵێت: دروست نی‌یە زەکات نەقڵ بکرێت، مەگەر خەڵکی شارێکی تر شتێکیان لێ بقەومێت و پێویست بن، ئەوکاتە پێشەوای موسوڵمانان بۆیان ئەبات بەپێی بۆ چوون و ئیجتیهاد.

حەنبەلی‌یەکان ئەڵێن: دروست نی‌یە زەکات ماوەی ئەوەندە نەقل بکرێت کە نوێژ کورت کردنەوەی تێدا ئەکرێت، وە پێویستە سەرف بکرێت لە شارەکەی خۆیدا یا لە دەور و پشتی دا بە شێوەیەك ئەوەندەی لێ دوور نەبێت نوێژی تێدا کورت بکرێتەوە.

ئەبوداود ووتویەتی: گوێم لێ بووە پرسیارکراوە لە ئەحمەد دەربارەی ناردنی زەکات لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر؟ ووتی: نەء دروست نی‌یە، ووتیان: ئەی ئەگەر خزمی ئەوکەسەی لێ بێت؟ ووتی: نابێت. بەڵام ئەگەر خەڵکی شارەکەی خۆی پێویستی‌یان پێی نەبوو ئەوە گواستنەوەی دروستە، وە لەسەر ئەمەش حەدیسەکەی ئەبوعوبەیدیان کردۆتە بەڵگە کە لەپێشەوە باس کرا.

ئیبنوقودامە ووتویەتی: ئەگەر کەسێك موخالەفەی کرد و زەکاتەکەی برد بۆ شارێکی تر زەکاتەکەی لە کۆڵ ئەکەوێت، بەپێی ڕای بەشی زۆری زانایان.

بەڵام ئەگەر پیاوێك دانیشتووی شارێك بوو ماڵ و سامانەکەشی لە شارێکی تر بوو لەم حاڵەتەدا ئەوەی ئیعتیباری هەیە ئەو شارەیە کە ماڵ وسامانەکەی تێدایە، چونکە ئەو شارە هۆی پێویست بوونی ئەو زەکاتەیە و موستەحەققەکانی ئەو شارە چاویان لەو ماڵ و سامانەیە.

---

(١) ئەم ئیسنادەش مونقە طیــعـە چونکە عەمری کوڕی شوعەیب نەگەیشتووە بە موعاز و لەنێوان کۆچی دواییاندا صەد ساڵیان فەرقە

سوودێك (جند) شارێك بووە لە یەمەن. هەروەکو لە قاموسدا هاتووە (تمام المنة/ألباني)

بەڵام ئەگەر هەندێکی لەو شوێنە بێت کە خۆی تێیدا دانیشتووەو هەندێکی تری لە شارێکی تر، ئەوە هەر شوێنە زەکاتی خۆی لێ بدات. ئەمە بۆ زەکاتی سامانو دارایی، بەڵام زەکاتی سەرفیترە لەو شارەدا دابەش ئەکرێت کە تێیدا لەسەری پێویست بووە، سامانەکەی چ لەو شارەبێت یا لە شوێنێکی تر، چونکە سەرفیترە لەسەر خۆیەتی و خۆی بووەتە هۆی پێویست بوونی نەك سامانەکەی.

**دابەش کردنی زەکات بەهەڵە:**

لە پێشەوە باس کرا کێ زەکاتی پێ ئەشێ و کێ پێی ناشێت. بەڵام ئەگەر زەکات دەر لەبەر تێك چوو زەکاتەکەی دا بە کەسێك زەکاتی پێ نەئەشیا و ئەوەی زەکاتی پێ ئەشیا هیچی نەدایە، بێ ئەوەی پێی بزانێت، پاشان هەڵەکەی لادەرکەوت. ئایا ئەو زەکات دانەی دروستە و لە کۆڵی ئەکەوێت، یا فەرزێکە و هەر لە ئەستۆی دایە هەتا جارێکی تر زەکات دەر ئەکاتەوە و ئەیدات بەوانەی پێیان ئەشێت؟

**رای زانایان لەسەر ئەوە جیاوازە:**

ئەبوحەنیفە و محمد و حسن و ئەبوعوبەید وتویانە: ئەو زەکات دانەی دروستە و داوای دانی زەکاتی تری لێ ناکرێتەوە. چونکە لە مەعنی کوڕی یەزیدەوە هاتووە وتویەتی: باوکم چەند دینارێکی دەرکرد بۆ ئەوەی بیکات بە صەدەقە، لای کابرایەك لە مزگەوتدا دای نا، منیش هاتم لەکابرام وەرگرت و هێنامەوە، ئەویش وتی: سوێند بە خوا مەبەستم ئەوە نەبوو بیدەم بە تۆ، منیش کێشەکەم برد بۆ لای پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (لَكَ مَانَوَيتَ يَا يَزِيد، وَلَكَ مَا أخَذتَ يَا مَعن). (رواه أحمد و البخاري). واتە: ئەی یەزید نیەیەتی چیت بووە ئەوەت بۆ نوسراوە، وە ئەی مەعن چیت وەرگرتووە بۆ خۆتە.

ئەم حەدیسە هەرچەندە ئیحتیمالی ئەوەی تێدایە ئەو صەدەقەیە سوننەت بووبێ، بەڵام لەفظی (ما) لە فەرموودەکەیدا (لك مانويت) عموم ئەگەیەنێت.

ئەم جەماعەتە بۆیان هەیە حەدیسەکەی ئەبوهورەیرەش بکەنە بەڵگە کە وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (قَالَ رَجُلٌ لأتَصَدَّقَنَّ اللَّيلَةَ بِصَدَقَةٍ، فَخَرَجَ بِصَدَقَتِهِ، فَوَضَعَهَا فِي يَدِ سَارِقٍ، فَأصبَحُوا يَتَحَدَّثُونَ تُصُدِّقَ اللَّيلَةَ على سَارِقٍ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ لَكَ الحَمدُ، لأتَصَدَّقَنَّ بِصَدَقَةٍ، فَخَرَجَ بِصَدَقَتِهِ فَوَضَعَهَا فِي يَدِ زَانِيَةٍ، فَأصبَحُوا يَتَحَدَّثُونَ: تُصُدِّقَ الليلةُ على زَانِيَةٍ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ لَكَ الحَمدُ على زَانِيَةٍ، لأتَصَدَّقَنَّ بِصَدَقَةٍ، فَخَرَجَ بِصَدَقَتِهِ فَوَضَعَهَا فِي يَدِ غَنِيٍ. فَأصبَحُوا يَتَحَدَّثُونَ: تُصُدِّقَ اللَّيلَةَ على غَنِيٍ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ لَكَ الحَمدُ على زَانِيَةٍ، وعلى سَارِقٍ، وعلى غَنِيٍ، فَأُتِيَ فَقِيلَ لَهُ: أمَّا صَدَقَتُكَ على سَارِقٍ فَلَعَلَّهُ أن يَستَعِفَّ عَن سَرِقَتِهِ. وَأمَّا الزَّانِيَةُ فَلَعَلَّهَا أن تَستَعِفَّ بِهِ عَن زِنَاهَا. وَأمَّا الغَنِيُّ، فَلَعَلَّهُ أن يَعتَبِرَ فَيُنفِقَ مِمَّا آتَاهُ اللهُ عَزَّوَجَل). (رواه البخاري ومسلم). واتە: پیاوێکی بەنی ئیسرائیلی وتی: ئەمشەو صەدەقەیەك ئەکەم، صەدەقەکەی هەڵگرت و چووە دەرەوە خستیە دەستی دزێکەوە -بێ ئەوەی بزانێت- بەیانی خەڵکی لەبارەی ئەوەوە قسەیان ئەکرد و ئەیان وت: ئەمشەو صەدەقەیەك دراوە بە دزێك. کابراش وتی: خوایە -

لەسەر هەموو حاڵێك- سوپاس بۆ تۆ، صەدەقەیەکی تر ئەکەم، بە صەدەقەکەیەوە چووە دەرێ و خستی‌یە دەستی ئافرەتێکی زیناکەرەوە، بەیانی خەڵکی لەو بارەوە ئەدوان وئەیان ووت: ئەمشەو صەدەقەیەك دراوە بە ئافرەتێکی زیناکار، کابراش ووتی: خوایە -لەسەر هەموو حاڵێك- سوپاس بۆ تۆ، صەدەقەیەکی ترئەکەم، بە صەدەقەکەیەوە چووە دەرێ و خستی‌یە دەستی پیاوێکی دەوڵەمەندەوە، بەیانی خەڵکی لەوبارەوە ئەدوان و ئەیان ووت: ئەمشەو صەدەقەیەك دراوە بە دەوڵەمەندێك. کابراش ووتی: خوایە -لەسەرهەموو حاڵێك- سوپاس بۆ تۆ، صەدەقە درا بە دزێكو ئافرەتێکی زیناکارو دەوڵەمەندێك. جا لەخەویدا هاتن پێ‌یان ووت: ئەمما ئەو صەدەقەیەی کە دات بە دزێك ئەوە بەڵکو ئەو دزە لە دزی کردن دوور کەوێتەوە، وە ئەمما ئەو صەدەقەیەی کە دات بە ئافرەتێکی زیناکار بەڵکو بە هۆی ئەوەوە لە زینا دوور کەوێتەوە، وە ئەمما ئەو صەدەقەیەی کە دات بە دەوڵەمەندێك، ئەوە بەڵکو پەند وعیبرەت وەربگرێ و لەوەی خوا پێ‌ی داوە لە رێ‌ی خوادا ببەخشێت.

وە لەبەر ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ بەو پیاوەی فەرموو: کاتێ داوای زەکاتی کرد: (إن كُنتَ مِن تِلكَ الأجزَاءِ أعطَيتُكَ حَقَّكَ). واتە: ئەگەر تۆش لەوبەشانەی زەکاتیان پێ ئەشێت ئەوە مافی خۆتت ئەدەمێ.

هەروەها بەشی دوو پیاوی بە توانای داو فەرمووی: (إن شِئتُمَا أعطَيتُكُمَا مِنهَا، وَلا حَظَّ فِيهَا لِغَنِي وَلا لِقَوِيٍ مُكتَسِبٍ). واتە: ئەگەر حەز ئەکەن بەشتان ئەدەم لێ‌ی، بەڵام دەوڵەمەند و بە توانا بۆ ئیش بەشی پێوە نی‌یە.

لە(المغنی)دا هاتووە: ئەگەر حەقیقەتی دەوڵەمەندی ئیعتیباری بۆ بکرایە پێغەمبەر ﷺ بە قسەکەیان ئیکتیفای نەئەکرد.

مالیك و شافیعی و ئەبویوسف و (ثوري)و (ابن منذر) بۆ ئەوە چوون کە ئەوکەسە زەکاتەکەی لە کۆڵ ناکەوێت تاوەکو ئەیدا بە کەسێکی موستەحەق، ئەگەر بۆی دەرکەوت هەڵەی کردووە، وە ئەبێت جارێکی تر زەکاتەکەی دەربکاتەوە و بیدات بە موستەحەق، چونکی واجبەکەی داوە بە کەسێك کە موستەحەققی نی‌یە، هەر بۆیە لە ئەستۆی لاناچێت، وەك قەرزی ئادەمیزاد.

لە مەزهەبی ئەحمەددا: ئەگەر کەسێك زەکاتی دا بە کەسێك وای ئەزانی هەژارە، دوایی دەرکەوت دەوڵەمەندە، ئەوە دوو ریوایەتی لەسەرە:

یەکێکیان ئەڵێت: دروستە، ئەوی تریان ئەڵێت: دروست نی‌یە. بەڵام ئەگەر دەرکەوت وەرگرەکە عەبدە، یا کافرە، یا لە بەنی هاشمە، یا لەو خزمانەیە کە نابێت زەکاتیان بداتێ، ئەوە زەکاتەکەی لە کۆڵ نابێتەوە، وە هەریەك ریوایەتیش هەیە لەوبارەوە، لەبەر ئەوەی هەژار و دەوڵەمەند لە یەك جیا کردنەوە گرانە. بەڵام

ئەوانی تر نا: ﴿يَحْسَبُهُمُ ٱلْجَاهِلُ أَغْنِيَآءَ مِنَ ٱلتَّعَفُّفِ﴾ (البقرة/٢٧٣). واتە: ئەوەی کە ئاگای لە حاڵیان نییە وا ئەزانێ دەوڵەمەندن لەبەر ئەوەی خۆیان لە سواڵ کردن ئەپارێزن.

**ئاشکرا کردنی زەکات:**

دروستە بۆ زەکات دەر زەکاتەکەی ئاشکرا بکات و خەڵك پێی بزانن، چ زەکاتی فەرز بێت یا خێری تر، بێ ئەوەی ریای تێدا بکات، بەڵام شاردنەوەی چاکترە. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِن تُبْدُواْ ٱلصَّدَقَـٰتِ فَنِعِمَّا هِيَ وَإِن تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا ٱلْفُقَرَآءَ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ (البقرة:٢٧١). واتە: ئەگەر صەدەقەکانتان بە ئاشکرا بدەن ئەوە زۆر باشە، بەڵام ئەگەر بە نهێنی بیدەن بۆ ئێوە خێری زۆرترە و باشترە بۆتان.

وە لای ئەحمەد و بوخاری و موسلیم، لە ئەبوهورەیرەوە هاتووە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (سَبعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللهُ فِي ظِلِّهِ يَومَ لا ظِلَّ إلا ظِلُّهُ: الإمَامُ العَادِلُ، وَشَابٌّ نَشأَ فِي عِبَادَةِ الله، وَرَجُلٌ قَلبُهُ مُعَلَّقٌ بالمَسَاجِدِ، وَرَجُلانِ تَحابَّا فِي اللهِ عَزَّوَجَل، إجتَمَعَا عَلَيهِ، وَتَفَرَّقَا عَلَيهِ، وَرَجُلٌ تَصَدَّقَ بِصَدَقَةٍ فَأخفَاهَا حتى لا تَعلَمُ شِمَالُهُ مَا تُنفِقُهُ يَمينُهُ، وَرَجُلٌ ذَكَرَ اللهَ خَالياً فَفَاضَت عَينَاهُ، وَرَجُلٌ دَعَتهُ امرَأةٌ ذَاتُ مَنصِبٍ وَجَمَالٍ إلى نَفسِهَا فَقَالَ: إنِّي أخَافُ اللهَ عَزَّوَجَلّ) واتە: حەوت کەس خوا ئەیانخاتە ژێر سێبەری خۆی لە رۆژێکدا سێبەر نییە جگە لە سێبەری ئەو: پێشەوای دادپەروەر، گەنجێك لە خواپەرستی دا پەروەردە بووبێ، پیاوێك دڵی بەسترابێت بە مزگەوتەوە، وە دوو پیاو لەبەر خوا یەکتریان خۆش بوێت و هەر لەبەر ئەویش لە یەك بن و جیاوەبن، وە پیاوێك صەدەقەیەك بکات و بیشارێتەوە بە شێوەیەك دەستی چەپی بە دەستی راستی نەزانێ بەو بەخشینە، وە پیاوێك هەرکاتێك یادی خوا بکات چاوەکانی پڕ بن لە فرمێسك، وە پیاوێك ئافرەتێکی خاوەن پلە و پایە و جوان بانگی بکات بۆ خراپەکردن لە گەڵیا، بەڵام بڵێت: من لە خوای گەورە ئەترسم.

## سەر فیترە

سەر فیترە: واتە: ئەو زەکاتەی بە هۆی بەربانگ لە رەمەزانا و پێش مانگی رەمەزان پێویست ئەبێت.

ئەم زەکاتەش پێویستە لەسەر هەموو کەسێکی موسوڵمان گەورە بێت یا بچوك، نێر بێت یا مێ، ئازاد بێت یا بەندە.

بوخاری و موسلیم لە ئیبنوعومەرەوە خوایان لێ رازی بێت ئەگێرنەوە فەرموویەتی: (پێغەمبەر ﷺ سەرفیترەی پێویست کرد لە رەمەزاندا بە دانی صاعێك خورما یا صاعێك جۆ لەسەر بەندە و ئازاد و نێر و مێ و گەورە و بچوك لە موسوڵمانان).

**حیكمەتی سەر فیترە:**

سەر فیترە لە ساڵی دووەمی كۆچی لە مانگی شەعباندا دانرا، بۆ ئەوەی ببێتە پاك كەرەوە بۆ ڕۆژووان لەو خراپانەی كە لەوانەیە لێی وەشابێتەوە، وەك قسەی خراپ و ناڵەبار. وە هەروەها بۆ ئەوەی ببێتە یارمەتی دەری هەژاران و لێ قەوماوانی موسوڵمانان.

ئەبوداود و ئیبنوماجە و دارەقوطني ئەگێرنەوە: لە ئیبنوعەبباسەوە خوا لێیان ڕازی بێت فەرموویەتی: (پێغەمبەر ﷺ سەرفیترەی پێویست كرد لەسەر موسوڵمانان بۆ پاك كردنەوەی ڕۆژووان لە قسەی خراپ و ناڵەبارو ڕۆزیێكیش ئەبێت بۆ هەژاران، جا هەركەس پێش نوێژی جەژن دای ئەوە زەكاتێكی قەبوڵ كراوە، وە هەركەس دوای نوێژ دای ئەوە صەدەقەیەكە لە صەدەقەكان).

**لەسەر كێ واجبە:**

سەر فیترە پێویستە لەسەر موسوڵمانێك كە ئازاد (واتە: بەردە نەبێت)، وە خاوەنی صاعێك بێت كە لە قووتی خۆی و خێزانی زیاد بێت، شەو و ڕۆژێك، وە پێویستە لە جیاتی خۆی و ئەو كەسانەی واجبە نەفەقەیان بكێشێ -وەك ژن و منداڵەكانی و ئەو خزمەتكارانەی كە بۆ خۆی بە كاروباریان هەڵئەستێ و نەفەقەیان ئەكێشێ- سەرە فیترە بدات.

**ئەندازەكەی:**

ئەوەی پێویستە لەسەرە فیترەدا بدرێ یەك صاعە كە بریتییە لە چوار (مد) -كە ١مد=٥٤٤گرام- گەنم یا جۆ یا خورما یا مێوژ یا كەشك یا برنج یا گەنمەشامی، یا وێنەی ئەمانە كە بە قوت دائەنرێن. وە ئەبوحەنیفە ڕێی داوە لە جیاتی ئەمانە نرخەكەی بدرێت، وە ووتویەتی: ئەگەر كەسێك سەر فیترەكەی لە گەنم بدات نیوصاع بدات دروستە.

ئەبوسەعیدی خودری ووتویەتی: (كاتێ پێغەمبەرمان ﷺ لەناودا مابوو سەرفیترەی گەورە و بچوك و ئازاد و بەندەمان دەرئەكرد، صاعێك خواردەمەنی، یا كەشك، یا جۆ، یا خورما، یا مێوژ بوو، ئیتر هەر بەو شێوەیە سەرفیترەمان دەرئەكرد، هەتا كاتێ موعاویە هات بۆ حەج یا عومرە لەسەر مینبەر ووتارێكی دا ووتی: من وا ئەزانم نیوصاع (دووەمد) لە گەنمی یەمەن هاوتای صاعێك (چوار مد) خورما ئەبێت، جا لەو كاتەوە خەڵك ئەوەیان وەرگرتووە. وە ئەبوسەعید ئەی ووت: بەڵام من هێشتا لەسەر شێوەی پێشوو سەرە فیترە ئەدەم، و هەتا ئەمرم هەروا ئەیم) (جەماعەت گێڕاویانەتەوە[1]).

---

(١) دانەر بەڵگەی بەم حەدیسە هێناوەتەوە، لەسەر ئەوەی كە واجب لە گەنمدا صاعێكە، بەپێی ئەوەی كە لە حەدیسەكەدایە (صاعاً من طعام)، ئەویش لەسەر قسەی (خطابي) بینای كردووە، كە ووتویەتی لێرەدا مەبەست بەو

(ترمذي) ووتویەتی: هەندێ لە زانایان ڕەئیان وایە کە لە هەموو قوتێکدا ئەبێ صاعێك بێت، کە ئەمەش قسەی شافیعی و ئیسحاقە.

هەندێ لە زانایان ووتویانە: لە هەموو شتێك صاعێکە، گەنم نەبێت نیوصاع دروستە، ئەمەش قسەی سوفیان و ئیبنوموبارەك و خەڵکی کوفەیە.

---

خواردنە گەنمە، بەڵام ئیبنومونزیر ڕەددی ئەو قسەیەی داوەتەوە، کە ئەبو سەعید بە گشتی باسی خواردنی کردووە، لە دواییدا شی کردۆتەوە.

پاشان حەدیسەکەی ئەبو سەعیدی هێناوەتەوە کە لای بوخاری هەیە بەم زاراوەیە:

لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ سەرفیترەمان ڕۆژی جەژن یەك صاع لە خواردن ئەدا، ئەبو سەعید ئەڵێت: خواردنی ئێمەش جۆو مێوژو کەشك‌و خورما بوو، (حافظ) ووتویەتی: ئەم قسەیەی کە ووتویەتی ئاشکرایە، و (طحاوي)یش هەروەکو ئەوەی تەخریج کردووە و لەو بارەیەوە ووتویەتی: جگە لەوانە نابێت دەربکرێت.

لەدواییدا (حافظ) چەند ڕێگایەك و زاراوەیەکی تری بۆ حەدیسەکەی ئەبو سەعید باس کردووە و ووتویەتی: ئەم ڕێگایانە بەڵگەی ئەوەن کە مەبەست بە خواردن لە حەدیسەکەی ئەبو سەعیدا گەنم نی‌یە، لەوانەشە مەبەستی گەنمەشامی بووبێت، چونکە ئەمڕۆ هەر ئەوە ناسراوە لای خەڵکی حیجاز و قوتی زۆربەشیانە.

منیش ئەڵێم: کەواتە ئەو قسەیەی دانەر باسی کردووە لە حەدیسەکەدا هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نی‌یە، ئینجا ئەم قسەیەشی ئاماژە بۆ ئەوە ئەکات کە بۆچوونی ئەبو حەنیفە لەوەدا کە نیو صاع گەنم بدرێت، هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نی‌یە، ئەوە نەبێت کە لە حەدیسەکەی ئەبو سەعیدا هاتووە کە موعاویە دەستکاری کردووە و کردوویەتی بە دوو مشت گەنم، لە جیاتی یەك صاع خورما، ئەم قسەیەش وا نی‌یە چونکە چەند حەدیسێکی مەرفوعی لەبارەوە هاتووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە صەحیحترینیان حەدیسەکەی عوروەی کوڕی زوبەیرە کە ووتویەتی: ئەسمائی کچی ئەبوبەکر لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ بیویستایە سەرفیترە دەربکات لە بری کەس‌وکاری چ ئازاد و چ بەندە لە بری هەریەکەیان دوو مشت گەنمی دەر ئەکرد، یان یەك صاع خورما کە بە مشت ئەیپێورا، یان بەو صاعەی کە پێوانەیان ئەکردو بەکاریان ئەهێنا، (طحاوي) بەم لەفزە تەخریجی کردووە، هەروەها ئیبنوئەبی شەیبە و ئەحمەد، و سەنەدەکەشی لەسەر مەرجی شەیخەین صەحیحە.

وە لەم بەشەدا چەند ئەسەرێکی مورسەل و موسنەد هەیە کە یەکتر بەهێز ئەکەن، هەروەکو ئیبنوقەییم لە زاددا باسی کردووە و ئەم حەدیسانەی هێناوەتەوە، جا هەرکەس ئەیەوێ با بۆی بگەڕێتەوە، هەروەها منیش لە (التعليقات الجياد) دا تەخریجم کردووە.

جا بەوە سابت ئەبێت کە ئەوەی واجب بێت لە سەرفترەدا لە گەنم نیوصاعە، ئەمەش هەڵبژاردەی شيخ الإسلام ئیبنوتەیمی‌یەیە هەروەکو لە (الإختيارت) دا هاتووە (ل٦٠) و ئیبنوقەییمیش هەر بەلای ئەو قسەیەدا چووە هەروەك باس کرا، و هەر ئەمەش حەقە (إن شاء الله) (تمام المنة).

**كەی واجب ئەبێت؟**

زانایان هەموو لەسەر ئەوەن كە لە كۆتایی مانگی ڕەمەزاندا پێویستە دەربكرێت، بەڵام لە دەست نیشان كردنی ئەو كاتەی كە پێویستە تێیدا دەربكرێت ئیختیلافیان هەیە:

جا (ثوري) و ئەحمەد و ئیسحاق و شافیعی لە قەولی تازەیدا و مالیك لە یەكێ لە دوو ڕیوایەتەیدا ئەڵێن: كاتی پێویست بوونی، ڕۆژئاوا بوونی شەوی جەژنە، چونكە ئەو كاتە كاتی جەژنی ڕەمەزانە كە بۆ بەیانی ڕۆژووی تێدا ئەشكێ.

وە ئەبوحەنیفەو (لیث) و شافیعی لە قەولی كۆنیدا و مالیك لە دووەم ڕیوایەتیدا ئەڵێن: كاتی پێویست بوونی طلوعی فەجری ڕۆژی جەژنە.

سوودی ئەم ئیختیلافە ئەوەیە: مندالێك لە پێش طلوعی فەجری ڕۆژی جەژن لە دایك ئەبێت، وە دوای ڕۆژ ئاوا بوون، ئایا سەرفیترەی لەسەرە یان نا؟ لەسەر قەولی یەكەم: پێویست نابێت، چونكە دوای كاتی پێویست بوون لە دایك بووە، وە لەسەر قەولی دووەم: پێویست ئەبێت، چونكە پێش كاتی پێویست بوون لە دایك بووە.

**ئایا دروستە پێش كاتی پێویست بوونی بدرێت؟**

جومهوری زانایان لەسەر ئەوەن كە دروستە سەر فیترە پێش بخرێت بە ڕۆژێك یا دوو ڕۆژ پێش جەژن.

ئیبنوعومەر خوا لێیان ڕازی بێت فەرمویەتی: (پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ ئەكردین كە پێش ئەوەی خەڵكی بچنە دەر بۆ نوێژی جەژن سەر فیترە بدرێت).

نافیع ووتویەتی: ئیبنوعومەر ڕەزای خوایان لێ بێت ڕۆژێك یا دوو ڕۆژ پێش جەژن سەر فیترەی دەرئەكرد. وە لە نێوان زانایان ئیختیلاف هەیە لەسەر ئەوەی ئەگەر لەوە زیاتر پێش بخرێت. جا لای ئەبوحەنیفە: دروستە لە پێش مانگی ڕەمەزاندا بدرێت، وە شافیعی ووتویەتی: دروستە لەسەرەتای مانگەوە بدرێت.

مالیك و ئەوەی بە ناوبانگە لە مەزهەبی ئەحمەددا ئەڵێن: دروستە ڕۆژێك یا دوو ڕۆژ پێش جەژن بخرێت.

زانایان ڕێكن لەسەر ئەوەی كە سەر فیترە بە دواكەوتنی لە كۆڵ ناكەوێت دوای پێویست بوونی، بەڵكو لە گەردنیا ئەمێنێتەوە هەتا ئەیدات، با لە كۆتایی ژیانیشدا بێت.

وە لەسەر ئەوەشن: كە نابێت دووا بخرێت لە ڕۆژی جەژن بەولاوە، ئەوە نەبێت كە لە ئیبنوسیرین و نەخەعیەوە نەقڵ كراوە، ووتویانە: دروست نی یە لە ڕۆژی جەژن بەولاوە دووا بخرێت. ئەحمەد ووتویەتی: ئومێدم وایە كە ئەو دوواخستنە خراپ نەبێت.

ئیبنوڕیسلان ووتویەتی: دوواخستنی حەرامە بە پێك هاتنی هەموو زانایان، چونكی زەكاتە، كەواتە لە دوواخستنەكەیدا تاوان هەیە، وەك چۆن نوێژ لەكاتی خۆی دەرچێ تاوانە.

لە پێشەوە ئەو حەدیسە باس کرا (مَن أدَّاهَا قَبلَ الصَّلاةِ فَهِيَ زَكاةٌ مَقبُولَةٌ، وَمَن أدَّاهَا بَعدَ الصَّلاةِ فَهِيَ صَدَقَةٌ مِنَ الصَّدَقَاتِ) واتە: هەرکەس پێش نوێژ گەیاندی‌یە جێ ئەوە زەکاتێکی قەبوڵ کراوە، وە هەر کەس گەیاندیە دوای نوێژ ئەوە صەدەقەیەکە لە صەدەقەکان.

**سەرفیترە ئەدرێ بە کێ:**

زەکات بە چ کەسانێك ئەدرێ، سەرە فیترەش بەو کەسانە ئەدرێت، واتە: دابەش ئەکرێت بە سەر ئەو هەشت جۆرەی کە باس کراوە لە ئایەتی: ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَـٰتُ لِلْفُقَرَآءِ﴾[1].

وە هەژاران لە هەموو جۆرەکانی تر لە پێش ترن بۆ وەرگرتنی سەرە فیترە، بەپێی ئەو حەدیسەی لە پێشەوە باس کرا کە ئەفەرمووێت: (پێغەمبەر ﷺ سەر فیترەی پێویست کرد بۆ ئەوەی ببێتە پاك کەرەوە بۆ ڕۆژووان لە قسەی خراپ و ناڵەبار و خواردنێکیش بێت بۆ (مساكين).

وە بەپێی ئەوەی بەیهەقی و (دارقطني) لە ئیبنوعومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ ئەگێڕنەوە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ سەرفیترەی لەسەر موسوڵمانان پێویست کرد و فەرمووی: (أغنُوهُم فِي هَذَا اليَومِ) واتە: لەم ڕۆژەدا بێ ئیحتیاجیان بکەن.

لە ڕیوایەتێکی تردا فەرموویەتی: (أغنُوهُم مِنَ الطَّوَافِ فِي هَذَا اليَومِ) واتە: ئەمڕۆ بێ ئیحتیاجیان بکەن لە سووڕانەوە بۆ سواڵ کردن.[2]

(١) ئەو دابەش کردنە سوننەتی عەمەلی لەسەر نی‌یە بەڵکو بەپێی حەدیس ئەدرێت بە هەژاران کە ئەفەرموێت: ﴿...وطعمة للمساكين﴾ واتە خواردنێکە بۆ مسکینەکان، مەبەستی تایبەت کردنیەتی بەوانەوە، بەڵام ئایەتەکە لەبارەی زەکاتی ماڵە، نەك بۆ سەرفترە، بەڵگەش ئایەتەکەی پێشەوەیە کە دەفەرمووێت: ﴿ومنهم من يلمزك في الصدقات فإن أعطوا منها رضوا﴾، واتە لەو دووڕووانە کەسانێك هەیە کە تۆ عەیبدار ئەکات لە زەکات داندا، جا ئەگەر ئەو زەکاتە بە خودی ئەوان بدرێت ئەوە ڕازی ئەبن، ئەمەش هەڵبژاردەی شيخ الإسلام ئیبنوتەیمی‌یەیە، و لەوبارەیشەوە فەتوایەکی گرنگی هەیە (بەرگی ٢ ل/٨١-٨٤) لە (الفتاوى)دا، وە هەروەها شەوکانی لە (السيل الجرار ٢/٨٦-٨٧) دا، هەر لەبەر ئەوەشە کە ئیبنوقەییم لە زاددا ووتویەتی: پێغەمبەر ﷺ ڕەفتاری وابووە کە ئەو سەرفیترەیەی تایبەت کردووە بە مسکینەکانەوە... (تمام المنة/ألباني).

(٢) بە کورتی شێخ ئەفەرمووێت وانی‌یە، چونکە بەیهەقی حەدیسەکەی لاواز کردووە، دانەر وائەزانێت بەیهەقی تەخریجی کردووە و بێ‌دەنگ بووە لەسەری.

وە (حافظ) بڕیویەتی‌یەوە کە ئەو حەدیسە لاوازە لە (بلوغ المرام) دا وە هەروەها ئەوەیش لەپێش ئەوەوە هەر بە لاوازی داناوە، وە ئەوەی ئێمە بێ ئیحتیاج ئەکات حەدیسەکەی ئیبنوعەبباسە (تمام المنة ألباني).

لە پێشەوە باسی ئەو شوێنە کرا کە زەکاتەکەی لێ ئەدرێت، لەوکاتەدا کە قسە لەسەر گواستنەوەی زەکات کرا بۆ شوێنێکی تر.

**ئایا دروستە زەکات بدرێ بە (ذمي)؟**

زوهری و ئەبوحەنیفە و محمد و ئیبنوشیبریمە بە دروستیان داناوە سەرە فیترە بدرێت بە (ذمي) بەپێی فەرمودەی خوای گەورە کە ئەفەرموێت: ﴿لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓاْ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ﴾. (الممتحنة: ٨). واتە: خوا رێ ی ئەوەتان لێ ناگرێت چاکە بکەن و دادپەروەر بن لەگەڵ ئەوانەدا کە نەجەنگاون لەگەڵتانا لەسەر ئاین و لە شوێن و رێی خۆتان دەریان نەکردوون، بەڕاستی خوا دادپەروەرانی لا خۆشەویستە[1].

---

(١) لەم ئایەتەدا بەڵگە لەسەر دروستی سەرفیترەدان بە (ذمي) دەرناکەوێت، چونکە ئەوەی لێوەی دەردەکەوێ چاکە کردنە لەگەڵیاندا لە ڕووی پەیوەندییەوە، ئەویش بەهۆی ئەو صەدەقانەی کە واجب نین.

ئەبو عوبەید بە ژمارە (١٩٩١) بە سەنەدێکی صحیح لە ئیبنوعەبباسەوە ئەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی:

کۆمەڵێك هەبوون خزمایەتیان هەبوو لەگەڵ هۆزی بەنی (قریظة) و بەنی (نضیر) وە خۆیان لەوە ئەپاراست کە صەدەقەیان بەسەردا بکەن و ئەیان ویست موسڵمان بین، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿لیس علیك هداهم ولکن الله یهدي من یشاء، وما تنفقوا من خیر فلأنفسکم، وما تنفقون إلا ابتغاء وجه الله، وما تنفقوا من خیر یوف إلیکم وأنتم لا تظلمون﴾ واتە: هیدایەتی ئەوانە لەسەر تۆ نیە (کە بە زۆر هیدایەتیان بدەیت) بەڵام خوا بۆ خۆی بۆ هەرکەس کە بیەوێ هیدایەتی ئەدات، جا هەرچی خێر و چاکەیەك کە ئێوە ئەیکەن ئەوە پاداشتەکەی هەر بۆخۆتان ئەگەڕێتەوە، وە ئێوە هەر چاکەیەك بکەن، لە ڕێگای خوادا ئەیکەن، و هەرچاکەیەك بکەن ئەوە پێتان ئەدرێتەوە و ستەمتان لێ ناکرێت.

جا ئەم ئایەتە هەروەکو ئەو ئایەتەی پێشەوەیە وایە.

وە هەروەها لە دوای ئەوە بە سەنەدێکی صحیح لە سەعیدی کوڕی موسەییبەوە ئەگێڕێتەوە:

پێغەمبەر ﷺ صەدەقەی دا بە ماڵێك لە یەهود، کەواتە ئەو صەدەقەیان هەر پێ ئەدرێ.

وە لە حەسەنی بەصرییەوە گێڕراوەتەوە وتویەتی:

ئەهلی زیمە هیچ زەکاتێکی واجبیان ناکەوێت. بەڵام ئەگەر کەسێك پێی خۆش بوو جیا لەو زەکاتە، صەدەقەیان بەسەردا ئەکات.

و ئەمەش سابتە لە شەرعدا و کاری سەلەف لەسەری ڕۆیشتووە، بەڵام لەبارەی سەرفیترە پێدانیانەوە ئەوە لە هیچ کەس لە صەحابەوە نەمان زانیوە کاری وای کردبێ، وە تێ گەیشتنی ئاوها لەو ئایەتەوە دوورییە لە ماناکەی بەڵکو لێکدانەوەیەکە کە خودی ئایەتەکە مەبەستی ئەوەی نییە.

**ئايا سامان جگە لە زەكات مافى ترى بە سەرەوە هەيە؟**

ئيسلام بە چاوێكى واقعىيەوە سەيرى سامان ئەكات، چونكە سامان لە ڕوانگەى ئيسلامەوە دەمارى ژيانە و ڕاگرى ياساى ژيانى تاكە كەس و كۆمەڵە، خواى گەورە فەرمويەتى: ﴿وَلَا تُؤۡتُواْ ٱلسُّفَهَآءَ أَمۡوَٰلَكُمُ ٱلَّتِي جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمۡ قِيَٰمًا﴾ (النساء: ٥). واتە: ئەو سامانەى خوا كردويەتىيە ڕاگرى ژيانتان مەيدەنە دەست نەفام وكەم ئاوازەكانتان.

ئەمەش وا داواكارە كە ئەبێت بە شێوەيەك دابەش بكرێت كە ئيحتياجى هەموو كەسێك دەفع بكات، لە خۆراك و پۆشاك و خانوو و باقى ئەو پێويستىيە سەرەكيانەى كە هيچ كەس بێ ئيحتياج نىيە لێى، هەتا كەس لارەمل و پەك كەوتە و كەم دەست نەبێت.

وە چاكترين و باشترين هۆ بۆ دابەش كردنى سامان، وە بۆ ئەوەى بەشى هەمووان بكات وەسيلەى زەكاتە، وە ئەم زەكاتە لە كاتێكدا بەخشينەكەى سەختى ناخاتە سەر دەوڵەمەندى، و ئاستى فەقيريش بەرز ئەكاتەوە بۆ ئەندازەى كيفايەت، وە لە ئەزيەتى ژيان و ئازارى نەبوونى بە دوورى ئەكا، وە زەكات منەتێك نىيە كە دەوڵەمەند بيكات بەسەر فەقيردا، بەڵكو حەقێكە خوا سپاردوويەتى بەدەستى دەوڵەمەند، بۆ ئەوەى بيگەيەنێ بە خاوەنى و دابەشى بكات بەسەر ئەوكەسانەدا كە موستەحەققى ئەوەن، ئينجا لێرەدا حەقيقەتێكى گەورەمان بۆ ڕوون ئەبێتەوە، ئەويش ئەوەيە: سامان شتێك نىيە وەقف و بەسراوە بێ لەسەر دەوڵەمەند بێجگە لە فەقير، بەڵكو سامان مافى هەموانە، واتە: هەم بۆ دەوڵەمەندان و هەم بۆ فەقيران بە شێوەيەكى يەكسان، وە ئەم حەقيقەتەش ئەم فەرموودەيەى خواى گەورە ڕوونى ئەكاتەوە كە لە بارەى حيكمەتى دابەش كردنى غەنيمەت ئەفەرموێت: ﴿كَيۡ لَا يَكُونَ دُولَةَۢ بَيۡنَ ٱلۡأَغۡنِيَآءِ مِنكُمۡۚ﴾ (الحشر/٧). واتە: دابەش كردنى غەنيمەت بۆ ئەوەيە تاوەكوو سەروەت و سامان تەنها لەبەينى دەوڵەمەندەكانتانا دەست بە دەستى پێ نەكرێ، بەڵكو ئەبێ دابەش بكرێ هەم بە سەر دەوڵەمەندانا وە هەم بەسەر فەقيرانا.

---

ئەمما ئەوەى كە ئەبو ئيسحاق لە ئەبو مەيسەرەوە ئەگێڕێتەوە كە سەرفيترەيان بۆ كۆ ئەكردەوە و ئەويش ئەيدا بە ڕاهيبەكان. ئەبو عوبەيد ڕيوايەتى كردووە (٦١٣/١٩٩٦) وە هەروەها ئيبنوزەنجەويهى.

ئەمە لەگەڵ ئەوەشدا كە (مقطوع) و مەقوفە صەحيحيش نىيە، (لەپاشان دەفەرموێت: )

وە ئەوەى پاڵپشتى ئەوەيە كە زەكات تايبەتە بە مسوڵمانانەوە حەديسەكەى پێشووە كە فەرمويەتى: پێغەمبەر ﷺ زەكاتى كردووە بە خواردنێك بۆ مسكينەكان، وا دەرئەكەوێت مەبەستى بە مسكينە موسڵمانەكان بووە، نەك مسكينەكانى هەموو ئوممەتەكانى تر. جا وورد بەرەوە (تمام المنة).

وە حەقی واجب لە ماڵ و سامانا زەكاتە، ئەگەر ئەم زەكاتە ئیحتیاجی فەقیان و موستەحەققان و لێ قەوماوانی دەفع كرد و لە برسیایەتیدا تێری كردن و لە بێ ئاسایشیدا دڵنیای كردن، بەڵام ئەگەر تەنها زەكات بۆ ئەو مەبەستە كافی نەبوو، وە ئیحتیاجی موحتاجانی دەفع نەئەكرد، ئەوە لە ماڵ و سامانا حەقێكی تریش بێجگە لە زەكات هەیە كە ئەبێ بدرێ، ئەو حەققەش ئەندازە و سنووری نی‌یە تەنها بە كیفایەت دانراوە،، جا ئەو ئەندازەیە لە ماڵی دەوڵەمەندەكان هەڵئەگیرێت كە كیفایەت بێت بۆ فەقیان.

(قرطبـي) دەربارەی ئەم فەرموودەی خوا: ﴿وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ﴾ (البقرە/١٧٧). واتە: وە ماڵ ببەخشێ لە گەڵ ئەوەشدا كە خۆشی ئەوێ -ئەڵێ: ئەوانەی كە ڕەئیان وایە بێجگە لە زەكات لە ماڵ و سامانا حەقێكی تریش هەیە كە كەماڵی چاكێتی تێدایە، ئەم ئایەتەیان كردووە بە بەڵگە، بەڵام هەندێك ڕەئیان وایە ئەم ئایەتە مەبەستی زەكاتی فەرزە، وە ڕەئی یەكەم ڕاسترە لەبەر ئەو حەدیسەی (دارقطني) لە فاطیمەی كچی قەیسەوە ڕیوایەتی كردووە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إنَّ فِي المَالِ حَقاً سوى الزَّكَاةِ). واتە: جگە لە زەكات، ماڵ مافی تری بە سەرەوە هەیە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَـٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَـٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَـٰهَدُوا۟ ۖ وَٱلصَّـٰبِرِينَ فِى ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلْبَأْسِ ۗ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ﴾ (البقرة/١٧٧). واتە: چاكی تەنها بەمە نی‌یە كە لەكاتی نوێژدا ڕوو بكەن لە خۆرهەڵات و خۆرئاوا، بەڵكو... هەتا كۆتایی ئایەتەكە.

وە ئەو حەدیسە ئیبنوماجەش ڕیوایەتی كردووە لە سونەنەكەیدا، وە هەروەها (ترمذي) لە جامیعەكەیدا، وە ووتویەتی: ئەم حەدیسە ئیسنادەكەی شتێكی وەها نی‌یە، وە ئەبوحەمزە (میمون الأعور) بە زەعیف دانراوە وە بەیان و ئیسماعیلی كوڕی ساڵم ئەم حەدیسە لە شەعبی‌یەوە ئەگێڕنەوە لە قسەی خۆی، كە ئەمەیان ڕاسترە.

منیش ئەڵێم: ئەم حەدیسە با قسەشی لەسەر بێت، بەڵام ئەو واتایەی كە لەم ئایەتەدا هەیە كە ئەفەرموێت: ﴿وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ﴾ (البقرە/١٧٧) ئەبێتە بەڵگەی ڕاستی‌یەتی، چونكی لەگەڵ نوێژدا باسی زەكات ئەكات، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خوای گەورە مەبەستی لە: ﴿وَءَاتَى

ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ﴾ زەكاتی فەرز نییە، چونكی ئەوەی دووبارە بوونەوەیە، ئیتر خوای گەورەش لە هەموو كەس زاناترە.

وە زانایان لەسەر ئەوە ڕێكن ئەگەر موحتاجییەك تووشی موسوڵمانان بوو، دوای زەكات دان، پێویستە بۆ ئەو موحتاجییە ماڵی تر صەرف بكرێت.

مالیك (رحمه الله) ووتویەتی: لەسەر خەڵك پێویستە بەهای ئازاد بوونی ئەسیرەكانیان بدەن، با ئەو بەهایەش هەموو سامانەكەیان بگرێتەوە، وە ئەمە ئیجماعی زانایانی لەسەرە، وە ئەو بۆچوونەش بە هێز ئەكات كە هەڵمان بژاردووە، ئیتر خواش یارمەتی دەرە.

وە لە تەفسیری(المنار)دا هاتووە دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ﴾ (البقرة/١٧٧) ئەڵێت واتە: ماڵی خۆی ببەخشێ لەبەر خۆشەویستی خوا، یا لە گەڵ ئەوەشدا كە ماڵەكەی خۆش بوێت.

مامۆستای پێشەوا (شیخ محمد عبده) ووتویەتی: ئەو بەخشین و دانە زەكات نییە، بەڵكو پایەیەكە لە پایەكانی (البر) چاكە، وە وەك زەكاتیش پێویستە، جا ئەگەر موسوڵمانان تووشی حاڵەتێك بوون پێویستی بە ماڵ بەخشین ئەكرد بۆی، بێجگە لە وەختی زەكات بەخشین، بەڵكو كاتێك بێت خاوەن دارایی خۆی بە ناچار ببینێ-لە دوای ئەوەی ساڵ بە سەر ماڵەكەیدا هاتووەو زەكاتەكەی لێ داوە -لەبەر ئەو حاڵەتە ئەبێ ماڵی تر ببەخشێ، وە ئەم جۆرە بەخشینانەش لە ماڵ (نصاب)ێكی دیاری كراوی تێدا دا نەنراوە، بەڵكو بەپێی تواناییە.

جا ئەگەر كەسێك تەنها كولێرەیەكی هەبێت و پێویستی پێی نەبێت، وە ئەوانەش كە نەفەقەیان لەسەرێتی هەر پێویستیان پێی نەبێت، بەڵام ببینێت كەسێك زۆر برسییە و ناچارە بۆ ئەو كولێرەیە، پێویستە لەسەری ئەو كولێرە بدات بەو ناچارە.

وە نەك ناچارەكان بە تەنها مافی ئەوەیان هەیە، بەڵكو خوای گەورە فەرمانی داوە بە موسوڵمانان جگە لە زەكات ببەخشن بە خزم وكەس (ذوي القربى) چونكی ئەمان لە هەموو كەس لە پێش ترن چاكەیان لەگەڵدا بكرێت و بەسەر بكرێنەوە، لەبەر ئەوەی مرۆڤ ئەگەر هەژاركەوت-لە خزمەكانیدا دەوڵەمەند هەبوو-لە خۆیەوە بەرەو ڕووی ئەچێت بە هۆی هەست و سۆزی خزمایەتییەوە.

وە شتێكی سروشتییە كە مرۆڤ دڵ تەنگ ئەبێت بە نەبوونی خزمەكانی زیاتر لە كەسانی تر، چونكە ئەو سەرشۆڕ ئەبێت بە سەرشۆڕیان و سەر بەرز ئەبێت بە سەربەرزیان، جا هەركەس سیلەی ڕەحم ببڕێت و ڕازی بێت بەوەی خۆی لە خۆشیدا بێت و خزمەكانی كلۆڵ و نەدار بن، ئەوە ئەو كەسە لە ئایین و سروشتی مرۆڤایەتی بەرییەو دوورە لە خێر و چاكەوە، وە هەر كەس خزمایەتییەكەی نزیك تر بێت ئەوە مافی لە پێش ترە و سیلەی ڕەحم بۆی چاكترە.

﴿وَٱلۡيَتَـٰمَىٰ﴾ هەتیوان و بێ باوكان بە هۆی مردنی سەرپەرشتەكانیانەوە كیفایەت و كەفالەتیان ئەبەسترێت بەو موسـوڵمانانەوە كە وەزعیان باشە و هەیانە، بۆ ئەوەی باری ژیانیان تێك نەچێت و بێ پەروەردە نەبن و نەبنە بەڵا بۆ خۆیان و خەڵكی تر.

﴿وَٱلۡمَسَـٰكِينَ﴾ مسكینەكان ئەمانیش كاتێ ئەبوونی پەكی خستن، وە ئەیان توانی بەشی پێویستی خۆیان بە دەست بهێنن، وە دەروونیـان دامركاو ڕازی بوون بە كەم لە جیاتی دەست پان كردنەوە لە خەڵك، پێویستە یارمەتی بدرێن لە لایەنی ئەوانەوە كە دەسەڵاتیان هەیە.

﴿وَٱبۡنَ ٱلسَّـبِيلِ﴾ ڕێبواری لە كەسوكار دابڕاو، كە ناتوانێ بگات بە خزم وكەس وكاری، وەك ئەوەی ڕێگا باوك و دایك و خزم و كەس و كاریەتی،

وە ئەم تەعبیرە قورئانی‌یە -كە ئەفەرموێ ﴿وَٱبۡنَ ٱلسَّـبِيلِ﴾- ئەوەندە دڵ نەرمی و میهرەبانی بەرەو ڕێبواران كە هیچ تەعبیرێكی تر پێی ناگات. وە لە فەرمان دان بە یارمەتیدان و دەستگرتنی ڕێبواران هاندانێكی خەڵكی تێدایە بۆ سەفەركردن و گەشت و گوزار لە زەویدا.

﴿وَٱلسَّـآئِلِينَ﴾ سواڵ كەران، ئەوانەی ئەبوونی پاڵی پێوە ناون بۆ ڕوونان لە خەڵك و دەست پان كردنەوە لێیان، وە خوای گەورە لە ئایەتەكەدا ئەم جۆرە كەسانەی دووا خستوە لەبەر ئەوەی سواڵ ئەكەن و ئەم و ئەو ئەیاندانێ، وە جاری وا هەیە ئینسان سواڵ ئەكا بۆ كەسێكی تر، وە بەپێی شەرع سواڵ كردن حەرامە، مەگەر لەبەر زەرووڕەت و ناچاری، كە سواڵ كەر نابێ لەو ئەندازەیە تێ پەڕێ.

﴿وَفِي ٱلرِّقَابِ﴾ واتە: بۆ ئازادكردن و ڕزگاركردنی بەندە، كە ئەمە كڕین و پاشان ئازاد كردنیشیان ئەگرێتەوە، هەروەها یارمەتی دانی بەندە بۆ نووسراوەكانیش (المكاتب) ئەگرێتەوە، بۆ ئەوەی خۆیان لە خاوەنەكانیان بكڕنەوە و ئەو قەرزە بەش بەشەی كە لەسەر شانیانە بدەن بە خاوەنەكانیان، هەروەها یارمەتی دانی ئەسیرانیش ئەگرێتەوە لە دانی بەهاكانیان.

وە كردنی ئەم جۆرە بەخشینە بە حەقێكی پێویست لەسەر موسوڵمانان بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە شەریعەتی ئیسلام چەندە ڕەغبەتی داوە بە ئازادكردنی بەندە، وە وای داناوە كە ئادەمیزاد دروست كراوە بۆ ئەوەی كە سەربەست بژی، مەگەر لە چەند حاڵەتێكی كاتیدا نەبێ كە مەصلەحەتی گشتی وا پێویست بكات بە ئەسیر بگیرێت و بكرێ بە بەندە، وە ئایەتەكە ﴿وَفِي ٱلرِّقَابِ﴾ی دووا خستووە لە هەموو جۆرە موحتاجەكانی پێشوو، چونكە ئیحتیاجی لە جۆرەكانی پێشوودا جاری وا هەیە بۆ پاراستنی ژیانە، بەڵام ئیحتیاجی بەندە بە ئازادبوون پەیوەندی بە عەینی ژیانەكەوە نی‌یە، بەڵكو بە كەماڵی ژیانەكەوەیە.

وە مەشروعیەتی بەخشین بەم جۆرانە جگە لە ماڵی زەکات بە کاتەوە نابەسترێت، وە هەروەها نابەسترێت بە بوونی (نصاب)ێکی دیاری کراویشەوە، وە ئەوەشی کە ئەدرێت ئەندازەیەکی دیاری کراوی نیەیە بە نیسبەت ئەوکەسەی کە هەیەتی، بۆ نمونە دە یەك بێ، یا چل یەك بێ، یا صەد یەك بێ مەسەلەن، بەڵکو چاکەیەکی موطلەقە، حەواڵەی سپێردراوە بە پیاوەتی و دڵ فراوانی بەخشەرو حاڵەتی پێبەخشراوەکە.

وە پاراستنی ئادەمیزاد کە بە ڕێزەو لەناوچون و تێك چوون شتێکی پێویستە لەسەر هەر کەسێك کە بەتوانا بێت، وە لەوە بەولاوە ئەندازەی دیاری کراوی نیەیە. بەڵام بەشی زۆری خەڵك لەم مافە گشتی یانە بێ ئاگان، کە قورئانی پیرۆز خەلکی هان داوە بۆ ئەنجام دانیان، لەبەر ئەوەی ئەم مافانە ژیانێکی یەکسان و هاوبەشی و بەرێزی تێدایە، بەڵام خەریکە خەلکی هیچ نەدەن بەو جۆرە موحتاجانە، ئیللا کەمێکی کەم نەبێ کە ئەدرێ بە هەندێ لە سوالکەران، لە کاتێکدا ئەوانە لەم سەردەمەدا لە هەموو کەس کەمتر موحتاجن، چونکە سواڵ کردنیان کردۆتە کار و پیشەی ڕۆژانەیان، وە زۆربەیان هەیانە. -قسەی (محمد عبده) تەواو بوو-.

ئیبنوحەزم ووتویەتی: لەسەر دەوڵەمەندەکانی هەر شارێك پێویستە لایەنی ماددی هەژارەکانیان ڕاست بکەنەوە، وە سوڵتانیش پێویستە زۆریان لێ بکات بۆ ئەوە، وە ئەگەر بە زەکات باری ژیانیان چاك نەبوو یا ماڵی موسوڵمانان هەموو توانای ڕاست کردنەوەی ئەو هەژارانەی نەبوو، ئەو کاتە شتێکیان بۆ دائەنرێت کە تەنها قووتی زەروری ڕۆژانەیان بۆ دابین بکات، هەروەها پۆشاکی هاوینەو زستانەشیان بە ئەندازەی پێویست بۆ دابین بکرێ، وە خانووش کە بیانپارێزێ لە باران و گەرما و چاوی ئەم و ئەو.

بەڵگەی ئەوەش فەرمودەی خوای گەورەیە کە ئەفەرموێت: ﴿وَءَاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلْمِسْكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ﴾ (الإسراء/٢٦). واتە: مافی خزمان و هەژاران و ڕێبواران بدەن.

هەروەها ئەفەرموێت: ﴿وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا وَبِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱلْجَارِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْجَارِ ٱلْجُنُبِ وَٱلصَّاحِبِ بِٱلْجَنۢبِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ﴾ (النساء/٣٦).

واتە: چاکە بکەن لە گەڵ دایك و باوك و مافەکانیان جێ بە جێ بکەن هەروەها مافی خزم و هەتیوو مسکین و دراوسێی نزیك و دوورو هاوڕێی سەفەرو غەیری سەفەرو ڕێبواری موحتاج و ئەو بەندە وکۆیلانەی کە ئێوە خاوەنیانن.

جا خوای گەورە مافی (مساکین)ی بە پێویست داناوە، وە هەروەها مافی ڕێبوار و خزمەتکار و کارەکەر و مافی دراوسێی نزیك. وە بە پێویستیشی داناوە چاکە کردن لەگەڵ دایك و باوك و خزم و مسکین و

دراوسێ و خزمەتکار و کارەکەر، وە ووشەی (الإحسان) -واتە: چاکە- ئەوانە هەموو ئەگرێتەوەو پێویستی ئەکات، وە بێ‌گومان نەکردنی ئەو چاکەیە خراپەیە.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ ۝ قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ ۝ وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ الْمِسْكِينَ﴾ (المدثر: ٤٢-٤٤). واتە: بە دۆزەخی‌یەکان ئەوترێ چی بەرەو ئەم ئاگرەی هێنان؟ ئەڵێن: نە نوێژمان ئەکرد، نە یارمەتی مسکینمان ئەدا.

ئەبینین خوای گەورە یارمەتیدانی مسکینی لەگەڵ واجبێتی نوێژ کردندا بەیەکەوە هێناوە.

لە پێغەمبەرەوە ﷺ لە چەند رێگای زۆرەوە و ئەوپەڕی صەحیحەوە هاتووە، فەرموویەتی: (مَن لايَرحَمُ النَّاسَ لايَرحَمُهُ اللهُ). واتە: هەرکەس بەزەیی بە خەڵکدا نەیەتەوە خوا بەزەیی نایەتەوە لەگەڵیا.

جا هەر کەس شتێك لە خۆی زیاد بوو، وە بینی برا موسوڵمانەکەی برسی و ڕوتە و نەچوو بەهاواری‌یەوە، بێ گومان ئەوە بەزەیی پیا نەهاتۆتەوە.

لە عوسمانی نەهدی‌یەوە هاتووە کە (عبدالرحمن)ی کوڕی ئەبوبەکری (صدیق) بۆی گێڕاوەتەوەکە ئەهلی صوففە خەڵکێکی هەژاربوون، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (مَن كَانَ عِندَهُ طَعَامُ اثنَينِ فَلْيَذهَب بِثَالِثٍ، وَمَن كَانَ عِندَهُ طَعَامُ أربَعَةٍ فَلْيَذهَب بِخَامِسٍ أو سَادِسٍ). واتە: هەرکەس خواردنی دوو کەسی هەیە باسێ کەس بباتەوە، وە هەرکەس خواردنی چوار کەسی هەیە با پێنج یا شەش کەس بباتەوە.

لە ئیبنوعومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێت هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (المُسلِمُ أخُو المُسلِمِ لا يَظلِمُهُ وَلا يُسلِمُهُ). واتە: موسوڵمان برای موسوڵمانە، نابێت ستەمی لێ بکات و بیدات بە دەستی دوژمنەوە.

هەرکەس وازی لە موسڵمان هێنا ڕوت و برسی ببێت ، لە کاتێکدا ئەم ئەیتوانی خواردن و پۆشاکی بداتێ ئەوە تەسلیمی کردوە.

لە ئەبوسەعیدی خودری‌یەوە ﷺ هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن كَانَ مَعَهُ فَضلُ ظَهرٍ، فَلْيَعُد بِهِ على مَن لا ظَهرَ لَهُ، وَمَن كَانَ لَهُ فَضلٌ مِن زَادٍ، فَلْيَعُد بِهِ على مَن لا زَادَ لَهُ. قَالَ: فَذَكَرَ مِن أصنَافِ المَالِ مَا ذَكَرَ، حتى رَأينَا أنَّهُ لا حَقَّ لأحَدٍ مِنَّا فِي فَضلٍ). واتە: هەرکەس وڵاغی سواربوونی زیادەی پێ‌یە، با بیدات بەو کەسەی کە وڵاغی سووارببوونی نی‌یە، وە هەرکەسێ نانی زیادەی پێ‌یە با بیدات بەو کەسەی کە نانی پێ نی‌یە. ئەڵێت: پێغەمبەر ﷺ باسی ئەوەندەی کرد لە جۆرەکانی ماڵ، تا وامان زانی کەس مافی ئەوەی نی‌یە ماڵی زیاد لە خۆی هەبێ.

ئەمە ئیجماعی صەحابەیە خوا لێ‌یان ڕازی بێت، ئەبوسەعیدی خودری پێمان ڕائەگەیەنێت، وە بە هەموو ئەوەی لەم خەبەرەدا هاتووە ئێمەش قەولی پێ ئەکەین.

وە لە ڕێگای ئەبوموسای ئەشعەرییەوە ﷺ هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أطعِمُوا الجَائعَ، وَعُودُوا المَرِيضَ، وَفُكُّوا العَانِيَ). واتە: هەژار تێر کەن و سەری نەخۆش بدەن و ئەسیر ئازاد بکەن.

و دەقەکان لە قورئان و حەدیسی صەحیح لەم بارەوە زۆر زۆن.

عومەر ﷺ فەرموویەتی: (ئەگەر بۆم بکرایە هەرچی زیادەی ماڵی دەوڵەمەندەکان هەبوو وەرم ئەگرت و دابەشم ئەکرد بە سەر هەژارە موهاجیرەکاندا). ئەم ئیسنادەش لەو پەڕی صیحەحتدایە.

عەلی ﷺ فەرموویەتی: (بەڕاستی خوای گەورە فەرزی کردووە لەسەر دەوڵەمەندەکان لە سامانەکانیاندا ئەوەندەی کە بەشی هەژارەکانیان بکات، جا ئەگەر هەژارەکان برسیان بوو یا پۆشتە نەبوون و تووشی ناڕاحەتی بوون، ئەوە لەبەر ئەوەیە دەوڵەمەندەکان پێیان نادەن، وە خوای گەورە حەقی خۆیەتی لەسەر ئەوە لە ڕۆژی قیامەتا لێیان بپرسێتەوە و سزایان بدات)[1].

لە ئیبنوعومەرەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتووە کە ووتویەتی: (لە سامانەکەتا جگە لە زەکات مافی تریشی تێدایە).

لە عائیشە دایکی موسوڵمانانەوەو حەسەنی کوڕی عەلی و ئیبنوعومەرەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتووە: (کە ئەوان هەموویان بەو کەسەی سواڵی لێیان بکردایە ئەیان فەرمو: ئەگەر داواکاریەکەت لە بارەی خوێنێکی بە ئازارەوەیە -واتە: خزمێك یا کەسێکت پیاوێکی کوشتووە و تۆ خوێنەکەی بۆ ئەدەیت- یا لەبارەی غەرامەیەکی سەنگین و لە ڕادە بەدەرەوەیە، یا لەبەر فەقیرییەکی تەواو داماوکەرەوەیە، ئەوە مافت هەیەو پێویستە).

وە ڕیوایەتی صەحیح لە ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕڕاحەوە و سێ صەد صەحابەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتووە: (کە ئەوان کاتێ خواردەمەنییەکەیان تەواو ئەبێت، ئەبوعوبەیدە پێیان ئەڵێت: چی خواردنتان پێیە لە دوو توێشە بەرەدا کۆی بکەنەوە، کاتێ کۆیان کردەوە وەك یەك یەك بە سەریاندا دابەشی کرد).

ئەمەش ئیجماعێکی قەتعییە لە صەحابەوە و هیچ کەس لەوان موخالیف نەبووە.

هەروەها بە صەحیحی هاتووە لە شەعبی و موجاهید و طاووس و غەیری ئەوانەوە کە هەموویان دەربارەی ماڵ ووتویانە: (جگە لە زەکات مافی تریشی لەسەرە).

پاشان ئیبنوحەزم ئەڵێت: دروست نییە موسوڵمانی ناچار گۆشتی مردارەوە بوو یا گۆشتی بەراز بخوات، لە کاتێکدا خواردن شك ببات زیاد بێت لە موسوڵمانێك یا لە (ذمي)یەك، چونکە فەرزە لەسەر خاوەن خواردن بەشی برسی بدات. جا کەوابوو ئیتر ناچار نییە بۆ خواردنی گۆشتی مردو یا گۆشتی بەراز، وە بۆی هەیە بە زۆری بە دەستی بهێنێت و شەڕ بکات لەسەری، وە ئەگەر کوژرا ئەبێ ئەو کەسەی

(١) ئەم حەدیسە لەسەرەتای ئەم کتێبەدا بە مەرفوعی باس کراوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ. (دانەر).

کوشتوبەتی بکوژرێتەوە، وە خواردن نەدەرەکە ئەگەر کوژرا بۆ دەوزەخ و نەفرینی خوا ئەچێت، چونکە مافێکی قەدەغە کردووە، وە لە کۆمەڵی (الباغية) ستەمکارانە.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَإِنْ بَغَتْ إِحْدَىٰهُمَا عَلَى ٱلْأُخْرَىٰ فَقَـٰتِلُوا۟ ٱلَّتِى تَبْغِى حَتَّىٰ تَفِىٓءَ إِلَىٰٓ أَمْرِ ٱللَّهِ﴾ (الحجرات/٩). واتە: جا ئەگەر یەکێك لەو دوو کۆمەڵە باوەڕدارە زیادەڕەوی کردو ستەمی کرد، ئەوە بجەنگن دژی هەتا ئەگەڕێتەوە بۆ فەرمانی خوا و مل کەچی ڕاستی ئەبێت. وە هەرکەس ڕێگری حەقێك بوو ئەوە ستەمی لە برای خۆی کردووە کە مافی لەسەریەتی.

وە هەر لەسەر ئەوە بوو ئەبوبەکر ﷺ جەنگا لەگەڵ ئەوانەدا کە زەکاتیان نەئەدا -ئیتر سەرکەوتنیش هەر لە خواوەیە- قسەی ئیبنوحەزم تەواو بوو.

وە ئەو دەقانەمان بۆیە هێناوە و زۆرلەسەر ئەم باسە ڕۆیشتین بۆ ئەوەی ڕوونی بکەینەوە کە چەند سۆز و بەزەیی لە ئیسلامدا هەیە، وە زۆر پێش مەزهەبەکانی ئێستا کەوتووە لەو بارەیەوە، وە ئەو مەزهەبانە لە چاو ئیسلامدا وەك گڕی مۆمێکن کە پرتە پرت ئەکات لەچاوتیشکی گەورەی خۆردا.

### صەدەقەی سوننەت

ئیسلام بانگەوازی بەخت کردنی سامان و دارایی لەڕێی خوادا ئەکات و مەردوم هان ئەدات لەسەری بە شێوازێك کە دڵان ڕائەکێشێ و پیاوەتی و جوامێری لە دەروندا ئەژێنێنەتەوەو واتاکانی خێرو چاکە ئەوروژێنێ.

١- خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنۢبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِى كُلِّ سُنۢبُلَةٍ مِّا۟ئَةُ حَبَّةٍ ۗ وَٱللَّهُ يُضَـٰعِفُ لِمَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ﴾ (البقرة:٢٦١). واتە: وێنەی ئەوانەی سامان و ماڵیان لە ڕێ ی خوادا بەخت ئەکەن وێنەی دەنکە گەنمێکە کە حەوت گوڵی گرتبێت و هەرگوڵەی صەد دەنکی تێدا بێت، وە خوا ئەگەر بیەوێ بۆ کێ ی زیاد بکات لەوە زیاتریشی ئەکات، بەڕاستی خوا میهرەبانی و بەخششی فراوانەو زانایە.

٢- هەروەها فەرموویەتی: ﴿لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ ۚ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِن شَىْءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ﴾ (آل عمران/٩٢). واتە: خێر و چاکەتان دەست ناکەوێت هەتا لەو دارایی و ماڵەی لاتان خۆشەویستە نەبەخشن لە ڕێی خوادا، وە هەرچی ببەخشن خوا ئاگادارە پێی.

٣- فەرموویەتی: ﴿وَأَنفِقُواْ مِمَّا جَعَلَكُم مُّسْتَخْلَفِينَ فِيهِ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَأَنفَقُواْ لَهُمْ أَجْرٌ كَبِيرٌ﴾ (الحديد/٧). واتە: ببەخشن لە ڕێی خوادا لەو داراییەی کە خوا ئێوەی کردووە بە جێنشین لەسەری، ئەوکەسانەی باوەڕیان هێناوە لە ئێوە و ماڵ و دارایی لە ڕێی خوادا بەخت ئەکەن پاداشتێکی گەورەیان بۆ دانراوە.

١- پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إنَّ الصَّدَقَةَ تُطفِئُ غَضَبَ الرَّبِّ وَتَدفَعُ مِيتَةَ السُّوءِ). (رواه الترمذي وحسنه)[1]. واتە: صەدەقە غەزەبی پەروەردگار لائەبا و عاقیبەت خراپی دوور ئەخاتەوە.

٢- هەروەها ریوایەت کراوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إنَّ صَدَقَةَ المُسلِمِ تَزِيدُ فِي العُمُرِ، وَتَمنَعُ مِيتَةَ السُّوءِ وَيُذهِبُ اللهُ بِهَا الكِبرَ وَالفَخرَ)[2]. واتە: صەدەقەی موسوڵمان تەمەن درێژ ئەکات و ڕێ لە عاقیبەت خراپی ئەگرێت و خوا لوت بەرزی و شانازی کردنی مرۆڤی پێ لائەبات.

٣- پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَا مِن يَومٍ يُصبِحُ العِبَادُ فِيهِ إلا وَمَلَكَانِ يَنزِلانِ، فَيَقُولُ أحَدُهُمَا: اللَّهُمَّ أعطِ مُنفِقاً خَلَفَا، وَيَقُولُ الآخَرُ: اللَّهُمَّ أعطِ مُمسِكاً تَلَفاً). (رواه مسلم). واتە: ڕۆژ نییە کە بەندەکانی خوا ڕۆژی تێدا ئەکەنەوە و دوو فریشتە نەیەنە خوارەوەو یەکێکیان نەڵێت: خوایە هەرکەس لە ڕێی تۆدا ماڵ بەخت ئەکات ئەوەندەی تری پێ ببەخشە، وە ئەوی تریان نەڵێت: خوایە هەرچی دەست ئەگرێتەوە لە خێر ماڵەکەی وێران بکە.

٤- پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (صَنَائِعُ المَعرُوفِ تَقِي مَصَارِعَ السُّوءِ، وَالصَّدَقَةُ خُفيا تُطفِيءُ غَضَبَ الرَّبِّ، وَصِلَةُ الرَّحِمِ تَزِيدُ فِي العُمُرِ، وَكُلُّ مَعرُوفٍ صَدَقَةٌ، وَأهلُ المَعرُوفِ فِي الدُنيَا هُم أهلُ المَعرُوفِ فِي الآخِرَةِ، وَأهلُ المُنكَرِ فِي الدُّنيَا هُم أهلُ المُنكَرِ فِي الآخِرَةِ، وَأوَّلُ مَن يَدخُلُ الجَنَّةَ أهلُ المَعرُوفِ). (رواه الطبراني في الأوسط ، وسكت عليه المنذري)[3]. واتە: چاکە کردن خاوەنی ئەپارێزێت لە مردنی خراپ، صەدەقەی نەهێنیش غەزەبی پەروەردگار دائەمرکێنێ، وە بەجێ هێنانی سیلەی ڕەحم تەمەن درێژ ئەکات، وە هەموو کردەوەیەکی چاك صەدەقەیە، وە چاکەکەرانی دنیا چاکەکەرانی ڕۆژی دواییـن و خراپەکارانی دنیا خراپەکارانی ڕۆژی دواییـن، وە یەکەم کەسێك کە ئەچێتە بەهەشتەوە چاکەکارانن.

---

(١) (شێخ ئەلبانی بە کورتی ئەفەرموێت): بەشی یەکەمی حەدیسەکە بە هێزە بەڵام حەدیسەکە لاوازە... (تمام المنة/ألباني).

(٢) (شێخ ئەلبانی بە کورتی ئەفەرموێت): حەدیسەکە زۆر لاوازە بەڵام ڕستەی یەکەمی حەدیسەکە سابتە لە حەدیسێکی تردا کە دێت. (تمام المنة/ألباني).

(٣) مونزیری بێدەنگ نییە لەسەری، بەڵکو بە ووشەی (رُوِيَ) لاوازی کردووە، بۆ زیاتر بڕوانە. (تمام المنة/ألباني)

**جۆرەكانی صەدەقە:**

صەدەقە تەنها لە جۆرێكی دیاری كراودا نییە لە كردەوە چاكەكان، بەڵكو قاعیدەی گشتی ئەوەیە كە هەموو چاكەیەك صەدەقەیە، ئەمەش هەندێك لەو فەرمودانە كە لەو بارەیەوە هاتووە:

١- پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (على كُلِّ مُسلِمٍ صَدَقَةٌ، فَقَالُوا: يَا نَبِيَّ اللهِ! فَمَن لَم يَجِد؟ قَالَ: يَعمَلُ بِيَدِهِ فَينفَعُ نَفسَهُ وَيَتَصَدَّقُ، قَالُوا: فَإن لَم يَجِد؟ قَالَ: يُعِينُ ذَا الحَاجَةِ الملهُوفِ، قَالُوا: فَإن لَم يَجِد؟ قَالَ: فَليَعمَل بِالمَعرُوفِ وَليُمسِك عَنِ الشَّرِّ، فَإنَّهَا لَهُ صَدَقَةٌ). (رواه البخاري وغيره). واتە: هەموو موسوڵمانێك لەسەریەتی صەدەقە بكات. ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەی ئەگەر كەسێك نەی بوو؟ فەرمووی: با بە دەستی خۆی كار بكات و سوود بە خۆی بگەیەنێت و صەدەقە بكات، ووتیان: ئەی ئەگەر ئەویشی نەبوو؟ فەرمووی: یارمەتی پەنابەری بە هەڵەداوان بدات، ووتیان: ئەی ئەگەر نەی بوو؟ فەرمووی: كاری چاكە بكات و واز لە خراپە بهێنێ ، ئەوە صەدەقەیە بۆی.

٢- فەرمویەتی: (كُلُّ نَفسٍ كُتِبَ عَلَيهَا الصَّدَقَةُ كُلَّ يَومٍ طَلَعَت فِيهِ الشَّمسُ، فَمِن ذَلِكَ أن يَعدِلَ بَينَ الاثنَينِ صَدَقَةٌ، وَأن يُعِينَ الرَّجُلَ على دَابَّتِهِ فَيَحمِلُهُ عَلَيهَا صَدَقَةٌ، وَيَرفَعُ مَتَاعَهُ عَلَيهَا صَدَقَةٌ، وَيُمِيطَ الأذَى عَنِ الطَّرِيقِ صَدَقَةٌ، وَالكَلِمَةُ الطَّيِّبَةُ صَدَقَةٌ، وَكُلُّ خُطوَةٍ يَمشِي إلى الصَّلاةِ صَدَقَةٌ). (رواه أحمد وغيره). واتە: هەموو كەسێك صەدەقەیەكی لەسەرە هەموو ڕۆژێك كە ڕۆژ هەڵدێت، لەوانە یەك خستنی دوو كەس بە دادپەروەری صەدەقەیە، وە یارمەتی كەسێك بدات بۆ سواربوونی وڵاغەكەی صەدەقەیە، وە كەلوپەلەكەی بۆ بخاتە سەر پشتی وڵاغەكەی صەدەقەیە، وە شتی زیان بەخش لەسەر ڕێگا دوور بخاتەوە صەدەقەیە، وە ووتەیەكی چاك صەدەقەیە، وە هەموو هەنگاوێك ئەی نێت بۆ نوێژ صەدەقەیە.

٣- لە ئەبوذەری غیفارییەوە ﷺ هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (على كُلِّ نَفسٍ فِي كُلِّ يَومٍ طَلَعَت فِيهِ الشَّمسُ صَدَقَةٌ مِنهُ على نَفسِهِ، قُلتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! مِن أينَ أتَصَدَّقُ، وَلَيسَ لَنَا أموالٌ؟ قَالَ: لأن مِن أبوَابِ الصَّدَقَةِ: التَّكبِيرُ، وَسُبحَانَ اللهِ، وَالحَمدُ للهِ، وَلا إلَهَ إلا اللهُ، وَأستَغفِرُ اللهَ، وَتَأمُرُ بِالمَعرُوفِ وتنهى عَنِ المُنكَرِ، وَتَعزِلُ الشَّوكَ عَن طَرِيقِ النَّاسِ وَالعَظمَ، وَالحَجَرَ، وَتَهدِي الأعمى، وَتُسمِعُ الأصَمَّ والأبكَمَ، حتى يَفقَهَ، وَتَدُلُّ المُستَدِلَّ على حَاجَةٍ لَهُ قَد عَلِمتَ مَكَانَهَا، وتسعى بِشِدَّةِ سَاقَيكَ إلى اللَّهفَانِ المُستَغِيثِ، وَتَرفَعُ بِشِدَّةِ ذِرَاعَيكَ مَعَ الضَّعِيفِ، كُلُّ ذَلِكَ مِن أبوَابِ الصَّدَقَةِ، مِنكَ على نَفسِكَ، وَلَكَ فِي جِمَاعِ زَوجَتِكَ أجرٌ). (رواه أحمد واللفظ له، ومعناه أيضا في مسلم). وعند مسلم (قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ! أيَاتِي أحَدُنَا شَهوَتَهُ، وَيَكُونُ فِيهَا أجرٌ؟ قَالَ: أرأيتُم لَو وَضَعَهَا فِي حَرَامٍ أكَانَ عَلَيهِ وِزرٌ؟ فَكَذَلِكَ إذَا وَضَعَهَا فِي الحَلالِ كَانَ لَهُ أجرٌ). واتە: هەموو كەس هەموو ڕۆژێك كە هەڵدێت صەدەقەیەكی لەسەرە بۆ خۆی بیكات، ووتم: ئەی نێرراوی خوا لە كوێ وە صەدەقە بكەم كە سامان ومالمان نەبێت؟ فەرمووی: چونكە لە بەشەكانی صەدەقە: ووتنی (الله أكبر) و (سبحان الله) و (الحمد لله) و (لا إله إلا الله) و

(أستغفر الله)یە، هەروەها فەرمان بکەی بە چاکە و نەهی بکەی لە خراپە، وە درکێ یا ئێسکێ یا بەردێ لەسەر ڕێگای خەڵك دوور بخەیتەوە، وەکوێرێك ڕێنمایی بکەیت، و کەڕێك ولاڵێك تێ بگەیەنیت تاوەکو فێربن، وە کەسێك شارەزا بکەی کە شتێکی ئەوێ و تۆ شوێنەکەی ئەزانی، و بەهێزی قاچت بەرەو کەسێکی بەهەڵەداوانی داواکاری یارمەتی بڕۆی، وە بە هێزی بازووت شتێك لەگەڵ زەعیفدا هەڵگری، هەموو ئەمانە لە بەشەکانی صەدەقەن کە خۆت بۆ خۆتی ئەکەیت، هەتا چوونە لای خێزانەکەت هەر خێرە و پاداشتت هەیە.

لە لای موسلیم هاتووە: ووتیان: ئەی نێرراوی خوا یەکێ بچێ بە لای حەز و ئارەزووی نەفسیشی‌یەوە پاداشتی هەیە؟ فەرمووی: ئایا ئەگەر لە حەرام دا ئەو ئارەزووە بشکێنێ تاوان نی‌یە؟ هەروەها ئەگەر لە حەڵاڵدا بە کاری بهێنێت پاداشتی بۆ هەیە.

٤- لە (أبوذر)ەوە ﷺ هاتووە ووتویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لَيسَ مِن نَفسٍ ابنِ آدَمَ إلا عَلَيهِ صَدَقَةٌ فِي كُلِّ يومٍ طَلَعَت فِيهِ الشَّمسُ، قِيلَ: يَا رَسُولَ الله مِن أينَ لَنَا صَدَقَةٌ نَتَصَدقُ بِهَا كُلَّ يَومٍ؟ فَقَالَ: إنَّ أبوَابَ الخَيرِ لَكَثِيرَةٌ: التَّسبِيحُ، وَالتَّحمِيدُ، والتَّكبِيرُ، وَالتَّهلِيلُ، وَالأمرُ بِالمَعرُوفِ، وَالنَّهيُ عَنِ المُنكَرِ، وَتُمِيطُ الأذى عَنِ الطَّرِيقِ، وَتُسمِعُ الأصَمَّ، وَتَهدِي الأعمى، وَتَدُلُّ المُستَدِلَّ على حَاجَتِه، وتسعى بِشدّةِ سَاقَيكَ مَعَ اللَّهفَانِ المُستَغِيثِ، وَتحمِلُ بِشدَّةِ ذِرَاعَيكَ مَعَ الضَّعِيفِ؛ فَهَذَا كُلُّهُ صَدَقَةٌ مِنكَ على نَفسِكَ). (رواه ابن حبان في صحيحه، والبيهقي مختصراً وزاد في رواية: (وَتَبَسُّمُكَ فِي وَجهِ أخِيكَ صَدَقَةٌ، وَإمَاطَتُكَ الحَجَرَ وَالشَّوكَةَ وَالعَظمَ مِن طَرِيقِ النَّاسِ صَدَقَةٌ، وَهديُكَ الرَّجُلَ فِي أرضِ الضَّالَّةِ صَدَقَةٌ). واته: کەس نی‌یە لە ئادەمیزاد هەموو ڕۆژێك کە ڕۆژی لێ هەڵهات صەدەقەیەکی لەسەر نەبێت. ووتیان: ئەی نێرراوی خوا لە کوێمان بوو هەموو ڕۆژێك صەدەقەیەك بکەین؟ فەرمووی: دەرگاکانی صەدەقە زۆرن ووتنی: (سبحان الله) و (الحمدلله) و (الله أكبر) و (لا إله إلا الله) صەدەقەیە، وفەرمان کردن بە چاکە و نەهی لە خراپە و لابردنی درکێ، بەردێ، ئێسکێ، لەسەر ڕێگا صەدەقەیە، وە تێگەیاندنی کەڕێك، و ڕێنمایی کوێرێك، و ڕێ نیشان دانی کەسێك بۆ پێویستی‌یەکەی صەدەقەیە، وە بە هێزی قاچت بڕۆی بە پیر یارمەتی دانی کەسێکی هەڵەداوان و داواکاری یارمەتی، وە بە هێزی بازووت یارمەتی شت هەڵگرتن بدەی لە گەڵ زەعیفا، ئەمانە هەمووی صەدەقەن بۆ خۆت. وە لای بەیهەقی ئەمەشی زیادە کە فەرموویەتی: بە ڕووی خۆشەوە چوون بەرەو ڕووی براکەت صەدەقەیە، وە لابردنی بەردێك یا درکێك و داڵێك یا ئێسك لەسەر ڕێگای خەڵك صەدەقەیە، وەڕێ نیشان دانی ڕێ لێ تێك چوویەك صەدەقەیە.

٥- وە فەرموویەتی: (مَنِ استَطَاعَ مِنكُم أن يَتَّقِيَ النَّارَ فَلِيَتَصَدَّق وَلَو بِشِقِّ تَمرَةٍ، فَمَن لَم يَجِد فَبِكَلِمَةٍ طَيِّبَةٍ). (رواه أحمد ومسلم) واتە: هەركەس ئەتوانێ خۆی لە ئاگری دۆزەخ بپارێزێت با صەدەقە بكات، ئەگەر تەنانەت بە لەتێك خورماش بێ، وە ئەگەر هەر نەی بوو بە قسەیەكی شیرین.

٦- وە فەرموویەتی: (إنَّ اللهَ عَزَّوَجَل، يَقُولُ يَومَ القِيَامَةِ: يَا ابنَ آدم! مَرِضتُ فَلَم تَعُدنِي، قَالَ: يَا رَبِّ كَيفَ أعُودُكَ وَأنتَ رَبُّ العَالَمِينَ؟ قَالَ: أمَا عَلِمتَ، أنَّ عَبدِي فُلاناً مَرِضَ فَلَم تَعُدهُ؟ أمَا لَو عُدتَهُ لَوَجَدتَنِي عِندَهُ. يَا ابنَ آدَمَ! استَطعَمتُكَ فَلَم تُطعِمنِي، قَالَ: يَا رَبِّ كَيفَ أُطعِمُكَ وَأنتَ رَبُّ العَالَمِينَ؟ قَالَ: أمَا عَلِمتَ أنَّهُ استَطعَمَكَ عَبدِي فُلان فَلَم تُطعِمهُ، أمَا عَلِمتَ أنَّكَ لَو أطعَمتَهُ لَوَجَدتَ ذَلِكَ عِندِي. يَا ابنَ آدَمَ! استَسقَيتُكَ فَلَم تَسقِنِي. قَالَ: يَارَبِّ كَيفَ أسقِيكَ وَأنتَ رَبُّ العالَمِينَ؟ قَالَ: استسقَاكَ عَبدِي فُلانٌ فَلَم تُسقِهِ. أمَا أنَّكَ لَو سَقَيتَهُ لَوَجدتَ ذَلِكَ عِندِي). (رواه مسلم). واتە: خوای گەورە ڕۆژی قیامەت ئەفەرمووێت: ئەی ئادەمیزاد نەخۆش كەوتم كەچی نەهاتی سەرم لێ بدەیت؟ ئەڵێ: ئەی پەروەردگارم چۆن سەردانت بكەم لە حاڵێكدا تۆ پەروەردگاری جیهانیانی؟ ئەفەرمووێت: ئەی نەت زانی فڵانە بەندەم نەخۆش كەوت كەچی، سەرت لێ نەدا؟ ئاگاداربە ئەگەر سەردانت بكردایە منت ئەبینی لە لای ئەو. ئەی ئادەمیزاد داوای خواردنم لێ كردی كەچی خواردنت نەدامێ؟ ئەڵێ: ئەی پەروەردگارم چۆن خواردنت بدەمێ لە حاڵێكا تۆ پەروەردگاری جیهانیانی؟ ئەفەرموێت: ئەی نازانی كە فڵان بەندەم داوای خواردنی لێ كردی كەچی خواردنت نەدا پێی، ئەی نازانی ئەگەر خواردنت پێ بدایە ئێستا لای من ئەت بینیەوە. ئەی ئادەمیزاد داوای ئاوی خواردنەوەم لێ كردی كەچی نەت دامێ. ئەڵێ: ئەی پەروەردگارم چۆن ئاوت بدەمێ لەحاڵێكا تۆ پەروەدگاری جیهانیانی؟ ئەفەرمووێت: فڵانە بەندەم داوای ئاوی لێ كردی كەچی نەتدایە، ئاگاداربە ئەگەر بتدایە ئێستا لای من ئەت بینیەوە.

٧- پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا يَغرِسُ مُسلِمٌ غِرساً وَلا يَزرَعُ زَرعاً فَيَأكُلُ مِنهُ إنسانٌ وَلا دَابَّةٌ وَلا شيئٌ إلا كَانَت لَهُ صَدَقَةٌ). (رواه البخاري). واتە: هیچ موسڵمانێك نیە دارێك بنێژێ، یا دانەوێڵەیەك بچێنێ پاشان مرۆڤێ یا ئاژەڵێ یا هەر شتێكی تر لێی بخوات، ئیللا بە صەدەقە بۆی ئەنووسرێت.

٨- هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (كُلُّ مَعرُوفٍ صَدَقَةٌ، وَمِنَ المَعرُوفِ أن تلقى أخَاكَ بِوَجهٍ طَلَقٍ، وَأن تُفرِغَ مِن دَلوِكَ فِي إنَائِهِ). (رواه أحمد والترمذي وصححه). واتە: هەموو چاكە كردنێك صەدەقەیەكە، وە لە چاكە حیساب ئەكرێت، ئەگەر بە ڕوویەكی خۆشەوە بچیت بە پیر برا موسوڵمانەكەتەوە، وە ئەگەر لە دۆڵچەكەی خۆت ئاوی بۆ بخەیتە جامەكەیەوە.

**لە پێش ترین کەس بۆ صەدەقە پێ دان کێن:**

منداڵ و خزم و کەس و کاری صەدەقەکەر لە پێش ترین کەسن کە صەدەقەیان پێ ببەخشێ، وە دروست نی‌یە صەدەقە بە بێگانە ببەخشێ لە حاڵێکا ئەو شتەی کە ئەیکا بە صەدەقە بۆ خۆی پێویستی پێ‌ی هەبێت بۆ نەفەقەی خۆی و خێزانەکەی.

١- لە جابیرەوە ﷺ هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذا كَانَ أحَدُكُم فقِيراً فَلْيَبدَأ بِنَفسِهِ، وَإِن كَانَ فَضلٌ فعلى عِيَالِهِ، وَإِن كَانَ فَضلٌ فعلى ذَوِي قَرَابَتِهِ، أو قَالَ: ذَوِي رَحِمِهِ، وَإِن كَانَ فَضلٌ فَهَاهُنَا وَهَاهُنَا) (رواه أحمد ومسلم). واتە: هەرکەس خۆی پێویستی بە شتێك بوو با بۆ خۆی بێت، جا ئەگەر لە خۆی زیاد بوو بیدات بە خێزانەکەی، ئەگەر لەوانیش زیاد بوو بۆ خزم و کەس و کاری، یان فەرمووی: بۆ خاوەن رەحمی، جا ئەگەر لەوانیش زیاد بوو لێرەولەوێ دابەشی بکات.

٢- پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (تَصَدَّقُوا. قَالَ رَجُلٌ عِندِي دِينَارٌ. قَالَ: تَصَدَّق بِهِ على نَفسِكَ، قَالَ: عِندِي دِينَارٌ آخَرُ. قَالَ: تَصَدَّق بِهِ على زَوجَتِكَ، قَالَ: عِندِي دِينَارٌ آخَرُ. قَالَ: تَصَدَّق بِهِ على وَلَدِكَ. قَالَ: عِندِي دِينَارٌ آخَرُ. قَالَ: تَصَدَّق بِهِ على خَادِمِكَ، قَالَ: عِندِي دِينَارٌ آخَرُ. قَالَ: أنتَ بِهِ أبصَرُ). (رواه أبوداود والنسائي والحاكم وصححه). واتە: صەدەقە بکەن، پیاوێك ووتی: دینارێکم هەیە. فەرمووی: بۆ خۆتی صەرف بکە صەدەقەیە، ووتی: دینارێکی تریشم پێ‌یە. فەرمووی: بۆ ژنەکەتی صەرف بکە صەدەقەیە، ووتی: دینارێکی تریشم پێ‌یە. فەرمووی: بۆ منداڵەکەتی صەرف بکە صەدەقەیە، ووتی: دینارێکی ترم پێ‌یە. فەرمووی: بۆ خزمەتکارەکەتی صەرف بکە صەدەقەیە. ووتی: دینارێکی ترم پێ‌یە. فەرمووی: ئیتر خۆت ئەزانی ئەی دەی بە کێ بیدە.

٣- پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (كفى بِالمَرءِ إثماً أن يُضَيِّعَ مَن يَقُوتُ). (رواه مسلم وأبوداود) واتە: بە سە بۆ ئەوەی پیاوی پێ تاوانبار بێت منداڵەکانی و ئەوانەی نەفەقەیان لەسەرێتی پشت گوێ بخات.

٤- وە فەرموویەتی: (أفضَلُ الصَّدَقَةِ على ذِي الرَّحِمِ الكَاشِحِ). (رواه الطبراني والحاكم وصححه) واتە: باشترین صەدقە ئەوەیە بدرێت بە خزمێکی قین لە سك.

**باتڵ کردنەوەی صەدەقە:**

حەرامە ئەوکەسەی صەدەقە ئەکات منەت بکات بەسەر ئەو کەسەدا کە صەدەقەکەی پێدراوە، یان ئەزیەتێ بدات، یا ریا بکا لە صەدەقەکردنەکەیدا، بەپێ‌ی فەرمودەەی خوای گەورە کە ئەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُبْطِلُواْ صَدَقَـٰتِكُم بِٱلْمَنِّ وَٱلْأَذَىٰ كَٱلَّذِى يُنفِقُ مَالَهُۥ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ﴾ (البقرە/٢٦٤). واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە بە منەت و ئازاردان صەدەقەکانتان باتڵ مەکەنەوە وەك ئەو کەسانەی لەبەر ریاکردن ماڵیان ئەبەخشن.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ثلاثةٌ لایُكَلِّمُهُمُ اللهُ یومَ القِیامَةِ، وَلا یَنظُرُ إلَیهِم، وَلا یُزَكِّیهِم، وَلَهُم عَذابٌ ألِیمٌ. قَالَ أبوذر ﷺ خَابُوا وَخَسِرُوا، مَن هُم یَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: المُسبِلُ، وَالمَنَّانُ وَالمُنفِقُ سِلعَتَهُ بِالحَلِفِ الكَاذِبِ). واتە: سێ كەس خوا ڕۆژی دوایی ڕوویان تێ ناكاتەو نایان دوێنێ و لەتاوان پاكیان ناكاتەوە و سزای توندیان بۆ ئەبێت، ئەبوذەر ووتی: هیوا بڕاوو ماڵ وێرانن، ئەوانە كێن ئەی نێراوی خوا؟ فەرمووی: كەسێك جلی شۆڕ (لە خوار قولاپەی) لەبەر بكات، وە كەسێك خێر بە هەژارێك بكات و دوایی منەتی بە سەردا بكات، وە كەسێك كەلوپەلی بە سوێندی درۆ سەرف بكات و بفرۆشێت.

**صەدەقە كردن لە ماڵی حەرام:**

خوای گەورە صەدەقە وەرناگرێت ئەگەر لە ماڵی حەرام بكرێت.

١- پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أَیُّهَا النَّاسُ، إنَّ اللهَ طَیِّبٌ لایَقبَلُ إلا طَیِّباً وَإنَّ اللهَ أمَرَ المُؤمِنِینَ بِمَا أمَرَ بِهِ المُرسَلِینَ، فَقَالَ عَزَّوَجَل: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُوا۟ مِنَ ٱلطَّيِّبَـٰتِ وَٱعْمَلُوا۟ صَـٰلِحًا ۖ إِنِّى بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾ (المؤمنون/٥١) وَقَالَ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَـٰتِ مَا رَزَقْنَـٰكُمْ﴾ (البقرة:١٧٢). ثُمَّ ذَكَرَ الرَّجُلَ یُطِیلُ السَّفَرَ، أشعَثَ أغبَرَ یَمُدُّ یَدَیهِ إلى السَّمَاءِ: یَارَبِّ، یَارَبِّ، وَمَطعَمُهُ حَرَامٌ، وَمَشرَبُهُ حَرَامٌ، وَمَلبَسُهُ حَرَامٌ، وَغُذِّيَ بِالحَرامِ، فأنى یُستَجَابُ لَهُ) (رواه مسلم). واتە: ئەی خەڵكینە خوا پاكە و شتی پاك نەبێت وەری ناگرێ، وە خوای گەورە چ فەرمانێكی كردووە بە پێغەمبەرەكانی ئەو فەرمانەشی كردوە بە باوەڕداران كە ئەفەرمووێت: ئەی نێرراوانی خوا شتی پاك وخاوێن و حەڵاڵ بخۆن وكردەوەی چاك بكەن چونكە من ئاگاداری كردەوەكانتانم، وە بە باوەڕدارانی فەرمووە: ئەی ئەو كەسانەی كە باوەڕتان هێناوە خواردنی پاك وخاوێن وحەڵاڵ بخۆن لەوانەی ئێمە پێمان بەخشیون. پاشان پێغەمبەر ﷺ باسی كابرایەكی ڕێبواری تۆزاوی سەرو ڕیش ئاڵۆزاوی كرد، كە خواردن و خواردنەوە و پۆشاكی حەرام بێت و بە حەرام پەروەردە بووبێت دەست بەرز بكاتەوە بۆ ئاسمان و لە خوا بپاڕێتەوە: پەروەردگارم، پەروەردگارم، ئەو پاڕانەوەیە چۆن گیرا ئەبێت.

٢- هەروەها فەرموویەتی: (مَن تَصَدَّقَ بِعدلِ تَمرَةٍ، مِن كَسبِ طَیِّبٍ -ولا یَقبَلُ اللهُ إلا الطَّیِّبَ- فَإنَّ اللهَ تعالى یَتَقَبَّلُهَا بِیَمِینِهِ ثُمَّ یُرَبِّیهَا لِصَاحِبِهَا كَمَا یُرَبِّي أحَدُكُم فُلُوَّهُ، حتى تَكُونَ مِثلَ الجَبَلِ ) (رواه البخاري). واتە: هەركەس ئەوەندەی دەنكە خورمایەك لەو ماڵە حەڵاڵەی بە دەستی هێناوە -وە خوا حەڵاڵ نەبێت وەری ناگرێ- بكات بە صەدەقە ئەوە خوا بە دەستی ڕاستی وەری ئەگرێ و پاشان پەروەردەی ئەكات بۆ خاوەنەكەی وەك چۆن هەر كام لە ئێوە جوانەمایەنەكەی پەروەردە ئەكات هەتا ئەوەندەی كێوێكی لێ دێت.

**صەدەقە کردنی ژن لە ماڵی مێردەکەی:**

دروستە ژن لە ماڵی پیاوەکەی صەدەقە بکات ئەگەر بزانێت ڕازیە. وە حەرامە لەسەری، ئەگەر نەزانێ ڕازیە یان نا.

لە عائیشەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إذا أنفقَتِ المَرأةُ مِن طَعَامِ بَيتِهَا -غيرَ مُفسِدَةٍ- كَانَ لَهَا أجرُهَا بِمَا أنفقَت، وَلِزَوجِهَا أجرُهُ بِماَ كَسَبَ، وَلِلخَازِنِ مِثلُ ذَلِكَ، لايَنقُصُ بَعضُهُم أجرَ بَعضٍ شَيئاً) (رواه البخاري). واتە: ئەگەر ئافرەت لە خواردەمەنی ماڵەکەیانی کرد بە صەدەقە، بە بێ ئەوەی مەبەستی بە فیڕۆدانی بێ، پاداشتی خۆی وەرئەگرێت لەسەر بەخشینەکەی‌و مێردەکەشی پاداشتی بۆ هەیە لەسەر ئەوەی پەیدای کردووە، بێ ئەوەی هیچیان پاداشتی هیچیان کەم بکەنەوە.

لە ئەبو ئومامەوە هاتووە فەرمویەتی: گوێم لە پێغەمبەر بوە ﷺ لە ووتاری حەجی ماڵ ئاواییدا ئەی فەرموو: (لا تُنفِقُ المَرأةُ شَيئاً مِن بَيتِ زَوجِهَا إلا بِإذنِ زَوجِهَا، قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ وَلا الطَّعَامَ؟ قَالَ: ذَلِكَ أفضَلُ أموَالِنَا) (رواه الترمذي وحسنه). واتە: نابێت ژن لە ماڵی مێردەکەی ببەخشێ بێ ڕەزامەندی مێردەکەی. ووتیان: ئەی نێرراوی خوا خواردەمەنیش؟ فەرمووی: خواردەمەنی باشترین ماڵی ئێمەیە.

جگە لە هەندێ شتی کەم کە لە عورفدا باوە ژن بیکات بە صەدەقە بێ ڕەزامەندی پیاوەکەی ئەوە دروستە.

چونکە لە ئەسمای کچی ئەبوبەکرەوە هاتووە فەرمویەتی: پرسیم لە پێغەمبەر ﷺ ووتم: زوبەیر پیاوێکی تورەیە، منیش هەژار ڕووم تێ ئەکات، ئایا لە ماڵەکەی صەدەقە بکەم بێ ڕەزامەندی خۆی؟ فەرمووی: (أرضخِي وَلا تُوعِي فَيُوعِيَ اللهُ عَلَيكَ). (رواه أحمد والبخاري ومسلم) واتە: شتی کەم ئەوەی لە عورفدا باوە، وە لە کیسەدا ماڵ زەخیرە مەکە ئەگینا خوا لێت مەنع ئەکات.

**دروستە سامان و دارایی هەمووی بکرێت بە صەدەقە:**

دوستە بۆ کەسێکی بە توانای کاسب کە هەرچی ماڵی هەیە بیکات بە صەدەقە[1].

عومەر ﷺ فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کردین کە صەدەقە بکەین، جا ڕێکەوت ماڵێکم هەبوو، لە دڵی خۆمدا ووتم: ئەمرۆ پێش ئەبوبەکر ﷺ ئەدەمەوە کە قەت پێشی نەکەوتوم، جا نیوەی ماڵەکەم هێنا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چیت بۆ خێزانەکەت هێشتۆتەوە؟ فەرموی: ئەوەندەی ئەمە. پاشان ئەبوبەکر هات بە خۆی و هەرچیەوە هەیبوو، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: چیت بۆ خێزانەکەت

(١) بەڵام ئەبوجەعفەری طەبەری ئەڵێت: هەر چەندە دروستە، بەڵام پەسەندە ئەو کارە نەکات، بەڵکو تەنها سێ‌یەکی ماڵەکی بکات بە صەدەقە (دانەر).

هێشتۆتەوە؟ ووتی: خوا و پێغەمبەرم بۆ هێشتونەوە. منیش ووتم: نابێت لە هیچدا پێش بڕکێت لە گەڵا بکەم. (ئەبوداوود و (ترمذي) کە بە صەحیحی داناوە گێڕاویانەتەوە).

زانایان بۆ دروستی کردن بە صەدەقەی هەموو ماڵ مەرجی ئەوەیان داناوە کە ئەبێت ئەو کەسە بە توانا و ئیش کەر بێت و بە ئارام بێت و قەرزدار نەبێت، وە کەسانێکی لانەبن کە پێویست بێ بەخێویان بکات، جا ئەگەر ئەو کەسە ئەو مەرجانەی تێدا نەبوو کەراهەتی هەیە هەموو ماڵی بکات بە صەدەقە.

چونکە لە جابیرەوە ﷺ هاتووە فەرمویەتی: جارێك لەلای پێغەمبەر ﷺ بووین، لەو کاتەدا کابرایەك هات ئەوەندەی هێلکەیەك زێڕی هێنا، ووتی: ئەی نێرراوی خوا ئەمەم لە مەعدەنێك دەرهێناوە، لێم وەربگرە ئەم هەوێ بیکەم بە صەدەقە، لەوەش زیاتر هیچ شك نابەم، پێغەمبەر ﷺ رووی لێ وەرگێڕایەوە، کابرا لەلای چەپەوە چووە بەردەمی، هەر رووی لێ وەرگێڕایەوە، پاشان لە پشتەوە هاتەوە. پێغەمبەر ﷺ لێی وەرگرت و تێی گرت، ئەگەر بەری بکەوتایە ئازاری پێ ئەگەیاند، یا برینداری ئەکرد، پاشان فەرمووی: (يَأتِي أحَدُكُم بِمَالِهِ كُلِّهِ يَتَصَدَّقُ بِهِ ثُمَّ يَجلِسُ بَعدَ ذَلِكَ يَتَكَفَّفُ النَّاسَ، إنَّمَا الصَّدَقَةُ عَن ظَهرِ غنى). (رواه أبوداود والحاكم وقال: صحيح على شرط مسلم، وفيه محمد بن اسحاق)[1]. واتە: هەندێ لە ئێوە دێت هەر چی هەیە ئەیکات بە صەدەقە پاشان خۆی دائەنیشێت دەست لە خەڵك پان ئەکاتەوە. تەنها لەکاتی بووندا صەدەقە ئەکرێت.

**دروستە صەدەقە بدرێت بە (ذمي) وحەربی:**

دروستە صەدەقە بدرێت بە (ذمي) و حەربی، وە موسڵمان پاداشت وەرئەگرێ لەسەری. خوای گەورە مەدحی کۆمەڵێکی کردووە ئەفەرموێت: ﴿وَيُطْعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا﴾ (الدهر/٨). واتە: خواردن ئەدەن بە هەژار وهەتیو وئەسیر لەبەر خۆشەویستی خوا. وە ئەسیریش حەربی‌یە.

وە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ﴾ (الممتحنة:٨). واتە: خوارێتان لێ

---

(١) (کورتەی قسەی شێخ ئەلبانی لەدوای ئەوەی لەحەدیسەکە کۆڵاوەتەوە ئەمەیە): حەدیسەکە لەبەر ئەو هۆیانەی باس کرا زەعیفە، بەڵام ئەو ڕستەیەی کە بەڵگەی پێ هاتۆتەوە ئەویش ئەوەیە کە فەرموویەتی: (لەکاتی بووندا صەدەقە ئەکرێت) صەحیحە، چونکە چەند ڕێگایەکی تری هەیە لە جابیرەوە، ئەحمەد تەخریجی کردووە (٣/٣٤٦) و شایەتێکی هەیە لە حەدیسی ئەبو هورەیرە لەلای بوخاری و کەسانی تر، و لە (الإرواء) یشدا تەخریج کراوە بە ژمارە (٣/٣١٦). (تمام المنة/ ألباني).

ناگرێت چاکەبکەن ودادپەروەربن لەگەڵ ئەوانەدا کە نەجەنگاون دژی ئێوە لەسەر ئایین، وە لە شوێنی خۆتان دەریان نەکردوون، بەڕاستی خوا دادپەروەرەکانی خۆش ئەوێت.

لە ئەسمای کچی ئەبوبەکرەوە ﷺ هاتووە ووتویەتی: دایکم هات بۆ لامان بێ باوەڕ بوو، منیش ووتم: ئەی نێرراوی خوا دایکم هاتووە بۆ لامان وزۆر پەرۆشە بۆمان، ئایا بچم بە لایەوە؟ فەرمووی: بەڵێ، سیلەی رەحم بگەیەنە لەگەڵ دایکتدا.

**صەدەقە وچاکەکردن لەگەڵ ئاژەڵدا:**

١- بوخاریو موسلیم ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (بَينَمَا رَجُلٌ يَمشِي بِطَرِيقِهِ، اشتَدَّ عَلَيهِ العَطَشُ، فَوَجَدَ بِئراً فَنَزَلَ فِيهَا فَشرِبَ، ثُمَّ خَرَجَ، فَإذَا كَلبٌ يَلهَثُ الثَّرى مِنَ العَطَشِ. فَقَالَ الرَّجُلُ: لَقَد بَلَغَ هَذَا الكَلبُ مِنَ العَطَشِ مِثلَ الَّذِي كَانَ قَد بَلَغَ مِنِّي، فَنَزَلَ البِئرَ فَمَلأَ خُفَّهُ مَاءً ثُمَّ أمسَكَهُ بِفَمِهِ حتى رقى، فسقى الكَلبَ فَشَكَرَ اللهُ لَهُ فَغَفَرَ لَهُ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ إنَّ لَنَا فِي البَهَائِمِ أجراً؟ فَقَالَ: فِي كُلِّ كَبِدٍ رَطبَةٍ أجرٌ). واتە: پیاوێك بە ڕێگایەکدا ئەڕۆشت و تینوێتی زۆری بۆ هێنا، بیرێکی دیەوە چووە ناو بیرەکە وتێر ئاوی خواردەوە وهاتەوە سەرەوە، بینی سەگێك لە تینوا گڵ ئەخوات، پیاوەکە ووتی: ئێستە ئەو سەگە لە تینوا وەك منی بە سەر هاتووە، چووە ناو بیرەکەوخوفەکەی پڕ کردلە ئاو وگرتی بە دەمیەوە وهاتەوە سەرەوە، سەگەکەی تێر ئاوکرد، جا خوا پاداشتی کابرای دایەوە ولە گوناحەکانی خۆش بوو. ووتیان: ئەی نێرراوی خوا بۆ ئەگەر چاکە بکەین لە گەڵ ئاژەڵدا بە خێر وپاداشت بۆمان ئەنووسرێت؟ فەرمووی: بەڵێ لە هەموو جگەرتەڕێکدا پاداشتان بۆ هەیە.

٢- هەروەها موسلیم وبوخاری ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (بَينَمَا كَلبٌ يطِيفُ بِرَكِيَّةٍ، قَد كَادَ يَقتُلُهُ العَطَشُ، إذ رَأتهُ بَغيٌ مِن بَغَايَا بَنِي إسرَائِيلَ فَنَزَعَت مُوقَهَا فَاستَقَت لَهُ بِهِ، فَسَقَتهُ فَغفَرَ لَهَا بِهِ). واتە: سەگێك بە دەوری دۆڵێکدا ئەسوڕایەوە خەریك بوو تینوێتی ئەیکوشت، ئافرەتێکی داوێن پیس لە داوێن پیسەکانی بەنی ئیسرائیل کە چاوی پێی کەوت خوفەکانی داکەندو ئاوی بۆ دەرهێنا وسەگەکەی تێرئاو کرد، خوای گەورە بە هۆی ئەوە لە تاوانەکانی خۆش بوو.

**صەدەقەی (جاریە) بەر دەوام:**

ئەحمەد وموسلیم ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إذَا مَاتَ الإنسَانُ انقَطَعَ عَمَلُهُ إلا مِن ثَلاثَةٍ: صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ، أو عِلمٍ يُنتَفَعُ بِهِ، أو وَلَدٍ صَالِحٍ يَدعُو لَهُ) واتە: کاتێ ئادەمیزاد ئەمرێت کاری لە دونیا دائەبڕێت لە سێ شت نەبێت، صەدەقەی جاریە وبەردەوام، یا زانستیەك کە سوود بەخش بێت، یا کوڕێکی صالحی هەبێت لەپاش خۆی دوعای بۆ بکات.

**سوپاس گوزاری چاکەکەر:**

١- ئەبوداودو نەسائی بە سەنەدێکی صحیح لە عبداللە ی کوڕی عومەرەوە ﷺ ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَنِ استَعَاذَ بِاللهِ فَأعِيذُوهُ، وَمَن سَألَكُم بِاللهِ فَأعطُوهُ، وَمَنِ استَجَارَ بِاللهِ فَأجِيرُوهُ، وَمَن أتى إلَيكُم مَعرُوفاً فَكَافِئوهُ، فَإن لَم تَجِدُوا فَادعُوا لَهُ حتى تَعلَمُوا أن قَد كَافَأتُمُوهُ). واتە: هەرکەس پێتانی ووت: پەنا ئەگرم بە خوا پەنای بدەن، وە هەر کەس پێتانی ووت: تو خوا فلانە شتم بدەنێ، بیدەنێ، وە هەرکەس پێتانی ووت: پشت بە خوا ئەبەستم پشت ولایەنی بگرن، وە هەرکەس چاکەیەکی لە گەڵدا کردن پاداشتی بدەنەوە، وە ئەگەر دەسەڵاتتان نەبوو ئەوەندە دوعای خێری بۆ بکەن ئەوەندە هەتا دڵنیا ئەبن پاداشتتان داوەتەوە.

٢- ئەحمد لە (أشعث) کوڕی قەیسەوە -بە سەنەدێك کە ڕاوی‌یەکانی ثیقەن- ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لا يَشكُرُ اللهَ مَن لا يَشكُرُ النَّاسَ). واتە: سوپاسی خوا ناکات کەسێك کە سوپاسی خەڵك نەکات لەسەر چاکە.

٣- (ترمذي) ئەگێڕێتەوە -وبە حەسەنیشی داناوە- لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە ﷺ کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن صُنِعَ مَعَهُ مَعرُوفٌ، فَقَال: لِفَاعِلِهِ: جَزَاكَ اللهُ خَيراً، فَقَد أبلَغَ فِي الثَّنَاءِ). واتە: هەرکەس چاکەیەکی لە گەڵدا کراو بە خاوەن چاکەی ووت: خوا پاداشتی بە خێرت بداتەوە، ئەوە ئەوپەڕی ستایشی کردووە.

# ڕۆژوو

ڕۆژوو بە وازهێنان و خۆگرتن ئەوترێ خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَنِ صَوْمًا﴾ (مریم/٢٦). واتە: من لەسەر خۆم نەزەر کردووە کە بێدەنگ بم و قسە نەکەم بۆ خوای بە بەزەیی.

بەڵام ڕۆژوو لێرەدا مەبەست خۆگرتنەوەیە لە خواردەمەنی و خواردنەوەو ئەو شتانەی ڕۆژوویان پێ ئەشکێت لە طلوعی فەجرەوە هەتا خۆرئاوا بوون لە گەڵ نییەت هێناندا.

**(فضل)ی ڕۆژوو:**

١- لە ئەبوهورەیرەوە هاتووە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (قَالَ اللهُ عَزَّوَجَل: كُلُّ عَمَلِ ابنِ آدَمَ لَهُ إلا الصِّيَامَ، فَإِنَّهُ لِي وَأَنَا أجزِي بِهِ، وَالصِّيَامُ جُنَّةٌ فَإذَا كَانَ يَومُ صَومِ أَحَدِكُم فَلا يَرفُثْ ولا يَصخَبْ وَلا يَجهَل، فَإن شَاتَمَهُ أحَدٌ أو قَاتَلَهُ فَلْيَقُل: إنِّي صَائِمٌ، مَرَّتَينِ، وَالَّذِي نَفسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَخَلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أطيَبُ عِندَ اللهِ يَومَ القِيَامَةِ مِن رِيحِ المِسكِ؛ وَلِلصَائِمِ فَرحَتَانِ يَفرَحُهُمَا: إذَا أفطَرَفَرِحَ بِفِطرِهِ، وَإذَا لَقِيَ رَبَّهُ فَرِحَ بِصَومِهِ). (رواه أحمد ومسلم والنسائي).

واتە: خوای گەورە و بەدەسەڵات ئەفەرموورێت: ئادەمیزاد هەموو کردەوە چاکەکانی بۆ خۆیەتی جگە لە ڕۆژوو کە بۆ منەو هەر خۆم پاداشتی ئەدەمەوە، وە ڕۆژوو قەڵغانی گوناحە، جا ئەگەر هەرکەسێك بەڕۆژوو بوو با قسەی ناشیرین و هاوار هاوار نەکات و نەزانی نەکات بەرامبەر بە خەڵك، وە ئەگەر کەسێك جوێنی پێدا یا شەڕی لەگەڵدا کرد دوو جار بڵێت: من بەڕۆژووم، بەو زاتەی گیانی محمدی بە دەستە بۆنی دەمی ڕۆژووان لە ڕۆژی دواییدا لای خوا لە بۆنی میسك خۆشترە. وە بۆ ڕۆژووان دوو خۆشی هەیە دڵیان پێ خۆش ئەکات، یەکەمیان: کاتێ ڕۆژووەکەی ئەشکێنێت دڵ خۆش ئەبێت، وە دووەمیان: کاتێ ئەگات بە خوا دڵ خۆشە بەڕۆژووەکەی کە فەرمانی خوای بەجێ هێناوە.

٢- وە لە ڕیوایەتی بوخاری و ئەبوداود هاتووە ئەفەرمورێت: (الصِّيَامُ جُنَّةٌ فَإذَا كَانَ أحَدُكُم صَائِماً فَلا يَرفُث ولا يَجهَل، فَإنِ امرُوءٌ قَاتَلَهُ أو شَاتَمَهُ فَلْيَقُل: إنِّي صَائِمٌ مَرَّتَينِ، وَالَّذِي نَفسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَخَلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أطيَبُ عِندَ اللهِ مِن رِيحِ المِسكِ، يَترُكُ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ وَشَهوَتَهُ مِن أجلِي؛ الصِّيَامُ لِي وَأنَا أجزِي بِهِ، وَالحَسَنَةُ بِعَشرِ أمثَالِهَا). واتە: ڕۆژوو قەڵغانە لە گوناح جا ئەگەر هەرکەسێك بەڕۆژوو بوو، با قسەی خراپ نەکات و نەزانی نەکات بەرامبەرکەس، وە ئەگەر کەسێکیش شەڕی پێ فرۆشت یا قسەی پێ ووت دوو جار بڵێت: من بەڕۆژووم، بەو زاتەی گیانی محمدی بە دەستە بۆنی دەمی ڕۆژووان لای خوا لە بۆنی میسك خۆشترە، چونکە ئەو کەسە خواردن و خواردنەوەو ئارەزووەکانی لەبەر من واز لێ ئەهێنێت، ڕۆژوو بۆ منەو من پاداشتی ئەدەمەوە، وە کردنی چاکە بە دەقات پاداشتی خاوەنی ئەدرێتەوە.

٣- له عبد الله کوڕی عەمرەوە خوایان لێ ڕازی بێت هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (الصِّيَامُ والقُرآنُ يَشفَعَانِ لِلعَبدِ يَومَ القِيَامَةِ، يَقُولُ الصِّيَامُ: أي رَبِّ مَنَعتُهُ الطَّعَامَ وَالشَّهَواتِ بِالنَّهَارِ فَشَفِّعنِي فِيهِ. وَيَقُولُ القُرآنُ: مَنَعتُهُ النَّومَ بِاللَّيلِ، فَشَفِّعنِي فِيهِ فَيَشفَعَانِ) (رواه أحمد بسند صحيح)[1]. واتە: ڕۆژوو قورئان لە ڕۆژی دواییدا تکا کاری بەندەکانی خوان. ڕۆژوو ئەڵێت: ئەی پەروەدگار من نەم هێشتووە بە ڕۆژ خواردن بخوات و ئارەزووەکانی بەجێ بگەیەنێت، خوایە تکات لێ ئەکەم لێی ببورەو تکاکەم وەربگرە، وە قورئان ئەڵێت: ئەی پەروەردگار من نەم هێشتووە بە شەو بخەوێت، تکات لێ ئەکەم لێی ببورەو تکاکەم وەربگرە، خوای گەورە تکای هەردووکیان وەرئەگرێت.

٤- لە ئەبوئومامەوە ﷺ هاتووە ووتویەتی: چوومە لای پێغەمبەر ﷺ ووتم: فێری کردنی کارێکم بکە بەرەو بەهەشتم بەرێت فەرمووی: (عَلَيكَ بِالصَّومِ فَإنَّهُ لاعَدلَ لَهُ، ثُمَّ أتَيتُهُ الثَّانِيَةَ فَقَالَ: عَلَيكَ بِالصِّيَامِ) (رواه أحمد والنسائي والحاكم وصححه). واتە: بەڕۆژووگرتنەوە خەریك بە چونكە ڕۆژوو لە چاکیدا بێوێنەیە. ئەڵێت: دووبارە چوومەوە بۆ لای هەر فەرموویەوە: بەڕۆژووگرتنەوە خەریك بە.

٥- لە ئەبوسەعیدی خودریەوە ﷺ هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لايَصُومُ عَبدٌ يَوماً فِي سَبِيلِ اللهِ إلا بَاعَدَ اللهُ بِذَلِكَ اليَومِ النَّارَ عَن وَجهِهِ سَبعِينَ خَرِيفاً) (رواه الجماعة إلا أباداود). واتە: کەسێك لەبەر خوا ڕۆژێك بەڕۆژوو بێت خوا بۆ ماوەی حەفتا ساڵ ڕێگا لەبەر ئەوکارەی ئاگری دۆزەخ لە ڕووی دوور ئەخاتەوە.

٦- لە سەهلی کوڕی سەعدەوە هاتووە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إنَّ لِلجَنَّةِ بَاباً يُقَالُ لَهُ: الرَّيَّانُ، يُقَالُ يَومَ القِيَامَةِ: أينَ الصَّائِمُونَ؟ فَإذَا دَخَلَ آخِرُهُم أُغلِقَ ذَلِكَ البَابُ) (رواه البخاري ومسلم). واتە: لە بەهەشتدا دەرگایەك هەیە پێی ئەڵێن: ڕەییان، لە ڕۆژی دواییدا ئەڵێن: ڕۆژووانەکان لە کوێن؟ ئەوانیش کۆ ئەبنەوە کاتێ هەموویان لەو دەرگایەوە چوونە ژوورەوە ئەو دەرگایە دائەخرێت.

**بەشەکانی ڕۆژوو:**

ڕۆژوو دوو بەشە: فەرزو سوننەت. وە ڕۆژووی فەرز ئەکرێت بە سێ بەشەوە:

١- ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان.

٢- ڕۆژووی کەفارەت.

٣- ڕۆژووی نەزر.

(١) شێخ ئەلبانی لە دوای لێکۆڵینەوە دەفەرموێت: ئیسنادەکەی لە ڕێگای ترەوە حەسەنە بەڵام ئیسنادەکەی ئەحمد زەعیفە. والله أعلم.

لێرەدا تەنها باسی مانگی ڕەمەزانو ڕۆژووی سوننەت ئەکەین، وە بەشەکانی تری لە شوێنی خۆیدا باس ئەکەین.

## ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان

**حوکمی ڕۆژووی ڕەمەزان:**

ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان واجبە بەپێی قورئان و سوننەت و ئیجماع. بەپێی قورئان ئەم فەرمایشتانەی خوای گەورەیە:

فەرموویەتی: ﴿شَهْرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلْقُرْءَانُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْهُدَىٰ وَٱلْفُرْقَانِ ۚ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ﴾ (البقرة/١٨٣). واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ڕۆژووتان لەسەر نووسراوە -واجب کراوە- وەك چۆن لەسەر ئەوانەی پێش ئێوە نووسراوە، بەڵکو لە خوا بترسن و خۆتان بپارێزن.

وە هەروەها فەرموویەتی: ﴿شَهْرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلْقُرْءَانُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْهُدَىٰ وَٱلْفُرْقَانِ ۚ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ﴾ (البقرة/١٨٥). واتە: مانگی ڕەمەزان ئەو مانگەیە کە قورئانی تێدا نێرراوەتە خوارەوە، کە هۆیەکە بۆ ئەوەی خەڵك ڕێی ڕاستی پێ بدۆزنەوە، وە ڕۆشن کەرەوەی ئەو ڕێ ڕاستەیەو جیاکەرەوەی ڕاست و ناڕاستە، جا هەرکەس لە ئێوە هاتنی مانگی ڕەمەزانی بینی با ئەو مانگە بەڕۆژوو بێت.

بەڵام بەپێی سوننەت ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەرە ﷺ کە فەرموویەتی: (بُنِيَ الإسلامُ على خَمسٍ: شَهَادَةِ أن لا إلَهَ إلا اللهُ، وَأنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ، وَإقَامِ الصَّلاةِ وَإيتَاءِ الزَّكَاةِ وَصِيَامِ رَمَضَانَ وَحَجِّ البَيتِ). واتە: ئیسلام لە پێنج شت پێك هاتووە: شەهادەتی لا إله إلا الله محمد رسول الله، ونوێژکردن، و زەکات دان، و گرتنی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان، و حەج کردن.

وە لە حەدیسی طەلحەی کوڕی (عبیداللە)دا هاتووە کە پیاوێك لە پێغەمبەری ﷺ پرسی ووتی: ئەی نێرراوی خوا، پێم بڵێ خوا چ ڕۆژوویەکی لەسەرم فەرز کردووە؟ فەرمووی: مانگی ڕەمەزان . کابرا ووتی: ئایا لەوە زیاترم لەسەرە؟ فەرمووی: نە، مەگەر سوننەت بکەیت.

وە ئوممەتی ئیسلامی ئیجماعیان لەسەر واجبێتی مانگی ڕەمەزان کردوو، و لەسەر ئەوەش کە ڕۆژوو یەکێکە لە ڕوکنەکانی ئیسلام کە بە زەرورەت لە دیندا زاندراوە، و ئەو کەسەی ئینکاری بکات کافرەو لە دین هەڵگەڕاوەیە، وە لە ڕۆژی دوو شەنبە دووی شەعبانی ساڵی دووی هیجریدا واجب کراوە.

**(فضل)ی مانگی ڕەمەزان، و (فضل) ی کردنی کاری خێر تێیدا:**

١- لە ئەبوهورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ ـ کاتێ مانگی ڕەمەزان هات ـ فەرمووی: (قَد جَاءَكُم شَهرٌ مُبَارَكٌ، إفتَرَضَ اللهُ عَلَيكُم صِيَامَهُ، تُفتَحُ فِيهِ أبوَابُ الجَنَّةِ وَتُغلَقُ فِيهِ أبوَابُ الجَحِيمِ وَتُغَلُّ فِيهِ الشَّيَاطِينُ، فِيهِ لَيلَةٌ خَيرٌ مِن ألفِ شَهرٍ، مَن حُرِمَ خَيرَهَا فَقَد حُرِمَ) (رواه أحمد والنسائي والبيهقي)[1].

واتە: وا مانگێکی پیرۆزتان بۆ هاتە پێش، خوا فەرزی کردووە لەسەرتان ئەو مانگە بەڕۆژوو بن، لەم مانگەدا دەرگاکانی بەهەشت ئاواڵە ئەبن و دەرگاکانی دۆزەخ دائەخرێن و شەیتانەکان کۆت و بەند ئەکرێن، شەوێکی تێدایە خواپەرستی تێیدا لە خوا پەرستی هەزار مانگ خێرترە، جا هەرکەس لە خێری ئەو شەوە بێ بەش بێت ئەوە بەڕاستی بێبەشە.

٢- لە عەرفەجەوە هاتووە ووتویەتی: لای عوقبەی کوڕی فەرقەد بووم باسی ڕەمەزانی ئەکرد، لەو کاتەدا یەکێ لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ هاتە ژوورەوە بۆ لامان، عوقبە لێی ترساو بێ دەنگ بوو، کاتێ ئەو بێدەنگ بوو هاوەڵەکەی پێغەمبەر ﷺ باسەکەی بۆ تەواو کردین و فەرموی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەربارەی ڕەمەزان ئەیفەرموو: (تُغلَقُ أبوَابُ النَّارِ، وَتُفتَحُ أبوَابُ الجَنَّةِ، وَتُصَفَّدُ فِيهِ الشَّيَاطِينُ. قَالَ: وَيُنَادِي فِيهِ مَلَكٌ: يَا بَاغِيَ الخَيرِ أبشِر، وَيَا بَاغِيَ الشَّرِّ أقصِر، حتى يَنقَضِيَ رَمَضَانُ) (رواه أحمد والنسائي وسنده جيد). واتە: کاتێ ڕەمەزان دێت دەرگاکانی دۆزەخ دائەخرێت و دەرگاکانی بەهەشت ئەکرێتەوە، شەیتانەکانیش دوور ئەخرێنەوە، ئەی فەرموو: فریشتەیەك بانگەواز ئەکات لەو مانگەدا: ئەی خێر خوازان مژدە بێ لێتان وە ئەی شەڕخوازان وازبهێنن، هەتا ئەو مانگە کۆتایی دێت.

٣- لە ئەبوهورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (والصَّلَوَاتُ الخَمسُ وَالجُمُعَةُ إلى الجُمُعَةِ وَرَمَضَانُ إلى رَمَضَانَ مُكَفِّرَاتٌ لِمَا بَينَهُنَّ، إذَا اجتُنِبَتِ الكَبَائِرُ) (رواه مسلم). واتە: پێنج فەرزەی نوێژەکان و جومعە هەتا جومعە و ڕەمەزان هەتا ڕەمەزان لابەری ئەو گوناهانەن کە لە نێوانیاندا ئەکرێت، ئەگەر ئەو کەسە لە گوناهە گەورەکان خۆی بەدوور بگرێت.

٤- لە ئەبوسەعیدی خودرییەوە ﷺ هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن صَامَ رَمَضَانَ وَعَرَفَ حُدُودَهُ، وَتَحَفَّظَ مِمَّا كَانَ يَنبَغِي أن يُتَحَفَّظَ مِنهُ، كَفَّرَ مَا قَبلَهُ) (رواه أحمد والبيهقي بسندٍ

---

(١) کورتەی قسەی شێخ ئەلبانی ئەوەیە کە ئەم ریوایەتەیان (منقطع)ە، بەڵام (صحیح لغیره) یە، چونکە ئەو قسەی: کردنەوەی دەرگاکانی بەهەشت و داخستنی دەرگاکانی دۆزەخ و بەند کردنی شەیتانەکان سابت و صەحیحە و لە صەحیحەیندا هەیە لە حەدیسی ئەبو هورەیرەوە، و لە (الصحیحة) دا بە ژمارە (١٣٠٧) تەخریج کراو، و باقی حەدیسەکە لای ئیبنوماجە هەیە بەسەنەدێکی حەسەن وە مونزریش بە حەسەنی داناوە.

جيد)[1]. واتە: هەركەس مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بێت و سنوری مانگی ڕەمەزان بزانێ كە چی تێدا نەكرێت و چی تێدا ڕەوا نییەو خۆی بپارێزێ لەوانەی پێویستە خۆی لێ بپارێزرێت گوناهی پێش ئەومانگە ئەسڕێتەوە.

٥- لە ئەبوهورەیرەوە هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن صَامَ رَمَضَانَ إيمَاناً وَاحتِسَاباً غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِهِ) (رواه أحمد وأصحاب السنن)[2] واتە: هەركەس مانگی ڕەمەزان بەباوەڕەوەو لە ڕێی خوادا بەڕۆژوو بێت خوا لە گوناهەكانی لەوەپێشی ئەبورێت.

**ترساندن لە نەگرتنی ڕۆژووی ڕەمەزان:**

١- لە ئیبنوعەبباسەوە رضي الله عنه هاتووە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (عرى الإسلامِ وَقَوَاعِدُ الدِّينِ ثلاثَةٌ، عَلَيهِنَّ أسِّسَ الإسلامُ، مَن تَرَكَ وَاحِدةً مِنهُنَّ فَهُوَ بِهَا كَافِرٌ حَلالُ الدَّمِ: شَهَادَةُ أن لا إلهَ إلا الله، وَالصَّلاةُ المَكتُوبَةُ، وَصَومُ رَمَضَانَ) (رواه أبويعلى والديلمي وصححه الذهبـي)[3]. واتە: دەستە گیرەكانی ئیسلام و بنەماكانی ئایین سێ شتن، كە ئیسلام لەسەرئەوانە دامەزراوە، هەركەس واز لە یەكێكیان بهێنێت ئەوە كافرەو خوێنی ڕەوایە، ئەوانیش شایەتیدانی (لا إله إلا الله) و نوێژە فەرزەكان و ڕۆژووی ڕەمەزانە.

٢- لە ئەبوهورەیرەوە هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن أفطَرَ يَوماً مِن رَمَضَانَ، فِي غَيرِ رُخصَةٍ رَخَّصَهَا اللهُ لَهُ، لَم يَقضِ عَنهُ صِيَامُ الدَّهرِكُلِّهِ وَإن صَامَهُ) (رواه أبوداود وابن ماجه والترمذي). واتە: هەركەس ڕۆژێك ڕۆژووی ڕەمەزان بشكێنێت بێ ئەوەی ڕوخصەتێكی هەبێت لەو ڕوخصەتانەی خوا دایناوە، ئەگەر ئەو ساڵە هەمموو بەڕۆژوو بێت جێی ئەو ڕۆژووەی بۆ ناگرێتەوە.

---

(١) شێخ ئەلبانی دەفەرموێت: وا ئەڵێت، بەڵام ئەم قسەیەش سەرنجی لەسەرە، چونكە لە سەنەدی ئەحمەدو بەیهەقیدا كەسێكی تێدایە كە لە ژمارەی مەجهولەكانە، و تەوسیق كردنی ئیبنوحیببان ئەو مەجهولیەتە لاتابات، لەبەر ئەوەی لەمەوبەر باسمان كرد كە ئیبنوحیببان مەجهول بە سیقە ئەزانێ.

وە دەفەرموێت لە (الضعيفة) دا بە ژمارە (٥٠٨٣) هاتووە.

(٢) دانەر زۆر دوور كەوتۆتەوە لە باسەكە، چونكە ئەم حەدیسە هەر بەم زاراوە لە صەحیحەیندا هەیە بە تەواوی وە لە (الإرواء) یشدا تەخریج كراوە بە ژمارە (٩٠٦) (تمام المنة).

(٣) دانەر ئەم حەدیسەی لەباسی نوێژ نەكەردا هێناوە، و لەوێدا ڕوونم كردۆتەوە كە زەعیفە ئیتر پێویست ناكات دووبارەی بكەینەوە (تمام المنة).

بوخاری ووتویەتی: ئەڵێن: ئەبوهورەیرە ئەم حەدیسە بە مەرفوعی ئەگێڕێتەوە: (مَن أفطَرَ يَوماً مِن رَمَضَانَ، مِن غَيرِ عُذرٍ وَلا مَرَضٍ لَم يَقضِهِ صَومُ الدَّهرِ، وإن صَامَهُ)[1]. واتە: هەرکەس ڕۆژێکی ڕەمەزان بەبێ مەعزەرەت یا نەخۆشی بشکێنێت ڕۆژووی ساڵێك جێی ناگرێتەوە ئەگەر بەڕۆژووش بێت. وە ئیبنومەسعودیش هەر ئەوەی ئەووت.

ذەهەبی ووتویەتی: لای ئیمانداران وا سابتە کە هەرکەس بەبێ نەخۆشی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان نەگرێت لە زیناکارو عارەق خۆر خراپترە، هەتا گومان ئەبەن لە ئیسلامەتی‌یەکەیدا، وە هەروەها گومانی پێ ئەبەن زیندیق و دەرچوو لە ئیسلام بێ.

**مانگی ڕەمەزان بە چی ثابت ئەبێت؟**

هاتنی مانگی ڕەمەزان بە دیتنی هیلال ثابت ئەبێت، با تەنها کەسێکیش بیبینێت، بەڵام عادڵ بێت، یا بەتەواو بوونی ڕۆژەکانی مانگی شەعبان بە سی ڕۆژ.

١- لە ئیبنوعومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە فەرمویەتی: خەڵکی ئەگەڕان بۆ مانگ، منیش بە پێغەمبەرم ﷺ ڕاگەیاند ووتم: مانگم بینیوە، خۆی بەڕۆژوو بووە بە قسەکەی من و فەرمانی بە خەڵکەکەش کرد کە بەڕۆژوو بن. (ئەبوداودو حاکم و ئیبنوحیببان گێڕاویانەتەوەو ئەم دووانە بە صەحیحیان داناوە).

(١) شێخ ئەلبانی ئەفەرموێت: ئەم حەدیسە زەعیفە، بوخاریش ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە، هەروەها ئیبنوخوزەیمە لە صەحیحەکەیدا باسی کردووە(٣/٢٣٨) و مونذیری و بەغەوی و (قرطبـي) و (ذهبـي) و (دميري) کە موناوی لێوەیان ئەگێڕێتەوە، هەروەها (حافظ) ئیبنوحەجەریش بە زەعیفی داناوە و سێ عیللەتی باس کردووە: (إضطراب و جهالة و إنقطاع) جا سەیری (فتح الباري) بکە (٤/١٦١٨) بەڵام (حافظ) لەوەدا بەهەڵەدا چووە کە ووتویەتی: ئیبنوخوزەیمە بە صەحیحی داناوە.

لەدواییدا شێخ دەفەرموێت: هەروها یەکێ لە براکانمان هەڵەیەکی گەورەی کردووە لە دانراوەکەیدا بەناوی (الأحاديث الصحيحة) کە هەڵی بژاردون لە (صحيح البخاري) وە ئەم حەدیسەی لەناو ئەوانا هێناوە، لەبەر ئەوەی نەیزانیوە کە ئەو حەدیسە لای بوخاری موعەللەقە، وە هەروەها نەیزانیوە کە ئەو حەدیسانەی بوخاری بە موعەللەقی هێناونی بەلای خۆشیەوە هەمویان صەحیح نین، تا بگات بە غەیری ئەو، وە ئەم حەدیسەش بوخاری بۆخۆی بە ئاماژە پێ کردن بە لاوازی داناوە، و من لە چاپی یەکەمی ئەو کتێبەدا سەرنجم بۆی ڕاکێشا، ئەویش بەڵێنی خێری پێدام، جا نازانم ئایا بۆی کراوە چاپی بکاتەوە و ئەو هەڵەیەی لابدات و بەڵێنەکەی بەرێتە سەر؟ چونکە من گومانی خێرم پێ ئەبرد.

٢- لە ئەبوهورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (صُومُوا لِرُؤيَتِهِ وَأفطِرُوا لِرُؤيَتِهِ، فَإن غُمَّ عَلَيكُم فَأكمِلُوا عِدَّةَ شَعبَانَ ثَلاثِينَ يَوماً) (رواه البخاري ومسلم). واتە: بە بینینی مانگ بەڕۆژوو بن و بە بینینی بیشکێنن، وە ئەگەر هەور بوو، مانگی شەعبان بکەنە سی ڕۆژی تەواو، ئەمجا بەڕۆژوو بن.

(ترمذي) ووتویەتی: بەشی زۆری زانایان لەسەر ئەوەن وئەڵێن: شایەتی پیاوێك وەرئەگیرێ بۆ بەڕۆژوو بوون. وە ئەمەش قسەی ئیبنوموبارەك و شافیعی و ئەحمەدە. وە ئەوەوی ووتویەتی: ئەمەیان ڕاستترە.

بەڵام بینینی هیلالی مانگی شەووال، بەوە (ثابت) ئەبێت کە مانگی ڕەمەزان سی ڕۆژ تەواو بکات، وە شایەتی تەنها پیاوێك وەرناگیرێت، هەرچەندە ڕاستگۆ و دادپەروەریش بێت، بەڕای بەشی زۆری زانایان، وە بە مەرجیان داناوە کە دوو کەسی عادل شایەتی بدەن لەسەر بینینی. ئەبوثەور نەبێت کە هیلالی مانگی ڕەمەزان و شەووال لەوەدا لە یەك جیا ناکاتەوە، وە ووتویەتی: شایەتی پیاوێکی ڕاست وعادڵ وەرئەگیرێت بۆ هەر دووکیان.

ئیبنوڕوشد ووتویەتی: مەزهەبی ئەبوبەکری کوڕی مونذر، مەزهەبی ئەبوثەورە، وە وا بزانم مەزهەبی زاهیریەکانیشە.

ئەبوبەکری کوڕی منذر بەڵگەی بەوە هێناوەتەوە کە ئیجماع لەسەر ئەوە پێك هاتووە، کە بەڕۆژوو بوون و شکاندن بە قسەی تەنها کەسێك بکرێت، کەواتە پێویستە هەر بەو شێوەیەش بێت لە چوونە ناو مانگ و دەرچوون لە مانگ، چونکە هەردووکیان نیشانەن، کاتی بەڕۆژوو بوون و شکاندنی پێ جیا ئەکرێتەوە؛ وە شەوکانی ووتویەتی: ئەگەر لە دەلیلە صەحیحەکانا بەڵگەی ئەوە نەهاتبێت کە شایەتی دوو کەسیش ئیعتیباری پێ بکرێت بۆ شکاندن، کەواتە ظاهرەن وا دەرئەکەوێ ئەوە بەس بێت، ئەویش بە قیاس لەسەر بەڕۆژوو بوون. وە هەروەها عیبادەت کردن بە قەبول کردنی خەبەری واحید، ئەوە ئەگەیەنێت کە لە هەموو جێیەکدا وەربگیردرێت، مەگەر جێگایەك کە بەڵگە هەبێت تایبەتی بکات، بە عیبادەت نەکردن بە خەبەری واحید، وەك شایەتی دان لەسەر ماڵ و سامان و ئەو جۆرە شتانە، کەواتە زاهیرەن ئەوە ڕاستە کە ئەبوثەور بۆی چووە.

### ئیختیلافی مەطلەع:

جومهور بۆ ئەوە چوون: کە ئیختلافی مەطلەع - جیاوازی شوێنی هەڵهاتنی مانگ - ئیعتباری پێ ناکرێت، بەڵکو هەر کاتێ خەڵکی هەر شار و وڵاتێك مانگیان بینی لەسەر هەموو خەڵکی شار و وڵاتەکانی تر پێویستە بەڕۆژوو بن، بەپێی فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: (صُومُوا لِرُؤيَتِهِ وَأفطِرُوا لِرُؤيَتِهِ). واتە: بە بینینی مانگ بەڕۆژووبن وە بە بینینی بیشکێنن.

وە ئەمە قسەیەکە ئەدرێت بە گوێی هەموو نەتەوەی ئیسلامدا، کە هەر کەس مانگی بینی لە شوێنێکدا ئەو بینینە بۆ هەموانە.

وە ڕەئی عیکریمەو قاسمی کوڕی محمدو سالیم و ئیسحاق و قەولی صەحیح لای حەنەفی‌یەکان و هەڵبژاردە لای شافیعی‌یەکان ئەوەیە: هەر وڵاتەو بەپێی بینینی خۆیان کار بکەن، وە بینینی وڵاتی تر بە سەر ئەماندا ناچەسپێت.

بەپێی ئەوەی کوڕەیب گێڕاوی‌یەتەوە و فەرموویەتی: لە شام بووم، ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان دەستی پێ کرد، شەوی هەینی بوو مانگم بینی، پاشان هاتم بۆ مەدینە لە کۆتایی مانگدا، ئیبنوعەبباس لێی پرسیم لەبارەی هیلالەوە فەرموی: ئێوەکەی لە شام مانگتان بینی؟ ووتم: شەوی هەینی بینیمان. ووتی: تۆ بە چاوی خۆت بینیت؟ ووتم: بەڵێ خەڵکیش بینیان و بەڕۆژوو بوون و موعاوی‌یەش بەڕۆژوو بوو، ئیبنوعەبباس فەرموی: بەڵام ئێمە شەوی شەمە بینیمان، هەر بەڕۆژووش ئەبین هەتا سی ڕۆژ تەواو ئەکەین، یا مانگ ئەبینینەوە. ووتم: ئەی بینینەکەی موعاوی‌یە و بەڕۆژوو بوونەکەی بۆ تۆ بەس نی‌یە؟ فەرموی: نا، پێغەمبەر ﷺ بەو شێوەیە فەرمانی پێ کردووین. (ئەحمەد و موسلیم و ترمذي گێڕاویانەتەوە).

(ترمذي) ووتویەتی: ئەم حەدیسە حەسەن و صەحیح و غەریبە، وە کردەوەی زانایان لەسەر ئەو حەدیسە ئەوەیە کە هەر شارە بینینی خۆی هەیە.

لە (فتح العلام) شەرحی (بلوغ المرام)دا هاتووە: نزیکترین شت لە ڕاستی‌یەوە ئەوەیە هەر شوێنە بەستراوە بە بینینی خۆیەوە، وە هەروەها ئەو شوێنانەش کە کەوتوونە سەر ئەو هێڵە، ئەمە شایەتەو لەگەڵ واقعیشدا دێتەوە[1].

---

(١) ئەمە قسەیەکی سەیرە چونکە ئەگەر ڕاستیش بێت کە ئەو قسەیە هەڵبژاردەیەو وا دەرئەکەوێت و لەگەڵ واقعیشدا دێتەوە، ئەوە لەگەڵ شەرعدا نایەتەوە، لەبەر ئەوەی ئەو هێڵ و شوێنانەی کە بە یەکەوەن چەند شتێکی نیسبین و سنووری ماددیان نی‌یە، تاوەکو خەڵك بتوانن دەری بخەن و وەستانی لەسەر بکەن.

وە من ـ سوێند بە خوا ـ نازانم چی وای لە دانەر کردووە کە ئەم ڕاو بۆچوونە شازە هەڵبژێرێت و پشت لە گشتیەتی کار کردن بە حەدیسە صەحیحەکە بکات، بە تایبەت کە ئەمە مەزهەبی جەماوەرە، هەروەکو بۆ خۆی باسی کردووە، وە زۆر کەس لە زانا لێکۆڵەرەوەکان هەر ئەو ڕایەیان هەڵبژاردووە، هەروەکو (شيخ الإسلام) ئیبنوتەیمی‌یە لە (فتاوى) دا (بەرگی ٢٥) وە هەروەها شەوکانی لە (نيل الأوطار) دا و (صديق حسن خان) لە (الروضة الندية ١/٢٢٤-٢٢٥) و جگە لەوانیش، وە هەر ئەمەش حەقە کە قسەی تر جگە لەو حەق نی‌یە، ئینجا حەدیسەکەی ئیبنوعەبباسیش بەرهەڵستی ئەم بۆچوونە ناکات، لەبەر چەند هۆیەك کە شەوکانی باسی کردووە ڕەحمەتی خوای لێ بێت، و بەهێزترین هۆ ئەوەیە کە بووترێت: حەدیسەکەی ئیبنوعەبباس لەبارەی کەسێکەوەیە کە کاری بە بینینی خەڵکی وڵاتەکەی خۆی کردبێت و بە قسەی ئەوان بەڕۆژوو بووبێت، لە دواییدا لە کاتی ڕەمەزاندا

**کەسێك کە بە تەنها خۆی مانگ ببینێت:**

زانایانی فقه لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون کە هەرکەس خۆی بە تەنها مانگی بینی لەسەری پێویستە بەڕۆژوو بێت[1].

---

هەواڵی پێ بگات کە خەڵکی وڵاتێکی تر ڕۆژێك پێش ئەوان مانگیان دیوە، لەو حاڵەتەدا ئەو کەسە لەگەڵ خەڵکی ئەو وڵاتەی خۆیدا سی ڕۆژەکە تەواو نەکات، یان مانگی خۆیان ببینن، جا بەم شێوەیە ئیشکال لائەچێت.

حەدیسەکەی ئەبو هورەیرە و کەسانی تر لەسەر گشتی‌یەتەکەی ئەمێنێتەوە، کە هەموو کەسێك ئەگرێتەوە کە هەواڵی مانگ بینینی پێ درابێت لە هەر شارو ناوچەیەك بێت، بێ ئەوەی کە ماوەیەك لە نێوانیاندا دیاری بکرێت، هەروەکو ئیبنوتەیمی‌یە لە (الفتاوی) دا ووتویەتی: (٢٥/١٠٧)، ئەو کارەش ئەمڕۆ زۆر ئاسانە هەروەکو زاندراوە، بەڵام کەمێك پەرۆشی و گرینگی پێدانی وڵاتە ئیسلامی‌یەکانی ئەوێت، تاوەکو بیکەن بە ڕاستی‌یەکی ڕوودار، ئەگەر خوای گەورە بیەوێت.

بەڵام تاوەکو وڵاتە ئیسلامی‌یەکان ئەو کارە ئەکەن من پێم وایە کە هەرکەسەو لەگەڵ خەڵکی وڵاتی خۆی بەڕۆژوو بێت، و بەش بەش نەبن، هەندێکیان لەگەڵ ئەو وڵاتەدا بەڕۆژوو بن و هەندەکەی تریان لەگەڵ وڵاتێکی تردا بەڕۆژوو بن، جا ئەو دەوڵەتەی خۆی لەو ڕۆژەدا دووا کەوێت یا پێش کەوێت ئەو هەر جیاوازی بکات، چونکە ئەم کارە بازنەی دوو بەرەکایەتی و ناکۆکی لەنێوان یەك گەلدا زیاتر ئەکات، وەکو لە هەندێ لە وڵاتە عەرەبی‌یەکان ڕووی داوە لە چەند ساڵێکەوە، ئیتر خواش پەنامان بێت (تمام المنة).

(١) ئەم قسەیە بە گشتی ناوەڕێت بەڵکو شی کردنەوەیەکی هەیە کە شیخ الإسلام ئیبنوتەیمی‌یە لە (فتاوی ٢٥/١١٤) دا باسی کردووە کە ئەفەرمووێت:

ئەگەر بە تەنیا مانگی بینی بۆ بەڕۆژوو بوون یان بۆ شکاندن ئایا بۆی هەیە بەو بینینەی خۆی بەڕۆژوو بێت یان بەو بینینە بەڕۆژوو نەبێت؟ یان هەر لەگەڵ خەڵکدا بێت لە بەڕۆژوو بوون و بەڕۆژوو نەبووندا؟ سێ قسەی لەسەرە چونکە سێ ریوایەت لە ئەحمەدەوە هەیە:

لەپاشان باسی ئەو سێ ریوایەتەی کردووە.

جا ئەوەی گرینگ بێت بۆ ئێمە ئەوەیانە کە لەگەڵ حەدیسەکەدا یەك هاتۆتەوە ئەویش ئەوەیە کە ئەفەرمووێت:

ڕای سێیەم ئەوەیە کە لەگەڵ خەڵکەکەدا بەڕۆژوو بێت و لەگەڵ ئەوانیشدا بیشکێنێت، ئەمەش زاهیرترین قسەیە لەبەر فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ (صومکم یوم تصومون، وفطرکم یوم تفطرون، وأضحاکم یوم تضحون) واتە: ڕۆژووی ئێوە ئەوکاتەیە کە کۆمەڵی موسڵمانان بەڕۆژوو ئەبن، وە جەژنی ڕەمەزانتان ئەوکاتە دروستە کە کۆمەڵی موسڵمانان جەژنیانە، وە جەژنی قوربانتان ئەوکاتە دروستە کە کۆمەڵی موسڵمانان جەژنیانە.

(ترمذي) ئەم حەدیسەی ریوایەت کردووە و ووتویەتی: حەسەن و غەریبە، وە ووتویەتی: هەندێك لە زانایان ئەم حەدیسەیان لێك داوەتەوە و ووتویانە، مانای ئەم بەڕۆژوو بوون و بەڕۆژوو نەبوونە ئەوەیە لەگەڵ کۆمەڵی موسڵمانان و زۆربەی خەڵکیدا بێت.

بەڵام (عطاء) بەپێچەوانەی ئەوەیەو ئەڵێت: ئەبێ غەیری ئەویش لەگەڵ ئەودا مانگ ببینێت ئینجا ئەبێت بەڕۆژوو بێت.

بەڵام زانایان ئیختیلافیان هەیە لە بینینی هیلالی مانگی شەووال لە لایەن تەنها کەسێکەوە، وە ڕاستی ئەوەیە کە ئەبێت ئەو کەسە بەڕۆژوو نەبێت، وەك شافیعی وئەبوثەور ووتویانە. چونکە پێغەمبەر ﷺ ڕۆژووی پێویست کردووە بە بینینی مانگ، وە شکاندەکەشی هەر بە بینینی پێویست کردووە. وە ئەو کەسەش ئەو بینینەی بە یەقین بە دەست هێناوە، وە بینین شتێکە کە هەست بەشدارە تێیدا، ئیتر پێویست بە بەشداری کەسی تر ناکات.

**پایەکانی ڕۆژوو:**

ڕۆژوو دوو پایەی هەیە کە حەقیقەتی ڕۆژووی لێ پێك دێت:

١- خۆگرتنەوە لەو شتانەی ڕۆژوو ئەشکێنن لە طلوعی فەجرەوە هەتا خۆر ئاوا بوون، بەپێی فەرموودەکەی خوای گەورە کە فەرموویەتی: ﴿فَٱلۡـَٔـٰنَ بَـٰشِرُوهُنَّ وَٱبۡتَغُواْ مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمۡۚ وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلۡخَيۡطُ ٱلۡأَبۡيَضُ مِنَ ٱلۡخَيۡطِ ٱلۡأَسۡوَدِ مِنَ ٱلۡفَجۡرِۖ ثُمَّ أَتِمُّواْ ٱلصِّيَامَ إِلَى ٱلَّيۡلِۚ﴾ (البقرة/١٨٧). واتە: ئێستا بچنە لای خێزانەکانتان وە ئەوەی خوا بۆی نوسیون هەوڵی بۆ بدەن، وە بخۆن وبخۆنەوە هەتا ڕشتەی سپی فەجر - ڕۆشنایی ڕۆژ - لە ڕشتەی ڕەشی شەو - تاریکایی شەو - جیا ئەکەنەوە - بە هەڵهاتنی فەجری صادق - ، پاشان بەردەوام بن لە ڕۆژووەکەتاندا.

بەپێی ئەوەی بوخاری وموسلیم ئەگێڕنەوە لە عەدی کوڕی حاتەمەوە ووتویەتی: کاتێ ئایەتی ﴿حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلۡخَيۡطُ ٱلۡأَبۡيَضُ مِنَ ٱلۡخَيۡطِ ٱلۡأَسۡوَدِ﴾ هاتە خوارەوە پەتێکی ڕەش و پەتێکی سپیم هێناو خستمە ژێر سەرینەکەمەوەو شەو سەیرم ئەکرد هەر بۆم جیا نەئەکرایەوە، کاتێ بەیانی هات چووم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و ئەوەم بۆ گێڕایەوە فەرمووی: (إِنَّمَا ذَلِكَ سَوَادُ اللَّيلِ وَبَيَاضُ النَّهَارِ). واتە: ئەوە مەبەستی تاریکی شەو و ڕووناکی ڕۆژە.

---

ئەم حەدیسەش لە (الصحيحة) دا تەخریج کراوە (٢٢٤) و لە (الإرواء ٩٠٥) لە چەند ڕێگایەکەوە لە ئەبو هورەیرەوە، جا هەرکەس پێی خۆش بێت با بۆیان بگەڕێتەوە.

لەپاشان ئیبنوتەیمیە ئەفەرمووێت (ل ١١٧):

بەڵام هەرکەس لە شوێنێك بوو کە جگە لەو کەسی تری لێ نەبوو، ئەگەر مانگی بینی بەڕۆژوو بێت، چونکە ئەو بە تەنیایە و کەسی لێ نیە (تمام المنة).

٢-نیـیەت هێنان: بەپێی فەرموودەکەی خوای گەورە کە ئەفەرمووێت: ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ﴾ (البینە/٥). واتە: وە بەوان فەرمانێك نەدرابوو جگە لەوەی کە عیبادەتی خوا بکەن و دینیان خالص و پوختە بۆ ئەو بێت.

وە بەپێی فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ کە ئەفەرمووێت: (إنَّمَا الإعمَالُ بِالنِّيَّاتِ، وَإنَّمَا لِكُلِّ امرِئٍ مَا نوی). واتە: قەبووڵ بوونی کردەوەکان لە لای خوا تەنها بە نییەتە، وە هەرکەس چ نییەتێکی هێنابێ هەرئەوەی بۆ هەیە.

وە ئەبێت پێش فەجر ئەو نییەتە هاتبێت لە هەموو شەوێك لە شەوەکانی ڕەمەزاندا، بەپێی ئەوەی حەفصە خوای لێ ڕازی بێت ئەگێڕێتەوەو ئەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن لَم يُجمِعِ الصِّيَامَ قَبلَ الفَجرِ فَلا صِيَامَ لَهُ). (رواه أحمد وأصحاب السنن وصححه ابن خزيمه وابن حبان). واتە: هەرکەس پێش فەجر نیازی بەڕۆژوو بوونی نەبێت ڕۆژووەکەی دروست نیـیە.

وە ئەو نییەت هێنانە لە هەر بەشێکی شەودا بێت دروستە، وە مەرج نیـیە بە دەم بووترێت، چونکە نییەت کارێکی دڵی پەتیـیە، زمان و دەم هاوبەش نین تیایدا، چونکە حەقیقەتی نییەت مەبەستە بۆ کارێك کە فەرمانی خوای تێدا بە جێ بێت و لەبەر خوا بێت.

جا هەرکەس پارشێوی کرد بە مەبەستی ڕۆژووگرتن و خۆگرتنەوە لە خواردن و خواردنەوە بە مەبەستی خوا پەرستی، ئەوە نییەتی هێناوە.

وە هەرکەسیش بیەوێت بە ڕۆژ هیچ نەخوات و هیچ نەخواتەوە لەبەر خوا با پارشێویشی نەکردبێت، ئەوە هەر نییەتی هێناوە.

زۆر لە زانایان ووتویانە: نییەتی ڕۆژووی سوننەت لەکاتی ڕۆژیشدا دروستە، ئەگەر کاتی ڕۆژ بوونەوە هیچی نەخواردبێت. عائیشە ڕەزای خوای لێ بێت فەرموویەتی: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێك هاتەوە ماڵ و فەرمووی: (هیچتان هەیە بیخۆم؟) ووتم: نا، فەرمووی: (دەی کەواتە من بەڕۆژووم). (موسلیم وئەبوداود گێڕاویانەتەوە).

بەڵام حەنەفیـیەکان ئەڵێن: مەرجە نییەت هێنانەکە پێش زەوال بێت . واتە: پێش نیوەڕۆ. ئەمەش مەشهورە لە دوو قەولەی شافیعی، وە ظاهیری دووقەولەی ئیبنومەسعودو ئەحمەد ئەوەیە: کە فەرقی نیـیە ئەو نییەتە چ لە پێش زەوال یا لە دوایدا بێت، دروستە.

**ڕۆژووی ڕەمەزان لەسەر کێ پێویستە؟:**

زانایان هەموو لەسەر ئەوە کۆن کە ڕۆژوو پێویستە لەسەر موسڵمانی خاوەن ئاوەزی باڵقی لەش ساغی (مقیم) نیشتەجێ، وە پێویستە ئەو موسڵمانە ئەگەر ئافرەت بوو پاك بێت لە حەیز و زەیستانی.

کەواتە بێ باوەڕ ڕۆژووی لەسەر نییە، وە هەروەها شێت و منداڵ و نەخۆش و موسافیر و ئافرەتی حەیزدار و زەیستان، وەهەروەها پیاوی پیر و ئافرەتی دووگیان و شیردەر.

هەندێ لەوانە بە هیچ جۆرێك ڕۆژویان لەسەر نییە، وەك بێباوەڕو شێت، وە هەندێکیان داوا لەسەرپەرشتیارەکەی ئەکرێت ڕۆژووی پێ بگرێت، وە هەندێکیان لەوانە پێویستە ئەو کاتە بەڕۆژوو نەبن و دوایی بیگرنەوە، وە هەندێکیان ڕێیان پێدراوە بەڕۆژوو نەبن و فیدیە بدەن. وە ئێستا هەریەك لەمانە بەجیا باس ئەکەین.

**ڕۆژووی بێ باوەڕ و شێت:**

ڕۆژوو خوا پەرەستیەکی ئیسلامییە، جا لەسەر غەیری موسڵمان پێویست نییە، وە شێت موکەللەف نییەو لەسەری نییە، چونکە ئاوەزی لێ سەندەراوەتەوە، کە ئاوەزە کە هۆی پێویست بوونی تەکلیفە لەسەری.

لە حەدیسی عەلی دا ﷺ هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (رُفِعَ القَلَمُ عَن ثلاثةٍ: عَنِ المَجنُونِ حتى يُفِيقَ، وَعَنِ النَّائِمِ حتى يَستَيقِظَ، وَعَنِ الصَّبِّي حتى يَحتَلِمَ) (رواه أحمد وأبوداود والترمذي). واتە: سێ کەس پێنووسیان (واجب) لەسەر هەڵگیراوە: شێت هەتا چاك ئەبێتەوە، و خەوتو هەتا لە خەو هەڵئەسێت، و منداڵ هەتا باڵق ئەبێت.

**ڕۆژووی منداڵ:**

منداڵ هەر چەندە ڕۆژووی لەسەر نییە، بەڵام پێویستە لەسەر (ولي) پەروەردەکەری کە فەرمانی ڕۆژووگرتنی پێ بکات، بۆ ئەوەی هەر لە منداڵییەوە ڕابێت لەسەر ڕۆژوو گرتن مادام بتوانێت ڕۆژوو بگرێت.

لە (رُبَيِّع) ی کچی (معوذ)ەوە هاتووە ووتویەتی: پێغەمبەر ﷺ ـ بەیانی عاشورا ـ نێرراوی نارد بۆ گوندەکانی ئەنصار، پێی ڕاگەیاندن: (هەر کەس ڕۆژی کردۆتەوەو بەڕۆژوو بووە با ڕۆژووەکەی تەواو بکات، وە هەرکەس بەڕۆژوو نەبووە با ئەوەی لە ڕۆژ ماوە بەڕۆژوو بێت). جا ئەوە بوو ئێمە لەوکاتەوە تێیدا بەڕۆژوو بووین و فەرمانمان بە منداڵەکانیشمان ئەکرد کە بەڕۆژوو بن، وە ئەچووین بۆ مزگەوت و بە مووخوری یاری منداڵانمان دروست ئەکرد بۆیان، جا ئەگەر یەکێکیان لە برسان بگریایە ئەو یارییەمان ئەدا بەدەستی هەتا ئێوارە ئەهات و ڕۆژوومان ئەشکاند. (بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە).

**ئەوانەی ڕێیان پێدراوە بەڕۆژوو نەبن و فدیەیان لەسەر واجبە؟**

پیاوی زۆر پیر و ژنی زۆر پیر و نەخۆشێك هیوای چاك بوونەوەی لێ نەکرێ و ئەوانەی کاری زۆرگران ئەکەن و لەو کارە بەولاوە نەبێت بیکەن، و بێ ئەو کارە نەژین، ئەمانە هەمویان بۆیان هەیە بەڕۆژوو نەبن، ئەگەر ڕۆژوو گرتنەکە پەرێشانیان بکاو زۆرگران بێ لەسەریان لە هەموو وەرزەکانی ساڵدا، وە ئەبێ هەموو

ڕۆژێك خواردنی هەژارێك بدەن لە بریتی ڕۆژووەكەیان. وە زانایان ئەوەیان داناوە بە صاعێك یا نیو صاع یا مشتێك، وە لە ئەندازەكەیدا خیلاف هەیە لە نێوان زانایاندا. وە لە سوننەتدا بەڵگەیەك نەهاتووە كە ئەو ئەندازەیەی پێ دیاری بكرێ.

ئیبنوعەبباس فەرمویەتی: پیاوێكی زۆر پیر بۆی هەیە بەڕۆژوو نەبێت، وە لە بریتی ڕۆژووەكەی هەموو ڕۆژێك هەژارێك تێر بكات و ڕۆژووەكەی نەگرێتەوە. (رواه الدارقطني والحاكم وصححاه).

بوخاری لە (عطاء)ەوە ئەگێڕێتەوە كە گوێی لە ئیبنوعەبباس بووە ﷺ ئەم ئایەتەی ئەخوێندەوە: ﴿وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ﴾ (البقرة/١٨٤). واتە: وە لەسەر ئەوانەی كە توانای ڕۆژووگرتنیان هەیە فدیەی هەر ڕۆژێك، خواردن پێدانی مسكینێكە. وە ئەی فەرموو: ئەم ئایەتە مەنسوخ نییە، بۆ پیاوی پیر و پیرەژن كە ناتوانن بەڕۆژوو بن، بۆیان هەیە لەجیاتی هەر ڕۆژێك هەژارێك تێر بكەن و بەڕۆژوو نەبن.

وە هەروەها نەخۆشێك كە هیوای چاك بوونەوەی لێ نەكرێت، و ئەگەر بەڕۆژوو بێت پەرێشان بێت، وەك پیاوی پیر وایە و جیاوازیان نییە لەوەدا، وە هەروەها ئەو كرێكارانەی كاری زۆر گران ئەنجام ئەدەن.

شێخ محمد عبده وتویەتی: مەبەست لە ﴿يُطِيقُونَهُۥ﴾ كە لە ئایەتەكەدا هاتووە پیاوی پیر وزەعیفە، وە ئەو نەخۆشانەن كە نەخۆشییەكەیان درێژ خایەنن، وەهەروەها ئەو كرێكارانەی خوا بژێوی خستونە سەر ئەنجامدانی كاری گران، وەك دەر هێنانی خەڵوزی بەرد لە كانەبەردەكان.

وە ئەو تاوان بارانەی كە حوكمی بەندی هەمیشەیی لەگەڵ كاری گران دراوە بە سەریانا لەمانەن، كاتێ ڕۆژوو بەڕاستی لەسەریان گران بێت، وبشتوانن فدیە بدەن.

وە ژنی دووگیان و شیردەر ئەگەر ترسیان لە خۆیان هەبێت یا لە منداڵەكەیان بۆیان هەیە بەڕۆژوو نەبن و فدیە بدەن، وە گرتنەوەكەی ئەو ڕۆژوەشیان لەسەر نییە. (بە ڕای ئیبنوعمر و ئیبنوعەبباس).

ئەبوداود لە عیكرمەوە ئەگێڕێتەوە وتویەتی: ئیبنوعەبباس لەبارەی: ﴿وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ﴾ (البقرة/١٨٢). ئەی فەرموو: خوای گەورە مەبەستی لە وانە پیری پەك كەوتە و پیرە ژنانن، ئەم دووانە ئەتوانن بەڕۆژوو بن، جا بۆیان هەیە بەڕۆژوو نەبن ولە جیاتی هەر ڕۆژێك هەژارێك تێر بكەن، وە نافرەتی دووگیان و ژنی شیردەر ئەگەر ترسیان هەبوو لە منداڵەكەیان بۆیان هەیە بەڕۆژوو نەبن و لە بریتی هەر ڕۆژێك هەژارێك تێر بكەن. (بەززار گێڕاویەتەوە).

وە لە کۆتاییدا ئەوەی زیاد کردووە: ئیبنوعەبباس بە دایکی کوڕێکی خۆی کە -ئەو دایکە- دووگیان بوو ئەفەرموو: تۆ لەو کەسانەی توانای گرتنی ڕۆژوویان نیە، فدیە بدە و ڕۆژووەکەشت مەگرەوە. (دارقطني ئیسنادەکەی بە صەحیح داناوە).

لە نافیعەوە هاتووە کە ئیبنوعومەر ڕەزای خوایان لێ بێت پرسیاری لیٚکرا لەبارەی ژنێکی دووگیان ئەگەر ترسی منداڵەکەی هەبێت چی بکات؟ فەرمووی: بەڕۆژوو نەبێت و لە جیاتی هەر ڕۆژێك هەژارێك تێر بکات بە موددێك گەنم. (مالیك و بەیهەقی گێڕاویانەتەوە).

وە لە حەدیسدا هاتووە: (إنَّ اللهَ وَضَعَ عَنِ المُسَافِرِ الصَّومَ وَشَطرَ الصَّلاةِ وَعَنِ الحبلى وَالمُرضِع الصَّومَ). واتە: خوا ڕۆژوو نیوەی نوێژی لەسەر موسافیر لابردووە، وە لەسەر ژنی دووگیان و شیردەر تەنها ڕۆژووی لابردووە.

وە لای حەنەفیەکان و ئەبوعوبەیدو ئەبوثەور: ژنی دووگیان و شیردەر بەڕۆژوو نەبن و تەنها گێڕانەوەیان لەسەرە بیٚ فدیە.

وە لای ئەحمەد و شافیعی: ئەگەر تەنها ترسیان لە منداڵەکەیان هەبوو، وە بەڕۆژوو نەبوون ئەبیٚ هەم بیگرنەوە و هەم فدیە بدەن. بەڵام ئەگەر تەنها ترسیان لە خۆیان هەبوو، یا ترسیان هەم لە خۆیان و هەم لە منداڵەکەیان هەبوو، ئەوە هەر گێڕانەوەیان لەسەرە وهیچی تر.

**ئەوکەسەی ڕێی پیٚ دراوە بەڕۆژوو نەبێت و گێڕانەوەی لەسەرە:**

کەسێك نەخۆش بێت و ئومێدی چاك بوونەوەی هەبێت، یان موسافیر بێت دروستە بەڕۆژوو نەبێت، بەڵام پێویستە لەسەری بیگرێتەوە.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ﴾ (البقرة/١٨٤). واتە: هەرکەس لە ئێوە نەخۆش بوو یا موسافیر بوو ڕۆژووەکەی بشکێنێت و لە چەند ڕۆژێکی تردا بیانگرێتەوە.

ئەحمەدو ئەبوداودو بەیهەقی بە سەنەدێکی صەحیح ئەگێڕنەوە لە موعاذەوە کە فەرموویەتی: خوای گەورە ڕۆژووی لەسەر پێغەمبەر ﷺ فەرز کرد و ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ﴾ (البقرة/١٨٣). واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ڕۆژووتان لەسەر واجب بووە وەك چۆن لەسەر ئەوانەی پێش ئێوە واجب بووە. هەتا ئەگاتە ﴿وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ﴾ (البقرة/١٨٤). واتە: وە ئەوانەی بۆیان ئەگیرێت با فدیە بدەن کە بۆ هەر ڕۆژوویەك خواردنی مسکینێك بدەن.

جا ئەوە بوو هەرکەس ئارەزوی لیّ بوایە بەڕۆژوو ئەبوو، وە هەرکەس ئارەزووی بووایە بۆ هەر ڕۆژوویێك مسکینێکی نان ئەدا، وە بۆی دروست بوو بەڕۆژوو نەبێت، پاشان خوای گەورە ئەم ئایەتەی تری ناردە خوارەوە: ﴿شَهۡرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلۡقُرۡءَانُ﴾ (البقرة/١٨٥). واتە: مانگی ڕەمەزان ئەو مانگەیە قورئانی تێدا هاتۆتە خوارەوە. هەتا: ﴿فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهۡرَ فَلۡيَصُمۡهُۖ﴾. واتە: هەرکەس لە ئێوە لە مانگی ڕەمەزاندا حازر بوو، وە لە سەفەردا نەبوو، با بەڕۆژوو بێت.

جا بەم فەرمایشتە بە ڕۆژوو بوونی ثابت کرد لەسەر (مقیم) نیشتەجیێی لەش ساغ، وە ڕیێ درا بە نەخۆش و موسافیر کە بەڕۆژوو نەبن لەوکاتەدا، وە خواردن پیێ دانیشی بە مسکین (ثابت) کرد بۆ پیری پەك کەوتە کە ناتوانیێ بەڕۆژوو بێت.

وە ئەو نەخۆشی‌یەی بەڕۆژوو نەبوون ڕەوا ئەکات، ئەو نەخۆشی‌یە گرانەیە کە بەڕۆژوو گرتن زیاتر بێت، یا ترسی دوا کەوتنی چاك بوونەوەی لیێ بکرێت.

لە (المغني)دا هاتووە ئەڵێت: لە هەندیێ سەلەفەوە ئەگێڕنەوە ووتویانە: بە هەموو نەخۆشی‌یەك ڕۆژوو شکاندن ڕوا نەبێت، هەتا بە دان ئێشە وئازاری پەنجەش بەپیێ گشتێتی ئایەتەکە، وە لەبەر ئەوەی موسافیر بۆی ڕەوایە بەڕۆژوو نەبێت، هەرچەندە توانای گرتنیشی هەبێت، کەواتە نەخۆشیش هەر بۆی هەیە. ئەمەش مەزهەبی بوخاری و (عطاء) و ئەهلی (ظاهر)ە.

وە ئەو ئینسانە ساغەی کە ترسی ئەوەی هەبێت ئەگەر بەڕۆژوو بوو نەخۆش بکەوێت، با بەڕۆژوو نەبێت وەك نەخۆش.

هەروەها کەسێك تینوێتی و برسێتی پەرێشانی بکات بە شێوەیەك ترسی گیان لە دەست دانی هەبێت، ئەبیێ ڕۆژووەکەی بشکێنێت با لەش ساغ و نیشتەجێش بێت، وە ئەبێت لە دواییدا بیگرێتەوە. خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمۡ رَحِيمٗا﴾ (النساء/٢٩). واتە: ـ یەکتری و ـ خۆتان مەکوژن بەڕاستی خوا دەرحەق بە ئێوە بە بەزەیی‌یە.

هەروەها ئەفەرمووێت: ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلدِّينِ مِنۡ حَرَجٖۚ﴾ (الحج/٧٨). واتە: خوا لە ئایین دا لەسەرتان باری گرانی دانەناوە.

وە ئەگەر نەخۆش خۆی بۆ ڕاگیرا و بەڕۆژوو بوو ڕۆژووەکەی دروستە، ئەوەندەی هەیە کەراهەتی هەیە، چونکە پشتی کردۆتە ئەو ڕوخسەتەی کە خوا پیێ داوەو پیێ خۆشە، وە لەوانەیە بەو ڕۆژوو گرتنە زیانی پیێ بگات. هەر بۆیە هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ هەندێکیان لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ دا بەڕۆژوو

نەبوون، وە هەندێکیان لەکاتی نەخۆشیدا بەڕۆژوو نەئەبوون، وە لەوەدا شوێن فتوای پێغەمبەر ﷺ ئەکەوتن.

حەمزەی ئەسلەمی لە پێغەمبەری ﷺ پرسی: ئەی نێرراوی خوا من لە خۆم ڕائەبینم بەڕۆژوو بم و توانام هەیە، ئایا ئەگەر بەڕۆژوو بم تاوانبار ئەبم؟ ئەویش فەرمووی: (هِيَ رُخصَةٌ مِنَ اللهِ تعالى، فَمَن أخَذَ بِهَا، فَحَسَنٌ، وَمَن أحَبَّ أن يَصُومَ فَلا جُنَاحَ عَلَيهِ) (رواه مسلم). واتە: ئەوە ڕوخصەتێکە لە خواوە، هەرکەس وەری بگرێ چاکە، وە ئەگەر کەسێك حەز بکات هەر بەڕۆژوو بێت تاوانبار نابێت.

لە ئەبوسەعیدی خودریەوە ﷺ هاتووە فەرمویەتی: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بۆ سەفەر چووین بۆ مەککە، وە ئێمە بەڕۆژوو بووین، لە شوێنێکدا لامان دا، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (إنَّكُم قَد دَنَوتُم مِن عَدُوِّكُم، وَالفِطرُ أقوى لَكُم). واتە: وا لە دوژمنتان نزیك ئەبنەوە، ئەگەر بەڕۆژوو نەبن بەهێزترو بەتواناتر ئەبن.

جا ئەمە ڕوخصەتێك بوو کە پێی داین، هەمان بوو ئەی شکاند، وە هەمان بوو نەیئەشکاند. پاشان لە شوێنێکی تردا لاماندا فەرمووی: (إنَّكُم مُصَبِحُوا عَدُوِّكُم، وَالفِطرُ أقوى لَكُم، فَأفطِرُوا). واتە: ئێوە بەیانی ئەگەن بە دوژمنەکەتان ئەگەر بەڕۆژوو نەبن بە هێزترو بەتواناتر ئەبن، لەبەر ئەوە بەڕۆژوو مەبن.

ئەڵێن ئەمەیان فەرمان بوو، ئێمەش بەڕۆژوو نەبووین. پاشان لە گەڵ پێغەمبەر ﷺ ئەچووین بۆ سەفەر، بەڕۆژوش ئەبووین. (ئەحمەدو موسلیم و ئەبوداود گێڕاویانەتەوە).

وە هەر لە ئەبوسەعیدی خودریەوە ﷺ هاتووە کە فەرمویەتی: ڕەمەزان بووە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دا غەزامان کردووە، هەمان بووە بەڕۆژوو بووە، وە هەمان بووە بەڕۆژوو نەبووە، نە ئەوانەی بەڕۆژوو بوون لۆمەی ئەوانەیان ئەکرد کە بەڕۆژوو نین، وە نە ئەوانەش بەڕۆژوو نەبوون لۆمەیێ ئەوانیان ئەکرد کە بەڕۆژوون، پاشان ڕایان وابوو هەرکەس توانای بەڕۆژوو بوونی هەبێت بەڕۆژوو بێت چاکی کردووە، وە هەرکەس توانای نەبێت و بەڕۆژوو نەبێت هەر چاکی کردووە. (ئەحمەد و موسلیم گێڕاویانەتەوە).

**بەڵام زانایان ئیختیلافیان هەیە لەسەر ئەوەی کە کامیان چاکترە:**

ئەبوحەنیفە و شافیعی و مالیك ڕایان وایە بەڕۆژوو بێت چاکترە، بۆ ئەو کەسەی توانای گرتنی هەبێ، وە نە گرتنی چاکترە بۆ کەسێك توانای ڕۆژوو گرتنی نەبێت.

وە ئەحمەد ئەڵێت: بەڕۆژوو نەبوون بۆ هەر دوو لا چاکترە.

وە عومەری کوڕی عبدالعزیز ووتویەتی: ئاسان ترینیان چاکترینیانە، جا هەرکەس گرتنەکەی ئەو کاتە لا ئاسان بێت و لەدواییدا گێڕانەوەی لا گران بێت، ئەوە بەڕۆژوو بوونی چاکترە.

وە شەوکانی لەم باسە ئەکۆڵێتەوەو ئەڵێت: ئەگەر کەسێك ڕۆژوو گرتنی لەسەر گران بێت و زیانی پێ بگات، وە هەروەها کەسێك ڕوخصەتەکەی وەرنەگرت و پشتی کرد، ئەوە نەگرتن چاکترە بۆیان، وە هەروەها

کەسێك لە ڕیاو بە خۆ نازینی خۆی بترسێت -ئەگەر لە سەفەردا بەڕۆژوو بێت- ئەوە نەگرتنی چاکترە، وە ئەگەر بەڕۆژوو بوونی لەوانە بە دوور بێت کە باسم کرد ئەوە بەڕۆژوو بوونی چاکترە، وە ئەگەر کەسێك موسافیر بوو، شەو نیێتی هێنا و بەڕۆژوو بێت و بەڕۆژوو بوو، دروستە لەو ڕۆژەدا ڕۆژووەکەی بشکێنێت، چونکی لە جابیری کوڕی عبداللە وە ﷺ هاتووە فەرمویەتی: ساڵی فەتحی مەککە پێغەمبەر ﷺ بەرەو مەککە ئەڕۆیشت و بەڕۆژوو بوو، هەتا گەیشتە (کراع الغمیم) -دۆڵێکە لە پێش عسەفانەوەیە- خەلکەکەش بەڕۆژوو بوون لەگەڵیا، پێیان ووت: خەلك پەرێشانن و چاو لە تۆ ئەکەن و بەڕۆژوو ئەبن، پێغەمبەریش ﷺ داوای پەرداخێك ئاوی کردو خواردیەوە، کاتیش دوای عەصر بوو، خەلکەکە سەیریان ئەکرد، ئیتر هەندێکیان شکاندیان و هەندێکیان نەیان شکاند، وە پێی گەیشتەوە کە هەندێ کەس هەر نەیان شکاندووە، فەرموی: (أولَئِكَ العُصَاةُ) واتە: ئەوانە سەرپێچیان کردووە. (رواه مسلم والنسائي والترمذي وصححه).

وە ئەگەر کەسێك نیەتی ڕۆژووی هێناو -موقیم بوو- پاشان سەفەری کرد لەو ڕۆژەدا، جمهوری زانایان ئەڵێن: دروست نیە ڕۆژووەکەی بشکێنێت، بەڵام ئەحمەدو ئیسحاق ڕێیان داوە بە شکاندنی، بەپێی ئەوەی (ترمذي) ئەگێڕێتەوەو بە حەسەنی داناوە کە موحەممەدی کوڕی کەعب ووتویەتی: لە ڕەمەزاندا چووم بۆلای ئەنەسی کوڕی مالیك، ئەی ویست بچێتە سەفەر، ووڵاغەکەی بۆ ئامادە کرابوو، جلی سەفەری لەبەر کردبوو جا، داوای خواردنی کردو خواردی، منیش ووتم: ئایا ئەوە سوننەتە؟ ووتی: سوننەتە، پاشان سووار بوو[1].

وە لە عوبەیدی کوڕی جوبەیرەوە هاتووە ووتویەتی: ڕەمەزان بوو لە گەڵ ئەبوبەصرەی غیفاریدا لە (فسطاط) -میصری کۆنە- سوواری کەشتی بووین، دەستی کرد بەڕۆیشتن و خواردنەکەی هێنایە پێشەوە، پاشان ووتی: نزیك بەرەوە، ووتم: هێشتا لەناو ماڵەکانداى!! ئەبوبەصرە ووتی: ئایا پشت لە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ ئەکەیت؟ (ئەحمەد و ئەبوداود گێڕاویانەتەوە و پیاوەکانی ثیقەن)[2].

---

(١) ئەم حەدیسە لە سەنەدەکەیدا عوبەیدی کوڕی جەعفەر هەیە کە زەعیفە (دانەر).

(٢) دانەر بەو شێوەیە ئەڵێت و چاو لە شەوکانی ئەکات، بەڵام دوو سەرنجی لەسەرە لە دوو ڕووەوە:

یەکەم: عوبەیدی کوڕی جوبەیر مەجهولە، بەڵام ئەگەر کوڕی حونەین بێت ئەوە سیقەیە.

دووەم: کولەیبی کوڕی (ذهل) لێوەی ئەگێڕێتەوە، ئیبنوخوزەیمە لەبارەیەوە ئەڵێت: عەدالەتم لێوە نەزانیوە، وە هەروەها (حافظ) یش لە (التقریب) دا ئەڵێت: (لین الحدیث)، بەڵام حەدیسەکەی دوای ئەمە شایەتی بۆ ئەدات، هەروەها حەدیسێکی تر لە ئەنەسەوە و سەنەدەکەشی، صەحیحە هەروەك لە نامیلکەکەمدا (حدیث إفطار الصائم قبل سفره بعد الحج) باسم کردووە، و لێی کۆڵاوەمەتەوە، کە چاپیش بووە (تمام المنة).

شەوکانی ووتویەتی: هەر دوو حەدیسەکە ئەبنە بەڵگەی ئەوەی کە موسافیر بۆی هەیە ڕۆژوو بشکێنێت پێش دەرچوونی لەو شوێنەی کە سەفەرەکەی لێوە ئەکات.

وە ووتویەتی: (ابن العربي) ئەڵێت: حەدیسەکەی ئەنەس صەحیحەو ئەوە پێویست ئەکات کە ڕۆژوو شکاندن لەکاتی خۆ ئامادە کردن بۆ سەفەر دروست بێت، جا شەوکانی ئەڵێت: حەق ئەمەیانە.

وە ئەو سەفەرەی ڕەوا کەری ڕۆژوو شکاندنە، ئەو سەفەرەیە کە نوێژی پێ کورت ئەکرێتەوە، وە ئەو ماوەیەی کە دروستە بۆ سەفەرکەر تێیدا بە ڕۆژوو نەبێت، ئەوماوەیە کە دروستە نوێژی تێدا کورت بکرێتەوە، وە ئەمانە لە پێشەوە لە باسی کورت کردنەوەی نوێژدا باس کراوەو لە باسی مەزهەبی زانایان و تەحقیقەکەی ئیبنوقەییم لەوبارەیەوە.

ئەحمەدو ئەبوداودو بەیهەقی و طەحاوی ئەگێڕنەوە لە مەنصوری کەلبی‌یەوە کە ووتویەتی: دیحیەی کوڕی خەلیفە لە دێیەکی دیمشق بەرەو شوێنێکی تر ڕۆیشت لە ڕەمەزاندا ئەوەندەی نێوان عوقبەو (فوسطاط) ئەبوو، خۆی ڕۆژووەکەی شکاند و کۆمەڵێکیش لەگەڵیا شکاندیان. بەڵام هەندێکیان شکاندنی ڕۆژووەکانیان پێ ناخۆش بوو، کاتێ گەڕایەوە بۆ دێکەی خۆی ووتی: سوێند بە خوا ئەمڕۆ شتێکم بینی هەرگیز بە بیرما نەئەهات شتی وابیبینم، کە کۆمەڵێك ڕەغبەتیان لە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەکانی نەبێت، مەبەستی ئەو کۆمەڵە بوو کە ڕۆژووەکانیان نەشکاند. پاشان ووتی: خوایە گیانم بەرەوە بۆ لای خۆت. وە هەموو گێڕەرەوەکانی ئەم حەدیسە ثیقەن، جگە لە مەنصوری کەلبی کە عەجلی ئەویشی بە ثیقە داناوە[1].

**ئەو کەسەی پێویستە بەڕۆژوو نەبێت و گرتنەوەشی لەسەرە:**

زانایان هەموو لەسەر ئەوەن کە پێویستە ژنی بێ نوێژو زەیستان بەڕۆژوو نەبن، وە ڕۆژوو گرتنیان لەسەر حەرامە، وە ئەگەر بەڕۆژوو بوون ڕۆژووەکەیان دروست نییە و پوچەڵە، وە لەسەریانە ئەو ڕۆژووانە بگرنەوە کە تیایدا بێنوێژ یا زەیستان بوون.

بوخاری و موسلیم لە عائیشەوە ئەگێڕنەوە فەرمویەتی: ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ کاتێ بێنوێژ ئەبووین فەرمانمان پێ ئەکرا ئەو ڕۆژانە بگرینەوە کە تیایدا بێنوێژ ئەبووین، بەڵام فەرمانمان پێ نەئەکرا نوێژەکانمان بگێڕینەوە.

---

(١) کورتەی قسەی شێخ ئەلبانی ئەوەیە: تەوسیق کردنەکەی عەجلی ئیعتیباری نییە، چونکە وەك تەوسیق کردنی ئیبنوحیببان وایە کە کەمتەرخەمە لە تەوسیق کردندا، هەر لەبەر ئەوە (خطابي) بە لاوازی داناوە لە (معالم) دا، بەڵام ئەو حەدیسەی پێش ئەم بەهێزی ئەکات، هەروەها حەدیسەکەی ئەنەس کە کەمێك لەمەوبەر ئاماژەم بۆ کرد (تمام المنة).

**ئەو ڕۆژانەی بەڕۆژوو بوون تێیاندا قەدەغەیە:**

چەند حەدیسێك هاتووە دان بەوە دائەنێت کە ڕۆژوو گرتن لە چەند ڕۆژێکدا قەدەغەیە، وا لە خوارەوە ڕوونی ئەکەینەوە:

**١- نەهی لە بەڕۆژوو بوون لە دوو جەژنەکاندا:**

زانایان هەموو کۆن لەسەر حەرامێتی بەڕۆژوو بوون لە دوو ڕۆژەی جەژنەکاندا، ڕۆژووەکە فەرز بێت یا سوننەت، بەپێی قسەکەی عومەر ﷺ کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژوو گرتنی دوو ڕۆژی هەردوو جەژنەکانی قەدەغە کردبوو. قەدەغەیی ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان لەبەر ئەوەیە کۆتایی هاتنی ڕۆژوو گرتنتانە، وە قەدەغەیی ڕۆژی جەژنی قوربان لەبەر ئەوەیە کە لە قوربانی‌یەکانتان بخۆن. (رواه أحمد والأربعة)[1].

**٢- نەهی لە بەڕۆژوو بوون لە (أيام التشريق) دا، واتە دووەم و سێیەم و چوارەم ڕۆژی جەژنی قوربان:**

دروست نی‌یە کەس لەو سێ ڕۆژەدا کە بە دوای جەژنی قورباندا دێت بەڕۆژوو بێت، بەپێی ئەوەی ئەبوهوڕەیرە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ عبدالله ی کوڕی حوزافەی نارد بۆ مینا بانگەواز بکات بڵێت: (ئەم ڕۆژانە بەڕۆژوو مەبن، چونکە ڕۆژانی خواردن و خواردنەوەو یادی خوا کردنە). (ئەحمەد بە ئیسنادێکی (جید) گێڕاویەتی‌یەوە).

طەبەرانی لە (الأوسط)دا ئەگێڕێتەوە لە ئیبنوعەبباسەوە ﷺ کە پێغەمبەر ﷺ جاڕچی‌یەکی نارد جاڕ بدات بڵێت: ئەم ڕۆژانە کەس تێیاندا بەڕۆژوو نەبێت، چونکە ڕۆژی خواردن و خواردنەوە و چوونە لای ژنەکانتانە[2].

---

(١) مانای ئەم حەدیسە لە صەحیحەیندا هەیە و لە (الإرواء) یشدا تەخریج کراوە بە ژمارە (٩٦٢) (تمام المنة)

(٢) کورتەی قسەی شێخ ئەلبانی ئەوەیە: دوو ڕەخنەی لێ ئەگیرێ:

دانەر ئەم حەدیسەی لە (مجمع الزوائد)ەوە وەرگرتووە جا بە هەڵە نەقڵی کردووە، چونکە ئەم زاراوەیە لە (الكبير) ی (طبراني) دا هەیە نەك لە (أوسط) دا جا گێڕانەوە ی ئەم زاراوەیە بۆ (أوسط) هەڵەیەکە هەم دەرهەق بە (طبراني) کراوە و هەم دەرحەق بە (هيثمي)، جا ئەم نەقڵ کردنەی دانەر بۆتە هۆی ئەوەی کە هەڵەی کردبێت لە زاراوەکەدا.

ڕەخنەی دووەم: ئەو زاراوەی کە لە حەدیسەکەدا هاتووە کە باسی چوونە لای ژن ئەکات سەنەدەکەی زەعیفە با (هيثمي)ش بە حەسەنی دانابێت،

پاشان شێخ بەڵگەی زەعیفی ئەم ئیسنادە ئەهێنێتەوە دوایی ئەفەرموێت: کورتەی باس ئەوەیە کە ئەم زیادەیە لە ماناو ریوایەتدا مونکەرە، لە ریوایەتدا ئەوە باسەکەیت زانی کە باسمان کرد، ئەمما لە ماناکەیدا لەبەر بەرهەڵستی کردنی‌یەتی لەگەڵ هەندێك ڕێنگای تردا کە بە صەحیحی هاتووە –لە جیاتی زاراوەی چوونە لای خێزان- یادی خوا کردن هاتووە، چونکە چوونە لای خێزان بە عەمەلی ناکرێت لە ڕۆژانی (أيام التشريق)دا لە ژێر ئەو هەموو چادرە زۆر و بەیەك نووساوە و قەرەباڵغەدا، هەروەك ناشکرایە، ئیتر خوای گەورەش بۆخۆی زاناترە.

بەڵام هاوەڵانی شافیعی ڕێیان داوە ئەو سێ ڕۆژە ڕۆژووی تێدا بگیرێت کە ناویان (أيام التشريق)ە بۆ ئەو کەسانەی ڕوژوو گرتنەکەیان لەو ڕۆژانەدا هۆی هەبێت، وەك ڕۆژووی نەزر یا کەفارەت وگێڕانەوە. بەڵام ئەو ڕۆژووەی کە هۆی نی یە، ئەوە بەبێ ئیختیلافی نێوان زانایان دروست نی یە لەو سێ ڕۆژەدا بەڕۆژوو بێت. وە ڕۆژووی ئەو سێ ڕۆژە کە نەهی کراوە لە ڕۆژوو گرتن تێیدا، هەروەك ئەو نوێژانەیان داناوە کە لەبەر هۆیەك لەوکاتانەدا دروستە بکرێت کە نەهی کراوە لە نوێژکردن تێیدا.

**٣- جیاکردنەوەی ڕۆژی هەینی و بەتەنها بەڕۆژوو بوون تێیدا قەدەغەیە:**

ڕۆژی هەینی جەژنی هەفتانەی موسڵمانانە، لەبەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ ڕۆژوو گرتنی تێدا قەدەغە کردووە، وە جەماوەری زانایان بۆ ئەوە چوون کە ئەو قەدەغە کردنە بۆ کەراهەتە، نەك بۆ حەرامێتی، مەگەر ڕۆژێك پێش هەینی یا دوای هەینی بەڕۆژوو بوو، یا کەوتە ناو ئەوکاتانەی ئەو خوی پێوە گرتووە تێیدا بەڕۆژوو بێت، یا ڕۆژی عەرەفە بوو، یا عاشورا، ئەوە کەراهەتی نی یە ئەگەر کەسێك تێیدا بەڕۆژوو بێت، چونکە لە عبدالله ی کوڕی عومەرەوە ﷺ هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ ماڵی جوەیریەی کچی (حارث) کە ڕۆژی هەینی بوو، سەیری کرد بەڕۆژووە، فەرمووی: (ئایا دوێنێ بەڕۆژوو بوویت؟) ووتی: نا.

---

جا کاتێك ئەوەت زانی، بزانە کە شیخ (عبد الله الغماري) لەو کتێبەیدا کە ناوی ناوە (الكنز الثمين في أحاديث النبي الأمين) هەڵەیەکی زۆر گەورەی کردووە لە حەدیسەکەی نوبەیشەدا کە لەمەوبەر باس کراوە.

لەو ریوایەتەشدا کە باسی چوونە لای ژنیشی هێناوە، کە ئەمەش لە چەند ڕوویەکەوە پوچەڵە:

١- ئەم زیادەیەی کە هەیە لەگەڵ ئەوەشدا کە زەعیفە، ئەو دووانەی کە ریوایەتەکە لە نوبەیشەوە ئەگێڕنەوە باسی ئەوەیان نەکردووە، ئەمەش هەڵەیەکە دەرهەق بە هەموویان.

٢- دەرهەق بە (سیوطي) ش هەر هەڵەی کردووە، چونکە ئەم حەدیسە لە (الجامع الصغير) دا هەیە بەڵام ئەم زیادەیەی تێدا نی یە.

٣- وا دەرئەکەوێت بۆ خۆی سەرنجی ئەو کارەی داوە کە ئاماژەمان بۆ کرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر ئەوەندەی باس کردووە لە ماناکەیدا کە نەکارەتی تێدا نەبێت. جا لە لێکۆڵینەوەکەیدا بەم شێوەیە لەسەری دوواوە:

چوونە لای ژنی بە دەست بازی لەگەڵیدا لێك داوەتەوە بێ ئەوەی باسی نزیکی و جووت بوون بکات، کە زۆربەی مەبەستی دەست بازی هەر لەبەر ئەوەیە، وە بۆیەشەیە وای کردووە چونکە ئەو مانایە مونکەرە، جا ئەگەر ناوبراو ئاگای لە حەدیسە صەحیحەکان بووایە و ئاگای لە مەتن و لەوەی کە صەحیحە و لەوەی کە صحیح نی یە لە زاراوەکانی، ئەوە ئاوها تووشی ئەم هەڵە زاراوەیی یەش نەدەبوو.

وە ئەم غەماری یەش چەندین هەڵەی هەیە، و چەندین حەدیسی بە صحیح داناوە لە کەنزەکەیدا و لە کتێبی تریشیدا کە من بەسەر زۆریاندا ئاگاداریم هەیە، لەبەرگی و سێ و چواری (الأحاديث الضعيفة) دا باس کراوە جا بگەڕێرەوە بۆ پێشەکی یەکەیان.

فەرمووی: (ئەی ئەتەوێ سبەینێ بەڕۆژوو بیت؟) ووتی: نا. فەرمووی: (کەواتە بیشکێنە). (بەززار بەسەنەدێکی حەسەن گێراویەتی‌یەوە)[1].

لە عامیری ئەشعەری‌یەوە هاتووە ووتویەتی: گوێم لێ بووە پێغەمبەر ﷺ ئەیفەرموو: (إنَّ يَومَ الجُمُعَةِ عِيدُكُم فَلا تَصُومُوهُ، إلا أن تَصُومُوا قَبلَهُ أو بَعدَهُ) (رواه البزار بسند حسن). واتە: ڕۆژی هەینی جەژنی خۆتانە تێیدا بەڕۆژوو مەبن، بەڵام ئەگەر عادەتتان بوو ڕۆژێکی پێشووی یا دوایی بەڕۆژوو بوون، ئەوە بەڕۆژوو بن.

عەلی ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس لە ئێوە ئەیەوێت بەڕۆژووی سوننەت بێت با ڕۆژی پێنج شەمە بەڕۆژوو بێت، نەك ڕۆژی هەینی، چونکە ڕۆژی هەینی ڕۆژی خواردن وخواردنەوە ویادی خوایە.(ئیبنوئەبی شەیبە بە سەنەدێکی حەسەن ڕیوایەتی کردووە).

لە صەحیحی بوخاری و موسلیمدا لە جابیرەوە ﷺ هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا تَصُومُوا يَومَ الجُمُعَةِ، إلا وَقَبلَهُ يَومٌ ، أو بَعدَهُ يَومٌ). واتە: ڕۆژی هەینی بەڕۆژوو مەبن مەگەر ڕۆژی پێشووی یا دوای بەڕۆژوو بن.

وە لە (لفظ)ێکی موسلیمدا هاتووە فەرموویەتی: (وَلا تَخُصُّوا لَيلَةَ الجُمُعَةِ، بِقِيَامٍ مِن بَينِ اللَّيَالِي، وَلا تَخُصُّوا يَومَ الجُمُعَةِ، بِصِيَامٍ مِن بَينِ الأيَّامِ، إلا أن يَكُونَ فِي صَومٍ يَصُومُهُ أحَدُكُم). واتە: شەوانی هەینی لەناو هەموو شەوەکاندا تایبەت مەکەن بۆ شەو نوێژ، وە ڕۆژانی هەینی لەناو هەموو ڕۆژەکاندا تایبەت مەکەن بۆ ڕۆژوو گرتن، مەگەر بکەوێتە ناو ڕۆژووی کەسێکتانەوە کە عادەتی وابێ بیگرێ.

**٤- ڕۆژوو گرتنی ڕۆژی شەمە بە تەنها و جیاکردنەوەی قەدەغەیە:**

بوسری سولەمی‌یەوە لە صەمّائی خوشکی‌یەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا تَصُومُوا يَومَ السَّبتِ إلا فِيمَا افتَرَضَ عَلَيكُم، وَإن لَم يَجِد أحَدُكُم إلا لِحَا عِنَبٍ أو عُودَ شَجَرَةٍ فَلْيَمضَغهُ). (ئەحمەدو خاوەن سوننەکان ڕیوایەتیان کردووە، وە حاکم ووتویەتی: صەحیحە لەسەر شەرتی موسلیم، وە

---

(١) بوخاری لە خودی حەدیسی جوەیری‌یەوە ئەگێڕێتەوە و حەدیسەکەش هەر یەکێکە لەگەڵ ئەوەی تریان، بەڵام ڕاوی‌یەکانیان جیاوازیان هەیە، چونکە هەندێکیان لە موسنەدی ئیبنوعەمەردا ئەیگێڕێتەوە و هەندێکیان لە موسنەدی جوەیری‌یەوە.

و (حافظ) لە فەتحدا هەر ئەوەی پارسەنگ داوەتەوە، جا سەیری لێکۆڵینەوەکەی من بکە لەسەر صەحیحی ئیبنوخوزەیمە کە بە ژمارە (٢١٦٢) وە صەحیحی ئەبی داود (٢٠٩٣) (تمام المنة)

(ترمذي) بە حەسەنی داناوە)[1]. واتە: ڕۆژی شەممە بەڕۆژوو مەبن جگە لە فەرزەکان، جا ئەگەر هیچتان دەست نەئەکەوت کە بیخۆن جگە لە چێوکە ترێیەك نەبێت، ئەوە بیجون با ڕۆژووەکەتان بشکێ.

---

(١) زانایان جیاوازیان هەیە لەبارەی ئەم حەدیسەوە، ئەوانەی دانەر باسی کردن بەهێزیان کردووە، وە مالیك وتوویەتی ئەم حەدیسە درۆیە، و ئیمام ئەحمەدیش بە زەعیفی داناوە لە (تهذیب السنن)دا و نەسائی ووتوویەتی: (مضطرب)ە، هەروەها (حافظ) یش وای ووتووە وە (حافظ) باسی (إضطراب)ەکەشی کردووە لە (التلخيص)دا، جا هەرکەس پێی خۆشە با بۆی بگەڕێتەوە (٦/٤٧٢) پاشان بۆم دەرکەوت کە حەدیسەکە صەحیحە، و ئەو (إضطراب)ەش لەسەر صیحەتی حەدیسەکە کاریگەر نیە، چونکە هەندێك لە ڕێگاکانی سالمە، ئەمەشم لە (إرواء الغليل)دا ڕوون کردۆتەوە بە ژمارە (٩٦٠) بە شێوەیەك کە هیچ ڕێگا بۆ گومان کردن لە صەحیحیەتەکەیدا ناهێڵێ.

وە مناکردنەوەی ئەم حەدیسە بە قەدەغە کردنی ڕۆژووی شەممە بە تەنها، بەم ڕستەیە لائەچێت کە فەرموویەتی: مەگەر ڕۆژووی فەرز نەبێت، چونکە ئەم حەدیسە وەکو ئیبنوقەییم لە (تهذيب السنن)دا باسی کردووە:

بەڵگەی قەدەغە کردنی ڕۆژووی سوننەتە، بە تەنیا بێت یان لەگەڵ ڕوژی تردا بێت وەك یەکە، چونکە ئەم جیا کردنەوەی ڕۆژووی فەرزە ئەوە ئەگەیەنێت کە قەدەغە کردنەکە هەموو جۆرەکانی ڕۆژووی سوننەت ئەگرێتەوە، جا ئەگەر هەر شێوەی تەنهایی شەممەی بگرتایەتەوە ئەوە ئەیفەرموو: ڕۆژی شەممە بە تەنیا جیا مەکەنەوە بە ڕۆژوو، مەگەر ڕۆژێك لە پێشیا یان لە دوایدا بەڕۆژوو بن، هەروەکو لەبارەی ڕۆژووی جومعەوە وای فەرمووە.

جا کاتێك ئەوە دەرکەوت ئینجا ئەم حەدیسە بەرهەڵستی لەگەڵ ئەو حەدیسانەدا ئەکات کە ڕۆژووی سوننەت لە شەممەدا بە ڕەوا دائەنێت، وەك حەدیسەکەی عبداللهی کوڕی عەمر کە لە پێشەوە هاتوە لە باسی نەی لە بەڕۆژوو بوونی ڕۆژی هەینیدا وە ڕێنەی ئەو کە ئیبنوقەییم لەژێر ئەم حەدیسەدا باسی کردووە لە لێکۆڵینەوەیەکی زۆر گرنگ و بەسووددا، لەوێدا قسەی زانایانی باس کردووە، لە دوایدا گەیشتۆتە ئەو سەرەنجامەی کە قەدەغە کردنەکە بۆ بەڕۆژوو بوونە لە شەممەدا بە تەنها، وە ئەم حەدیسە و ئەوانەی تری یەك خستووە، جا منیش لە (الإرواء) دا هەر بەلای ئەم ڕایەدا چووم.

وە من پێم وایە یەك خستن و کۆکردنەوە لەنێوان ئەم حەدیسانەدا چاکە، ئەگەر دوو شت نەبێ:

یەکەم: ئەم حەدیسە بە صەراحەت بەرهەڵستی ئەم حەدیسە صەحیحانە ئەکات وەك لە ئیبنوقەییمەوە باسم کرد.

دووەم: ڕێگایەکی تر هەیە بۆ یەك خستنی ئەم حەدیسانە و کۆکردنەوەیان، ئەگەر بمانەوێ کار بەو قاعیدە زانستیانە بکەین کە لە کتێبە ئوصولیەکاندا باس کراوە، جا لەو قاعیدانە ئەمانەی خوارەوەن:

١- زانایان ئەڵێن: ئەگەر قەدەغەکەرو ڕەواکەر کۆبوونەوە، ئەوە قەدەغەکەرەکە پێش ئەخرێت.

٢- ئەگەر قسە و کردەوە بەرهەڵستی یەکتریان کرد ئەوە قسەکە پێش کردەوەکە ئەخرێت.

وە هەرکەس لەو حەدیسانە وورد بێتەوە کە بەرهەڵستی ئەم حەدیسە ئەکەن، ئەبینێت کە دوو جۆرن:

١- حەدیسی یەکەم کردەوەی پێغەمبەر ﷺ و بەڕۆژوو بوونیەتی.

(ترمذي) ووتویەتی: واتای کەراهەت لێرەدا ئەوەیە کە ئەو کەسە بە تایبەتی هەر لە ڕۆژی شەممەندا بەڕۆژوو بێت، چونکە جولەکەکان ئەم ڕۆژە بە ڕۆژێکی مەزن دائەنێن.

ئومموسەلەمە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی شەممان و یەك شەممان زۆرتر بەڕۆژوو ئەبوو، لەچاو ڕۆژانی تردا. وە ئەیفەرموو: ئەم دوو ڕۆژە جەژنی بێ باوەڕەکانە، بۆیە حەز ئەکەم پێچەوانەی ئەوان بم. (ئەحمەدو بەیهەقی و حاکم و ئیبنوخوزەیمە گێڕاویانەتەوە، وە حاکم و ئیبنوخوزەیمەش بە صەحیحیان داناوە).

مەزهەبی حەنەفی‌یەکان و شافیعی‌یەکان و حەنبەلی‌یەکانیش ئەوەیە، کە ڕۆژوو گرتنی ڕۆژی شەممە بەتەنیا بە کەراهەت دائەنێن بەپێی ئەو بەڵگانە.

مالك بە پێچەوانەی ئەمانە ڕەی داوە بە بێ کەراهەت ڕۆژووی تێدا بگیرێت، بەڵام حەدیسەکە بەڵگەیە بەسەریەوە.

**٥- قەدەغەیی ڕۆژوو گرتنی (یوم الشك):**

عەممارى کوڕی یاسر فەرموویەتی: هەر کەس ئەو ڕۆژەی گومانی هەیە کە ڕەمەزان بێت، بەڕۆژوو بێت ئەوە سەرپێچی ئەبوقاسمی کردووە ﷺ. (خاوەن سونەنەکان گێڕاویانەتەوە). (ترمذي) ووتویەتی: حەدیسێکی حەسەن و صەحیحە، وە بەشی زۆری زانایان بەو حەدیسە کار ئەکەن، وە سوفیانی ثەوری و مالیکی کوڕی ئەنەس و عبداللەی کوڕی موبارەك و شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاق ئەڵێن: کەراهەتی هەیە هەر کەس لەو ڕۆژەدا بەڕۆژوو بێت.

---

٢- حەدیسەکەی تر قسەی پێغەمبەرە ﷺ هەروەك لە حەدیسەکەی ئیبنوعەمەردا هاتووە لەسەرەوە. جا ئەوەی ئاشکرا و دیارە ئەوەیە، کە هەردووکیان ڕەوا بوون دەرئەخەن. کەواتە کۆ کردنەوە لە نێوان ئەواناو لەنێوان حەدیسی نەهی‌یەکەدا، ئەوە پێویست ئەکات کە ئەم حەدیسە پێش ئەوان بخرێت چونکە ئەم قەدەغەکەرە، وە ئەوان ڕەواکەرن، هەروەها فەرمودەکەی پێغەمبەر ﷺ کە بە جاری‌یەکەی فەرموو: (أتريدين أن تصومي غداً) واتە: ئایا ئەتەوێ بەیانی بەڕۆژوو بیت؟ وە ئەوەی کە مانای ئەمی هەبێت، دووبارە ڕەوا بوون ئەگەیەنێت، کەواتە دووای حەدیسەکە ئەخرێت.

من ئاوام بۆ دەرکەوتووە. جا ئەگەر پێکابێتم ئەوە لە خواوەیە سوپاس و ستیاشی ئەکەم لەسەر یارمەتی دانی و سەرخستنم، وە ئەگەر هەڵەشم کردبێت ئەوە لە خۆمەوەیە، وە داوای لێ خۆش بوونی گوناهم لە خوا ئەکەم. (تمام المنة ـ محمد ناصرالدين الألباني).

وە بەشی زۆری زانایان ڕایان وایە ئەگەر کەسێك لەو ڕۆژە گومان لێ کراوەدا بەڕۆژوو بێت واتە بە گومانەوە تیایدا بەڕۆژوو بێت و ڕەمەزانیش بێت، ئەوە نەبێت ڕۆژێك دووای ڕەمەزان بەڕۆژوو بێت لەجیاتی ئەو ڕۆژە. وە ئەڵێن: بەڵام ئەگەر ئەو ڕۆژە بەر عادەتێکی ڕۆژووی خۆی کەوت، دروستە بەڕۆژوو بێ تیایدا.

لە ئەبوهورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لا تُقَدِّمُوا صَومَ رَمَضَانَ بِيَومٍ وَلا بِيَومَيْنِ، إلا أن يَكُونَ صَومٌ يَصُومُهُ رَجُلٌ، فَلْيَصُم ذَلِكَ اليَومِ) (رواه الجماعة). واتە: ڕۆژێك یا دوو ڕۆژ پێش ڕەمەزان بەڕۆژوو مەبن، مەگەر کەسێك عادەتی بێت، ئەوکاتە با بەڕۆژوو بێت.

(ترمذي) ووتویەتی: ئەم حەدیسە حەسەن وصەحیحە، زانایان کردەوەی پێ ئەکەن، وە بە خراپیان داناوە کەسێك پەلە بکات لە بەڕۆژوو بوون پێش ئەوەی ڕەمەزان بێت لەبەر واتای ڕەمەزان.

بەڵام ئەگەر کەسێك ڕۆژووێکی تایبەتی خۆی هەبێت و ئەو ڕۆژەشی بەر بکەوێت ئەو کاتە قەیناکە لایان.

٦- ڕۆژوو گرتنی هەموو ساڵ قەدەغەیە:

حەرامە کەسێك ساڵەکە هەمووی بەڕۆژوو بێت، بەو ڕۆژووانەشەوە کە پێغەمبەر ﷺ ڕۆژوو گرتنی تێیاندا قەدەغە کردووە. بەپێی حەدیسی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: (لاصَامَ مَن صَامَ الأَبَدَ) (رواه أحمد والبخاري ومسلم). واتە: ڕۆژووی ئەو کەسە گیرا نابێت کە ساڵ دوانزەی مانگ بەڕۆژوو ئەبێت.

بەڵام ئەگەر کەسێك دوو ڕۆژە جەژنەکەو سێ ڕۆژی دووای قوربان بەڕۆژوو نەبێت، ئیتر هەموو ڕۆژەکانی ساڵ بەڕۆژوو بێت جگە لەو ڕۆژانە کەراهەتی لەسەر نامێنێ[1]، بە مەرجێك لەو کەسانە بێت کە توانای بەڕۆژوو بوونیان هەبێت.

(ترمذي) ووتویەتی: کۆمەڵێك زانایان بە خراپیان داناوە بەڕۆژوو بوونی ساڵ دوانزە مانگە، ئەگەر ڕۆژەکانی جەژن و ڕۆژانی تەشریقیشی لەسەر بێت، جا ئەگەر کەسێك لەو ڕۆژانەدا بەڕۆژوو نەبێت ئەوە لەوکەراهەتە خۆی ڕزگار کردووە، وە لەو کەسانە نابێت کە ساڵ دوانزە مانگە بەڕۆژوو ئەبن.

وە ئەوەش لە مالیك و شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقەوە ئەگێڕنەوە.

---

(١) ئەو لێکدانەوەیە جیاوازە لەگەڵ ڕواڵەتی حەدیسەکەدا، کە ئەفەرمووێت: (لا صام من صام الأبد) وە فەرموویەتی: (لا صام ولا أفطر) واتە: نە بەڕۆژوو بووە و نە ڕۆژووی شکاندووە، وە ئیبنوقەییمی زانا ئەمەی ڕوون کردۆتەوە لە (زاد المعاد)دا، بەشێوەیەك کە هەموو گومانێك لائەبات جا فەرموویەتی: مەبەستی ئەو حەدیسە ئەوکەسە نییە کە ڕۆژە حەرامەکان بگرێت. هەروەها (حافظ) یش لە فەتحدا وەك ئەوەی باس کردووە (تمام المنة).

پێغەمبەر ﷺ ئیقراری کرد لەسەر ئەوەی حەمزەی ئەسلەمی لەسەر یەك بەڕۆژوو بێت. وە پێی فەرموو: (صُم إن شِئتَ وَأفطِر إن شِئتَ)[1]. واتە: هەرکاتێك ویستت بەڕۆژوو بە و هەرکاتێك ویستت بیشکێنە.

ئەمەش لە پێشەوە باس کرا.

وە باشتر وایە ئەو کەسە ڕۆژێك بەڕۆژوو بێت و ڕۆژێك بەڕۆژوو نەبێت، چونکە ئەم شێوەیە چاکترین ڕۆژووە لای خوا[2]، وەك لە دواییدا باسی ئەکەین.

**٧- ئافرەت کاتێك مێردەکەی ئامادە بێت نابێت بێ ئیزنی ئەو بەڕۆژوو بێت:**

پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە لە وەختی لە ماڵ بوونی مێردا ژن بێ پرسی مێردەکەی بەڕۆژوو بێت، هەتا ڕێی نەدات.

---

(١) بەڵێ ئەم حەدیسە باس کرا لە ژێر قسە کردن لەبارەی ئەو کەسانەوە کە بۆیان هەیە بەڕۆژوو نەبن... بەڵام بە زاراوەیەکی تر کە باسی لەسەر یەك ڕۆژوو گرتنی تێدا نی یە. لە ریوایەتێکی موسلیمدا هاتووە بەم زاراوەیە:

وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! من پیاوێکم ڕۆژوو بە بەردەوامی ئەگرم؟ جا ئایا لە سەفەردا بەڕۆژوو ببم؟ ئەویش فەرمووی: ئەگەر پێت خۆش بوو بەڕۆژوو بە وە ئەگەر پێت خۆش نەبوو بەڕۆژوو مەبە، ئیبنوخوزەیمە گێڕاویەتی‌یەوە (٢١٥٣).

بەڵام ئەوە نابێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە دانەر باسی کردووە، چونکە هیچ پەیوەندی‌یەك لە نێوان ڕۆژوو گرتنی بەردەوام و ڕۆژوو گرتنی ساڵ دووازدەی مانگدا نی‌یە.

وە (حافظ) لە فەتحدا بەڵگەی هەندێك زانا باس ئەکات لە دروستی بەڕۆژوو بوونی ساڵ دووازدەی مانگ بەم حەدیسەی حەمزە، لە دواییدا قسەی لەسەر کردووە و فەرموویەتی:

وە ووتویانە پرسیار کردنەکەی حەمزە لەبارە ڕۆژوو گرتنی سەفەرەوە بووە، نەك لەبارەی ڕۆژوو گرتنی ساڵ دووازدەی مانگ، وە لەمەدا مانای ڕۆژوو گرتنی ساڵ دووازدە مانگی تێدا نی‌یە.

چونکە ئوسامەی کوڕی زەید ئەفەرموونێت: پێغەمبەر ﷺ بە بەردەوامی بەڕۆژوو ئەبوو تاوەکو ئەیان ووت ئیتر ڕۆژوو ناشکێنی، ئەحمەد لە موسنەدەکەیدا تەخریجی کردوە. وە ئاشکراشە کە پێغەمبەر ﷺ هەموو ساڵەکە بەڕۆژوو نەئەبوو، کەواتە کاتێك باسی بەردەوام بوون لە ڕۆژوودا ئەکرێت، ئەوە ناگەیەنێت کە مانای ڕۆژوو گرتنی هەموو ساڵەکە بێت (تمام المنة)

(٢) ئەمە لەو بەڵگانەیە کە کەراهەتی هەیە هەموو ساڵ ڕۆژوو بگیەدرێت، لەگەڵ جیاکردنەوەی ڕۆژە حەرامەکاندا، چونکە ئەگەر ڕۆژوو گرتنی هەموو ساڵ دروست بووایە، یان پەسەند بووایە ئەوە لە هەموو شت زۆرتر کاری پێ ئەکرا، وە لە هەموو شت باشتر ئەبوو، چونکە تەنها عیبادەت بەهێز ئەبێت، وە ئەگەر عیبادەت بووایە شتی تر لەو بەهێزتر نەئەبوو، هەروەك لە ئیبنوقەییمەوە باس کرا (تمام المنة).

له ئەبوهورەیرەوە هاتووە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لاتَصُم المَرأةُ يَوماً وَاحِداً وَزَوجُهَا شَاهِد إلا بإذنِهِ إلا رَمَضَانَ) (رواه أحمد والبخاري ومسلم). واتە: ئافرەت نابێت هەتا یەك ڕۆژیش بەڕۆژوو بێت بێ پرسی مێردەکەی، ئەگەر مێردەکەی ئامادە بوو -یەعنی لە ماڵ بوو- جگە لە ڕەمەزان.

زانایان ئەو قەدەغەیی‌یەیان حەمل کردووە لەسەر حەرامێتی، وە ڕێیان داوە بە پیاو ئەگەر ڕازی نەبوو ڕۆژووەکە بە ژنەکەی بشکێنێ، چونکە دەست درێژی کردووە لە مافی مێردەکەیدا. ئەمە ئەگەر ڕەمەزان نەبوو وەك لە حەدیسەکەدا هاتووە، چونکە ڕەمەزان پێویست ناکات پیاو ڕازی بێت. هەروەها ژن بۆی هەیە بێ پرسی مێردەکەی بەڕۆژوو بێت بە مەرجێك پیاوەکەی ئامادە نەبێت -لە سەفەر بێت- بەڵام کاتێ هاتەوە بۆی هەیە ڕۆژووەکەی پێ بشکێنێت، وە نەخۆشی مێردو نەبوونی توانای چوونە لای ژنەکەی، وەك لە ماڵ نەبوونیان داناوە، لە دروستی بەڕۆژوو بوونی بەبێ پرسی مێردەکەی، واتە: ژن ئەگەر پیاوەکەی بەو شێوەیە بوو ئەتوانێ پرسی پێ نەکات و بەڕۆژوو بێت.

**دانە دەم یەکی ڕۆژوو (وصال) قەدەغەیە:**

١- لە ئەبوهورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إيَّاكُم وَالوِصال، ـ قَالَهَا ثَلاثَ مَرَّاتٍ ـ قَالُوا: فَإنَّك تُوَاصِلُ يَا رَسُولَ الله؟ قَالَ: إنَّكُم لَستُم فِي ذَلِكَ مِثلِي، إنِّي أبِيتُ يُطعِمُنِي رَبِّي وَيَسقِينِي، فَاكلُفُوا مِنَ الأعمَالِ مَا تُطِيقُونَ) (رواه البخاري ومسلم). واتە: نەکەن ڕۆژوو بدەنە دەم یەك، سێ جار ئەمەی فەرموو، ووتیان: تۆ خۆت ڕۆژوو ئەدەیتە دەم یەك ئەی نێرراوی خوا؟ فەرمووی: ئێوە لەمەدا وەك من نین، من ئەمێنمەوە پەروەردگارم خواردن و خواردنەوەم پێ ئەبەخشێت، ئێوە کارێك مەگرنە ئەستۆ کە لە تواناتانا نەبێت.

وە زانایان ئەم قەدەغە کردنەیان لەسەر کەراهەت داناوە.

ئەحمەدو ئیسحاق و ئیبنومونذیر ڕێیان داوە بە دانە دەم یەکی ڕۆژوو (وصال) هەتا پارشێو، بە مەرجێك لەسەر ڕۆژوو گرەکە گران نەبێت.

بەپێی ئەوەی بوخاری ئەگێڕێتەوە لە ئەبوسەعیدی خودری‌یەوە ﷺ کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لا تُوَاصِلُوا، فَأيُّكُم أرَادَ أن يُوَاصِلَ، فَليُوَاصِل حتى السَّحَرِ). واتە: ڕۆژوو مەدەنە دەم یەك، وە هەرکەس لە ئێوە بیەوێ ڕۆژوو بداتە دەم یەك با هەتا پارشێو بێت.

**ڕۆژووی سوننەت:**

پێغەمبەر ﷺ هانی خەڵکی ئەدا بۆ بەڕۆژوو بوون لەم ڕۆژانەدا:

**ڕۆژووی شەش ڕۆژ لە مانگی شەواڵ:**

جەماعەت ئەگێڕنەوە -جگە لە بوخاری و نەسائی- لە ئەبو ئەییوبی ئەنصاری‌یەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن صَامَ رَمَضَانَ ثُمَّ أتبَعَهُ سِتاً مِن شَوَّال، فَكَأنَّمَا صَامَ الدَّهرَ). واتە: هەرکەس مانگی

ڕەمەزان بەڕۆژوو بوو، وە شەش ڕۆژیش لە شەوال بە دوایدا بەڕۆژوو بێت، وەك ئەوە وایە كە ساڵێك بەڕۆژوو بووبێت.

وە لای ئەحمەد ئەو شەش ڕۆژە بەسەریەكەوە بێت، یان بەسەریەكەوە نەبێت هەر ئەبێت، وە هیچیان لە هیچیان چاكتر نین و وەك یەكن.

بەڵام لای حەنەفیەكان و شافیعی‌یەكان چاكتر وایە بە سەریەكەوە بێت یەكسەر دوای جێژن.

**ڕۆژووی دە ڕۆژ لە مانگی (ذي الحجة) وە تەئكیدی ڕۆژی عەرەفە بۆ جگە لە حاجی:**

١- لە ئەبو قەتادەوە ﷺ هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (صَومُ يَومِ عَرَفَةَ، يُكَفِّرُ سَنَتَيْنِ، مَاضِيَةً وَمُستَقبلةً، وَصَومُ يَومِ عَاشُورَاءَ يُكَفِّرُ سَنَةً مَاضِيَةً) (رواه الجماعة إلا البخاري والترمذي). واتە: ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفە كەفارەتی گوناحی دوو ساڵە، ساڵی پێشوو ساڵی داهاتوو، وە ڕۆژووی ڕۆژی عاشورا كەفارەتی گوناحی ساڵی پێشووە.

٢- لە حەفصەوە هاتووە فەرمویەتی پێغەمبەر ﷺ وازی لە چوار شت نەئەهێنا: ڕۆژووی عاشورا، و دە ڕۆژ لە مانگی (ذي الحجة)، و لە هەرمانگێكدا سێ ڕۆژو، وە دوو ڕكاتی پێش نوێژی بەیانی (ئەحمەدو نسائی گێراویانەتەوە).

٣- لە عوقبەی كوڕی عامیرەوە هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (يَومُ عَرَفَةَ، وَيَومُ النَّحرِ، وَأَيَّامُ التَّشرِيقِ، عِيدُنَا -أهلَ الإسلامِ- وَهِيَ أَيَّامُ أكلٍ وَشُربٍ) (رواه الخمسة، إلا ابن ماجه وصححه الترمذي). واتە: ڕۆژی عەرەفە و ڕۆژی قوربانی كردن و سێ ڕۆژی دوای قوربانی كردن، جەژنی ئێمەی موسوڵمانە، وە ئەم ڕۆژانە ڕۆژی خواردن وخواردنەوەن.

٤- لە ئەبوهورەیرەوە هاتووە كە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژوو گرتنی ڕۆژی عەرەفەی -بۆ حاجی- قەدەغە كردبوو[1] (ئەحمەدو ئەبوداوودو نسائی و ئیبنوماجە گێراویانەتەوە).

(ترمذي) ووتویەتی: زانایان ڕۆژوو گرتنی ڕۆژی عەرەفەیان بە موستەحەب دائەنا جگە لەو كەسانەی كە لە عەرەفەن.

٥- لە (أم الفضل)ەوە هاتووە: ڕۆژی عەرەفە گومانمان لە بەڕۆژوو بوونی پێغەمبەر ﷺ هەبوو، منیش قاپێك شیرم بۆ نارد، ئەویش خواردی‌یەوە، لەكاتێكدا ووتاری ئەدا لە عەرەفە (موسلیم و بوخاری گێراویانەتەوە).

**ڕۆژووی مانگی موحەڕڕەم و تەئكیدی ڕۆژی عاشوراو ڕۆژێكی پێش عاشوراو ڕۆژێك پاش عاشورا:**

---

(١) كورتەی قسەی شێخ ئەلبانی ئەوەیە: سەنەدیەكەی زەعیفە كەسێكی مەجهولی تێدایە و لە (الأحاديث الضعيفة) دا تەخریج كراوە بە ژمارە (٤٠٤).

١- لە ئەبوهورەیرەوە هاتووە کە فەرمویەتی: لە پێغەمبەریان ﷺ پرسی چاکترین نوێژ دوای نوێژە فەرزەکان کام نوێژەیە؟ فەرمووی: (الصَّلاةُ فِي جَوفِ اللَّيلِ). واتە: ئەو نوێژەی لە نیوە شەودا بکرێت.

پاشان لێیان پرسی: ئەی چاکترین ڕۆژوو دوای ڕۆژووی ڕەمەزان کام ڕۆژوویە؟ فەرمووی: (شَهرُ اللهِ الَّذِي تَدعُونَهُ المُحَرَّم). واتە: ڕۆژووی ئەو مانگەی خوایە کە پێی ئەڵێن موحەڕڕەم (ئەحمەد و موسلیم و ئەبوداود گێڕاویانەتەوە).

٢- لە موعاوییەی کوڕی ئەبوسوفیانەوە هاتووە فەرمویەتی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو ئەیفەرموو: (إنَّ هَذَا يَومُ عَاشُورَاءَ، وَلَم يُكتَب عَلَيكُم صِيَامُهُ، وَأنَا صَائِمٌ، فَمَن شَاءَ صَامَ، وَمَن شَاءَ فَلْيُفطِر) (متفق عليه). واتە: ئەم ڕۆژە ڕۆژی عاشورایە، خوا لەسەری نەنووسیون بەڕۆژوو بن تێیدا، وە من بەڕۆژووم، جا هەرکەس حەز ئەکات بەڕۆژوو بێت، وە هەر کەس حەز ناکات بەڕۆژوو نەبێت.

٣- لە عائیشەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە کە فەرمویەتی: ڕۆژی عاشورا ڕوژێك بوو قورەیش لەسەردەمی نەزانیدا تێیدا بەڕۆژوو ئەبوون، وە پێغەمبەر ﷺ تێیدا بەڕۆژوو ئەبوو، کاتێ هاتینە مەدینە هەر بەڕۆژوو ئەبوو، وە فەرمانی بە خەڵکەکەش ئەکرد کە بەڕۆژوو بن، بەڵام کاتێ ڕەمەزان فەرز کرا فەرموی: (مَن شَاءَ صَامَهُ وَمَن شَاءَ تَرَكَهُ) (متفق عليه). واتە: هەرکەس حەز ئەکات بەڕۆژوو بێت تێیدا، وە هەر کەس حەز ناکات با وازی لێ بێنێت.

٤- لە ئیبنوعەبباسەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتووە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ کاتێ هاتە مەدینە سەیری کرد جولەکە ڕۆژی عاشورا بەڕۆژوو ئەبن، فەرمووی: (ئەمە چییە؟) ووتیان: ڕۆژێکی پیرۆزە خوا لەم ڕۆژەدا موسا و بەنی ئیسرائیلی لە دوژمن ڕزگار کردووە، بۆیە موسا تێیدا بەڕۆژوو بووە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (أنَا أحَقُّ بِموسى مِنكُم). واتە: من لە پێش ترم بۆ موسا لە ئێوە.

جا پێغەمبەر ﷺ تێیدا بەڕۆژوو بوو، وە فەرمانی ئەکرد خەڵکیش بەڕۆژوو بن تێیدا (بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە).

٥- لە ئەبوموسای ئەشعەرییەوە ﷺ هاتووە فەرمویەتی: جولەکە ڕێزیان لە ڕۆژی عاشورا ئەگرت و کردبویانە جەژنی خۆیان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (صُومُوهُ أنتُم) واتە: ئێوە تێیدا بەڕۆژوو بن (موسلیم و بوخاری گێڕاویانەتەوە).

٦- لە ئیبنوعەبباسەوە خوایان لێ ڕازی بێت هاتووە ووتویەتی: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی عاشورای گرت و فەرمانی دا بەگرتنی، ووتیان: ئەی نێرراوی خوا، ئەوە ڕۆژێکە جولەکە وگاور ڕێزی ئەگرن، فەرمووی: (إذَا كَانَ العَامَ المُقبِل -إن شَاءَ الله- صُمنَا اليَومَ التَّاسِعَ). (رواه مسلم وأبوداود). واتە: خوا بیەوێ ساڵی داهاتوو نۆهەمیش ئەگرین. جا ساڵ نەگەڕایەوە کۆچی دوایی کرد.

وە لە (لفظ)ێكی تردا هاتووە فەرموویەتی: (لَئِن بَقِيتُ إلى قَابِلٍ لأصُومَنَّ التَّاسِعَ) (رواه أحمد ومسلم) واتە: ئەگەر بمێنم ساڵێكی تر نۆهەمیشی لێ ئەگرم- واتە: لە گەڵ دەیەمدا-.

زانایان ئەڵێن: بەڕۆژوو بوونی ڕۆژی عاشورا سێ جۆرە:

یەكەم: ڕۆژوو گرتنی سێ ڕۆژی نۆهەم و دەیەم و یانزەهەمی.

دووەم: گرتنی نۆیەم و دەیەمی.

سێیەم: گرتنی دەیەمی بەتەنها.

**فراوانی كردن لە ڕۆژی عاشورادا:**

لە جابیری كوڕی عبدالله وە خوایان لێ ڕازی بێت هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن وَسَّعَ على نَفسِهِ وَأَهلِهِ يَومَ عَاشُورَاءَ، وَسَّعَ اللهُ عَلَيهِ سَائِرَ سَنَتِهِ) (رواه البيهقي في الشعب وابن عبدالبر). واتە: هەركەس لەڕۆژی عاشورادا فراوانی بكات بۆ خۆی و خێزانی، خوا ئەو ساڵە ماڵ و سامانی فراوان ئەكات.

ئەم حەدیسە ڕێگای تریشی هەیە، هەموویان لاوازن، بەڵام ئەگەر بخرێنە پاڵ یەك هێز پەیدا ئەكەن، وەك سەخاوی ووتویەتی[1].

---

(١) كورتەی قسەی شێخ ئەوەیە: ئەوە قسەی سەخاوی خۆیەتی كە ئەڵێت: یەكتر بەهێز ئەكەن، و ئێمە پێمان وایە كە وانەبێت.

شێخ لێكۆڵینەوە لەسەر حەدیسەكە ئەكات و باسی عیللەتەكانی ئەكات و قسەی زانایانی لەسەر ئەهێنێتەوە. پاشان ئەفەرموێت:

هەموو ڕێگاكانی كۆمەڵێك مەتروك و مەجهول ئەیگێڕنەوە، لەوانەشە ئەوانە لە دوژمنەكانی حوسەینی كوڕی عەلی بن ڕەزای خوایان لێ بێت، كە حەدیسیان لەسەر فەزڵ و چاكی خواردن دان و چاو ڕشتن و جگە لەوانەشیان هەڵبەستوە لە ڕۆژی عاشورادا، بۆ بەرهەڵستی كردن لەگەڵ ئەو شیعانەدا كە ئەو ڕۆژەیان كردووە بە ڕۆژی ماتەم لەسەر حوسەین ڕەزای خوای لێ بێت، چونكە حوسەین لەو ڕۆژەدا كوژرا، هەر لەبەر ئەوە (شيخ الإسلام) ڕەحمەتی خوای لێ بێت، بڕیویەتیەوە كە ئەم حەدیسە درۆیە.

وە باسی ئەوە ئەكات كە لەبارەی ئەم حەدیسە لە ئیمام ئەحمەدیان پرسی ئەویش پێی وابوو كە هیچ نییە، وە بەوەش پاڵپشتی بۆ ئەم قسەیەی خۆی هێناوە كە هیچ كام لە سەلەف فراوانیان لە ڕۆژی عاشورادا بە موستەحەب نەزانیوە، وە هیچ كام لەم حەدیسانە لەسەردەمی قەرنە چاكەكاندا نەناسراون (كە پێغەمبەر ﷺ دانی بە چاكیاندا ناوە) و شێخی ئیسلام بەدرێژی باسی لەسەر كردووە لە (الفتاوى) دا (٢/٢٤٨-٢٥٦) جا بۆی بگەڕێرەوە.

وە مەناوی لە مەجدی لوغەویەوە ئەگێڕێتەوە كە ووتویەتی:

**ڕۆژووی بەشی زۆری مانگی شەعبان:**

پێغەمبەر ﷺ بەشی زۆری مانگی شەعبان بەڕۆژوو ئەبوو، عایشە فەرمویەتی: پێغەمبەرم ﷺ نەبینیوە هیچ مانگێك تا سەر بەڕۆژوو بێت تێیدا جگە لە ڕەمەزان، وە نەم بینیوە هیچ مانگێك ئەوەندەی شەعبان زۆر تێیدا بەڕۆژوو بوو بێت. (بوخاری وموسلیم گێڕاویانەتەوە).

وە لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە خوایان لێ ڕازی بێت هاتووە فەرمویەتی: ووتم: ئەی نێرراوی خوا نەم بینیوە لە هیچ مانگێکدا ئەوەندەی مانگی شەعبان بەڕۆژوو بیت تێیدا؟ فەرمووی: (ذَلِكَ شَهرٌ يَغفَلُ النَّاسُ عَنهُ، بَينَ رَجَبٍ وَرَمَضَانَ، وَهُوَ شَهرٌ تُرفَعُ فِيهِ الأعمَالُ إلى رَبِّ العَالَمِينَ؛ فَأُحِبُّ أن يُرفَعَ عَمَلِي وَأنَا صَائِمٌ). (رواه أبوداود والنسائي وصححه ابن خزيمه)[1]. واتە: ئەوە مانگێکە لە نێوان مانگی ڕەجەب و ڕەمەزاندایە خەڵك تێیدا بێ ئاگان، وە ئەوە مانگێکە کردەوەی تێدا بەرز ئەکرێتەوە بۆ لای پەروەردگاری جیهانیان، منیش حەز ئەکەم کاتێ کردەوەکانم بەرز ئەکرێتەوە بەڕۆژوو بم.

وە تایبەت کردنی نیوەی مانگی شەعبان بەڕۆژوو گرتن وا بزانرێ کە فەضیلەتی هەیە بەسەر ڕۆژەکانی تردا، ئەوە هیچ بەڵگەیەکی ڕاستی لەسەر نیە.

**ڕۆژووی مانگە حەرامەکان:**

مانگە حەرامەکان بریتین لە ذولقەعیدە و ذولحیججە و موحەڕڕەم و ڕەجەب، وە پەسەندە مرۆڤ زۆر تێیاندا بەڕۆژوو بێت.

لە پیاوێکی باهیلیەوە هاتووە ووتویەتی: چووم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ووتم: ئەی نێرراوی خوا من ئەو پیاوەم پار هاتمە لات، فەرمووی: (فَمَا غَيَّرَكَ، وَقَد كُنتَ حَسَنَ الهَيئَةِ؟). واتە: ئەی چی تۆی گۆڕیوە، لەوە پێش شێوەت جوان بوو؟ ووتم: لەوکاتەوە لە تۆ جیا بوومەوە بە شەو نەبێت بەڕۆژ هیچم نەخواردووە،

---

ئەوەی لەبارەی ڕۆژی عاشوراوە ئەگێڕنەوە لەڕۆژوو گرتن و نەفەقە کردن و خەنە بەکارهێنان و سەرورِیش چەور کردن و چاو ڕشتن، لەو بیدعانەیە کە قاتلەکانی حوسەین ڕەزای خوای لێ بێت دروستیان کردووە (تمام المنة).

[1] دانەر لە گێڕانەوەی ئەم حەدیسە بۆلای ئەبوداود چاوی لە (حافظ) کردووە لە فەتحدا. و صەنعانی لە (سبل السلام) دا و شەوکانی لە (نیل الأوطار) ئەمەش وەهەیکە لە هەموویانەوە کە یەك بە دوای یەك لەسەری ڕۆیشتوون چونکە ئەم حەدیسە لای ئەبو داود نیە، بەڵکو حەدیسێکی تری هەیە لە ئوسامەوە لەبارەی ڕۆژوو گرتنی دوو شەممە و پێنج شەممە.

جا لەبەر ئەوە (منذري) لە (الترغيب)دا و (حافظ) لە (تبيين العجب فيما ورد في فضل رجب)دا، وە هەروەها نابلسی لە (الذخائر) دا هەمور ئەمانە تەنها گێڕاویانەتەوە بۆ نەسائی، پاشان ئەم حەدیسە لای نەسائی سەنەدەکەی حەسەنە.

فەرمووی: (لِمَ عَذَّبتَ نَفسَكَ؟) واتە: بۆچی خۆت شکەنجە داوە؟ پاشان فەرمووی: (صُم شَهرَ الصَّبرِ وَيَوماً مِن كُلِّ شَهرٍ). واتە: مانگی ئارام گرتن بەڕۆژوو بە و لە هەموو مانگێکدا ڕۆژێك بەڕۆژوو ببە، ووتم: بۆم زیاد بکە چونکی تواناییم هەیە، فەرمووی: مانگی دوو ڕۆژ بەڕۆژوو ببە، ووتم: زیاتر، فەرمووی: سێ ڕۆژ، سێ ڕۆژ لە مانگە حەرامەکاندا بەڕۆژوو بە، واتە: سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بە و سێ ڕۆژ بەڕۆژوو مەبە، جا پێغەمبەر ﷺ سێ پەنجەکانی کۆ ئەکردەوە و بڵاوی ئەکردنەوە[1]. (رواه أحمد وأبوداود وابن ماجه والبيهقي بسند جيد).

وە بەڕۆژوو بوون لە مانگی ڕەجەبدا چاکتر نی‌یە لە ڕۆژووی مانگەکانی تر، ئەوە نەبێت ڕەجەب لە مانگە حەرامەکانە، وە لە سوننەتدا نەهاتووە کە ڕۆژووی مانگی ڕەجەب بە تایبەتی فەزڵی ببێت، وە ئەوەی لەوبارەیەوە هاتووە بۆ ئەوە نابێت کە ببێتە بەڵگە.

ئیبنوحەجەر ووتویەتی: دەربارەی فەزڵی مانگی ڕەجەب و ڕۆژووی ڕەجەب، هەروەها لەبارەی ڕۆژوویێکی تایبەت و شەونوێژ لە ڕەجەبدا حەدیسێکی صەحیح نەهاتوە کە بگونجێ بۆ بەڵگە.

**ڕۆژووی دوو شەممان و پێنج شەممان:**

لە ئەبوهورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ بە زۆری ڕۆژانی دووشەممەو پێنج شەممە بەڕۆژوو ئەبوو، لەو بارەیەوە پرسیاری لێ کرا، فەرمووی: (إنَّ الأعمَالَ تُعرَضُ كُلَّ اثنَينِ وَخَمِيسٍ، فَيَغفِرُ اللهُ لِكُلِّ مُسلِمٍ، أو لِكُلِّ مُؤمِنٍ، إلا المُتَهَاجِرَينِ، فَيَقُولُ أخِّرهُمَا) (رواه أحمد بسند صحيح)[2]. واتە: کردەوەکان ڕۆژانی

---

(١) شێخ ئەلبانی لەبارەی ئەم حەدیسەوە ئەفەرمووێت: سەنەدەکەی جید نی‌یە چونکە ڕاویەکەی دڵەڕاوکێ (إضطراب)ی تێدا کردوە لە چەند ڕوویەکەوە کە (حافظ) لە (التهذيب)دا باسی کردووە، هەروەها (منذري) لە (مختصر السنن) دا وە ووتویەتی: ئەم جیاوازی‌یەی تێ کەوتووە هەروەکو ئەبینیت، و هەندێك لە شێخەکانمان ناماژەیان بۆ زەعیفی کردووە، وە ئەمەش ڕێی تێ ئەچێت وابێت، منیش ئەڵێم: عیللەتێکی تریشی تێدایە ئەویش جەهالەتە وەك لە (ضعيف أبي داود) دا ڕوونم کردۆتەوە بە ژمارە (٤١٩).

(٢) کورتەی قسەی شێخ ئەلبانی ئەوەیە کە ئەو حەدیسە صەحیحە، بەڵام ئیسنادەی ئەحمەد صەحیح نی‌یە، ئینجا بەڵگەی لاوازی ئیسنادەکەی ئەحمەد و قسەی زانایانی لەسەر باس کردووە، پاشان ئەفەرمووێت: بۆیە ئەم حەدیسەم بە صەحیح داناوە چونکە هەروەك چاوت لێیە و -باس کرا لەمەوبەر- ڕستەی دووەمی صەحیحە، وە ڕستەی یەکەمیش چەند شایەتێکی هەیە، یەکێ لەو شایەتانە لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوەیە، کە ئەم زیادەیەشی لەگەڵدایە: (ذانك يومان تعرض فيهما الأعمال على رب العالمين، فأحب أن يعرض عملي وأنا صائم) واتە ئەو دوو ڕۆژە کردەوەی بەندەکان نیشان پەروەدگاری جیهانیان ئەدرێت، جا من پێم خۆشە لەومایەدا کە کردەوەکەم نیشانی ئەدرێت بەڕۆژوو بم.

دووشەممە وپێنج شەممە نیشان ئەدرێن، پاشان خوا لە هەموو موسوڵمانێك یا لە هەموو باوەڕدارێك خۆش ئەبێت، جگە لەوانەی دەنگیان لەیەك دابڕیوە، ئەفەرمووێ: دوایان بخە.

لە صەحیحی موسلیمدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ڕۆژووی دووشەممە پرسیاری لێ کرا فەرمووی: (ذَاكَ يَومٌ وُلِدتُ فِيهِ، وَأُنزِلَ عَلَيَّ فِيهِ). واتە: ئەوە ڕۆژێکە منی تێدا لە دایك بووم وتێیدا قورئانم بۆ هاتۆتە خوارەوە.

**بەڕۆژوو بوونی سێ ڕۆژ لە هەر مانگێکدا:**

ئەبوذەڕی غیفاری ﷺ فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ ئەکردین کە لە هەرمانگێکدا سێ ڕۆژە سپی‌یەکان بەڕۆژوو بین، ئەوانیش سیانزەو چواردەو پانزەی هەموو مانگێکە، وە ئەیفەرموو: (هِيَ كَصَومِ الدَّهرِ). واتە: ئەو سێ ڕۆژە وەك ڕۆژووی هەموو ساڵە. (نەسائی گێڕاویەتی‌یەوە، و ئیبنوحیببان بەصەحیحی داناوە).

وە هاتووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە لە مانگێکدا شەممەو یەك شەممەو دوو شەممە بەڕۆژوو ئەبوو، وە لە مانگێکی تر سێ شەممەو چوارشەممەو پێنج شەممە[1].

جاری وابوو لەسەرەتای هەموو مانگێکدا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو ئەبوو، وە لە پێنج شەممەی ئەوەڵی مانگدا بەڕۆژوو ئەبوو، هەروەها دووشەممەی دووای ئەوەش، پاشان دووشەممەی دوای ئەوانەش[2].

---

نسائی و ئەحمد بە سەنەدێکی حەسەن تەخریجیان کردووە، وە ئەبوداود لە ڕێگای دوەمەوە، وە ئیبنوخوزەیمە لە ڕێگای سێیەمەوە ریوایەتی کردووە، تەماشای تەرغیب بکە، جا ئیبنوخوزەیمە ڕێگاکەی نەسائی و ئەبو داودی کردوە بە یەك، ئەمەش لە وەهمەکانی‌یەتی جا ئاگادار بە.

(١) لەوەدا کە نیسبەت بدرێتە پێغەمبەر ﷺ سەرنجی لەسەرە، چونکە لە ریوایەتی سوفیانە لە مەنصورەوە لە (خیثمە) وە لە عائیشەوە فەرموویەتی: ..ترمذي تەخریجی کردووە و ووتویەتی حەدیسێکی حەسەنە، و عبد الرحمن ی کوڕی مەهدی ئەم حەدیسەی لە سوفیانەوە گێڕاوەتەوە بەڵام ڕەفعی نەکردووە بۆ پێغەمبەر ﷺ.

(حافظ) لە فەتحدا ووتویەتی: ئەمەیان ڕێچوترە.

منیش ئەڵێم: عیللەتێکی تریشی هەیە لە (التهذيب) دا لە تەرجەمەی ئەم (خیثمە)دا هاتووە ــ کە عبدالرحمنە ــ لە ئیبنومەسعود و عومەرەوە ریوایەتی کردووە لەحاڵێکدا کە بۆ خۆی لێیانەوە نەی بیستووە.

وە ووتویەتی (إبن القطان) ئەڵێت: هەرچی لە عائیشەوە گێڕاویەتی‌یەوە پێویستی بە چاو پیاخشاندنەوە هەیە (تمام المنة).

(٢) شتی وام لە هیچ کتێبێکی سوننەتدا نەدیوە، وە ئیبنوقەییمیش لەباسی ڕەوشتی پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژووەکەیدا باسی نەکردەوە، جا ئەترسم ئەم حەدیسە دانەر لێی هەڵگەڕابێتەوە یان لەسەر کەسانی تر جگە لەو هەڵگەڕابێتەوە.

**ڕۆژە نا ڕۆژێك بەڕۆژوو بوون:**

لە ئەبوسەلەمەی کوڕی عبدالرحمن‌ەوە هاتووە، لە عبداللە ی کوڕی عەمرەوە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: بیستومە تۆ بە شەو نوێژ ئەکەیت و ڕۆژیش بەڕۆژوو ئەبیت، ووتم: بەڵێ ئەی نێرراوی خوا! فەرمووی: ڕۆژێك بەڕۆژوو بە و ڕۆژێك بەڕۆژوو مەبە، شەو نوێژیش بکە وبش خەوە، چونکە لاشەت و ژنەکەت و میوانەکەت مافیان هەیە بەسەرتەوە، وە ئەوەندەت بەسە کە لە هەموو مانگێکدا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بیت، ئەڵێ: من زۆریم لێ کردو ئەویش توندی کرد لەسەرم، ووتم: ئەی نێرراوی خوا،لەوە زیاتر ئەتوانم، فەرمووی: هەموو هەفتەیەك سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بە، ئەڵێ: زۆرم لێ کردو ئەویش زۆری لێ کردم، ووتم: ئەی نێرراوی خوا لەوە زیاتر ئەتوانم، فەرمووی: دە وەك ڕۆژووی داود پێغەمبەر ﷺ بەڕۆژوو بە ئیتر لەوە زیاتر بەڕۆژوو مەبیت. ووتم: ئەی نێرراوی خوا ڕۆژووی داود پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) چۆن بووە؟ فەرمووی: ڕۆژێك بەڕۆژوو ئەبوو ڕۆژێك بەڕۆژوو نەئەبوو. (ئەحمەدو غەیری ئەو گێڕاویانەتەوە).

دیسان ریوایەت کراوە لە عبداللە ی کوڕی عەمرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (أَحَبُّ الصِّيَامِ إلى اللهِ صِيَامُ دَاوُد، وَأحَبُّ الصَّلاةِ إلى اللهِ صَلاةُ دَاودَ، كَانَ يَنَامُ نِصفَهُ، وَيَقُومُ ثُلُثَهُ، وَيَنَامُ سُدسَهُ، وَكَانَ يَصُومُ يَوماً، وَيُفطِرُ يَوماً). واتە: باشترین ڕۆژوو و نوێژ لای خوا نوێژو ڕۆژووی داود بووە، نیوەی شەوەکە خەوتووە، پاشان لە سێ‌یەکی شەودا نوێژی کردووە و لەشەش یەکی داخەوتووە، وەڕۆژێك بەڕۆژوو بووەو ڕۆژێك بەڕۆژوو نەبووە.

**دروستە بۆڕۆژووانی ڕۆژووی سوننەت، ڕۆژووەکەی بشکێنێت:**

١- لە ئومموهانی‌یەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی فەتحی مەککە هاتە ماڵەوە و خواردنەوەیەکیان بۆ هێنا، ئەویش لێی خواردەوە، پاشان دایە دەستم بیخۆمەوە، ووتم: من بەڕۆژووم. فەرمووی: (إنَّ المُتَطَوِّعَ أميرٌ على نَفسِهِ فَإن شِئتَ فَصُومِي، وَإن شِئتَ فَأفطِرِي). واتە: ڕۆژووگری سوننەت سەرۆکی خۆیەتی، ئەگەر ئارەزو بکەیت بەر دەوام بە لە ڕۆژووەکەتدا، وە ئەگەر ئارەزو نەکەیت ڕۆژووەکەت بشکێنە. (رواه أحمد والدارقطني والبيهقي).

---

چونکە ئەوەی ناسراوە لە سوننەتی پێغەمبەرەوە ﷺ ئەوەیە کە هەموو مانگێك سێ ڕۆژ بەڕۆژوو ئەبوو، لە سەرەتای مانگەوە، دوو شەممە بەڕۆژوو ئەبوو ئینجا ڕۆژی پێنج شەممە، پاشان پێنج شەممەکەی دوواتری.

نسائی تەخریجی کردووە (١/٣٢٨) وە هەروەها جگە لەویش، وە لە صەحیحی ئەبوداودیشدا تەخریج کراوە (١/٢٠١٧) لە حەدیسی ئیبنوعومەرەوە، وە هەروەها نسائی و ئەبوداود و ئەحمەد ئەیگێڕنەوە لە هەندێك خێزانەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ و سەنەدەکەشی حەسەنە. (تمام المنة).

حاكم ئەم حەدیسە ئەگێڕێتەوە ئەڵێت: سەنەدەکەی صەحیحە، وە زاراوەکەی بەم شێوەیە: (الصَّائِمُ المُتَطَوِّعُ، أميرُ نَفسِهِ، إن شَاءَ صَامَ، وان شَاءَ أفطَرَ). واتە: کەسێك سوننەت بەڕۆژوو بێت لە دەست خۆیایەتی بەڕۆژوو ئەبێت یا ئەیشکێنێت.

لە ئەبوجوحەیفەوە هاتووە ووتویەتی: پێغەمبەر ﷺ سەلمان و ئەبودەرداثی کردە برای یەکتر، جارێك سەلمان چوو بۆ دیدەنی ئەبودەرداء، بینی ئوموددەرداء پۆشاکی ناشیرینی لەبەردایە، پێی ووت: ئەوە چیتە؟ ووتی: ئەبودەرداثی برات ئیحتیاجی‌یەکی بە دونیا نی‌یە، کاتێ ئەبودەرداء هاتەوە خواردنی بۆ دروست کرد، بە سەلمانی ووت: تۆ بخۆ من بەڕۆژووم. سەلمان ووتی: هەتا تۆ لێی نەخۆیت منیش ناخۆم، ئەویش لێی خوارد، کاتێ شەو هات ئەبودەرداء چوو بۆ شەو نوێژ سەلمان پێی ووت: بخەوە جارێ، ئەویش خەوت، پاشان هەڵسایەوە، سەلمان پێی ووت: بخەوەرەوە، هەتا شەو ئەوەندەی نەما، سەلمان پێی ووت: ئێستا هەستە، جا هەر دووکیان هەڵسان بۆ شەو نوێژ، ئینجا سەلمان پێی ووت: پەروەردگارت مافی بە سەرتەوە هەیە، خۆت مافت بە سەرخۆتەوە هەیە، خێزانت مافی بە سەرتەوە هەیە، جا هەریەك مافی خۆی بدەرێ. جا کاتێ ڕۆژ بۆوە چوو بۆ لای پێغەمبەر ﷺ باسەکەی بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سەلمان ڕاستی کردووە. (بوخاری و ترمذي گێڕاویانەتەوە).

٣- لە ئەبوسەعیدی خودری‌یەوە ﷺ هاتووە فەرمویەتی: خواردنم بۆ پێغەمبەر ﷺ دروست کرد بوو، خۆی و یارەکانی هاتن، کاتێ خواردن دانرا پیاوێك لەناویاندا ووتی: من بەڕۆژووم. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (دَعَاكُم أخُوكُم، وَتَكَلَّفَ لَكُم). واتە: براکەتان بانگی کردوون وخۆی ماندوو کردووە بۆتان. پاشان پێی فەرموو: (أفطِر وَصُم يَوماً مَكانَهُ، إن شِئتَ). واتە: بیشکێنە جا ئەگەر ویستت ڕۆژێکی تر لەجیاتی ئەمرۆ بەڕۆژوو بە. (رواه البيهقي بإسناد حسن، كما قال الحافظ).

بەشی زۆری زانایان بۆ ئەوە چوون کە دروستە بۆ کەسێك بەڕۆژووی سوننەت بێت ڕۆژووەکەی بشکێنێت، وە موستەحەببە لە جیاتی ئەوە ڕۆژێکی تر بگرێتەوە، بەڵگەشیان ئەو حەدیسە صەحیح و صەریحانەیە.

## ئاداب و ڕەوشتی ڕۆژوو

**هەرکەس بەڕۆژوو بێت موستەحەببە پەیڕەوی ئەم دەستورانەی خوارەوە بکات:**

**١- پارشێوکردن:**

موسڵمانان هەموو کۆن لەسەر ئەوەی کە پارشێوکردن موستەحەببە، وە هەر کەسیش نەیکات تاوانبار نابێت، لە ئەنەسەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (تَسَحَّرُوا فَإِنَّ فِي السُّحُورِ بَرَكَة) واتە: پارشێو بکەن چونکە لە پارشێوکردندا بەرەکەت هەیە. (رواه البخاري ومسلم).

لە میقدامی کوڕی مەعدی کەریبەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (عَلَيكُم بِهَذَا السُّحُورِ، فَإِنَّهُ هُوَ الغِذَاءُ المُبَارَكُ). واتە: پارشێوبکەن چونکە خواردنی پارشێو خواردنێکی موبارەکە. (رواه النسائي بسند جيد).

وە هۆی پیرۆزی‌یەکەشی ئەوەیە ڕۆژووان بەهێز ئەکات وگورج وگۆڵی ئەکات و ڕۆژووەکەی لەسەر ئاسان ئەکات.

**پارشێو کردن بە چی بەجێ دێت:**

پارشێو کردن بە خواردنێکی زۆر یا کەم بە جێ دێت، ئەگەر قومێك ئاویش بێ. لە ئەبوسەعیدی خودری‌یەوە ﷺ هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (السُّحُورُ بَرَكَةٌ، فَلا تَدَعُوهُ وَلَو أن يَجرَعَ أحَدُكُم جَرعَةَ مَاءٍ فإنَّ اللهَ وَمَلائِكَتَهُ يُصَلُّونَ على المُتَسَحِّرِينَ) (رواه أحمد). واتە: خواردنی پارشێو بەرەکەتە، واز لە پارشێوکردن مەهێنن، ئەگەر یەکێك لە ئێوە بە قومێك ئاویش بێت، هەر پارشێو بکات، چونکە خوا ڕەحمەتی خۆی ئەڕژێنێ و فریشتەکان ئەپاڕێنەوە بۆ پارشێوکەران.

**کاتەکەی:**

کاتی پارشێوکردن لە نیوەی شەوەوە دەست پێ ئەکات هەتا طلوعی فەجر، بەڵام دووا خستنی پەسەندە.

لە زەیدی کوڕی ثابیتەوە ﷺ هاتووە فەرموویەتی: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ پارشێومان کردووە و هەڵساوین بۆ نوێژی بەیانی. ووتم: ماوەی نێوانیان چەندە ئەبوو؟ فەرمووی: ئەوەندەی خوێندنی پەنجا ئایەت لە قورئان. (بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە).

لە عەمری کوڕی مەیمونەوە هاتووە ووتویەتی: یارەکانی پێغەمبەر ﷺ بە پەلەترین کەس بوون بۆ بەربانگ کردنەوە، و دوواکەوتوترین کەسێش بوون لە پارشێوکردندا. (بەیهەقی بە سەنەدێکی صەحیح گێڕاویەتەوە).

لە ئەبوزەری غیفاری‌یەوە بە مەرفوعی ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا تَزَالُ أُمَّتِي بِخَيرٍ مَا عَجَّلُوا الفِطرَ وَأخَّرُوا السُّحورُ). واتە: ئوممەتی من هەتا بەردەوام زوو بەربانگ بکەنەوەو پارشێو دروا بخەن، لەسەر خێرن.

بەڵام لە سەنەدی ئەم حەدیسەدا سلیمانی کوڕی ئەبو عثمان هەیە کە مەجهولە.

**گومان کردن لە طلوعی فەجر:**

ئەگەر کەسێك گومانی بوو لە طلوعی فەجر بۆی هەیە بخوات و بخواتەوە، هەتا دڵنیا ئەبێت لە طلوع، وە نابێت بە گومان کار بکات، چونکە خوای گەورە کۆتایی هێنان بە خواردن و خواردنەوەی ڕۆژووگری لەو کاتەدا داناوە کە بۆی دەرکەوت طلوعی فەجرە، نەك بە گومان. وەك ئەفەرمووێت: ﴿وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ﴾ (البقرة/١٨٧). واتە: بخۆن و بخۆنەوە هەتا ڕشتەی سپی فەجر لە ڕشتەی ڕەشی شەو جیا ئەکەنەوە.

پیاوێك بە ئیبنوعەبباسی ﷺ ووت: من کە هەڵئەسم بۆ پارشێو ئەخۆم و ئەخۆمەوە جا کاتێ گومانم هەبوو ڕۆژ بۆتەوە دەست هەڵئەگرم. ئیبنوعەبباس پێی فەرموو: دەست هەڵمەگرە هەتا دڵنیا ئەبیت کە ڕۆژ بۆتەوە.

ئەبوداوود ووتویەتی: ئەبوعبداللە (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل) ووتویەتی: ئەگەر کەسێك گومانی هەبوو لەوەی ڕۆژ بۆتەوە با دەست لە خواردن و خواردنەوە هەڵنەگرێت هەتا دڵنیا ئەبێت ڕۆژ بۆتەوە.

ئەمەش مەزهەبی ئیبنوعەبباس و (عطاء) و ئەوزاعی و ئەحمەدە.

نەوەوی ووتویەتی: هاوەڵانی شافیعی یەك کەوتوون لە ڕێ دان بەو کەسەی دڵنیا نی‌یە لە ڕۆژ بوونەوە، کە دەست لە خواردن و خواردنەوە هەڵنەگرێت هەتا دڵنیا ئەبێت.

**٢- پەلە کردن لەبەربانگ کردنەوە:**

هەرکاتێك ساغ بۆوە کە ڕۆژ ئاوا بووە، موستەحەببە بە پەلە ڕۆژوو بشکێنێت. لە سەهلی کوڕی سەهلەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا يَزَالُ النَّاسُ بِخَيرٍ مَا عَجَّلُوا الفِطرَ) (رواه البخاري ومسلم). واتە: بەردەوام خەڵك لە خێردان مادام پەلە بکەن لە ڕۆژوو شکاندندا.

وە ئەبێ بە چەند دەنك خورمای تەڕ ڕۆژوو بشکێنێت و تاك بێت، جا ئەگەر دەست نەکەوت بەئاو بیشکێنێت.

لە ئەنەسەوە ﷺ هاتووە ووتویەتی: پێغەمبەر ﷺ پێش ئەوەی نوێژەکەی بکات بە خورمای ڕوطەب ڕۆژووەکەی ئەشکاند، جا ئەگەر ڕوطەب نەبووایە بە خورمای ووشك، وە ئەگەر ئەویش نەبووایە چەند قومێك ئاوی ئەخواردەوە. (رواه أبوداود والحاكم وصححه والترمذي وحسنه).

لە سولەیمانی کوڕی عامیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذا كَانَ أَحَدُكُم صَائِماً فَلْيُفطِر على التَّمرِ، فَإن لَم يَجِدِ التَّمرَ فعلى المَاءِ، فَإنَّ المَاءَ طَهُورٌ) (رواه أحمد والترمذي وقال: حسن صحيح). واتە: ئەگەر کەسێك لە ئێوە بەڕۆژوو بێت با بە خورما بەربانگ بکاتەوە، جا ئەگەر خورمای دەست نەکەوت بە ئاو، چونکە ئاو پاك کەرەوەیە.

لەم حەدیسەدا بەڵگەی ئەوە هەیە کە موستەحەببە پێش کردنی نوێژی ئێوارە بەربانگ بکرێت، بەو شێوەیە، وە کاتێ لە نوێژ بۆوە خواردنی تەواو بخوات، بەڵام ئەگەر خواردنەکە ئامادە بوو ئەبێ پێش نوێژەکە دەست بکات بە نان خواردن. ئەنەس فەرموویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذا قُدِّم العَشَاءُ فَابدَؤا بِهِ قَبلَ صَلاةِ المَغرِبِ، ولا تعجَلُوا عَن عَشَائِكُم). (رواه الشيخان). واتە: ئەگەر نانی ئێوارە ئامادە بوو دەست بکەن بە نان خواردن پێش نوێژی ئێوارە، وە پەلە مەکەن لە خواردنەکەتاندا.

**٣- پاڕانەوە لەکاتی ڕۆژوو شکاندندا و کاتی بەڕۆژوو بوون:**

ئیبنوماجە لە عبداللە ی کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إنَّ للصَّائِمِ عِندَ فِطرِهِ دَعوةً مَا تُرَدُّ)[١]. واتە: بەڕاستی بۆ ڕۆژووان لە کاتی ڕۆژوو شکاندنەکەیدا پاڕانەوەیەك هەیە کە گەڕانەوەی نی‌یە و گیرا ئەبێت لای خوا.

عبداللە کاتێ ڕۆژووەکەی ئەشکاند ئەی ووت: (اللَّهُمَّ إنِّي أسألُكَ بِرَحمَتِكَ الَّتِي وَسِعَت كُلَّ شَيءٍ أن تَغفِرَ لِي) واتە: خوایە من داوات لێ ئەکەم بە ڕەحمەتی خۆت، ئەو ڕەحمەتەی هەموو شتێکی گرتۆتەوە کە لێم خۆش بی.

وە ثابتە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ بەربانگی ئەکردەوە ئەی فەرموو: (ذَهَبَ الظَّمَأُ وَابتَلَّتِ العُرُوقُ، وَثَبَتَ الأجرُ إن شَاءَ اللهَ تعالى). واتە: بەم ڕۆژوو شکاندنە تینوێتیمان نەما و دەمارەکان پاراو بوون، وە خوا بیەوێت پاداشمان سابت بووە.

بە مورسەلی ڕیوایەت کراوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (اللَّهُمَّ لَكَ صُمتُ وعلى رِزقِكَ أفطَرتُ). واتە: خوایە بۆ تۆ بەڕۆژوو بووم و لەسەر ڕزقی تۆ بەربانگم کردۆتەوە.

---

(١) دانەر بێ دەنگ بووە لەسەری و وای نیشان داوە کە صەحیح بێت، بەڵام واش نی‌یە چونکە لە سەنەدەکەیدا ئیسحاقی کوڕی (عبیداللە)ی مەدەنی تێدایە، ئەویش ناسراو نی‌یە، هەروەك (منذري) لە الترغیب دا ووتویەتی، وە هەر لەبەر ئەوەشە ئیبنوقەییم لە زاددا ئاماژەی بۆ زەعیفی ئەم حەدیسە کردووە، منیش ئەم حەدیسەم تەخریج کردووە و هەندێك بە درێژی باسم کردووە لە (التعليقات الجياد) دا پاشان لە (إرواء الغليل) دا بە ژمارە (٩٢١) (تمام المنة).

(ترمذي) بە سەنەدێکی حەسەن ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (ثلاثةٌ لاتُرَدُّ دَعوتُهم: الصَّائِمُ حتى يُفطِرَ، والإمَامُ العَادِلُ، وَالمَظلُومُ)[1]. واتە: سێ کەس دوعاکانیان گەڕانەوەی نیە: ڕۆژووان هەتا ڕۆژووەکەی ئەشکێنێ، پێشەوای دادپەروەر و عادل، وە ستەم لێ کراو.

٤- وازهێنان لەوشتانەی لەگەڵ ڕۆژوودا ناگونجێن:

ڕۆژوو عیبادەتێکە لە ڕیزی ئەو شتانەی کە ئینسان لە خوا نزیك ئەخاتەوە، خوای گەورە بۆیە ڕۆژووی داناوە تاوەکو پەروەردەی نەفس بکات و لەسەر خێر ڕامی بێنێ، جا بۆیە پێویستە ڕۆژووان خۆی لەو کردەوانە بپارێزێت کە ڕۆژووەکەی کەل ئەکەن، بۆ ئەوەی سوودی تەواو لەو ڕۆژووە وەربگرێت، وە ئەو تەقوایەی دەست بکەوێت کە خوا باسی کردووە. لەم فەرموودەیەدا: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ﴾ (البقرة/١٨٣). واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ڕۆژووتان لەسەر فەرز کرا، وەك چۆن لەسەر ئەوانەی پێش ئێوە فەرز کرا بەڵکو تەقواتان ببێت و خۆتان بپارێزن.

بەڕۆژوو بوون تەنها ئەوە نیە خۆ بگرێتەوە لە خواردن و خواردنەوە، بەڵکو خۆگرتنەوەیە لە خواردن و خواردنەوە و هەرچی خوا قەدەغەی کردووە.

لە ئەبوهورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لَيسَ الصِّيَامُ مِنَ الأكلِ وَالشُّربِ، وَإِنَّما الصِّيَامُ مِنَ اللَّغوِ وَالرَّفَثِ، فَإن سَابَّكَ أحَدٌ، أو جَهِلَ عَلَيكَ، فَقُل: إنِّي صَائِمٌ إنِّي صَائِمٌ). (رواه ابن خزيمة وابن حبان والحاكم وقال: صحيح على شرط مسلم). واتە: بەڕۆژوو بوون تەنها خۆگرتنەوە نیە لە خواردن و خواردنەوە، بەڵکو خۆ گرتنەوەیە لە قسەی خراپ و جوێندان، وە ئەگەر کەسێك جوێنی پێ دایت یا بەرانبەرت هەڵە و نەزانی کرد، تۆ بڵێ: من بەڕۆژووم، من بەڕۆژووم.

جەماعەت جگە لە موسلیم ئەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن لَم يَدَع قَولَ الزُّورِ وَالعَمَلَ بِهِ فَلَيسَ لله حَاجَةٌ فِي أن يَدَعَ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ). واتە: هەرکەس واز لە بوختان و قسەی

(١) کورتەی قسەی شێخ ئەوەیە: دانەر ئەو تەحسین کردنەی لە ترمذیەوە وەرگرتووە بەڵام هیچ پەیوەندی نیە لەنێوان تەحسین کردنی (ترمذي) و لەنێوان ئەم حەدیسەدا، چونکە جاری وا دەبێت حەدیس هەیە کە بە شاهیدەکانی لای (ترمذي) حەسەنە بەڵام خودی ئەو ئیسنادەی کە ئەم حەدیسەی لێ هاتووە حەسەن نیە، جا زانایان بە حەدیسی ئاوها ئەڵێن: (صحيح لغيره). جا وورد بەرەوە ئێنجا حەدیسەکە کەسێکی تێدایە کە مەجهولە و نەناسراوە، وە منیش لە (الضعيفة) دا تەخریجم کردووە بە ژمارە (١٣٥٨) و باسی ئەوەشم کردووە کە بەرهەڵستی حەدیسی صەحیحی تر ئەکات کە لە (الصحيحة) دا هاتووە بە ژمارە (٥٩٦).

درۆو کردەوە پێ کردنی نەهێنێ خوا پێویستی بە وازهێنانی ئەو لە خواردن و خواردنەوەکەی نییە. (واتە: خوا ڕۆژووەکەی لێ وەرناگرێت).

هەر لە ئەبوهورەیرەوە هاتووە: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (رُبَّ صَائِمٍ لَيسَ لَهُ مِن صِيَامِهِ إلا الجُوعَ، وَرُبَّ قَائِمٍ لَيسَ لَهُ مِن قِيَامِهِ إلا السَّهَرَ). (رواه النسائي وابن ماجه والحاكم وقال: صحيح على شرط البخاري) واتە: زۆر ڕۆژووان هەیە لە برسێتی بەو لاوە هیچی بۆ نامێنێتەوە، وە زۆر شەونوێژکەریش هەیە لە بێ خەوی بەو لاوە هیچی بۆ نامێنێتەوە.

**٥- سیواك کردن:**

پەسەندە بۆ ڕۆژووان سیواك بکات، جا لە سەرەتای ڕۆژەوە بێت یا لە کۆتایی ڕۆژ دابێت وەك یەکە. (ترمذي) ئەڵێت: شافیعی بە خراپی نە ئەزانی لەسەرەتا و کۆتایی ڕۆژدا سیواك بکرێت.

پێغەمبەر ﷺ بەڕۆژوو بووە و سیواکیشی کردووە، وە ئەمە لە پێشەوە باس کراوە، جا بۆی بگەڕێرەوە.

**٦- سەخاوەت و قورئان خوێندن:**

قورئان خوێندن و سەخاوەت هەموو کاتێك پەسەندە، بەڵام لە ڕەمەزاندا زۆرتر جەختی لەسەر ئەکرێ.

بوخاری لە ئیبنوعەبباسەوە رضي الله عنه ئەگێڕێتەوە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ سەخیترین کەس بووە، بەڵام لە ڕەمەزاندا زۆرتر سەخی بووە کاتێ جوبرائیل ئەهات بۆ لای، وە هەموو شەوێك ئەهاتە لای و قورئانی لەگەڵدا ئەخوێند، وە پێغەمبەر ﷺ لە خێرکردن و بەخشیندا لە با خێراتر بوو.

**٧- تێکۆشان لە خوا پەرستیدا لە دە ڕۆژی دوایی ڕەمەزاندا:**

١- بوخاری و موسلیم لە عائیشەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ ئەگەیشتە دە ڕۆژی دوایی ڕەمەزان شەوانی زیندو ئەکردەوە بە عیبادەت و خێزانەکانی هەڵئەساند و بەندوخێنی توند ئەکرد.

لە ڕیوایەتێکی موسلیمدا هاتووە: پێغەمبەر ﷺ لەو دە ڕۆژانەدا ئەوەندە تێ ئەکۆشا کە لە غەیری ئەو دە ڕۆژانە ئەوەندە تێ نەئەکۆشا.

(ترمذي) ئەگێڕێتەوەو بە صەحیحی داناوە لە عەلیەوە رضي الله عنه فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ خێزانەکانیشی لە دە ڕۆژی ئاخری ڕەمەزاندا هەڵئەساند و بەندوخێنی توند ئەکرد.

## ئەو شتانەی بۆ ڕۆژووان ڕەوایە

لەکاتی بەڕۆژوو بووندا ڕەوایە ئەم شتانەی خوارەوە بکرێت:

**١-خۆخستنە ناو ئاوو خۆ نوقم کردن تێیدا:**

بەپێی ئەوەی ئەبوبەکری کوڕی عبدالرحمن لە هەندێ صەحابەوە گێڕاویەتیەوە کە بۆیان باس کردوە: پێغەمبەر ﷺ بەڕۆژوو بووە و ئاوی کردەوە بە سەریا لە گەرما، یا لە تینوا. (ئەحمەد و مالیك و ئەبوداوود بە ئیسنادێکی صەحیح گێڕاویانەتەوە).

لە صەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتووە لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێت کە پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی ئەکردەوە بە لەشگرانیەوە وبەڕۆژووش ئەبوو، لەپاشاندا خۆی ئەشۆری.

جا ئەگەر ئاو بچێتە ناو سکی ڕۆژووانەوە بەبێ ویستی خۆی ڕۆژووەکەی دروستە و ناشکێت.

**٢- چاو ڕشتن بە کل و دڵۆپە (قطرە) لە چاوکردن:**

کل و قەترە و ئەو جۆرە شتانە کە بکرێتە چاوەوە ڕۆژوو ناشکێنن، چ تامەکەی لە قورگیا هەست پێ بکات یا هەستی پێ نەکات، چونکە چاو ڕێگایەك نیە بۆ ناو سك.

لە ئەنەسەوە هاتووە ووتویەتی: پێغەمبەر ﷺ بەڕۆژوو بووە و چاوی ڕشتووە بە کل.

وە شافیعیەکانیش هەر لەسەر ئەوەن، وە ئیبنومونذیرلە (عطاء) و حەسەن و نەخەعی و ئەوزاعی و ئەبوحەنیفە و ئەبوثەورەوە گێڕاویەتیەوە.

هەروەها لە صەحابەکان ئیبنوعومەر و ئەنەس و ئیبنوئەبی ئەوفاوە ریوایەت کراوە، وە مەزهەبی داوودیشە. بەڵام لە پێغەمبەرەوە ﷺ لەم بارەیەوە بە صەحیحی هیچ نەهاتووە، وەك (ترمذي) ئەڵێ.

**٣- ماچ کردن:**

ماچ کردن بۆ کەسێك کە توانای بە سەر خۆیەوە هەبێت ڕەوایە.

چونکە ثابتە لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێت فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ بەڕۆژوو بووە و ماچی کردووە، وە هەروەها یاری کردووە لەگەڵ ژنەکانیدا و بەڕۆژوو بووە، وە پێغەمبەر ﷺ لە هەموو کەس بە تواناتر بووە بە سەر خۆیدا.

لە عومەرەوە ﷺ هاتووە فەرمویەتی: ڕۆژێك ئارەزوم جوڵا و خێزانم ماچ کرد و بەڕۆژووش بووم، هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ پێم ووت: ئەمرۆ کارێکی گەورەم کردووە، بە زمانی بەڕۆژووەوە ماچم کردووە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أرَأيتَ لَو تَمَضمَضتَ وَأنتَ صَائِمٌ؟ قُلتُ: لابَأسَ بِذَلِكَ. قَالَ: فَفِيمَ). واتە: ئەی ئەگەر بەڕۆژوو بیت و ئاوت لە دەمت ڕادا چی ئەبێت؟ ووتم: ئەوە قەیناکە. فەرمووی: ئەی بۆ چی پرسیار ئەکەیت، ئەوەش وەك ئەوەیە.

ئیبنومونذیر ووتویەتی: عومەرو ئیبنوعەبباسو ئەبوهورەیرەو عائیشەو (عطاء)و شەعبی و حەسەن و ئەحمەد و ئیسحاق ڕێی ماچ کردنیان داوە بە ڕۆژووان.

وە مەزهەبی حەنەفی‌یەکان و شافیعی‌یەکان ئەوەیە: ماچ کردن بە زمانی بەڕۆژووەوە کەراهەتی هەیە بۆ کەسێك ئارەزووی بجولێت بە ماچ کردن، بەڵام بۆ جگە لەوانە کەراهەتی نی‌یە، بەڵام نەکردنی چاکترە، وە لەم کارەدا جیاوازی نی‌یە ئەو کەسە گەنج بێت یا پیر، وە تەنها بە جولاندنی ئارەزوو و ترسی ئاوهاتنەوە ئیعتیبار ئەکرێت لەمەدا، بۆیە ئەگەر ئارەزووی گەنج و پیری بەهێزی جولاند ئەوە کەراهەتی هەیە، بەڵام ئەگەر ئارەزووی پیر و گەنجی لاوازی پێ نەجولا ئەوە کەراهەتی نی‌یە، بەڵام نەکردنی باشترە، جا ماچ کردنەکە هی دەم بێت یان هی کولم وەك یەکە، بەو پی‌یە دەست کردنە مل و دەست لێدان حوکمی ماچ کردنیان هەیە.

**٤- دەرزی لێدان:**

دەرزی بە گشتی ڕەوایە لە خۆ بدرێ، خۆراکی بێت یا جۆری تر، لە دەمار بدرێت یا لە ژێر پێست، ئەگەر بگاتە ناو سکیش قەیناکە، چونکە لەو دەرگایانەوە ناچێت کە دەرگای سروشتین.

**٥- کەڵەشاخ گرتن:**

پێغەمبەر ﷺ کەڵەشاخی-خوێنی سەری- لە خۆی گرتووە و بەڕۆژوویش بووە. (ئەمەش بوخاری ڕیوایەتی کردووە). بەڵام ئەگەر ببێتە هۆی لاواز کردنی ڕۆژووانەکە کەراهەتی هەیە.

ثابتی بونانی بە ئەنەسی ووت: ئایا ئێوە لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ بە خراپتان ئەزانی ڕۆژووان کەڵە شاخ لە خۆی بگرێ؟ ووتی: نە، تەنها مەگەر لەبەر لاوازی ڕۆژووانەکە بێت کە مەترسی لاواز کردنی لێ بکرێت. (بوخاری وغەیری ئەو گێڕاویانەتەوە). وە خوێن گرتنیش لە هەر ئەندامێکی لەش جگە لە سەر هەر حوکمی کەڵە شاخی هەیە.

**٦- ئاولەدەم ولوت رادان:**

ئاو لە دەم ولوت ڕادان ڕەوایە بۆ کەسێك بەڕۆژوو بێت، بەڵام زۆر بردنی بۆ ناو قورگ و لوت کەراهەتی هەیە. لە (لقيط) ی کوڕی صەبورەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (فَإذا استَنشَقتَ فَأبلِغ، إلا أن تَكُونَ صَائِماً) (رواه أصحاب السنن، وقال الترمذي: حسن صحيح). واتە: ئەگەر ئاوت لە لوتت ڕادا زۆری هەڵمژە، مەگەر بەڕۆژوو بیت.

زانایان بە کەراهەتی ئەزانن کە ڕوژرووان قەترە بکاتە لوتی، وە ئەڵێن: ڕۆژووی پێ ئەشکێت، وە لە حەدیسدا بەڵگەی ئەوە هەیە کە قسەکەیان بە هێز ئەکات.

ئیبنوقودامە ووتویەتی: ئەگەر کەسێك کاتی دەست نوێژەکە ئاوی ڕادا لە لوت و دەمی، و ئاو پەڕی‌یە قورگی بێ ئەوەی خۆی مەبەستی بوو بێت هیچی لەسەر نی‌یە.

ئەوزاعی و ئیسحاق و شافیعی لە یەکێ لە ڕاکانیاندا هەر وایان ووتوە، وە ئەوەش لە ئیبنوعەبباسەوە ڕیوایەت کراوە.

مالیك و ئەبوحەنیفە ووتویانە: بەو شێوەیە ڕۆژوو ئەشکێنێ، چونکە ئاو چۆتە ناو سکی و بیری هەبووە کە بەڕۆژوو بووە، وەك کەسێك بە قەستی ئاو بخواتەوە.

ئیبنوقودامە ڕای یەکەم پێش ئەخات ئەداتەوە و ئەڵێت: لای ئێمە ئەو کەسەی ئاوەکە گەیشتۆتە قورگی بێ ئیسراف و بێ مەبەست وەك ئەوە وایە مێشێك پەڕیبێتە قورگی، بەوە جیائەکرێتەوە لە کەسێك کە بە قەستی ئاوی خواردبێتەوە.

٧- وە هەروەها ڕەوایە ئەو شتانەی کە ناتوانرێت خۆیان لێ بپارێزرێت وەك قووت دانی تف و تۆز و خۆڵی ڕێگا و بان و تۆزی ئاردی بێژراوو تۆزی پوش و کاو ئەم جۆرە شتانە:

ئیبنوعەبباس ووتویەتی: خراپ نیە تامی ترشیات و شتێك کە بیەوێ بیکڕێت بکات، بە مەرجێك قووتی نەدا.

حەسەن گوێزی بۆ منداڵێکی کوڕەکەی ئەجو و ئەیدایە و بەڕۆژووش بوو، وە ئیبراهیمیش ڕێ ی بەوانە داوە.

بەڵام بنێشت جوین کەراهەتی هەیە، ئەگەر پارچەشی لێ نەبێتەوە، وە ئەوەی ئەڵێت کەراهەتی هەیە شەعبی و نەخەعی و حەنەفیەکان و شافیعی و حەنبەلیەکانە.

عائیشە و عطاء ڕێیان داوە بە بنێشت جوین، چونکە ناچێتە ناو سکەوە، ئەڵێن: وەك چەوێك وایە بخرێتە ناو دەمەوە.

ئەمە ئەگەر بنێشتەکە پارچەی لێ نەبۆوە، بەڵام ئەگەر پارچەی لێ بێتەوە و بچێتە خوارەوە بۆ ناو سکی ئەوە ڕۆژوو ئەشکێنێت.

ئیبنوتەیمیە ووتویەتی: قەیناکە بۆ کەسێك بەڕۆژوو بێت بۆنی شتی خۆش بکات. وە ووتویەتی: بەڵام کل و حۆقنە و ئەو قەترەیەی ئەخرێتە مەجرای میزەوە و تەداوی کردنی برینی قووڵی سك و شکانی قووڵی سەر، ئەمانە زانایان کێشەیان هەیە لەسەری، جا هەیانە ئەڵێن: ئەوانە هیچی ڕۆژوو ناشکێنن، وە هەشیانە ئەڵێن: بەوانە هەمووی ئەشکێت، جگە لە کل، وە هەیانە ئەڵێن: بەوانە هەمووی ئەشکێت جگە لە قەترە، وە هەیانە ئەڵێن: نە بە کل ئەشکێت نە بە قەترە، وە بەجگە لەو دووانە ئەشکێت.

پاشان ئیبنوتەیمیە پارسەنگی قەولی یەکەم ئەکات و ئەڵێت: وا دەرئەکەوێ بە هیچ کام لەوانە ڕۆژوو ناشکێ، لەبەر ئەوەی ڕۆژوو لە ئاینی ئیسلامە، کە خاص و عام پێویستیان بەوەیە شارەزایی یان لێی هەبێت، جا ئەگەر ئەو شتانە لەوانە بوونایە کە خوا و پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژوو دا حەرامی کردوون و ڕۆژوویان پێ بەتاڵ ئەبێتەوە، ئەوە پێویست بوو لەسەر پێغەمبەر ﷺ ڕوونی بکاتەوە، وە ئەگەر باسی

ئەوانەی بکردایە صەحابە ئەیان زانی و ئەیان گەیاند بە ئوممەت، وەك چۆن هەموو شەرع و یاسای ئیسلامیان گەیاندووە، جا کە هیچ کەسێك لە ئەهلی عیلم ئەمانەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ نەقڵ نەکردووە، نە بە حەدیسێکی صەحیح، نە بە زەعیف، نە بە موسنەد، نە بە مورسەلی، ئەوە زانراوە کە ئەمانە شتێك بوون ئینکاری لە بەکارهێنانیان نەکراوە.

وە ووتویەتی: دوای ئەوە حوکمی هەر شتێك کە بڵاوە لەناو خەڵکدا پێغەمبەر ﷺ ڕوونی کردۆتەوە بە شێوەیەکی گشتی، وە ئەوەی ئەویش ڕوونی کردبێتەوە، ئەبێت موسڵمانەکان نەقڵیان کردبێت، وە مەعلووم و ئاشکراشە کە کل و ئەو جۆرە شتانەی پێشو بڵاو لەناو خەڵکدا، وەك چۆن بۆن لە خۆدان و خۆشتن و خۆ بخورکردن و خوچەورکردن بڵاوە لەناو هەموو خەڵکیدا، جا ئەگەر ئەو شتانە ڕۆژوویان بشکاندایە پێغەمبەر ﷺ ڕوونی ئەکردەوە، وەك چۆن شکاندنی بە شتەکانی تر ڕوون کردۆتەوە، ئیتر مادام باسی نەکردوون، ئەزانرێت کە کل و ئەو جۆرە شتانە هەروەك بۆنی خۆش و بوخور و چەورکردن وایە. وە جاری وا هەیە بوخور بە لوتا ئەڕواتە سەر و ئەچێتە ناو مێشکەوە قەبارەش دروست ئەکات؛ هەروەها چەورییەکەش بەدەن هەڵیئەمژێ و ئەچێتە ناوییەوە و مرۆڤیش پێی بەهێز ئەبێت، وە هەروەها بە بۆنی خۆش چاك بەهێز ئەبێت، جا لە کاتێکدا ڕۆژووان نەهی لێ نەکراوە لەو شتانە ئەوە بەڵگەیە لەسەر دروستییەتی بۆن لە خۆدان و بوخورکردن و چەورکردن و چاوڕشتن بە کل بۆ ڕۆژووان.

موسڵمانەکان لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ دا لە جیهاددا بوایە یا لە شتی تردا بریندار ئەبوون و توشی برینی قووڵی سك و شکانی قووڵی سەر ئەبون، خۆ ئەگەر تەداوی کردنی ئەو برینانە ڕۆژووی بشکاندایە ئەوە بۆی ڕوون ئەکردنەوە، جا مادام قەدەغەی نەکردووە، ئەزانرێت کە لەوانەی دانەناوە ڕۆژوویان پێ ئەشکێت.

لە پاشاندا ووتویەتی: کل، بە هیچ جۆرێك خۆراك نادات بە لەش، وە کەسیش کل ناخاتە ناو سکی، نە لە لوتییەوە نە لە دەمییەوە، هەروەها حۆقنەکردن خواردن نییە، بەڵکو ئەبێتە هۆی دەرچوونی ئەو شتانەی لەناو ڕیخۆڵەدا هەن، وەك چۆن کەسێك بۆنی شتێك بکات کە سك بچێنێت، یا بە شێوەیەك بترسێ سکی پێی بچێت، ئەبینین ئەمانە ناچنە ناو گەدەوە، جا ئەوانەی تریش هەر وەهان.

وە ئەو دەرمانەی بە هۆی تەداوی کردنی قڵشی ناو سەرو برینی قوڵ بۆ ناو سك، بگاتە گەدە هەرگیز وەك ئەوە نابێت کە خواردن بکاتە گەدەیەوە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ (البقرة/١٨٣). واتە: ڕۆژوو لەسەر ئێوە فەرز کراوە وەك چۆن لەسەر ئوممەتەکانی پێش ئێوە فەرز کراوە.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الصَّومُ جُنَّةٌ) واتە: ڕۆژوو قەڵغانە.

وە ئەفەرموویت: (إِنَّ الشَّيطَانَ يَجرِي مِنِ ابنِ آدَمَ مَجرى الدَّمِ فَضَيِّقُوا مَجارِيَهُ بِالجُوعِ وَالصَّومِ). واتە: شەیتان لەناو دەمارەکانی ئادەمیزاد وەك خوێن ئەگەڕێت، ئێوەش بە برسێتی و ڕۆژووگرتن دەمارەکانی لێ تەسك بکەنەوە.

پاشان ڕۆژووان بۆیە خواردن و خواردنەوەی لێ قەدەغەکراوە، چونکە ئەوە هۆی تەقوایە، جا وازهێنان لە خواردن و خواردنەوە کە خوێنی زۆر پێك ئەهێنن، ئەو خوێنەی کە شەیتان پێیدا ئەڕوات، لە خواردن دروست ئەبێت، نەك لە حۆقنە و کل و ئەو دەرمانە قەترانەی ئەکرێتە ناو زەکەرەوە، وە نەك لەو دەرمانانەی کە تەداوی قلشی قوڵی سەر و برینی گەیەنەر بۆ ناو سکی پێ ئەکرێ. تەواو.

**٨- ڕەوایە بۆ ڕۆژووان بخوات و بخواتەوە و جیماع بکات هەتا طلوعی فەجر، جا کاتێ فەجر طلوعی** کرد و پارویەك لەناو دەمیدا بوو پێویستە لەسەری تفی بکاتەوە، وە ئەگەر خەریکی جیماع کردن بوو پێویستە خۆی بکێشێتەوە[١].

---

(١) ئەمە چاولێکەری هەندێك لە کتێبە فیقهی‌یەکانە، کە هیچ بەڵگەیەکیشی لە سوننەتی موحەممەدیدا لەسەر نی‌یە، بەڵکو پێچەوانەی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرە ﷺ: (إذَا سَمِعَ أَحَدُكُمُ النِّدَاءَ وَالإِنَاءُ على يَدِهِ، فلا يَضَعهُ حتى يَقضِيَ حَاجَتَهُ مِنهُ) واتە: هەرکام لە ئێوە لە پارشێودا گوێی لە بانگ بوو، وە جامەکەشی بەدەستەوە بوو، با دای نەنێت هەتاوەکو ئەوەی پێویستی‌یەتی لێی ئەخوات.

ئەحمەد و ئەبو داود و حاکم تەخریجیان کردووە، وە حاکم و (ذهبـي) بە صەحیحیان داناوە. وە ئیبنوحەزمیش تەخریجی کردووە و ئەم زیادەیەشی باس کردووە:

عەممار ووتویەتی: -مەبەستی ئیبنوئەبی عەممارە کە لە ئەبو هورەیرەوە ئەگێڕێتەوە- کاتێك بەرەبەیان دەر ئەکەوت بانگیان ئەدا.

وە حەمماد -واتە: ئیبنوسەلەمە- لە هیشامی کوڕی عورووەوە ئەگێڕێتەوە کە ووتویەتی: باوکم هەر بەوە فتوای ئەدا.

ئەم ڕیوایەتەش چەند شایەتێکی هەیە کە لە (التعليقات الجياد)دا باسم کردووە پاشان لە (الصحيحة)دا بە ژمارە (١٣٩٤).

وە بەڵگەی ئەوەشی تێدایە کە هەرکەس تلوعی فەجری بەسەردا هات و جامی خواردن یا خواردنەوەی بەدەستەوە بوو، بۆی هەیە کە دای‌نەنێت هەتا پێویستی‌یەکەی لێ وەرئەگرێت. جا ئەم شێوەیە لە ئایەتەکە جیا کراوەتەوە کە ئەفەرموێت: ﴿وكلوا واشربوا حتى يتبين لكم الخيط الأبيض من الخيط الأسود من الفجر﴾ واتە: بخۆن و بخۆنەوە هەتا هێڵی سپی بەرەبەیان لە هێڵی تاریکی شەودا دەرئەکەوێت.

کەواتە هیچ بەرەنگاری‌یەك لەنێوان ئەم ئایەتەو ئەو حەدیسەدا نی‌یە، وە هیچ ئیجماعێکیش نی‌یە کە بەرهەڵستی بکات، هەروەها ئەو حەدیسانەش کە مانای ئەم ئایەتەیان هەیە.

جا ئەگەر خواردنەکەی تف کردەوە یا خۆی کێشاوە ئەوە ڕۆژووەکەی دروستە، بەڵام ئەگەر خواردنەکەی ناو دەمی بە ئارەزووی خۆی قوت دا، یا بە ئارەزووی خۆی جیماعەکەی تەواو کرد ڕۆژووەکەی دروست نییە.

بوخاری و موسلیم لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێت ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إِنَّ بِلالاً يُؤَذِّنُ بِلَيلٍ، فَكُلُوا وَاشرَبُوا، حتى يُؤَذِّنَ ابنُ أُمِّ مَكتُوم). واتە: بیلال شەوی ئەمێنێ بانگ ئەدات، ئێوەش بخۆن و بخۆنەوە هەتا ئیبنوئومی مەکتوم بانگ ئەدات.

**٩- ڕەوایە بۆ ڕۆژووان ڕۆژ بکاتەوە بە لەشی گرانەوە، وەك لە پێشەوە باس کرا لە حەدیسەکەی عائیشەدا.**

**١٠- هەروەها ژنی بێ نوێژ و زەیستان ئەگەر لە شەودا پاك بوونەوە دروستە بۆیان خۆشتن دوا بخەن** هەتا بەیانی، وە بەڕۆژوو بوونیان دروستە، پاشان لەسەریانە خۆیان بشۆرن بۆ نوێژەکانیان.

## ئەوانەی ڕۆژوو بەتاڵ ئەکەنەوە

ئەو شتانەی ڕۆژوو بەتاڵ ئەکەنەوە دوو بەشن:

یەکەم: ئەوەی بەتاڵی ئەکاتەوە و تەنها گرتنەوەی ڕۆژووەکە پێویست ئەکات.

دووەم: ئەوەی بەتاڵی ئەکاتەوە وگرتنەوە و کەفارەت پێویست ئەکات.

ئەما ئەوەی ڕۆژوو بەتاڵ ئەکاتەوە و تەنها گرتنەوەی پێویستە ئەمانەن:

**(١و٢) خواردن و خواردنەوە بە قەستی:**

بەڵام ئەگەر کەسێك لە یادی نەبوو، یا بە هەڵە، یا زۆری لێ کرا شتێکی خوارد یا خواردییەوە، ئەوە نەگێڕانەوەی لەسەرە نە کەفارەت.

---

بەڵکو کۆمەڵێك لە صەحابە و کەسانی تر بۆ لێکدانەوەیەك چوون کە لە مەبەستی حەدیسەکەش زیاترە، ئەویش ئەوەیە کە بە ڕەوایان داناوە پارشێو بکرێت هەتا بەرەبەیان دەرئەکەوێت و ڕێگاوبان سپی ئەبنەوە. جا بگەڕێرەوە بۆ فتح (٤/١٠٩-١١٠).

وە یەکێ لەو سوودانەی کە ئەم حەدیسە ئەیگەیەنێت پوچەڵ کردنەوەی بیدعەی ئیمساکە کە لە پێش بەرەبەیاندا نزیکەی چارەکە سەعاتێك خۆیان لە خواردن ئەگرنەوە، بۆیە ئەو کارە ئەکەن لەوە ئەترسن کە بەیان پێیان بگات لە کاتێکدا ئەمان خەریکی پارشێون، جا ئەگەر بەم ڕێ پێدانەیان بزانیایە، نەئەکەوتنە ئەم بیدعەتەوە جا وورد بەرەوە. (تمام المنة).

لە ئەبوهورەیرەوە ﷺ هاتووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن نَسِيَ ـ وَهُوَ صَائِمٌ ـ فَأكَلَ أو شَرِبَ، فَلْيُتِمَّ صَومَهُ، فَإنَّمَا أطعَمَهُ اللهُ وَسَقَاهُ) (رواه الجماعة). واتە: کەسێك لە یادی نەبوو ـ لە کاتێکدا بەڕۆژوو بوو ـ شتێکی خوارد یا شتێکی خواردەوە، با ڕۆژووەکەی تەواو بکات، چونکی خوا خواردن وخواردنەوەی پێ داوە.

(ترمذي) ووتویەتی: بەشی زۆری زانایان بەوە کار ئەکەن، وە سوفیانی ثەوری و شافیعی و ئەحمەد وئیسحاقیش بەپێی ئەو حەدیسە قەول ئەکەن.

دارقطني و بەیهەقی وحاکم، کە ئەڵێت: صەحیحە لەسەر مەرجی موسلیم لە ئەبوهورەیرەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن أفطَرَ فِي رَمَضَانَ ـ نَاسِياً ـ فَلا قَضَاءَ عَلَيهِ وَلا كَفَّارَةَ) (قال الحافظ ابن حجر إسناده صحيح). واتە: هەرکەس لە ڕەمەزاندا ـ لە بیری نەبوو بە ڕۆژووە ـ شتێکی خوارد یا خواردیەوە نە گێڕانەوەی لەسەرە ونە کەفارەت.

لە ئیبنوعەبباسەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إنَّ اللهَ وَضَعَ عَن أُمَّتِي الخَطَأ وَالنِّسيَانَ، وَمَا استُكرِهُوا عَلَيهِ) (رواه ابن ماجه والطبراني والحاكم) واتە: خوا تاوانی هەڵە کردن ولە بیر چوونەوەو بە زۆر پێ کردنی لەسەر ئۆممەتەکەم هەڵگرتووە.

٣- خۆڕشاندنەوە:

بەڵام ئەگەر کەسێك ڕشانەوە زۆری بۆ هێنا و ڕشایەوە، ئەوە نەگێڕانەوەی لەسەرە، نە کەفارەت.

چونکە لە ئەبوهورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن ذَرَعَهُ القَيءُ فَلَيسَ عَلَيهِ قَضَاءٌ، وَمَنِ استَقَاءَ عَمداً فَلْيَقضِ) (رواه أحمد وأبوداود والترمذي وابن ماجه وابن حبان والدارقطني والحاكم وصححه). واتە: هەرکەسێك بەڕۆژوو بوو ڕشانەوە زۆری بۆ هێنا و ڕشایەوە گێڕانەوەی لەسەر نییە، وە هەرکەس بە قەستی خۆی ڕشاندەوە ئەبێ ئەو ڕۆژە بگرێتەوە.

(خطابي) ووتویەتی: هیچ جیاوازییەك نازانم لە نێوان زانایاندا هەبێت، لەسەر ئەوەی کە کەسێك ڕشانەوە زۆری بۆ هێنا وڕشایەوە قەزای لەسەر نییە، وە ئەوەی خۆی برشێنێتەوە قەزای لەسەرە.

(٤و٥) - بێ نوێژی وزەیستانی، ئەگەرچی لە دەقیقەکانی دوایی ڕۆژدا بێت پێش ئەوەی خۆر ئاوا بێت، ئەمەش ڕای هەموو زانایانی لەسەرە.

**٦- ئاو هێنانەوە:**

بە هۆی ماچ کردنی ژنەوە بێت، یا بە هۆی خۆپێوە نوسانی‌یەوە، یا بە دەست بێ، ئەوە ڕۆژووی پێ ئەشکێت وگێڕانەوەشی پێویستە[1]، بەڵام ئەگەر هۆی ئاو هاتنەوەکە تەنها سەیر کردن بێت، یا بیر لێ

---

(١) هیچ بەڵگەیەك نی‌یە کە بڵێین ڕۆژوو بەتاڵ ئەکەنەوە، وە وا دەرناکەوێت کە وەك جیماع دابنرێت، هەر لەبەر ئەوەصەنعانی ئەڵێت:

وا دەرئەکەوێت کە کەفارەت و ڕۆژوو گرتنەوە تەنها لەسەر ئەو کەسەیە کە جیماع بکات، وە ئەمە دوورە لە ڕاستی‌یەوە ئەگەر کەسێك جیماعی نەکردبێت وەك ئەو کەسەی دابنێین کە جیماعی کردبێت.

شەوکانیش هەر بەلای ئەم بۆچووندا چووە، وە ئەمەش بۆچوونی ئیبنوحەزمە، جا سەیری (المحلی ٦/١٧٥-١٧٧و٢٠٥) بکە.

وە ئەوەی ڕێنمونیت ئەکات لەسەر ئەوەی کە قیاس کردنی ئاو هێنانەوە لەسەر جیماع کردن قیاس کردنێکە کە جیاوازی هەیە، ئەویش ئەوەیە کە هەندێك لەوانەی قیاسیان کردووە بە جیماعەوە نەیان ووتووە کەفارەتیشی لەسەرە، وە وتویانە: جیماع کردن حوکمەکەی توندترە لە ئاوهێنانەوە، وە ئەصلیش لە ئاوهێنانەوەدا ئەوەیە کەفارەتی لەسەر نی‌یە، سەیری (المهذب) بکە لەگەڵ شەرحەکەی نەوەوی دا (٦/٣٨٦).

ئێمەش هەروا ئەڵێین، ئەصل ئەوەیە کە ڕۆژوو ناشکێنێ، وە جیماعیش حوکمەکەی توندترە لە ئاوهێنانەوە کەواتە قیاس ناکرێتە سەری جا وورد بەرەوە.

ڕافعی ووتویەتی (٦/٣٩٦):

ئەگەر مەنی بە دەست بێتەوە ئەوە ڕۆژوو ئەشکێنێت، لەبەر ئەوەی ئامێری پیاو ئەگەر بخرێتە ناو لەشی ئافرەتەوە بێ ئەوەی ئاوی بێتەوە ڕۆژوو بەتاڵ ئەکاتەوە، جا ئاوهاتنەوە بە جۆرێك ئارەزووەوە نزیکترە لەوەی ڕۆژوو بەتاڵ بکاتەوە.

منیش ئەڵێم ئەگەر ئەم قسەی ڕاست بووایە ئەوە ئەبوایە کەفارەت دان لە ئاوهێنانەوە بە دەست نزیکتر بووایە لە واجبێتی کەفارەت دان لە خستنی ئامێری پیاو بۆ ناو لەشی ئافرەت. ئەوانیش دان بەم قسەیەدا نانێن، جا سەیری دژایەتی (تناقض)ی ئەم دو قیاسە بکە.

لەگەڵ ئەوەشدا تەماشای بەرهەڵستی ئەوکەسانە بکە لەگەڵ هەندێك ئاسار کە لە سەلەفەوە هاتووە و ئەڵێت: باوەش پیا کردنی ئافرەت ئەگەر ئاو بهێنێتەوە ڕۆژوو بەتاڵ ناکاتەوە، جا من هەندێکم لەم ئاسارانە باس کردووە لە (سلسلة الأحاديث الصحيحة) دا لەژێر حەدیسی ژمارە (٢١٩-٢٢١) جا لەوانە قسەی عائیشەیە ڕەزای خوای لێ بێت دەربارەی ئەو کەسەی پرسیاری لێ کرد، پیاو ئەگەر بەڕۆژوو بو، چی بۆی حەڵاڵە لەگەڵ ژنەکەیدا بیکات؟ ئەویش فەرمووی هەموو شتێك دروستە جیماع نەبێت.

عبد الرزاق لە (مصنف)ەکەیدا تەخریجی کردووە (٤/١٩٠/٨٤٣٩) بە سەنەدێکی صحیح هەروەك (حافظ) لە فەتحدا ئەمەی ووتووە، ئیبنوحەزمیش کردویەتی‌یە بەڵگە جا سەیری ئەوانەی تر لەوێدا بکە کە باسمان کرد.

وە ئیبنوخوزەیمە تەرجومەی هەندێك حەدیسی كردووە، كە لەم بەشەدا هاتووە بەوە كە لە صەحیحەكەیدا (٣/٢٤٢) ووتویەتی:
ئەمە بابێكە لەبارەی ئەو باوەش پیاكردن و خۆپێوە نوساندنەی كە بە جیماع دانانرێت بۆ ڕۆژووان، وە بەڵگەی ئەوەی كە هەندێك ناو، جاری وا هەیە بە دوو شت ئەوترێت، یەكیان حەرامە و ئەوی تریان حەڵاڵ، چونكە ناوی (مباشرة) نزیكی كردن خوای گەورە لە كتێبەكەیدا بە جیماع ناوی بردووە، وە كیتابی خوا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە جیماع لەكاتی ڕۆژوودا حەرامە.
پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إنَّ الجِمَاعَ يُفَطِّرُ الصَّائِمَ) واتە: جیماع ڕۆژووی ڕۆژووان ئەشكێنێ.
وە پێغەمبەریش ﷺ بە كردەوەكەی بەڵگەی ئەوەی نیشان داوە كە ئەو (مباشرة) نزیكی كردنەی كە جیماع نیە و كەمترە لە جیماع ڕەوایە بۆ ڕۆژووان و كەراهەتی نیە.
وە ئەوەی پێویستە ئاگاداری لەسەر بكەینەوە دوو شتە:
یەكەم: ئاوهاتنەوە بە بێ جیماع ڕۆژوو ناشكێنێ، وە (مباشرة) نزیكی كردنی ڕۆژووان شتێكی ترە، ئەوەی هەیە ئێمە ئامۆژگاری ڕۆژووان ئەكەین ئەگەر هات و ئارەزووەكەی بەهێز بوو ئەگەر بەڕۆژوو بوو ئەو موباشەرەیە نەكات. نەوەكو بكەوێتە حەرامەوە كە جیماعە، ئەمەش بۆ ئەو دەرگا داخستنەیەكە بەرەو حەرام ئەڕوات، كە لە زۆر بەڵگەكانی شەریعەتدا بەكار دێت. لەوانە فەرمودەی پێغەمبەرە كە فەرموویەتی: (ومَن حَامَ حَولَ الحمى أوشَكَ أن يَقَعَ فِيهِ) واتە: هەركەس بەدەوری سنووری حەرامدا بڕوات نزیكە بكەوێتە ناویەوە.
لەوانەشە عائیشە مەبەستی ئەوە بووبێت كاتێ باسی موباشەرە كردنەكەی پێغەمبەر ﷺ ئەكات لەكاتی ڕۆژوودا وئەفەرمووێت: بەڵام كێتان هەیە كە بە ئەندازەی ئەو دەسەڵاتی بەسەر خویدا هەبێت.
دووەم: كاتێك دانەر باسی ئەو ئاوهێنانەوەی كردووە بەدەست، نابێت كەسێك نیسبەتی ڕەوایی بداتە پاڵ دانەر لەبەر ئەوەی دانەر بۆیە باسی كردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بكاتەوە كە ئاوهێینانەوە بە دەست لای ئەو ڕۆژوو باتڵ ئەكاتەوە. ئەمما حوكمی خودی ئاوهێنانەوە بە دەست، ئەوە باسەكەی لە شوێنێكی تردا هەیە، وە دانەر بە شیكراوەیی باسی لێوە كردووە لە (كتاب النكاح) دا و باسی قسەی زانایانی كردووە لەوبارەیەوە، و باسی جیاوازیەكەیانی كردووە، هەرچەندە خوێنەر لەوێدا ڕایەكی ڕوونی بۆ دەرناكەوێت كە دانەر ووتبێتی، هەروەك دانەر پێشەیەتی لەزۆربەی ئەو كێشانەدا كە جیاوازی لەسەر هەیە.
بەڵام ئێمە لەگەڵ ئەوكەسانەداین كە بە حەرامیان داناوە، بە بەڵگەی فەرمودەی خوای گەورە: ﴿وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِفُرُوجِهِمۡ حَـٰفِظُونَ ۝ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَـٰنُهُمۡ فَإِنَّهُمۡ غَيۡرُ مَلُومِينَ ۝ فَمَنِ ٱبۡتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡعَادُونَ﴾ واتە: وە ئەوانەی كە پارێزەری داوێن و پاكی خۆیانن، مەگەر لەگەڵ ژنانی خۆیان یا كەنیزەكانیان, جا بێ گومان (لەمەدا) لۆمە ناكرێن.

کردنەوە بێت، ئەوە ڕۆژوو ناشکێت وهیچیشی لەسەر نابێت، وە هەروەها هاتنەدەری مەذی کار ناکاتە سەر ڕۆژوو کەم بێت یا زۆر.

٧- خواردنی شتێك کە بە موغەززی دانەنرێت، لە شوێنی سروشتی‌یەوە کە دەمە وگەیشتنی بە گەدە، وەك خواردنی خوێی زۆر، ئەمەش ڕۆژوو ئەشکێنێ بە قسەی هەموو زانایان.

٨- هەرکەس نییەتی شکاندنی ڕۆژووەکەی هەبێت ـ لە کاتێکدا کە بەڕۆژووە ـ ئەو کەسە ڕۆژووەکەی ئەشکێت.

با هیچیش نەخوات، چونکە نییەت هێنان پایەیەکە لە پایەکانی ڕۆژوو، جا ئەگەر ئەو نییەتەی هەڵوەشاندەوە -بە مەبەستی ڕۆژوو شکاندن بە قەستی- ڕۆژووەکەی بەتاڵ ئەبێتەوە بەبێ شك.

٩- ئەگەر کەسێك شتێکی خوارد یا خواردی‌یەوە یا جیماعی کرد وای ئەزانی ڕۆژ ئاوا بووە یا وای ئەزانی ڕۆژ نەبۆتەوە دوایی پێچەوانەی ئەوە دەرکەوت، ئەوە قەزای لەسەرە لای جەماوەری زانایان، لەوانە هەر چوار ئیمامە خاوەن مەزهەبەکانن.

بەڵام ئیسحاق و داود و ئیبنوحەزم و (عطاء) و عوروەو حەسەنی بەصری و موجاهید، ڕایان وایە ئەو کەسە ڕۆژووەکەی دروستە وگێڕانەوەی لەسەر نی‌یە، بەپێی فەرموودەی خوای گەورە: ﴿وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَآ أَخْطَأْتُم بِهِۦ وَلَٰكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ﴾ (الأحزاب/٥). واتە: لەسەر ئەوانەی بە هەڵە ئەیکەن تاوانبار نابن، بەڵام لەسەر ئەوانەی بە قەستی دڵ ئەیان کەن تاوانبار ئەبن.

وە بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: (إِنَّ اللهَ وَضَعَ عَنْ أُمَّتِي الخَطَأَ الخ...) کە لەپێشەوە باس کراوە.

(عبدالرزاق) ئەگێڕێتەوەو ئەڵێت: مەعمەر لە ئەعمەشەوە بۆمان ئەگێڕێتەوە لە زەیدی کوڕی وەهبەوە کە ووتویەتی: لەسەردەمی عمری کوڕی (خطاب) دا خوا لێی ڕازی بێت خەڵك ڕۆژوویان شکاند، من بە چاوی خۆم ئەم بینی دۆڵچەیان لە ماڵی حەفصەوە ئەهێنایە دەر لێیان ئەخواردەوە، پاشان ڕۆژ لە ژێر

---

وە ناڵێین بۆ ئەو کەسانەی کە لە زینا مەترسییان هەیە دروستە، بەڵکو ئێمە پێی ئەڵێین با پزیشکایەتی‌یەکەی پێغەمبەر ﷺ بەکاربێنێت کە لە حەدیسە بەناوبانگەکەیدا بە گەنجەکان ئەفەرموێت: (وَمَن لَم يَستَطِع فَعَلَيهِ بِالصَّومِ فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ) واتە: وە هەرکەس توانای ژن هێنانی نەبوو با بەڕۆژوو بێت چونکە ڕۆژوو ئارەزووەکەی ئەشکێنێت.

وە هەروەها ئێمە زۆر بە توندی ئینکاری ئەوکەسانە ئەکەین کە بۆ گەنجەکان لەبەر مەترسی زینا حەڵاڵی ئەکەن، بێ ئەوەی بەم پزیشکی‌یەی پێغەمبەری بەڕێز ﷺ فەرمانیان پێ بکەن (تمام المنة).

هەورەکەوە دەرکەوت، لای خەڵکەکە زۆر ناخۆش بوو، وتیان: ئەم ڕۆژە ئەگرینەوە، عمر ﷺ فەرمووی: بۆ چی؟ سوێند بە خوا مەبەستمان نەبووە ئەو تاوانە بکەین.

بوخاری لە ئەسمای کچی ئەبوبەکرەوە ڕەزای خوایان لێ بێت ئەگێڕێتەوە ووتویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێکی ڕەمەزان هەور بوو، ئێوارە وامان ئەزانی ڕۆژ ئاوا بووە، ڕۆژوومان شکاند لەپاشاندا ڕۆژ دەرکەوت.

ئیبنوتەیمیەیە ووتویەتی: ئەوە ئەبێتە بەڵگەی دوو شت:

(یەکەم)- ئەوە ئەگەیەنێت ئەگەر ڕۆژەکە هەور بوو، موستەحەب نییە ڕۆژوو شکاندن دوا بخرێت هەتا دڵنیا ئەبن لە ڕۆژ ئاوابوون، چونکە ئەوان وایان نەکردووەو پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی پێ نەکردون وا بکەن، وە صەحابە لەگەڵ پێغەمبەرەکەیاندا لە هەموو کەس شارەزاتروو مل کەچی فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەیان بوون لە ئوممەتەکانی دوایی.

(دووەم)- ئەوە ئەگەیەنێت ئەگەر شتی وا کرا ئەوە ئەو ڕۆژە ناگیرێتەوەو قەزا ناکرێتەوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی قەزا کردنەوەی پێ نەکردون، وەئەگەر فەرمانی پێ بکردنایە بڵاو ئەبۆوە، وەك چۆن ڕۆژوو شکاندنەکەیان بۆ نەقڵ کردوین، جا چونکە نەقڵ نەکراوە ئەبێتە بەڵگەی ئەوەی فەرمانی گرتنەوەی ئەو ڕۆژەی پێ نەکردون.

ئەما ئەو شتەی کە ڕۆژوو بەتاڵ ئەکاتەوە وگێڕانەوە وکەفارەت پێویست ئەکات تەنها جیماعە وهیچی تر نییە لای جەماوەری زانایان.

لە ئەبوهورەیرەوە هاتووە فەرمویەتی: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ ووتی: فەوتام ئەی نێرراوی خوا! فەرمووی: چی فەوتاندتی؟ ووتی: توخنی ژنەکەم کەوتم لە ڕەمەزاندا، فەرمووی: ئەوەندەت هەیە بەندەیەکی پێ ئازاد بکەیت؟ ووتی: نەء، فەرمووی: ئەی ئەتوانی دوو مانگ لەسەر یەك بەڕۆژوو بیت؟ ووتی: نەء، فەرمووی: ئەی ئەوەندەت هەیە شەصت هەژار تێر بکەیت؟ ووتی: نەء، ئەڵێ: لە پاشاندا دانیشت، ئەوەندەمان زانی(عرق)ێك خورمایان هێنا بۆ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە ببە بیکە بە خێر، کابرا ووتی: بۆ چی کەس هەیە لە ئێمە هەژارتر؟ لەنێوان ئەم دۆڵەی مەدینەدا خێزان نییە ئەوەندەی ئێمە موحتاجی ئەو خێرە بێت، پێغەمبەر ﷺ پێکەنی هەتا دانەکانی دەرکەوت وفەرمووی: برۆ بیدە بە خێزانەکەت.(جەماعەت گێڕاویانەتەوە).

ڕای جومهوری زانایان ئەوەیە کە ژن و پیاو هەر دوو وەك یەکن لە پێویست بوونی کەفارەت لەسەریان، بە مەرجێك هەردووکیان بە قەستی ئەوەیان کرد و بە ئارەزووی خۆیان بوو لە ڕۆژی ڕەمەزاندا، وە نییەتیشیان بوبێت کە بەڕۆژوو بن.

بەڵام ئەگەر ئەوەیان کردو بیریان نەبوو بەڕۆژوون، یا بە ئارەزووی خۆیان نەبوو، وەك ئەوەی زۆریان لێ بکرێت بۆ ئەو کارە، یا نییەتی ڕۆژوویان نەهێنابوو و بەڕۆژوو نەبوبن، ئەوە کەفارەت لەسەر هیچ کامیان نابێت.

جا ئەگەر ژنەکە لە لایەن پیاوەکەوە زۆری لێ کرا، وە یا بەهۆی مەعزەرەتێکی شەرعی‌یەوە بەڕۆژوو نەبوو، ئەوە تەنها کەفارەت لەسەر پیاوەکەیە نەك ژنەکە.

مەزهەبی شافیعی لە مەدا ئەوەیە کە کەفارەت لەسەر ژن نی‌یە بە هیچ جۆرێك، نە لەحاڵەتێکدا خۆی ڕازی بێت، نە لە حاڵەتێکدا زۆری لێ کرا بێت، بەڵکو تەنها گرتنەوەی ڕۆژووەکەی لەسەرەو بەس.

ئەوەی ووتویەتی: ڕاستتر ئەوەیە یەك کەفارەت پێویست ئەبێت لەسەر پیاوەکە بە تایبەتی، تەنها لە جیاتی خۆی ئەیدات، وە ژنەکە هیچی لەسەر نابێت، چونکە ئەوە مافێکە تایبەتە بە جیماعەوە، وە لەسەر پیاوە بە تەنها وەك مارەیی.

ئەبوداود ووتویەتی: لە ئەحمەدیان پرسی کەسێك لە ڕەمەزاندا جیماع لەگەڵ ژنی خۆی بکات، ئایا ژنەکە کەفارەتی لەسەر ئەبێت؟ ووتی: ئەمان بیستووە ژن کەفارەتی لەسەر پێویست بێت.

لە (المغني)دا هاتووە: ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دا بە پیاوەکە کە جیماعەکەی کردبوو لە ڕەمەزاندا بەندەیەك ئازاد بکات، بەڵام هیچی بە ژنی کابرا نەفەرموو، لەگەڵ ئەوەشدا ئەی زانی ژنەکەش هاوبەش بووە تیایدا.

کەفارەتەکەش هەر بەو شێوەو تەرتیبەی لە فەرموودەکەدا باس کراوە ئەبێ جێبەجێ بکرێت لای جەماوەری زانایان، جا پێویستە یەکەم جار بەندە ئازاد کردنەکە بەجێ بێت، جا ئەگەر توانای نەبوو ئەبێ دوو مانگ لەسەر یەك بەڕۆژوو بێت، جا ئەگەر نەیتوانی شەصت هەژار تێر بکات لەوەی ئەیدات بە خێزانەکەی خۆی بە شێوەیەکی مام ناوەندی، وە دروست نی‌یە لە کەفارەتێکەوە باز بدات بۆ کەفارەتێکی تر مەگەر توانای نەبێت، بەڵام ئەگەر توانای هەر کامیانی هەبوو ئەبێ بە جێی بهێنێت.

مالیکی‌یەکان ورِیوایەتێکی ئەحمەد بۆ ئەوە چوون کە ئەو کەسە ئارەزوی خۆیەتی لەو سێ کەفارەتە کامیان هەڵئەبژێرێت وبە جێی ئەهێنێ دروستە بۆی.

بەپێی ئەوەی مالیك و ئیبنوجورەیج ئەگێڕنەوە لە حومەیدی کوڕی عبدالرحمن‌ەوە لە ئەبوهورەیرەوە فەرمویەتی: پیاوێك لە ڕەمەزاندا (بە جیماع) ڕۆژووەکەی شکاند، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کرد کە یان بەندەیەك ئازاد بکات یا دوو مانگ لەسەریەك بەڕۆژوو بێت یا شەست هەژار تێر بکات. (موسلیم گێراویەتی‌یەوە). وە (أو) واتە: یان ، کە لە قسەکەی ئەبوهورەیرەدا هاتووە لە زمانی عەرەبی دا بۆ هەڵبژاردنە. وە لەبەر ئەوەی کەفارەت بە هۆی سەرپێچی کردنەوەیە، جا ئەو کەسە ئارەزوی خۆیەتی کامیان ئەدات، وەك کەفارەتی سوێند.

